

لە راستەوە بۆ چەپ: میران قادر بەگ، عەلی پاشا، مەلا گچکە، موفەتیش، مەجید پاشا، هاوسەری موفەتیش، موختار ئەفەندی

# چینی (ئەفەندی) لە هەولێر

**عەدنان رەشاد موفتی ***

شاری هەولێر بە کۆنترین شار دەژمێردرێ لە جیهاندا، کە ژیانی تێیدا بەردەوام بووە، بەر لە چەند ساڵێکیش کرا بە پایتەختی هەرێمی کوردستان، ئەم شارە دێرینە مێژوویەکی شارستانی کۆنی هەیە، هەر لە دامەزراندنییەوە ئاوەدانی تێدا بووە، تا ئەمڕۆش خەڵک تێیدا نیشتەجێ بووە، دەربارەی ناوەکەشی سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە ناوی ئێستای شارەکە، لە گۆڕانی بەردەوامدا بووە، هەر لە ناوە کۆنەکانییەوە، کە لە ناوی ئێستای نزیک بووە، بەر لە سەردەمی ئاشووری و دوای ئەو سەردەمەش بە ئەربائیلۆ ناسراوە، واتا (چوار خواوەند) پاشان ناوی بۆتە (هۆربیلم) و ئۆربیل تاوەکو بۆتە (اربیل)، بەلام ناوە کوردییەکەی (هەولێر) لەو چەند ناوانەی باسمان کرد، وەرگیراوە.

لەگەڵ ئەوەی چەندین توێژینەوە و لێکۆڵینەوە دەربارەی مێژووی شارستانییەتی اربیل (هەولێر) لەلایەن چەندین توێژەر و رۆژهەلاتناس و لێکۆڵەرەوە کراوە، بەلام هێشتا پێویستی بە توێژینەوەی زیاتر هەیە بۆئەوەی لە بنەچەی گۆڕنکارییەکان بکۆڵرێتەوە، کە کاریگەریان بەسەر قۆناغە مێژووییە یەک لەدوای یەکەکانی شارەکەوە هەبووە.

اربیل (هەولێر) بە شوێنە جوگرافییە ناودارەکەی ناسراوە، کە کەوتۆتە ناوەڕاستی کوردستانی عیراق (باشووری کوردستان). لە دیارترین رووە شارستانییەکانی قەلا مێژووییەکەیەتی، کە شێوەیەکی بازنەیی هەیە و مێژووەکەی بۆ هەزاران ساڵ دەگەڕێتەوە، شارەکە بەهۆی کاریگەری شێوە بازنەییەکەیەوە بەرفراوان بووە، دانیشتوانی لە بووندا زیاد بووە، لە ساڵی ١٩٥٧ لە (٧٠٠٠٠)، بە پێی ئامارەکان لە کاتی

(هەڵبژاردنەكانی پەرلەمان) لە ساڵی ١٩٩٢دا بۆ (٥٠٠٠٠٠) زیادی كردووە، سوڵتان موزەفەرەدین گوگبری (كە زاوای سەلاحەدین ئەیوبی) بووە، كە لە سەدەی سێزدەمینی كۆچی حوكمڕانی شارەكەی كردووە: هەر ئەو لە رووی بیناسازییەوە تازەی كردۆتەوە هەندێك لە شكۆدارییەكانی بۆ گەڕاندۆتەوە، كە چەندین سەدە پشتگوێ خرابوو، بەڵكو لەسەردەمی ئەودا شارەكە پۆشاكێكی ئایینی و كۆمەڵایەتی پۆشی، سوڵتان موزەفەری یەكەم، یەكەم كەس بوو، كە ئاهەنگی لە دایكبوونی پێغەمبەری پیرۆزی بە شێوەیەكی جیاواز و بە بەشداری سەرجەم چین و توێژە كۆمەڵایەتییەكان كردووە، كە دواتر بووە نەریتێكی باو تاوەكو ئەمڕۆش بەردەوامە. شارەكە لە رۆژی لە دایك بوونی پێغەمبەر محەمەد (د. خ)، دەكەوێتە حاڵەتێكی ئاهەنگسازی گشتی و وەك زەماوەندێكی لێدێت، كە نێو بازاڕە سەرەكییەكەی و مزگەوتەكانی و ماڵەكانی دەگرێتەوە. خەڵكی شارەكە سوڵتان موزەفەر بە پیرۆز دەزانن، بۆیە گۆڕەكەی بۆتە مەزارگەیەك و تا ئەمڕۆش خانەوادە هەولێرییەكان سەردانی دەكەن، مێژووی ئەم شارە بە شێوەیەكی بنەڕەتی بە شوێنەواری مێژوویی قەڵاتە كۆنەكەی پەیوەستە بە زانایانی شوێنەوارناس، دروستبوونی قەڵاكە بۆ بەر لە ٨٠٠٠ هەزار دەگەڕێتەوە، ئەمەش بە مەبەستی دروستكردنی شوێنێكی قایم و سەنگەری سەربازی بە رووی هێرشی دوژمناندا كە دەكرایە سەر شارەكە، بۆ یەكەم جار لە لەوحە سۆمەرییەكاندا ناوی شارەكە هاتووە، دەستەی دۆزەرەوە لەكاتی هەڵكۆڵینەكاندا لە لەوحێكی سۆمەریدا، كە بە زمانی مسماری سادە لەم سەردەمەدا بەكارهاتووە، مێژووەكەی بۆ سەردەمی پاشای دووەمی بنەماڵەی ئور دەگەڕێتەوە، كە پاشایەكی (شولكی) بووە و لە ساڵانی (٢٠٩٥ - ٢٠٤٨) پێش زایین ژیاوە، لە لەوحەكەدا باس لەوە دەكات، كە شازادەیەكی سۆمەری هێرشێكی سەربازی كردۆتە سەر شاری (ئوربیلم)، بۆ ئەوەی بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی: دواتریش ئاشوورییەكان هەڵمەتێكی هاوشێوەیان كردۆتە سەر شارەكە و داگیریان كردووە، تاوەكو ببێتە شاری (چوار خواوەندەكە)، بروایان وابوو كە ئەم خواوەندانە لە هەر كارەساتێك كە دووچاریان بێت پارێزگاریان لێدەكات، بەڵكو لە كردەوە بەرپرسیاریەتی خواوەندەكە دەبێت، بەدرێژایی زۆر لە سەردەمەكاندا قەڵاتی هەولێر نێوەندێكی ئایینی بووە، پارێزگاریشی لێكردووە، تاوەكو حكومەتی عێراق لە ساڵی ١٩٧٧ بڕیاریدا، كە ئەم شوێنە شارستانییە ببێتە موڵك بەڕێوەبەرایەتی گشتی شوێنەوار و دانیشتوانەكەشی قەرەبوو بكرێتەوە، بۆ ئەوەی لە دەرەوەی قەڵا نیشتەجێ بن، بەڵام پلانی بەڕێوەبەرایەتی شوێنەوار، بەهۆی جەنگەوە جێبەجێ نەكرا، ئەو هەوڵەش كە بۆ بونیاتنانەوەی دابووی تا رادەیەك شێواندنی سیماكەی بوو، دەروازەكەی بەشێوەی ئەندازەی بیناسازی سۆمەرییە!. ئێستاش نیمچە كەلاوەیەكە، خەڵكی بێ دەرەتانی گوندە وێران كراوەكانی كوردستان تێیدا نیشتەجێن، حكومەتی هەرێمی كوردستان لە ساڵانی ١٩٩٥ - ١٩٩٦، چاكسازی و سەرلەنوێ بونیاتنانەوەی هەندێك رووە شارستانییەكەی قەڵاتی جێ بەجێ كرد، بە تایبەتی ئەم خانووە دانسقانەی كە نیگار و وێنەی سەرنجڕاكێشی تێدایە، بە شێوە بیناسازییەك كە ئاماژەیەك بێت بۆ بوونی بەشێكی تایبەت بە ئافرەتان، كە لە پیاوان جودایان دەكاتەوە، كە یەكتری نەبینن، مزگەوتی گەورەی قەڵا، كە تا ئێستاش نوێژكەران نوێژی تێدا دەكەن، ئاماژەیە بەوەی، كە هەر لە كۆنەوە قەڵا نێوەندێكی ئایینی بووە، وەك ئەوەی لە لەوحە سۆمەرییەكەدا باسی لێوەكراوە، كە پەرستگایەك بۆ خواوەندی (عەشتار) لە قەڵا هەبووە، كە ناوی لە نووس--راوە مسمارییەكانی (ئەی - كشان - كلاما)دا هاتووە واتاكەشی (پەرستگای خانمی وڵات) دەگەیەنێ[1].

هەولێر شوێنێكی ستراتیژی لە سەردەمە كۆنەكاندا هەبووە، خاڵی دەرچوونی سەرەكی سوپای ئیمپراتۆریەتە گەورەكانی وەك:

لە نێو هەمان خانەوادەدا، لە توێژی (ئەفەندی) ئاماژە بە (عوسمان ئەفەندی) دەکرێت، کە برای شێخ (عومەر ئەفەندی) بووە، کە قازی و پیاوی ئایینی و دەوڵەت بووە،، بۆ ماوەیەکی درێژ لە شاری هەولێر و موسڵ کاری قازیەتی کردووە، پەیوەندی چاکی لەگەڵ بنەماڵە موسڵییەکان هەبووە، چەندین جار سەردانی ئەستەمبوڵی کردووە، هەندێک لە دەستنووسەکان کە لە کتێبخانەی خوالێخۆشبوو (ڕەشاد موفتی) هەیە، کە پەیوەندییەکی بەردەوام لە نێوان ئەم خانەوادەیە و سوڵتانەکانی عوسمانی دەکات (عوسمان ئەفەندی) برایەکی دیکەی هەبوو، کە ناوی (عەلی ئەفەندی)یە بە (حوسامی) ناسراوە، چونکە هۆگری (شێخ حوسامەدین) (شێخی تەریقەتی نەقشبەندی) بووە، خۆشی ویستووە، تاوەکو مردنی موفتی شاری هەولێر بووە، پاش ئەویش برازاکەی (محەمەد ئەفەندی) کوڕی عوسمان ئەفەندی یەکێک لە دەستنووسە ناودارەکانیدا بەر لە (١٠٤) ساڵ بە زمانی کوردی نووسیویەتی، مەولودنامەی پێغەمبەری خۆشەویستە جگە لە چەندین دەستنووسی دیکە، کە بە زمانی کوردی و عەرەبی و تورکی و فارسی نووسراوە، (عەلی ئەفەندی) تاقە کوڕێکی هەبووە، کە (شێخ جەمیل ئەفەندی)یە، ئەویش پێگەیەکی ئایینی بەرزی هەبووە، کە کچی شێخ حوسامە، بەمەش پەیوەندی لە نێوان هەردوو بنەماڵە بەتین بوو، ئەوەی دەزانین کە (شێخ حوسام) لە شارۆچکەی (تەوێڵە) سەر بە پارێزگای سلێمانی ژیاوە، کە دەکەوێتە نزیک سنووری ئێران، ئەوەشمان زانی ئەم جۆرە پەیوەندیانە و ئایینی ئیسلامیش بە شێوەیەکی گشتی ڕۆڵی سەرەکیان لە بەردەوام بوونی پەیوەندییەکانی نێوان ناوچە کوردییەکان هێشتنەوەی تەبایی نێوانیان بینیوە، شێوەزارە کوردییەکان، کە قوتابخانە و قوتابیانی زانست دەچوونە شارەکان لە سەرانسەری کوردستاندا راوبۆچوونی خۆیان ئاڵوگۆڕ دەکرد، (شێخ جەمیل ئەفەندی) لە قەڵا نیشتەجێ بووە، ئێستا ماڵەکەی بووە بە مۆزەخانە لەبەر ئەوەی هونەری تەلارسازی و کەلەپورێکی جوانی پێوە دیارە، لە کەسایەتییە ئەفەندییەکانی دیکە، کە کاریگەریان لەسەر شاردا بەجێهێشتووە، (محەمەد ئەفەندی) (موفتی) کوڕی عوسمان ئەفەندییە، کە لە کتێبی (مێجەر های) باسی کراوە، بایەخی کەمی بە سیاسەت داوە و مرۆڤێکی سۆفیگەر بووە و شاعیر و وتارخوێن بووە و پەیوەست بووە بە ڕێبازی نەقشبەندی و پەیوەستی شێخ (حوسامەدین) بووە، تەنانەت جوانترین شیعری نووسیوە، کە باس لە سۆفیگەری و ستایشی شێخ دەکات، هەندێ لەم بەیتانە لەم شیعرە جوانە دێنە بەرچاو:

**یا ساقي الراح باللذات والنعم**

**وناشط الفكر بالحداء والنغم**

(ڕەشاد موفتی) بۆ هاو مەجلیسەکانی خۆی باسی (محەمەد ئەفەندی) باوکی کردووە، بۆ سەردانی (شێخ عەلی) بردووە بەسواری وڵاخ لە ساڵانی (١٩٢٥ - ١٩٤٠) هەر ئەو (شێخ)ەش بووە، کە هانی داوە بچێتە میسر بۆ تەواوکردنی خوێندنی لەزانکۆی ئەزهەر لە ساڵی ١٩٣٤ز، کە بەهۆیەوە بۆتە قازی و وتارخوێن لە مزگەوتی گەورەی قەڵات، (ڕەشاد موفتی) کە سوودی لە خانەی ڕەواقی کوردەکان لە ئەزهەر وەرگرتووە پەیوەندی دۆستانەی لەگەڵ کەسایەتییە کوردەکانی میسر بەستووە، زۆر سوودی لێیان وەرگرتووە بۆ ئاشنابوون و کرانەوە بە ڕووی جیهاندا و ئایین ئاسان و میانڕەوی لە ئایینیدا بۆ تەواوی خەڵک بێنێتەدی و دەست بە بنەماکانی پەروەردگار بگرێ، دوور لە ڕق لێبوونەوە، لە پێشەوەی هەموویان (شێخ نەجمەدین کوردی) و (شێخ عومەر وەجدی) و (بەڕێز محەمەد عەلی عەونی) دێن، کە هانی قوتابیانی هەولێر و کوردستانی عێراقیان داوە و یارمەتیان داون، بۆ ئەوەی خوێندنیان تەواوکەن و بگەڕێنەوە هەولێر و کوردستان، بۆ ئەوەی بەشداری لە بزووتنەوەی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بکەن، لەوانە: (فوئاد مەعسوم) و (محەمەد گەزنەیی) و (حوسێن ڕەشوانی)، (عوسمان مەلا ساڵح). لێرەدا ئاماژە

بەوە دەکەین، کە (شێخ نەجمەدین کوردی) خانەوادەیەکی ناسراو و رەسەنی هەولێرە، کە دانیشتووی قەڵاتی هەولێر بوون، کە کوری (شێخ محەمەد ئەمین فەتحوڵڵا زادە)یە، لە سەرەتای سەدەی پێشوودا چووەتە میسر و لەوێدا جێگیر بووە و ناوەندێکی ئایینی نەقشەبەندی دامەزراندووە، تا ئێستاش ئەم نێوەندە شوێنێکی رۆشن و دیارە، لەلایەن (شێخ ضیاء الدین الکوردي)ی نەوەیەوە بەرێوەدەبرێ. دوای مردنی باوکی (شێخ نەجمەدین و برا گەورەکەی شێخ عەبدولرەحمان) خوا رەحمیان پێبکات، کە ئەندامانی خێزانەکەی لە دەوریدان، بەڵام تا ئێستا وابەستەن بە رەسەنایەتی کوردییەوە و شانازی پێوەدەکەن، بۆیە وای بە گونجاو دەزانم، کە زانیارییەکی مێژوویی بەنرخ لەسەر سەردانی شێخ عیزەت عەبدولعەزیز لە ساڵی ١٩٤٤ بنووسم، بۆ قاهیرە، ئەویش یەکێکە لە چوار ئەفسەرە کوردەکان، کە لەلایەن دەسەڵاتدارانی عێراقەوە لە سێدارە دران، دوای بەشداری کردنیان لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد، کە لەدوای کۆتایی جەنگی دووەمی جیهانی، دوای کشانەوەی سوپای سۆڤییەت لە ئازەربایجان رووخا، لەم بارەوە (عیسام عەونی) دەڵێت: (کە شەهید عیزەت هاتە ماڵی باوکی، بەبێ ئەوەی پێشتر یەکتر بناسن تەنها لەبەر ئەوەی محەمەد عەلی عەونی کەسایەتییەکی کوردی میسری ناسراو بوو، یارمەتیدا لە گەیشتن بە باڵیۆزخانەی بەریتانی، چاوی بە نوێنەری بەریتانی (لۆر مۆین) کەوت، کە پاشان لە ساڵی ١٩٤٦ بەدەستی جوولەکەکان تیرۆرکرا، ئێمە هیچ زانیارییەکمان (لەسەر ئەوەی لەو کۆبوونەوە باسکراوە نییە، بەڵام گومان لەوەدانییە لەلایەن چەند هاورێیەکەوە لە کوردستانی عێراقەوە رەوانەی ئەوێ کرابوو)، هەروەها چەندین خانەوادەی هەولێری هەیە کە رەسەن بوون و ئینتیمایان بۆ شارەکە هەبوو لە چینی ئەفەندی بوون، کە رۆڵی بەرچاویان لە گۆران و گەشەسەندنەکاندا هەبۆوە. لەوانە بنەماڵەی (دۆغرەمەچی - دەباغ - یەعقوبی - ئەسعەدی - چەلەبی - عوزێری - حەیدەری - چاوشلی) و خانەوادەی عەتەولا ئاغا باپیری (رەمزی نافع) و چەندانی دیکە، دەبێت لێرەوە هەڵوەستەیەک بکەین و باس لە (رەمزی نافع) بکەین، ئەم لاوە خوێن گەرمە بە گیانی شۆرشگێری گۆش کرابوو و پەرۆشی رزگاری نەتەوایەتی بوو، کە دواتر لەسەرەتای چلەکاندا چووە نێو خەباتی شۆرشگێری، لەتەک قوتابییە کوردەکانی زانکۆی ئەمەریکی لە بەیرووت، لەوانەش کەسایەتی کوردی ناسراو (نورەدین زازا)، رەمزی یەکێک بوو لە ئەندامە چالاکەکانی حزبی هیوا لە ساڵی ١٩٤٢دا، رەمزی چووە ئەڵمانیا و لە ناخەوە دەیویست بە هاوکاری ئەڵمانەکان لە دژی ئینگلیزەکان کاربکات لە پێناو رزگاری کورد و ئایندەکەیان، لەوەدا گیانبازییەکی کەم وێنەی ئەنجامدا، کە کارێکی سەیریش بوو، لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی سوپای ئەڵمانی یەکێ لەو ئەفسەرانە (مۆلەر) بوو، کە تا ئێستاش لە ژیاندا ماوە، ناوەرۆکی ئەم گیانبازییە لە کتێبێکدا بە نێوی (لە رۆژهەڵاتی گڕگرتوو)دا باسی لێوەکراوە، کە لە ساڵی ١٩٩٢ لە لایەن بەرێز بەدران ئەحمەد وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی، تێیدا باس لەوە دەکات، کە چۆن فرۆکەیەکی ئەڵمانییان لێخوریوە و لە کوردستان نیشتوونەتەوە و نەخشەیان پێبوو، بەڵام لە شوێنی دابەزینەکەیاندا هەڵەیان کردووە، لە بری ئەوەی لە ناوچەی پشدەر دابەزن، کە دوورین لە سوپای ئینگلیز، بەڵام لە دەشتی هەولێر نیشتوونەتەوە بەمەش هێزی هاوپەیمانان هەموویان دەستگیرکردن، لەگەڵ ئەوەی ئەم کارە پووچەڵ بووەوە، ئەمەش خراپی نەخشەکێشانی بەهەڵەچوونی پێشبینییەکان بوو، ئەوەی دیارە بەرێز رەمزی لەرێی هاوکاریکردنی ئەڵمانەکان دەیویست بە چەند ئامانجێک بگات، کە ناتوانین ناواخنەکەی باس کەین و حوکمی لەسەر بدەین، بەڵام جەخت لەسەر ئەوە دەکرێت، کە گەنجێک بوو گەرم و گوری شۆرشگێری تێدا بوو، گیانی نەتەوایەتی هەبوو، رێگایەکی گیانبازی گرتە بەر بۆ گەیشتن بە مەبەستەکانی، ژیانی لەپێناو ئەو

پرسەدا بەخت کرد، کە بڕوای پێی هەبوو، وەک ئەوەی (مۆلەر) دەڵێت لە کتێبەکەیدا، کە رەمزی نەخشەیەکی پێ بوو، سەبارەت بە ئالای کوردستان، کە ئێستاش هەمان ئەم ئالایە بەکاردێت، هەولەکە پووچەڵ کرایەوە و دەسەلاتدارانی ئینگلیز دەستگیریان کردن، پاشان گواسترایەوە بۆ قاهیرە، لەوێدا حوکمی لە سێدارەدانی بەسەردا سەپا، بەلام خێزانەکەی زۆر هەولیاندا بۆ ئەوەی حوکمەکەی بۆ سووک بکەن، زۆر لە کەسایەتییە دیارەکانی شار هەولیاندا، لەلای الوصي (عبدالإله) و (نوری سەعید) لەوانە (عیزەدین مەلا) تاوەکو هەولبدەن، ئەوحوکمەی بەسەریدا سەپاوە سووک بکەن، بەلام حوکمەکەی کرا بە تا هەتایی، پاشان لە بەندیخانە تووشی نەخۆشی بوو دواتر ئازاد کرا و گەڕاندیانەوە هەولێر، لەدوای چەند مانگێک کۆچی کرد، دەگوترا کە ئەو ژەهر خواردی کرابوو، ئەوەش نابێ لەیاد بچێ چەندین کەسایەتی رۆڵیان هەبووە کە ئاسەواری خۆیان بەسەر شارەکە جێهێشتووە، دوای ئەوەی چەندین ساڵ خزمەتیان تێدا کرد، چ ئەوانەی موتەسەریف بوون یاخود فەرمانبەرێکی گەورە یان سیاسەتمەدار، لەوانە (عەونی یوسف) کە سیاسەتمەدارێکی ناسراو بوو لە چلەکان و پەنجاکاندا حکومەتی عەبدولکەریم قاسم لادرا، هەروەها خوالێخۆشبوو (مستەفا قەرەداغی) لە سالانی چلەکان قازی بووە، پاشان موتەسەریف، بووە هەروەها خوالێخۆشبوو (حوسێن ئاغا) ئەسعەدی، کە لە سالانی ١٩٢٨ - ١٩٣٠ بەڕێوەبەری شارەوانی بووە، بەلام توێژی ئایینی ئەفەندی تاوەکو شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ کاریگەری زۆریان بەسەر شارەکەوە هەبوو. وەک شارەکانی دیکە بەلام کەمێک زیاتر لەبەرئەوەی شارەکە لە بنەڕەتدا پارێزگار بووە، بەلام وەک پێشتر باسمان کرد پیاوانی ئایینی، تێدا رۆشنگەربوون دژ بە رەوتی پێشکەوتن و گۆڕان نەوەستان، بەڵکو پشتگیری هەڵگرتنی ئەم دروشمانەیان دەکرد، کە گونجاو بێت لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی شارەکە، هەر لەگەڵ دروستبوونی یەکەم قوتابخانەی سەرەتایی کچان لە سالی ١٩٢٧ - ١٩٢٨ دانیشتووانی هەولێر رێگەیان نەدا کچەکانیان بنێرنە قوتابخانە پێیان وابوو، کە ئەمە دژ بە شەریعەتی ئیسلامە، بەلام مەلا ئەفەندی بە ئەقڵ و زانست و کەسایەتی بەتوانای خۆی، کچەکانی خۆی نارده قوتابخانە، خانم "نەفیسە" کە کچی یەکەمی مەلا فەندی بوو یەکەم کچ بوو کە ناوی لێ تۆمارکرا، پاشان کچانی دیکە چوونە قوتابخانە بەلام ئەوکات خوێندنی کچان و کوران تەنها لەنێو مندالانی ئەفەندییەکان و دەستە بژێر و خێزانە دەست رۆیشتووەکان بوو، تا دوای شۆڕشی ١٩٥٨ بارەکە گۆڕا.

**رۆڵی ئەفەندییەکان لە گۆڕانکارە سیاسییەکان:**

دوای ئەوەی جەنگی جیهانی تەواو بوو مەسەلەی موسڵ لە چوارچێوەی پەیماننامەی سیڤەری سالی ١٩٢٠ دەرکەوت، کە تێیدا هاوپەیمانان دانیان بەوە دانا، کە دەبێت قەوارەیەک بۆ کورد دابمەزرێ لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی، کە دواتر روویاندا، لە پێشەوەی هەمووشیان هەرەسهێنانی شۆڕشەکەی شێخ مەحمود بوو لە سلێمانی، دوای ئەوەی، لەلایەن هێزەکانی ئینگلیزەوە سەرکوت کرا شۆڕشی تورکیش بە سەرکردایەتی کەماڵ ئەتاتورک سەرکەوتنی بەدەست هێنا، رۆژئاوا لەگەڵیدا کرد و لە سالی ١٩٢٣دا پەیماننامەی لۆزانیان لەگەڵ بەست، بەمەش لە بەلێنەکانی پەیماننامەی سیڤەر پاشگەز بوونەوە، پەیوەندی مەلا ئەفەندی بە شێخ مەحموودەوە باش بوو، ئەمەش بەردەوامی ئەم پەیوەندییە بوو، کە پێشتر لە نێوان باوکی هەردووکیان هەبوو، (شێخ عومەر ئەفەندی) و (کاک ئەحمەدی شێخ) بوون، چەندین نامەش لەنێوانیاندا گۆڕدراوەتەوە، کە لە کتێبخانەی (رەشاد موفتی)دا پارێزراون، بەلام ئەم پەیوەندییە نەبووە هۆی ئەوەی، مەلا ئەفەندی پەیوەندی بە شۆڕشی شێخ مەحموودەوە بکات، لەبەر چەند هۆکارێک ناکرێت لێرە باسی لێوە بکەین، ئەو گفتوگۆیەی لە نێوان مەلا

ئەفەندی و میجەر های کراوە مەلا ئەفەندی پێی گوتووە. ( بەداخەوە کە بەخێلی بووە هۆی یەکنەبوونی هەڵوێست لە نێوان سەرەک هۆزەکان، بۆیە ئێمە پێویستمان بە کاتە، تاوەکو فێری خۆ بەرێوەبردن بین) ئەوکاتەی کۆمەڵەی گەلان، هەوڵیدا راپرسی گشتی سازبدات تاوەکو رای خەڵکی کوردستان دەربارەی ئەوەی دەیانەوێ لەگەڵ دەوڵەتی عیراق بژین یان نا؟ بزانن.

دەنگی مەلا ئەفەندی، کاریگەرییەکی زۆری هەبوو، ئەگەرچی مەسەلەکە تەنها رواڵەت بوو، لە دیاریکردنی خواستی خەڵک. لەم بارەوە دەگێرنەوە کە فەتوای داوە بۆ ئەوەی دەنگ لە بەرژەوەندی عیراق بدرێت ((مادامەکی کۆمەڵەی گەلان دان بە مافەکانمان دانانێت دەوڵەتمان هەبێت، باشتروایە لەگەڵ عێراقدابین، چونکە ئێمە، بەپێی بڕیارەکانی کۆمەڵەی گەلان مافەکانمان زیاتر دەستەبەردەکەین، تورکیاش پشتی لە ئیسلام کرد و ئەتاتورکیش بەڵێنەکانی بەجێنەگەیاند، برای نیشتمان لەوێدا جۆرەها زوڵم و زۆرداریان چەشت، بۆیە چاکتروایە بچینە نێو دەوڵەتی عێراق)).

کاتێک کە بزووتنەوەی کوردایەتی سەری هەڵدا و لەژێر کاریگەری بزووتنەوە رزگارییە هاوشێوەکانی عەرەبی و تورکی و ئێرانی بوو، چینی ئەفەندی بەر لە هەموو کەس چوونە نێو بزووتنەوەکە و زمانی تورکی و عەرەبی و فارسی زاڵ بوو لە مامەڵەی خەڵک لەگەڵ یەکتر، لە بواری کارگێری و رۆشنبیریدا بەکاردەهات، پیاوانی ئایینی ئەوانەی رۆشنگەر بوون لە پێشەنگی ئەو کەسانەدا بوون، کە پرۆسەی گۆڕانیان دەست پێکرد، ئەمەش لە میانەی جۆشدانی گیانی نیشتمانپەروەری لە نێوان خەڵک و هاندانیان بۆ ئەوەی بە زمانی دایکیان بنووسن.

(رەشاد موفتی)، کە بوو بە ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی گەورە لە چلەکاندا، یەکەم کەس بوو، کە وتاری هەینی بە کوردی پێشکەش کرد.

لە ساڵی ۱۹۵۲ کتێبی مەولوودنامەی پێغەمبەری پیرۆزی بە زمانی کوردی چاپ کرد، کە تا ئێستاش لە گەرووی زۆر لە قورئان خوێن و مەولوود خوێنەکاندا لە گشت بۆنە ئاینییەکاندا دێتە دەرەوە، لە سەرتاسەری کوردستاندا بە گوێی خەڵک دەگات، رەحمەتی خوای لێبێت لە ساڵی ۱۹۷۰ کۆچی دوایی کرد، یەکەم کەس بوو بە بەشداری سەدان حاجی کورد رێورەسمی بەجێگەیاندنی حەجی بە زمانی کوردی جێبەجێ کرد.

ساڵانی دوای جەنگی جیهانی یەکەم، رابوونێکی نەتەوەیی سەری هەڵدا لە بزووتنەوەی کوردایەتی، سەرەتاکەی بزووتنەوەی شێخ مەحموود و بزووتنەوەکانی بارزان و دروستبوونی گرووپ و حیزبەکان دەستی پێکرد، کە لەم دۆخە تازەیەشدا کوڕانی ئەفەندی بە شێوەیەکی کاریگەر بەشداریان تێیدا هەبوو، بەتایبەتی لە حیزبی هیوادا، ئەوانەی کە تێیدا چالاک بوون، خوالێخۆشبوو (فەیسەڵ) و براکەی (زەید ئەحمەد عوسمان)، فەیسەڵ لە رووداوێکی دڵتەزێندا کۆچی دوایی کرد، لەم بارەوە شاعیری گەورەی کورد پیرەمێرد شێوەنێکی لە شیعرێکدا بۆ دەکات، کە بە زمانی کوردی نووسیویەتی، لێرەدا پێویستە دەقی شیعرەکە بە کوردی دابنرێت.

زەید پەیوەندی باشی لەگەڵ چەپڕەوەکانی میسردا هەبوو، بە هاوکاری ئەوان کتێبەکەی خۆی بە نێوی (خەباتی کوردەکان) بە ناوێکی خوازراو کە (شێرزاد محەمەد) بوو، ساڵی ۱۹٤۸ لە قاهیرە بەچاپ گەیاند.

لەم بارەوە بەرێز (محەمەد مستەفا)ی پارێزەر، کە ئەندام بوو لە کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد، بۆی باس کردم کە چۆن کتێبەکەی بەسەر رۆشنبیرانی کورد لە بەغدا و سلێمانی دابەش کردووە.

زۆر رێکخستن لە تەک حیزبی هیوا دروست بوون، بەر لەوەی هەموو ببنە یەک و پارتی دیموکراتی کوردستان لە ساڵی ۱۹٤٦دا پێک بهێنن، لەمبارەیەوە خوالێخۆشبوو (نوری شاوەیس) لە بیرەوەرییەکان دەڵێت: (ئەو) و (زەید) و یونس رەئووف (دڵدار) و محەمەد مستەفا و رەشید باجەلان و موکەرەم تاڵەبانی لە سەرەتای ساڵانی چل (کۆمەڵەی دارکەریان - الحطابين) دامەزراند،

بەپێی قسەی بەڕێز جەلال جاف بۆی باس كردم، كە دڵداری شاعیر سەرۆكی ئەم كۆمەڵەیە بوو، هەر ئەویش ئەو ناوە سەیرەی بۆ دانا، كە كاریگەربوو بە (گاریبالدی)، كە لە سەرەتای ژیانیدا كۆمەڵەی (خەڵووزی) دامەزراند، پاش ماوەیەک لە دامەزراندنی لەگەڵ حیزبی هیوا یەكیان گرت، چەندین كەسی دیكەیان لە كوڕانی ئەفەندییەكان لەگەڵدا بوو، هەروەها چەند ئەندامێكی عەشیرەتی دزەیی، لە دانیشتوانی هەولێری تێدابوو.

ساڵی ١٩٥٠ كاتێک بەڕێز جەلال تاڵەبانی لە قەزای كۆیەوە چووە نێوەندی شار بۆ ئەوەی خوێندنی تەواو بكات لە نێو هاوڕێكانیدا وەک قسەكەرێكی شۆڕشگێڕ لە بارەی مافی گەلی كورد دەركەوت باسی لە مافی چارەی خۆنووسین دەكرد، بۆیە لەلایەن هاوڕێكانییەوە بەگەرمی پێشوازی لێكرا، لەپێشەوەی هەمووشیان بەڕێزان شەمسەدین موفتی و مەعروف رەئووف، بەشێوەیەكی فراوان بەشداری لە رێكخستنی قوتابیان كرد لە نێو ریزەكانی پارتی دیموكراتی كوردستان.

ساڵی ١٩٥٣ یەكێتی قوتابیانی كوردستان دامەزرا، دوای چەند مانگێک بەڕێز شەمسەدین موفتی بە سەرۆكی ئەو یەكێتییە هەڵبژێردرا و درێژەی بە خەباتێكی نەپچڕاو دا، بەرچاو و كاریگەری لەنێو بزووتنەوەی كوردایەتیدا، بۆچوونەكانی رۆڵەی ئەفەندییەكان كردبوو بۆئەوەی پشتیوانییان بۆ بزووتنەوەی نەتەوایەتی كوردی مسۆگەربكات، لەنێو ئەوانەشدا لاوێكی مافپەروەر دەركەوت، كە ئەویش (مەئموون دەباغ) بوو، كە دوای ئەوەی پەیوەندی بە ریزەكانی شۆڕش كرد، لە ساڵی ١٩٦٣ شەهیدكرا.

مزگەوتی قەلا، كە نێوەندێكی خوێندنی زانستی ئایینی و شوێنی بەیەک گەیشتنی رۆڵەی ئەفەندییەكان بوو، ببووە كۆڕی بەستنی چالاكییە نەتەوەیی نیشتمانییەكان، لەمبارەیەوە بەڕێز (عەبدولڕەحمان گۆمەشینی)، كە قوتابی بوو، لەم مزگەوتەدا دەگێڕێتەوە، كە چۆن ئەوان چەندین كات ژمێریان بە كۆپیكردنی بەیاننامە و بلاوكراوە حیزبییەكان بە دەستنووسی بەسەردەبرد، بۆ ئەوەی بەنهێنی و لە بارێكی مەترسیداردا دابەشیان بكەن، دوای شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨ رێكخستنەكانی حیزبی شیوعی عێراقی لە هەولێر وەكو شارەكانی دیكەی عێراق فراوان و چالاک ببوون، كە چەندین لە كەس و كوڕانی ئەفەندییەكان چووبوونە ریزەكانییەوە، هەندێكیان گەیشتنە سەركردایەتی، وەک (جەمال حەیدەری)، كە ببووە ئەندامی مەكتەبی سیاسی و نافع یونس، كە ئەندامی كۆمیتەی ناوەندی بوو، هەردووكیان لە ساڵی ١٩٦٣ لە سێدارەدران.

هەروەها لە رێزەكان و سەركردایەتی ئەم حیزبەدا چەندین كەسی دیكەی وەک: (حەمید عوسمان) و (سالح حەیدەری) و (رەشید عەبدولقادر)، بەڕێز (عەزیز محەممەد)، كە هەولێرییەكی تۆكمەیە لە ١٩٦٤ - ١٩٩٣ سكرتێری گشتی حیزبی شیوعی عیراقی بوو، ئێستا وشەی ئەفەندی زۆر بەكەمی بەكاردێت لەبری ئەو وشەی دیكەی وەک: (مامۆستا) بەكاردێت، بەتایبەتی بۆ پیاوانی ئایینی و ئەوانەی لە بواری پەروەردە و خوێندندان، هەروەها وشەی (كاكە) بەشێوەیەكی بەربلاو بۆ رێزگرتنی بەرامبەر بەكاردێت.

**پەراوێزەكان**

١- هەندێک توێژەر بڕوایان وایە، كە گەلی كورد بەدرێژایی مێژوو لە ئەنجامی تێكەلاوبوونی دانیشتووانە دێرینەكانی كوردستان پێک هاتووە، لەوانە (فەرسیەكان و میدیاكان و میتانییەكان و گۆتییەكان و لۆلۆبییەكان و كوردەكان)، دوای ئاوێتە بوونیان لەگەڵ نەتەوەكانی هیند و ئەورووپی، كە لە چیاكانی زاگرۆسەوە هاتبوون.

٢- زۆر خانەوادەی هەولێری هەیە، كە بڕوایان وایە، كە ئینتیمایان بۆ نەتەوەی توركمانییە، توركیا بە وڵاتی دایک دادەنێن، خانەوادەی (دۆغرەمەچی و چەڵەبی) تا كار گەیشتە ئەوەی یەكێک لە ئەندامانی خانەوادەی دۆغرەمەچی، كە دكتۆر ئیحسان دۆغرەمەچییە،

بچێتە تورکیا و بەیەکجارەکی هەولێری جێهێشت، ئێستا بەیەکێک لە کەسایەتییە ناسراوەکانی تورکیا دەژمێردرێ، چەند ساڵێکیش سەرۆکایەتی زانکۆکانی تورکیای کردووە، یەکێکە لە دەوڵەمەندەکانی، دوای جەنگی کەنداو و رووداوەکانی، کە بەسەر ناوچەکەدا هات، پەیوەندی بە ئەندامانی خێزانەکەی کرد و یارمەتی زۆری ئەوان و خەڵکی دیکەی دا، لەوانەی، پێویستیان بە کۆمەک هەبوو، هەروەها خانەوادەی (عەبدولخالیق چەلەبی) و کورەکانی (فەرید و سینان) ئەوەی دوایان سەرۆکی بەرەی تورکمانییە، کە لەلایەن خاڵییەوە (ئیحسان دۆغرەمەچی) پاڵپشتی دەکرێت لە تورکیادا.

پەیوەندییەکانی نێوان خانەوادەی مەلا ئەفەندی و خانەوادەی پاشایەتی بەهێز بوو، مەلا فەندی کۆشکێکی (قەشەنگ)یان لە گوندی (باداوە) هەبووە، کە بەشێکە لە هەولێری ئێستادا، کە چەندین کەسایەتی شار و میوانانی دیکە، سەردانی ئەوێیان دەکرد، لەکاتی بزووتنەوەی (رەشید عالی گەیلانی) شا فەیسەڵی دووەم و چەند کەسێک لە خانەوادەی پاشایەتی ناردە کۆشکی باداوە، کە لەوێدا لە سایەی پارێزگاری ئەودا بوون، کە ئەوکات بەهۆی رووداوە سیاسییەکانی بەغدا باری ئاسایش باش نەبوو.

ئەم وەڵامدانەوەیە بۆ رۆژنامەی (الحیاة)ە:-

**سەروەرییەکی دیکە**

بەرێز سەرنووسەر

پاش سلاوێکی گەرم...

زۆر چێژم لەو وتارە جوانە وەرگرت، کە لە رۆژنامەی (الحیاة)ی ژمارە ١٢٥٦٠ لە رێکەوتی ٢٠ی تەمموزی رابردوو لەبارەی هەولێر و توێژی ئەفەندی بلاوکرابووەوە، کە لەلایەن عەدنان موفتییەوە نوسرابوو، لێرەدا دەمەوێ، شتێک بخەمە سەر ئەو بابەتەی نووسەر، کە سەروەرییەکە لە سەروەرییەکانی خوالێخۆشبوو مەلا فەندی باوکی عیزەددین، ئەویش ئەمەیە:

کاتێک کودەتای رەشید عالی گەیلانی و چوار پەیمانبەستووەکە لە ساڵی ١٩٤١ سەرکەوتوو بوو، حکومەت داوای خوالێخۆشبێ شاژن عالیەی کرد، کە لەگەڵ شا فەیسەڵی دووەمی کوری بچنە هەولێر لەگەڵ خانەوادەی پاشایەتی لە میوانداری مەلا فەندی دابن، ئەفسەرێکیان لەگەڵ نێردرا، کە نوێنەرایەتی کودەتاچییەکان بوو، کە موقەدەم ساڵح زەکی بوو، کە بەهۆی قسە و شتی دیکە لە رووی دەروونییەوە ئازاری دەدان، مەلا فەندی رێزی لە خانەوادەی پاشایەتی نا و چی لەتوانای بوو بۆیانی کرد، لەپێناو بەختەوەری و حەسانەوەیان، بەلام رۆژێک موقەدەم ساڵح زەکی هات و داوای لە مەلا فەندی کرد، کە شا فەیسەڵ و خێزانەکەی بگەرێندرێنەوە بەغدا، تاوەکو سازشیان پێ بکەن، دوای ئەوەی لە سەرەتاکانی پووچەڵبوونەوەی کودەتاکە دەرکەوت شاژن عالیە ئەمەی رەت کردەوە، بە مەلای گوت: ئێمە لەژێر پارێزگاری تۆ پاراستنی کوردان داین، بۆیە مەلا فەندی هەمان کات پەیوەندی بە شێخە کوردەکان کرد و پێی راگەیاندن، لە ماوەی ٢٤ کاتژمێر دەیان هەزار کەس چواردەوری گوندی باداوەی مەلا فەندییان دا، بەمەش نەخشەسازی ئەم تاوانکارییە پووچەڵ کرایەوە، بۆ مێژوو دەگوترێ بنەماڵەی هاشمی، کە لەگەڵ خوالێخۆشبوو شاژن عالیە رۆیشتن، پێکهات بوو لە دایکی شاژن نەفیسە و کورەکەی شا فەیسەڵی دووەم و شازادە عابدییەی کچی عەلی، کە لە کودەتای ١٤ی تەموزی رەشدا شەهیدکران، شازادە ساڵحە و شازادە جەلیلەی کچی عەلی و شازادە بەدیعەی کچی عەلی و شەریفە نازمە ئەسعەد، خوا لە هەموویان خۆش بێت، هەروەها خودا لە مەلا فەندی و خانەوادە چاکەکەی خۆش بێت.

لەندەن -

عەمیدی خانەنشین ئەبو قوتادە فەیسەڵ، رۆژنامەی (الحیاة)، ژمارە ١٢٦٠١ لە ١٩٩٧/٨/٣٠.

* سەرۆکی پێشووی پەرلەمانی کوردستان

# مەکتەب و مەکتەبلییەکانی گوندی لهێبانی کەندێناوە (١٩٦١- ١٩٦٥)

جەلال مەولود ئەحمەد سنجاوی

دەشتی کەندێناوە جیا لە زۆربەی دەڤەرەکانی دیکەی کوردستان تایبەتمەندێتی خۆی هەیە لە رەوتی ژیان و پەیوەندییە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵگای کوردەواریدا و خەڵکەکەی دەستەبژێرن لە عورف و عادەت و ئەمن و ئەمانەت و رێزگرتنی گەورە و گچکە و دڵفراوانی و میوانداری و بە یەکەوە ئاسوودە بوون لە جەژنەکان و مەراسیمی ئاهەنگی بووک گواستنەوە و دڵتەنگ بوونیش لە کاتی مردنی یەکێکی گوندی و دەوروبەری، بەم شێوەیە هەر هەموویان خۆیان بە یەک بەرەباب دادەنێن.

بە گشتی خەڵکی کەندێناوە مرۆڤی کوردپەروەر و پاک و خاوێن و ژیر و لێزان و ئازا و بوێر و قسەخۆش و دڵتەڕ و میوان ڕاگر و نان دەرن، ئافرەتانیان دەست ڕەنگین و داوێن پاک و چوست و چالاکن و لە کارکردندا وەک پیاو وان، کەندێناوە ملوانکەی ئەڵماسی گەردەنی کوردستانە و مەملەکەتی حەیران و ئەفسانە و حەکایەتی خورافی و بەیتە فۆلکلۆرییەکان و قسەی نەستەق و سوارچاکان و عەگیدانی مەیدان و هەگبەی گرانبەهای کەلتوور و کەلچەری کوردەوارییە و زۆربەی گوندەکانی دیوەخان و نەخۆشخانەی لێیە، بەڵام مەرج نییە هەموو گوندەکانی قوتابخانەی هەبێ، چونکە بارودۆخی نائارامی کوردستان بە گشتی و دەڤەرەکە بەتایبەتی بووە ئاستەنگ لەبەردەم جێبەجێکردنی بەشێک لەم دەزگا خزمەتگوزارییانە.

### خوێندن لە گوندی لهێبان

لهێبان گوندێکی خۆش و دڵگیرە لە باشووری کەندێناوە و دەکەوێتە بەینی گوندی (سێقوچان، قەپڵان، قووچ، سەرگەڕان، گورگە، سلێمان بەخشیان، دەرماناوە و خۆشاو)، ئەم گوندە موڵکی (سلێمان ئاغای سەلیمی خورشید ئاغا) بوو، بەڵام (تاهیر ئاغای عەلی خورشید ئاغای قەپڵانی) سەرپەرشتی دەکرد، کە زاوای سلێمان ئاغا بوو، گوندەکە جگە لە مزگەوت، تەکیەی دەروێشانی لێ هەبوو، کە بە تەکیەی (خەلیفە حەسەنی لهێبان) ناسرا بوو، خەڵکی گوندیش مرۆڤی دنیا دیتەو رۆشنبیر و زانست دۆست بوون، منداڵەکانیان بۆ مەکتەب رەوانە دەکرد، تەنانەت هەندێکیان کچەکانیشیان لە خوێندن بێبەش نەکردبوو، کە بۆ سەردەمانی ساڵانی ١٩٦١ - ١٩٦٥ هەنگاوێکی زێڕین بوو، کچ و کوڕ لە گوندێکی دووردشار پێکەوە بخوێنن و کچان بۆ مەکتەب رەوانە بکرێن، لەم سەروبەندەدا ناکرێ رۆڵی مەردانەی (تاهیر ئاغا) و (مەلا سولەیمان) و مامۆستایان لەیاد بکەین،

کاتێک ئاغا لە دیوەخانی خۆی و مەلا سولەیمانیش لە مزگەوت هانی خەڵکەکەیان دەدا، کە مەکتەب وەک ماڵی خۆیان بپارێزن و رێز لە مامۆستایان بگرن و منداڵەکانیان لە خوێندن بێبەش نەکەن، چونکە زانست بناغەی ژینە، گەر گەلێک بێ زانین بێ، گەر زیندووش بن مردوون.

لەم توێژینەوەدا زیاتر تیشک دەخەینە سەر رۆڵی پەروەردەیی بەڕێوەبەری قوتابخانەی لهێبان کە لە لایەنی کارگێری و وانەبێژی لە ئەستۆ گرتبوو، رێچکەیەکی دانسقەی لە پەروەردە و فێرکردن گرتبوو، کە ببووە مایەی خۆشحاڵی سەرجەم خەڵکی گوندی و مەکتەبلییەکان.

بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان مامۆستا (مەولوود ئەحمەد مستەفا) بوو. ناسراو بە (مەلا تاهیری کەندارەقەلی) کە مرۆڤێکی زیرەک و لێزان و ئەدەب دۆست بوو، هەر مەکتەبلییەک کە لە خوێندنەوە و نووسین باش بوایە، پارچە هەڵبەستێکی چەند دێری لە دەفتەرەکەی بۆ دەنووسی و ستایشی دەکرد، یان ئەگەر خراپ بوایە لۆمەی دەکرد کە جارێکی دیکە وا نەکات، بەم شێوەیە منداڵەکە سۆزی دەکەوتە سەر خوێندن و دەفتەرەکەی بە پاک و خاوێنی رادەگرت و بەبێ فروفێڵ وانەکانی ئەرکی ماڵەوەی بۆ مامۆستاکەی دەنووسییەوە. ئەوێ سەردەم (من و خالید جووتیار)ی برام لە پۆلی دووەمی سەرەتایی بووین، کە ماڵمان چووە گوندی لهێبان، بۆیە ئێمەش لەم هۆنراوە بە پێزانە بێبەش نەبووین.

مامۆستا (مەلا تاهیری کەندارەقەلی) لە کۆتایی ساڵ دەفتەری هەموانی کۆ کردەوە و سەرجەم هۆنراوەکانی لەلای خۆی لە دەفتەرێکی بچووک تۆمار کرد، لەبەزئەوەی هۆنراوەکان تێکەڵاوی پەروەردە و فێرکردن و پەندی پێشینان و قسەی نەستەقن، بۆیە بۆتە بەشێکی دانەبڕاو لە هەگبەی فۆلکلۆر و فەرهەنگی کوردەواری و بە پێویستم زانی لە سەردانێکی تایبەتیدا وێنەو دەفتەرەکە لە مامۆستا وەربگرم و بەڵێنم پێیدا کە بە ئەمانەتەوە لە گۆڤاری (ئاسۆی فۆلکلۆر) بڵاوی بکەمەوە لەگەڵ هەندێ بیرەوەری شیرین لە مەکتەبی لهێبان و ماجەرای هەڵسوکەوتی مەکتەبلییەکان لە مەکتەب و لە رێگای هاتنیان بۆ مەکتەب کە قەت لە یاد ناکرێن.

کە منداڵ بووم لە (لهێبان)، بەیانیان بە پەلە نانم دەخوارد و دەفتەر و کتێبی (ئەلف و بێی کوردی)م لە ئامێز دەگرت و یەکسەر لەگەڵ چەند قوتابییەکی خنجیلانە و روح سووک رێگای مەکتەبمان دەگرتە بەر، لە رێگادا یەکە یەکە لاپەڕەکانی کتێبەکمان هەڵدەدایەوە و دڵمان بە وێنە جوان و رەنگاورەنگەکان خۆش دەکرد، ناوە پیرۆزەکەی (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) کە لەسەر بەرگی کتێبەکە نووسرا بوو، سەرنجی رادەکێشاین و نەشمان دەناسی کێیە!.

ئەوکات ژیان هێمن و ئاسوودە بوو، مامۆستا و مەکتەب جۆرە قودسیەتێک و خوێندنیش جۆرە تام و چێژێکی تایبەتی خۆی هەبوو (دارا و زارا و نەسرین و ئازاد و نەوزاد) پێکەوە گەمەیان دەکرد و دادەش دۆی ئامادە دەکرد و مام زۆرابیش مێوژی نایابی دەهێنا و ئازادیش لە بەرزایی دارەکەوە سێوی بۆ ناو کۆشی نەسرین فڕێ دەدا: (ئەوا سێوێ، ئەوا دوو سێو، ئەوا سێ سێو) تا ئەو کاتەی نەسرین دەیگوت: بەسە بەسە ئیتر نامەوێ.

## مەکتەبلییەکان لە هۆنراوەکانی مامۆستایاندا

کە بووین بە پۆلی چواردم ئەم مامۆستایانە لە مەکتەبی لهێبان هەبوون:

١- مامۆستا مەلا تاهیری کەندارەقەل - بەڕێوەبەر.
٢- مامۆستا کامیل نەبیل کانون.
٣- مامۆستا سدقی محێدین.
٤- مامۆستا مەلا رەشید حەمەد شێروانی.
٥- مامۆستا محەمەد شەعبان ئاکرەیی.
٦- مامۆستا سامی عەبدولجەبار جەنابی.
٧- مامۆستا مەلا حەمەدەمین مەلای رەش.
٨- مامۆستا ئەرسانیس باسا عەبدولئەحەد.

دیارە هەموو ئەو مامۆستا بەڕێزانە زۆر بە ئێمە ماندوو دەبوون، بەڵام مەبەستی سەرەکیم مامۆستا مەلا تاهیر هۆنراوەی بۆ هاندانی ئێمە دەنووسی، بۆیە تیشک دەخەینە سەر دەفتەرە دەستخەتەکەی ئەو زاتە.

مەکتەبلییە زیرەکەکان ئەمانە بوون: (ئیسماعیل عەدۆ، رەشید عومەر و خالید جووتیار، لەتیف حەسەن، جەعفەر ئەحمەد، محەمەد حەمەدەمین - مەدە - مام پیر، محەمەد مەلا سولەیمان، ئیبراهیم مەلا سەعید....).

* ئیسماعیل عەدۆ جگە لەوەی لە خوێندن و نووسینەوە زیرەک و خەتخۆش بوو، هەروا دەنگی گەلێک

خۆش بوو، چونکە دایکی عەرەب بوو، زۆربەی گۆرانییە عەرەبییەکانی لەبەر بوو، لە مەکتەب بۆ مامۆستایان و لەناو گوندیش بۆ ئێمەی دەگوت، تەماشاکە مامۆستا چۆن باسی دەکا:

**کاکە ئەم ئیسماعیلە زۆر زیرەک و قابیلە**
**شان بداتە هەر ئیشەک دەیباتە سەر وەک فیلە**
**گەر بێتو تەمەڵی نەکات بنووسی بەبێ حیلە**
**گەلێ جوانی دەنووسی غەڵەتی زۆر قەلیلە**
**خەتی راستە وەک توخێ بێگرێ و قال و قیلە**
**سەریعیشە لە نووسێ دەڵێی ئۆتۆمۆبیلە**
**کاک رەشید و لەتیفی دانانێ بە جوجیلە**

* قوتابی رەشید عومەر، گەلێک نوکتەچی و قسەخۆش بوو، هەردەم لە مەکتەب پێدەکەنی و زۆر لێدانی دەخوارد، بەڵام بێ سوود بوو، مامۆستا پێی دەڵێت:

**رەشید دەبا بڵێم پێت**
**راستی نیشان بدەم رێت**
**چیدی رازی نابم لێت**
**سبەی دەبێ بگرم گوێت**

(رەشید عومەر) لە ماڵەوەش زۆر ئاگای لە خوێندن و نووسینەوە نەبوو، چونکە خێزانێکی گەورە بوون، باوکی لە باخچە ئیشی پێ دەکرد و توور و پیاز و کەرەوز و تەرەتوولە و سڵقی لە باخچەکە چاند بوو، ئاودان و فرۆشتنی تایبەت بە (رەشید) بوو، بەڵام مامۆستا هەر هانیدەدا تا واز لە خوێندن نەهێنێ:

**بڕێ بڕێ رەشید عومەر**
**تەرەپیاز و توور و کەوەر**
**نان و چایە هێلکە لەگەر**
**پاڵدانەوە لەبن سێبەر**
**نەدەی بەبێ فایدە و سەمەر**
**نەوەک دەبێ کەرک لەبەر**

(رەشید) بەم قسە خۆشانەی مامۆستا زۆر کەیفی دەهات و ئەرکی ماڵەوەی بە جوانی نووسیبوودەوە و مامۆستا مەلا تاهیریش بەم جۆرە مەدحی رەشید و خەتەکەی دەکا:

**کاکە بڕۆننە ئەو خەتە رەشید لێو بوویتە چەتە**
**ئەگەر زۆر ئازا نەبێ مەعلوم لێو دەکا رەتە**

هەروەها مامۆستا لە بارەی خەتە خۆشەکەی (رەشید عومەر) دەڵێ:

**چەندی بڵێی زیاتر ئەمڕۆ جوانت نووسییە**
**(جیدجدا) بەلاشە وەڵڵا هۆرت کردییە**
**ئەوەی بڵێ خراپە خوا لێی غەزەب گرتییە**
**هەموو با بڵێین با بژی رەشیدی پێشکەوتییە**

ماوەیەک (رەشید عومەر) نەخۆشی (لەرزوتا)ی گرتبوو، نەدەهاتە مەکتەب و لە ماڵەوە کەوتبوو، بۆیە قوتابییە زیرەکەکان (لەتیف و جەعفەر و جەواد و محەمەد) ئەو ماوەیە وایان نیشان دەدا، کە زۆر لە رەشید باشترن، هەرکە رەشید گەڕایەوە مەکتەب بە خەتە خۆشەکەی مامۆستای خۆشحاڵ کردەوە، مامۆستاش بەمجۆرە پاداشتی کرد:

**هاتەوە شێری جاران بەو خەتی وەک قەمەرە**
**باڵەک باڵەک پەیدا بوو لە لەتیف و جەعفەرە**
**نەکەن خۆتان هەڵکێشن شێر لە مەیدان خەتەرە**
**بڕۆن لۆ خۆ دانیشن بە خۆ مەکەن قەشمەرە**
**چۆن رەشید دەبەزێنن دەرسی هەموو لەبەرە**

* قوتابی (جەعفەر ئەحمەد) لەگەڵ عەبدوڵڵای برای لە پۆلی ئێمە بوون، ئەویش قسەخۆش و دەم بە پێکەنین بوو، بەڵام لە خوێندن و نووسینەوە مامناوەندی بوو، بۆیە مامۆستا پێی دەڵێ:

**جەعفەر لەبەر پێکەنین پێت ناکرێ باش بنووسی**
**جارێکی تر وا بکەی گوێت دەبڕم بە مووسی**

لە کوردەواری خۆمان دەڵێن: ئەگەر مریشکەک لەگەڵ جووجکەکانی نەلەوەڕێ و بەجێیان بهێڵێ، ئەم مریشکە بگرن لەناو هێرەگەکی دانێن و هەتا سەری گێژ دەبێ بیسووڕێنن ئینجا بەرەڵڵای بکەن و ناتوانێ بڕوات، ناچار دەبێ لای جوجکەکانی رابوەستی، لەبەر ئەوەی (جەعفەر) لە ئیملا خراپ بوو مامۆستا بۆی نووسیوە:

**ئەرێ توخوا پێم بڵێ جەعفەر ئەتو بۆچی وای**
**لە نووسینی دەرسەکان ناگری بە سەپانت شای**
**بەڵام لە دەرسی ئیملا دەڵێی ناو هێرەگ سووڕای**

کاک جەعفەر بەم قسانەی مامۆستا دڵتەنگ دەبێ و قوتابییە زیرەکەکان قەشمەری پێ دەکەن، ئەویش گازاندەی حاڵی خۆی کرد لە ئیدارەی مەکتەب و بەرامبەر مامۆستایان بەڵێنی دا، کە دەبێ زۆر باشتر بخوێنێ و جوانتریش بنووسێتەوە، وەک بەڵێنی دا قسەکانی ڕاست دەرچوون، تەماشاکەن مامۆستا مەلا تاهیر چۆن باسی (جەعفەر) دەکات:

**بەڵێ ئێستاکە جەعفەر گەلێ گەلێ پیاوە**
**نووسینەکەی زۆر باشە وەک زێڕی داڕژاوە**
**بەڵام پێشی نیوەساڵ دەیخوارد و پاڵی دەداوە**
**وەک ئەو تەمبەڵ و زەغەل نەبوو لە کەندێناوە**
**هەڵبەت قوتابی وەها دەرەجەی ناتەواوە**

* * *

**ئافەرین لەبۆ جەعفەر چۆن قوتابی زرینگە**
**هەموو ڕۆژێ وەردەگری (جیدجدا) گرینگە**
**لە ڕاست ڕەشید و لەتیف ئێستا بوویتە پرینگە**
**کاکە بۆ ئێوە عەیبە بەس بازۆن لەسەر ڕینگە**
**هەموو کات هەوڵ نەدەن لێو دەستینی بەرسینگە**
**لە پاشی ئیمتیحانیش پێتان دەڵێ فڕفینگە**

* * *

**چەندە باشە، بێ ولاشە، بێ تەناشە**
**وەک قوماشە، ئەگەر پیاوی ئەوها باشە**
**ئینجا پیاوە جەعفەر پاشا**
**پاڵ مەدەوە وەک تەڕاشە**
**هەردەم دەنگت بێ وەک ئاشە**

* * *

**جەعفەر دەڵێ لە سەفی سێ هەر منم کەوا خەت خۆشم**
**کەچی کە تەماشا دەکەم دەبێ هەر عەیبی داپۆشم**

* قوتابی (جەلال سنجاوی) کە ئەوکاتی لە پۆلی سێ بوو نە لە خوێندنەوە باش بوو نە لە نووسینەوە، بۆیە ڕۆژانە لە لێدان بێبەش نەبوو، بەڵام بێ ئامانج:

**(جەلال) دەبی عاقڵ بی      نابی هەروا خافر بی**
**هەتا ئاخیری ساڵێ      دەبی گەلێ حازر بی**
**تا ناجیح بی و پێت بڵێن      شێرکۆ نەوەک مامر بی**

* * *

**ئای ئای چەند عەیبە      ئەتو وەها بنووسی**
**ئەوجارە قەت خەتەکەت      ناهێنێ دوو فلووسی**
**سبەی دەبی سەرتاپا      سمێڵت بکەم بە مووسی**

* قوتابی (لەتیف حەسەن) لەگەڵ برایەکەی (ڕەئوف حەسەن) هەردووکیان هاوپۆلی من بوون، لە خێزانێکی هەژار و کەم دەرامەت بوون، لە خانوویەکی بچووکی پشت تەکیەی خەلیفە حەسەنی لهێبان دەژیان، بەڵام کاک (لەتیف) قوتابییەکی نموونەیی بوو لە ڕەوشت و زیرەکی و خەت خۆشی، بێ هاوتا بوو، هەموو مامۆستاکان بە پلەی یەکەم (لەتیف حەسەن)یان خۆش دەویست، بۆیە مامۆستا مەلا تاهیری کەندارەقەل زۆر هۆنراوەی بۆ کاک (لەتیف) داناوە، وا بەشێکیان بڵاو دەکەینەوە:

**بژی لەتیف سەد کەڕەت**
**قەلب ساغ بی و بێ مەزەڕەت**
**قەت نەشکێ کۆسکە و جەڕەت**
**نەدرێ جاجم و بەڕەت**

* * *

**کاکە هەرچەند دەنۆڕم خەتی ئەم کاک لەتیفە**
**قلی غەرەتی نییە دەڵێی تڕێی تایفە**

* * *

**هەر بژی لەتیف بەڕاستی هەرتۆ نووسەری**
**گەرچی جارجار محەمەد و ڕەشید هەم لەگەڵ جەعفەری**
**وەکو مار لێت دەکیفێن بەڵام دوورن ناچنە سەری**

* * *

**برام بەو خەتە خۆشە دەفتەرەکەت پڕکەوە**
**سیلاحی ئەوڕۆ خەتە چاکترە لە برنەوە**
**گەر ئەوڕۆ تۆی زۆر بکەی سبەی ڕۆژێ خڕکەرە**

* * *

**کاک لەتیف ئاخیر سارە**
**دەنگت بێ وەک تەیارە**
**گەر شەو و ڕۆژ نەخوێنی**
**هەوڵت هەموو بەتارە**

**شـــــــــەرم لـە ردێـنـت نـەکـــــــــەی**
**فـــــــشــــــــەت پێ دەکــــــــەن مـنـداره**

* قـوتابی (عـەبدوڵڵا ئەحـمـەد) کـە گـوتمان برای جەعفەرە، ئەویش زیرەک بوو، بەڵام لەوی زیرەکتر هەبوو، زۆرجـار لەناو قـوتابیـیـەکـان دەیگوت من لە (لەتیف حەسەن) زیرەکترم، بەڵام مامۆستا جیاوازی لە نێوانمان دەکـا، جـا مـامـۆسـتـا بەم شـێـوەیە وەڵامی دەداتەوە تا (لەتیف) لە بابەتەکە ئاگادار بێ:

گـەلێ جـار عـەبدوڵڵا ئەحـمـەد لە راست تۆ خـۆی هەلدەکێشە

**بەڵام بۆ وی مـاندی بوون و هۆنەهۆن و کـێـشـە کـێـشـە**
**شێری شای دراندان لە کوێ لەگەڵ مێروو شانەو مێشە**
**براله خـۆت مـاندوو مـەکـە زۆری وەک تۆی هاتە پێـشـە**
**دەفـتــەر و قــەڵەمت دانێ و عــارەبانەت راکـێــشــە**

* * *

کـاک عـەبدوڵڵا ئەحـمـەد کـە ئێـسـتـا مـامـۆسـتـایە لە هەولێـر، لە خـوێندنەوە باش بوو، بەڵام لە نووسـینەوە بە خەتێکی سەقەت و هەندێکیشی پاز دەدا، گوایە مامۆستا نازانێ! خەڵاتی ئەم رەفتاری ئەوە بوو:

**عــەبدوڵڵا بۆ تۆ عــەیبــە دامناوی بە ســەربازە**
**بۆ لێـــــرە وا داوتـە نەرە شـــــینە شـــــابازە**

* * *

**سـەیری عـەبدوڵڵا ناکـەی بۆ دەڵێی شوانی پەزی**
**چەند عـەجوولە لە سـەفێ دەڵێی مێـروو دەیگەزی**
**چییـە وا خراپ دەنووسی خـەسار دەکەی کـاغـەزی**
**دەبێ شــەقــەکت لێــدەم دەســتم لەگــەڵ بـتــەزی**

* * *

* قوتابی (شێخ محەمەدی پلکەزەمۆکی) لە خێزانێکی هەژار و دەستکورت پەروەردە کرابوو، جلوبەرگی چەند شرو بە پینە بوو، خوێندنەوە و نووسـینیشی بە هەمـان شێـوە، بەڵام مـامـۆسـتـایان بە رەفـتـارێکی هێـمن و دوور لە توونـدوتیـژی پەروەردەیان دەکـرد، ئەمـەش جـۆرێـک بـوو لە هاندانی (شێخ) بۆ بەردەوامبوون لە خوێندن:

**ئەرێ (شێخی) نوێژ نەکەر بۆچی باشتر نانووسی**
**دەبێ سـبـەی سـمێـڵت سـاف بـتـاشم بە مـووسی**

* * *

**کە تەماشای (شێخ) دەکەم لە سەفێ گەلەک کرە**
**وا دەزانم خـوێندنەوە و نووسـینی خـراپ و شـرە**
**کـەچی دوایی دەنۆڕم نەخـێـر خـەتی وەک دورە**

* * *

**ئافـەرین لەبۆ (شـێـخی) هەر حـازر بێ هیـمـەتی**
**چەند جوان و رێکی نووسـیـە وەرن بڕۆننە خـەتی**
**بزانن هەتا ئاخــیــر دەبینیــتــەوە غــەرەتی**
**جەعـفـەر ئەو خەتە بیبینی نانووی لەبەر خەفـەتی**

* قوتابی (خالید جووتیار) کە لە قوتابییە زیرەکەکان بوو، بەڵام بە دەستی چەپە دەینووسی و خەتی خۆش بوو، مامۆستا بەم جۆرە باسی دەکات:

**ئافـەرین کـاتبی چۆیە لە سـەفی سێ سـەرتۆیە**
**خـــەتی وی لەناو خـــەتان دیارە وەکـــو گلۆیە**

**دوا قسە**

هەرچەندە هۆنراوەکان زۆر ماون، بەڵام من گولبـژێرێکم کرد، تەنیا مەبەسـتیش لە بڵاوکردنەوەی ئەم بابەتە ئەوەیە، کە ئەو مـامـۆسـتـا بەرێزانە لە ساڵانی شەسـتـەکـان چەند بایەخیان بە مەکتەب و مەکتەبلییەکان داوە، بە بێ ئەوەی لێدان و ترس و تۆقاندن بەکار بهێنن، بە شێوەیەکی هێمن و زیرەکانە کاری پەروەردە و فێـرکردنیان ئەنجام داوە و بە زمانی گوڵ رەفتاریان لەگەڵ قوتابییان کردووە، هەروەک لە هۆنراوەکـاندا دیارە مـامۆسـتـا مـەلا تاهیر، کە بەرێوەبەری مەکـتـەبەکەش بوو، ئینجا لە چەند جێگا وشـەی (کاکـە، برام، ئەفـەندی) لەگەڵ ناوی قـوتابیـیـەکـان بەکـار هێناوە، تەنها بۆ هاندان و بەرز راگرتنی ئاڵای زانست و زانیاری و خـزمـەتکردنی منداڵە چاوگـەشـەکـانی کـوردسـتـان، لە گـوندێکی دوورەشـاری وەک (لهێبـان) و لە باری ئاڵۆز و دژواری ئەوێ سـەردەم و لە هەرای حـەرەس قـەومـیـان و لە هەژاری و نەداری باری گـوزەرانی جـووتیـار و کـرێکـارانی پێدەشتەکە.

ئەم بابەتە لە گـۆڤـاری ئاسـۆی فـۆلکلۆر، ژمـارە ۱۱، ۲۰۰۵ بڵاوکراوەتەوە.

# ئالیکانە و نانانە

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

لادێیی کە لە نوێ - لەسەر شێوەی کۆن و عەشیرەتی - چەند ماڵێک بەیەکەوە دابمەزرابان، یەکێکیان لەبەینی خۆیان هەڵدەبژارد: ١- هەرە ئیختیار ٢- پیتۆڵ و زانا ٣- خاوەن کوڕ و برا زۆر ٤- حاڵ خۆش ٥- ئازا و رەشید و بە دەرەوە، ئەمەیان دەکردە برا گەورە، هەبوو (کێخوا) یا (موختار)یشی پێدەگوترا، هەشبوو گوێنەدەر بوو بە هەندێ یاسا و دەستووری کۆمەڵایەتی و ئایینی پێیان دەگوت (گزیر).

ئەو براگەورەیەیان بەرانبەر بە عەشیرەتی تر یا حکومەت دەکرد بە دەمڕاست، ئەرکی ئاواییەکەی دەخستە سەرشانی خۆی، هەتا حکومەتی بێگانە لە وڵاتەکە رەگی توند دانەکوتا بوو، ئەو براگەورەیە، ئەگەر بە کەیفی ئەهالییەکە هەڵنەستابا، لەکاتی خۆی لێیان دەخست و یەکێکی دیکەیان دادەنا، هەبوو بۆخۆی وازی دێنا و پێی هەڵنەدەگیرا، هەشبوو رایان لێبا هەتا هەتایە دەماوە و دەبووە براگەورەی بەڕاستی.

ئەهالییەکە بۆ باروبوو چاڵێکیان لێدەدا، هەرکەس ساڵی بارێک جۆی تێدەکرد، بەناوی ئالیکانە دەیاندا وڵاغی میوانان یان پۆلیسان، بە نۆبە هەر ماڵەش جارێک نانیان بۆ میوانی ماڵی موختاری دەکرد، دوایی گوتیان: (ئەوە عەیبە، یا رێک ناکەوێ) ماڵی ساڵی بارێک گەنمیان دەدایە بەناوی (نانانە).

ئەگەر حاڵی خۆشبا و ناوبەناو لەسەر حسابی خۆی پیاوەتییەکی بکردبایە و دەسەڵاتێکی هەبا، پێیان دەگوت (کێخوا) دەنا (موختار) بوو.

لە دار و سپیاتی و خانوو دروستکردن یاریدەیان داوە، تا بۆ میوانان جێیەکی بەلاوەی هەبێ، ناوماڵێکی گەورەیان بۆ دروست دەکرد و دەرگەیان تێدەخست، هەندێ رایەخیان تێدا رادەخست، ناویان لێدەنا (دیوەخان)، زۆر لە دیوەخانەکان لە شوێنێکی بڵند دروست دەکران، تا باش ببیندرێن، بە تەنیشتییەوەش تەویلەیان دروست دەکرد.

هەندێ (کێخوا) کە دیتیان (ئاغا) بێگاری دانا، ئەوانیش لە هەموو بەروبوومێکی (١/١٠)یەکیان ستاند، دوایی کردیانە (١/٧) یەک، کە لە پێشان بە غەیری ئالیکانە و نانانەکە چیتریان لە فەلاحەکان نەدەستاند، ئەمیش خۆی بە فەلاحەتییەوە خەریک دەکرد، هەندێ لە فەلاحەکان کە ئەم لێوەرگرتنەیان پێ (تەحەمول) نەدەکرا - کە دۆست و خزمی دوێنێ بوون - دەبوونە دوژمن و ناحەز، بەناچاری لەو گوندی باریان دەکرد، بە کۆمەڵ دەچوونە جێیەکی تر یا بڵاوەیان لێدەکرد، یەعنی هەرچەند ماڵێک بۆ شوێنێکی تر[1].

پیاوانی ئایینی وەک (مەلا، شێخ، سەید) کە مەیلی ماڵ و

مولّک کۆکردنەوەیان کەوتە میّشک، ئەوانیش ریّی ئاغایەتی دەگرن و تووشی زۆرداری دەبن، چونکە ناوەدەردەکەن و میوان و مەسرەفیان زۆردەبێ، واریداتیان بەشی مەسرووفاتیان ناکا، مرید و دەرویّش دەبنە خولام و نۆکەر، تەسبیح و سیواکیان دەبتە شیر و رم و تیر و تفەنگ، سەر و پرچ و بەرمالّیان دەبیتە ولاغ و ئۆتۆمبیّل، دەف و دمبکیان دەبیّتە رادیۆ و تەلەفزیۆن، دەست بەسەر مولّکی دەوروپشتیان دادەگرن، لە پیّشیان نابێ کەس دەست دریّژیان بۆ بکا، چونکە پیاوی ئایینی وجاغن، خەلّک چاویان کویّردەبێ، یا وجاغ لیّیاندەدا، بەلاّم کە خۆیان گرت، ئەوجا لە ترسی دەسەلاّتی قیامەتی و دنیایی ناویّری دەستیان بۆ ببەی، ئەوان پەلامارت دەدەن.

ئەو چەند قسەیەم نووسیەوە، تا بزانین بنەچەکەی ژیانی عەشیرەتی و لادێیی - بەلّکو شارستانیش - چۆن داندرا، چۆن کاری لە قۆناغەکانی ژیان کردووە و باری ئابووری و کۆمەلاّیەتی و رامیاری چۆن گۆڕاوە، ئەمەش نەک هەر پەیوەندی بە ولاّتی کۆیەوە هەیە، بەلّکو پەیوەندی بە زۆر شوێنی تریشەوە هەیە.

کە حکومەتی عوسمانی باجی زەوی و (تخمین)ی کشتوکالّ و رەز و باغ و حەیوان ژماردنی دانا، بەشی زۆری گوندەکان چۆلّ و ویّران بوون، زۆر زەوی و زار بە بەیاری مانەوە، زۆر جار (٦ - ٧) فەلاحیان سەرەوقوون هەلّدەواسی و کایان لە ژیریانەوە دەسووتاند و دووکەلّیان بۆ دەچوو، نەیانبوو خەرجی زراعەت بدەن!.

میللەت کە خەریکی مەڕ و مالاّت بەخیّوکردن و کۆچەربوون، کویّستان و گەرمێنیان دەکرد، ولاّتەکە ئاوەدانی کەم بوو، زۆر عەشیرەتی کۆن لەم ولاّتە هەبووە، فەوتان و ناویشیان نەماوە، زۆر کەس لەبەر بیّدەسەلاّتی وەک دەلّیّن: (تا نەخوریّ و جقوقی بپاریّزریّ) - ئەگەر پیتاکیشیان زیاد لیّ ستاندرابێ - خۆی بە عەشیرەتیّکەوە بەستۆتەوە.

چەند عەشیرەتیّکی کۆچەر هەن - کە دەوار نشینن، وەک (بۆلّی)[2]، (بابۆلّی)[3]، (بەرەکەیی)[4]، (مەنتک)[5]، کە پایزان لە کویّستان دەگەڕیّنەوە، هەندیّکیان لە ئاقارەکانی ولاّتی کۆیە هەلّدەدەن و بەروبوومیان لە کۆیە ساغ دەکەنەوە، وەک: پەنیر، خوری، کاوڕ....

**سەرچاوە و پەراویّزەکان:**

١- لە (٢١/٤/١٩٧٦) لە مامۆستا مەلا عەبدولقادر کانی دەربەندیم وەرگرتووە.

٢- بۆلّی: (٣٠٠ - ٤٠٠) مالّیّک دەبن، هاوینان دەچنە (حاجی ئۆمەران)، خاوەن مولّکن، دەغلّ و تووتن و چۆمی دەچیّنن و فەلاحەتیش دەکەن، زستانان دیّنەوە (بیتویّن)ی.

٣- بابۆلّی: کویّستانیان لە (حاجی ئۆمەران)ە، بە (پشت ئاشان)یدا دەڕۆن (٣٠٠) مالّیّک دەبن، زستانان لەگەلّ (بۆلّی)یان دیّنەوە (بیتویّن) و (ونکە) و (عەلی ئاوا) و (ئەشکەوسەقا)، دەلّیّن: (گوتیتیان) ئیّمەش بۆلّین، (بۆلّی)یەکانیش گوتیتیان: (با، ئەوانیش بۆلّین) و ناویان بوویتە (بابۆلّی).

٤- بەرەکەیی: (١٠٠) مالّ دەبن، هاوینان دەچنە کویّستانی (مەنگوڕان)، زستانان دیّنەوە لای (ئالیقە) و (ژوشکە) و دۆلّی (خەلەکان).

٥- مەنتک: (٥٠٠) مالّ دەبن، هاوینان هەواری تەواویان نییە، لە کویّستانی پەرت دەبن، بەشی زۆریان شوانکارەیی هەولیّریانن و علاقەیان لەگەلّ هەولیّر زۆرە، زستانان دیّنە دیوی (باواجی)، (دیگەلّە)، (هەرەجە)، (بیّستانە)، دەم شەرغە.

* ئەم بابەتە لە کتیّبی (میّژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەویزی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ٢٠٠٧ وەرگیراوە.



# پەیوەندیی بڕشتی ئافرەت و ژینگەی نیشتەجێبوون

## (لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە لەپارێزگای هەولێر)

دکتۆر نوری یاسین هەرزانی- زانکۆی سەڵاحەدین
دکتۆر سەلیم بەترس ئەلیاس- زانکۆی سەڵاحەدین

**سەرەتا**

"بڕشت"، لە لێکۆڵینەوەی دانیشتووان بە توخمێکی سەردکی دادەنرێت. چونکە بەرپرسە لەمانەوەی ڕەگەزی ئادەمیزادو لەنەمان دەیپارێزێت. کاریگەری زۆریشی هەیە لەسەر ئاییندەی دانیشتووان لەڕووی (زیادو کەم) بوون و پەیوەندی بەپرۆسەی گەشەسەندن و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییەوە.

کۆمەڵێک هۆکار هەن کەرۆڵێکی گرینگ دەبینن، لەدیاریکردنی ڕێژەی بڕشت لەو سنوورەی، هۆکاری فیسیۆلۆجی وێنای دەکات. ئەو هۆکارانەش بایەدارن لەوەی کە زانایان بایەخی زۆری پێدەدەن، وەک هۆکاری کۆمەڵایەتی- شارستانی- دەروونی...هتد.

بەپێی ئەم ڕاستییە، ئەم لێکۆڵینەوە وێنە کێشراوە لە "پەیوەندی نێوان بڕشتی ئافرەت و ژینگەی نیشتەجێ- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە لەپارێزگای هەولێر" بەشداری دەکات بۆ بەرپەرچدانەوەی

یەکێ لەو هۆکارە مەیدانیانە.

"ناحیەی عەنکاوە"مان هەڵبژارد، وەک ژینگەیەکی شارستانیی لەگەڵ "گوندی بەحرکە" وەک ژینگەیەکی لادێیی.بە مەیدانی لێکۆڵینەوەکە، لەرێگەی چاوپێکەوتن لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی شوویان کردووەو هاموشۆی بنکەی تەندروستی دەکەن بۆ بەدەستهێنانی نموونەی هەروایی کە ١٠٠ ئافرەت لەخۆ دەگرێت و دابەش بوونەکەش بەم شێوەیەیە: (٥٠) ئافرەت لەبنکەی عەنکاوە، (٥٠) ئافرەت لەبنکەی بەحرکە، بەمەبەستی گەیشتن بەسروشتی پەیوەندییەکان لەنێوان برشتی ئافرەت و پەیوەندی بەژینگەی نیشتەجێبوون.

ئەم لێکۆڵینەوەیە دوو لایەنی تیۆری و مەیدانی لەخۆ دەگرێت. بۆ کۆکردنەوەی زانیارییەکان و پۆلینکردنیان و شیکردنەوەیان بەئامانجی گەیشتن بەدەرەنجامێکی زانستی.

**بەشی یەکەم: (لایەنی تیۆری)**

**١- دیارکردنی چەمکی زانستی**

روونکردنەوەی هەندێ چەمکی لێکۆڵینەوەکە بە پێی رەچاوکردنی پێوەری لێکۆڵینەوەی زانستی لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا:

ا) **برشت:** پرۆسەیەکی ئاڵۆزەو بەرپرسە لەبەردەوامی ژیانی کۆمەڵگا. بەمەش لایەنێکی سەرەکی لەلێکۆڵینەوەی دانیشتووان پێک دەهێنێت[١] مەبەست لەبرشت توانای ئافرەتە لە زاوزێ. هەندێ لەتوێژەران بە لێهاتوویی زاوزێی ئافرەتی دادەنێن کە لەرێگەی ژماردن (ئامار)ی لەدایکبوونی زیندووەکان وەدەستی دەهێنن[٢].

لەزانستی دانیشتووانیشدا دیاردەی لێکۆڵینەوەیەکە و دەگەرێت بەدوای رێژەی لەدایکبوون و هۆکارە وروژێنەرەکانیاندا[٣].

دیمۆگرافییەکان برشتیان دابەش کردووە بۆ برشتی شاراوە (Fecundity) کە مەبەست لێی توانای فیسیۆلۆجی ئافرەتە لەسەر زاوزێ. برشتی کردەکی (Fertility) کە گوزارشت لەژمارەی لەدایکبوونی زیندووەکان دەکات. هەروەها لەسەر توانای فیسیۆلۆجی و هەندێ هۆکاری دیکە لەرووی کۆمەڵایەتی و شارستانی و ئابووری و دەروونی کۆمەڵگە جیا جیاکان دەوەستێت[٤].

کەواتە، مەبەست لەبرشتی توانای ئافرەتە لەسەر زاوزێ لەماوەیەکی دیاریکراو لەژیانیدا، کە لەنێوان تەمەنی پێگەیشتن تا تەمەنی لەزگ وەستان(٤٠ تا ٥٠ ساڵ بەرەو سەر) درێژ دەبێتەوە. هەڵبەتە کۆمەڵێ هۆکاری کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری و دەروونی رۆڵی گرنگ لەدیارکردنی ئاستەکانیان دەبینن.

زۆری رێژەی برشتی لەهەڵوێستی ژن یان مێرد دیار دەکرێت. چونکە کاتێ هەوڵ دەدەن منداڵیان بێ، ئەوا رێژەی برشتی کردەکی بۆ ئافرەت دەگوازرێتەوە، بەڵام لەکاتێکدا، کە ژن و مێرد بەم رێسایە پابەند نەبوون، ئەوا رێژەی برشتی بەرز دەبێتەوە[٥].

بەڵام ئەوەی پەیوەندەدارە بەپێوەدانگەی برشت، هەندێ لەتوێژەران رێژەی لەدایکبوونیان کردۆتە پێوەرێک بۆ برشت. ئەویش بەدابەشکردنی ژمارەی ئەو منداڵانەی لەساڵدا بە زیندوویی لە دایک دەبن، بەسەر ژمارەی دانیشتووان لەنیوەی ساڵەکەدا، بەلێکدان لەهەزار. بۆ



زانینی توانای دانیشتووان لەسەر زۆر بوون و بەراورد کردن لەنێوان گەشەسەندنی دانیشتووانی شارانی لەیەکچوو، لەرووی تەمەن و رەگەزدا. یاخود بەراورد کردنی قەوارەی دانیشتووان لەشارێکدا بۆ دوو ماوەی جیاواز لەکاتێکدا گەر هاتوو ئاکارەکانی گۆڕانکاری گەورەی بەسەردا نەهاتبوو[٦].

لەکاتێکدا توێژەری دیکە رێژەی برشتی گشتییان کەپشت بەزیاتر یان کەمی ژمارەی ئافرەتانی زگپڕ دەبەستێت بەکار دەهێنن. لەدابەشکردنی ژمارەی لەدایکبووانی زیندووەکان لەساڵی دیاریکراودا بەسەر ژمارەی ئافرەتانی زگپڕ لەو ساڵەدا دەردەهێندرێت و لەهەزار دەدرێت[٧]، بۆیە لەکاتی لێکۆڵینەوەی دانیشتووان لەهەر هەرێمێک یان لەشارێک لەجیهاندا، دەبێت ژمارەی نێرو مێ بزاندرێ لەگەڵ جیاوازی نێوانیان. چونکە جیاوازی ژمارەی نێوانیان کاریگەری لەسەر جۆری گرفتەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و هێزی کارو رێژەی لەدایکبوون و مردن و هاوسەرگیریدا هەیە هەروەها لەسەر کۆچکردن و دابەشبوونی پیشەی لەدانیشتووانیشدا[٨].

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بەرامبەرو هاویەکبوون لەنێوان ژمارەی نێرو مێدا وای لێدەکات کە لەرووی برشتیدا زیاتر شیاویی بەخۆوە ببینێ. بەڵام گەر پەشێوی کەوتە ئەو هاویەکبوونە لەهەردوو جۆردا، پەشێوی لەیەکبووندا کەموکوڕی دەخاتە ئەگەری برشت[٩].

لەسەرنجێکدا لەدەرەنجامی ئاماری گشتی دانیشتوانی عێراق دەبینین رێژەی برشتی گشتی لەپارێزگای هەولێردا پێشتر، واتە لەساڵی ١٩٧٧، (٢٢٩) هەزار بووە، بەڵام لەساڵی ١٩٨٧ دابەزیوە بۆ (٢٠٥) هەزار[١٠].

کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شێوانی هاویەکبوون لەنێوان ژمارەی نێرو ژمارەی مێدا، لەدەرەنجامی زیانە گەورەکان کە بەپیاوان گەیشت.هەروەها دەشگەڕێتەوە بۆ نەبوونی سەقامگیریی خێزانی بەهۆی جەنگی عێراق- ئێرانەوە، کە بەشێوەیەکی نێگەتیڤی کاری لەرێژەی برشتدا کرد.

**ب- ژینگەی نیشتەجێ:**

نێوەندێکە مرۆڤ تێیدا دەژی و کاریگەریشی لەسەر گوزەران و رەفتارو پەیوەندییەکانی لەگەڵ کەسانی دیکەدا و جۆری ژیان و بیرکردنەوەشیدا هەیە[١١]. ژینگەی نیشتەجێ دابەش دەکرێت بۆ:

١- ژینگەی لادێ
٢- ژینگەی شارستانی

**١- ژینگەی لادێ:** بریتییە لەژینگەیەک پشت بەپیشەی کشتوکاڵ دەبەستێت. ژیانی کۆمەڵایەتییان زۆر سادەیە. زۆری یەک کارەن و پیشەی جۆراو جۆریان نییە. پەیوەندی نێوان ئەندامەکانیان زۆر بەتین، جێگر، رێکخەر و ئاراستەیە بەرەو بەها باوەکان. هەروەها ژینگەی لادێ پڕە، لەهێزی رۆحی ئایینی و پابەندبوون بە پراکتیزەکردنی بەندایەتی و پیرۆزییەکان و دروشمە رۆحییەکان بەپلەیەکی گەورە، لەگەڵ یەکگری خێزانیی و توانای بەرزەفتی پەروەردەیی و کۆنترۆڵکردنی نەریتدا[١٢].

ئەو ژینگەیە لەسەر رێکخەری نزم، ژیان تێپەڕەدەکات و بەکۆنترۆڵکردنی پیشەی کشتوکاڵ و پەیوەندییە بەتینەکانی نێوان خەڵک و بچووکی قەوارەی کۆمەڵگا کۆمەڵایەتییەکەی جیا دەبێتەوە. شێوەش دەکەوێتە نێو دانیشتووانەکەی بەپلەیەکی بەرز لەرەگەزی کۆمەڵایەتی و رێ بزرکردنی جیاو پلەدانانی ناوخۆییەکان و رێ بزرکردنی بزاوتی کۆمەڵایەتی لای دانیشتووانەکەی[١٣].

هەروەها بە سادە و ساکاری ژیان و سەرەروەری دابونەریت و بەهاو عورفی کۆمەڵایەتی و بڵاوبوونەوەی بنەماڵە(شەجەرە) درێژ بووە یەکگرتووەکان لە ژینگەی شارستانی جیا دەکرێنەوە.

**٢- ژینگەی شارستانی:**

ژمارەیەک تاکن لە (شار) نیشتەجێن، بەگەورەیی قەوارەو زۆربوونی دانیشتووان و چڕی و نەبوونی یەک رەگەزو کۆنترۆڵی پەیوەندییە بەسوودەکان و پەرەسەندنی پێشبڕکێ و نیشانەکانی بەرزەفتی فەرمی لەشوێن بەستێن و

پەیوەندییە نافەرمییەکان، لەژینگەی لادێ جیا دەکرێتەوە. هەروەها بەپلەی پێشکەوتن لەدابەشکردن و پسپۆری لەکارداو پیشە جیا جیاکان و ئاستی ئابووری و رۆشنبیری و زانستی بەرز جیا دەکرێتەوە [١٤].

ژینگەی شارستانی جۆرەها پیشەی، وەک پیشەسازی و بازرگانی و گواستنەوەو باڵەخانەو دەستەبەرکردنی پێداویستیی ژینگە جۆراو جۆرەکان و تۆڕی فراوانی خزمەتگوزاری پێویست و، بەشە جیاکەرەوەکان لەرۆشنبیری و زۆری بزاوتی کۆمەڵایەتی و سەرودری یاساو پەیوەندی ئەندامانی کۆمەڵگا دارابوونی ئازادی کەسێتی و بلاوبوونەوەی بنەماڵەی تازە لەخۆ دەگرێت.

**٢- پەیوەندی نێوان برشت و ژینگەی نیشتەجێ**

لێرەدا جیاوازییەکی ئاشکرا لەبرشتی نێوان هەردوو ژینگەی لادێی و شارستانیدا هەیە. برشت لەژینگەی لادێ بەرز دەبێتەوە هەروەک لەژینگەی شارستاندا بەرز دەبێتەوە. ئەمەش بەهۆی سروشتی ژیان لەلادێدا لەبەرامبەر پێشوازیکردنی دانیشتووانی شار بەوەرگرتنی زۆر پێناو بۆ دیاریکردنی زاوزێ[١٥].

بێگومان وەرنەگرتنی ئەو پێناوە بەیەکێ لەهۆکارەکانی کۆمەکیدەر دادەنرێت بۆ زۆربوونی برشت و زاوزێ، چونکە دابونەریتی و بەها کۆمەڵایەتییە گونجاوە لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی لەژینگەی لادێدا، بەوەی کە ئەو ژینگەیە بەحوکمی ئەوەی کشتوکاڵییە پێویستی بەچالاکی ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتووان دەبێت. هەروەها پێویستی بە دەستەبەرکردنی پاراستنی کۆمەڵگا دەبێت لەدژی ئەو مەترسیانەی دەرەوە، کە رووبەرووی ژینگەی لادێ دەبێتەوە. بۆیە دەشێ ژینگەی لادێ لەهەوڵی ئەوە دابن برشت زیاد بکەن بەئومێدی ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لەنەوە زیاتر بکەن. بەتایبەت نێرینە بۆ بەهێزکردنی شوێن و پێگەی کۆمەڵایەتی خێزان یان بنەماڵە لەناو کۆمەڵگەدا.

بەلایەنێکی تایبەت بۆمان روون دەبێتەوە کەخودی ژینگە کەمتر رێژەی برشت لەخۆ دەگرێت، کە ژینگەی شارستانی بەسەریدا زاڵە[١٦].

ژینگەی شارستانی بەرێژەیەکی کەمی برشت، بۆ ئەوەی لەگەڵ گۆرانکارییە تازەکانی کۆمەڵایەتی بشێ، بەسیەتی. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە کە رەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی لەژینگەی شارستانیدا ئاڵۆزو قورسە. هەڵبەتە ئەم هۆکارانە پاڵ بەژینگەی شارستانییەوە دەنێن کە دیاریکردنی منداڵبوون پراکتیکە بکەن و هەوڵی بۆ بدەن بەمەبەستی بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووری و رۆشنبیری تاکەکانی خێزان بەپەیرەوکردنی شێوازو نەخشەو پلانی خێزانی. ئافرەتی شارستان ئاستی رۆشنبیری بەرزترە بە بەراورد کردن لەگەڵ ئافرەتی لادێ. ئافرەتی شارستان هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدایە بە بەختەوەری و خۆشگوزەرانی ژیان بەسەر بەرێت. بۆیە ئەمە وای لێکردووە کە رۆڵ لەکەم کردنی رێژەی برشتدا ببینێت.

**بەشی دووەم (لایەنی مەیدانی): راپەراندنی لێکۆڵینەوە و نواندنی بەیاننامە و شیکردنەوەکانی**

**ا) لێکۆڵینەوەی مەیدانی**

١- پرۆگرامی لێکۆڵینەوە: هەردوو توێژەر پرۆگرامی شیکردنەوەیان لەراڤەکردن و شیکردنەوەی بەیاننامە مەیدانییەکان و، پرۆگرامی بەراوردکردن بۆ ماوەی جیایی رێژەی برشت لەنێوان هەردوو ژینگەی لادێ و شارستاندا بەکار هێناوە.

٢- کەرەستەی لێکۆڵینەوە: هەردوو توێژەر فۆرمی کارنامەیان وەک پێناوێک بۆ کۆکردنەوەی بەیاننامەکان بەخستنە سەری ئەنجامدانی دیانە لەگەڵ تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوە بەکار هێناوە، بەمەبەستی پڕکردنەوەی برگەکانی فۆرمەکە، نموونەی فۆرمەکە لێکۆڵینەوەکە هاوپێچ کراوە.

٣- بوارەکانی لێکۆڵینەوە: لەم بوارانە پێک دێت:

أ- بوارەکانی مرۆیی: ئەو ئافرەتانەی سەردانی بنکەی تەندروستی ناحیەی عەنکاوەو بنکەی تەندروستی گوندی بەحرکەیان کردووە.

ب- بواری شوێن: بنکەی تەندروستی هەر یەک

لەناحیەی عەنکاوەو گوندی بەحرکە.

ج- بواری کاتی: ئەو ماوەیەیە کە لەمیانەی پرۆسەی دابەشکردنی فۆرمەکانی لێکۆڵینەوەو ئەنجامدانی دیمانە لەگەڵ تاکەکانی نموونەی لێکۆڵینەوەکە خایاندی کە لەرۆژی ٤/ ١٠/ ٢٠٠١ دەستی پێکردو لەرۆژی ١٦/ ١٠/ ی ئەو ساڵەش کۆتایی پێهات.

٤- نموونەی لێکۆڵینەوە: نموونەی لێکۆڵینەوە پێک دێت لەو ئافرەتانەی سەردانی بنکەی تەندروستی ناحیەی عەنکاوەیان کردووە بەو گوزارشتەی کۆمەڵگەیەکی شارستانە، لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی سەردانی بنکەی تەندروستی گوندی بەحرکەیان کردووە، بەو گوزارشتەی کۆمەڵگەیەکی لادێییە. نموونەی رێگەکەش بەهەرەوایی وەرگیراوە، بەقەوارەی (١٠٠) ئافرەت (٥٠) ئافرەت لەهەر بنکەیەک و بەشێوەیەکی زنجیرەیی بەپێی پێشینەی سەردانیکردن.

٥- پێناوی ئاماری بەکارهێنراو لەلێکۆڵینەوەدا: هەردوو توێژەر رێژەی سەدیان، وەک تاکە پێناوی ئامار لەلێکۆڵینەوەکە بەکار هێناوە.

**ب) نواندنی بەیاننامە و شیکردنەوەکانی:**

هەروەکو زانراوە بەدواداچوونی پرۆگرامی زانستی لەلێکۆڵینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وا لەتوێژەر دەکات بەیاننامەو شیکردنەوەکانی لەمیانەی پشت بەستن بە وەڵامی توێژەرەکان لەسەر پرسیارەکان، بەبەستێت.

١- پەیوەندی نێوان برشت و ژینگەی کۆمەڵایەتی: لەزانیارییە مەیدانییەکان دەرکەوتووە کە رێژەی برشت لەژینگەی لادێدا بەدوو هەندی رێژەی برشت لەژینگەی شارستانیدا زیاتری کردووە، هەروەکو لەخشتەی ژمارە (١)دا روون دەبێتەوە:

بروانە خشتەی ژمارە (١)

لەخشتەی سەرەوەدا دەردەکەوێت جیاوازییەکی ئاشکرا لەبرشتی دایکان لەنێوان هەردوو ژینگەی شارستان و لادێدا هەیە. مامناوەندی منداڵ لەژینگەی شارستانی دەگاتە نزیکەی زێتر لەدوو منداڵ (٢/٤٤) بۆ هەر دایکێک. بەڵام لەژینگەی لادێدا دەگاتە نزیکەی (٥) منداڵ، (٥/١). هەڵبەتە ئەمەش بۆ زیاتر هوشیاری و بەرزبوونی ئاستی رۆشنبیری لای ئافرەتی شارستان دەگەرێتەوە لەپراکتی کردنی دیاریکردنی منداڵبوون لەبەر ئاڵۆزی ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردە بەکەمترین ژمارەی منداڵ تاوەکو بتوانێ بەشێوەیەکی دروست پەروەردەیان بکات و بایەخیان پێبداو بەمەبەستی خزمەتکردنیان پێویستییە زەرووریەکانیان بۆ دابین بکات. بەپێچەوانەی ئافرەتی لادێ لەناو ژینگەیەکی کۆمەڵایەتی ژیان دەگوزەرێنێ، کە پڕە لە دابونەریت و بەهای کۆمەڵایەتی، ئەوساکە هانی برشت و منداڵبوونی زۆر دەدات.

٢-پراکتیک کردنی ئافرەت لەدیاریکردنی منداڵبوون بەپێی ژینگەی نیشتەجێ.

بروانە خشتەی ژمارە (٢)

لەزانیاری مەیدانی خشتەی ژمارە (٢)دا دەرکەوت، کە ژمارەی ئەو دایکانەی دیاریکردنی منداڵبوونیان لەژینگەی شارستاندا دیاری کردووە (٣٦) یەکەیە لەکۆی (٥٠)دا. واتە بەرێژەی (٧٢٪). ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرێتەوە، کە ژینگەی شارستان بەحوکمی ئاڵۆزی ژیانی ئابووری و

**خشتەی ژمارە (١)**

| ژینگەی نیشتەجێ | ژمارەی دایکان | ژمارەی منداڵ | مام ناوەندی منداڵ بۆ هەر دایکێك |
|---|---|---|---|
| شارستان | ٥٠ | ١٢٢ | ٢/٤٤ |
| لادێ | ٥٠ | ٢٥٥ | ٥/١ |
| کۆ | ١٠٠ | | |

کۆمەلایەتی و بەرز بوونی ئاستی رۆشنبیری دانیشتووانەکەی، بەتایبەت ئەو دایکانەی سوودیان لەپێناوی زانستیی تازە وەرگرتووە، وای لێکردوون ئارەزووی زێدە مندالی وەلابنێن و بەچەند مندالێک رازی بن. بەم پێیەش بتوانن پەروەردەیەکی خێزانی بەشێوەیەکی نموونەی دروست ئەنجام بدەن. بەلام لەژینگەی لادێدا هیچ وەلامێک بەدی ناکرێت بۆ پراکتیکردنی دیاریکردنی مندالبوون. چونکە تاکو ئێستاش دابونەریت و بەها کۆمەلایەتییەکان کاری پێدەکرێت و لەسەری دەرۆن.

بروانە خشتەی ژمارە (٣)

لەخشتەی ژمارە (٣)دا دەردەکەوێت، پێشخستنی هاوسەرگیری لەژینگەی لادێدا باوە. بەوەی کە تەمەنی دایکانی لادێ لەهاوسەرگیری لە ٢٢ سالی تێپەری نەکردووە. بەلام لەژینگەی شارستاندا بەرزترین تەمەنی هاوسەرگیری (٣١) سالە. ئەو تەمەنە گەورەیە بەشێوەیەکی رێژەیی لەژینگەی لادێ بەدی ناکرێت. بەلکو بچووکترین تەمەنی دایکایەتی لەلادێییەکان لەهاوسەرگیریدا لەو نێوەندە تەمەنەدایە (١٤-١٦) سال. لەبەرامبەر ئەوە تەمەنی دایکایەتی بەگوێرەی ژینگەی شارستان لەنێوان (٢٠-٢٢) سالیدایە. هۆکاری دواخستنی هاوسەرگیری لەژینگەی شارستانیدا بەرامبەر بەژینگەی

**خشتەی ژمارە (٢)**

**پراکتیك کردنی ئافرەت لەدیاریکردنی مندالبوون بەپێی ژینگەی نیشتەجێ روون دەکاتەوە.**

| ئایا ژینگەی نیشتەجێ دیاریکردنی مندالبوونی پراکتیك کردووە | بەلێ | ٪ | نەخێر | ٪ | کۆ |
|---|---|---|---|---|---|
| شارستان | ٣٦ | ٪٧٢ | ١٤ | ٪٢٨ | ٥٠ |
| لادێ | - | - | ٥٠ | ٪١٠٠ | ٥٠ |
| کۆ | ٣٦ | | ٦٤ | | ١٠٠ |

**خشتەی ژمارە (٣)**

**پەیوەندی نێوان برشت و تەمەنی هاوسەرگیری (زوو و درەنگ) بەپێی ژینگەی شارستان روون دەکاتەوە**

| تەمەن لای هاوسەرگیری بەسال | ژمارەی دایکان لەژینگەی شارستان | ژمارەی دایکان لەژینگەی لادێ | کۆ |
|---|---|---|---|
| ١٤-١٦ | - | ٠٦ | |
| ١٧-١٩ | - | ٤٠ | |
| ٢٠-٢٢ | ١٠ | ٠٤ | |
| ٢٣-٢٥ | ٢٢ | - | |
| ٢٦-٢٨ | ١٢ | - | |
| ٢٩-٣١ | ٦ | - | |
| کۆ | ٥٠ | ٥٠ | ١٠٠ |

لادێ بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، لەشار کچەکانیان دەنێرنە قوتابخانەو خۆشیان ئارەزوویان هەیە، بەرەو پێشەوە بچن و بەڵگەنامەی زانکۆ وەدەست بێنن و ژیانی کارمەندی ببێنن. سەرەڕای بەرز بوونەوەی ئاستی ڕۆشنبیریان و بیرکردنەوەیان لەوەی کە لەهاوسەرگیریدا سەرکەوتووبن و ئایندەی خێزان لەبەرچاو بگرن. بەڵام ئافرەتی لادێ ئەو لایەنانە بەنەفامی وەردەگرێ، تەنانەت گەر بچێتە قوتابخانەو لەخوێندنیش بەردەوام بێ و قۆناغی پێشکەوتووش ببڕێ یان واز لەقوتابخانە دێنێ گەر بەڵگەنامەی سەرەتایی وەرگرت. هەر لەتەمەنی بچووکییەوە شوو دەکا و پاشان ملکەچی دابونەریت و بەها کۆمەڵایەتییە باوەکان دەبێت و ئارەزووی منداڵی زۆر دەکات کە بەهۆی دەسەڵاتی باوک سالارییەوە، لەژینگەی لادێدا هەر باوی ماوە.

بڕوانە خشتەی ژمارە (٤)

لەخشتەی ژمارە (٤)دا دەردەکەوێت، کە ماوەی ژیانی هاوسەرگیری لەژینگەی لادێدا درێژترە بە بەراورد لەگەڵ ژینگەی شارستان، سەبارەت بەدایکان بەنموونە بەهۆی هاوسەرگیری زوویی لەلادێدا. هەڵبەتە ئەمەش کاریگەریی بەسەر ڕێژەی بڕشتدا دەبێت. لێرەدا سەرنج دەدەین کە ئەوپەڕی مام ناوەندی منداڵ لەدایکانی شارستان نزیکەی (٣) منداڵە، بەڵام لە دایکانی لادێدا دەگاتە (٨) منداڵ. لەسەر ئەم بنەمایە دەتوانین بڵێین: هەر چەند ماوەی ژیانی هاوسەرگیری درێژ بێتەوە، ئەوەندە ژمارەی منداڵ بەشێوەیەکی سروشتی زیاتر دەبێت، لەکاتێکدا گەربێتو دایک دیاریکردنی لەدایکبوون پراکتیک نەکات و گەر بەشێوەیەکی کاتیش بێت. هەروەها دایکانی شارستان جیاوازیان هەیە لەگەڵ هاوتاکانیان. دایکانی لادێ بەدوو تایبەتمەندی، (هاوسەرگیریی درەنگ)و (پراکتیک کردن)ی دیاردەی منداڵبوون لە ژنانی شارستانی جیا دەبنەوە.

### دەرەنجام

پاش ئەنجامدانی ئەو لێکۆڵینەوە مەیدانییە و پۆلینکردنی بەیاننامەو شیکردنەوەکانیان، گەیشتینە هەندێ دەرەنجامی زانستی بۆ زانینی پەیوەندییەکانی نێوان بڕشتی ئافرەت و ژینگەی نیشتەجێ، ئەویش ئەمانەن:

**خشتەی ژمارە (٤)**

**پەیوەندی نێوان ماوەی ژیانی هاوسەرگیری و ژمارەی منداڵ بەپێی ژینگەی نیشتەجێ**

| ماوەی ژینگەی هاوسەرگیری بەساڵ | ژینگەی شارستانی | | | ژینگەی لادێ | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| | ژمارەی دایکان | ژمارەی . منداڵ | مام ناوەندی منداڵ بۆ هەر دایکێك | ژمارەی دایکان | ژمارەی منداڵ | مام ناوەندی منداڵ بۆ هەر دایکێك |
| ١-٥ | ٦ | ٨ | ١٣ | ٠٤ | ١٢ | - |
| ٦-١٠ | ٨ | ١٦ | ٢ | ١٦ | ٥٢ | ٣ ٢٥ |
| ١١-١٥ | ١٨ | ٤٨ | ٢٦ | ١٢ | ٥٦ | ٤ ١٦ |
| ٢٦-٢٠ | ١٨ | ٥٠ | ٢٧ | ٤ | ٢٦ | ٦ ٥ |
| ٢١-٢٥ | - | - | - | ٠٦ | ٤٥ | ٧ ٥ |
| ٢٦-٣٠ | - | - | - | ٠٨ | ٦٤ | ٨ |
| کۆ | ٥٠ | ١٢٢ | ٠ | ٥٠ | ٢٥٥ | - |

١- لێكۆڵینەوەكە دەریخست، كەلێرەدا پەیوەندییەک لەنێوان رێژەی بۆشت و ژینگەی نیشتەجێ هەیە، بەوەی كەرێژەی بۆشت لای ئافرەتی لادێ بەرز دەبێتەوە.

رێژەی بۆشتی لەگوندی بەحركە، كە كۆمەڵگەیەكی لادێییە، گەیشتە (١/٥). بەڵام ئەو رێژەیە لەژینگەی شارستان دادەبەزێ، بەوەی لەناحیەی عەنكاوە كە بەكۆمەڵگەیەكی شارستان دادەنرێت، گەیشتە (٢/٤٤). هەر وەک لەو لێكۆڵینەوەیە دەركەوت، كە بەرزترین مامناوەندی ژمارەی منداڵ بۆ هەر دایكێک لەژینگەی شارستان گەیشتە نزیكەی (٣) منداڵ. بەڵام بەرزترین مام ناوەندی ژمارەی منداڵ لەژینگەی لادێ گەیشتە (٨) منداڵ.

٢- لەو لێكۆڵینەوەیەدا دەركەوت كە ژمارەی ئەو دایكانەی دیاریكردنی منداڵبوون لەژینگەی شارستان پراكتیک دەكەن لەوانەیە بگاتە (٣٦) یەكە لەكۆی (٥٠) یەكە، واتە بەرێژەی (٧٢٪). بەڵام لەژینگەی لادێ هیچ وەڵامێک بۆ پراكتیک كردنی دیاریكردنی منداڵبوون نەبوو.

٣- لەو لێكۆڵینەوەیەدا دەركەوت كە پێشخستنی هاوسەرگیری لەژینگەی لادێدا باوە، بەوەی كە بچووكترین تەمەنی دایک لەهاوسەرگیریدا لەتەمەنی (١٤-١٦)ساڵیدایە. بەڵام لەژینگەی شارستان هاوسەرگیری لەتەمەنی گەورەدا لە (٢٠-٢٢) ساڵیدا پێک دێت.

هەروەها لەو لێكۆڵینەوەیەدا دەركەوت، كە هاوسەرگیری درەنگ لەژینگەی شارستان باوە بە بەراوردكردن لەگەڵ ژینگەی لادێدا كە بچووكترین تەمەنی دایكان لەهاوسەرگیریدا لە (٢٠-٢٢) ساڵیدایە. بەڵام لەژینگەی شارستان گەورەترین تەمەن لە (٢٩-٣١) ساڵیدایە.

**پەراوێزەكان:**

١- فوزي سهاونة، مبادیء الدیموغرافیا، ص٧٥.
٢- طه حمادي الحدیثي، جغرافیة السكان، ص١٧٣.
٣- مكي محمد عزیز و ریاض السعدي، جغرافیة السكان، ص١٧٦.
٤- یونس حمادي علي، مبادیء علم الدیموغرافیا، ص١٠٧.
٥- احمد زكي بدوي، معجم العلوم الاجتماعیة، ص١٥٩.
٦- عبدالحسین زیني، الاحصاء السكاني، ص١٨٨.
٧-المصدر نفسه، ص١٨٨.
٨- عبدالله الخفاف و عبد مخور الریحاني، جغرافیة السكان، ص٣٢٢.
٩- د.عبدالمنعم عبدالحي، علم السكان، ص١١٠.
١٠- نتائج التعداد العام لسكان العراق، ١٩٧٧، ص٤٥، ١٩٨٧، ص٧٥.
١١- د.احسان محمد الحسن، موسوعة علم الاجتماع، ص١٤٠.
١٢- المصدر نفسه، ص٥٧٧.
١٣- احمد زكي بدوي المصدر السابق، ص٣٦٢.
١٤- د.احسان محمد الحسن، المصدر السابق، ص٥٥٥-٥٥٦.
١٥- د.عبدالمنعم الحي، المصدر السابق، ص١١٤.
١٦- سمیث. ث. لین، اساسیات علم السكان، ترجمة محمد سید غریب و فؤاد اسكندر، ١٩٧١، ص٣٣٤.

**سەرچاوەكان:**

١- د.احسان محمد الحسن، موسوعة علم الاجتماع، الدار العربیة للموسوعات، لبنان ١٩٩٩.
٢- احمد زكي بدوي، معجم العلوم الاجتماعیة، مكتبة لبنان، بیروت، ١٩/٢.
٣- طه حمادي الحدیثي، جغرافیة السكان، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥.
٤- سمیث، ث، لین، اساسیات علم السكان ترجمة محمد سید غریب و فؤاد اسكندر، طبعة الاسكندریة، ١٩٧١.
٥- عبدالله الخفاف و عبد مخور الریحاني، جغرافیة السكان، مطبعة جامعة البصرة، ١٩٨٦.
٦- عبد الحسین زیني، الاحصاء السكاني، دار المعرفة للطباعة، بغداد، ١٩٨٠.
٧- د.عبدالمنعم عبد الحي، علم السكان، المكتب الجامعي الحدیث، الاسكندریة، مصر ١٩٨٥.
٨- فوزي سهاونة، مبادیء الدیموغرافیا، الجامعة الاردنیة، ١٩٨٢.
٩- مكي محمد عزیز و ریاض السعدي، جغرافیة السكان، مطبعة جامعة بغداد، ١٩٨٤.
١٠- یونس حمادي علي، مبادیء علم الدیموغرافي، مطبعة جامعة الموصل، ١٩٨٥.
١١- نتائج التعداد العام لسكان العراق، ١٩٧٧، ١٩٨٧.

# عەشیرەتەکانی لیوای هەولێر

شوان محەمەد ئەمین خۆشناو

**عەشیرەتە نیشتەجێبووەکانی دەوروبەری هەولێر**

ا- **عەشیرەتی دزەیی:** ئەو عەشیرەتە لە گەورەترین عەشیرەتەکانی ناوچەی دەوروبەری هەولێرە، لە دەشتی هەولێر و کەندیناوە و قەراج بڵاوبوونەتەوە، بە کشتوکاڵ و پەروەردەکردنی ئاژەڵ خەریکن و لە چوار بەرە (فخذ) پێکهاتوون:

یەکەم: بەرەی برایمی بایزاغا.

دووەم: بەرەی ئەحمەدی پاشا.

سێیەم: بەرەی حاجی پیرداوداغا

چوارەم: بەرەی کاکە خان

ب- **عەشیرەتی گەردی:** ئەو عەشیرەتە لە گردەکانی نزیک هەولێر و دۆڵی بەستۆرە و ئەو دەشتاییەی لە عەنکاوەوە دەست پێدەکات، نیشتەجێن. بە کشتوکاڵەوە خەریکن، دەر دەکەوێ ئەوانە لە کۆیەوە هاتبن، چونکە لقێکیان لەوێدا هەیە، مەڵبەندەکەیان بەحرکەیە، کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی هەولێر.

ج- هەندێ عەشیرەتی بچووکتر هەن، یاخود لقێکن لە عەشیرەتەکانی دیکە و زێد و ناوچەکانیان جێهێشتووە، لەناوچەی دیکە نیشتەجێ بوون، ئەوانیش:

یەکەم: عەشیرەتی سیان، کە مەڵبەندەکەیان گوندی سەر بەشاخە.

دووەم: عەشیرەتی لەک، کە لە گوندی جەدیدەلەک و منارەن.

سێیەم: عەشیرەتی بندیان لە گوندی قورشاغلۆ.

چوارەم: عەشیرەتی گەلاڵی لە گوندی بێستانە و گردەسوور.

پێنجەم: عەشیرەتی مامەشین لە سەرگەران و ناوچەی کەندیناوە.

شەشەم: عەشیرەتی شەرەبۆتی لە گوندی دارە خورما و حەسەن بلباس.

حەوتەم: عەشیرەتی رۆژبەیانی لە گوندی میللیهۆرت و قەزای مەخموور.

هەشتەم: عەشیرەتی مام خولە لە گوندی دیبەگە و ناحیەی کەندیناوە.

نۆیەم: عەشیرەتی هورمزیان لە گوندەکانی ئیسماعیلاوە لە قەزای مەخموور.

دەیەم: عەشیرەتی سارمەمی لە گوندەکانی گۆمەشینی

ناحیەی قەراج.
یازدەم: عەشیرەتی مام زێندینی لە گوندەکانی کورتاندور و لە قەزای مەخموور.
دوازدەم: عەشیرەتی مەنتک لە گردۆڵکەکانی کۆتایی دەشتی هەولێر، لەناوچەی قوشتەپە بۆ تەق تەق.
سێزدەم: عەشیرەتی بزێنی لە گوندەکانی گاینج و کەورگۆسک، کە لقێکن لە عەشیرەتێکی سەر بە لیوای کەرکووک.
چواردەم: عەشیرەتی زراری • ناوچەی پیرمام لە دیوی زێی گەورەن.
- هەروەها چەند عەشیرەتێکی عەرەب هەن لەناوچەکانی شەمامک و گوێڕ نیشتەجێن، ئەوانەش بەرەیەکن لە عەشیرەتی (طی) تەی و چەند بەرەیەکن لە عەشیرەتەکانی (جبور) و (عبید)، جبور و عوبێد لەناوچەی قەزای مەخموور و لەسەر لێواری رووباری دیجلە.
**د- عەشیرەتی خۆشناو:** ئەو عەشیرەتە لە ناوچەکانی پیرمام و حەریر و خۆشناو (هیران) لە شەقڵاوە نیشتەجێن، دەبنە سێ لقی سەرەکی، ئەوانیش: میر یوسفی، میر مەحمەل و پشگەری. کە لە ناوچەکانی دەوروبەری چیای سەفین و ناحیەی شەقڵاوە و کۆیە و رانیە نیشتەجێن.
**هـ- عەشیرەتی سوورچی:** لە قەزا و ناحیەکانی شەقڵاوە حەریر و رواندز بڵاو بوونەتەوە، ناوچەکانی نێوان حەریر و باتاس و خەلیفان بڵاوبوونەوە و، ئەو عەشیرەتەش دەبنە دوو بەش: سورچی سۆران کە سەر بە لیوای هەولێرن و سورچی بادینان لە قەزای ئاکرێ و لیوای موسڵ نیشتەجێن، ئەو عەشیرەتە لە بەرەکانی (مام سال و خەیلانی)ن و هەندێکیان کۆچەرن.
**و- عەشیرەتەکانی بارزان:** لە ناوچەکانی سنووری عێراق، تورکیا نیشتەجێن. لە قەزای مێرگەسۆر و لەگەڵ عەشیرەتەکانی برادۆستی دراوسێن، دەبنە چوار لقی سەرەکی.
**ز- عەشیرەتەکانی برادۆست:** ئەو عەشیرەتە لە سێگۆشەی سنووری عێراقی، ئێرانی، لە ناوچەی سیدەکانی نیشتەجێن.
**ح- عەشیرەتەکانی هەرکی:** هەرکییەکان دەبنە سێ بەش: هەرکی مەندان لەناوچەی موسڵ و هەرکی سەرهات لە ناوچەی هەولێر و هەرکی سەیدان لە ناوچەی هەریر و باتاس، ئەو عەشیرەتە لە کۆچەرییەکانن، چونکە گەرمیان و کوێستان دەکەن، زستانان لەناوچە دەشتاییەکانن و هاوینانیش بەرەو چیا هاوبەشەکانی سنووری عێراق- ئێران رەوەدەکەن.
**ت- عەشیرەتەکانی ناو دەشت:** لەناوچەی رواندز بڵاو بوونەتەوە، کە باڵەکی سرێشمە و باڵەکی سەرگەلی دەگرێتەوە.
**ی- عەشیرەتی باڵەک:** لە ناوچەی باڵەک نیشتەجێن، کە لە گوندی ناوپردانی سەر رێگای حاجی ئۆمەران دەست پێدەکا تا کۆتایی سنووری عێراق- ئێران.

* اربيل في اربعة اعوام

# هۆزەکان

عەباس سلێمان سمایل

**هۆزی لەک:** لەک هۆزێکی گەورەی کوردە لە باشووری کرماشان لەتەک هۆزی کەلهوڕ جێوارن، بە شێوەیەکی جیا لە شێوەی کەلهوڕ قسە دەکەن، ژمارەیەکی زۆریان لە ناوچەی جیاجیای کوردستان بڵاوبوونەتەوە، هەندێکیان بە ڕەوەندی و کۆچەری و هەندێکیشیان دوای رووخانی کەریم خانی زەندبووە.

(لەک)ی دەشتی هەولێریش بەر لە (٢٥٠) ساڵ لە گەرەکی تەپەی (مەلا عەولا)ی شاری کەرکووک لەلایەن عوسمانییەکان دەردەکرێن.

لەکی دەشتی هەولێر چوار تیرەن: برایمی، سمایلی، خەمان و جەردیسی، لە ژمارەیەک لە گوندەکانی دەشتی هەولێر جێوارن.

ناوی لەکیش لە دوو پیتی (ل) و پیتی (ک) پێکهاتووە، (ل) کورتکراوەی (لوڕ)ە و (ک)یش کورتکراوەی (کورد) (کرمانج)ە، واتە لەک لە تێکەڵاوی هەرێمی لوڕ و کرمانج پێک هاتووە.

**کەلهوڕ:** کەلهوڕ هۆزێکی گەورەی کوردە لە بیست تیرە زیاتر پێک هاتووە، لەنێوان کرماشان، بەغداد، کووت و ئیلام بڵاوبوونەتەوە، هەندێک لە مێژوونووسان بیروبۆچوونی جیاجیایان هەیە لەوانە:

راو لینسۆن دەڵێت: کەلهوڕ هەر کالە (کالح - ناوی کۆنی ناحیەی نەمرد)ە، پایتەختی ئاشووریانە و گۆڕانی بەسەرداهاتووە. و یا (کالەه)ی ناوی کۆنی سەرپێل زەهاوە و گۆڕانی بەسەرداهاتووە دووریش نییە کەلهوڕ لە (کەڵ = مامز، ئاسک) هاتبێت، بەهۆی گورج و گۆڵی ئەم هۆزە، بێجگە لەمانە مێژوونووسان بەم جۆرە لە رەسەنایەتی کەلهوڕ دەدوێن:

هۆزی کەلهوڕ لە نەوەی (کیلهوری کوڕی گیو)ن، ناوەکانیشیان لەناو کیلهوڕی باپیرە گەورەیان هاتووە، کەلهوڕ لە، کەڵ (گەورە، سەرۆک)و هوڕ (لوڕ) پێک هاتووە، کە واتاکەی دەبێتە گەورەی لوڕان.

کەلهوڕ لە (کەڵوڕ) هاتووە بەم جۆرە: کەڵ (چیا، بەرد) + وڕ (لەکاری داخوازی بوڕ وەرگیراوە).

کە واتاکەی بڕین و تێپەڕکردنی چیا دەگەیەنێت، وشەکە بە تێکڕایی دەبێتە شاخەوان یا ئەوانەی کاری ئاگر کردنەوەیان کەوتبووە ئەستۆ لەسەر چیاکان، کەلهوڕ لە کەڵە ئاهورای هاتووە، واتە گۆڕانییە هەڵبژاردەکانی ئاهورا، چونکە ئەمڕۆ کەلهوڕ یا کەلوڕی چەند هەوایەکی یا ئاوازەکی (هۆرە)یە.

کەلهوڕ لە کەل (بەرز + هۆر= خۆر) هاتووە، کە واتای خۆری بەرز و پیرۆزی دەگەیەنێت، لەوانەشە ئەم هۆزە زەردەشتی یا خۆرپەرستی بووبن، دەوروبەری (٥٠٠) ساڵ لەمەوبەریش ژمارەیەکی زۆریان لەسەر ئایینی (یارسان) بوون.

ئەمڕۆش کەلهوڕ لە رۆژهەڵاتی کوردستان دەکرێن بە دووبەش:

١- شابازی.

٢- مەنسووری، هەریەک لەمانەش لە ژمارەیەک تیرە و هۆز پێک دێن.

ژمارەیەکیان لە گوندەکانی

دەوروبەری شـــاری هەولێـــر نیشتەجێن.

**نانەکەلی:** هۆزی نانەکەلی یەک لە هۆزە کۆنەکانی دەشتی هەولێرە. زێدی کـۆنیـان دینەوەر و بیلوارە و لەسەر مەزهەبی (حەقە)ن، نزیک بە زاراوەی کەڵهـوڕی قـسـەدەکـەن، هەندێک وای بـۆ دەچن، کــه نانەکەلی واتای هۆزانی گەرمێن یا ئەوانەی کە هاتووچۆی کـوێستـان دەکەن، کەچی هەندێکی دیکە وای بۆ دەچن نانەکەلی هەموویان ڕەوەند و کـۆچەر بوون و نانەکـەیان کـەل و پارچە کـردووە بۆ ئەوەی بیـانخـەنە تورەگەکانیانەوە، بۆیە پێیان وتوون نانەکـەلی. ژمـارەیەکـیش لەم هۆزە لەسـەردەمی زەندییـەکـان چوونەتە شیراز و ژمارەیەکیشیان بە کۆچەری و ڕەوەندی هاتوون و لـە دەشـــتی هەولێر جێواربوون.

**سنجاوی (سنجابی):** هۆزێکی کۆنی دەشتی هەولێرن، هەندێک لە مێژوونووسان بە بەشێک لە هۆزی زەنگەنەیان دەزانن و لە بنەڕەتەوە لە کرماشانەوە بۆ باشووری کوردستان هاتوون، کـەچی مـەلا جـەمـیل ڕۆژبەیانی دەڵێت هۆزی سنجاوی لە ناوی (سـەنگاو) هاتووە و کـاتی خـــۆی لە ناوچەی ســـەنگاوی چەمچـەمـاڵەوە چوونەتە ئێـران و پاشـان هەندێکیـان بە ڕەوەندی گەڕاونەتەوە.

ئەمـڕۆش ژمـارەیەکی زۆریان لە دەشتی هەولێر جێوارن، ناوەکەشیان ئەگــەر لە نـاوی شـــارۆچـکەی (سەنگاو) نەهاتبێت، ئەوا لە ناوی (سنجـاو، سنجـاب واتە سـمـۆرە) هـاتووە، بەهـۆی ئـەوەی جـــاران جلوبەرگـیـان لە پـیـسـتی سـمـۆرە دروست دەکرد.

**زەنگـەنە:** هـۆزی زەنـگـەنـە لـە مـایدەشتی کرمـانشـانەوە جێـوارن، هەروەها لە شـیـراز، خـۆراسـان، ئەفغانستـان و باشووری کوردستـان بەتایبەتی شاری بەغدا، کەرکووک، سلێمانی، هەولێر جێوارن.

هەندێک وای بۆدەچن کـە ناوی زەنگەنە لە ناوی پاڵـەوانی کـەیانی (زنگە) یا (زنـگنە) هاتبـــێت، هەندێک لەم هۆزە خـۆیان بە نەوەی ئەم پاڵەوانە دەزانن.

نـاوی زنـگـەی پاڵـەوانیـش لـە مـێژووی تەبەری بە شـێـوەی (زندە کـــوڕی ســـابریغـــان) هاتووە، لە داسـتـانە ئێـرانییـەکـانیش ناوی بە زنگە کـوڕی شـاوران (شـاپۆران) هـاتـووە، هـەنـدێـکـی دیـکـە وای بۆدەچن زەنگەنە لە شاری زنجـانەوە ئاوارە بووبن و ناوەکەشیان لە ناوی شاری زنجانەوە هاتووە.

**باجەلان:** باجـەلان بە تێکەڵاوی لە چەند گـوندێکی دەشـتی هەولێـر جێوارن: گوندی گرد قۆشەنەی قەراج گوندێکی هۆزی (باجەلان)ە.

بیروڕای جیاجیا هەیە دەربارەی ریشـــەی ئەم هۆزە، هەنـدێک لە مـێژوونوسـان وای بۆدەچن، کـە لە باکووری کـوردستـانەوە کۆچیان پێ کرابێت، هەندێکیش بە بەشـێک لە هۆزی زەنگـەنـەیان دەزانـن و زێدی کۆنیشـیان ناوچەکانی سەر سنوری ئەمـڕۆی عـێـراق و ئێـرانە، هەر لە هورینەوە تا دەگـاتە مـەندەلی و لە ڕۆژهەڵاتی کوردستـانیش لە زەهاو و جوانڕۆ و کرند جێـوارن، ژمارەیەکی زۆریشـیـــان لە (بازوایا)ی نزیک شــــاری مـــوسـڵ جـــێــــوارن، هەندێکیشـیـان لە دەشـتی هەولێـر، ژمارەیەکیشیـان بۆ ئوستانی قەزوین ئاوارەکراون.

بەڕێز مـەلا جـەمـیل ڕۆژبەیانی دەڵێت: ناوی باجەلان لە بادگلانەوە هاتووە، واتە ئەوانەی خانوو لە قوڕ دروست دەکـەن، هەندێکیش دەڵێن لە نـاوێـکی تورکی بـاج + ئـالان (وەرگـرتن، لێـسـتـاندن) هاتووە، دیارە کـاتی خـۆی ئەم هۆزە باج و سەرانەیان لە دانیشـتوانی ناوچەکە و دەوروبەری وەرگـرتووە، هەنـدێک لە پسـپـۆرانی زمـانیش دەڵێن: ئەم ناوە لە دوو برگـــەی (باج + لان) پێک هاتووە، باج یا واج یا ڤـاج، وشـەیەکـە لە ئاوێسـتـا بە واتای قسەو گفتار هاتووە و لە پەهلەویش بووەتە ڤا، برگـەی (لان)یش واتای جـێگای خـوداپەرستێ دەگـەیەنێ، کەواتە باجەلان واتای خوداپەرستی لە پەرســـتگە یا خـــوێندنەوەی ســــروودی ئـاییـنی بـەبێ دەنـگ

دەگەیەنێت.

**كاكەیی:** كاكەیی بریتییە لە كۆمەڵە هۆزێک، خاوەن ئایینێكی كۆنی كوردن، زێدی كۆنیان، ناوچەكانی نێوان سنە و كرماشان و هەمەدانە، لەوانە بەشێک لە هۆزانی كەڵهوڕ و سنجاوییە، هەندێ لە مێژوونووسەكان وای بۆدەچن كە (كاواز كوڕی فەیرۆز) دامەزرێنەری میرنشینی شارەزوور كاكەیی بووە و بابا ئەردەڵانی دامەزرێنەری ئیماراتی ئەردەڵانیش كاكەیی بووە.

جا دوای ئەوەی ئیمارەتی شارەزوور و ئەردەڵان لەناودەچن ژمارەیەكی زۆری كاكەیی لە زێدی خۆیان ئاوارە دەبن، دوای نەمانی ئیمارەتی (بابان)یش ژمارەیەكی دیكەیان لێی ئاوارە دەبن، هەندێكیان دەگەنە شەمامک و دەوروبەری رووباری خازر و شارۆچكەی تەلەعفەر.

كاكەیی هەرچەندە لە ژمارەیەک هۆزی لوڕ و گۆران پێكهاتووە، بەڵام من وای بۆ دەچم كاكەیی لە بنەڕەتدا گەلی كۆنی كوردستان (كاكۆیی) بن، كە بەناوی خواوەندەكەیان (كاش - كاشی یا كاسی) ناسراون.

كاكەیی لە دەشتی هەولێریش لە گوندی سفەیە و مەتراد جێوارن، جاران لە گوندی (سوورێژە و مەلاعومەر و فەتحاوە)یش جێواربوون.

**جاف:** هۆزێكی بڵاوی ئەم دەشتەیە، بەر لە (٣٠٠) ساڵ گەڕۆک بوون لەسەر سنووری ئێران و عێراقی ئەمڕۆ، شاری جوانرۆ ناوەندی سەرەكییان بووە.

هورمزیار: هورمزیار بریتی بووە لە كۆمەڵە هۆزێكی زەردەشتی لە ناوچەكانی ماكۆ و سنووری ئەرمینیا و بایەزید، هاوسێی هۆزی گەلالی (جەلال) بوون، ئەم هۆزانە كاتی خۆی واتە بەرلەوەی ببن بە ئیسلام، هەریەكە ناوێكی هەبووە، بەڵام دوای ئەوەی دەبن بە ئیسلام، هەموویان دەڵێن هورمزیار واتە پێرانی خودا، خوداپەرستان، خۆشەویستانی خودا، ئەوانەی لەسەر ئایینی زەردەشتی بوون، دووریش نییە بەرلەوەی ببن بە ئیسلام هەر هۆزێک لەم هۆزانە جگە لە ناوەكەی خۆی هورمزیاریشیان پێ گوتووە.

جا دوای ئەوەی لێكۆڵینەوە روون بووەوە، ئەم هۆزە لە ساڵی (١٥١٤) واتە دوای هەڵگیرسانی جەنگی نێوان سەفەوییەكان و عوسمانییەكان لەگەڵ بەشێک لە هۆزی گەلالی (گەراری) و چەند هۆزێكی دیكە كە بۆ خۆرەسان گواسترانەوە، ئاوارەكانی رۆژهەڵات و باكووری كوردستان ئێستاكە بوون، ئەوانەی ئاوارەی رۆژهەڵاتی كوردستان بوون، لە ناوچەكانی بۆكان و میندواو و سەقز و دیواندەرە و ناوچەكانی نێوان قەسری شیرین و ئیلام نیشتەجێ بوون و ئەوانەی كەوتنە باكووری كوردستان بە پەرتوبڵاوی لە ناوچەكانی ئورفە و دیلۆک (غازی تەپە) نیشتەجێ بوون و لەنێو هۆزانی دیكە توانەوە.

بەڵام ئەوانەی لە ناوچەكانی سنە و سەقز و دیواندەرە نیشتەجێ بوون، بوونە سوننە و ئەوانەی چوونەتە ئیلام و بەدرە و جەسان بوونەتە شیعە، زیاتر لە (٣٥٠) ساڵیش دەبێ شەپۆڵ شەپۆڵ یا تیرە تیرە لە رۆژهەڵاتی كوردستانەوە هاتوونەتە ناوچەكانی باكووری خانەقین و قەزای كفری و بتوێن و دەشتی دزەیی و گوندی تۆبزاوەی كەركووک، تیرەیەک لەم تیرانە لەنێو رەگەزی توركمانی توانەوە و بە زمانی توركمانی قسە دەكەن و پێیان دەڵێن (هورمزی).

هەروەها بە شێوەی ماڵ و دوو ماڵ و گوندەک و دوو گوند لە زۆربەی ناوچەكانی كوردستانی عیراق دەبینرێن وەک سلێمانی، رانیە، شەبەكستان (ئامدان).

ژمارەیەكیشیان لە ناوچەكانی نێوان قەزای كفری و زنجیرە چیای حەمرین لە بۆتەی رەگەزی عەرەب تواونەتەوە. هورمزیارەكانی ئێران دوو تیرەن:

١- هورمزیاری زێرینە ٢- هورمزیاری دەرەسەر، هەروەها (وەرمزیار)یشیان پێ دەڵێن،

بەشێک لە هۆرمزیارەکانی ئێرانیش لەگەڵ هۆزی (گەڵباخی) دەژین.

هۆزی هورمزیار لە دەشتی دزەییش لە چەند تیرەیەک پێکهاتووە و لە هۆزە کۆنەکانی ناوچەکەش دەژمێردرێن، بەڵام ئەم تیرانە بە هیچ جۆرێ نازانرێ لە کوێوە دەگەنە یەکتر، تەنها ئەوە نەبێ، کە هەندێکیان لەم (١٥٠) ساڵەی دوایی لە بیتوێنەوە هاتوون، کۆنترین هەواری هورمزیاران لە دەشتی هەولێر گوندی (قورشاغلو و سۆربەش و سمایلاوە و بیراوە) بووە، کە یەکێک لەم بنەماڵانە بە بنەماڵەی (ئەحمەد ئاغا یا سوراحی) ناسراوە.

بە قسەی (خدر شیرین) ناوێک، کە دانیشتووی گوندی سۆربەش بووە، تەمەنی لە (١٢٠) ساڵ تێپەڕ کردبوو، پیاوێکی زیرەک و تێگەیشتوو و جیهان دیدەبوو، لە ساڵانی پەنجا واتە بەر لەوەی کۆچی دوایی بکات، بەردەوام سەربردەی مێژوویی بۆ خەڵکەکە دەگێڕایەوە، جا بەم جۆرە باسی لە بنەماڵەی سوراخی کردووە: بەرەبابی سوراخی دەگەڕێنەوە سەر نەوەی (ئەحمەد ئاغا)، ئەم پیاوە بەخۆی و دوو ئامۆزای لە ئێران هاتوون و لە گوندی سۆربەش جێوار بوون، بەڵام هەردوو ئامۆزاکەی بەجێیی دێڵن و یەکێکیان دەچێتە توێزاوە و ترکەلانی کەرکوک و ئەوی تریش تا ئەمڕۆ نەزانراوە رووی لە کوێ کردووە، بەڵام بە دووری نازانم هورمزیارەکانی گوندی وەرمزیاری بەدرە و جەسان نەوەی ئەو کەسە بن).

خدر شیرین دەڵێ: کاتێک شەڕ و ناخۆشییەکی زۆر لە ئێران بەرپا دەبێ، زۆر تیرە و بنەماڵە ئاوارەی ئەم دیوە دەبن، ئەم سێ هورمزیارەش دێنە دەشتی هەولێر و کاولگەی گوندی سۆربەش ئاوەدان دەکەنەوە، بەڵام تەنها (ئەحمەد ئاغا) ژن و منداڵی هەبووە، لە سۆربەش دەمێنێتەوە دوای ئەوەی حکومەتی عوسمانی (ئەحمەد ئاغا) دەکوژێ دوو ئامۆزاکەی دیکەی، کە خاوەن ژن و ماڵ و نەبوون گوندی سۆربەش بەجێ دێڵن، بەڵام نەزانراوە حکومەتی عوسمانی لەبەرچی (ئەحمەد ئاغا)ی کوشتووە، ئینجا نەوەی (ئەحمەد ئاغا) زۆردەبێ و تا دەبنە بنەماڵەیەک لەم گوندە، ئەمەش بەشێک لە سەرجەلەی ئەم بنەماڵەیەیە: ئەحمەد ئاغا چەند کوڕێکی هەبوون، گەورەکەیان ناوی سلێمانی باباگەورە بووە، ئەویش چوار کوڕی هەبووە بەناوی خدر، مەحمود، حەمەد، حەمەدەمین، حەمەد دوو کوڕی هەبووە یەکێک چووەتە کەرکوک، ئەوی دیکەش ناوی قادر بووە هەر لە سۆربەش دەمێنێتەوە بە قادر سوراحی دەناسرێت.

**سیان:** لە چوار تیرە پێکهاتووە: (دەم سۆری، گون تووله، سورمی، شەمزینی). سیان هۆزێکی گەورەیە لە زەوییێکی پان و پۆری نێوان دەڤەری دیبەگە و پردێ و کاڤاری دووبز جێوار بوون، گوایە دەڵێن سەدان ساڵ لەمەوبەر سێ خێزان بە کۆچ و کۆچبار لە ناوچەی شەمزینانی تورکیاوە کۆچ و کۆچباریان تێکناوە تا لەم ناوچەیە گیرساونەتەوە، لە گوندەکانیان جاستان - پۆریجە - قوچە سپیلکە - غەرابە - سەربەشاخ - دەربەند - گابەرەکە - بیرەبات - دۆرەزە... لە پیاوە ناودارەکانیان (ئۆمەرە خێڵ) و کاخدرن.

**مامەسێنی:** هەندێ بیرباوەڕ هەر بە تیرەیەک لە هۆزی سیان دەیانژمێرن، کەچی هەندێکی دیکە دەیانبەنەوە سەر هۆزی (مەمسانی لوڕ)، گوایە لەسەر کەنداوەوە هاتوون و لە پاڵ هۆزی سیان گوزەرانیان کردووە، لە گوندەکانیان: سەرگەڕان - عالا - عەبدوللا گوجیلان.

**بن دیان:** بن (نەوە) + دیان (خاوەن پەرتووکی ئاسمانی گاور) نەوەی دیانان، بریتییە لە چوار تیرە (ناسری - حەسەنی - بەکری - شێخ ئاودەلی). دەگێڕنەوە دەوروبەری (٣٠٠) ساڵ لەمەوبەر دووبرای گاور (دێژەن) بەناوی (یەلدا و جەلیل) لە دیاربەکرەوە

دێنە گوندی هەرمۆتەی کلدانیـان، نزیک کـاڤـاری کـۆیە و مـاوەیەک دەمـێننەوە، جـا بە هەر هۆیەک بێ ئەوێ بەجێ دێلـن، یەلدا روو لـە دەشـتی هەولێـر دەکـات و دەبێـتـە مـوسلـمـان، ناوی خـۆشی دەکـاتە (عەبدوللا) و هەر لەوێ ژن دێنێ و نەوەی هۆزی بن دیانانی لێی بەپاش دەکـەوێت، گلکۆکـەی لە گـوندی (بەرەکـە)ی سـەر بە دەڤـەری خۆشناوەتییـە و پێی دەلێن چاکی (شێخ ئاودەل) (شێخ عـەبدوللا)، خـەلکی ناوچەکـە نەخـۆشی دەبەنە سـەری، بەتایبـەتی منداڵان بۆ چاکبـوونەوەیان، لە گـوندەکـانیـان: دووکەلە و ئازی کەندە...

بەلام براکەی تری جەلیل دەچێتە شـاری مـوسل، لەوێ دەبێـتـە موسلمان و ئێستا هۆزێکی بەناوی جەلیلی لێی بەپاش کەوتووە.

فـەقێ مـەرکی: هۆزێکی کـۆنی ناوچەکەیە، لە کۆندا لە گوندەکانی سـەر رووباری گـەورە و رووباری دیجلە دانیشـتـوون، کە دەکـەوێتـە خـوارووی دەڤـەری گـوێر، لە گوندەکانیان: گامێش تەپە - هەوار غـەر - کـوشاف، ئەم ناوە لە فـەقێ مـەرگی هاتووە، دەبێت کـاتی خۆی لە مەرگە و پشدەرەوە هاتبن.

**ئۆمـەریل:** هۆزێکی گـەورە و کۆنی دەشـتـەکـەیە، لە گوندەکـانی شەمامک و کەندێناوە - ملکیـە و قـەراج بـلاوبـوونـەتـەوە، لـە گـونـدەکـانیـان: تیـمـار - تۆبزاوە - گـردەشـینـە - دوو گـردکـان - گردەرەشەی گەورە.

**گەراری (گەلالی):** دەگـەرێنەوە سـەر هۆزی گـەلالی، کـە لە دەوری ٤٠٠ - ٥٠٠ سـاڵ لەمـەوبەر، بەهۆی جـەنگەکـانیـان لەگـەڵ سەفەوییەکان و سولتان سەلیمی عوسمانی پەرگەندەی ناوچەکانی کـوردسـتـان و ئێـران دەبن، واتە لە ناوچەکـانی بایەزید و مـاکـۆ و سەر سنووری سـۆڤـیـەت هاتوون، لە گـوندەکـانیـان لە دەشـتی هەولێـر شێخان - پوونگینە - مەلاکاغە - هەمزەکۆر.

**سـارمـەمی:** هۆزێکی کـۆنی دەشـتی هەولێـرن، بەپێی هەندێ بیروباوەڕ تیـرەیەکن لە هۆزی فـەقێ مـەرکیـان لە گوندەکانیـان: مشار - مـحـێـجـیلە - وادی غـوراب بەشێکیـان لەسەر ئایینی ئێزیدین و لە کۆمەلگای مەهەد جێوارن.

**سـازەیی:** هۆزێکن لە سـالح ناوێکەوە بەپاش کـەوتوون، بەلام روون نییـە، کـە سەر بە چ هۆزێکن سـەرەتا لە ناوچەی (شـوان)ی کـەرکـوکـەوە چوونەتە دەشـتی هەولێـر، لە گوندەکانیـان: ماجد - مەلاقەرە... هتد.

**پالانی:** لەوانـەیە لـە بـنـەرەتا پەهلەوی بن، وشـەکـە سـواوە و بووە بە پالانـی، لە ناوچەی زەنگابادی باکووری دەڤەری جەلەولاوە هاتوون.

لە گوندەکـانیان لە دەشـتی هەولێـر: پالانیـان، ژمارەیەکی زۆریشـیـان لە کـاڤـاری مـەخـموور جێـوار بوون، گـەڕەکـێکیـان لەو شـارۆچکەیە بەناوی پالانیان هەیە.

**سـورچی:** هۆزێکی زۆر و بلاون لە دەشتی هەولێر و دەشـتی هەریر و ناوچەی بادینان، ئێـزیدییـەکـان دەلێن: سورچی کاتی خۆی ئێزیدی بوون.

تیـرەکـانی سورچی لە دەشـتی هەریرێ، ١- مـارەباس (کـەلەکینی سـەرچیا - خـرێ) ٢- مـام سـار (هەریر و باتاس) ٣- وسـوکـاکی (گوندی ئامۆکان) ٤- کلومەکۆیان (دەڤەری هەریر)، تیرەکانی سورچی لـە بادینـان، ١- مـام گـرد گـوندەکـانیـان (سـوسناوە و پێسـمـەکـەر) ٢- مـام ردس ٣- نەقـەبی. تێبینی ئاری کـوتکی: تیـرەیەکن لە هۆزی سـورچیـان لە دەشـتی هەولێـر، لە گـوندەکـانیـان: کەندار، گاوەرە.

**مەنتک:** بریتییە لە سێ تیرە: چاربۆت، چاوکـول، ئاری. ئەم هۆزەش سەر بە سورچین، سەرەتا لە گـوندی (جـۆلەمـێـرگ)ی ناوچەی خەلیفانەوە چوونەتە هەرەتی هەرەجە و دەشتی کۆیێ، ژمارەیەکی کەمیان لە دەشتی هەولێر دەبینرێن.

**شێـروانی:** سـەرەتا لە کـاڤـاری شـێـروان مـەزنەوە هاتوون، لە گـوندەکـانیـان: گـردگـراوی،

دارەخورما.

**مەمووندی:** سەرەتا لە ناوچەی مەمووندی نێوان چیای سپیلک و گوندی سیساوە لەسەردەمی حارساغا گوێزراونەتەوە بۆ ناو شاری هەولێر و دەوروبەری و ئێستا خاوەن موڵک و ماڵێکی زۆرن لە هەولێر و گوندەکانی دەوروبەری شار لە گوندەکانیان: چالووک.

**بلباس:** هۆزێکن لە رانیە و قەلادزەوە هاتوون، پەرتوبلاون، ئەم تیرانەش هەر سەر بە هۆزی بلّباسن: ئەحمەد ئارکە، پیّوە، گوربەسەری، موخانە، مەلازادە، موغبایزە.

**رۆژبەیانی:** سەرەتا لە ناوچەی (داقوق)ەوە هاتوون.

**شێخانی:** هۆزێکی لە بنەڕەت ئێزدین لە کاڤاری شێخانەوە هاتوون و لە دەشتی کۆیە ئاکنجین و بوونەتە موسڵمان، بە پەرتوبلاوی لە دەشتی هەولێر دەبینرێن.

**موغ بایزی:** هۆزێکی بچوکن دەگەڕێتەوە سەر هۆزی بلباس، لە گوندەکانیان: توورەق.

**مەغی:** کاتی خۆی لە موکریانەوە هاتوون، لە گوندی سەردەشتێ لە دەشتی هەولێر نیشتەجێ دەبن.

**چۆغە رەشی:** لە گوندی چۆمە زەردەلە دادەنیشن.

**هەروتی:** سەرەتا لە ناوچەی هەریرەوە، لە گوندەکانی دەشتی هەولێر پەرتوبلاون.

**بۆری:** هۆزێکی کۆچەر بوون لە باکووری شەقلاوە، لە دەشتی هەولێر پەرتوبلاون.

**هەمبانە زەرد:** هۆزێکن سەر بە هۆزی هۆرمزیار لە گوندی سات و قەرا و دەشتی کۆیە دادەنیشن، لە گوندەکانی ملکیە بە پەرتوبلاوی دەبینرێن.

**گۆران:** هۆزێکن لە ناوچەی گۆرانی ئاکرێوە هاتوون، لە گوندەکانیان: کەلەشخان.

**گەردی:** هۆزێکن سەرەتا لە کوردستانی تورکیاوە هاتوون و لە باکووری شاری هەولێر جێواربوون وە پاشانیش هەندێکیان هاتوونتە دەشتی ملکیە، کەندیناوە، دەڤەری دیبەگەش هەر خۆیان ئاوەدانیان کردۆتەوە.

**زراری:** تیرەکانی ئەم هۆزە: مارە پیربار - توخمی باسی - مارە ڕەش - توخمی رەشاغەی.

هۆزێکن سەرەتا لە گوندەکانی شانەدەری ناوچەی بارزانەوە هاتوون، لە باکووری چەمی بەستۆرە ئاکنجینە و بەشێکی زۆریشیان لەوێوە دەچنە دەشتی دزەیی و ناوچەی شەبەکان.

**مەرزان:** هۆزێکی کۆنی دەشتەکەنە لە گوندەکانیان قەراتە سۆران، زمارە، ئێدی قزلەر... بەشێکیشیان لە گوندەکانی کۆیە نیشتەجێن.

**بامەند:** هۆزێکی کۆنی ناوچەکەیە، دەگەڕێتەوە سەر هۆزی فەقێ مەرکی لە گوندەکانیان: چاربەردە، قەراتەسۆری بامەندان.

**کۆلە:** (واتە خزمەتچی ناوماڵ) تیرەیەکن سەر بە هۆزی بامەندان، بە خزمەتچی ئاغا ناسراون لە گوندەکانیان (قەپران).

**کاروان:** هۆزێکی کۆنی دەشتەکەن زۆربەیان لە کاڤاری مەخموور ئاکنجینە.

**پووەکە سەری:** هۆزێکی کۆنە، لە گوندەکانیان: داڵداغان - سۆربەشی هەمزەی - کونە قیر...

**رەبات:** لە ناوچەی (رەبەت - رەبات)ی رۆژهەلاتی کوردستانەوە هاتوون، لە دەشتەکە پەرتوبلاون.

**بنەماڵەی کەریم مامزد:** هۆزێکی (گورج)ینە و لە گورجستانەوە هاتوون و لە دەشتی هەولێر دادەنیشن و کەریم مامز خۆشی لە گوندی قورشاغلو دادەنیشێ.

**کوردە:** تیرەیەکە لە جاف لە گوندەکانی ناو زورگی دێدەوان نیشتەجێن.

**بەرزنجە:** زۆربەی مێژوونوسان هۆزی بەرزنجە دەبەنەوە سەر جووتە برا، بەناوی (عیسا - موسا)، کە لە ناوچەی هەمەدانەوە دێنە ناوچەی هەڵەبجە.

ئاغای ناوچەکە ناوی خالد ئاغا بووە، کە دەزانێ جووتە برایێکی ئایینپەروەر هاتوون، ئەویش بە سواری فیلێک بۆ لایان دەچێت و دەیان حەوێنێتەوە و خانوویێکی لە

دار دروست كراویان دەداتێ و كچی خۆشی پێشكەشی (موسا) دەكات. دوای ئەوە موسا دەچێتە ناوچەی ئاغجەلەر بۆ مەلایەتی و ماوەیەك لە ناوچەی ناوبراو دەمێنێتەوە پاشان دەیەوێ بگەرێتەوە بۆ بەرزنجە، خەڵكەش زۆر هەوڵ دەدەن كە جێیان نەهێلێ. كە دەزانن شێخ سوورە لە رۆیشتنی و نەگەرانەوەی ئینجا دەیكوژن و دەڵێن كەوابێ ئەگەر بیكوژین هەر هیچ نەبێ گۆرەكەی لێرە دەمێنێتەوە، بەم جۆرە كوشتیان و لەلای خۆیان زۆر بەرێزەوە شاردیانەوە. براكەی (عیسا) كە بەم هەواڵە دەزانێ دێتە ئاغجەلەر و براژنەكەی دەباتەوە و لە خۆی مارە دەكات (موسا هیچ منداڵی لێ نەبوو)، ئینجا عیسا (١١) كوری لێ دەبێت و دەتەنێتەوە، ئەم هۆزە مەلایەتیان لە زۆربەی ناوچەكانی باشووری كوردستان كردووە و چەند دەستەیەكیشیان لە رۆژگاری جیاجیا هاتوونتە دەشتی هەولێر، یەك لەم چینانە بنەماڵەی (شێخ عەبدولكەریم) بوو، كە باوكی ناوی (سەید ئەحمەد) بووە، ماوەیەك لە گوندی گۆمەشینی سارمەمیان ماوەتەوە، كاتێ ویستوویەتی بگەرێتەوە سلێمانی، بەڵام لەبەر ئەوەی خەڵكەكە زۆریان خۆش ویستووە نەیان هێشتووە. ئەویش گوتوویەتی ئەگەر دەتوانن بریارم لە كاكە ئەحمەدی شێخ بۆ وەربگرن، ئەوا دەمێنمەوە! ئەوانیش بە كاكە ئەحمەدی شێخ رادەگەیەنن و دەڵێن ئەگەر رێگا بدەی با سەید ئەحمەد لای ئێمە بمێنێتەوە.

لەپێش ئەم سەید ئەحمەدە، سەید ئەحمەدێكی دیكەمان لابووە، بەڵام لەگەڵمان باش نەبووە و بەجێی هێشتووین و دووعاشی لێ كردین، ئینجا كاكە ئەحمەدی شێخ دەڵێ باشە رێگام دا لەلاتان بمێنێتەوە، ئەگەر باش نەبن لەگەڵی من و سەید ئەحمەدیش دوعاتان لێ دەكەین ئەوا دەبێتە دوعای سێ سەید ئەحمەدان، ئینجا سەید ئەحمەد لە گوندی ناوبراو دەمێنێتەوە و راژەیەكی باش بە خەڵكی گوندەكە دەگەیەنێت.

**كارەش:** دەڵێن ئەم هۆزە كاتی خۆی لە رۆژئاوای شنۆ و تا دەگاتە سیدەكان بە پەرتوبڵاوی دەژیان و پێڵاوەكانیان لە چەرمی گای رەش بووە، بۆیە بە كارەش دەناسرێن، لەم دەشتە لە گوندی گەزنە دادەنیشن.

**بنەماڵەكانی ناو شاری هەولێر:** بنەماڵەكانی ناو شاری هەر هەمان هۆزەكانی دەوروبەری شارن، هەر بنەماڵەیەك بە پیشەیەك ناسراوە، وەك دەباغ - قەساب - لەبەر ئەوەی شاری هەولێر لە كۆنەوە بنكەیەكی عوسمانیان بووە، بۆیە زۆربەیان بە توركی قسەیان كردووە. عەنكاوەش ئاسووری لێ ئاكنجین، سەرەرای جوولەكەیەكی زۆریش لە شاردا گوزەرانیان كردووە... بەڵام گشتیان بەرەو فەلەستین كۆچیان كردووە. تەنها ماڵی حاجی موراد نەبێ بوون بە ئیسلام و لە هەولێرمانەوە.

ئەمەش ناوی بنەماڵەكانە: سەرداری - مەلا فەندی - بنەماڵەی لێورەش - یەعقوب ئاغا - عوزێری - حەیدەری - سەید ئەحمەدلی - سۆفی حەسەن - وەیسی ئاغا - عەبدوڵلا نەقیب - هارو ئاغا - چاوشلی - دەباغ - پیرەبابی - دوغرمەچی - بەیرەقدار - خەزنەدار - بنەماڵەی عالم - حاجی عومەر - حەماو - خەیات - ئال جوامێر - موختار - سێ بنەماڵەی بەناو قەساب، هیدۆش - زمۆ - دوو بنەماڵەی بەناوی قازی - بەرزنجی - خانەقا - نەقشبەندی - چیچیو - گورجی - سەید خەنجەر - خۆرەسانی....

**شێخانی بەرزنجی:** ئەم هۆزە سەرەتا لە گوندی (شێخان)ی سلێمانییەوە هاتوونتە گوندی (ئاومار)ی ناوچەی (تەق تەق) ئینجا لە ئاومارەوە هەندێكیان دێنە گوندی (كەور)ی نزیك ناحیەی كەلەكی ئەمرۆ و پاشان بەنێو گوندەكانی دەشتی هەولێر بڵاودەبنەوە.

**پیرە بابی:** هۆزێكی گچكەن لە دەشتەكە بڵاون.

**مهاجر:** مهاجر ئەو شكاكەن كە

دوای جەنگی یەکەمی جیهانی لە دەشتی هەولێر بڵاوبوونەوە.

**هۆزی دزەیی:** ئەم هۆزە لە بنەڕەتا دەگەڕێنەوە گوندی (دزێ)ی (ورمێ)و، دەوروبەری (١٥٠) ساڵ دەبێ هاتوونتە ئەم دەشتە و بەهۆی سیاسەتمەندی خۆیانەوە لەگەڵ عوسمانییەکان ڕێککەوتن، پاشان بەهۆی ئینگلیزەکان توانیان ئاغایەتی لە دەشتەکەدا بکەن.

**گەردوان:** تیرەیەکی سەر بە ئاکۆن، لە گوندی میرخوزار نیشتەجێن.

پەراوێز

(فیلد)ی مێژوونوس دەڵێ هۆزی مەمەسانی کە لە (نورئاباد، ئەردەکان) جێوارن، بریتین لە سێ تیرە: بەکیش، جاوید، روستم، عشایر مرکز ایران ص١٤، د. جواد.

- هۆزێ بەناوی سالحی لە ناحیەی سەعدیە جێوارن، هەندێکیان خۆیان بە کورد دەزانن، هەندەک بە تورکمان، جا دوور نییە ئەمانەش سەلەیی بن.

- هۆزی ئۆمەر گەرمیان و بلی دەشتی هەولێر دەگەڕێنەوە سەر هۆزی گەورەی ئۆمەری باکووری کوردستان.

هۆزی گەلالی، سەرەتا (سوڵتان سەلیم) ئەم هۆزەی گواستۆتەوە بۆ شاری بەغدا و لەسەر گردۆلکەی بەرامبەر مەیدان جێواری کردوون.

ئێستاکەش کۆلانێک لەسەر ئەم گردە هەیە بەناوی (دربونە الجلالیین)، پاشان ئەم هۆزە بۆ شاری کەرکووک دەگواسترێنەوە و پاشان بە باشووری کوردستان بڵاودەبنەوە. ناوی گەلالی لە دوو برگەی گەل (کەل، بەرز + ئالی) پێکهاتووە.

- لەو هۆزانەی کە تواونەتەوە لە بۆتەی رەگەزی عەرەب، هۆزی (دلێمی)یە، خۆیان دەڵێن ئێمە لە بنەڕەتا (گۆران)ین جا پەیوەندی هۆزی گۆرانی ئاکرێ و دلێمییەکان زۆر کۆنە لە سەدەکانی دوای فەتحی عێراق ناوی کوردی لەناو ئەم هۆزەدا زۆر دەبینرێت وەک: خەسرۆ، شازان، بەهرام....

- هۆزێک بەناوی (جوران) لە بەهرز و کەنعان و باقوبە نیشتەجێن، خۆیان دەڵێن ئێمە عەجەمین، واتە ئێرانین، هۆزی (قەرغول)یش کە بە تیرەیەک لە (شەمر)ی عەرەب ناسراون و لە بەغداد نیشتەجێن، کاتی خۆی سوڵتان مورادی یەکەمی عوسمانی ئەوانی لە ئەرزەڕۆم گواستۆتەوە بۆ شاری بەغداد.

- بەڕێز جەلال زەنگابادی دەڵێ: هۆزی پالانی سەرەتا لە (هەرسین)ی کرماشانەوە هاتوون، بەشێکیان بەرەو چیای داڵەهۆ کەوتوونەتە ڕێ و بەشەکەی دیکەش بۆ ناو جەرگەی گۆران، کە بنەماڵەی رەزا شای پەهلەوی شای ئێران لە ورەوە بۆ رەشت و تاران، دەڕۆن ئینجا بەشێک لە پالانییەکانی گۆران بەرەو سەربیێلی زەهاو دەکەونە ڕێ، هەندێکیش بەرەو لای بەمۆ و پێواز دەکەونە ڕێ، هۆزی جاف لەم ناوچانە رایان دەماڵن بەرەو سەرقەڵا و دەشتی زەنگاباد، هۆزی گێژ پێش پالانییەکانی سەرقەڵا بۆ دەوروبەری قەرەتەپە رادەماڵێ، پالانییەکانی دەشتی قەراجیش لە ئەنجامی ئەو رامالینانە ئاوارە بوون و بەر لە شەڕی یەکەمی جیهانی هەر لە ناحیەی کولەجۆ تا دەگاتە ناحیەی (قزرەوات - سەعدیە) لەژێر کۆنترۆڵی هۆزی پالانی بوو، بەڵام دوای ئەوەی حکومەتی عێراق دروست دەبێت دەست دەکەن بە بەعەرەبکردنی ناوچەی پالانییان، بە تایبەتی دەشتی زەنگاباد، کە بریتیبوو لە (١٥) گوند و زۆربەیان گواسترانەوە بۆ ناحیەی خالدییە و سدیقیەی ئوستانی رەمادی، ئەمڕۆش پالانی لە شۆڕیجەی کەرکووک و جەلەولا و هەولێر و مەخموور و بەردەڕەشی ئاکرێ نیشتەجێن، زمانیشیان لە نێوان لوڕی و گۆران دایە و لە هەولێریش زمانیان بەرەو شێوەی سۆرانی گۆڕاوە.

- هۆزی سارەلو حەوت گوندیان لە دەوروبەری روباری خازر هەیە.

کەلهوڕ لە بنەڕەتا لە باشووری

کرماشانەوە هاتوون.
بەر لە فەتح کردن (گۆران)ە کان لە ناوچەکانی نێوان دەریاچەی قەزوین و هەمەدان و هەورامان جێوار بوون، کە بریتی بوون لە کۆمەڵە هۆزێکی ئاگر پەرست، وشەی گۆران واتای گاوران، ئاوران، ئاگرپەرستان با ئەوانەوە رێز لە ئاگر دەگرن دەگەیەنێت، دووریش نییە زەردەشتی بووبن.
هورمزیار: هورمز (ئاهورا مەزدا، یەزدان، خودا + یار (پێر) = یارانی خودا، پێرانی خودای زەردەشتیان یا خودا پەرستان).
دووریش نییە هورمزیار پێری خوداوەندی (هورمیس)ی سۆمەری بن و چوونەتە سەر ئایینی و زەردەشتی و دوای ئاوارەبوونیان لە (ماکۆ)یی چوونەتە سەر ئایینی ئیسلام و ئێزیدی مەسیحی.
- هۆزی بڵباس هەر بە رەوەندی بەشێکیان گەیشتونەتە ئوستانی رەمادی و تواونەتەوە لە بۆتەی رەگەزی عەرەب، ئیتر ئەو هۆزانەی کە لێیان دوایین، زۆربەیان گوندی تایبەتی خۆیان هەبووە، یا بە تێکەڵاوی دەژیان، بەڵام بە داخەوە ئەمرۆ هەموو گوندەکانی قەراج و شەمامک و کەندێناوە یا چۆڵ بووە یا بە عەرەب کراوە، تەنها چەند گوندێکی شەمامک نەبێ، کە کەوتۆتە باکووری هێڵی (٣٦)و گوندەکانی مرکیە و پشت رێش وا خەریکە دووبارە ئاوەدان دەبێتەوە.
دوای نەمانی دەسەڵاتی هەزبانی، مارنجان ئەمارەتی سۆران و ئێزیدییەکانی زۆرگەزراو و کەندێناوە و قەراج چۆڵ بووە، باپیرم دەیگوت، بەر لە ساڵی ١٨٨٠، دەشتی قەراجی چۆڵ بوو، تەنها مەرداری بلباسی تێیدا دەبینرا، کەندێناوەش تاکو توک گوند و هەوارگەی مەردارانی تیا بوو، بەڵام کاولە گوند زۆر لە قەراج و کەندێناوە هەبووە، ناوەکانیشی هەمووی کوردی بوون و هەمووی لەلایەن هۆزانی کوردەوە ئاوەدان کرایەوە، بەڵام گوندەکانی باشووری گوندی شەک بە هۆزانی عەرەب ئاوەدان بووەوە.
لە ساڵێکی بەهاری بەر لە ساڵی ١٩٠٠ بابی باپیرم، ماڵی لە گوندی سۆربەش دەباتە هەواری کەندەبەکرە و بەردەوام چینە ماڵێکی عەرەب بە شەو بەسەریان داداون، جا لەبەر ئەوەی چەکی عەرەب شیر بوو، چەکی ماڵی باپیرەم حوسکە و قەربیناو بووە توانیان عەرەب بشکێنن، بەڵام عەرەب ئەم گوندەیان بە هەواری خۆیان زانیووە، بۆیە وازیان نەهێناوە، حاکمی کەرکوکی ئەوکات پیاوێکی کوردی بە ردێن بووە، رۆژێک بەخۆی و کۆمەڵە سوارێکی عوسمانی، کە بە تورکی دواون، دێنە کەندەبەکرە، کابرای حاکم بە بابی باپیرم دەڵێ: بەو ردێنەی دەکەی واز لەم گوندە بێنە و ئێوە ژمارەتان کەمە و عەرەب ژمارەی زۆرە، دوایی دەتان کوژن و مەروماڵەکەشتان هەموو دەبەن، برۆ بۆ خۆت کاولە گوندی (جوکوژ) ئاوەدان بکەوە و ئەم گوندە بۆ تۆ بێ، ئینجا کۆچ و کۆچبارییان تێکدەنێن بەرەو کاولە گوندی جوکوژ، جا دوای ئەوەی عێراق دەبێتە حکومەتێکی عەرەبی بەردەوام هۆزانی عەرەب لە جزیرەوە دێن و لە رووباری دیجلەی ئاودیو دەبن تا ساڵی ١٩٣٦ و بە عەرەب کردنی کوردستان هەر لە عەمارەوە تا شارۆچکەی شەنگار دەگرێتەوە.
بۆ یەکەمین جار لە سەرەتای ساڵانی (٤٠) بریاری هێنانی هۆزی شەمەری عەرەبی بۆ دەشتی قەراج دراوە و هەندێک لە ئاغاکانی ناوچەکەش دەستیان تێدا هەبووە، بەڵام حوسێن مەلا، کە بەمە دەزانێ دەڵێ ئەگەر هۆزی شەمەر بێتە قەراجی ئەوا ئاغاکان دەسەڵاتیان نامێنێ و بەرە بەرە کەندێناوە و مرکیەشمان لەبن دەست دێننە دەرێ، بۆیە بەپەلە خۆی دەگەیەنێتە لای مەلیک و پێی رادەگەیەنێ، کە دەشتی قەراج ئاوەدانە و هۆزانی کوردی تێیدا نیشتەجێ بووە، ئەم هۆزانەش قەبوڵ ناکەن هۆزی شەمەر بێنە سەر زەوی و زاریان، ئینجا مەلیک ئەم بریارە رەت دەکاتەوە و هۆزی شەمەریش ناوێرن بەبێ

پاڵپشتی حکومەت لە رووباری دیجلە ئاودیو بن.

دوابەدوای ئەم بڕیارە، حکومەت بڕیاری بە عەرەبکردنی کلکەی قەرەبۆتکی داوە، واتا ناوچەی هۆزی سیانان، حکومەتی مەلەکی ویستویەتی هۆزی شەمەری لەوێ نیشتەجێ بکات.

کاخدر کە پیاوماقوڵێکی هۆزی سیانان بووە، کە بەم کەین و بەینە دەزانێ، دەچێتە لای مەلیک و بڕیاری بە عەرەبکردنی پێ ڕەت دەکاتەوە، ئینجا مەلیک عەبایەک بە پاداشت دەداتە کاخدر، ئاغاکانی دیکە زۆریان پێناخۆش دەبێ بە چوونی کاخدر بۆ لای مەلیک.

بە بڕیاری رەسمیش بە عەرەبکردنی کەندێناوە و قەراج لە ساڵی ١٩٦٣ لەلایەن سەرەک کۆماری عیراق (عەبدولسەلام) بڕیاری لەسەر دەدرێ، لەم ساڵەدا هۆزانی عەرەب بە پاڵپشتی حکومەت کەندێناوە و قەراج تالان دەکەن و ژمارەیەک گوندیش داگیر دەکەن.

لە ساڵی (١٩٧٥)یش بە عەرەب کردن ژمارەیەکی زۆری گوندەکانی قەراج و کەندێناوەی گرتەوە، بە جۆرێ زۆربەی گوندەکانی رۆژئاوای دیبەگە لە ناحیەکە دادەبڕن و دوای بە عەرەبکردن دەیکەن بە (ناحیة القدس)، دەیخەنە سەر ئوستانی کەرکووک، ئیتر بە عەرەبکردن و وێران کردنی گوندەکانی دەشتی هەولێر تا ئازادکردنی عێراق بەردەوام دەبێت.

- کەلهووڕی لەسەردەمی خۆی بە هەوایەکی تایبەتی خۆی وتراوە لەسەر وەزنێک لە وەزنەکانی عروز...

هەندێ جاریش (ئورامە، ئورامان)یان پێ وتووە، جا کاتی خۆی ئاوێستا بە ئاوازی جۆراوجۆر خوێندراوە، ئەڵلاوەیسی-یش یەکێک لەم ئاوازانە بووە، کە یەکێکی دەنگخۆش بەناوی وەیسی خوێندویەتی و پاشان بووەتە ئەلاوەیسی و ئەمڕۆکەش لە ئاوازی گۆرانی فۆلکلۆری رەنگی داوەتەوە، تاکو ئەمڕۆش بە گۆرانی بێژی میللی لە لوڕستان دەگوترێت لوڕی.

ژمارەیەک لە نوسەران لەو باوەڕەدان کە کەلهووڕ پاشماوەی دیلە جوولەکەکانی سامارین کە بۆ شاری کالخی ئاشووری دوور خراونەتەوە.

- بۆڕی (بۆڵی) ئەم وشەیە لە زمانی گەیلانی واتای هەسپ دەگەیەنێت، کەواتا دوور نییە، ئەم هۆزە لە ناوچەی گەیلانی نزیک دەریاچەی قەزوێن هاتبن و پیشەی سەرەکیشیان هەسپ بەخێوکردن بووبێ.

- گەراری (گەلالی): هەندێک وای بۆ دەچن ئەم هۆزە بەشێک بن لە جاف و لە گوندەکانیان: مەلاکاغە و کەردز و لە ژمارەیەک لە گوندی دیکەش نیشتەجێن.

- کاڕەش: هەندێک دەڵێن ناوی کاڕەش لە کانی رەش هاتووە، واتا کاتی خۆی لە گوندێک بەناوی کانی رەش لەسەر سنووری نێوان سیدەکان و شنۆوە هاتوون، هەندێکیش دەڵێن لە کاکەرەش هاتووە، واتا برا گەورەکەیان ناوی کاکەرەش بووە.

سەرچاوەکان
١- کەلهوڕ/ قادر جیهانگیری/ گۆڤاری سروە، ژ ١٥٨، ل ٤٥.
٢- گۆڤاری تیشک، ژ ٥، ساڵی دووەم، رەزبەری ١٣٧٨.
٣- إیلات وطوایف کرمانشاهان/ محمد سلطانی ١٣٧٢ تهران.
٤- زبان کردی کلهوری/ گۆڤاری ئاوێنە/ ژ ٦٧.
٥- تواجد الکاکائیة/ هەیاسی کاکەیی/ گولان العربي، ژ ٤٧.

ئەم بابەتە لە کتێبی مێژووی دەشتی هەولێر لاپەڕە (٦ - ٢٢) وەرگیراوە.



# قەرەجەکانی شاری هەولێر

عەباس سلێمان سمایل

گەلان هەر لە کۆنەوە دوو بەش بوون، بەشی جێوار، کە بە کاری کشتوکاڵی، پیشەی جۆراوجۆر خەریک بوون و بەشێکی کارکەرو رۆشنبیرو ئاشتیخواز بوون. بەشی دووەمیش بەشێکی رەوەند و کۆچەر و ناجێگیر و دواکەوتوو و شەڕەنگێز بوون. و بەردەوام بەشی یەکەمیان خستووەتە نائارامی و هەمیشە بۆیان ترسناک بوون.

بەڵام رەوەند و گەڕۆکی ئەو کاتی جیاوازبوون لە گەڵ رەوەند و گەڕۆکی ئەمڕۆی جیهان، جاران ژمارەیان زۆر بووە و زۆریش دواکەوتوو و شەڕاوی بوونە، کەچی.ئەمڕۆ ئەم چینە بە هۆی پێشکەوتنی جیهان ژمارەیان کەم بۆتەوە و بە هۆی تێکەڵاوبوونیان لە گەڵ گەلان، گۆڕانیان بە سەردا هاتووە.

جا گەڕۆک و رەوەندەکانی ئەمڕۆی جیهان هەندێکیان تەنها بە بەخێوکردنی مەڕو ماڵاتەوە خەریکن و گەرمیان و کوێستان دەکەن، ئەمانەش بەشێکن لەو گەلانەی، کە لە نێوانیاندا دەژین وەک: هۆزی مام سار، رەوەندۆک، کۆچەر، زێدبەگی، ژمارەیەک لە تیرە و بنەماڵەی هۆزانی سەر سنووری عێراق و ئێرانی ئەمڕۆ، زستانان لە گوندەکانیان لە پێدەشتەکان جێوار دەبن و هاوینانیش مەڕو ماڵاتەکانیان بۆ کوێستان دەبەن.

بە لام جۆری دووەمیان کە بریتین لە دۆم و قەرەج، دۆمەکان زیاتر بە کاری پیشەی دەستییەوە خەریک بوون، وەک دروستکردنی تەشی، تیرۆک، ناوبرێشک، کەوچک، شانە، ملاکدان،....

ئەمڕۆکەش بە هۆی ئەودی ئەم

کەردستانە باویان نەماوە لە بەکارهێنان، ئەم دۆمانەش خەریکن بن بە شارستان و واز لەم کاردیان بێنن، بەڵام تاکو ئەمڕۆ هەندێک بۆ بەخێوکردنی خێزانەکانیان پیاوەکانیان گۆرانی دەڵێن و بانگ دەکرێن بۆ ئاهەنگ گێڕان. ئەم دۆمانەش ژمارەیەکیان لە گەڕەکی سەیداوە و گەڕەکی باداوە و گەڕەکی نەورۆز جێوار بوون و بوونەتە شارستانی و وازیان لە کاری پێشووی خۆیان هێناوە. و لە ئەسلیشدا لە هیندستانەوە هاتوون، تاکو ئەمڕۆش هۆزێکی گەورە بە ناوی دۆم لە باکووری هیندستان جێوارن. بەڵام قەرەجەکان لەو وڵاتان بە ناوی جۆراوجۆر ناویان دەبەن: وەک غەجەر، قەرەج، کاولی (کۆلی) ڤین، زانگی، چەد، کاجو، تەتەر،.....

قەرەجەکان ئەمڕۆ ژمارەیان دەوروبەری هەشت ملیۆن کەس دەبێت، زۆربەیان لە ئاسیاو ئەورووپا دەژین و بە رەسەن هیندستانین، دەوروبەری (١٥٠٠) ساڵ لەمەوبەر شەپۆل دوای شەپۆل لە هیندستانەوە بەرەو خۆرئاوا کشاون، بەشێکیان لە رێگای ئێرانەوە بەشام و تورکیا بڵاوبوونەتەوە. و، بەشێکی دیکەشیان بەرەو باکوور کشاون و لە ئەفغانستان و شۆرەوی پێشوو بڵاوبوونەتەوە، ژمارەیەکیان لەوێوە بەرەو کیشوەری ئەورووپا کۆچیان کردووە، کەچی هەندێکی دیکە وای بۆ دەچن، کەوا هەندێک لەم قەرەجانە مێژووی کۆچکردنیان بۆ دەوروبەری (٢٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە.

جاران ئەم قەرەجانە بەردەوام لە گەڕان دابوون، بەڵام ئەمڕۆ زیاتر لە دەوروبەری شارەکان جێوارن بە هۆی ئەوەی زیاتر خەریکی پیشەی دەستی و ئاهەنگ گێڕانن ئافرەتەکانیشیان بە کاری دەرۆزەکردن خەریکن.

ئەمانە تا سەرەتای سەدەی پازدەیەم لێکۆڵینەوەیان لە سەر نەکرابوو، بەڵام دوای ئەو رێکەوتە لێکۆڵینەوەی هەمە لایەنە لەسەر هەموو قەرەجەکانی وڵاتانی ئەورووپی و ئاسیاییدا کراوە، لە ئەنجامدا بۆیان دەرکەوت، کە زۆربەیان لە رەگەزی هیندین و بە درێژایی رۆژگار لە گەڵ هەر میللەتێک تێکەڵاو بووبن بە داب و نەریت و زمانی ئەم میللەتە کاریان تێ کراوە، بەڵام قەرەج تاکو ئەمڕۆ لە ژێر چادرو رەشماڵان دەژین و نەخوێندەوارن و بێ وڵات و بێ دەسەڵات و بێ پەرستگا ماونەتەوە و هەموویان رەنگ ئەسمەرن و یەک رەنگ و روویان هەیە، زۆر داب و نەریتی کۆنیان لەنێو داماوەتەوە، کە تا کو ئەمڕۆ زۆربەیان پەیڕەوی دەکەن، وەک پیرۆزی ئاسمان، خۆر، مانگ و هەندێکیان تاکو ئەمڕۆ دەیانپەرستن. کاتێکیش یەکێکیان لە سەرەمەرگ و ئاوزینگدان بێت، دەیبەنە دەرەوە دوای ئەوەی دەیشۆن و جلێکی جوانی لەبەر دەکەن، لە دەرەوەی رەشماڵەکە دای دەنێن تاکو گیانی دەردەچێت، ئینجا دەینێژن چونکە مردنیان پێ لە ژوورەوە شوورەییە، جا لە بەر ئەوەی مردووەکە دەکەوێتە گەشتێکی دوورودرێژ بۆیە جلی تازەی لەبەر دەکەن و دوای ناشتنیش گۆڕەکەی پشت گوێ دەخەن و بیری لێ ناکەنەوە. لە نێو زۆربەی قەرەجەکانی ئاسیا و ئەورووپا بەسەرەک هۆزەکەیان دەڵێن (کاکۆ).

قەرەج بە گشتی سێ ناویان هەیە، یەکێکیان نهێنی لە نێو خێزان بەکاردێ، ئەویش دوای ئەوەی ژنێک منداڵی دەبێت، دایک زۆر لە سەر خۆ ناوێکی بە گوێی کۆرپەکە دەچرپێنێ و دووەمیش ناوێکە تەنها لە نێو بنەماڵەکە یا هۆزەکەی بەکاردێت، سێ هەمیش بۆ تۆمارکردن لە فەرمانگەکانی میری و نێو خەڵکی بێگانە.

### قەرەجەکانی کوردستان

لە کوردستان قەرەجی جۆراوجۆر هەیە، هەیانە بەڕەسەن کوردن و بە هۆی ئاوارەییەوە بوونە قەرەج و وەکو قەرەجییان لێهاتووە، ئەمانەش زیاتر بە هۆی زەبرو زەنگی تورکانەوە ئاوارە بوون، لە ساڵی (١٩٧٩) ژمارەیەکیانم دیت لە شاری موسڵ دەرۆزەیان دەکرد، لە هۆزی گۆیان بوون، کاتی خۆی لە ئوستانی هەکارییەوە دەربەدەر بووبوون، بنەماڵەیەکیش لە ساڵی (١٩٧٨) بەزاراوەیەکی کرمانجی قورس قسەیان دەکرد لە گوندی ئامادەی زێبار جێواربوون و بە پیشەی دەستییەوە خەریک بوون، پیاوەکانیشیان هێواران لە بنکەی نەهێشتنی نەخوێندەواری وانەیان دەخوێندو زۆر ئارەزوویان لە خوێندن و نووسین بوو، رۆژێک بە پڵنگ - م وت بۆ ناویان لێناوی پڵنگ......؟ وتی ئێمە کە لە دایک دەبین بە ناوێک بانگمان دەکەن، دوای ئەوەی گەورە دەبین، بنەماڵەکەمان ناوەکانمان بە ناوی ئاژەڵێک دەگۆڕن، جا ئەو منداڵەی بە چ ئاژەڵێک بچێت بەم ناوە دەناسرێت، وەک: پڵنگ،

شێرۆ، مشکۆ، تەیرۆ، گورگۆ.
هەڵبەتە هەر مرۆڤێکیش بە ئاژەڵێک دەچێت لە هەمان ساڵ ژمارەیەک قەرەج لە گوندی سولاقەی سەر بە ناحیەی بجیل هەبوون، ئەمانە قەرەجی تەواو بوون و بێجگە لە پیشەی دەست ئافرەتەکانیان فاڵیان دەگرتەوە و جادوویان دەکرد و بەلایانەوە زۆر ئاسایی بوو.
لە ناوچەکانی نێو جبایش و سوگ شیوخ و قورنە لە باشووری عێراق بە جۆرێک دەژین، کە بە لورییەکی قورس قسە دەکەن و خۆیان بە هۆزی گەورەی بەختیاری دەزانن، زیاتر بە کاری بەخێوکردنی گامێش و راوە ماسییەوە خەریکن و لە گەڵ هۆزی نەواشی جێوارن، عەرەب پێیان دەڵێن کاولی، لە ساڵی (١٩٨٠) لە جبایش هەندێکیانم دیت و پرسیارم لێکردن، وتیان ئێمە بەڕەسەن بەختیارین و زۆرمان پێ ناخۆشە، کە عەرەب پێمان دەڵێن کاولی، چونکە کاولی قەرەجن جا کاولییەکان لە ئوستانەکانی ناسریەو دیوانیەو سەماوە جێوارن و زیاتر بە گۆرانی وتن و کاری ناشیرین بەڕێوەدەچن و بە زمانی عەرەبی قسە دەکەن. هەروەها لە ساڵی (١٩٨٢) هەندێک قەرەجم لە شاری رومادی دیت، کە هوردەواڵەی قاچاغیان دەفرۆشت، لە سوریا و ئوردن هێنابوویان و بە زمانی تورکییەکی ئازەری قسەیان دەکرد و دەوروبەری (٢٠) چادر دەبوون. لە نزیک شار لە سەر رێگای رومادی - فەلوجە چادریان هەڵدابوو.

**قەرەجەکانی ئەمڕۆی شاری هەولێر**

قەرەجەکانی ئەمڕۆی شاری هەولێر چەند بەشێکن بەشێکیان بە فارسی قسە دەکەن و بەشێک بە تورکی و بەشێکی دیکەیان بە بنەماڵەی سۆفی ناسراون. ئەمانە بەر لە (٢٠) ساڵ لە ناوچەی سلێڤانی لای دهۆکەوە هاتوون و دەوروبەری (١٠) ساڵ بە ناچاری و بە هۆی نالەباریی باری سیاسی لە گەڕەکی باداوە جێوار بوون. بەڵام دوای راپەڕین خانووەکانیان فرۆشتەوە و ژیانیان لە ژێر چادرەکاندا دەست پێکردەوە. ئەمانە تەواو گۆڕانیان بەسەرداهاتووە. گۆڕان بەسەر زمان و داب و نەریت... ئەمانە ئەمڕۆ دیالیکتی سۆرانی تەواو کاری لێکردوون، ئی واشیان تێدا هەیە لە گەڵ یەکتری بە زمانی تورکی قسە دەکەن.
جا بە پێویستمان زانی لە دیمانەیەکدا ئەم قەرەجانە بەسەر بکەینەوە و بە خوێنەرانیان ئاشنا بکەین.
ئەم چینە قەرەجە (٥٤) ماڵن و هەر ماڵەی یەک چادری خۆی هەیە و لە رێگای هەولێر - عەنکاوە هەڵیانداوە، پیاوەکانیان بە پیشەی جۆراوجۆرەوە خەریکن، وەک:
ددان دروستکردن، کەو بەخێوکردن، ئاهەنگ گێران، بەڵام ئافرەتەکانیان بە زۆری دەرۆزە دەکەن و چەند پیاوێکیشیان تەواو تێکەڵ بە ئایینی ئیسلام بوون و بوونەتە دەروێش. لەوانە (کەمال جەمیل رەمەزان) ە، ئەم پیاوە بووەتە دەروێش و تەریقەتی وەرگرتووە و پرچێکی درێژی هێشتوتەوە، دەوروبەری (٢٨) ساڵە ددان لێدەنێتەوە و تاقمی ددان دروست دەکات و هەموو کەرەستەیەک و مادەیەکی پێویستی بۆ ئەم کارە هەیە، سەرەتا لە لای ددانسازێکی ئێرانی بە ناوی حاجی ئەحمەد لە ورمێ لە ساڵی (١٩٧٢) فێری ئەم کارە بووە و شارەزاییەکی باشی لێپەیدا کردووە.
ئەمڕۆش کاک کەماڵ لە ژێر ئەم چادرە گچکەیە لە سەر کاری ددانسازی بەردەوامە و خەڵکێکی زۆریش لە هەولێر و بادینان پێی لێدەنێنەوە و کارەکەشی بەباشی بەڕێوە دەچێ.
پاشان چەند پرسیارێکمان لەو کەسانە کرد کە دەهۆڵ و زورنا لێدەدەن و لە ئاهەنگەکانی بووک گواستنەوە بەشداری دەکەن، لەوانە:
عەبدولڕەزاق بەحری، رەمزی سلێمان و ساڵح و لوقمان و مەولوود و غایب دەروێش.
وتیان ئێمە لەو رۆژانەی، کە خەڵک ژن دێنن ئێمە بە خۆمان و دەهۆڵ و زۆرناکانمان لە بەر دەرکی قەڵا رادەوەستین، زۆرجاریش خەڵک دێنە ماڵمان بۆ ئەوەی لە گەڵیان بچین و ئاهەنگیان بۆ بگێڕین، لە دروستکردنی ئامێرەکان خۆمان ماددەکان دەکڕین و خۆمان دروستیان دەکەین هەروەها تەشی و تیرۆگ و قەفەس و شتی دیکەش دروست دەکەین. بۆ نموونە تیرۆگ لە دار بی یا سپیندار، یا رولک دروست دەکەین، مەلاکیش لە داری گرۆسک یا گوێز دروست دەکرێت، شانەیش لە دارتوو یا دارگوێز دروست دەکرێت.

**دروستکردنی دەهۆڵ**

دەهۆڵ لەم ماددانە دروست دەکرێت: (کەوات) ە کە دەورەکەیەتی بەزۆری لە داری گوێز دروست دەکرێت.

پێستەکەش پێستەی مەڕ یا بزنە دەهۆڵەکە دەنگی خۆشتر دەبێت ئەگەر پێستەکە پێستی مەڕێک یا بزنێکی تەمەن گچکە بێ، چونکە پێستی پیرەمەڕو بزن دەنگی باش نایێ.

پاشان پێستەکە بەکەندرێک لە کەوانەکە دەبەسترێت، پێستەکەش بەر لەوەی لە کەوانەکە ببەسترێت دەتراشرێت، ئەو دارەی، کە بەکاردێت بۆ لێدانی دار (بی) یە، لە بەر ئەوەی دارێکی سووکە و دەنگێکی باشیشی لێوەدێت. زورناش لە داری قەیسی یا سێو یا گوێز دروست دەکرێت.

دووزەلەش لە هێسک و قامیش دروست دەکەین و هەموو جۆرە ئاوازێکی شایی کردنیش دەزانین لێ بدەین. هەروەها (دەف) یش دروست دەکەین، کە بە هەمان ماددەی دەهۆڵ دروستی دەکەین. ئینجا رووەمان لە پیرەمێردێک کرد دەربارەی شوێنی حەوانەوەی جارانیان.... وتی:

جاران ئێمە هەر (٥ - ٦) ماڵێک لە ناو یەک ڕەشماڵ دەژیاین، ڕەشماڵەکانیشمان (٨ - ١٠) پارچە بوو، بە هەر پارچەیەک دەگوترا (تەژ)، ڕەشماڵەکانیشمان لە نێوان (١٠ - ٢٠) مەتر درێژ بوو، هەر خۆشمان لەمووی بزن بە (١٠) رۆژ دروستمان دەکرد، ئینجا لە ژێرەوەی ڕەشماڵەکان کەژیمان پێوە دەبەست، لە هەڵدانیش (٥ - ٦) ئەستوونمان بۆ دادەنا.

ڕەشماڵیش بە کەندری حەلەبی بە سنگ دەبەسترایەوە و رادەگیرا، سنگەکانیش لە دار بەڕوو دروست دەکران.

ئەو چەند ماڵەی لە ژێر ڕەشماڵێک دەژیان، تەواو تێکەڵ بوون لە نان خواردن و نووستن و هەڵسوکەوت. چەند هێسترێکیشمان هەبووە، بۆ گواستنەوەی ڕەشماڵ و کەل و پەلەکانمان، ڕەشماڵەکانیش لە ناوەوە سێ بەش بوو. ناوەڕاستی کە پێی دەگوترا (کۆچک) جێگای میوانان بوو، گۆڕک واتە ئاگردانیش هەر لەوێ بوو، لای راستیش تایبەت بوو بۆ نووستنی هەموو ئەندامەکانی هەر (٥ -٦) خێزان. لای چەپیشی بۆ دەوارەکان بوو.

ش

پەراوێزەکان:

ژمارەیەک لە قەرەج لە شارۆچکەکانی نێوان حاجی ئۆمەران و دیانە جێوارن. جاران بنەماڵەی دیکەی قەرەج لە شاری هەولێر هەبوون، هەروەها چەند ماڵە قەرەجێکیش لە گەڕەکی عارەبان و تەعجیل هەبوون، کە بە زمانی تورکی قسەیان کردووە وئەمڕۆکەش ناوی قەرەجیان لەسەر نەماوە و پێیان شوورەییە بە ناوی قەرەج ناویان بهێنن.

بەڵام دۆمەکانی هەولێر خۆیان بە ڕەگەزی کورد حیساب دەکەن و بریتین لەم تیرانە: دۆمە موکری، دۆمی هەڵۆ، دۆمە دەرویشی، دۆمی حوس حوس، دۆمی هەتووری، هەریەک لەوانە جۆرە پیشەیەکی هەیە.

قەرەج لە دهۆک لە زۆربەی ناوچەکانی دهۆک نیشتەجێن، هەندێکیان بە کرمانجی قسە دەکەن، هەندێکیشیان بە زمانێکی تێکەڵ بە زمانی هیندی و فارسی و کاردانەوەی دیالێکتی کرمانجیشیان لێکراوە.

بۆ نموونە قەرەجی ئالوک بریتین لە سێ تیرە:

١- تیرەی شەرەفا کە بە بێژنگکەر ناسراون.
٢- بەگزادە: بە گۆرانیبێژ ناسراون و کەمانچەش لێدەدەن.
٣- موکری: ئەم تیرەش کەل و پەل لە دار دروست دەکەن، وەک لانک و کەوچک لە رووی پیشەیان لە دۆم دەچن.
٤- لەکۆڕی گاڤانا بنەماڵەیەکی قەرەج هەیە، کە بە ئایینی (قوت) دەناسرێت یا بنەماڵەی (بەرەیخدر)یان پێ دەڵێن ئاسن قوت و شەرەفا، چەند وشەیەک لە زمانی قەرەجی دهۆک:

یێ دا: وەرە
هەجایی: برۆ
پەیدارڤە: وەرە بەگزادە
هەجەسە: برۆ
بینا: وەرە موکری
ب مەشی : برۆ

لە نێوان قەرەجان کوشتن نییە، مردوو ناوی ناهێنرێت و لە بیر دەکرێت. ئافرەتی قەرەج بە ئارەزووی خۆی رادەبوێرێ. جاران ئەندامانی (٥ - ٦) خێزان لە ژێر یەک بەرە دەخەوتن ئەمڕۆکەش بە ئارەزووی خۆیتیان لە هەر خێمەیەک بخەون.

چەند ماڵێکی قەرەج لە گەڕەکی

نەورۆز جیاوازن و لە ماڵەوە بە تورکییەکی ئازەری قسە دەکەن، خۆیان بە نەوەی خانی لەپ زێڕین دادەنێن: گوایە دوای گیرانی قەڵاتی دم دم ئەوان دەربەدەربوون.

کاک خالید دەربەندی وتی جارێک قەرەجێکی پیرم دیت پەرتووکێکی دەخوێندەوە، منیش لێم پرسی ئەم پەرتووکە چییە و ئێوە لە کوێوە هاتوون ؟ قەرەجەکە لەوەڵامدا وتی:

لە قەفقاسیا جێوار بووین، دوای ئەوەی لە سییەکاندا فەرمانی گواستنەوەمان درا، ئێمە بووینە کۆچەر و ژیانمان بە پیشەی دەستی بەرێوە دەچێت.

نەواشی: نەواشی کۆمەڵە هۆزێکن لە هۆزەکان جێوارن بە شێوە زمانێکی عەرەبی قورس قسە دەکەن. عەرەب پێیان دەڵێن معدان، کەچی ئەوان بە خۆیان دەڵێن نەواشی. هەندێک لە مێژوونووسان بە نەوەی سۆمەریان دەزانن، هەندێکیش دەڵێن ئەمانە بەشێک بوون لە میدییەکان و دابڕاون و بە درێژایی رۆژگار زمانیان بەرەو زمانی عەرەبی گۆڕاوە. ناوی معدانیش هەر (ئامدان، میدی) بووە و لە سەر زمانی عەرەب گۆڕانی بەسەرداهاتووە. خاتوعیسمەت فەریاد"، بابەتێکی لە ژێر ناوی قەرەجەکان کە لێدوانێکە لە کتێبی (کولی ها) ی د. ئیرەج ئەفشاری سیستانی، ئامادە کردووە، ئێمەش بە پێویستمان زانی چەند دێرێکی لێ هەڵێنجین، بۆ زیاتر ئاشنا بوونی خوێنەران، قەرەجەکان خەڵکێکی گەڕۆکن و بناغەی سەرچاوەیان هیندستانە، ژیانێکی سادەو پڕ کارەساتیان هەیە.

ژمارەیەکی زۆریشیان لە سەدەی بیستەمدا جێگیربوون، بەڵام هەمیشە رەسەنایەتی و کەسایەتی خۆیان پاراستووە و تێکەڵی خەڵکی دیکە نەبوون.

پتر لە ئۆزبەکستان دەژین، لە ئەفریقیا پتر لە باکوور و لە ئەمریکای باشوور پتر لە کەنەدا و بەرازیل دەژین، لە زۆربەی ناوچەکانی ئەوروپا لە سەرانسەری ئەفغانستانیش بڵاون. لە ئێرانیش ئوستان نییە قەرەجی تێدا نەبێت و بە سی ناو زیاتر بڵاون لە وانە: پووشە، توشمال ئەسمار، قەرەجی کابۆلی، کاولی، کۆلی، لەوەند....

قەرەجەکانیش بە خۆیان دەڵێن رۆم، کە لە زمانی خۆیاندا واتای (مرۆڤ) دەگەیەنێت.

* مێژوونووسان دەڵێن:" یەکەمین شەپۆلی قەرەجی بۆ ئێران لە سەردەمی ساسانییەکان هاتوون و بەڵگەکانی جوگرافیایی و.... مێژوویی و مرۆڤایەتیدا، ئاماژە بەوەکراوە، کە کۆچی قەرەجەکان لە سەردەمی شاپووری دووەمدا لە ئێران روویداوە، هەندێکیش دەڵێن سەرەتا بەهرامی پێنجەم قەرەجی لە کابوول هێنایە خوزستان و شووشتەر.

بەهرامی پێنجەم یا بارامی گوڕ (٤٢١ - ٤٣٩ ز) یش گرووپێکی سازلێدەر و مۆسیقاژەنی هیندی بە ناو لوری لە هیندستان هێناو لە سەرانسەری وڵات بڵاوبوونەوە.

لە سەرەتای ئیسلامیش ئاماژە بە هەبوونی قەرەج لە قەرەداغ، دەریای پارس، خوزستان، بەسرە.... کراوە. لە سەردەمی عەباسییەکانیشدا چەند جارێک باشووری عێراقیان گرتوو چ کردووە.

ئەمڕۆکەش ٣/ ١ ی قەرەجی ئەفغانستان لە دەوروبەری شارەکان جێواربوون و ژمارەیەکی زۆری قەرەجەکانی وڵاتانی ئیسلام ئەمڕۆ بوونەتە ئیسلام.

لە سەدەی (١٨) و (١٩) شەپۆلی قەرەجەکان گەیشتنە هەردوو کیشوەری ئەمریکای باکوور و باشوور.

دۆم: دۆم وشەیەکی زۆر بەرێزە لە لای گەلانی ئەوروپی، بەڵام لای ئێمە وا نییە، دۆم وشەیەکی ئارییایی و ئەوروپییە تا ئەمڕۆ وەک ناوی گەورە و نازناو لە وڵاتی ئەڵمانیا بەکار دەهێنرێت.

لە هەمان کاتدا هێمایە بۆ پیرۆزی و شکۆداری بەشێک لە کلێسەی مەزن و دێرین و گرنگەکان، بەتایبەتی کاستۆلیکەکان بەو ناوە ناسراون.

* بۆ پێشەکی و پەراوێزی ئەم بابەتە سوودم لەم سەرچاوانە وەرگرتووە:

١- الغجر / دراسة تاريخية اجتماعية فولكلورية / جان بول كليسر / ترجمة: لطفي الخوري / بغداد / ١٩٨٦.

٢- قەرەجەکان / ب ١ / ئا: عیسمەت فەریاد / گۆڤاری سروە / ژ ١٦٦ / ١٣٧٩ ی هەتاوی.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر / ژمارە ١٦ ی پایزی ٢٠٠٢ وەرگیراوە.

# درەختی خانەوادەی دزەییان لەساڵی ١٦١٣ تا ٢٠٠٣/١/١

**سەرەتا**

سەرجەلەی تایبەت بە دزەییان لەساڵی ١٦١٣ز تا ساڵی ١٩٤٥ز لەلایەن (مەلا خالیدی) مورتکە نووسراوەتەوە بەهۆی (عەبدوڵلا) کوڕی حاجی (کاکە ئەحمەدی) دارەتوو دۆزرایتەوەو، پاشان لەلایەن (عەلی حەمەد سەعید)ی گردلانکە تەواو کراوە، لەو کەم و کوڕیانەی کە هەیبووە، ناوی ئافرەتانیشی تێکردووە تاکو (٢٠٠٣/١/١ز) و بەدەست خەتی (جەوددت حەسەن ئیسماعیل) نووسراوە. لەم سەرجەلەیەدا.... مستەفا بەگی سۆران (خوارزای سەیدی خانی میری ئامێدی) زۆر دۆستی خان ئاودەل بووە... خان ئاودەل کە لە باپیرانی قەرەنی ئاغا بوو، بووەبە دەستە راستی مستەفا بەگ لە هێرشەکەی بۆ سەر بەغدا. مستەفا بەگ لەبەغدا شەهید دەبێت و خان ئاودەل جێی دەگرێتەوە، جەنازەکەی مستەفا بەگی هێناوە کوردستان و خۆی بوو بەمیری سۆران.کوڕێکی بوو بەناوی مستەفا بەگی کردەوە. لەپاش مردنی خان ئاودەل ئەو کوڕە جێی باوکی گرتەوە و بەمیر مستەفا ناوی دەرکرددووە.

میر مستەفا گەنج و خوێن گەرم بووە لەگەڵ نەوەی مستەفا بەگی سۆران. دوای ماوەیەک ناخۆشیان کەوتە بەینی و باری کردووەو رووی کردۆتە وڵاتی ئێران، بۆلای (شا حسێن)ی کوڕی شاعەباس و لە گوندی (دزێ) لای ئورمێ نیشتەجێ بوون بۆ چەند ساڵێک. لەپاشان نێوانیان لەگەڵ (شاحسێن) تێک چوو، گەڕایەوە کوردستانی عێراق و پاشان لەساڵی ١١٥٠.کۆچی وەفاتی کرد.

* مامەر ئاغا (یەک لە نەوەکانی میر مستەفا بوو). سێ کوڕی هەبوو (عیسا و پیرداود و قەرەنی) ئەوانیش لێک جیابوونەوە.

* (عیسا) ئاغا رووی کردە ناوچەی سلێمانی و ئێستاش (نەوەکەی) لەسلێمانی ماڵی ئاغای گەورەیان پێ دەڵێن: پیرداود ئاغاش رۆیشت بەرەو دیار بەکر و نەوەکەی بەهەرتۆشی ناویان دەرکردووە. لەوانە حاجی ئاغای هەرتۆشی بەناوبانگە.

(قەرەنی ئاغا)ش خۆی و زۆربەی زۆری نەوەکەی چوونە دەشتی هەولێر و، لەوێ بە (دزەیی) ناسراون.....

عیزەددین شێری میری سۆران - خان ئاودەل - میر مستەفا - ئاری ئاغا - فەقێ وەسمان - مامەر ئاغا - **بەرەی مامەر ئاغا**

عیسا ئاغا
پیرداود ئاغا
قەرەنی ئاغا
بەرەی قەرەنی ئاغا
مەحمود ئاغا
برایم ئاغا
مام زێندین
مام خولە
هەر چوار کوڕی قەرەنی ئاغا بوون

*** کوڕەکانی مەحمود ئاغا**

١- مەلا

٢- حەسەن
٣- عەلی
٤- مستەفا
٥- فارس ئاغا
٦- ئاودەل
٧- كاكەخانی گەورە

*** كورەكانی حسن ئاغا**

١- سلێمان
٢- حەویز

*** كوری سلێمان ئاغا**

١- عەلی ئاغا

*** كورەكانی عەلی ئاغا**

١- حسێن ئاغا
٢- عومەرە فەندی

*** كورەكانی حسێن ئاغا**

١- ئەحمەد پاشا
٢- حاجی نادر
٣- حەمەد ئاغا
٤- حاجی مستەفا
٥- علی ئاغا

*** كورەكانی ئەحمەد پاشا**

١- خدر بگ"خدری پاشا"
٢- عەزیز
٣- سەلیم
٤- شێخ محەمەد
٥- قادر
٦- حمد
٧- ئاغا"حوسێن"

*** كورەكانی خدر بەگ"خدری پاشا"**

١- مەحمود
٢- پاشا- لەژیاندا ماوە
٣- محەمەد
٤- عومەر
٥- كانەبی

### سەرجەلەی تایبەت دزەییەكان لەساڵی (١٦١٣ز تا ساڵی ٢٠٠٣/١/١

خدری ئەحمەد پاشا سەرۆك هۆزی دزەیی بوو ئەحمەد پاشای باوكی لەدەولەمەندیو ئازایەتی وزیرەكی خۆی ئەو پاشایەتیەی بۆماوەتەوە... ئەو شوهرەتەش لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەكانەوە پێی بەخشراوە وەك باسی لێوەدەكەن لەسەردەمانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ئەوكاتەی سوپای عوسمانییەكان لەعێراق بوون بە تایبەتی لە كوردستانی باشووردا گرانییەكی زۆر سەخت بەسەر فەرمانرەوایی سوپای عوسمانی داهات كە مووچەی فەرمانبەرانی ناوشاری هەولێر نەدرابوو.. ئەحمەدپاشای دزەیی هەستا لەسەر هەبوونی خۆی مووچەی بەسەر فەرمانبەرانی فەرمانرەوایی عوسمانیدا دابەشكرد لەناو شاری هەولێردا.... لەسەفەرێكی شێخ سەعید كە شێخ مەحمودی نەمربوو بۆ ئەستەنبوڵ لەوێ ئەو هەڵوێستەی ئەحمەد پاشا دزەیی لەباوكی لای سوڵتان عەبدولحەمیدی فەرمانرەوایی عوسمانیەكان باس كردبوو، بۆیەش سوڵتان عەبدولحەمید بەدوای ئەحمەد پاشای دزەییدا دەنێرێ و پلەی (پاشایەتی) دەدا بە ئەحمەد پاشای دزەیی و پلەی (بەگ) دەدات بە خدر بەگ و عەولا بەگ و لیرەیەكی زۆریشی پێدابوو لەبری ئەو هاوكارییە كە ئەحمەد پاشای دزەیی بەرامبەر فەرمانرەوایی عوسمانییەكانی لەناو شاری هەولێردا كردبوو.



خدری پاشا پیاوێكی زیرەك و ئازا بوو لەرووی نشكێنی و سوار چاكی و بەرێوەبردنی وەك سەرۆك هۆزی دزەیی ناوبانگێكی باشی بۆخۆی تۆمار كردبوو هەم لەگەڵ خەڵكی ناوچەكە و هەم لەرووی پەیوەندی لەگەڵ كەسایەتیە ناسراوەكانی سیاسی و كۆمەڵایەتی پێگەیەكی بەهێزی هەبوو... فراوانی جوگرافیای هۆزی دزەیی لەناوچەی دەشتی هەولێر وەك لە گوندەكانی ١- قوڵتەپەو- كەردز و - سۆربەش و قورشاغلوو - قازی خانە و- گەرشێخان و چێربەشە و ئۆمەراوە كە ژمارەی گوندەكانیان (٤٢) گوند دەبوون وەك دەگێرنەوەبەهۆی دەوڵەمەندی ئەحمەد پاشای باوكییەوە و بەهۆی دەوڵەمەندی دزەییەكانەوە ئەو گوندانە ئاوەدان

کراوەتەوە هەر برایەکیان و کوڕێکیان کەژنی هێناوە شوێنێکی وەک گوند لێ ئاوەدان کردۆتەوە و لەدواییدا خەڵکی تری لەناوچەی هەولێر و ناوچە دوورەکاندا لیی نیشتەجێ بوونە و هۆزی دزەییەکان پەیوەندی عەشائیری زۆرباشی لەگەڵ سەرۆک هۆزەکانی وەک: ئاغای زراری و گەردی و تاڵەبانی و ئەتروشی و مەنتک و بلباس و گەراری و بندیان و مامەسێنیدا هەبووە لەرووی ژن و ژنخوازیدا ئەو پەیوەندیە فراوانتر بووە. خدری پاشا هەتا لە رووی پەیوەندی کردنی خزمایەتییەوە کیژی حاجی ئاغای زاخۆیی هێناوە بۆ برازای خۆی دیوەخانەی خدری پاشا دەگێڕنەوە زۆر گەرم و گوڕ بووە قسەی خۆشی تێدا کراوە وە خدری پاشا شیعری فارسی دەزانی و حەزی لە شیعر خوێندنەوە کردووە و زمانی تورکی باش دەزانی و لەهجەی زمانی ئاخاوتنی خدری پاشا زیاتر بە لای سلێمانی دابووە نەک هەولێری وە جل و بەرگیشی کەواو سەڵتە و عەبا بوو هەوری بەریش دەبەست... و قسەخۆش و حەزی لە تێکەڵاوی ناو کرمانجیەتی گوندی دەکرد. جار جارەش مێوانی ناو دیوەخانی ئیزن نەدەدا حەزی دەکرد نانی ئێوارەی لەگەڵدا بخۆن دەینارد (کەباب) بهاتایە لەساڵەکانی حەفتا ئەوکات نان و کەباب زۆر خۆش بوو و خەڵکی گوندیش گەر بهاتبایە شارو بگەڕیایەوە بۆ گوندی خەڵکەکە دەیوت (کەبابت)خوارد ئەگەر بیوتایە (نا) ئەوە دەیانوت چوویتە شاری، ئەگەر وتووبای (نەء) ئەوە دەیانوت نەچوویتە شار -بۆیە (خدری پاشا) لە گوندیەوە دەینارده شار (کەباب) بهاتبایە بۆ میوانەکانی دیوەخانەکەی و لە ساڵەکانی حەفتادا زۆر لە رۆژنامەوانانی بیانی وەک بەریتانی دەهاتنە لای خدری پاشا بۆ گێڕانەوەی مێژووی رووداوەکانی سەردەمانی تەمەنی رابردووی خۆی و دەگێڕنەوە زۆر جار لە دانیشتنی لەگەڵ سەرۆک هۆزە چەکدارەکان و هەتا لەگەڵ پیاوەکانی خۆیدا ئامۆژگاری دەکردن کە کورد - کوردی ئەزیەت نەدات چونکە ئەمڕۆ زروفێکە هاتۆتە پێشمان کە چەک هەڵگرین، بەڵام بۆ دژایەتی و کوشتنی برای کوردی خۆت نەبێ، هەتا دەیوت ئەو پێشمەرگەی دەیگری برای خۆتە کوڕی خۆتە هەوڵ بدە تەسلیمی مەکە هاوکاری بکە، چونکە چەکی دەستی تۆ یا لەرووی لاوازی ماددی یاخود دوژمنداریبە بۆ دژایەتی برای خۆمان بەکاری نەهێنین... خدری پشا لەرووی دۆستایەتییەوە لەگەڵ پێشمەرگەکانی سەردەمانی خۆیاندا زۆر باش بووە چەند جار تووشی رووبەرووی خدری پاشا بوونەتە گاڵتە و قسەی خۆشیان لەگەڵ کردووە و زەخیرەی سلاحی خۆی بۆ پێشمەرگە بەتاڵ کردووە و یاخود لێیانی لاداوە تەقەیان لێک نەکردووە، خدری پاشایان ناسیوە.... خدری پاشا لەنیشانە شکاندن زۆر سەرکەوتوو بووە (جەرەی ئاویی لەسەر شانی ژنی لادێدا) شکاندووە و لەدواییدا بۆشی کڕیونەتەوە... خدری پاشا دووەمین کوڕی ئەحمەد پاشا بووە دایکی کرمانج بووە لە عەشیرەتی (گەراری) بووە، دەگێڕنەوە دەڵێن کە ئەو قسەیەش کە لەو مەجلیسەدا ئامادە بووە کراوە کە ئەویش عەلی ئاغای حەمامیان بووە کە سەرۆک هۆزی موکریان بوو. دەڵێن لە ساڵەکانی چلەکاندا ئەوکاتەی (بارزانی نەمر) لە ئێران بووە لەناو مەجلیسدا مەوزوعێکی هێناوە لەسەر خدری پاشا (بارزانیی نەمر) وتوویەتی لەجوانی و ئازایەتی یەک لە ئاغاکانی دزەیی هەیە خدری پاشای پێ دەڵێن، دەڵێی خەنجەری دەبانە جەوهەری لێ پەیدا دەبێ) و خدری پاشا لە بەیاننامەی یانزەی ئازاریشدا سەردانی (بارزانیی نەمری کردووە چۆتە لای ئەوکاتی ساڵی ١٩٤٤ کە (بارزانیی نەمر) مفاوەزاتی لەگەڵ حکومەتی بەغدادا هەبووە لەکاتی گەڕانەوەی بارزانی نەمر لە بەغدا لە ڕێگادا نزیک هەولێر چۆتە گوندی شێخانان و میوانی (خدری پاشا)ی بووە و بەژمارە ٢٢ کاوڕی کوشتۆتەوە خدری پاشا بۆ بارزانیی نەمر و پیاوەکانی و لەدوای میوانداریدا بارزانیی نەمر بەیاوەری خدری پاشای چۆتەوە هەولێر و سەردانی ماڵی عزەدین مەلافەندی کردووە و بۆ گەڕانەوەشی بارزانیی نەمر، خدری پاشا و عزالدین مەلا فەندی تا شارۆچکەی شەقڵاوە لەگەڵیدا بوونە و بەرێیان کردووە.

رزگار سیبان

# سەلیم قاقا

**شێرزاد عەبدولڕەحمان**

منداڵ بووین، دەچووینە بازاڕی قەیسەری، ئێستاش وا دەزانم ئەوڕۆیە، ئەو قەیسەرییە دنیایەکی جەنجاڵ و تایبەت بوو، ڕێک لە بەرامبەر دەرکی قەڵات، کابرایەکی هەولێری - بە مەعنای تەواو هەولێری - بانگی دەکردێ «ڕەشۆڵە»، ئێستاشێ «دوای تێپەڕبوونی ٣٠ ساڵ» ناتوانم لە بیر خۆمی بەرمەوە، دەنگی نووساوی ئەو هەولێرییە ئێسک سووکە لە گوێم دەزرنگێتەوە، ڕاستە «سەلیم قاقا» هونەرمەندێکی گەورە، یا سیاسەتمەدارێک، یا کەڵە ئەدیبێک نەبوو، ئەندازیارێکی گەورە نەبوو، دەوڵەمەندکی شار نەبوو، بەڵام ئەو هەموو سادەییەی خۆی ڕۆژێ لە ڕۆژان، بوو بە ناوێکی بەرچاو لە ناوە دیارەکانی هەولێر و ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان ژیانی لە هەولێر بە سەر بردبێ «سەلیم قاقا» دەناسێت، بگرە لە ویژدانەوە خۆشی دەوێت و ناتوانێت فەرامۆشی کات.



سەلیم قاقا

کە گوتیان «سەلیم قاقا»ش مرد، لە پڕ گوێی بانگی «ڕەشۆڵە» کانی لە گوێم زرنگایەوە و بۆ چەند ساتێک تێکەڵ بوومەوە بەو ڕۆژانەی، مام سەلیم بە هەرزانتر لە خەڵک ڕەشۆڵەی پێ دەفرۆشتین و مەگەر خوا بزانێت تامی ئەو ڕەشۆڵانە چەند بە لەزەت بوو، چونکە ئەوەندەی پێدا هەڵدەگوت، لە خۆتەوە ڕەشۆڵەت خۆش دەویست

«مام سەلیم» پیاوێکی هەتا بلێی سادە و رووخۆش بوو، نەیدەزانی ڕق و کینە چییە، هەمیشە دڵی بەوە دەکرایەوە کە خزمەتی خەڵکی شارەکە بکات، تەنانەت ئەوەی حەزی لە ڕەشۆڵە بووایە و دەست کورت بایە، دڵی نەدەڕەنجاند و بە خۆڕایی ڕەشۆڵەی دەدایێ.

«سەلیم قاقا» لە ١٩٣١ لە قەڵات لەدایک بوو، هەتا مردیش خوێندەواری نەبوو، جارجار زمانی دەگیرا، بۆیە لە جیاتی «کاک»بە باوکی دەگوت «قاقا» و ئیدی هەر بەو ناوە، ناوی رۆیشت و پێشی شەرم نەبوو.

لە بیرمە جارێکیان لێم پرسی، ئەو هەموو رەشۆڵە لە کوێ پەیدا دەکەی؟

گوتی: لە هەر شوێنێ، کە بزانم رەشۆڵەی لێیە، بە تایبەتی نزیک کەسنەزان «لای قەبرستانەکە» و گەلێک هاورێشم هەن، کە لە هەمان کار هاوکاریم دەکەن و حەزیان لە راوی رەشۆڵەیە، وەک: مام حەردان، پیربالٚ مەلا نادر، عەبوو سەید مودیر، ئەلیاس، رەشید سلێمان.

پێم دەگوت: جگە لە رەشۆڵە؟

دەیگوت: راوی مراوی و تەیرو توار، جگە لە ئەشکەوتەکان و گرتنی کۆتر!

یەکێک لە روخسارە هەرە جوانەکانی ئەو کابرایە ئەوە بوو، کە حەزی لە پیاوەتی بوو، ئەگەر هەژارێک وەفاتی بکردایە (با نەیناسیبا) خۆی دەکردە خاوەن پرسە و دەچوو گۆڕی بۆ هەڵدەکەند و دڵی خاون، مردووی دەدایەوە، هیچ پرسەیەکیش نەبوو «مام سەلیم» بەسەری نەکاتەوە.

شەوانی رەمەزان، سەلیم قاقا، زیاد لە هەموو کات بە بیر خەڵک دەهاتەوە، دەچوون رەشۆڵەیان لێ دەکڕی و بەî کێشکەی کولاو) دەیان فرۆشت و بازاڕی گەرم بوو، جگەلەوەی کە بە هۆی ئەو پیشە میللییەوە، لای هەموو خەڵک خۆشەویست بوو، هاورێی کاسبکارو نوژدارو مامۆستا بوو، کەس نەبوو دڵی برەنجێنێ.

زۆر جار بە گاڵتە پێیان دەگوت، مام سەلیم چەند پارەت دەوێت بەرامبەر بە بەرەڵلاکردنی هەموو رەشۆڵەکان؟ دەیگوت، بە هەر نرخێک لێم بکڕنەوە ئەوانە دەگەڕێنەوە لای من .... پاشان دەیگوت: کاکە بڕواتان بێت ئاسمانی هەولێرێ هەمووی هی منە و راویان دەکەمەوە !! . ناوی گرنگترین باڵندەکانی مام سەلیم بریتی بوون لەî فاتیمە خان، قورنمایی، جۆخورا، رەشۆڵە، قەتێ، کۆتری کێوی ....».

مام سەلیم بەشەو، سەعات (٤) ی بەیانی دەچووە راوە رەشۆڵە و (٥) ی بەیانی لە «قەتەوی» مراوی دەگرت و هەموو پۆلیسەکانی شار دەیانناسی و کەس رێی لێ نەدەگرت بە ئارەزووی خۆی بسوورێتەوە !

«سەلیم قاقا» هەتا مرد بە تەنیا و بێژن و منداڵ ژیانی بردە سەر، پێم دەگوت، وەختی نەهاتووە، دەیگوت، من خۆم خۆش نەژیاوم، تا منداڵیشم لەو خەفەتە ژیان بباتە سەر ....

بەڵام دەیگوت بڕوات بێت رەشۆڵە فرۆشتن هەر بۆ پارە و نانەکە نییە، بەڵکو خوویێکی شیرینە و دڵم پێی دەکرێتەوە .... بە هۆی رەشۆڵە فرۆشتنەوە، هەموو خەڵک خۆشیان دەوێم و هەموو خێزانێک لە هەولێر دەمناسن و رێزم دەگرن.

* لە کۆتاییدا، سڵاو لەو رۆحە پاکەی سەلیم قاقا، کە بەو هەموو سادەییە، بەو هەموو بەرائەتەی خۆی و بەوپەڕی بێنازی چووە ژێر گڵ، لە پاش خۆی هیچی بە جێ نەهێشت بێجگە لە یادو بیرەوەری و خۆشەویستی، ئەوەش لە لای ئەو لە هەموو شتێک گەورەتر بوو ....!

* ئەم بابەتی لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە ٥ ی زستانی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.



# دابونەریتی بەخاکسپاردن

## (لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە لە جوگرافیای شار- هەولێر و عەنکاوە)

ئا: پرشنگ جەمال عەبدوڵلا و دینا یەلدە شابا
شاخەوان مەعروف جەمیل، عومەر عەلی ئەحمەد،
هێمن محەمەد ئیسماعیل

شاری هەولێر، هەر لە کۆنەوە چەند دابونەریتێکی جێماوەی تایبەت بە ناشتنی مردووان و سەردانی گۆڕستانەکانی هەیە، نەریتەکانی بە خاکسپاردن بەو شێوەیەی خوارەوەیە:

کاتێ کەسێک دەمرێ، مردووەکە دەبردرێتە سەر تاتەشۆر و دوو لینگەی لە قوماش دروستکراو دەهێنن و سابوونی لەناو دادەنێن و مردووەکەی پێ دەشۆن، ئەگەر مردووەکە پیاو بێت، ئەوا پیاو دەیشوا، بەلام ئەگەر ژن بێ، ئەوا ژن دەیشوا. دوای شووشتنەکە، مردووەکە دەخرێتە ناو خەلات (کفن). (کفن بریتییە لە خامی سپی)، پاشان دەخرێتە ناو دارەبازە (دارەمەیت) و نوێژی مردووانی لەسەر دەکرێ، دوای کۆتایی هاتنی ئەو کارانە، مردووەکە بە دارەبازەوە هەلدەگیرێ و دەبردرێتە گۆڕستان و دەخرێتە ناو ئەو گۆڕەی بۆی ئامادەکراوە، دوای ئەوەی تەواو گڵی بەسەردا دەکرێ و لەلایەن ئاییینزانێکەوە بەگوێیدا دەخوێندرێ (تەلقین دەدرێ)، دوو کەس بۆ ماوەی (١٠) خولەک لەلای دەمێننەوە، لە پاشان گۆڕەکە بە کەرپووچ هەلدەنێن و دوو کێلی گەورە دەهێنن و (پێشتر تەمۆخی ناو چیاکان بوون و رێکیان دەخستن، بەلام ئێستا بەهۆی قالبەوە لە چیمەنتۆ یان بەردی حەلان دروست دەکرێن)، لەسەر یەکێکیان ناوی مردووەکە و مێژووی مردنی

دەنووسرێ.

بەڵام رووی گۆڕەکە بە ئاراستەی کەعبەیە، دوای سێ رۆژیش پیاوان سەر لە گۆڕەکە دەدەن و هەروەها دوای ئەوانیش ئافرەتان سەردانی دەکەن، سەردانەکەش بە ئاسایی دوای نوێژی عەسران و لە رۆژانی پێنج شەموان دەکرێ، هەروەها بە رۆژێک یان دوو رۆژ بەر لە جەژن، ئەو سەردانانە دەکرێن و لەکاتی سەردانەکانیش سورەتی فاتحە لەسەر گیانی مردووەکە دەخوێندرێ و لە گۆڕستانەکانیشدا چەند قورئان خوێنێک هەن بەرامبەر بڕە پارەیەک لە نێوان پێنج تا دە دینار لەسەر گیانی مردووەکان دەخوێنن.

لەبارەی دابونەریتی بە خاکسپاردن لە شاری عەنکاوەش جیاوازی لە نێوان ئاشووری و کلدانییەکان هەیە.

### دابی ئاشوورییەکان:

کەسوکاری مردووەکە جوان دەیشۆن و خاوێنی دەکەنەوە، ئەگەر مردووەکە کچی عازەب بێ و مێردی نەکردبێ، ئەوا پۆشاکی بووکێنی لەبەر دەکرێ، ئەگەر گەنجیش بێ و هێشتا ژنی نەهێنابێ ئەوا پۆشاکی زاوایی لەبەر دەکرێ.

لەلایەکی دیکەش مردووەکە جوانترین و خاوێنترین پۆشاکی لەبەر دەکرێ و لە پاشان بە قوماشێکی سپی کفن دەکرێ و چەند خورجییەکی قوماشی سپی دەخرێتە هەردوو دەستی و سەریشی بە کڵاوێکی دروستکراو لە هەمان قوماش دادەپۆشرێ و لەسەر خورییەکی دەرکێشراو دادەنرێ، هەروەها هەموو ئەو کەرەستانەی بۆ شووشتنی و دوورینی کفنەکەی بەکارهاتوون، وەک سابوون و لیفکە و تیغی تراش و دەرزی و دەزوو و گوڵاو، لەگەڵی دەخرێنە گۆڕەکەیەوە و نابێ کەسانی دیکە بەکاریان بهێنێ، هەروەها یەکێک لەو شتانەی مردوو لە ژیانیدا شانازی پێوە دەکرد، لەگەڵی دەخرێتە گۆڕەوە، تەنها خاچ نابێ، چونکە یەکێکە لە قەدەغەکراوەکان و ناکرێ بخرێتە ژێر گڵەوە، لەوکاتەی مردووەکەش دەخرێتە ناو گۆڕ رووی (دەم و چاوی) بەهەمان ئەو قوماشە دادەپۆشرێ کەپێی کفن کراوە.

### دابی کلدانییەکان:

لەکاتی مردنی هەریەکێک، دەخرێتە ناو دارەبازەیەک و پۆشاکەکانی بەپێی توانا لەگەڵ دادەنرێ و سندووقەکە کلیل دەدرێ و پاشانیش لە پەتوویەک یان قوماشێکی سپی لوول دەدرێ و مردووەکەش ناشۆردرێ. لەکاتێک ئەگەر مردووەکە یەکێک لە پیاوانی ئایینی، وەک قەشە یان شەماس بێ، ئەوا رێوڕەسمی ئایینی تایبەتی لەناو کڵێسە، بەمەبەستی بەرزکردنەوەی پایەی ئایینی بۆ دەکرێ، ئەویش ئەوەیە کە دارەبازەکە هەڵدەگیرێ و بە ئەستووندەکانی کڵێسە دادەخشێنرێ لەگەڵ خوێندنەوەی هەندێ دوعای تایبەت بەو بۆنەیە، بەڵام ئەگەر مردووەکە لە خەڵکانی رەش و رووت بوو، ئەویش رێوڕەسمی تایبەتی خۆی هەیە کە لە کڵێسەدا ئەنجام دەدرێ، بەوە دەست پێدەکات کە قەشەی لێپرسراو ئاگادار دەکرێتەوە بۆ ئەوەی لە رێوڕەسمی ناشتن و نوێژ کردن لەسەر مردوو ئامادە بێت، تەرمەکە لەناو سندووقێکی لەدار دروستکراو دادەنرێ و بە کەژاوە، کە قەشە لەپێشیانەوە دەڕوا، تەرمەکە دەبردرێتە کڵێسە و چەند دوعایەکی ئایینی دەخوێنێتەوە، کەسوکاری یان خزمانی مردووەکەش لەگەڵ تەرمەکە دەڕۆن و بەر لەوەی بگەنە کڵێسە بەماوەیەک، زەنگی کڵێسە چەند جارێک بە پچڕ پچڕی و خەمباری لێدەدا و بەوەش خەڵکان دەزانن رووداوێکی مردن روویداوە و ئەوانەی بیانەوێ ئامادەبن ئامادە دەبن و هاوبەشی لە رێوڕەسمی نوێژی مردووان دەکەن.

نوێژ لەسەر گیانی مردووەکە لە کڵێسە دەکرێ و دواتر هەڵدەگیرێ بۆ گۆڕستان و لەوێ بە ئامادەبوونی قەشە دەنێژرێت، دوای چل رۆژ نوێژی چلە و هەروەها نوێژی سوننەت لەسەر گیانی مردووەکە دەکرێت. لە گۆڕستانەکەش چەند گۆڕێکی ئامادەکراو هەن و مردوو لەناو یەکێکیان و بەپێی ریز بوونیان دەشاردرێتەوە، ئەگەر دوای بەسەرداڕۆیشتنی کاتێکی زۆر یەکێکی دیکە لەو خێزانە مرد، ئەوا بە ئارەزوو و رەزامەندی خۆیان مردووەکە لەهەمان گۆڕ دەنێژن، کڵێسەش رۆژی هەینی، کە دەکەوێتە پێش نوێژی گەورە و ناودەبردرێ بەهەینی مردووان، تەرخان دەکرێ بۆ گێڕانی رێوڕەسم و دوعای تایبەتی لە کڵێسەکان لەسەر گیانی تێکڕای مردووەکان و هەر لەو رۆژەش نوێژی

مردووان دەكرێ، وەک نەریتێکیش وا باوە کە ئافرەتان لەو بۆنەیەدا گۆڕی مردووەکانیان بەداگیرساندنی چەند مۆمێک ڕووناک دەکەنەوە و چەند دەسکە گوڵێکیش لەسەر گۆڕەکان دادەنێن.

پێشتر وا باو بوو ئافرەتەکان سەردانی گۆڕەکانیان دەکرد و پرچ و ڕووی خۆیان دەڕناندەوە و بۆ ماوەی سالێک خۆیان ڕەشپۆش دەکرد، بەڵام کلێسە ئەوەی قەدەغە کرد، هەروەها ئەوەشی قەدەغە کرد کە ئافرەتان لەگەڵ تەرمی مردووەکە بۆ کلێسە و گۆڕستان بڕۆن، ماوەی پرسە دانانیش بۆ پیاوان و ئافرەتان سێ ڕۆژە، ئەگەرچی پرسەی ئافرەتان لەم ماوەیە زیاتر دەخایەنێ.

لەبارەی ڕووی گۆڕەکەش، سەری بۆ لای ڕۆژئاوا و لاقەکانی بۆ لای ڕۆژهەڵات دەبن، پاشان گۆڕەکە بەگڵ پڕ دەکرێتەوە و دوای ئەوەش کرداری ڕازاندنەوەی گۆڕەکان دێت کە هەریەکە و بەگوێرەی توانای خۆی دەیکا، لەسەر هەر گۆڕێکیش ناوی مردووەکە و ڕۆژی مردنەکەی دەنووسرێ[1].

### گۆڕستانەکان لە لێکۆڵینەوەکانی جواگرافیایی

گۆڕستانەکان یەکێکن لەو خزمەتگوزارییە گشتییە پێویستییانەی دەبێ لە شاردا دەستەبەر بکرێ، بۆیە و لەبەر بەها ئایینی و سۆزێتییەکان ڕووبەرێکی زۆر لە شارەکان دەگرنەوە، فراوان بوونی ئاسۆی شارەکانیش وای کردووە لەو ڕووبەرە تێپەڕێنێ، کە بۆ گۆڕستانەکان تەرخان کراوە، زۆر جاریش گەڕەکەکان لە تەنیشت گۆڕستانەکان دروست دەکرێن و وای لێهاتووە هاووڵاتی لە شارە گەورەکان نەتوانێ بە ئاسانی شوێنێک پەیدا بکات بۆ ئەوەی مردووەکەی خۆی لێ بنێژێ. ئەوەش لەکاتی ڕێکخستنی شارەکان و گەشە پێکردنیاندا پێویستییەکی ئەوتۆ دەهێنێتە کایەوە، کە خۆ دوور بخرێتەوە لەو مەترسییانەی لە ئەنجامی بوونی چەند گۆڕستانێکی نارێک لە گەڕەکە ئاوەدانەکانی شار، دێنە بەردەم. کەواتە ڕێکخستنی گۆڕستانەکان تەنها ئەوە نییە لەلایەن دەسەڵاتە کارگێڕییەکان بایەخی پێبدرێ، بەڵکو کارێکی هاوبەشە، هەریەکە لە هاووڵاتی و پسپۆڕ و کارگێڕ لەلایەن خۆیەوە لە دۆزینەوەی چەند چارەسەرییەکی گونجاو هاوبەشی دەکەن[2].

بەڵام لەبارەی ڕۆڵی زەویناسەکان لە لێکۆڵینەوەی گۆڕستانەکان وەک گرفتێکی ڕێکخەرییانە و کۆمەڵایەتییە لە شارەکاندا.

ئەو بابەتە لایەنە کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکانی، لەکاتی دروستکردنی گۆڕستانەکان و هەڵبژاردنی شوێنەکانیان، چارەسەر کردووە و لایەنەکانی یاسایی پەیوەست بە بەردەوام بوونیان یان لابردنیان و پۆلێن کردنیان بەگوێرەی ڕووبەریان و شوێنی مانەوەیان و مەترسییە جیاجیاکانیان دەرخستووە.

هەروەها و بەتایبەتی ئەو کردارە بایەلۆژی و کیمیاوییانەی لێکدی جیاکردۆتەوە لە دوای ناشتن ڕوو دەدەن و کار دەکەنە سەر گڵ و ئاوی ژێر زەوی، لە پاشان بەهۆی ئەو بابەتە گفتوگۆ کرا لەسەر پڕۆژەکانی پەیوەندیدار بە پێشکەوتنی گۆڕستانەکان و لابردنی زیانەکانیان، ئەوەش لە ڕێگای هەڵبژاردنی چەند شوێنێکی پێشوەختی لەبار بۆ ڕێکخستنی پرۆسەکانی بە خاکسپاردن لەو شوێنانەی بە ئاسانی خەڵک دەتوانێ بیانگاتێ و سەردانیان بکات و کەم زیانن و ڕواڵەتیان لەگەڵ دەوروبەر گونجاوە و کەشوهەوا و گیانێکی لەبار بۆ ئەو کەسانەی سەردانیان دەکەن دابین بکەن، بە تایبەتی لە کاتی ئەو سەردانانەی کە هەردەم دووبارە دەبنەوە و لە ڕاستیدا بەشێکی زۆر لەکاتی کەسوکار و خزمانی مردووی گۆڕستانەکان وەردەگرن[3].

### دابەش بوونی جوگرافیایی گۆڕستانەکانی هەردوو شاری هەولێر و عەنکاوە

بەر لەوەی لەبارەی دابەشبوونی جوگرافیایی گۆڕستانەکانی شاری هەولێر بدوێین، پێویستە ئەوە بزانین، کە گۆڕستانەکان بریتین لە زەوی ئامادەکراو بۆ ناشتنی مردووان، پێناسەیەکی دیکەش بۆ گۆڕستانەکان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بریتییە لەو زەوییە تەرخانکراوە بۆ مردووان و دەکەونە ژێر باری حوکمەکانی دەستووری ئیسلام و لە تۆماری زەوییە وەقفەکان تۆمار دەکرێن، بە گوێرەی ڕێکەوتننامە نێو دەوڵەتییەکان پارێزگاری کردن لێیان، دەکەویتە ئەستۆی تێکرای

موسـڵمانان و بە تایبەتیش فەرمانگەی ئەوقاف و بە گوێرەی یاسا و دەستووری ئیسلام[٤].

**دابەشبوونی جوگرافیایی گۆڕستانەکانی شاری هەولێر:**

**١- گۆڕستانی گەورە:** دەکەوێتە ناوەندی شـار و ئەو ناوچەیەی دەوروبەری بە ناوی شەقامی شێخەڵلا دەناسرێ و رووبەرەکەی دەگاتە ٣٣٨٠٠ مەتری چوارگۆشە و یەکێکە لە کۆنترین گۆڕستانەکانی شاری هەولێر، ئەوەش بەو بەڵگەیەی کە زۆربەی کەسایەتییەکانی شاری هەولێر لەو گۆڕستانە شاردراونەتەوە، گەورەیی ئەو گۆڕستانەش ئەوە دەسەلمێنێ، کە شاری هەولێر پێشتر گەورە و فراوان بووە، ئەو گۆڕستانەش لە شەستەکاندا یەکجار فراوان بووە، بەلام شارەوانی هەولێر هەندێ لە گۆڕەکانی گواستەوە ئەوەش لەبەر کردنەوە و قیرتاو کردنی شەقامەکان و دروستکردنی دوکانەکانی شێخەڵلا[٥].

**٢- گۆڕستانی چراغ:** دەکەوێتە ناوەندی هەولێر، پشت دەزگای شەهید لە رۆژئاوایدا سەیرانگای گلکەند و لە رۆژهەلاتی گەڕەکی ئاشتی و لە سەرووی گۆڕستانی گەورە و لە خوارووشی قوتابخانەی کرمانج دەورەیانداوە، رووبەرەکەی نزیکەی دەگاتە ٢٧٥٠٠ مەتری چوارگۆشە، هۆی ناو لێنانی ئەو گۆڕستانەش بە ناوی چراغ دەگەڕێتەوە بۆ ئەو چیرۆکەی کە خەڵکی هەولێر لە نێوان خۆیاندا باسی دەکەن و دەڵێن: شەوانی هەینی رووناکی دەهێنرێت بۆ ئەو هاوڵ و پیاوچاک و شێخانەی لەوێ نێژراون، کۆنترین گۆڕیش لەو گۆڕستانەدا، گۆڕی خوالێخۆشبوو (مەحمود ئاغا پیرداود)ەو لەسەر گۆڕەکەشی ئەو رستەیە نووسراوە: "ئەوە گۆڕی مەحمود ئاغایە لە بەهاری ١٢٦١ کۆچی دوایی کردووە و هەر لەو رێکەوتەشدا ئەو گۆڕە دروست کراوە)[٦].

**٣- گۆڕستانی شێخ نۆمەر:** ئەو گۆڕستانە دەکەوێتە نزیک تەکیەی شێخ عەبدولکەریم و نزیک خانووی عەتا ئاغای گەڕەکی خانەقا، رووبەرەکەی نزیکەی ١٦٢٥٠ مەتری دووجا دەگرێتەوە و مەزارگەی ئەو شێخەی تێدایە و بە مەبەستی دوعاکردن سەردانی گۆڕەکەی دەکەن و دەڵێن: (یا شێخ ئامادەین یان نیسک یان گیسک)، ئەو گۆڕستانەش لە سەرەتادا تایبەت بوو بە دانیشتوانی گەڕەک، بەلام دواتر بووە گشتی و بۆ تێکڕای خەڵک[٧].

**٤- گۆڕستانی شێخ مەعروف:** دەکەوێتە گەڕەکی باداوە و لەسەر ئەو رێگایەی دەچێتە کۆمەڵگای بنەسلاوە، گۆڕی شێخ مەعروف خۆشی دەکەوێتە ئەو گۆڕستانە و بە ناوی خۆشی ناسراوە، رووبەری زەویەکەی نزیکەی ١٠٧٠٠ مەتری دووجای داگیر کردووە، دەڵێن شێخ مەعروف خەڵکی پەلکە رەشەی سەر بە کۆیەیە و یەکێک دەستدرێژی کردۆتە سەر و شێخیش دوعای لێکردووە، خودا یەکسەر دوعایەکەی پەسند کردووە[٨].

**٥- گۆڕستانی شێخ ئەحمەد:** ئەو گۆڕستانە دەکەوێتە گەڕەکی شێخ ئەحمەد و سەر رێگای کۆیە، نزیک نەخۆشخانەی رزگاری، رووبەرێکی زەوی نزیکەی ٤٣٦٠٣ مەتر دووجای داگیر کردووە، ناوەکەشی لەوەوە هاتووە، کە گۆڕی شێخ ئەحمەد خۆی دەکەوێتە ناو ئەو گۆڕستانە، ئەوەش یەکێک بوو لە گۆڕستانە دوورەکانی شار، بەلام بەهۆی ئەو فراوان بوونە ئاسۆییەی شار لەو دوایەدا هەندێ لە ماڵەکان بە گۆڕستانەوەکە نووساون[٩].

**٦- گۆڕستانی شێخ محەممەدی خۆراسانی:** ئەو گۆڕستانە دەکەوێتە تەنیشت جباتی پزیشکانی هەولێر نزیک سەیرانگای گلکەند لە گەڕەکی عەرەب، بۆیەش بەو ناوە دەناسرێ، چونکە گۆڕی شێخ محەممەدی خۆراسانی دەکەوێتە ناو گۆڕستانەکە، رووبەرەکەشی نزیکەی دەگاتە ٢٥٢٥ مەتری دووجا، لە ناوەکەشییەوە وا دەردەکەوێ ئەو شێخە ئێرانی بێ[١٠].

**٧- گۆڕستانی ئیمام محەممەد:** دەکەوێتە گەڕەکی عەرەب بەرامبەر منارەی چۆلی و پشت ئوتێلی هەولێر، ئەوەش یەکێکە لە گۆڕستانە کۆنەکان و گۆڕێکی یەکجار زۆری تێدا کەڕەسیسە بووە، بەجۆرێک هەر شوێنێکی تێدا هەڵبکەندرێ ئێسکی مردووانی تێدا دەردەکەوێ، گەلێک راوبۆچوونیش لەبارەی ناوی ئەو ئیمامە هەیە، دکتۆر موحسین محەمەد دەڵێ: لە پاسەوانی گلکۆکەیم بیست، کە ناوی - محەمەد حەنەفی) یان (محەمەد غەزالی)یە، لەوانەشە شێخ محەمەد کرێدی لەو گۆڕستانە شاردرابێتەوە،

تاكو ئێستاش مردووی تێدا دەشێردرێتەوە بەتایبەتی ئەو خێزانانەی چەند گۆڕێكی شوورەبەندیان تێدا هەیە، لەو گۆڕستانەشدا مێژوونووسی كورد (حوزنی موكریانی) و براكەی مامۆستا (گیوی موكریانی) بەخاك سپێردراون[١١].

**٨- گۆڕستانی بەستەپیازە:** ئەو گۆڕستانە دەكەوێتە گەڕەكی بەستەپیازە و سەر ڕێگای شەقلاوە، ڕووبەرەكەی دەگاتە ١٢٠٦٥ مەتری دووجا، یەكەم تەرمیش لەو گۆڕستانەدا لە ساڵانی پەنجاكانی ئەو سەدەیە شاردراوەتەوە، ئەو گۆڕستانە بەناوی گۆڕستانی (سلە ئاغا)ش ناسراوە، وای لێهاتووە تێكەڵاو بەكاروباری دانیشتووانی ئەو ناوچەیە بووە و كۆمەڵێكی زۆر خانوو دەوریان داوە، بۆیەش دەبێ ناشتن لەو گۆڕستانەدا رابگیرێ[١٢].

**٩- گۆڕستانی شێخەڵلا:** ئەو گۆڕستانە دەكەوێتە، تەنیشت شەقامی شێخەڵلا و پشت سینەمای حەمرا و ناو ناوچەی بازرگانی ناسراو بە (شێخەڵلا)، ڕووبەری نزیكەی دەگاتە ١١٣٩٢ مەتری دووجا، ئەو گۆڕستانەش، بۆیە بەو ناوە ناونراوە، چونكە شێخەڵلا خۆی لەو گۆڕستانە بەخاك سپێردراوە، نەشمانتوانی زانیاری زیاتر لەبارەی ئەو گۆڕستانە و مێژووی ژیانی شێخەڵلا بەدەست بێنین[١٣].

**١٠- گۆڕستانی باكوور:** ئەو گۆڕستانە دەكەوێتە سەر (١٠٠) مەتری و دەرەوەی مەڵبەندی هەولێر، ڕووبەرەكەی نزیكەی دەگاتە ٢٨٣٥٠٠ مەتری دووجا، خاوەنی ئەو گۆڕستانەش بەڕێوەبەرێتی شارەوانی هەولێرە و لە ساڵی ١٩٨٠ لەلایەن شارەوانی هەولێر دروست كراوە، ئەو گۆڕستانەش نزیكەی بۆ ٢٥٠٠ گۆڕ تەرخان كراوە[١٤].

**١١- گۆڕستانی خواروو:** ئەو گۆڕستانە دەكەوێتە سەر ڕێگای مەخموور و دەرەوەی مەڵبەندی هەولێر، كە بە گۆڕستانی كارگەی قیریش ناسراوە، ڕووبەرەكەی نزیكەی دەگاتە ٢٢٢٥٠٠ مەتری دووجا و بەڕێوەبەرێتی شارەوانی هەولێر خاوەنیەتی و لە ساڵی ١٩٨٤ لەلایەن شارەوانی هەولێر دروست كراوە، ئەو گۆڕستانەش نزیكەی بۆ ١٨٠٠ گۆڕ تەرخان كراوە و هاووڵاتیان بەهۆی مۆركردنی پەیمانێك لەگەڵ شارەوانی هەولێر دەتوانن ڕووبەرێكی دیاریكراو وەدەست بێنن[١٥].

سەرەڕای ئەو گۆڕستانانەی باسمان كرد، چەند گۆڕستانێكی دیكەش هەنە، وەك گۆڕستانی شێخ مەلا ڕەشید لە گەڕەكی تەیراوە، كە ڕووبەرەكەی نزیكەی ٣٠٢٦ مەتری دووجایە، گۆڕستانی بێش بەرماق لەسەر شەقامی ئیبن مستەوفی لە گەڕەكی تەیراوە و نزیك بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردەی هەولێر، كە ڕووبەرەكەی دەگاتە ٧٥٠ مەتری دووجا، گۆڕستانێكی دیكەش دەكەوێتە پشت شارەوانی هەولێر، كە تایبەتە بەناشتنی منداڵان. هەروەها گۆڕستانی ئەحمەد چەلەبی، كە دەكەوێتە پشت ساختمانی جڤاتی كرێكاران (نەقابەی كرێكاران)، ئەوەش تایبەتە بە خانەوادەی چەلەبییەكان لە هەولێر، گۆڕستانی حەیدەری كە دەكەوێتە سەر شەقامی شێخەڵلا و تایبەتە بەخانەوادەی حەیدەرییەكان. هەروەها گۆڕستانی شێخ مستەفاش هەیە. بڕوانە خشتەی ژمارە (١).

## دابەشبوونی جوگرافیایی گۆڕستانەكانی عەنكاوە

**١- گۆڕستانی قسرا:** ئەوە بریتییە لە گردێك ڕووبەرەكەی نزیكەی ١٥٠٠ مەتری دووجایە و دەكەوێتە بەشی باكووری عەنكاوە، كۆنترین گۆڕستانە لە عەنكاوە، ناشتنی مردوو لەو گۆڕستانە وەستێندراوە و هەر لە ساڵی ١٩٧٤وە مردووەكان دەبەنە گۆڕستانی نوێ.

**٢- گۆڕستانی مارت شمونی:** ئەو گۆڕستانە تایبەت بوو بە ئاشوورییەكان، ڕووبەرەكەی نزیكەی ١٠٠٠ مەتر دووجایە، ژمارەی گۆڕەكانی نزیكەی ٥٠ گۆڕە و دەكەوێتە باكووری گۆڕستانی قسرا و نزیكەی ١٥٠ مەتر لێی دوورە، لەو گۆڕستانەش ناشتن وەستێندراوە و بەشێك لەو گۆڕستانە كراوەتە خانووی تایبەت بە مەزارگەكە و بەهەمان ناو (مەزارگەی مارت شمونی)، شێوەی ئەو گۆڕستانەش لاكێشەیە.

**٣- گۆڕستانی ناو حەوشەی كلێسەی مار گۆرگیس:** ئەو گۆڕستانە دەكەوێتە ناو حەوشەی كلێسە و كلێسەش دەكەوێتە لای ڕۆژئاوای گۆڕستانی قسرا، ڕووبەرەكەی

**خشتەی ژمارە (١)**

**شوێنی گۆڕستانەکانی هەولێر و رووبەر و تێکڕای چڕی بە خاکسپاردنیان دەردەخا**

| ز | ناوی گۆڕستانەکان | شوێنی | رووبەر/ مەتر دووجا | تێکڕای چڕی بە خاکسپاردن بۆ هەر ١٠٠م٢ |
|---|---|---|---|---|
| ١ | گۆڕستانی گەورە | مەلبەندی شار-شەقامی شێخەللا | ٣٣٨٠٠ | ٣٩ |
| ٢ | گۆڕستانی چراغ | مەلبەندی شار-پشت دەزگای شەهید شەقامی ٣٠مەتری | ٢٧٥٠٠ | ٣٧ |
| ٣ | شێخ ئۆمەر | مەلبەندی شار- گەڕەکی خانەقا | ١٦٢٥٠ | ٣٦ |
| ٤ | شێخ مەعرووف | دەرەوەی مەلبەندی شار - گەڕەکی باداوە | ١٠٧٠٠ | ٣٤ |
| ٥ | شێخ ئەحمەد | دەرەوەی مەلبەندی شار-گەڕەکی شێخ ئەحمەد | ٤٣٦٣ | ٣٨ |
| ٦ | شێخ محەمەد خۆراسانی | گەڕەکی عەرەب - تەنیشت سەیرانگای گلکەند | ٢٥٢٥ | ٢٠ |
| ٧ | ئیمام محەمەد | گەڕەکی عەرەب | ٢٤٦٠٠ | ٣٥ |
| ٨ | بەستەپیازە | گەڕەکی بەستەپیازە - رێگای شەقلاوە | ١٢٠٦٥ | ٢٨ |
| ٩ | شێخەللا | شەقامی شێخەللا- پشت سینەمای حەمرا | ٨٠٠ | ٣٠ |
| ١٠ | شێخ مەلا رەشید | گەڕەکی تەیراوە | ٣٠٢٦ | ٢٨ |
| ١١ | پێش بەرماق | شەقامی شێخ مستەوفی - گەڕەکی تەیراوە | ٧٥٠ | ٧ |
| ١٢ | گۆڕستانی باکوور | شەقامی ١٠٠ مەتری | ٢٨٣٥٠٠ | ١١ |
| ١٣ | گۆڕستانی خواروو | رێگای مەخموور | ٢٢٢٥٠٠ | ١٥ |
| ١٤ | حەیدەری | شەقامی شێخەللا | ٥٠٠ | ٤ |
| ١٥ | ئەحمەد چەلەبی | پشت نەقابەی کرێکاران - گەڕەکی سۆران | ٧٦٠ | ٨ |
| ١٦ | شێخ مستەفا | گەڕەکی خانەقا | ٦٠٠ | ٤ |

* ئەم زانیارییانە لەلایەن تیپی تۆژینەوە و وەزارەتی ئەوقاف/ بەڕێوەبەرێتی موڵکایەتی بەدەست هاتووە.

نزیکەی ٦٠٠ مەتر دووجایە دەبێ، ئەو گۆڕستانەش تایبەت بوو بە ناشتنی مردووی ئەوانەی پارچە زەوی و خانوویان پێشکەش بە کلێسە دەکرد، کەچی قەشەکان لەناو کلێسە مردووەکانی خۆیان بەخاک دەسپێرن، شێوەکەشی لاکێشەیە.

**٤- کلێسەی مار یوسف:** ئەو کلێسەیە دەکەوێتە ناوەڕاستی عەنکاوە و ئەو شەقامە گشتییەی لە هەولێرەوەدێت، تەنها گۆڕێک لەناو ساختمانی کلێسەدا هەیە، ئەویش گۆڕی یەکێک لە مەترانەکانە.

**٥- گۆڕستانی نوێ:** دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای شارۆچکەکە و لە ساڵی ١٩٦١ز کراوتەوە، ڕووبەرەکەی نزیکەی ١٥٠٠ مەتری دووجا دەبێ و ژمارەی گۆڕەکانیشی نزیکەی ١٥٠٠ گۆڕە.

تاکو ساڵی ١٩٧٠ کاری میللی تێدا دەکرا و دوای ئەوە لیژنەی ئەوقاف چین چین گۆڕەکانی ئامادە دەکرد، کە هەر چینەی لە نێوان ٤٠ - ٦٠ گۆڕ بوو، ئەو گۆڕانەش بەهۆی هەڵکۆلەر ئامادە دەکرێن و لە پاشان لە ڕێگای بەڵێندانەوە، هەندێ جاریش لە ڕێگای بەکرێ گرتنی کرێکارانەوە، بەبلۆک و چیمەنتۆ چاک دەکرێن، شێوەی گۆڕستانەکەش لاکێشەییە، ئەو گۆڕستانەش بۆ تێکڕای خەڵکە، تەنها پیاوە ئاینییەکانی لێ دەرچێ، چونکە ئەوان بە خاکسپاردنیان لەناو کلێسەیە[١٦].

بڕوانە خشتەی ژمارە (٢)

**پۆلێن کردنی گۆڕستانەکانی هەردوو شاری هەولێر و عەنکاوە**

ئەگەر سەیری شاری هەولێر بکەین، گەلێک گۆڕستانی تێدا دەبینین، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر فراوانی شارەکە، بۆیە گۆڕستانەکانی شاری هەولێر بە گوێرەی چەند پێوەر و بنەمایەکی جیاجیا دەبنە چەند جۆرێک لەوانەش:

یەکەم/ لە ڕووی کۆنی و تازەییەوە دەتوانین بیکەینە دووبەش:

أ- گۆڕستانە کۆنەکان: مەبەستمان لە گۆڕستانە کۆنەکان ئەو گۆڕستانانەیە کە مێژووی بوونیان دەگەڕێتەوە بۆ بەر لە حەفتاکان و لەناو نەخشەی بنەڕەتی شاری هەولێردا نینە و کوێرانە لێدراون، کە

**خشتەی ژمارە (٢)**

**شوێنی گۆڕستانەکانی عەنکاوە و ڕووبەر و چڕی گشتیان دەردەخا**

| ز | ناوی گۆڕستان | شوێنی | ڕووبەر/ م٢ | چڕی گشتی |
|---|---|---|---|---|
| ١ | قسرا | لە بەشی باکووری عەنکاوە | ١٥٠٠ | (*) |
| ٢ | مارت شمونی | دەکەوێتە باکووری گۆڕستانی قسرا بەدووری ١٥٠م | ١٠٠٠ | ٥٠ |
| ٣ | گۆڕستانی کلێسەی مار گۆرگیس | دەکەوێتە ناو حەوشەی کلێسە و کلێسەش دەکەوێتە لای ڕۆژئاوای گۆڕستانی قسرا | ٦٠٠ | (**) |
| ٤ | مار یوسف | لە ناوەڕاستی عەنکاوە لەسەر ئەو شەقامە گشتییەی لە هەولێرەوە دێت | - | یەك گۆڕ |
| ٥ | گۆڕستانی نوێ | دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای شاری عەنکاوە | ١٥٠٠ | ١٥٠٠ |

(*) لەبارەی گۆڕستانی قسرا چڕییەکەی دەرنەهێنراوە، چونکە لە ساڵی ١٩٧٤دوە مردووی تێدا ناشرێتەوە و بۆ گۆڕستانی نوێ گوێزراونەتەوە.

(**) لەبارەی گۆڕستانی مار گۆرگیس چڕیەکەی دەرنەهێنراوە، چونکە گۆڕەکان بە چیمەتۆ داپۆشراون و دەبێ ئەوەش بزانین کە ناشتن لەسەر گۆڕە کۆنەکان ڕوو دەدەن.

بریتین لەو گۆڕستانانەی خوارەوە.
(گۆڕستانی گەورە، چراغ، ئیمام محەمەد، شێخ محەمەد خۆراسانی، پێش بەرماق، شێخ ئۆمەر و گۆڕستانی شێخەڵلا).
**ب- گۆڕستانە تازەکان:** مەبەستمان لەو گۆڕستانانەیە کە بەگوێرەی نەخشەی بنەڕەتی شاری هەولێر هەڵبژێردراون و بریتین لەو گۆڕستانانەی خوارەوە:
(گۆڕستانی باکوور، گۆڕستانی خواروو، بەستەپیازە، شێخ مەلا ڕەشید، شێخ مەعرووف و گۆڕستانی شێخ ئەحمەد).
دووەم/ پۆلێن کردنی گۆڕستانەکان بە گوێرەی قەوارە و توانای بەخۆوەگرتنیان:
**أ- گۆڕستانە گەورەکان:** ئەو گۆڕستانانەن کە ڕووبەریان لە (٢٥٠٠٠) مەتری دووجا زیاترە و ئەو گۆڕستانانە دەگرێتەوە:
گۆڕستانی باکوور، گورستانی خواروو، ئیمام محەمەد، شێخ ئەحمەد، چراغ، گۆڕستانی گەورە.
**ب- گۆڕستانە گچکەکان:** ئەو گۆڕستانانەن کە ڕووبەریان لە (٢٥٠٠٠) مەتری دووجا کەمترە و ئەو گۆڕستانانە دەگرێتەوە:
گۆڕستانی شێخ مەلا ڕەشید، پێش بەرماق، شێخ مەعروف، شێخ محەمەد خوراسانی، بەستە پیازە، گۆڕستانی شێخەڵلا.
سێیەم/ پۆلێن کردنی گۆڕستانەکان بۆ گۆڕستانی تایبەتی و گشتی:
**أ- گۆڕستانە گشتییەکان:** ئەو گۆڕستانانەن، کە ڕێگا بە تێکڕای خەڵک دەدرێ مردووەکانیان تێدا بە خاک بسپێرن و تایبەت نین بە خانەوادەیەک یان توێژێکی دیاری کراو.
**ب- گۆڕستانە تایبەتییەکان:** ئەوانەش ئەو گۆڕستانانەن کە ڕێگا بە تێکڕای خەڵک نادرێ، مردووی تێدا بشارنەوە، تەنها خانەوادەیەک یان کۆمەڵێکی دیاریکراو دەتوانن مردووەکانی خۆیان تێدا بە خاک بسپێرن، هەروەها ئەو دیاردەی تایبەتمەندییەش لەناو گۆڕستانە گشتییەکانیش بەرچاو دەکەوێ، کە دەبینین چەند خێزانێکی دیاریکراو هەندێ ناوچەی ئەو گۆڕستانانە بۆ خۆیان دادەبڕن و لە چواردەوریدا شوورە دروست دەکەن و مردووەکانی خۆیان لەناو ئەو ناوچە شوورەکراوانە بە خاک دەسپێرن، ئەوەی شایانی باسیشە ئەو جۆرە گۆڕستانانە لە شاری هەولێر خەریکە لەناو دەچن.
بڕوانەخشتەی ژمارە (٢)
چوارەم/ گۆڕستانە لەناوچووەکان: ئەو گۆڕستانانەن، کە لەبەر چەندین هۆی وەک فراوانبوونی ئاسۆیی شار یان نەگونجانی لەگەڵ یاساکانی پلانرێژی و پێویست بوون بەو زەوییانە بۆ خۆ دوورخستنەوە لە چەندین تەنگژەی، وەک تەنگژەی نیشتەجێ بوون و تەنگژەی بازرگانی و خزمەتگوزاری، لەناوچونە، بۆ زیاتر زانیاریش زۆربەی گۆڕستانە لەناوچووەکان، لە جۆری گۆڕستانە قەوارە گچکەکان بوون و دەکەوتنە ناوەڕاستی شار یان نزیک مەڵبەندی شار کە بەو شێوەیەی خوارەوە بوو:
**١- گۆڕستانی جوولەکەکان:** ئەوە یەکێکە لە گۆڕستانە کۆنەکان و تایبەتە بە جوولەکەکان، دەکەوێتە گەڕەکی ئاشتی بەرامبەر دەزگای شەهیدی ئێستا، ئەو گۆڕستانەش تاکو بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی هەر مابوو، حکومەتی عێراقی ئەوکات، دوای کۆچ کردنی جوولەکەکانی ئەو شارە، هەوڵیدا ئەو گۆڕستانە تێکبدات، بەڵام یاسا و دەستووری ئایینی ڕێی بەتێکدانی نەدا، تەنها دوای دەرچوونی یاسا لە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی هەولێر، کە بەگوێرەی ئەو یاسایە ئەو گۆڕستانە تێک درا و هەندێ لە لاشەکان گوێزرانەوە بۆ چەند گۆڕستانێکی دیکە و ئێستا ئەو ناوچەیە بە گەڕەکی ئاشتی (سەیداوە) ناسراوە[17].
**٢- گۆڕستانی جوولەکەکان:** ئەو گۆڕستانەش دەکەوتە شەقامی شێخەڵلا، هەروەها گۆڕستانی خانەقا لە مەڵبەندی ئاگر کوژێنەوەی خانەقا، کە هەردوو گۆڕستانەکە لە ئەنجامی فراوانبوون و پەرەسەندنی بیناسازی شاری هەولێر تێک دراون[18].
بەڵام لەبارەی پۆلێن کردنی گۆڕستانەکانی شاری عەنکاوە، گۆڕستانەکانی لە ڕووی کۆنی و تازەییەوە دەکرێنە دووبەش:
یەکەم/ گۆڕستانە کۆنەکان: گۆڕستانی قسرا، مارت شمونی، مار گۆرگیس دەگرێتەوە.
دووەم/ گۆڕستانە تازەکان: گۆڕستانی نوێ و گۆڕستانی کلێسەی مار یوسف دەگرێتەوە.

**پەراوێزەکان:**
١- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی توێژینەوەیە.

**خشتەی ژمارە (٢)**

**ئەم نەخشەیەش گۆڕستانە کۆن و تازەکان و گەورە و گچکەکان و تایبەت و گشتییەکان دەردەخا(*)**

| | |
|---|---|
| **گۆڕستانە کۆنەکان -A** | **گۆڕستانە تازەکان -B** |
| **گۆڕستانی گەورە، شێخەڵڵا، چراغ، ئیمام محەمەد، شێخ محەمەد خۆراسانی، پێش بەرماق، شێخ ئۆمەر، ئەحمەد چەڵەبی، شێخ مستەفا و حەیدەری** | **گۆڕستانی باکوور، خواروو، شێخ مەلا ڕەشید، شێخ مەعرووف، شێخ ئەحمەد و بەستە پیازە** |
| **گۆڕستانە گەورەکان - C-**<br>**زیاتر لە ٢٥٠٠٠ مەتری دووجا** | **گۆڕستانە گچکەکان - D-**<br>**کەمتر لە ٢٥٠٠٠ مەتری دووجا** |
| **گۆڕستانی باکوور، خواروو، ئیمام محەمەد، شێخ ئەحمەد، چراغ و گۆڕستانی گەورە** | **گۆڕستانی شێخ مەلا ڕەشید، بەستەپیازە، پێش بەرماق، شێخ مەعرووف، شێخ ئۆمەر، شێخ محەمەدی خۆراسانی، شێخەڵڵا، حەیدەری، ئەحمەد چەڵەبی و شێخ مستەفا** |
| **گۆڕستانە تایبەتییەکان -E-** | **گۆڕستانە گشتییەکان -F-** |
| **گۆڕستانی شێخەڵڵا، پێش بەرماق، حەیدەری، ئەحمەد چەڵەبی و شێخ مستەفا** | **گۆڕستانی باکوور، خواروو، شێخ ئۆمەر، گەورە، شێخ مەعرووف، چراغ، شێخ مەلا ڕەشید، بەستەپیازە، شێخ محەمەد خۆراسانی، ئیمام محەمەد و گۆڕستانی شێخ ئەحمەد** |

**(*) ئەو زانیاریانە لەلایەن تیپی تۆژەرەوە دەست کەوتووە.**

٢- د. ساطع المحلي، جغرافية المدن عمرانيا وتنظيميا، منشورات جامعة دمشق، مطبعة اتحاد، ١٩٩٢ - ١٩٩٣، ص٢٨٤.
٣- هەمان سەرچاوە، ل٢٢٨.
٤- وزارة الأوقاف، مديرية الأملاك.
٥- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی تۆژینەوەیە.
٦- د. مەعرووف خەزنەدار، مجلة التراث الشعبي، مطبعة دار الحرية للطباعة، بغداد العدد (١)، ١٩٧٥، ص٣٣.
٧- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی توێژینەوەیە.
٨- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی توێژینەوەیە.
٩- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی توێژینەوەیە.
١٠- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی توێژینەوەیە.
١١- تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر، هەندێک لە گۆڕستانەکان و پیاوچاکانی شاری هەولێر، هەولێر لە یادی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی، المكتبة الوطنية، بغداد، ١٩٨٥، ل١٦٣.
١٢- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی توێژینەوەیە.
١٣- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی توێژینەوەیە.
١٤- ئەو زانیاریانە لە بەڕێوەبەرایەتی شارەوانی هەولێر دەست کەوتووە.
١٥- هەمان سەرچاوە.
١٦- ئەو زانیاریانە لەلایەن تیپی توێژینەوە بەدەست کەوتووە.
١٧- د. مەعرووف خەزنەدار، گۆڤاری بەیان، ژمارە (١٢)، چاپخانەی دار الحريه، ١٩٧٤، ل٢.
١٨- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی کۆمەڵەی توێژینەوەیە.

ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە ٦، بەهاری ٢٠٠٠ بڵاوبۆتەوە.

# ئاوی خێرات لە هەولێر

**محەمەد کەریم نانەوا**

هەولێر هەر لە رۆژی بنیاتنانییەوە تا ئەمرۆ، ئەوە لە دوای ئەوە، لەسەر دەستی ئەو کەڵەمێرد و زانایانە مێژوو، بە رەوشتی بەرزی مرۆڤایەتی بە داب و نەریتی جوان و خۆشەویستی مرۆڤ پەروەردە و گۆش کراون و دەکرێن، دانیشتووانی هەولێر لە هیچ کات و سەردەمێکدا، دریغیان نەکردووە لە پێشکەش کردنی کاری چاکەخوازی و خزمەتگوزاری، بە خەڵکی پەناهەندە و هەژار و لێقەوماوان.

نموونەی چاکەکارییەکانی دانیشتووانی شاری هەولێر مێژوو گەواهیدەرە، هێندە زۆرە بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی دیکەی ناوەڕاست و خوارووی عێراق و کوردستان، بێگومان بە سەربەستی و ئازادی و ئارامی تێیدا دەحەوێنەوە، لێرەدا باسی (ئاوی خێرات) دەکەین لە شار و دەوروبەری هەولێر، بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی دیکەی ناوەڕاست و خوارووی عێراق، بێجگە لە (شارەکانی هەرێمی کوردستان).

شاری هەولێر، بەپێی شوێن و هەڵکەوتەی جوگرافیا لە زۆر لاوە سەرە ڕێی کاروانچییان و مەڵبەندی بازرگانییە، هاتوچۆیەکی زۆری لەسەرە، لە زەمانی زووش گواستنەوە بە زۆری بە هۆی ولاخی بەرزە بووە، جا لەسەرەڕێ و لەم شوێنانەی، کە ئاوی لێ دووره دەست بووە، دانیشتووانی ئەو گوندانەی نزیک ڕێگا گشتییەکان، بە زۆری لە دووریانەکان و لە نزیک گۆڕستان و مەزاری پیاوچاکان، بە هەرەوەزی کەپرێکیان دروست دەکرد، کوویەیەک، دوو کووپەی گەورەیان لێ دادەنا، خەڵکی ئاوایی بە (نۆبە) هەر رۆژەی خانەوادەیەک، لە بەرەبەری زەردەپەڕی خۆر ئاوا بوون، بە چوار پێ و بە (ڕاویە)، واتا (تێری ئاوکێشان)، کە لە ماددەی (مشەمما) دروست دەکرا، کووپەکانیان پڕ ئاو دەکردەوە، ئەو ئاوە (شەوبا)ی لێدەدا، سارد دەبوو، بە (ئاوی شەوی) ناو دەبرا، تا بڵێی ساف و بێگەرد و خۆش بوو، ئەویش بە هۆی کووپەکانەوە بوو، ئەوها سارد دەبوو، ئەو کووپانە، کووپەی گەورە بوون، نەک وەکو کووپەی ئەم سەردەمە، هاوچەشنی کووپەی (خمچی)یەکان بوون.

دوای گەڕان و بەدواداچوون، بۆمان ساغ بووەوە، کە ئەم کووپانە لە (عەنکاوە)ی سەر بە شاری هەولێر، لە لایەن برا مەسیحییەکان دروست دەکرا، کە دەستێکی باڵایان هەبووە لە دروست کردنی ئەو کووپانە.

ئەم جۆرە کووپانە زیاتر لە هەیوانی دیوەخانی گوندەکان دادەنران، زۆر گرنگیان پێ دەدا، لە پەنجاکان لەسەر ڕێگای کەرکووک- هەولێر، لە زۆر شوێنان بەدی دەکران، ژێر کووپەیان بۆ دانابوو، ئەو ئاوەی لە کووپەکەوە تکە تکەی دەکرد بۆ ناو ژێر کووپەکە، ئەویش سوودی هەبوو، باڵندە و ئاژەڵە کێوی لێیان دەخواردەوە، ناو شاریش بێبەش نەبووە لە ئاوی خێرات، لە سەرجەم خانەکانی شاری هەولێر وەکو خانی سپی و خانی مام خدرو... کووپەی ئاوی خێرات هەبووە، بگرە لە بەر دەرگای ئاشەکان: ئاشی شێخ محێدین، ئاشی عوسمان بابەش و ئاشی ئەحمەد چەڵەبی، ئەو کووپانە بۆ خێرات دانرابوون، تەنها لە ئاشی ئەحمەد چەڵەبی، (بەفر)یان لە کووپەکان دەکرد، چونکە کارگەی بەفری خۆیان هەبوو، بەڵام لە شوێنەکانی دیکە بەفریان تێنەدەهاوێشت، دەیانگوت:

ئەگەر بەفری تێبکەین (کەرخ) دەبێت، واتا چیتر ئاوی سارد ناکات.

لە ئاخرونۆخری پەنجاکان، ئێمە قوتابی بووین، عەسران بۆ خوێندنەوە و دەورکردنەوەی وانەکانمان، هێدی هێدی بەرەو گۆڕستانی (سەید مەعرووف) دەخشین، لە پێش هەیوانی مەزارەکەدا، کووپەی ئاوی خێراتی لێ بوو، ئاومان لێ دەخواردەوە.

ئەوسا و ئێستاش سەر بە هەر مزگەوتێک دادەگری، بەسەر هەر شۆستە و شەقامێکی شاردا رادەبووری، یان لە پێش دەرگەی زۆربەی هەرە زۆری دوکاندارەکان ئەگەر تێنووت بوو، بگرە لە هەر سەرە کۆڵان و کووچە و گەڕەکەکانی شاری هەولێر ئاوی خێرات، ئاوی تەزی، بێ بەرامبەر دەست دەکەوێ، وەلێ بە پێچەوانە لە رۆژانی هاوین و گەرما پرووکێندا لە شارەکانی خواروو و ناوەڕاستی عێراقدا، تێبینی ئەوە دەکرێ، ئاوی خێرات دانەندراوە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە (٢٥)ی حوزەیران ٢٠٠٧ وەرگیراوە.



# كاركردنی منداڵان

## (لێكۆڵینەوەیەكی مەیدانییە لەشاری هەولێر)

ئامادەكردنی:
د.نوری یاسین هەرزانی، د.تاهیر حسو زێباری،
د.فوئاد قادر ، د.داود یۆحەننا ، د. عەبدوڵڵا خورشید،
ئارام ئیبراهیم حەسەن

**پێشەكی:**

دیاردەی كاركردنی منداڵان، گرفتێكی گەورەیە، كە ژمارەیەک لە وڵاتانی جیهان پێیەوە دەناسرێن. ئەم گرفتە بووەتە دیاردەیەكی بەردەوام و لە زۆر دەوڵەت و ناوچەش روو لە زیاد بوون دایە، كوردستانی عێراق لەوانەیە. ئەمەش پێوەندیی بە فاكتەری ئابووری، سیاسی و كۆمەڵایەتییەوە هەیە. وێڕای ئەوەش ژمارەیەک لەوڵاتان رێككەوتننامەكانی كاری نێودەوڵەتی پەسند ناكەن و كاری پێناكەن.

هەرچەندە ئامارێكی ورد نییە لەسەر دیاردەی منداڵان لە زۆربەی وڵاتانی فەراژوودا، بەڵام رێژە خەمڵێندراوەكان ئاماژە بەوە دەدەن، كە ژمارەكە خۆی لەنزیكەی (٩-١٠) ملیۆن منداڵ دەدات، كە لەكۆمەڵگەی عەرەبی لەبەر سەختی باری گوزەران كار دەكەن[1].

ئەو دیاردەیە بەشێوەیەكی بەرفراوان لەكوردستانی عێراق بڵاوبۆتەوە. جا لەبەر بایەخدانمان بەو مەسەلەیە هەوڵماندا لەمیانەی دیاردەی كاركردنی منداڵان، لێكۆڵینەوەیەكی مەیدانی لەشاری هەولێر ئەنجام بدەین.

لەمیانەی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین زانیارییە بابەتییەکان لەسەر لێکۆڵراوان (منداڵی کارکەر) راستەوخۆ و بە شێوەی مەیدانی کۆبکەینەوە. بەمەبەستی نزیکبوونەوەمان لەزانیارییەکان بەشێوەیەکی بابەتیانە، فاکتەرو پاڵنەرە شاراوەکان لەپشت دیاردەی کارکردنی منداڵان بەشێوەیەکی گشتی لەکوردستانی عێراقدا تاوتوێ دەکەین. بۆ ئەوەی لەپاشان بگەین بەدەرەنجامی زانستی، لەپێناو دانانی چارەسەرێکی بابەتیانە بۆ کەمکردنەوەی ئەو دیاردەیە کە لەم ماوانەی دواییدا بەپێی تێروانین پەرەی سەندووە.

بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر هەردیاردەیەک یان گرفتێکی کۆمەڵایەتی، دەبێ توێژەر پشت بەبیرۆکەو پێشنیازی پێشووی زانستی ببەستێ لەپێناو جێبەجێکردنیان لەسەر واقیعی مەیدانیدا. ئەمەش لەمیانەی رێکخستنی فۆرمی هەڵێنجان (استنباط)ی و چۆنیەتی جێبەجێکردنی لەمەیداندا ئەنجام دەدرێت. تەواوبوونی هەر لێکۆڵینەوەیەک و وەدیهێنانی ئامانجەکانی لەسەر توێژەر واپێویست دەکات کەپشت بەهەندێ پرۆگرامی سەرەکی ببەستێ، کە ئێمەش لەو لێکۆڵینەوەیەدا بەشێوەیەکی ورد پشتمان پێ بەستووە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە لەچەند بەشی تیۆری و پراکتیکی پێک دێت. بەشی یەکەم، لە پێشەکییەکی گشتی لەسەر بابەتەکان و دیاریکردنی هەندێ چەمکی سەرەکی، پەیوەندیدار بە بەبابەتی لێکۆڵینەوەکە پێک هاتووە. بەشی دووەم، بە ناونیشانی "فاکتەرەکانی دیاردەی کارکردن منداڵان" هاتووە. لەکاتێکدا بەشی سێیەم، گشتگیرییە لەپرۆگرامی لێکۆڵینەوەکە. بەڵام بەشی چوارەم، ناونیشانی "شیکردنەوەی بەیاننامە سەرەکییەکانی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکەی" لەخۆگرتووە. دوابەش تایبەتمان کردووە بەگرینگترین دەرەنجامەکان کە لەم لێکۆڵینەوەیەدا پێی گەیشتووین. وێرای هەندێ پێشنیاز کە پێشکەشمان کردووە بەمەبەستی کەمکردنەوەی ئاسەواری ئەو دیاردەیە.

**بەشی یەکەم:**

**دیاریکردنی چەمک و زاراوە زانستییەکان**

لەنێو ئەو ئاستەنگانەی لەزانستە کۆمەڵایەتییە جۆراو جۆرەکاندا رووبەرووی توێژەر دەبنەوە، رێک نەکەوتنی توێژەرانە لەسەر بەکارهێنانی چەمک و زاراوەکان. چەمکە کۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکار دەهێنرێن و هەمەجۆرن، بەگوێرەی تێروانین و پسپۆڕایی جیا جیا لە زانستی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتیدا. بۆیە پێویستە ئەو چەمکە بەکارهێنراوانە ببینینەوە کە پێناسەی کار راپەراندن و چوارچێوەی چێوەی زانستی دیار دەکەن، کە لەسنووری لێکۆڵینەوەکەدا بەکاردەهێندرێن. سەرەڕای ئەوە چەمکەکانی کۆمەڵناسی لەو زاراوە باوانەی لەژیانی رۆژانە بەکاردەهێندرێن جیا ناکرێنەوە. بۆیە ئەو زانستە ناوە ناوە رووبەرووی کاری سەخت دەبێتەوە، کەپەیوەندداری بەگۆڕینی زاراوە بەکارهێنراوە جیا جیاکان بۆ زاراوەی زانستی و دیاریکردنی بەکارهێنانیان بەدیاریکردنێکی وردکارانە. ئەو پرۆگرامەی لەلێکۆڵینەوەکان بەکاردەهێنرێت، چەمکی ئاڵۆزن و سادە نین. چونکە چەمک پێناوی هێمایەکە مرۆڤ پشتی پێدەبەستێ بۆ گوزارشت کردن لە واتاو بیرۆکەی جیا جیادا. زیاتر لەسەر یەک واتا دەنوشتێتەوە، یان لەدەربڕینی جیا جیادا بەواتای جۆراوجۆر بەکاردەهێندرێن.

گرنگترین چەمکەکانی زاراوەی زانستی کە لەو لێکۆڵینەوەیەدا بەکارهێنراون ئەمانەن:

١- منداڵ **The Child**

لەوانەیە پرسیاربکرێ منداڵ چییە و لەچ قۆناغێکی گەشەسەندن دا بە "منداڵ" ناو دەبرێ؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە دەڵێین: جیاوازییەکی گەوهەریی لەنێوان رێککەوتننامەی مافی منداڵ و بۆچوونی دەروونزانان و پەروەردە ناسان و کۆمەڵناساندا هەیە.

کاتێ چەمکی منداڵ بە رێککەوتننامەی مافی منداڵ لەساڵی ١٩٨٩ لەبەرچاو دەگرین، تەمەنی منداڵی بە ١٨ ساڵ دیاریکردووە. بەڵام رێککەوتننامەکە پێناسەی تەمەنی منداڵی بۆ یاسادانەرانی جیا جیای جیهان بەبێ دیاریکردنی تەمەن جێهێشتووە.

دەقی مادەی یەکەم لەو رێککەوتننامەیە دەڵێت:" بۆ دۆزی ئەو رێککەوتننامەیە، واتە هەر مرۆڤێک تەمەنی لە ١٨ ساڵ تێنەپەڕاندبێ منداڵە. مادامەکی لەپێشدا نەگەیشتۆتە تەمەنی هەراش بەپێی ئەو یاسایەی لەسەری جێبەجێ دەکرێت"[٢].

جاڕدانی مافی مرۆڤی جیهانی ساڵی ١٩٤٨ وای

دەبینێت کە هەر مرۆڤێک لەهەموو ئەو ماف و ئازادییانەی لەبەندەکانیدا هاتووە، بەبێ هیچ جۆرە جیاوازییەکی توخمی، رەنگی، رەگەزی، زمانی، ئایینی یان بۆچوونی سیاسی و... مافی پارێزراوە. هەروەها نەتەوە یەکگرتووەکان لەهەردوو پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بەمافی مرۆڤ رایگەیاندووە(*). جاڕدانی مافی مرۆڤی جیهانی ئاماژە بەوە دەدات کەمنداڵ مافی خۆیەتی چاودێری و کۆمەکی بکرێت لەخێزاندا، بەو گوزارشتەی خێزان یەکەیەکی سەرەکییە بۆ کۆمەڵگاو ژێرخانی سروشتی بۆ گەشەسەندن و خۆشگوزەرانی تەواوی ئەندامەکانی بەتایبەت منداڵ. پێویستە بە پاراستن و کۆمەکیکردنی پابەندبن، تاوەکو پەڕاکەندە نەبن و بەرپرسیارێتیان لەناو کۆمەڵگا بگرنە ئەستۆ.

منداڵ زیانمەند دەبێت کاتێ کەسایەتییەکەی بەتەواوی شلەژا، بۆیە پێویستە لەنێو خێزان و کەشوهەوایەکی بەختەوەری و خۆشەویستیی و لەیەک گەیشتن گەشە بکات.

هەروەک تێبینیمان کرد، منداڵ بەهۆی کامڵ نەبوونی ئەقڵی و جەستەیی پێویستە ئاگاداری بین و چاودێری تایبەتی بۆ بکەین لەچوارچێوەی پاراستنی یاسادا لەپێش لەدایکبوون و لەدوای لەدایکبووندا هەروەکو لەمادەی سێیەم لەرێککەوتننامەی مافی منداڵاندا هاتووە[٣]. منداڵ لەرووی کۆمەڵایەتی وا ناسراوە کە مرۆڤێکە لەماوەی ژیانیدا پشت بەگەوران دەبەستێت.

هەتا لەم ماوانەی نزیکدا (لەوڵاتە پێشکەوتووەکان)یش لەسەر ئەوە رێککەوتوون تا تەمەنی هەژدەساڵی هەر منداڵە. بەڵام، ئێستا دەستیان داوەتە ئەوەی، کەچاو بەو تەمەنە بخشێننەوەو پێشنیازیان کردووە کە دیاریکردنی تەمەنی منداڵ بیست و یەک ساڵ بێت، با لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاو زۆربوونی پسپۆڕیی و ئاڵۆزییەکەی بێتەوە. چونکە پرۆسەی ئامادەکردنی سەرەتا بۆ پیشە یان کاری پێشکەوتوو دەگەڕێتەوە، کە کاتێکی درێژی دەوێت. ئەمانە هەر هەمووی لەبۆچوونی زۆرێکدا دەیخاتە ئەستۆی دامودەزگا فێرکارییەکان، کە هەر لەزۆر زووەوە هەر لەتەمەنی شیرەخۆری دەست پێدەکات و بەلای کەم بیست ساڵ بەردەوام دەبێت[٤].

بەڵام قۆناغی منداڵی لای دەروونزان و پەروەردە ناسەکان ئاسایی بەو ماوەیە دەگوترێت کە منداڵی بچووک هەر لەو کاتەی لەدایک دەبێ تا هۆشمەند دەبێ و دەگاتە قۆناغی هەراشی[٥].

## ٢- کار The Work

دەشێ پێناسەی کار بکەین هەروەک لەفەرهەنگی پەیوەندییەکانی پیشەسازیدا هاتووە بەوەی: "دەستەواژەیەکی گشتییەو ئاماژە بەهەوڵ و کۆششی مرۆڤ دەکات، کە بۆ بەرهەمهێنان و دابەشکردنی کاڵاو خزمەتگوزاریی و لەبەرامبەردا پارە یان قەرەبوو وەردەگرێت"[٦].

لەکاتێکدا پێناسەی کار لەدیانەیەکی فەرهەنگی زاراوەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکان هاتووە بەوەی: "هەوڵێکی ویستی ئەقڵی یان جەستەیی، کاریگەریی لەسەر شتە مادییەکان و نامادییەکان هەیە بۆ وەدیهێنانی ئامانجی ئابووری سوودمەند هەروەکو فرمانێکی کۆمەڵایەتییە کەسی تاک وەدەستی دەهێنێت"[٧]. مارکسیش پێناسەی کاری کردووە بەوەی: "کۆمەڵە توانایەکی جەستەیی و ئەقڵێن لەمرۆڤدا هەیە"[٨]. هەروەها "پارکەر" پێناسەی کار دەکات و دەڵێت: "چالاکییەکە لەژێر بارودۆخێکدا روودەدات بۆ هێنانی داواکاری، مادی، کە پەیوەندندارە بەکات و شوێن، هەوڵەکەش بەرهەمی شمەک و خزمەتگوزارییە"[٩].

هەروا توێژەری ئابووری "کۆلسن COLSEN" وای دەبینێت کە " کار مرۆڤ بەهێزی سروشتی و بیرۆکەی خۆی دروستی دەکات بۆ وەبەرهەم هێنانی سامان و خزمەتگوزاری"[١٠] کار بەواتا یاساییەکەی: "بەهەموو هەوڵ و کۆششێکی مرۆیی، بیرۆکەیی یان دەروونی یان جەستەیی دەگوترێت لەبەرامبەر کرێیەکی یەکساندا، جا چ بەشێوەیەکی هەمیشەیی یان کاتی یان وەرزی بێت".[١١] هەروەها پێناسەکراوە بەوەی" هەر هەوڵێکی فسیۆلۆجی بەها بکرێت لەپێناو داواکارە مادییەکان بۆ برسێتی، جا چ بەچەشتنی جەستەیی یان هزری بێت"[١٢].

لەرووی زمانیشەوە وشەی "کار" بەزۆر ماناداێت، لەوانە: "ئاکار، پیشە، کار و کرێکار"[١٣]. لە مانا فیقهیەکەش وشەی کار، ژمارەیەک مەدلولاتی جۆراوجۆر لەخۆ دەگرێت، واتە کاری ئاییني هەروەک خوای گەورە

دەفەرموێت: (ومن احسن قولا ممن دعا الى الله وعمل صالحا)[١٤]. یان کاری پیشەسازی هەروەک خوای گەورە دەفەرموێت (ليأكلوا من ثمره وما عملت ايديهم افلا تشكرون)[١٥]. یاخود کاری ئیداری وەک فەرمووده‌ی پێغەمبەر د.خ: (هدايا العمال حرام كلها)[١٦]. بەم شێوەیە زاراوەکە زۆر لایەن دەگەیەنێت. بەڵام ئەوەی زیاتر لە یاسادانانی کاردا دیاری دەکرێت، واتا یاساییەکەیەتی، هەوڵ و کۆششی بەهاکراوە بەپێی رێککەوتنێک لەگەڵ غەیری خۆیدا لەبەرامبەر قەرەبووی پرۆژەیەک بۆ بەرژەوەندی ئەو کەسەو لەژێر فەرمان و سەرپەرشتی ئەو یان جێگرەکەی، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو یان بۆ وەدیهێنانی شتێکی زانراو.

پێناسەی کار راپەراندن بۆ ئەو زاراوەیە: بەهاکردنی هەوڵی مرۆڤە بۆ ئەوەی پارە یان کرێیەکی دیاریکراوی دەسکەوێت.

٣- یاسای کار:

ئەو یاسایانە بە پەیوەندی سەرەتایی حوکم دەکات بۆ جێبەجێکردنی گرێبەستی کار لەنێوان کرێکارو خاوەن کاردا[١٧]. بەڵام پێناسەی ئابووری بۆ یاسای کار، بریتییە لەکۆیەک رێسا، کە پەیوەندیی پرۆژەکە لە نێوان خاوەن سەرمایەو هێزی بەرهەم هێنەردا بەرێوە دەبات.

هەروا پێناسەی مرۆیی بۆ یاسای کار، بریتییە لەکۆیەک رێسا کە مەبەستێتی باری خراپی کرێکاران سووک بکا و دادوەریی کۆمەڵایەتی بێنێتەدی.

هەروەها بەوەش پێناسەکراوە: "کۆمەڵە رێسایەکی یاسایین لەسەر پەیوەندییەکانی تاک و کۆمەڵی سەرەتایی لەنێوان خاوەن کارو کرێکاران لەژێر چاودێرییان جێبەجێ دەکرێت". واتە ئەم یاسایە پەیوەندییە سەرەتاییەکان لەجێبەجێکردنی کار لەسەر حسێبی کەسی دیکە رێک دەخات، مادامەکی ئەو کارە بەسەرپەرشتی و ئاراستەی دوایی تەواو دەکرێت[١٨].

**بەشی دووەم:**

**فاکتەرەکانی دیاردەی منداڵانی کارکەر**

دیاردەی کارپێکردنی منداڵان یەکێکە لەو دیاردانەی ژمارەیەکی زۆر لەوڵاتان بەتایبەت وڵاتە تازە فەراژووەکانی پێیەوە دەناڵێنن، بەهۆی پەشێوی کۆمەڵایەتی و ئابووری و گۆرانکارییەکانی رەوشی ئابووری کە رووبەرووی زۆرێک لەهەرەشە بوونەتەوە کە لەئەنجامدا بازنەیەکی هەژاری گەورەو بەرفراوانی دروست کردووە.

خەملێنراوەکانی "رێکخراوی کاری نێودەوڵەتی"، ئاماژە بەوە دەدات کە (٢٥٠) ملیۆن منداڵ لەنێوان چواردەو پانزەساڵیدا لەوڵاتە تازە فەراژووەکان کار دەکەن. بەلایەنی کەم (١٣٠) ملیۆن لەوانە کاتی تەواو کار دەکەن، لە (٦١٪) منداڵی ئاسیایین و (٣٢٪) ئەفریقی و، (٧٪)یش منداڵی ئەمریکای لاتینین[١٩].

مادەی (٣٢) لە (رێککەوتننامەی مافی منداڵ ساڵی ١٩٩١) منداڵان لەقۆرغکردنی ئابووری و لەئەنجامدانی هەر کارێکدا، کە مەترسی بۆ سەریان هەبێت دەپارێزێت، یان ئاستەنگ بخاتە بەردەم خوێندنیان، یاخود زیان بەتەندروستی یان گەشەسەندنی جەستەیی یان ئەقڵی یان رۆحی یان وردەیی یان کۆمەڵایەتی بگەیەنێت. هەروەها ئەو مادەیە داوا لەوڵاتانی لایەنی رێککەوتننامەکە دەکات رێو شوێنی یاسایی و کارگێری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی بگرنە بەر. ئەو مادەیەش بەتایبەت ئەوانە لەخۆ دەگرێت:

١- دیاریکردنی کەمترین تەمەن یان ئەو تەمەنانەی پەیوەندی بەکارەوە دەکەن.

٢- دانانی سیستەمێکی شیاو بۆ کاتەکانی کارو رەوشەکەی.

٣- سەپاندنی سزا یان کار راپەراندنی دیکەی شیاو بۆ زامنکردن و کاراکردنی ئەو مادەیە[٢٠].

بۆیە کارپێکردنی منداڵان لەناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەراست و جیهاندا، لەبەر مەترسییەکانی و شکانەوەی بەنێگەتیڤی بەسەر خێزان و کۆمەڵدا بووە جێی بایەخ پێدانی بەرفراوان. لەراپۆرتی رێکخراوی یونسیف ساڵی ١٩٩٧ لەبارەی کارکردن منداڵان هاتووە زیاتر لە (٢٥٠) ملیۆن منداڵ لەجیهان رووبەرووی مەترسی دەبنەوە لەبەر کارپێکردنیان و ژیانیان رووبەرووی مەترسی دەبێتەوە[٢١] لێکۆڵینەوەیەکی تازەی عەرەبی، کە لەبارەی کارپێکردنی منداڵان لەنیشتمانی عەرەبی سازدراوە سەلماندوویەتی ژمارەی منداڵانی دەستکار (دەستفرۆش و...) لەوڵاتە عەرەبییەکان گەیشتۆتە (١٢) ملیۆن منداڵ بەکچ و کوڕەوە، لەوانە (٦٠٪) رووبەرووی زیان پێگەیاندنی

جەستەیی بوونەتەوە، (٢٠٪)یش هێشتا تەمەنیان نەگەیشتۆتە دە ساڵی[٢٢].

لەپوختەی شرۆڤەکردنی لێکۆڵینەوەی ڕێکخراوی کاری نێودەوڵەتی و یونسیف و ڕێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و منداڵان لە نیشتمانی عەرەبی هاتووە، ژمارەیەک فاکتەر یان هۆکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی ئاڵۆز هەن بوونەتە دیاردەی کارپێکردنی منداڵ لەناوچەکەدا و خەڵکەکەش کاریان پێدەکەن:

١- داتەپیوی ڕێژەی گەشەسەندنی ئابووری و ئاستی داهات و کارپێکردن و وەبەرهەم هێنانە، کە ئاراستەیە بۆ فێرکردن و تەندروستی و چاودێری منداڵ و پەشێوی دابەشکردنی داهات لەنێوان چین و توێژەکانی کۆمەڵگادا.

٢- بەرزبوونەوەی ڕێژەی گەشەسەندنی دانیشتووان و بەخێوکردن و بێکاری. دواتر زۆری منداڵبوون لای زۆر لە خێزانەکان لە ناوچەکە و پاڵنانی منداڵەکانیان بۆ سەر شەقام. هەندێ جار وای لە باوان کردووە منداڵەکان هان بدەن بۆ پەیداکردنی بڕێ پارەی دیاریکراو.

٣- کەمبوونی ڕێژەی منداڵان لەپەیوەندیکردنیان بەقوتابخانە یان سەرنەکەوتنیان لەقوتابخانە، یان خۆ دزینەوەیان لەخوێندن لەبەر هۆکاری ئابووری و کۆمەڵایەتی و پەروەردەیی.

٤- کەموکوڕی یاساکان و جێبەجێ نەکردنیان، کە لەبارەی ڕەوشی منداڵ و کاری منداڵ بڕیاری لەسەر دراوە.

٥- هەژاری و نەبوونی و ناخۆشگوزەرانی خێزان یەکێکن لەهۆکارە سەرەکییەکان. دەتوانین بڵێین پاڵنەری سەرەکییە بۆ ناردنی منداڵ بۆ کار. هەروا بوونی گرفت و کارپێکردنی منداڵ و باری هەژاری خێزان، پاڵ بەمنداڵەکانیان دەنێت ڕوو لەبازاڕەکان بکەن لەبەر پێویستی ژیانیان.

بەڵام بۆ دیاریکردنی کارپێکردنی منداڵ لەهەرێمی کوردستانی عێراق، بەیاننامەو ئامار لەسەر سروشتی ئەو دیاردەیە لەبەر دەست نییە. سەرەرای ئەوەش بەهۆی گۆڕانکارییە ئابوورییەکان لە نەوەتەکانی سەدەی ڕابردوودا، بەشێوەیەکی بەرفراوان پەرەی سەند. هەڵبەتە هۆکاری ئەو پەرەسەندنە ناوخۆیی بووە. لێرەدا لەرێگەی ئەم لێکۆڵینەوەیەوە لەگەڵ هۆکارەکان ئاشنا دەبین. پاشان ئەوەندەی لەتواناماندا بێت چارەسەرو ڕێو شوێنی کار ڕاپەڕاندن بۆ دیاردەی کارپێکردنی منداڵان دەگرینەبەر و دادەڕێژین.

**بەشی سێیەم: (پرۆگرامی لێکۆڵینەوە)**
**- پرۆگرامی ڕوپێوکردنی کۆمەڵایەتی**

ئەم پرۆگرامە بەیەکێ لەو پرۆگرامانە دادەندرێت کە لەلێکۆڵینەوەکانی مەیدانی کۆمەڵایەتیدا بەکاردەهێندرێت. چونکە لەو ڕێگەیەوە توێژەر دەتوانێ لەگەڵ زۆربەی زانیارییەکان ئاشنا بێت، کە بریتییە لەهەوڵێکی هەرەوەزییانە و ڕێگەیەکی زانستی دەگرنە بەر بۆ لێکۆڵینەوە و چارەسەریی گرفتە کۆمەڵایەتییەکان، کە کەوتوونەتە سنوورێکی دیاریکراوی جوگرافی[٢٣].

پرۆگرامی ڕووپێوی کۆمەڵایەتی لەژمارەیەک قۆناغ پێک دێت لەوانە:

**١- بابەتی لێکۆڵینەوە**

بابەتی ئەم لێکۆڵینەوە پێشنیازکراوە (دیاردەی کارپێکردنی منداڵ) لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە لەهەولێر. دیاردەی کارپێکردنی منداڵ بەیەکێ لەگرفتە گەورەکان دەژمێردرێت، کە زۆربەی وڵاتانی جیهان ڕووبەڕووی بوونەتەوە. ئەو دیاردەیەش کاریگەری لەسەر ئایندەی منداڵ دەبێ. پاشان ماوەکەی کاریگەریی دەبێت لەسەر بنیاتنانەوەی کۆمەڵایەتی لەکۆمەڵگادا. وێڕای ئەوە کاریگەریشی لەسەر زۆر لەسیستەمە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەدا دەبێت.

بەتێڕوانین لەبڵاوبوونەوەی ئەو دیاردەیە، بەشێوەیەکی بەرفراوان لەکۆمەڵگەی کوردستاندا، هەوڵ دەدەین بەهەندێ فاکتەری پاڵنەر ئاشنابین، کە لەپشت بڵاوبوونەوەی ئەو دیاردەیەن، کە لەبنەڕەتدا لەگەڵ زۆربەی بەڵگەنامەکانی نێودەوڵەتی یەک ناگرنەوە، بەتایبەتی ئەوانەی پەیوەندداربن بەمافەکانی منداڵان.

**٢- هەڵبژاردنی جۆری نموونەکە**

ئەو نموونانەی لێکۆڵینەوەمان لەسەر کردووە بەنموونەی هەڕوایی گوزارشت دەکرێن. چونکە ئەو نموونانە بەرێگەی هەڕوایی لەناوچە جیا جیاکان لەکۆڵان و لەشەقامەکانی شاری هەولێر هەڵبژێردراون. تاقیکردنەوەکە لەسەر ٣٠٠

منداڵ لەهەردوو رەگەزی نێرو مێ ئەنجام درا. لەوانە ٢٨٥ منداڵی کوڕو ١٤٥ منداڵی کچ. ئەو جیاوازییەی لەهەڵبژاردنی رەگەزی منداڵانیشدا هەیە، بۆ سروشتی بەهاو دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان دەگەڕێتەوە کە تائێستاش لایەنێکی گرنگی لەبەرزەفتکردنی کۆمەڵایەتی پێک هێناوە.

### ٣- بوارەکانی مرۆیی و جوگرافی و کاتی لە لێکۆڵینەوەکەدا

نموونەی منداڵانی کارکەر لەشاری هەولێر بەهەر دوو رەگەزەوە (نێرو مێ)، کە ژمارەیان گەیشتە (٣٠٠) منداڵ و لە سنووری ئەو شارە کاریان دەکرد، هەڵبژێردران. ئەم لێکۆڵینەوەیە ماوەی ساڵێکی خایاند بەهۆی قورسی پڕکردنەوەی فۆرمەکان و ئەنجامدانی دیمانە لەگەڵ منداڵانی سەر شەقام و گەڕەکە گشتییەکان کە کاریان تێدا دەکرد.

### ٤- وێنەکێشکردنی فۆرمی زانیاری

ئەم فۆرمە بەیەکێ لەکەرستە سەرەکییەکانی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی مەیدانی گوزارشت دەکرێت. چونکە توێژەر لەو میانەدا لەتوانایدا دەبێت زانیاری و راستییەکان لەخاوەنی خودی گرفتەکان کۆ بکاتەوە. فۆرمی زانیاری (داتا) بە لەخۆگرتنی زانیارییە گشتییەکان لەسەر منداڵی دەستکار و خێزانەکەی و پەیوەندییەکانی و سروشتی کارەکەی کە ئەنجامی دەدات و ئەو گرفتانەی لەماوەی مانەوەی لەکار رووبەڕووی دەبنەوە. فۆرمەکە (٣٢) پرسیار لەخۆی گرت. جا بۆ زیاتر روونکردنەوەی وەڵامەکان، بۆ زۆر لەپرسیارەکان زیاتر لەوەڵامێکیان خستە روو بەمەبەستی ئاسانکاریکردن لەکاری لێکۆڵینەوەکەدا.

### بەشی چوارەم: "شیکردنەوەی بەیاننامە سەرەکییەکان"

یەکەم: بەیاننامە گشتییەکان

خشتەی ژمارە (١) دابەشکردنی نموونەکان بەپێی رەگەز

| رەگەز | ژمارە | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|
| نێر | ٢٨٥ | ٪٩٥ |
| مێ | ١٥ | ٪٥ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (١)دا بۆمان روون دەکاتەوە کە ژمارەی نێر لەو نموونانەی لێیان کۆڵراوەتەوە، ٢٨٥ منداڵە بە رێژەی ٩٥٪. بەڵام ژمارەی مێیەکان (١٥) منداڵە و رێژەکەی تەنیا دەگاتە (٥٪)، بەمەش سەرجەمی دەگاتە (٣٠٠) منداڵ. واتە رێژەی نێر زۆر لەرێژەی مێ زیاترە لەوانەی کەلێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجامدراوە.

خشتەی ژمارە (٢) دابەشکردنی نموونەکان بەپێی تەمەن

| تەمەن | ژمارە | رێژەی |
|---|---|---|
| ٥-٧ | ٨ | ٪٢٦٦ |
| ٨-١٠ | ٢٨ | ٪٩٣٣ |
| ١١-١٢ | ٩٩ | ٪٣٣ |
| ١٤-١٦ | ١٦٥ | ٪٥٥ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (٢) تەمەنی ئەو تاکانەی نموونەیان لەسەر هێنراوەتەوە ئاشکرا دەکات. کە (٨)منداڵا لەسەرجەمی (٣٠٠) منداڵ، بەرێژەی (٢/٦٦٪) تەمەنیان لەنێوان (٥-٧) ساڵی بووە. (٢٨)ی دیکەش بەرێژەی (٩/٣٣٪) تەمەنیان لەنێوان ٨- ١٠ ساڵی بووە. بەڵام ئەو منداڵانەی تەمەنیان لەنێوان (١١-١٣) ساڵی بووە رێژەکەی (٣٣٪) کە لەسەر شەقامەکان کاریان دەکرد. لەکاتێکدا تەمەنی ئەو منداڵانەی لەنێوان (١٤-١٦) ساڵ بووە رێژەکەیان (٥٥٪) بووە.

خشتەی ژمارە (٣) لایەنی خوێندەواری نموونەکان

| لایەنی خوێندن | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | ٦٠ | ٪٢٠ |
| سەرەتایی | ١٨٣ | ٪٦١ |
| ناوەندی | ٥٥ | ٪١٨ |
| ئامادەیی | ٢ | ٪١ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

خوێندن بەمافێکی سەرەکی بۆ هەموو منداڵان دادەنرێت، بەپێی دەقی هەردوو مادە (٢٨-١٩) لە (رێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ). لەسەر ئەم پرنسیپەوە هەوڵماندا لایەنی خوێندەواری ئەو تاکانەی نموونەیان لەسەر هێنراوەتەوە کە لەسەر رێگەو شەقامەکان کاریانکردووە بزانین. لەمیانەی دەرەنجامی خشتەی ژمارە (٣)دا دەردەکەوێت، کە لایەنی خوێندەواری بەم شێوەیە بووە: (٢٠٪) نەخوێندەوار بوون و پێیان نەناوەتە

قوتابخانە. (٦١٪) خوێندنی سەرەتاییان تەواوکردووە، کە ژمارەیان گەیشتۆتە (١٨٣) منداڵ لەکۆی (٣٠٠) منداڵدا. ڕێژەی (١٨٪)یش قۆناغی ناوەندیان بڕیوە کەژمارەیان (٥٥) منداڵ بووە، لەکاتێکدا ڕێژەی ئەوانەی قۆناغی ئامادەییان تەواو کردبوو تەنیا (١٪) بووە. واتە لەکۆی (٣٠٠) منداڵ تەنیا (٢)یان ئەو قۆناغەیان تەواو کردبوو.

لەڕێژەی ئەو دەرەنجامانەی لەخشتەکەدا هاتووە، ئەوە بەدەست دێنین کە ئەو منداڵانەی لەدەرەوەی ماڵ لەسەر کۆڵان و شەقامەکان کار دەکەن، بێ بەش بوون لەخوێندن. ئەم بارەش پێچەوانەی ئەو مادانەیە کە لەڕێککەوتننامەی مافەکانی منداڵ هاتووە، کە پێویستە منداڵان بخرێنە بەر خوێندن و مافێکی ڕەوای خۆشیانە.

**خشتەی ژمارە (٤) شوێنی نیشتەجێی نموونە کان**

| نیشتەجێ | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| هەولێر | ٢٦٥ | ٨٨ |
| کەرکووک | ١٤ | ٥ |
| سلێمانی | ١٣ | ٤ |
| شوێنی تر | ٨ | ٣ |
| کۆ | ٣٠٠ | ١٠٠٪ |

لەخشتەی ژمارە (٤)دا بۆمان روون دەبێتەوە، کە ڕێژەی (٨٨٪) لەو تاکانەی نموونەیان لەسەر کراوە، شوێنی نیشتەجێبوونیان هەولێر بووە کە ژمارەیان (٢٦٥) منداڵ بووە. لەکاتێکدا بەڕێژەی (٥٪) کەژمارەیان (١٤) منداڵ بووە شوێنی نیشتەجێیان کەرکووک بووە. ڕێژەی (٤٪)یش کە ژمارەیان (١٣) منداڵ بووە شوێنی نیشتەجێیان سلێمانی بووە. بەڵام ئەوانەی نیشتەجێی شوێنە جیا جیاکانی دیکە بوون ڕێژەیان (٣٪) و ژمارەیان (٨) منداڵ بووە. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە زۆرترین ڕێژە شوێنی نیشتەجێیان هەولێر بووە.

**خشتەی ژمارە (٥) شوێنی نیشتەجێی نموونەکان**

| نیشتەجێ | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ناوچەی هەولێر | ٢٦٧ | ٨٩٪ |
| دەرەوەی هەولێر | ٣٣ | ١١٪ |
| کۆ | ٣٠٠ | ١٠٠٪ |

لەخشتەی ژمارە (٥)دا روون دەبێتەوە، کە (٢٦٧)ی ئەو تاکانەی لەو لێکۆڵینەوەیەدا بە نموونەبەنموونە وەرگیراون، نیشتەجێی ناو چەقی هەولێرن و ڕێژەکەیان ٨٩٪. بەڵام ئەوانەی لەدەرەوەی هەولێر نیشتەجێن ژمارەیان (٣٣) و ڕێژەکەیان (١١٪). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، کە زۆری ئەوانەی نموونەیان لەسەر هاتۆتەوە نیشتەجێی چەقی شاری هەولێرن.

**خشتەی ژمارە (٦) جۆری کاری نموونەکان**

| جۆری کار | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| کاسب | ١٧٠ | ٥٦٪ |
| جگەرە فرۆش | ٢٩ | ١٠٪ |
| بۆیاغچی پێڵاو | ٢٩ | ١٠٪ |
| فیتەر | ٢٩ | ١٠٪ |
| ئاسنگەر | ٢١ | ٧٪ |
| فرۆشیاری گەرۆك | ٢١ | ٧٪ |
| کۆ | ٣٠٠ | ١٠٠٪ |

- ڕێکخراوی (یونسیف)، کاری منداڵانی بۆ حەوت جۆری سەرەکی دابەش کردووە. وەک (ماڵداری، کاری زۆرەکی، قۆرغکردنی سێکسی، قۆرغکردنی بازرگانی، کاری پیشەسازی کشتوکاڵ، کاری سەر شەقامەکان، کاری خێزانی، کاری رووەکی). جا لەبەر ئەوەی بابەتەکەمان بەدیاردەی کارپێکردنی منداڵان تایبەت کردووە، بۆیە هەوڵمان دا بەو جۆرە کارە ئاشنابین کە منداڵان لەسەر شەقامەکان دەیکەن. ئەوە بوو لەمیانەی دەرەنجامی خشتەی ژمارە (٦)دا بۆمان دەرکەوت کە جۆری کارەکانی ئەو نموونەکانی لێکۆڵینەوەکە بەم شێوەیە بووە: (٥٦٪) کاسب، کە زۆرینەی ڕێژەکەیان پێکدێنێت و ژمارەیان گەیشتە (١٧٠) منداڵ لەکۆی (٣٠٠) منداڵ. (١٠٪)یش جگەرە فرۆش بوون لەسەر شەقامەکان. هەروەها هەشبووە پیشەی (پێڵاو بۆیاغکردن و کاری تری کردووە وەک پیشەوەر لای چاککەرەوەی ئۆتۆمبێلەکان). بەڵام ئەوانەی پیشەی ئاسنگەری ‌ء فرۆشیاری گەرۆکیان کردووە بەڕێژەی لەیەکچوو هاتووە بۆ هەر پیشەیەک (٧٪).

لەمیانەی ئەو وەڵامانەی لەخشتەکەدا هاتووە ئەو دەرەنجامە وەدەست دێنین، کە منداڵانی دەستکار لەشاری

هەولێــــر زۆر جــۆری کـــاریان ئەنجـــامــــداوە، بەبێ پسپۆرییەتییەک لەکارێکدا. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە تەنیـا سـەیری قـازانجی مـادیان کـردووە، کـە نیـازیان بووە وەدەستی بێنن.

خشتەی ژمارە (٧) شوێنی کاری نموونەکان نیشان ئەدات

| شوێنی کار | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| کارکردن لەشەقامەکان | ١٥٤ | ٪٥١ |
| کارکردن لەناوچەی پیشەسازی و دەزگا هونەرییەکان | ٥٦ | ٪١٩ |
| کارکردن لەبازاڕگەی سیروان و شێخەڵلا | ٩٠ | ٪٣٠ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشــتــەی ژمــارە (٧)دا بۆمــان روون دەبێــتــەوە، کـە ڕێژەی (٥١٪) لەو تاکــانەی نموونەیان لەســەر هاتۆتەوە لەشـەقـامـەکـان بەگـەڕۆکی کـاریان کـردووە، ژمــارەیان گــەیشــتــۆتە (١٥٤). لەکــاتێـکدا (١٩٪) لەناوچەی پیشەسازیی و دەزگاکانی هونەری کاریان کردووە، ژمارەیان (٥٦) منـداڵ بوون. (٣٠٪) لەبازاڕگـــای ســـیـــروان و شێخەڵلا کاریانکردووە، کە ژمارەیان (٩٠) منداڵ بووە. ئەمــــەش ئەوە دەردەخـــات، کــە ڕێـژەی زۆری نموونە لەسەرهێنراوەکان لەسەر شەقامەکان کاریان کردووە.

خشتەی ژمارە (٨) دەستکەوتی ڕۆژانەی نموونە کان

| دەستکەوتی ڕۆژانە | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| کەمتر لە (٥) دینار | ٢٦ | ٪٩ |
| ٥-١٠ | ٧١ | ٪٢٤ |
| ١١-١٥ | ٨١ | ٪٢٧ |
| ١٦-٢٠ | ٦٠ | ٪٢٠ |
| ٢١-٢٥ | ٣٥ | ٪١٢ |
| ٢٦-٣٠ | ١٣ | ٪٤ |
| زیاتر لە (٣٠) دینار | ١٢ | ٪٤ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخـشـــتــەی ژمــارە (٨)دا بۆمـــان روون دەبێـــتــەوە کەدەستکەوتی ڕۆژانەی کەمتر لە (٥) دینار (٩٪) بووە، لەژمـارەی (٢٦) منداڵدا. بەڵام ئەوانەی ڕۆژانە (٥-١٠) دیناریان دەست کـەوتووە ڕێژەکـەی (٢٤٪)ە کە ژمـارەیان گەیشتۆتە (٧١٪)، کەچی ئەوانەی ڕۆژانەیان (١١-١٥) دینار بووە، ڕێژەیان (٢٧٪) بووە، کە ژمارەیان گەیشتۆتە (٨١) منداڵ. لەکـاتێکدا ڕێژەی (٢٠٪) ڕۆژانە (١٦-٢٠) دیناریان دەست کـەوتووە کـەژمـارەیان (٦٠) منداڵ بووە. هەروا ئەوانەی دەستکەوتیـان (٢١-٢٥) و (٢٥-٣٠) و (٣٠) دینـار بەرەو ســـەرەوە بووە، ڕێژەیـان بەم شـێــوەیە بووە: ١٢٪ ژمـارەیان (٣٥) منداڵ و (٤٪) ژمــارەیان (١٣) منداڵ و (٤٪) ژمــارەیان (١٢) منـداڵ لەکۆی (٣٠٠) منداڵدا.

خشتەی ژمارە (٩) لایەنی خوێندەواری باوکی نموونەکان

| لایەنی خوێندەواری باوکی منداڵ | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| نەخوێندەوار | ١٢٦ | ٪٤٢ |
| خوێندەوار | ٣٦ | ٪١٢ |
| خوێندەواریی(خوێندن و نووسین) | ١٢ | ٪٤ |
| سەرەتایی | ٧٢ | ٪٢٤ |
| ناوەندی | ١٨ | ٪٦ |
| دواناوەندی | ١١ | ٪٤ |
| پەیمانگا | ٤ | ٪١ |
| کۆلێژ- زانکۆ | ٢ | ٪١ |
| مردوو | ١٩ | ٪٦ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشــتـەی ژمـارە (٩)دا ئامـاژە بەلایەنی خـوێندەواری بـاوکی منـداڵەکــان دەدات، کــە لێکۆڵـینەوەیان لەگــەڵ سازدراوە: لەوانە (٤٢٪) نەخوێندەوارو ژمارەیان (١٢٦) بووە. (١٢٪) خوێندەوار بوونو ژمارەیان گەیشتۆتە (٢٦) کەس (٤٪)یش تەنیا خوێندنەوەو نووسینیشیـان زانیووە، کـە ژمـارەیـان (١٢) بووە، لەکـاتێکدا (٢٤٪) قـۆناغی سەرەتاییان تەواو کردبوو، کە ژمارەیان دەگەیشتە (٧٢). (٦٪)یش قۆناغی ناوەندییـان تەواو کردبوو، کە ژمارەیان (١٨) بووە. (٤٪) قـۆناغی دواناوەندییـان تەواو کـردبوو کـە ژمـارەیان (١١) بووە. لەکـاتێـکدا (١٪) پەیمانگایان تەواو کـردووە، کـە ژمـارەیان (٤) کـەس بووە. بەڵام ڕێژەی ئەوانەی کــۆلێــژ (زانکۆ)یان تەواو کــردبوو (١٪) بوو ژمارەشیـان دەگەیشتە (٢) کەس.

لەبەیانـنامـــەی ناوبراودا بۆمـــان روون دەبێـــتـــەوە کـەزۆرینەی ڕێژەی باوکی ئەومنداڵانە لەلێکۆڵینەوەکـەدا بەنموونە هێنراونەتەوە نەخوێندەوار بوون.

خشتەی ژمارە (١٠) پیشەی باوکی منداڵ دەردەخات

| پیشەی باوك | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| کاسب | ١٥٢ | ٪٥١ |
| چاککەرەوە | ١٥ | ٪٥ |
| شوفێر | ٣٣ | ٪١١ |
| ئاسنگەر | ٨ | ٪٣ |
| مردوو | ١٩ | ٪٦ |
| فەرمانبەری حکومەت | ٣٤ | ٪١١ |
| بێکار | ٢٥ | ٪٨ |
| فیتەر | ١٢ | ٪٤ |
| وانەبێژ | ٢ | ٪١ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (١٠)دا بۆمان روون دەبێتەوە، کە باوکی ئەو منداڵانەی لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجام دراوە کاسب بوون، ژمارەیان گەیشتۆتە (١٥٢) منداڵ، ئەمەش بەبەراوردکردن لەگەڵ پیشەی باوکەکانی دیکە زۆرینە وەردەگرێت. دوای ئەوە (٥ ٪) دێت کەچاککەرەوە بوون و ژمارەیان (١٥) منداڵ بووە. (١١٥)ش شوفێر بوون و ژمارەیان گەیشتۆتە (٣٣) منداڵ. لەوانە (٣ ٪) ئاسنگەر بوون، کە ژمارەیان (٨) منداڵ بوو. فەرمانبەری حکومەت رێژەیان (١١ ٪) بووەو ژمارەیان گەیشتۆتە (٣٤) منداڵ. (٤ ٪)یش فیتەر بوون کە ژمارەیان (١٢) منداڵ بووە. لە (١ ٪)یش وانەبێژ بووە، کە ژمارەیان (٢) منداڵ بووە لەکۆی ٣٠٠ منداڵدا.

خشتەی ژمارە (١١) داهاتی مانگانەی هەر خێزانێکی منداڵ دەردەخات

| داهاتی مانگانەی هەر خێزانێك | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ٢٥٠-٥٠٠ دینار | ٥٧ | ٪١٩ |
| ٥٠١-٧٥٠ | ٦٦ | ٪٢٢ |
| ٧٥١-١٠٠٠ | ٦٩ | ٪٢٣ |
| ١٠٠١-١٢٥٠ | ٤٨ | ٪١٦ |
| ١٢٥١-١٥٠٠ | ٢٢ | ٪٧ |
| ١٥٠١-١٧٥٠ | ٨٠ | ٪٣ |
| ١٧٥١-٢٠٠٠ | ١١ | ٪٤ |
| ٢٠٠٠ زیاتر | ٩ | ٪٦ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتە ژمارە (١١)دا بۆمان روون دەبێتەوە، کە داهاتی مانگانەی هەر خێزانێکی ئەو نموونانەی هێنراونەتەوە لەژمارەی (٣٠٠) منداڵ بەم شێوەیە بووە، رێژەی (١٩ ٪) داهاتی مانگانەی لەنێوان (٢٥٠-٥٠٠) دینار بووە، کە ژمارەیان گەیشتۆتە (٥٧). رێژەی (٢٢ ٪) داهاتی مانگانەیان لەنێوان (٥٠١-٧٥٠) دینار بووە کە ژمارەیان (٦٦) منداڵ بووە. (٢٣ ٪)یش داهاتی مانگانەیان لەنێوان (٧٥١-١٠٠٠) دینار بووە، کە ژمارەیان (٦٩) منداڵ بووە. (١٦ ٪)یش داهاتی مانگانەیان لەنێوان (١٠٠١-١٢٥٠) دینار بووە، کە ژمارەیان گەیشتۆتە (٤٨) خێزان. رێژەی (٧ ٪) داهاتی مانگانەیان لەنێوان (١٢٥١-١٥٠٠) دینار بووە کە ژمارەیان (٢٢) خێزان بووە. رێژەی (٣ ٪)یش داهاتی مانگانەیان لەنێوان (١٥٠١-١٧٥٠) دینار بووە، کە ژمارەیان گەیشتۆتە (٨) خێزان، لەکاتێکدا رێژەی ئەو خێزانانەی داهاتی مانگانەیان (١٧٥١-٢٠٠٠) دینار بووە (٤ ٪) بووە، کە ژمارەیان (١١) خێزان بوو. بەڵام ئەو خێزانانەی داهاتی مانگانەیان لەسەرووی (٢٠٠٠) دینار بووە رێژەیان (٦ ٪) بووەو ژمارەشیان گەیشتۆتە (٩) خێزان. هەروەها لەبەیاننامەی ناوبراودا بۆمان روون دەبێتەوە، کە زۆرینەی داهاتی مانگانەی هەر خێزانێک لەنێوان (٢٥٠-١٠٠٠) دینار بووە، کە رێژەیان گەیشتۆتە (٦٤ ٪) لەکۆی ئەو تاکانەی نموونەیان لەسەر هێنراوەتەوە لەلێکۆڵینەوەکەدا.

خشتەی ژمارە (١٢) ژمارەی ئەندامانی خێزانی نموونەکان

| ژمارەی ئەندام | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ٢-٣ | ٢٠ | ٪٧ |
| ٤-٥ | ٥٢ | ٪١٧ |
| ٦-٧ | ٢٩ | ٪٣٧ |
| ٨-٩ | ١١٠ | ٪٣٧ |
| ١٠ زیاتر | ٨٩ | ٪٣٠ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەبەیاننامەی خشتەی ژمارە (١٢)دا بۆمان روون دەبێتەوە، کە رێژەی (٧ ٪) لەخێزانی نموونە هێنراوەکان ژمارەی ئەندامانی خێزانیان (٢-٣) ئەندام بووە. رێژەی (١٧ ٪)یش ژمارەی ئەندامانی خێزانەکانیان (٤-٥)

ئەندام بووە. ڕێژەی (١٠٪) ژمارەی ئەندامان لەنێوان (٦-٧) ئەندام بووە. بەڵام ئەو خێزانانەی ژمارەی ئەندامانیان لەنێوان (٨-٩) بووە لەکۆی نموونە هێنراوەکان (٣٧٪) بووە. لەکاتێکدا ڕێژەی قەوارەی ئەو خێزانانەی لەسەرووی (١٠) ئەندام بوو گەیشتۆتە (٣٠٪).

لەدەرەنجامی قەوارەی خێزانی ئەو منداڵانەی بەنموونە لەلێکۆڵینەوەکەدا هاتوون جۆرێکی زۆر لەوانە ڕێژەی ئەندامانی خێزانیان لەنێوان (٦-١٠ و زیاتر) بووە لەکۆی گشتی نموونە هێنراوەکان گەیشتۆتە (٧٧٪).

**خشتەی ژمارە (١٣) ژمارەی دەستکارانی خێزانی نموونەکان**

| ژمارەی دەستکاران لەخێزان | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ١-٢ | ١٥٤ | ٥١٫٣٣ |
| ٣-٤ | ١٣١ | ٤٣٫٦٦ |
| ٥-٦ | ١٢ | ٤ |
| ٧-٨ | ٣ | ١ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (١٣)دا ژمارەی ئەو کار دەستانەی لەخێزانی نموونە هێنراوەکان بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە ئاماژە بە (١٥٤) نموونەی هێنراو دەدات بەڕێژەی (٥١/٣٣٪) کە ژمارەی دەستکار لەخێزانەکانیان لەنێوان (١-٢) کەس بووە. (١٣١)یش بەڕێژەی (٤٣/٦٦٪) ژمارەی دەستکار لەخێزانەکانیان لەنێوان (٣-٤) کەس بووە. بەڵام ئەو خێزانانەی ژمارەی دەستکار لەخێزانەکانیان لەنێوان (٥-٦) کەس بووە ژمارەیان (١٢) خێزان بووە بەڕێژەی (٤٪). لەکاتێکدا تەنیا (٣) نموونە هێنراو بەڕێژەی (١٪) لەکۆی گشتی ژمارەی دەستکار لەخێزانەکانیان لەنێوان (٧-٨) کەس بووە.

هەروەها لەمیانەی بەیاننامەی ئەو خشتەیەدا بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە زۆرینەی خێزانی ئەو نموونانەی هێنراوەتەوە زیاتر لەکەسێک لەخێزانەکەیان کاری کردووە، مەبەست بەرزکردنەوەی ئاستی گوزەرانی خێزانەکەیان بووە.

**خشتەی ژمارە (١٤) بەردەوامبوونی منداڵ لەخوێندن**

| وەڵام | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٨٩ | ٣٠ |
| نەخێر | ٢١١ | ٧٠ |
| کۆ | ٣٠٠ | ١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (١٤)دا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە ڕێژەی ئەو منداڵانەی نموونەیان هێنراوەتەوە تەنیا بەڕێژەی (٣٠٪) بەردەوامبوون لەخوێندن. لەکاتێکدا (٧٠٪) خوێندنیان جێ هێشتووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت لەزۆرینەی منداڵەکان بەردەوام نەبوون لەخوێندن، بەڵکو جێیان هێشتووە. لەدەرەنجامی ئەو خشتەیەدا ئەوە وەدەست دێنین، کە ئەو ڕێژە زۆرەی خوێندنیان جێ هێشتووە پێچەوانەی کارنامەی مافی منداڵانە، کە لەهەردوو مادەی (٢٨ و ٢٩)ی مافی منداڵان هاتووە پێویستەو زەرورە منداڵ بەردەوام بێ لەخوێندن.

**خشتەی ژمارە (١٥) هۆکاری بەردەوام نەبوونی منداڵ لەخوێندن**

| هۆکار | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ئابووری | ١٩٧ | ٪٦٥ |
| سیاسی | ٥ | ٪٢ |
| کۆمەڵایەتی | ٤٤ | ٪١٤ |
| نەمێشتنی ماڵ | ٥٤ | ٪١٩ |
| کۆ | ٣٠٠ | ١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (١٥)دا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە ئەو هۆکارانەی بوونەتە هۆی ئەوەی منداڵ بەردەوام نەبێت لەخوێندن و وازی لێبێنێت، هۆکاری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی بوون لەگەڵ ئەو خێزانانەی نەیانهێشتووە منداڵەکانیان بخوێنن. جا لەمیانەی ئەم خشتەیەدا بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە ڕێژەیەکی زۆر لەو منداڵانەی نموونەیان هێنراوەتەوە هۆکاری دوورکەوتنەوەیان لەخوێندن، ئابووری بووە.

**خشتەی ژمارە (١٦) پەیوەندی نێوان کاری منداڵ و پیشەی باوک**

| وەڵام | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٨٧ | ٪٢٦ |
| نەخێر | ٢١٩ | ٪٧٣ |
| بێ وەڵام | ٣ | ٪١ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (١٦)دا جەخت لەسەر زۆرترین ڕێژەی نموونەکان دەکاتەوە، کە پەیوەندییەک نییە لەنێوان ئەو کارانەی ئەوان ئەنجامی دەدەن لەگەڵ پیشەی

باوکەکانیان بەڕێژەی (٧٣٪). بەڵام ئەوانەی کارەکانیان لەگەڵ پیشەی باوکیان یەک دەگرێتەوە تەنیا بەڕێژەی (٢٦٪).

لەوەڵامی ئەو خشتەی سەرەوەدا دەگەینە ئەوەی کە:" پەیوەندییەک هەیە لەنێوان پیشەی باوک و ئەو کاردی منداڵ ئەنجامی دەدات". ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە زۆرجار خێزان هۆکاری راستەوخۆ دەبێت بۆ پاڵنانی منداڵ، کە هەمان ئەو کارە بکات کەپیشەی باوکیەتی.

**خشتەی ژمارە (١٧) ژمارەی کاتەکانی کار لەکاتی ئێستادا**

| کاتەکانی | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ١-٣ کاتژمێر | ٣١ | ٪١٠ |
| ٤-٦ | ١٠٥ | ٪٣٥ |
| ٧-٩ | ٩٢ | ٪٣٠ |
| ١٠-١٢ | ٦٩ | ٪٢٤ |
| بێ وەڵام | ٣ | ٪١ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەبەیاننامەی خشتەی ژمارە (١٧)دا ژمارەی کاتژمێرمان بۆ روون دەبێتەوە، کە ئەو منداڵانەی نموونەیان هێنراوەتەوە لەکارکردن بەسەریان بردووە بەم شێوەیەیە: رێژەی (١٠٪) بۆ ماوەی (١-٣) کاتژمێر کاریان کردووە. رێژەی (٣٥٪) بۆ ماوەی (٧-٩) کاتژمێر کاریان کردووە. بەرێژەی (١٠-١٢) کاتژمێریش (٢٤٪) کاریانکردووە.

لەمیانەی ئەو خشتەی سەرەوەدا ئەو دەرەنجامە وەدەست دەهێنین، کە ئەو منداڵانە زیاتر لەوەی بۆیان دیاریکراوە بەکاتژمێر کاریان کردووە لەبواری کاردا، بێگومان ئەوەش پێچەوانەی کارنامەی مافەکانی منداڵە.

**خشتەی ژمارە (١٨) تەمەنی نموونەکان لەکاتی دەست بەکارکردنیان**

| تەمەن | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ٤-٦ | ١٩ | ٪٦ |
| ٧-٩ | ٩٢ | ٪٣١ |
| ١٠-١٢ | ١٢٨ | ٪٤٣ |
| ١٣-١٥ | ٥٤ | ٪١٨ |
| ١٦-١٨ | ٧ | ٪٢ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

خشتەی ژمارە (١٨) بۆمان روون دەکاتەوە، کە زۆرینەی رێژەی ئەو منداڵانەی بەنموونە هێنراونەتەوە، لەدەرەوەی ماڵ دەستیان بەکار کردووە و تەمەنیان لەنێوان (١٠-١٢) ساڵی بووە و رێژەشیان گەیشتۆتە (٤٣٪). بەڵام ئەوانەی لەماوەی تەمەنی نێوان (٧-٩) ساڵ و (١٠-١٢) ساڵ و (١٣-١٥) ساڵ و (١٦-١٨) ساڵ، رێژەکەیان بە ریز بەم شێوەیە بووە (٣١٪)- (١٨٪)- (١٢٪).

**خشتەی ژمارە (١٩) ژمارەی ئەو ساڵانەی منداڵ کاری کردووە**

| ژمارەی ساڵ | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ١-٢ | ١٣٩ | ٤٦ ٣ |
| ٣-٤ | ٩٤ | ٪٣١ ٣ |
| ٥-٦ | ٤٣ | ٪١٤ ٣ |
| ٧-٨ | ١٧ | ٪٥ ٦ |
| ٩-١٠ | ٢ | ٪٠ ٦ |
| ١١-١٢ | سفر | سفر |
| ١٣ زیاتر | ١ | ٪٣ |
| بێ وەڵام | ٤ | ٪١ ٣ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (١٩)دا بۆمان روون دەبێتەوە کە رێژەی (٤٦/٣٪) لەو منداڵانەی بە نموونە وەرگیراون (١-٢) ساڵ تەمەنیان لەکارکردن بەسەر بردووە. رێژەی (٣١/٣٪)یش تەمەنی (٣-٤) ساڵیان بەسەر بردووە. رێژەی (١٤/٣٪) (٥-٦) ساڵیان لەکارکردن بەسەر بردووە. رێژەی (٦/٥٪) (٧-٨) ساڵیان بەسەر بردووە. بەڵام ئەوانەی دیکە لەماوەی (٩-١٠) ساڵ هەروەها (١٣) بەرەو سەرەوەتر بەم رێژەیە بەسەریان بردووە بەنزیکەی (١٪) بۆ (٢) منداڵ و رێژەی (١/٣٪) بۆ تەنیا (٤) منداڵ لەکۆی (٣٠٠) منداڵدا.

**خشتەی ژمارە (٢) دابەشکردنی نموونەکان بەپێی تەمەن**

| تەمەن | ژمارە | رێژەی |
|---|---|---|
| ٥-٧ | ٨ | ٢ ٦٦ |
| ٨-١٠ | ٢٨ | ٩ ٣٣ |
| ١١-١٢ | ٩٩ | ٣٣ |
| ١٤-١٦ | ١٦٥ | ٪٥٥ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

بەیاننامەی خشتەی ژمارە (٢٠) بۆمان روون دەکاتەوە، کە رێژەی ئەو منداڵانەی ئارەزوویان لەوە هەبووە واز لەکارکردن بێنن گەیشتۆتە (٤٦٪). لەکاتێکدا ئەوانەی ئارەزوویان نەبووە، واز لەکار بێنن گەیشتۆتە رێژەی (٥٤٪) لەکۆی گشتی (٣٠٠) منداڵدا.

**خشتەی ژمارە (٢١) هۆکارەکانی پاڵنەری منداڵ بۆ کارکردن**

| هۆکار | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| هەژاری | ٢٣٠ | ٪٦٠ |
| نەبوونی بەخێوکار | ٩ | ٪٣ |
| پاڵنەری ماڵ | ٤٧ | ٪١٥ |
| ئارەزووکردن لەکار | ٥٣ | ٪١٧ |
| سەرنەکەوتن لەخوێندن | ٣٨ | ٪١٢ |
| هۆکاری دیکە | ٤ | ٪١ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی (٢١)دا بۆمان روون دەبێتەوە، کە ژمارەیەک هۆکار لەئارادان بۆ پاڵنەری منداڵ، کە بەنموونە هێنراونەتەوە بۆ کارکردن لەدەرەوەی ماڵ لەسەرووی هەموویانەوە هەژاریی، پاشان ئارەزوو کردن لەکار، دواتر پاڵنەری ماڵ و دوا هۆکار سەر نەکەوتن لەقوتابخانە. بەم رێژانەی لەخشتەکەدا دیاری کراوە.

**خشتەی ژمارە (٢٢) رازیبوونی منداڵ لەکارەکەی**

| وەڵام | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٧٠ | ٪٥٦٫٦ |
| نا | ١٢٥ | ٪٤١٫٦ |
| بێ وەڵام | ٥ | ٪١٫٦ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەبەیاننامەی خشتەی ژمارە (٢٢)دا بۆمان روون دەبێتەوە، کە رێژەی (٥٦/٦٪) لەو منداڵانەی نموونەیان لەسەر هێنراوەتەوە ئەو لێکۆڵینەوەیە دەیانگرێتەوە کە رازین لەو کارەی پراکتیزەی دەکەن. بەڵام بەرێژەی (٤١/٦٪) رازی نین لەکارەکانیان. لەکاتێکدا (١/٦٪) وەڵامیان نەداوەتەوە ئاخۆ رازین یان نا لەکۆی (٣٠٠) منداڵدا.

**خشتەی ژمارە (٢٣) هۆکاری نارازی نەبوون لەکار**

| هۆکار | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| کارەکە شیاو نییە لەگەڵ هێزو توانای | ٣٥ | ٪١١٫٦ |
| کارەکە شیاو نییە لەگەڵ قۆناغی تەمەنی | ٣٠ | ٪١٠ |
| کەمی قازانجی مادی | ٥٩ | ٪١٩٫٦ |
| خراپی جووڵانەوەی پیاوانی پۆلیس و شارەوانی | ١ | ٢٣ |
| درێژەی ماوەی کار | ٣٩ | ١٣ |
| هۆکاری دیکە | ٩ | ٣ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (٢٣)دا ئەو هۆکارانەمان بۆ دەردەخات، کە وای لەو منداڵانەی نموونەیان لەسەر هێنراوەتەوە کردووە نارازی بن لەکارەکانیان بەم شێوەیە: رێژەی (٦/١١٪) کارەکە لەگەڵ هێز و توانایان ناگونجێ. (١٠٪) کارەکە لەگەڵ قۆناغی تەمەنیان یەک ناگرێتەوە (١٩/٦٪) لەبەر کەمی قازانجی مادییە. (٤/٣٪) خراپی جووڵانەوەی خاوەن کارە لەگەڵیاندا. بەرێژەی (٣/٣٪) پۆلیس و پیاوانی شارەوانی بەخراپی لەگەڵیان دەجوڵێنەوە. (١٣٪) لەبەر دوورو درێژی ماوەی کارەکەیانە. کەچی (٣٪) لەبەر هۆکاری دیکەن.

بروانە خشتەی ژمارە (٢٤)

لەخشتەی ژمارە (٢٤) چۆنیەتی مامەڵەکردنی توند لەگەڵ ئەو منداڵانەی نموونەیان لەسەر هاتۆتەوە لەبواری کارەکەیدا روون دەکاتەوە. شایانی ئاماژە پێکردنە لەدەرەنجامی ئەو ئامارەدا ئەو بەڵگە وەدەست دەهێنین، کە رێژەی زۆری منداڵان لەلایەن ئەو کەسانە دووچاری بەشمەینەتی بوونەتەوە، کە رۆژانە مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون.

**خشتەی ژمارە (٢٥) ئارەزووی نموونەکان بۆگەڕانەوەیان بۆ خوێندن کە وازیان لێهێنابوو**

| وەڵام | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١١٦ | ٪٣٨٫٦ |
| نەخێر | ١٧ | ٪٢٣٫٦ |
| بێ وەڵام | ١١٣ | ٪٧٣٫٦ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

**خشتەی ژمارە (٢٤) چۆنیەتی مامەڵەکردنی خەڵك لەگەڵ منداڵ**

| جۆری مامەڵە | باس | ڕێژەی | خراپ | ڕێژەی | ئاسایی | ڕێژەی |
|---|---|---|---|---|---|---|
| جۆری مامەڵە کراوەکان لەگەڵ منداڵ | ژمارە | سەدی | ژمارە | سەدی | ژمارە | سەدی |
| کەس و کار | ١٩٣ | ٪٦٤ | ١٤ | ٪٤ | ٨٥ | ٪٢٨ |
| خاوەن کار | ١١٣ | ٪٣٧ | ١٣ | ٪٤ ٣ | ٨٢ | ٪٢٧ |
| هاوڕێ | ١٤١ | ٪٤٧ | ٢٠ | ٪٦ ٦ | ١١٨ | ٪٣٩ |
| پیاوانی پۆلیس و شارەوانی | ٥٥ | ٪١٨ | ٨٩ | ٪٢٩ ٦ | ٧١ | ٪٢٣ |
| خاوەن شوێنە بازرگانییەکان | ٦٦ | ٪٢٢ | ١٤ | ٪٤ ٦ | ١٠٦ | ٪٣٥ |
| میوانەکان | ٨٠ | ٪٢٦ | ١٣ | ٪٣,٤ | ١٤٣ | ٪٤٧ |

لەبەیاننامەی خشتەی ژمارە (٢٥)دا بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە بەڕێژەی (٣٨/٦ ٪) لەو منداڵانەی نموونەیان لەسەر هاتوتەوە ئارەزووی ئەوەیان هەبووە سەرلەنوێ بگەڕێنەوە سەر خوێندن، کە پێشتر وازیان لێهێنابوو. بەڵام بەڕێژەی (٢٣/٦ ٪) ئارەزوویان نەبووە بگەڕێنەوە بۆ خوێندن. لەکاتێکدا ڕێژەی (٧٣/٦ ٪) ئامادە نەبوون وەڵام بدەنەوە بەوەی ئاخۆ ئارەزوویان لەگەڕانەوە هەبووە یان نا، جارێکی تر دەست بەخوێندن بکەنەوە.

**خشتەی ژمارە (٢٦) هۆکاری ڕووبەڕوو بوونەوەی منداڵ لەگەڵ گرفت لەکاتی کاردا**

| جۆری گرفت | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ئەرك و ماندوو بوونی زیدە | ٤٩ | ٪١٦/٣ |
| شەڕکردن | ٤٨ | ٪١٦ |
| سووکایەتی پێکردن | ٤٣ | ٪١٤ ٣ |
| مانەوەی کاتێکی زۆر لەشەقامەکان | ٣٥ | ٪١١ ٦ |
| دواکەوتن لەگەڕانەوە | ٢٠ | ٪٦ ٦ |
| تەنگ پێ هەڵچنینیان لەلایەن دوکاندارەکانەوە | ١٩ | ٪٦ ٣ |
| گرفتی دیکە | ١٠ | ٪٣ ٣ |

لەدەرەنجامی ئەو خشتەیەی سەرەوەدا دەرکەوتووە، کە منداڵەکان لەکاتی کارکردنیان لەسەر شەقامەکان ڕووبەڕووی گرفت بوونەتەوە. ڕێژەی (١٦/٣) گرفتەکانیان بەهۆی ئەرک و ماندووبوونی زۆر بووە، کە زیاد لەهێزو توانای خۆیان مایەیان داناوە. بەڕێژەی (١٦ ٪) بەهۆی شەڕکردن بووە لەگەڵ کەسانی دیکە. لەکاتێکدا بەڕێژەی (١٤/٣ ٪) ڕووبەڕووی سووکایەتی پێکردن بوونەتەوە.

بەڵام ئەوانەی گرفتیان تووش بووە بەهۆی مانەوەی ماوەیەکی زۆر لەشەقامەکان لەرۆژدا، لەهاوینی گەرمدا یان زستانی ساردا ڕێژەکەیان گەیشتۆتە (١١/٦ ٪). کەچی ئەوانەی گرفتیان ڕووبەڕوو بۆتەوە بەهۆی ئەوەی درەنگ گەڕاونەتەوە ماڵەوە ڕێژەیان (٦/٦ ٪) بووە. بەڵام ئەوانەی لەلایەن دوکاندارەکانەوە دووچاری تەنگ پێ هەڵچنین بوونەتەوە ڕێژەیان (٣/٣ ٪) بووە.

لەدەرەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەدا ئەوە وەدەست دەهێنین، کە ڕێژەی زۆری ئەو منداڵانەی نموونەیان لەسەر هێنراوەتەوەو لەشەقامەکان کاردەکەن بەڕێژەی (٧٥ ٪) ڕووبەڕووی گرفتی جۆراوجۆر بوونەتەوە، کە ئەوەش کاریگەریی هەبووە لەسەر کەسایەتییان و سروشتی پەیوەندییەکانیان و جۆری ڕەفتاریان، کە لەگەڵ کەسانی دیکە پراکتیزەی دەکەن.

**خشتەی ژمارە (٢٧) ئایا منداڵان دووچاری نەخۆشی هاتوون؟**

| وەڵام | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ٥٩ | ٪١٩ ٦ |
| نەخێر | ٢٤١ | ٪٨٠ ٣ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشتەی سەرەوەدا ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە تاچەند ئەو منداڵانەی لەشەقامەکان کار دەکەن، دووچاری نەخۆشی

بوونەتەوە. ڕێژەی (١٩/٦٪) لەکـــۆی (٣٠٠) منداڵ بەزۆری تووشی نەخـۆشی بوون لەمــاوەی کــاردا بەهۆی بەرزبوونەوەی پلەی گـەرمـا لەهاویندا و سـەختـی سـەرمـا لەزستاندا. لەکاتێکدا بەڕێژەی (٨٠/٣٪) دووچاری هیچ جۆرە نەخۆشییەک نەبوونەتەوە. لەخشـتـەی ژمارە (٢٨)دا جـۆری ئەو نەخـۆشـیـیـانە نیـشـان دەدات، کـە منداڵانی نموونەیان لەسەر هاتۆتەوە دووچاری بوون.

خشتەی ژمارە (٢٨) جۆری نەخۆشی، کە منداڵان لەکاتی کارکردن تووشی بوون

| جۆری نەخۆشی | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| سکچوون | ٧ | ٢ ٣ |
| سووتان | ٢ | ٠ ٦ |
| بریندار | ٤ | ٪١ ٣ |
| ژانەسەر | ١٣ | ٤ |
| تا | ٩ | ٣ |
| جومگە | ١١ | ٣ ٦ |
| تەنگە نەفەسی | ١ | ٠ ٣ |
| لاوازی | ١٢ | ٤ |
| نییە | ٢٤١ | ٨٠ ٣ |
| کۆ ٣٠٠ | ٣٠٠ | |

خشـتـەی ژمـارە (٢٨) جـۆری ئەو نەخـۆشـیـانەمـان بۆ دەردەخـات، کـە منداڵان لەکـاتی کـارکـردن تووشی بوون. "ڕێژەی (١٩/٤٪ لەکۆی گشـتی لەماوەی مـانەوەیان لەو کارەی پراکتیزەی دەکەن تووشی نەخۆشی جۆراو جۆر بوون وەک (سکچـوون- سـووتان- برینداری- ژانە سـەر- تا- تەنگە نەفـەسی- جـومگە- لاوازی) لەکـاتێکدا بەڕێژەی (٨٠/٣٪) تووشی هیچ جۆرە نەخۆشییەک نەبوونەتەوە.
لەدەرەنجامی بەیانکردنی ئەو خشـتـەیەدا دەتوانین ئەوە وەدەست بێنین، کـە ئەو ڕێژەیەی لەوانە تووشی نەخـۆشی جۆراوجـۆر بوون، بەهۆی درێژی کـاتی کـارکـردن بووە، کە سەرمای زستان و گەرمایەکی زۆری هاوین لێیداون.

خشتەی ژمارە (٢٩) ئاخۆ منداڵەکە لە شوێنی کارەکەی برای لە گەڵ بووە ، کە لەهەمان قۆناغی تەمەنی ئەودا بێت؟

| وەڵام | ژمارە | |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٣٥ | ٤٥ |
| نەخێر | ١٥٥ | ٥١ ٦ |
| بێ وەڵام | ١٠ | ٣ ٣ |
| کۆ | ٣٠٠ | ١٠٠ |

لەخشتەی ژمارە (٢٩)دا بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە بەڕێژەی (٤٥٪) لەو منداڵانەی بەنموونەوەرگیراون، برایان لەهەمان قۆناغی تەمەندا کاریان لەگەڵ کردوون. لەکاتێکدا بەڕێژەی (٥٠/٦٪) برایان نەبووە لەهەمـان قۆناغی تەمـەندا. بەڵام بەڕێژەی (٣/٣٪) لەکـــۆی (٣٠٠) منداڵ وەڵامـــیـــان نەداوەتەوە.

خشتەی ژمارە (٣٠) ئاخۆ منداڵ لەهەمان بواری کاردا پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێکانی هەبووە و سەردانی کردوون؟

| وەڵام | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| بەڵێ | ١٣٢ | ٪٢٤ |
| نەخێر | ١٦٥ | ٥٥ |
| بێ وەڵام | ٣ | ١ |
| کۆ | ٣٠٠ | ٪١٠٠ |

لەخشـتـەی ژمـارە (٣٠)دا بۆمـان ڕوون دەبێـتـەوە، کە بەڕێژەی (٤٤٪) پەیوەندی لەگەڵ هاوڕێیـان و سـەردانیـان هەبووە. کـــەچی (٥٥٪) هیـچ پەیوەندیـیـــان نەبووەو سـەردانی هاوڕێکانیـشـیـان نەکـردوون لەهەمـان بواری کارەکانیاندا. بەڵام (١٪) وەڵامیان نەداوەتەوە.

خشتەی ژمارە (٣١) ئەو شوێنەی کە منداڵ لەدوای کار بۆی دەگەڕێتەوە

| وەڵام | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| ماڵ | ٢٨٧ | ٪٩٥ ٦ |
| شوێنەکانی ئەتاری | ٢٠ | ٪٦ ٦ |
| هاوڕێ و خزمەکانی | ١٥ | ٪٥ |
| سینەما | ١٣ | ٪٤ ٣ |
| شوێنی تر | ١٠ | ٪٣ ٣ |

لەدەرەنجـامی خـشـتـەی سـەرەوەدا ئەو شـوێنانەمـان بۆ ڕوون دەبێـتـەوە، کـە منداڵ لەدوای کـارکـردنەکـەی بۆی گەڕاوەتەوە. ڕێژەی (٩٥/٦٪) گەڕاونەتەوە مـاڵ. ڕێژەی (٦/٦٪) چوونەتە شـوێنەکـانی ئەتاری بە مـەبەسـتی یاریکردن بەئامـێـرەکـان. (٥٪) سـەردانی هاوڕێ و نزیکەکـانیـان کـردووە بۆ یاریکردن و کـات بەسـەربردن لەگەڵیـان. کەچی (٤/٣٪) ڕوویان لەسینەماکان کردووە.

بەڵام ئەوانەی روویان لەشوێنی دیکە کردووەو چوونەتە (باخچە گشتییەکان- شەقامە گشتییەکان- بازارەکان) کە رێژەیان گەیشتۆتە (٣/٣٪).

لەدەرەنجامی ئەو خشتەی سەرەوەدا، ئەوە وەدەست دەهێنین کە رێژەیەکی زۆری منداڵان لەدوای کارکردنیان گەڕاونەتەوە ماڵەکانیان.

**خشتەی ژمارە (٣٢) جۆری نیشتەجێی نموونەکان**

| جۆری نیشتەجێ | ژمارە | ٪ |
|---|---|---|
| موڵك | ٥٠ | ١٦٦٪ |
| کرێ | ٣٨ | ١٢٦٪ |
| بێ وەڵام | ٢١٢ | ٧٠٦٪ |
| کۆ | ٣٠٠ | ١٠٠٪ |

بەیاننامەی خشتەی ژمارە (٣٢) ئاماژە بەشوێنی نیشتەجێی ئەو منداڵانە دەدات، کە بەنموونەیان وەرگیراون، بەوەی رێژەی (١٦/٦٪) خانووەکەیان موڵک بووە، رێژەی (١٢/٦٪) کرێچی بوون. کەچی ئەوانەی وەڵامیان نەداوەتەوە رێژەکەیان زۆر بووەو گەیشتۆتە (٦/ ٧٠٪) ئاخۆ خانووەکەیان موڵک بووە یان کرێ.

**بەشی پێنجەم: (دەرەنجام و راسپاردەکان)**
**گرنگترین دەرەنجامەکان**

پاش شیکردنەوە و شرۆڤەکردنی ئەو بەیاننامانەی لەسەر ئەو تاکانەی بەنموونەیان وەرگیراون، لەلێکۆڵینەوەیەکی مەیدانیدا گەیشتینە هەندێ دەرەنجام و دەشێ گرنگترین دەرەنجامەکان بخەینەروو:

١- ئەو لێکۆڵینەوە مەیدانییە ئاماژەی بەوەدا، کە بەرێژەی (٢٠٪) لەو منداڵانەی بەنموونەوەرگیراون بێبەش بوون لەخوێندن، ئەمەش پێچەوانەی یاسای مافەکانی منداڵە.

٢- لێکۆڵینەوەکە ئەو دەرەنجامەی وەدەست هێنا، کە کارکردنی منداڵ بەشێوەیەکی هەمیشەیی یەک پیشە پراکتیزە ناکات، بەڵکو زۆر جۆری پیشەو کاری تایبەت پراکتیزە دەکات، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ زۆری رێژەی قازانج، دەرەنجامی خشتەی (٦) ئەو خاڵە روون دەکاتەوە.

٣- (٧٠٪)ی ئەو منداڵانەی کارکردن دەکەن لەو نموونانەی هاتووە، لە خوێندن بەردەوام نەبوون و هۆکارەکەش بۆ سروشتی ئەو کارە دەگەڕێتەوە، کە دەیکەن. خشتەی ژمارە (١٤) ئەو خاڵە روون دەکاتەوە.

٤- لێکۆڵینەوەکە بۆمانی ئاشکرا کرد کە (٢٦٪)ی ئەو منداڵانەی بەنموونە هێنراونەتەوە هەمان کاری باوکیان کردووە. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە خێزان رۆڵی هەبووە بەپاڵنانی رۆڵەکانیان بۆ کارو دەستکەوتی مادی.

٥- ئاماژەی بەرێژەیەکی زۆرکەم نەداوە لەو منداڵانەی کارکردن دەکەن و چەند کاتژمێرێکی دوورو درێژ لەبواری کاردا بەسەر دەبەن کە رێژەکەیان گەیشتۆتە (٨٩٪) کە رۆژانە (٤-١٢) کاتژمێر بەشێوەیەکی بەردەوام کات بەسەر دەبەن. خشتەی ژمارە (١٧) ئەو رێژەیە روون دەکاتەوە.

٦- دەرەنجامی لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە ئاماژە بەوە دەدات، کە رێژەیەکی دیاریکراو لەو منداڵانەی کارکردن دەکەن، رووبەرووی مامەڵەی خراپ بوونەتەوە لەلایەن ئەو کەسانەی مامەڵەیان لەگەڵدا کردوون، وەک: (خاوەن کار- هاوڕێییانیان- پیاوانی پۆلیس- شارەوانی و میوانەکان) خشتەی ژمارە (٢٤) ئەو دەرەنجامە دەخاتە روو.

٧-لێکۆڵینەوە مەیدانییەکە ئەو دەرەنجامەی وەدەست هێنا، کە ئەو منداڵانەی کار دەکەن رووبەرووی زۆر گرفت دەبنەوە کە کاریگەریی دەبێت لەسەر سروشتی پەیوەندییەکانیان و رەنگدانەوەی رەفتاریان لەگەڵ کەسانی دیکە.

٨- نزیکەی لە (١٩٪)ی ئەو منداڵانەی تووشی نەخۆشی هەمە جۆر بوون لەکاتی مانەوەیان بۆ ماوەیەکی درێژ لەکاردا وەڵامیان داوەتەوە، کە بەهۆی سەرمای سەختی زستان و بەرزبوونەوەی پلەی گەرمای هاوین بووە.

٩- لێکۆڵینەوەکە ئاماژەی بەوەداوە، کە رێژەی (١٦٪) لەو منداڵانەی بەنموونە هێنراونەتەوە پاش ئەوەی کارەکانیان تەواوکرد، ناگەڕێنەوە بۆ ماڵ، بەڵکو لەشوێنی دیکە کات بەسەر دەبەن، وەک چوون بۆ سینەماو شوێنەکانی ئەتاری لێدەکرێت. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی رووبەرووی هەندێ گرفت ببنەوە یاخود لەرێگەی راست لابدەن.

**پێشنیازو راسپاردەکان**

لەمیانەی ئەو دەرەنجامانەی پێی گەیشتین دەشێ ژمارەیەک پێشنیاز پێشکەش بکەین بەمەبەستی کەم کردنەوەی ئەو بارانەی خرانە روو.. پێشنیازەکان ئەمانەن:

١- کارکردن لەپێناو دۆزینەوەی پەیوەندییەکی بەردەوام لەنێوان ئیدارەی قوتابخانەکان و خێزانی ئەو منداڵانەی خۆ دەدزنەوە بەمەبەستی گەڕاندنەوەیان بۆ قوتابخانەو لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو خێزانانەی قوتابخانە لە منداڵەکانیان قەدەغە دەکەن.

٢- دانانی هێمای تایبەت لەسەر ئەو منداڵانەی کار دەکەن و چاودێری بکرێن بەمەبەستی ئەوەی زێدەڕۆیی نەکەن لەو کاتەی بۆیان دیاریکراوە بۆ کارکردنی منداڵ بەپێی یاساکانی نێودەوڵەتی.

٣- قەدەغەکردنی منداڵی کرێکار لەو شوێنانەی پێویستی بەئەرک و هێزو توانا هەیە، کە ناگونجێ لەگەڵ ئەرک و توانای منداڵ، لەهەمان کاتدا لێپرسینەوە لەگەڵ ئەو خاوەن پیشەو دوکاندارانە بکرێت، کە بوار بۆ کارپێکردنی منداڵ رێک دەخەن.

٤- کردنەوەی شوێنی تایبەت بۆ منداڵ و دەستەبەرکردنی تەواوی پێویستییە زەرووڕەکانیان، وەک یاری و کۆمپیوتەرو ئەتاری بەمەبەستی گرتنەوەیان، وێڕای ئەوەی وانەی پەروەردەییشیان بۆ بگوترێتەوەو، خێزانەکانیشیان بۆ ئەو مەسەلەیە هان بدرێن.

**سەرچاوە وپەراوێزەکان:**

١- المجلس العربي للطفولة والتنمية- ظاهرة عمالة الاطفال في الدول العربية- ١٩٩٨- ص٢٦٤.

٢- الانترنيت، موقع google اتفاقية حقوق الطفل، شبكة عراقية حقوق الاطفال- بيروت.

* تقصد بالعهدين الدوليين الخاصين لحقوق الانسان هي:
١- الهعد الدولي شأن الحقوق المدنيه والسياسية ١٩٩٦.
٢- العهد الدولي للحقوق الاقتصادية والاجتماعية والثقافية ١٩٦٦.

٣- الانترنيت- المصدر السابق.

٤- سعد زهران- اطفالنا في السياسات التعليمية. مجلة الطفولة والتنمية- المجلس العربي للطفولة والتنمية، العدد ص مجلد شتاء ٢٠٠١- القاهرة.

٥- محمد ابو العزم- العناية بالثقافة القومية للطفل العربي- جامعة الدول العربية بيروت ١٠٧٠ ص٦٧.

6- Harold Roberts, Roberts, Dictinary of industrial Relations washingtton P 189.1964

٧- عبدالعزيز، هيكل، مشاكل قياس من الانتاجية العمل- معهد الانماء العرب- ط- بيروت ١٩٧٦ ص٥٣.

٨- بدوي، احمد زكي- معجم المصطلحات العلوم الاجتماعية- مكتبة بيروت- لبنان ١٩٧٨ ص٤٤٨.

٩- باركر اخرون- علم الاجتماع الصناعي- ترجم د.محمد علي محمد آخرون- دار المعارف- الاسكندرية ١٩٧٢ ص٢٤٠.

١٠- محمود عبدالمولي- علم الاجتماع من ميدان العمل الصناعي الدار العربية للكتاب ١٩٨٤ ص١٥.

١١- يوسف الياس حسن. الوجيز في شرح قانون العدل رقم ١ لسنة ١٩٨٧ مطابع التعليم العالي بغداد ١٩٩٠ ص١٨٠.

١٢- حسين- محمد حري- اهم المشاكل العالمية في مصانع بغداد- رسالة ماجستير غير منشورة- جامعة بغداد- كلية الاداب- علي الاجتماع.

١٣- شفعه- محمد فهد- احكام العمل وحقوق العمال في الاسلام- دار الرشاد- بيروت ١٩٦٧ ص١٥.

١٤- القران الكريم (فصلت/ ٣٣).

١٥- القران الكريم (يسين/ ٣٥).

١٦- عزيز ابراهيم (الدكتور) شرح قانون العمل العراقي الجديد ج١- مطبعة جامعة بغداد ١٩٧٥ ص٢٨.

١٧- عزيز ابراهيم (الدكتور) شرح قانون العمل- المصدر السابق ص٢٩.

١٨- الانترنيت، منظمة العمل الدولية، موقع www.ilo.org.

١٩- اتفاقية حقوق الطفل- المصدر السابق.

٢٠- منظمة الامم المتحدة للطفوله- اليونسيف- وضع الاطفال في عام ١٩٩٧- المطبعة الوطنية- عمان- الاردن- ص٤٠.

٢١- صحيفة تشرين الديمشقية ارتفاع معدات عمالة الاطفال في الوطن العربي- الاثنين ٢٠٠٢/٤/٨.

٢٢- د.احسان محمد الحسن و د.عبدالمنعم الحسن- طرق البحث الاجتماعي- جامعة الموصل ١٩٨١ ص.١٥٩

و: فاتیح یاسین مودەڕیس

# رۆڵی ئافرەتانی هەولێر لە بزاڤی رۆشنبیری و نیشتمانی و نەتەوایەتیدا

دکتۆر سامیە شاکر (مەشخەڵ)

هەر لە منداڵییەوە... سەرەتای چالاکییەکانم زۆر جاران باوکم پێی دەگوتم: یا خوا بەدەردی «رەحمەخانی بچی» ئەو بێژە نەستەقەی باوکم... بۆی گێرامەوەو دەیگوت و دەیگوتەوە لەو کاتانەی کە هەستی بەبزاڤی رامیاری و رۆشنبیریی من دەکرد!! رۆژێکیان لە بەرێزیانم پرسی: ئەرێ بابەگیان ئەو «رەحمەخانە» کێیە و چ کارێکی نابەجێی کردییە... بۆچی من بەدەردی ئەو بچم؟

ئەویش بۆی گێرامەوە بە ئامادەبوونی خوشکەزاکەی خوالێخۆشبووان (مووسا عەبدولسەمەد)و خەزووردکەشی کاک (عەونی یووسف)، کە ئەوانەی زۆر خۆش دەویستن هەمیشە هاوینان لە شەقڵاوەی هاوینەهەوار دەهاتنەلامان: فەرمووی کچم ئەو رەحمەخانە هیچی نەکردبوو!! رۆژێکیان لەگەڵ دایکی چووبووە سەر قەبران «لەبری چەکمە پێڵاوی لەپاکردبوو» «پێڵاوی ئاسایی لەپێ کردبوو»...

کاتێ لەدەرگای قەلا ئاوڕلێکی براکەی ناسیبوونییەوە دەستبەجێ بەبراکەی گوتبوو... ئەویش ئێوارە لەدایکی پرسیبوو... دایکە هەرچەندە دڵنیای کردبوو کە بەیەکەوە بووینە و بۆ سەر قەبران چووینە... بێ سوودبووەو چووەتە ژووریّ (٣٦) خەنجەری لێداوەو کوشتبووی[1] ئەوبەسەرهاتە دڵتەزێنە هەتا ئێستا کەس لێی نازانێ! با هەولێریش بێ!

ئێمەیش لە هەندەران... لەژێر سایەو سێبەری ژیانێکی سەختی دەربەدەری هەرچەندە دووچاری زۆر لە ئازارو ئەشکەنجە هاتین، زۆرشتی باشیش فێربووین و لە راستی گەلێ کاروکرداریش گەیشتین... بۆمان روون بووەوە: کە ئەوەی لەمێژووی خۆی شارەزاییەکی باشی نەبێ، ناتوانێ هەنگاوی راست و رەوا و لە بار بهاوێ!! ناتوانێ خۆی بەخەڵکانی بیانی بناسێنێ و کەلتووری خۆیانیان پێ رابگەیەنێ.

لەژێر باڵی سەختی دوور وڵاتی تاراوگەو لە غەریبیان لەسایەو سێبەری ناگزووری ژیانی ئاوارەیی... ژیانێکی سەختی ئاوەگێی و تەنگەبەریماندا... لەکان و کانیاوی زووخاوی مێشک و دەروون شتی پوخت و پتەوو باشیشمان هەڵێنجا- لەبینین و فێربوون- خوێندن و پراکتیک- لەساتمەو لێکدانەوە... و تەنیایی و پشت بەخۆ بەستن...

ئەوانە سوودی یەکجار زۆریان پێ بەخشین... کورد واتەنی: هەر عەقلێک لەخەسارەیەک... (هەر خەسارەیەک؟! بەڵکو هەزارو هەزاران خەسارە)بوو. شارەزایی لەتێکۆشان و رابردووی گەلان... لەهەڵسوکەوت و

هونەرو زانست و رۆشنبیرانیان، لە شارستانیەتی ئەو ولاتانە... هەزاران بەسەرهات و داستانی جۆراوجۆری سەر سوڕهێنەر. چاومان بە چەندین پارک و پەیکەری نەخشین و پەڕاوو پەرتووکەکانیان کەوت- لە (لایپزیک)ی ئەلمانیا[2] (ئەو شارەی کە چاردنووسی منی تێکەوت) چاوم بە پەیکەری (ڤۆلکەر شلاخت دینکمال) کەوت: واتە پەیکەری کوشت و کوشتاری گەلان کە بە عەرەبییەکەی نووسراوە «تمثال معرکة الشعوب» دیاردەی شەڕەکەی (ناپلیۆن)ی سالی (١٨٨٣) پیشان دەدا کە لە (٧٨)ی ئوکتۆبەری ئەو سالەیاندا کە ئێستاش شەقامەکە ناوی هەر (ئاختسینتن ئۆکتۆبەر)ە ناوی نەگۆڕاوە... ئا لەو شەقامە شەڕەکە کۆتایی پێ هاتووەو بەچەکی سپی لەشکرانی حەڤدە دەولەتی فرە نەتەوە کەوتوونەتە گیانی یەکتری و یەکتریان براندبووەوە... بەسەدان لاشە بە کۆمەل نێژراوەکان هەر لەو شوێنە «گۆمێکیان لەسەر دروست کردووەو تێیدا قازو مراوی بەخێوەدەکرێ» ڕۆژانە خەلکانی خۆیی و بیانی دانەوێلە دەبەن بۆ ئەوێ و دەیدەنە پەلەوەرەکان و سەیری ئاوی سەر ئەو گۆڕستانە دەکەن!! لەلای ژووروشیانەوە پەیکەرێکی بەرزی (١٨٠) مەتری و پانی (١٢٠) مەتر کە بە(٤٠٠) پەیژە بۆی دەچنە سەر لووتکەکە[3] قەدی پەیکەرەکەش بە بەرگی (١٧) سەربازی فرەنەتەودیی جۆراوجۆر نەخش کراوە، کە هی ئەو ولاتانەن لەو شەڕەدا بەشدار بووینە و لەسەرەوەشیان بەخەتێکی دیار نووسراوە: «ئەی گەلانی جیهان سوود لەو کارەساتە وەرگرن»!

ئەوەیان جگە لە پەیکەری داهێنەرو هونەرمەندان و شاعیر و بوێژو نووسەرانی وەک گۆتە... شیلەر سباسیتان باخ... ڕۆبەرت کۆخ... ئێرنست تێلمان و زۆر زۆری تر... پارک و پەیکەری دێرین و دروشمی لێهاتووش بەهەمان شێوە دارێژراون بۆ ئەو ئافرەتانەی کە لەهەمان بارو بارست و لەهەمان خول و کارگێڕیدا بووینە، وەک: «گسقیستەر شولە» واتە قوتابخانەی خوشکان... ڕێکخراوو گۆڕستانی لویزا ئۆتۆپێتەر... پارک و پەیکەرێکی جوان بۆ «کلاراتسکیی» کە باخێکی پان و بەرینی (٤٥٠) دۆنمییە کراوە بەلاتەیەکی گەشتوگوزارو کۆڕو کۆبوونەوەو سەیرانگای خۆیی و بیانییان... ڕۆژانە سەردانی دەکرێ سالانەش لەیادو بیرەوەرییەکانیاندا... (لەدایک بوون و کۆچ کردنیدا) خەلکی چەپکە گولی نایابی ڕەنگاوڕەنگ دەخەنە سەر پەیکەرەکانیان. یا شەقامی ڕۆزا لۆکسمبرگ... بەهەمان شێوەو شیواز و بەبێ هیچ جیاوازییەک پیاو یا ئافرەت، هیچ جیاوازییەکی لایەنە تێکۆشانەکانیان و لاپەڕە گەشی و بەهرەدارەکانیان فەرامۆش نەکراوەو تەنانەت لەیەک بارستی دیارو دروستدا بۆ هەردوو لایەنیان سەنگ و ڕێزلێنان دانراوە... جگە لەوەش لەگشت مۆزەخانەو زانکۆو بان و بالەخانەو بەڕێوەبەرایەتییەکان ناوونیشانی لێهاتوو بۆ ئەوانە نەخش کراوەو ناوو ناوداری و بیرەوەرییەکانیان هەلکەنراوە، سەدان نامەو نامیلکەیان بۆ چاپ کراوە... تا بەنەوەکانیان و بەبیانیانیشیان بناسێنن... هەروەکو ئاماژەم پێ کرد: دەلێن مرۆڤ ئەگەر مێژووی خۆی نەزانێ ناتوانێ هەنگاوی ڕاست بهاوێ و خۆی بەکەسانی تر بناسێنێ...

هەر بۆیە منیش ماوەیەکە دووچاری بیرو لێکدانەوەیەکی لە ئەندازە بەدەربوویمەو داوایەکی ڕەوایەو بەرۆکی گرتیمە... بەناو شەقام و دەروازەکانی هەولێری (شارەکەم)دا دێم و دەڕۆم، لە هەموو کووچە و کۆلانانی ورد دەبمەوە... هەقەو دەشبینیم بەچاو پەیکەری پیاوە تێکۆشەرو ناودارەکانی خۆیی کوردو بیانی... پارک و دووریان و لەسەر دووکانێکیشیان مۆنالیزام بەدی کرد... ئەوانە هەموو دروستن و شایەنی بایەخ پێدانن... بەلام لەگەل ئەوانەشدا کەلێنێکی زل و زەبەلاحی ئاشکراشی تێدا دەبینم... چقلێکی دوور چاوان و گرێیەکی ئاگرینە لەدل و دەروون بۆ ئێمەی ئافرەت، کە دەبێ هەر چۆنێک بێ لێی بکەوینە سەرچۆکان و پرسیارێکە ئازارمان دەداو دەبێ بیدرکێنین: کاتێ کە یەکێتیی نووسەران پشتگیرییان لێ کردم لە خۆشییان بالم گرت و خۆمم خستە ژێر بارەکەو کەوتمە بنجوێناوانی مەسەلەکان.

کە جەنابی بەڕێز سەرۆکی

هەرێمی کوردستان کاک «مەسعود بارزانی» لەسەردانەکەی ئەو دواییانەدا بۆ پارێزگای دهۆک فەرمووی: نابێ ئەنفال کراوەکان لەیاد بکرێن و دەبێ بخرێنە نێو پرۆگرامەکانی خوێندن و زانست... ئەو وتەیەی بەڕێزیان پتر بووە هاندەرو دڵنیای کردم و ئاسۆیەکی روون و ئاشکران تری بۆ رەخساندم و بابەتەکەم ساناترو کراوەتر بوو، هەر بۆیە... پێنووسەکەم تیژترو کەوتەبەر دارشتنی رستەکانی دوورِ چاوو دڵ و دەروونان... بۆ سەر گۆڕی بەکۆمەڵ نێژراوەکان... ئەنفالکراوەکان... بەخورتی گوێزراوەکان[٤] بۆ نێو بەندو بەندیخانەکان و بەناهەق ونبوو و کوژراوەکان... و بە نائومێدیش و بێ سەرو شوێن بەجێماوەکان، کە زۆرینەیان دایک و خوشک و هاوسەرو بەچکەی برا پیاوەکانمانن و... لەخۆمم پرسی!!

دەبێ ئێمە نەتوانین ئەو دەروازە تاریکە روون بکەینەوە؟! نەتوانین داواکارییەک بخەینەروو و ئەو «کەلێنە پربکەینەوە»... ئەو کۆمەڵە قەشەنگەی کاروانی ئافرەتە لێقەوماوو دەربەدەرو تێکۆشەرو زاناو رۆشنبیرو دایک و خوشک و هاوسەری شەهیدو پێشمەرگە نەمرەکان بێنینەکایەو بۆی بکەوینە سەرچۆکان و ئەو کەلەبەرە بەدەربخەین و بلێین ئایا دایک و خوشک و هاوسەرانتان بۆ ئەو بارستەی ئەمڕۆ یارمەتیدەر نەبوون؟؟ رۆڵەی دایکە پشت شکاوەکەت نەبووی؟! ئەدی خوشکەکەت و هاوسەردکەت پۆستەی بۆ بە ئەنجام نەدەدای؟!... چەکی بۆ نەدەگواستیتەوەو بۆی نەدەشاردییەوە...؟! شان بەشانی جەنابتان لەخولی زانست و زانین و رووناکبیری تێکۆشانیشدا نەبوو؟؟ ئەدی لە تەک ئێوەی بەرێز نەکەوتە هەندەران و ژەهری تاراوگەی نۆش نەکرد؟! کە بەپێی سەرژمێرێکی یاسایی (٣/٥) پەنابەرانی کورد ژن و منداڵ بوون... و خۆشم شایەتم و (لەگەڵ سەرژمێرەکەدا بوومە)...

هەر بۆیە ئێمەی ئافرەت دەمانەوێ ناونیشانی ئەو ئافرەتە هەولێرییانە بخەینەروو و شارەزاییەکەی خۆمان زیندە بەچاڵ نەکەین... وەک دڵۆپە ئاوێکی دەریای بێ سنووری گیانی فیداکاری و خۆبەختکردنیان نەشاردرێتەوەو ئازارو ئەشکەنجەی ئەو بەشە گرنگەی کۆمەڵەکەمان فەرامۆش نەکرێ و رێگا نەدرێ بەپشت تێکردنیان پێچەوانەکەی زیان بەخشەو پشت تێکردنە لەمێژووی خۆمان.

بەڕێزان: هەر لەسەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق «لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە» ئافرەتانی شاری هەولێر هەروەک ئافرەتانی جیهان و ئافرەتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەمەیدانی تێکۆشان بوون، هەروەکو پێشتر باسمان لێ کرد... هاوبەشییان لەهەموو بوارەکانی تێکۆشاندا کردووە:

- لە پشتیوانی باوک و براو هاوسەرە تێکۆشەرەکانیان لەپێناوی داخوازییە گشتی و تایبەتییە رۆژانەکان... بۆ سەربەخۆیی وڵات و لەدژی داگیرکەران.

- بۆ پشتگیری کردن لە مافی نەتەوایەتی گەلی کوردمان بەپێی پەیمانی سیڤەر و پووچەڵکردنەوەشی لەدوای پەیمانی لۆزان.

- پشتیوانی کردن لە شۆڕش و راپەرینە نیشتمانییەکانی کورد: شۆڕشی شێخ مەحموودی حەفید، شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری، عەبدولسەلام بارزانی و شۆڕشە یەک لەدوای یەکەکانی بارزان.

- یارمەتیدانی بەندە سیاسی و بەدیل گیراوەکان: بەخۆ پێشاندان و رێپێوان و بەسەر کردنەوەی خێزانە شەهیدو لێقەوماوەکان.

- هەوڵ و تەقەڵای ئافرەتان بووە هۆی پتر هوشیاری و بەرهەڵستکردنی چەوسانەوەیان و... داخوازییەکانیان پتر پەرەی سەند... بۆ چوونە بەر خوێندن و خوێندکاری و بۆ کارکردن و رزگاریی ئابووری و یارمەتیدانی نەخۆشان و کردنەوەی نەخۆشخانەو دابینکردنی رووناکی (کارەبا) و ئاوی پاک و بواری تری پێداویستی و خزمەتگوزاریی رۆژانە.

- دواتر قۆناغی تری نیشتمانی و نەتەوایەتی هاتەبەرهەم بیری نەتەوایەتی گەش و رۆشنتر بوو هەستکردن بە چەوسانەوەی ئاشکراتر، هەتا وای لێهات ئافرەتانی قەڵای هەولێر ئاهەنگی جەژنی نەتەوایەتیی نەورۆزیان لەسەربانی ماڵەکانیان رێکدەخست... چایەو سەماوەرو بنەوش و کنێریان دابەش دەکردو

شایی و هەڵپەڕکێیان بەدیاردا دەگێڕا[٥]... ئەوکاتە ئاهەنگگێڕانی تێکەڵاو باو نەبوو، (ئاهەنگ گێڕانی تێکەڵاو قەدەغەبوو) ئافرەتان بەتەنها هەر بۆ خۆیان سازیان دەکرد.

- هەنگاوی دواتر کەوتە قۆناخێکی تری پێشکەوتووتر، قۆناخی ڕامیاری و پەیدا بوونی حزبە سیاسییەکان و بەشداری کردنی ئافرەت تێیدا و چالاکی نواندن لە ڕێکخراوە نیشتمانییەکانیان، کە بەسەدان ئافرەتی کوردی تێدا بەشدار بوو و بەدەیان ئافرەتی بە توانای تێدا هەڵکەوت.

- دەبێ دان بەو ڕاستییە دابنێین و بڵێین، کە یەکەمین زەنگی ئازادی و ڕزگاری لە بنەماڵە خوێندەوارە شێخ و مەلازادە پێشکەوتنخوازەکانەوە لێدرا، بۆیە دەبێ بڵێین و لەیادیان نەکەین: ڕێزو سوپاس بۆ خانەوادەو بنەماڵەکانی شاری هەولێر:

- بنەماڵەی: خوالێخۆشبوو بوو- مەلا عوسمان- هەزار سڵاوو ڕەحمەت لەگیانی- دایە عەیشێ و مەلا بەسێ و خاتوو زولەیخا و کچەکانیان (کچە خۆڕاگرەکان)[٦].

- بنەماڵەو کچەکانی مەلا هیدایەت (مەلا کۆرە)[٧].

- بنەماڵەی گیوی موکریانی و کچە لێهاتووەکانی- کە ماڵەکەیان ماڵی خۆمان بوو و لێی فێری وشەی ڕەسەن و کوردی پاراو دەبووین[٨]

- کچانی وەستا پیرداوود (وەستا پیرە)[٩]

- کچانی مەلا سەبری گەڕەکی خانەقا.

- خوشکانی خوالێخۆشبوو نافیع یوونس- بەتایبەتی فەریدەخان- یەکەم کچە هەولێری بووە... کە زۆر بەجورئەت و بەرزی لەڕاپەڕینەکانی جووتیارانی دەشتی دزەییانی هەولێر لەدەرگای قەڵات وتاری خوێندۆتەوە.

- بنەماڵەی ئەحمەد محەمەدەمین ئاغا دزەیی و بنەماڵەی دزەییانی قازیخانە... یارمەتی زۆری ڕووناکبیران و تێکۆشەرانی کوردو کوردستانیان دەدا.

- خوشکە (ساکینە سولەیمان)م ناسی کە کچە خانمێکی هەڵکەوتووی بنەماڵەیەکی هەژاری قەڵاتی هەولێر بوو لەڕێگای برا تاقانەکەی کەوتبووە سەرچەقی ڕێگای تێکۆشانی بێوچان و بەدەستی ئەو ڕۆژانە بڵاوکراوە نهێنییە ڕامیارییەکانمان پێ دەگەیشت و ئاسۆی بیرمانی پێ گۆش دەدراو هەست و هۆشمانی پێ دەگەشایەوەو- سروودی نیشتمانیمان ڕەوان دەکردو کەسایەتییەکانی ئافرەتانمان پێ هوشیار دەکردنەوە.

- دوای شۆڕشی چواردەی تەمموزی (١٩٥٨) بزاڤی ئافرەتان کەوتە قۆناخێکی بەرزی ڕێک و پێکترو باڵاتر، ڕێکخراوەکانی ئافرەتان کەوتنە مەیدانی تێکۆشانی ئاشکراو بەهەزاران ئافرەت بوون بە ئەندام و ڕۆژانە کۆڕو کۆبوونەوە دەبەستران بۆ داواکارییە پیشەیی و ڕۆشنبیری و ئابوورییەکان... بۆ داواکاری خزمەتگوزاری ڕۆژانەو بۆ نەهێشتنی جیاوازیی نێوان ئافرەت و پیاویش، بۆ مافی نەتەوایەتیی کوردستان و لەپێناوی ئاشتی و ئازادی، لێرەدا بەشانازییەوە دەڵێین:

هەی ئافەرین بۆ: خاتوو ساکینە سلێمانی نەمر، ساکینە عوسمان، نەجیبە خەلیل، سەبیحە عومەر ئەمین و خوشکەکانی ئینعام مەجید، فەتحیە محەمەد، لامیعە نادر، ساڵحەخانی خێزانی شەهید خەیروڵڵا عەبدولکەریم، نازەنین حەیدەری[١٠]، ئەدیبە حاجی سەعید[١١] و گەلێک و گەلێکی تر ئەوانەی لەیادم نینەو داوای لێبووردنیان لێ دەکەم...

هەروا بێتەوە: کچە خانمە خوێندەوارو بەتواناو ناودارەکانی کۆیە: کچانی مەلای گەورەو زۆری تریشی، وەکو خوشکە فریشتەی قسە لەمەست و شاعیر[١٢] و عایشە گوڵۆکەو... هتد.

کچە لێهاتووەکانی مستەفا فەندی ڕەواندزو مامۆستا گولیزار و حەبیبەی خوشکی و گشت بنەماڵەکەیان... کچە خاتوونەکانی ئەمین ڕەواندزی و خوشکە شوکریە سەید حەلیم (دایکی ئامێز) و هاوەڵەکانی، کە هەمیشە لەچەقی ڕێگای تێکۆشانی نیشتمانیدا گورجوگۆڵ و چالاک بوودو بەردەوامیشە[١٣].

خوشکانی عەنکاوەو بنەماڵە ناودارەکان، بەداخەوە کە لە ست حانێ بەولاوە کەسی ترم لەیاد نییە تکایە ناویان بێنین و ونیان مەکەن، دەنا تاوانیان دەکەوێتە ئەستۆو ئەسکوردمانەوە.

- خوشکانی شەقڵاوەی ناودار: بنەماڵەی مەلا محەمەدئەمین (مەلا حوتان)و کچە خاتوونەکانی حەلیمەو

ئامینەخان و دۆست و دراوسێکانیان و خەدیجەخانی بەگزادان، دایکی نەسرین و پەروین، بنەماڵەی زەخۆکان و خۆڕاگرانی تر... و خێزانی ساڵح بەگی میران و خەلیل خۆشناو، هەر لە شەقڵاوە ماڵە دیانەکان: ماڵی قەشەو ماڵی حەنا ئەفەندی، خوشکە حەیات-ی (ستەر) برینپێچ، کە زۆری یارمەتی هەمە جۆری داینە هەروەها مامۆستا حەمدیە عەبدولڕەحمان، کە لەشەقڵاوەو هەولێرو بەغداش چالاکی زۆری نواندووە (لە ڕۆژانی ڕەشدا چەندین تێکۆشەرو بە ئاوەڵانی لەماڵی خۆیدا دەپاراست و شوێنی بۆ دابین دەکردن.

خوشکانی کرێکار و فەلاحە ڕەنجدەرەکانی دەشتی هەولێر... خوالێخۆشبوو (هەیبەت)ی (مەلا نەفتە) خوشکە مامزو زوهریەو خوشکە بەسێ میکایل-ی چالاک و پۆستەبەر... زۆر جاران لەگەڵ خاوەن ماتۆڕەکانی دەشتی هەولێر بێ ئەوەی هەستی پێبکەن پۆستەی بە دێیەکان دەگەیاند[١٤]... ئەوانەو زۆری تر کە بەدڵ و گیان بەکارو کردەوەو سەروماڵ یارمەتییان دەداین و چالاکیی هەمە جۆریان دەنواندو جاری واهەبوو گیانیان دەخستەسەر لەپی دەستیان تا ئەرکەکەیان ئەنجام دەدا! دووبارەش داوای لێبووردن لەو کەسانە دەکەم کە ناویان نەکەوتە ناو لیستەی ناودێران و من بەش بەحاڵی خۆم، خۆم بە قەرزاری هەمووان دەزانم و دەستخۆشییان لێ دەکەم و ئۆخەی و ئافەرینیان بۆ دەنەخشێنم بۆ ئەو ڕۆژە خۆشەی ئاواتەکەمانی هێنایەدی و ماندوویەتی حەساندینەوە... دەڵێم با ئەو کەسانەی لەوە پتر دەزانن و درامای تریان لەلایە با بیخەنەسەر خەرمانی مێژوو و بیڵێن و بینووسنەوە، چونکە من نەمێژوونووسم و نە بابەتەکەشم رامیارییە... باسەکەی من بەشێکی کۆمەڵایەتی ڕووناکبیری ڕەوای ئافرەتانەو دەبێ فەرامۆشی نەکەین و ئەو کەسایەتییانە لەیاد نەکەین و بیانناسێنین.

ئایا نەوەکانمان ئەو کەسایەتییانە دەناسن؟! ئاخۆ گیانی بەختەوەریی ئەو کەسایەتییە ئافرەتانەیان هەڵسەنگاندووە؟ چەندجار کۆڕو کۆبوونەوەیان بۆ سازکراوە!! چەند نامەو نامیلکە و پشکنینی زانستییان بۆ بە ئەنجام دراوە[١٥]... بە دۆست و بیانیانیان ناساندوون کەسوکارو لایەنە رامیارییەکانی ئەو کەسایەتییە ئافرەتانە سیاسی خۆیان پێشکەش بەو لایەنە کۆمەڵایەتی و لێ پرسراوەکان کردووەو گوتوویانە ئۆخەی برینەکانمان سارێژبوو و بەروبوومی تێکۆشانی ڕۆڵەکانمان ون نەبوو و بەرهەمەکانیانمان بەچاو بینی... ئەوەیان نازانم... گوێم لێ نەبووە!!

هەربۆیە ڕێگام بدەن بانگەوازێک بخەینەڕوو: بۆ سەروەران و کارگێڕەکانمان بۆ تەنها: کردنەوەی پارکێک و پەیکەرێکی لێوەشاوەی لەبار تا ناوی (ئەو کەسایەتییەی ئافرەتان و ئەوانەی کە لەیادیشمان نین) لەسەری تۆمار بکرێ بۆ نموونە بەناوی پارکی (ڕەحمەخان)، یا ئەوەی کە زۆرینەی خەڵک پەسندی دەکەن.

### ڕوونکردنەوەو پەراوێزەکان

(١) دەڵێن ڕەحمەخان کچی سەید عەبدوڵڵا ئاغا بووە... هیوادارم بۆ خوێنی ئەو خاتوونە پاکانەیی بکرێ.

(٢) لایپزیک (Leipzig) شارێکی گەورەی ئەڵمانیایە (دەکەوتە) ڕۆژهەڵاتی- شاری پێشانگای نێودەوڵەتی و کتێبخانەو زانکۆیش لەزانکۆی بەرلین کۆنترە... خوێندنی باڵا لەو زانکۆیە وەدەست هێناوە.

(٣) ئەوپەیکەرە ئەو هێرش و تێکشکانەی ناپلیۆن پیشان دەداو پەیکەرێکی یەکجار مەزنەو سەروەرییەکەی وەکو پانۆرامایەکە پیاو دەتوانێ هەموو شاری لایپزیک ببینێ. هەر لەدووریی پەیکەرە مەزنەکە/ پەیکەرێک بۆ ناپلیۆن بەسەر ئەسپەکەیەوە دروست کراوە، کە چاوەنواڕی ئەنجامی شەڕەکە دەکا.

(٤) ئەوکاتەی کە ڕژێمی دیکتاتۆر ئەو هەموو دێ و شارۆچکانەی کوردستانی بە خورتی و بەزۆرداری گوێزایەوە بۆ لەشکرگاکان و خوارووی عێراق... ماڵمان لەسەر ڕێگا بوو بەچاو دەمبینی ئەو خێزانانە بە سەر لۆرییە بارکراوەکان

زۆربەیان ئافرەت و منداڵ بوون... خەڵکی ئەگەر سیخورەکان دیار نەبوونایە ئاوو نانیان دەدانێ... هەروەک کەلەشێرو مریشکەکانی سەربارەدار... ئای چ دیمەنێکی دڵتەزێن و پڕ لە ئازار بوو.

(٥) جارێکیان من خۆم قوتابی یەکی ناوەندی بووم... لەسەربانی ماڵی کچانی مەلا هیدایەت ئەو ئاهەنگەمان گێڕا... دەنا لەماڵی خوشکانی نافیع یوونسی خوالێخۆشبوو و ساکینە سولەیمان ساز دەکرا.

(٦) مەبەست ئەوانەی کە هەتا سەر لەتێکۆشان و خزمەتگوزاری بەردەوام بوون.

(٧) ماڵی کچانمان پێ دەگوت ئەو ماڵە یارمەتی زۆریان بە بزووتنەوەی نیشتمانی و نەتەوەیی داوە هەتا لە بزووتنەوەی دەشتی دزەییان پیاوەکان خۆیان لەوێ دەشاردەوەو شوێنی حەوانەوەیان بوو.

(٨) ئەو ماڵە خزمەتی بێ سنووریان نەک هەر بە بزووتنەوەی نەتەوایەتی، بەڵکو بە ئەدەب و زمانی کوردی و هەم مرۆڤایەتی کردووە، چاپخانەی کوردستان بۆ خۆی نیشانەیەکی بەرزی تێکۆشان و تیری چاوی دوژمنان بوو.

(٩) خوشکە وەزیرە و کوردستان خان هێشتا بۆ ئێمە مەشخەڵێکی دێرینی پێشکەوتنخوازینە.

(١٠) نازەنین حەیدەری خۆی دوا کەسی کاروانی خەباتی ئەو بنەماڵەیە بوو، کە رۆژانە لەگەڵ ئەدیبە حاجی سەعید وەک جووتە خوشک هەولێریان بۆ گێرە دەکردو خواست و داخوازییەکانیان بەجێ دەهێنا- فیداکاری ئەو بنەماڵەیە بێ سنوورەو نایەتە باسکردن، بەڵکو پێویستی بەبابەتێکی تەنها و تایبەت هەیە.

(١١) خوشکە ئەدیبە سەعید هەروەکو باسی لێ کرا خزمەتی زۆر کرد هەروەها بنەماڵەکەیان بەیارمەتیدان و بەگیان بەختکردن. لە یادمە کە چۆن (دلاوەر)ی لاو پۆلی کۆتایی دوا ناوەندی لەژێر داری ستەمکاران قیرەبڕ کرا، تەنها چونکە نامەیەکی لە پێشمەرگەیەکەوە بۆ هاتبوو... هەروەها سامال خاتوون، کە یەکێک بوو لە بوێرو خوێندەوارەکان لە چەندان شانۆو شانۆگەریدا بەشداری کردووە، دووجاران لەلایەن ئاسایشی بەغداو هەولێرەوە دەسگیرکراوە... بەداخەوە سامال خان، کە هاوسەری رۆژنامەنووسی بەڕێز کاک ئیسماعیل بەرزنجی بوو، ساڵی ١٩٩٦ بە نەخۆشییەکی کوشندە کۆچی دوایی کردو ماڵئاوایی لێ کردین.

(١٢) خوشکە فریشتە کچی بنەماڵەی شاعیرانە... خوشکی کاک ئەحمەد دڵزار وکاکە کەریم شارەزایەو بێ پشوو بووە لەتێکۆشان.

(١٣) دایکی ئامێز... شوکریە محەمەدئەمین لەتێکۆشانیدا شەقامەکانی رواندزو هەولێرو عەنکاوەو زبندانی هەولێرو مووسڵ و کەرکووک شایەتی بۆ دەدەن.

(١٤) دوو ساڵ بەر لەئێستا... خوشکە بەسێم بینی و دەستی خستە ملم و گوتی چاوم کزەو بێ توانا بوویە تا ئێستا کەس یارمەتی نەداوم... هیوادارم ئەو جۆرە کەسانە لەیاد نەکرێن و یارمەتی بدرێن.

(١٥) بەڵێ، لەوڵاتانی پێشکەوتووی کۆمەلایەتی و شارستانییەتی و رامیاری سوود لەتێکۆشانی ئەو کەسایەتییانە وەردەگرن و لەهەست و بیرو مرۆڤایەتیان دەپشکنینەوە... منێکی لەهەندەران و بیانی لە ئەنجامی سەردان و ناسینی خوێندکارێکی زانکۆ (کریستیان پۆمەرینک) ماجستێرێکی لەسەر ژیانی من بەسەرکەوتوویی وەدەست هێنا... کاتێ کە دیمانەی لەگەڵدا دەکردم و چەند جاریش هاتە هەولێرو ئێمەی ناسی... زۆرشت هەبوو من پێم نەدەگوت، چونکە دەمگوت چۆن دەکرێ ئەوانە ڕێز لەو بڕە تێکۆشانەی من بنێن و منێکی بیانی باوەڕم نەدەکرد.

# هاوین و نووستنی سەربان لە شاری هەولێر

مەولود بێخاڵی

گەلێ لە مێژوونووسە ناودارەکان شاری "هەولێر"بەکۆنترین شاری سەر رووی زەمین دادەنێن و دەڵێن: یەکەم کۆنە شارە لە رۆژی دامەزراندنییەوە تاکو ئیمرۆ ژیانی تێدا بەردەوامە" ئەگەرچی گەلێ زەبرو زەنگی زەمانەو کارەساتی سروشت و رەشەباو گەردەلوولەی رۆژگاریشی لێ ئالاوە، بەلام رۆڵە نەبەردو نیشتمانپەروەرەکانی رێبازە پیرۆزەکانی باب و باپیرانیان بەرنەداوەو لە سەنگەرە سەختەکانی" قەلا" ش بە دژواری بۆ مان و نەمانی گەلە ستەمدیدەکەیان گەلێ قوربانیان داوە..

**شوێن و رووبەری شارو قەلا**

بە دووری نازانم ئەم زانیارییانەی خوارەوە لە چەند جار زیاتر نووسرابنەوە بۆ چەسپاندنیان دووپاتیان دەکەمەوە.

بە پێی نەخشەی جوگرافی هەولێر دەکەوێتە ناوەراستی هەرێمی کوردستانی رزگارکراوی خاوەن" پەرلەمان و فیدراڵ" لەسەر پانتایی گردێکی سێ گۆشەیی بەرزو نەوی بە پێچ و پەنا بە دەشتی"هەولێر" ناونراوە، دەشتێکی سروشتییە زەوییەکەی لە وەبەرهەمهێنانی جۆرەها دانەوێڵەی دێمی لە پیت و بەرەکەتدا بێ نموونەیە، لایەکی بناری ناوچە شاخاوییەکانی رۆژهەلاتی باکوورە، لە لایەکی دیکەشییەوە سنووری لە باشووری رۆژهەلاتی باشوور دەگەرێتەوە، بە (٣٩٠) مەتر..یان (١٣٠٠) پێ لەسەر ئاستی دەریا لە نێو هێڵی پانی (٤٥ر٣٧ د - ٣٧د) و هێڵی درێژی (٤٣ د - ٤٥ د) ئۆقرە گیربووە.

قەلا دێرینەکەشی بە (٤١٤) مەتر..یان (١٣٣٢) پێ لەسەر رووی دەریا بەرزترە.. راژەی بارانی لە ١٩٩٨/١/١ تا ١٩٩٨/٩/٣٠ ز (٩ر٣٠٢) ملم بووە (ئا. د. ك)، بەپێی گۆرانکارییەکانی کەش و هەوا راژەی بارانی باکوورو باشوور لە زیاد و کەمی دایە.. بەهەر حاڵ ساڵ نییە لە چیاکانی دەوروبەری پارێزگای" هەولێر" بەفر نەبارێت.

**رووبەری شاری هەولێر**

لە سنووری شارەوانیدا لە ساڵانی شەستەکان خۆی لە (١٥) کم دەدا، لە ساڵی ١٩٨٥ ز گەیوەتە (٨١) کم، ئێستاش بە پێی نەخشەی سنووری تازەی بەم

شێوەی خوارەوەیە:

١- لە باکوورەوە کۆتایی سنووری کارگەو کێڵگەکانی پەرەوڵە..

٢- لە رۆژهەلاتیشەوە دەگاتە بازگەی" کۆیە" و زورگەکانی و کۆلەک و پیرڕەش و خالی گەیشتنەوەی رێگای گوندی" بنەسلاوەو کۆمەڵگای دارەتوو و رێگا سەرەکییەکەی"هەولێر" کەرکووک" بە ٨٧ کیلۆمەتریش لە کەرکووک دوورە.

٣- لەرۆژئاواشەوە سەنتەری جیاواز بوونەوەی گوێر و موسڵ- ە بە (٩٦) کیلۆ مەتریش لە موسڵ دوورە..

٤- لە باشوورەوەش لەئاقاری"مورکیە" و" سەنیە" و" گوندی پیرداود" و قوشتەپە دەگەرێتەوە رووبەرەکەی دەگاتە (٥٢٠٠٠) هەزار مەتری چوار گۆشە..

### ناوەکەی

پرۆفیسۆر(خندگ) دەڵێت: لەکۆنەوە کوردەکان ئەم شارەیان بە (خۆرلێر) ناویردووە..، چونکە پەرستگای خۆرو ئاگر پەرستیان تێدا دروست کردووە، (٢٠٠٠) هەزار ساڵ پێش زاینییش لە نووسینەکانی سۆمەرییەکانی سەردەمی (شاشولکی) و (ئامارسین) ناوی بە (اوربیلم) هاتووە، لە نووسینی ئاشووری و بابیلییەکانیشدا بە (ئەربائیلو) چوار خواوەند هاتووە، لە نووسینە میسماربیەکانیشدا بە (مالی) خاتوونی ناوچە ... ئای، گەشان، کەلاما ... ناویان بردووە. لە ساڵی (٢٥٠٠) پێش زایینی ئارییەکان ئەم شارەیان ئاوەدان کردۆتەوە ناویان بە (ئەربیلۆ) ناوە، لە (تەوراتیش) دا ناوی بە (ئەربائیلا) هاتووە. لە گەڵێ نیگارە هێلکارییە فارسییەکانیشدا ناوی بە ئەربیرا هاتووە. زانا عەرەب و عوسمانیەکانیش بە (اربل) زەوی سەوز ناوی دەبەن.

### قەلا و خولە بەرگرییەکانی لە پاراستنی شار

خۆ ئەگەر نەختێ بە وردی بەناوەرۆکی مێژووە نووسراوەکاندا بچینەوە، ئەو راستییەمان وەدەست دەگات (هەولێر) ماوەیەک هەر بریتی بوو لە (قەلا)، بۆ گەورە کردنی شارو بایەخدان بە بازاڕی جۆرەها بازرگانی و کشتوکاڵ لە خوارەوە قەیسەری و حەساریان دروست کردووەو بە تێپەڕبوونی زەمانە ئەم شارەی ئێستا دروست بووە.

بەڵگەشمان بۆ ئەوەی (هەولێر) لە پێشدا هەر (قەلا) بووە ئەو پەیکەرو تاتە بەردانەن، کە لە چەند شوێنێکی تایبەت دۆزراونەتەوە، نموونەی ئەو تاتە بەردانەی، کە نووسراوەکانی (مەلیک ئاشووربانیبال) و پەیکەرە برۆنزییەکەی مۆزەخانەی هەولێرە.

قەلا رووبەرەکەی خۆ لە (١٥٠) هەزار مەتری چوارگۆشە دەدات چێوەکەشی نزیکەی نیوکیلۆمەترە بە (٢٥) مەترلەسەر زەوی لە شاری هەولێربەرزترە. لە هەندێ سەرچاوەی تردا هاتووە. گوایە لەمەش بەرزتر بووە، بەلام سەرکردەی رۆمانییەکان (قارقلا)، کە لە ساڵی (٢١٦ پ. ز) لە تیسفۆن گەڕاوەتەوە شاری داگیر کردووەو دەستکارییەکی لەنزم کردنەوەی" قەلا" کردووە.

### ئاو لە هەولێردا

هەولێر شارێکی بێ ئاوە، هیچ جۆرە رووبارو کانیاوێکی لەسەر زەوی تێدا نییە، بۆیە لەسەرەتای دامەزراندنییەوە ئێستاشی لەگەڵدا بێ، گیروگرفتی بێ ئاوی هەیە... جا بۆ رزگار بوون لە بێ ئاوی پسپۆری خۆرسکی بێهاوتای جیۆلۆجیان لێی هەڵکەوتووە، بە تەرازووی چاو و هۆشمەندییان وەک ئەندازیارێکی پێشکەوتوو بیر و کاریزی ئاویان بۆ خواردنەوە و رەنێوهێنانی جۆرەها شینایی پێویست بۆ خواردنی ئادەمیزاد

ئەنجام داوە.

هەر لەبەر ئەم بێ ئاوییەش بووە، لە ساڵی (٧٠٥ - ٦٨١ پ. ز) سنحاریب دووەمین شای ئیمپراتۆریەتی ئاشوورییەکان لە نزیک گوندی"قەلە مورتکەی" لێواری رووباری بەستۆرە رێڕەوی سێ رووباری چیاکانی خانی" کە بریتییە لە چیای" سەفین" پیرمەم " بنەباوی گۆڕیوە و بە درێژایی (٢٠) کیلۆمەتر ئاوی گەیاندۆتە " قەلای " ئەربائیلۆ.

بەرخەمی کردن لەم پرۆژەیە ناچارمان سێ بیری ئاو لە ناو" قەلا" لێ بدەن، بەجۆگاش ئاوی کاریزی" جوج ئەحمەد و مفتاح" بۆ ناو شار بێنن، بۆ خواردنەوەی دانیشتووانی (قەلا)و شار لەو" حەوزە کۆنە" بکەن کە شوێنەوارەکەی ئێستا باڵەخانەی خوالێخۆشبوو (ئەحمەد جامبازو کەبابخانەی بورهانی) لێ دروست کراوە، تا پرۆژەی ئاو لە نێو شار دامەزرا (سەقا) ئاوکێشی تایبەت هەبوون بە (راویە، ولاغ) ئاویان بەپارەیەکی کەم بۆ دانیشتووانی قەلاو ماڵە ساماندارەکانی خوارەوە دەبرد، خێزانە چەوساوەو نەدارەکانی خوارەوەش ئاویان لە (جەرە)دا بەپشتی ژنەکانیان دەگواستەوە ماڵ، ئافرەتی ئازاو بەتین هەبوون سێ جەرەیان لە پشت دەکردو دووشیان بەدەستەوە دەگرت، جارجارە ماندوودەبوون نسکۆیان دەبردو بەردەبوونەوە، بۆیە ئاوەکان دەرژان و جەرەکان ورد دەبوون، تا جەرەیان دەکرییەوە تووشی بێ ئاوی دەبوون، چونکە هێمن و بێ تەنگەژەی تر بوون و بەو ژیانەیان رازی بوون.

پاش دامەزراندنی حکومەتی نیشتمانی بە دوو سێ ساڵ پرۆژەی ئاو بەبۆری بۆ هەولێر هات، سەرەتا بە چەند دەزگای میرییەکان و ماڵە کاربەدەست و ساماندارەکانیان دا، لە هەموو سەرەگەرەکێکیش بلووسکە "شێرە "حەنەفیە" کی ئاویان بەلاش بۆ خەڵکەکە دێنا، بەم کردەوەیە دڵی دانیشتووان کرایەوە و وردە وردە هێڵی ئاوی پرۆژە بۆ ماڵەکان بەپارەیەکی کەم گوێزرایەوە.

جا لەبەرکەمی ئاوو نەبوونی ئامێری فێنک کردنەوە تا ئەو ساڵانەی دواییش دانیشتووانی هەولێر ناچار بوون شەوانەی هاوین لە سەربانی خانووەکانیان بنوون.

**هاوینان و نووستنی سەربان**

راستە خانووەکانی سەربەدەنی" قەلا" لەوەرزی هاوین لە خانووەکانی خوارەوە فێنکتر بوون، بەڵام شەوانە خێزانەکانی ئەوانیش بۆ نووستن بە سەربان دەکەوتن.

**قەلا**

هاوینان لە "هەولێر" لە سەرەوەی قەلا و لە خوارەوەی"کورتەک" دەوڵەمەند و کاسبکار و هەژار تێکرا شەوانەی هاوین لە سەربان دەنووستن، جا ئەوانەی حاڵ و گوزەران باش بوون، لەسەر چوارپایەی داری بە کوللە لوولدراو لەگەڵ یەکدو و منداڵی بچووکیان بۆ خۆپاراستن لە مێش و مەگەزو زیندەوارو تۆزو با شەوانە دەنووستن، جاری وا دەبوو شەو بایەکی توند رووی دەدا کوللەو موللەی تێک دەدا، پارچە چوارپایەو کەلوپەلی خەوتنی وەبەر تاقی ئاسمان دەدا، دانیشتوانی سەربەدەن ئێواران (کەدینە، تەزینە، بق بقە، شەربەی عەنکاوەی سەربە کلاو، پێخەفی رەنگاورەنگی خاوێنیان) وەسەر دەخست، لەسەر ستارەی خانووەکانیان ریزیان دەکردو دیمەنێکی جوان و رازاوەیان بە دانیشتووانی خوارەوە نیشان دەدا، هەندێ ماڵی بەتواناش لەسەرەوە و لە خوارەوە هەبوون چارپایە و کوللەی تایبەتیشیان بۆ منداڵەکانیان دادەنا، هەشبوون لە جیاتی کوللە چیغیان لە چوارپایەی نووستن وەردێنا، پێخەفی هاوینانی خواپێداوەکان جیاواز بوون لەگەڵ هی زستان، هی هاوینان بەزۆری جاجمی سپی"لۆکە بوو" لەگەڵ دۆشەگی لۆکەی تەنک و بالیفی کولک و بە هاوینان

هەموو بەیانییەک، کە هەڵسان، دەبوایە هەموو پێخەف و کەرستەکانی سەریان داگرن و رۆژی دووەم پاش بانگی عەسر، وەسەریان خەنەوە، کرداریکی ناخۆش بوو لێشی بێزار نەدەبوون.

دانیشتووانی قەڵا، کورتەک بۆ جل و بەرگی پیاو سەبەتەی لەقەسەل"جیل" دروست کراویان دەبردە سەربان (مشکی، پژدێنە و خەنجەرو تەزبیح و کەواو سەڵتەیان) تێ دەخست.

زۆربەی خێزانان لەسەربان دەنووستن، بە دەگمەن - خاوەن ناحەزێک لە نێو خانوودا دەمایەوە.

**کورتەک**

جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان رەوشتی دانیشتووانی" قەڵا" و"کورتەکدا" نەبوو تەنیا لە خوارەوەی "قەڵا" لە هەموو گەڕەکەکاندا حەساری ساماندااران و خاوەن زەوی و زاران بۆ رەنجبەر و جووتیارەکانیان هەبوو، چەند خێزانێکی نەداریشیان لەگەڵدا دەژیان، لە تەک یەک دەبوون، هەر خێزانێ رووبەری سەربانەکەی خۆی پێ دەدرا، لە دوورەوە تەماشایەکی سەربانی ئەم حەسارانەت بکردابا، دەیان چیغت وەبەرچاودەکەوت، چونکە هەر خێزانێک چیغێکی تایبەتی دەگرتەوە..

چیغ چییە؟ چیغ لە جۆرە قامیشێکی باریک و رێک بەداوی موو دەنەخشێت بڵندییەکەی دوو مەتر دەبێت، پان و بەرینییەکەشی لە نێوان ٥ - ٦ مەتر دەبێت.. لوول دەدرێت و بەبێ گچکە و گەورە چەند قیسپێکی (بەرچیغێکی راستی بۆ دەچەقێنن و چیغەکەی لێ وەردارێنن) دەئاڵێنن وەک خانوویەکی کوناش کوناشی بێ سەری لێدێت، لە سەربان خێزانی تێدا ستردەبێت.. خۆ هەندێ جار بە پێی ژمارەی خێزان و توانای دارایی بۆ حەوانەوە دوو چیغیان لێکدەدا بێ ترس تێیدا دەنووستن و بیریان بۆ هیچ خەراپەکارییەک نەدەچوو، گەلێ ساکار و ساویلکە بوون، دەگمەن بۆ ماوەیەکی کەم لێک دەتۆران، خاوەن خووڕەوشتی کۆک بوون، لە خوای بەخشندە و میهرەبان دەترسان.

خێزانانی کورتەکیش (خوارەوەی قەڵا) کە ئێوارە دادەهات پێخەفی پێویستیان وەسەربان دەخست و لەسەر لێواری سواندەی خانووەکەی خۆیان دادەنا، پاش نوێژی شێوان بە کەدینە و شەربەی دەستکردی عەنکاوەییەکان (بۆ نووستن هەڵدەکشانە سەربان) کڵاوی زۆربەی شەربەکان لە حەسیر دروست دەکران، لە هەندێ ماڵان ئافرەتی بە زەوق هەبوون، ئەو سەر کڵاوانەیان لە دانتێل دروست دەکرد، چواردەورەشیان بە زەنگیانەی رەنگاوڕەنگ دەنەخشاند، خەمی میوانیشیان دەخوارد، چونکە ئەو کاتە لە هەولێر (مسافر خانە) زۆر کەم بوو، جا ئەو خێزانانەی میوانیان دەهات ئافرەتەکانیان لەگەڵ خۆدا دەنواند پیاوەکانیشیان پاش رەزامەندی دەروجیران لە شوێنێکی بەتاڵ دەنواند.

زۆربەی ئەو خێزانانەی لەسەربان دەنووستن ماستاوی بە بەفری چیای خودایی و جۆرەها میوەجات و شووتیان بۆ خواردن دەبردە سەربان.

سەرچاوەکان

١- مدينة أربيل دراسة في جغرافية الحضر، الدكتور هاشم خضر الجنابي، ١٩٨٧.
٢- شارەوانی هەولێر، نەخشە و پلان، ١٩٩٨.
٣- أربل في العهد الأتابكي، د. محسن محمد، ١٩٧٩.
٤- مدن العراق القديمة، دوروبي مكاي، ترجمة يوسف سكوني، ١٩٥٢.
٥- هەولێر لە خولە مێژووەکانی، مامۆستا زوبێر بیلال، ١٩٧٠.
٦- دائرة المعارف الإسلامية، ج١.
٧- چەند زانیارییەکی تایبەت بە خۆم.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)ی زستانی ١٩٩٨ بڵاوبۆتەوە.



# بن لەیلووکان

یاریگایەکە بۆ منداڵان لە ڕۆژانی جەژنەکانی قوربان و ڕەمەزاندان لەوێ کۆدەبنەوە، بەجل و بەرگی ڕەنگاو ڕەنگ و بە زەوقەوە لەو شوێنەدا دەستی یەکتر دەگرن و بە کۆمەڵ دەسووڕێنەوە، سواری هەموو یارییەکان دەبن، وەک: (چەرخ و فەلەک و لەیلووک و هەندێ یاری دەستی و ڕمبازی و لگاو و لەکۆنەوە یارییەکی تایبەتییان دەکرد، ئەویش یاری (سوفی بوو) (ئەم یارییە بریتی بوو لە، بەستانی پارچەیەک قوماش لە زارکی جەرەیەکی گەورە لەشێوەی باڵداری پۆپیتە سلەیمانە و بەقیتی دەیان بەستەوە. هەر منداڵێک پارەکەی خۆی بۆ پۆپیتەکە دەهاویشت، پۆپیتەکە وابەسترا بوو گەر زیرەکانە منداڵەکان پارەکانیان بهاویشتبا، ئەوا دەکەوتە جەرەکەوە و دەیبردەوە... ئەگەر نا دەیدۆڕاند.)

لەم شوێنەدا چەندین جۆرە خواردن و خواردنەوەیان دەفرۆشت و بە ئۆتۆمبێلی گەورە منداڵان لەرۆژانی جەژندا بەکرێ سوار دەبوون بۆ شوێنی خۆش و دوور، بە تایبەتی بۆ باداوە، کە جاران لەبەر چۆڵی ڕێگاکە دوور دیار بوو، شێخ گەزنەی پشت عەنکاوە و شێخ عەبدولعەزیزی لای گوندی قونیان و منداڵەکانیش لە پشتەوەی ئۆتۆمبێلەکە دەیانکردە چەپڵەڕێزان و هەڵپەڕین و گۆرانی فۆلکلۆرییان دەوت.

پیرداوەد کوڕ گۆرانی بێژێکی مێللی ناوداری هەولێری بوو، بەشداری خۆشی شایی خەڵکی زۆری دەکرد، بۆیە خاوەن لەیلووکەکان بەرامبەر بە پارەیەکی کەم گۆرانیان پێ دەوت، تا ڕەواجی سوار بوونی منداڵانیان زۆربێ، چونکە منداڵ هەودسی زۆری بە گۆرانی دێت.

بن لەیلووکان لە هەولێر جاران لەپشت مزگەوتی شێخەڵڵا بووە، وەک من تێگەیشتبووم دەوروبەری باغی شار بووە، دوایی گوازراوەتەوە بۆ جێگای تەنیشت قەسابخانەی کۆن.

پاش دامەزراندنی (شاری یاری) لە لایەن شارەوانی هەولێر منداڵان زۆربەیان ڕۆژانی جەژن ڕوویان تێدەکرد، چونکە لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵدا مەیلی منداڵی ئێستا گۆڕاوە، منداڵی ئێستا هەرگیز حەز بە سوار بوونی گوێدرێژ ناکات، لە ڕۆژانی جەژنە و زەوقیش وەرناگرێت، بۆیە یارییە نوێیەکانی ئێستا ڕەواجی زۆرترە.

* لە کتێبی هەولێر بە سەرپەرشتی و ڕێکخستنی تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر لاپەڕە ١٥٠-١٥١ وەرگیراوە.

# هەندێ خواردنی تایبەت بە شاری هەولێر

**هۆشیار عەبدوڵڵا**

لە كوردستاندا گەلەک چەشنە خواردەمەنی هەیە، هەندێكیان گشتین و لە هەموو ناوچەو دەڤەرەكانی كوردستاندا دەكرێن و بەڵام شێوەی ئامادەكردنیان و دروستكردنیان لە دەڤەرێكەوە بۆ دەڤەرێكی دیكە دەگۆڕێ و جیاوازییان هەیە، هەندێكیشیان تایبەتمەندن بە ناوچەو دەڤەرو شارێكی دیاریكراو، بۆ نموونە ئەو خواردنانەی كە زۆر تایبەتمەندن بە دەشتی هەولێر لەوانە دۆینە، دۆغەوا، كاردی بەترش، كاردی بە زەردكرایی، دۆبەكەشک، كەشكەک، داندۆک، ساوار بە پلاوی، ساوار بە گۆشت، ناسكەنان، هەرمیشک، پیرخەنی، كەنگرو روون، كەنگر بە ساوار، دوومەران و روون، دوومەران بە ساواری، بەربەسێری "قوڕاو"، ئەمە لە دەشتەكەدا بەڵام ئەو خواردنانەی كە تایبەتمەند بوون لەناو شارەكەدا ئەمانە بوون "كێشكەی كولاو، سەروپێ، نۆک و لۆبیای بەیانییان".

**كێشكەی كولای:** ئەو خواردنە تایبەتە بە شاری هەولێر لە شارو ناوچەكانی دیكەی كوردستاندا نەبووە، منداڵ بووم دێتەوە یادم لە ساڵانی ١٩٦٣ دەمدیت لەناو بازاڕی شاری هەولێر، خەڵكانێک هەبوون كێشكەی كولایان دەفرۆشت و رۆژانە بژێوی ژیانیان پێ پەیدا دەكرد، دەمدیت كابرایەک یا گەنجێک یا ئەوەتە مێرمنداڵێک سەرو مەنجەڵێكیان لەسەر سەری دادەنا، هەندە جاریش مەنجەڵەكە لەناو سەبەتەكی بوو، لە ناو بازار و كۆڵانان دەسووڕانەوە و هاواریان دەكرد: "كێشكەی كولای، كولایە كێشكە" دەچوونە شوێنە گشتیەكان بەردەمی چایخانەو سینەماو بەردەركی قوتابخانەكان و یاریگاو مەیدانی حەیوانان و یا ئەو شوێنانەی كە خەڵكی لێ خڕدەبوونەوەو كەلایانێی لێ دەكرا، خەڵک دەوریان لێدەدا و لێیان دەكڕین وابزانم جێی بە ٢٠-٢٥فلسی ئەوكاتی بوو، جامی گچكە گچكەیان پێبوو، هەندێ چەلاویشیان لەگەڵ تێدەكرد، بەڕاستی كێشكەی كولای، كێشكەی كولای بوو، تام و چێژەكی زۆر خۆش و بەلەزەتی هەبوو، پیاو لە خواردنی تێر نەدەبوو هی وا هەبوو ٢-٣ جار بە كابرای دەگوت لۆم تێكەوە، ئەوكاتی كێشكەو ریشۆڵە "رەشۆێرە" زۆر بوو، هەژاری و بێ دەرامەتی بوو، شاری هەولێریش شارێكی بچووک بوو، پاشان ئەو جۆرە كارە رووی لەكزی كرد بەرە بەرە كەم بۆوە وای لێهات هەر نەما، بەڵام هەنووكە چەند ساڵێكە لە ناو بازاڕی گەڕەكی تەعجیل پەیدا بوویتەوە لە باتی كێشكەی كولای ریشۆڵە و كۆتر و سووسكەو "گاپەل" كە جۆرە كۆترێكە لە هەندێ دوكاندا دەفرۆشن.

**نۆک و لۆبیا فرۆشتن:** جاران ئەو جۆرە خواردنە و ئەو كارە لەناو شاری هەولێر زۆر باو بوو بەتایبەتی لە وەرزی زستاناندا هەر لەگەڵ نوێژی بەیانییان بە دەنگی گاز كردنی "نۆک و لۆبیای كولای" بەخەبەر دەهاتی و بە ئاگا دەبوویەوە، لە كۆڵانان دەگەڕان نۆک یان لۆبیای كوڵایان لەناو توورەگە یان جاغێكی سپی دووراى كردبوو جاغەكەشیان لەناو سەبەتەیەک دانابوو، نیمدەرێكی خاوێن یان پارچە پەڕۆكێكی خاوێنیان بەسەر دادەدا بۆ ئەوەی نۆكەكە و یا لۆبیایەكە سارد نەبێتەوە بە كۆڵانان دەسوڕانەوەو دەگەڕان هاواریان دەكرد یاڵڵا نۆكە، لۆبیای كولای، لە ماڵان پیاو بایە ئافرەت بایە دەرگای دەكردەوەو بانگی نۆكفرۆشی دەكرد: ودرد وەرد نۆک، لۆبیا وەرە، بای ١٠یا ٢٠-٣٠فلسی بایە چەندی بیویستایە ئەوە بۆی تێدەكردو قیاسی تایبەتی خۆیان هەبوو بەزۆریش بن پیاڵە یەک بوو. كاتی ئە ئاوا خەڵک گوزەرانی دەكرد و بژێوی ژیانی رۆژانەی خۆی پەیدا دەكرد هەنووكەش ئەو جۆرە كارانە ماوە بەڵام زۆر كەم بووە جارجارە لە پێش فڕنی و سەموونخانەكاندا دەبینم نۆک یان لۆبیای دەفرۆشن یا ئەواتە بەیانیان گەلەک جاران دەبینم كابرا بە ماتۆڕی سەموونی دەفرۆشی، نۆک یان لۆبیاشی پێیە.

**سەروپێ یان سەروپێچک:** بە شێوە دیالێكتە بچووكەكەی دەشتی هەولێر، لە پشدەرو ناوچەی سلێمانیش "سەروپا"ی پێدەڵێن ئەو جۆرد خواردەمەنیەش زۆر تایبەتە بە شاری بە راستی زۆر بە پۆختەیی لێدەندرێ بە تایبەتی لە دەعودتی گەورەو تایبەت، جاران چەند دوكان و چێشتخانەیەک هەبوون كە تەنیا سەرو پێیان دەفرۆشت، خەڵک دەچوون لەوێ نانیان دەخوارد گەلەک جاران بەیانیان زۆر زوو هەندێ لە هەولێرییەكانم دەدیت كە دەچوونە حەمامێ خۆیان دەشوشت و یەكسەر دەگەڕانەوە دەچوون بەو بەیانییە زووەی سەروپێیان دەخوارد، هی وام دیتبوو دەیگوت ئەگەر بەیانیان سەروپێی نەخۆم ناتوانم.



# داب و نەریتی توركمانی

**نافیع قەساب**

## ژنهێنان و هاوسەرێتی لە هەولێر

هەولێر شارێكی كوردستانی جوانە، كە بە شارە یەكەمەكان دادەنرێ، توركمانەكان بەردەوام لەگەڵ برا كوردەكانیان بەیەكەوە و بە برایەتی و بە یەكگرتوویی و ئاشتی لەو شارەدا ژیاون، هەروەها لەگەڵ یەك لەسەر ئاستی كۆمەڵایەتی تێكەڵ بوون و رێزیان لەیەك گرتووە.

## ژنهێنان لە نێوان توركمانەكان

ئەوەی لێرە باسی دەكەم، داب و نەریتی كۆمەڵگای توركمانییە، لە ساڵەكانی پەنجایەكانی سەدەی رابردوو، بەتایبەتی خێزانە توركمانەكان، من خۆم وەكو كەسێك ئەو قۆناغەم بەچاوی خۆم بینیوە، بەشداریم كردووە لەو نەریتانە، لەبەر ئەوەی من لەدایكبووی ساڵی (١٩٤٠)م، ئەو دیاردەیەم بە جوانی بەبیر دێت، لەگەڵ روودانی هەندێ گۆڕانكاری، بەهۆی پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش خێزانە توركمانەكان هەر بەردەوامن لەسەر ئەو نەریتانە، هەندێ دیاردەی نوێ هاتووەتە ناو ئەو مەسەلەیە، لێرەدا وەسفێكی گشتی بۆ مەسەلەی ژنهێنان لە ناو توركمانانەندا دەكەین.

زۆرینەی خێزانە توركمانەكان حەزدەكەن هاوسەر بۆ ئەندامانی خێزانی خۆیان پێك بهێنن، لەوكاتەش زۆر ئاسان بووە، بەهۆی ئاسانی ژیان و كەمی خەرجی و تێچوونەكانی، لەو سەردەمانەدا، هەولێر شارێكی بچووك بوو و دانیشتووانی زۆر كەم بوو، زۆربەی

یەكتریان باش دەناسی، بە تایبەتی توركمانەكان، جیاوازی زۆر لەلایەن تواناكانی مادی نەبوو، بەلام ژنهێنان لەوكاتانەدا، لەسەر بنەمای خۆشەویستی و عیشق نەبووە، زۆر بەكەمی زانیومانە گەنجێك توانیبێتی كچێك ببینێ، لەوانەشە كچی دراوسێ یان لە خزمەكان بێت، هاوسەربیەتی لەوسەردەمەدا بەردەوام و تاسەر دەبوو، زۆر بەكەمی حالەتی (تەلاق) رووی دەدا، ئافرەتی توركمانی، هەتا ئێستاش هەر بە سەبر و قەناعەت ناسراوە، پالپشتی مێردەكەی دەكرد، گرنگییەكی زۆری بە مندالەكانی دەدا، لە پێناویان قوربانی زۆری دەدا، بە بەردەوام لێیانی دەپرسی، هەتا دوای ژنهێنانیشیان بە تایبەتی ئەگەر هەر یەك كوڕیان

هەبێ، بۆ ئەوەی نەوەیان لە دوا بەجێ بمێنێ بۆیە هەر زوو و لە تەمەنی (٢٠) سالیدا ژنیان بۆ دەهێنا، بۆ ئەوەی ناوی خێزانەكەیان ون نەبێت.

لەكاتی گەیشتنی تەمەنی كوڕ بە هەرەتی ژنهێنان، خێزانەكەی بڕیاری دەدا ژنی بۆ بهێنێ... لێرەدا، دایكی یان خوشكی گەورەی یان پووری یان ژنی مامەكەی یان براژنی هەولیان بۆدەدا، بەتایبەتی ئەگەر هات و كوڕەكە دایكی نەمابێت (هەتیو بێت) یان ئەگەر دایكی زۆر بەتەمەن بێت و نەیتوانی بەدوای ئەو جۆرە كارانەدا بچێت، یان بەهۆی جێگا و پایەی خێزانی.

دایك بە بەردەوامی بۆلای خزمەكانی خۆی دەچوو... وەكو كچە برا یان خوشك، (باوك) بۆلای خزمەكانی خۆی دەرۆیی، وەكو كچە برا یان خوشك، یان كچی برادەرێك یان دراوسێیەك، ئەگەر هاتو خێزانەكەی ئەو كچەی دۆزیبیەوە، كە مەبەستیانە ژنێك یان یەكێك لە خزمەكانی دەنارد بۆ مالی كچەكە، سەردانی مالی كچەكەیان دەكرد لە كاتی بەیانیدا، بەوەی كە كچەكە یان خێزانەكەی ئاگایان لە مەسەلەكە نەبێت، بۆ ئەوەی خۆی ئامادە نەكات و مكیاج بەكار نەهێنێ، هەر لەسەر حالەتی سروشتی خۆی بێت... لە دەرگای مالی كچەكەیان دەدا، بۆ داواكردنی ئاوی خواردنەوە، یان دەیان گوت: ئێمە ماندووین و پێویستیمان بە حەسانەوە هەیە... یا لە مالێك دەپرسن.. لەو كاتەدا كچێك لەو مالە دەهاتە لایان.. بەلام كچەكە و خێزانەكەی، هیچ شتێكیان نەدەزانی لە ئامانجی سەرەكی ئەو سەردانە، لەگەل ئەوەش هەندێك خێزان لە رێگای هەستی كۆمەلایەتیان، شتێكیان دەزانی و هۆی ئەو سەردانەیان شیدەكردەوە، دوای ئەوە دەگەڕانەوە و وەسفێكی وردیان دەربارەی كچەكەی پێشكەش دەكرد (قژی و بالای و دەنگی و چۆنیەتی پێشوازی كردنی میوانان... كاتێك باوكەكە دەهاتەوە، وەسفێكی تەواوی كچەكەیان پێشكەش دەكرد، ئەگەر هاتوو



باوکەکە خێزانی کچەکەی ناسی، ئەو کاتە، یان رازی دەبوو یان رەتی دەکردەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو بە باشی نەیناسی، ئەو خۆی دەربارەی ئەو کچە و خێزانەکەی پرسیاری دەکرد. لێرە مەسەلەی (مولک و پارە و پووڵ) زۆر گرنگ نەبووە، بەڵکو مەسەلەی (ئەخلاق و پیاوەتی) زۆر گرنگ بوو. هەروەها ناوودەنگی ماڵی کچە بە پلەی یەک، بەڵام کورەکە (زاوا) دوور بوو لەو ئامادەکارییەی بۆ ئەو مەسەلەیە دەکرا، کورەکە مافی رەتکردنەوەی نەبوو، بەڵکو بێ دەنگ دەبوو، لەبەر ئەوەی خێزانەکەی دەستنیشانیان کرد و پێ رازی بوون، دەبێ ئەویش رازی بێت، دوای رازی بوونی، کورە دەستی دایک و باوکی ماچ دەکرد، هەروەها گەورەکانی خێزانەکە، دوای ئەوەی بە تەواوی لەسەر کچەکە رازی دەبن، دایکی کورەکە و هەندێ لە خزمانی سەردانی ماڵی کچەیان دەکرد، بۆ خوازبێنی کچەکە بۆ کورەکەیان، ئەلێرە باوکی کچە، لە کورەکەی و خێزانەکەی دەپرسی ئەگەر هات و رازی بوون، دایکی کورەکە و کچەکە لەسەر سەردانی باوکی کچە پێک دەهاتن، بۆ خوازبێنی کچەکە، لەدواییش دایکی کچەکە و کورەکە لەسەر مەسەلەی وردەکاریەکانی (مارەیی) کچەکە پێکدەهاتن.

لەو سەردانەی خێزانی کورەکە بۆ ماڵی کچەکە، دوای (چای و شەربەت) خواردنەوە، دەیانگوت: ئێمە دوای رێکەوتنی ئافرەتان هاتووین، داوای کچەکەتان دەکەین بۆ کورەکەمان، باوکی کچە زۆر بە گەرمی و رێزێکی زۆر بەخێرهاتنیان دەکات و دەیگوت: کچی من کچی ئێوەیە، جێگای شەرەفە و زۆر بەخێربێن، لێرە (سورەتی فاتیحەیان) دەخوێند و پیرۆز باییان لە یەکتری دەکرد، ئافرەتان (هەل هەلەیان لێدەدا)، دوای رۆژێک یان دوو رۆژ، خزمانی کورەکە سەردانی ماڵی کچەیان دەکرد و هەندێ (دیارییان)، بەپێی توانا و ئەوەی هەیانە پێشکەش دەکرد، لەوانە: (جلوبەرگ و پێداویستییەکانی حەمام "خاولی" هەموویان دەخستە ناو "بوخچەیەک"، کە پارچە قوماشێکی حەریر بوو، لە چوار لای بوخچەکە دەبەستراوە، خزمان و برادەرانی (زاوا) لە ماڵێ کۆدەبوونەوە و خۆیان بۆ ئامادەکارییەکانی ژنهێنان و ئاهەنگێران سازدەکرد.

پێش دوو رۆژ لە گواستنەوەی بووک، هەموو شتێک ئامادە دەکرا، لەکاتی ئێوارەدا، خێزانی کورەکە دەچوونە ماڵی بووک بۆ هێنانی جیهازی بووک بۆ ماڵی زاوا، کە شت و مەکی کچەکە بوو، (شووشەواتیان) لەناو سەڵلەیەکی پووش دادەنا، نوێن و شتەکانی دیکەیان بە حەماڵ دەهێنا، ئەگەر هاتو جێگایەکە دووربایە، ئەوە هەندێ وڵاغیان بەکرێ دەگرت، خێزانی زاواش (ژووری زاوایان)، بۆ پێشوازی کردن رێک دەخست، ماڵی باوکی کورە خۆشی و هەلهەلە و ئەگلنجە، شەوێک پێش بووک هێنان، (مەولوودی پێغەمبەریان)ساز دەکرد، تیایدا خزم و برادەران و دراوسێی کورەکە ئامادە دەبوون، ئەوەش: یان لە مزگەوتێک یان لە ماڵی زاوا سازدەدرا، لەدواییش، هەندێ لە گەنجان و پیاوان و برادەرانی زاوا، ئاهەنگیان لە ماڵی زاوادا دەگێرا، هەندێ گۆرانی و شایی پێشکەش دەکرا، هەندێ جار، چەند برادەرێکی زاوا جلوبەرگی ژنانیان لەبەردەکرد و شاییان دەکرد، ئافرەتانیش لەسەر بانەکان سەیریان دەکرد، ئەو ئاهەنگە هەتا بەرەبەری بەیانی بەردەوام دەبوو، لەگەڵ بەیانیش خواردن، وەکو (پەنیر و قەیماغ) لەگەڵ چای پێشکەشی میوانان دەکرا، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی لەو شەوەدا لە ماڵی زاوا مانەوە، لەدواییش (زاوایان) دەبردە حەمام، لێرە حەمام هەر بۆ زاوا

دەبوو، ناوی (خلوت) بووە بە زمانی تورکمانی، مامی زاوا یان باوکی، پارەی حەمامیان دەدا...، کە لە سێ یان چوار دینار زیاتر نەبووە، لەدواییش زاوا دەگەڕایەوە ماڵەوە، دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ، دەچوونە ماڵی بووکەکە، بۆ ئەوەی بیهێنن بۆ ماڵی زاوا، لەوکاتانەدا بووکیان سواری وڵاغێک دەکرد، بە پارچە قوماشێکی ڕەنگاوڕەنگ رووی بووکیان دادەپۆشی، لەکاتی ڕۆیشتنی بووک یان سواربوونی وڵاغەکە، دەبێ باوکی زاوا یان مامی یان برای لەتەنیشت کچەکە بێت، بۆ پاراستنی کەرامەتی و ستڕکردنی، لەگەڵ هەبوونی برایەتی و ڕاستگۆیی لەو کاتانەدا کە لەناو تورکمانەکان هەبوو.

باوکی زاوا و برادەرەکانی لەسەربان رادەوەستان و لەوکاتەی، کە بووک لە دەرگا دەهاتە ژوورەوە، هەندێ چوکلێت و شەکرۆکە و هەندێ پارەی ئاسنیان فڕێ دەدا خوارەوە، منداڵانیش ڕایان دەکرد و دەیانکردە شەڕ بۆ ئەوەی لەبن پێی بووک کۆی بکەنەوە.

بووکیان لە ژوورێک دادەنا، لەسەر کورسییەک دادەنیشت، ئاوێنەیەک لەپشتی دەبوو، منداڵێکی ساواشیان لەسەر کۆشی بووک دادەنا، کە بە بڕوای ئەوان دەبێتە جێگای بەختەوەری و منداڵبوونی بە پەلە، خوشکان و براژن و مامۆژنی بووک، هەر لەگەڵ ڕۆژئاوابوون، بووکیان بەجێدەهێشت، تەنیا خوشکێکی یان براژنێکی یان پورێکی بووک دەمایەوە، بۆ وەرگرتنی مـوژدەی خۆشی بۆ دایک و باوکی کچەکە، یەکسەر (هەل هەلەیان) لێدەدا و نیوچەوانی بووکیان ماچ دەکرد و بەجێیان دەهێشت، کاتی بەیانیش سەردانی دەکردەوە.

دوای ڕۆژێک لە زاوا بوون، زاوا دەچووە ماڵی خەزووری، دەستی خەزوور و خەسووی ماچ دەکرد، باوکی (بووک) دیارییەکی پێشکەشی زاوا دەکرد، ئەو نەریتە لەناو تورکمانەکاندا هەر ماوە.

لە ڕۆژی (سێیەم) یان (چوارەم)، زاوا و بووک بەیەکەوە سەردانی ماڵی بووکیان دەکرد، لەگەڵ ماڵی بووک و خزمانی بووک، نانی نیوەڕۆیان دەخوارد، هەردووکیان هەتا کاتی دوای مەغریب دەمانەوە، هەندێ دیاریان پێشکەش دەکردن، لە ڕۆژی (حەوتەم)دا، ئاهەنگی یەکتری ناسین لە نێوان بووک و خزمانی زاوا و بووک سازدەدرا، هەموو خزمان ئامادە دەبوون و دیاریان پێشکەش دەکرد، بە زۆری پارە بوو، یان پارچەیەک زێڕی بچووک، یان تاخم شوشەوات یان پارچە قوماشێک، گەورەترین بڕی پارەی دیاری لە (٥) دینار ڕەتی نەدەدا، هەندێ لە خێزانە هەژارەکانی هەردوولا بڕی (نیو یان چارێگە دینارێکیان)دەدا، لەلای تورکمانەکان (یدی جونە)ی پێ دەڵێن.

بووک لەلای خۆی زۆر ڕێزی لە دایک و باوکی و خزمانی و خوشک و برایانی زاوای دەگرت، هیچ خۆی نەدەڕازاندەوە لەپێش دایک و باوک و برا و خزمانی مێردی، دەموچاوی خۆی دەپۆشی، کاتێک دەچووە (حەمام)، بەبێ ئیزنی خەسووی نەدەچووە ماڵی باوکی، پێڵاوی لەپێش مێرد و خەزووری دادەنا، لەگەڵ بەڕێوەبردنی کار و پێویستییەکانی ماڵ... لە نێوان (١٠) ڕۆژ یان مانگێک سەردانی ماڵی باوکی دەکرد، ئەویش لەگەڵ برایەکی بچووکی یان خەسووی، قەد بە تەنیا نەدەچووە ماڵی باوکی بخەوێ و بمێنێتەوە، تورکمانەکان ڕیزیان لە بووکی خۆیان دەگرت و زۆرشتیان بۆ دابین دەکرد، زاوا لەپێش باوکی و دایکی و برایەکانی سەیری ژنەکەی خۆی نەدەکرد، هەروەها بووکەکەش، زۆرینەی ئەو نەریتە کۆنانە لەلای تورکمانەکانەکان هەرماون و ڕێزی لێدەگرن.

و: نەجات خۆشناو

# کەسایەتیی تورکمان لە هەولێر

تەحسین شێخ ئۆغلۆ

گومان لەوەدا نییە مێژوو یادەوەرێکی قووڵ و هەمەچەشنی هەیە. زۆر شتی لەنێو خۆیدا خەفە کردووە، کە بە راستگۆیی رووداوەکانی میللەتان و سەرجەم سەربوردەکان دەخاتە بەردەست، جا ئەم رووداوانە نەبەردی بن یاخود پاڵەوانیەتی و رووداوی خوێناوی بن یاخود رووداوی دڵخۆشکەر یاخود نسکۆ و نەهامەتی بێت. ئەمانە هەمووی لەنێو ناخی مێژوودا، بە سەرجەم وردەکارییەکانییەوە هەریەکە و بەپێی گرنگی خۆی دەمێنێتەوە، پسپۆران و شارەزایانی ئەم بوارانە لاپەرەکانی هەڵدەدەنەوە و لە دووتوێی نووسینەکانیدا بە ئارەزووی خۆیان بابەت دیاری دەکەن و هەندێکیان ئیزافاتی خۆیانی دەخەنەسەر و هەندێکی دیکەش شتی لێ لادەدەن.

غەریبە کوێر (یوسف کوری خەلیلی چەبوقچی): (١١٦٨ - ١٢٣٢ک) (١٧٥٤ - ١٨١٦ز)، (غەریبە کوێر)ی شاعیر لە شاری هەولێر لەدایک بووە. چاوی بینایی نەبووە و رووناکی دنیای نەدیوە، لە خێزانێکی هەژار پەروەردە بووە، خەلیلی باوکی بە فرۆشتنی (شەتوب - چەبوق) بەخێوی کردووە.

باوکی لەم پیشەیەدا دەست رەنگین بووە، بۆیە لە شاری هەولێر بە (خەلیل چەبوقچی) ناسرابوو. غەریب بەهۆی کەمدەرامەتیەوە نەیتوانیوە بچێتە قوتابخانە، تەنها لەرێگەی بیستن لە رۆشنبیران و شاعیرانی سەردەمی خۆی فێرە خوێندەواری بووە. دۆستی زانست بووە و بەزەیی بە هەژاراندا هاتۆتەوە. لە تەکیە و مزگەوتەکانی شاری هەولێر لە گەڵیاندا دۆستایەتی کردووە و گوێی لە گرفتەکانیان گرتووە و لە ئازارەکانیانی کەم کردوەتەوە. بە گوتە خۆشەکانی داوای لێکردوون، کە دان بەخۆیاندا بگرن. شاعیرێکی خۆرسک بووە. هەر لە هەرەتی منداڵییەوە بەهرەی شاعیرێتی پێوە دیاربووە. بەهۆی لەدەست دانی چاوەکانی، جگە لە باری کۆمەڵایەتی و دۆستایەتی کردنی لەگەڵ هەژاراندا زیاتر ئەم بەهرەی لەلای گەشەی سەندووە. ئەم دۆخە خودی و بابەتییەی کاریگەری لەسەر پارچە شیعرێکی کردووە کە کاریگەر بووە بە شاعیری گەورە (ئەبو عەلاء ئەلمعەری). ئەم دەقە رەشبینی و ئەوپەری غەمگینی تێدایە، کە تیایدا ئاخ هەڵدەکێشێ لەوەی کە

بەهاکان و پێوەرەکان گۆڕاون و روو لە دەسەڵات و سامان و لەخۆبایی بوون دەکەن، کە بەمەش لایەنی گیانی و مەعنەوی فەرامۆش دەکەن. شاعیری ناوبراو شیعرێکی لەژێر ناوی (چ نەماوە) لە دیوانە شیعریەکەی خۆیدا نووسیوە.

بەدرەدین هەولێری و ئەرگۆزەی (قەرەقۆزی) ئاوازەکان، ئەرگۆزە شیعرێکی درێژی خەتیب هەولێری یاخود بەدرەدین هەولێرییە. ناوی تەواوی (بەدرەدین ئەبولمەعالی محەمەد کوڕی عەلی خەتیب کوڕی ئەحمەد ئەربیلی) یەکێک بووە لە ناوە دیارەکانی بواری ئەدەب و مۆسیقا. لە شاری هەولێر لە ساڵی ١٢٥٦ لەدایک بووە، واتە دوای داگیرکردنی هەولێر لەلایەن مەغۆلەکانەوە. لە ئاسەوارە ئەدەبییەکانیدا رووبەرووی نالەباری ژیان بۆتەوە لەژێر ستەم و جەوری مەغۆلەکاندا و پارێزگاری لە مۆسیقا و کەلەپووری میللی خۆی کردووە، کە ئەوکات ئەدەب و هونەر بەرەو دارمان دەڕۆیی. بەدرەدین هەولێری هەردەم ئاوازەکانی خۆی لەسەر شیعری درێژ داناوە، کە لە (١٠١) بەیت پێکهاتبوو، کە تێیدا سەرجەم نەزم و ئاوازەکانی مەقامی بەرجەستە دەرکرد. لەژێر ناوی (ئەرگۆزەی ئاوازەکان) بووە. ناوبراو ئەم کارە هونەرییەی خۆی دابەشی سەر پانزە بەش کردووە. هەوڵ و ماندووبوونێکی زۆری داوە لە ناولێنان و کۆکردنەوەی مەقاماتەکان و ئاوازەکان.

هەندێک حاڵەت لە زاری مەقام بێژەکانەوە وەریدەگرت و هەندێک جار لە دانەری مەقامات (سەفیەدین ئەرمەوی) وەریدەگرت، کە لە ساڵانی (١٢١٤ - ١٢٩٤)دا ژیاوە. لەوانە (مەقامات لە کتێبی ئەدوار) و (نامە رۆژهەڵاتییەکان) کە لەدوای گرتنی بەغدا دایناوە.

شاعیری ناوبراو زۆر پشتی بە زانیارییە تایبەتییەکانی خۆی بەستووە، تاوەکو توانی ئەرگۆزەکانی خۆی کۆبکاتەوە، کە لە مەقامات پێکهاتبوو. ئەم مەقاماتە عیراقییەی ئێستا هەیە، ئەوکاتەش هەبووە. بەهای هونەری ئەم کارانەی ناوبراو لەوەدایە، کە پێناسەی جۆراوجۆری بۆ کردووە و لەوانە کتێبی: (برء الاسقام في شرح قصيدة الأنغام) بەرهەمەکانی نووسەر. هەروەها لەژێر ناوی (جواهر النظام في معرفة الأنغام)دایە، هەروەها بەدرەدین ئەربیلی وەک نوێنەری میسر لەلایەن فەرمانڕەوای ئەوکاتی شاری موسڵەوە نێردراوەتە ئەوێ، پاشان گەڕاوەتەوە و لە گەشتی بەنێو مەقامات و ئاوازدا بەردەوام بووە.

زۆر لە زانایانی ئەوکات وەک (أبو المعالي، إبن رافع) سوودیان لەو وەرگرتووە و شتیان لێی وەرگرتووە. بەدرەدین ئەدیب و زانا و شارەزا بووە لە بوارەکانی ئەدەب، جگە لە بواری ئاواز و مۆسیقادا، لە ئەگۆزەکانی ئەم هونەرمەندەدا دەردەکەوێت، کە مەقاماتی عیراقی لەسەردەمی عوسمانی پەیدا نەبووە و لە فارسییەوە وەرنەگیراوە. بەڵکو بنەما سەرەکییەکانی لەسەردەمی عەباسییەوە سەریهەڵداوە، پاشان چەندین بەشی لێ پەیدابووە لەسەردەستی هونەرمەندە بەهرەمەندەکان و گۆرانیبێژ و مۆسیقازانەکان بەدرێژایی مێژوویەکی دوور و تا وەکو تا ئێستاش بەردەوامە و نوێکاری و ئافراندنی تێدادەکرێت. ئەم دەستنووسە مێژووییە وەک دەقێکی بەڵگەنامەیی پرەنسیپەکانی گۆرانی و کێش و جۆری مەقاماتی دیاری کردووە، کە لەوکاتەدا باوبووە.

کێشی جۆری مەقامەکانی سەردەمی عەباسی دوانزە جۆر مەقام بووە، ئەمەش لەلایەن (محەمەد کوڕی عەبدولحەمید لازقی) کە لە ساڵی (١٤٩٤)دا کۆچی دوایی کردووە، جەختی لەسەر کراوەتەوە، لە نامەکەی بە نێوی (الرسالة الفتحية) هەروەها (صفي الدين الأرموي) لە نامەکەی خۆیدا بەنێوی (الرسالة الشرقية)دا دەڵێت: ژمارەی مەقامات لە دوانزە مەقام تێپەڕی نەکردووە، کە ئێمە باس لە (أرجوزة الأنغام) دەکەین، کە زۆربەی مەقاماتی عیراقی لەخۆگرتووە.

# دابونەریتی تورکمانەکان لە هەولێر

شێرزاد شێخ محەمەد

تورکمانەکانی شاری هەولێر هەر لە کۆنەوە دابونەریتی تایبەتی خۆیان هەبووە، هەموو ئەو کردار و رەفتارانە لە دایک بووی سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم نەبووە، بەڵکو لەگەڵ نیشتەجێ بوونیان لەم شارە کۆنە تایبەتمەندی خۆی پاراستووە. کەچی چەند لایەنەکی ئەو بابەتە لەگەڵ گەلانی ناوچەکە هاوبەشە، ئەمەش بەهۆی لە یەکتر نزیک بوون و پێکەوەژیانی ئەم نەتەوانەیە لەم شارەدا، هەندێک لەم داب و نەریتانەش کە هەیە، دەتوانم بەم شێوەیە تۆماریان بکەم:

**١- کاتی شەوان ئاوی گەرم رووناکرێتە سەر زەوی:**

تاکو ئێستاش ئافرەتانی تورکمان لە شاری هەولێر ئاوی گەرم لە شەودا لەسەر زەوی نارێژن، چونکە واتێدەگەن رژانی ئاوی گەرم لە شەواندا جنۆکەکان ئازار دەدات، بۆیە ئافرەتان بەردەوام ئامۆژگاری منداڵەکانی خۆیان دەکەن، شەوان ئاوی گەرم نەرێژنە سەر زەوی، ئەگەر رشتیان دەبێ (بسم الله الرحمن الرحيم)ی لەگەڵدا بڵێن تاکو جنۆکەکان لەم شوێنە دوورکەونەوە و تووشی ئازار نەبن.

**٢- رووکردنی ئاو لەدوای ئەو کەسانەی کە سەفەر دەکەن:**

تا ئێستا زۆربەی خێزانەکانی تورکمان لە شاری هەولێر ئەم کردارەیان بەباش زانیوە، کە یەکێ لە ئەندامەکانی خێزانیان سەفەر بکات چەند جامێ ئاو لە دوای گەشتیارەکە دەرێژن، چونکە وای بۆ دەچن بە رشتنی ئەم ئاوە خودا ئەو کەسەی دەپارێزێت و بە ساغ و سەلامەتی لە سەفەرەکەی دەگەرێتەوە.

**٣- نیشانەکانی هاتنی میوان:**

لە کۆنەوە ئافرەتانی تورکمان لەو باوەڕەدان، ئەگەر ئەم چەند کردارانە لە ماڵیان روبدات میوانیان دێت:

- کۆبوونەوە و جریوە جریوی چۆلەکە لە ماڵەکەیاندا.
- ئەگەر کچێکی ساوا حەوشیان گەسک بدات.
- ئەگەر پووشکەیەک بکەوێتە ناو پیاڵەی چای خواردنەوە، ئەمە نیشانەیە کە ئەم خێزانە میوانیان دێت.
- ئەگەر پشیلەی ناو ماڵ بە زمان و دەستی خۆی رووی خۆی بسرێتەوە لەبەر دەرگای ماڵ دابنیشێت و رووی لە دەرەوە بێت.

**٤- پەسند نەکردنی دوورینی جلوبەرگ لە بەیانی یەکەمی جەژنی قوربان:**

ئافرەتانی تورکمان پێیان خۆش نییە جلوبەرگی خۆیان بەیانی رۆژی جەژنی قوربان بدوورن، چونکە دوورینی جلوبەرگ لەم کاتەدا کاری حاجییەکان لە بەیتی خودا تێک دەدات.

**٥- بەردەوام هاتنی دەنگی پشیلە:**

لە کۆنەوە پیرەژنەکانی تورکمان لە شاری هەولێر بە دەنگی (میاوە میاوی) پشیلە نارەحەت دەبوون و دەترسان، گوایە ئەم دەنگە فاڵێکی باش نییە بۆ ئەندامانی ئەم خێزانە و یەکێ لە ئەندامەکانی ئەم خێزانە دووچاری کارەساتێک دەبێت.

**٦- ئازار نەدانی پشیلەی رەش:**

لە کۆنەوە ئافرەتانی تورکمان خۆیان لە ئەزیەتدانی پشیلەی رەش دووردەخستەوە، چونکە وای بۆ دەچن کە هەندێ جار جنۆکەکان خۆیان بۆ شێوەی پشیلە دەگۆڕن، بۆیە ئەندامانی ئەو ماڵە هەوڵیان دەدا بە هێمنی ئەو پشیلە رەشانە لە ماڵی خۆیان دوور بکەنەوە.

**٧- گواستنەوەی بووک لە نێوان**

**دوو جەژندا:**

تا ئێستاش زۆربەی خێزانە تورکمانەکان لە شاری هەولێر حەزناکەن لە نێوان جەژنی رەمەزان و جەژنی قوربان بووک بگوازنەوە، چونکە وای بۆ دەچن کە گواستنەوەی بووک لەم کاتەدا دەبێتە هۆی مردنی یەکێک لە بووک و زاوا.

**٨- هەڵدانی ددانی منداڵ بەرەو رۆژ:**

لە کۆنەوە ئەگەر منداڵێک ددانی بکەوتبایە پێیان دەگوت: برۆ دەرەوە ددانەکەت بەرەو رۆژهەڵدە، گوایە هەڵدانی ددان بەرەو رۆژ تەمەنی منالەکە درێژ دەکات.

**٩- کوتانی لووت و ړوومەت:**

لە نەریتە کۆنەکانی خەڵکی هەولێر، کە منداڵێک لە دایک دەبوو یەکسەر دەیان بردە ماڵی سەیدێکی ئەولادی رەسوڵ لە گەرەکی عەرەب بۆ کوتینی سەر لووتی یان ړوومەتی ئەو منداڵە.

**١٠- کونکردنی گوێی چەپەی منداڵی کوڕ:**

لە کۆنەوە ئەگەر خێزانێک چەند کچێکی هەبوایە گەورەی خێزانەکە نەزری دەکرد ئەگەر خودا کوڕێکی بداتێ وەکو کچۆڵە گوێی چەپەی کون دەکات ئەڵقەکی ئاسنی پێوە دەکات.

**١١- خۆشوشتنی شەوانی چوارشەم:**

لە کۆنەوە خێزانی تورکمان لە هەولێر حەزیان نەدەکرد شەوانی چوارشەم بچنە حەمام، یان لە ماڵێکدا خۆیان بشۆن، چونکە وا تێدەگەیشتن ئەگەر خۆیان بشۆن زەرەرمەند دەبن.

**١٢- یاری کردن لەگەڵ مقەس:**

لە کۆنەوە دایکەکانمان هەوڵیان دەدا کە ئێمە منداڵ بووین لەگەڵ مقەس یاری نەکەین، چونکە یاری کردن لەگەڵ مقەس دەبێتە هۆی ڕوودانی شەڕ و شۆڕ.

**١٣-گەرمکردنی کەوچک لەسەر ئاگر:**

لە کۆنەوە زۆر کەس پێیان خۆش نەبووە، کە منداڵەکانیان کەوچک گەرم بکەن لەسەر ئاگر، چونکە ئەو منداڵەی کە ئەم کارەی ئەنجام دەدات دووچاری نەخۆشی قوڕگ دێت.

**١٤- دانانی خوێ لە جێبی منداڵ:**

لە کۆنەوە ئەگەر خێزانێک نیازی هەبایە سەردانی دراوسێیەکیان یان خزمێکیان بکات، هەندێ خوێیان لە جێبی منداڵی بچووکی خۆیان دادەنا، چونکە وای بۆ دەچن کە دانانی خوێ لە جێبی ئەم منداڵە ئەندامانی خێزان لە چاو و نەفەس دەپارێزێت.

**١٥- دانانی خوێ لە پێڵاوی میوانان:**

ئەگەر دراوسێیەک بە شەو سەردانی جیرانێ خۆی بکردبایە و لە ماڵەکە زۆر بمابایەوە منداڵێکی ماڵەکە هەندێک خوێی دەخستە ناو پێڵاوی میوانەکەیان تا زوو لە ماڵەکەیان برۆن.

**١٦- لە کاتی شەودا سەیرکردنی ئەینۆک:**

لە کۆنەوە پەسند نەدەکرا شەوان تەماشای ئەینۆک بکەن.

**١٧- بڕینی دار و درەختی باخچەی ماڵ:**

خێزانە هەولێرییەکان بە چاکیان نەدەزانی کە درەختێکی بەرداری باخچەی ماڵ ببڕن، چونکە واتێدەگەیشتن بەم کردارە یەکێک لە ئەندامانی خێزان دەمرێت.

**١٨- تێپەڕبوون لەسەر منداڵی ساوای نوستوو:**

تێپەڕ بوون لەسەر منداڵی ساوا لە کۆنەوە خەتایەکی گەورە بوو لەلای هەولێرییەکان، چونکە واتێدەگەیشتن کەوا گیانی ئەم منداڵە بە تەواوی لە جەستەکەی جێگیر نەبووە، دوور نییە لە کاتی تێپەڕبوون منداڵەکە بمرێت.

**١٩- کوشتنی بۆق:**

لە کۆنەوە لەلای هەولێرییەکان پەسند نەدەکرا منداڵەکانیان بۆق بکوژن، چونکە کوشتنی بۆق دەبێتە هۆیەک بۆ تووشبوونی باڵۆکە.

**٢٠- هەڵواسینی لەپکە و مازی:**

لە کۆنەوە خەڵکی هەولێر لەپکە و مازیان لەسەرشانی منداڵی ساوا گرێ دەدا، گوایە لەپکە مازی منداڵەکەی لە چاو و نەفەس دەپارێزێت.

**٢١- زرنگانەوەی گوێ:**

لە کۆنەوە خەڵکی ئەم شارە واتێدەگەیشتن ئەگەر گوێیان بزرنگابایەوە، ئەوا کەسێک غەیبەتیان دەکات.

**٢٢- گریانی بەردەوامی منداڵی ساوا:**

لە کۆنەوە خێزانەکان لایان پەسند نەبوو ئەگەر منداڵێکی ساوا زۆر بگریابایە، چونکە واتێدەگەیشتن ئەو منداڵە سەری باوکی خۆی دەخوات.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر ژمارە (٢٤) ساڵی ٢٠٠٧ وەرگیراوە.



# مەسیحییەکانی هەولێر (عەنکاوە، شەقڵاوە، هەرمۆتە، هەریر، کۆیسنجق، رواندز، دیانا، برادۆست، بارزان)

حەبیب شەقڵاوەیی

**هەولێـــر:** شـــارێکی دێرینی کوردستـانە، بەپێی (دائرة المعارف الاسلامیة أربیل) چەند خێزانێکی مەسیحی لێدەژین، پێیان دەڵێن "کلدانی"، کە گوندی "عەنکاوە" هەموویان مەسیحین. لە کتێبی (Aham book to mosepat) بەشی سێیەم، لاپەڕە ٢٥، عەنکاوە، دەکەوێتە بەشی باکووری هەولێر، پتر لە ٣٠٠ خێزانی مەسیحی رۆژهەڵاتی لێ دەژین، بەڵام بەپێی ئامارێکی حوکمڕانی عوسمانییەکان لە ساڵی ١٩١٣ (١٢٠٠) مەسیحی لە هەولێر هەبووە، شان بەشانی ئایینەکانی تر ژیاون، (حەدیاب)یش لە زێی گەورە، تاوەکو زێی بچووک و ئازەربایجـان و زاوزاری نەینەوا، دەکشا و مەسیحیەت لەناو باو بوو.

**کەنیسەکانی هەولێر:**

١- کەنیسەی قلب الاقدس کۆنە لە گەڕەکی عارەبان.

٢- کەنیسەی مار گورکیس لە گەڕەکی شۆڕش.

٣- کەنیسەی مار قەرەداغ لە نزیک بەنزینخانەی شۆڕش تازە دروست کراوە.

٤- گۆڕی کچە بەشەرەفەی هەولێر یان (یەزداندوخت) پاشماوەی کەنیسەی تا ئەم ساڵانە لێ دیار بوو بەچاکی مەحەتە ناسراوە (ستی ئیمام).

**عەنکاوە:**

شارۆچکەیەکی کشتوکاڵی بوو، بەپێی لێکۆڵینەوە (الارکولوجیة) هەر لە کۆنەوە هاوچەرخی قەڵای هەولێر بوو، مێژووی ئاوەدانی دەگەڕێتەوە پێش سەردەمی ئاشوورییەکان. بەگشتی دانیشتوانەکانی مەسحین پتر لە ١٥٠٠ خێزانی تێدایە، هەندێک خێزانی ئیسلامیش لەگەڵیان بەبرایانە دەژین.

دەزگای شوێنەواری عیراق و کوردستان لێکۆڵینەوەیان لە ١٩٤١/٢/٩ مێژووی بۆ سەردەمی نەرید و (٤٥٠٠) ساڵ پێش زاینی دەگەڕێتەوە، کە شوێنەکە ناسراوە بە (خربەی عەنکاوە).

١- تانیتان کردسینا، وتەیەکی ئارامییە بەمانای کۆشکە لە ڕێکەوتی ١٩٤٥/١٠/٨ لێکۆڵینەوە لەسەر کرا کە پاشماوەی کلدانییەکانی تازەی لێ بەدیار کەوت، کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٦٢٥ - ٣٩پ. ز.

٢- قەسرا (گردی گۆڕستانی عەنکاوەی کۆن) لە ڕێکەوتی ١٩٤٥/١٠/٥ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەنجام درا کە سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی ٩٦١ - ٦١٢ پ. ز.

٣- گردی (مام یەلدا) دوو کیلۆمەتر لە عەنکاوە دوورە لە ڕێکەوتی ١٩٥٤/١٠/٨ لێکۆڵینەوەی لەسەر کرا مێژووەکەی دەگەڕێتەوە (١٦٠٠ - ٩٦٢) پ.ز.



٤- گردی (مار عودا) یان (مار عود یەشوع)، کەوا دێرێکی کۆن بووە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانییەکان، (ساڵانی ٢٢٦ - ٣٣٩ زایینی)، شوێنەواری جاردە ڕێک و پێک و خشت کرا و خانوبەرە و ئاگر کردنەوە و چەند گۆڕێکی مەسیحییەکانی لێ دۆزرایەوە.

٥- پیاو چاک ئیلیا شەهید و پیاو چاک قریاقوس، کە لەسەر ڕێگای گوندی (گەزنەیە)، شوێنەکەیان و پاشماوەیان تا ئێستا هەرماوە.

٦- پیاو چاک (مار سیڤا)، کەنیسەیەکی کۆن بووە، تاوەکو ئێستا بەناو دیر ناسراوە، دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بۆ شەقڵاوە و عەنکاوە کۆچیان کردووە بەبنەماڵەی ئیسحاقی دەناسرێن. هەروەها بنەماڵەی شنگوڵ.

٧- چاکی مارت شمونی و منداڵەکانی، کەنیسەیەکی لێیە لەگەڵ گۆڕستانێک شوورەکراوە، خەڵک زۆر زیارەتی دەکەن.

٨- چاکی (مریم العذراء) یان مریمانە، جێگای کەنیسەیەکی کۆنە خەڵک لە ڕۆژانی هەینی زۆر زیارەتی دەکەن، بەتایبەت ئەو ساڵانەی باران نەبارێت، زیارەت و نوێژ دەکەن، باران دەبارێت و پێی دەوترێ مریەمەی ئاگاداری گیا و گوڵ. ئێستا دوو قوبەی لێیە و نزیکی (٥) دۆنم دەورەی شوورە کراوە.

لەگەڵ بیری ئاوی تایبەت هەروەها زۆر جێگای پیرۆزی تری لێیە.

٩- بنەسڵاوە نزیکەی (٥کم) لە هەولێر دوورە مەسیحی بووە مانەیەکی منداڵانی نوێژکەر و شوێنەواری کەنیسەکەی تا ئەم ساڵانە مابوو گشتیان کۆچیان کردووە بۆ عەنکاوە.



١٠- تەوسکا: دەکەوێتە ناو قەدەی چیای سەفین (حەدیاب) لە رۆژهەڵاتی حجران کنیسەیەکی گەورە بوو، تاوەکو ئێستاکەش پاشماوەی هەر ماوە لەلایەن ئیسلامەکان و مەسیحیەکان زیارەت دەکرێت.

**کنیسەکانی عەنکاوە**

١- کنیسەی مارگۆرگیس دەکەوێتە ناو عەنکاوەی کۆن زۆر لە کۆنەوە دروست کراوە پتر لە چوار جار نۆژەن کراوە.

٢- کنیسە مار یوسف: دەکەوێتە سەر شەقامی سەرەکی عەنکاوە لە ساڵانی هەشتایەکان دروست کراوە لە تەنیشتی کۆشکی مەتران و خانووەکان بۆ قەشە دروست کراوە.

٣- کنیسە مارایلیا لە ساڵی ٢٠٠٧ دروست کراوە، دەکەوێتە سەر دوو شەقامەکان.

٤- کنیسە ئاشوریەکان: دەکەوێتە ناوەندی عەنکاوە لە ساڵی ٢٠٠٧ دروست کراوە.

٥- پیاوچاکی مار قرداغ ئەو چوار ساڵە شورەی بۆ کراوە، بەڵام بەداخەوە هەر لەجێگای خۆی ماوە

**شەقلاوە:** دەکەوێتە دۆلی چیای سەفین (حەدیاب) و بە چیای سۆرک (دار اباد) ناسرابوو، دەکەوێتە باکووری شەقلاوە، کە پێی دەوترێ دەربەند لە گەلی سۆرک.

**کەنیسەکانی شەقلاوە:**

١- کەنیسەی (مار تۆما)، شوێنەوارەکەی شاخێکی وێنەی خاچ و نووسراوی کۆنی لێماوە لەناو باخچەکانی مەسیحییەکانی شەقلاوەیە.

٢- کەنیسەی مار ئوراها (چاکی سەرگرد)، شوێنەواری دوو گۆڕی گەورە و (٢٠) گۆڕی بچووک و دارێکی پیرۆزی لێیە مەسیحییەکان و ئیسلامەکان سەردانی دەکەن و هەردوولایان بە پیرۆزی دەزانن.

٣- کەنیسەی مار یوحەننا: لەم ساڵانە کەنیسەیەکی بچووک و خانوویەکی میوانداری لێ دروست کراوە.

٤- کەنیسەی مریم العذراء: کۆنترین کەنیسەیە لەساڵانی سێیەمی زاینی دروست کراوە، دوو دەرگای رۆژهەڵات و رۆژئاوای هەبووە، چەندەها جار نۆژەن کراوەتەوە، لە ساڵانی ١٩٩١ بەڕێز مام جەلال سەرۆکی کۆماری عێراقی فیدراڵ تازەی کردەوە. لە دەوروبەری گۆڕستانی مەسیحییەکانی شەقلاوە دەوری شوورە کراوە بەدار و بار چاندراوە و دیمەنێکی جوانە لەسەر گردەکەی کەنیسە و لەرێگای رەبەن بۆیا، لە پێناو نوێکردنەوە ئەم کەنیسەیە قەشە یوحەننا لە رێکەوتی ١٩٨٦/٣/٢٨ شەهید کرا.

٥- کەنیسە (انتقال العذراء) لە شەستەکان بە هیمەتی خەڵکی شەقلاوە و پیاوانی خێرخواز لە دەرەوەی شەقلاوە و قەشە فرنسیس شیر دروست کرا (لەناو باخچەکانی مەسیحییەکانی شەقلاوەیە).

٦- کەنیسە (قلب الاقدس): تازە دروست کراوە، لەناوەڕاستی شەقلاوە لە گەڕەکی مەسیحییەکان لەلایەن (غبطهی

مار بطریک عما نوئیل ولی) کرایەوە و بەهیمەت و بەدواداچوونەوەی بەڕێز قەشە ئازاد سەبری لە شەقڵاوە، زۆر پیاوچاک و قەڵا ئەشکەوتی رەبەنەکان هەیە و لەناوقەدی چیای سەفین (حەدیاب) تاوەکو ئێستاکەش شوێنەواریان هەرماوە، لەمانە.

٧- مار شمونی، مار گورگیس، مار مارتوریس، یان مار سهرونا بەمانای (شەهیدی بچووک) دێت، مار یوسف و سارابیا هورمز و قەشەی رەبەن شەمعون شەقڵاوەیی لە پشت (کەنیسە مریم العذراء) لە قەد سەفین دایە و پاشماوەی کەنیسەی کۆن بە رووبەری (٢٠٠)م٢ بوو دەستێکی باڵای هەبووە لە نووسینەوە بەتایبەت اوخارستیا، المعمودیە و تفسیری الاسرار.

**رەبەن بویا:** (بێری) شێخ وسو رەحمان: کە لە مێژوویەکی کۆنی مەسیحییەتەوە، ئەم پیاوچاکە هەبووە، کە دەکەوێتە ناوقەدی چیای سەفین (حەدیاب)، لە پاشماوەکانی دێرێک بووە بۆ کۆبوونەوەی رەبەنەکانی ئەم ناوچەیە، دیوارەکانی هەرماوە و لە هەمووی سەیرتر، دیوارەکەی پێشەوەی کەوا نزیکەی (٢٠م) دەبێت دەرگایەکی گەورەی لەسەر شێوەی کەوان، پتر لە(٣م) لەسەر ئەم ئەشکەوتە دروست کراوە. هەروەها بیرێکیش بەقووڵی ٦م بە ٣م لەناو شاخێکی گەورە هەڵقوڵاوە.

لە حیکایەتی ئەلمزربان مار قرداغ حاکمی حەدیاب کە یەکەم ئوسقفی نیشتمان حەدیاب لەلایەن ئەدی نیراو کراوەتە ئوسقفی حەدیاب، بەناوی پقیدا لە ساڵی ١٠٤ز کوڕی بیریّ بووە، ئێستا پێی دەڵێن رەبەن بۆیا.

٨- شەمعون هیرانی (شەمعون هیرانایا)، گۆڕەکەی لە نزیک مار یوحنان دایە لە ناوەکەی دیارە خەڵکی هیران (خۆشناوی ئێستاکە بووە).

٩- هۆڵی شەهید قەشە (یوحنان شێر) دەکەوێتە جەرگەی شەقڵاوە، پاش شەهید بوونی بەدەستێکی رەش لە رۆژی ١٩٨٦/٣/٢٨ کە رۆژێکی زۆر پیرۆزە، پێش قیامەتی حەزرەتی مەسیح شەهید کرا بیروبۆچوون هەستێکی زۆر پێشکەوتووانە و نیشانەی برایەتی لەنێوان مەسیحی و ئیسلامەکان بوو، پاش شەهید بوونی ناوی هۆڵەکە ناونرا هۆڵی شەهید یوحنا.

١٠- چاکی حودا و (رەشەدول)، کە دەکەوێتە پشت گوندی حوجران و گردەچاڵ، کانیاوێکی بەناوبانگ لە بەرامبەری هەیە، کە ئاوەکە دڵۆپ دڵۆپ دێتە خوارێ، پیاو چاکێکی بەناوبانگی لێ دەژیا بەناوی مارعەبد یەشوع، زۆرجار سەردانی پیاو چاک رەبەن بوو یا (بێری) دەکرد، مار قەرەداغ لەسەر دەستی ئەم پیاوە چاکە لە مەجوسی بووە مەسیحی، کە مەرزبانی فارسی بووە لە هەولێر.

لە مێژوو زۆرجار باسی مار قەرەداغ کراوە.

١١- چاکی پیرمام یان (مار ئیلیا) خدری زیندە، کە دەکەوێتە نزیک چوارڕیانی هاوینەهەواری پیرمام (سەلاحەدین)، پیاوە بەساڵاچووەکانی شەقڵاوە دەگێڕنەوە، زۆرجار بەهانای کاروانچییەکان هاتووە.

١٢- چاکی شێرەسوار (مار گۆرگیس)، دەکەوێتە باشووری گوندی حوجران، خەڵک لە موسڵمان و مەسیحییەکان زیارەتی دەکەن، کانیاوێکی سافی لێیە.

١٣- چاکی مار یەعقوب (حاجی مەرەگ)، دەکەوێتە نێوان هەردوو ئاقوبانی سەرەوە و خوارەوە. پاشماوەی کەنیسەی لێ دیارە، جووتیارەکان لەکاتی کێڵانی زەوییەکی بەرامبەر ئەو شوێنە، زۆر پاشماوەی ئاسن و گۆگردی وەک گاسن و زینی ئەسپ و شتی تریان دیوە، کە وێنەی خاچی لەسەر بووە، ئێستا هەندێکیان لە مۆزەخانەی هەولێر پارێزراون، ئاقوبان لە بنەڕەتدا یەعقوب بووە، هەروەهاش لە ئاقوبانی سەرەوە، لەکاتی لێدانی بناغەی ماڵێک خاچێک دۆزرایەوە.

**هیران (خۆشناو)**، لەسەر گردەکەی پێشەوەی کەنیسەیەکی کۆن تاوەکو ئەم سەردەمانە هەرمابوو، کانییە ئاوێکی لە نزیک هەیە پێی دەڵێن کانی قەشە، بەپێی

سەرچاوەکانی مەسیحییەت (مطران خانە)ی لێبوو، زۆربەی زۆری مەسیحی بوون تاوەکو کۆتایی سەدەی هەشتەمی زایینی.

**حەریر (بیت ئاسا)**، تاوەکو ساڵانی ١٩٦٣ ناحیەی حەریر مەترانییەتی هەر لێ مابوو، لەگەڵ گوندەکانی دەوروبەری، بەڵام پاش کودەتای رژێمی بەعس فاشی ١٩٦٣ و تێکچوونی ئاساییش، ناچار بوون کۆچ بکەن بەرەو هەولێر و شارەکانی دیکە، تاوەکو ئێستا بەردە گەورەکەی کەنیسەی مار یوحەننا لە کەنیسەی مار گورگیس لە هەولێر هەرماوە.

بەپێی کتێبی (شهداء المشرق) بەرگی یەکەم، نووسینی زانای گەورە (ئەدی شێر، مار یونان مار بریختیشوع) لە ساڵانی ٣١٨ - ٣٣٩ زایینی مەترانی ناوچەی حەریر بوون و لەوێ شەهید کراون.

**ناوچەی دیانا:** وشەی دیانا وشەیەکی ئارامییە بەمانای دادوەر (الحاکم) ئاشورییەکان دادگایەکی گەورەیان لەم ناوچەیە پێکهێنابوو، مێجەرهای لە کتێبەکەی دوو ساڵ لە کوردستاندا دەڵێت دیانا گوندێکی گەورەیە و مەسیحییەکان لێی دەژین، دەکەوێتە تەنیشت رواندوز، ئەم مەسیحییانە پێش هاتنی ئایینی ئیسلام، لەوێ دەژیان. ناوچەکە تاوەکو زێی گەورە و لیوای موسڵ دەگرێتەوە، دەشتەکە تاوەکو ئێستا بەدەشتی دیانا ناسراوە، هەروەها لە دەست نووسەکەی (الاب شوئیل جمیل) (١٦)دا هاتووە کەنیسەی مار گورگیسی شەهید و دیانا ئەسقفیە بوو، ناوی ئەسقفەکەش مار یوخەنا بوو تاوەکو سەدەی بیستەم.

مەسیحیەت لەناوچەی برادۆست و گوندەکانی هاودیان، رواندوز، بیاو، بادلیان، بیربال، زورا، سیرا هەبوو، بەناوبانگترین کەنیسەی (مار قریاقوس) بوو، تاوەکو ئەم سەردەمە بەپیاو چاکێکی خۆشەویست لەلایەن مەسیحییەکان و ئیسلام چاوی لێکراوە. هەروەها مەزاری مارت شمونی و مریم العذراء، مار اسطیفان، مار یوسف. لە هاودیاندا کەنیسەی مار ئورها و کەنیسەی دێری و کانیاوی دێری ئێستاش ماوە لەگەڵ گەلی رەبەنان (وادی الرهبان).

**گوندی بیربال:** دەکەوێتە سەر چیای شیرین، نزیکی سنووری تورکیا، گشت دانیشتووانی مەسیحین لە نزیکی گوندی بیبخشاش و بینی گۆرستانێکی گەورەی مەسیحییەکان هەیە و پاشماوەی خاچ لەسەر کێلەی گۆڕەکان هەرماوە، لە کۆنەوە بەناوی (بیت بغاش) ناسرابوو ئەبرەشیەکی گەورە بوو. نزیک گوندی کانی بوت لەسەر چیای شیرین پاشماوەی کەنیسەکەی هەرماوە. گۆڕی زۆر پیاو چاکی لێیە وەک مار تۆما، مار یەشوع، مریم العذراء، مار ساوا (شایب) و مار خاسو، مار ئورها، مار زیا. هەروەها لە گوندی بارزان کەنیسەیەکی زۆر گەورە هەبوو.

کوردستان بەگشتی بنکەی زانست و زانیاری بووە، بەتایبەت پاش بڵاوبوونەوەی مەسیحییەت، چونکە هەر کەنیسەیەک یان دێرێک کتێبخانە و قوتابخانەی هەبوو بۆ گشت خەڵک دەبوایە و پێویست بوو راهیبەکان و قەشەکان و ئەسقفەکان دەستنووسیان هەبێت، لەبەر زۆری ژمارەیان ناوچەیەکی حەدیاب هەولێر، بەناوبانگترین کەسیان بەپێی سەرچاوەکان لێرەدا تۆمار دەکەین.

١- مشیخازخا: مێژووناسێکی باوەڕپێکراوە لەلایەن کتێبخانەکانی ئەوروپا لەسەدەی شەشەمی زایینی ژیاوە. ناوی لە خشتەی عبد یشوع الصوباوی ژمارە (٥٤)دا هاتووە، بەباوکی مێژووی کوردی ناسراوە. یەکەمین قەشە بوو مێژووی وڵاتەکەی نووسیوەوە، شانازی بەپیاوە گەورەکانی وڵاتەکەی دەکات، سورە لەسەر مێژووی حەدیاب (حزە) و ناوەندەکەی هەولێر و سەرکردایەتی ئایینی مەسیحییەت لەناوچەکە بنچینەی یەکەمی کەنیسەی هەرێمەکەیە، لەوێدا مەسیحیەت بڵاو بووەوە لە رۆژهەڵاتدا.

## پیاوە ناودارەکانی حەدیاب لە مێژوودا

١- بقیدا: یەکەمین ئەسقفی حەدیاب بووە لە ساڵی(١٠٤ - ١١٤ز) کوڕی قەشە یوسف لە دایک بووی گوندی گەروانی ژووروە، کە (٥)کم لە رواندوز دوورە، دەکەوێتە چیای بێخاڵ و

دۆڵی ئاکۆیان، تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی هەشتەم بنەماڵەی (الجوجا) لەوێ مابوون، بەپێی تۆماری بەناو کردنی کەنیسەی عەنکاوە، ساڵی ١٨٨٧. هەروەها خێزانەکانی خزو بەرەو عەنکاوە هاتن.

٢- داود قەرەداغی (بارزانی): کوڕی یوحەنا نیان گورگویە (الذئب)، ئەوسا نەخۆشی رشانەوە لەناوچەکە بڵاو بوودوە، لە ساڵی ١٨٢٧ دەستی کردووە بەنووسینی کتێب، تاوەکو ساڵی ١٨٣٢ خەڵکێکی یەکجار زۆر مردن، لەوانە مامەکەی قەشە حزیران.

٣- ماربردیهانی حەدیابی/ لە حەدیاب لە سەدەی یەکەم لەدایک بووە، کتیبی (شرائع البلدان) و کتێبی بڵاوبوونەوەی مەسیحیەت لە رۆژهەڵاتی داناوە، زۆرر شانازی بە هەولێرەوە دەکات.

٤- ئیبراهیم نەشفری: لە گوندی شقرا لەدایک بووە (گویڕی) ئێستا دەستنووسی نووسراوی هەبووە، زۆر قوتابخانەی لە حەدیاب دروست کردووە.

٥- زانایانی مەسیحی بەناوبانگ لە جیهاندا: ئەدی شیر مەترانی شاری سعرد، ساڵی ١٨٦٧ - ١٩١٥ لە شەقڵاوە لەدایک بووە، بەدەستی رەشی عوسمانییەکان ئیعدام کراوە، (٢٧) کتێبی نووسیوە، جگە لە ژمارەیەکی زۆر لەدەستنووس، باسی کورد و کوردایەتی کردووە.

٦- یەزداندوخت (الشریفة الأربیلیة/ ست امامی): دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای هەولێر، مەسیحی و ئیسلام سەردانی دەکەن، یەزداندوخت کارگێڕی کاروباری دێرەکەی دەسووڕاند کە، لە شوێنی قەسری باب و باپیرانی، پاش مردنی هەژدیها شابووری دووەم دروستی کردبوو، ژیانێکی خۆش و دووروودرێژو بەکاری خواناسی تێدا بەسەر برد، رۆژانە سەردانی گۆڕی دایکی دەکرد و ١٠ دەقیقە لە هەولێری ئەو سەردەمە دوور بوو. مار قرداغ فرربانی هەولێر بووە لە حوکمڕانی فارسەکان برای یەزداندوخت بوو.

٧- مار یەعقوبی سورچی: لەناوچەی بیت ئاسا (حەریر) لەدایک بووە، ساڵی لەدایک بوونی دیار نییە، بەڵام لە ساڵی ٥١٢زایینی کۆچی دوایی کردووە، دەستێکی باڵای لە نووسینەوە و وەرگێڕان هەبووە.

٨- کویسنجەق: بەپێی سەرچاوەکان خێزانێکی مەسیحی لێ هەبوو، بەڵام لە پاش ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمین چەند خێزانێک لە هیران و ئازەنێن و رواندوز و حەریر بۆ کوێسنجق کۆچیان کردووە، کەنیسەیەکی بەناوی مار یوسف لێیە.

٩- ئەرمۆتا: ئەم گوندە دێرینە بەمانای (ئەرعاموتا) عاردی مردن دێ، لە سەرچاوەکاندا هاتووە، چونکە هەرلەکۆنەوە زۆر شەهیدی داوە، بۆیە ئەم ناوەی لێنراوە، لەدەشتی دزەیی چەند گوندێک هەیە پێیان دەڵێن بندیان، گوایە ئەمانە بە ئەسڵ خەڵکی ئەرمۆتن و کۆچیان کردووە پاشان ئیسلام بوون.

١٠- دێر مار ماربینا (مار بهنام) ٣کم لە ئەرموتە دوورە، دەکەوێتە قەدی چیای باواجی، نزیک گوندی تۆبزاوە، ساڵی دروست کردنی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شاپووری دووەم، خەڵک زۆر سەردانی دەکەن، بەڕێز مام جەلال سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵ تازەی کردەوە و ئاوی بۆ هێنا و شەقامەکەی قیرتاو کرد.

سەرچاوەکان:

١- المرشد / الأب شموئيل جميل.
٢- سنتان في كوردستان/ ميجرهاي.
٣- أدب اللغة الارامية/ البيرابونا.
٤- كتاب الرؤساء/ البيرابونا.
٥- شهداء المشرق/ العلامة اداي شير.
٦- سيرة داود يشوع/ العلامة اداي شير.
٧- حياة العلامة اداي شير/ الأب فرنسيس جبرائيل شير.
٨- تاريخ عنكاوا/ عزيز عبدالأحد نباتي.
٩- كرونولوجيا أربيل/ ت. عزيز عبدالأحد نباتي.
١٠- تاريخ عنكاوا/ الشماس حنا روفو.
١١- تاريخ شقلاوة/ الشماس ميخائيل منصور.
١٢- تاريخ موصل/ ياسين العمري.
١٣- المزارات في أربيل/ الأب ازاد صبري.
١٤- الينبوع/ الأب ازاد صبري.
١٥- يزداندوخت الشريفة الأربيلية/ الآب سليمان صانع.
١٦- مجلة نجم الشرق ٨، ١، ٤.
١٧- الفكر المسيحي ٣٧، ٣٧٢.
١٨- الكرد و الحق/ ت. عزيز عبدالأحد نباتي.



# جلوبەرگی کلدانییەکان

نوری بوترس

جلو بەرگی میللی بە گرنگترین دیاردە شارستانییەکان دەژمێردرێت، لە هەر نەتەوەیەک لە نەتەوە زیندووەکانی سەر زەوی و زۆریش شانازی بە جلو بەرگی خۆیان دەکەن، بەو پێیەی کە بایەخ و گرنگی تایبەتی خۆی هەیە لە هێشتنەوە و مانەوە و بەردەوامی کەلەپوور و فۆلکلۆری باپیران، هەروەها جلوبەرگ بەشێکیشە لە ئاکار و تەقالیدی میللەتان.

جلوبەرگی میللی ئاوێنەی لایەنەکانی دیکەی رۆشنبیریی میللەتان، لەگەڵ سروشتی جوگرافی و داب و نەریتی ئاوێنە بووە، زۆربەی توێژەران جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە کلدانەکان خاودنی بنەماو رەگەزەکانی فۆلکلۆری میللین، بەو فۆلکلۆر و پاشماوانەی کە لە باپیرانەوە بۆیان بەجێ ماوە، لەگەڵ شوێنەوار و شارستانییەکانیان هەروەک بابلی کۆن تاکو ئەو سەردەمانەش...

چەندین نموونەی بە شارستانی بوون شایەدی بۆ ئەم بۆچوونە دەدەن، زۆربەی بەلگەنامە مێژوویییەکان لەبەر چاومانن و لە سەرچاوە کۆنەکان و سەر دیواری پەرستگاکان و وێنە و پەیکەر و کارە دەست رەنگینییەکان و بەکارهێنانی رەنگ و وێنەدار کردنی جلوبەرگ، ئێستاشی لەگەڵدا بێ

ئەو جلوبەرگ و نموونانە لە گوند و شارۆچکە و لادێیەکانی کلدانییەکان پارێزراون و شانازیشی پێوە دەکەن، بە تایبەتی لە عەنکاوە و ئەلقۆش و تلسقۆف و هەرمۆتە و بەرتلە و تلکێف و شوێنەکانی دیکەی کلدان نشین، هەروەها لە دەڤەر و گوند و ئەو شوێنانەی کە دانیشتوانیان سریانین.

لە گوندی هەرمۆتەی نزیک شارۆچکەی کۆیێ، ئافرەتان سەرپۆشێک دەبەستن، کە لە شێوەی جامیلکەیەکدایە و دەورو پشتی ئەو جامیلکەیە بە چەند لیرەیەک لە زێڕ و زیو و شتی گرانبەها دەرازێتەوە و لە چەشنی پرپرە شۆڕ دەبێتەوە، هەروەها کراسێکی شۆڕ لە چەشنی (فستان) پێی دەگوترێ (شوقتە)، کە بە سێ ئالقە یان لیرەی زێڕ لە ناوەڕاستی سینگی بۆ گرێدان لەجیاتی قۆپچە دەرازێندرێتەوە.

لە زاخۆ ئافرەتە کلدانییەکان جلوبەرگی شۆڕ کە چەند چینێک لە سەریەکە، داپۆشراوە پێی دەگوترێ (پوشیا)، لێوارەکانی بە پرپرە و لیرەی زێڕ و زیو دەرازێندرێتەوە، لە ئەلقوشیش کە شارۆچکەیەکی کلدانییەکانە، ئەوێندەریش جلوبەرگی تایبەتی خۆیان هەیە و پێی دەگوترێ (قەبایە)، ئەم جۆرە جلوبەرگە لێوارەکانی دەرازێندرێتەوە بە مۆر و زێڕ و زیو و بەسەر شان دادەدرێ و بەسەر سینگ و بەرۆک شۆڕ دەکرێتەوە، بەمجۆرە دەسرۆکە دەگوترێ (مێزەر)، ملو گەردەنیشی بە تۆقێکی بازنەیی دەرازێتەوە پێی دەگوترێ (گەردانە)، ئەو گەردانەیە بریتییە لە پارچەیەک حەریر یان قوماشێکی جوان و گرانبەها و بە زنجیرەیەکی زێڕ دەرازێتەوە و پێوەی دەبەسترێتەوە، ئەم جۆرە نەخش و گەردانەیە بۆ رازاندنەوەیە و لە هەموو گوند و شارۆچکەکانی تلسقۆف و باتنایە و تلکێف و هەندێ شوێنی دیکەی مەسیحی جێوار بەکاردێ.

باتنایە کە گوندێکی کلدانییەکانە و نزیکە لە موسڵ، ئافرەتەکانیان جۆرە فستانێک دەپۆشن پێی دەگوترێ (شوقتە)، کە بریتییە لە جلوبەرگێکی میللی دیانەکانی ئەوێندەر، کە پێک هاتووە لە جۆرە کراسێکی شۆڕ و کەمەرە بەستێکی قایشی یان پەڕۆی نەخشاو لەسەر نێک و کەمەر دەبەستن کە بە زێڕ و زیو و مەرجان دەنەخشێندرێ، هەروەها سەرپۆشێک دەبەستن پێی دەگوترێ (پوشیا)، لێوارەکانی بە گوڵینگ دەرازێتەوە، هەروەها لە باطوفە، کە ئەویش گوندێکی دیانەکانە، ئافرەتەکانیان جلوبەرگێکی میللی خۆیان هەیە لە حەریر یاخود هەر جۆرە قوماشێکی دی دەچندرێ و بە نەخش و پرپرەی زێر و زیو لێوارەکانی دەچندرێ و پێی دەڵێن (قبایا).

سەبارەت بە جلوبەرگی دیانەکانی بەرتلە، لە سێ پارچە پێک دێ پێی دەگوترێ (قوجما) لەسەر شێوەی جامیلکەیەک لە زێر و زیو دروست دەکرێ و زنجیرێکی لە دەورە دایە و لوول دەدرێ پێی دەڵێن (کەرەوان).

ئێستاشی لەگەڵدا بێ لە بۆنە تایبەتی و گشتییەکاندا ئافرەتی دیان خۆیان پێ دەرازێننەوە و شانازیشی پێوە دەکەن، ئەم جۆرە جلوبەرگانە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی دیکە گواستراوەتەوە و زۆریش حەزی لێ دەکەن.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ٧ ساڵی ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.



# جوولەکەکانی هەولێر

عەباس سلێمان سمایل

بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتی لە کوردستان، بۆ دەوروبەری ساڵانی ۲۰۰ - ۱۵۰ ساڵ بەر لە ئایینی جوولەکە دەگەڕێتەوە، ئایینی زەردەشتی زیاتر لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان و ئایینی جوولەکەش لە ڕۆژئاوای بڵاوبووەوە، گەلانی ئیرەن ڤەیج و گەلانی کۆنی کوردستان چوونە سەر ئایینی زەردەشتی و بەشێکیش لە گەلانی کۆنی کوردستان چوونە سەر ئایینی جوولەکە، پاشان تێکەڵ بەو جوولەکانە بوون کە کاتی خۆی (شەلمانسەر)ی سێیەمی ئاشووری و (نەبوخودنەسر)ی کلدانی بە دیلی گرتبوون و لە فەلەستینەوە ئەوانیان بۆ میزۆپۆتامیا و زاگرۆس گواستبۆوە..

ئازربایجان مەڵبەندی سەرەکی بڵاوبوونەوەی ئایینی زەردەشتی بووە و پەرستگای (شیز) لە شاری گویزانی نێوان ورمێ و تەوریز، پەرستگای هەرە پیرۆز و جێگای حەج کردنیان بووە.

ئایینی زەردەشتی تا سنووری هیندستان و چین و باکووری توران و قەفقاسی و جزیرە بڵاوبووەوە و لە سەردەمی ساسانییەکان بووە ئایینی ڕەسمی ئیمپراتۆریەتی ساسانییەکان و بە نەمانی ئەم ئیمپراتۆریەتە ئایینی زەردەشتیش لەناو چوو، تەنیا (پارس)ییەکانی گوجراتی هیندستان و هەندێک لە دانیشتوانی هەردوو ئوستانی یەزد و کرمان لەسەر ئایینی زەردەشتی مانەوە، کە ئەمڕۆ بە گابر (گاور) ناسراون.

بەڵام ئایینی جوولەکە بێجگە لە شام و عەرەبستان، لە میزوپۆتامیا و زاگرۆس و ناوچەکانی دەوروبەری دەریاچەی قەزوین و چەند هەرێمێکی کیشوەری ئەورووپا بڵاوبووەوە و لەسەر خاکی گەلانی ئێرانی هەرگیز

بەربەرەكایەتی ئایینی زەردەشتی نە كردووە و شاری هەولێریش مەڵبەندی سەرەكی ئایینی جوولەكە بووە لە سەردەمی ئەشكانییەكان، چەند فەرمانڕەوایێكی ئەو سەردەمەی شاری هەولێر جوولەكە بوون، ئەو جوولەكانەش بەشێكن لە رەگەزی سكاییەكان و بەشەكەی دیكەش بە دیل گیراوەكانی فەلەستین. پادشاكانی هەولێر لە چاخی یەكەم و دووەمی پێش زایینی ئەم ئایینەیان قبووڵ كرد، بەم سەردەمەشیان دەوت (هیلونی)، دوو لەم پاشایانە ناویان (هێلین) و (مونابارلو) بوو، كە بە زمانی كوردی كۆن دەدوان و بوونە پاڵپشتی بڵاوبوونەوەی ئایینی جوولەكە و بە جۆرێك هەموو دانیشتوانی ئوستانی هەولێر هاتنە سەر ئایینی جوولەكە و تێكەڵ بە جیهانی جوولەكە بوون، پاشانیش لە كاتی دەركەوتنی ئایینی مەسیحی زۆریان بوون بە مەسیحی و تێكەڵ بە جیهانی مەسیحی بوون، بەڵگەش بۆ ئەمە نزیكایەتی هەردوو زمانی جوولەكە و مەسیحییە لە یەكتری، كە هەردووكیان بە زمانی ئارامی نوێ قسە دەكەن، زۆر بە ئاسایی لە یەكتری تێدەگەن، هەروەها وشەیەكی زۆری زمانی كوردی لە نێو زمانی جوولەكە و مەسیحی كوردستاندا هەیە، بەڵام بە داخەوە تا ئەمڕۆ فەرهەنگی جوولەكە و مەسیحی كوردستان كۆنەكراوەتەوە، كە خزمەتێكی گەورە بە زمانی كوردی دەگەیەنێت.

جا دوورنییە زۆربەی مەسیحییەكانی هەردوو ئوستانی هەولێر و دهۆك لە بنەڕەتدا جوولەكەبن، تەنیا جیاوازیەكی كەم هەیە لە نێوان زمانیان، بە هۆی ئەوەی زمانی ئەوانەی بوون بە مەسیحی كەوتۆتە ژێر كاریگەریی زمانی ئایینی عیسایی، جا دوای ئەوەی ئایینی ئیسلام بڵاودەبێتەوە لە كوردستان ژمارەیەكی زۆر لەو مەسیحییانە و جوولەكانەی كە لەسەر ئایینی جوولەكە و مەسیحی ماون دێنە سەر ئایینی ئیسلام و هەندێك تیرە و بنەماڵەیان بە ناوەكانیان دەناسرێنەوە، وەك:

هۆزی بندیان، بافلە، بنجوو، شكوانا،...... جوولەكەكانی كوردستانیش پەرستگای گەورەیان نەبووە، نەوەك گەڕیدەكان باسیان دەكرد، تەنیا كەنیشتەیان هەبووە، ئەویش بە درێژایی رۆژگار بوونەتە كەنیسە و دێر و مزگەوت.

### رەگەزە سەرەكییەكانی جوولەكەی كوردستان

جوولەكەی هەموو جیهان زمانی ئایینی و خودا پەرستیان (زمانی عیبری)یە و زمانی ئاخاوتنیشیان جۆراوجۆرە، بەڵام هەر هەموویان خەتی عیبری بەكاردەهێنن بۆ نووسینی زمانەكانیان.

ئەوانەی لە كوردستان دەژیان بە زمانێك قسەیان دەكرد، كە زۆر نزیكە لە زمانی سریانی و كلدانی و سابیئە و دەخرایە گرووپی زمانی ئارامی نوێ و بە زمانی تارگوم ناسراوە، بە ئاسانی بە زمانی مەسیحییەكانی كوردستان تێدەگەیشتن، هەروەك لێك تێگەیشتنی سۆرانی و بادینی وابووە. ئەم جوولەكانە لە رەگەزیش بە بەشێك لە جوولەكەكانی رۆژهەڵات ناسراون و دەیانبەنەوە سەر هۆزە یەهودییە ونبووەكان.

ئەم جوولەكانەش بۆ یەكەمین جار پاشای ئاشووری شەلمانسەری سێیەم٨٥٨ - ٨٢٤ پ.ز دوای داگیركردنی فەلەستین ژمارەیەكی لێ بەدیلگرتن و گواستنەوە بۆ كوردستان، دوابەدوای ئاشوورییەكان، پاشای كلدانیی (بوخت نەرسی) یا ئەبووخود نەسر ٥٩٧ - ٥٨٦ پ.ز بە دوو جار ژمارەیەكی زۆری لە جوولەكەكانی فەلەستینی گواستەوە ناوەڕاستی عێراق و پاشان بە باشووری عێراق و لورستان بڵاوبوونەوە تا هەمەدان و خوزستان، جا دوای ئەوەی ئەخمینییەكان ئیمپراتۆرییەتی میدیا دەرووخێنن و رێگا بە گەڕانەوەی جوولەكەكان دەدەن بۆ فەلەستین، تەنیا (٤٠,٠٠٠) چل هەزاریان دەگەڕێنەوە.

جا ئەو جوولەكانەی هاوردنیان بۆ كوردستان لە هەموو وڵات بڵاوبوونەوە و بەردەوام كاسبییان كردووە و دوژمنكارییان لەگەڵ هیچ ئایین و مەزهەب و فەرمانڕەوایەك نەكردووە و هەوڵی بڵاوكردنەوەی ئایینی جوولەكەشیان نەداوە، مەگەر

ی واهەبێت خۆی ئەم ئایینەی قبوڵ کردبێت، هەر لە کۆنەوەش مەڵبەندی سەرەکییان هەولێر و موسڵ بووە، دوای ئەوەی بنەماڵەی ئەدیابین (حدیاب)، کە لە رەسەن (سکایی) بوون دەبنە جوولەکە و پاڵپشتی ئەم ئایینە، ئینجا دانیشتووانی هەولێر بەجارەکی دەبن بە جوولەکە، هەروەک مێژوونووسان (ئیریش براوەر) و (رافاییل پاتال) دەڵێن دوای ئەوەی فەرمانڕەوایانی ئەدیابین (هەولێر) لە سەدەی یەکەم دەبنە جوولەکە، ئایینی جوولەکە بووە هەڵمژینی زۆر لە ناجووەکان بۆ ناوەوەی کۆمەڵەکە، بەم جۆرە میرە هیدایەت دراوەکانیش بوونە پاڵپشتی نیشتەجێ بوونی جووەکان.

بەڵام ئەم ئیمارەتە لە کۆتایی ساڵی (١١٥)ز بەدەستی تراجان (تەرژان)ی رۆمانی دەڕووخێ و دوای ئەوەی رۆمانەکان دوو ساڵ ئەمارەتی (ئەدیابن)یان دەکەوێتە ژێر دەستی ئینجا رۆمانەکان لە لایەن ئەشکانییەکانەوە شکست دەخۆن و هەولێر دەکەوێتە ژێر دەستی ئەشکانییەکان و جوولەکەی هەولێر بەرەو مەسیحییەت دەگۆڕێن، بەجۆرێک بەر لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە کوردستان، زۆربەی دانیشتووانی هەولێر لەسەر ئایینی مەسیحی بوون و زمانی سەرەکی دانیشتووانی ئوستانی هەولێر و موسڵ و دهۆک و کەرووک و رانیە و قەڵادزێش ئارامی بووە.

جا دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام لە کوردستان جوولەکە و مەسیحی بەرەبەرە دەبن بە ئیسلام و لە بۆتەی رگەزی نوێی کورد دەتوێنەوە.

تا ساڵی ١٩٤٨ - ١٩٥١ و گەڕانەوەی ئەو جوولەکانەی کە مابوونەوە بۆ فەلەستین. دوای گەڕانەوەشیان بۆ ئیسرائیل تاکو ئەمڕۆ بەشێکی زۆریان جلی کوردی لەبەردەکەن و ئاهەنگی کوردی ئاسا دەگێڕن و گۆرانی بە کوردی دەچڕن، خۆشیان بە رەگەزی کورد دادەنێن، لەوانە (ئیسحاق مەردخای)ی وەزیری بەرگری پێشووی ئیسرائیلە، کە دەڵێت:

من کوردێکی (ئاکری)ی کوردستانم.

ئیتر ئەو جوولەکانەی کە لە کوردستانەوە لە زۆربەی گوند و شار و شارۆچکەکان لەگەڵ کوردی موسڵمان و مەسیحی و ئێزیدی دەژیان تا ساڵانی ١٩٤٨ - ١٩٥١ هیچ جیاوازییەکیان لە داب و نەریت و جل و بەرگ لەگەڵ کورد نەبوو تەنیا زمانەکەیان جیا بوو، زمانی جوولەکەکانی گوندنشینەکانیش زیاتر نزیک بوو لە زمانی کوردی، کەچی زمانی جوولەکەکانی نیشتەجێی شار بە هۆی خوێندنی تەورات و بابەتی ئایینی و کۆڕ و کۆبوونەوەی سیاسی دوورتربوون لە زمانی کوردی.

بەدووری نازانم ئەو زمانەی، کە جوولەکەکانی کوردستان تا ساڵانی بەر لە دەرچوونیان جیاوازییەکی تەواوی هەبووبێ لەگەڵ سەدەکانی رابردوو.

بۆ نموونە ناوی مرۆڤ کە لقێکە لە زمان، لە سەدەکانی رابردوو، ژمارەیەکی زۆر لە ناوی جوولەکەکان کوردی بوو، بە تایبەتی ناوی ئافرەتانیان وەک: ئەستێرە، بنەوشە، رەوشەن، نێرگز، شیرین، زارا، خۆخێ، خاتوون... هتد.

ناوی پیاوەکانیشیان زیاتر پەیوەندی بەناوی کۆنی کوردییەوە هەبوو، وەک: شینە، گابای، خەمۆ، تەتۆ، بادۆ، کوهێن، میرۆ، دەروێش، سەیدۆ، وسو، بیداوید (پیرداود)، مانی، بادۆ، جاوید... هتد.

هەروەها ژمارەیەکی زۆر لەم جوولەکانە نەیاندەویست بەرەو فەلەستین کۆچ بکەن و خۆیان بە کورد دەزانی، نەک بە گەلێکی دیکە، کەچی بە زۆر و هەزار فرت و فێڵ بۆ فەلەستین راپێچیان کردن، کە گەیشتنە فەلەستین زۆر پەشیمان بوونەوە و تاکو ئەمڕۆ بە هیوان کوردستان ئارام بێت و ببێتە دەوڵەت و بگەڕێنەوە گوند و شارەکان.

بۆ هەر کێشەیەکی دووچاری (کورد)یش بووبێ، ئەوان لەوره خۆپێشاندانیان سازداوە و هاوبەشی خۆشی و ناخۆشی کوردستانیان کردووە.

تاکو ئەمڕۆش جوولەکەکانی کوردستان لە فەلەستین هەر بەکورد دەناسرێن و گاڵتەیان پێ دەکرێت لەلایەن جوولەکەکانی رۆژئاوایی و بە گاڵتەوە پێیان دەڵێن: (کوردی) و ئیش و کاری گرنگی دەوڵەتیشیان پێ ناسپێرن، نەوەک سۆزیان هەبێت

بەرامبەر بەکێشەی کورد.

### ڕەگەزەکانی دیکەی جوولەکەش ئەمانەن

١- جوولەکەی سقاردیم: ئەوانە بە زۆری ئەو جوولەکانە دەگرێتەوە، کە لە وڵاتی ئیسپانیا و دوورگەی ئیبریدا ژیاون، بەتایبەتی لە سەدە ناوەنجییەکاندا ٤٧٦ - ١٤٥٣ز دوای ئەوەی لە ساڵی ١٤٩٩ز وەدەرنراون و لەوێوەش ڕوویان کردۆتە وڵاتانی، وەک: فەرەنسا، هۆڵەندە، ئینگلتەرە، یۆنان، باکووری ئەفریقیا و تورکیا و ئەمەریکا و وڵاتانی دیکە، جا جوولەکەکان لەم وڵاتانە توانیویانە زمان و داب و نەریت و ئایینەکەیان بپارێزن، زمانەکەشیان بە زمانی (لادینۆ) ناسراوە، کە شێوەیەکە لە شێوە زمانەکانی ئیسپانی، وشەیەکی زۆری (عیبری)یشی لەگەڵ تێکەڵاو بووە و خەتی (عیبری)یش بۆ نووسینەوەی زمانەکەیان بەکاردەهێنن.

٢- جوولەکەی ئەشکەنیزم (ئەشکنازم: ئەوانە بە بنەچە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی ئەڵمانیا و بە شێوە - زمانێکی ئەڵمانی کۆن قسە دەکەن، بەناوی زمانی (یدیش) و کەوتۆتە ژێر کاریگەری زمانی عیبری و خەتی (عیبر)یش بەکاردەهێنن لە نووسینی زمانەکەیان.

٣- جوولەکەی دۆغە: ئەم جوولەکانە بە ڕەسەن یۆنانین و لە دوای ساڵی ١٦٢٦ بە هۆی داهێنانی بیروڕایەکی نوێ لە ئایینی جوولەکە گەیشتنە وڵاتی تورکیا، هەندێک لە مێژوونووسەکانیش هەر بە ڕەسەنی جوولەکەی ئیسپانیان داناون.

٤- جوولەکەکانی پاکستان و ئەفغانستان: ئەوانەش بە ڕەسەن دەگەڕێنەوە سەر جوولەکەکانی خەیبەر، دوای ئەوەی قەڵای خەیبەر دەگیرێت، زۆربەیان بە ڕێگای دەریای سوور و زەریای هیندی، دەگەنە ئەو وڵاتانە و ئەمڕۆ ئاسەواریان لە نووسین و پەرستگاکانیان ماوە و کارێکی زۆریشیان لە کۆمەڵگای ئەم وڵاتانە کردووە، لەوانە سەرپۆشی ئەفغانییەکان لە بنەڕەت سەرپۆشی ژنانی جوولەکەکان بووە.

بەڵام ئەمڕۆ مەگەر بە دەگمەن جوولەکە لە پاکستان و ئەفغانستان مابن، ئەوەک هەموویان بوون بە ئیسلام و لە بۆتەی ڕەگەزی ئەم وڵاتانە تواونەتەوە.

### ژیان و داب و نەریتی جوولەکەکانی ئوستانی هەولێر

جوولەکەکانی ئوستانی هەولێر هەروەک جوولەکەکانی هەموو کوردستان خۆیان بەنەوەی ئیبراهیم پێغەمبەر دادەنێن، کە بەدوروبەری (٢٠٠٠پ. ز) لە وڵاتی میزوپۆتامیا چوونەتە فەلەستین، هەندێکیشیان حەزرەتی نوح بە باپیرەی خۆیان دادەنێن...

هەڵبەتە وەک ڕوون بووەتەوە ئیبراهیم پێغەمبەر لە کوردستانەوە چووەتە باشوری عێراق و پاشان بەرەو فەلەستین و میسر و جەزیرەی عەرەبی سەری هەڵگرتووە، ناوەکەی خۆشی (سەپا) بووە و لەسەر زمانی گەلانی سامی بووەتە سەفا و نازناوەکەشی "بەهرام" بووە و لەسەر زمانی گەلانی سامی بووەتە ئیبراهیم و ناوی خێزانەکەشی (سارا) بووە، کە ناوێکی هوریە و واتای (کیژێ، کچێ) دەگەیەنێت لە زمانی هوری، کەواتە ئیبراهیم لە ڕەگەزی باپیرەی کوردانە.

حەزرەتی (نوح)یش لە ڕەسەن سۆمەرییە و ناوەکەی لە تابلۆ بسماریەکان بە "ئوتوناپشتم" هاتووە، سۆمەریش چەند گەلێکی میزوپۆتامیا و زاگرۆس بوون لە ساڵانی دەوروبەری (٣٠٠٠ ساڵ پ. ز) بەرەو باشووری عێراق کۆچیان کردووە، (سۆمەر)یش واتای وڵاتی نزمایی دەگەیەنێت.

بەڵام ئەو زمانەی کە جوولەکەکانی کوردستان قسەیان پێ دەکرد، شێوە زمانێکی ئارامی نوێیە و زمانی ئایینی موسایە، ئەم زمانەش لە زمانی (بابل)ییەوە سەرچاوەی گرتووە، لەبەر ئەوەی زمانی بابلی زمانی ڕەسمی هەرسێ حکومەتی بابلی بووە، حکومەتی ئاموری، کاسی و کلدانی، هەروەها مانی بازرگانی و ڕۆشنبیران بووە بەدرێژایی ڕۆژگار تا بڵاوبوونەوەی ئیسلام، جا زمانی جوولەکەش وەک زمانی کاسی، زمانێکی کۆنی گەلانی میزوپۆتامیا و زاگرۆس بووە، زمانی ئایینی بابلی باوەشی بە ڕەگەزی کاسییەکان گرتووە و زمانی

ئارامیش باوەشی بە جوولەکەکان گرتووە.

دوای ئەوەی هۆز و تیرەیەکی زۆری کورد بەر لە زایین بە هۆی هەبوونی بۆشاییەکی زۆر لە ئایینی یەکتاپەرستی، ئایینی جوولەکە قەبوڵ دەکەن، وشە و زاراوەیەکی زۆری ئەو هۆز و تیرانە تێکەڵ بەزمانی تاگور یا شێوە زمانە ئارامییەکەی جوولەکەکانی دەبێت. بەتایبەتی وشەی کار و پیشە و جۆرەها کەلوپەل و خواردەمەنی.

ئەم زمانە ئارامییەش ئەمڕۆ لە ئیسرائیل بە زمانی کوردی ناوی دەنێ و حکومەتی ئیسرائیل هەوڵ دەدات لە بیریان بباتەوە و فێری زمانی (عیبری)یان بکات.

جا هەرچەندە جوولەکەکانی کوردستان لە ماڵەوە بەزمانی ئایینی جوولەکە دەدوان، بەڵام لە دەرەوەش بە زمانی کوردی قسەیان دەکرد، مرۆڤ هەستی پێ نەدەکرد کە لەسەر ئایینی جوولەکەن. بەڵام لە رووی داب و نەریت، هەمان داب و نەریتی کوردیان هەبوو.

جوولەکەکانی ئوستانی هەولێر تا سالانی (١٩٤٨ - ١٩٥١) و گەڕانەوەیان بۆ فەلەستین لە شار و شارۆچکەکان گەڕەکی تایبەتی بەخۆیان هەبوو، لە زۆربەی گوندەکانیش نیشتەجێ بوون هەر لە بارزان و سیدەکانەوە تا دەگەیشتە یەکاو و دەشتی قەراجی، گوندی گچکە (١ - ٣) ماڵی جوولەکەی تێدا بوو، گوندی گەورەش زیاتر و بەپێی هەبوونی کار، چونکە ئەوان زیاتر وردەواڵە فرۆش و جۆلایی و خەمچیاتیان دەکرد، ئی وا هەبوو (قەسابی)یشی دەکرد، بەڵام لە شار و شارۆچکەکان زیاتر بازرگانی و قەساب و وردەواڵە فرۆش و زێڕینگر بوون، مامۆستاشیان زۆربوو.

بەساڵاچووەکانی شەمامک دەڵێن دەوروبەری ٢٠٠ ساڵ لەمەوبەر جوولەکە زۆر گوندیان هەبووە لە شەمامک، وەک گوندی (شارە) و گوندی (شایان)، کە ئەمڕۆ ئاسەواری ئەم گوندانە لە ئاقاری گوندی عەوێنە ماوە، هەروەها گوندی کوشافیش گوندێکی جوولەکان بووە و هەمووشیان مەڕدار بوون تا ساڵی ١٩٤٨یش گوندی ساسۆن نزیک گوندی شێخ شەروان ١٠ ماڵە جوولەکە بوون، بەڵام هەموویان بۆ فەلەستین کۆچیان کرد، گوندی عەوێنەش ٢٠ ماڵە جوولەکەی زیاتر تێدابووە و (مالم)یش لە گوندی عالڵا دانیشتووە، بۆ سەلماندنی هەبوونی جوولەکە لە کۆنەوە لەم دەشتە گۆڕستانێکی گەورەی جوولەکان لە دۆڵی حەوشۆڕ نزیک گوندی چلهوێزە، کە تا بەم دواییە زۆربەی جوولەکەی دەشتی هەولێر تەرمەکانیان لەم گۆڕستانە بەخاک دەسپارد، سەرەڕای هەبوونی گۆڕستانی دیکەش وەک: گۆڕستانی جوولەکە لە مەخموور.

دایکم دەڵێت جارێک جوویێک دەمرێت منیش لەگەڵ خەڵکی ئاوایی چوومە گۆڕستانی حەوشۆڕ، دوایی ئەوەی تەرمەکەیان خستە ژێر زەوی و سەرەکەیان وەک سەکۆ لێکرد و کێلیشیان نەچەقاند، ئینجا مالم کتێبێکی گەورەی کردەوە و هەندێکی لێ خوێندەوە، ئینجا کتێبەکەی پێوەدا و هەندێک دوعای خوێند و گەڕانەوە و تازیەیان دانا، ژنی کورد وەک جوولەکەکان بۆ مردووەکە دەگریان.

باوکم دەڵێت: لە ساڵانی چلەکان جوولەکەیەکی گوندی شێخانان یەکێکیان لێ دەمرێت، لەبەر ئەوەی تاقە ماڵ بووە لە گوندی، بۆیە داوا لە یەکێکی دانیشتووی گوندەکە دەکات، کە یارمەتی بدات و تەرمەکەی بۆ بگەیەنێتە شاری هەولێر، ئەویش سێ وڵاخ دەهێنێت و یەک بۆ جوولەکەکە و یەک بۆ خۆی و یەکێکیش تەرمەکەی لێ بار دەکەن، ئینجا دوای نوێژی شێوان بەڕێ دەکەون و دەگەنە نزیک گوندی شێراوە، جوولەکەکە دەڵێت من زۆرم خەو دێت، ئەگەر ئاگات لە تەرمەکە بێت من سەرخەوێک دەشکێنم. جووە نووست و پاشان برادەرەکەشی زۆری خەو دێت و یەک لە وڵاخەکان لە دارەبازە دەبەستێتەوە، کاتێک بەخەبەر دێت نە وڵاخ ماوە و نە تەرم، بەم شەوە زۆر تەنگاو دەبێت، پاشان لە نەوراییەک دەیانبینێتەوە و لەوێ دەڵەوەڕێ و دارەبازەکەشیان لەدوای خۆیان راکێشەوە و پڕی سەر تەرمەکەشیان قەرسەقول کردووە، کابرا هەر بەخێرایی قەرسەقولەکە لەسەر تەرمەکە لادەبات و پاکی

دەکاتەوە و ولاخەکان و تەرمەکە دەهێنێتەوە شوێنی خۆی و دادەنیشێت، کاتێک جوولەکەکە بەخەبەر دێت و پێی دەڵێت ئەوە هەر دانیشتووی، ئەویش دەڵێت ئەرکی جیرانەتییە.... ئینجا بەرێ دەکەون و تەرمەکەی بۆ دەگەیەنێتە هەولێر.

لە چلەکان جوولەکەیەک لە دیبەگە بەناوی (بنۆ)، لە سەرەمەرگی بوو دەیویست شەهادە بێنێ، خزمەکانی بەخورتی پەنجەیان دەخستەوە ژێر بەرماڵەکە و نەیاندەهێشت شەهادە بێنێ و دەیانگۆت خوا لێی گۆڕیوە، لەوکاتی حەسەن ئاغا دێتە ژوورێ و ئەم دیمەنە دەبینێت و بەتوورەیی پێیان دەڵێت دەڵێی گەرێن با شەهادە بێنێ....

جا دوای ئەوەی بنۆ کۆچی دوایی دەکات دانیشتووانی دیبەگە وەک جوولەکەکان شینیان بۆ گێڕا و لە تازیەی دانیشتن و هاوبەشی خەمیان کردن.

لە زۆربەی رووداوی ناخۆشیشی دەبووایە (مالم) ئامادە بێت، وەک: مردن، تازیە و نەخۆشی و پێشهاتی کارەسات، مالمیش لە گوندی عالاڵا دادەنیشت، لەوانەیە لە گوندی دیکەش هەبوبێت، هەروەها جوولەکەکان هیچ ئاژەڵێکیان سەر نەدەبڕی، دەبووایە مالم بە چەقۆیەکی زۆر تیژ سەری ببڕێت، هەرکاتێک منداڵیشیان ببوایە، ئەوا لە دووی مالمیان رەوان دەکرد بۆ ئەوەی منداڵەکە سونەت بکات.

هەروەها لە رووی شایی و هەڵپەڕکێ و گۆرانی چڕین بەکوردی و بەکاروباری ناوماڵ و نان کردن و چێشت لێنان و میوانداری هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ کورد نەبوو، باوکم وتی لە چلەکان لە گەڕەکی جوولەکەکان جارێکیان لە حەوشەیەک شایی و هەڵپەڕکێیەکم بینی بووک تارایەکی سووری پێدادرابوو، هەڵپەڕکێیەکەیان هەمان هەڵپەڕکێی کوردی بوو و بەکوردیش بەندی شاییان دەگوت.

رۆژی شەممەش، رۆژی پشوودان بووە، دەبوایە هیچ کارێک نەکەن، زیاتر بە کۆبوونەوە و خۆشی رایاندەبوارد، لەسریشیان نەبوو لەو رۆژە ئاگر بکەنەوە، بۆیە رۆژی هەینی بەر لە خۆرئاوا بوون شیویان لێدەنا و لەسەر پەنگرە رەژوویان دادەنا تا سارد نەبێتەوە بۆ ئەوەی لە رۆژی شەممە بەگەرمی بیخۆن، تا حەوت ئەستێرەشیان نەبینیبایە، ئەوا لە شەوی شەممە لەسەر یەکشەممە ئاگریان نەدەکردەوە.

هەروەها لەکۆتایی مانگی خاکەلێوە پاییز جەژنێکیان هەبوو بەناوی جەژنی (کەپرەشینە) کە جەژنی هاتنی زستان و باران بارین و خێر و بەرەکەت و تۆبە و جەژنی سەری ساڵ بوو، جوولەکەی گوندەکانی دەشتی هەولێر، کەپرێکیان دروست دەکرد و دەیانڕازاندەوە و هێلکەی برژاوی رەنگاورەنگیان پێوە هەڵدەواسی لەگەڵ جۆرەها میوەی وشک کراوەی وەک هەنجیر و شتی دیکە و بۆ ماوەی سێ رۆژ دەمایەوە و زۆرجار لە سێ رۆژ تێدەپەڕی، چاوەڕوانیان دەکرد کەی باران ببارێت ئینجا کەپرەکە تێکبدەن، هەرسێ رۆژیش جۆرەها چێشتیان لێدەنا و لە ژێر ئەو کەپرانەیان دادەنا و زۆرجار موسڵمانیش دەیانخوارد، هەروەها دوای کۆتایی هاتنی سێ رۆژەکە بە موتفەرک هێلکە و میوەکانیان بەسەر جوولەکەکان دابەش دەکرد، هەروەها دەیاندا بە موسڵمانەکانیش، زیاتریش کچە جحێڵەکان بۆ مراز دەیانخوارد.

لە نوێژ کردنیش روویان لە خۆرئاوا، واتە روویان لە قودس دەکرد، جوولەکەکان زۆر ئازا بوون و بێ فرت و فێڵ بوون، هەرگیز نەیاندەویست فرت و فێڵ لە کرمانجان بکەن، بۆیە کرمانجیش زۆری خۆش دەویستن، جوولەکەیەک بەناوی برایمۆک یاریدەی هەموو کەسەکی دیبەگەی دەدا لە قورکاری و ئیشی دیکە، زۆرجار بە گاڵتە دەیگوت: "سەد کورە کرمانج بەرپلۆخ"، واتە سەد کورە کرمانجم بەقوربان بێت.

بەدەگمەنیش کرمانج غەدری لە جوولەکە دەکرد، ئەوەی من بزانم جارێک خزمەتکارێکی سلێمان ئاغای دیبەگە بەناوی کەریم عارەب، زێڕی سارای بووکی برایمۆکی دزی و برایمۆک لەوێ باری کرد، دەیگوت ئەمن جیرانی ئاغای بووم چۆن دەبێت دزیم لێ بکرێت، بەلام جوولەکە لە شاری هەولێر زیاتر ئازاردەدران و

دزیان لێ دەکرا.

مامۆستا نەژاد بەرزنجی گوتی: لە ساڵی ۱۹۳۹، کە مەلیک غازی کوژرا، قوتابییەکانی ناوەندی لە هەولێر وایانزانی جوولەکە مەلیکیان کوشتووە. بۆیە قوتابیان هێرشیان کردە سەر گەڕەکی جوولەکان، جا کاتێک سەیریان کرد هەر ماڵە و ئالایەکی رەشیان هەڵکردووە و خەمباری خۆیان نیشان دەدەن بەرامبەر بە کوشتنی مەلیک غازی نارەزایی دەردەبڕن، قوتابییەکان تێگەیشتن کە جوولەکە دەستیان لە کوشتنی مەلیک غازی نەبووە و ئەوانیش بەم کارەساتە نارازین.

**پەراوێزەکان:**

* جوولەکە، ناوێکی جوگرافییە لە وڵاتی فەلەستین، کاتی خۆی ناوی ناوچەیەکی کەنعانیان بووە، دواتر بە هەموو ئەو کەسانە وتراوە جوولەکە، کە چوونەتە سەر ئایینی موسا، واتە جوولەکە بەرامبەر بە یەهودی بەکاردێت، هەروەها یوسف کوڕی یەعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی ئیبراهیم لە ساڵی (١٧٤٥پ.ز)، لە وڵاتی میسر لە دایک بووە و لە خاکی ئیسرائیلیش کۆچی دوایی کردووە، کە دەکەوێتە باکووری فەلەستینی ئەمڕۆ، هەروەها ئیسرائیل نازناوی (یەعقوب)یش بووە، لە رووی زمانیش ئیسرائیل واتای (خوداوەند دەجەنگێ) دەگەیەنێت، وەک ناسناوێکیش بۆ ئەو دەوڵەتەی کە لە باکووری فەلەستین دروست بوو بەکار دەهات.

* شاسوار هەرشەمی دەڵێت: لە سەردەمی سلۆکییەکاندا ٣١١ - ٢٤٩پ. ز حاکمی هەولێر (ئادیابین) ناوی یەزدین بووە، لە رەگەزی سکاییەکان و دەبێتە یەهودی، دواتر هەموو دانیشتووانی هەولێر دەبنە یەهودی و دوابەدوای ئەو (هیلینا)ی کچی و (مونازس)ی کوڕی یەک لەدوای یەک دەبنە حاکمی هەولێر، ناوی هیلیناش ناوێکی یۆنانییە و موزوس و ئیزاتیس دوو ناوی (سکایی)ن و (عەزە)ش کوڕێکی دیکەی ئیزاتیسە ناوێکی عیبرییە، کە شاری عەزەی بەناو کراوە، کە ئەمڕۆ بەشێوەی گوندێک ماوە، لەناوی (غەزە)ی ئیسرائیل نزیکە، پاشان شاسوار دەڵێت: دانیشتووی هەولێر لە ساڵی (٢٣ - ٢٢پ. ز) لە ئایینی جوولەکە چوونە سەر ئایینی مەسیحی، کەواتە مەسیحی ئەمڕۆی شاری هەولێر لە رەگەزی سکایین، کە بەشێکن لە مادەکان، شاری هەولێریش تا ساڵی ١٩٤٨ - ١٩٥١ بەشێکی دانیشتووانی جوولەکە بوون و لە گەڕەکی تەعجیلی جوولەکان نیشتەجێ بوون و دوو (کەنیسە)شیان هەبوو، کە ئەمڕۆ بوونەتە مزگەوت و کلدانی و ئاسوورییەکانیش لە پشت پارێزگای کۆن (بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی ئەمڕۆ) لە گەڕەکێک نیشتەجێ بوون و کەنیسەیەکیشیان هەبوو، هەروەها لە نزیک مزگەوتی شێخی چۆلی (دێر)ێکی مەسیحیان هەبوو بەناوی دێر بڕیشە تا کۆتایی سییەکانیش کاولگەکەی هەرمابوو، لە رۆژئاوای پارێزگای ئەمڕۆکەش ژمارەیەک لە خێزانی ئەرمەنی و سابیئە نیشتەجێ بوون، دانیشتووانەکانی دیکەی شاری هەولێریش هەندێک بە زمانی کوردی دەدوان و هەندێکیش بە زمانی تورکمانی.

دوای راپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێر ١٩٥٣ بڕیارێک لەلایەن میری دەرچوو بۆ ماوەی دوو مانگ لە مانگی ٩ ا مانگی ١٠ بۆ ئەو کەسانەی، کە ناوی سەربازییان هاتووە، دوای مەشق کردنی سێ مانگ دەتوانن بەبڕی (٥٠) پەنجا دینار خۆیان بکڕنەوە.

جووتیارەکانیش ساڵەهای ساڵ بوو سەربازییان نەدەکرد و ساڵانە پارەیان بە ئاغا دەدا، تا خەبەریان لێنەدا و لە گوندی دەریان نەکات، جا کە جووتیاران دژی ئاغا راپەڕین دەوروبەری (٤٠٠٠) چوار هەزار کەس بوونە سەرباز لە سەربازگەی هەولێر، کە زۆربەیان دانیشتووی گوندەکانی دەشتی هەولێر بوون و ئەوی دیکەش خەڵکی ناوچەکانی دیکەی هەولێر بوون، دەوروبەری (٦٠) کەس لەمانە عارەبی قەراج و شەمامک بوون، ئەوانیش هەر بە کوردی قسەیان دەکرد.

جا ئەم سەربازانە بۆیان نەبوو لە سەربازگە بمێننەوە، بۆیە دوای نیوەڕۆ دادەبەزینە نێو شار و کاریگەرێتی زۆریان لە دانیشتووانی نێوشار کرد، هاوکات لەگەڵ ئەمە حکومەتی

مەلەکی لەهەر گوندێکی ئەم دەشتە (٥ - ٦) ماڵی شۆڕشگێڕی دژ بە ئاغای دەربەدەر کرد، ژمارەیەکی کەمیان چوونە پردێ، دوبز، حەویجە، کەرکوک، ئەویدیکە هەمووی هاتە نێو شاری هەولێر، کە ژمارەیان دەوروبەری (١٠٠٠) هەزار ماڵ دەبوو، یەکسەر زەویان دەکڕی و خانوویان دروست دەکرد و دەستیان بە کاسبی دەکرد، جا ئەم هەزار ماڵەی دەشتی هەولێر بوونە پێشەنگی فراوان بوونی شاری هەولێر زیندوو کردنەوەی مۆرکی کوردایەتی لەم شارە ئیتر لەوکاتەوە شاری هەولێر و بەردەوام لە فراوان بووندایە.

* ئەحمەد سووسە دەڵێت: شای میرنشینی ئادیابینی (حدیاب) ناوی (ئەزاتی یەکەم) بووە و ژنەکەشی ناوی هیلینا بووە، ئەمانە جوولەکە بوون دواتر بە دەستی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی (تراجان) لەناوچووە، پاشان ئەحمەد سووسە دەڵێت: بنەماڵەی فەرمانڕەوایی حدیاب بوون جوولەکە، دکتۆر (گرانت)یش پێی وایە کوردان دەچنەوە سەر رەگەزی جوولەکە.

**عیبری:** عیبری زمانی حەزرەتی موسایە و دواتر بووە بە زمانی ئایینی موسا، مێژووی عەرەب گەلانی ئارامی دەڵێن کاتێک، کە موسا لە میسروە کۆچی کرد بۆ فەلەستین و دەریای سووری کەوتە پێش دوعای کرد دەریایەکە شەق بوو بە ئاسانی موسا و هاوەڵەکانی دەربازبوون، واتە عیبری کە واتای دەربازبوون دەگەیەنێت و لەوەوە هاتووە.

بەڵام هەندێک لە مێژوونووسان دەڵێن عیبری وشەیەکی هوری کۆنی کوردستانە و لە (ئیبر، هیرود) بەواتای بەرێز هاتووە و جاران لە وڵاتی سوبارتوو لە ساڵانی هەزارەی دووەمی پێش زایینی دەکەوتە بەردەم ناوی خوداوەندەکان.

هەروەها میتانی و فیرعەونییەکانی شانشینی تازەی میسر، (برا) یان (ئیبوری)یان دەکردە نازناو بۆ پادشاکانیان، ئەم نازناوەش نازناوێکی گەلانی کۆنی کوردستان بووە، شاسوار هەرشەمی دەڵێت: بە گوێرەی دەقەکانی تەورات، ئیبراهیم باپیرە گەورەی جوولەکانە و لە تەورات بە ئیبرهیم ناوی هاتووە، گریکەکانیش پێیان گوتووە هیبرایۆسی یان هیبری، ئەم ناوەش دواتر لە زمانی عەرەبی بووەتە عیبری.

* دوای فەتحکردنی کوردستان لەلایەن سوپای ئیسلامەوە هەموو ئایینێک بەربەرەکانی دەکرا، بۆیە ئایینی جوولەکەش بە تەواوی لە گەشەکردن راوەستاوە و بووەتە ئایینێکی داخراو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش ئی وا هەبوو دەبوو بە جوولەکە، بۆ نموونە دوو کەس لە گوندی گرمامک لە ساڵانی سییەکان بەناوی وەسمان ساڵح و مەولود ئیسماعیل لەسەر دەستی خواجەخنۆ حاخامی ئاکرێ دەبن بە جوولەکە و ژنی وەسمان ساڵح قەبوڵی نەکرد ببێ بە جوولەکە، بۆیە ژنەکەیان لێ گێڕاوە.

* لەناودارەکانیان کە خزمەتی کوردی کردبێت نیگارکێش مامۆستا دانیال قەسابە و ماڵەکەی هەمیشە پڕ بووە لە هونەرمەندانی کورد، مامۆستا دانیال زۆر کەسی کردە نیگارکێش، کوردستانی زۆر خۆش دەویست، بۆیە هەمیشە لە تابلۆکانی هەرجارەی دیمەنێکی کوردستانی دروست دەکرد، جارێکیان بە مامۆستا دانیالم گوت: مامۆستا ئەم قوتابییانەی خزمی تۆ (چەند قوتابییەکی جوولەکە بوون لە پۆلەکەی مامۆستا نەژاد) کتێبێکیان لە باخەڵدایە و وێنەی پیاوێکی ردێن گەورەی لەسەرە، جار جارە دەبینم ئەم کتێبە لە باخەڵیان دەردەهێنن و ئەم وێنەیە ماچ دەکەن... نازانم ئەمە کێیە....؟

مامۆستا دانیالیش گوتی: ئەوە باپیرە گەورەمانە، ئێمە باپیرە گەورەی خۆمان خوشدەوێت، بەڵام تۆ نیگارکێشێکی باشی حەقت بەسەر ئەو شتانەوە نەبێت.

* ئادیابێن یا ئەدیابێن (حدیاب) واتای خاکی نێوان دوو رووبار دەگەیەنێت.

* دوور نییە ناوی گوندی تەرجان لەناوی پادشای رۆمان (ترژان - ترجان) هاتبێت و لەم ناوە سوپاکەی تراجان سوپای جوولەکەی حدیابی شکاندبێ، ناوی گوندی (کوشاف)یش نزیکە لە ناوی عیبری (موشاف - کۆمەڵگە - مستوطن) و کلکەی بێجانی چیایی قەرەچووخیش

دوور نییە بەناوی مرۆڤێکی جوولەکە کرابێت، چونکە جاران جوولەکەی کوردستان بەناوی بێجان ناو دەنران.
* جوولەکەکانی ئێران و ئەفغانستان بە زمانی فارسی دەدوان.
* کەپرەشینە: ئەمڕۆش جەژنی کەپرەشینە لە ئیسرائیل ساڵانە لە پارکێک یادی دەکەنەوە و چەند ڕۆژێک درێژە دەکێشێ و ئاهەنگی کوردی تیا دەگێڕن و شایی و هەڵپەرکێی کوردی و بەکوردیش گۆرانی دەچڕن، ئەم جەژنەش ئەمڕۆکە لە ئیسرائیل بە جەژنی کوردی ناسراوە، جوولەکەکانی هەڵەبجە یادی جەژنێکی دیکەشیان بەناوی (چەقالە) دەکردەوە.
* لەسەرژمێری ساڵی ١٩١٨ - ١٩١٩ ژمارەی جوولەکەکانی ویلایەتی موسڵ ١٤/٨٣٥ کەس بووە، لە ویلایەتی بەغدایش ژمارەیان ٨٧/٤٨٨ کەس بووە. دابەش بوونی جوولەکەی ویلایەتی موسڵ بەم جۆرە بووە: ٧/٦٣٥ موسڵ، ٤/٨٠٠ هەولێر، ١/٤٠٠ کەرکووک، ١٠٠٠/ سلێمانی.
لە ساڵی ١٩٤٧ لیژنەی ئەنگلۆ ئەمریکی سەرژمێری جوولەکەی کوردستان (ویلایەتی موسڵ)ی بە ١٨/٠٠٠ کەس داناوە.
* ئەشکنازم: یەک لە کوڕەکانی حەزرەتی (نوح) ناوی ئەشکنازم بوو، کاتی خۆشی گەلێک و ناوچەیەک لە باکووری ڕووباری فورات لە ئەرمینیا بەو ناوە هەبوون. ئەشکنازمییەکانیش ئەمڕۆکە تەمسیلی کۆمەڵگای ئیسرائیل دەکەن.
* سەفاردیم: کاتی خۆی ناوی ناوچەیەک بووە لە باکووری فەلەستین.
* دوور نییە جوولەکەکانی کوردستان بەر لەوەی بچنە سەر ئایینی جوولەکە زۆربەیان ئەستێرەیان پەرستبێ، کە ئەمڕۆ لە ناوی ئافرەتان و هەندێک لە داب و نەریتەکانیان ناوی ئەستێرە ڕەنگی داوەتەوە، بۆ نموونە لە ڕۆژووشکاندن تا ئەستێرە هەڵنەیەت ڕۆژوو ناشکێنن و تا حەوت ئەستێرەش نەبینن شەوانی یەکشەممە ئاگر داناگیرسێنن، سەرەڕای ئەوەی هەڵکەندنی وێنەی ئەستێرە لەسەر هەندێک دەرگا نزمەکانی پەرستگاکانیان، بۆ ئەوەی لە چوونە ژوورەوە سەری خۆیان بۆ ئەستێرە بچەمێننەوە.
* شاری موسڵ لە کۆنەوە ناوەندێکی بەرزی خوێندنی باڵای جوولەکەکانی ڕۆژهەڵات بووە.
* بۆ سەلماندنی کورد بوونی جوولەکەی کوردستان، دانپێدانانی جوولەکەکان خۆیان بە کوردایەتیان، لە بەرنامەیەکی کەناڵی ئاسمانی تەلەفزیۆنی میدیا، دیمانەیەک لەگەڵ جوولەکەکانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان لە ئیسرائیل کرا، کە ژمارەیان لە ١٠٠/٠٠٠ سەد هەزار زیاترە - هەموویان خۆیان بەکورد دەزانی، بەردەوامیشن لەسەر درێژەپێدانی کلتووری کوردی لە وڵاتی ئیسرائیل حیساب بکرێن.

سەرچاوەکان:

١- جوولەکەکانی کوردستان، ئەحمەد باوەڕ، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠.
٢- مێژووی جووە کوردەکان، نووسینی ئیریش براوەر و رافایل پاتال، و. لە ئینگلیزییەوە: زەردەشت موکریان، گۆڤاری سەنتەری برایەتی، ژ١٧.
٣- گۆڤاری گوڵانی عەرەبی، ژ٢٨٠، ١٩٩٨.
٤- اثر الأقلية اليهودية في سياسة الدولة العثمانية تجاه فلسطين، د. احمد وري النعيمي، بغداد، ١٩٨٢.
٥- کورد و جوولەکەکانی ئیسرائیل، ساسۆن، گۆڤاری یەکبوون، ژ١٤، ساڵی ٢٠٠٠.
٦- یەک لە کەناڵەکانی سەتەلایتی ئیسرائیل.



# جوولەکەکانی ناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێر

هوشیار عەبدوڵڵا

لە وڵاتی عێراق و هەرێمی کوردستانی عێراقدا ژمارەیەکی زۆر لە جوولەکەکان لە زۆربەی شار و گوند و شارۆچکەکاندا تا دوا ساڵانی چلەکانیش دەبینران، پاش ئەوەی قەوارەیەکی سیاسییان لە فەلەستین بۆ دامەزرا، بە گوێرەی پەیمانی بەلفۆری ساڵی (١٩١٧ز) بەرەبەرە جوولەکەکانیان لە وڵاتانی جیهان رەوانەی فەلەستین کرد، یەکێک لەو وڵاتانەش عێراق و هەرێمی کوردستان بوو، کە ژمارەیەکی زۆر جوولەکەی تێدابووە، دەڤەرەکەی ئێمەش یەکێک بووە لەو دەڤەرانە، بەئەرکی سەرشانی خۆمم زانی کە شتێک لەبارەی جوولەکەکانی ناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێر بنووسم بۆ ئەوەی نەوەی ئێستامان شتێک لەبارەی جوولەکەکانی وڵاتی کوردەواری و دەڤەرەکەمان بزانن. لە گوندەکانی دەشتی دزەییایەتیدا ژمارەیەک لە جوولەکەکان هەبوون. لە هەر گوندێک چەند بنەماڵەیەک دەژیان بە زۆری بەکاری خەمچیاتی و رەنگ و ریس رەنگ کردن و جولایی و دروستکردنی جاجم و دووگرد و تێر و کوتاڵ فرۆشتن و عەتاری و بەرگدروو و زێرینگری خەریک بوون، جوولەکەکانی ناوچەی دزەییایەتی لە گوندەکانی "دەشتی ملکیە" و "دەشتی پشترێ" و "دەشتی شەمامک" و تەنانەت گوندێکیان بەناوی "شابان شارە" هەبووە، لە شارۆچکەی "دیبەگە" و دەوروبەری و ناوچەی کەندیناوە و لە شارۆچکەی مەخموور و دەشتی قەراجێ بلاوبوونەوە، ژمارەیەکی زۆریشیان لە دەشتی بەرانەتی و ناو شاری هەولێردا دەژیان، تەنانەت گەرەکێک بەناوی تەعجیل بەشێکی جوولەکە بوو، کە بەناوی "تەعجیل یەهود" بەگەرەکی جوولەکەکان ناسراو بووە.

لەوانەیە پرسیار بکەن بڵێین: ئەدی ئەو جوولەکانە چۆن کەوتوونەتە وڵاتی عێراق و هەرێمی کوردستان؟ مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کەوا لە زەمانی ئاشوورییەکاندا پاشایەکی بەهێزیان هەبووە، ناوی "سەرجۆنی ئاشووری" بووە، ئەم پاشایە شاری (سامرە)ی لە فەلەستین داگیر کردووە، جوولەکەیەکی زۆری لێدەرکرد و بردنی بۆ نەینەوا و وڵاتی میدیا، ئەم جوو گواستنەوەیەش لە مێژوودا پێی دەڵێن "دیلایەتی جوولەکەکان بەدەست ئاشوورییەکانەوە".

نەبوخەزنەسری دووەم (٦٠٤پ. ز - ٥٦٢پ. ز) پاشای وڵاتی بابل لەشکرێکی بەهێزی نارده شاری (یەهودا - قودس) لە فەلەستین و لە ساڵی(٥٩٧پ. ز) و داگیری کرد، ژمارەیەکی زۆری لە جوولەکەکان بەدیل گرت و هێناونییە بابل، ئەمەش لە مێژوودا ناوی (یەکەم دیلگیری بابلی) لێدەندرێت، لە ساڵی (٥٨٦پ. ز)دا جوولەکەکان دووبارە کەوتوونەتەوە سەر ملکەچ نەکردن و سەرکێشی، بۆیە جارێکی دیکە نەبوخەزنەسر پەلاماری شاری قودسی داوە و داگیری کردووە، ئەم جارەیان (٤٠٠٠٠) چل هەزار جوولەکەی بەدیل گرتووە و هەموویانی هێناوەتە شاری بابل، ئەمەش لە مێژوودا بە (دووەم دیلگیری بابلی) دادەنرێت، پاش ئەوەی بابلییەکان بەدەستی ئەخمینییەکان لەناوچوون، ئەو هەموو (دیله جووانە) بەناو گوند و شار و شارۆچکەکانی وڵاتی عێراق و کوردستان بڵاوبوونەتەوە.

ئەمەش ناوی ئەو گوند و شار و شارۆچکانەیە لە ناوچەی دزەییایەتی دەشتی هەولێر کە جوولەکەکانی تێدا ژیاوە: لە گوندی سۆربەشی خدری پاشای ٤ - ٥ ماڵێک هەبوون، لەوانە ماڵی (ئیسحاق)ی بوو، ئەو پیاوە ردێنێکی گەورە و درێژ و پانی هەبوو ٣ - ٤ کوڕی هەبوو، یەکێکیان ناوی سلێمان بوو لە شاری هەولێر نیشتەجێ بوو، پاشان هاتەوە گوندی سۆربەش خەجیاتی دەکرد.

ماڵێکی دیکەیان (مکاییل) بوو بەکاری عەتاری خەریک بوو، وردەواڵەی دەفرۆشت، وەکو خرێلە و سنجاق و دەرزیلە و بنێشت و سابوون و شتی دیکە.

ماڵێکی دیکەیان ماڵی (بنیامین) بوو، کوڕێکی ناو سەلیمی هەبوو، ژنەکەی ناوی گورجی بوو، هەروەها ماڵی (حەنۆکە)ش لەوێ بوو (شیرین)ە جوو هەبوو، ماڵی لە هەولێر بوو، بێوەژن بوو، ٢ - ٣ منداڵی لە پیاوە جووەکەی هەبوو، مام حاجی حەسۆ لە گوندی سۆربەشی دادەنیشت سەرکاری خدری پاشای بوو، دێتە هەولێرێ، لەوێ لەگەڵ خوشکە شیرینی رێک دەکەوێت و بۆی دەبێتە موسڵمان و مێردی پێدەکات و هینایەوە گوندی، چەند ساڵێکی لەگەڵدابوو کوڕێکی بەناوی (تەها) و کچێکی بەناوی (ستیلە)ی لە مام حاجی حەسۆ هەبوو، لە کاتی رۆیشتنی جوولەکەکان لە کوردستاندا بۆ فەلەستین پلکە شیرین بەبیانووی ئەوەی سەر لە منداڵەکانی دەدات، دێتە هەولێرێ و لەوێ بەگەڵ منداڵەکانی دیکەی دەکەوێت و لەگەڵ جوولەکەکان دەڕوات، مام حاجی حەسۆ و هەردوو منداڵەکانی بەجێ هێشت و بوودە (جوولەکە). هەنووکەش کاک تەها ماوە و لە شاری هەولێر نیشتەجێیە، لە گوندی سۆربەشدا هەندێ کەس فێری زمانی جوولەکان ببوون، بە حوکمی ئەوەی لەکاتی منداڵییاندا لەگەڵ منداڵانی جوولەکەکان یاری و گەمەیان دەکرد و جیرانی یەکتر بوون و هاتوچۆیان بەسەریەکەوە زۆر بووە، لەوانەی زمانی جوولەکەیان دەزانی خوالێخۆشبوو مام حاجی وەستا ئەمین و دادە فاتم بووە.

لە گوندی (قازیخانە)شدا ٣ - ٤ ماڵێک هەبوون، لەوانە بنیامین دوو خوشکی هەبوو، بەناوی سورامی - ئەستێر، ماڵێکی دیکەیان ماڵی (سالحۆکی) بوو، مەلا ئۆمەر ئەحمەد ناوێک خەڵکی گوندی قازیخانەی ژنیشی هەبوو ناوی بەسێ بوو، هەستا لە گوندی شێخانان کچە جوولەکەیەکی بەناوی بەسێ هەڵگرت و هینایەوە گوندی و ژنەکە موسڵمان بوو.

لە گوندی شێخانان سەلیمۆکە جوو هەبوو، ماڵی لەوێ بوو عەتاری دەکرد، هاتوچۆی پردێی دەکرد لە گوندان دەگەڕا، رۆژێکیان لە بەینی شارۆچکەی پردێ و شێخانان زۆر بەنامەردی کوشتبوویان و سەربڕیبوو.

لە گوندی (قورشاغلو - قشاغلو)شدا چەند ماڵێک هەبوون، لەوانە ماڵی (مۆشی) بوو، ژنەکەی ناوی مەتان بوو، دوو کوڕ و دوو کچی هەبوو، کوڕێکیان ناوی عەبدوڵلا بوو دەستێکی نەبوو، سیمۆن زۆر قۆز و لاو چاک بوو، خوشکێکیان ناوی عەزیزە بوو، کچێکی زۆر ناسک و جوان و شۆخ و شەنگ بوو، گەنجێک لە گونددکەدا هەبوو

ناوی کەریم مامز بوو دڵی بە کچەکەوە بووە، دەگێڕنەوە دەڵێن هەموو جارێک لەبەر خۆیەوە دەیگوت

**ئەی عەزیزە جوو چاو پێر و تەرازوو**
**لەگەروان ئاوا دەبوو لە خۆفی خوای نەبایە**
**دەهاتمە سەر دینی توو**

سیمۆن هەستا وەکو کرمانجەتی دەشتی دزەییاتی ژن بەژنی بە عەزیزەی خوشکی لەگەڵ کابرایەکی جوولەکەی دانیشتووی گوندی (عاللا)ی ناوچەی کەندیناوەی کرد و ژنی هێنا، ژنەکەی ناوی سوڵتانە بوو، پاش ٦ - ٧ رۆژان بەسەر ژنهێنانەکەیدا تێپەڕیبوو سیمۆن لە گوندان دەگەڕا بۆ رەنگ کردنی و ریس لە گوندەکانی بناری (زوورگەزراو) لە بەینی ئاقاری هەردوو گوندی قازیخانە و باشتەپەدا بزربوو و تاوەکو ئێستاش کەس نەیزانی چی بەسەرهات.

لەم بارەیەوە دایکم (عازیە کەریم عەبدوڵلا) لە دایک بووی ساڵی ١٩١٧ز بۆی گێرامەوە گوتی: دێتەوە بیرم نازانم چ ساڵێک بوو، کوڕێکی جوولەکە هاتە گوندەکەمان (سیمۆن)یان پێ دەگوت بەکاری رەنگ و ریس کردن خەریک بوو، دەگەڕا لە گوندان ریسی دەکردەوە بە پارە بۆ خەڵکی رەنگ دەکرد، لە ئاقاری نێوان گوندی باشتەپە و قازیخانە و ئەو دەوروبەرەدا بزر بوو، تاوەکو ئێستاش کەس نەیزانی چی بەسەرهات، پاش یەک دوو رۆژان پیرە بابێکی هەبوو لەگەڵ برایەکی دەست گۆجەدا هاتنە دوو سۆراغی لەو گوندانەی بناری زوورگەزراودا دەگەڕان، بەڵام سەد حەیف و مەخابن... هیچ شتێکیان دەست نەکەوت و بەدڵ ساردی گەڕانەوە گوندی قشاغلوو، ئامۆزایەکی ئەو (سیۆن)ە ناوی حوجرە بوو کوتاڵی دەفرۆشت، لە ئاقاری گوندی (عەولافات)ی ناوچەی کەندیناوەدا هەستا بووە موسڵمان، خەڵکی گوندی باروبوویەکی زۆریان کرد، بەتایبەتی ئاغەی پاشای، بەڵام لەدواییدا هەڵگەڕایەوە و بوودوە جوولەکە و هاتەوە هەولێرێ.

عوسمان فەقێی کێخوا حوسێن، خەڵکی گوندی سۆربەش لە دایکبووی ١٩٣٢ز بۆی گێرامەوە گوتی: ماڵە جوولەکەیەک لە گوندی قشاغلوو هەبوو، ناوەکەی نایەتەوە بیرم بەکاری زێرینگری خەریک بوو، لە شاری هەولێرێ هاتبووە گوندەکەمان، کورتەک و شەڕواڵی لەبەر دەکرد و هەوری لەسەری دەنا، کوڕێکی قۆز بوو، دەنگێکی خۆشی هەبوو، حەیرانی دەگوت، یەکێک لەو حەیرانانەی کە تا ئێستاش هەر لەیادم بێت ئەو حەیرانەی خوارەوەیە.

(حەیران بەستۆرە بە کەپرە مێلە، خەناوکەی زەردە، سەدەف خەسێلە، لەبەر شێ مەحەمەداغەی وەراشێ، کابایزاغەی زراری، ئەو حاکمی کسۆکباب، لەبەر خاتری نازێ و مەربێلی کوڕەتیمە حەیران ئیعدام ناگۆلی)، ئەگەر تەماشا بکەین هەندێ وشەی بە زمانی جوولەکەی تێدایە وەکو مێلە بەمانای مێو - خەسێلە - ناگۆلێ.

گەلەک جاران لەگەڵ منداڵەکانیان بەشەڕ دەهاتین دەکەتینە دوویان دەمانگوت:

**هەدەیسی، دەیسی، دەیسی**
**گوو بە گۆڕی عەدەیسی**

(عەددس - عەدەیس) وا دیارە گەورەی جوولەکەکان بووە لە وڵاتی عێراقێ، (٢) دوو ماڵی دیکەیان بەناوی (ونسن) و (موسا) هەردووکیان برا بوون، ونس ژنەکەی ناوی مریەم بوو، جۆلاییان دەکرد، جاجم و بەرماڵ، لە گوندی ئۆمەراوەی نزیک شارۆچکەی پردێ ئەو گوندەش سەر بەناحیەی قوشتەپەیە (٣) سێ ماڵە جووی تێدا بوو، لەوانە ماڵی (دانیال)ی بوو، کەوا و سەڵتەی لەبەردەکرد، عەتاری دەکرد، ماڵی یەعقوبی ژنەکەی ناوی خوچێ بوو، ماڵی داودە جووی خێزانەکەی ناوی خاتون بوو، کوڕەکەی ناوی شالۆم بوو، زەلامێکی درێژ بوو، داود کچێکی جوان و شۆخ و شەنگی هەبوو ناوی بەسێ بوو، رەحمان حاجی حەمە ساڵحی خەڵکی گوندەکە خۆشی دەویست، هەڵیگرت و بردییە گوندی (قووچ)ە لە ناوچەی کەندیناوە، جوولەکەکان خڕبوونەوە و هەموویان هاتنە گوندی ئۆمەراوەی بۆلای ئاغای گوندی، خوالێخۆشبوو برایمی عەلی حەمەدی شکاتیان کرد،گوایا کاک رەحمان بەزۆر کچەکەی فڕاندییە، برایمی عەلیش گوتی: بابە کچەکەتان بە ئارزووی خۆی بەگەڵی کەوتووە و موسڵمان بووە، ئەگەر دەشڵێن بەزۆری بردوویەتی، ئەوە ئەمن دەنێرمە دوویان و دەیانهێنمەوە و بزانن خۆی بەگەڵی کەوتووە یان نا؟

ئەگەر کچەکەی خۆشتان پێ ئیقناع دەکرێت ئەوە بیبەنەوە، گوتیان باشە، برایم عەلی پیاوی نارده دوویان،

كـاک رەحـمـان و (بەسێ)ی لە گـوندی قـووچی هێنایەوە ئۆمـەراوەی، لەوێ خـاتوونی دایكی چەندی هێنا و برد كچـەكـەی خـۆی پێ ئیـقناع نەكرا كـچـەكـە گـوتی من بە ئارەززوی خۆم مێـردم پێكردووە و تازە موسـلـمـان بوومە و نایەمەوە، ناچار وازیان لێهێنا.

هەروەها لە گـوندی (گـردمـەلا)ی رۆژهەلاتی ناحیـەی قـوشـتـەپەش (٢) دوو مالە جوو هەبوون، برا بوون، مـتی (لارۆ)ی كـورێكی بەناوی مـشـكـۆ و كـچـێـكی بەناوی گورجی هەبوو، مشكۆ زۆرجاران دەبووە موسلـمان و پاشان دەگەرایەوە سەر دینەكەی خۆی، برایەكەی دیكەی (لارۆ) بووە مـوسـلـمـان و ناویان لێنا فـەقێ عـەولا، بەراستـی موسلمان بوو، پیاوێكی خواناس و سەر راست بوو، لەگەل كـاری جۆلایی و رەنـگ و ریس كردن خـەریک بوو جاجم و بەرمـالی دروست دەكـرد، لەبەر سـەر راسـتـی و دەست رەنگینی خۆی لە هەموو لایەكەوە خەلـک روویان تێدەكرد، لە ئاخـر و ئۆخـری سـالانی چلەكـاندا كـاتێـک حكومـەت جوولەكانی رەوانەی فەلەستین كرد مالی (لارۆش) چوونە فـەلەسـتـین، مـام فـەقێ عـەولاش مـالی هاتە هەولێـر و لە گـەرەكی سـەیداوە نیشـتـەجێ بوو، هەر بەكـاری جوولاییـەوە خەریک بوو، هەر لە هەولێریش كۆچی دوایی كردووە.

هەروەها لە دەشـتە رەنگینەكەی (پیرە قـەراج)یش و لە شـارۆچكەی مـەخـمـووریشـدا چەند مـالە جـوولـەكـەیەک هەبوون، لەوانە مـالی دانۆی (دانیـال)، مـالی یوسی - مـالی خدرۆكی هەرسێكیان برا بوون، خوشكێكیان هەبوو ناوی شـۆرێ بوو، بەدوو مـەلا رەحـمـانی حـەمـەد حوسـێنی گـوندی دووگـردكـانی قـەراجی كـەوت، كـە بووە مـوسـلـمـان ناویان لێنا فـاتم، هەنووكەش هەر ماوە و لە شـاری هەولێر لە گەرەكی كووران نیشـتـەجێیە.

مـالێكی دیكەیان مـالی خدرۆكە جوو بوو، ریشـێكی سـپـی و پان و درێژی هەبوو، ژنەكـەی ناوی رەحـان بوو، كـورێكی هەبوو ناوی سـەلمان بوو، لە شـاری هەولـێـرێ دادەنیـشـت بە دوكـاندارییـەوە خـەریک بوو، ناوە ناوە سەردانی مالی باوكی دەكرد و دەهاتە مەخمـوور، خدرۆک (٥) پێنج كچی هەبوو بەناوی سورامی، ئەستێر، ئاسـک، سەبحە، مـەلكە، خـمـچیـاتیـان دەكـرد، مـالێكی دیكەیان مـالی (ینحـاس)ی بوو، پیـاوێكی پیر بوو، ژنەكـەی ناوی خاتوون بوو، ژنێكی جاحێل بوو، هەستا بەدوو رەفیق مەلا مـحـەمـەدی كـەوت، رەفـیـق برای مـەلا غـەریبی مـەلا مـحەمـەدی چنێـرانی بوو، كـاتی خـۆی ئەو بنەمـالەیە لە گوندی چنێرانی نزیک شـەقلاوە و لە ناوچەی خۆشناوەتی كەوتبوونە مـەخـموور، مەلا محەمەد كـاری عەریزەنووسی دەكرد، پاشان كە جوولەكەكان رۆیشتن ئەویش بەگەلـیـان كـەوت بۆ فـەلەسـتین، مێـردەكـەی بەجێ هێـشت، كـچێـكی دیكەیان ناوەكەی نایەتەوە بیرم بۆ حوسێن وسوی خەلكی گوندی خەزنەی دەشتی قەراجێ موسلمان بوو.

لە دەڤـەرەكـەمـاندا چەند پەندێكی پێـشـینان لەسـەر جـووان هەیە، یەكـێـک لەمـانە دەلـێن: (لە مـاری جـووان بخۆن، لە ماری دیانان بنوون). موسـلمانەكان هەموو جۆرە خـواردەمـەنیـیـەكی جـوولەكـەیان دەخـوارد، خـۆ ئەگـەر كرمانجەتی دەشتی دزەییـان بهاتانایە شـاری هەولێر بۆ كەل و پەل كرین ئەوە شوێنی دیكەیان نەبوو، تەنیا مالە برادەرە جـووەكـانیـان نەبێ، ئەوانەی كـە مـامـەلـە و پەیوەندییـان پێكەوە هەبوو شـەوانە مـیـوانیـان دەبوون و بە كـەمـالی سەلـتەنەت لێیـان پالدەدایەوە و دەنووستن، هەولێرییـەكـان زۆربەیان عـادەتیـان وابوو، مـیـوانیـان نەدەبردەوە مـالێ، پەندێكی دیكەش هەیە دەلـێن (دەرێی جـووە) یا (خـۆ نەبوویتە جوولەكە) یان (دەرێی جوولەكەیە).

شـایان شـارە (شـەعبـان شـارە): ناوی گـوندێكی كـۆن بووە، كـەوتبـووە دەشـتـی ملكیـەی، لە بناری زوورگـی (زوورگەزراو) هەلكەوتبوو بەدیوی ملكیەی، ئاقاری لەگەل ئاقاری گوندەكانی شێخ شەروان - ماستاوە - سەیداوە - عـەوێنە لە سـەریكە لایەكـیـشی زوورگی (زوورگـەزراوە)، لەوێ ئاودیو بێن گوندی (بەرزەوار)ی ناوچەی كەندێناوەیە، شـایان شـارە گـوندێكی زۆر كـۆن بووە، كـاتی خـۆی هی جوولەكەكان بووە، دەلـێن بەناوی كابرایەكی جوولەكەیە، كە ناوی شـابان بووە، ئەو ئاوەدانی كـردۆتەوە، هەندێكیـش دەلـێن (شارەش) هەر ناوی گوندێكی دیكەی جوولەكەكان بوو لە نزیک گوندی شابان، هەر چۆنێكی بێت كاتی خۆی ئەو ناوە بە تایبەتی لە دەشـتی شامـامكێ جوولەكەی زۆر تێدا بووە، زۆر لە بەسالاچووەكانی دەڤەرەكەمان شوێنەوار و ئاسـەواری ئەو گـوندەیان كـاتی خـۆی دیوە، ئەو گـوندە لە زووەكـەوە نەمـاوە و وێران بووە، وابزانم ئاقـارەكـەی

هەندێکی لەگەڵ ئاقاری شێخ شەروانی کەوتووە، بەشەکەی دیکەشی بە بەر ئاقاری گوندی (عەوێنە)ی کەوتووە، لە دەڤەرەکەماندا ناوی (شابان) دەتوانم بڵێم هەر نییە، ئەگەر هەشبێت دەڵێن (شەعبان) ئەو ناوەش زۆر کەمە. بەڵام لەناو خێڵی (مەنتکان)دا ناوی (شابان) زۆرە، لەپاش راپەرینە مەزنەکەی ۱۹۹۱ز، کە بیری چوونە هەندەران کەوتە مێشکی ئەو خەڵکەوە لە ساڵی ۱۹۹٤ز چەند بنەماڵەیەک لە ناوچەی دزەییاتی دەشتی هەولێر، کە کاتی خۆی دایکیان یا داپیریان جوولەکە بوون و بوونەتە مسوڵمان و شوویان بە باوک و باپیریان کردوون لە رێگای خاڵ و خوارزایەتییەوە چوونەتە فەلەستین و هەندێکیان ماوەیەک لەوێ ماونەوە، ئەوێیان بە دڵ نەبوو گەڕانەوە کوردستان، باس و خواسی ئەو جوولەکانەیان دەگێڕایەوە کە کاتی خۆی دانیشتووی هەرێمی کوردستانی عێراق بوون، بە تایبەتی شاری هەولێر و دەشتی دزەییاتی. جا لەو جوولەکانە (دانیال)ە جوو بووە، کە پێیان دەگوت (دانۆ) لە شارۆچکەی مەخموور دادەنیشت، هەنووکەش ماوە و تەواو پیر بووە، هەردەم یادی دەشتە رەنگینەکەی (پیرە قەراج) و شارۆچکەی مەخمووری کردۆتەوە، ناوی یەکەیەکەی ئەو شارۆچکەیە و جیرانەکانی پرسیوە.

هەروەها لەناو جەرگەی شاری (هەولێر)یش ژمارەیەکی زۆر جوولەکە هەبوون، بە تایبەتی لە گەڕەکی تەعجیل ئەم گەڕەکە دوو بەش بوون تەعجیلی ئیسلام، تەعجیلی یەهود، کە بە گەڕەکی جوولەکان بەناوبانگ بوو، ژمارەیەکی زۆریان دوکاندار بوون بە کاری قوماش فرۆشتن و عەتاری و قەسابییەوە خەریک بوون هەندێکیشیان زێڕینگر و بەرگدروو و مامۆستا بوون.

(برایمۆکە جوو) هەبوو لە هەولێرێ دوکاندار بوو، دوکانەکەی لە قەیسەری بوو، قوماش و شەکر و چا و سابوون و خرپیلە و ئاوریشم و دەزوو و وردەواڵەی دەفرۆشت، لە مانگی (۱۰)ی ساڵی ۱۹٤٥ز) پاش ئەوەی شۆڕشی بارزانی نەمر بەخۆی و (۳۰۰۰) سێ هەزار کەس ئاوارەی کوردستانی ئێرانێ بوون، لە خەتی (کێلە شین)ەوە چوونە سابلاغێ. هەندێک لەو برا بارزانییانە کەوتبوونە دەشتی دزەییایەتی هەولێرێ ناو شاری هەولێر، یەکێکیان بێ مەئوا و داماو لە قەیسەری دەگەڕا بۆ ئەوەی خەڵک یارمەتییەکی بدەن، برایمۆک دەیگۆت: (بیاندەنێ...بیاندەنێ لەسەر شەرەف لێیان قەومایە یارمەتییان بدەن) ئەمەی خوارەوەش هەندێک لە ناوی پیاوان و ژنانی جوولەکەکانی ناوچەی دزەییایەتی هەولێرییە، ناوی ژنانیان هەندێک هەمان ناوی ئافرەتانی موسڵمان بووە، وەکو خاتون - مەلەکە - بەسێ - گورجی - مەتان - عەزیزە - سوراحی - ئەستێر - ستی - ستیلە - شیرین - خوچێ - فەرحە - رەحان - سۆرێ - سوڵتانە - مربەم - خونچە - شۆرێ - پۆرێ - گورە (گوڵە).

ناوی پیاوانیشیان هەندێک هەمان ناوی ناوچەکە بوو، بەڵام ناوی پیاوانیان جیاوازییەکی زۆری هەبوو لەگەڵ موسوڵمانەکان و تایبەتە بە خۆیان، ناوەکانیش ئەمانە: بوون سالح (سالحۆک) برایم (برایمۆک) خدر (خدرۆک) سلێمان - عەبدوڵڵا - مکاییل - داود - مالم - سەلیم (سەلیمۆک) - دانیال (دانۆ) - سیۆن - مۆشێ - یۆسێ - رەحیم - نەسیم - ئیسحاق - حسقێل - یوسف - نورێ - ناجی - بارۆخ - مراد - یاقۆ - ساسۆن - عوزێر - حەبیب - هتد.

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**

۱- زۆربەی ئەو زانیارییانەی سەرەوەم لە پیرە بەساڵاچووەکانی دەشتی دزەییایەتی وەرگرتووە لەوانە (حاجی عوسمان فەقێ کێخوا حوسێن لە دایک بووی ساڵی ۱۹۳۲ شاری هەولێرە و بەرەسەن خەڵکی گوندی سۆربەشی خدری پاشایە).
۲- عازیە کەریم عەبدوڵڵا ۱۹۱۷ز تەمەنی ۸٤ ساڵە لە شاری هەولێر لە گەڕەکی رووناکی نیشتەجێیە.
۳- هەولێرم وادیوە و بیستووە، بەرگی دووەم، مەولود قادر / ۱۹۹۷، ل۲۸٤.
٤- شۆڕشەکانی کورد عەلائەدین سوجادی - ۱۹۵۹ - چاپخانەی مەعارف، بەغدا
۵- محەمەد ئۆمەر کێخوا عەوڵا لە دایک بووی ساڵی ۱۹۲۲ خەڵکی گوندی قوشاغلو، لە ژیاندا ماوە و لە شاری هەولێر نیشتەجێیە.

# مەسیحییەکانی کۆیە

ماریا چالاک عەزیز

### کۆیە و ئایینی مەسیحی (مەسیحیەت)

گومانی تێدا نییە، لە زۆر کۆنەوە ئەم ئایینە لەم ناوچەیەدا هەیە، لەبەرئەوەی زوبانەکەیان کلدانییە، دەشێ زوبانەکە و ئایینەکەیان پێکەوە بۆ هاتبێ[1].

ئایینی مەسیحیش لە کۆیە سەرەتا لە هەرمۆتە جێگیر بووە، ئەم ئایینەش لە دەوروبەری ساڵانی (٣٥٠) زایینی بەهۆی ئەرمەنییەکانەوە بەناوی ئۆینبازی هاتۆتە ئەم ناوچەیە، ئەمەش بۆ دڵ راگرتنی ئیمپراتۆریەتی رۆما بەرامبەر بە ئیرانییەکان[2].

لەگەڵ هاتنی فتوحاتی ئیسلامی لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب بە فەرماندەیی عەبدوڵڵا کوڕی جندل بەرەو هەرمۆتە هاتوون[3]، لەم گوندە لە شاری کۆیە، کە گوندێکی مەسیحییە میتای کوڕی سەنعا کە حاکمی شارەکە بوو، لەگەڵیان دەکەوێتە شەڕ، شەڕێکی گەورە دەقەومێ. پاش ئەوە مەسیحییەکانی ئەم ناوچەیە زۆر بەتوندی رەفزی ئیسلامیان کردووە[4]، بەڵام سەرەڕای فتوحاتی ئیسلامی چەندین بارودۆخی ناخۆشی دیکەیان بەسەر هاتووە، خێزانە مەسیحییەکانی کۆیە توانیویانە رووبەرووی هەموو ئەوانە ببنەوە، کە توشیان هاتووە، وەک رووداوە سروشتییەکان و نەخۆشی تاعون، کە ژیانی زۆر لە مەسیحییەکانی کۆیە و هەرمۆتەی کۆتایی پێ هێنا[5].

ئێستا مەسیحییەکانی کۆیە زۆر بە سەربەستی لەم ناوچەیە ژیان دەبەنە سەر و بەباشی لەگەڵ موسڵمانەکانی ئەم ناوچەیە، کە زۆرینەیان پێک هێناوە دەژین و لە هەموو خۆشی و ناخۆشی یەکتردا بەشداری دەکەن.

مەسیحییەکانی ئێستا لە کۆیە دەژین هەندێ داب و نەریتی تایبەت بەخۆیان هەیە، کارە دینییەکانی خۆیان بە شێوەیەکی سەربەست لە کەنیسەکانیان بەڕێوەدەبەن، لە سەرەتا کەنیسەکەیان لە یەک ژوور پێک هاتبوو، لە هەمان شوێنی ئێستای بوو کە گەڕەکی دیانانە، بەڵام لە ١٩٢٣/٩/٢٣ ئەم کەنیسە لەسەر شێوازی کەنیسەکانی تر نۆژەن کرایەوە[6].

لە بارەی کار و پیشەی مەسیحییەکانی ئەم شارە، وەک هەموو مەسیحییەکانی شوێنەکانی دیکەی کوردستان، پێشتر لەسەر ئیشی دەستی دەژیان، کە لەوانەش رستن و چنین و یاخود کشتوکاڵیان دەکرد، بەتایبەتی مەسیحییەکانی هەرمۆتە، بەڵام کاتێ قوتابخانە لە کۆیە لە بیستەکانی سەدەی پێشوو کرایەوە، یەکسەر کچ و کوڕەکانیان ناردە بەر خوێندن، ئێستا زۆربەی مەسیحییەکانی کۆیە کارمەند و کاربەدەستن لە دەوڵەت، بەتایبەتی پیشەی مامۆستا و ئەندازیار و پزیشک و.... هتد، لە بەجێهێنانی ئەرکەکانی سەر شانیشان دڵسۆزن، لەبەر ئەمەشە رێزێکی تایبەتیان هەیە لەم شارە[7].

### دابەش بوونی دانیشتوانی مەسیحی

سەبارەت بە دابەشبوونی مەسیحییەکان لە شاری کۆیە کە دەتوانین بلێین ئەمڕۆ زۆرینەی مەسیحییەکانی کۆیە لە گوندی هەرمۆتە نیشتەجێن، کە گوندێکی مەسیحییە و دەکەوێتە رۆژئاوای شاری کۆیە، لە کۆندا نزیکەی ٣ کیلۆمەتر لە شاری کۆیەوە دوور بووە، ئێستا بەهۆی فراوان بوونی کۆیە کەمتر لە یەک کیلۆمەتر لێک دوورن و بەتەواوی لێک نزیک بوونەتەوە و مێژووی ئەم گوندەش دەگەڕێتەوە پێش ئیسلام[٨].

حەننا ئەنتوان کە لە دەستنووسێکی ماوەتەوە دەڵێت: (لە دێرین زەمانەوە شارێکی گەورە بووە، کە درێژییەکەی ٢ - ٣ کیلۆمەتر بووە[٩].

مەزەندە دەکرێ زۆر لەوە گەورەتر بێت کە (حەننا ئەنتوان) باسی کردووە، بەڵگەش بۆ قسەکانمان ئەوەیە، کە لەناوەڕاستی هەرمۆتەوە بەدرێژایی ٣ کیلۆمەتر بەرەو باکوور و رۆژئاوای هەرمۆتە، نزیکەی ٢ کیلۆمەتریش بەرەو رۆژهەلآتی و باشووری هەرمۆتە بڕۆین، دەبینین هەمووی گۆڕستان و بناغەی خانوو و کۆنە ئاش و بناغەی کەنیسە دەدۆزینەوە، کە ئەمانە بەڵگەی زیندوون و ئەوە دەسەلمێنن کە ئەم گوندە زۆر گەورە و فراوان بووە، وەک ئەویش ئاماژەی پێکردووە شارێکی گەورە بووە، چونکە پاشماوەی حەوت دێر و کەنیسەی تێدا دۆزراوەتەوە، رەنگە زیاتریش بێت، ژێر خاک کەوتبێت و شوێنەواریان بزر بووبێت[١٠].

دیانەکانی هەرمۆتە زۆر لە هی ناو کۆیە کۆنترن، وەک دەڵێن: گوندی (کلێسە)، (بۆگد)یش دیان بوون، وە کلێسەش بە ناوی کەنیسەی دیانان مابێتەوە[١١].

هەندێک لە مەسیحییەکانی هەرمۆتە هەر لە دێر زەمانەوە کۆچیان کردووە بۆ زۆر شوێن و بلآوبوونەتەوە، بە تایبەتی لە کۆیە، هەولێر، عێنکاوە، کەرکووک، بەغدا، سنە. دوای راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ وەکو خەڵکی هەموو کوردستان ژمارەیەکیان روویان کردە هەندەزان.

ئێستا ژمارەی مەسیحییەکانی گوندی هەرمۆتە کە سەر بە کۆیەیە نزیکەی ٩٨ خێزانی مەسیحییە، خێزانی موسڵمانیش لەم گوندەدا دەژین، کە ٢٠ خێزانی موسڵمان دەبێت، پێش ١٠٠ ساڵ تەنانەت یەک خێزانی موسڵمان لە هەرمۆتە نەدەژیا، هەمووی مەسیحی بوون، بەلآم ئێستا تێیدا دەژین[١٢].

دەربارەی مەسیحییەکانی ناو کۆیە، کە لە هەرەزۆریان لە هەرمۆتەوە هاتنە ناو کۆیە لە سەرەتا لە گەڕەکێک نیشتەجێ بوون بەناوی (بەفری قەندیل) تەنها یەک ماڵە دیان بوو بەناوی (خۆشاب کۆ - خۆشاوەکۆ) لە دواییدا ئەوانی تر هەریەکە لەلایەکەوە هاتوون، وەک هێران و شەقلآوە و دیانە و موسل،...هتد. نەیان وێراوە لە کۆیە کەنیسەیەکیان بۆ دروست بکەن لە هەرمۆتە بۆیان داناون[١٣].

پێشتر زۆربەی خێزانە مەسیحییەکان لە کۆیە لە دەوروبەری کەنیسەکەیان لە گەڕەکی جەمعیە و بەفری قەندیل و سەرباغ لە کۆیە دەژیان،

مەسیحییەکانی کۆیە ژمارەیان لە نێوان ٣٥ - ٤٥ خێزانە، پێش هەڵگیرساندنی شۆڕشی ئەیلول لە ساڵی ١٩٦١ ژمارەیەک لە مەسیحییەکان زۆر زیاتر بوون لە ئێستا، بەلآم بارودۆخی گرانی ژیان و بارودۆخی سیاسی پاڵی بەزۆربەیانەوە نا، کە بۆ بەغدا و کەرکووک و عێنکاوە کۆچ بکەن[١٤].

### بارودۆخی کۆمەلآیەتی مەسیحییەکانی کۆیە

أ- ژن و ژنخوازی و جل و بەرگ:

هاوسەرگیری پەیوەندییەکە کۆمەڵگا دانی پێداناوە لە نێوان ژن و پیاودا، چەند بەهایەکی تایبەتی ژن و مێردەکە دەستنیشان دەکات، لە دوای ئەوەی کە منداڵیان دەبێ خێزان دروست دەکات، وەچەکانیش لە رووی شەرعییەوە دانی پێدادەنرێت بۆ هەریەکێک، چەند پەیوەندییەک دەبەستن، کەوا یاسا و داب و نەریتە کۆمەلآتییەکان رێکی دەخەن، هاوسەرگیری سیستەمێکی کۆمەلآیەتییە، کە شێوەی جیاجیا وەردەگرێت بە پێی شارستانییەتە

جۆراوجۆرەكان[١٥].

شێوازی ژن و ژنخوازی لەناو مەسیحییەكانی كۆیە وەک مەسیحییەكانی هەموو ولاتانی دیكە هەندێ تایبەتمەندییان هەیە كە پەیڕەوی دەكەن، هەرچەندە لەوانەیە شێوەی داواكارییەكەیان وەک موسڵمانانی كۆیە و هەموو موسڵمانان وابێ، بەلام لە هەمان كاتدا هەندێ داب و نەریتی تایبەت بەخۆیان هەیە كە پەیڕەوی دەكەن، لە مەراسیمی ژن هێنانی مەسیحییەكان لە كەنیسە بەڕێوەدەچێ، لە دوای ئەوەی كە داوا كردنەكە تەواو بوو، كچە دەستنیشان دەكرێ لە كەنیسە، لە هەر شوێنێک بن، دەبێ لە كەنیسەی ئەو شوێنە مارە بكرێ، بۆ نموونە لە كۆیە بن دەبێ لە كەنیسەی كۆیە مارە بكرێ، بەلام ئەگەر بێتو لە هەرمۆتە بوون، ئەوا دەبێ لە كەنیسەی هەرمۆتە ئەم مەراسیمە جێبەجێ بكرێت[١٦].

كاتێ كە كوڕەكە كچەكە دەستنیشان دەكات، ئیتر بۆ ماوەیەک كچ و كوڕەكە سەردانی لای قەشە دەكەن، هەندێ قسە و ئامۆژگاریان لەبارەی ژیان و مەسەلەی ژنهێنان دەكات، بۆ ئەوەی لەم ماوەیەدا بیر لە خۆیان بكەنەوە، ئەگەر لەم ماوەیەدا نەگەیشتنە یەک دەتوانن لە یەک جیا ببنەوە پێش ئەوەی لە كەنیسە مارە بكرێ، چونكە لە دوای مارە كردن ناتوانن لەیەک جیا ببنەوە، واتا لە ئایینی مەسیحی تەلاقدان نییە[١٧].

بەشێوەیەكی گشتی مەسیحییەكانی كۆیە لە پەیڕەو كردنی ئەم مەراسیمە سوورن لەسەر پشت بەستن بە عادات و تەقالید و ئایینی خۆیان، لەبارەی جل و بەرگیان مەسیحییەكانی كۆیە خۆیان بە ئاشووری دانانێن كە ئەوان واتا ئاشوورییەكان جل و بەرگی تایبەت بەخۆیان هەیە و دەیپۆشن، بەلكو مەسیحییەكانی كۆیە شێوەی جل پۆشینیان وەک خەلكانی دیكەی ناو كۆیە وایە، كە ئەوان زۆربەیان خۆیان بە كورد دادەنێن و دانی پێدادەنێن، واتا هیچ جل و بەرگێكی تایبەت بەخۆیان نییە، هەرچەندە زۆرینەی خەلک وا پێشبینی دەكەن جل و بەرگی تایبەت بەخۆیان هەبێت[١٨].

**ب- یارییە کۆنەکانی گوندی هەرمۆتە:**

١- شەوچەرە و شەوەڕەشە: لە كۆندا رادیۆ و تەلەڤزیۆن و سەتەلایت نەبووە، كارەباش نەبووە یاخود بە شێوەی ئێستا نەبووە، نەگەیشتۆتە گوندەكان، شەوانی زستانی دوورودرێژ وا زوو نەدەڕۆیی، بۆیە پەنایان دەبردە بەر چیرۆک و یاری و قسەی نەستەق...هتد، تاوەكو شەویان لێ بڕوات و كاتێكی خۆش بەسەربەرن[١٩].

لە گوندی هەرمۆتەش وەک هەموو شوێنەكان و گوندەكانی تری كوردستان ئەم دیاردە هەبووە، چەند كەسانێكی چیرۆكزان هەبوون لەوانە: (ئیلیا فەرەنسی كە پێیان دەگوت مام زۆرا - تۆما یوسف...هتد)[٢٠].

چیرۆكخوان ڕووی بكردایە هەر مالێک پێشوازیان لێدەكرد و خزم و كەس و خەلكی گوند لە مالێک كۆ دەبوونەوە و لە تاریكی شەوی زستان بەدیار سۆپای دار و قوتیلەی چرا دادەنیشتن، چیرۆكخوان دەستی دەكرد بە چیرۆک گێڕانەوە، كە سەعاتێک چیرۆكی دەگێڕایەوە و چەندان شەو ئینجا چیرۆكەكە كۆتایی پێدەهات، واتا زنجیری بوو، شەوچەرەی مێوژ و گوێز و...هتد، دەخورا[٢١].

زۆرجار لە دوای گێڕانەوەی چیرۆكەكە یان بەبێ چیرۆكیش شەوە ڕەشەیان دەكرد، چۆنیەتی ئەم یارییەش بەم شێوەیە بوو، لەناو قاپێكی گەورە یان مەقلییەک دوو سێ چەنگە خوێیان دەخستە سەر ئاگر تا تەواو خوێیەكە سوور دەبوودوە، دواتر قوتیلە و چرا دەكوژایەوە، خوێیەكەیان لەسەر ئاگر دادەگرت و نەختێک مەی (ئارەقیان) بەسەرداكرد لە هەموو لایەک دەبووە پێكەنین، چونكە ئەم دووكەلە وای دەكرد كە هەر كەسەی سەیری ئەوەی بەرامبەری بكات چاوەكانیان دەبریقێتەوە و شێوەشیان زۆر سەیر و پێكەنیناوی دەردەچێت، كە دیمەنێكی پێكەنیناوی دروست دەكرد[٢٢].

٢- یاری كۆسانێ: كۆسانێ یەكێكە لەو یارییە فۆلكلۆرییە كۆنانەی كە ئێستاش ماوەتەوە، هیچ كەس لە پیاوە بە سالاچووەكان نازانن و لە باب و باپیرانیشیان نەبیستووە، كەی ئەم یارییە پەیدا بووە. لە زۆربەی یارییەكانی تر چێژ بەخشترە،

چونکە جگە لەو کەسانەی یارییەکە دەکەن کەسانی دەوروبەر و تەماشاکا چێـژێکی خـۆش لەم یارییـە وەردەگرن(٢٣).

ئەم یارییە لە زەمانی کۆن لەناو مەسیحییەکانی کۆیە و هەرمۆتە دەکـرا، ئێسـتاش تەنیـا مەسیحییەکانی هەرمۆتە ئەم یارییە دەکەن، یارییەکی زۆر خۆشە و لە تەواوی جیهان ئەم جۆرە یارییە نییە، تایبەتە بە مەسیحییەکانی هەرمۆتە(٢٤).

ئەم یارییـە لە سێ بەش پێک هاتووە، یەکـەم: تەختـە، دووەم: سوار، سێیەم: چار.

١- تەختـە: لە زەمانی کۆن بەم شێوەیە دروست دەکرا: لەبن سێبەری دار زەیتون و ناو رەزان کۆسپەیەکیان بە قوڕێکی پر کا و شێلراو دروست دەکرد، لە شێوەی خشتێکی بڕاو دەچوو، درێژییەکەی ٢٥ - ٣٥سم و پانییـەکـەی ٨ - ١٠سم دەبوو، خشتەکە لەباری درێژی بە ئەندازەی چاو دەکرا بەدوو بەش، هەر بەشەی ١٢ جووت کونیان تێدەکرد بە چیلکە دار، وازیان لێـدەهێنا تا وشک دەبووەوە، دواتـر ٢٤ چیلکەیان دەهێنا، هەر چیلکە دارەش لە شێوەی نیـوە قـەڵەمێکی رەساس دەچوو، دوازدە چیلکە داریان پاک دەکردەوە رەنگی سپی دەنواند، بەڵام دوازدە چیلکە دارەکەی تریان بە توێکڵەوە دەهێشتەوە تاکو لە یەکتری جودا بکرێنەوە، هەریەک لەم چیلکە دارانە پێی دەڵێن سـوار. (١٢) چیلکە داریان دەخستە لایەکی کۆسپـە کونکراوەکە دەخرایە ئەو کونانەی دەکەوتە بەشی دەرەوەی، واتا دوای چەقاندنی دوازدە سوارەکە بەشێوەی ریزبەند دوازدە کـونی دیکە بەتەکیانەوە دەمایەوە، بۆ لایەکەی دیکەش لەم دوازدە جـووت کـونە لایەکیان وەردەگرت و لای دەرەوەی دوانزدە چیلکە دارەکـان (سوارەکان)یان دەچەقاند بەم شێوەیە دەردەچوو.

لەسەر تاتە قوڕەکە چوار ریز کون هەیە، هەر ریزەی (١٢) خـانە یان کونی لەسەر کراوە، هەر لایەی (١٢) سواری تێدا دادەنێن، واتا ٢٤ خانە بۆ سوارەکان و ٢٤ خانەش بە بەتاڵی دەمێنێتەوە، بەڵام ئێستا پارچە لەوحەیەک بەو ئەندازەی وتمان یان بچووکتر ئامادە دەکرێت و کونەکانیش بەهەمان شێوە ئامادە دەکرێت، واتا دوازدە سواری رەش بۆ لایەکیان دەبێت، دوازدە سوارە سپییەکەش بۆ لایەکەی دیکە، بەم شێوەیە لەسەر پارچە تەختەی خانەکراو دەتوانرێت یارییەکە وەک هەموو یارییەکانی تر بگوازرێتەوە بۆ هەموو شوێنێک(٢٥).

جگە لە تەختە و سوار بەشێکی دیکەمـان هەیە پێی دەڵێن (چار)، چۆنیەتی دروست کردنی (چار)، دوو دار دەهێنن درێژییەکەیان نزیکەی ٢ - ٤سم بێت، ئەستوورییشیان بەقەد دەسکی خاکەنازێک یان کەمتر بێت، لە ناوەڕاسـتـەوە لەباری درێژی هەریەک لە دارەکان دەقڵیشێنن و دەیانکەن بە دوو لەت، هەر لەتەش دوو دیوی هەیە، دیوی تەخت و دیوی کەوانەیی، واتا (پشت) یان (زگ)، دیوێکی راست و سپییـە، دیوی کەوانەش توێکڵی دارەکەی پێوە ماوە و مەیلەو رەشە، ئەمە چۆنیەتی دروست کردنی کەلوپەلی یارییەکە بوو(٢٦).

چۆنیەتی یاری کردنی کۆسانێ: دوای دانانی تەختەکە و دامەزراندنی سوارەکان و چارەکان، کەسەکان دەبن بەدوو گروپ، هەرلایە و لەیەک کەس تا سێ دەبن، واتا یەک بەیەک یان دوو بەدوو یان سێ بەسێ دەتوانن زیاتریش بن بۆ ئەوەی یارییەکە بکەن، بۆ نموونە سێ کەس لەوبەر دادەنیشن و سێ کەسی تریش لەمبەر، کەسێک لە گروپی یەکەم دەبێت بە (ئۆستا) لە تەنیشت تەختە کون کراوەکە دادەنیشێت. گرووپەکەی تریش بەهەمان شێوەیە، واتا دانیشتنەکە شێوەی سفرەی نان خواردن وەردەگرێت، بەرامبەر بەیەک دادەنیشن.

ئەو کەسەی ئوستایە لە گرووپی یەکەم و ئەو کەسەی ئوستایە لە گـرووپی دووەم، یەک لەو دارانە (چار)انە وەردەگرێت بە ئەندازەی ١مەتر بەرزی دەکاتەوە، تەقڵەیەکی پێ لێدەدا و فڕێی دەدا. ئەگەر کەوتە سەر پشت واتا لای توێکڵەکەی لەسەر ئەوی بێت و رووەو تەختەکەی بە رووتەوە بڕوانێ و ئەوە یارییەکە دەکەوێتە دەست ئەم گرووپە، گرووپەکەی تریش هەمان شت

دەکات، ئەگەر هەر بەم شێوەیە دەرچوو ئەوا دووبارەی دەکەنەوە، واتا هەردوو گرووپەکە هەمان کردار دەکەنەوە تا یەکێکیان دەکەوێتە سەر پشت و رووە سپییەکە بەدیار دەکەوێت، لە شێوەی خەت و شێرانێ وایە، کە بزانن یارییەکە دەکەوێتە دەست کام گرووپ[27].

دوای ئەوەی کەوتە دەست یەک لەو دوو گرووپانە، ئاخر کەس لە گرووپەکە دەست دەکات بە یاری کردن، دواتر ئەوەی تەنیشتی ئاخر کەس،واتە ئوستا لێدەدا، بەلام بۆ گرووپەکەی تر لە دوای ئەوەی ئوستای گرووپی یەکەم لێیدا یەکسەر ئوستای گرووپی دووەم وەری دەگرێت و بەپێچەوانەوە دەبێت، چۆنیەتی یاری کردنی چوار پەلە دارەکە وەردەگرێ، هەردوو پارچەیان پێکەوە بەدەستێک دەگیرێت، دوو پارچەکەی تریش بەدەستەکەی تر، لەشێوەی پەلیکانێ لە شوێنی خۆی لێکیان دەدات، یەک لەمانە دەردەچێت: (کۆس، دوو، سێ، چوار، شەش):

کۆس: لە ئەنجامی لێدانی هەرچوار پارچە دارەکان، ئەگەر سێ لە دارەکان کەوتنە سەر (زگ) یەکێکیشیان کەوتە سەر دیوە کەوانەییەکە، ئەوا دەبێت بەکۆس.

دوو: ئەگەر دوو لە (چار)ەکان یان شەپکە دارەکان کەوتنە سەر پشت، دووەکەی تریش کەوتنە سەر زگ، ئەوا پێی دەلێین دوو، کە دوو داریان یەک شێوە وەردەگرن و دووەکەی تریش شێوەیەک.

سێ: لەم چوار پەلە دارە، ئەگەر سێیانیان کەوتنە سەر پشت و یەکێکیان کەوتە سەر زگ، ئەوا پێی دەلێین (سێ).

چوار: (چار)ەکان یان پەلە دارەکان بکەونە سەر پشت، واتا هەر چوار رووە سپی و تەختاییەکە بە رووتەوە بێت.

شەش: هەر چوار پەلە دارەکە بکەونە سەر زگ، واتا رووە کەوانەییەکە و بەتوێکلەکە بەرووتەوە بێت[28].

گرووپی یەکەم هەریەکەیان پەلە دارەکە لێک دەدەن تا سرەیان تەواو دەبێت، ئینجا گرووپەکەی تر، بەلام مەرجێک هەیە هەز کەسە چ لە گرووپی یەکەم یان دووەم بێت، دەبێت یەک جار (کۆس) بهێنن دەنا هەرچەند سێ و چوار و شەش و...هتد بهێنن بۆی حیساب ناکرێ و ئەو کەسەی کۆسی هێنابێت دەلێین (زا)، ئەوەی کۆسی نەهێنابێت دەلێین (قسرە)، هەر کۆسەیەک چیلکە دارەکان (سوارەکان) سەربەست دەکا، واتا ئەو دارەی بەکۆس نەجولابێ ناتوانرێت دەستی لێبدرێ بۆ ئازاد کردنی هەر (١٢) سوارەکان، دەبێت ئەم گرووپە (١٢) کۆسی هێنابێ بەم شێوەیە بەهاتنی کۆس و ژمارەکانی تر سوارێک یان چەند سوارێک دێنە دەرێ بۆ دوازدە خانەکەی تەنیشت خۆی دەروات[29].

دیوی گرووپەکەی تر هەنگاو بەهەنگاو دەروا تا دەگاتە ریزە خانەکانی ئەوبەر و سوارەکانیان دەکوژێت و ئەگەر پێک نەگەیشتن گرووپەکەی تر دەیکوژێت، بەم شێوەیە سوار سوار دەکوژێت تا تەواو لایەکیان هیچ سواری نامێنێ لایەکەی تر چەند سوارێک یان تاقە سوارێکیان دەمێنێ و دەیبەنەوە.

لەم یارییە چەند جۆرێک قسرکردن هەیە:

یەکەم: ئەگەر کەسێک تا کۆتایی یارییەکە کۆسی نەهێنا، ئەوا چوار و شەش و دوو و سێ هیچیانی بۆ حیساب ناکرێت.

دووەم: ئەگەر هەرسێکیان واتا گروپەکە هەموو کۆسی هێنابێ و ئەو سوارانەی بەکۆس دەجولێنەوە هەر هەمووی بکوژرێن دەبێت سەر لەنوێ کۆس بهێننەوە، دەنا هەچ ژمارەیەکی تر بهێنن بۆیان حیساب ناکرێ.

ئەگەر ئەو سوارەی چووە شاری گروپەکەی تر ئەوانیش هەموو سوارەکانی خۆیان هێنادەر، ئەو سوارانە هەمووی عاسێ دەبن ناتوانن بێنەدەر و ناتوانن بەکاریان بهێنن، تەنها دەتوانن لەوکاتە بەکاریان بهێنن کە هیچ سوارێکی تریان بەدەستەوە نەبێت.

لەوکاتەش پێویستە (کۆس) بهێنن بۆ دەرکردنی یەک سوار، واتا لێرە یەک لە شەریکەکانی کۆس بهێنن بەسە، نەک تەواوی شەریکەکان، لێرە بە پێچەوانەی سەرەتای یارییەکە، واتا دەتوانن یەک سوار دەربهێنن، کەچی ئەگەر لە شاری خۆت بی بە ئارەزووی خۆت سوار دەردەهێنیت، ئەگەر لە شارەکەی

خـۆت بی دەبێت هەمـوویان کـۆس بهـێنن، ئەوەی کـۆسی نەهێنا خاڵەکانی تری بۆ حیساب ناکرێت، بەڵام لەمەیان یەک کۆس بەسە، کە سوارەکە هاتەدەر هەموو گرووپەکە دەتوانن خاڵەکانیان بۆ حیساب بکرێت[30].

دوو مێرد: سوارێکی خۆت لە سوارێکی خۆتی دەدەی دەبێت بەدوو سوار، بەڵام لە یەک چیلکە دار (یەک سوار) لەوکاتەش چیلکە دارێکی جیاواز دادەنێین تاکو بناسرێتەوە، سوارەکەش لە سەرەوە دوو لقی لێدەبێتەوە.

سێ مێرد: بەهەمان شێوە سێ سواری هەمان گرووپ لێکدەدرێت.

چوار مێرد: چوار سواری هەمان گرووپ لێک دەدرێت... پێنج مێرد...هتد، بەهەمان شێوە...

سوودەکانی دوو مێرد و سێ مێرد و........هتد ئەوەیە، تاکو بەیەک کەرەت سێ چوار سوار کە ئاوێتە بوون بەیەک سوار پێش دەخرێت بۆ ئەوەی زوو بگاتە شاری گرووپەکەی تر و سوارەکانیان بکوژێت.

ئەگەر بمانەوێ فەرعێکی لێبکەینەوە، واتا ئەگەر سێ مێرد بوو، بیکەینەوە بەدوو مێرد یان بیکەینەوە بەسێ سوار، وەک جاران ئەوا دەبێ کۆس بهێنی، بە هاتنی کۆس دەتوانیت سوارێک (چیلکە دارێک) لە پێش ئەو سوارەی کە ناومان ناوە سێ مێرد بچەقێنین بە چەقاندنی ئەم سوارە سێ مێردەکە دەبێت بەدوو مێرد، بەهێنانی یەک کۆسی تر دیسان سوارێکی تر لە پێش سوارە دوو مێردەکە دەچەقێنین بەم شێوەیە دەبێتەوە سێ سوار و سێ مێردەکەش هەڵدەوەشێتەوە[21].

#### هۆیەکانی شێتبوونی سوار

- شێت بوونی سوار بەبێ مەبەست: ئەگەر سواری گرووپێکیان گەیشتە شاری گرووپەکەی تر، هیچ سوارێکی تر نەبوو بیجوولێنێتەوە بەهۆی نەبوونی کۆس، سوارەکانی تر کۆت و بەند کراوە، ئەوا ئەم سوارە شێت دەبێت واتا هەچ ژمارەیەک بێت دەبێت تەنها هەر بەم سوارە بجوولێتەوە، ئەگەر نەکوژرێت لەلایەن گرووپەکەی تر دووبارە دەچێتەوە ناو شار و دەست دەکات بەکوشتن، یان دەتوانێت بێتەوە لایەکەی خۆی بە دوازدە خانە، دیسان بجوولێتەوە و بچێتەوە لایەکەی تر.

- ئاقڵکردنی سواری شێت: دەبێت کۆسی تر بهێنن و ئەو سوارەی کە شێت بووە لەنێو شاری گرووپەکەی تر چەند سوارێکی پەراندووە، دەبێت سوارێکی تر بنێردرێت تا بچێت ئەم سوارانە بکوژێت کە پشتی سوارەکەی تۆی گرتووە بە کوژرانی ئەم سوارانە و نەمانی مەترسی لەسەر سوارە شێتەکە، ئەوا ئاقڵ دەبێتەوە.

- شێت بوونی سوار بەمەبەست: لێرە ئەو گرووپە خۆی ئەو سوارە شێت دەکات، چونکە حیساب دەکات کە ئەم سوارە سوارێکی زۆر لە گرووپەکەی تر دەکوژێت یان هەموو ئەو سوارانە دەکوژێت کە بە کۆس جوولاونەتەوە کە هەمووی کوشتن ئەوان قسردەبن، دەبێت دووبارە کۆس بهێنن دەنا ناتوانن دەست بدەنە گواستنەوەی هیچ سوارێک[22].

#### سوودەکانی کۆس

١- بە هاتنی کۆس یەک خانە سوارەکە دەڕوات.

٢- هەموو سوارێک لە کۆت و بەند رزگار دەکات.

٣- رێگا بە یاریکەر دەدات لەدوای هێنانی کۆس ژمارەکانی دیکە بۆ حیساب بکرێ.

٤- ئەگەر دوو مێردە یان سێ مێردە هەبوو بە کۆس دەکرێ بەسوار.

ئەوانی تر دوو - سێ - چوار - شەش، هەریەکەیان ئەوەندە خانەیە دەبرن، دوو دوو خانە دەبرێت، سێ تەنها سێ خانە دەبرێت...هتد، ئەو کەسەی کە چارەکانی لێکدا و تەنها یەک لەمانەی هێنا، (کۆس - چوار - شەش) دووبارە لێک دەداتەوە، واتا هەتا (کۆس - چوار - شەش) بهێنێت هەر لێدەداتەوە و هەمووشیان حیساب دەکرێت، بەڵام ئەگەر (دوو - سێ)ی هێنا، بۆ نموونە ئەگەر دووی هێنا دوو خانەی بۆ حیساب دەکرێت و سوارێک دوو خانە دەچێتە پێشەوە، بەڵام ناتوانرێت دووبارە لێبداتەوە، هەمووشیان پێویستن، چونکە جاری وا هەیە هەریەک لە گرووپەکان یەکی یەک سواریان ماوە ئەم دوو سوارە دەکەونە راوەدوونان، جاری وا هەیە پێویستیت بەم دووە

هەیە، چونکە سوارەکەی گرووپەکەی تر دوو خانە لەهی ئەوەکەی تۆ دوورە بە هێنانی (دوو) سوارەکەی تۆ دەچێتە شوێنی سوارەکەی گرووپەکەی تر، سواری گروپەکەی تر فڕێدەدەی، بەم شێوەیە دەیبەیتەوە، یان جاری وا هەیە یەک خانە لە سوارەکەی تۆ دوورە تۆ دەبێت کۆس بهێنی، بەم شێوەیە هەموو ژمارەکان سوودیان هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی (کۆس و شەش) لە هەموویان باشتر یارییەکە بەرەو پێشەوە دەبات، کۆس بۆ ئازاد کردنی سوارەکان، شەشیش بۆ بەرەو پێشبردنی سوارەکان زۆر خێرایە.

ئەم کۆس و شەشە چووەتە ناو فۆلکلۆریشەوە، کە دەڵێن ئەگەر ئەم شتەم بۆ سەرکەوتایە کۆس و شەش بوو، واتا ئەم کۆس و شەشەیە کە لەم یارییەدا هاتووە[٣٣].

**بواری خوێندن**
**لەلای مەسیحییەکانی کۆیە**

مەسیحییەکانی کۆیە، وەک هەموو مەسیحییەکانی شوێنەکانی تری کوردستان کە لە پێشتر لەسەر ئیشی دەستی دەژیان لەوانە رستن و چنین بوو، بەڵام کاتێ کە قوتابخانە کرایەوە لە کۆیە لە بیستەکانی سەدەی پێشوو یەکسەر کچ و کورەکانیان و نەوەکانیان ناردە بەرخوێندن[٣٤].

لە دەرچووانی نەوەی یەکەم بە مامۆستا لە کۆیە وەک مامۆستا، (حەننا ئەنتوان، جەبار عەبدولکەریم، اندراوس هورمز،...هتد)[٣٥].

ئێستا زۆربەی ئەهلی مەسیحییەکانی کۆیسنجق کارمەندن لە دەوڵەت بەتایبەتی پیشەی مامۆستا و ئەندازیار و پزیشک و.... هتد، بە (نێر و مێ)ەوە، بە دڵسۆزی ئەرکەکانیان بەڕێوە دەبەن، هەر لەبەر ئەمەیە کە ڕێزێکی تایبەتیان هەیە لەناو کوردەکانی ناوچەکە[٣٦].

ئەگەر بێتو باسی خوێندن بکەین لە هەرمۆتە کە گوندێکە دەتوانین بڵێین تایبەتە بە مەسیحییەکانی کۆیە، کە زۆرینەی مەسیحییەکانی کۆیە لەم گوندە نیشتەجێن، بۆ یەکەم جار کە قوتابخانەی هەرمۆتەی سەرەتایی کرایەوە ئەم قوتابخانەیە لە ساڵی ١٩٧٤ بوو، یەکەم مامۆستای قوتابخانەی هەرمۆتەی سەرەتایی مامۆستا (قاقۆز بنیامین) بوو، کە خەڵکی عەنکاوە بوو، کە بەڕێوەبەر و مامۆستای قوتابخانە بوو، تا گەیشتە دروست کردنی پۆلی چوارەم مامۆستایەکی دیکە بۆ هات، ئەویش مامۆستا جەبار کەریم بوو[٣٧]، لەسەرەتادا ئەم قوتابخانەیە بینای نەبوو، بەڵام لە هۆدەیەکی کەنیسە دانراو هەیوانێکی لە پێش بوو، کە بەڕێوەبەر لێی دادەنیشت، کۆی قوتابیان گەیشتە ٣٥ قوتابی، زۆربەیان تەمەنیان گەورە بوو، کە دەگەیشتە ١٤ - ١٥ ساڵ تەنیا ئەو دوو کچە بۆ یەکەمین جار لەم گوندە چوونە قوتابخانە: (ترێزا عۆدیش و فەریدە بوتروس) بوون، بەردەستی قوتابخانەش ناوی (حنا یوسف) بوو، کاتێ کە پۆلی شەشەم کە ژمارەیان حەوت قوتابی بوو، ئەم قوتابیانەیان گواستەوە، کە ٣ قوتابی بۆ قوتابخانەی ئولای (کویسنجق الاولی) و ٤ قوتابی بۆ قوتابخانەی پانیە (زانست) لە کۆیە، ئەو سەردەمە تەنیا ئەو دوو قوتابخانە لە کۆیە هەبوو، بەڵام وەک قوتابییەکان خۆیان دەڵێن کە ئاستی زانستیان زۆر نزم بوو، لەبەر ئەوەی باری ژیانیان باش نەبوو، دوو قوتابی موسڵمانیان تێدابوو، ئەویش (ئیبراهیم ئەحمەد - قادر عەبدوڵڵا) بوون، ئەوانی تر مەسیحی بوون[٣٨].

ساڵ بەساڵ کەنیسە هۆدەی بۆ دروست دەکرد مەبەست قوتابخانەکەی هەرمۆتەیە، تاکو ساڵی ١٩٧٢ قوتابخانەیەکی بچووکیان دروست کرد، لە ساڵی ١٩٧٨ مامۆستا (شەفیق سابیر) سەرپەرشتیار(مشرف) بوو، سەردانی کردن و گوتی کە دەبێ قوتابخانەی ناوەندی (تکمیلی) بکەینەوە، ئیدی ئەو کاتە چوار مامۆستای سەرەتایی لەوێ بوون، توانرا ناوەندییەکە بکەنەوە، تاکو میلاکی بۆ دانراو لە سایەی یەزدان چەند مامۆستا و پزیشک و ئەندازیاری لێ دەرچوو[٣٩].

**بۆنە و جەژنە ئایینییەکان و چۆنیەتی یاد کردنەوەیان**

أ- جەژنی لە دایک بوون (میلاد):

جەژنی سەری ساڵ بەواتای رۆژی لە دایک بوونی حەزرەتی عیسا و هەنگاونان بەرەو ساڵێکی نوێ[40]. مەسیحییەکانی کۆیەش، وەک هەموو مەسیحییەکانی جیهان، بە خۆشحاڵییەوە پێشوازی لەم جەژنە دەکەن و گەڕەک و ماڵەکانیان دەڕازێننەوە، بە دڵێکی خۆش پێشوازی لە ساڵی تازە دەکەن، بەو هیوایەی ساڵی تازە بەخۆشییەوە دەست پێبکات و ژیانیان ئاسوودە و بەختەوەر بکات[41].

ئەو دیاردانەی لە پێشوازی ساڵی نوێ دەبینرێ، کەسایەتی (بابا نوئێل) و (شجرة المیلاد)ە، واتا درەختی جەژنی لە دایک بوون، کە دوو شتی سەرنجڕاکێشی ئەم زەماوەند و پێشوازییەیە، ئەگەر بمانەوێ ئەم دوو دیاردەیەش شی بکەینەوە دەتوانین بڵێین:

بابا نوئێل ئەو کەسەیە بەرگێکی سوور و کڵاوێکی بە گوڵینگە و پێڵاوێکی فەروودار و ریشێکی سپی و درێژ و چاویلکەیەک دەپۆشێ، خۆی لە شێوەی پیاوێکی پیر نمایش دەکات و گۆچانێک بەدەستییەوە دەگرێت و توورەگەیەکی گەورە دەکاتە شانییەوە، کە جۆرەها نوقڵ و شیرینی و لەعابە بەسەر مناڵان دابەش دەکات، بە بینینی ئەم دیمەنە مناڵان شاگەشکە و دڵخۆش دەبن، سەبارەت بەم درەختەش کە بە (شجرة عید المیلاد) ناسراوە زیاتر مەسیحییەکانی لای ئێمە لقی دارێکی سنەوبەر لەناو گوڵدانێک دادەنێن و لەخوارەوە تاکو لوتکەی سەری دەڕازێننەوە بە گڵۆپی رەنگاوڕەنگ و شتی درەوشاوە، ئەستێرەیەکیش دروست دەکەن بەسەر لووتکەی درەختەکەی دەخەن، کە ئەم بیرۆکەیە ئەوە دەگەیەنێ کاتێ عیسا بن مەسیح لە رۆژێک لە دایک بوو بەرامبەر دەلاقەی ژوورەکە ئەستێرەیەکی گەش و نوورانی بە دیارکەوت، هەر بۆیە چەسپاندنی ئەم ئەستێرەیە مانای لەدایکبوونی پێغەمبەری مەسیح حەزرەتی عیسا دەگەیەنێ.

بۆیە ئەوانیش مەسیحییەکانی کۆیە وەک هەموو گەلانی جیهان بە باق و بریق و سنەوبەری سەوز پێشوازی لەم جەژنە و لە ساڵی تازە دەکەن و خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕن[42].

ب. جەژنی هەستانەوە (قیامە): ئەم جەژنە کە بە جەژنی (قیامە) واتا هەستانەوە ناو دەبرێ، ئەم ناوەش لەوە هاتووە، کە هەستانەوەی حەزرەتی عیسا دوای سێ رۆژ و زیندووبوونەوەی ئەم جەژنە دەکەوێتە مانگی نیسان کە دەکاتە مانگی چوار بە جەژنی گەورەش ناو دەبرێ، بەپێی ساڵ (١٠) رۆژ دێتە پێش و ساڵی وا هەیە (١٠) رۆژ دەچێتە دواوە، واتا (٣/٢٥ - ٤/١٠) دەکەوێتە ئەم نێوانە! عادەتێک هەیە لەگەڵ سروشتی بەهار، کە سروشت دەڕازێتەوە بۆ ئەم جەژنەش هێلکە بەهەموو جۆرەکانی، کەسک و سوور و مۆر...هتد رەنگ دەکەن، کە لەگەڵ نانی بەیانی دایدەنێن، ئەم (هێلکە) رەنگاورەنگانە تەعبیر لە خۆشی و شادی دەکات[43].

ج- جەژنی خاچ (صلیب): جەژنی (صلیب) لەناو کوردەواری خۆمان بە (ئاگری پاییزی) ناوبانگی دەرکردووە، هەموو ساڵێک لە ئێوارەی (٩/١٤) ئاگر دەکرێتەوە، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کاتێک عیسای مەسیح لە خاچ درا، بەڵام نەدەزانرا، کە خاچ هی عیسای مەسیحە، مەلیکە هێلین مردووییەکی هێنا لەسەر سەلیبەکان درێژی کرد، لەسەر سەلیبی حەزرەتی عیسا مردووە کە هەستایەوە بەم شێوەیە زانیان بە کام سەلیب عیسا لە خاچ دراوە، وەک رووداوەکەی نەورۆز، ئەم سەردەمە هۆی راگەیاندن نەبوو، بەڵکو لەسەر لوتکەی شاخەکان ئاگریان کردۆتەوە، بۆ ئەوەی ئەمە رابگەیەنێن، کە خاچەکەی عیسای مەسیح دۆزراوەتەوە[44].

ناونانی ئەم جەژنەش لەناو کوردەواری بە جەژنی ئاگری پاییزی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەم جەژنە دەکەوێتە ٩/١٤ هاوکات بەرەو ساردی و نزیک بوونەوەشە لە سەرما و سۆڵە، بۆیە بەو ناوە ناودەبرێت[45].

## کەنیسەی کۆیە و هەرمۆتە و دێری مار بەهنام

لە کۆیە کەنیسەیەکی بەقوڕ دروستکراو هەبوو، هەر ماڵێک بوو، کرابووە کەنیسە. لە پێش ساڵانی

١٩١٣ بەردیان کێشا بوو، کە کەنیسەی پێ دروست بکەن، دەڵێن حکومەتی عوسمانی کە ویستی بینای قوتابخانەکەیان بکات بەردەکەی کەنیسەشیان هێنا، بەناوی تەبەروع لە بینای قوتابخانەکەیان بەکار هێناوە، لەبەر ئەوەی مزگەوتی گەرموک لە کەنیسەکە نزیک بوو، نەدەبووایە کەنیسەکە ئەوەندە بڵند بێ، بەسەر مزگەوتەکە بنۆڕێ. لەدواییدا ئینگلیز کۆیەی خستە ژێر ئیدارەی خۆی، دیانەکان کەمێک سەربەستیان پەیدا کرد، لە ساڵی ١٩٢٢ نۆژەنیان کردەوە، بەڵام لەبەر بۆردوومانی ئینگلیز نەتوانرا تەواوی بکەن لە ساڵی ١٩٢٣ بەگێچ و بەرد دارەڕێ و تەواویان کرد، بە پارەی خەڵکی مەتران و هەندێ پارەشیان لە کەرکووکەوە بۆ هاتبوو، کەنیسەی کۆیە بە کەنیسەی (مار جەرجیس) ناونراوە[٤٦].

ئەو قەشانەی لە کەنیسەی کۆیە خزمەتیان کردووە، قەشە پۆلس عەجمایە و قەشە گۆرگیس کە زۆر زانا بوو، لە دانیشتووانی کۆیە بوو، هەروەها لە ساڵی ١٩٥٧ خزمەت کردنی ئەو کەنیسەیە لەلایەن زۆر قەشە و راهیبەکانی هرمزدیە وەک: قەشە سلێمان شەمەند و قەشە ئیسحاق و قەشە مەتی کۆسا، کە راهب بووە، کە ئەو بەڕاستی یەکێکە لەوانەی کە لەسەردەمەکەیدا زۆر خزمەتی کردووە[٤٧]. چاککردنەوەی کەنیسەکە و فراوان کردنی و گۆڕینی سەقفەکەی بە چیمەنتۆ کە پێشتر گەچ بوو، ئەمە یەکەم نوێ کردنەوە بوو لەسەر بودجەی حکومەتی عیراق. دوای راپەڕین لە کوردستان و رزگار بوونی لە دەستی رژێمی سەدامی زۆردار، حکومەتی هەرێمی کوردستان گوژمەیەک پارەی بەبڕی (٦٢٠٠) دیناری سویسری بۆ چاک کردن و نۆژەنکردنەوەی کەنیسەکە تەرخان کرد، کۆمەڵێک کەنیسە بە کەرپووچ تەغلیف کرد و حەوشەکەی چیمەنتۆ کرا و ناوەوەی کەنیسە کاشی کرا[٤٨]. لە ساڵی ٢٠٠٢ - ٢٠٠٣ حکومەتی هەرێم لەدوای رزگار کردنی عیراق دیسان بڕە پارەیەکی تری بۆ سەرف کردن بەبڕی (٥٠٠٠٠) دۆلاری ئەمریکی، کە بگونجێ لەگەڵ شوێنی خۆی، وەک پەرستگایەکی مەسیحییەکان لە ناوچەکە، فراوان کردنی هۆڵی پێشوازی و دروست کردنی هۆڵێکی شیاو بۆ ئاهەنگەکانی قەشە و خوشکە راهیبەکان و ئەوانەی کە لە هاویندا بە مەبەستی وتنەوەی وانە سەردانی کۆیە دەکەن، بەتایبەتی خوشکەکانی دڵی پیرۆز (اخوات قلب الأقدس). حەوشەکەی لە دەرگای سەرەکییەوە هەموو بەکاشی شتایگەر دروست کراوە، بۆیە کردنی ناو کەنیسەکە و دروست کردنی سەریرخانەیەکی نوێ[٤٩].

کەنیسەی هەرمۆتەش کەسێکی ئەرمەنی (یوسف سەرفیان) کە خەڵکی شاری تۆقانە لە تورکیا، لە ساڵی ١٨٦٨ دروستی کردووە، بە یارمەتی قەشە (قس شمعون)، کە ئەمیش (٥٠٠) قرانی داوە و خواردنی (١٤)ە کرێکاری داوە تا کەنیسەکە تەواو بووە (لە زەمانی مەتران (یوحنا تەمرەز - رەبەی دێرە) کە لە کەرکووک دادەنیشت، بگرک یوسف ئودووش کە لە بەغدا دادەنیشت و پاپا بیوسی نۆیەم). قەشە شەمعون و یوسفی برای لە بنەماڵەی شێخی مجی غرۆیە، کەنیسەکە لە جێی کەنیسەیەکی کۆن دروست کراوەتەوە، کە پێشان کەنیسەکە قوڕ بووە، بەردی گێچی سووتاوی بە وڵاغی دێنێتە هەرمۆتە، لەوێ دەیکوتن. لە هاوینی ١٩٧٧ کەنیسەکە لەلایەن قەشە متی کۆسە لە شەقڵاوە فراوان کرا، هەر ماڵە هەرمۆتەیەکیش (٢٥) دیناری داوە، هەروەها یوسف سەرفیانی گەورەش (٩٥) دیناری داوە، حکومەتیش هەزار دیناری داوە، بەکەنیسەی مریەمە دەناسرێ[٥٠]. لە دەوروبەری هەرمۆتە بناغە و پاشماوەی حەوت دێر و کەنیسەی تێدا ماوەتەوە، کە تا ئێستا پاشماوە و شوێنەواریان بزر نەبووە، بەڵام ئەوەی کە بە تەواوەتی ماوەتەوە دێرەکە دەکەوێتە باکووری گوندی هەرمۆتە بە دووری ٣ کیلۆمەتر[٥١].

دێرێ مار بەهنام کە ئێستا بە مەربێنە قەدیشە ناسراوە، کە لەناو ئیسلامەکان بە شێخ محەمەدی دێرێ، دەکەوێتە بناری چیای باواجی بەرزییەکەی (١٢٦) پێیە و نزیک گوندی تۆبزاوەیە، بینایەکە خۆی لە بەرد و گەچ دروست کراوە و لە بەشی پشتەوەی گۆڕستانێکی گەورەی

لێیە[٥٢]. لەسەر مێژووەکەی ڕای جیاوازی هەیە، ڕای یەکەم مێژووی ئەم دێرە دەبەستێتەوە بە دێری مار بەهنام، کە لە دەوروبەری موسڵ دروست کراوە بۆ ڕێز لێنانی هەر دوو برا (بەهنام - سارە)، کە ئەوانە لەنێوان شەهیدەکانی ساسانی بوون لە کاتی پێکدادانی تاپوری دووەم لە ساڵی ٣٦٣میلادی. ڕای دووەمیش دەڵێت: کە لە هێرشی مەغۆلەکان بۆ دێری مار بەهنام کاتێ قەشەکان و کاهنەکان ئەوێ بەجێ دەهێڵن و دەگەنە نزیک گوندی هەرمۆتە، ئەم دێرەیان دروست کردووە، ناویان ناوە مار بەهنام. بەڵام لە ساڵی ١٩٨٦ بەردە نووسێکیان لەناو دێرەکە دۆزییەوە کە بە ئەلف و بێی کلدانی چەند ڕستەیەکی لەسەر نووسرابوو. کە ئامەژەی بەوە دەکرد کە حەفت سەد ساڵ بەر لە ئێستا نۆژەن کراوەتەوە لەلایەن کێخوا (ئۆغان)، کە ئەو کات ئەو کەسایەتییە کێخوای هەرمۆتە بوو[٥٣]، لە ساڵی ١٩٨٨ لەگەڵ شاڵاوەکەی ئەنفال و تێکدانی گوندەکان ئەم دێرەش بەر ئەم شاڵاوە کەوتووە بە تێئێنتی تەقێنراوەتەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٩٦ لەسەر بناغەی و شێوازی خۆی لەلایەن یەکێک لە ڕۆڵەکانی گوندەکە بەناوی (یەعقوب باسی) و بە بەشداری ڕۆڵەکانیشی دروست کراوەتەوە، دوو ساڵ دوای ئەمیش فراوان کرا و چەند تاقێک و حەوشەیان بۆ زیاد کرد، هەروەها دار و درەختیان بە دەوری دێرەکە چاند[٥٤].

**پەراوێزەکان**

١- تاهیر ئەحمەد حەویزی: مێژووی کۆیە، ب١، بەغداد، ١٩٦٢، ل٣٣.
٢- هـ. س: هـ. ل.
٣- مەلا رەئوف سەلیم حەویزی: کوردستان و ئایینی ئیسلام هاتنی سوپای عومەری کوڕی خەتاب و گرتنی کوردستان، بەغداد، ١٩٧٠، ل٨٣.
٤- سەفین جەلال فەتحوڵلا: شاری کۆیە، بەشی یەکەم، لێکۆڵینەوەیەکی (مێژوویی - جوگرافی - کۆمەڵایەتییە) هەزارمێرد، گۆڤار، ژ ١٥، ل١٥٢.
٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز جەمال ئەندراوس مەتی: ٢٠٠٧/٢/٩، کۆیە.
٦- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز فەریدە شەمعون گورگیس: ٢٠٠٧/٢/٥، کۆیە.
٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز پێسان یەعقوب ئیبراهیم: ٢٠٠٧/٢/١١، کۆیە.
٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز یوسف تۆما یوسف: ٢٠٠٧/١/٦، کۆیە/ هەرمۆتە.
٩- دەستنووسێکی بەجێماوی نووسەر (حەننا ئەنتوان).
١٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٦/١٢/١٤، کۆیە/ هەرمۆتە.
١١- تاهیر ئەحمەد حەویزی: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٣.
١٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هۆرمز عیسا کەریم، ٢٠٠٧/١/١٨، کۆیە / هەرمۆتە.
١٣- هـ. س، ل٧٥.
١٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز بەهار یەعقوب، ٢٠٠٧/١/١٩، کۆیە.
١٥- شاكر مصطفى سليم: قاموس الانثربولوجيا، لندن، ١٩٨١، ص٦١.
١٦- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز پولس فرنسی نوعمان، ٢٠٠٧/٢/١٥، کۆیە.
١٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز جەمال ئەندراوس مەتی، ٢٠٠٧/٣/١٥، کۆیە.
١٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز بوترس فرنسی نوعمان، ٢٠٠٧/٣/١٦، کۆیە.
١٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٦/٢/١٢، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هورمز عیسا کەریم: ٢٠٠٦/١٢/١٣، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢١- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز سلێوە عیسا کەریم: ٢٠٠٦/١٢/١٢، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز مرقۆس ئۆدیس سلێمان: ٢٠٠٦/١٢/١٥، کۆیە/ هەرمۆتە.

٢٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٧/١/١٤، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هورمز عیسا کەریم: ٢٠٠٧/١/١٤، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز سلێوە عیسا کەریم: ٢٠٠٧/١/١٦، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢٦- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٧/١/١٦، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز مرقوس عۆدیش سلێمان: ٢٠٠٧/١/١٥، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٧/١/١٦، کۆیە/ هەرمۆتە.
٢٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هۆرمز عیسا کەریم: ٢٠٠٧/١/١٦، کۆیە/ هەرمۆتە.
٣٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز سلێوە عیسا کەریم: ٢٠٠٧/١/١٦، کۆیە/ هەرمۆتە.
٣١- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٧/١/١٧، کۆیە/ هەرمۆتە
٣٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز مرقۆس عۆدیش سلێمان: ٢٠٠٧/١/١٠، کۆیە/ هەرمۆتە.
٣٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٧/١/١٦، کۆیە/ هەرمۆتە.
٣٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز یەعقوب ئیبراهیم: ٢٠٠٧/١/٢٠، کۆیە.
٣٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز پۆلس فرنسی نوعمان: ٢٠٠٧/١/١٩، کۆیە.
٣٦- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز ئاهەنگ ئیسحاق: ٢٠٠٧/١/٢٦، کۆیە.
٣٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز جەمیل عیسا: ٢٠٠٦/١١/١٥، هەولێر.
٣٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٧/١/٣، کۆیە/ هەرمۆتە.
٣٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز مرقۆس عۆدیش سلێمان: ٢٠٠٧/١/٢، کۆیە/ هەرمۆتە.
٤٠- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز جەمال ئەندراوس: ٢٠٠٧/٣/٩، کۆیە.
٤١- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز سلێوە عیسا کەریم: ٢٠٠٧/٣/٨، کۆیە/ هەرمۆتە.
٤٢- هاوژین سلێوە (جەژنی سەری ساڵ و چەند دیاردەیەک)، هەنگاوی نوێ، ژ ٥، ٢٠٠٤، ل١.
٤٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز ئاهەنگ ئیسحاق: ٢٠٠٦/١١/٢١، کۆیە.
٤٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز کەریم عەزیز بوترس: ٢٠٠٧/٢/٢٨، کۆیە.
٤٥- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز یەعقوب ئیبراهیم: ٢٠٠٧/١/٣، کۆیە.
٤٦- تاهیر ئەحمەد حەویزی: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٥.
٤٧- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز ئاهەنگ ئیسحاق: ٢٠٠٧/١/٢٢، کۆیە.
٤٨- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز پۆلس فرەنسی نوعمان: ٢٠٠٧/٣/١٩، کۆیە.
٤٩- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز یەعقوب ئیبراهیم: ٢٠٠٧/٣/١٢، کۆیە
٥٠- تاهیر ئەحمەد حەویزی: سەرچاوەی پێشوو، ل٧٢.
٥١- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ٢٠٠٦/١٢/٢، کۆیە/ هەرمۆتە.
٥٢- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز سلێوە عیسا کەریم: ٢٠٠٦/١٢/٢٢، کۆیە/ هەرمۆتە.
٥٣- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هورمز عیسا کەریم: ٢/ ٢٠٠٧/١، کۆیە/ هەرمۆتە.
٥٤- چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز هاوژین سلێوە عیسا: ١٢/ ٢٠٠٦/١، کۆیە/ هەرمۆتە.



# ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٤٦

عاسم حەیدەری

جەژنی نەورۆز جەژنێکی نەتەوایەتی کۆنی میللەتی کوردە، هەزاران ساڵە کورد یادی ئەم رۆژە رووناک و بە بەهایە دەکاتەوە، ئەو رۆژەی کاوەی ئاسنگەری رۆڵەی نەتەوەی دڵسۆز ئالای شۆڕشی گەلی کوردی رەنجبەری هەڵکرد، لە دژی ستەم و زۆرداری شاهەنشاهی بێبەخت ئەژدەهاک (زوحاک) بۆ ئەوەی ئەو زۆردارە لەناو ببرێ، ئەژدەهاک هەموو رۆژێ دوو لاوی دەکوشت بۆ ئەوەی بیانکا بە خۆراکی ئەو دوو مارەی لەسەر شانەکانی شین ببوون، گەلی ئازا و پاڵەوان بەسەر زۆرداردا زاڵ بوو و شاهەنشای بەدفەڕی کوشت و جاڕی یەکسانی و ئازادی و برایەتی دا.

ئەمە رۆژێکی تازە بوو، دوای زستان و سەرما و بەفر و بارانیش بوو، بەفر توایەوە، درەخت چرۆی دەرکرد زەوی کراسی سەوزی لەبەرکرد، باڵندە خەریکی جریوە و بڵاوکردنەوەی ئاوازە خۆشەکانی بوو، قاسپەی کەو گۆرانی بلبل دنیای پڕ لە ئاواز کردبوو، ئاوی زەلال لەسەر شاخ و قەدپاڵ و گردەکاندا دەهاتە خوارەوە، بەهەشتێک بوو بۆ خۆی.

ئەم رۆژە تازەیە رۆژی نەورۆزە، رۆژی سەری ساڵی کوردییە، ئەو رۆژەی کاوەی ئاسنگەر نەتەوەی لە زۆرداری رزگار کرد، کوردەکان بە درێژایی رۆژگار یادی ئەم رۆژە پیرۆزە دەکەنەوە، دەچنە دەرەوەی شار و دێهات، هەرە جوانترین جلیان لەبەر دەکەن، بە خۆشی رادەبوێرن ژن و پیاو شایی و هەڵپەڕکێ دەکەن لەسەر ئاوازی مۆسیقای نەتەوەیی، دەهۆڵ و زوڕنا و دەف و شمشاڵ، چەکمەڕەق و سوارچاکەکان تەڕاتێن

و رمبازی دەکەین بە یادی ئەم رۆژە پیرۆزە.

نووسەر و شاعیر و رۆشنبیرانی کورد دەورێکی گەورەیان هەبوو لە هاندانی خەڵکی بۆ یادکردنەوەی ئەم جەژنە، شاعیری نەمری کورد پیرەمێرد و هی هەموو ساڵێک ئاگرێکی زۆریان لەسەر لوتکەی شاخەکان دەکردەوە لە شاری سلێمانیدا، بە رۆژیش خەڵکی دەچوونە دەرەوەی شار، کۆڕیان دەبەست، باسی نەورۆز و بیرەوەریان دەگێرایەوە لە بابەت مێژووی نەتەوەی کوردەوە، هەروەها لە کۆیە و هەولێر و رەواندوز و شاری کوردی دیکەیش ئەم ئاهەنگانە گێردران.

لە سەرەتای چلەکانی ئەم سەدەیە و لەپێش هێرشە تاوانبارەکەی ئەڵمانیای هیتلەری فاشستی بۆ سەر خاکی سۆڤیەت، نەتەوە ژێر دەست و بەش خوراو و بێ مافەکان دەستیان بە خەبات کرد، بیری نەتەوایەتی دیموکراتی، پەرەی سەند و بڵاوبووەوە، لە ئەنجامی ئەمەدا هەندێ رێکخراو و پارتی نەتەوەیی لە کوردستانی عێراقدا پەیدابوون... (پارتی هیوا) یەکێک بوو لەم رێکخراوانە، دەورێکی باڵای هەبوو لە هاندانی کورد بۆ زیندووکردنەوەی رووداوی نەتەوایەتی لە مێژووی کورددا،



بەهۆی هاندانی پارتی هیوا لە ساڵانی ١٩٤٤ - ١٩٤٥ لە هەندێ شارەکانی کورد ئاهەنگی نەورۆز گێردرا، لە ساڵی یەکەمدا لە هەولێر لە جێگەیەک لە دەرەوەی شار، کە ناوی (زار مفتاح)ە، لە ساڵی دووەمیشدا لە دێی (تووڕەق) یادی نەورۆز کرایەوە، ئەم دوو ئاهەنگە بە شێوەیەکی نهێنی کران، بێ ئەوەی دەسەڵاتی میری ئاگای لێبێ.

لە ساڵی ١٩٤٥دا کە دێوی فاشستی نازی کوژرا، زیاتر، بیری نەتەوایەتی لەناو خەڵکی کورددا پەرەی سەند، بیروباوەڕی سۆشیالیزمی بڵاوبووەوە و لایەنگری زۆربوون، لەم کاتەدا پارتی رزگاری کورد هاتە ناوەوە، ئەم پارتییە باوەڕی بەوە بوو، کە کورد نەتەوەیە، دابەشکردنی وڵاتەکەی دەستکردی ئیمپریالیزمە، لەگەڵ ئەوەی خەباتی ئەم پارتییە بە نهێنی بوو، بەڵام گەلێ لە کردەوەکانی ئاشکرابوون، وەکو ئەوەی بۆ یەکەمین جار کورد توانی ئاهەنگی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٦ بە ئاشکرا بگێڕێ، لە بەغدا و لە هەولێر، پارتی رزگاری خەریکی رێکخستنی ئەم ئاهەنگە بوو. لەلای خوارەوە هەندێ بیرەوەری لە بابەت ئاهەنگی شاری هەولێر دەگێرمەوە.

لە سەرەتای مانگی نەورۆز (مارتی) ١٩٤٦ کۆمەڵێک کاسبکار و رۆشنبیری[1] ئەندامانی حیزب و لایەنگرانی عەریزەیەکیان دا بە موتەسەریفی هەولێر، داوای ئەوەیان تیا کرد رێگەیان بدرێ بۆ کۆبوونەوەیەکی گشتی لە دەرەوەی شار بەهۆی جەژنی نەورۆز، جەژنی نەتەوایەتی کورد، لەپاش ئەوەی کە کۆنەپەرستەکان بەمەیان زانی شێت و هاربوون و کەوتنەخۆ بۆ

بەربەرەکـــانێ، لەلایەن هەندێ لەوانەی کە خۆیان بە مەلا دەزانن فـــەتوایان دەرکـــرد، کـــە نەورۆز جەژنێکی زەردەشتییە و لە ئاینی دەرچـوونـە، ئـەوەی بـچـێ بـۆ ئاهەنگەکە کافرە، هەندێ جەردە و رێگریشـــیــــان هـان دا، کـــە بەربەرەکـانێی ئەوانە بکەن، کـە ئاهەنگەکـــە دەکـــەن، لەمـــەدا سەرنەکەوتن، ئینجـا رێگەیەکی خوار و خێـچـتـریان گـرت بەوەی چاویان بە هەندێ لە سەرۆکی دایرە و مووچەخۆرەکان کەوت، ئەوانەی بە زمانی تورکمانی قسە دەکەن، پێـیــان وتـن: هاوار بە مـالـتـان، ئـەوانـەی خـــــەریـکی نـەورۆزن هێرشتـان دەبەنە سەر و تالانتـان دەکەن، لەبەر ئەوە پێویستە تکا لە فـەرمـاندەی تیـپی سـوپای دووەم بکەن، بۆ ئەوەی نەهێـلـێ جـەژنی نەورۆز بکرێ. هەندێک لەم مووچە خۆرانە چوونە کەرکووک و هانایان بردە بەر مـــســـتـــەفـــا راغــیـــبی فەرماندەی تیپی دووەمی سوپا، بۆ ئەوەی ئاهەنگی نەورۆز قـــەدەغــە بکا، مـسـتـەفا راغـیب رووی کردە هەولێـر بۆ ئەوەی ئاهەنگی نەورۆز قـــەدەغــە بکا، بەلام یاریدەدەری موتەسەریف کە شامیل یەعقوبی بوو، باوەڕی بەم قـسـانە نەکـرد و وای لە مستەفا راغیب گەیاند، کە ئەمـە هەمـووی درۆ و دەلەسـەیە، مستەفا راغیبی ئیقناع کرد، بەم جـۆرە کـۆنەپەرسـتـەکـان پاشگەز بوونەوە، ئەم کـردەوەیەی شـامـیل یەعـقـوبی جـێگەی رێز و سـوپاس بوو.

لە رۆژی دوایـیـــدا شـــامـــیل یەعـقـوبی داوای من و کـاک فـایق نادری کـرد، چووینە لای، هەوالی رێگەدانی ئاهەنگەکــــەی داین، هـەنـدێـکـیـش بـاسـی هـەولـی کـۆنەپەرسـتـەکـانی بۆ کـردین لە بابەت قەدەغە کردنی ئاهەنگەوە.

لەو سەردەمەدا شەکر بە پلیت دەفـــرۆشـــرا. بەپێی قـــانـوونی رێکخستنی ژیانی ئابووری ژمـارە (٤١) سـالی ١٩٤٣، داوامـان لە مـوتەسـەریف کـرد، کـە هەندێ شـەکـرمـان بداتێ بۆ ئاهەنگەکـە، بەلێنی پێـدایـن، کـە (٣) کـیـلۆ شـەکـرمـان بداتێ لەوەی، کـە بۆ مــوتـەســەریف تەرخـــان کـــراوە، نامەیەکی بۆ ئەحمەد چەلەبی دەباغ نووسی، لەو کـــاتـەدا وەکـــیـلی دابەشکردنی شـەکـر و چای بوو لە هەولێـر، کـە شـەکـرمـان بداتێ، شەکرەکـەمـان وەرگرت، ئەحمەد چەلەبی پارەی لێـوەرنەگـرتین و کـردی بە باروبۆ دوو دینار و نـیـو و پەنجا فلس بوو، بۆ ئەمـە قاسـەی ژمــارەیەکی کـردەوە و پارەکــەی لێدەرهێنا و خستییە قاسەی ژمارە دووەوە[٢]. لــەپـــاش ئـــەوەی رێـگـەدانـی ئـاهـەنـگـی نـەورۆز بلاوبـووەوە گـــەلێ لە بـرادەرانی حیزب و نیشـتـمـان پەروەرەکان بە پـارە بـاروبـۆیـان بـۆ کــــــردین، ئاهەنگەکە (٨٣) دیناری تێـچـوو هەمووی کۆ کرابووەوە.

بۆ ئاهەنگی نەورۆز لە بەغداوە مـــیـکرۆفـــۆنمان هێنا، جـێگەی ئاهەنگەکـە گـۆڕەپانەکـەی پشت نەخۆشخانەی هەولێر (مستوسفی ئێستا) بوو، ئێستاکە ئەم گۆڕەپانە نەمـــاوە و هەمـــووی بـووە بە خانووبەرە.

ئاهەنگی نەورۆز لە سـەعـات چواری پاش نێـــــوەڕۆی ٢١ی نەورۆزی ١٩٤٦ کـرایەوە، بەیانی ئەو رۆژە کـورسی و قـەنەفـە لە چایخانەکانی هەولێرەوە گوزرایەوە شوێنی ئاهەنـگ، گەلێ لە خەلکی هەولێـریش کـورسی و قـەنەفـەی مـالی خـۆیان هێنا[٣]، بەم جـۆرە جێگەی دە هەزار کـەس جێبەجێ کرا.

رۆژی نـــــەورۆزی ١٩٤٦ رۆژێکی خـۆش بوو، ئاسـمـان پیـرۆزەیی و هەوا فـێنک بوو، لە بەیانیـــیـــەوە خـــەلکی لەناو کـــۆلانەکـانی شـاردا خـەریکی هەلپەڕکێ و گۆرانی بوون.

ئێـواره سـەعـاتێک لەپێش کردنەوەی ئاهەنگ خەلکی روویان کردە گۆڕەپانەکە، پیاو و ژن و لاو و گەورە و بچووک، کەس لە مال نەمابوو مەگەر پیر و نەخۆش نەبن، هەروەهـا بـەشـــــێـکی زۆری

جووتیارەکانی دێهاتی دەوروبەری هەولێریش بەشداریان تێیداکرد، لە پیاوانی میری یاریدەدەری موتەسەریف و فەرماندەی ئۆردوو و بگیری پۆلیس و حاکمەکان و سەرۆکی شارەوانی و بەشێکی زۆر لە مووچەخۆرەکان بەشدار بوون.

ئاهەنگ بە سروودی (ئەی رەقیب)[4] ی نەتەوایەتی لەلایەن هەندێ لە قوتابیانی قوتابخانەکانی سەرەتایی هەولێر کرایەوە، لە پاشاندا کۆمەڵێک لە لاوە کوردەکان شایی و هەڵپەرکێیەکی جوانیان پێشکەش کرد، ئینجا بەناوی لیژنەی ئاهەنگەوە وتارێک خوێندرایەوە، لە وتارەکەدا وترا کە ئەم جەژنە جەژنێکی نەتەوایەتی هەموو کوردە، ئەو نەتەوەیەی وڵاتەکەیان لەلایەن ئیمپریالیزمەوە دابەش کراوە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی، ئەو ئیمپریالیزمەی کە لەسەر سیاسەتێکی میکاڤیلی دەڕوا بۆ مانەوەی دەسەڵاتی، لەبەر ئەوە پێویستە ئێمەی نیشتمان پەروەرانی کورد لە عیراقدا خەباتێکی بێوچان لەگەڵ نیشتمان پەروەرە عارەبەکان بکەین، لە بەرگرییەکی بەریندا لە دژی ئیمپریالیزم بۆ وەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی و نیشتمانی و سەربەستی دیموکراتی، دەبێ لە ئەنجامیش نەترسن، ئەم وتارە بە شیعرێکی نازم حیکمەت دوایی پێ هێنرا: "من نەسووتێم، تۆ نەسووتێی، ئەو نەسووتێ، چۆن لە تاریکییەوە دەڕۆین بۆ رووناکی".

لە پاشان هەندێ گۆرانیبێژ گۆرانی کوردیان پێشکەش کرد، شاعیرێکیش لە بابەت نەورۆزەوە هەندێ شیعری خوێندەوە، ئینجا ماوەی پشوودان دەستی پێکرد و چایە و شیرینی بەسەر میوانەکان دابەش کرا، جارێکی تر هەندێ شایی و هەڵپەرکێی کوردی پێشکەش کرا، لە پاشاندا قوتابییەک وتارێکی بە ناونیشانی (جەژنی نەورۆز و لاوەکان) خوێندەوە، کۆتایی ئاهەنگ بە سروودێکی نیشتمانی هات.

لە پاش کۆتایی پرۆگرامەکانی ئاهەنگ، جێگری موتەسەریف هەڵسا و سوپاسی پێشکەشی لیژنەی ئاهەنگ کرد، هەروەها خەڵکەکەش بە دڵخۆشییەوە سوپاسی ئەو کەسانەیان کرد، کە ئاهەنگەکەیان رێک خستبوو.

لە ساڵانی ١٩٤٧، ١٩٤٨ دیسانەوە ئاهەنگی نەورۆز بە ئاشکرا لە شاری هەولێر کرا، بەڵام لە پاشاندا ماوەی رەشبگیری لە عیراقدا دەستی پێکردەوە، لەبەر ئەوە بوو ئاهەنگەکانی نەورۆز بە نهێنی دەکران تا شۆڕشی ١٤ی تەموزی ١٩٥٨.

لە پاش شۆڕشی ١٧ی تەموزی ١٩٦٨ بە پێی بڕیاری ئەنجومەنی فەرماندەی شۆڕش نەورۆز بوو بە جەژنێکی رەسمی نەتەوایەتی میللەتی کورد و ماوەی حەسانەوە لە هەموو عیراقدا.

**پەراوێزەکان:**

١- ئەوانەی عەریزەکەیان ئیمزا کردبوو ئەمانەن: ئەنوەر فەیزی، شێخ محەمەد، یونس یەحیا، فایق نادر، مەولوود شێخ محەمەد و هی تر، کە ناویانم لە بیر نەماوە.

٢- لە ئەحمەد چەلەبیمان پرسی هۆی دەرهێنانی ئەم پارەیە لە قاسەی یەکەمەوە بۆ دووەم چییە؟ وتی: قاسەی یەکەم هی خۆمە، بەڵام دووەم بۆ پارەی شەکر و چایە، ناهەوی پارەی شەکرەکە قەرز بێ لەلام.

٣- لەمانە خوالێخۆشبوو، رۆستەم جەبار، رەئوف قانلی و فایق نادر بوون.

٤- "ئەی رەقیب" لە شیعری یونس رەئوفی دڵدارە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (دەفتەری کوردەواری)، بەرگی دووەم، مارت - نیسانی ١٩٧٠ بڵاوبۆتەوە.

# ئاهەنگی جەژنی نەورۆزی سالّی ١٩٤٧ی شاری هەولێر

هوشیار عەبدوللا

لە ٢١ی ئاداری سالّی ١٩٤٧ز بۆیەکەم جار لەناوشاری هەولێر ئاهەنگی جەژنی نەوروز بەڕەسمی و بەئاشکرا کرا، ئەمەش مۆلّەت پێدراو بوو لەلایەن سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتی عێراق خوالێخۆشبوو (نوری پاشا- نوری سەعید) ئەمەش بە هەولّ و هیممەتی خوالێخۆشبوو پارێزەر (عەونی یوسف ئەحمەد ئاغای تریەسپیانی) و بەیارمەتی موتەسەریفی ئەوکاتی شاری هەولێر (جەمال عومەر نەزمی) و وەزیری ناوخۆی ئەو سەردەم (عومەر نەزمی) باوکی جەمال موتەسەریفی هەولێر، کە بەڕەسەن خەلّکی شارۆچکەی کفری سەر بە پارێزگای کەرکووکن.

چیرۆکی ئەم مۆلّەت پێدانەش بەم جۆرە بوو:

خوالێخۆشبوو (عەونی یوسف) کوڕی قەلاّ و منارە، رۆلّەی بەئەمەک و بەوەفای کوردستان رۆلّێکی زۆر گەورە و کاریگەری هەبووە لە هوشیار کردنەوەی دانیشتووانی شاری هەولێر و دەوروبەری بەتایبەتی دەڤەری دزەییاتی، بەخوشی باپیرەی (ئەحمەد ئاغا) کە لەناوشاری هەولێر بە (ئەحمەد ئاغای تریەسپیانی) ناودەبراو لە زەمانێکی زووەوە کەوتبوونەتە ناوشاری هەولێر و لەقەلاّ بەرز و سەرکەشەکەی نیشتەجێ بوون، کاک عەونی گەلێک جاران دەربارەی نەورۆزی سالّی ١٩٤٧ز بۆ دۆست و هەڤالانی گێڕاوەتەوە کە چۆن مۆلّەتی ئاهەنگی نەورۆزی وەرگرتووە، خوالێخۆشبوو عەونی دەلّێت:

لە ئاداری سالّی ١٩٤٧ لەگەلّ چەند هەڤالێکی دلّسۆزی نەتەوەکەمان سکالایەکمان پێشکەش بە موتەسەریفی ئەوکاتی هەولێر کرد کە خوالێخۆشبوو (جەمال عومەر نەزمی) بوو، بۆ ئەوەی رێمان پێبدات ئەم سالّە ئاهەنگی جەژنی نەوروز بە ئاشکرا بگێرین، ئەویش رێی پێدان، لە کاتێکدا سەرقالّی ئەوە بووین خۆمان ئامادە دەکرد بۆ ئاهەنگەکە کەوا موتەسەریف بەدوایدا ناردم و پێی گوتم: «لە رێپێدانەکەتان پاشگەز بوویەوە»، گەلێک لەگەلّمان هەولّدا، بەلاّم بێ سوود بوو، لەئاخیرا گوتی: من رێگایەکتان بۆ دادەنێم بۆ ناچیتە بەغدا بۆلای باوکم وەزیری ناوەخۆیە، بەلّکو یارمەتیەکتان بدات و رێگاتان پێبدات. عەونی یوسف دەلّێت یەکسەر چوومە بەغدا و چاوم بە وەزیری ناوەخۆ (عومەر نەزمی) کەوت، دەربارەی بابەتەکە گفتوگۆیەکی دوور و درێژ و زۆرمان کرد، وەزیر وای نیشان دا کە ئەو رێپێدانە لە دەسەلاتی ئەودانییە، ئەوە لە دەسەلاتی سەرۆکی وەزیرانە، کە ئەویش (نوری پاشا- نوری سەعید) بوو،

گــــــوتی: هەر ئەویش بوو فەرمانەکەی هەڵوەشاندۆتەوە کە ئاهەنگەکە نەکرێت. منیش داوای ئەوەم لێکرد کە بەڵکو یارمەتیەکمان بدات بۆ ئەوەی چاوم بە سەرۆکی وەزیران بکەوێت ئەویش واتە (عومەر نەزمی) یەکسەر تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و قسەی لەگەڵ نوری سەعید کرد و پێی گوت: «پاریزەرێکی کوردی خەڵکی هەولێر لێرەیە و هاتووە دەیەوێت بتبینی» پاش ئەوەی رەزامەندی سەرۆک وەزیرانی وەرگرت بۆ چاوپێکەوتنەکە، منیش یەکسەر چوومە دیوانی سەرۆک وەزیران، لەگەڵ نوری پاشادا دانیشتم و دەربارەی بابەتەکە دواین و گفتوگۆ و قسەمان کرد رەجای ئەوەم لێکرد کە رێگامان پێبدات، یەکەم جار رازی نەبوو، بەڵام لە کۆتاییدا بەرێزیان رێی پێداین کە بەئاشکرا ئاهەنگی نەورۆز بگێرین، ئەم چاوپێکەوتنەم نزیکەی (٢٠) بیست دەقیقەی خایاند و یەکەم جار و دواجارم بووە لەگەڵ نوری سەعیددا. شوێنی ئاهەنگ گێرانەکە لە خوارووی تاوەری مایکرۆ وێفی هەنووکە بووە، ئەوکاتی ئەو شوێنە چۆل بووە و سەرەتای رێگای هەولێر- موسڵ بوو. سەبارەت بە بەرپاکردنی ئاهەنگەکە ئاڵۆزییەک پەیدا ببوو، کۆمەڵێک لەوانەی کە خۆیان بەئایین پەروەر لەقەڵەم دەدا دژی ئەوەی بوون کە نابێت لە ئاهەنگی نەورۆزدا ئاگر بکرێتەوە، لێرەدا دەبێت هەڵوێستی خوالێخۆشبوو (شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما) باوکی خوالێخۆشبوو شێخ کاکە لەیاد نەکرێت کە چ هەڵوێستێکی ئایین پەروەرانە و کورد پەروەرانەی هەبووە، چونکە شێخ پیاوێکی زانا و دانا و نەبەرد و چاونەترس بووە، کاتی خۆی پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ خوالێخۆشبوو (شێخ مەحموودی حەفید)دا هەبوو، هەموو ساڵێک سەردانی شێخی حەفیدی کردووە لە (داریکەلی)، بۆیە وەفدێک چوونەتە لای شێخ لەوانە خوالێخۆشبووان، عەونی یوسف ئەحمەد حەمەدەمین، عاصم حەیدەری، شێخ بەزیرەکی خۆی توانیویەتی هەردوو لایەنەکە بگەیەنێتەیە و هەردوو لایان رازی بکات کەوا ئاهەنگەکە بگێرن، بەڵام ئاگر نەکرێتەوە.

ئاهەنگەکە بریتی بوو لە سروود و وتار خوێندنەوە و شیعر و گۆرانی و هەڵپەرکێی کوردی، لەو ئاهەنگەدا گۆرانیبێژی بەناوبانگی شاری هەولێر خوالێخۆشبوو (حەیدەر عەبدولڕەحمان) ناسراو بە (حەیدەرە کەچەڵ) چەند سروود و گۆرانییەکی پێشکەش کرد، مامۆستا (زەکی بارۆخ)یش کە مامۆستایەکی جوولەکەی شاری هەولێر بوو مۆسیقا ژەن بوو، کەمانچەی دەژەنی. کاک (عومەر حەمەدەمین) ناسراو بە (هۆمەری دزەیی) کە ئەوکاتی منداڵ بوو لە قوتابخانەی یەکەمی سەرەتایی هەولێر چەند گۆرانییەکی پێشکەش کرد.

هەروەکو کاک عومەر لە کتێبەکەیدا بەناوی (چیرۆکی ئەویندارییم) لەلاپەڕە (٢٥٩)دا دەڵێت: «لە نەورۆزی ساڵی ١٩٤٧ کە هێشتا نۆساڵان بووم، بۆیەکەم جار لە ژیانمدا لەبەردەم مایکرۆفۆن و لەبەرچاوی پتر لە بیست هەزار میوان سروود و گۆرانی کوردیم گوت.

جا بۆ رێزلێنان لە هەڵوێستی (شێخ عەبدولکەریمی دارە خورما) بۆ رۆژی دوایی ئاهەنگەکە خوالێخۆشبووان: ئەحمەد حەمەدەمین و سالح شێرە سەردانی شێخ دەکەن و دوو قوتییە چوکلێتیش دەبەنە تەکیە و شێخ بەسەر دەروێشەکانیدا دابەشی دەکات

سەرچاوەکان:

١- شخصيات تتذكر، طارق ابراهيم شريف الجز و الاول، اربيل.

٢- هەولێرم وادیوە و بیستووە، مەولود بێخاڵی / هەولێر- ١٩٩٧.

٣- کۆمەڵێک لە تەمەندارای شاری هەولێر ئەوانەی لەنزیکەوە هەڤاڵ و دۆستی عەونی یوسف بوون لەوانە حاجی محەمەد عومەر عەبدوڵلا.

# کەلەپووری هەولێر

**نافیع دیبەگەیی**

کورد بە درێژایی مێژوو کەلەپووری خۆی بەگشتی لە کارتێکەری کەلەپووری داگیرکەرە دراوسێکانیدا پاراستووە، هەرچەندە سروشتییە کەلەپوورە هاوسێکان پێکدەگەن، بەڵام هەمیشە زۆر بەسەر بۆردا زاڵ بووە.... دابونەریت، زمان، کارو پیشە، تەنانەت شەڕ و پێکدادان، لە بەراییدا زمانی کوردی خۆی پاراستووە لە کاریگەریی زمانانی داگیرکەران و لەگەڵ ئەوەی کە تا رادەیەک بەیەکگەیشتن لەگەڵ زمانانی دراوسێ تیایدا دەرکەوتووە، بەڵام ئەوەش کەموزۆری هەبووە و وا لێکدراوەتەوە خۆ پارێزی زمانی کوردی دەگەڕێتەوە بۆ قایمی جوگرافیای شاخاوی کوردستان، کە کورد لە خەڵکی دیکە تەواو دابڕ بکات، کەچی سەبارەت بە ئایینی ئیسلام زمانی عەرەبی تا رادەیەک کاریگەری لە زمانی کوردی هەیە هەرچەندی کەمیش بێت و لە بارتەقای ئەوەش زمانی کوردی کاریگەری لە زمانی عەرەبی هەیە و ئەگەر بەدواداچوون هەبێت دەیەها زاراوە و دەستەواژەی کوردی لەنێو عەرەبیدا بەسەر دەکرێتەوە. هەرچەندە ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی زۆری بۆ زمانی کوردی و تەنانەت باری کۆمەڵایەتی هێناوە، بەڵام هەمیشە پێشی گیراوە. لێرەدا پتر مەبەستم بەرەنگاربوونەوەی زمانی کوردییە لە کاریگەری زمانی ئایینی ئیسلام و پرۆسە بەردەوامەکانی بە عەرەبکردنی سەردەمی عرووبە.

دیارە پیشەی داگیرکەرانی کوردستان بە تایبەتی عەرەب و تورک بە تالانبردنی سەروەت و سامان و کلتوور و زمان و مێژوو و تەنانەت کەسێتی کورد بووە و لەولاشەوە بە تۆزێک شێواندن و گۆڕینی سەروسیما بەکورد فرۆشراوەتەوە، دیارە نەزان و خەواڵۆبانی گوێی گا نایانناسنەوە، بەڵام مرۆڤی هوشیار توانیویەتی پەی بەو رەفتارە دزێوانەی داگیرکاران ببات، ئەوەی جێگای سەرنج و سەرسوڕمانیشە کاتێک دڵسۆزێکی کورد راستییەک بەسەر دەکاتەوە، ئەوا هەر خۆ کوردی لێی دەبنە دڕک و بە قازانجی دوژمن مامەڵەی لەگەڵ دەکەن جا لەبەر کەمزانی بێت یان بە فیتی دوژمن، لەو روانگەیەوە ئەو لایەنە شی دەکەمەوە، کە چۆن زمانی کوردی و کلتووری کوردی خۆپارێزییان کردووە بەرامبەر بە بەعەرەبکردن لە ناوچەیەکی دیاریکراوی کوردستاندا، ئەویش دەشتی هەولێرە، واتە شەمامک و مرکیە و کەندێناوە و قەراج، بەڕانیان بەو پێیەی هەمیشە کاریگەری پتری هەموو لایەنەکان دەکەوێتە ناوچە سنوورییەکان، کە لەو نێوەندانە کورد لە زمان و کلتوورەکانی بیانی

دەسوویێت. بە سەرنجدان لە نەخشەی باشووری كوردستان دەبینرێ ناوچە سنوورییەكان لەگەڵ عەرەبەكان وەكو هێلێكی جودا دیارە، لە باكووری خۆراواوە بۆ باشووری خۆرهەڵات، بەبێ گومان كاریگەری لەسەر ئەو هێڵە پترە. بە سەرنج و لێكۆڵینەوە دەردەكەوێت كاریگەری زمان و كلتووری عەرەب لە ناوچەكانی باكوور و ناوچەكانی باشووری ئەم هێڵە زۆرە، بەڵام لەسەر ئەو هێڵە لە سنووری ئەو ناوچانەی باسمان كردن كاریگەری بەئاشكرا دیارە زۆر زۆر كەمە، واتە لە باكوور تا دەگاتە سەر زێی گەورە و لە باشووریش تا دەگاتە سەر زێی گچكە، كەوا نێوان هەردوو زێكەش سنووری قەزای مەخموورە، شەمامك، كەندێناوە، قەراج، كاریگەری كلتوور و زمانی عەرەب نەک هەر كەمە، بەڵكو لە نەمان نزیک بۆتەوە، ئەوە یەكێكە لە سیماكانی زمانی كوردی لەو نێوەندە بە قبووڵ نەكردنی كلتوور و زمانی عەرەب بەهیچ زاراوە و دەستەواژەیەک بە كەلەپوور هەموو بابەتەكانییەوە فۆلكلۆر و دابونەریت، جلوبەرگ، كاروپیشە، تەنانەت خواردن، لێرەدا ناڵێم كلتووری ئایینی عەرەب وەكو ئیسلام زاڵ نەبووە لە فەرزو واجباتەكانی ئایینی، ئەگەر بە وردی سەرنج لە زمانی ئاخاوتنی دەشتی هەولێر بگرین بە گشتی، دەبینرێ جوداییەک هەیە لەگەڵ زمانی كوردی هەموو ناوچەكانی سەر سنووری عارەبان، كە ئەو جوداییە لە چەند خاڵێكدا خۆ وەدەردەخەن كە قبووڵی زمانی عەرەبی ناكەن:

* جودا نەكردن لەنێوان دەنگەكانی (ح) و (ع).

* جێگۆڕكێ كردنی دەنگەكانی (ح)، (ع)، (هـ)، (هەمزە) لەگەڵ یەكدی.

* كەم گۆكردنی (ڵ) لامی قەڵەو یاخود گۆڕانی بە (ر) رای لاواز.

* گۆ نەكردنی دەنگی (ج، چ) وەكو عارەبان، یاخود پاراستنی بەشێوەی رەسەنی خۆی، وەكو وشەی (جوان - jewan) (چەند- cend) كە خاسیەتێكی تایبەتی و رەسەنی لەشێوە زمانی كوردی دەشتی هەولێر بۆ ئەو دوو دەنگە هەیە و لە جێگاكانی دیكەی سەر سنوور و تەنانەت نا سنوورییەكانی دیكەش نییە. خەڵكی ئەو دەشتە كە دەكەونە نێوان دوو زێیان و رووباری دیجلە ئەو دوو دەنگە وەكو دەنگەكانی زمانی عارەبی دەرنابڕن و ناخرێتە سەر شێوە و گۆتەی دەنگەكانی (ج، چ)ی زمانی عارەبی یاخود هەر زمانێكی دیكەش وەكو لە وشەی (جمیل، جمال) كە دەنگیان وەكو دەنگی (ج)ە، لە وشەی (GENERAL)ی ئینگلیزی، هەروەها بۆ دەنگی (چ) لە عامییەدا، بەڵكو (ج، چ)ی كوردی رەسەن شێوازێكە و لە باقی ناوچەكانی دیكەی كوردستان گوتەیان كەمە، واتە كاریگەرن بەزمانی بیانی، بەڵام لە دەشتی هەولێر نەكەوتوونەتە بەر هیچ كارێک و وەكو خۆیان ماون.

* تەقبوول نەكردنی دەنگە عەرەبییەكانی وەكو (ط، ظ، ص، ض، ذ، ث) بە هیچ جۆرێک لەو دەشتە، تەنانەت گەر یەكێ بە عارەبیش قسە بكات مەگەر یەكێكی تایبەتمەند نەبێت لە زمان، ئەگینا هەر بەسەریەوە دیارە، كە ناتوانرێ تەواوگۆ بكرێن.

وەک روونە ئەو خاڵانەی باسكران كە لە راستیدا لایەنێكی پۆزەتیڤی زمانەكەمانە بۆ بەرەنگاری و بەرپەرچدانەوەی بەعارەبكردن لە كۆن و نوێدا و هەمیشە خەڵكی قەراج و كەندێناوە و شەمامک و مركیە و بەرانیان پەیرەویان كردووە، جا ئەوە خۆویستی بێت یاخود خۆنەویستی، خۆویستییەكە بریتییە لە هۆشكردن بە هەستی نەتەوایەتی و جوداخوازی و تەحەددای زمانی عارەب بەسەر زمانەكان. خۆنەویستییەكەش بریتییە لە پێكهاتەی گەرووی رەسەنی مرۆڤی كورد و چۆنیەتی دەربڕین، دیارە گەرووی مرۆڤی ئەو دەشتە وەكو ئەوەیە تایبەت بۆ دەنگە رەسەنەكانی زمانی كوردی خولقابن، یان ئەو گەروانەی خەڵكی كورد لەو نێوەندە ئەو دەنگە رەسەنانەی تایبەت بەقالب و قەوارەی گەرووی خۆی دەربڕیوە، ئەگەر دوور لە هیچ مەبەست و بەشێوەیەكی ئەكادیمییانە شارەزاو زمانەوانان لەوە بكۆڵنەوە بە دڵنیایی

دەگەن بە مەبەستی ئەوەی خەلکی ئەو نێوە بۆ دەنگی (ح، ع) لێکدی جودا ناکەن و چەندان گۆتەی عەرەبی وەکو عەرەب گۆ قبوول ناکەن، تەنانەت ئەگەر وشە و زاراوەی عەرەبیش کە هاتوونەتە نێو زمانەکەمان گۆ بکەن، ئەوا جێگۆڕکێ بە شوێنی پیتەکان دەکرێ، وەکو (جومعە- ربع) دەبن بە (جوعمە- روعب)، (حج- عمر) دەبنە (عەج- حومەر)، (طالب) بۆتە تابیل، (فقط) بۆتە (فەتەق)، (سورة فاتحة) (سوورەتی فاتیعە، ئەوە سەرەڕای بەدەگمەن گۆتەکردنی (تائی تەئنیس) لە ناوەکانی (خەدیجە، رابحە، فاطمە، عائشە) کە بوونەتە (خەجێ، رابی، فاتێ، حەیشێ، ئاییش)، تەنانەت ناوی (جمیلە) دەبێتە جەمیل بۆ ئافرەتان.. سەبارەت بە دەنگی لامی قەلەو (ڵ) و گۆڕانی بە ڕێی لاواز (ر) ئەوەش بەبێ حیکمەت نییە، لامی قەلەو لە هەموو قۆناغە رابردووەکانی زمانی کوردی یاخود بلێین بەپێی سەردەمەکان بە بەردەوامی بوونی نەبووە و لەکەم سەردەم ئەو دەنگە هەبووە، بەلکو لە سەدەکانی دوایی دەرکەوتووە، ئەو دەنگە لە زمانی تورکی بوونی زۆرە و رەنگە ئەوەش کاریگەرەکە بێت، کەوا زیندوو بووبێتەوە، کەچی لە دەشتی هەولێر هێشتا بەپێی پێویست جێگای خۆی نەگرتووە، هەرچەندە زۆر وشە هەیە دەنگی لامی لە رەسەن لاوازە، کەچی قەلەو کراوە و لەو نێوەندە هەر بە لاوازی ماوەتەوە، وەکو لە (تالەموو، دلۆپ، چێل، چلێس)، کە لەڕاستیدا (تارەموو) تار واتە داو (دروپ، چێر، چرێس)... لە زمانی عەرەبیدا (چریس) بە واتای دەم جوولان دێت، کە لە وشەی (چرز) دادەبینرێ و لە کوردیشدا چلێس واتە مانگایەک دەم بۆ هەموو شت ببات و بیخوات، کە بەردەوام دەمی بجوولێت بۆ خواردن.

هیچیش سەیر نییە کە جاروبار گوێم لێبووە بە (کارەبا) گوتراوە (کالەبا) واتە گۆڕینی ڕێی لاواز بۆ لامی قەلەو...

روونە ئەگەر زۆر لە ناوچەکانی کوردستان تەقەبوولی کاریگەری زمانی بێگانە کراوە و لەسەری راهاتوون، ئەوا مەرج نابێت هەموو ناوچەیەک بەمجۆرە بکەوتە ژێر رکێف. مخابن تا ئێستا لێکۆلینەوەیەکی زانستی و ورد دەربارەی ئەو دیاردەیەی زمانی کوردی ئەو دەوروبەرە نەکراوە، هەرچەندە وەکو پەلارە قسە گوێ بیستی بووینە. بە دلنیاییی ئەو دیاردانە خاسیەتێکی تایبەتی زمانی کوردی ئەو دەشتەن و بەرەنگاریبوونەوەی زمانی کوردییە بەرامبەر تەحەددای زمانی بیانی، مخابن بەرگوێ کەوتووە زۆرکەس وەکو ئەوەی لەم سەر عیلم و مەعریفە هاتبنەوە دەلێن: خەلکی دەشتی هەولێر تا ئێستا (ع، ح) و (ڵ، ر) لێک جوداناکەنەوە، بەبێ ئەوەی بیر لە لایەنی زانستی و لایەنی پۆزەتیڤی بکرێتەوە، چونکە ئەگەر کورد برێک بایەخی بە ئاسایشی نەتەوەیی خۆی بدابا، ئەوکات دەگەیشتنە ئەو باوەڕەی ئەو دیاردانە رەسەنایەتی و خۆپاریزی زمان و کلتووری کوردە، کە بەمجۆرە هەمیشە نەکەوتۆتە بەر رکێفی زمانی دیکە، دیاردەیەکی زۆر سەیرە کە زۆرمان کاتێ زاراوە و دەنگەکانی عارەبی یان بیانی بەکاردێنین شانازی بەوە دەکەین، کە وەکو خاوەنی زمانەکە وان و خۆمان تەسلیمی یاساو رێسای زمانی دیکە دەکەین و بە تەرازووی زمانی ئەوان زمانەکەی خۆمان دەپێوین، بەلام باش لێمان عەیانە، بەرامبەر عارەبێک کە دەلێی ناوم کامەرانە دەلێ ها... (کامیران)، گەر بلێی ناوم هیوایە ئەوا دەلێ... (هەیوا).. کەم عارەب هەیە تا ئێستاش بە تەواوی بلێت کورد یان کوردستان بە هەمیشە دەلێن (کرد) (کردستان)، ئەوان بۆ هەموو زمانێکی نا عارەب وان، زانا ئاییینییەکانی تورک و فارس ئێستاش (ث، ض، و)ی عارەبی گۆ ناکەن، تەنانەت لە خوێندنی قورئانی پیرۆزیش هەستی خودپارێزی زمانی خۆیان لێ ناگەڕێت بەراستی ئەو دەنگانە دەرببڕن، لەگەل ئەوەی باشیش دەزانن و دەتوانن دەنگەکانی دەربڕن... وەک دەلێن (سیراتەللەزینە)، (قەل هەمرو)، کەسێکیشیان باسی ئەوە ناکەن...

کەچی خۆمانی کورد بە عەلمانی و ئیسلامیمان دەمانەوێ منداڵی کورد لەسەر تەلەفوزی عارەبی رابهێنین، ماوەیەک لەمەوبەر لە تەلەفزیۆنێکی کوردی منداڵی وا رادەهێنا چیدیکە نەڵێن عوسمان، چونکە هەڵەیە و راستییەکەی (عثمان)ە... ئەوە دەردی کوردە و ترسناکتر لەوەش ئێستا ماوەیەکە زۆر رۆشنبیریش و تەنانەت سیاسیش وا فێربوونە بڵێن (کوردەکان) وەکو ئەوەی خۆیان کورد نەبن و لە تەرجەمەی (الاکراد) و (کوردس) دەیانکرنەوە، بیانییەک مافی خۆیەتی پێمان بڵێ کوردەکان وەکو ئەوەی ئەو لە کورد نییە، بەڵام کورد خۆی بۆ بەخۆی بڵێ (کوردەکان) بۆ یەکێکە بڵێت کوردەکان کە خۆی واتە قسەکەر کورد نەبێت... لە لایەکی دیکە کۆکردنەوەی ئەو بابەتە ناوانە لە زمانی کوردیدا نییە، وەکو ئەوەی لە زمانی عارەبیدا هەیە، بۆ گەڕانەوەی سەر ڕاستی و دروستی گوتەی کوردی و زمانی رەسەن ناڵێم سەد لە سەد، بەڵام زاری دەشتی هەولێر نیشانەی مقاوەمەتی زمان و کلتوورە....... لە جیاتی بڵێن (کوردەکان) یان (کوردان) دەگوترێ (ئێمەی کورد) یان (کوردی خۆمان، کوردەواری خۆمان، کوردی ئێران، کوردی قەفقاس).. هتد ئەو نموونانە بۆ ئەوەیە (ئەوانەی سوژنی چاوی خۆیان نابینن دەرزی لە چاوی خەڵک دەبینن).

هەر بەمجۆرە بۆ فۆلکلۆر تەواوی کلتووری نەتەوایەتیمان بە بەردەوامی لە بەرەنگاربوونەوەی بە عارەبکردندا بووە، جلوبەرگ، پیشە، خواردن، نەریت لە دەشتی هەولێر و لەسەر سنووری عارەب وەکو رەش و سپی جودایە و بۆری تێدا نییە دەستووری عارەبی کلۆجێک کاری تێکردبێ... هەرچەندە لە سەرانسەری هێڵی سنوور و لێکسوان تێکەڵایەتیش هەبووە لەگەڵ هۆزەکانی عارەبان، بەڵکو ژن و ژنخوازیش هەبووە لەنێوان کورد و عارەبان سەرەڕای ئەوەی زمانی ئایینی عارەبی وەکو ئیسلام لەنێو کورد زمانی ئایینییە... لەگەڵ هەموو ئەوانە جلوبەرگی ئەو نێوەندە زۆر بە زەقی پارێزگاری لە خۆی کردووە، جا جلی پیاوانە یان ژنانە بێت تاکو ئێستا نەدیتراوە رۆژێک لە رۆژان کوردێک دیشداشەیەکی عارەبی لەبەر کردبێت، یان جۆری جەمەدانییەکەی وەکو هی عارەبان بێت، نەدیتراوە چاکەت لەسەر شەرواڵ لەبەر کرابێت، نەدیتراوە کوردێک لەو دەڤەرە بەسۆلە (نەعلە) بێتە بازاڕ یان بۆ شوێنە گشتییەکان بچێت، کە جگە لە دەشتی هەولێر ئەو دیاردانە لە درێژایی هێڵی سنووری کورد و عارەبان زۆر بەرچاوە، بە جۆرێک کورد و عارەب جوداییان کەم بۆتەوە و بگرە خاسیەتی دەستووری کوردی لە دەستدراوە پێچەوانەی کلتووری دەشتی هەولێر کە پارێزراوە، بۆ

ئافرەتانیش بە هەمان شێوە جلی کوردی جودایی لەگەڵ عارەب لە رادەبەدەرەو تۆزقاڵێک جلی ئافرەتی کورد کاریگەر نەبووە بەهی عارەبان، بەڵکو بە پێچەوانەوە ئافرەتانی عارەب زۆرن، هەوڵدەدەن لاسایی جلی کوردی بکەنەوە، بە تایبەتی کراسی کوردی، کە لە دەشتی هەولێر پێی دەڵێن (کراسی شکاکی)... هەرچەند ئێستا خەریکە کەمبۆتەوە، کراسی ژنانە، بە تایبەتی لە دەشتی هەولێر (کراسی بەباخەڵ) باشترین نموونەی بەرەنگاربوونەوە و خۆپاراستن و جوداکارییە، جۆر و دەستووری ئافرەتی کوردی ئەو نێوەندە بەربەستێکی یەکجار گەورەی لە بەردەم پەرینەوەی کلتووری عارەبی داناوە. دیارە لێرە ناتوانرێت هەموو هۆکارەکانی زمان و کلتوور روون بکرێنەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە دەبێ بگوترێ چی وای لەو خەڵکە کردووە بە هیچ جۆرێک تۆزقاڵێک تەقەبوولی زمان و کلتووری عارەبان نەکەن، وێڕای دەنگ و گەرووی رەسەنی کورد شتێکی دیکەش هۆکاری پاراستنی بووە، کە بەندە بە واری کۆمەڵایەتی نێوەندەکە، ئەویش (عەیب)ە بووە، شەرم بووە، هەمیشە لە لایەن خەڵکی ئەو ناوچەیە شەرم و عەیبە بەردی ڕێگر بووە لە بەردەم قبووڵ نەکردنی زۆر شت لە جلوبەرگ و نەریت و تەنانەت بابەت و جۆری قسەکردندا، لە بواری ئاخاوتن شەرم بووە یەکێک زمانەکەی خۆی

بگۆڕێت، دیارە گەر یەکێ ئەو سنوورەی شکاندبا، ئەوا دووچاری رەخنەلێگرتن و پلارتێگرتن دەبوو بۆ جلوبەرگیش بە هەمان شێوە نەدەبوو لە داب و نەریتی خۆی لابدات، یان دەستووریکی دیکە وەربگرێت تەنانەت کوردیش بووبا، لێرە جۆری کورتەک و شەرواڵ دروین، جۆر و رەنگی جەمەدانی و چۆنیەتی بەستان و لێنانی، جۆری کڵاو، بۆ ئافرەتانیش هەموو شتێکیان لەگەڵ هی عارەبان جودا بووە، تەنانەت جۆر و رەنگی کوتاڵەکان، جۆری سەرو شەدەو دەسماڵ و کەواو سەرکەواو کراسی بە باخەڵ، کە لە هیچ شوێنی دیکە نموونەیان نییە، دەرپێی ئافرەتی کورد جودایە لەگەڵ هی هەموو میللەتان و تەنانەت لە دەشتی هەولێر جۆرێک دەرپێی ئافرەتی کورد هەبوو جودا بوو لەگەڵ هی هەموو کوردستان، ئەویش بە (دەرپێی بە کشتەک) ناسرابوو، کە زۆر درێژ بوو و لە خوارەوە لە گوزەندی پێ لوول دەدرا، ئێستا تەنیا ئەوجۆرە دەرپێیە بوونی نییە، کە پتر بۆ توندوتۆڵی و تەنانەت بۆ دۆخێن توونیدیش سوودی هەبوو، خۆم چەند پیرەژنێکم دیوە تا پێش راپەرین ئەوەیان لەبەر بوو، لە پیرەژنێکم بیست دەیگوت لە ناوچەی بەرانیان من یەکەم ژن بووم، کە دەرپێی بە کشتەکم گۆڕی بە هی ئێستا، ئەوکات ئەوە عەیبێکی زۆر گەورە بوو و سەبارەت بە گۆڕینی جۆری دەرپێم زۆرجار لە مەجلیساندا پیاوەکەمیان زمان کورت دەکرد، بەوەی کە من دەرپێی بە کشتەکم فڕێ دابوو، ئیدی بۆ گۆڕین و فڕێدانی کراسی بە باخەڵیش بە هەمان گۆڕینی جۆری سەروپۆتکی ئافرەتان. بۆ پیاویش زۆر عەیب بوو کراسەکەی فەقیانەی نەبا، جا فەقیانە چەندی شۆڕتر با ئاوا ماقووڵتر بوو، لە مەجلیساندا ئەگەر پیاوێک جەمادانی لەسەر کردباوە عەیبێکی گەورە بوو، تەنانەت ریش تاشین باو نەبوو، بەڵام وردە وردە ئەمە نەما بەمجۆرە ترازان لە بەکارهێنانی هەریەک لەوانەی باسمکردن و لاسایی کردنەوەی بە دەستووری جێگایەکی دیکە نەخاسما دەستووری عارەبان ئەوا لەرادە دەرچوو. ئەو کەسانەی تێکەڵی ژنیان دەبوو لەگەڵ عارەبان، ئەوا دەبوو ئەو ژنە عارەبەی شووی بە پیاوی کورد دەکرد جلی کوردی لەبەریکردبا، سیمای ئافرەتی کورد لەو نێوەندە هەمیشە جودا بوو لەگەڵ سیمای عارەبان، تەنانەت لە بابەتی رەنگی جلەکان و لە بابەتی جۆری خۆکوتین و نەخش لە دەست و دەم و چاوکردن. گەر یەکێ لە دەستووری خۆی لای بدابا یان دەستوور و نەخشی عارەبانی هەڵگرتبا، ئەوە بە چاوێکی کز سەیر دەکراو دەستەواژەی (خۆ تۆ عارەب نیت) بەکاردەهات بۆ کەسانی وا، تەنانەت لەو بوارانە زۆر زاراوە و دەستەواژە داکەوتوونە، کە بە داخەوە لێکۆڵەری کورد لێیان بێ ئاگایە. کورد لەو ناوچانە هەمیشە شانازی بە دەستووری خۆی کردووە و نەیویستووە ملکەچی هیچ کەسێک بێت، تەنانەت لە لێقەومان و لە تەنگانەدا، خۆ ئەگەر یەکێک لە پێناو کارێک، یان شتێک داوای لە یەکێکی دیکە بکردبا، ئەوا دەستەواژەی ( وەک عارەب دەخیلت دەبم)ی بەکاردەهێنا، چونکە دەخیل بوون، واتە خۆهاویشتنە نێو ماڵ و ئامادەیی هەموو ملچکەچییەک دەبێ، ئەوەش لەنێو کورددا مەحاڵە یان زۆر دەگمەنە، بەڵام لای عارەبان ئاساییە، بۆیە واگوتراوە، لێرەدا ئەوانە جودایی نێوان دەستووری کورد و عارەبان پیشان دەدا لە لایەک و لەلایەکی دیکە قەدەغەکردن بۆ لایەکەی دیکە پیشان دەدا، لە راستیشدا لەنێوان کورد و عارەبی سەر سنووری دەشتی هەولێر جودایی زۆرە، لەیەکچوون دەگمەنە، تەنیا کلتووری ئایین نەبێت، لە دەشتی هەولێر لە زمانی پیرەژنێک کە گوتوەتی (وەڵلا ئەمن هەر نوێژان بە کوردی دەکەم و حەزناکەم بە عارەبی بیکەم و ناشزانم دەبێ خوا لێم قبووڵ بکات، وای دەزانی سوورەتی فاتیحەش هەر کوردییە). جودایی نەریتەکان هەموو لایەنێکی ژیانی خەڵکی نێوەندەکە دەگرێتەوە لە بارەی سەردان و داوەتکردن، لە خواردن و چێشت لێنان، لە دروستکردنی جاجم و مافوور و بەڕەو قاڵی، کە رەنگ و نەخشیان لێک ناچێت، لە کار و پیشەو جۆری خانوو

و دروستكردنی لە جۆری داوەت و زەماوەند و جۆرەكانی شایی و هەڵپەركێ... تەنانەت لە شەڕ و پێكدادان جودایی زۆر هەیە هەمیشە كورد خۆی پێ ماقوڵتر بووە، بۆیە گەر شتێک بەپێی پێویست رێكوپێک یان باش نەبێ دەستەواژەی (عارەبی عارەبی) بەكاردێنێ.

لە بیرمە منداڵ بووم زۆر جاران لە دانیشتن و كۆڕەكاندا باس لەوە دەكرا، كە پیاو دەبێ بزانێ لە كوێیە تاكو بتوانێ قسەو گفتوگۆی مەجلیس و دیوەخانان و قسەی بازاڕ لێک جودا بكاتەوە، بەمجۆرە پیاوانی بەساڵاچوو سەرمەشقی تازە پێگەیشتوانیان دادەدا، وا بووە لە گوندەكان شارەزاو دنیا دیدە ئامۆژگاری نەوجەوانیان دەكرد لەسەر راهاتن و جۆری دەربڕین و ئاخاوتن، بە تایبەت بۆ پاراستنی دەستووری خۆیان و لاسایی نەكردنەوەی كەسانی دیكە. دیارە ئەوانەش هۆكارێكی گرنگ بوون بۆ پاراستن و پوخت مانەوەی زمانی ناوچەكە، لەنێو دیبەگەدا ناوی (عەوڵا حەمشین) دێت، كە زۆر سەرمەشقی جۆر و ئاخاوتنی لاوان دەبێت، نەریتی كوردەواری هەمیشە بە پەسەند زانیوە لە بەرامبەر عارەبدا، بەڵكو لاوان لە دەستوور و نەریتی عارەب بەپارێز بن، لە پیرێژنێكم گوێ لێبوو لە ساڵانی شەست گوتی: عەوڵا حەمشین و باوكم كە ناوی مەلا قادر بوو رێگایان بە گوندەكانی عارەبان دەبێت لە كەناری رووباری دیجلە و شەو دەمێننەوە، دیارە لە لایەن عارەبان تەكلیف دەكرێن شەو لەلایان بمێننەوە، ئەوانیش هەندێ دەكەن لەبەر پیس و بێ سەروبەریان بەروەست نابن بچنە هەموو ماڵێک، بۆیە لە نێوخۆیاندا وا تەگبیر دەكەن بە نهێنی سەیری قاپ و مەنجەڵ و كەرەستەكانیان بكەن هی كێ پاک بوو لەوێ نان بخۆن... بەمجۆرە ماڵە دۆستێک نیشان دەكەن و شەو لایان دەمێننەوە، لە رۆیشتن كابرای عارەب پێیان دەڵێ لام سەیر بوو لە چەند ماڵێک تەكلیف كران بۆ خواردن و مانەوە لاتان نەدا تەنیا لای من مانەوە و پێی خۆشحاڵ بووم... عەوڵا حەمشین لە وەڵامدا دەڵێ چیت لێ بشارمەوە بەراستی بێزمان نەهات لە هەموو جێگایەک دابەزین و نان بخۆین، بەراستی ئێوەش قاپ و مەنجەڵ و ماڵەكەتان زۆر پاكە، بۆیە لاماندا، كابرای عارەب بەپێكەنینەوە هاتە وەڵام و گوتی: ئەتوو راست ئەو ماڵ فەقیرانە چەلب نییە حەتا قاپ و قازان بلێسن خاوێن بێن).

ئیدی چەندان گۆتە و دەستەواژەی وا هەن، كە مایەی ئەوەن كورد خۆ لە نەریت و زمانی عارەب بپارێزن، بێگومان ئەوەش ئەگەری دوورەپەرێزی و خۆپارێزی كوردە لەزمان و كلتووری عارەب.

لە بواری شەڕ و پێكدادانیش چ بەتاک و چ وەک كۆمەڵ جودایی زۆر هەیە، عارەب دەكەنە هۆسە و هەلهەلە و هەراو جۆرێک لە قیژاندن و نەڕاندن پەیدا دەبێ، چەندان سوێند دەخورێ كە وادەكات وادەكەن. لە كۆتاییدا بەیەک نەعلەتوڵلاهی عەلە شەیتان سەربەخۆ ئارام دەبنەوە، بەلام ناسراوە هی كورد بێدەنگە و بە ئاسانی كۆتایی نایەت، عارەب تاڵان دەهێننەوە، زۆرجارم دیوە بۆ پێكەنین و عەنتیكەیی چەند پیاوێک لاسایی شەڕی عارەبانیان كردۆتەوە لە بواری توانج و ناپەسندی ئەو نەریتەیان. ئیدی هەموو ئەوانەی باسكران لە زمانی گفتوگۆ و فۆلكلۆر و خواردن و جلوبەرگ و ... هتد، بەمجۆرە بووبوون بە فاكتەری رێگر و دژەنەكردنی كلتووری عارەبان بۆ نێو كورد و ئەوها كلتوور و زمانی ئەو دەشتە خۆپارێزی لە سنووری نیشتمانەكەی خۆی كردووە و لەم لاشەوە هەندێک كەس بەبێ ئاگایی، ئەو هەڵوێست و زمانە رەسەنەی دەشتی هەولێر بەر توانج دەدەن، دیارە ئەگەر وانەبا ئەو هەموو پەند و كەرستەی فۆلكلۆری و سەرگوزەشتە و قسەی نەستەق و زمانی ئاخاوتن و حەیران، كە تایبەتی دەشتی هەولێرە وەک ئێستا نەدەمان و تێكەڵ و بێهێز دەبوو.

* لە ژمارە ١٥ی گۆڤاری ئاسۆی فۆلكلۆر بلاوكراوەتەوە.

# یانەی سەرکەوتن و بنەماڵە هەولێرییەکان

فوئاد سدیق

یانەی سەرکەوتن ئەو یانەیەیە کە مەعرووف جیاووک وەک دامەزرێنەرو دواییش وەک باوەڕ پێکراوی گشتی یانەکە بوو. هەمیشە لە خەمی ئەوەدا بوو، کە یانەیەکی رووناکبیری، زانستی، دوورلەسیاسەتی رووت بۆ کورد دابمەزرێت. جیاووک تێروانینێکی مەدەنی و شارستانیانەی وای لەلا گەڵاڵەببوو، کە هەموو توانایەک بخاتە گەڕ تا رووناکبیرو نیشتمانپەروەرانی کورد لەو یانەیە، کە ناوی لێ نابوو یانەی سەرکەوتن، کۆبکاتەوە. هەروەک نامیلکەیەکیشی بە ناوی (باربوو) چاپ و بلاوکردەوە، کە ئێمە وا لێرەدا دەیخەینە ڕوو.

هەڵبەت دامەزراندنی یانەیەک پێویستی بە زۆر شت هەیە کە دەبێت بۆی مسۆگەر و دابین بکرێ، کە ئەمەش لە توانای ئەو دەستەیە نەبوو، بۆیە هەمیشە ڕووبەڕووی نەبوونی شوێن بۆ یانەکە و نەبوونی ئیمکانیات بۆ تینوگوڕ پێدانی یانەکە دەبوونەوە، چالاکییەکانیان بە پێی پێویست نەدەبوون. هەرچەندە لە دواییدا ناچار بوون ئەم شارو ئەو شار بکەن بۆ باربوو (تبرعات) کۆکردنەوە بۆ یانەی سەرکەوتن. بەلام دەبا بزانین ئەم یانەیە چۆن دامەزراو دەستەی دامەزرێنەرانی لە کێ پێکهاتبوون و...

مەعرووف جیاووک لە (٩ / ٢ / ١٩٣٠) دا داواکارییەکی بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی زانستی خستەڕوو. داواکارییەکە لە کۆمەڵێک رووناکبیر پێک هاتبوون، هەرچەندە هەندێک خۆیان لەم داواکارییە کێشایەوە "بەلام خوالێخۆشبوو پارێزەر ئەحمەد موختاربەگی زەهاوی، کە لە قوتابخانەی حەربیە، بە ئەفسەری دەرچوو بوو لە قوتابخانەی ماف (حقوق) یش بروانامەی وەرگرتبوو، سەرۆکی یوزباشی محەمەد عەلی بەگ عەبدولعەزیز، پارێزەر عارف بەگی پشدەری، داواکارییەکەیان بە شەوق و هەوەسەوە مۆرکرد و پێشکەشی وەزارەتی ناوخۆیان کردو پاش کێشمە کێش و ماندووبوونێکی زۆر بە ژمارەی ٦٨٩٥ و مێژووی ٩ - ٢٠ / ٥ / ١٩٣٠ مۆڵەتی کردنەوەی یانەی سەرکەوتن بە بەرێز مەعرووف جیاووک دراو لە رۆژی ١٩٣٠/٥/٣٠ لە سینەمای رویال، بە ئاهەنگێکی زۆری خەڵک یانەی سەرکەوتن کرایەوە".

"هەر دەستوبرد دەستە (هیئة) ی ناوچەی کۆمەڵە هەڵبژێردرا و کەسانی وەکو شێخ ئیسلامی عوسمانی سەماحەتی خوالێخۆشبوو ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری، پایەبەرز محەمەد ئەمین زەکی بەگ و خوالێخۆشبوو (مەحمود جەوددت)، بەرێز ئەحمەد ئاغا کەرکووکلیزادە و بەرێز عەبدوڵلا لوتفی بەگ حاجی عەلی ئاغا و بەرێز میرزا فەرەج شەریف و هەر دوو خوالێخۆشبووان (شێخ عەلی قەرەتاغی و خەلەف شەوقی داودی) و بەشیر موشیری بەرگدروو هەڵبژێردران و بە رێککەوتنی دەنگەکان ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری بوو بە سەرۆکی یانەی سەرکەوتن و (مەعرووف جیاووک) یش بە باوەڕپێکراو (معتمد)ی گشتی یانە هەڵبژێردران" و نزیکەی دووساڵ بەم جۆرە لە خانووی مەعرووف جیاووک یانەی سەرکەوتن درێژەی کێشاو بەردەوام بوو، دوای کۆچی دوایی ئیبراهیم ئەفەندی حەیدەری، بە رێکەوتنی ئەندامەکان، پایەبەرز

ئەمین زەکی بەگ کرا بە سەرۆکی یانەی سەرکەوتن".

ئەمە بەرکۆڵێکی کەم بوو سەبارەت بە دامەزراندن و مۆڵەت وەرگرتنی یانە، بەڵام کتێبی (باربوو) پێش ئەوەی بێتە سەر درێژەی لایەنەکانی یانەی سەکەوتن، لە رووی یارمەتی و کۆمەکیکردن و باربووی خەڵک و چالاکی و پێرەوی ناوخۆو هەموو ئەم خاڵانەی کە بە یانەی سەرکەوتنەوە پەیوەندن. کتێبەکە فەسلێکی بۆ (چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی کورد) و (مێژوو لە کەیەوە دەست پێ دەکات ؟) و (بۆ چی کوردمان پێ وتراوە ؟) و رەگەزمان و ئاییمان و حکومەتە کوردییەکانمان و هەروەها کورتەیەکیشی لە سەر ئایینی زەردەشت نووسیوە.

ئێمەش هەوڵ دەدەین لە نووسینە پڕ بایەخەکان بۆ خوێنەری هێژای دەنووسینەوە.

لە بابەتی (چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی کورد) دا دەڵێت: ((کورد لە چیای زاگرۆس بینراوەو لە لای گەلی هەورامان و دەربەندی رواندز (کێلەشین) بە کۆمەڵ ژیاون و دەستکردیان (مصنوعاتیان) لە ئەشکەوتەکانی زاگرۆس شاردوونەتەوە. لەم دواییە خەنجەرو شیری سنگی و کەلوپەلی ناو ماڵێکی زۆر لەم ئەشکەوتانە دۆزراونەتەوە. جگە لەمە وێنە (تصویر)ێکی زۆری چوار پا (مەڕو بزن و مانگاو گاو ئەسپ و وڵاخ و بزنە کێوی و ئاسک و رێوی و کەروێشک) لە ناو ئەم ئەشکەوتانە بینراون، کە دەلالەت لە سەر توانا و سنعەتی کورد دەکات)).

((لە مێژووی یۆنان و ئەورووپادا، بە ئازاو جەنگاوەر ناسراوین، (گەزنەفون) ی یۆنانی - کە زانا و فەیلەسووف و مێژوونووس بووە - لە کتێبەکەی (انا بازیس) دەڵێ:
"لە گەڵ لەشکری ١٠ هەزار کەسی یۆنانی لە لای (بابل) وە دەستمان بە گەڕانەوە کرد بۆ دایکی نیشتمان ساڵی (٤٠١ پ. ز) رێی تای گرسمان(دیجلەمان) گرت، تووشی قەومێکی زۆر ئازا بووین، کە (کورد، کوردوخ، کورئین) یان پێ دەبێژن و تەنگیان پێمان هەڵچنی. ئێمە رێگامان نەدەزانی، (واتە شارەزا نەبوون. ف. س) شەوو رۆژ سەرمان لێ شێوابوو، دوایی چەند کەسێکمان بە دیل گرت و هەرچەندی ویستمان رێگامان پێ نیشان بدەن، سەریان داو رێیان نیشان نەداین و لە دارو شیر نەترسان)). ئینجا لە بارەی باوەڕو ئایینی کوردەوە، دەڵێت ((هەرچەندە بە تەواوی نەزانراوە، بەڵام وادیارە لە پێش هەموو شتێکدا کورد بنەداری گەورە دوایی مانگ و ئەستێرە و هەتاوپەرست بووە، پاش ئەوە خوای چاک و خراپمان بۆ خۆمان داناوە، ئەم خوایانەش لە بەرد تاشراون، پەیامبەریشمان هەبووە، دواییش چووینە سەر ئایینی زەردەشت، چونکە زەردەشت خۆی کوردو خەڵکی لاهیجان بووە.

یەکەمین ئاتەشگەدەی لە نزیکی ئورمێیەو لە لاهیجانی دامەزراندووە. پاش ئەوە هەندێکمان ئایینی موسایان قبووڵ کردووە، جوولەکەی کوردستانی ئەمڕۆ (مەبەستی هەموو ئەو جوولەکانەبوو، کە هەتا کۆتایی چلەکان لە کوردستاندا بوون (ف. س) نەتەوەی ئەو کوردانەن، کە داخلی ئایینی موسا ببوون. هەندێکیشمان دوایی ئایینی عیسایان قبووڵ کرد، کە ئەمەیان لە سەدەی سێیەمین (٢١٦) ی پاش زایینی بووە.

پێش هەموو کەسێک کوردی چیای کورد واتە (چیای دیاربەکر و ئورفە) لە سەر دەستی (مارماری) قەشەی ئورفە ئایینی عیسایان وەرگرتووە و پادشاهی کوردی کەرکووک و هەولێر، کە ناوی (گرت = گورد) بووە و لەگەڵ کوردی ئەم جیهەتانە بوونەتە مەسیحی و هەندێکی تریش لە جیهەتی (جەزیرە) ئەم ئایینەیان قبووڵ کردووە و هەندێ عەشایری کورد چوونە سەر ئایینی عیسا پەیامبەر. ئەمانە زۆریان (یەعقوبی) و (نسطوری)ن و لە دەوروبەری ماردین و (نصیبین) زۆرن و بنەچەیان کوردە. بەدوورکەوتنەوە و تێپەڕبوونی وەخت بنەچەی خۆیان بزرکردووە)).

کە دێتە سەر ئایینی زەردەشتیش دەڵێت: ((بە ٦٠٠ ساڵ لە پێش لە دایکبوونی عیسا، لە لای خوراسان، بنەچەی کوردی لاهیجانی زاتێک (زەردەشت) پەیدا بوو، داوای پەیامبەری کردو هەندێ پەندی ئەخلاقی و ئایینی زۆر باش خەڵکی بە ناوی (زندو ئاویستا) کتێبێکی دەرکرد و ئەم ئایینەی لە ئێران بڵاوبووەوە چەند (ئاتەشگەدە) یەکی دروست کرد، گرنگترینیان ئاتەشگەدەی ئورمێ و لاهیجان و گشتاسیب بوو، کوردیش ئەم ئایینەی قبووڵ کرد.

ماوەیەکی زۆر لە نێوان ساسانییەکان و رۆمییەکان لە سەر کوردستان شەڕ بوو، دواییش هەواڵی بڵاوبوونەوەی ئایینی مەسیحی لە ئەرمەنستان و جەنگی ئایینی (زەردەشتی و مەسیحی) دەستی پێ کرد. ئەم شەڕە لە سەردەمی (یزد گورد) ی دووەم زۆر توندوتیژ داگیرسا و... لە سەدەی شەشەمی پاش زایینی سەرۆکی عەشیرەتی (گۆرانی) کورد لە کرماشان حکومەتێکی دامەزراند. لە ساڵی (٥١٢د.ز) دیسان شەڕی ئێران و رۆما دەستی پێکرد. (نەوشیروانی عادل)، لە ساڵی (٥٦٢) دا بە سەر کوردستانەوە چووە، سەرقەومی خەزەرو (خوسرەوی پەروێز) یش لە ساڵی (٦٠٥) بە سەر کوردستانی باکوورەوە تەکانی دا بۆ ناو ئاسیای بچووک (تورکیای ئێستا). بەم شێوەیە درێژە بەم مێژووە دەدات تا دەگاتە هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ ئێران و کوردستان و بڵاوبوونەوەی ئایینەکە و قەبووڵکردنی ئایینەکە لە لایەن کوردەوە.

دوای ئەو کورتە مێژووەی کورد و ئایینەکانی، کە هەر لە پەرستنی ئەستێرە و بەرد و ئایینی جوولەکەوە تا دەگاتە ئایینی زەردەشت و مەسیحییەت و ئیسلام و... ئینجا دێتەوە سەر بنچینەی بابەتی کتێبەکە، کە دەربارەی (یانەی سەرکەوتن)ە و باسی چۆنێتی کردنەوەی یانەکە دەکات و دەڵێت: ((ئەگەرچی ئەم یانەیە، بە رەسمی هەر هەبوو، بەڵام دوای دوو ساڵ بەردەوامبوونی لە کارو چالاکی، وردە وردە سست و مات بوودوە و تا وای لێهات خەریک بوو، خەڵک هەر لە یادیشی بکات. بۆیە دوای ١٣ ساڵ دامەزراندنی یانە، جارێکی تر مەعرووف جیاووک لە رۆژی ١ / ٤ / ١٩٤٣ تین و گوڕێکی تری دایەوە یانەو، دەستەیەکی ناوچەیی نوێی کۆمەڵەی هەڵبژاردەوە، کە ئەمانەی خوارەوە بە ئەندامی یانەکە هەڵبژێردران:

میرزا فەرەج شەریف، عەلی کەمال بەگ، حیکمەت بەگی زەهاوی، ناجی عەباس، پارێزەر هادی رەشید چاوشلی، موسا سەمەد، بەشیر موشیر حەمە ڕەش، عەبدولڕەحمان نورجان، بەڵام لە بەر ئەوەی (حەمە ڕەش و عەبدولڕەحمان نورجان) دەستیان لە کارکێشایەوە و حیکمەت بەگی زەهاوی لە بەغدا نەما، محەمەد بەگ (حەمە پاشا) ی ئەوڕەحمان و محەمەد بەگ بابان و مەسعود بەگ بەهائەدین بامەڕنی، رێگەی ئەوانیان گرتەوە.))

یانەی سەرکەوتن، ئەگەرچی ١٣ساڵ بوو دامەزرابوو، بەڵام بە درێژایی ئەو ١٣ ساڵە هیچ شوێنێکیان نەبوو، بۆیە. ((دەستەی نوێی ناوچە لە پاش گفتوگۆیەکی دوورو درێژ بڕیاری دا، کە خانووەکی گەورە و موناسب پەیدا بکات و خانووی مەعرووف جیاووک ئازاد بکرێ، لەم گاڤە تەنگوچەڵەمەیەدا خانوویەکی موناسبی ئەوها بە پارەیەکی زۆر نەبێ بە دەست ناکەوێ، هەر لە بەر بێ پارەیی و بێ داهاتی، دەستە (هیئە) نەیتوانی خانوو بدۆزێتەوە، لەبەرئەوە ئەم مەسەلەیەی خستە پێش ئەنجوومەنی گشتی کۆمەڵە و ئەنجوومەن بڕیاری دا، کە ئەندامانی یانە، هەر کەسەو بە پێی حاڵی خۆی شتێک بەخشێ و هەموو رۆژی پێنج شەموان بۆ ژنان و رۆژانی هەینی بۆ پیاوانی کۆمەڵە راگیری و باربوو قبووڵ بکرێ. ئەم بڕیارە پەسەند کراو لە یەکەم کۆبوونەوە لە (٢٦٠) دینار زیاتر کۆکرایەوە و لە چەند کۆبوونەوەیەکی دیکە ئەو پارەیە کۆکرایەوەو گەیشتە نزیکەی هەزار دینار)). بەڵام وا دیارە خەڵک هێندە بۆ بەردەوامبوونی یانە پەرۆش نەبوون، بۆیە هەموو کۆمەکی و باربووکردنەکەش سنووردار بووە و ئەم باربووە سنووردارەش دادی یانەی نەداوە، چونکە یانەی سەرکەوتن لەو رۆژەی، کە کراوەتەوە هێز هەتا ئێستا (مەبەستی لە ساڵی ١٩٣٠ تا ١٩٤٤ ز(ف -س) چواردە ساڵە لە خانووی مەعرووف جیاووک دامەزراوە و کۆمەڵەی ناوچەی یانە و کۆمەڵەی هەمووان (عام) لەوێ کۆ دەبوونەوە و لە چلەی هاوین ماڵ و منداڵ و خێزان و عێلی خۆی دەخستە ژوورێکی گەرم و، حەسانەوە و تەندروستی خۆی و ئەوانی تێکدەدا. هەر بۆ رێکخستنی میللەت، بۆ سەربەرزی هەموو لایەک، بۆ ژیانی کوردەواری، پێویست نییە ئاشکرا بکرێ، کە هەیئەتی ناوچەی یانە لەوەختی خۆی لە ساڵی کردنەوەی بڕیای دا، کە مانگی (٥٠) رووپیە، واتە ساڵی (٦٠٠) رووپیە، کە دەکاتە (٤٥) دینار بدرێتە جیاووک، بەرامبەر کرێی خانووەکەی. بەڵام بڵندی و دڵپاکی و ئامانی بەرزی جیاووک، نەوەک کرێی چواردە ساڵ، کە ئەکاتە (٦٣٠) دینار بستێنێ، دیسان هەر بە یانەی بەخشییەوە و

پوولێکی قبوولٚ نەکرد. جیاووک هەر بەمەش نەوەستاوە، لە یەکەم هەنگاودا (٨٦٠) رووپیە، کە دەکاتە ٥، ٦٤ نیوی تری داوە، کە ئەم جارەش (٧٠) دیناری دا. لەم سنوورەش رانەوەستا، کە دیتی وەختی هاتووە ئەم چەشنە کۆبوونەوانە لە گەلٚ ئامانجە بەرزەکانی یانە رێک ناکەوێ. جگە لەو باربووەی، کە (٢٦٠) دیناری کۆ کردەوە، لە سەر رۆشنایی بیری جیاووک بوو. ئەم باربووە بەردەوام بوو تا لە ١٠٠٠٠ دینار تێپەڕی.

جیاووک بۆ کۆکردنەوەی پارە و باربوو، بڕیاری دا بچێتە شارو دێهاتەکان و گوێی نەدایە نەخۆشی و پیری خۆی و کۆمەڵەی ناوچە. شەوی ١٧/٧/١٩٤٣ لە بەغداوە بە شەمەندەفەر بۆ خانەقین سەفەری کرد. دوو کەسی تری لە گەلٚ خۆی بردو لە پاش ٤٥ رۆژ، واتە لە شەوی ٣١ / ٨ / ١٩٤٣ گەڕایەوە بەغدا و لە (٥٠٠٠) پێنج هەزار دینار پتری باربوو کۆ کردەوە)). مەعرووف جیاووک، کە باوەڕپێکراوی گشتی یانەکە بوو، لەو گەشتەی بۆ کۆکردنەوەی باربوو لە گەلٚ عەبدولڕەحمان ئەفەندی و باران جیاووک)دا بوو. دیارە هەموو ئەو گەڕان و سووڕانەیان بە پێ یا بە وڵاخ بووە، چونکە ئوتۆمۆبیل لە زۆربەی شارەکان نەبووە، یا زۆر کەم بووە، کە بەم شێوەیەی خوارەوە بوو: خانەقین، کەلار، کفری، داودە، کەرکووک، سلێمانی، هەڵەبجە، هەولێر، کۆیە، تەق تەق...... بەڵام لێرە تەنها باسی ئەو سەفەرە دەکەین، کە بۆ شاری هەولێری کردووە.

رۆژی ١١ی ئاب باوەڕپێکراو بۆ کەرکووک و لەوێشەوە لەبەر نەبوونی ئوتۆمبیل بە (----) بۆ هەولێر رۆیشتن و بە رەنج و ماندووبوونێکی زۆر ئێوارەکەی گەیشتن و میوانی خانەقای شێخ محەمەد ئەفەندی بوون. رۆژی دووەم باوەڕپێکراو چووە لای موتەسەریف جەنابی مستەفا بەگی یەعقوبی و لە پاش سڵاوو خۆشهاتنکردن، موتەسەریف (١٥) دیناری بەخشی. دوایی هەندێ لە مەئموورە گەورەکان و ئیشراف، شاری زیارەت کردو ئیشراف و ئاغاکان زیافەتی زۆریان داو لە پێش هەموو کەسێک تمپال و سەخاوەت و کوردی بە گەرمی و سەربەرزی جەنابی عیزەدین ئەفەندی مەلا ئەفەندی و نەهەنگی دەریای

ئازایەتی و لە سەخا بێ هاوتا و شێری ژیان، عەلی ئاغای سەید عەبدوڵڵا پاشا لە کیسەی شەرەفیان پارەیەکی موناسبیان بەخشی. هەر ئەو رۆژە جەنابی حەسەن ئاغای شێخ محەمەد ئاغا، کە بە (شێتە) بە ناوبانگە و لە سەردارانی دزەییە، باوەڕپێکراوی بۆ گوندی خۆی (عەوێنە) داوەت کرد و بۆ ئێوارە باوەڕپێکراوو هاوڕێکانی بە ئوتۆمبیل چوونە لای. کاتبی یانە (محەمەد روشدی)، کە خەڵکی عەوێنەیە لە گەلٚ سەردارو ئاغایانی دزەیی و ئەهالی بە چەشنێکی رێک و پێک هاتنە پیریان و لە باخچەی دیوەخانی حەسەن ئاغا ماندوویەتیان رابوراند. لەودەمەدا محەمەد روشدی هاتە شەوق و وتارێکی گەرم ئامێزی داو بە چەپڵەلێدان چاوپێکەوتن کرایەوە. رۆژی دووەم خەڵکی ئاوایی کۆبوونەوەو مامۆستای گوند، جەنابی مەلاعەزیز ئەفەندی لە گەلٚ فەقێیەکانی لەو کۆبوونەوەیە ئامادە بوون، ئینجا باوەڕپێکراو وتارێکی موناسب و بە تینی پێشکەش کرد. مەلاو شاگردەکان زۆریان پێخۆش بوو پەیمانیان دا، کە خزمەتی کوردایەتی بکەن. دوایی باربوویەکی باش کۆکرایەوە و گەڕانەوە بۆ هەولێر. حەسەن ئاغا و خزمەکانی شایانی شانازی پێ کردنن و سوپاسیان دەکەین. لە پاش رۆژێک باوەڕپێکراو چووە لای (خدر بەگی ئەحمەد پاشا) ی سەرۆکی دزەییان، دووەمین رۆژ دەستی کرد بە سەردانی ئاغاکانی دزەیی، وەکوو حوسێن ئاغای مەلا و کوڕانی ئەحمەد پاشا: قادر ئاغا و عەزیز ئاغا و حوسێن ئاغا و بەرەی بایز ئاغا، مشیر ئاغای ئیبراهیم ئاغا، عەلی ئاغای مەحموودی کاکەخان، حاجی ئەمین سورێژە، حاجی جوکل ئاغای حەوێز ئاغاو دوایی سەرداران و ئاغاکان و کوێخا کانی دەشتی هەولێر.

هەر لە خۆیانەوە پارەیەکی زۆریان بەخشی کە لە:

| ناو | دینار |
|---|---|
| موتەسەریف مستەفا بەگی یەعقوبی | ١٥ |
| شێخ محەمەد ئەفەندی شێخ ئەسعەد | ٣٠ |
| عیزەدین ئەفەندی مەلا ئەفەندی | ١٥٠ |
| جەمال عەبدوڵڵا | ٢٠٠ |

خدر بەگی ئەحمەد پاشا ١٢٠
پاشای محەممەد شەریف ٢٠٠
عەلی مەحموودی کاکە خان ٧٠
نافیع محەممەد ماستاو (شاگردی قورکاری) ٢٥٠
عەزیزی ئەحمەد پاشا ١٠٠
عەتا ئوڵڵا حاجی رەشید ئاغا ١٠٠
مشیری ئیبراهیم بایز ٦٠
عەلی خوشید ئاغا بایز ٦٠
قادری ئەحمەد پاشا ٥٠
حوسێن ئەحمەد پاشا حاجی جوکل ئاغا ٥٠
عەبدوڵڵا ئاغا عومەر ئەفەندی ٥٠
شێخ محیەدین شێخ ساڵح بەرزنجی ٥٠
سلێمان ئاغا رەسول ئاغا ٥٠
عەزیزی حاجی سادق ٥٠
حوسێن ئاغا مەلا ٤٥
قادر ئاغا حاجی ئەحمەد ٤٥
کانەبی حەوێز ئاغا ٤٥
ئیبراهیم ئاغا حاجی ئەمین ٤٥
ئیبراهیم ئاغا ئەحمەد ئاغا سەرگەران ٤٤
مەحموود عەبدوڵڵا عەلاف، حەسەن ئاغای شێتە ٣٥

**((ئەوانەی ٣٠ دینارو زیاتریان داوە))**

ئیبراهیم ئاغای حاجی عەلی، رەحمان ئاغا قەرەنی، مەعرووف ئاغای حاجی پیرداود، عەزیز ئاغای حاجی مستەفا، موشیر ئاغای عەبدوڵڵاتاغا، مستەفا ئاغا حاجی مەلا، حاجی ئەمین کاوێس ئاغا، خواجا ساڵح یووسف نووری (بە ناوی جوولەکەیەکی هەولێر).

**((ئەوانەی ٢٠ دینارو زیاتریان داوە))**

ئەحمەد چەڵەبی دەباغ، شەهاب دەباغ، حاجی محەممەد سەعید جامباز ٢٥
سابر ئاغای عەلی بەگ ٢٥
سەید محەممەد ئاغا سەید عەبدوڵڵا پاشا ٢٥
قادر ئاغا ساڵح، محەممەد ئاغاخورشیدی عالم ٢٥
شێخ حەنەش، عوسمان سووفی کوێخا وسوو هادی ئاغای ئەحمەد ئاغا، کوێخا هەمزە کاکەشین، کوێخا تاهیر دارەخورما، حوسێن ئاغا حاجی پیرداود، رەشید ئاغاحەوێز قولتەپە، سلێمان حاجی نادر ئاغا، سلێمان ئاغای حاجی ئەحمەد ٢١
سابیر مەحموود کاکەخان، ئاغای کاک خدر کەسنەزان ئەسعەدی ئەحمەد ئاغا، سەعدی ئاغا محەممەد ئومەران ٢٥
جەبار حاجی سەعید جامباز، ئەحمەد سلێمان ئاغا ترپەسپیان، کوێخا عەزیز کەشاف کوێخا جەمیل حاجی سادق خەزنە ٢٥

**((ئەوانەی پانزە دینارو زیاتریان داوە))**

یونس ئەفەندی ملاحظ ئەشغال، پارێزەر موعتەسەم دەباغ، قادری حاجی ئەحمەد فەتحوللا ئاغا، مەولود حاجی فەتحوڵڵا بەقاڵ، رەشید حاجی ساڵح چاوشلی، ئیسماعیل حەسەن ئاغای کەنداڵ، کوێخا عەبدوڵڵا چیغەلوک، ئەحمەد ئاغا محەممەد عەلی ئاغا یەعقوب ئاغا، کوێخا ئومەر کوێخارەزا، شێخ نووری شێخ قادر سافیە، حەمدی ئیسماعیل پیمەرەبر، عەزیزی ئەحمەد ئاغا کەور، داود سلێمان گویل سائقی سەیارە

**((ئەوانەی لە (١٠) دینارو زیاتریان داوە))**

فەتاح ئاغای حەوێز دووسەرە، قادری ئەحمەد ئاغا چل هەوێزە، کوێخا عەبدوڵڵا پیرەبان، داود ئاغای سەعید ئاغا، کوێخا محەممەد ئەمین عاشوور قادریە، عەلی پاشا دوغرەمەچی اعیان (سیپارە)

شێخ مستەفا ئەفەندی شێخ ئەبوبەکر، حەمدی ئەحمەد پاشا ١٢

**((ئەوانەی پێنج دینارو زیاتریان داوە))**

کورد خۆشەویستێک
حەیدەر ئەفەندی، عەبدولرەزاق حاکم
ناجی شائول محامی، سەبری عەبدوڵڵا مودیری شورتە
محەممەد تاهیر ئەترووشی محامی، تەلعەت محەممەد عەلی ئاغا یەعقوب ئاغا
محامی، یونس ئاغا حاجی سەعید ئاغا، حەمدی

عەلی خان، جەلال عەبدوك، عەبدوڵلا عەلی بەقاڵ، عیسا فەهمی تەبیب بەیتەری، حاجی رۆستەم قەساب، موحسین ئاغا رەئیسی بەلەدیە، لەتیف رەشید قەساب، هادی رەشید چاوشلی، محامی مەلا تەها حاجی سالح چاوشلی، جەودەت بەگ محەمەد عەلی یەعقوب ئاغا وەلی حەسەن چاوشلی ٧

ئەحمەد سالح ئاغا قەساب باشی، خەلیل بچوك مەلا كەریم تەحسین بەگ دۆغرەمەچی پارێزەر ٦

**((ئەوانەی (٣) دینارو زیاتریان داوە))**

ناسح ئەفەندی حەیدەری، شێخ رەئوف شێخ شاكر خانەقاە، محەمەد فائق ئەفەندی شێخ نەجیب، شێخ مەزهەر ئەفەندی خانەقاە ئەكرەم عەبدولمەجید چاوشلی، جەبار عەبدولرەحمان بەقاڵ، حەسەن خەدیج عەبدولقادر ئەفەندی قرگەیی مودیری واریدات، ئیبراهیم سوور ٤

ئەسعەد چەلەبی مەلا شەریف دەباغ ٤

نورەدین ئاغا محەمەد ئاغا ٤

**((ئەوانەی دوو دیناریان داوە))**

جەمیل چایچی

عوسمان یونس نەعلبەند، خورشید ئەمین، عەبدولرەحمان عەبدوڵلا چەلەبی ٢

حاجی شەهاب بەزاز ٢

مستەفا ئاغا بەقاڵ ٢

مەلا ئەمین بەقاڵ باشی ٢

**((ئەوانەی دیناریكیان داوە))**

محەمەد عەلی موختار

حاجی سەلیم ستەفا

فەتاح مەحموود (كاتبی تەموین)، مەلا یونس ناجی (كاتبی مەحكەمەی شەرعیە)، رەشید حاجی محەمەد ئەمین، مەلا یاسین حاجی ئەلیاس، حاجی تەها قەساب محەمەد ئەمین دوغرەمەچی، مەلا عەزیز عەتتار، مەلا ئیبراهیم فەرهاد، خەلیل ئەمین جامباز، عەبدلرەزاق مەلا خورشید، قادر فاتەكە، محەمەد سەفوەت ئەفەندی، حاجی عەباس بازرگان، بیلال ئاغا مستەفا چەلەبی.

**((ئەوانەی نیو دینارو كەمتریان داوە))**

ئەحمەد ناجی ئەفەندی (مودیری مەدرەسە) جەبار وەهاب محەمەد مەلا قۆجە، نورەدین یوسف

((باربووەكانی شاری شەقلاوە))

| | |
|---|---|
| میران سدیق بەگ | ٢٥ |
| میران سالح بەگ | ٢٥ |
| حاجی مەجید ئاغا كۆرێ | ١٠ |

**((باربووەكانی شاری كۆیە))**

| | |
|---|---|
| كاكە زیاد ئاغا | ٥٠ |
| كاكە حەوێز ئاغا | ٥٠ |
| عەبدولرەحمان حاجی ئەسعەد چەلەبی | ٤٠ |
| كاكە حاجی مەحمود چەلەبی | ٤٠ |
| حاجی عەبدولمەجید چەلەبی | ٢٠ |
| محەمەد تاهیر حاجی ئەفەندی | ٢٠ |
| حاجی جەلال | ١٠ |
| حوسێن جەمیل بەگ قائمقام | ٧ |

**((ئەوانەی (٥) دیناریان داوە))**

سلێمان ئاغا غەفوری، عەبدولسەمەد ئاغا حەوێزی، حاجی سەعید حاجی ئەحمەد، حاجی جەمال حاجی عەبدولرەحمان، حەمەد حاجی ئیسماعیل، سەعید ئاغا كاكە ئەسعەد ئاغای كاكە ئەسود، رەفیق حاجی سالح، دكتۆر نەجیب بەگ، تاهیر چەلەبی، عەبدولرەحمان ئەفەندی (مەئموری مەركەز)، جەمال ئاغا جەمیل حەوێزی، بەكر سدیق حەوێزی، ئیسماعیل تەها (زراع توتن)، سەلیم بەگ گرد گۆران، عەبدولباقی حاجی جەلال.

**((ئەوانەی (٣) دیناریان داوە))**

حەوێز ئاغا حەبیب، عەبدولوەهاب چەڵەبی مستەفا، محەمەد سەعید كاك ئەسعەد، مەلا سەدر مەلا بەهائەدین، كەمال حاجی مەجید، تۆفیق یاسین، نورەدین متعهد، سالح موشكە، حاجی سابر مام خدر، سابر ئیسماعیل بەڕێوەبەری قوتابخانە

**((ئەوانەی دوو دیناریان داوە))**

محەمەد ئەمین ئاغا غەفوری، عەبدولکەریم حاجی عەلی، حاجی کاکەمین، حەمەد ئەسعەد بەزاز، کەمال عەبدولوەهاب ئەفەندی، جەمال عەبدولوەهاب عومەر عەبدوڵڵا عەتتار، ئەحمەد محەمەد مەلا، عوسمان عەونی، خواجە فەرەج بابە زورە، وەستا عەبدوڵڵا ئاسنگەر، ئەسوەد ئەحمەد عەتتار، حاجی تاهیر سالح، سوفی محەمەد قەساب، جەلال محەمەد ئەبابەکر، سەید حوسێن سەید عەبدوڵڵا بەقاڵ، کوێخا عەلی محەمەد ئەمین جەمیل ئاغا، جەلال ئەفەندی حەوێزی، محەمەد ئەمین مەعرووف، عەبدولسەمەد تەها، جەمال محەمەد تاهیر.

**((ئەوانەی دینارێک و زیاتریان داوە))**

حەمەد بەگ ئەسعەدە سوور، حاجی محێدینی بەقاڵ، حاجی ئیسماعیل قادر هەینی ((١،٥٠٠))، خواجە سالح بابەزورە، خواجە نووری ئیسحاق سلێمان حاتان، فرەنسیس جەرجیس، ئیبراهیم روبین، ئیسرائیل، فەتحوڵڵا حەمەد زەری خالی، سالح مەنسور، حەمەد مستەفا سوور العەتتار، ((١،٥٠٠)) بەکر حاجی محەمەد بنار، ئەحمەد مام یەحیا، فەتاح کەریم ((١،٥٠٠))، مەحموود بەگ ضابط تجنید، ئەحمەد عیزەت بەگ، شەوکەت ئەفەندی عەبدولڕەحمان، ئیبراهیم ئەفەندی مەئمووری تەموین، زەکی ئەحمەد، سالح ئەفەندی تاپو، حەمەد محەمەد، شێخ تەیب ئەترووشی، سادق ئەفەندی، حاجی مزەفەر ئەفەندی، تاهیر سەعید مودەرس، سەید ئەحمەد وەلی (١،٥٠٠)، سەید ڕەئوف ئیستهلاک، شەوکەت ئەفەندی ئیستهلاک، سدیق نورجان.

**((ئەوانەی نیو دیناریان داوە))**

عومەر مام یەحیا، سلێمان یەلدا، ئیسماعیل ئەفەندی مهندس، کەریم ئەفەندی ئەوقاف، عیزەت تاهیر موهەندیس، محەمەد غەفور مدرس، پەترۆس موظف صحی.

سەبارەت بە ئامانجی یانە، بە چوار خاڵ کۆی کردۆتەوە، کە بەم شێوەیەی خوارەوەن.

١- ئەو قوتابیانەی کە بۆ تەواو کردنی خوێندنیان بۆ بەغدا دێن لە ناو یانە جێگایەکی تایبەتیان بۆ دروست بکرێ و لەوێ دابمەزرێن و لە ژێر چاودێری دەستە خوێندنیان تەواو بکەن و لە ناو یانە جێگای یاری جوان دابمەزرێ، بەم هۆیەوە قوتابییەکان لە جێگای نا پەسەند دوور بخرێنەوە.

٢- ئەگەر بتوانرێ چەند رووژێک بە تایبەت بۆ سەپەرشتکارو سەرۆکەکانی کورد رێک بخرێ، کە هاتنە بەغدا لە وێ دابەزن، بەم جۆرە لە جێی تەنگ و ژووری پیسی ئوتێلەکان رزگار بن.

٣- کۆمەڵە چەند لیژنەیەک دادەمەزرێنێ و هەر لیژنەیەک بە پێی تایبەتمەندی خۆی کتێب دادەنێن و وەرگێران دەکەن. چونکە لە پێش هەمموو شتێکا بە یەکبوونی زمانەکەمان پێویستە کە هەموو کوردان بتوانن لە یەکتری تێبگەن.

٤- مانگی جارێک هەروەکو فەرمانگە (دائرە) ی پەیوەندییە گشتییەکان ئاهەنگی یەکتری ناسین و خۆشویستنی ئەکا، بەم جۆرە خەڵکی رۆژئاوا، ئەوروپا و ئەمریکا ئەمانناسن و تێمان ئەگەن کە ئێمەش وەکو ئەوان مرۆڤین و هەقی ژیانمان هەیە و دەبێ هەروەکو خەڵکی تر سوود لە یەکتری وەربگرین.

بێگومان یانە بەرنامە و پێڕەوی ناوەخۆی هەبووە. یەکێک لە بەندەکانی پێڕەوی ناوەخۆی یانە ئەوە بوو کە کۆمەڵە لە گەڵ سیاسەتدا خەریک نابێ، چونکە کۆمەڵەیەکی زانستییە. یانە دوا بە دوای ئەو باربوو کۆ کردنەوەیەی کە بۆی کرا، خانووەکیان بۆ دۆزییەوە کە ساڵانە بە (٣٥٠) دینا گیرا بوو، کرێی دوو ساڵ (٧٠٠) دیناری پێشوەخت دراو کۆمەڵە لە ١١ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٣ گوازرایەوە بۆ ئەو شوێنە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر / ژمارە (١) ی زستانی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.

# یانەی کۆیسنجاق بۆ یەکەم جار لە ساڵی١٩٣٣ کرایەوە

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

لە ساڵانی ١٩٣٠ لە کۆیە چەندین چاخانە و قاوەخانەی بە هەرمێن هەبوو، بەڵام لە زەمانی قائیمقام ساڵح زەکی ساحێبقڕان لە ساڵی ١٩٣٣ بۆ یەکەمجار یانە (نادی) لە کۆیە کرایەوە، لەلایەن (تحریرات)ەوە، ئەم نووسراوەیە بڵاوکرایەوە:

"نادی کۆیسنجەق شتات موظفین قەزای کۆکردەوە و مجەمەعێکی عائلەوی مەئمورینی تەشکیل کردووە، فەوائیدی ئەم نادیە لەپێش انظار و احساساتی هەموو کەسێکدا متمادیا لە تجسم تجلا دایە".

وەحید محەمەد ئەفەندی ناوێک، کە لە کوردە ئاوارەکانی تورکیا بوو، لەسەر نادیەکە دانرا، ئەم محەمەد ئەفەندییە بۆ یەکەمجار بلیاردی هێنا کۆیە و لە نادی دانا.

نادی بۆ یەکەمجار لەبن بەلەدیە داندرا، بینایەکی گەورە و یەک دوو پێکەی گێچی هەبوو. محەمەد ئەفەندی خواردنیشی دروست دەکرد، هەندێ کەس لەوانەی خۆیان بە (منەوەر) دادەنا، دەچوون خواردنیان لەلا دەخوارد، بەناوی یارمەتی.

مامۆستا عەبدولرەحمان شەرەف مودیری مەکتەبی کۆیسنجەق کرا سەرۆکی نادیەکە.

نادی پێکهاتبوو لە ناوماڵێکی گەورە، بەرانبەری هۆدەیەکی گچکەی هەبوو لەگەڵ حەوشێکی گەورە، دیوارێک لە نێوانی نادی و سەرایە بوو، دوایی لەلای سەردەوە، دوو ژووری درێژیان دروست کرد، لەپاشان یەک لەو ژوورانەیان کردە، دوو ژوور.

نادی زستانان هەر چای هەبوو، هاوینان ماستاویشی هەبوو، ئیجازەی مەشروباتی نەبوو، لەدوای ساڵانی (١٩٤١) پاش مەغریبان، مەشروب خۆرەکان بەدزی دەچوون لە ماڵی (وسو)ە جووی عارەقیان دەینا. هەندێ موعەلیم و مەئمورەکان بە دزی و بەبێدەنگی دەیانخواردەوە و مەزەیان توور و تۆ شفتی بوو، لە ساڵی ١٩٤١ لەتیف ئاغا چایەچی نادی بوو، هەموو مووچەخۆرەکان

ئێواران بۆ نانخواردن دەچوونەوە ماڵ، تەنها (حەویزی حەبیب ئاغا)ی نەدەچۆوە، هەتا پاش بانگی عیشایە دەماوە.

پاش مەغریبان مەئموورەکان دەهاتنەوە، یەک دوو سەعاتان دەمانەوە و دەچوونەوە ماڵ، لەپێشان بە تاوڵە و بلیارد و کاغەزانی کۆنکان، کاتیان بەڕێ دەکرد، هەندێ ڕۆژنامەشی لێ دەخوێندرایەوە.

هەندێ کەس (٤ - ٥)ێک لە نادی دەمانەوە، (پۆکەر)ی (مەستوور)یان دەکرد، چایەچییەکە هێلکەی بۆ دەکوڵاندن، شەو لای سەعات (١٢) دەیانخواردەوە، لە ساڵانی (١٩٤٣ - ١٩٤٤) کە پارەی تووتنی زۆر بوو، (پۆکەر)ی (مەکشوف)یان دانا، زۆر کەس بەشدارییان دەکرد. چەند مریشکیان دەکوڵاند، شەوێ دەیانخوارد، یا (متعهد)ەکە گیپەی بۆ دەکردن، بەیانیان دەیانخوارد.

ئەوەی کە دەبووە (موعەلیم) یان مووچەخۆر، دەبوایە بەشداری نادی بکا، دخولیە و مانگانەی دەدا، کۆییەکان، کە لە شاران موعەلیم بوون، هاوینان کە دەهاتنەوە دەچوونە نادی و دەبوایە پارەی (٣) مانگەکەیان بدابا.

هەیئەتی نادی زۆر دەسەڵاتی هەبوو، زۆر جار (حاکم) یا (ضابط تجنید) یا (معاونی شورتە)یان دەکردە (رئیس)، لەدوایی هەندێ مودیری مەکتەبیش دەبوونە سەرۆک، یا (سکرتێر) یا (موحاسب). کورسی و مێز و قەنەفە و کەرستەیەکی زۆریان بۆ کڕی، بلیتی چایان پەیاکرد.

لەدوای ساڵانی ١٩٥٠ (متعهد) لە هەڵسووڕاندنی کاروباری نادی و هەیئەتەکە دەستێکی کاریگەری هەبوو، بەڵکو دەمی ئەندامی هەیئەتی چەور دەکرد، ئەمەی قوماری کردبا، وەیا (مەشروبات)ی نادی بخواردباوە، پتر ڕێزی رادەگیرا، زووتر کورسی بۆ دەهات، ئاوی ساردی دەدرایە.

وردە وردە نادی بووە تەنبەڵخانە، زۆر بێئیش کاتیان لێ بەڕێ دەکرد، ئەوەندەی لەوێیان رادەبوارد، هێندە نەدەچوونەوە ماڵی خۆیان، تا وای لێ هات لە نادی دەست لە کاروباری سەرا و دانیشتوانی شارەکە خرا، هەندێ بەناوی حیزبایەتی بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان هێنا، زۆر مەئموور تێیدا وەردەگیران، زۆر مووچەخۆر تێیدا قەلاش دەبوون. تەنانەت دانانی مەجلیسی ئیدارە و ئەندامی مەجلیسی بەلەدیە و هەڵبژاردنی نائیبانیش لە پەناوپێچی نادی قسەی لێ دەکرا، تا لە ساڵی ١٩٥٦ نادییەکە قەپات کرا، زۆر لە بەشدارانی گیران و پەرتەیان لێکرد، لە زەمانی (هادی رەشید چاوشلی) لەبن گردی قشڵەی لەسەر ڕێگای هەولێر، بینایەکی تازە دروست کرا و نادی گواستراوە ئەوێ.

### جەمعیەتی عیلم و عیرفان

لە دەوری قائیمقام ساڵح زەکی بەگ ساحێبقران، عەبدوڵڵا سامی و زەکی ئەحمەد مامۆستایانی مەکتەب مەنهەجی (جەمعیەتی عیلم و عیرفان)یان بۆ جەنابی مەلای گەورە بردە ماڵێ و پێیان ئیمزاکرد، ئەویان کردە سەرۆکی جەمعیەتەکە، جەمیل ئاغا و مامۆستا مەلا بەهائەدین، مامۆستا مەلا تۆفیق، مامۆستا مەلا سادق و عەبدولحەمید حاجی مەلا تۆفیق، عەبدولرەحمان حاجی ئەسعەد، عەبدولمەجید حاجی کاکەمین ئەندام بوون لەگەڵ مەلا حەوێز ئاغا، کاکەی حاجی مەحموود....

ساڵح زەکی بەگ دامەزرێنەر و ئەندامی کارای ئەم جەمعیەتە بوو، بەڵام بە گوازرانەوەی بۆ (عمادیە) جەمعیەتەکە نەشاتی نەما و هەر بەناو هەبوو، جارێکیش کۆنەبوونەوە.

ئەو ساڵی (سەعید قەزاز) وەزیری ناوخۆ، لەبەر باری شڵۆقی ناوخۆی عێراق و خۆنیشاندان، ئەمرێک دەرکرا: هەرچی (جەمعیەت) و (نادی) هەبوون هەمووی لەغو کران، سەیر ئەمە بوو، لە ساڵی (١٩٣٤)ەوە تا ساڵی ١٩٥٧ ناوی ئەم جەمعیەتە، لەناو فایلی وەزارەتی ناوخۆ هەر مابوو، کە لیستەی ناوەکانیان بڵاوکردەوە، ناوی بێ ناوک بەدەرکەوت!.

جەمعیەتەکە بۆ ئەمە بوو، خزمەتی قوتابی و فەقێ و خوێندەواری بکا، یارمەتی قوتابی هەژار بدا و چاودێری مزگەوت و مەدرەسەکان بکا.

ئەو ئەندامانەی کە کۆکرابوونەوە، هەندێکیان لەبەر جێگاکەیان و هەندێکیان لەبەر هەبوونی و دەرامەتیان بوو.

*** ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، ١٩٨٤ وەرگیراوە.**

# هەولێر لە دیدی هادی چاوشلیدا

**بە قەڵەمی هادی رەشید چاوشلی**

مامۆستا (هادی چاوشلی) لە کتێبی (هەولێر لەگەڵ کاروانەی فەلەک)دا وەک رۆڵەیەکی ئەم شارە لەزۆر رووەوە باسی شاری هەولێری کردووە و ئەوەی کە بەچاوی خۆی دیوبەتی نووسیویەتی و باسەکەشی بۆ ساڵی ١٩٢٦ زایینی دەگەڕێتەوە، هەرچەندە بابەتەکان زۆر لایەنی گرتۆتەوە کە دەبوو لێکیان دابڕین، بەڵام، وەک رێزێک بۆ مامۆستای رەحمەتی بەسەر یەکەوەمان چاپکردن، تەنیا ئەو وەرگێرانانە نەبێ کە مامۆستا لە کتێبەکاندا وەریگێڕاون و خستمانە نێو بەشی هەولێر لە دیدی گەشتیارەکاندا.

*** دیمەنی کۆنی هەولێر**

زۆر بەگرنگی دەزانم کە باسی دیمەنی هەولێر پێش ٦٠ ساڵ یان لە ١٩٢٦ بە بیری خەڵک بخەمەوە، چونکە دەتوانم بڵێم، هەتا ساڵی ١٩٣٥ هەولێر زۆر نەگۆڕابوو، زۆر شێوەی کۆنی تێدامابوو، لە ساڵی ١٩٢٦ بەرەو دوا هەولێر وردە وردە دەستی بە گۆڕین کرد، لێرەدا بیر و باوەڕی خۆم کە لە ساڵی ١٩٣٠ هەولێرم چۆن دیوە باسی دەکەم. ئەو شارە دانیشتووانی زۆریان لەقەڵابوون، قەڵا (٣) گەڕەکی تێدابوو، کە بەناوی گەڕەکەکانی (تۆپخانە) و (سەرا) و (تەکیە) ناو دەبران.

لە دەرگای قەڵا سەرای کۆن بوو پاش ساڵی ١٩٢٠ کراوەتە بەندیخانە و پاش ساڵی ١٩٣٦ کراوەتە قوتابخانەی کچان و لە دەرگای قەڵا چەند دوکانێکی تێدابوو.

لە قەڵاکە سەرنەکەوتی، گۆڕەپانێک بۆ ئەوانەی بۆ قەڵا دەهاتن نەختێ رادەوەستان هەناسەیەکیان دەدا، ئەنجا کە دەچوونە ناو دەرگا پیاو رێگای راستیان دەگرت و رێگەی تر بەدەستی چەپدا ژن هاتوچۆی لێ دەکرد و، لەلای چەپی پێچەی ئەو رێگایە کاولە قوتابخانەیەکی کۆن بوو کە پێیان دەوت قوتابخانەی مەلا رەسول ئەفەندی، وادەردەکەوێ کە ئەم شوێنە لە کۆنەوە بۆ قوتابخانە تەرخان کرابوو، دەڵێن زۆر عولەمای گەورە لەم شوێنە فێری خوێندنی بەرز بووینە.

لە قەڵا تەنها لەیەک مزگەوت نوێژی جومعە دەکرا، ئەوەش مزگەوتی بەرێز مەلا ئەفەندی بوو، ناوبراو یەکێک بوو لە پیاوە گەورەکانی هەولێر لەم مزگەوتە قوتابخانەیەکی ئاپینی ئیسلام بەناوبانگی تێدابووە کە زۆر خوێندەواری بەرز لەو شوێنە فێری زانستی بوون و مەلای گەورەی بەرێز خۆی رۆژی جومعەی ئامۆژگاری دەکرد هەروەها خۆی سەرۆکی مامۆستایانی ئەم قوتابخانەیە بوو، هەموو پێویستی مزگەوت و مەلاکان و قوتابییەکان لەلایەن خۆی پارەی بۆ دادەنرا.

قەڵا یەک دەرگای بووە، لە دەوری عوسمانی دەرگای دووهەمی بۆ کراوە و پاش ساڵی ١٩٢١، دەرگای سێیەم بە ناوی ئەحمەدی دروست کراوە.

کۆڵانەکانی قەڵا وەک ئێستا نەبوو، هەردوولای کۆڵان وەک دیوارێک بوو کە رێگای رۆیشتن پیادە بوو، ناوەندەکەی جۆگەلەی ئاوی پیس بوو و ئاوی بارانیشی تێدا دەچوو، ئەم سەکۆیەیان بەخشتی سوور دروست کردبوو، جوولەکەکان هەرچەند لەخوار قەڵا دانیشتبوون، بەڵام لە قەڵا کەنیشتەیەکیان هەبوو

دوو حەوشەی هەبوو حەوشەی دەرەوەیان دوو و یا سێ ماڵی تێدا جێنشین ببوو.

قەڵا نزیکەی ۸۰۰ خانووی تێدابووە ژمارەی نزیکەی نۆ هەزار کەس دەبوو.

لە قەڵا چەند مزگەوتی تر هەبوو و چەند تەکیەی شێخ و دەروێشی تێدابووە، وەک مزگەوتی ماڵی یەگەن و تەکیەی شێخ شەریف و نزیکەی ۲۰ دیوەخانەی تێدابوو کە شەو خەڵکی تێدا کۆدەبووەو لە هەریەکەیاندا چەند میوانێک دەخەوت کە لە جێگای دیکە هاتبوون یا خەڵکی گوندەکانی هەولێر بوون.

لەوکاتە دانیشتواتی قەڵا هەموو پیاوی ناوداری شاربوون و هەموو دەوڵەمەندی شار کە خاوەن کشتوکاڵ بوون، یا خاوەنی پارەی زۆر بوون، ماڵیان لە قەڵا بوو، پاش ساڵی ۱۹۳۵ وردە وردە چەند خاوەن ماڵی قەڵاتی دەستیان بەخانوو کردن کرد لە گەڕەکەکانی خوارەوە.

شاری هەولێر لەو کاتەشدا بازاڕێکی زۆر گەورەی هەبوو، جگە لە سەدەها دوکان، حەوت قەیسەری بنەماڵەی دەباغەکانی تێدابوو، لە گەسی قەیسەری تر و هەر گۆشەی بازاڕ بۆ فرۆشتنی یا دروستکردنی بابەتێک بوو، لە لایەک جێگای ئاسنگەر، دوای وان تەنەکەچی و سەڕاج، کورتان دروو، کارگەچی، سەبزەفرۆش، قەساب، بەقاڵ و عەتار و کوتاڵ فرۆش و دەلاک و زۆر شتی تر.

دانیشتوانی هەولێر، بە گشتی وەک ئێستا، ئیسلامی شافعی مەزهەب بوون. گەڕەکێکی بچووک لە خوارەوە جوولەکە بوون، کە گشتی ژمارەیان نزیکەی هەزار کەس دەبوون، لە ساڵی ۱۹۵۰- ۱۹۵۱ هەموویان هەولێریان بەجێ هێشت.

باسمان کرد کە ئەم شارە بەشێکی قەڵا بوو، بەشی دووەم خوارەوەی قەڵا بۆ ئەم بەشە بە کورتەک ناودەبرا.

ژمارەی دانیشتوانی شار لە ساڵی ۱۹۲۷ ئەوانەی ناونووس کران و ئەوانەی لە ناونووس خۆیان شاردبووەوە، گشتی نزیکەی ۲۵ هەزار کەس بوون.

مەسیحی هەموویان لە گوندی عەنکاوە دادەنیشتن کە ئێستا بۆتە شارێکی بچکۆلە، بە گەلێکی هەولێر دادەنرێ، ئەمانەش لە دانیشتوانی زۆر کۆنی ئەم خاکەن و ماوەی چەند چەرخێک هەر بە برایەتی لەگەڵ دانیشتوانی دێهاتی تر و شارستانی هەولێری بەڕێوە چوون و لەو کاتەدا لەناوشار تەنها دە دوانزە ماڵ مەسیحی زیاتر نەبووە و لەپاش ساڵی ۱۹٤۰ لە گەڕەکی عەرەب کەنیسەیەکیان دروست کردووە، پاش ئەم سەرەتایە پێویستە هەندێ شتی کۆنی هەولێر بە تایبەتی باس بکرێ.

*** قوتابخانە:**

لەم دەورەدا لەم شارە تەنها یەک قوتابخانە هەبووە، شوێنەکەی ئێستا دوکانە لەسەر شەقامی سەلاحەددین بەرامبەر بە بازاڕی گەورە، لە ساڵی ۱۹۲۵- ۱۹۲٦ قوتابخانەی تازە دروست کرا، کە جێگاکەی ئێستا کراوە بە پارێزگای هەولێر و بێجگە لەم قوتابخانە لەوکاتەدا قوتابخانەیەکی تر کراودتەوە لە گەڕەکی تەعجیل و، پاش ساڵی ۱۹۳۰ سێیەم قوتابخانە لەسەر شەقامی موزەفەرییە بەرامبەر بە قەڵا کراوەتەوە.

بەڵام قوتابخانەی کچان، پاش ساڵی ۱۹۳٦ لە قەڵا دامەزراوە و بێجگە لەمەش لەزۆر مزگەوت و قوتابخانەی ئایینی بوو وەک مزگەوتی قەڵا و مزگەوتی یەگەن، لە قەڵا و مزگەوتی بازاڕ و مزگەوتی شێخ ئەبوبەکر ئەفەندی.

*** کۆنە مزگەوتەکانی هەولێر**

مزگەوتی مەلائەفەندی لە قەڵا، مزگەوتی شێخ چۆلی، مزگەوتی خانەقا، مزگەوتی شێخ محێدین و مزگەوتی بازاڕ، مزگەوتی شێخەڵلا، مزگەوتی شەش پەنجە لەناو بازاڕ و چەند مزگەوتی تر.

بێجگە لە مزگەوت و تەکیەکان کە شوێنی دەروێشی قادری و نەقشبەندی بوون لە گەلێکیان نوێژکراوە وەک تەکیەی شێخ شەریف لە قەڵا و تەکیەی شێخ تاجەدین، تەکیەی شێخانی دارەخورما، تەکیەی شێخ مستەفا ئەبوبەکر ئەفەندی و تەکیەی خەلیفە ئەحمەد و، تەکیەی شێخ عارف و تەکیەی شێخ سەلیم..)

*** نەخۆش و تەندروستی**

لە دەوری عوسمانلی پاش ساڵی ۱۹۰۸ لە لایەن بەلەدییەی

(شــــارســـــتــــانی) هەولێـــــر نەخۆشخانەیەکی بچووکیان دامەزراند و دکـتـۆرێکی زانایان لە مـوسـڵـەوە هێنا پاش کـۆتایی شـەڕی یەکـەمی سەرزەمین لە ساڵی ١٩١٩ دەوڵەت نەخـۆشـخـانەی دامـەزراندووە پاش دامەزرانی مەلەکـیـەتی عێـراق، لە ســــــاڵی ١٩٢١ وردە وردە ئـەم نەخۆشخـانەیە رێک خرا، بەڵام هیچ کـــاتێ هەتا ســـاڵی ١٩٤٠ لەدوو دکتۆر زیاتری تێدا نەبووە و ئەگـەر زۆر کـۆن باسی تەندروسـتی بکەین، دەبینین چەند بابەت دەرمـانی خـۆیی بووە بـۆ هەنـدێ نەخــــۆشی، وەک دەرمـانی چاو کـە ئەم دەرمانە لەتۆی تریش و شەب دروست دەکرا، بۆ چاو ئێـشـە بەکـار دەهێنرا و دەخـرا ناو پارچە پەڕۆکـێکی خـاوێن و لەناو شیری دایکی کوڕێکی شەش مانگە، ئەم دەرمـانە دەتاواوە ئینجـا دەخـرا بەچاو ژنێکی بە ئێش و ئەگـەر پیـاو بایە شـیـری دایکی کـچـێک پەیدا دەکـرا بۆ ئەوەی دەرمـانەکـەی تێـدا دەتاواوە. بۆ سەرما و تەنگە نەفەسی و کـۆکە، هەنگوینیـان گـەرم دەکرد و دارچین و بەهاراتیـان تێدەکرد، پاش ساردبوونەوەی رۆژی ٣ جـار نەخـۆش بەکاری دەهێنا.

بۆ هەڵامـەت، گـیایەک لە دەشتی هەولێر بەهار پەیدا دەبێت بە حاجیلە ناودەبرێ، لە مـوسڵ بە (بەیبـون) ناودەبرێ گوڵی حاجیلە وشک دەکرا، ئەم گـوڵە بە دوو شـێـوە بۆ هەڵامـەت وەکـو زگـئێـشـە بەکـاردەهات، پاش کــوڵاندنی لەگـەڵ شــەکــر ئـاوی دەخورایەوە و بۆ هەڵامەت جار بەجار نەخـــۆش لووتی دەدا بەر هەڵمی. هەروەها، سـوتەک لەگـەڵ شـەکـر دەکوتراوە و لەناو شیر دەکوڵا ئینجا نەخۆش بەکاری دەهێنا.

دەرمـانێکی تر لە مـازو شـەب و چەند شتی دیکە تێکەڵ دەکرا، پاش کوتینێکی ورد بۆ ئازاری دەم و، ددان بەکاردەهات.

*** سەرای دەوڵەت:**

لەکاتی عوسمـانی لە قەڵا بووە و لەدوا رۆژی ئەم دەورە لە خـوارەوە لە جـێـگای بەڕێوەبەرایەتی پۆلیـــسی پارێزگای ئێستا لەو شوێنە قشڵەیەک بۆ لەشکر دروست کـرابوو و پاش ئەم دەورە، جـێـگای لەشکر گـــوازراوە دەرەوەی شـار و، ئەم شوێنە جێگای پارێزگـــای هەولێــر و پاش ســـاڵی (١٩٢٧-١٩٣٠) دەزگــــایەکی تـازە لەم شـوێنە بۆ سـەرا دروستکرا، پاش مـاوەی چەند سـاڵ لەپشـتی چەند ژووری تریش دروست کرا.

هەتا ســـاڵی ١٩٤٠ هەمـــوو دائیـرەکـان لەو جێگایە بوون، بێجگە لە قـوتابخـانە، نەخـۆشـخـانە و شـارەوانی (شـارسـتـانی). پاشـتـر دائیـرەی تەجنید و نفوس لە دەرەوەی سەرا جێگایان بۆ پەیداکرا.

*** جێگای زیارەت**

چەند شـوێنێک لەناوشــار بە پیـاوچاک دادەنران و نیشـتەجێ شار جار بەجار زیارەتی ئەم مەرقەدانەیان دەکرد، ئەم مەزارگا کۆنانە ئەمانەن: شێـخی چۆلی، بابا حـەیدەر ئیـمـام مـحـەمـەد، سـولـتـان مـوزەفـەرەدین، عوزێر پێغەمبەر، ئیمامی باوەرهێل کـە بەیل ئیـمـام ناو دەبرا، وەتەنی ئیمامی.

*** ئوتێل لە هەولێر**

پێش سـاڵی ١٩٢٦ هیچ ئوتێلێک لە هەولێـر نەبووە، رێبـوار کـــاروانچی لەخـــان دادەبەزین و ئەمـانەی لەخـان دەهاتنە خـوارەوە زۆر کـەم بوون، چونکە لە قـەڵا نزیکەی ٢٠ دیوەخـانە بووە لە کـورتەک هەم دیـســان نزیکەی ٢٠ دیوەخـانە یا میـوانخـانەی تێدابوو ئەم میـوانانە هـەنـدێـکـی لـە لادێـوە دەهـاتـن و هەندێکی دیکەش لە شارێکی ترەوە گەلێ لەمانە ناسیاوی ئەم خانەخوێیە دەبوون. پاش سـاڵی ١٩٢٦ دوو ئوتێلی بچووک پەیابوو کە یەکێکیان بە مگـردیچ و دووهەم بە ئـوتێـل (فەرح) ناوبرا.

*** حەمام لە هەولێر**

لە کـۆنەوە چەند حـەمـامـێک هەبووە، حەمامی قەلات و عەلی ئاغا و حەمامی گەورە و مۆدە بوون.

* یەکەم چاپ لەلایەن مامۆستای گەورە، سەید حوسێن حوزنی هێنراوە بۆ هەولێـر، کـە رۆژنامـەی زاری کرمانجی پاشتر چەند گۆڤـاری پێ چاپ کراوە.

*** قاوەخانە لە هەولێر**

تەنیـا قـاوەخـانەی عـەبۆ هەبوو، خـاوەنەکـەی (عـەلی فلەیەح) بوو، قـاوەخانەی عـەزیز ئەفـەندی جێگای خوێندەواران بوو، کـتـێـبخـانەشی تێدابوو لە ساڵی ١٩٣٠.

### * جل و بەرگ

بەرگی کوردی بۆ چاکەت و پانتۆڵ تەنها لە لایەن مەئموورانی دەوڵەت بەکاردەهات، بە بۆنەی خوێندن و قوتابخانە ئەم بەرگە ئەورووپییە بڵاوبۆوە بەڵام جل و بەرگی خۆ ولاتی بەم جۆرە بوو. شارستانی کەوا و سەڵتەی لەبەردەکرد و بۆ سەر جامەدانیان دەبەست و لەپشت پشتێنیان دەبەست و پیاوی ماقوڵ عەبایان لەبەردەکرد. لادێی پیاوی پیریان زۆریان ئەم بابەتە جلەیان بەکاردەهێنا.

لەگەڵ ئەمەشدا ئەم تەرزە بەرگە لەلایەن دانیشتووانی قەڵا بەکاردەهات. زۆربەی دانیشتوانی گەڕەکەکانی کورتەک و دانیشتوانی گوندەکان کورتەک و شەرواڵیان لەبەر دەکرد لە هەندێ ناوچەی کورد بە مرادخانی ناو دەبرێ، لە هەموو کات پشتێن لەپشت دەبەسترا و هەندێ لادێی هەولێر رانک و چۆغەڵیان بەکاردەهێنا لەگەڵ پەستەک.

لە لادێ قاپووتی لباد شوان و نۆبەچی بەکاریان دەهێنا بۆ رۆژی ساردی زستان.

پێڵاو و قۆندەرە بۆژن و پیاو و کرێکار و جووتیار و سەپان لە زستان کاڵەیان لەپێ دەکرد و لە هاوین کلاش بەکاردەهات.

جل و بەرگی ژن هەر بە دەستووری ئێستا بوو، بۆ کراس و کەوا و سوخمە بەکاردەهات و هەوری، مشکی لەسەر دەبەسترا.

ژن لەشار (چارچەف و پێچەیان) بەخۆوە دادەپۆشت و روویان دەرنەدەکەوت و لەزستان جزمەیان لەپێ دەکرد ژنی لادێی و گەڕەکەکانی خواری قەڵات روویان دەردەکەوت، بەڵام خۆیان بە چارۆگە دادەپۆشی.

### * ئاو- چرا- سووتەمەنی

پێش ساڵی ١٩٣٠ بە ولاغ سەقا ئاوی دەبرد بۆ ماڵانی قەڵات و ئەو ئاوە لە کارێزی هەولێر و یا لە کارێزی میری بەجۆگەلە دەهات بۆ حەوزی ناوشار کە لە دەرگای بازاڕ بووە.

بەڵام نیشتەجێی گەڕەکەکانی کورتەک (ئەی خواروی قەڵا) ئەم ماڵانە هەندێکیان ئاوی بیریان بەکاردەهێنا و هەندێکی تر ئاوی کارێزیان دەخواردەوە و پاش ماوەیەک شارستانی دەستی کرد کە ئاوی کارێزی میری بە بۆری بەسەر ماڵان دابەش بکات.

چرای شەو (فانۆس)ی پێدەوترا و ماڵی کەمدەرامەت گەلێکی فانۆسیان نەبوو، قودیلە یا لامپایان بۆ شەو بەکار دەهێنا، ئەو هەموو بابەتە چرایانە بەنەوت پێدەبوون.

لە زەماوەند ۆ شایی و مەولود (مۆمیان) پێدەکرد، ئیتر بەو جۆرە نەختێ رۆشنایی و رووناکی بۆ شەو دروست دەکرا تا پەیدابوونی کارەبا پاش ساڵی ١٩٣٦.

ئەگەر لە کارەبا بپرسین، نەک بۆ ولاتی ئێمە، ئەم شتە تازەیە پەیدابوون و بڵاوبوونەوەی زۆر کۆن نییە و دەگەڕێتەوە سەرەتای ئەم چەرخە.

بۆ سووتەمەنی و ئاگری زستان دار و رەژوو (خەڵووز) و لەگوندەکانەوە پووش بەکاردەهات و هەر بەدار و کا، یا (پشقەل)، ئاگر دەکراوە. بۆ دروستکردنی شیو و خواردەمەنی، پاش ساڵی ١٩٤٠ وردە وردە نەوت بۆ سووتەمەنی و بۆ دروست کردنی خواردن بەکارهات لە ساڵی ١٩٦٠.

غاز پەیدابوو، زۆر کەس لەجیاتی نەوت بۆ ئاگری زستان و بۆ دروستکردنی شیو بەکاریان هێنا، هەرچەندە کارەبا پێش ساڵی ١٩٤٠ پەیدابوو، بەڵام لە هاوینی پاش ١٩٤٠ ئینجا (پانکە) بەکارهات.

### * بۆ ئاوی سارد بەفری چیا دەخرایە چاڵ.

لە گوندەکانی شەقڵاوە و پیرمامەوە ئەم بەفرە لە هاویندا دەهێنرا بۆ شار، ئاوی سارد و ماستاوی پێ دەکرا، پاش ساڵی ١٩٤١ (بوز) سەهۆڵ پەیدا بوو، بەفری دروستکراو بە مەکینە و پاش ساڵی ١٩٥٨ ئینجا (سەلاجە) یەخچاڵ پەیدابوو لە هەولێر.

### * ئۆتۆمبێل لە هەولێر

یەکەم ئۆتۆمبێل لە ساڵی ١٩١٥ هاتۆتە هەولێر و بۆ خەلیل پاشا سەرلەشکری عوسمانی تەرخان کرابوو، دەڵێن شوفێرەکەی (ئەڵمانی بووە)، پاش ساڵی ١٩٢٢ ئۆتۆمبێل بۆ هاموشۆ لەنێوان هەولێر و موسڵ بەکارهاتووە.

پاش ساڵی ١٩٢٣- ١٩٢٤ ئینجا بۆ رۆیشتن بۆ کەرکووک و بەغدا بەکارهاتووە، پێش ماوەی

ناوبراو تەنها ئەسپ و ولاغی تر هەبووە بۆ کاروان و سەفەر.

*** رادیۆ لە هەولێر**

رادیۆ کە بە پاتری کاردەکات، پاش ساڵی ١٩٣٤ لە هەولێر پەیدابووە و ئەوەی بە کارەبا کاردەکات، پاش ساڵی ١٩٤١ بۆ هەولێر هێنراوە.

*** تەلەفزیۆن لە هەولێر**

تەلەفزیۆن پاش ساڵی ١٩٦٠ لە هەولێر پەیدابووە، پاش ئەوەی کە لە موسڵ تەرتیباتی پرۆگرامی تەلەفزیۆن دروست کرا.

پێش ساڵی ١٩٣٧ ئەگەر مامۆستایەک لە قوتابخانە باسی بوونی تەلەفزیۆن یا شتێکی دروستکراوی تازەی بکردبا هیچ کەس بڕوای بەو قسەیە نەدەکرد و هەروەها لە ساڵی ١٩٦٧ کە ئەمریکییەکان چوونە سەر مانگ زۆرکەس دەیوت ئەم قسەیە راست نییە و هەتا ئێستاش زۆرکەس بڕوا بەم گفتە ناکات، ئیتر ئەم جۆرە بیر و باوەڕە دواکەوتووە مەبەستی نەخوێندەوارییە، دەبێ بزانین خوێندن و پێشکەوتنی زانستی هۆکارێکە بۆ رێگای بەرزبوونەوەی ئاستی گەل و نیشتمان، نەخوێندەواری وڵات تاریک دەکات و گەل دوادەخات.

*** شارەوانی**

کاروباری شارستانی بنکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٨٥. لەم ساڵەدا شارەوانی هەولێر دامەزراوە، ئەم دەزگایە زۆر کاروباری شاری جێبەجێ دەکرد وەک کۆڵان پاککردنەوە و زبڵی ماڵان گواستنەوە بۆ دەرەوەی شار و شەو کۆڵان و جادەکانی شار بە فانۆس رووناک دەکرا، هەروەها بەلەدیە نۆبەتچی بۆ بازاڕ و گەڕەکەکانی شار دادەنا، ئەم نۆبەتچیانە لەژێر چاودێری دائیرەی پۆلیس پاسەوانی شاریان دەکرد.

لە شار دوو جێگا بە مەیدان ناودەبرا، یەکێک مەیدانی دارفرۆشتن، کە دار خەڵوزی تێدا دەفرۆشرا، هەروەها هەندێ میوەجاتی گوندەکانی چیا دەهاتە ئەو مەیدانە بۆ فرۆشتن. مەیدانی دووهەم پێیان دەوت مەیدانی ولاغ فرۆشتن، مەڕ و بزن و گا و مانگا لەم مەیدانە دەکرا، هەروەها ئەم جێگایە کڕین و فرۆشتنی بەرزە ولاغی تێدا دەکرا وەک کڕینی ئەسپ، ماین، ئێستر. ئەو دوو مەیدانە لەژێر چاودێری شارەوانی بووە.

گۆڕەپانی سێیەم شتی کۆنەی ماڵان یا شتێ کە خاوەن ماڵ لەخۆی زیاد بوو لەو جێگایە دەفرۆشرا، زۆرشت لەلایەن چەند پیرەژن دەفرۆشرا و ئەم ئافرەتانە بەم کارە خەریک بوون و شتی بەنرخ (چەرچی جاری بۆ دەدا) هەرکەس زیادی بکردایە ئەو شتە بۆ ئەو دەبوو.

ئەم گۆڕەپانە بە مەیدانی (قاری بازاڕ) یا بە دەلاڵخانە ناودەبرا. ئەم سێ مەیدانە لەلایەن شارەوانی چاودێری دەکرا و هەندێ رسومات لەلایەن باجگیری شارستانی وەردەگیرا.

*** ژنخواستن**

بە زەماوەند یا شایی ناودەبرا، ژن مارەکردن، بەپێی ئایینی ئیسلام، لەلای مەلا یا قازی مارەی دەبڕا.

ژن گواستنەوە لە ماڵی بووک بۆ ماڵی زاوا لە شوێنی نزیک بەپێ بووکیان دەهێنا بۆ ماڵی زاوا و لە شوێنی دوور بە ولاغ ژنیان دەگواستەوە لە دەرگای ماڵی زاوا، زاوا یان یەکێ لە خزمەکانی شەکر و پارەیان بەسەر بووک هەڵدەدا و بەشەو کە زاوا دەچووە لای بووک و بە تەواوبوونی زاوایەتی یەکێ لە ولداش زاواکان یا خزمێکی زاوا هەر لەوکاتەدا تەقەی بە تفەنگ دەکرد. ئەمەش زۆرجار یەک تەقە دەبوو یا سێ زیاتر نەدەبوو.

پێش رۆژی بووک گواستنەوە ماڵی زاوا ئاهەنگیان دەکرد و مەولود بەشەو دەخوێندرایەوە.

ناسیاوی ماڵی زاوا و خزمەکان رۆژی گواستنەوە هەرکەس شتێکی بەناو بارو بۆ یا بەناو پیرۆزی دەیانبرد ئەم شتە زۆرجار پارە دەبوو، یا شتێکی بەنرخ وەک مافوور یا سەعاتێک.

بووک پاش (٣) رۆژ لەناو ماڵی خۆی هەندێ دیاری دابەش خزمانی ماڵی زاوای دەکرد.

رۆژی حەوتەم ئافرەتان خزمی ماڵی بووک و زاوا هەر ماڵی نەختێ پارەی دەبرد بۆ بووک.

بووک نزیکەی شەش مانگ نەدەچووە ماڵی باوکی دوایی کە دەچووە، ماڵی باوکی یەکەم جار نزیکەی دەرۆژ زیاتر دەمایەوە ژنە

خـــزمـــانی مـــاڵی زاوا دەچوون دەیانهێنایەوە.

ئاهەنگی شـار هەر بە گـۆرانی دەبوو، رۆژی زەمـاوەند کـەم جـار هەڵپـەڕکێ دەکـرا، بەڵام لە لادێ هەردەم لە زەماوەند و زوڕنا لێدراوە و هەڵپەڕکێ دامەزراوە.

*** منداڵ بەخێوکردن**

پاش بوونی منداڵ بە (٣) رۆژ کوڕ لە لایەن باپیری یا باوکی ناوی لێدەنرا کچ لە لایان داپیری یا دایکی ناوی لێدەنرا.

منداڵ کـە دەبووە حـەوت رۆژە لەلایەن پیـرەمـێـردێکی دانای خـزم یاخـەڵکی گـەڕەک بەگـوێی چەند گـفـتـێـک ئەوترا منداڵ بوون بە یارمـەتی مـامـانی ژن دەبوو، ئەم مـامـانە ناوکی منداڵی دەبڕییەوە و ئاگـاداری تەندروستی منداڵ دەبوو، هەتـا چـل رۆژ بەســـــەر بـوونی رادەبووری.

ئەم مـامـانانە ئەم کـارە ئەرکـیـان بووە و کرێی خۆیان لە خاوەن منداڵ وەردەگرت.

منداڵ بەشـــــیـــــری دایکی بەخـێـودەکـرا، ئەگـەر دایکی منداڵ نەخۆش بووایە یا شیری ئافرەت کەم بووایە، ژنی جیران و خزم جار بەجار مـەمکـیـان ئەدا بەم منداڵە، ئەگـەر خاوەن منداڵ دەوڵەمەند بووایە، (مەم دایانیـان) بۆ دەگـیـرا بە مـانگانە. ئەوانەی منداڵیـــان نەدەمـــا، هەندێکیـان منداڵی خـۆیان دەدا بە یەکێ لەماڵی خۆی بەخێوی بکات، یا ئەگـەر خـاوەن مـاڵ پارەدار بایە شـوێنێکی تایبـەتی تەرخـان دەکـرد منداڵەکەی ژنی لەو جێگایە بەخێوی بکات.

منداڵی کـــوڕ پاش یەک ســـاڵ خەتەنەدەکرا و بەبۆنەی خەتەنە ئەگەر باوکی منداڵەکـە دەوڵەمـەند بایە، ئاهەنگی بۆ دەکـرا، خـزم و ناسـیـاوو دیاریـیـــان بۆ دەهێنا و منداڵ پاش حەوت ساڵە لە مزگەوت مەلا فـێری خوێندن و نووسینی دەکـرد، ئەوانەی کە دەچوون بۆ خوێندن زۆرکەمبوون و ئەوەی دەیخوێند، پاش سێ چوار ساڵ فـێری خوێندن دەبوو، وازی لەخوێندن دەهێنا، ئەوانەی مەبەسـتیـان بوو ببنە مـــەلا یا خـــوێـندەوارێکی تـەواو ماوەیەکی زۆر دەیانخوێند.

*** جەژن**

جەژنەکـانی شـاری هەولێـر گـەلێ جەژنی بەپێی ئاینی ئیسلامە، کە ئەو جەژنانەن: جەژنی رەمەزان و قـوربان، جەژنی مەولودی پێـغـەمـبـەر محەمـەد (د.خ)، ئەم سێ جـەژنە بە گـرنگی دەگـیـــڕدرێ و، لە جـەژن کـورد لە یەکـتـری جـەژنە پیـرۆزە دەکـەن و بۆ جەژنە پیـرۆزی لە دیوەخـانی گوند یا دیوەخـــانی گـــەڕەک کـــۆ دەبنەوە و هەروەها لە مـزگـەوت تێکڕا نوێژی جـەژن دەکـەن و مـەلا ئامـۆژگـاری دەکات.

لە زۆر گـوند لە کـۆنەوە واباوە، خاوەن ماڵەکان چێشـتی جەژن ببەنە دیوەخانەی گوند کە تێکڕا پیـاوەکان نان بخۆن.

هەموو ماڵێک ئەم چێشـتە دەباتە دیوەخـان، بێجگە لەو کـەسانەی کە زۆر بێ دەسـەڵات بن و خـاوەن مـاڵ نەبن، ئەویش مـــاوەیەکی کـــورت یەکـێکیـان لێ مـردبێ یا خـاوەن شین بن.

لە جـەژنی رەمــەزان و قـوربان خـاوەن ماڵ جلوبەرگی تازە دەکـڕێ بۆ منداڵەکـانی و خێزانی و جەژنانەیان دەداتێ و ئەو کـەسـانەی کـە زۆر بەدەسـەڵات، یا دەوڵەمـەندبن ئەم کـەسـانە جـەژنانەیان دەدەنە خـزم و دۆسـتی خـۆیان. لە جـەژنی قـوربان سەربڕینی مەڕێک، یا گایەک لەلایەن پیـاوی دەوڵەمەند پیشـەیەکی کـۆنە، زۆر پەسـەند بووە، ئەمـانە لە جەژنی (١٢ی رەبیـــعی یەکـــەم) لە رۆژی لەدایکبوونی پێغـەمبەر (د.خ) پیاوی بەدەسـەڵات مەولودیان دەکرد لە مـاڵ یان مزگەوت.

ئەمـا جـەژنی نەورۆزی کـوردان پێش سـاڵی ١٩٥٠ تەنها لە دێهاتی چیـا ئاهەنگی بۆ دەکرا، پاش سـاڵی ١٩٥١ ئینجا خەڵکی شاری هەولێر دەسـتـیــان کـردووە بە یادی رۆژی نەورۆز، هەموو ساڵ لەکاتی خۆی کە دەکەوێتە ٢١ مارتی ساڵی زایینی.

*** خانووبەرە**

خـانووبەرەی قـەڵای هەولێـر و گەڕەکـەکانی خوارەوە کە بە کورتەک ناو دەبرا، زۆربەی ئەم دەستوبەرەیە بە کـەرپوچ (خـشـتی سـوور) دروست کـراوە و هەر خـانووی چەند ژووری تێـــیـدا بووە، هەر مـــاڵی دوو بەر هەیوانی تیـابوو یەکیان بۆ دانیشتن و دووهەمـیـان بۆ شـیـولێنان و جێگای شـیوکردن لەبەر هەیوان بوو نەک وەک

ئێستا لە ژووری بێ، لەبەر دووکەڵ، چونکە ئامادەکردنی خواردەمەنی بە ئاگری داریا کا و کوتەڵ دەکرا.

خانووبەرە زۆربەیان یەک نهۆم بوون و هەندێ خانووی پیاوی دەوڵەمەند بەدوو نهۆم دەکرا و ژوورەکانی سەرەوە بە کۆشک ناودەبران و گەلێ ماڵی قەڵا ئەندازەی زۆر بچووک بوو، لەبەرئەوە زۆرجار لە پایەی سەرەوە دوو کۆشک لەگەڵ بەرهەیوانێ دروست دەکرا و لەگەڵی سەربانی قەڵا لەسەرەوە بەر هەیوانێکی بچووک هەبوو بۆ پاراستنی جێگا و بەڕەو لێف و بالیفی نووستنی هاوینە تا لە سەربان لەبەر تریشکی رۆژ نەمێنێ و لەم جێگایە دابنرێ تا دووبارە بۆ ئێوارە و شەو لەسەربان رابخرێنەوە.

لە سووچی شار ئەگەر خانووبەرێکی گەورە و نزیک دروست بکرابایە و دار و باغی تێدابایە ئەم خانووە بە باڵەخانە و قەسر ناودەبرا، وەک قەسری مەلائەفەندی لە باداوە و قەسری عەتاوڵاغا لەوپەڕی گەڕەکی خەنەقا و سەیداوە.

دانیشتوانی شار هەرکەس خانووی خۆی بوو، ئەما کرێکاری تازە هاتوو بۆ شار یا رەنجبەری کشتوکاڵ کە جووتیار و سەپانیان پێ دەوترا، ئەمانە زۆریان بێ خانوو بوون. پیاوی بە دەسەڵات کە خاوەنی زەوی و کشتوکاڵ بوون لە گەڕەکەکانی خوارووی قەڵا لە گەڕەکی عەرەب و گەڕەکی خانەقا حەساریان بۆ جووتیار و سەپانی خۆیان تەرخان نەکردبوو، ئەم ژوورانە بەکرێ دەدرانە ئەم کرێکارانە بە مانگانە. ئەم حەسارانە بەناوی خاوەنی یا بەناوی ئەوەی دروستی کردووە ناودەبرا و هەندێ حەسار ناوی بەناوی ئەو شوێنە دەبرا کە تێیدا دروست کرابوو. ئەم حەسارانە بە خشتی سوور دروست کرابوون و هەندێکی بە خشتی کاڵ.

دەرگای ژوور و دەرگای دەرەوە و کلیلی دەرگا و چەکوش لێدانی دەرگا، بە شێوەیەکی جیاواز لە ئێستا بوو. بازاڕی گەورەی هەولێر لە کۆنەوە تا ئێستا هەر لە شوێنی خۆیەتی و ئەم بازاڕە ١٢ قەیسەری تێدا بووە، تا رادەیەک ئەم قەیسەرییانە لەسەر نەخشەی کۆنیان هەر بەردەوامن و لەناو بازاڕ زۆر دوکانی تر هەبووە کە ژمارە لە (١٠٠-٢٠٠) زیاتر بووە، لەگەڵ بوونی چەند چایخانە و جێگای ناڵبەند و خەمچی و چەند خانێک کە بۆ وڵاغی کاروانی و بۆ حەیوان بەکارهاتووە، ئەم دوکانە لەسەر شەقام زۆر کەم بووە، لەگەڵ چەند چایخانەیەک و پاش ساڵی ١٩٣٠ وردە وردە دوکان لەسەر شەقامە کۆنەکانی دروست کرا و لەکاتی ناوبراو تەنها شەقام لەشار بووە (موزەفەرییە، خانزاد، سەلاحەدین و پاش ساڵی ١٩٤٠ و ساڵ دوای ساڵ چەندین جادە و شەقامی تازە لەناوشار کرایەوە.

لە کۆنەوە لەشار گەلێ مزگەوت و تەکیە هەر هەبووە. دەوڵەت زۆر کەم بینای بووە تەنها لە ساڵی ١٩٣٠ سەرای کۆنی قەڵات (سەرای موتەسەڕفییەت لە خوارەوە و بینایەک بۆ نەخۆشخانە و یەک بۆ قوتابخانە و شارستانی لەگەڵ دوو سێ خان و حەسار بەکرێ گیرابوو، بۆ چەند دائیرەی تر، لە کۆنەوە یەک حەمام لە قەڵاتێ بووە و لە کورتەک چوار حەمامی تێدا، بووە.

*** دروستکردنی خانوو**

دروستکردنی خانوو بە کەرپووچ بوو، لەگەڵ قوڕی خۆڵە سوور بە تەنهایی یا قووڕ و گەچ ئەو قوڕ و قسڵە بۆ دیوار بڵند کردن بەکار دەهات و بناغەی خانوو قووڵ دەکرا تا دەگەیشتە ساغە. لە قەڵا بناغە زۆر قووڵ دەبوو هەندێ کەڕەت چوار گەز زیاتر دەکۆڵدرا، ئەمجا بەرد رێژدەکرا و دەکوترا و پاشتر بە کەرپووچ و بە قسڵ و مشکی دروست دەکرا، پاش ساڵی ١٩٣٠ چیمەنتۆ وردە وردە پەیدابوو لە جیاتی قسڵ و مشکی بەکاردەهات تا بەجارێ قسڵ و مشکی بەکارهێنانی بەتاڵ بوو.

شایانی وتنە قسڵ و مشکی تێکەڵ دەکرا و دەگیراوە، سێ رۆژ دەمایەوە بۆ ئەوەی بە تەواوی بخووسێ، ئەوجا بەکاردەهات. ئەم شتە بەرگەی ئاوی دەگرت و لە حەمام و ئاودەست جۆگەی ئاو بەکاردەهات و بۆ دروست کردنی حەوزی ئاو. کەرپووچ (خشتی سوور لەلایەن کوورەچی دروست دەکرا و جێگای کۆنی کورەکان لەسەر بەست بوو لە گەڕەکی تەعجیل، ئەما پێویستتر و هەموو کاروباری هەر خانووبەرەی تریشی لە لایەن وەستا و کرێکار بەجێدەهات، هەریەک وەستا لەگەڵ

چەند شاگردی شارەزا ئیشەکەیان دەکرد، بۆ سپی کردن و سەربان تەواوکردن و دیوار سواغدان، هەموو کار ئەم وەستایە دەیکرد وەک ئێستا، هەر کاری زانا و وەستای خۆی بێ و پێویستی تری خانوو تەنها بۆ دەرگا، پەنجەرە، لەلایان نەجارِ و ئاسنگەر تەواو دەبوو بە کارگەی خۆماڵی.

*** ناوماڵ**

ناوماڵ بە دەستووری کۆن بەهیچ جۆرێک لە تەرزی ناوماڵی ئێستا نەدەچوو، کەم ماڵ تەختەی نووستنی نەبووە و ئەم تەختە، دارتاش لە داری خۆماڵی دروستی دەکرد، ئەم تەختی نووستنە، تەنها بۆ هاوین لەسەربان بەکاردەهات.

ئەما لەناو ژوور دۆشەک لەسەر رایەخ دادەنرا و بالیف (سەرین) زۆرجار شوێنی پاڵ بەدیواری خانووی دەدا، ئینجا لێفە جاجم بۆ سەرپۆش بەکاردەهێنرا، ئەوە جێگای نووستن بەشەو رادەخرا، بەیانی جێگا کۆدەکرایەوە، ئەمەش بۆ پاکوتەمیزی بوو و دووبارە کە جێگا فراوان بێ بۆ دانیشتن و دانشتن لەماڵان ژووری نووستن و دانیشتن هەریەک بوو، جێگای دانیشتن لە سەر رایەخ بوو، گەر مافوور بوایە رەویا لباد و دۆشەک. لەپاڵ دیوار دادەنرا و بالیفێ دەخرایە قەدی بۆ دانیشتن و پاڵدانەوە بۆ رۆژ و شەو، پێش ساڵی ١٩٣٠ لەهیچ ماڵێ کورسی و مێز و قەنەفە بەکارنەدەهات، ناوماڵی زیاد ئەگەر جلکوبەرگ بایە دەخرایە ناو کوتاڵێکی دوورمان کراو کە بە (بوخچە) ناودەبرا و شتی زیادی تر دەخرا سندوقی دار کە لەلایەن دارتاشی بازاڕی هەولێر دروست دەکرا و هەر ژوورێ سندوقێکی گەورەی تیابوو.

لە خانووەکانی قەلات لە چینی سەرەوەی دیوارەکان و لەبن میچی کولانکی تیا دەکرا کە بە (تەخچە) ناودەبرا بۆ رازاندنەوەی ماڵ زۆر شتی جوان کە لە شووشە و فەخفووری دروست دەکرا دەخرا ئەم کولانکانە.

هەروەها بۆ جوانی زۆر خانووی قەلا کە سەری بەکاریتەی دار و بەشقلەدار دادەپۆشرا دیوی ژوورەوەی بە تەختە پۆش دەکرا لەلایەن دارتاشەوە.

لە جیاتی دار چینکۆ بەکاردەهات ئەم دارپۆشە بە رەنگاورەنگ بۆیە دەکرا و خواردەمەنی وەک ساوار، برووش، برنج و گەنم و نۆک و نیسک دەخرا کەندوو کە لە قوڕ دروست کرابوو.

روون، پەنیر، گۆشتی سوورکراوە و گۆشتی خێ لێدراوە دەخرا جەرە.

مەنجەڵ، قاپ، سەرپۆش قاپ، سینی، تەشت و، هەندێ چەشنە کەوچک و مەسینە و گۆم گۆم، ئەم شتانە کە بۆ دروستکردنی شیو بەکار دەهێنرا، بەکاربەدەستی مزگەوتی هەولێر دەکرا.

کەوچکی دار، کوتک، تەشی بۆ رستنی خوری و پەمۆ، بازوو تیروک و فەرشەی دار، مەلاکی ماستاو ئەم کاروبارە لە دێهاتی خۆشناوەتی دروست دەکرا و بۆ شار دەهێنرا.

هەروەها لە دێهاتی شەقلاوە و پیرمام و گوندەکانی تری ناو خۆشناوەتی لە چلوی دار، سەبەتە و، قەرتاڵە و سەوەشیر و شتی تر بۆ ناوماڵ بەم جۆرە دروستیان دەکرد و دەیانهێنا بۆ شار و هەروەها تەسبیحی قەزوان و گۆچان و زۆر شتی تر لەم بابەتەوە.

مەسینەی قوڕ و کووپەی ئاو و شەربەی ئاو لە شێوەی بەرداغ، مەرکانی گوڵ زۆرشت لەم بابەتە کوورەچییەکانی هەولێر لە کوورە بەسوور کراوەیی ئامادەیان دەکرد.

شتی تر لە پێستە دروست دەکرا، وەک هیزەی روون و دێمکەی ئاو و راویە کە سەقا ئاویان پێ دەگوازتەوە، بێژینگ ئەم ئامێرانەش هەر لە بازاڕی هەولێر پاش دەباغ کردنی پێستە دروست دەکرا.

هەروەها رایەخ وەک مافوور و لباد و بەڕە و دۆشەک و بالیف و جاجم و دووگردی نوێژ لە خوری دروست کراو و دووگردی پێخەف کە لە دەزووی پەمۆ ئەهۆنرایەوە و ئەم کار و بارەش هەندێکی لە شار دروست دەکرا و هەندێکی لەلادێ دەکرا.

لەم باسە بۆ خوێندەواران ئاشکرا بوو کە هەموو کەلوپەلی ناوماڵ بە لە کردەوەی خۆڵاتی بوو، ئەم دەستوورە ئەمرۆ بە تەواوی شێوەکەی گۆڕاوە.

کاروباری ناوماڵ هەموو خرابووە، پاڵ کابانی ماڵ ئەم کابانە گەورەترین ژن بوو، لەو ماڵە ئیشوکاری ماڵی خۆی جێبەجێ دەکرد و ژنانی تر لەماڵ و یا کچەکان هەرکەس بەشی خۆی یارمەتی دەدا. یەکەم ئیش

لەناوماڵ ئەوەبوو سەر لە بەیانی خانوو و ماڵی بە گسک پاک بکرێتەوە و ئەمجا جێگای خەوتن کۆبکرێتەوە و یاتاغ بخرێتە سەر ئەرز، لە پاشتر پێویست بوو سەماوەر پێ بکرێ و چایە و بەرچایی ئامادە بکرێ و سەماوەر بە خەڵووز (ڕەژوو) گەرم دەکرا و پاش چای خواردنەوە، خاوەن ماڵ و پیاوانی تر هەرکەس بەرەو ئیشی خۆی دەڕۆیشت.

پێش ساڵی ١٩٣٠ لە هەولێر و گوندەکان نیوەڕۆ چێشت نەدەکرا، شتی سووک دەخورا و نانی ئێوارە شێوی بۆ ئامادە دەکرا لە لایەن کابانی ماڵ. هەروەها خانووبەرە و ناوماڵ بەم تەرزە بوو و ئەگەر سەرنج بدەین ئەم دەستوورە باس کراوە، کە پەیوەندی بە کۆمەڵایەتی و ژیانی کۆنی هەولێرییەکانە، بۆ ماوەی چەند چەرخێ تا نزیکەی ساڵی ١٩٣٠ ئەم جۆرە ژیانە لەم وڵاتە وابوو جێگای گرتبوو، وێنەی زۆرشت لەم کردەوانە بە تەواوی ئێستا بزر بووە و ئەم شتانەی هێشتا نیوە بە نیوە لەسەر ڕەگەزی کەون ماون و تا ئێستا کەمێک بەرچاوە، ئەم چەشنە پاش ماوەیەک بەرەو گۆڕان دەچن و لەدوای چەند ساڵی تر وێنەی ژینی کۆن بە جارێ لەبەرچاو نامێنێ و لە دەفتەری مێژوو دەنووسرێ.

*** خواردەمەنی**

لەمەوبەر هەروەک وتمان هەمەڕەنگ و چەشنە شێو (چێشت) بە ئاگری دار، یا بەکاو کۆتەڵ و قەسڵ دەکرا و سووتەمەنی نەوت و غاز و کارەبا نەبوو پێش ساڵی ١٩٣٠ هەرچەند نەوت کەمەو زۆر پەیدا دەبوو، بەڵام تەنها بۆ چرا بەکاردەهات.

پێش ساڵی ١٩٣٠ لەشار و گوندەکان برنج بۆ خواردن زۆرکەم بەکاردەهات، پیاوی بە دەسەڵات ئەگەر میوانی نەبووایە حەوت ڕۆژ جارێک پڵاوو گۆشت بۆ چێشتی ئێواران دروست دەکرا، بەڵام کرێکار و ڕەنجبەر لەشار بەڵکو لە مانگی جارێ برنجی دەکردە شێو و دانیشتوانی دێهاتی دەشتی هەولێر ڕەنجبەر و سەپان و جووتیار وابووساڵی جەژن و جەژن برنجیان بەکاردەهێنا و چەندجار لە مانگی ڕەمەزان ئەگەر ئەو کەسە بەرۆژوو بایە، بەڵام دێهاتی بەرئاو و دێهاتی چیا زیاتر برنجیان بەکاردەهێنا، ئەگەر برنج لە زەوی گوندیان بکرابایە.

ساوار و گەنمەکوتاو نیسک و بروش و نۆک و داندۆک و کەشک و دۆغاوا، ئەم خواردەمەنییەیان شێوی ئەم وڵاتە بووە. وەک خواردنی. هێلکە، ماست، دۆشاو، خورما، پەنیر، گەلێ شتی تر بەکاردەهات.

ئەما سەبزەی زستان لەشاری هەولێر تەنها توور و شێلم و پیاز و کەرەوز و سلق و چەوەندەر و پاقلە بوو و لە هاوینی سەوزەی جۆراوجۆر وەک ئێستا بووە.

زۆرشت کە ئێستا بەکاردێت پێشی ساڵی ١٩٣٠ لە هەولێر نەدەچاندرا و لە شوێنی تریش ئەم (شتانە) بۆ هەولێر کەس نەیدەهێنا، ئەوەی پێش ساڵی ١٩٣٠ بەکارنەدەهات بریتی بوو لە: (پەتاتە، قەرنابیت، فاسۆلیا، سپێناغ)

لە دەمی پیاوی گەورە لە منداڵی گوێم لێ بووە، کە دەڵێن نزیکەی (١٠٠)ساڵ لەمەوبەر لەم وڵاتە تووتن و چای و تەماتە نەبووە و بەکارنەهاتووە و لە بابەت میوەجات هەمەچەشنە میوەجات لە دێهاتی خۆشناوەتی بۆ هەولێر لە هاوین و پاییز هاتووە و لەزستان هەنگوین و گوێز و باوی (بادەم) و مێوژ و قەیسی و کشمش و ژاژی و پەنیر. ئەم چەشنە بەرهەمانە هەموو خۆماڵی بووە لە بازاڕ پەیدا دەبوو، گەلێ جار ئافرەتی کۆچەر وەک ژنە پۆلی، پاییزان کە لە کوێستان هاتووینەوە ئەم شتانەیان هێناوە بۆ شار، ڕۆژ دوای ڕۆژ لە ماڵان بەپارە فرۆشتوویانە یا بەشەکر و چای و خورما و ساوار و بروش و ئاڵوگۆڕیان کردووە. هەر شتێ کە بەرهەمی وڵاتی هەولێر نەبووە، بێجگە لە خورما و قەسپ و شتی تر خاوەن دوکان لەجێگای تردوە نەیاندەهێنا وەک پرتەقاڵ، مۆز، نارەنگی، نارنج، لیمۆ ترش، بەڵکو زۆر ماڵی شارستانی ساڵی جارێ یا دووجار ئەم چەشنە میوەیان نەدەخوارد لە بازاڕ نەبووە و جار بەجار بەدیاری لە بەغداد و کەرکوک بۆیان دەهات. گەلێ چەشنە شێو لە هەولێر ئێستا زۆر بابەتی وەک جارانە تەنها کردنی هەندێ شێوی کۆنی قەڵای هەولێر لە نەمانە، بەشە شێوێکی تر زۆرکەم کەس ماوە دروستی بکات.

تا ساڵی ١٩٤٠ هەموو

دانیشتوانی شار و گوندەکان پێش زستان ساوار و گەنمەکوتاو برووش و نیسک و نۆک و هەڕشتەو پیازو روون بۆ زستان ئامادە دەکرا و دادەکرا.

پێویست بوو هەر مالێی ساوار بکوڵێنێ و لێی بکات و برووش بەدەستاڕی بەرد دەیهاڕی و گەنمەکوتا و بە دەنک پوختە بکرێ، هەڕشتە بە کردەوەیەکی تایبەتی بکرێ و دابەستی مەڕ سەر ببرێ و گۆشتەکە بکرێ بە قاورمە یا ناوخۆی ئاو و لەناو جەرە هەڵبگیرێ، بەم جۆرە خواردەمەنی بۆ زستان ئامادە دەکرا.

شایانی باسە، دانیشتووانی شار ئالوودەی گۆشتی مەڕ بوون، گۆشتی بزن و رەشە وڵاغ، قەسابی شار سەریان نەدەبری، چونکە گۆشتی گا و بزن کەس نەیدەکڕی، پاش سالێی ١٩٣٠ وردە وردە خەڵک فێری بەکارهێنانی گۆشتی گا و مانگا بوون.

گۆشتی مریشک و قاز و مراوی، هێلکە لە هاوین و لەدوا مانگی بەهار تا پایز بەکارنەدەهێنرا.

ماسی وردە دانیشتوانی هەولێر بەکاریان نەدەهێنا، تەنها ماسی گەورە کە لە بەهار لەزێی گەورە دەهێنرا، ئەم گۆشتە نەرمکە لە بازاڕ دەفرۆشرا. هەروەک وترا زۆر چەشنە شێوی هەولێری و دزەیی و خۆشناوەتی لەسەر رەگەزی کۆن ماوەتەوە، بەلام هەر شێوێک دەستکاری زۆری بوێ کە، ژن و مالێ لەکردنی خۆیان لادەدەن و مەبەست ئەوەیە کە هەندێ کابان و خێزان کاری تریان هەیە، بێجگە لە بەڕێوەبردنی مالێ و منداڵ و زیاتر لەوە مالێی کۆن چەند مالێکی تێدا بوو کوڕ و برا لەیەک مالێ دەژیان لەبەرئەوە لە توانایان بوو هەر چەشنە شێوێ ئامادە بکرێ. ئەما ئێستا ئافرەت خۆی لەم تەرحە کارە لادەدات و پەسندی ئەم شێوە (چێشت)ە، دەکات کە بە سانایی جێبەجێ بکرێ.

*** کاروباری دانیشتوانی هەولێر:**

هەمەچەشن کاروباری لە کۆمەلایەتی لەم شارە بووە، بە شێوەیەک کە بە تەواوی پێویستی ژیان و داخوازی بەڕێوە چوون و بەرهەمی خۆمالێی گرنگ بووە و گرنگترین کار لە هەولێر کشتوکالێ بووە.

* کردەوەی کار بەدەستی

وڵاتی کوردستان لەمێژووی کۆن ناواخنی پێشکەوتن بووە و مرۆڤ لەم خاکەدا پێش هەموو جێگایەکی تر پەیدابووە و هەولێر کە کۆنترین شاری سەر رووی زەمینە ناوچەی شت دروست کردن بووە، تا سالێی ١٩٣٠دەزگای کاربەدەستی کۆن و بەرهەمی ئەم کارانە پێویستی شار و لادێی هەولێری بەجێ گەیاندووە. ئابووری ئەم وڵاتە بەم شێوەیە سەربەخۆ بووە و خۆی خۆی ژیاندووە و زۆرکەم شتی لە دەرەوە بۆ هاتووە.

*** ئاسنگەر**

هەموو کاروباری جووت و دروێنە و دەرگا و پەنجەرە و خانوویان دروست کردووە لەگەڵ زۆرشتی تر.

بەداری خۆمالێی هەمەچیزە کاروباری خانووی کراوە لەگەڵ کارگەی جووت و هەمیشە تەختی نووستن و کورسی و مێز و دۆلاب و سندوق و گەلێ شتی تر، ئەم دارتاشانەی بازاڕی هەولێر بەدار و بزماری خۆمالێ کاریان کردووە.

مزگەر، مەنجەڵ، قاپ، سنی، تەشت، مەسینە، پەقرەج، پارزونگ، کەوچک ئەم شتانەیان دروست کردووە.

*** تەنەکەچی**

مەسینە، قودیلە چرا و گەلێ شتی تری کردووە.

*** قۆندرەچی**

دوکانەکەی گەلێ جار دوو دووکان بووە، یەکیان وەک کارگە بووە دووەمیان بۆ فرۆشتنی ئەم کار بەدەستانە بووە، هەموو چەشن پێلاویان دروست دەکرد. وەک قۆندەرە و جزمە، کالەک، کلاش، پۆتین و ئەم پێلاوانە لە پێستی دەباغکراوی خۆمالێ دروست دەکران.

*** خەنجەرچی**

چاخماخساز، کەسانی وابوو هەردوو کاری دەکرد و کاربەدەستی تری بۆ تەنها لەم ئیشە لە یەکیان زانابوو، خەنجەرچی، خەنجەری دروست دەکرد گەلێکیان. گەلێ چەشنە چەقۆی قەساب بە چەقۆی مالانیان دروست دەکرد.

*** چاخماخساز**

فیشەکی بەتالێ، تفەنگ و

دەمانچەیان بە بارود، دەگرتەوە و هەروەها تفەنگی تێکچوویان چاک دەکردەوە.

*** دەلاک**

دەلاک سەرتاشی دەکرد و خەتەنەی منداڵی دەکرد و زۆر برینی دەرمان دەکرد و پسپۆری واهەبوو کە شکەستیان دەگرتەوە (ئەم کارە تا ئێستا ماوە، لە ماڵان ژن بە تەون مافوور و بەڕەی دروست دەکرد و جاجم و بەرماڵی نوێژ دروست دەکرا لە ریسی خوری، لە دەزووی پەمۆ (دوگرد) دەکرا لە جیاتی بەتانی لەهاوین بەکاردەهات.

مافور لە گوندەکان دەکرا بەڵام دروستکردنی دوگرتی پەمۆ تەنها دەستکردی دانیشتووانی عەنکاوە بوو.

لەلایەن کوورەچی گۆسکە، مەسینەی کویەی ئاو بێ بقە و شەربەی ئاو لە قوڕ دروست دەکرا.

لەم باسە دەردەکەوێت کە بازاڕی هەولێر تەنها جێگای کڕین و فرۆشتن نەبوو، گەلێ گۆشەی بازاڕو دوکانەکانی وەک کارگە و کارخانەی شت دروست کردن بوو.

ئەم بازاڕە گەورەیە بێجگە لەم کارگانە دوکانی فرۆشتنی ئەم شتانە هەموو کڕین و فرۆشتنی پێویستی تری تێدا بووە بەقال، عەتار، بەزاز (کوتاڵفرۆش)، سەبزەچی، قەساب.

لەم چیرۆکە وادەردەکەوێ کە ئابووری کۆنی هەولێر سەربەست و سەربەخۆ بووە و پاڵی داوە بەرهەمی خۆماڵی، زۆر کەم شت ئەم شارە لە لاوە هێنراوە بۆ پێویستی دانیشتووانی.

*** کڕین و فرۆشتن**

لە بەندی رابردوودا بۆمان روون بووە کە بازاڕی هەولێر هەر گەورە بووە و هەموو رەنگە پێویستییەکانی ژیانی تێدا پەیدا دەبوو، خاوەن دوکان زۆرشتیان لەلادێ دەکڕی و شتی تریان لە خاوەن ماڵات دەکڕی، یا لە کۆچەرایەتی و بە قازانجێکی کەم شتیان دەفرۆشت.

دوکاندار کەمیان دوکانەکە هی خۆیان بووە، گەلێکیان دوکانیان بە مانگانە و ئەو ساڵانە لە خاوەنی دوکان بەکرێ دەگرت و پێش ساڵی ١٩٣٠ مانگانەی دوکان لە سێ چوار رووپیە زیاتر نەبووە، یا لەنیو دینار کەمتر. هەندێ کەلوپەل و چەند پێویستییەکی ماڵ یا ژیان کە لە وڵاتی هەولێر نەبوو بە کاروانی وڵاغ لە موسڵ و بەغدا و حەلەب و دیاربەکر و نەسیبین دەهێنرا. دەرگای تر بۆ هێنانی شت بۆ هەولێر بە کاروانی شنۆ و سابلاغ و ئورمییە و تەبریز دەهات. وەک: سەماوار، پیاڵە، قۆری چای، مافوور، چەک و زۆر شتی تر.

شاری هەولێر، لەسەر چەند رێگایەک هەڵکەوتبوو بەم بۆنەیە هەردەم کاروانی لایەدەش لەم شارە رادەبوورد بۆ شارەکانی تر.

زۆرجار گەڕۆکی بێگانە و مێژوونووس سەریانداوە و لەم شارە بە رێبواری و ویستوویانە لە هەواڵی کۆمەڵایەتی و مێژوویی تێبگەن.

زۆر لەو نووسەرانە باسی گرنگی و گەورەیی و پوختەیی ئەم بازاڕە ئاوەدانەیان کردووە. بەبێ گومان ئەم تەرزە کۆمەڵایەتییە و ژیانی رێک و ئەم بەرهەم و کردەوەی کارخانەی کردنی گەلێ شت بەدەست تێکرا لەم نیشانانە وادەردەکەوێت، کە وڵاتی هەولێر لەمێژووی کۆن پێشکەوتوو بووە، زانستی تێدا گەش بووە و پەرەی سەندووە، لەهەموو جیهان ناوبانگی رۆیشتووە.

* لە بەند و ئەستووندەکانی پێشووی ئەم وتارە، چەند چەشن کار و فەرمانی دانیشتووانی شار و گوندەکان لەسەر رەوتی شێوەی کۆن بێژرا، ئەگەر بە چاوێکی ورد سەیری کۆمەڵایەتی کۆن بکرێ، چەند چەشنە کاری تر لەم شارە بووە، وەک، دارفرۆش و حەماڵ و کرێکار و وەستای خانوو و کارێزچی (کرێکاری خانوو نزیکەی سێ مانگی زستان هیچ ئیشیان نەدەکرد) و خاوەن ئیشی تریش وەک، دەنگچی، خانچی، چایچی، کاروانچی، نانەوا، گامێشەوان، حوشتردەوان و شوون هەڵگر...

کەسانی تر کە بە مووچە بۆ میری کاریان دەکرد، یا شارستانی ئەو بە پاسەوانی و هی تر وەک، پۆلیس ئەمانەش پێش ساڵی ١٩٣٠ ژمارەی گشتیان لەشار لە (٥٠٠) کەس کەمتر بووە.

*** ماڵات بەخێو کردن**

بەخێوکردنی مەڕ و بزن و رەشەوڵاغ لەشاری هەولێر کارێکی

زۆر کۆنە و دانیشتووانی گوندەکانی و کۆچەری ناوچەی هەولێر و دانیشتووانی شار و دێ هەردوولا هۆگری ئەمکارە بوون.

مەڕ بەخێوکردن پارچە پارچە بووە، بە (مێگەل) ناو دەبرا. هەر مێگەلێ لە ٢٠٠ سەر تا هەزار سەر ژمارەی مەڕ و بزن بووە.

ژمارەی گشتی مالآت و مەڕ و بزن و رەشەولآغ لەگەڵ بەرزە ولآغ لە ناوچەی هەولێر گەلێ زۆر بوو، دەتوانین مەزندەی بکەین کە نزیک ملیۆنێک دەبوو. بەرهەمی ئەم مالآتە زۆر بوو وەک، ماست و پەنیر و روون و گۆشت و خوری و پێستە و مو، ریخۆڵە و بەرخە نێر، لەم بەرهەمانە زۆر بابەتی بۆ فرۆشتن بەرێگای موسل دەبرایە حەلەب یا جێگای تر وەک خوری و پێستە و ریخۆڵە (روونی بەرخ دەبرا بۆ بەغدا).

شایانی باسە دانیشتووانی شار و دێهات پێش (٥٠) ساڵ کەمتر هیچ کەس روونی گیای بەکارنەدەهێنا، تەنها روونی مەڕ و بزن بەکاردەهات بۆ شیو دروست کردن، لە مالآن تا سالی ١٩٥٨ هەر ئەم روونەیان بەکاردەهێنا.

بێجگە لەمە گۆشتی گا و مانگا پەسەند نەبوو و زۆر کەم بەکاردەهات، لەشار پێش سالی ١٩٣٠ تەنها خەڵکەکە ئالوودەی گۆشتی مەڕ و بزن بوون و لەبازاڕی هەولێر زۆرکەم گۆشتی گاو بزن دەفرۆشرا و بەرهەمی تر ماوەی شەش مانگ لە بازاڕ پەیدا دەبوو وەک: ماست، پەنیر، کەرە (فەریکەروون) لۆر، و پایزان پەنیری ژاژی دەهاتە بازاڕ. لە دێهاتی و هەر دیسان کۆچەرەکان هەمیشە زۆر تەرحە زندەی تریان بەخێودەکرد، وەک ئەسپ، ماین، ئێستر، گوێدرێژ، گامێش، بەخێوکردنی ئەم مالآتە زۆر پێویست بوو بۆ کاروانی و سواری و بار. لەگەلێ مالی ناوشار و لە هەموو گوندەکان چەند چەشنە تەیر و توالێ بەخێودەکرا، وەک مریشک، قاز، مراوی، عەلی شیش، کۆتر، ئەم بەرهەمە بەشی پێویستی شار و لادێی دەکرد و هیچ پێویست نەبوو هێلکە یا گۆشتی مریشک لەجێگای تردوە بۆ ولآتی هەولێر بێت تا سالی ١٩٥٨ بەم جۆرە بووە.

تەنها لە زستان و پایز پاش باران پەلە بەکارهێنانی گۆشتی مریشک پەسەند بوو بەهیچ جۆرێ لەکاتێ کە مریشک، قاز.. کە جووجەڵەیان هەڵدەهێنا لەکاتی کورک بوونی لە بەهار و هاوین گۆشتی مریشک بەکارنەدەهێنرا و لەهاوین زۆر کەم هێلکە دەخورا.

*** تەندروستی ولآغ**

کوردەواری بە چاوێکی تەواو چاویان لە هەموو پێویستی مالآت بوو، هەروەها لەسەرما مەڕ و بزن لەدەشت لەغالی بەڕلآ دەکرا و لە گوندانی چیا لە ئەشکەوت و لە خانوو لەکاتی بەفر دەپارێزرا. ئیتر ئەسپ و رەشەولآغ لە تەوێلەی رێکوپاک بەخێو دەکرا خاوەن مالآت و ولآغ هەردەم ئالیک و لەوەڕی ئەم زندە مالآتەی بەرچاو دەکرد، سەرباری ئەم شتانە تەندروستی زیندەوەر، ئەگەر مەڕێ یا بزن یا بەرزە ولآغ بۆ هەر نەخۆشییەک دەرمانی تایبەتی هەبوو و مرۆڤی پسپۆری زانای ئەمکارە هەبوون، لەدێهات پێشبوونی بەیتاڵخانە و ولآغە بەرزەی وەک. ئەسپ و ئێستر ناڵبەند لەشار لە جیاتی بەیتالی ئێستا کاری تەندروستی ولآغی دەبینی.

*** مەڕ و بزن**

گەلێ ساڵ هەندێکی لە سالی زۆر سەرما و سەخت دەفەوتا، ئەگەر جێگاو رێگای تەواو نەبووایە. هەروەها سالی نەهاتی (بێ بارانی) ئەم مالآتە زۆر زیادی نەدەکرد و زۆر کەمی ئاووس دەبوو، لەبەربێ هێزی و لەبەر نەبوونی پووش و پەلآش و پەرێز و پاوانی تەواو بوو بۆ بەخێوکردنی، سالی بێ بارانی کارەساتێکی گەورە بوو بۆ ئەم بەستە زمانانە.

بەخێوکەری مەڕ و بزن هەندێ کەرەت خاوەنەکەی بووە و هەندێ جاریش لەگەڵ لادێ بەهاوبەش مەڕیان بەخێودەکرد بە شێوەیەکی تایبەتی کەپێی دەوترا دووبەش مالآتی شارستانی، بەشێک مالآتی لادێ لێکدەدرا و خەرجی بەخێوکردنی مێگەلەکە هەندێ شتی لەسەر شوان دەبوو و هەندێ خەرجی تر لە بەرهەمی مالآت دەردەچوو، ئەم لێکدانە بۆ ماوەی حەوت ساڵ دەبوو و هەموو بەرهەمی ساڵ بە ساڵ بەش دەکرا بە دووبەش، هەر بەش بۆ یەکێ لەمانە. پاش تەواوبوونی حەوت

ساڵە سەروبەری مێگەلەکە گشتی مەڕ و بزن کە دەکرا بە دوو لەت، هەر بەشێکی دەدرا بە لایەکیان. چەشنی تر بۆ بەخێوکردنی مەڕ و بزن و خاوەن مێگەل شارستانی و شوانەکە لادێی دەبوو، ئەم شوانکارییە، مێگەلەکەی بەخێودەکرد و بەرهەمی روون و خوری و ماست و پەنیر دەکرا بەدووبەش هەر بەشێک بۆ لایەکیان بەڵام بەرخە نێر تەنها بۆ خاوەن مێگەل بوو و بەرخی مێ لەگەڵ مێگەل لێکدەدرا بۆ ئەوەی ساڵ دوای ساڵ ژمارەی زیاد بکرێ. ئەم بەشدارییە بە (دوخور) ناودەبرا.

*** نێری و نێری زەوی و کێڵانی**

هەر خاوەن زەوییەک گەلێ جار زەوییەکانی دەکردە ٣ بەش، بەشێکی بە بۆڕ دەماوە و ئەگەر ئەم بۆڕە ساڵێکی تریش بەبێ کێلان بەجێ بمابایە بەیاریان پێ دەوت و مەبەست لەبەجێ هێشتنی زەوی یەک دوو ساڵ بۆ ئەوە بوو تا هێزی زەوی زیاد بکات و بۆ دواساڵ بەرهەمی زۆربێ. ئەم کارە ئێستا نەماوە لەبەرئەوەی زەوی زۆرجار هەرساڵ ئەکێڵدرێ.

بەشی تری زەوی دەکرا بەشۆی پێویست بۆ ئەم شۆیە لە کانگای سەرما بکرێ یا لە کاتی شەختەبەستن لە رۆژانە ساردی زستان بۆ ئەوەی کە کرم و مشک بفەوتێ و گیا و گۆڵی تێدا نەڕوێ و نەمینێ بۆ ساڵی ئاینده.

ئەم شۆینە لە بەهار دووبارە دەکێلرا و ئەم کێڵگە دووەمە بە وەرد ناودەبرا و ساڵی تازە لەگەڵ دەست پێکردنی پایز دەست بەتۆ چاندن دەکرا و ئەم تۆیە بە کێڵگەیەکی جووت دادەپۆشرا.

ئەوانەی تۆیان پێوە دەکرد بە (تۆدەر) ناودەبران، ئەم کارە هەرکەس بە تەواوی و بە پوختەیی شارەزایی نەبوو، پێویست بە تۆدەری زانا بوو. ئەوەی کە تۆ هەڵدەدات بە شێوەیەکی ناوەنجی بێ بۆئەوەی تۆ زۆر تەنک یا پڕ نەبێ، ئەگەر تەنک بێ، بەرهەمی زەوی کەم دەبێ و ئەگەر تۆ پڕ بێ دیسان برشتی کەم دەبێتەوە.

هەروەها تۆی تەنک گەلێ جار کشتوکاڵ، تووشی گیاو گۆڵی دەکات و زیان بەدەغڵ دەگەیەنێ و تۆی قایدە دەبێتە معاوەی باش بوونی دەغڵەکە.

*** جووت چۆن دەکرا**

ئەم باسە چیرۆکی تایبەتی خۆی هەیە، گەنجی ئێستا زۆربان هیچی لێ نازانن، هەروەک لە سەرەتای ئەم باسە گوترا جووت بەدوو ئێستر یا گا یا گوێدرێژ دەکرا و لە بەینی هەردوو وڵاغەکە دارێکی چەماو دەبەسترا، پێیان دەوت (هەوجاڕ) ئەوە لەکاتی پایز بەکاردەهات دەبا سووک بێ لە (دار بی) یا لە (بەڕوو) دروست کرابێ، بۆ زستان لەبەر قوڕی زەوی هەوجاڕی بەتین بەکاردەهێنرا، کە ئەمەش لەدار گوێز دروست کرابوو زۆرجار هەوجاڕ دەشکا ئەگەر کەڵکی پێدا بمابایە دەنێردرا بۆ نەجاڕ کە چاکی بکات و ئەگەر زۆر بێ کەڵک بووایە، لەکاردەکەوت، لەبەر ئەمە خاوەن کشتوکاڵ هەوجاڕ و زۆر کاروباری تری زیادە لەپێویست هەر پارچەیەک لەجووت شکا و یا لەکار کەوت، دەست بەجێ ئەو شتە بگۆڕێ تا ئیش و کاری رانەوەستێ و ئەم هەوجارە لەگەڵ (بن مل) (کە لە لباد و کەونە بەرە دروست دەکرا) و لەگەڵ کویەلانی دار دەخرایە ملی ئێسترەکان و لای دووەمی هەوجار کە چەماوە بوو ئاسنێکی لێ دەبەسترا ئەو لەداری هەوجاڕی تێدەخرا بە (گاسن) ناودەبرا و ئەم کارگەیە لەگەڵ هەوجاڕ دەبووە یەک پارچە. ئەوجا هەوجاڕ بە دارێکی تر دەبەسترا بەملی ئێستر بە هەوەی بن ملو کویەلانەکە و ئەم دارە بە (مژان) ناودەبرا. بەلای خوارەوەی هەوجاڕ دارێکی راستی تر بوو کە بە (ئەستندوو) ناودەبرا و جووتیار ئەم ئەستندووەی بە دەستێکی دەگرت و بەدەستی تری دارێکی هەڵدەگرت بۆ ئەوەی وڵاغەکانی لێ خوڕێ و ئەم دارەش وەک گۆچانێک بوو، بەڵام هەردوولای راست بوو و لەدار بەڕوو دروست دەکرا و بەدارجووت یا داری جووتیارانیان پێ دەوت.

هەروەها جووتێک لەم چەند کاروبارە رێک دەخرا.

زەوی بەم کارگەیە یا بەم جووتە دەکێڵدرا بۆ چاندنی دەغڵی زستان وەک گەنم و جۆ و هەر کێلانێکی تر بۆ چاندنی شینایی و بێستان. ئەگەر کشتوکاڵی زستان یا هاوین بایە، هەر بە جووت زەوی دەکێڵرا، بۆ ئەمام چاندن یا جووت بۆهەموو کارێکی کشتوکاڵ بەکاردەهێنرا، هەتا باغچەی و میوەجاتی ئاوی و دێم، ساڵێ جارێ بەجووت دەکێڵدرا.

دەستووری کێڵان لە زەوی گەورە کە ئەندازەی فرەوان بوو دەستووری تایبەتی بوو و ئەم کێڵانە کە بەچەند جووتێک دەکرا، برا گەورەی جووتیاران، زەوی بە چەند جێ دابەش دەکرد و ئەم کارە (بەلات برین) ناودەهێنرا و پاشتر جووتیاران دەستیان بەکێڵان دەکرد و ئەم کارە لەکاتی شۆبرین و وەرددانەوە و تۆکردن هەمان کردەوە لەهەرسێ گاسن بە هەمان شێوە جێبەجێ دەکرا.

*** کوتانی دەغڵ**

کشانەوەی بۆ ئاوایی، دەغڵ وەک گەنم و جۆ لە مانگی نیسان دەبووە فەریکە، لە ناوەڕاستی مانگی مایس گوڵی خەلە بە تەواوی پێدەگەیشت هەروەک باس کرا سەپان بەداس دەیدوورییەوە و داسەکە بە دەستێکی دەبوو و دەستی تر دەست کێشێکی دەخستە دەستی کە سواڵەی دەغڵی دەدووری تا پەنجەکانی دەستی بریندار نەبێ و ئەم دەستکێشە بە (قەیناغ) ناودەبرا، هەروەها سەپان کڵاوێکی لبادی لەکاتی دروێنە دەخستە سەری، هەروەک (شەبقەی) ئێستا بوو و ئەم کڵاوە سەروگیانی لە تەوژمی ڕۆژ و گەرمایی دەپارێزت، سەپان بەداس دروێنەی دەکرد و گیشەکەری کچ کۆی دەکردەوە و سواڵەکانی دەکردە گیشە کۆمەڵ دوای کۆمەڵ.

(داس ئاسنێکی پۆڵا بە سەرێکی چەماوەو تیژ بوو) جار بەجار بەردێکی تایبەتی کە ناوی (هەسان) بوو، ئەم داسە بە هەسان تیژ دەکرا، پاش چەورکردنی و لای دووەمی داس، دەسکەی لەدار دەکرا بۆ ئەوەی سەپان بە ئاسوودەیی بەکاری بهێنێ و بە سانایی لە گەرمای هاوین بەکاربێت.

پاش تەواوبوونی دڕک و کۆبوونەوەی قرشەی دەغڵ لەناو زەوی بەوڵاغ ئەم قرشەیە دەگوازرایەوە ئاوایی بۆ جێی جۆخینان و لەهەر گوندێ و لەشاری هەولێر چەند جێگای گۆڕەپانی تایبەتی بوو، کە تەنها بۆ جێگای جۆخین و دەغڵ تەرخان کرابوو (زۆرجار لەنزیک یا لەقەراغ ئەم گۆڕەپانە جێگای چەند قەسناغ جۆ دەکرا بە قەرسیل و لەوەڕاندنی ئێستر و وڵاغی تر بۆ ماوەی نزیک مانگی پاش تەواوبوونی جووت تا دروێنە دەستی پێ دەکرا).

قرشە لەزەوی بۆ جێگای جۆخین بەوڵاغ دەهێنرا و ئەم وڵاغە (شەغرێکی دەخرا سەری) و ئەم شەغرەیە لەدار دروست کرابوو وەک پەیژەیەکی دوولایی دەخرا سەر کورتان و ئێستر و قرشەی دەغلی لێ توند دەکرا و لەزەوی دەگوازرایەوە سەر جۆخینان بەم شێوەیە.

ئەم قرشەیە دەستبەجێ کۆ دەکراوە و دەکرا بە جۆخین، لەناوەڕاستی هەریەک لەم جۆخینانە دارێکی ئەسپینداری ڕاست دەچەقا و ئەم دار جۆخینە جەنجەری لێ دەبەسترا و لە دەورەی دەسووڕا.

پاش ئەوەی کە جۆخین ڕێک دەخرا و قرشەکێشانی تەواو دەبوو، هەر جۆخین تەنها یەک دوای یەک بەوڵاغ گێرە دەکرا بۆ ئەوەی قرشەکە پان بکات و بیشێلێ و بۆ کوتان ئامادەبکرێ.

پاش ئەم ئیشە دەست بەخەلە کوتینەوە دەکرا بە جەنجەر، کە بەوڵاغ رادەکێشرا و ئەم جەنجەڕە بە گوریسێک دەبەسترا بەدار جۆخین و جەنجەڕەوان سواری جەنجەڕ دەبوو و هەڵی دەسووڕان بە دەوری جۆخین بەپێی سووڕانی وڵاغەکە و ئەم جەنجەرە دەغڵی دەکوتی سەپانێ لەدیار ئەم کاری دەبوو کە قرشە بداتە بەر دەوی جەنجەڕ بەم دەستوورە دەغڵ دووجار دەکوترا، جاری یەکەم (قرشە کوت دەکرا) و دووبارە سەپانەکە جۆخینەکەی گرد دەکردەوە و بەبێڵ و شەنە کۆی دەکردەوە و بە جەنجەڕ دەکوترا و کوتانی دووەم کە وردە کوتی پێ دەوترا بەم کوتینە بە تەواوی دانی دەغڵ لەکا جیا دەبووەوە.

ئەم وردییە کە تێکەڵە بوو لە کاو دان، بە (شەنە) دەدرا بەربا و بەبا دەکرا بۆ ئەوەی دان لەکا جیا بێتەوە و دان بەلایەک دەما و کا دەکەوتە دووری جۆخین و سەپان کاو دانی بەجیا کۆ دەکردەوە.

زۆرجار شەنەبا دوادەکەوت لەبەر نەبوونی با، لەکاتێ کە بای شەماڵ کزەی بکردایە، بە خەڵاتێکی خودایی دەژمێردرا کە ئەم بایە یارمەتی تەواوکردنی ئەم ئیشوکارەی دەکرد پێش هاتنی زستانی ساڵی تازە.

جۆخینە گەنم و جۆ پاش ئەم سەینو بەینە دوور و درێژە کۆتایی پێ دەهێنرا.

لەو رادەیەدا تووڕەیی جیاکردنەوەی مزەی بەشداران دەست پێدەکرا، کە هەرکەس بەشی خۆی بەپێی پیشەکەی کە هەیەتی پاش بەشکردن هەربەشێ بدرێ بە خاوەنەکەی.

بەشی سەپانان جیا دەکرایەوە و هەروەها بەشی خاوەن زەوی لێی دەردەچوو کە بەتابوو یا ملکانە بەبەشی برا گەورە ناودەبرا.

هەرکەس بەشی خۆی دەگوازتەوە، خاوەن خەلەی زۆر لە عەنبار یا لەژووری حەسار، یا لەچاڵی دەغڵ دانەکەی دادەکرد، ئەمانەی خاوەن بەرهەمێکی زۆر بوون، (چاڵی دەغڵیان هەبوو، کەناوەکەی بەخشتی سوور دروست کرابوو). ئەم چاڵانە گەنم یا جۆی تێدا هەڵدەگیرا، لەژێر بیر یەک بەستە کای تێدەخرا ئەوجا دانەکەی تێدەکرا پاش دان دیسان کا ئەوجا (قرشە و قەسڵ دەخرا سەری و بەقوڕە سوور سواغ دەدرا)، ئەم تەرزە چاڵە وەک سایلۆ بوو کە دان لە گەرما بیپارێزێ بۆ ماوەی ٣ ساڵ ئەم دەغڵە نەگۆڕێ). چاڵی زۆرباش بۆ ماوەی (٥) ساڵ خەلەکە لەناوی وەک خۆی دەمایەوە. ئەما کا بۆ ئالیکی وڵاغ (ئالیک) یا بۆ قوڕکاری و بۆ مەڕ و ماڵات دەخرا لەوەدە کادان و هەندێ لەوەدەی شار دیوارەکانی بە کەرپووچ (خشتی سوور) دروست دەکرا، لەوەدەی کای گوندەکان بەلبن (لبن- خشتی کاڵ) دروست دەکرا.

کا دەخرا لەوەدە، قەسڵ دەخرا سەری پاشتر قوڕەبەست دەکرا بەشێوەی باران لەسەری رانەوەستێ.

ئەمە کای بەردەست ئەخرا ژوور یا چاڵ کە رۆژ بەرۆژ بەکاردەهات و لەوەدە زۆر کەرەت لە ساڵێک بۆ ساڵی تر یا زیاتر ئەما لەترسی ساڵی نەهات و بێ بارانی ئەبوو بە ئافات.

*** خاوەنی گوند و زەوی**

خاوەنی گوندەکانی وڵاتی هەولێر و دێهاتی دەم رووبار و بەرانەتی و شەمامک و کەندێناوە و قەراج لەم گوندانە هەندێکی خاوەنی هەولێری بوون و هەندێکی تر گوندی ئاغای دزەیی بوو یا ئاغای گەردی و هەندێ گوندی خاوەنی لەدێیەکە دادەنیشتن هەرچەند زەوی هیٚ جووتیاری بوو.

پێش ساڵی ١٩٣١ و پێش دەرچوونی یاسای تەسویە لە قەراج و لەپشت رێ و شەمامک و زۆر گوند خاوەنی دانیشتوانی گوند بوون. هەر جووتیاری خاوەن چەند پارچە زەوییەک بوو، بەم شێوەیە ئەم گوندانە زۆری هەرکەس هی خۆی بوو و کوێخای دێ براگەورەی دێ بوو.

دەبێ خوێندەواران ئاگاداربن، دەرەبەگایەتی لەشاری هەولێر و لە ناوچەکەی نەبووە و پێش یاسای ناوبراو زۆرکەم کەس بووە لەیەک یا دوو گوند زیاتری بێ، دەتوانین بڵێین هەتا پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی ١٤ی تەمووز ١٩٥٨ لە هەموو خاکی کوردستانی عیراق، لەهەشت نۆ کەس زیاتر نەبووە، کە بەنیوە دەرەبەگی دابنرێن و ئەمانەش زۆریان نیشتمان پەروەر و پیاوچاک بوون و خاوەن دێ یا سەرۆکی تەنها برا گەورەیەک بوو کاروباری دێهاتەکانی هەڵدەسووڕاند و لە دەستووری ژیان ئەم ڕیزە پیاوانە ماوەیەکی زۆر لەبەینی ئەمانە و ژیان و جووتیار بەرچاو نەدەدرا.

هەردەم برایەتی و خۆشەویستی و ئاسایش و یارمەتی لەنێوان دانیشتوانی شار و گوند بە شێوەیەکی زۆرجوان هۆنرابۆوە جیاوازی لەپلەی ژیان زۆرکەم بوو، جلوبەرگ و خواردەمەنی شارستانی و لادێی و پیاوی دەستکورت و دەستدرێژ و دەوڵەمەند و رەنجبەر لەسەریەک رەنگ و ریس بوو و لەم شتانە وا دەردەکەوێت وڵاتی هەولێر دەوری چینایەتی نەدیوە وەک گەلانی وڵاتانی تر لە رۆژهەڵات یا رۆژئاوا.

زیاتر لەهەرکەس بەکار و کردەوەی خۆی ئەگەر هەوڵ و تەقەلای دابێ، وردە وردە پارەی بەدەست کەوتووە، لەریزی جووتیار بووە و لەریزی فەلاح ئەگەر چەند ساڵ بەرهەمی باش بووبێ و ئابووری خۆی رێک کردبێ لەتوانای بووە زەوی بکرێ و وردە وردە دەوڵەمەند بێ.

*** بەرهەمی کشتوکاڵی لە زستان**

کشتوکاڵی زستان ئەو چەشنە کشتوکاڵەیە کە لەمانگی زستان تۆ دەکرێ و دەچێنرێ و زۆربەی کشتوکاڵی شاری هەولێر و گوندەکانی دەشت لەزستان دەچێندرا، چونکی ئەم کشتوکاڵە لەزەوی دێم دەکرا و بەئاوی باران دەڕوا.

گەنم و جۆ لەپایز دەست بە چاندنی دەکرا، هەتا دوامانگی زستان و لەبەهار نۆک و نیسک و

تەرۆزی و گندۆرە (کاڵەک) ئەم بابەتانەش بە باران دەکران و لەساڵی باران زۆری لەجێی ئاوگر پیاز و پاقلە بەدێم دەکرا.

گەنم و جۆ لەوەرد دەکرا یا نێر و نێر دەکرا، بەڵام بیستان دێم و نۆک و نیسک لەشۆ دەکرا، کە ساڵی ئایندە دەکرا بەگەنم یا جۆ.

* بەرهەمی کشتوکاڵی لە هاوین

بەرهەمی هاوین یا بەشێوەیەی راست کشتوکاڵی بەرئاو، لەدامەنی زێی گەورە و زێی بچووک بەجۆگەلە ئاو هەڵدەگیرا یا بە ناعور ئاو هەڵدەهێنجرێ و لەبەر ئەمبەر ئاوە سەوزە و بێستان و باغ دەچێندرا، لە دێهاتی دەوروپشتی شار کە بەدەم رووبار ناودەبرا لەوارش هەولێر چەند کارێزێ هەبووە بە ئاوی ئەم کارێزانە سەوزە و شینایی دەدرا و لەبەر هەندێکیان درەختی میوەجاتی تێدا روابوو.

دەڵێن لەسەدەی (١٨)ی زایینی و پێشتر نزیکەی (٤٠٠) کارێز لە وڵاتی هەولێر هەبووە و ئەو کارێزانە بەدەستکردە کراون.

لەم کاتەدا تەنها نزیکەی (٣٠) کارێز ماوە ئەو کارێزانە زۆر کەرت هەر هی خاوەن دێ بووە و جار بەجار خاوەن زەوییەکی تر بووە، کشتوکاڵی بەر ئاوی کارێز بە شینایی ناوبراوە. هەندێجار خاوەن کارێز زەوی بەرئاوەکە هی خۆی بووە و خۆی شینایی کردووە بە یارمەتی شینایی چییەکی پسپۆڕ کە بە (جەوان) ناوبراوە و ئەم جەوانانە لەکاری شینایی چاندن و رێکخستنی زەوی زانا بوون. ئەگەر خاوەنی زەوی کەسانی تر بووایە، پشکێک لە بەرهەمی شینایی پێ دەدرا.

جاری واش هەبووە عەرد و ئاو بەکرێ دراوە یا بەجۆرێکی تر ئەم کارە کراوە.

لەبەر کارێز برنج، لۆکە، پیاز لەگەڵ سەوزە، وەک پاقلە، تەماتە، کودو، بامیە و باینجان کراوە. لەکاتی پایز خەیار، لۆبیا، توور، شێلم، چەوەندەر، کەرەوز، سیر و لەدێهاتی پاڵ چیاو بەرەوشاخ کە لەپشت رێی هەولێر هەڵکەوتووە و دەوروپشتی ناوچەی پیرمام و بەو دیوی بەستۆرە کانی تیابووە و گوندی تر کە لەسەر رووبار هەڵکەوتووە، هەرچەند گەنم و جۆ و نۆک و نیسک بەدێم کرابێ، بەشی دووەمی کشتوکاڵیان لەبەر ئاوی ئەو سەرچاوە ئاوانەی باس کرا، کردووە و ئەو سەرچاوە ئاوانە هەندێکی ساڵ دوای ساڵ ئاوی لەیەک ئاست بووە کەم و زیادی نەکردووە، ئەما کانی ئاو و گەلێ لە رووباران ساڵی کەم باران و بەفر بەرەو هاوینی ئاوی ئەم چاوگانە لەکورتی بووە.

لەم دێهاتانە لە هاوین و پایز و بەهار گەلێ رەنگ و بابەتی شینایی و سەبزە کراوە، وەک: تووتن و برنج و لۆکە و باغی میوەجاتی تێدا چاندراوە.

داری میوەجات وەک رەزە مێو، گوێز، هەنجیر، هەرمێ، سێو، خۆخ، هەڵووژە، زەردەلوو (قەیسی)، کشمیش، توو، گەلاس، ئینجاز....

بێجگە لە باغی ئاوی رەزەدێم لەگەڵێ دێهاتی چیاو پاڵ چیا بووە، وەک ئێستا و ئەم میوەجاتە کە تەنها لەسەر ئاوی باران راوەستاوە (وەک باوی، سماق، ترێ (رەزەمێو)، هەنجیر، هەرمێ...).

## * ئاهەنگ و رابواردن لە کۆمەڵایەتی کۆن لە هەولێر

لەم وتارەدا باسی هەموو چەشنە یاری و ئاهەنگ و چەند شتی تر دەکرێ کە پەیوەندیان بە رابواردنەوە هەیە.

کۆمەڵایەتی کورد لەناو شاری هەولێر و لە گوندەکانی و لەناو کۆچەرانی رەنگاورەنگ بەچەند شێوە بابەت شت بووە بۆ رابواردن، ئەم کردەوانە زۆری لەسەر دەستووری پێشووی نەماوە و دەربارەی ئەم کارانە، شێوەی کۆنی چلۆن بووە و چۆن گۆڕاوە، بەند دوای بەند ئەم باسە روون دەکەینەوە.

### * چیرۆک:

بوونی چیرۆک لەشاری هەولێر و گوندەکانی بەجێ ماوەیەکی زۆر کۆنە و پێش ساڵی ١٩٣٠ لە شەوانی دوور و درێژی زستان بۆ رابواردن و چیرۆک بێژتن بەکارهاتووە و گێرانەوەی چیرۆک زۆر بەنرخ بووە، چونکە لەکاتی ناوبراو رادیۆ، تەلەفزیۆن، رۆژنامە و گۆڤار هیچ یەکێ نەبووە.

لەبەرئەوە چیرۆکبێژی پیاو لە دیوانخانەکان و لە چایخانەکان، چیرۆکبێژی ژن لەماڵان بۆ ئافرەت و منداڵ چیرۆکیان بەشەو دەگێڕایەوە.

چیرۆک وتن پێویستییەکی گرنگ بووە بۆ رابواردن، چیرۆکبێژی وا بوو، کە لەشارێ بۆ شارێکی تر و یا گوندێکی تر دەچوو بۆ ئەوەی چیرۆک بگێڕێتەوە.

ئەم چیرۆکانە لەپەرتووک یا لەگۆڤار نەنووسرابوون، ئەوانەی ئەم کارەیان دەزانی و چیرۆکیان دەگێڕایەوە، لەبەریان کردبوو.

گەلێکیان ئەم زانستە لەدایک و باوکی خۆیان فێری ببوون یا لە چەند چیرۆکبێژی تر ئەم زانستەیان وەردەگرت.

ئەو چیرۆکانە هەندێکی مەبەست و رەگەزی سەربوردەی شاری هەولێر و ناوچە هەرێمی بووە، هەندێکی تری لە ناوچەکانی تری کوردستان وەرگیرابوو.

ئەو چیرۆکانە هەمەرەنگ و ئاوێنەیەکی رووناک بوون لە بارەی ژیانی کۆن و لە بارەی مێژووی کورد و پیاوی ناوداری و پاڵەوانی ئازا و یادی شەڕ و جەنگی رابوردەی دەکرد و بابەتی تر مەبەستی بە دڵداری و خۆشەویستی بوو.

ئەم چیرۆکە کۆنانە جێگای شانازییە و پێویستی بە باس و لێکۆڵینەوەیە لەبەرئەوەی زۆریان زانستێکی بەنرخی تێیدا هەیە لە بارەی ژیان و کۆمەڵایەتی و مێژووی رابوردەی کورد و کوردستان.

ئەم چیرۆکە رەنگاو رەنگانە زۆرکەمی تا ئێستا نووسراوەتەوە و چیرۆک بێژ لەسەر دەستوور و شێوەی کۆن لەشاری هەولێر و گوندەکانی لە نەمانە، لەبەرئەوە پێویستە چەند نووسەرێکی شارەزا خەریکی کۆکردنەوەی ئەم یاداشتە کۆنەبن، زوو بەزوو پێش فەوتانی ئەم باسە کۆنانە کە گەلێکی مەبەستی بەمێژووی پێش چەند چەرخێک و بنج و بنەوانی کۆمەڵایەتی و ژیانی ئەم گەلەیە.

شایانی وتنە کە لە سلێمانی چەند نووسەرێک هەندێ لە چیرۆکەکانی وڵاتی شارەزوور و سلێمانییان کۆکردووەتەوە، ئینجا پێویستە نووسەری هەولێر و بادینان و ناوچەکانی تر بە هونەرمەندی و بەهێزێکی تەواو دەست بەم کارە بکەن.

لەکاتی کۆکردنەوەی ئەم هەواڵە کۆنانە دەبێ هیچ زانیارییەکی تێدا نەگۆڕێ ئەگەر پەیوەندی بەمێژوو بێ.

چیرۆکی تر ئەگەر دەستکاری تێداکرا بۆ رێکخستن بەشێوەیەک کە خوێندەوار بە پەرۆشەوە ئالوودەی خوێندنی بێ.

*** گۆرانی و ساز (مۆسیقا)**

گۆرانی لەشار و دێهات بەچەند چەشن بووە، ئێستاش هەروەک جاران لەباوی خۆی ماوە و پێش کەوتووە، هەر چەشنێکی ناوی تایبەتی خۆی هەیە وەک: حەیران، لاوک، بەستە، مقام، قۆریات، بێجگە لەم بابەتە کۆنانە لە چەرخی ئەم دەورە تازەیە پاش پەیدابوونی قوتابخانە. هەمەرەنگ گۆرانی قوتابییان پەیدابووە، کە پەیوەندیی بەگەل و نیشتمان و وڵات و خوێندەواری هەیە. گۆرانی کۆن وەک: حەیران و لاوک جاربەجار سەر و چاوەکەی لە هۆنراوەیەک وەرگیراوە و هی تری لە رەگەزەوە بۆ گۆرانی رێکخراوە، لاوک و حەیران و بەستە و گۆرانی تریش رەنگاورەنگن هەندێکی بۆ ئازایی یا بەشان و باڵای پیاوی ناوداری بەکەڵک وتراوە، یا باسی هونەرمەندێک دەکات یا بۆ دڵداری و خۆشەویستی بێژراوە.

گۆرانی هەر چەشنێکی، بابەتێکی لەشوێن کاتی پێویستی بەکاردێت وەک گۆرانی زەماوەند و شایی و هەڵپەڕکێ و هی تری لەکاتی دروێنەی دەغڵ دەوترێ (ئەم چەشنە) کە مەبەستی بە دوورینەوەی گەنم و جۆیە روو بەنەمان و فەوتانە لەبەرئەوەی دەستووری خەلە (دەغڵ) کۆکردنەوەی بە تەواوی گۆڕاوە.

گۆرانیبێژ هەندێکیان کاریان ئەوە بووە و ژیانیان بەو رێیە رابواردووە و کەسانی تر بۆ هەوەس بوونەتە گۆرانیبێژ لە ئاهەنگی تایبەتی زەماوەندی دۆست و برادەریان یا لەکاتی سەیران رابواردن یا لەجۆشی دڵداری گۆرانییان گوتووە.

لەگەڵ بوونی ئەو چەشنە گۆرانییە رەنگارەنگە لەوڵاتی کوردستان کە بەدەنگی خۆش گوتراوە و لەچیاو دەشت دەنگی داوە و دڵی فەردوان کردووە و مرۆی ماندووی پێ حەساوەو ئادەمیزادی بەجۆش هێناوە و ختوویەتییە باوەش هەوەس و دڵخۆشی، شان بەشانی ئەم ئاوازە خۆشانە ساز و تەنبووری کوردەواری کۆن بە شێوەیەکی پێشکەوتوو هەبووە و ساز و تەنبوور (مۆسیقا) دۆڵ و

زورنا و بلوێر، دەف، ساز، تەنبوور، تێکرا لەگەڵ گـۆرانی لەکـاتی هەر رەنگە ئاهەنگێک و زەماوەند و جەژن ئەم بەزمە ساز و خۆشە داگیرساوە.

شایانی وتنە لە هەموو ئاهەنگێ، لەکاتی سەیران ژن و پیاو شان بەشان گـوێیـان لە گـۆرانی و دهۆڵ و زورنا بـووە و لەم وڵاتـە نـازدارە لە رۆژانـی بەهار دەرچوون بۆ سەیری خاکی سەوز کە بە رەنگێ گـوڵاڵەی زەرد و سـوور داپۆشراوە و لەسەر چاوگەی کانی یا لەسەروچاوەی کارێز یا نزیکی رووبار ئاو بە قەراغ دارستـان و رووباری ئاو و لەنزیـک زەوی کـە بەدەغـڵـی سـەوز داپۆشـراوە کـۆبوونەوەیان بـووە و زۆرجار لەم چەشنە رابواردنە گۆرانی گوتراوە لەگەڵ لێدانی ساز و تەنبوورە بەدەست پێکردنی زورنابێـژ و دهۆڵ لێـدانی شایی چۆپی و هەڵپـەرکێ و رەشبەڵەک داگیرساوە.

*** هەڵپەرکێ**

دانیشتـوانی گـوندەکـانی هەولێر بەشـایی ناوی دەبەن و بوونی شـایی لە وڵاتی کـورد زۆر کـۆنە و هەزارەها سـاڵ لەمـەوپێش پەیدابوونی لەگـەڵ بوونی و دامـەزراندنی شـاری هەولێر لەیەک کات و سەددەیە و لەم گفتە وا دەردەکەوێت، کورد لەمێژوو خاوەنی کۆمەڵایەتی شەنگ و بەرز بووە.

شـایی لە گـوندەکـانی هەولێر بە چەنـد جـۆرێک کــراوە، وەک: هەڵپـەرکێ، چۆپەیی، رەشبـەڵەک و هەریەکە لەم بەزمـانە هەڵسـووڕاندنی بە شـێـوەیەکی تایبـەتی بووە، لە هەڵپـەرکێ و رەشبـەڵەک ئافـرەت و پیـاو دەست لەدەست شـان بەشـان هەڵپـەڕیون و جـار بەجـار ژن تـەنیـا و پیـاویش بە تەنیـا ریـزیان گـرتووە و ریزی ژنان بەرامبـەر بەریزی پیـاوان شاییان کردووە.

ئەو پیـاوانەی بۆ شـایی کـردن هاتوون خۆیان بەجل و بەرگێکی تازە ئامــادە کــردووە، ژن و کچ کــە بۆ هەڵپـەرکێ هاتبێ جلی رەنگاورەنگی تازەی لەبەرکـردووە، پیـاو خـۆی بە خەنجەر و چەک رازاندۆتەوە و ئافرەت بە کـەلوپەلی رازاوەتەوە، ئەوجـا دەستی بە هەڵپەرکێ کردووە. لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئافـرەتی کورد بە رابووردەی مێژوو پێشکەوتوو بووە و لە تەرازوو ژیان لەگەڵ پیـاو لەیەک کێشانەوە بووە.

هەڵپـەرکێ لەکاتی ژنخواستن و لە زەمـاوەند دەکـرێ، هەروەها لەرۆژی جـەژن و خـەتەنەی منداڵ نازدار و لە نەورۆز و لـەکــاتی ســەیران و هەمەرەنگە ئاهەنگێک دەکرێ و جار بەجار شایی بۆ بەخێرهاتنی پیاوی گەورە و ناودار دەکرێ لەکاتی هاتنی بۆ گوندێک، بۆ پیشاندانی دڵ خۆشی و شایی ئەگەر گۆرانی لەگەڵ نەبێ و دەهۆڵ و زورنا بەکار نەهێنرێ شایی بەگـۆرانی خـۆش و دەنگی دەهۆڵ و زورنا بە تەواوی دروست دەبێ و وردە وردە شاییـوان بەجـۆش دێن و شـایی گـەرم و گـوڕ دەبێ و هەروەها چەشنی سـاز و تەنبـووری دەهۆڵ و زورنا بۆ هەر بابەتێ، هەڵپەرکێ جیاوازە.

زۆرشت لە بنچینەی کولتـووری و کـۆمـەڵایەتی گـەلی کـورد، لە روو لە بـزربـوونـە، بە گــــۆڕینـی ژیـان و پێشکەوتنی بەڵام گۆرانی و هۆنراوە و چیـــرۆک و هەڵپــەرکێ و ســـاز (مۆسیقا)، کوردی هەر بەردەوامە و لەپێشکەوتنە.

*** راو- چەک و سواری**

راو و سواری و چەک بەکارهێنان، ئەم سێ شـتـە بە پیـشـەی کـۆنی دانیـشـتـوانی شـاری هەولێـر و گوندەکانی دەژمێـردرێن و گـەلی ئەم شـار و ناوچەکـەی بە هەوەســەوە ئالوودەی ئەم سێ کـردەوەیە بوون و پێـویست بووە، کـە هەرکـەس فێـری سواری وڵاغ بێت تەقڵە و رمبازێن بە ئەسپ بکات.

فـێـربوونی ئەم کـارە تەنهـا بۆ هــەوەس و رابــواردن نــەبــووە، لەبەرئەوەی بە پێویستییەکی گرنگی کـۆمـەڵایەتی و ژیان دانراوە تەنهـا سـواری وڵاغ بۆ هامـوشۆ و گـەڕان و کاروان بەکارهاتووە، هەروەها سواری زانین، زۆری پێـویست بووە بۆ کـاتی شـەڕ و جـەنگ و بۆ پاراستنی وڵات لـە دوژمـن و ســـــواری بـاش و لێهەڵکەوتوو لە هەموو کاتێ لە شەڕ سەرکەوتوو بووە.

شـارسـتـانی هەولێـر و جێنشـینی گـوندەکـانی زۆربەیان خـاوەن چەک بوون لە چەرخـانی پێـشـوو (رم، تیروکەوان، شمشێر، خەنجەر لەشەڕ بەکــارهێنراوە و پاش پەیدابوونی باروت و تفـەنگ و شـەش ئاگـر بووەتە چەکی شـەرکـەر و تفـەنگچی باش لە کۆمەڵ ناودار بووە و چەکدار نیـشـانیـان داناوە لە گـۆرەپانەکـانی نزیک شار یا نزیک گوند و مەبەست

لەمەوە ئەوە بووە کە بزانرێ کام کەس نیشانگرێکی باشە و لەلایەکی ترەوە بۆ ئەوەی گەنجەکان فێری تفەنگ هەڵگرتن و بەکارهێنانی ببن.

لێرەدا پێویستە بۆ خوێنەوەراران روون بکرێتەوە کە خەنجەر هەڵگرتنی لەکاتی خۆی، زۆر بەپێویست دادەنرا و زۆربەی پیاو لەشار و دێهاتەکان خاوەنی خەنجەر بوون و لەشاری هەولێر چەند کەس بوون کە کاریان خەنجەر دروست کردن بووە.

سەرەتای سواری و چەکداری دانیشتوانی شاری هەولێر و گوندەکانی وەک شارستانی و لادێی تری کوردستان زۆر کەسیان ئالوودەی راوکردن بوون.

راو بە چەند شێوەیەک کراوە، وەک راوی کەروێشک، بۆ پێکهاتنی ئەم چەشنە راوە پێویستی بە چەند سوارێک بووە لەگەڵ دوو سێ تاژی رستکراو. ئەم سوارانە چوون سەر زەوییەک کە ئەم نێچیرەی تێدا پەیدا دەبێ، لەکاتی گەیشتن بۆ سنووری زەوییەک سوارەکان پەرتەیان کردووە و ئەم خاکەیان هەڵپشکتووە بەگەران و سووران، سوارەکان قەد بەقەد تەماشای زەوییەکەیان کردووە، تا کەروێشک لە لانەکەی دەدیتراوە و یا هەلاتووە ئینجا تاژی (تانجی) رستکراو کە جڵەوی پەتەکەی بە دەستی سوارێک لە سواران بووە و تاژییەکەی بەرەڵا کردووە بەدوای کەروێشک و ئەم سوارە بە دەنگێکی بەرز دەیوت (دیار دی)، واتە ئەوەتە دەرکەوت، مەبەست لەم بانگکردنە ئەوەیە تا سوارەکانی تر ئاگادارین و لەهەموو لایەک تەکانی وڵاغیان بدەن و رابکەن بەدوای نێچیر و دەوری بدەن، نەک بزربێت یا رابکات یا لە پەناپەنچگی خۆی گوم بکات سوارەکان دوو بەدوو تاژی یا لە دەوروپشتی نێچیرەکە دەخولانەوە تا تاژییەک کەروێشکی دەگرت لەوکاتە دەستبەجێ سوارێک لەوڵاغی دادەبەزی و سەری کەروێشکی دەبری و لاشەی تەواوی کەروێشک سوارێک دەیبەستە پاشکۆی ئەسپەکەی و گۆشتی کەروێشک زۆرجار لەگەڵ پلاو و ساوار دەکرا بە چێشت و پێستەکەی بۆ سەر رایەخ و دۆشەک بەکاردەهات یا بۆ سەر زینی ئەسپ و جار بەجار بۆ بەرگی فەروا بەکاردەهێنرا و راوە ئاسک (مامز) بەهەمان دەستوور دەکرا تەنها ئەوەی پێویست بوو ئەم تەرحە راوە لەرۆژی پاش باران دەکرا بۆ ئەوەی زەوی و زار قوربێ تا سمی مامز لە قور گیربێ و بچەقێ تا بە تەواوی نەتوانێ باز بازانێ بکا و هێزی راکردنی سست بێت و دەرفەتی نەبێ خۆی لەتاژی بزر بکات، بۆ ئەوەی تاژی پەلاماری بدات و بیگرێ و سوارێ لەوڵاغ دەهاتە خوارێ، کە ئەم نێچیرە تاژی وەربگرێ و سەری ببرێ.

چینە راوکەری تر بە تفەنگی (چاخماخدار) راوی ئاسکیان دەکرد.

پێش ساڵی ١٩٣٦ و پێش (٥٠) ساڵ چوار دەوری هەولێر گەلێ لە زەوییەکانی کەروێشکی تێدا پەیدا دەبوو و زورگ و هەڵەتی چوارگۆشەی شار، وەک خاکی رەشکێن عەنکاوە شمعون ئاوا، سوێری، پیرزین، بێرکۆت، مەلائۆمەر، بنەسڵاوە و کەسنەزان، لەم شوێنە نزیکانە لەهەر رێگایەک لات بدایە چاوت بە مامز دەکەوت و زۆر بە سانایی گەلێ ماڵ لە شار فەرخە مامزی بەدیاری بۆ دەهات و لەناوماڵ بەخێو دەکرا.

وردە وردە و ساڵ دوای ساڵ ئەم جانەوەرە جوانە بەرەو نەمان چوو بە پەیدابوونی تفەنگی تازە و ئۆتۆمبێل کە راویان پێ دەکرا و ئەو راوچییانە بەبێ پەروا هەتا لەکاتی (ئاووس بوون) راویان هەر دەکرد مامز راو دەکرا و لەزگی بێچووەکەی دەفەوتا و فەرخە و کارمامزیش بەزندوویی راو دەکرا. ئەم جۆرە راوە بێ تامە و ئەم هەڵمەتە گر و گەرمە بەدوای ئەم بێ زمانە بووە ماوەی فەوتانی ئەم زیندەوەرە جوانە.

ئێستا لە شوێنی لاچەپ و زۆر دوورە ئاوایی تاک تاک کەروێشک هەیە و لە ئاقاری دێهاتی شاخاوی و هەڵەتی زۆر دوور، جار بەجار چاویان بە مامز دەکەوێ.

گەلێ درندە و دەعبای تر لە دێهاتانی نزیک شاری هەولێر بوو، وەک رێوی و چەقەڵ و چەند تەیر و تواڵی زۆر قەشەنگ و جوان، ئەم جانەوەرانەش تووشی هەمان بەزمی راوە کەروێشک بوون. بەکارهاتنی چەند چەشنە چەکی تازە هەناسەیان لێ بری و لەم خاکە هەندێکی دوور کەوتەوە پاش فەوتانی تاخمێک زۆری و لە گوندانی چیا حەیوانە کێوی راودەکرا بۆ گۆشتی و چەند بابەت دەعبای تر لەبەر پێستیش راودەکرا ئەم درندانەش لەمکاتەدا

زۆر کەمی ماوە ئەگەر لە هەندێ لوتکە شاخی بەرز جار بەجار چاوی پێ بکەوێ و زۆربەی ئەم زیندەوەرانەی بەهەمە دەردی چەکی تازە زۆریان لەناو چوون.

تەیر و هەندێ زندەیی تر بە تەلە، فاق، تۆڕ راو دەکرا وەک کەو، کۆترە کێوی، قەتێ، رەشۆلە، کێشکە (چۆلەکە) و قەلەڕەش...

دوو تەیری گەورەی زۆر جوان کە بەچرگ و حەبارە ناودەبران، لەکاتی درەوی خەلە لەناو زەوی و زار پەیدا دەبوون و چرگ لە گەورەیی وەک عەلیشیش دەبوو و حەبارە لە مریشک بەلاتر و ئەم دوو تەیرە پاش سالی ١٩٤٥ زۆر کەم بینراوە.

بە سایەی تفەنگی تازە کەوا لەچیاو پۆڕ لە دەشت هەمیشە تووشی دەرد و بەلای کەم بوون و زۆر دوور نییە ئەگەر پاریزێکی توند و تووش نەکرێ، پاش ماوەیەکی کورت بنەڕەتی ئەم دوو نگارە جوانە لە ئاسمانی کوردستان دوایی پێدێت.

*** یاری کردن:**

یاری یا وازی کردن، ئەم کارە پاشماوەیەکی مێژوویی کۆنە لە هەولێر و دێهاتەکانی یاری (وەرزش) هەر بووە پێش پەیدابوونی قوتابخانە گەنجەکانی شار و دێهات گەلێ چەشنە یاریان کردووە لەکاتی دەست بەتالی یا لەکاتی سەیران لە رۆژانی بەهار و ئەم یارییانە دوو بابەتن، یاری لەش (ریازەی بەدەنی) و یاری دەست.

یاری لەش تەنها کردەوەی گەنج و هەرزەکار بووە و ئەم یارییانە چەند چەشن و بابەت بوون وەک: راکردن، باز بازانێ، پشتی پشتی، قاشو، پەت پەتێن، گوریس راکێشان، تۆپ تۆپانێ و زۆر یاری تریش و یاری تایبەتی لەلایەن سواری چاک بە چەند شێوەیەک کراوە.

بابەتی دووەم، یاری دەستە. هەندێکی بەرۆژ کراوە و زۆربەی تری شەو لە دیوەخانەکانی شار و دێهات کراوە. ئەم یارییانە لە شەوانی زستان زیاتر کراوە لەبەر دوور و درێژی شەوی زستان و لەلایەکی ترەوە، لە مانگانی تری سال بەرۆژ کاروباری کشتوکال بووە ماوەی ماندووبوونی خەلک، چونکی بەرۆژ خەریکی ئیش و کاریان بوون.

هەروەها لەزۆر چایخانە و قاوەخانەکانی شار هەمیشە ئەم یارییەیان دەکرد.

یاری دەست تەنها بۆ گەنج و جاحێل نەبوو، بەلکو زۆر بابەتی لەلایەن پیاوی گەورەی بەرێز بە پەرۆشەوە دەکرا وەک دام، زەرف و فنجان، یاری ئەنگوستیلە، (مەنقلی بەرد) یاری فنجان، بالیفانێ.

شەڕە گەڕەک لەلایەن گەنج دەکرا، وەک یارییەک کە بزانرێ کامە لا ئازایە. ئەم شەڕە گەڕەکە بەچاوی برایەتی و خۆشەویستی دەکرا. بەهیچ جۆرێک پەیوەندی بەکینە و رقەبەری و ناخۆش نەبوو.

یاریی تر بۆ مندالی ساوای گەنجی تازە پێگەیشتوو وەک ئاش قولانی بۆ کچ و یاری تیغ تیغانێ و یاری کەلای بەرد بۆ مندالی کورد.

وا دیارە ئەم جۆرە یارییانە زۆریان بەجێی ماوەی میراتی ئەم خاک و خۆلەیە، بێجگە لەیاری دۆمینە و تاولە وادەردەکەوێت کە لەجێگای تر وەرگیراوە.

ئەو دەستوورانەی ژیان بنج و بنەوانی و رەگەزی دەگەرێتەوە پاشماوەی دانیشتوانی کۆنی ئەم شارە کۆنە، هەزارەها سال پێش ئەمرۆ. هەر چەند ئەم زانستانە بە تایبەتی پەیوەندی بەولاتی هەولێرە، لەگەل ئەمەشدا ئەم روالانە و ئەم کردەوانە ئاوێنەیەکی تەواوە بۆ رۆشناکردنی کۆمەلایەتی گەلی کورد و نیشتمانی ئەم خاکە لە هەرێم و ناوچەکانی تری کوردستان.

پاشماوەی ئەم وتارە خوا یاربێ، دەست لە قەلەم هەلناگرم تا بە تەواوی هەرچی لەبیر و یادم بێ کە پەیوەندی بە دەستووری کۆنی ژیان و هەوالی رابردووی هەولێر هەیە، تا کۆتایی پێ دێت و مەبەست لەمە ئەوەیە کە ئەم یادگارە بۆ دوارۆژ سەروچاوەیەکی بەکەلک بێ کە سوودێکی تەواوی هەر بمێنێ.

* هەولێر لەگەل کاروانەی فەلەک، هادی رەشید چاوشلی، چاپخانەی الجاحظ، بەغدا، سالی ١٩٨٧، یادەوەری رۆژانە، نووسینی خوالێخۆشبووە بە خستنە سەر رێنووسی نوێ.

# ئامێرە بەردینییەکانی کوردەواری لە هەولێر

ئەنوەر عەزیز

لەوەتەی مرۆڤ هەیە، هەر لە چاخەکانی بەردینەوە تاکو ئێستا بەردەوام مامەڵە و تێکەڵییەکی لەگەڵ بەرد بە شێوە و قەبارەی جیاواز هەیە: گەورە بێت یان بچووک بێت. کوردیش وەکو نەتەوەیەکی سەر رووی ئەم زەمینە، وەکو ئامێر و قاپ و ساج و بۆ دروستکردنی خانوو و زۆر شتی دیکە بەردی بەکارهێناوە.

پێ بەپێی هزر، بەکارهێنانەکەی گۆڕانی بەسەرداهاتووە و بەردەوامە. بۆ نموونە: ئەگەر بێت و تۆزێک بگەڕێینەوە بۆ سالانی شەستەکان تا کۆتایی سالی حەفتاکانی سەدەی رابردوو، لە شاری هەولێر ئەو دیاردەیەمان بە چاوی خۆمان دەدیت و درکمان پێدەکرد و بەکارمان دەهێنا. یەکێک لەم پێکهاتانە کە لە بەرد دەتاشرا، پێی دەڵێن: (باگوردان) لەسەر بانەکانی گەڕەکە کۆنەکانی هەولێر وەکو (قەڵا، خانەقا، سەعدووناوا، سەیداوا و تەیراوا) هەبوو، پارچە بەردێک لە شێوەی لوولەیەک خڕ کرابوو لە ناوەڕاستیدا کونێکی تێدابوو سەربانەکانیان پێ دەپەستاوە بۆ ئەوەی لە کاتی باران بارینی بارینا دڵۆپە نەکات. وەستای کارامەی خۆیان هەبوو بەپاچ و تەوری تایبەتی رێکیان دەخست، لەوانە: وەستا محەممەد نەقار و مام بەهراوی ئاشەوان کە تا لە ژیاندا بوون، قەت دەست و چەکوچیان لە یەک جیا نەدەبوونەوە. هەروەها لە دەوروبەری هەولێریش لە گوندەکانی وەکو: (حەسارۆک و تووڕەق و پیرداود و قەتەوی و کەسنەزان و بەستۆرە و دەڤەری زراردتی و بەرانەتی) ئامێرێکی بەردی دیکەمان دەدیت، ئەویش پێی دەگوترا (جۆنی). جۆنیش بریتی بوو لە دوو پارچە یەکێکیان، کە دانەوێڵەیان تێدەکرد پێی دەگوترا (کۆڵ). ئەوەی دیکە هەر بەردێکی خڕی درێژ و لە شێوەی (دەسک) بوو پێیان دەگوت: (دەسکە جۆنی). ئەم ئامێرانەش دەسەلمێنن، کە زیاتر کورد بەکاری هێناوە، بۆیە هەتا لە پەندەکانیشدا دەنگی داوەتەوە بۆ نموونە دەڵێن: (با... بەلایەک، باگوردان بەلایەک) واتە هەر شتەو بەکاری خۆی. باپیرانیشمان نەریتێکیان گرتۆتەبەر تاوەکوو ئێستاش پەیرەو دەکرێن لە هاوین دانەوێڵە و بەروبوومی خۆراک کۆدەکەنەوە، لە زستانیش بەکاری دەهێنن، لەبەر ئەوەی جاران، کە زستان دادەهات رێگاوبانەکان دەگیران بەهۆی بەفر و بارانێکی زۆرەوە، کە نەدەتوانرا لە کونی ژۆرێ سەر دەربێنن بە تایبەتی لە ناوچە شاخاوییەکاندا. یەکێک لەو ئامێرە هەرە پێویستانەی کە بەکار دەهات، بریتی بوو لە دوو پارچە بەردی خڕی بازنەیی یەکێکیان لە سەرەوە، ئەوی تریان لە ژێرەوە. ئەوەی ژێرەوە لە ناوەڕاست کونێکی تێدایە دارێکی تێ کراوە، ئەو داردش وەک دەزانین پێی دەڵێن چەق و پارچەکەی سەرەوەش کونێکی تێدایە، بەلام ئەو کونە دوو ئەرکی هەیە:

١- سەنتەرکردنی پارچەکەی سەرەوە.

٢- لێکردنی دانەوێڵە (تێکردنی دانەوێڵەکە لە کونەکە).

دەسکێکی داری هەیە بۆ لێکردن بەکاردێت. ئەو دانەوێلانەی، کە بە دەستار لێدەکرێن بریتین لە (نیسک، نۆک، برنج، گەنمەکوتا، گەنم دەکرێتە برووش، ساوار) چەندین دانەوێڵەی دیکە.

ئەمانەش لە وەرزی زستاندا خۆراکی سەرەکینە.

**ئیشکردن بەم شێوەیە:**

لەسەر پارچە کەوڵێک یان سفرە دادەنرێت، ئینجا دوو ئافرەت بەرانبەر بە یەک دادەنیشن و پێیان لە یەک گیر دەکەن. دەستارەکەش لە نێوان هەردووکیان دادەنێن و دەست لە دەسکەکەی دەگرن و بەنۆرە دەیسووڕێنن. دانەوێڵەی تێدەکەن و لە نێوان هەردوو پێدەستارەکەشدا ئەو زادە دێتە خوارەوە.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە ٢٥ حوزەیرانی ٢٠٠٧ وەرگیراوە.**



# پیشەی کوورەچیاتی لە هەولێر

بەرهەم عەلی

زۆر لە مێژە وڵاتی کوردەواری لەڕووی ئابوورییەوە بە کۆمەڵگەیەکی خۆژێێن ناسراوە و زۆربەی ئەو کەلوپەل و پێویستییانەی، کە لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا پێویست بووە، لێرە و لەوێ لە نێو دانیشتووانی گوند و شاردا، لەلایەن نیشتەجێیانی دەشت و دۆڵ و چیادا تاکەکانی ئەم کۆمەڵگەیە بە دەست و مەچەکی خۆیان دروستیان کردووە و خودی خۆیان بۆ مەیسەرکردنی ژیانی ڕۆژانەیان بەکاریان هێناوە.. ئا لەم سەروبەندەدا کاروپیشەی تایبەت هاتۆتە ئاراوە و پیشەسازییە دەستکردەکان لە هەموو بوارێک زیاتر بایەخی پێدراوە. بێگومان ئەو بەرهەمانەی دروستیشیان کردووە، شێوە و قەبارە و بواری جۆراوجۆری بەکارهێنانیان هەبووە. لەم سۆنگەیەوە زۆرجار ڕووی داوە، کە ئەندامانی بنەماڵەیەک تێکڕا لەباو و باپیرانەوە تا دەگاتە نەوەکانی داهاتوو بە پیشەیەکی تایبەتەوە خەریک بوون و لە ژێر سایەی هەر بارودۆخێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریدا بووبێت، دەستبەرداری ئەو پیشەیە نەبوون و پیشەکە بووەتە ناو و نازناو و ناوبانگێک بۆ ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە. یەکێک لەو پیشانە لە شاری هەولێردا پیشەی کوورەچێتی بووە. کە لەم ڕیپۆرتاژەدا بەسوود وەرگرتن لە چەند دانیشتنێک لەگەڵ (مام ئەسعەد کوورەچی)دا، مێژووی ئەو پیشەیەو هەموو لایەنە پەیوەستەکانیمان بۆ ئاشکرا بوو.

### مام ئەسعەد کوورەچی

زۆر گەڕام و زۆرم لە ناونیشانی مام ئەسعەد کوورەچی پرسی، دەمویست چەند دانیشتنێکی لەگەڵدا سازبدەم بۆ ئەم ڕیپۆرتاژە، تا ئەو ڕۆژەی لە نێو کۆنە قەیسەری هەولێر لە کونجی چایخانەکەی مام خەلیلدا بە مام ئەسعەد کوورەچی ئاشنا بووم، ئەو چایخانەیەی، کە تەمەنی پتر لە (٧٠) ساڵە و زۆربەی هەرە زۆری هەولێرییە کۆنەکان و کەسایەتی و ناودارانی شار ڕۆژانە لێی دادەنیشتن و بەدەم چای گەرم و گوڕەوە بیرەوەرییەکانی ڕۆژانی رابردووی ژیانی پایتەخت دەگێڕنەوە. مام ئەسعەد کوورەچیش یەکێکە لە دانیشتووانی هەمیشەیی ئەو چایخانەیە. ئەم پیاوە ئەگەرچی تەمەنی لە سەروو شەست ساڵەوەیە، بەڵام بە جووڵەو چالاکی و قسەکردن و گێڕانەوەی بیرەوەری گەنجێکی زدین روونەو هەست ناکەیت ئەو هەموو ساڵەی لە تەمەن بەڕێ کردبێت. خۆ کە لەکاتی ئیش کردنیشدا سەرنجی دەدەیت، هەروەک جاران بەهەمان سەلیقەیی و گوڕوتینی زەمانی گەنجێتییەوە کاری گۆزە دروستکردن و گوڵدان و کووپە و کەردستەی جوان جوان دەکات.

### مێژووی کوورەچێتی لە هەولێر

ئەگەر سەرنج لە خشت و کەرپووچەکانی قەڵای هەولێر و کەردستە بیناسازییەکانی ئاسەوارە



مێژوویی و دێرینەکانی ئەو شارە بدەین، بۆمان دەردەکەوێت، کە مێژووی پیشەی کوورەچێتی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دروستبوونی شاری هەولێر، چونکە ئەو کەرەستانە قوڕی سوورکراوی کوورەچییانن.. کەواتە تەمەنی پیشەی کوورەچێتی لە هەولێر دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ بەر لەئێستا، بەڵام ئەوەی سەیرە لەم بارەیەوە، کە هەر لە کۆنەوە چەند خێزانێکی دیاری ئەم شارە سەرقاڵی ئەم پیشەیە بوون، کە دیارترینیان بنەماڵە و وەچە و بەرەبابی مام میکائیلی کوورەچی بوون، کە دەکاتە باپیری ئەم مام ئەسعەد کوورەچی حازرەی لەمەڕ خۆمان.

### کوورەچێتی چییە؟

ئەسعەد شەهاب میکائیلی کوورەچی لەدایکبووی ساڵی ١٩٣٨ی گەڕەکی تەعجیلی شاری هەولێرەو ئێستاش یەکێکە لە کوورەچییە هەرە دیارەکانی ئەم شارە، ئەم پیاوە وەک باسمان کرد لە باپیرانیانەوە بابەلباب بە پیشەی کوورەچێتی خەریکن. بۆیە سەرەتا لێمان پرسی کوورەچێتی چییەو بۆچی ئەم ناوەی لێنراوە؟ لە وەڵامدا گوتی: کوورەچێتی بریتییە لە دروستکردنی کەلوپەل و کەرەستەی ناو ماڵ و بیناسازی بە خۆڵ. بێگومان لە هەموو دنیادا مرۆڤە سەرەتاییەکانی مێژوو بەم پیشەیە ئاشنا بوون، بەڵام لە هەولێردا ئەم کارە مێژوویەکی تایبەت و کۆمەڵێ مەعناو مەغزای تایبەتی هەیە. چونکە ئاسەوارەکان مێژووی ئەم پیشەیە دەگێڕنەوە و بۆ هەر سووچ و گۆشەیەکی ئەم هەولێرە بڕۆیت جێ دەستی کوورەچییان دیارە و یاد و یادگاریان هەمیشە بە زیندوویی دەمێنێتەوە.. ئەگەر باس لە زاراوەی (کوورەچی) بکەین، ئەوە بێگومان

لەوەوە هاتووە کاتێ ئەو خۆڵەی کە کەرەستەی سەرەکی پیشەکەمانە، سەرەتا بەهێلکەک و بێژنگ دایدەبێژینەوە، پاشان بە ئاو دەیشێلین و دەیکەینە قوڕ. ئینجا ئەو قوڕە وەستای دەسترەنگین و بە توانا لەسەر دەزگایەکی تایبەت بەدەست جوانترین کەلوپەلی لێ دروست دەکات، وەک: (گولدان، شەربە، کوپە، مەرکانە، دەخیلە، دەفری ماستاو...چەندان بەرهەمی دیکە، بەڵام هەرچی خشت و کەرپووچە ئەوە بێگومان قالبی تایبەتی هەیە، دوای ئەوەی بەرهەمەکەمان دروست کرد دەخرێتە بەر هەتاو تاوەکو بەتەواوی وشک دەبێتەوە، ئینجا دەستە دەستە و تاقم تاقم دەخرێتە ناو کوورەیەکی ئاگری گەورەوە.

بێگومان جاران ئەو کوورەیە بە دار گەرم دەکرا، بەڵام ئێستا بە گاز و نەوت سوور دەکرێتەوە، دوا جار پاش ساردبوونەوەی کوورەکە یەکە یەکە بەرهەمەکان دەردەهێنرێن و بەکۆمەڵ رەوانەی بازاڕ دەکرێن. ئینجا لە بەکارهێنانی ئەو کوورەیەوە ناوی (کوورەچی) بەسەر وەستایانی ئەم پیشەیە دابڕاوە.

## گەڕەکی کوورەچییان

بێگومان لە زۆربەی هەرێم و دەڤەر و ناوچەکانی دنیا لە مێژە و تاوەکو ئێستاش لە هەندێ شوێن وا باوە، کە ئەهلی یەک بوار و یەک پیشە لە گەڕەک و کۆڵانێکی تایبەتدا کۆبنەوە، هەموو دەرو دراوسێی یەکدی بن، هەروەک چۆن لە بازاڕەکانیشدا، ئەو دوکانانەی تایبەتن بە شمەکێکی دیاریکراو لەیەک گوزەردا لە نزیک یەکدی کۆدەبنەوە، هەربۆیە لەناو هەولێریشدا زۆر لەمێژە گەڕەکێک هەبووە بەناوی گەڕەکی کوورەچییان.. مام ئەسعەد کوورەچی سەبارەت بەم گەڕەکە دەیگوت: بەڕاستی من لە سەرەتای دروستبوونی ئەم گەڕەکە ئاگادار نەبووم، بۆیە ئەمەی دەیگێڕمەوە کاتی خۆی باوکم بۆی باس کردووم. گەڕەکی کوورەچییان دەکەوێتە نزیک گەڕەکی تەعجیل. ئەویش کاتێ لەنێو بازاڕەوە لای کۆتری ئاشتی بەرەو خوار دەڕۆی بەرلەوەی بگەیتە پردی تەعجیل، کۆڵانێک هەبوو بەدەستە ڕاستدا تا دەگەیشتە مزگەوتی شێخی چۆلی ئیدی ئەو گۆشە بەرینە تێکڕا کە نزیکەی (١٠٠) ماڵێک دەبوون سەر لەبەر کوورەچی بوون، لەوان (مام میکائیل کوورەچی کە باپیرم بوو، مام جوبرائیل کوورەچی، مام سەلیم کوورەچی، سۆفی سمایل کوورەچی، مام یاسین کوورەچی) وێڕای ئەوانەش هەندێ ماڵی جووی لێ بوو، جووەکان ئەوەدەمە زۆربەیان خومچی و عەتار و دوکاندار بوون.

## کوورە کۆنەکانی هەولێر

سەبارەت بە شوێنی کوورە کۆنەکانی هەولێر مام ئەسعەدی کوورەچی دەیگوت: ئەو کات شاری هەولێر وەکو ئێستا قەرەباڵغ نەبوو. ژمارەیەکی کەم خانوو ماڵ و بینا و تەلار لە دەوری قەڵا بوون. بۆیە هەموو کوورەکانی هەولێر کەوتبوونە ئەوبەر بەستەکەی تەعجیل، ئیدی هەر لە بەیانی زووەوە تێکڕای کوورەچییان دەچوونە سەر ئیشی خۆیان بۆ سەر کوورەکان، ئەو دەمە نزیکەی (٢٠) کوورە کاری دەکرد، بێگومان ئەو کەلوپەل و کەرەستانەی



بەرهەمیان دەهێنا، بە کەر و وڵاخ بۆ ناو شار دەیانگواستەوە، بۆ ئەوەی خانوو و بینای لێ دروست بکرێ یاخود بفرۆشرێت. ئەو کات کۆمەڵە کەسانێک هەبوون، کە وڵاخیان هەبوو، تایبەت بوون بە گواستنەوەی بەرهەمی کوورەچییان بۆ ناو بازاڕ پێیان دەگوتن کرێبارچی، کرێبارچییانی ئەو کاتە ئەوەی ناویم لەیاد مابێ، بریتی بوون: لە (مام خورشید، مام خەلیل، دایی عیزەدین، مام وەلی و زۆرانی دیکە) ئەمان هەریەکەیان وڵاخێک یان چەند وڵاخێکیان هەبوو، رۆژانە بەرهەمی کوورەچییانیان دەگواستەوە، بێگومان ئەو کات هەرزانی بوو، بۆیە بەرامبەر کرێیەکی زۆر کەم ئەم کارەیان دەکرد.

### چایخانەی کوورەچییان

سەبارەت بە بەسەربردنی کاتی رۆژانە لای کوورەچییان، مام ئەسعەد کوورەچی دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کوورەچییان رۆژانە هەر لەبەیانی زووەوە، تاوەکو عەسر سەرقاڵی کارکردن دەبوون، کە عەسریان لێ بەسەر دەهات، ئیدی دەستیان لەکار هەڵدەگرت و کۆمەڵ کۆمەڵ دەهاتن بۆ ناو بازاڕ بۆ حەوانەوە.

بێگومان ئەو کات بەزۆری لە چایخانەی (مام مستەفای دەقاقچی) لە نزیک مزگەوتی بازاڕ دادەنیشتن و ئیدی تا شەوانێکی درەنگ بەدەم گاڵتە و گەپ و قسەی خۆش و سوحبەت کردنەوە ماندوویێتی رۆژیان بە با دەکرد، بۆیە بەو چایخانەیە دەگوترا (چایخانەی کوورەچییان). بەڵام زۆریش لە کوورەچییان لە چایخانەی (مام سەمەدی کوورەچی) دادەنیشتن، کە دەکاتە مامم. هەروەها کوورەچییەکان چایخانەکانی (مام شەریف کە بە شەرۆ ناسرابوو، چایخانەی حاجی عەبدوڵڵای خەیاڵ) و چەند شوێنێکی دیکەیان ئاوەدان کردبۆوە، زۆر جار لە چایخانەی حاجی عەبدوڵڵا داستانی رۆستەمی زاڵ دەخوێندرایەوە.

### بنەماڵەی کوورەچییان

ئینجا لە مام ئەسعەدی کوورەچیمان پرسی، پیشەی کوورەچێتی چۆن ئاوا بە بنەماڵەی ئێوەوە لکا؟ یەکەمین کەسی بنەماڵەکەتان کێ بووە کە دەستی بەم کارە کردووە؟

لە وەڵامدا گوتی: کوورەچێتی و بنەماڵەی ئێمە مێژوویەکی دوورو درێژیان هەیە پێکەوە، یەکەمین کەس (مام مەحموود کوورەچی) باپیرە گەورەمان دەستی داوەتە ئەم ئیشە، ئینجا (مام میکائیلی باپیرم)، دوای ئەوە (شەهاب کوورەچی بابم)، ئنجا من دەستم دایە ئیش و ئێستا منیش وا بەردەو پیری دەڕۆم، کوڕەکانم جێگەی منیان گرتۆتەوە، ئەو وەختەی بابم لە کوورەکەی نزیک بەستی تەعجیلەوە کاری دەکرد، بڕیارێک لە حکومەتەوە دەرچوو، کە دەبێ کوورەکان لەنێو شار دوورکەونەوە، چونکە وردە وردە لەو دەوروبەرەدا ماڵ و خانوو دروست دەبوو، بێگومان دوکەڵی کوورەکانیش بۆ ئەو ماڵانە باش نەبوو، بۆیە لەبیرمە کوورەکەمان گواستەوە بۆ پشت مەحەتە لای نزیک ئەلبان، کە ناوی گەڕەکی کوورانیش، کە دواتر ناوی بوو بە رزگاری هەر لەوەوە هاتووە. بێگومان سەرجەم کوورەکان هاتنە ئەوێندەر. من ئەو کات سەرەتای کارکردنم بوو لە پیشەی کوورەچێتیدا لە ساڵی (١٩٤٧- ١٩٥٦) لای مەحەتە ماینەوە، ئینجا کوورەکانمان گواستەوە بۆ قۆرێتان و تۆبزاوە و عەزەوقونیان، چونکە هەولێر تا دەهات فراوانتر دەبوو، خانوو و ماڵی زیاتر تێدا دروست دەکرا.

### سەرچاوەی گڵ

بێگومان وەک لە سەرەتاوە باسمان کرد، کە خۆڵ و گڵ کەرەستەی خاوی پیشەی کوورەچێتین، ئەی کە لە شارێکی وەکو هەولێردا رۆژانە نزیکەی (٢٠) کوورە کاری کردبێت، دەبێ خۆڵ و گڵیان لە کوێوە بۆ کاری رۆژانەیان هێنابێ؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەشدا مام ئەسعەد کوورەچی گوتی: هەر هەموو کوورەکان سوودیان لە گڵی ئەم باخچەیەی ئێستای گڵکەند وەردەگرت، بەردەوام لەوێوە گڵمان دەگواستەوە بۆ لای کوورەکان، هەربۆیە ناویشی گڵکەندە، واتە (کەندی گڵ) ئیدی هەروەک

کانەبەرد، هەریەکەمان لە شوێنێکی ئەو گلکەندەوە خۆڵ و گڵمان دەبرد بۆ دروستکردنی بەرهەمەکانمان.

**چۆن دەست بەکار بووم؟**

سەبارەت بەسەرەتای دەست بەکاربوونی خۆی لە پیشەی کوورەچێتیدا مام ئەسعەد دەیگوت: زۆر منداڵ بووم، کە هاتوچۆی کوورەکەی بابم دەکرد و بەوردی سەرنجم لە چۆنیەتی ئیشکردنیان دەدا، بۆیە خۆشەویستییەکی تایبەتم هەبوو بۆ ئەم پیشەیە، تاوەکو لە ساڵی (١٩٤٧)دا ئەو ئاواتەم هاتە دی و بوومە شاگردی باوکم لە کوورەکەی خۆماندا، ئیدی بە شاگردی مامەوە تاوەکو ساڵی (١٩٥٦) خۆم و براکانم (نافیع، عەبدولوەهاب، هاشم) بووینە وەستای کوورەچی، لە بیرمە ساڵی (١٩٥١) چوومە قوتابخانەی ئێواران و رۆژانە پاش ئیشکردن دەچوومە قوتابخانە و تاوەکو پۆلی شەشەمی سەرەتاییم خوێند، ئەو کات خوێندن بە زمانی عەرەبی بوو، تەنیا یەک وانەی کوردیمان هەبوو، ساڵی (١٩٥٨) بابم تاقەتی کارکردنی نەماو وازی لە ئیش هێنا، ئیتر لەو کاتەوە من کاری کوورەچێتی دەکەم تاوەکو ئێستاش، شایەنی باسە ساڵانی (١٩٥٤-١٩٥٦) لە شاری سلێمانی لە موشیراوە کوورەمان داناو لەگەڵ پوورزایەکی بابم بە ناوی عەبدوڵلا لە سلێمانی کاری کوورەچێتیمان دەکرد، ماوەیەکیش لە کۆیە لە نزیک حەساری حاجی ساڵحی قەساب، کوورەچی بووین، پەیوەست بوونیشمان بەم پیشەیەوە وێڕای بەڕێوەبردنی گوزەرانمان، حەزمان کردووە ئەم پیشەیە بپارێزیّ و ناوی باو و باپیرانمان کوێر نەبێتەوە، چونکە لەم حاڵەتانەدا راستە کارکردن و بەڕێوەچوونی گوزەران شتێکی پێویستە، بەڵام مانەوەی ئەم پیشەیە وەک میراتێکی رەزاسووک بۆ ئێمە لەوە گرنگترە.

**نرخی بەرهەمەکان**

مام ئەسعەد کوورەچی کە باسی لە هەرزانی ئەو کات و خۆشی و یادگارییەکانی سەردەمانی زووی دەکرد، سەری بادەداو بە توندی دەستی دەکێشا بەڕانیدا، بۆیە کاتێ باسی لە بارەی نرخەکانی ئەوکاتی بەرهەمەکانی کوورەچییان دەکرد دەیگوت: ئەو کات یەک هەزار کەرپووچمان دەکرد و بە دوو دینار دەمانفرۆشت، بەڵام ئەو کاتە دوو دینار زۆر شتی دەکرد، کێ پارەی وای دەست دەکەوت!!!.. بەڵام ئێستا هەمان ئەو کەرپووچانە هەزار دانەی بە (٣٥٠- ٤٥٠) دینارە، ئێمە تاوەکو ساڵی (١٩٥٦)یش بە کەرو وڵاغ بەرهەمەکانمان بۆ ناو شار دەگواستەوە، بەڵام لە دوای (١٩٥٦)دوە، ئۆتۆمبیلی بارهەڵگرو لۆری پەیدا بوو، بۆیە بەوانە دەمان گواستەوە، بەڵام نرخی گواستنەوەش زۆر هەرزان بوو وەکو ئێستا نەبوو، بۆ نموونە هەزار کەرپووچیان بە (١٥) پەنجایی دەگواستەوە، ئەو (١٥) پەنجاییەش (٦٠٠) فلس بۆ لۆرییەکە دەبوو، (١٥٠) فلسیش دەدرایە حەماڵەکان بۆ بارکردن و داگرتنی بارەکە.

**ئێستای کوورەچێتی**

ئەم پیشەیە ئێستا روو لەکزییە، چونکە لەچاو ئەو قسانەی مام ئەسعەد لەبارەی کوورەچێتی جارانەوە دەیگوت ئێستا ژمارەی کوورەچییان زۆر کەمە. هەروەک مام ئەسعەد دەڵێ: ئێستا (ئێمە و قەرەنی شەهاب و قەرەنی مستەفا) کوورەمان هەیە و کاری تێدا دەکەین، ئەویش لە وەرزی زستاندا بۆ ماوەی چوار مانگ لەبەر سەرماو بێ هێزی هەتاو کارناکەین و ئیش رادەگرین، بەڵام هەشت مانگەکەی دیکەی ساڵ رۆژانە کاردەکەین و نزیکەی سەد پارچە بەرهەم دەهێنین، وەلێ هەنووکە تاقەتی دروستکردنی کەرپووچمان نەماوە، بەڵکو تەنیا (گوڵدان، شەربە، مەرکانە، دەفری ماستاو، جەرەی شین و چەند بەرهەمێکی دیکە) دروست دەکەین، بەڵام لە هەمووی گرنگتر ئەوەیە، کە ئێمە بەڵێنمان داوە هەرگیز دەستبەرداری ئەم پیشەیە نەبین.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش)، ژمارە (٤) وەرگیراوە.**



# جامباز و دەڵاڵ و قەساب

محەمەد سەعید کوردە

مەیدانی ئاژەڵان، یان مەیدانی حەیوانان ئەو شوێنە دیار کراوەیە، کە هەموو سپێدەیەک لەگەڵ هەڵهاتنی خۆری بەرەبەیان سەودا و مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی تێدا دەکرێ.

لە شاری هەولێر مەیدانی حەیوانان دەکەوێتە کەسنەزان، ئیدی جامباز و قەساب و ئاژەڵدارەکان هەر لە ساڵی (١٩٨٥)ەوە مامەڵەی کڕین و فرۆشتن لەو شوێنە دیارکراوە دەکەن و بە درێژایی چوار وەرزی ساڵ بە دەیان و بە سەدان ئاژەڵی جۆراوجۆری تێدا ساغ دەکەنەوە.

## مەیدانی حەیوانان

بە پێی ئەوەی کەسانێکی زۆر کار و کاسبییان کەوتۆتە ئەو شوێنە، بۆیە ڕۆژانە مەیدانی حەیوانان جمەی دێ، جا یەکێک لەوانەی ساڵانێکی زۆرە هاموشۆی ئەو شوێنە دەکات و کار و کاسبی لەوێدایە (جەمال محەمەد عەبدوڵڵا)ی ناسراو بە (جەمال جامباز)ە، ئەو بەرێزە بە خۆشحاڵییەکی زۆرەوە زانیارییەکی چڕوپڕی لەمەڕ ئەو مەیدانە و چۆنیەتی ئیش و کارەکانیان پێشکەش کردین.

## جەرەبی حەیوان

ئەوانەی سەودا و مامەڵەی کڕین و فرۆشتنی حەیوان دەکەن ئەوە دەزانن، کە بە مێگەلێکی زۆری حەیوان دەڵێن جەرەب یان (جەلەب)، بۆیە ئەوەیان وشەیەکی کۆنە و پتر لەنێو قەساب و جامباز و دەڵاڵەکانی نێو مەیدانی حەیوانان و ئاژەڵدارانددا ناسراوە و بەکار دێت.

## جامباز و دەڵاڵ

دیارە لە مەیدانی حەیوانان جامباز و دەڵاڵەکانی حەیوان ڕۆڵێکی دیار و بەرچاویان هەیە و چۆنیەتی سەودا و مامەڵەی کڕین و فرۆشتنەکان بە پلەی یەکەم لەسەر شان و ئەستۆی ئەواندانە، بەڵام لە هەمان کاتدا جیاوازییەکی زۆریش لە ئیش و کارەکانیان بەدی دەکرێ، بۆ نموونە جامبازەکان بە درێژایی مێژوو تەنیا ئاژەڵ و حەیوانیان بە جەرەب کڕیوە یان لە شوێنێک بۆ شوێنێکی دیکە گواستووەتەوە، زۆرجاریش

ئاژەڵ و ماڵاتیان هەر لە مەیدانەکەدا دابەستووە، کەچی دەڵاڵەکان تەنیا ئاژەڵی ئەم و ئەو لە مەیدانەکەدا دەفرۆشنەوە و دەڵاڵی خۆیان وەردەگرن.

### جامبازەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ

جەمال جامباز لەبارەی جامبازەکانی دوێنێی مەیدانی حەیوانان، ئاماژەی بە ناوی چەند جامبازێکی خوالێخۆشبوو کرد، ئەوانەی ناویان هەمیشە لەسەر زاران بوو، وەک شێخان عەبدوڵڵا جامباز و عوسمان عەبدوڵڵا و زوبێر جامباز وپیرداود جامباز و فەتاح جامباز و چەندانی دیکە، بەڵام جامبازەکانی ئەمڕۆ بریتین لە: جەلال جامباز و شەریف جامباز، فەتاح عەبدوڵڵا و تۆفیق عەزیز و خەسرۆ عوسمان جامباز و عەبدوڵڵای کوڕی و هونەر ئەسکەندەر و... هتد.

### مەیدانی حەیوانان لە ڕۆژانی شەممە و دووشەممەدا

وەک لە پێشەوە ڕۆشنایمان خستە سەر مەیدانی حەیوانان هەمیشە جمەی هاتووە، بە تایبەتیش لە هەردوو ڕۆژانی شەممە و دووشەممە، هەروەها خەڵکان لە کات و ساتی قوربانی کردندا پتر ڕژاونەتە نێو مەیدانی حەیوانان بە مەبەستی کڕینی ئاژەڵ بۆ قوربانی، لەم بارەیەوەش پێیان گوتین حەیوانی قوربانی دەبێ دوو ساڵە بێ و سێ جەژنی ڕدت کردبێ، جا گرنگ نییە حەیوانەکە نێر بێ یان مێ، لەوە بەو لاوە حەیوانەکە بۆ قوربانی دەست نادات.

### فرۆشتنی حەیوان بە پێی وەرزەکانی ساڵ

دیارە لەهەر وەرزێکی ساڵدا جۆرێک لە حەیوان و ماڵات داواکاری لەسەرە، بۆ نموونە لە وەرزی زستاندا ماڵاتی گۆشتداری وەک ڕەشەوڵاغ و مەڕ و گیسک بەهەرمێنە، ئەویش بۆ دابەستی. لە هاوینیش بە هەمان شێوە ماڵاتی لاواز دەکڕێت کە ئێمە پێی دەڵێین (ماڵاتی سەرحی) بۆ ئەوەی خۆراکێکی چاکی پێ بدەین و قەڵەوی بکەین ئینجا بیفرۆشینەوە، لە بە هاریدا ماڵات دەکڕین تا تێروپڕ لەو گژوگیایە سەوزە بخوات و قەڵەو بێت، کەچی لە پایزانیش دیسانەوە حەیوان بۆ دابەستی دەکڕین.

### قەسابەکانی مەیدانی حەیوانان

هەر لە مەیدانی حەیوانان ژمارەیەکی زۆری قەساب هەن، کە حەیوان و ماڵات بۆ کڕیارەکان سەردەبڕن بە (٤٠ - ٥٠) دیناری سویسری و پێستەکەش بۆ خۆیان دەبەن، چونکە پێستی کاوڕ (٥٠) دینار دەکات، بەڵام هی ڕەشەوڵاغ کیلۆی بە (٣) دینارە.

### کۆنترین دەڵاڵی حەیوان

ئەگەر ئێمە باس لە کۆنترین دەڵاڵی کڕین و فرۆشتنی حەیوان و ماڵات بکەین، ئەوا ناوی (حاجی عەبدوڵڵا جامباز)ی ناسراو بە (حاجی حەمەدێ) لە پێشەوەی هەمووان دێ.

حاجی حەمەدێ لەدایکبووی ساڵی (١٩٢٥)ی شاری هەولێرە و لە ساڵی (١٩٨١)یش کۆچی دوایی کردووە و لە دوای خۆیشی کۆمەڵێک یادگاری بە تام و چێژی لە مەڕ کەسابەتەکەی بە جێ هێشتووە، کە ئێستاش مایەی قسە و باسکردنە.

یەکێک لەوانە زۆرجار گامێشی وایان کڕیوە شێت بووە و پەلاماری خەڵکی داوە و زامداری کردوون، ئیدی خەڵکەکە لەو سەردەمەدا شکایەتیان لێ کردووە، یان دەگێڕنەوە زۆرجار ماڵات هار بووە و بە دە زەلام بەرزەفت نەبووە، ئیدی ناچار بە گوللە لێیانداوە، نەبادا گیانی خەڵکی بخاتە مەترسییەوە.

### جامبازەکان کێ بوون

لە کۆتاییشدا کاک (جەمال جامباز) سەبارەت بە جامبازەکان گوتی: ئێمە بە ئەسڵ خەڵکی ئەو هەولێردین و بابەلباب ئەوە کار و پیشەمان بووە، بەڵام ئێمە لە دەوروبەری ساڵی پەنجا و شەستەکان جامبازی ئەسپ و ماین و هێستر بووین، چونکە ئەوساکە هۆیەکانی گواستنەوە وەکو ئێستا نەبوو، خەڵکی بە شێوەیەکی گشتی پشتی بە ئەسپ و ماین و هێستر دەبەست بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکی ڕۆژانەی خۆی لە نێوان گوند و شارەکاندا، بەڵام هەر کە ئۆتۆمبێل بە شێوەیەکی بەربڵاو پەیدا بوو ئیدی ئێمە ناچار بووین لە جامبازی ئەسپ و ئەو جۆرە شتانە بیینە جامبازی حەیوان و ماڵات.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە ١٤، ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.

# پۆلیسی هەولێر

لیوای مافپەروەر - فاروق ئیبراهیم شەریف *

پۆلیسی عێراق لە دوای رووخانی دەسەڵاتی عوسمانییەکان لە ١٩١٩ دا و داگیرکردنی عیراق لە لایەن بەریتانیاوە، سەرکردەی گشتی بەریتانیا فەرمانی تایبەتی دەرکرد کە بە (فەرمانی هەنووکەیی) ناونرا بۆ ساڵی ١٩١٩، هەروەها بەیاننامەی (٧٢)ی پۆلیس بۆ ساڵی ١٩٢٠، بە پێی ئەو بەیاننامەیە ئەرکەکانی پۆلیس جێگیر کرا و بنەمای رێکخستنی ئیداری و ئینجیباتی دانراو بەڕێوەبەرایەتی گشتی بە سەرۆکایەتی عەقید نوری سەعید دامەزراو نزیکەی سێ هەزار پۆلیسی دەگرتەوە، کە پێکهاتبوو لە پیادە و سواردو تێکەڵ، ئەمەش دوو



ئەفسەری عیراقی و ٩٢ مفەوەزی هیندی و عیراقی و ئەوانی تر بەریتانی بوون.

لە ساڵی ١٩٢٢ پۆلیسی عیراق گەشەی کردو پۆلیسی شارەکان دامەزراو ئەفسەری بۆ داندراو کەوتنە دانانی بنکەو یاریکارەکان، بەمەش بەرە بەرە پۆلیسی بەریتانی کەم دەکرددوە و عیراقی زیادی دەکرد.

لە ساڵی ١٩٣٠ بەپێی پەیماننامەیەک لەنێوان عیراق و بەریتانیا ئاسایشی ناوخۆ کەوتە دەست حکومەتی عیراق. یەکەمین دایەرەی پۆلیسی لە هەولێر بە ناوی (قشڵەی سواری) کرایەوە، ئەوەی کە پۆلیسی عوسمانی ناوی (جەندرمە) بوو، لە ساڵی ١٩١٠ دروستکرابوو، کە هەر ئەو جێگایە بارەگای حاکمی ئینگلیز بوو، کە لە هەولێر دادەنیشت و ناوی (کاپتن های) بوو. دواجار هەر ئەوْ بینایە بووە دایەرەی پۆلیسی هەولێر و بەرە بەرە پۆلیس و مفەوەز دامەزراو لە بەغدا دەورە کرایەوە و کۆلێژی پۆلیس دامەزراو قوتابیانی کوردی هەولێر چوونە ئەم کۆلێژە، بە دەرچوونی ئەم قوتابییانە لە کۆلێژی شورتە ژمارەی ئەفسەرە کوردەکان زیاد دەکات، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە بنکەی زۆر بۆ پۆلیس بکرێتەوە، بۆ نموونە:

١- بنکەی پۆلیسی سەرای لەناو بینایەی قشڵە.

٢- بنکەی پۆلیسی سواری لەناو بینایەی قشڵە.

٣- مەخفەرێک لە تەعجیل.

٤- بنکەی پۆلیسی خانەقا.







٥- بنکەی پۆلیسی شەمەندەفەر.
٦- بنکەی پۆلیسی تەیراوە.
٧- بنکەی پۆلیسی قەزا.
٨- بنکەی پۆلیسی هاتوچۆ.
٩- بنکەی پۆلیسی گومرگ
١٠- بنکەی پۆلیسی ئیسکان
١١- بنکەی پۆلیسی ئازادی
١٢- بنکەی پۆلیسی نەخۆشخانە
١٣- بنکەی پۆلیسی کوران
١٤- بنکەی پۆلیسی عەنکاوە

بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی هەولێر بریتی بوو لە هاتوچۆ و هۆبەی تایبەت، کۆچ و سنوور و گومرگ لە ئاستی بەش معاونیەتێک بوو، بەلام لە دوای فراوان بوونی بەشەکانی پۆلیسی عیراقی، بەڕێوەبەرە گشتییەکان دامەزران، وەک هاتوچۆ و، رەگەزنامە و سنوور لە بەڕێوەبەرایەتی پۆلیسی هەولێر جودابوونەوە و بەڕێوەبەرایەتی سەربەخۆیان پێکهێنا و سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی بوون.

نووسینگەی رەگەزنامە و کۆچ لە هەولێر سەر بە بەڕێوەبەرایەتی رەگەزنامە و کۆچی کەرکووک بوون، هەتا سالی ١٩٧٨، پاشان بووە بەڕێوەبەرایەتی رەگەزنامە و کۆچی هەولێر و سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی بەغدا بوون.

بەڕێوەبەرایەتی سنووری هەولێر سالی ١٩٧٤ لە بەڕێوەبەرایەتی هەولێر گواسترایەوە و سەر بە بەڕێوەبەرایەتی گشتی هۆبەی تایبەت گۆڕا بووە (امن) لە کۆتایی شەستەکان بووە بەڕێوەبەرایەتی و سەر بە (امن العامة) بووە. دواجار بوو بە بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی هەولێر.

* لە سالی ٢٠٠٩ لیوا فاروق ئیبراهیم شەریف، یەکەمین کتێبی لەسەر پۆلیسی هەولێر بەناوی (شرطة اربيل، تأسسها، تطورها، رجالها ١٩٢١-١٩٩١)، چاپکراوە.



# حەسحەس.. پاسەوانی شەوانە

پیرداود مەخمووری

زۆرن ئەوانەی شەوانی ساردو ئەنگوستە چاوی زستانانی هەولێری جارانیان لە یادەو بۆ نەوەکانی دوای خۆیان وەک سەربردە ناوی ئەو کەڵەمێردانەیان بۆ دەگێڕنەوە، کە رۆژێک لە رۆژان خشتێکیان لەسەر بناغەی رەسەنایەتی و مێژووی سەردەمانێکی زوو داناوەو نازناویان پێوە دەرکردووە.

تووڕتووڕە و فیتەفیتی پاسەوانی شەو (حەسحەس) تێکەڵ بە تاریکستانی ئەو شوێنە دوورانەی ئەو سەردەم و کۆڵانە تەنگە بەردکانی گەڕەکە سامدارەکان و کەندو پەنادیواری داڕووخاوی ئەو دەمە بوون.

ئەو فیتەیەی کە لای هەندێ کەس دڵخۆشکەری و دڵنەوایی بووەو لەلای هەندێکیش زەندەق چوون و تۆقێنەر بووە، لەو کاتەی کە هەولێر لە چەند گەڕەکێک تێپەڕی نەدەکرد، کاتێ کە مرۆڤ بە کۆڵانەکانی (تەعجیل و جوولەکان و خانەقاو تۆپخانەو بەرتەکیە)و شوێنەکانی دیکە تێدەپەری، ئەوا تووڕتووڕەی (حەسحەس) دڵنەوایی و متمانەی پێدەبەخشی و سەلامەتی چوون و هاتنەوەی مسۆگەر دەکرد، بە پێچەوانەوەش ئەو کەسانەی، کە نیازی خراپەکارییان هەبووە بۆیان تۆقێنەر بووەو کۆڵانەکانی (قەیسەری لێ کردوونەتە کونە مشک).

لە سەرەتای سالانی سییەکان بەدواوە تا دەگاتە سەرەتای پەنجاکانیش ئەو کاتەی کە خوالێخۆشبوو (ئەحمەد چەلەبی) ئامێری (کارەبا)ی هێنایە هەولێر، ئەو کەسەی شەقام و کۆڵانەکانی قەیسەری و گەڕەکەکانی دیکەی جارانی هەولێری بە فانۆسە کز داگیرساوەکانی لە یاد مابێت، ئەوا حەتمەن (حەسحەس) و تووڕتووڕەکەی وەبیردێتەوە، بە تایبەتی ئەو کەسانەی کە بۆ شەوچەرەو شەقبێری هاتوچۆی ماڵە خزم و دراوسێ و چایخانەکانی ئەو سەردەمانەیان دەکرد، کە لەزۆربەشیان حەکایەتخوان هەبووەو هەقایەت و بەیت دەگێڕدرایەوە تاکو دوو بەترێکی شەو بەسەر دەچوو یاللا بەیت و بالۆرەکەی تەواو دەبوو، گەلێ جاریش بۆ چەند شەوێک بەیت خوێن بە ئەڵقە دەیگێڕایەوە، یان ئەو رێبوارانەی کە لە دوورەوە هاتبوون و دەرفەتی گەڕانەوەیان نەبووە بۆ شوێنەکانیان، ناچار لە یەکێک لە خانەکانی بازێڕ دەمانەوەو بۆ شەو بەسەر بردن، یاخود ئەوانەی مەلابانگدانان بۆ نوێژی بەیانی روویان لە مزگەوتەکان دەکرد، هەندێکیشیان بۆسەر کار دەچوون، ئەو کاتەی فانۆسەکان لەدەرکی کۆڵانەکان هەڵواسرابوون و کز کز دەسووتان و هەندێکیشیان نەفتیان تێدا نەدەماوترووسکەیان لەبەر برابوو، ئەو کاتە فیتەی فیتی (حەسحەس)، کە لێدەدرا دڵنەوایی بە خەڵکی دەبەخشی.

(ئەو کاتانەی کە منداڵ بووین) و بەزۆری ئەو شەوانەی کە بەیت خوێن هەقایەتی دێو و ئەجندەو لەمەچێترو مێردەزمۆکەیان بۆ دەگێڕاینەوە نەدەوێراین بگەڕێینەوە ماڵەکانمان،

نەخاسمە ئەوانەی ماڵیان لە لاتەریکی شاربوو و کەوتبوونە پەرگەی گەڕەکەکان.

ئەو شەوانەی ئۆقرەمان لێ هەڵدەگیرا و تەنانەت بۆ کاری پێویستیش نەدەوێراین سەر بەهەندێ حەوش و کۆڵانە تاریکەکاندا بکەین و هەزارو یەک دوعامان دەکرد تا دەرباز دەبووین و بە سەلامەتی دەگەڕاینەوە ماڵەکانمان.

لەو دەمەیدا کە چاومان بە (حەسحەس) دەکەوت، یاخود هەر لە دوورەوە گوێمان لە دەنگی فیتە فیتەکەی دەبوو، گەلێ جاریش دەنگی دەدایەن، فەرامۆشییەک بەدڵماندا دا دەهات و جۆرە غیرەتێکی دیکەمان دەهاتە بەرو لەوە دڵنیا دەبووین کە ئیدی دێو و ئەجندەو لەمە چێتر و ئەو شێتانەی ئەوکاتی ناتوانن بێنە کۆڵانەکان و دەستمان لێ ناوەشێنن.

(حەسحەس) هەر ئەوە نەبووە، کە دڵخۆشکەر بێت بۆ منداڵان، بەڵکو سەرو ماڵی خەڵکیش لە ئەمانەت دابوو.

(حەسحەس) لەگەڵ یەکەم دەست بەکاربوونیدا تا ئەو کاتانەی ئەرکەکانیان کۆتایی پێ دەهات، سەریان بەهەموو کەلێن و قوژبنێکی بازێڕ و قەیسەری و کۆڵانەکاندا دەکرد.

زۆر جاری وابووە، کە خاوەن دوکانێک یا چایخانەیێک دەرگای بە (قوفڵ) یان بە قایی دانەخستبوو، ئەوا بۆ (حەسحەس) کێشەیەکی گەورەبوو، یا ئەوەتە تاکو بەیانی دەبوایە بەدیارییەوە ئێشک بگرێت ئەگەر شارەزای ماڵی خاوەنەکەی نەبوایە، بەزۆریش هەموو خاوەن دوکانەکان و شوێنەکانی دیکە ناسراو بوون و ئاگادار دەکرانەوە.

کە شەویش کشومات دەبوو، کەس بە کۆڵانەکاندا هاتوچۆی نەدەکرد، جوولە نەدەما، بۆ نەختێک حەسانەوە چەرخەچی (حەسحەس) لەسەر تەختێک لە تەختەکانی قاوەخانەیەک دادەنیشت و ئاوی دەخواردەوە. وەنەبێ لە کاتی حەسانەوەدا (حەسحەس) وازی لە ئەرک بەجێگەیاندن هێنابا، هەر بەین نا بەینێک تووڕتووڕەکەی لە باخەڵی دەردەهێنا ئەوەندی توانای هەبوو دوو سێ جار لەسەریەک لێی دەداو تەمام خەبەری دەدا، ئەو (حەسحەسە)ی کە لە گەڕەکێک یان کۆڵانێکی دیکە ئێشکگر بووایە هەر دوای ئەو دەستی دەکرد بە فیتە لێدان وەک وەڵامدانەوەیێک ئاگاداری یەکتریان دەکردەوە.

ئەگەر کەسێک هاتوچۆی بکردبایە و (حەسحەس) پێ بحەسیایە ئەوە دەنگی دەداو تاقیقاتی لەگەڵدا دەکرد، کابراش بە دروستی وەڵامی دەدایەوە.

مامۆستا (تاهیر ئەحمەد حەوێزی) لە مێژووی کۆیە بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، باسی (حەسحەس) دەکات، کە تاکو ساڵەکانی شەستەکانیش لە کۆیەدا هەر مابوو..

بەڵام زۆر بە کورتی باسی کردووە و ناوی کەسیشی نەهێناوە، کە لە کۆیە (حەسحەس) بوون، لە پەنجاکان هەبوون و کابرایەک بە ناوی (عوسمانە کەچەڵ) سەرۆکی (حەسحەسەکان) بوو.

لە گۆڤاری (التراث الشعبي) ژمارەی (٦) ساڵی یازدەهەم بابەتێک بلاوکراوەتەوە (حەسحەس) بە (عەسعەس) دەنووسێت، ئێمەش لە دیمانەیەکدا لەگەڵ بەرێز مامۆستا (سەید مەولود بێخاڵی) دا ئەوەمان لێ پرسی ئەویش جەختی لەسەر ئەوە کردەوە، کە وشەکە (حەسحەس)ە نەک (عەسعەس).

حەسحەس، وەکو پیشە لە سەردەمی ( عەبباسیە )کانیشدا هەبووە، بەڵام لەبەر ئەوەی بابەتەکەی ئێمە تەنها باس لە سەدەیەک لە هەولێر دەکات، بۆیە پێویست بە سەرجەلەی (حەسحەس) ناکات کە کەی پەیدا بووە.

**حەسحەس کێیە؟**

حەسحەس ئەو کەسەیە کە ئەرکی پاراستن و پاسەوانی کردنە لە سەر و موڵک و ماڵ و ژیان و سامانی هاووڵاتیان وەک مەئمورێکی دەوڵەت، بە شەو کاری دەکرد و شوێنی تایبەتیش هەبووە بۆ ئەنجامدانی کارەکانی، بەرۆژ پاسەوانی نەدەکردو هیچ فەرمانێکی میری پێ نەدەسپێردرا.

حەسحەس پۆلیسی رەسمی نەبووە تا پلەو دەرەجەدار بێ، بەشێوەیەکی کاتی کاری دەکردو هەر دەمێک

پێویستییان بەخزمەتی نەمابوایە یان لە خزمەتدا کەمتەرخەمی بکردایە، ئەوا زۆر بە ئاسانی دەستبەرداری دەبوون، بۆیە هیچ مافێکی نەبووە.

سەر بە شارەوانی هەولێر بوون لە مووچە وەرگرتن و خزمەتدا، بەلام لە ئەرک و فەرماندا مامڵەتیان لەگەڵ پۆلیس بەرەسمی یاسای تەقاویتی (خانەنشینی) گرتیانیەوە.

حەسحەس ریزو پلەو پایەیەکی کۆمەلایەتی و وەزیفی بەرزی هەبووە.

**حەسحەس و ئەرک و ماف**

* حەسحەس جلوبەرگی کوردەواری خۆمانی لەبەردا بوو، بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکی دیکە جیاوازییان هەبوایە لە کاتی بەجێگەیاندنی ئەرکی (صدریە)ی سەربازییان بۆ تەرخان کرابوو، ئەستێرەی (پۆلیس)یان لە جەمەدانییەکانیان گرێ دەدا.

* حەسحەس لە دوو بنکە (مەخفەر) دەوامیان دەکردو هەر (مەخفەر)دو تایبەت بوو بە پاراستنی چەند شوێنێک و کۆلانێکی دیاریکراو، بەم شێوەیە:

أ- بنکەی (مەخفەری) یەکەم لە گەڕەکی (جوولەکان) بوو بەرامبەر چایخانەی (خدری) ئەو کات، کە ئێستا شوێنەکەی دەکاتە گۆڕەپانی ئاشتی (کۆتری سەلام)ی ئێستا.

ب- مەخفەری (تەعجیل) کە (قوللغ)ی پێ دەگوترا لە گەڕەکی عارەبان بەرامبەر (باتا)ی نزیک (بانکی خانزاد) لەم دوو مەخفەرە (حەسحەس) بە شەوان دەوامیان دەکردو ئەرکیان پێ دەسپێردرا.

* ئەو چەک و تفەنگانەی کە (حەسحەس) بەکاریان دەهێنا بەزۆری زەمانە بوون وەک:

(سێتیر، جامبێزار، کچک چاپ، حوسکە، ئینگلیزی)

لە سێ تا چوار (پاکەت) فیشەک زیاتری نەبوو، بە هۆی خەریتەیێکی وەک (حەمایل) راست و چۆپ لە ملی خۆی دەکردو فیشەکەکانی دەخستە ناو فیشەکدانەکە.

* دوو (شەفت) دەوامیان دەکرد، شەفتی یەکەم لە ئێوارەوە پاش مەلای مەغریب تاکو نیوەی شەو، شەفتی دووەم لە نیوەی شەورا هەتا رۆژهەلات، (حەسحەس)ی شەفتی دووەم پێی دەگوترا (دوومان)، لە کاتی ئەرک لە یەکتر وەرگرتندا پێویست بوو (حەسحەس)ی یەکەم تەواو خەبەری بە (حەسحەس)ی دووەم بدابوایە.

* حەسحەس مووچەی لە شارەوانی وەردەگرت، شەوی بە (٤٠- ٤٥) فلوس بوو، کە مانگانە دەیکردە (١٣٥٠) فلس.

* فیتەو قەیتان: هەر (حەسحەس)ێک پێویست بوو فیتە و قەیتانی تایبەتی خۆی هەبێت، لە شانی راستەی گرێ دەداو لە بەرکی (صدریە)کەی هەڵی دەگرت.

**حەسحەس، چیرۆک و بەسەرهات**

ئەو کەسانەی کە بە زۆری (حەسحەس) بوون ئەم زاتە خوالێخۆشبووانە بوون: (حەسەن کانەبی، مام بەکر چاوەش، مام شاباز، مام عەساف موختار، مام خالید حەمەد).

شێخۆ قادر بەحری سەرۆک پاسەوان بوو پێی دەگوترا سەرۆکی چاودێران (رئیس المراقبین) لە سالی ١٩٥٧ کۆچی دوایی کردووە.

پاراستنی سەرو مالی خەلک و شەونخوونیکردن و گەڕان و چەرخەلە کردن بە دەوری مالان و شوێنە بازرگانییەکان ئەرکی ئەو پیاوە بە جەرگ و دلسۆزانە بووە.

مام (یونس ئیبراهیم) بە ئەسڵ خەڵکی قۆریتانە لە دایکبووی (١٩١٢)ە یە، ئێستاش لە ژیاندا ماوەو زۆریش زەینی روونە، گەلێک زۆر لە سەربردەو بەسەرهاتەکان دەزانێت و بە چاوی خۆی دیویەتی بۆی گێرامەوە و گوتی:

"لە دەوروبەری سالانی چلەکان بەسەردەو بوو، لە یەکێک لە کۆلانە هەرە تاریکەکانی (عارەبان)، کە ئێستا شوێنەکەی دەکاتە کۆلانی بەرامبەر (کۆمەلەی هونەرە جوانەکانی کورد لقی هەولێر) لە کاولە خانوویێکی نزیک (تەکیەی شێخ عارف) بە قسەی زۆر کەس، کە گوایە کاولە خانوویێک مالی ئەجندانەو پیاوچاکی لێیە، بەشەو زۆر کەرەتان ئاگری (کەسکی) لێ دیتراوەو وەک دەلێن (نووری) لێ هەلدەستێت، شەوێکی ساردی ئەنگوستە چاو لەو کاتەی کە (حەسەن کانەبی) حەسحەس نۆرەی

دەبێ ئەجندەکان ڕێگای لێ دەگرن، (حەسحەس)ەکەش بێ ئەوەی بشڵەژێ و کاری تێبکەن لە جێگای خۆی دەوەستێت و تووڕتوورەکەی دەردێنێت و فیتەیێکی بە توندی لێ دەداو ئەوانیش (جەرتێکی) بۆ دەکێشن و گاڵتەی پێ دەکەن، دیسان (حەسەن کانەبی) لێیان ناترسێ و چەرخی ئاگر دەردێنێ و دوو سێ جار بەرامبەریان دایدەگیرسێنێ و دەیکوژێنێتەوە. ئەجندەکان کە هەست دەکەن (حەسەن کانەبی) خەریکی ئاگر کردنەوەیە دیارە ئەوانیش لە ئاگر دەترسن و هەڵدێن و خۆ دەشارنەوە، ئەم هەواڵە بەناو عامی هەولێر بڵاو دەبێتەوە، ئیدی هەر بابا بوو شقارتەیێکی مۆمی کڕی و لە کۆڵانەکاندا هاتوچۆیان دەکرد، لە کاتی پێویست لە شوێنی تاریک سەرو (لکیان) لێ دادەگیرساند، ئەم ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی، کە خەڵکی زیاتر متمانە بە (حەسحەس) بکات و لەکاتی تەنگانەدا هانایان بۆ بردووە، دیارە هەقایەتی ڕۆستەم لەو سەردەمیدا باو بووە، بەڵام خەڵکی دەیانگوت: حەسحەس لە ڕۆستەمیش ناترسێت.

**پاسەوان و نۆبەتدار**

حەسحەس ئەگەرچی لە دامەزراندندا لە شارەوانی دادەمەزرا، بەڵام ڕێکخستنی ئەرکەکانی لە لایەن پۆلیسەوە دەکرا، ئەوە بوو ئەنجومەنی وەزیرانی ساڵی ١٩٥٣ بە پێی ماددەی (٢٣) بڕیاری دا، کە خزمەتی حەسحەس بخرێتە سەر حزمەتی مەدەنی و ئەو مووچە و دەرماڵانەی، کە بۆی تەرخان کرابوو خرایە سەر میزانییەی بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس.

**ئەنجامدانی ئەرک**

چەند یاسایێک هەبوو پێویست بوو، کە (حەسحەس) پێڕەویان بکات، لەوانە:

(حەسحەس)ی یەکەم کە ئەرکی سەر لە ئێواران بوو لە (قوللغ) لای (قۆمیسەر) یان (مەئموری قوللغ) چەکی وەردەگرت و پێداویستییەکانی دیکە دەدران بە حەسحەسی دوومان و تەمام خەبەر دەکرا، (حەسحەسی)ی دووەم لە کاتی تەواوبوونی ئەرکەکانی پێویست بوو چەک و کەلوپەل و فیشەکەکان بگەڕێنێتەوە بۆ (قوللغ) بە (تەمام ئەفەندم) بیداتەوە قۆمیسەرەکەو هەر زانیارییەک هەبوایە بە قۆمیسەر رادەگەیەندرا.

ئەوەی کە پێویستە ڕوونی بکەینەوە ئەوەیە جیاوازی نێوان (حەسحەس) و (نۆبەتدار) چییە؟

هەرچی حەسحەسە، ئەوا لە لێکۆڵینەوەکەماندا باسمان کرد، نۆبەتدار: ئەو کەسەیە کە نۆبەت و پاسەوانی لە کەسێک یان شتێک بگرێت، پاسەوان لە زۆر گوندو باژێرو لای پیاوە دەست ڕۆیشتووەکان هەبووە، ئەخاسمە ئاغای گوندەکان، کە هەر یەکەو چەند نۆبەتدارێکی تایبەتی خۆیان هەبووە.

سەرچاوەکان:

١- هەولێرم وا دیوە (سەید مەولود بێخاڵی) بەرگی یەکەم لەگەڵ دانیشتنێک لە ڕێکەوتی ١٩٩٧/١/٢

٢- گۆڤاری هەولێر، بە بۆنەی سەد ساڵەی دامەزراندنی شارەوانی هەولێر، ژمارەی تایبەت.

٣- گۆڤاری (التراث الشعبی) ژمارە (٦) ساڵی یازدەهەم.

٤- مێژووی کۆیە: تاهیر ئەحمەد حەویزی، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم ل١٧٣.

٥- دانیشتنێک لەگەڵ بەڕێز (سەید ئیسماعیل) تەمەن (٧٥) ساڵە دانیشتووی خانەقایە (ماوە).

٦- دانیشتنێک لەگەڵ بەڕێز (مام یونس ئیبراهیم) لەدایکبووی (١٩١٢)یە ئێستاش لە ژیاندا ماوە.

٧- دانیشتنێک لەگەڵ بەڕێز (حاجی ئەحمەد شەوقی کەبابچی) تەمەنی (٧٠) ساڵە خەڵکی هەولێرە.

* حەسحەس لە (عەسعەس)ەوە هاتووە، چونکە بەپێی تەفسیری ئەلجەلالین لاپەڕە ٧٨٦ ئەم وشەیە عەرەبییە، بۆ نموونە خوای گەورە لە سورەتی (ئەلتەکویر)دا دەفەرموێ: (واللیل اذا عسعس)واتە (اقبل اللیل بظلامە او ادبر).

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (١)، زستانی (١٩٩٨) بڵاوبۆتەوە.



# هاتوچۆ لە شاری هەولێر

فاتیح یاسین مودەریس

**سەرەتا**

لەگەڵ سەرهەڵدانی تەکنەلۆژیای سەردەم بەشێوە جیا جیاکانییەوە، بۆ هەر بەشەو یاسایەکی تایبەت بەمەبەستی جێبەجێکردن هاتۆتە کایەوە. سەرهەڵدانی ئۆتۆمبێلیش یاسایەکی تایبەتی بۆ داهێنراوە، کەوا پێویستە ئەم یاسایە لەسەر ئاستی جیهان پەیرەو بکرێت، بۆ نموونە هێماکانی هاتوچۆ کە هەر هەموویان ئاستێکی نێودەوڵەتی بەخۆوە گرتووە.

شاری هەولێریش کە یەکێکە لەشارە دێرینەکان بێبەش نەبووەو ئەو تەکنەلۆژیاو یاسا نێودەوڵەتییەی گەیشتۆتێ. یەکەم دەزگای هاتوچۆ لەهەولێر بەناوی (معاونیة المرور والنقلیات) لەشاری هەولێر دامەزرا. تەواوی رێنماییەکانی هاتوچۆ و هێماکانی لەرێگەی ئەم فەرمانگەیەوە لەشوفێران و خەڵک دەگەیێندران.

جا بەهۆی کەمی ژمارەی ئۆتۆمبێل لەو شارە، هەڵبەتە ژمارەی کارمەندانی پۆلیسی هاتوچۆش کەم بووە تا ساڵی ١٩٧٥ تەواوی کارمەندانی ئەو شارە گەیشتۆتە (٣٦) کارمەند بەئەفسەرو پلەکانی خوارووتری کارمەندان. سەرەتا لەساڵی ١٩٧٤ باڵەخانەکەی لەگەڕەکی ئیسکان بووە. لەدوای ساڵی ١٩٧٤ بۆ خانوویێک نێوان چایخانەی بایزو حاجی حوسێن لەگەڕەکی عارەبان گوێزراوەتەوە. لەساڵی ١٩٨١ بۆ شوێنی ئێستای لەسەر رێگای کەرکوک گوێزرایەوە.

تا ساڵی ١٩٧٥ ژمارەی ئۆتۆمبێل (١٠٠٠) دراوە بەئۆتۆمبێلێکی جۆری (لادا) تایبەت.

بەڵام دوا بەدوای ئەو ساڵە شار بەرفراوان بووەو رۆژ بەرۆژیش ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان زێدەیکرد. ئەمەش خۆی لەخۆیدا وایکرد کە فەرمانگەکە بەرفراوان بکرێت. بۆیە لەهەفتاکان بەرێوەبەرایەتی هاتوچۆ لەپارێزگاکانی عێراق دامەزراو هەولێریش بوو بەیەکێ لەو بەرێوەبەرایەتییانە. بۆیە دوای ئەوە یاسای هاتوچۆی ژمارە ٤٨ی ساڵی ١٩٧١ هەموارکرا.

لەمادەی (٣٧)ی ئەم یاسایە هاتووە بەم شێوەیە:

(یصدر مدیر المرور العام بیانات وفق احکام هذا القانون من الامور التالیة:

١- أ-تعین جهة المرور في الطرق العامة وتحدید سرعة المرکبات.

ب- تعین ابعاد اجازة التسجیل ولونها ومحتویاتها ومحل تعلیقها.

ج- تطبیق احکام الاتفاقیات الدولیة المتعلقة بالمرور علامات المرور في الطرق العامة المنظمة او التي تظم الیها جمهوریة العراق.

د- کیفیة اختیار طالبا اجازة السوق والمعلومات التي تجري اخباره فیها.

٢- یجوز لمدیر المرور العام او من یخوله اصدار البیانات لغرض تنظیم المرور وفق احکام هذا القانون.

شایانی ئاماژە پێکردنە ساڵانە لەمانگی یانزە بۆنەیەکی هاتوچۆ ساز دەکرێت بەناوی (هەفتەی هاتوچۆ). لەم ڕۆژەدا بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆ خۆی ئامادە دەکات بەسازکردنی فیستیڤاڵێکی قەشەنگ و بەنێو شەقامەکانی شار تا دەگەیشتە نزیک وەزارەتی ناوخۆ. لەم ڕۆژەدا مۆسیقای تایبەت لێدەدرێت و هەموویان جل و بەرگی تایبەت بەخۆیان و پلەکانیان دەپۆشن. دیارە لەم ڕۆژەدا ئەو شوفێرانە ڕێزیان لێنراوە کە سەرپێچییان نەبووە. جا بەهۆی زۆربوونی شوفێرو ژمارەی ئۆتۆمبێل و خەڵک ڕێنمایی زیاتر لە بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆ دەرکراون و ئێستا بەشی ڕاگەیاندن بە بەشداریکردن لە بەرنامەی تایبەت بەهاتوچۆ ڕۆڵێکی کارا دەبینن لەڕێنماییکردنی خەڵک بەقوتابی و خەڵکی دیکەو شوفێران. ئێستا تامانگی ئازاری ساڵی ٢٠٠٧ ژمارەی کارمەندان بەڕێژەیەکی گەلێ زۆر زیادی کردووە و گەیشتۆتە (١٢١٥) کارمەند بەئەفسەرو پلە جیا جیاکان.

جێی ئاماژە پێدانە لە ١٩٩١/٣/١١ فەرمانگەی هاتوچۆی هەولێر لەکاتی ڕاپەڕینە شکۆدارەکە بەر شاڵاوی سووتان بۆوەو هەرچی لە دۆسیەو فۆرم هەبووە هەمووی سووتا.

#### مۆڵەتی تایبەت (خصوصي)

هەڵبەتە پێش رووخانی ڕژێم، واتە بەر لەڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ مەرجەکانی دەرکردنی مۆڵەتی شوفێری تایبەت بەم شێوەیە بووە:

١- خوێندەواری.

٢- تەمەنی لە ١٨ ساڵ کەمتر نەبێ.

٣- پشتگیرییەک لەیەکەکانی سەربازی، کە بەردەوامە لەڕاژەی سەربازیدا.

٤- سەبارەت بەقوتابی هێنانی پشتگیرییەک کە بەردەوامە لەدرێژەدان بەخوێندن.

٥- خەڵکی شاری هەولێر بوایە.

داواکار بەپێی ئەو مەرجانەی تێیدا بووە، فۆرمی پێدراوە. لەدوای فۆرمی تایبەت بەو مۆڵەتە کە ڕەنگەکەی (سەوزە) بەم شێوەیە کارەکانی ئەنجام دەدات:

١-پشکنینی چاو- کە لیژنەیەک پێکهاتووە لە فەرمانگەی تەندروستی هەولێر بەهەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی هەولێر.

٢- تاقیکردنەوەی هێماکانی



هاتوچۆ، كە پرسیارو وەڵامەكان نووسراونەتەوەو بۆ هەر پرسێك سێ وەڵام داندراوەو وەڵامەدەر وەڵامی ڕاست هەڵدەبژێرێت بەم شێوەیە (ڕاست).

٣- لەپێش سالّی ١٩٨٣ تاقیكردنەوەی میكانیك بەزارەكی بوو. ئەفسەرێك لەگەڵ موفەوەزێك لەسەر ئۆتۆمبێلێك دەوەستان و بۆنیتی ئۆتۆمبێلەكەیان بەرز دەكردەوەو پرسیاریان ئاراستە دەكرد. گەر دەرنەچووبووایە (٣) ڕۆژ دوا دەخرا.

٤- ترا (ڕەمپە)- هەر وەكو ئەو ڕەمپەی ئێستاكەیەو لە پیتی (L)ی ئینگلیزی دەچێت، كە بەڕێوەبەری هاتوچۆی هەولێر خودی خۆی سەرپەرشتی تاقیكردنەوەكەی دەكرد. جا گەر دواخرا بووایە، ئەوا بۆ ماوەی (٣) ڕۆژ دوا دەخرا.

٥- تاقیكردنەوەی دەرەوە واتە بازاڕ هەبووە، كە ئەوسا بەپلەی مفەوەزی هاتوچۆ لەگەڵ شوفێرەكە سوار دەبوو تاقیكردنەوەكەی ئەنجام دەدا. لەمەش دەرنەچوون هەبووەو دوا خراوە.

بەڵام لەپاش ڕاپەڕین فۆرمەكە بەهەمان ڕەنگ مایەوەو تەنیا زانیارییەكان لەزمانی عەرەبییەوە كران بەزمانی كوردی.

تا سالّی ٢٠٠٠ بەهەمان شێوەی پێشتر باسكرا تاقیكردنەوەكان ئەنجام دەدران تا مۆڵەتەكە وەردەگیرا.

لەدوای ئەوە ژمارە (٨)ی ئینگلیزی پەیدا بوو، كە دەبوا شوفێر لەناو هەشتەكە سوار بوایەوە پاشان بە بەگیش گەڕابایەوە. لەمەش دواخران هەیە گەر دەرنەچووبووایە.

بەڵام پاشان بەگ لەژمارە (٨) نەما. بەپێی ئەو زانیاریانەی دەستكەوت ڕۆژانە (٢٢-٢٦) مۆڵەتی (تایبەت) دەردەكرا.

شایانی باسە جاران مۆڵەت دەفتەر بووە، واتە لەچەند پەڕێك پێكهاتبوو.

لە بەرگی یەكەم:
مديرية المرور العامة
اجازة سوق مركبة (خصوصية)
رقم/

كارتی دەفتەرەكە دەكرایەوە لەدیوی بەرگەكە ئەم زانیاریانەی تێدا بوو.
اسم صاحب الاجازة/
محل اقامته/
تاريخ ومحل الولادة/
جنسية/

لەلاپەڕەكانی دیكەی دەفتەرەكەدا لەم چەند زانیارییە پێكهاتووەو هەر چەند زانیارییەكیش چەند لاپەڕەیەكی لەخۆ گرتبوو:
تجديد الاجازة
المخالفات
احكام قانون
ارشادات عامة

جاران پوولێكی (١٠) دیناری چاپی سویسری لێدەدرا.

**تێبینی:**

تا سالّی ١٩٩٠ (٤٣٣٦٨) مۆڵەتی تایبەت لەبەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی هەولێر بەخەڵك دراوە.

شایانی باسە ئەرمەنییەكان هەر لەزووەوە یەكەم كەس بوون كە خاوەنی مۆڵەتی شوفێری بن و لەئۆتۆمبێل بزانن.

بەڵام ئێستا مۆڵەتەكە لەدەفتەر بچووك بۆتەوە و ڕەنگەكەی سەوزە. ئەم زانیاریانەی بەزمانی عەرەبی لەسەر دیاری كراوە:

دیوی یەكەم- وێنەی مۆڵەت
دیوی دووەم: وێنەی مۆڵەت

ئێستا بڕی (٨٧٠٠) دینار وەردەگیرێت لەبەرامبەر مۆڵەتەكە وەك رسومات.

**ڕوونكردنەوەیەك:**

سەبارەت ئەوانەی خەڵكی شاری هەولێر نین و لە هەولێر بیانەوێت مۆڵەت دەربكەن ئەم پێداویستیانەیان لێ داوا دەكرێت:

١- پشتگیری فەرمانگە كە لە فەرمانگەكە بەردەوامە لەدەوامكردن.

٢- پشتگیری لە قوتابییان وەردەگیرێت.

٣- پشتگیری نیشتەجێ و مۆری موختارو مۆری بنكەی پۆلیسی ناوچەكە لەگەڵ ئیمزاكردنی دوو شایەت.

ئینجا مافی ئەوەیان دەبێت دەست بكەن بەدەرهێنانی مۆڵەتی تایبەت.

بۆ كردنەوەی فایلێكیش ئەم

پێداویستییانە داوا دەکرێن:
١- گەر داوای نوێکردنەوە بکەن دەبێت ناسنامەی شارستانیء رەگەزنامە نوێ بکرێنەوە.
٢- فۆتۆکۆپی ناسنامەی شارستانی.
٣- فۆتۆکۆپی رەگەزنامە.
٤- پشتگیری نیشتەجێ بەمۆری موختارو مۆری بنکەی پۆلیس و ئیمزاکردنی دوو شایەت.
٥- دوو وێنەی رەنگاو رەنگ.
٦- سەبارەت بەوانەی تەمەنیان لەنێوان ١٨-٢٠ ساڵە داوای "سورەت قەید"یان لێ دەکرێت بۆ دروستی ساڵی لەدایکبوون و تەمەنیان.

**مۆڵەتی گشتی (عمومي)**

بەر لەراپەرینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ سەرەتا لەو کەسانەی داوای مۆڵەتی (گشتی)یان کردبا وەک مەرج دەبوایە:
١- تەمەنی ٢٠ ساڵی تەواو کردبا بەرۆژو مانگ و ساڵ.
٢- خوێندەواری.
٣- خەڵکی شاری هەولێر بوایە.
٤- پشتگیری سەبارەت ئەو کەسانەی سەرباز بوون لە یەکە سەربازییەکانیان.
٥- پشتگیری سەبارەت بەقوتابیان کە لەقۆناغە جیاجیاکانی خوێندن بوون، کە بەردەوامن لەسەر خوێندن.

ئینجا فۆرمێکی رەنگی (سوور)ی وەردەگرت و دەبوا کە لەلایەن ئەفسەری مۆڵەتدان بەشی (گشتی) مۆری لێدەدرا:
١- پشتگیری چاو.. کە لە فەرمانگەی تەندروستی هەولێر پێکدەهێندرا بەهەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی هەولێر.
٢- رەمپە- هەروەک ئەو رەمپەیەی ئێستاکە لەگەڵ پیتی (L)ی ئینگلیزی کە لیژنەیەک پێکدەهێندرا بەسەرۆکایەتی بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی هەولێر و بەڕێوەبەر، خۆی سەرپەرشتی تاقیکردنەوەکەی دەکرد.
٣- کرداری (عەمەلی) کە ئەمەش موفەوەزی هاتوچۆی ئەقدەم لەگەڵ بەرادێک تاقیکردنەوەکەیان ئەنجام دەداو ئۆتۆمبێلێکیان رادەگرت و بۆنیتەکەیان هەڵدەگرت و پرسیاری جۆراو جۆر لەداواکارەکە دەکرا. گەر دەرنەچووبا ئەوە بۆ ماوەی (٣) رۆژ دوا دەخرا.
٤- هێماکان- لیژنەیەک بەپلەی ئەفسەر تاقیکردنەوەی ئەنجام دەدا.
٥- ترای بازار - لەپاش ساڵی ١٩٨٤ پەیدا بوو پێشتر نەبووە.
٦- خول - کە بەرگێکی مۆریان لەبەر دەکردو شوفێریان لەقوڵ هەڵدەکێشان.

**تێبینی:**

گەر داواکار بۆ ماوەی دوو رۆژ بەبێ هۆ بەشداری لە خولەکە نەکردبایە و بە نەهاتوو لەقەڵەم درابایە، ئەوا لەرۆژی سێیەم دوا دەخراو بۆ دەستەیەکی دیکە خولەکە (٧) رۆژ بوو. ئەوسا (٤٠-٥٠) کەس بەشداری لەو خولە دەکرد.
٧- پەیوەندیکردن بەسەندیکای کرێکاران بەمەبەستی ئەندام بوونیان وەرگرتنی ناسنامەی ئەندامیەتی لەسەندیکا.

بەڵام لەپاش راپەرین بۆ ماوەیەک خولی سەر شەقام نەماو هەڵگیرا. لەپاش ساڵی ٢٠٠٠ بۆ جارێکی دیکە خولەکە کرایەوە.

جا سەرەرای ئەو تاقیکردنەوانەی پێشتر باسکران، لەپاش ساڵی ٢٠٠٠ تاقیکردنەوەی ژمارە (٨)ی ئینگلیزی پەیدا بوو، بەوەی کە شوفێر دەبوایە چووبا پێشەوەو دواتر بە بەگیش کشابایەوە. گەر دەریش نەچووبایە ئەوا دوادەخرا.

سەبارەت بەو دەورەیە لەپاش راپەرین کە گەرێنرایەوە، دەبوا داواکار کە ناوی دەنووسرێت پسوولەیەک وەرگرێت و بچێت بۆ هاتوچۆی ناوشار دەورە دەکرێت و دەبێت رۆژی (٥) کاتژمێر لەسەر شەقامەکانی ناو شاری هەولێر بوەستێت و لەلایەن بەڕێوەبەری بەشی (گشتی) کە پلەی ئەفسەرە سەرپەرشتی دەکرێن.

لەسەر فۆرمەکە رسوماتی حکومەت بایی (٢٢٥٠) دینار پولی لێدەدرێت. ئێستا پارەی پسوولە (٨٧٠٠) دینارە.

جاران مۆڵەتی گشتی دەفتەر بووە و رەنگەکەی نزیک بوو لە پەمەیی. بەهەمان شێوەی دەفتەری مۆڵەتی

تایبەت تەنیا لە بەرگەکەی بەم شێوەیە بووە.

### وێنەی مۆڵەتی گشتی

شایانی باسە لەبەر ئەوەی لەکاتی راپەرینی ساڵی ١٩٩١دا تەواوی دامودەزگاکان سووتان، لەوانە بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی هەولێریش بۆ جارێکی دیکە ژمارەی پێدانی مۆڵەتەکان لەژمارە یەکەوە دەستی پێکرد.

ژمارە (١)ی مۆڵەتی گشتی درا بە "نەجمەدین مەجید رەمەزان"، دواتر کەوتە دەست عەبدوڵلا دایەخچێ لەپاش مردنی ئەو درا "بەفەرهاد موسا ئەمین (سەفار)". تا رێکەوتی ٢٨/٢/٢٠٠٧ ژمارەی پێدانی مۆڵەتی گشتی گەیشتۆتە (١٢٣٦٢٧) مۆڵەت دراو.

### دانانی ژمارەی ئۆتۆمبێل

هەر لەسەرەتاوە ئەو کەسانەی بەنیاز بوونایە ئۆتۆمبێلی نوێ بکڕن، ئەوا دەچوون لەکۆمپانیای گشتی ئۆتۆمبێل لەبەغدا ناوی خۆیان تۆمار دەکرد. مەرج بوو کەوا دەبوا کەسی داواکار مۆڵەتی شوفێری هەبوایە. ئینجا کە دەچووە کۆمپانیاکە ناوی خۆی تۆمار دەکرد. لەکۆمپانیاکە بۆ ماوەیەک.. بگرە چەند ساڵێک کە ئۆتۆمبێل دەهاتن ئەو کەسانەی ئۆتۆمبێلیان بۆ دەردەچوو لەکۆمپانیاکە نووسراویان بۆ دەکرا بەپێی ئەو پارێزگایانەی لێیەوە دەهاتن، بەمەبەستی تۆمارکردنیان و پێدانی ژمارەی ئۆتۆمبێل.

بۆ نموونە لە شاری هەولێر ئەو کەسانەی ئۆتۆمبێلیان بۆ دەردەچوو دەبوا:

١- ناسنامەی شارستانی.
٢- ڕەگەزنامەی عێراقی.
٣- (٢) وێنە.

لەگەڵ:

١- پشکنین.
٢- بژاردن.
٣- هاتوو.
٤- پشتگیری نیشتەجێ.. ئامادە کرابان.

ئینجا.. دوای تەواوی ئەو کار راپەراندنانە ژمارەی ئۆتۆمبێلیان پێدەدرا.. سەبارەت بەسەرجەم ئۆتۆمبێلەکان بەم شێوەیە بووە.

بەڵام سەبارەت بەو ئۆتۆمبێلانەی تایبەتیان دەکردن بۆ کرێ. ئەوا بەرەزامەندییەکی تایبەت دەکراو بریارەکە بەپێی مۆدیلەکان لە سەرووەوە دیاری دەکرا. بەپێچەوانەشەوە..



ئۆتۆمبێلی سەلاحەدینیش بەهەمان شێوە ژمارەی بۆ دادەندرا، کە بەنووسراوێک ئاراستەی هاتوچۆی هەولێر دەکرا کار راپەراندنی بۆ دەکرا ئەوسا ژمارەی پێدەدرا.

سیکرابیش بەهەمان شێوە کە ئەوسا لیژنەیەکی حکومەت کارەکانی رادەپەراند، دەدرایە زیادکاری ئاشکرا، کە بۆ شاری هەولێر دەهاتن ژمارەیان پێدەدرا.

لەپاش راپەرین تا ساڵی ٢٠٠٥ بەبێ هەڵوەشاندنەوە ژمارەی ئۆتۆمبێل دەدرا. بەڵام دوا بەدوای ئەوە لەدوای ساڵی ٢٠٠٥ لەبەرامبەر ژمارەی ئۆتۆمبێل، دەبێت ئۆتۆمبێلێک هەڵبوەشێندرێتەوە، سەرەتا هەندێ لەمۆدێلە کۆنەکان دیارکرا، بەڵام دواتر بوو بەگشتگیری، تەواوی مۆدێلەکانی گرتەوە. واتە بەبێ ژمارەی هەڵوەشاندنەوە ژمارەی ئۆتۆمبێل نادرێت.

بۆیە هەوڵدرا تاوەکو بزانین تا (١١)ەمین ژمارەی ئۆتۆمبێل لە

سەرەتادا کە هاتوونەتە هەولێر هی کێ بوون:
١- عومەر ئاغای سورچی.
٢- ئەحمەد چەلەبی.
٣- فەیزی هادی ئاغای سەربەشاخ.
٤- بەناوی یەکێ لەجامبازەکان بووە.
٥- شێخ کاکە.
٦- خدری پاشا.
٧- ئەکرەم مەحمود عەللاف.
٨- خالی لیوا وشیار.
٩- حاکم رەحمان.
١٠- عوسمان بەگی میران- شەقلاوە.

ئەم ژمارەی ئۆتۆمبێلانە تاگەیشتە سالی ١٩٧٥ ژمارە (١٠٠٠) بەئۆتۆمبیلێکی جۆری (لادا) خسوسی (تایبەت) دراوە.

بەلام تا سالی ٢٠٠٧ بەپێی ئەو ئامارەی لە بەشی ژمارەدان لە پۆلیسی هاتوچۆی هەولێر وەرگیرا واتە تا ٢٠٠٧/٢/٢٧ گەیشتە ئەم ژمارانە تایبەت ١٠١٤٥٥ کرێ ٢٣٣٣٣

**ناوی بەڕێوەبەرە گشتییەکانی بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی هەولێر**

١- موقەدەم نوری مستەفا
٢- موقەدەم خالید وەتتار
٣- عەقید نافیع ئیسماعیل
٤- عەقید قاسم ئەسعەد محەمەد دوری
٥- عەقید حاتەم ئەلعانی
٦- عەمید غازی خدر
٧- عەمید عەبدوللا مەعروف
٨- لیوا ئازاد سالح خۆشناو
٩- لیوا دژوار مەجید ئیسماعیل

شایانی باسە عەمیدی هاتوچۆ عەبدولخالیق ئیبراهیم، کە خەلکی هەولێرە بەیەکەم بەڕێوەبەری هاتوچۆی بەغدا دامەزرا.

لەسالی ١٩٦٠-١٩٧٠ عەقیدی هاتوچۆ "سەلاحەدین شەهاب رەزا"، یاریدەدەری بەڕێوەبەری هاتوچۆی هەولێر بووە.

لەسالی ١٩٧٠ ئەفسەری تۆمارکردنی مۆلەتەکان بووە. دواتر پاش ئەوەی یاریدەدەری بەڕێوەبەری هاتوچۆی سلێمانی و عیمارەو کەرکوک و دهۆک بووە. لەسالی ١٩٨٠ گەڕاوەتەوە هەولێرو ئێستا خانەنشین کراوە.

**ئەمەش ناوی هەندێ لە مفەوەزەکانی هاتوچۆی دێرینی هەولێر:**

١- سەفا عەبدولنەبی
٢- تۆفیق سەعید
٣- تەلعەت سەعید
٤- جەلال مەولود
٥- فازل هادی
٦- محەمەد مەولود حوسێن
٧- عارف عیزەت عەبدوللا
٨- نەجمەدین مەجید رەمەزان

سەرچاوەو پەراوێز:

١- لیوای هاتوچۆ "ئازاد سالح خۆشناو" بەڕێوەبەری بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆی هەولێر.
٢- موقەدەمی مافپەروەری هاتوچۆ "یوسف عەبدوللا محەمەد" بەڕێوەبەری بەشی هونەری هاتوچۆی هەولێر.
٣- عەقیدی هاتوچۆ "رۆبیتان فازل شەهاب" بەڕێوەبەری بەشی پێویستییەکانی هاتوچۆی هەولێر.
٤- مولازم "سەعدیە عارف مارف" بەڕێوەبەری بەشی مۆلەتدانی گشتی لە هاتوچۆی هەولێر.
٥- مولازمی یەکەمی "ماف کەمەند عوسمان ئیبراهیم" بەرپرسی بەشی یاسایی لە هاتوچۆی هەولێر.
٦- مولازمی هاتوچۆ "ئاهەنگ".
٧- مفەوەزی پلە (١)ی هاتوچۆ "مەولود حوسێن" نووسەر لە بەشی کارگێری هاتوچۆی هەولێر (٣١) سال خزمەت.
٨- مفەوەزی هاتوچۆ "عارف عیزەت عەبدوللا" بەرپرسی بەشی مۆلەتی تایبەت.
٩- مفەوەزی هاتوچۆ "حوسێن" لە بەشی پێدانی ژمارەی ئۆتۆمبێل.
١٠- مفەوەزی هاتوچۆ "نەجمەدین مەجید رەمەزان" (٣٠) سال خزمەت لە بەشی مۆلەتدانی گشتی.
١١- یاساکانی هاتوچۆ ژمارە ٤٨ی سالی ١٩٧١ی هەمووارکراو- ئامادەکردنی "سەباح سادق جەعفەر"- چاپی سێیەم ٢٠٠٤.



# پاسی ناوشار

شار یان پایتەخت ئەو شوێنە جوگرافیایەیە کە لەسەدان گەڕەک پێک دێت و دانیشتووانێکی زۆری تێدا دەژی و پێیان دەگوترێ هاووڵاتی.

دانیشتووانی شاریش هەریەکە بەگوێرەی پسپۆری خۆی کارێک ئەنجام دەدات، چ لە بواری کەرتی تایبەت، یان لەبواری کەرتی گشتی.

دانیشتووانی شاریشش ئەرک و مافێکی بەگوێرەی یاسا هەیە کە بوونی هاووڵاتیەکەی دەچەسپێنێ.

ئێمە لەم نووسینەدا زیاتر باس لە مافی هاووڵاتیان دەکەین لەرووی (گواستنەوە و هاتوچۆ) ی ناوشار، گواستنەوەی هاووڵاتیان لەگەڕەکەکانەوە بۆ جێگای کارو ناو سەنتەری شار.

شاری هەولێر، پایتەختی کوردستان، لەرووی گواستنەوەو هاتوچۆوە دووچاری گرفتێکی گەورە بووە، هەم لە قەڵەباڵغی و بەفیڕۆدانی کات و هەم لەپیس بوونی ژینگەوە.

لەناو شاری هەولێر قەڵەباڵغیەکی زۆری ئۆتۆمبێل هەیە بەتایبەتی لەسەر ئۆتۆمبێلی تەکسی، کە زۆربەشیان ئۆتۆمبێلی مۆدێلی کۆنن و بەقەدەر ئۆتۆمبێلی (دووکەڵی مێش) دووکەڵ لە گزۆزەکانیانەوە دووکەڵی ژەهراوی فڕێ دەدەنە ناو سییەکانی شار.

گیروگرفتی هاتوچۆ چەند لایەنێک دەگرێتەوە کە دەبنە ئاستەنگێک بەرامبەر هاووڵاتی و وڵات و حکومەت.

قەڵەباڵغی. بەفیڕۆدانی کات، پیسبوونی ژینگە.

لەوڵاتانی رۆژئاوا، زۆر رێگا چارە بۆ هاتوچۆی هاووڵاتیان دابین کراوە. وەک (ترام، کە ڤیتارێکی بچووکەو لەسەر سکەو بەکارەبا لەناوشار کار دەکات، یان میترۆ کە لەژێر زەویە هەروەها پاسی گەڕەکەکانیش.

بێجگە لەوەی لەهەندێ شاردا شارەوانی لە رۆژانی پشووی هەفتەدا هاووڵاتیان بەبێ نرخ دەگوازێتەوە بۆ ناو شار، تاکو هاووڵاتیان ئۆتۆمبێلەکانیان کەمتر بەکار بهێنن و قەڵەبالغی و هۆسەی ناوشار کەمتر بکەنەوە، بەڵام لێرە لەم هەولێری پایتەختی کوردستانە نە ترامان هەیەو نەمیترۆ، هەتا بگرە پاسی ناو شاریشمان نییە. بڕواناکەم لەهیچ شوێنێکی دنیا شار هەبێت بەبێ پاسی شارەوانی، بێجگە لە قەندەهار.

بەبیرم دێ ساڵانی ناوەڕاستی شەستەکان وحەفتایەکان لەشاری هەولێر هەر گەڕەکەو خاوەن چوار پێنج پاسی گەورەی شارەوانی بوو. پاسی گەڕەکی تەیراوە، کووران، شۆڕش، ئیسکان، سێتاقان، پاسەکانیش رەنگیان سوور بوو و دوو جۆرە کورسیان بۆ دروست کرابوو، کورسی دارو کورسی کوشن. دارەکان بلیتی بە دە فلس و کوشنەکانیش بە پانزە فلس بوو.

هاووڵاتیانیش بەبێ پاڵەپەستۆو ئارەقە رژاندن لەسەر ئەو شەقامانە و بەپارەیەکی کەم بەخۆیان و شەفتی و گندۆرەکانیانەوە دەگەڕانەوە ماڵەوەو قوتابیانیش بەخۆیان و پەرتووکەکانیانەوە دەچوونە قوتابخانە و دەگەڕانەوە.

نەبوونی پاسی ناوشاریش وای کردووە کە خەڵکانێکی زۆر ببن بە شوفێری تەکسی هەتا پۆلیس و فەرمانبەرەکانیش دوای دەوام تەکسی لێ دەخوڕن و ناوشاریان کردووە بەگۆڕەپانی تەکسی و بەسەدان و بەهەزاران جرت و فرتیانە بەهەوەسی خۆشیان نرخی گواستنەوە دادەنێن و هەندێکیشیان تەنها بۆکچان و ئافرەتانی جاحێل رادەگرن و هەندێکیشیان ناچن بۆ هەموو گەڕەکێک.

جا بۆیە پێویستە کە ئێستە هەولێر گەورەتر بووەو دانیشتووانی هەولێر لەزیاد بووندایە، وەزارەتی گواستنەوە یان شارەوانی یان پارێزگای هەولێر ئەو گیرو گرفتە بە شێوەیەکی هاوچەرخ چارەسەر بکەن و چەندیکە مافی هاووڵاتیبوونی خەڵک پێشێل نەکەن کە مافی خۆیەتی حکومەت کێشەی هاتوچۆی بۆ چارەسەر بکات.

شار بەبێ پاس، شار نییەو بێگومان پایتەختیش نییە، چەتری راوەستانی پاسی بەدیکۆری تازەی پڕ هونەر، شار جوانتر دەکات، ئێستا لە هەولێر چەند چەترێکی پاسی جوان دروست کراون، بەڵام هێشتا پاسمان بۆ نەکراوە بۆ نابێ بۆ سی مەتری چەند پاسێک و بۆ شەست مەتری و سەدی چەند پاسێکی تر، بێجگە لە دانانی پاس بۆ هەموو گەڕەکەکانی شارو دامەزراندنی شوفێر و جابی و جەنابی موفەتیش.

لە گۆڤاری مێرگ وەرگیراوە





# وێستگەی شەمەندەفەری هەولێر

**سیپان نانەکەلی**

رۆژانێک وێڕای وێرانکردن و خاپوورکردنی گوند و دێهاتەکان، رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی پێشووی عێراق هەولّی لێک دابڕاندنی شارەکانی کوردستانیان دەدا، ئەوەش سیاسەتێکی دیکەی چەپەلّ بوو دژ بە گەلی کورد ئەنجام دەدرا، ئەو سیاسەتەش هەر لەبەر ئەوە پەیڕەو دەکرا، بۆ ئەوەی چالاکی پێشمەرگەکانی کوردستان بە ئاسانی لە شارێک بۆ شارێکی دیکەی کوردستان نەگوازرێتەوە.

بەلام ئەو سیاسەتەش کاریگەرییەکی گەورەی نەکردە سەر یەک پارچەیی کوردستان و چالاکییەکانی پێشمەرگە دژ بە رژێمە سەرکوتکەرەکانی ئەوسای عێراق، یەک لە هەولّە گەورەکان بۆ لێک دابڕانی شارەکانی کوردستان، نەهێشتنی هێلّی شەمەندەفەری نێوان هەولێر- کەرکووک بوو، خۆشبەختانە دوای چەندان سالّ بڕیاردرا ئەو هێلّە جارێکی دیکە دەست بەکاربکاتەوە و ئەو بەیەک بەستنەوە توندەش لە نێوان شارەکانی کوردستان ئەمجارە تا هەتایە دوای نەمانی رژێمی دیکتاتۆری عێراق هەر بەردەوام بێت.

**وێستگەی شەمەندەفەری مەحەتە لە سەردەمی مەلیکدا**

لە سەردەمی "مەلیک فەیسەلّ" دا و بەهاوکاری ئەو ئینگلیزانەی هاتبوونە نێو خاکی عێراقەوە، هێلّی شەمەندەفەری نێوان هەولێر- کەرکووک وەکو پرۆژەیەکی گرنگ بۆ بەستنەوەی ئەو دوو شارە و پاشان بەستنەوەیان بەشارەکانی دیکەی عێراق و بەمەبەستی خزمەتکردنی خەلّکی کوردستان دەستی پێکرد. ئەو هێلّەش وەکو مێژوو لە شاری هەولێر شوێنەکەی تا ئێستا ماوەتەوە و ناوەکەی بەو شارەوە لکاوە،

هاتوچۆ لە لایەن خەڵکەوە بە هۆی ئەو وێستگەیەوە لە هەولێرەوە بۆ کەرکووک و شارەکانی دیکەی عێراق و بە پێچەوانەوەش ماوەیەکی دوورودرێژی هەبووە.

**شۆڕشەکانی کورد و پچڕانی شارەکانی کوردستان**

لە ساڵانی چلەکاندا ئەو وێستگەیە کەوتە کار، لەو ساتەوە شۆڕشە گەورەکانی کورد بەچڕی و گەرم و گوڕی دژ بە رژێمی سەرکوتکەری ئەوسای عێراق دەستی پێکرد، شۆڕش دژ بە هەموو ئەو زوڵم و کارە ستەمکاریانە دەستی پێکردبوو، کە دژ بە گەلی کورد دەکران، ئەو وێستگەیە تا ساڵانی هەشتاکان لە کارکردن بەردەوام بوو، کەچی دوای هاتنە سەر تەختی دیکتاتۆری رووخاو، بە فەرمانێکی فەرمی لەبری خزمەتکردنی خەڵک، بریار دەرچوو کە ئەو هێڵە شەمەندەفەرەی هەولێر و کەرکووک و شارەکانی دیکەی عێراق بەیەکتر دەبەستێتەوە، بۆ یەکجارەکی لە هەولێر هەڵبگیرێت.

**شوێنی وێستگەکە لەپێشان و ئێستادا**

ئەو گەڕەکەی ئێستا بە ناوی (مەحەتە) ناوی دەبەن و رووبەرێکی فراوانی لەو شارەدا داگیر کردووە، شوێنی پێشانی وێستگەی شەمەندەفەری هەولێر بوو، شوێنی حەوانەوەی گەشتیار و رێبوار و پلیت بڕین بۆ سەفەر کردن و چاوەڕوانی سەفەرکەرەکان بوو، ئێستا بەشێکی بۆتە گرتووخانە و بەشێکی دیکەشی باڵەخانەی نووسینگەی سەتەلایتی کوردستانە. بانکی ناوەندی هەرێم و مزگەوتی سەواف و کۆشکی هونەریش هەر لەسەر شوێن و رووبەری وێستگەکە دروست کراون. زۆر لەوانەی لەو وێستگەیە کاریان دەکرد، خەڵکی ئەو شارە بوون. هەندێکیان تا ئێستاش لە ژیاندا ماون، ئێستا گۆڕانکارییەکی تەواو بەسەر ئەو شوێنە مێژووییەدا هاتووە، ئەگەر کەسێک خەڵکی ئەو شارە نەبێت و نە شارەزابێت هەر گیز باوەڕناکات، کە لەو شارەدا ساڵانێکی زۆر زوو وێستگەی شەمەندەفەر هەبووە. هاموشۆی خەڵکی و رێبواران و گەشتیاران ئەو کات لە ئێستا زۆر ساناو خۆشتر بووە، ئەو شوێنەی ئەو گۆڕانکارییەشی بەسەردا هاتووە، هەرگیز لە شوێن وێستگەی شەمەندەفەر ناچێت و ئێستا بۆ کاری دیکە سوودی لێ وەردەگیرێت.

**لە کوردستان..**
**وێستگەیەکی پێشکەوتووی شەمەندەفەر دروست دەکرێت**

دوای پرۆسەی ئازادیی عێراق و گۆڕانکارییە خێراکان، حکومەتی هەرێمی کوردستان دەستبەجێ پلانی بۆ سەرجەم ئەو پرۆژانەی دانا، کە پێشتر مەحاڵ بوو لە سەردەمی رژێمی رووخاوی بەعس جێبەجێ بکرێت، چونکە ئەگەر پرۆژەیەک خزمەتی سەرجەم خەڵکی عیراقی بکردبایە و لەگەڵ سیاسەتی حزبی بەعسی رووخاو نەگونجابوایە رێگایان لێ دەگرت و جێبەجێ نەدەکرا.

یەک لەو پرۆژە گرنگ و گەورانەی ئێستا حکومەتی هەرێمی کوردستان، کە بەنیازە لە رێگای وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندنەوە جێبەجێی بکات، پرۆژەی دروستکردنی وێستگەیەکی پێشکەوتووی مۆدێرنی شەمەندەفەرە لە کوردستاندا. وەک سەرچاوەیەک لە وەزارەتی گواستنەوە و گەیاندن رایگەیاند، لە پلانی وەزارەتی گواستنەوەدایە، کە لە ماوەی چوار ساڵدا (٦) پرۆژەی گەورەی هێڵی شەمەندەفەر لە نێوان شارەکانی کوردستان و ولاتانی دراوسێدا ئەنجام بدرێت. بەلام لە پێشەوەی هەموو ئەو پرۆژانە، هێڵی شەمەندەفەری نێوان هەولێر- کەرکووک، کە گرنگییەکی تایبەتی پێ دەدرێت و لە ئەمساڵەوە دەست بە جێبەجێ کردنی دەکرێت، پاشان پرۆژەکانی هێڵی شەمەندەفەری نێوان (هەولێر- دهۆک- زاخۆ) پرۆژەی یەکەم، (هەولێر- سۆران- حاجی ئۆمەران) پرۆژەی دووەم، (هەولێر- کۆیە- سلێمانی) پرۆژەی سێیەم (هەولێر- کەرکووک)، کە لە پرۆژەی چوارەمدایە، بەلام ئەمساڵ جێبەجێ دەکرێت، (هەولێر- مووسڵ) پرۆژەی پێنجەم و (دهۆک- مووسڵ) پرۆژەی شەشەمە.

# نووسینگەکانی راهێنانی شۆفێر لە هەولێر

**فاتیح یاسین مودەریس**

ئەگەر ئۆتۆمبێل هەبێ، دەبێ شوێنێکیش هەبێ خەڵک بۆ شوفێری رابێنێ و ئەو رێنماییانەی تایبەتن بەو پیشەیەشیان فێر بکا. هەڵبەتە لەسەرەتاوە بەو شێوەیە نەبووە کە نووسینگەکانی ئەمڕۆ کاروبارەکانیان هەڵدەسووڕێنن.

بەپێی گوتەی خاوەنی ئەو نووسینگانەی کە سەرەتا لە شاری هەولێر کردوویانەتەوە، لەساڵی ١٩٨٣ ئۆتۆمبیلی تاکسی جۆری بیجۆ (٤٠٤) بەکار دەهات بۆ مۆڵەتی گشتی. ئەوکات (٣) دینار وەردەگیرا لەو کەسانەی لە تاقیکردنەوە دەردەچوون. بەڵام ئەوەی دواخرابایە (١) دیناری لێ وەردەگیرا. ئەو کات پارەکە تەنیا بۆ خاوەن ئۆتۆمبێلەکە بوو. لەم ساڵەدا هیچ نووسینگەیەکی فەرمی بۆ فێربوونی چۆنێتیی ئاژوتنی ئۆتۆمبێل لەم شارەدا نەبوو.

دوای ئەوەی (ئیدارەی مەحەللی) شاری هەولێر ئەو ئەرکەی گرتە ئەستۆ، ئەمجارە لەجیاتی (بیجۆ ٤٠٤) ئۆتۆمبیلی جۆری (تۆیۆتا- پیکەب) ستاوتی بۆ مەشق پێکردن بەکار هێنا.

مەسەلەی پارە وەرگرتن بوو بەپسوولە و بۆ دەرچوون و دواخران بوو بە (٣) دینار.

پاش ئەوە سەندیکای گواستنەوە و گەیاندن ئەم کارەی گرتە ئەستۆ، ئیدی ئۆتۆمبێلی جۆری (بیجۆ) بۆ هاتوچۆی گشتی (عمومی- گشتی) بەکاردەهێنرا و مەشقیان پێی دەکرد، ئۆتۆمبێلی جۆری (لادا) بۆ هاتوچۆی (خصوصی- تایبەتی) بوو. بەڵام بۆ فێربوونی مۆڵەتی تایبەت کەسەکە بەویستی خۆی بوو، بەهەر ئۆتۆمبێلێک مەشقی بکردبایە، دەیکرد.

دواتر جۆری ئۆتۆمبێلەکە گۆڕا و بوو بەئۆتۆمبێلی جۆری کرۆلا- ژاپۆنی. بەڵام لەدوای ئەوە ئۆتۆمبێلەکانی مەشق پێکردن بوو بەئۆتۆمبێلی جۆری (پرۆتۆن)، بەمەرجێ مۆدێلی لە (٢٠٠٠) کەمتر نەبێ. سەبارەت بەنووسینگەکان، ئەو ئۆتۆمبێلانەی بۆ مەشق پێکردن بەکاری دەهێنن، هەموو جۆرە ئۆتۆمبێلێک دەبێت، بەمەرجێک مۆدیلەکەی لە (٢٠٠٠) کەمتر نەبێت.

لەساڵی ١٩٨٥ نووسینگەی (سۆران) بۆ یەکەم جار لە شاری هەولێرو کوردستان کراوەتەوە. خاوەنەکەی (بەهرام تاهیر حەسەن)ە. دیارە بۆ کردنەوەی نووسینگەکان دوای هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، لەلایەنی پەیوەندداری هەولێرەوە رەوانەی بەغدا دەکرێن.. لەوێ ئاسانکارییان بۆ دەکرێت بۆ کردنەوەی نووسینگەی شوفێری، ئەوکاتەش نەک لەشاری هەولێر بەڵکو لە کوردستان نووسینگەیەک نەبووە.

دواتر نووسینگەی شێروان پاشان نووسینگەی سەفین دوای ئەو، نووسینگەی سامی کرانەوە. شایانی ئاماژە پێکردنە نووسینگەی (سەفین)، پێشتر نووسینگەی (دۆرە) بووە، لەخاوەنەکەی کراوەتەوە. بەپێی ئەو زانیارییانەی دەست کەوتن جاران دەتوانرا نووسینگە بکرێتەوە. نووسینگەی (دۆرە) لەشاری (بەغدا) بووەو دوای ئەوەی کراوەتەوەو گوێزراوەتەوە بۆ شاری هەولێر بووە بە (سەفین). ئینجا حکومەت ئۆتۆمبێلەکانی خۆی کێشایەوەو دایانە ئەو نووسینگانەی بەشدارییان کرد. سەرەتا نرخەکەی بوو بە (٥) دینار دواتر بوو بە (١٠) دینار، بەپسوولەش بۆ خاوەن نووسینگەکان بووە.

تا گەیشتە راپەڕینی بەهاری ساڵی ١٩٩١ پارە دانەکە هەر بەپسوولە مایەوەو بوو بە (٢٥) دینار. (١٥) دینار بۆ نووسینگەو،

(١٠) دینار بۆ هاتوچۆی هەولێر.
دوای ئەوە ئەو (٢٥) دینارە بەم شێوەیە دابەشکرا ١٢/٥ بۆ نووسینگە ١٢/٥ دینارو نیو بۆ هاتوچۆی هەولێر.
نرخی خولی فێرکردن لە نووسینگەکان بەم شێوەیە بوو لە (ئیدارەی مەحەللی) (٥٠) دینار تەنیا بۆ فەرمانبەران بوو، ماوەکەشی سێ هەفتە بوو.
لە (یەکێتی ئافرەتانی عێراق) (٥٠) دینار تەنیا بۆ ئافرەتان بوو، ماوەکەشی سێ هەفتە بووە.
نووسینگە ئەهلییەکان بڕی (١٠٠) دیناریان وەردەگرت ماوەی شوفێرییەکەش دوو هەفتە بووە. دواتر بووە بە (١٥٠) دینار ماوەکەش زیاد بووەو بووەتە یەک مانگ.
جاران واتە بەر لە رووخانی رژێمی بەعسی هەڵوەشاوە، مانگانە مەشق پێکراوان ژمارەیان نەدەگەیشتە (١٠) کەس
ئافرەت بەرێژەی ٢٪ بوو.
پیاو بەرێژەی ٩٨٪ بوو.
بەڵام حاڵی حازر رێژەی ئافرەت و پیاو وەک یەکە بە رێژەی "٥٠٪ بە ٥٠٪". لەهەمان کاتدا، ئەو رێژە بەرەو زیاد بوونیشە، مانگانە نزیکەی (٢٠-٣٠) کەس بەمەبەستی مەشق پێکردن روو لە نووسینگەکانی ناو شار دەکەن.

### مەشقی نووسینگەکان

خولی فێربوون و لێخوڕینی ئۆتۆمبێل لەبارەی (تایبەتی و گشتی) یەک جۆر بووە، چونکە مەبەست تەنیا فێربوون بووە وەک:

- لێخوڕینی ئۆتۆمبێل
- هێماکانی هاتوچۆ
- میکانیک
- رەوشتی شوفێری

وانە گوتنەوە بەم شێوەیە بووە:

- یاساکانی هاتوچۆ (١٠)وانە
- بنچینەکانی هاتوچۆ (٨)وانە
- نیشانەکانی هاتوچۆ (٨) وانە
- میکانیک (١٠) وانە
- فریاکەوتنی سەرەتایی (٢) وانە
- بەرگری شارستانی (٢) وانە
- کۆمپانیای بیمەکردن (٢) وانە
- کۆ (٤٠) وانە

### مەرجەکانی دانانی نووسینگە

١- رەزامەندی بنکەی پۆلیسی ناوچەکە کە لێی دادەنێت و دەکاتەوە.
٢- پشتگیری و مۆری موختار.
٣- دوو شاهید لە ناوچەکە.
٤- پەنجەمۆری خاوەن نووسینگە.

### ئیمتیازەکانی نووسینگە

جاران نووسینگە چەندین ئیمتیازاتی هەبووە.. لەوانە پاش ئەوەی خولەکەی تەواو دەبوو بەڵگەنامەی وەردەگرت پلەکانی لەسەر تۆمار دەکرا بەباشەو زۆر باشە یاخود دواخران. گەر هاتوو دواخرابوایە، ئەوا بۆ جاری دووەم داخیلی دەورە دەبۆوە.

### (رێنماییەکانی نووسینگەی مەشق پێکردن)

تەواوی نووسینگەکانی لێخوڕین و فێربوونی ئۆتۆمبێل لەسەر کۆمەڵێک رێنمایی رێککەوتوون و لە نووسینگەکانیان هەڵواسیوە.. هەر کەسێ چ (ژن یان پیاو) بچێت بۆ لایان بەمەبەستی داخیلی بوونی خول، رێنماییەکانی دەخەنە بەر دەست، چونکە مەرجە ئەو کەسەی روو لەو نووسینگانە دەکات دەبێت جیاوازیکردن بەرێنماییەکانیان پابەند بێت بەبێ.. رێنماییەکانیش ئەمانەن:

فۆرمی رێنمایی
نووسینگەی مەشق پێکردن

برا/ خوشکی مەشق پێکراو
پێویستە پابەند بیت بەم رێنماییانەی خوارەوە
لەگەڵ رێزدا

١- گوێڕایەڵی رێنماییەکانی فێرکاربە.
٢- جگەرە کێشان قەدەغەیە لەکاتی مەشق پێکردن.
٣- نابێ منداڵتان لەگەڵدا بێت لەکاتی مەشق پێکردن.
٤- نابێ هاورێتان لەگەڵدا بێت لەکاتی مەشق پێکردن.
٥- پێشەکی پارەکە وەردەگیرێت.
٦- لەدوای وەرگرتنی پارەی فێرکردن، پارەکە ناگەرێتەوە.
٧- گەر لەکاتی دیاریکراو ئامادە نەبیت، ئەوا بۆت قەرەبوو ناکرێتەوەو بۆت نییە دواتر مەشق بکەیتەوە.
٨- رۆژی هەینی پشووە.
٩- ماوەی خولەکە (١٥) رۆژە.
١٠- (٩) رۆژ لە دەرەوە و ناو شار.

١١- (٦) رۆژ لە (رەمپە) و (ژمارە ٨).
١٢- رۆژانە (٤٥) خولەک مەشقکردنە.

**چۆنیەتی مەشق پێکردن**

سەرەتا رۆژی یەکەم لە دەرەوەی شار لە شوێنێکی چۆڵ مەشقەکە دەست پێدەکات. لە سەرەتادا مەشقکار باسێکی (٥) خولەکی بۆ ئەو کەسەی هاتووە فێری شوفێری ببێ دەڵێت: دەربارەی چۆنێتی دانیشتن و رێکخستنی ئاوێنەکان و کوشن. دەربارەی کلاج و سویچ لێدان و گێر (دەندە) بەردو یەک بردن بۆ رۆیشتن و لەکاتی هەر گێڕ گۆڕینێکدا کلاج تەبق دەکرێت. دوای ئەم موحازەرە کورتە دەکەونە بواری کردەییەوە.

پاش ئەوەی راهات و فێربوو وردە وردە دەهێندرێتە نێو قەرەباڵغی سەر شەقامە سەرەکییەکان. دوای ئەوە دەهێندرێتە نێو شار، بۆئەوەی مەشق پێکراو متمانەی تەواوی لا پەیدا ببێ و کارەکەی لا خۆشەویست بێ و هەوڵی تەواوی بۆ فێربوونەکە بدات.

شایانی ئاماژە پێکردنە، پێشکەوتنی کارەکان لەسەر مەشق پێکراوەکە دەوەستێت تا چەند وەریگرتووە و کاری پێدەکات. بۆ نموونە بەپێی ئەو قسانەی خاوەن نووسینگەکان لەسەری کۆکن.

ئەم کارە لەسەر تەمەن دەوەستێت. بۆ نموونە لە تەمەنی (١٥-٤٠) ساڵ بەنیسبەت پیاو زۆر زوو رێنماییەکان وەردەگرن و بەرزەفتی کارەکان دەکەن. بەلام لە (٤٠) ساڵ بەرەو سەرەوە ئەوا ماندوو بوونی زیاتری دەوێ و درەنگتر دەتوانێ خۆی بەرزەفت بکات. لەتەمەنی (١٥-٣٠) ساڵ بەنیسبەت ئافرەت زوو رێنماییەکان وەردەگرن و بەرزەفتی فێربوون دەبن. بەلام لە (٣٠) ساڵ ماندوو بوونی یەکجار زۆر دەوێت. ماندوو بوونی پێوە دیار دەبێت.

ئەو (٦) رۆژەی دەمێنێتەوە لای زۆری نووسینگەکان لە (رەمپەو ژمارە ٨) (٤٥ بە ٤٥) خولەک لێکی دەدەن و دەبێت بەکاتژمێرو نیوێک. تا مەشق پێکراو بە تەواوی بتوانی چۆن بەسەر رەمپە دەکەوێ و چۆنی رادەگرێ و چۆن دووبارە هەڵدەستێتەوەو دەڕوات. چۆن لەسەر رەمپە دێتە خوارێ و بە چ شێوەیەک دەچێتە گەراج.. لەگەراج بە چ شێوەیەک دەکشێتەوەو چۆن پیتی(L) ئێلی ئینگلیزی ئەنجام دەدات.

هەڵبەتە لەسەر رەمپەو ژمارە (٨) و ناو بازاڕ نووسینگەکان رۆڵێکی بالا دەبینن و بەئۆتۆمبێلی نووسینگەکان تاقیکردنەوەکان ئەنجام دەدرێت.

ئێستا لە رەمپە (١٧٥٠) دیناری چاپی ئێستا وەردەگیرێت. بۆ هەر جارێک گەر بۆ چەند جارێک دوا بخرێت، ئەوا بۆ هەموو جارێ دەبێ جارێکی تر خۆی ناونووس بکاتەوە. بەهەمان شێوە سەبارەت بەتاقیکردنەوەی ژمارە (٨) و ناو بازاڕ.

**نووسینگەکانی ئاژوتن و فێربوونی ئۆتۆمبێل لە شاری هەولێر**

١- نووسینگەی سۆران
٢- نووسینگەی شێروان
٣- نووسینگەی سەفین
٤- نووسینگەی سارا
٥- نووسینگەی سەلاحەدین
٦- نووسینگەی کانی
٧- نوسینگەی کەمەند
٨- نووسینگەی راستی
٩- نووسینگەی قەرەچوغ
١٠- نووسینگەی سانا
١١- نووسینگەی بەڵێن
١٢- نووسینگەی ئالا
١٣- نووسینگەی دەریا
١٤- نووسینگەی هەولێر
١٥- نووسینگەی هەرێم
١٦- نووسینگەی سامی
١٧- نووسینگەی کارزان
١٨- نووسینگەی لێزان
١٩- نووسینگەی ئارام
٢٠- نووسینگەی هێمن

**سەرچاوەکان:**

١- عەبدولکەریم قادر لەشکری خاوەنی نووسینگەی کانی لەساڵی ١٩٨٥ دامەزراوە.
٢- مام نورەدین خاوەنی نووسینگەی سەفین لەساڵی ١٩٨٣ مۆڵەتی فەرمی نەبووە. لەپاش ساڵی ١٩٨٧ەوە بووە بەفەرمی. مۆڵەتی نووسینگەکە بەناوی (ئەبو زەید محەمەد ئەمین- خالید محەمەد ئەمین)ە.
٣- شوان غەریب عەزیز خاوەنی نووسینگەی سەلاحەدین. لەساڵی ١٩٩٨ دامەزراوە.
٤- بارام تاهیر حەسەن خاوەنی نووسینگەی سۆران ١٩٨٥ بۆ یەکەم جار لە هەولێر و کوردستان دامەزراوە.
٥- نوالەی نوێ/ کانوونی دووەم. ٢٠٠٤ ژمارە (٦) دیمانە/ زانا گەلالی ل٢٩.



# دەرگای ئەحمەدی قەڵای هەولێر

**هوشیار عەبدوڵلا**

قەڵا سەرکەش و خۆڕاگرەکەی شاری هەولێر هەر لەکۆنەوە یەک دەرگەی هەبووە، کە ئەویش "دەرگەی گەورە"یە، کە دەکەوێتە بەشی باشووری قەڵاوە، کاتی خۆی لەزەمانی عوسمانییەکاندا بینایەی سەرەوەی دەرگەکە سەرای حکومەت بووە، هەموو دام و دەزگای میری لەوێ بووە، لە موستەنتیق و تاپۆ و زیندان و نفووس و شاردوانی و دادگا.

ئینجا هەرکە شەو دادەهات سەر لەئێواردکەی دەرگای قەڵات دادەخرا، بەیانیانیش دەکرایەوە. لەدوا سالانی سەدەی نۆزدەهەم دەرگایەکی بچووک لە رۆژهەلاتی قەلات کرایەوە، ناویان لێنابوو"دەرگەی گچکە" دەرگەی قوللەشیان پێدەگوت، کە کاتی خۆی لەو دەرگایەوە "گەردییەکان" توانیبوویان بە یارمەتی"حاجی عەبۆ ئاغاو عەبدولرەزاق ئاغای عەوێزی "دزە بکەنە ناو قەڵاو هێرش بکەنە سەر سەراو"کاکل ئاغا"ی برا گەورەیان لە بەندیخانە دەربێنن و رزگاری بکەن و باشچاوەشەکەش کە ناوی"رەشید باشچاوەش"بوو، بکوژن. کاتێ کە دەوڵەتی عوسمانی لەشەڕی یەکەمی جیهانی ١٩١٤- ١٩١٨ دۆڕاندی و رووخا، لەشکری بەریتانیا گەیشتە کوردستان و هاتە ناو هەولێر، کاپتن (های) بوو بە فەمانرەوای شارەکە، بینایەکی نوێیان لەخوارەوەی قەڵا دروستکرد، سەرایان گواستەوە خوارێ، هەولێر کرایە لیواو یەکەم موتەسەریفی هەولێریش داندرا کە "ئەحمەد عوسمان" ئامۆزای مەلا ئەفەندی بوو"ئەحمەدە فەندی"یان پێدەگوت، مالی لەقەلاتێ بوو، هەستا لەلای باکووری قەلاتێ دەرگایەکی نوێی کردەوە، ئەو جادەیەیان لێدا، لەوکاتییەوە ئەو دەرگایە بەدەرگای "ئەحمەدی" ناسراوە، ئەمەش لەسالی ١٩٢٢- ١٩٢٣ بووە، دەرگاکەش بەرامبەر گەڕەکی تەیراوەیە.

# ئاشی ئاوی گۆمەشین ـ شێخان

فەرهاد گۆمەشینی

ئاشی ئاو، لەسەردەمی خۆیدا بۆ هاڕینی (گەنم و جۆ و نیسک و نۆک و... هتد) و بۆ بەرهەمهێنانی ئارد و عەلەف و دانەوێڵە دەزگایەکی بەسوود بووە. جگە لەوەش خەڵکانێکی زۆر کاریان تێدا کردووە و دەستمایەکیان لێی دەست کەوتووە بۆ خەرجی و پێویستیی ژیانیان. ئاشی ئاو لەبەر ئەوەی ئەرک و ماندی بوونی زۆر بووە، کەم بووە، هەبووە بە خێزانێک بەڕێوە بچێ، زۆربەی ئاشەکان کۆمەڵە خێزانێکی زۆر کاریان تێیدا کردووە، وەک لەم ئاشە بۆمان روون دەبێتەوە، لەوانەیە دەستمایەش یەکێک بووبێت لەبەرئەوەی خەڵک ئەو کاتە پارەیان کەم بووە. ئەرکی بەڕێوەبردنیشی زۆر بووە، هەم بۆ هەڵبەستانی جۆگە و هەم کاتێک بنەوان تەقیوە و ئاو بۆ ئاش نەهاتووە، یاخود بەهۆی بەفر و شەختە، ئیتر شەو بێت یا رۆژ، ناچار چەند کەسێک بە دوای چاکردنەوەی جۆگەدا چوون، چ شەختەی شکاندبێ یاخود بنەوانی چاکردبێتەوە، یاخود جۆگەی پاک کردبێتەوە، لە کاتێکدا بنەوانی ئاشەکان هی زۆربەیان دوور بووە، بە تایبەت ئەم ئاشەی ئێستا باسی دەکەین، ئەم ئاشە زیاتر لە وەرزی زستان و بەهاردا کاری کردووە، بەهۆی کەمی ئاو لە دوو وەرزەکەی دیکەدا.

پیاوێک بەناوی (جبرائیل مەحموود) کە ئیشی لەم ئاشەدا کردووە و بەشی تێدا بووە. زۆربەی کاتەکان شەختەی بەپێ خاوس شکاندووە. ئەم پیاوە پیاوێکی چوار شانەی زۆر بەهێز بووە. خەڵک ئازایەتی زۆری لێ دەگێڕنەوە.

ئاشەوانەکان بە شەوو بە رۆژ لەوێ ماونەتەوە و کاریان تێیدا کردووە، ئاگردانێکیان لەوێ بە بەرد دروست کردووە، هەر لەوێ هەویریان کردووە و ئەستووکیان کردووە و خۆراکیان بۆ خۆیان ئامادە کردووە، بە تایبەتی لە زستاندا، کە چەند شەو و رۆژ هاتوچۆ نەبووە بەهۆی بەفر و کرێوە. خانووی ئاش خانوویێکی زۆر گەورە بووە، بەشێکی تری بۆ باری گەنم و جۆی ئەو کەسانەی باراشیان هێناوەتە ئاش و بەشێکی تری تایبەت بووە بۆ تەویلەی وڵاغان. بۆ وڵاغی ئەو کەسانەی لە گوندەکانی تر هاتوون و چەندان شەو و رۆژ لە ئاشدا ماونەتەوە.

ئەم ئاشە لەلایەن بنەماڵەی (کێخوا عەولا) و بنەماڵەی (حوسێن ئاغا) دروست کراوە و بەکاریان هێناوە بە نیوەیی، نیوە هی کوڕەکانی (حوسێن ئاغا) بووە: (فارس حوسێن، ئەمین

حوسێن، مەولود حوسێن). نیوەکەی تری هی نەوەکانی (کێخوا عەولا) بووە، بەم شێوەی خوارەوە: هەشتیەکی هی: (فەتحوڵلا قادر) بووە، هەشتیەکی هی (حەمە رەشید عەزیز) بووە، هەشتیەکی هی (حەویز کەریم، عومەر کەریم، شەریف کەریم، فەتاح کەریم، حەمەدەمین کەریم) بووە، نیوە هەشتیەکی هی (مستەفا مەحموود، عەبدوڵلا مەحموود، جبرائیل مەحموود) بووە، نیوەی هەشتیەکی هی (مراد ساڵح، کاکل ساڵح) بووە، ئەم ئاشە لە ساڵی (١٩٣٦ز) دروست کراوە و کاری کردووە تاکو ساڵی (١٩٤٢ز) ئەم ئاشە باش وەستایەک بەناوی (ئەحمەد) دایمەزراندووە، کە خەڵکی کۆیە بووە و ناوەناوەش بەرداشەکانی تیژ کردیتەوە لەجیاتی دەست هەقیش مزەی ئاشی وەرگرتووە، هی چەند رۆژێک. ئەم ئاشە کەوتۆتە بەشی سەرووی گوند و لەلایەن بەردبابی چەلەبی و خێڵی (گەردی) بەڕێوەیان بردووە. کە دانیشتووی گوندەکەن، ئەم ئاشە پێشتر لە دوورتر و لە سەرەوەی ئەم ئاشە دروست کرابوو، تەنها بەرەی (کێخوا عەولا) بەڕێوەیان دەبرد، بەلام ئەو کاتە ئاشەکە (کۆڵ) بوو. کاتێک ئاشەکە گواسترایەوە ئەم شوێنە و کرایە (قۆرە) ئەو کاتە بنەماڵەی (حوسێن ئاغا)یان کردە شەریک. ئەم ئاشە زیاتر زستانان گەڕ بووە، واتا بەهۆی کەم ئاوی زیاتر لە زستانان کاری کردووە. بەلام ئاشی تر هەبوو لە شوێنی تر بە بەردەوام کاریان کردووە. (ئاشە قوتە) کە کەوتۆتە بەشی خوارووی گوند و مێژووی لە هەموو ئاشەکانی تری (قۆتەرە) کۆنترە، کە خاوەنەکەی نادیارە و لە خوار ئەم ئاشە ئاشێکی تر هەیە بە ناوی (سەید عوزێر) لەلایەن سەیدەکانی ئەم گوندە ئیشی پێکراوە، لە (ئاشە قوتە) نوێترە. ئاشێکی تر هەیە لەناو گوند، بە ناوی (ئاشی ناو گوند) یاخود (ئاشی وەیسی)، ئەم ئاشەش لەلایەن بەرەی وەیسی، کە لە خێڵی (شێروانی)ین دروست کراوە و کاری پێکراوە، لەسەردەمی ئاشی (کێخوا عەولا) کاری کردووە و بە یەکەوە وەستاون و لە کار کەوتوون. ئەم چوار ئاشە قۆتەرە ئاسارێکی کۆن و مێژوویێکی ئەم گوندە دەگێڕنەوە، چەند جار ئەم گوندە سووتاو و تێک درا. خانووی بەپێوە نەما لەلایەن بەعسییەکانەوە. بەلام شوێنەواری ئەم چوار ئاشە دەستی لێنەدراوە وەک خۆی مایەوە، بەلام بەداخەوە ئاشی (ناو گوند) یاخود (ئاشی وەیسی) لە ساڵی (٢٠٠٣) لە رۆژی نەورۆز لە کاتێکدا خەڵک جلی رازاوەی دەپۆشی و ئاهەنگیان دەگێڕا، ئەم ئاشە لەو رۆژەدا شینی دەگێڕا و بەرەو مەرگ دەچوو بە دەستی شۆفەڵەکانی ڕێگاوبان، لە کاتێکدا لەم شوێنەدا ڕێگایەکیان دەبرد، ئاشەکەیان تەخت کرد. جگە لەم چوار ئاشە ئاسەواری (١٨) ئاشی تر بینراوەن، بەلام لەبەر ئەوەی ئاشەکانی تر (کۆل) بوون بۆیە ئاسەواریان نادیارە.

تێبینی:

* ئەوانەی لە ئاشی (کێخوا عەولا) بەشدارییان کردووە و لە پێشەوە ناومان هێنان، هیچیان لە ژیاندا نەماون. جگە لەوانەی ناومان هێنان، کەسانی تریش لەم ئاشەدا کاریان کردووە بەتایبەت نەوەکانیان، باوکم یەکێک بووە لەو کەسانەی کاری تێدا کردووە و ئەم زانیارانەم زیاتر لەو وەرگرتووە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (١٥)ی، ٢٠٠٥ بلاوبۆتەوە.



# ئاشە ئاوییەکانی دەشتی هەولێر

## هۆشیار عەبدوڵڵا

لە هەمـوو کـوردسـتـانـدا پێش بەدیارکـەوتنی ئاشی ئاگـر تەنیـا هەر ئاشی ئاوێ هەبووە، بەڵام لە دوای داگیـرکـردنی وڵاتی عـێـراق و کـوردسـتـان لە ساڵی (١٩١٨) لەلایەن بەریتـانیـاوە (ئاشی ئاگـر، ئاشی مەکینە) بەدیار کەوت، ئەوانە ئاشی ئاگریان هێنایە کـوردسـتـان و وڵاتی عـێـراق و دایانمەزراند، ئاشـە ئاوییەکانیش بەرە بەرە کزبوون و لەکار کەوتن، تا دوا ساڵانی سییەکان و سەرەتای چلەکان بەکارهێنانی ئەم ئاشانە لەدەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرێ دەبینران، پاشـان ئەم جۆرە ئاشانە بەیەکجاری لەکـار کـەوتن و نەمـان، بەزۆری ئەو جـۆرە ئاشـانەش لەو شـوێنانە دامـەزرابوون، کـە کـارێز و جـۆگـەو رووباری لێ بوو، هەنووکەش لە هەندێ جێگاو شوێنان، شـوێنەواری ئەم جۆرە ئاشـانە هەر مـاوە و دەبینرێ، لە هەنـدێ ناوچەی دەڤـەری کـوردسـتـانـدا ئەم جۆرە ئاشـانە هەتا سـاڵی (١٩٨٧) هەر مـابوون، بەکـار دەهێندران، لەوانەی کـە بەندەتان دیبـووی ئاشی گـوندی (کـچـان)ە لە نـاوچەی (سەنگاو)ی سەر بە قەزای (چەمچەماڵ)ی پارێزگای سولەیمانی، هەروەها ئەو ئاشە ئاوییانەی کە لە (دۆڵی ئاران)ێ بوون، سـەر بەناحیـەی خـەلیـفـانێ قـەزای رواندزێ بوون، لە پارێزگای هەولێر لە ساڵی (١٩٨٧) لەگەڵ خاپووورکردن و ویرانکردنی دێهاتەکانی باشووری کـوردسـتـان، ئەو ئاشـانەش کـاول و خـاپوور کـران، لە دوای راپەڕینی سـاڵی (١٩٩١ز) گـەلی کـورد دووبارە لەگەڵ دەستپێکردنەوەی بە ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان لەزۆر شـوێنان ئەو جـۆرە ئاشـانەیان دامـەزراندەوە، بەتایبەتی لە ناوچە شاخاوییەکاندا، تەنانەت هەندێ لە رێکخراوە بیانییەکان (بەرداش)ەکانیان بۆ دەهێنان و بۆیان دابین دەکـردن، ئەمـانەش ناوی هەندێ لە ئاشە ئاوییە کۆنەکانی دەڤەری دزەییاتی دەشتی هەولێرن:

**١- ئاشە کۆرە:** ناوی یەکێک لە ئاشە ئاوییەکانی دەشـتی هەولـێرێ بووە، کـەوتبووە ناو ئاقـاری گـوندی (عـەلیـاوەی شێـخان) لە ناوچەی قـوشـتـەپەدایە، هی بنەماڵەی شێخ سدیقی ماستاوەیی بووە، بۆیە ناونراوە ئاشـە کۆرە، وادیارە بەرداشـەکـەی (کـول-کـۆر) بووە، باش گـەنمی نەهاڕییـە، بۆیە لە دەڤـەرەکـە بە ئاشە کۆرە

ناسراوە، ناوی ئەو ئاشەش تێکەڵ بە ئەدەب و بەیت و بەند و فۆلکلۆری دەڤەرەکە بووە، لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێردا واهاتووە:

**قوونی ئاشە کۆرەیە، سەد عەرەبەی زەرەر دایە**
**چاوی هێلانە قولتە، جیقنەی پێدا رژایە**

**٢- ئاشەکانی گوندی قەتەوی:** قەتەوی گوندێکە دەکەوێتە خوارووی رۆژئاوای شاری هەولێر، گوندێکی زۆر کۆنە، بە موڵک هی بنەماڵەی سەید ئەحمەدی نەقیبی هەولێرێ بووە، ئەو گوندە ئاقاری لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (قونیان، بێریات، باغە منارە، مزەحمەد، تۆبزاوە، شاری هەولێر) لەسەر یەکە، کارێزێکی ئاوی گەورەی هەبوو، پێیان دەوت (کارێزی قەتەوی) یان (ئاوی قەتەوی) ئاوێکی زۆری هەبووە، بەو ئاوەوە دەرۆیشتە خوارێ، شینایی و برنجێکی زۆری لەبەر دەکرا، دوو ئاشی لەبەر دەگەڕا، یەکەمیان ئاشی (خەرابەی) بوو، دووەمیان ئاشی قۆر (قوڵ)یان پێدەوت، کەلاوەو شوێنەکانی هەتا بەو ساڵانەی دواییش هەر مابوون.

**٣- ئاشی خوڕخوڕی:** ئاشێکی کۆن بووە، ئاوەکەی لە (بەستی شەرغەی) بە جۆگەلە بۆ ئاقاری گوندی (خوڕ خوڕ)یان هێناوە، ئاشەکەیان لەوێ دامەزراندبوو و دەگەڕا، ئەو گوندەش لە سنووری ناوچەی قوشتەپەیە و هی بنەماڵەی (کێخوا هیدایەت)ی بوو، هەنووکەش شوێنەوارەکەی هەر ماوە، کە ئاشی ئاگریش پەیدابوو ئەو بنەماڵەیە لە ساڵی (١٩٥٠) ئاشێکی ئاگریان کری و لەوێ دایانمەزراند.

**٤- ئاشی شێخی چۆلی:** لە مەخمووری بناری چیای قەرەچووغی (دەشتی قەراج) کاتی خۆی ماڵی خوا لێخۆشبوو (شێخ محەمەد نەقشبەندی) (١٨١٧-١٨٩١) ناسراوە بە شێخی چۆلی، (٣) ئاشیان لەسەر (ئاوی دەرماناوە)ی هەبوو، ئەو ئاوەش لە بناری چیای قەرەچووغی دێتە دەرەوە، جاران ئاوێکی زۆر تیژڕەو بوو، بەڵام هەنووکە لەبەر گۆڕانی باری کەش و هەواو کەمی بەفرو بارانی، ئەم ئاوەش کەم بووە، خەریکە وشک دەبێ، ئەو ئاوەی بە ئاوی ئاشان یان (ئاوی شێخی چۆلی) ناسراوە، لەبەرئەوەی (٣) ئاشی لەبەر دەگەڕا، ئاشەکانیش هی ماڵی شێخی چۆلی بوون، ئەو ئاوە مادەی (کانزا)یی بوو، سوودێکی زۆری هەبوو بۆ ئەوانەی تووشی نەخۆشی پێست ببوون، وەکو گرووپی، ئەو ئاوە بە جۆگەلەی دەهاتە خوارێ هەتا (کەندی هەوشار)ی دەرۆیشت، شینایی و بێستان و برنجێکی زۆری لەبەر دەکرا، هەنووکەش شوێنەواری ئاشەکان، کە لە بەرد و گەچ دروستکراون هەر ماون، ئاشەوانەکەش ناوی (وەستا محەمەد) بووە، کە بەڕەسەن خەڵکی دەڤەری (شەمدینان)ی باکووری کوردستان بووە، لەکاتی خۆی لەبەر تەنگ و چەڵەمەیەکی کۆمەڵایەتی عەشایری دەکەونە شاری هەولێرێ، پەنایان هێنابووە لای شێخی چۆلی، شێخ کە زانیبووی کابرا ئاشەوستایە، رەوانەی مەخمووریان دەکات، بۆ ئەوەی سەرپەرشتی ئاشەکانیان بکات و دابمەزرێن، ئەو پیاوە لەدەشتی قەراجی بە (وەستا گۆجە) ناسرابوو، کاتی خۆی لە ناوچەکەی خۆیان پەنجەیەکی بەبەر (بەرداش)ی کەوتبوو، ئەو پیاوە پەنجا ساڵێک دەبێت کۆچی دوایی کردووە.

**٥- ئاشی غەرابە تاوسە:** ئەو ئاشە کاتی خۆی سەر بە ئاقاری گوندی (عەلیاوەی شێخان) بووە، لە سنووری ناحیەی قوشتەپەی هەڵکەوتبوو، شوێنەکەی غەرابەیەو نەختێک بەرزاییە و لەدەو (کەندی قوڕە بەگ)یە، (ئاوی گامردی) دەهاتەوە سەری، گردی ئەلیاس تەپە لەوێ نزیکە، کە گردێکی توورەگەرێژە، دەڵێن کاتی خۆی لەشکرگای عوسمانییەکان بووە، شوێنەواری ئەم ئاشەش هەتا ئەم ساڵانەی دواییش هەر مابوو.

**٦- ئاشی دۆغانی:** ئەو ئاشەش لەسەر (ئاوی

قورەبەگ)ەوە بوو، لەناو ئاقاری گوندی دۆغانی لە نزیک (گردی دۆغان)ی هەڵکەوتووە، ئەو ئاشە زۆر کۆن بووە، ئاشی (مەلا حوسێن)یان پێدەوت، دەڵێن ئەو پیاوە مەلا بووە لە گوندی (گرد عازەبان) ئەو کاتی خۆی ئاشەکەی چاک کردبۆوە، بۆیە بەو ناوە ناسراوە، لەپاش مردنی مەلا حوسێن لە پاش گرانی ساڵی (١٩١٧ز) براکەی لە هەولێرەوە بە ماڵ و خێزانەوە هاتۆتە گوندی و بووەتە مەلا، مامۆستا بە خۆ و خێزانەوە تورکییەکی باشیان دەزانی.

**٧- ئاشی داودە فەندی:** لە نێوان گوندی (عەزە) و (قونیان) بووە، ئەم پیاوە کابرایەکی هەولێری بوو، (٣) ئاشی ئاوی هەبوو، هەتا هەنووکە کەلاوەی منارەکەو شوێنەواری ئاشەکە هەرماوە.

**٨- ئاشی عەرەبکەند:** (عەرەبکەند) ناوی گوندێکە لە خوارووی رۆژئاوای شاری هەولێر هەڵکەوتووە، سەر بە ناحیەی عەنکاوەی قەزای مەڵبەندی هەولێرە، گوندێکی زۆر کۆنە، ئاقارەکەی لەگەڵ ئاقاری گوندەکانی (دوزتەپە، سوێرێ، عەزە، قونیان، قەریەتاغ، جمکە، باغەمنارە، لەسەر یێکە، بە موڵک هی بنەماڵەی یەعقوبییەکانی هەولێر بووە، ئەو گوندە گوندێکی بەخێرو بێر بووە، چەند کارێزێکی هەبووە، لەوانە (ئاوی ئەسعەدە فەندی، ئاوێ شێخ زادەی، کارێزی قاسماغا)ی، ئەو کارێزە لەناو گوندی دەردەبوو، بە ئاقاری گوندی (دوزتەپە)یدا دەڕۆیشتە خوارێ هەتا دەگەیشتە گوندی (تەندوورە)ی، سەوزەو شینایەکی زۆری لەبەر دەکرا، سێ ئاشی لێ بوو، (١) ئاشی سەرداری، (٢) ئاروەندی هی هەولێرییەکان بوو، (٣) ئاشی قاسمە فەندی هی ماڵی مەلا فەندی بوو.

**٩- ئاشی هەباسی:** ناوی شوێنەواری ئاشێکی زۆر کۆنە لە دەو کەندەڵانەکی دروستکرابوو، لە مابەینی گوندی پیرداود و دووگردکان هەڵکەوتبوو، مێژووەکەی دیار نییە و خەڵکی ناوچەکەش کەسی وا نەماوە، کە ئەو ئاشەی دیبێ کاری کردبێت، تەنیا ناوەکە و شوێنەوارەکەی مابوو، کە ئەو شوێنە (کاولە ئاش) بووە.

**١٠- ئاشی گۆسکەی:** گۆسکە ناوی گوندێکە کەوتۆتە دەشتی ملکیەی سەر بە ناحیەی قوشتەپەیە، بە (٢٢)کم لە خوارووی شاری هەولێر هەڵکەوتووە، ئاقاری لەگەڵ ئەو گوندانەی خوارەوە لەسەر یەکە، لەوانە (مێرخوزار، پرینگە، قووچەبرباس، برایمەلەک، شارۆچکەی قوشتەپە)، دەڵێن کاتی خۆی ئەو گوندە لە ئاقاری گوندی (پرینگە)ی جودا کرایتەوە، (پرینگە)ش هی بنەماڵەی (سوڵتاناغای قورشاغلوی) بووە، جۆگەو ئاوێکی پێدا دەڕۆیشت، برنج و شیناییەکی زۆری لەبەر دەکرا، ئاشێکی ئاویشی لێ بوو، (ئاشی گۆسکە)یان پێدەوت، هی ماڵی (حەسەنی شێتە)ی بوو، ئەو گوندە بوو بە هی بنەماڵەی فارساغا، حەسەنی شێتەی عەوێنەیی (رەشید)ی برازای لەوێ دانابوو، لەپاشان بە (رەشید گۆسکە) ناسرا، لە فۆلکلۆری دەشتی هەولێردا وا هاتووە:

**عەوێنەم عەوێنەیە**
**گوندی (حەسەناغە)یە**
**ئاشی وا لە (گۆسکە)یە**

**١١- ئاشی پرینگەی لە دەشتی ملکیەی دەشتی هەولێردا،** (٢) گوند بەو ناوەی هەیە، هەردووکیشیان ئاقاریان لەسەر یەکە و سەر بە ناحیەی قوشتەپەن، کاتی خۆی یەک گوند بوونە، بە موڵک هی بنەماڵەی (سوڵتاناغای قورشاغلۆ) بووە، پاشان گۆڕان روویداوە بەشێکی کەوتۆتە بن دەستی بنەماڵەی (ئەحمەداغا)، کە پاشان بە (ئەحمەد پاشا) ناسرا، ئەحمەد ئاغا (مامی نادری) برای رەوانەی ئەوێ دەکات بە (پرینگەی نادراغا) یان (پرینگەی سەرێ) ناسرا، بەشەکەی دیکە بووە هی بنەماڵەی دۆغرەمەچییەکانی هەولێرێ، بە (پرینگەی عەلیاغا) یان (پرینگەی

خواریّ) ناسرا، پاشان بووە هی حەمەداغای برای عەلی پاشای دۆغرەمەچی، ئەو گوندە ئاشێکی ئاوی لیّ هەبوو.

**١٢- ئاشی قوشتەپە:** جگە لە شارۆچکەی قوشتەپەی، کە مەلّبەندی ناحیەکەو دەڤەرەکەیە، (٢) گوندی دیکەش بەو ناوە هەیە، (١) قوشتەپەی گەورە، (٢) قوشتەپەی گچکە، کە ئاقاریان لەسەر یەکە هاوسنووری ناحیەکەن، قوشتەپەی گەورە (٢) کارێزی ئاوی هەبوو، یەکێکیان لەناو گوندی ئاوەکەی دەردەبوو، بەناو گوندیدا دەهات، ئەوەی دیکەیان لەبەرەوەی ئاوایی بوو، ئاوێکی زۆری هەبوو، دەغلّ و دانیان پیّ رەباس دەکرد، تووتن و برنج و شینایییەکی زۆریان لەبەردەکرد، رەز و باغێکی گەورەی لەبەر کرابوو، نزیکەی جێگای (٦-٧) عەربە گەنمی داگرتبوو، جۆرەها داری بەرداری تێدابوو، ئاشێکی ئاویشی هەبوو، کە بە (ئاشی قوشتەپە)ی بەناوبانگ بوو، هی مالّی (سلێماناغای حاجی ئەحمەد)ی بوو، تا سەرەتای سالانی چلەکان هەر مابوو، ئیشی دەکرد، بەلام لەگەلّ بە دیارکەوتنی ئاشی ئاگر ئەو ئاشەش لەکار کەوت.

**١٣- ئاشەکانی داوداغای یەعقوبی:** لەسەر ئاوی کارێزی یەعقوباغای لە ناو سەربازگەی هەولێر (٣) ئاشی ئاوی هەبووە، کە ئەو کاتە ئەو شوێنە سەربازگە نەبوو، زەوی و زارو رەزو باغی بنەمالّەی یەعقوباغا بووە، ئاشەکانیش، (ئاشی، گەورە و ناوەنجی و گچکە) بووە، خەلّکی شاری هەولێر و گوندەکانی دەوروبەری شار بۆ لێکردنی باراش دەچوونە ئەویّ، مامۆستای بەرێز (سەید نەژاد بەرزنجی) لە دایکبووی سالّی(١٩٢٠)ی قەلای هەولێر بۆی گێرامەوە وتی: (٧-٨) سالّ دەبووم دایکم بەگەر (مام عومەراغا) ناوێکی دام لۆ ئاشی یەعقوباغای، ئەو مام عومەرە بە پارە بە کەر و باران باراشی لۆ خەلّکی دەبردە ئاشی و لێی دەکرد و دەیهێناوە، پیاوێکی پیر بوو، ئەمنی لەسەر پشتی کەرەکەی سوار کرد هەتا گەیشتینە ئەویّ، گەنمەکەمان لێکرد، کە گەراینەوە مالّەوە دایکم تەمەشای ئاردەکەی کرد، وتی: ئاردێکی خراپە، کەپەکی زۆرە، پێش هەنگینیّ دەیانگۆ خەلّک بە کاروانان بە هێستران دەچوونە (شاری موسل)یّ لەویّ دەیان وت (ئاشی ئاگر) هەیە، ئاردەکە جوانە، درشت نییە هووردە، پاشان پیاوەک ناوی (جەعفەراغا) بوو، ئاشێکی ئاگری کری، هات لە بەرامبەر مزگەوتی (حاجی قادری دەباغی هەولێری) دایمەزراند، بەراستی لۆ فەقێیەکانی مزگەوتەکە زۆر ناخۆش بوو، دەنگە دەنگی ئاشەکە فەقێیەکانی هەرەسان کردبوو، پاشان (ئەحمەد چەلەبی) ماکینەی ئاردی کری و مەکینەی کارەبای هێنا، وابزانم لە سالّی (١٩٣٤) بوو.

**١٤- ئاشی گردمەلای:** لە گوندی گردمەلای بوو.

**١٥- ئاشی مورتکە:** لە گوندی مورتکە بوو.

**١٦- ئاشی باشتەپەی:** لە دەو کەندی باشتەپەی بوو.

**١٧- ئاشی مێرخوزاری:** لەسەر جۆگەی مێرخوزاری بووە.

**١٨- ئاشی عەباسی:** ئەو ئاشەش هی مالّی شێخی چۆلی بووە، لە گوندی (ئاغولان)یّ لەسەر چەمی ئاغولانیّ دامەزراوە، ئەو گوندە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای دەشتی بەرانەتی چەمێکی زۆر چر و پری هەبوو، کاتی خۆی بەراز و گیانداری کێوی تێدا بووە، چەمێکی بەناوبانگ بوو، لە نزیک چاکی ئەسحابە رەشەیە، هەنووکەش شوێنەواری کاولە ئاشەکە هەر ماوە.

**سەرچاوەکان:**

بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لە پیرە بەسالاچووەکانی دەڤەرەکە وەرگرتووە.



# چاپخانەکانی شاری هەولێر

**ئەسعەد جەباری**

**چاپخانەی کوردستان**
**(زاری کرمانجی)**
**١- دامەزراندنی چاپخانەی (زاری کرمانجی) لە ڕەواندز**

بەرلەوەی باسی چاپخانەکانی شاری هەولێر بکەم دەمەوێ وەک ڕێزلێنان بۆ هەردوو خوالێخۆشبووان حوستێن حوزنی موکریانی و گیوی موکریانی باسێکی خۆیان هەیەو بەپێنووسی مەرحوم گیوی موکریانی لە گۆڤاری (هەتاو) ژمارە ١٦٩ی ٦ی بەفرانبار ڕۆژی هەینی ١٥ی کانوونی دووەمی ١٩٦٠ لەژێر ناونیشانی (مێژووی دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان) هەر وەکو خۆی و بەڕێنووسی ئەو سەردەمە بڵاو بکەمەوە.. دیارە گیوی موکریانی لەم نووسینەیدا مەبەستی چاپخانەی (کوردستان)ە کە لەشاری هەولێر دایمەزراندووەو ئامـاژە بۆ ئەوەش دەکات کە ئەم چاپخانەیە هەر چاپخانەکەی (زاری کرمانجی)یەو پاشماوەی ئەو چاپخانەیەیە کە لە (ڕەواندز) دامەزراوە، ئەمەش دەقی نووسینەکەیە:

"مێژووی دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان

داماو حوزنی موکریانی لەپاش ئەوەی لە ١٢ ساڵان بۆ کۆکردنەوەی کەرەستەی مێژوویی کوردان بەهەموو کوردستانی ژێر دەستی عەجەم و رووس و عوثمانییە ناپاکەکاندا گەڕاوە هەر بۆ ئەو ئامانجە کتێبخانە گرنگەکانی ئەستەنبۆل و سوریەو لبنان و مصر و پاریس و بەرلین پشکنێ و هەر کتێبێکی بە هەر زمانێ کە کەم و زۆر باسی کوردو کوردستانی بکات بەهەر نرخێکی بێ کڕیوە وە لە ١٩١٢ دا بڕیاریدا کە لەشاری حلبێ دانیشن بۆ ئەوانەی کۆی کردوونەتەوە بیانکاتە کوردی و چاپیان کات وە بۆ ئەم ئامانجە چاپخانەشی بەپیتەکانەوە لە ئەڵەمانیا کڕی لە ١٩١٤ دا لەبەر شەڕی گەورەی یەکەم دواکەوت بەڵام لە ١٩١٥ دا لەڕێگای بێروتەوە گەیشتە حلب و دامان مەزراند کە پیتەکانمان دابەش کرد (پ، چ، ژ، ڤ، گ)ی تێدا نەبوو کاکم ناچار بەقەڵەمی مۆرچییەتی قالبەکانی دروستکرد و ناردییە ئەڵەمانیاو

بۆیان دارشتین و لەوێ لەماوەی چەند ساڵێکی دا بەزاراوەی باکورو سۆران چەند کتێبێکی مێژوویی و عقیدەی ئیمان و مولودنامەو چەند جۆرە گۆڤارێکی کوردی و گەلێک ئاگاداری چاوراومان بەپێچەوانەی فرانسە و ترکان بەدزی پێ چاپکردوە چونکە فرانسەکان بە مور رێگایاندا بە تورکان کە بچن پشتی هێزی شۆرشی شێخ سعید بگرن وە هێزو تۆپ و فرۆکەشی دانێ.

داخەکەم ئەو سیانەی خوارەوە نەبێ ناوی هەموویانم لەبیرچۆتەوە.

١- مێرگەی دڵان (مێژوو).

٢- گەوهەری باگانە - چوار بەرگ مێژوویی.

٣- خونچەی بەهارستان.

ئێستا تەنها خونچەی بەهارستان ماوە چونکە لەپێش هاتنی خۆماندا هەزاران بەرگێکمان بۆ عێراق بۆ مستەفا پاشا نەمرود ناردبوو ئەوانی تر لەحلب بە ماڵ و خانوو هەموو شتێکەوە دەوڵەتی فرانسە سەبارەت بەدڵی تورکان سوتاندی.

و کاکیشمیان (١١) مانگان لە گرتووخانە تاریکرد، لەرووی ئەوەوە کە داماو دەپازدە پیشەی (صنعة)ی هەبو.

رۆژی دەپازدە لیرەیەکی سوری زێری دەست دەکەوت پارەی زۆر بوو هەرچی هەیە دای بە پارێزەر (محامی)انی کوردو ئەرمەنی تا رزگاریان کرد.

جاران پتر چوونە بیروت و پاریس لە ١٩٢٥ دا هاتینە بەغداو لە ١٩٢٦ دا چووینە رەواندزی وە چاپخانەکەمان ناو نا زاری کرمانجی بە یادگاری شەهیدەکانی باکور، وامتیازی گۆڤارێکی کۆمەڵایەتی و هونەری و وێژەیی و مێژوویمان بەناوی (زاری کرمانجی) وەرگرت کە سەرنووسەرو بەرپرسیار داماو (حزنی)و هەڵسووڕێنەری بەندە بوو تا تەموزی ١٩٣٢ ژیا لەماوەی ٧ ساڵاندا لەبەر بێ یارمەتی و دەست کورتی خۆمان ٢٥ ژمارەی لێ دەرچوو چونکە یاریکەرمان نەبوو بەپێی خۆی ناومالی خۆشمان وورده وورده دەفرۆشت دەماندا بەقاقەزو مەرەکەب و شەکرو چا سەرڕای ئەوەش چاوراوی مەلاکانی رەواندوزی سەبارەت بە دڵی تورک و عەجەمان و پۆلیسەکانی نوری سعیدی لەژێر پەردەی ئاینی دا ئێمەی شرکرد دەیانگوت ئەو جۆتە برایە کافرن تەماشا بەزمانی زەندەقە (کوردی) دەنووسن ئای جاسووسن بەکورتی ئێمەیان والێ کردو گەیشتینە رادەیەکی وا کە ساڵی لە جێژنانیشدا چاومان بە برنج و گۆشت نەدەوکەوت جاری واهەبوو دەبوو مانگێکی تەواو نانی بەناوی قووت بدەین شەکرو چاشمان بۆ نەدەکڕا چونکە وایانکرد کە خەڵک پێیان کفربوو دەست لەکتێب یا گۆڤارێکی کوردی بدەن وە بۆمان نەدەفرۆشرا بەڵێ ئەو چاوراوو درۆو بوختان و ساختەکاریە هەر دەوامی کرد بۆیە بەدوو برایان بە چاپخانەی خۆمانەوە نەمانتوانی لەماوەی چل ساڵاندا خزمەتێکی تەواو بەدڵی خۆمان بۆ نەتەوە دواکەتوو و خاک دابەشکراو و چارە رەشەکەی کوردان بکەین، بەڵێ ناپاکێتیان لەگەڵ ئێمە نەکرد بەڵکو لەگەڵ نەتەوەی کوردیان کرد چونکە ئێمە ٥٠ ساڵە خۆمان و سەرو ماڵ و چاپخانەکەمان کردۆتە قوربانی بۆ بووژاندنەوەی ناوی کورد و کوردستان لە هەموو لایەنێکەوە خزمەتمان کردوە بەتایبەتی زمان و وێژەو مێژووی کورد ئەگەر کەسێکی چاوراوی دوژمن و کلکەکانی استعمار کاری لێ کردبێ دەتوانی ئەوە بکاتە بەڵگە ئەگەر ئێمە هەر دووک برا بەو هەموو تواناو دەسەڵاتانەوە کە لەگەڵێک زانیاری و پیشەسازیماندا هەیە ئەگەر بۆ خزمەتی کورد روومان لەکوردستان نەکردبایەو لەشارێکی وەکو حلب یا بغداد خەریکی کاسبی باین ئایا ئەمرۆ لە هەموو کوردستاندا کەس لەئێمە دەوڵەمەندتر دەبوو؟ ئێستاش نەتەوەی کورد یارمەتی ئێمەی دابا یەکێکی وەکو من لەجیاتی ئەوەی کەکاری رەنجبەرێکی بکەم و تەمەنم لە کارێکی وادا بەسەربچێ بەنووسین لە وێژەو مێژوو و ئیتر کارم کردبا نەتەوەی کورد خێری پتر لێ نەدەدیم؟.

ئەوا گەیشتینە ١٥ / ١ / ١٩٦٠ بەو هۆیە مێژووی دامەزراندنی چاپخانەی کوردستان گەیشتوتە (٤٥) ساڵان چونکە لە ١٩١٥ دا لە حلب دامەزراوە خۆی لە دارو بەرد دای ترک وعەجەم و استعمار و جاسوسەکانیان کە بەلایانەوە وابوو بەڵێ یارمەتی و یا لەبەر چاو و راو لەخزمەت سارد دەبمەوە ئەوا بەکوێرایی چاوی دوژمنانی کوردو کوردستان بەگرەودانی خانووی نیشتەمەنی منداڵەکانم چاپخانەیەکی نوآی ئۆتۆماتیکم لە ئەڵەمانیادا کری، بەهەموو چەشنە پیتێکی تازەوە.

داماو (حزنی) کە زەبر و زەنگی زەوی و ئاسمانی بەهەزارجار زیندان و ماڵ سوتاندن و تالانکردن و هەڕەشەو گوڕەشەو درۆو بوختانی پڕ بەدونیا نەیانتوانی لەخزمەتی کوردو

کوردستانی سارد بکەنەوە منیش سەرەڕای ئەوەی کە برای ویم یارمەتی ئەدرێم کاروبارم هەر بەسستی دەڕوا کە یارمەتیش بدرێم ئەو خزمەتانەی کە لەژووری بیرو باوەڕتاندایە لەتوانامدا هەیە پێشکەشتانی بکەم ئیتر وەبالی ئێمە و نەتەوەی کوردیشە وەئەستۆی ئێوە."

ئەم نووسینەی مەرحوم گیوی موکریانی پێویستی بە هیچ خوێندنەوەیەک نییە و خۆی گوزارشت دەکات لە راستی و دروستی ئەو رووداوە مەزنەو ژیان و گوزەرانی هەڵکەوتەی کوردو کوردستان مەرحوم حسێن حوزنی موکریانی و ئەو رەنجەی داویەتی بۆ ئەو بوارەی کە رۆژ ئازاری پێوە چەشت و سەرگەردانی زۆر پێوە بینی بە هۆی کارەکەیەوە.. ئەوەتا گیوی خوالێخۆشبوو کاتێ لە ژیاندا بووە بەو شێوەیە باسی خۆی و براکەی و ماڵ و منداڵی خۆیان دەکات.

بە راستی دڵسۆزی ئەو دوو جوامێرە بۆ کارەکەیان و هەنگاونان بۆ پەرەپێدانی کاری رۆژنامەوانی و دەزگای چاپ نیشانەی ئەوپەڕی خۆشەویستییە بۆ ئەدەب و وێژە و کلتوور و هونەر و مێژووی گەلەکەمان و خەرمان بەرهەمەکانی دەست و پەنجەی ئەو بەڕێزانە لەمێژوودا هەمیشە بەشانازیەوە باس دەکرێن.

ئەندازیاری ئینگلیزی (هاملتون) لە کتێبەکەی خۆیدا بەناوی (ڕێگایەک لەکوردستان - طريق في كوردستان) لەو کتێبەیدا دەڵێ: حوسێن حوزنی موکریانی بە تەنها مێژوونووس نەبوو بەڵکو رۆژنامەنووسێکی ناوخۆیی و خاوەن ئیمتیازی رۆژنامەیەکی کۆمەڵایەتی بوو.. هەروەها دەڵێ: کاتێ مرۆڤ دەچێتە ماڵی ئەم کەسەو لەسەر دەرگای ماڵەکەی بە تابلۆیەکی مس لەسەری نووسراوە (زاری کرمانجی) ئەمەش ناوی رۆژنامەکەی بوو.. سەروتاری رۆژنامەکەی دەنووسی و خاڵ و پیتەکانی چاپی رۆژنامەکەی ئامادە دەکرد بە داری بەڕوە، هەر خۆی کاری چاپەمەنی و ڕێکخستنی لاپەڕەکان و تایپ و راکێشانی رۆژنامەکەی دەکرد لاپەڕە بە لاپەڕە.

ئەو چاپخانەیە بەردەوام بوو لە ڕەواندز تا ساڵی ١٩٣٦ ز. بەهۆی ئەو باردودۆخە دژوارەوە کە ڕووبەڕوویان دەبوویەوە لەلایەن دەسەڵاتداران و بەکرێگیراوان و دواکەوتووان و دەربەگەکانەوە چاپخانەکەیان لەو ساڵەدا گواستەوە شاری هەولێر.

ئەو چاپخانەیەی حوسێن حوزنی موکریانی بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٤٧ خۆی کۆچی دوایی کردو پاش ئەویش براکەی مەرحوم (گیوی موکریانی) سەرپەرشتی چاپخانەکەی کرد، لەو ماوەیەی کە گواستراوەتەوە بۆ هەولێر گۆڤاری (ڕووناکی)یان دەرکردووە.

ئەو چاپخانەیەی بنەماڵەی حوسێن حوزنی و گیوی موکریانی جگە لەچاپکردنی چەندین گۆڤارو رۆژنامە لە کوردستان، زیاتر لە ١٤٠ کتێب و نامیلکەی لەچاپداوە وەکو کتێبەکانی (مەم و زین، مێرگەی دڵان، خونچەی بەهارستان، کوردستانی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، مێژووی ناودارانی کورد، مێژووی میرەکانی مەهاباد، فەرهەنگی نۆبەرە، دیوانەکانی حاجی قادری کۆیی، نالی، سالم، کوردی) هەروەها چاپکردنی گۆڤارەکانی (زاری کرمانجی، ڕووناکی، هەتاو، هەولێرو....هتد).

ئەم چاپخانەیە گرنگی و بایەخی خۆی هەبووە لە هەولێرو سەرتاپای کوردستان و ئەو مێژووەشی کە هەیەتی ئەوەی سەلماندووە کە سەرکەوتووانە کارەکانی خۆی راپەڕاندووەو زاڵ بووە بەسەر هەموو کۆسپ و تەگەرەیەک کە هاتبێتە ڕێی.

**چاپخانەی سەلاحەدین**

٢- چاپخانەی سەلاحەدین لە ساڵی ١٩٦٣ لەلایەن (ئەنوەر ئیبراهیم ئەحمەد حەقی)یەوە دامەزراوە.. سەرەڕای ئەوەی ئەم چاپخانەیە لەسەرەتا کەرەسەکانی زۆر پێشکەوتوو نەبوون بەڵام بۆ پێویستیەکانی ئەو شارە باش بوو چەندین دیوانە شیعر و کتێب و نامیلکەی پێ لەچاپدراوە.

**چاپخانەی پەروەردە**

٣- ئەم چاپخانەیە ساڵی ١٩٧٠ دامەزراوە یەکێکە لەدەسکەوتەکانی بەیاننامەی ١١ی ئازار - ئەم چاپخانەیە کۆمپانیایەکی ئەڵمانی بەناوی (ئونیکا) هێنای بۆ هەولێر بەبڕی ٣٥٠ هەزار دیناری ئەو کاتە..هەروەها لەگەڵ کۆمپانیای (ئەلینو تایپ) ڕێککەوتن بۆ هێنانی دوو ئامێری چاپی لاینۆ لەگەڵ هەموو کەرەسەکانی بە ٦٠ هەزار دیناری ئەوکات.

سەرەتا ئەم چاپخانەیە ئەم سێ بەشەی بۆ دانرا:-

١- بەشی بەرهەمهێنان.
٢- بەشی کرێکارەکان.
٣- بەشی کارگێڕی.

پاش ئەوەی کە هەموو ئەم چاپخانەیە تەواو بوو بە بڕی (٦٠٣) هەزار دیناری ئەو کاتە لەڕۆژی ٥ / ١ / ١٩٧٨ لەئاهەنگێکدا چاپخانەکە کرایەوە.

ئەم چاپخانەیە رۆڵی گەورەی بینیوە لەچاپدانی کتێبەکانی پرۆگرامەکانی خوێندن و خوێندنگەکان، هەروەها ئەم چاپخانەیە رۆڵی هەبووە لە پێشخستنی بزووتنەوەی رووناکبیری لەشاری هەولێرو هەموو کوردستان.

**چاپخانەی شارەوانی هەولێر**

٤- ئەم چاپخانەیە لەناوەڕاستی سالی ١٩٧٤ ز دامەزراوە.. لەم چاپخانەیەدا دەزگایەکی نیو بەتاڵ و دەزگایەکی بچووکی بازرگانی تیابووە جگە لە هەبوونی مەقەس بۆ بڕینی کاغەز، ئەم چاپخانەیە لەلایەن شارەوانی هەولێرەوە سەرپەرشتی کراوە.

پاش نوێکردنەوەی ئەم چاپخانەیەو هێنانی چەندین بەش ئامێری تر بۆ رێکخستنی چاپخانەکەو بەبڕی ١٤٠ هەزار دینار ئەوکات چەندین کەرەسەی بۆ دابینکراوە.

لەم چاپخانەیەدا سەرەڕای ئەوەی کاروبارەکانی دەولەتی پێ چاپکراوە بەلام چەندین دیوانە شیعرو نامیلکەو کتێبی پێ چاپکراوە بەهەردوو زمانەکانی کوردی و عەرەبی.

**چاپخانەی رۆشنبیری**

٥- ئەم چاپخانەیە کاتی خۆی بەمەبەستی خزمەتکردنی باری رۆشنبیری کوردی دامەزراوە! لە ٧/١/١٩٨٤ بۆ یەکەمجار دەست بەکاربووەو یەکەم نامیلکەشی چاپکردووە، کتێبێکی خوالێخۆشبوو (دکتۆر نافع ئاکرەیی)یە.

ئەم چاپخانەیە هەموو بەشەکانی لەخۆگرتووەو کاتی خۆی یەک ملیۆن دیناری تێچووە.. بەشەکانیشی بریتییە لە:

بەشی مۆنتاژ.
بەشی وێنەگرتن.
بەشی چاپ.
بەشی کارگێڕی.
بەشی رێکخستنی کارە هونەرییەکان.
بەشی بەرهەم.
بەشی وەرشەی هونەری.
بەشی گەنجینە.

لەم چاپخانەیەدا دوو دەزگای ئەلدینۆ تایپیان هەبووە لەگەڵ ئامێرێکی کۆپی و ئامێرێکی دابەزاندنی رەنگاورەنگ.

بەدرێژایی تەمەنی ئەم چاپخانەیە تا بەر لە راپەڕینی ١٩٩١ دەیان کتێبی چاپکردووە جگە لەچاپدانی رۆژنامەو گۆڤار.

**چاپخانەی ئاسۆ**

٦- ئەم چاپخانەیە سالی ١٩٨٨ لەلایەن عەبدوللا ئەبو زێد دامەزراوە.. ئەم چاپخانەیە زیاتر چاپخانەیەکی بازرگانی بووە.. کارتۆن و تابلۆی کاغەزی سەر کەرەسەکانی خواردنی پێ لەچاپدراوە.. چاپخانەیەکی بەتاڵ بووە، کارمەندی سەرەکی ئەم چاپخانەیە عەبدوللا مەحمود بووە.

**چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین**

٧- ئەم چاپخانەیە لەسالی ١٩٨٥ لەزانکۆی سلێمانییەوە گواستراوەتەوە بۆ زانکۆی سەلاحەدین بەهەموو کەرەسەکانییەوە - (دکتۆر لەتیف حەسەن نەجارو ئوستاز ئەحمەد)دوە سەرپەرشتی کراوە تاسالی ١٩٩١.

لەم چاپخانەیەدا چەندین کتێب و نامیلکەو پرۆگرامەکانی خوێندنی زانکۆ چاپکراون.

ئەو دەزگاو چاپخانانەی دوای راپەڕینی ١٩٩١ لە هەولێر دامەزراوە.

١- دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس.
٢- چاپخانەی حاجی هاشم.
٣- چاپخانەی ماردین.
٤- چاپخانەی نەوا.
٥- چاپخانەی ئارێز.
٦- چاپخانەی پاک.
٧- کۆمەلگای شەهاب بۆ چاپ.
٨- دەزگای مێرگ.
٩- چاپخانەی کشتوکاڵ.
١٠- چاپخانەی موکریانی.
١١- چاپخانەی کاروان.
١٢- چاپخانەی هێڤی.
١٣- چاپخانەی رۆژهەلات.
١٤-چاپخانەی منارە.
١٥- چاپخانەی هاوسەر.
١٦- چاپخانەی بێریڤان.
١٧- چاپخانەی ژیان.
١٨- چاپخانەی ژین.
١٩- چاپخانەی کەوێل.
٢٠- چاپخانەی دارا.
٢١- چاپخانەی بژار.
٢٢- چاپخانەی سەید برایمی برژاو.
٢٣- چاپخانەی هەرێم.
٢٤- چاپخانەی نور.
٢٥- چاپخانەی چرا.

# کتێبخانە کۆنەکانی شاری هەولێر

کتێب جوانترین هاوڕێی مرۆڤە و مرۆڤیش لە خوێندنەوەی کتێب فێری زۆر زانست و زانیاری دەبێ، مێژووی نەتەوەکەی و وڵاتەکەی دەناسی، چێژ لە شیعری شاعیرەکانی وەردەگرێت و دەچێتە ناخی هەموو باسێکی بەسوود، کتێبخانەش شوێنی فرۆشتنی ئەم گەنجینانەیە، بۆیە لەشاری هەولێر کتێبخانە زۆر بووە. چاپخانەکەی مامۆستا (گیو موکریانی)، کە جۆرەها دەستنووسی نووسەرەکانی کوردی بەچاپ گەیاندووە، چاپکراوەکانی خۆی لە چاپخانەکەیدا دەفرۆشت، بۆیە دەتوانین بە چاپخانەی کوردستانی مام گیوی خوالێخۆشبوو بڵێین کتێبخانەی کوردستان، لە سەرەتای هاتنی ئەم چاپخانەیە لە رواندزەوە بۆ هەولێر، شوێنەکەی لەسەر چایخانەی (رەشید کاکۆ)، لەبن قەڵات بووە بەرامبەر بازاڕی هەولێر و تا رووخاندنی ریزە دووکانەکەی ئەحمەدە فەندی هەر لەوێ بوو.

لە سالآنی ١٩٣٧ - ١٩٣٨ عەبدولعەزیز ئەفەندی کتێبخانەی (شیمال)ی دانا و بەزۆری لەبەر کەمی چاپەمەنی کوردی گۆڤارەکانی میسری و لوبنانی و عێراقی دەفرۆشت، وەک (مصور)و (اخر الساعة، الاثنین) و هی تریش و لەسەر داوای سەربازە ئینگلیزەکان رۆژنامەی (لەندەن تایمز)ی دەهێنا بۆ فرۆشتن و وەکیلی بڵاوکردنەوەی گۆڤاری گەلاوێژ بووە لە هەولێر.

کتێبخانەی هەولێر لە ناوەڕاستی چلەکان لە لایەن (شێخ محەممەد محەمەد (شێخەشەل) دانراوە، ئەویش وەک کتێبخانەی شیمال چاپکراوی ئەوسای دەفرۆشت.

کتێبخانەی جیهاد، کە خاوەنەکەی (عەبدولرەحیم سائغ) بووە و کتێبخانەی سەربەستی لەلایەن (مەلا رەئووف مەعروف سەربەستی)یەوە لە پەنجاکان هەبوون و کتێبخانەی شۆڕش، کە خاوەنەکەی (قادر شۆڕش) بووە و کتێبخانەی ئازادی لە پاش شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ لەلایەن (تەلعەت نوری) دانراوە.

(جمعیة الاخوة الاسلامیة) کتێبخانەیەکی بۆ (موحسین ئەحمەد) دانا بوو بۆ فرۆشتنی پەڕاوی ئایینی و بڵاوکراوەکانی ئەم کۆمەڵەیە، ئەم کتێبخانانەش لە هەولێر هەبوونە: (هەولێر، خۆشناو، کوردستان سەرکەوت، سیروان عەسکەری، حەیدەری) ، ئەم کتێبخانانەش ئێستا لە هەولێر کتێب دەفرۆشن: التامیم، زانا، سۆلاف، ماردین و هی تریش هەن. کتێبخانەی میریش (گشتی) تا سالی ١٩٤٥ بەشێوەیەکی سادە و بچووک بوو، لەسالی ١٩٦١ بینایەکی گەورەیان بۆکرد و ئێستاش لە سەرەتای هەشتاکان بینایەکی تریان بە شێوەیەکی زۆر فراوان بۆ دروست کردووە.

*** لە کتێبی هەولێر بە سەرپەرشتی و رێکخستنی تەحسین چیچۆ و شێرزاد قادر لاپەڕە ١٤٤-١٤٥ وەرگیراوە.**

# چایخانەكان

یەكەمین چایخانە، كە مێژووی بوونی لە هەمموویان كۆنترە، چایخانەی (مام ئەنیشتەی ئەرمەن) بووە، كە بەرامبەر چێشتخانەی تاجربانی ئێستا و نزیك حەوزەكەی ئاوی بازاڕ بووە.

**قاوەخانەی عەبۆ:**

خاوەنی ئەم قاوەخانەیە لە بنەماڵەیەك بووە، كە بە خاوەن قاوەخانە و قاوەچیاتی ناودار بوون و قاوەخانەكەی دوو بەش بووە: "شوێنی زستانان و هاوینان"، حەوزێكی بچووكی ئاوی لە ناوەڕاستی شوێنە هاوینییەكەی بووە، كە بەرزاییەكەی (٦) مەتر دەبوو، ڕووی پێشەوەی بە نەخش و قەوس و جامخانە بوو و شوێنەكەی بەرامبەر مزگەوتی خانەقا بووە.

**چایخانەی مام جەمیل:**

ئەمەشیان لە جێگای باڵەخانەی عەبدوڵڵا شێخۆ، كە شوێنی هەر سێ كەبابخانەكەی بەرامبەر پەیژەی پیادەی قەڵاتە، ئەویش وەك قاوەخانەی عەبۆ شوێنی هاوین و زستانی هەبووە.

**چایخانەی حەسەن ڕەزا:**

چایخانەكەی مەچكۆی ئێستایە.

**چایخانەی حەسەن قانون:**

یەك چایخانە بووە لە گەڕەكی تەیراوە.

**چایخانەی تاقی:**

كرێكار و وەستای لێ دادەنیشت لەسەر شەقامی قەڵات بەرامبەر بازاڕ بووە.

**چایخانەی عەلی فلەیح:**

لەڕیزە دووكانەكەی بن قەڵات بووە، كە ڕەمەزانان حیكایەتخوان و بەیتبێژی لێ دادەنیشتن و مەجلیسیان خۆش دەكرد، زۆر قەوانی گەنج خەلیلی لێ دەدرا و لەگەڵ قەوانەكە ئەم وشەیە تۆمار كرابوو (چای عەلی فلەیح)، هەروەها چایخانەی سەید سەلیم و محەمەد كۆیی و چایخانەی جەوهەر چایەچی و چایخانەی معلق و چایخانەی سەعیدكەللە كە لەناو نەجاران نزیك مزگەوتی حاجی قادر بووە، نابێت ئەوەشمان لەیاد بچێ لە ڕیزی ئەم چایخانانەی سەرەوە لە قەڵاتیشدا چایخانەی تر هەبووە.

**چایخانەی بایز:**

وەك شوێن و مەڵبەند بەهۆی ئەم چایخانەیە ناوچەكە بەناوی ئەو هەڵدراوە تا ئێستاش ئەم ناوچەیە هەر بە چایخانەی بایز ناودارە و ناوچەكەش دەوروبەری گۆڕەپانی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی هەولێرە. لەم چایخانەدا خەڵكی گوندەكانی ڕێگای موسڵ و كرێكاران و ئۆتۆمبێلەكانی ئەم ڕێگایەی لێ دەوەستا، كە وەك گەراجێك شوێنی كۆبوونەوەی خەڵكی ئەم ناوچەیە بووە و ئۆتۆمبێلی گاز و نەوت و لۆری گەورەی موسڵاویشی لێ ڕادەوەستا.

**گازینۆی عەنتەر:**

لەسەر ڕێگای عەنكاوە گازینۆیەك، كە دیوارەكەی پەرژینی بەدار و قامیش و لاولاو بوو، خەڵكێكی زۆری دەهاتێ و تا سەردەتای حەفتاكانیش مابوو خاوەنەكەی پیاوێكی گەورە و قەڵەو بوو، لەبەر قەڵەوییەكەی عەنتەریان پێ دەگوت، بەڵام ناوی ڕاستی خۆی (پیرداود) بوو، شوێنی دەوروبەر و نزیكی ئەم گازینۆیە ئێستاش بە گازینۆ عەنتەر ناودارە.





# چایخانە دێرینەکانی هەولێر

محەمەد سەعید کوردە

هەولێر شارێکی کۆن و دێرینی سەر ئەو رووی زەمینەیە، لە پاڵ ئەوەشدا خاوەن مێژوویەکی پڕ لە کەند و کلتوورو شارستانییەتێکی دەوڵەمەندە.

بەڵێ هەولێری قەڵا و منارە بەقەد مێژووە پڕ لە سەروەرییەکەی جێگاو شوێنی بەناوبانگی هەبووە، ئەو شوێنانەش تا ئەوڕۆکە بەشانازییەوە لە کۆڕو مەجلیس و بۆنە تایبەتی و گشتییەکاندا باسی لێوە دەکرێت و بە بەشێکی زۆر گرنگ و پڕ بایەخی شارەکە لەقەڵەم دەدرێت. یەکێک لەوانەش چایخانە دێرینەکانی هەولێرە، کە هەموو کات شوێنی دیدەنی کۆڕو کۆبوونەوەو کات بەسەربردنی دەیان و بگرە سەدان پیاوماقووڵ بووە، بۆیە تا مێژووی ئەم هەولێرەش مابێ ناوی چایخانەو ئەو شوێنانە هەمیشە بە نەمری دەمێننەوە...

بێگومان هەر ئەوەش هانیدام چەند زانیارییەکی پێویست لە دەمی بنەماڵەو کەس و کاری خاوەن چایخانەکان کۆبکەمەوە، بەپێی ئەو هەلەی کە بۆم رەخساوە خزمەتێکی بچووک پێشکەش بە مێژوو و کەلتووری شاری هەولێر بکەم، بەو ئومێدەی لە داهاتوودا وەک ئەرشیفێکی دەوڵەمەند مامەڵەی لە تەکدا بکرێت و بە چاوی رێز و خۆشەویستییەوە سەیری بکرێت.

بۆ ئەو کاردەشم هەوڵێکی زۆرم دا مێژووی تەواوی ئەو چایخانانە تۆمار بکەم، کە بۆتە بەشێکی هەرە زیندووی شاری هەولێر، بەڵام دیارە کەم دەرفەتی و هەندێ هۆکاری دیکە هەر هێندەم بۆ کرا کورتە باسێکی ئەو چایخانە بەناوبانگانە تۆمار بکەم، کە ئەمڕۆ بۆتە وێردی سەر زاری گەورە و بچووک.

### چایخانەی عەبۆ

چایخانەی عەبۆ کە بە قاوەخانەی عەبۆ ناسراوە، چونکە ئەو کاتەی هەموو بەیانیان قاوەیان بە خۆڕایی دەدایە میوانەکانی، عەبۆ ناوی تەواوی (عەبدوڵلا سلێمان)ە و لە دەوروبەری ساڵانی (١٨٨٥) بە هۆی باوک و باپیرانییەوە ئەو چایخانەیان داناوە، بەڵام دوای کۆچی

دوایی مام عەبۆی قاوەچی، كوڕەكانی كاكۆ، پاشان نادر سەرپەرشتی چایخانەكەیان دەكرد.

سەرەتا شوێنی چایخانەكە لە ناو جەرگەی بازاڕ بوو، پاشان لە دەوروبەری ساڵی (١٩٠٠) گواسترایەوە بۆ لای گەراجی مەخموری كۆن، دواتر لە ساڵی (١٩٢٥) چووە بەرامبەر مزگەوتی خانەقا (كە دەكاتە شوێنی دەلالخانەی ئێستا)، بەڵام ساڵی (١٩٥٨) بۆ دواجار گواسترایەوە بۆ تەنیشت چێشتخانەی تاجریان.

(عەبدوللا سلێمان) ناوی بە ئازایەتی و مەردایەتی و جوامێری و یارمەتیدانی هەژاران دەركردبوو، بۆیە خەڵكی خۆشیان دەویست و نازناوی (عەبۆ)یان لێ نابوو.

میوانەكانی چایخانەكە بریتی بوون لە پیاوە ماقووڵ و ناسراوەكانی شاری هەولێر، كە سەرجەمیان ئاغا و فەرمانبەر و كاسبكار بوون، هەر چینێكیش لەوانە شوێنی تایبەتی خۆی هەبوو لە چایخانەكەدا. ئەوكاتەش نرخی چا بە یەك عانە بوو، كە دەیكردە (٤ فلوس)، پاشان بوو بە (١٠ فلوس) و لە دەوروبەری ساڵی حەفتاكانیش نرخەكەی بوو بە (٢٥ فلوس).

چایخانەی عەبۆ لە سەرەتادا شاگردی نەبوو، بۆیە ئەو كاتە تەنیا براو ئامۆزاكانی وەكو حاجی ئەمین و وەلی و محەمەد و تاهیر و یونس و منداڵەكانیان كاریان تێدا دەكرد و ئیش و كاری چایخانەكەیان بەڕێوە دەبرد، بەڵام لە ساڵی (١٩٦٠)ەوە شاگردیان بۆ چایخانەكە گرت،



لەوانەش كەمال و سابیر و عەلی و حاجی قادر و محەمەد حاجی و سەلاح و بەهرام و جەلال و... هتد بوون.

بۆ مێژوو دەڵێین چایخانەی عەبۆ، یەكەمین چایخانە بوو لە شاری هەولێر، كەوا لە ساڵی (١٩٥١)وە یاری (بلیارد)ی هێنایە شاری هەولێر، هەروەها یەكەمین چایخانەش بوو، یاریی شەترەنجی لە ساڵی (١٩٧٦ - ١٩٧٧) لە هەولێر بڵاو كردەوە، كە ئەو كات مامۆستایان (عەلی هەمزە) و (سەمیر عەبدوللا) پاڵەوانی شەترەنجی شاری هەولێر پاڵەوانەتیان بۆ ئەو یارییە رێك دەخست و پێویستییەكانیان بۆ دابین دەكرد، بۆیە بە داخێكی زۆرەوە دەڵێین لە مانگی ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٣ ژیانی ئەو چایخانە دێرینە بە هۆی چەند هۆكارێكی ناڵەباری ئەو كاتە كوژایەوە، بەڵام لە هەمان كاتدا دڵمان بەوە خۆشە دانیشتووانی شاری هەولێر چەندەها یادگاری شیرینی ئەو چایخانەیان لەیاد ماوە، كە هەمیشە بەتام و لەززەتەوە بۆ یەكتری دەگێڕنەوە.

بەڵێ دیمەنی دەیان سەماوەری هەمە قەبارە و نزیكەی بیست پیاڵە چای پڕی دەستی شاگردە ماندوونەناسەكان هەر لەبەر چاوی ئەو كەسانە ماوە، كە رۆژێك لە رۆژان هاتوچۆی چایخانەی عەبۆیان كردبێت، جگە لەوەی دەنگی زاری تاوڵە و چەقە چەقی دۆمینە و ئاوازی ئەو لاوك و حەیرانانەی كە لەسەر قەوانەكان تۆمار كرابوون، لەگەڵ گفتوگۆ خۆشەكانی ئەوانە تێكەڵ بە یەكتری دەبوون، بە ڕاستی دیمەنێكی هێندە سەرنجراكێشیان لێ دروست دەبوو، ناشێ هەروا بە ئاسانی لە یادبچنەوە.

## چایخانەی عەلی فلەیح

(عەلی فلەیح حەسەن) لە سەیدەكانی نەعیمییە، باوكی لە ئەسڵدا تەكیەیەكی دیاری لە شاری كەركووك هەبووە، بەڵام بەهۆی بار و دۆخی تایبەتی خۆی هاتە هەولێر.

عەلی فلەیح لە ساڵی (١٨٨٤) لە شاری هەولێر لە دایک بووە و ساڵی (١٩٢٠) لە بن قەڵای هەولێر چایخانەیەکی داناوە و سەرەتا خۆی سەرپەرشتی کردووە، ئەو کاتە بینایەکەی لە خوا لێخۆشبوو (عەبدولڕەحمان چەلەبی) بەکرێ گرتبوو، پاشان شوێنێکی دیکەی لە (شێخۆ ئاغا) کڕی و وەستاشی لە شاری موسڵ هێنا و چایخانەیەکی نموونەیی لە شووشە بەند بۆ زستان و هاوین دروست کرد.

ئەوانەی لە چایخانەکە کاریان دەکرد خوالێخۆشبووان (عەبدوللا و تەها قاوەچی) بوون. ئەوسا چا و قاوە لە چایخانەکە دەخورایەوە، نرخی چایەک بە یەک عانە بوو، بەڵام قاوەکە بە خۆرایی بوو، تەنیا پارەی چایەکە وەردەگیرا، بە هاوینانیش شەربەت و ماستاوی مەڕی هەبوو.

عەلی فلەیح یەکەم کەس بوو قەوانی هێنایە هەولێر، کە ئەوسا لە شاری موسڵ و بەغدا دەهات، ئەو قەوانەش بەقورمیش کاری دەکرد و دەرزییەکیشی هەبوو و دەکەوتە سەر بەکرەکە شێوەکەی بازنەیی بوو کە دەنگی چەندین حەیرانبێژی ڕەسەنی وەک کاوێس ئاغا و حەسەن حەیران و گۆرانی بێژەکانی دیکەی وەک ئوم کەلسوم و فەرید ئەتردش و عەبدولحەلیم حافز و... هتد لەسەر تۆمارکرابوو.

هەموو جارێکیش عەلی فلەیح لەسەر حسابی خۆی کاوێس ئاغای حەیرانبێژی دەنارده بەغدا بۆ ئەوەی تازەترین جۆری قەوانی بۆ بهێنێت، دیارە ئەو کاتە کاوێس ئاغا دۆستایەتییەکی بە تینی لەگەڵ عەلی فلەیحدا هەبووە بۆ ڕاستی ئەو قسانەشمان کاوێس ئاغا لە یەکێک لە بەیتەکانی (گەنج خەلیل ئاغا)دا دەڵێ لە چاوی عەلی فلەیحی.

ئەوانەی هەمیشەش دەبوونە میوانی چایخانەکە بە زۆری ئاغاکانی دزەیی و خۆشناوەتی بوون، وەک زیوەر ئاغا و سەعدی ئاغای برای شێخۆ ئاغا، کە شوێنی تایبەتییان هەبوو، هەروەها حەیرانبێژان و کەسانی دیکەش لە چایخانەکەدا بەزمی خۆشی و شادییان ساز دەکرد، زۆر جار حەیرانبێژان و ئەوانی دیکەش دەهاتنە چایخانەکە و دەیانگوت مام عەلی خەرجیمان نییە، ئەویش دەیگوت وا من بۆ پشوودان دەچمەوە ماڵێ، ئێوەش لەسەر دەخیلەکەبن و ئەو ماوەی چایخانەکە دەسکەوتی چەند بوو، بۆ خۆتان بیبەن. جگە لەوەی عەلی فلەیح بە شاگردەکانی دەگوت ئەوەی پارەی نەدا نەکەن پێی بڵێن، نەبادا پارەیان نەبێ، چونکە بە ڕاستی ئەو چایخانەکەی بۆ خۆشی و کات بەسەربردن دانابوو، نەک بۆ قازانج و دەستکەوت، چونکە خۆی بە سواری ولاغ کاری بازرگانی لە ئێران و توران دەکرد، جگە لەوەش حەزی لە ڕاووشکار دەکرد، هەر بۆیە لە ماڵەکەی خۆیدا لە گەڕەکی عارەبانی لای مزگەوتی شێخی چۆلی ژوورێکی تایبەتی هەبوو، کە تاژی و تووڵەی تێدا بەخێو دەکرد.

لە سییەکانیش جوولەکەکانی هەولێر کە کاری بازرگانییان دەکرد، ڕۆژانی شەموان کە پشوویان بوو، دەهاتنە چایخانەکە و هەرچییان بخواردبایە پارەیان لێ وەرنەدەگیرا.

عەلی فلەیح لە ساڵی (١٩٤٠) بۆ دواجار وازی لە کاری چایخانە هێنا و لە ساڵی (١٩٤٧) کۆچی دوایی کرد.

**چایخانەی حاجی مستیل**

(حاجی مستەفا محەمەد



ئەحمەد) ناسراو بە (حاجی مستیل) لە ساڵی (١٩١٢) لە شاری هەولێر لە دایک بووە، هەر لە سەردەمی لاویدا کاری شەربەت فرۆشی بووە و پاشان (قەتارچێتی) دەکرد و هەمیشە هاتوچۆی شنۆ و سابلاخی دەکرد و مافوور و قاڵی دەکڕی و دەفرۆشت، ئەوکاتەش بەو پیشەیەیان دەگوت (قەتارچی)، دواتر لە دەوروبەری ساڵانی (١٩٤٥ - ١٩٤٦) لە کۆڕیی دامێنی شارۆچکەی مەسیف سەلاحەدین چایخانەیەکی بچووکی دانا، چونکە ئەوساکە ماڵیان لە کۆڕێ بوو، پاشان لە ساڵی (١٩٤٩) هاتنەوە هەولێر و لەناو بازاڕی دارتاشەکان چایخانەیەکی دیکەی دانا، ئەوەبوو بۆ چەند شوێنێکی دیکەی گواستەوە، ئەو شوێنانەی کە چایخانەکەی لێ دانابوو، بریتی بوو لە خانی حاجی ئەحمەد ئاغا بەرامبەر کەبابخانەی کۆیە و کۆتری سەلام و هوتێلی سندباد.

هەروەها چایخانەیەکی هاوینەی لە تەنیشت سینەمای (حمراء) دانا، ئەوسا چواردەوری هەمووی چۆڵایی بوو.

دوا شوێنی کە چایخانەیەکی هاوینە و زستانەی لێ دانا، ئەو شوێنە بوو کە ئێستا بۆتە کەبابخانەی ئەربیل، ئەوسا (حاجی جەمیل) لە (عەلی فلەیح)ی رەحمەتی کڕیبووەوە و (حاجی مستیل)یش لە (حاجی جەمیل)ی کڕیبووەوە.

شاگردەکانی چایخانەکە بریتی بوون لە: کاک عوسمان محەمەد و کاک جەمال و کاک عەبدوڵڵا و



حاجی قادر، ئەوانەی دەهاتنە چایخانەکەش بە زۆری ئاغاکانی هۆزی گەردی و پیاوماقوڵانی شاری هەولێر بوون.

ئەو کاتەش نرخی چا بە (١٠) فلوس بوو، هەروەها بیبسی بە (٢٠) فلوس بوو، تەنیا قاوە نەبێ بەخۆڕایی دەدرایە خەڵک. لە چایخانەکەدا یاری دامە و دۆمینە دەکرا، پاشان لەسەر داوای مامۆستایان یاری (بلیارد)یش هاتە چایخانە، جگە لەوەی میوانان بە (١٠) فلوس ئێرگلەشیان دەکێشا.

لە چایخانەکەی (حاجی مستیل) قەوانیش هەبوو، کە دەنگی زۆربەی زۆری هونەرمەندانی کوردی، عەرەبی لەسەر تۆمار کرابوو. حاجی مستیل لە ساڵی ١٩٦٧ چایخانەکەی نەما و لە ساڵی ١٩٧٦یش کۆچی دوایی کرد.

**چایخانەی باییز**

(باییز ئیسماعیل مەحمود) یەکێک بووە لەو خاوەن چایخانانەی شاری هەولێر. لە ساڵی ١٩١٤ لە شاری هەولێر لە دایک بووە و لە هۆزی نانەکەلییە، مام باییز لە تەمەنی ١٨ ساڵییەوە شاگرد چایچی بووە، تا خۆی لە نزیک سینەمای سەلاحەدینی ئێستا چایخانەیەکی بچکۆلانەی لە حەسیر دروستکراوی دانا، دوای چەند ساڵێک چایخانەکەی گواستەوە سەر ڕێگای کۆن و ماوەی ٣٥ ساڵ لەوێ مایەوە تا ئەو کاتەی تاقەتی نەما و وازی لەو کارە هێنا، چونکە نزیکەی نیو سەدە تەمەنی خۆی لە چایچێتی بەسەر برد.

وەک دەگێڕنەوە و دەڵێن مام باییز لە شاری هەولێر باشترین چایچی زەمانی خۆی بوو، بە تایبەتی لەو سەردەمەی تورک و ئینگلیز لە هەولێر دەژیان، مام باییز مرۆڤێکی قسە خۆش و روح سووک بوو، هەر بۆیە شوێنی چایخانەکەی ببووە ناوچەیەکی گەورد بۆ گواستنەوەی ئەوانەی لە هەولێرەوە سەفەری

موسڵیان دەکرد، یان ئەوانەی لە موسڵەوە دەهاتنە هەولێر بە واتای ئەوەی چایخانەی باییز، هەم چایخانە و هەم وەک نەقلیاتێک وابوو، ئەوانەی لە لادێکانی دەوروبەریش دەهاتنە شار، دەبوایە سەرێک لە چایخانەکەی مام باییز بدەن و چایەکی شیرین لەوێ بخۆنەوە، چونکە بە هەقیقەت مام باییز خۆشی زۆری هەوەس بە چای شیرین دەهات. ئەوانەی هەمیشە میوانی چایخانەکەش بوون بە زۆری پیاوماقووڵ و ئاغاکان بوون، ئەوانیش حاجی ئیسماعل و عومەر گالۆن، حاجی سلێمان و حاجی قادری شنۆیی و گەلێکی دیکە بوون، یەکەم شاگردی چایخانەکە خوالێخۆشبوو مام ئەحمەد بوو، کە ماوەی ٢٠ ساڵ لەلای کاری دەکرد، دووەمین شاگردیش هەر ناوی مام ئەحمەد بوو، دواتر کاک فەیسەڵ و کاک عەدنان کاریان لەلا دەکرد.

لە چایخانەکەدا نرخی چایەک بە یەک عانە بوو، جگە لە چای، هێلکە و روونێکی چاکی هەبوو، باشترین چای ئەو کاتەش کە لە چایخانەکەدا دەخورایەوە (ابو کعب) (ابو کتلی) (ابو جمال) بوون.

مام باییز لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا، واتە لە رۆژی ١٩٩٤/٨/١٧ کۆچی دوایی کرد.

چایخانەیەکی دیکە بە هەمان ناوی باییز لە هەمان شوێنیش لە کاردایە، بەڵام ئەوەیان مام باییزی دووەمە و رەنگە لەبەر بەربڵاوی ناوی مام باییزی یەکەم، یان خۆشەویستیی چایخانەکەی بە هەمان ناوی مام باییز ناوزەندی کردبێت بۆ ئەوەی ناو و ناوبانگی مام باییزی یەکەم بێنێتەوە.

## چایخانەی مەچکۆ

(مەچکۆ) ناوی تەواوی (مەجید ئیسماعیل مستەفا)یە و ساڵی (١٩٢٣) لە شاری هەولێر لە دایک بووە،لە دەوروبەری پەنجاکان چایخانەیەکی دانا، ئەوکاتەی خۆی لەسەر شنگ و تاقەتی خۆی بوو، بۆیە بە تەنیا هەموو کاروبارێکی چایخانەکەی هەڵدەسووڕاند و هیچ شاگردێکی نەبوو، پێویستە بگوترێ چایخانەی مەچکۆ یەکێکە لەو چایخانە کۆنانەی تا ئەمڕۆش بەردەوامی هەیە و هەر لەو کاتەوە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت بە چایخانەی ئەدیب و رۆشنبیر و نووسەر و رۆژنامەنووسان بەناوبانگە، ئەگەر بتەوێ هەر ئەدیب و نووسەرێک بدۆزیتەوە ئەوا بێ شک لە چایخانەی مەچکۆیدا بە دیدەنی شاد دەبیت.

کاتی خۆی لە چایخانەکە بە تەنیا چا و شەربەت دەخورایەوە، چونکە مەچکۆی رەحمەتی خۆشی وەستایەکی زۆر چاکی شەربەت بوو.

لە چایخانەی مەچکۆدا، جگە لە کۆڕ و کۆبوونەوە و گفتوگۆی ئەدەبی و رۆشنبیری، یاری دۆمینە و تاوڵەی تێدا دەکرا بەڵام دوای ئەوەی مەچکۆی رەحمەتی لە ساڵی (١٩٦٢) کۆچی دوایی کرد، ئەوا (تەحسین)ی کوری شوێنی گرتەوە، ئەویش وەک باوکی ئاسا دۆستایەتییەکی زۆر بە تینی لەگەڵ نووسەر و رۆشنبیر و هونەرمەندان هەبوو، هەر ئەو دۆستایەتییە وای کردبوو، مەچکۆ ببێتە شوێنی ئەدیبان، بەڵام بە داخێکی زۆرەوەش (تەحسین مەچکۆ)ش لە ساڵی (١٩٩١) کۆچی دوایی کرد، ئێستا (موحسین)ی برای سەرپەرشتی چایخانەکە دەکات، بەڵام هەر کە ئەرکی هەڵسووڕانی چایخانەکەی وەرگرت بڕیاری دا یاری دۆمینە لە چایخانەکە نەکرێت، لە بری ئەمەش یاری شەترەنجی هێنایە چایخانەکە، جێی وەبیرهێنانەوەیە مام حاجی قادر یەکێکە لەو شاگردە هەرە کۆنانەی کە لەگەڵێ چایخانەدا کاری کردووە، وەک چایخانەی عەبۆ، ئێستا لە چایخانەکەی مەچکۆدا کاری بەردەوام دەکات.

سەرچێک

بەمەبەستی ئامادە کردن و نووسینەوەی ئەو بابەتە زانیارییەکانم لە بنەماڵە و کەسوکاری خاوەن چایخانەکان وەرگرتووە وەک نەبیل نادر عەبدوڵلا - محەمەد عەلی فلەیح - رەشاد مستەفا محەمەد - ئەیاد باییز ئیسماعیل - موحسین مەجید ئیسماعیل، بۆیە ئەوان بەرپرسن لەو زانیاریانەی کە لە نووسینەکەدا هاتوون.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر، ژمارە (٨)، پایزی ٢٠٠٠ بڵاوبۆتەوە.



# هەولێر ماڵی هەمووانە!

**رێکار مزوری**

گەلی کورد بەگشتی گەلێکی دڵپاک و دڵسۆزو مرۆڤ دۆستە و خاوەن هەڵوێستە بەرامبەر لێقەوماوان، هەولێرییەکانیش هێمای بەرزی فیداکاری و قوربانیدان بوون، لەم ئەرکە مرۆییەدا بەرامبەر بە کوردستانییان بەگشتی و بارزانییان بە تایبەتی. لە ساڵی ١٩٤٥ بارزانییەکان ئاوارەی کوردستانی رۆژهەڵات بوون، بەشدارییان لە کۆماری کوردستان لە مهابادا کرد، لەبەر نەبوونی پێداویستی تەندروستی، کەمی خۆراک و باری نالەباری خەڵکەکە، تووشی نەخۆشی بوون و نزیکەی (٢٠٠٠) هەزار کەس بوونە قوربانی. لە دوای هێرشی سوپای شای گۆڕبەگۆڕی ئێران بۆ سەر کوردستان بارزانییەکان خۆیان بەدەستەوەنەدا و بوون بە دووبەش: بەشێکیان کە زۆرینەیان پێشمەرگە بوون، بە سەرۆکایەتی مەلامستەفای بارزانی بەرەو سوڤیەت بەرێکەوتن، بەشەکەی تریش کە زۆربەیان ژن و منداڵ بوون، بە رابەرایەتی شێخ ئەحمەدی بارزانی بەرەو کوردستانی باشوور گەڕانەوە. حکومەتی عێراقی هەموویانی لە ناو سیمی دیانا کۆکردەوە و لە دەوروبەریان سەربازی تایبەتی دانا. لە دوای چەند رۆژێک زۆربەی زۆری نێرینە بارزانییەکانیان

گرت و بەرە و گرتووخانەکانی (موسڵ، کەرکووک، بەغداو بەسرا) ڕەوانەکران بۆ ماوەی (٢) ساڵ لەناو ئەم گرتووخانانەدا مانەوە. چەندین کەس بە هۆی ئەشکەنجەدان گیانی خۆیان لەدەست داو بوونە قوربانی ڕەفتاری نامرۆڤانەی حکومەتی ئەوکاتی ئێراق. ژن و منداڵەکانیش لەناو سیمی دیانە و کۆمەڵگەکانی (گاڕانە و شیڤەدز) بە کۆڵەمەرگی ژیانی خۆیان بەسەر دەبرد. لە دوای دوو ساڵ لە ناو گرتووخانە ساڵی (١٩٤٩) بارزانییەکان ئازادکران، بەمەرجێک نەگەڕێنەوە دەڤەری بارزان، هەرکەسێک بگەڕێتەوە بۆ شوێنی پێشووی خۆی لە سێدارە دەدرێت، نزیکترین شوێن لە دەڤەری بارزان سنووری قەزای شەقڵاوە بوو. حکومەت ئاغایەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی هەر چەند ماڵە بارزانییەک ڕەوانەی گوندێک بکرێن، ئاغایەکانیش بەمە رازی بوون، گیراوەکان هەموویان لە هەولێر کۆکردەوە و دوای ئەوەی خێزانەکانیان لە دەڤەری بارزان گواستەوە بۆ هەولێر و بە کەسوکارەکانی خۆیان شادبوونەوە و هەر سێ ماڵ، دوو کەرو یەک هنجاریان دەداین لەگەڵ یەک فەردە گەنم، بۆ ئەوەی بە نیوەیی بۆ ئاغاکان کار بکەن. وەک کوشتی خێر لە رانیەوە بگرە تاوەکو ئاکرێ بەسەر گوندەکاندا دابەشکران، هەولێرییەکان نارازیبوون و خۆپیشاندانیان دژی حکومەت ئەنجام دا بەرامبەر ئەم ستەمکارییە. باوکم کەناوی (تاهیر محو لەشکری) تەمەن (٧٨) ساڵە، خەڵکی گوندی گوزێی سەربە ناحیەی شێروانی مەزنە، وەک شایەدحاڵێک هەمیشە بۆ ئێمە ئەم چیرۆک و بەسەرهاتانەی دەگێڕایەوەو دەیگوت : کاتێک برایەکانم (لەشکری، دەروێش) لە گرتووخانەی کەرکوک ئازاد بوون، ماڵمان چووە گوندی ئاژگەو زرگوزان لەبن پیرمام، (لەشکری) برام لەدوای ئازادبوون لە گرتووخانە لەناو گوندی ئاژگە کۆچی دوایی کرد، ئێمە رەزو باخ و رەژومان بەنیوەیی بۆ ئاغایانی گوندەکان دەکرد، بە کەرو هێستر دەمانبردنە هەولێر، بە گەنم و جۆ بۆمان دەفرۆشت. هەر ئەوکاتی هەولێرییەکان بۆ ئێمە زۆر باش بوون بەهەموو جۆرێک هاوکاریيان دەکردین. لە سەرەتاوە جێگای حەوانەوەو زۆر لەپێداویستییەکانی ژیانیان بۆ ئێمە ئامادەکردو تا وایلێهات، ئێمە وەک خەڵکی ئاوایی حیساب دەکراین لە هەموو خۆشی و ناخۆشییەکانی ئێمە بەشدار بوون. بۆ ماوەی شەش ساڵ ئێمە لە دەشتی هەولێر ماینەوە، دوای ئەوەی گەڕاینەوە بۆ دەڤەری بارزان لە دوای ئێمەش لە ساڵی ١٩٥٨ دووبارە زۆربەی خێزانە بارزانییەکانی لە سۆڤیەت گەڕانەوە کوردستان، لە پیرمام و هەولێرو شەقڵاوە نیشتەجێبوون، خەڵک پێشوازی و هاوکاریيان دەکرد، بەڵام هاوکاریکردنەکەی وان جیاواز بوو، چونکە باری ئابووریان لە ئێمە باشتر بوو. لە دوای نسکۆی ساڵی (١٩٧٥) بارزانییەکان دووبارە بوون بە چوار بەش، بەشێکیان چوون بۆ ئێران، بەشێکیان ڕاگوێزرانە باشووری ئێراق، قەزای عەفەک، پارێزگای دیوانیە، بەشەکانی تریش بەقوناغی جیا جیا لەساڵی (١٩٧٨-١٩٩٠) ڕاگوێزرانە دەوروبەری هەولێرو قەزاکانی سەر بەپارێزگای هەولێر. لەناو ئەم کۆمەڵگەیانەدا نیشتەجێکران (قودس، قادسیە، قوشتەپە، لەناحیەی قوشتەپە، شاخۆلان، بەحرکە، سێبیران، لەناحیەی بەحرکە، باسرمە، هەریر، لە ناحیەی هەریر، دیانا سارداو دیلزیان گۆڕەتوو، لە قەزای سوران). لە ساڵی (١٩٨٣) کاتێک رژێمی بەعسی رووخاو دەستی کرد بە رەشبگیری بارزانییەکان، هەموو نێرینەکانی سەرووی تەمەن (١٠) ساڵی تاوەکو تەمەن (٩٠) ساڵیان گرت و لە دواییدا لە پارێزگای موسەنا دەڤەری بوسیە زیندەبەچاڵ و گوللەباران کران. ژن و منداڵەکانیش لە ناو کۆمەڵگەکاندا دەستبەسەرکران و ئاو و کەهرەب و پێداویستییەکانی ژیانیان لێ قەدەغەکران، وای لێهاتبوو ئافرەتەکان بۆ خۆیان دەچوونە سەر گۆڕستانەکان و گوڕیان دەکولێ بۆ مردووەکانی خۆیان، بە دزی دەچوونە گوندی گردمەلا، پیاوێک هەبوو بەناوی (حاجی خدر) بەدزی دەهات مردووەکانیانی لەناو گۆڕ دەنان، لەم قوناغەدا هەولێرییەکان ڕۆڵێکی جوامێرانەیان دیت و بە هەزاران بارزانییان رزگار کرد و چوون بۆ دەڤەرە ئازادکراوەکان، هەروەها بە هەموو شێوەیەک کۆمەکی ئەو ژن و منداڵانەیان دەکرد ئەوانەی لەناو کۆمەڵگەکاندا مابوونەوە. ئێمەش ئەوە ماوەی (٣٠) ساڵە لە

کۆمەڵگەی (بەحرکە) ژیان بەسەر دەبەین، هیچ کێشەو گیروگرفتمان نەبووە لەگەڵ برایەکانمان، بۆیە ئەرکی سەرشانی ئێوەیە، کە ئەم چاکەیە لەبیر نەکەن و خزمەتی خەڵکی هەولێرو دەوروبەری بکەن.

خوێنەری بەڕێز ئەمە چەند سەرقەلەمێک بوون لەهاوکاری کردنی هەولێریان بەرامبەر بارزانییەکان لە سێ قۆناغی جیاوازدا. هەولێرییەکان خاوەن دڵێکی گەورەی پڕ لەمیهرەبانی و دلسۆزی و تەبایی بوون لە بەرامبەر گشت کوردستانیان بە ئایینە جیاوازەکانەوە. بۆ نموونە: لە ساڵی (١٩٨٨) لە قۆناغەکانی ئەنفالدا خەڵکی بادینان بەر شالاوی ئەنفالی (٨) کەوتن وبە هەزارن خێزان، بەژن و منداڵەوە راگوێزران بو دەشتی بەڕانەتی ناوپەرێزەکانی جێژنیکان و بەحرکە فڕێدران بەبێ هیچ پێداویستییەکی ژیان، ئەو دیمەنەی من بەچاوی خۆم دیتم لەهاوکاریکردن و بەهاناهاتنەوەی هەولێریان سەرسوڕهێنەر بوو، مەزنترین کاری مرۆیی و نەتەویی و ئاینییان ئەنجام دا. کەلوپەلی ژێر منداڵەکانی خۆیان دەردەهێنا، لەبن منداڵە لێقەوماوەکانیان دادەنان. ئەوەی هەولێرییەکان لەبۆ خەڵکی دەڤەری بادینان کردیان کارێک بوو تەنها حکومەتەکان و رێکخراوە خێرخوازە گەورەکان دەتوانن بیکەن. لەدوای یەک ساڵ دووبارە بەهەزاران خێزانی دیکەی پارێزگای سلێمانی کە خەڵکی رانیە و قەلادزەو هەورەمان بوون، راگوێزرانە کۆمەڵگەکانی (گردەچاڵ، بەرحوشتر، تویزاوە، کەورگۆسک). لەهەمانکاتدا هەولێرییەکان بەهەموو شێوەیەک هاوکاری ئەم خەڵکەیان دەکرد. لە دوای راپەرین و پێش راپەرینش، لە ساڵی (١٩٨٩- ١٩٩١) خەڵکی شاری کەرکوک لەژێر دەستی رژێمی دیکتاتوری بەعس هەڵدەهاتن و لە دەوروبەری هەولێر کودەبوونەوە لە ناو کۆمەڵگەکانی (جدیدە، دارەتوو، بنەسلاوە) نیشتەجێدەبوون. لەدوای هاوکاریکردنی خەڵکی پارێزگەکانی (سلێمانی، کەرکوک، دهۆک، هەولێرییەکانی سەرسنوورەکان ئەوانەی بە زۆرەملێ راگوێزرابوون) لە دوای ساڵی (٢٠٠٣) لەپاش ئازادی ئێراق دووبارە هەزاران خێزانی کوردی رۆژهەلات لە لەدەست تیرۆریستان لەو ناوچانەی ژێردەستی حکومەتی پێشووی بەغدادا بوون، ئاوارە بوون، لەناو کۆمەڵگەکانی (کاوە لەقوشتەپە، جەژنیکان لە بەحرکە) لە دەوروبەری هەولێر نیشتەجێبوون. هەروەها خەڵکی کوردستانی باکوور بە هەزاران خێزان لە ناو کۆمەڵگەی (مەخموور) نیشتەجێبوون و هەموو پێداویستییە سەرەتاییەکانی ژیان لە لایەن حکومەت و کاربەدەستانی شاری هەولێر بۆیان دابینکرا. زیاتر لە (٥٠٠٠) خێزانی کورد لە ترسی هێرشەکانی تیروریستان بۆ سەر کوردەکان ئاوارەی پارێزگای هەولێر بوون، لە قەزای خەبات و دەوروبەری نیشتەجێبوون، بەم دواییە لە ساڵی (٢٠٠٦) بەسەرووەتر، تیرۆریستان هێرشێکی بەربلاویان کردە سەر کلدو ئاشوورییەکانی مەسیحی چەندین کلێسەو شوێنە ئاینییەکانیان لە بەغدا و موسل و شوێنەکانی تری ئێراق سووتێنران و تەقێنرانەوە، بەهەزاران خێزانی مەسیحی ئاوارەی پارێزگای هەولێر بوون، لە شارۆچکەی عەنکاوە نیشتەجێبوون. نزیکەی چارێکە ملیونێک خێزانی ئاوارەی هەرچوار پارچەکانی کوردستان و پارێزگەکانی کوردستانی باشوور لە دەوروبەری پارێزگای هەولێر کوبوونەوە تاوەکو ئێستا لەدادگاکانی بەرایی و داگاکانی تر تەنها یەک کێشەی دوژمنداری یان کوشتن تۆمارنەکراوە، بە هۆی ناوچەگەرایی. هەموویان ژیانێکی سەربەرزانە لەگەڵ برا هەولێرییەکان بە سەر دەبەن، زۆربەیان ئامادە نین بگەڕێنەوە شوێنەکانی پێشووی خۆیان، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە هەولێر بووەتە جێگایەکی پڕ لە ئاسایش و ئارامی و بۆ کوردستانیان. دوور لە هەموو هزرێکی ناوچەگەرایی و ئایینی و خێلەکی، کاتێک کوردستانیان لە دەوری قەلای هەولێر کۆدەبنەوە، قەلا دەبێتە جێگای برایەتی و تەبایی و سەکۆیەکی ئازاد بوو ئالوگۆڕکردنی بیروڕاو لێکتێگەیشتن و یەکگرتنێکی پتەو و بەهێز بۆ دروستکردنی کیانێکی سیاسی و سەربەخۆ، سنوورە دەستکردەکانی داگیرکەران هەلدەوەشێنەوە و هزری دووبەرەکی ناوچەگەرایی لەگوڕدەنێن، ئەمەش گەورەترین جوامێری و شەڕەفە بۆ کوردان بەگشتی و هەولێرییەکان بە تایبەتی.



# ئاهەنگی مەولودی پێغەمبەر

دکتۆر ئارسن موسا رەشید
کۆلیژی ئاداب - زانکۆی سەلاحەددین

لەمانگی رەبیعی یەکەم، موسڵمانان لەسەرتاسەری جیهان بەبۆنەی لەدایکبوونی پێشەوا محەمەد (د.خ) ئاهەنگ دەگێڕن. لە ١٢ی ئەو مانگە پێغەمبەر (د.خ) لەشاری مەککەی پیرۆز لەساڵی ٥٧٠ز لەدایکبووە. بۆیە موسڵمانان بەم بۆنەیەوە هەموو ساڵێک بەدرێژایی چاخە یەک لەدوایەکەکان و هەر لەدەستپێکی سەدەی چوارەمی کۆچی ئیماندارو پیاو چاکەکان ئاهەنگ دەگێڕن[1] لەمبارەوە ئادم متز دەڵێت: یەکەم کەس کە بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) ئاهەنگی گەورەی گێڕابێ میر ئەبو سەعید موزەفەرەددین گوگبری ساحیبی هەولێر بووە، کە لەساڵی ٦٣٠ک کۆچی دوایی کردووە. بەڵام ئەم قسە دروست نییە چونکە قلقەشەندی لەکتێبەکەیدا (جح الاعشی فی صناعە الاشیاء) دەڵێت: پێشتر فاتیمییەکان بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) ئاهەنگی گەورەیان سازدەدا و پێدەچێ ئەوان دەستپێشخەری خەڵک بووبن[2] ئێمەش لەلاپەڕەکانی داێ قسەی قلقەشەندی دەخەینە روو، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دەڵێین موزەفەرەددین بەیەکەم پادشا دادەنرێت کەبەم بۆنە پیرۆزە بایەخی گەورەی پێدا بێ. جەخت بۆ ئەم قسەیە سەنحاوی دەڵێت: شا موزەفەرەددین ساحێبی هەولێر (لەیادی لەدایکبوونی پێغەمبەردا (د.خ) چی لەتوانایدا بایە بەهای دەکرد. و پێشەوای عەللامەش ئەبو شامە لەکتێبەکەیدا (الباعث من اذکار البدع والحوادث) ستایشی دەکات و دەڵێت: کاری واباش پێویستە سوپاسگوزاری و ستایشی بۆ بکرێت[3].

بۆیە واباشە، ئاهەنگێران بەبۆنەی ئەم یادە پیرۆزەوە لەرۆژهەڵات و رۆژئاوای ئیسلامی بخەینە روو، سەرەتا لەچۆنیەتی ئاهەنگێرانی فاتیمییەکانەوە دەست پێبکەین، چونکە بەکۆنترین دەوڵەتی ئیسلامی دادەنرێن کە بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر هەروەکو پێشتر باسمان کرد ئاهەنگیان گێڕابێ. قلقەشەندی دەڵێت: یەک لەکاردە

گرنگەکانی خەلیفەی فاتیمی ئەوە بوو بە ١٢ی مانگی رەبیعی یەکەم لەئاهەنگێرانی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) ئامادە دەبێ[٤]. قلقەشەندی ئاهەنگی ئەم رۆژەیان باس دەکات و دەڵێت: فاتیمییەکان ئاسا لەم رۆژەدا لەخانەیەکدا (٢٠) قینتار شەکریان ئامادە کردو پێی دەوترا شیرینی و، هەمە جۆریش بوو، لەناو (٣٠٠) سنی مسیان دادەنا. کەشەوی لەدایکبوون دادەهات پیاوە گەورەکان وەک قازی قازییان و (داعی دعاە)[٥] خوێنەرانی قورئان[٦] وتارخوێنی مزگەوتەکان لەقاهیرەو میسرو شوێنی تر کەناویان لەدیوانی دەوڵەت تۆمار کرابوو ئامادە دەبوون. خەلیفە لەسەکۆی تایبەتی خۆی لەبەرامبەر خانەی (قطبیة) دادەنیشت. پاشان قازی پاش عەسر لەگەڵ پیاو ماقولان دەهات بۆ جامیعەی ئەزهەر. دواتر ئەو سینیانەی باس کران پەرت دەکران و بەقەدەر خوێندنی خەتمی قورئان دادەنیشتن. پاککەرەوەکان خاوێنیان دەکردەوەو ئاو رشێنیان دەکرد (شوێنی خەلیفەشیان بەجەوی زەرد دەرازاندەوە)، دەرگەوان و والی قاهیرە دەوەستان[٧] لەسەری رێگاکەوە هاتوچۆی پیادە قەدەغە بوو پاشان داوای قازی دەکرا لەگەڵ ئەو پیاو ماقولانەی لەگەڵی بوون تا دەگەیشتنە نزیک شوێنی خەلیفە و لەلای سەکۆیەکەوە کۆ دەبوونەوەو لەسەرپێ دەوەستان و چاوەروانی دەرکەوتنی خەلیفەیان دەکرد. یەکێ لەدیوارەکانی شوێنەکە دەکرایەوە رووی خەلیفە دەردەکەوت ئەوسا یەکێ لەخزمەتکارانی خەلیفە ئاماژەی بەوشەیەک دەکرد و دەچەمایەوە، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند خەلیفە سلاویان لێدەکات. پاشان قورئان دەخوێندرا. وتار خوێنەکان وتاری خۆیان دەدا. کاتێ وتارخوێنەکان کۆتایی بەوتارەکەیان دەهات، مامۆستایەک[٨] دەستەکەی دەردەکرد ئەمەش ئاماژە بوو بۆ وەرگرتنەوەی سلاو هەر وەکو جاری یەکەم. پاشان دیوارەکان دادەخران و خەڵکەکان دەرۆیشتنەوە ماڵی خۆیان[٩].

بەم شێوەیە میسرییەکان لەئاهەنگ گێران بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) بەردەوام بوون.هەتا لەپاش نەمانی دەوڵەتی فاتیمییەکانیش لەسەردەمی پادشایەکانیش هەموو ساڵێک ئەو ئاهەنگە دەگێردرا. لەم بارەوە، عەلی کوری داود سیرخی لەکتێبەکەیدا (ابناء الهمر في ابناء العصر)دا دەڵێت: سوڵتان مەملوکی لەماڵی سوڵتان لەقەلاتی جەبەل هەموو ساڵێک ئاهەنگی دەگێرا تایبەتی لەدایکبوونەکە گەورە بوو، سفرەی خواردنەکەی پادشایانە بوو، زۆر گەورەو بە بەهابوو[١٠] هەروەها عەلی کوری داود دەڵێت: ئاسایی وابوو کە لەم ئاهەنگەدا هەر چوار قازی ئامادەبن[١١] لەگەڵ گەورە میردکان[١٢] بەبێ ئەوەی یەکێکیان دوا بکەوێت. هەندێ جاریش جێگری شام ئامادە دەبوو، سوڵتان لەسەرووی هەموویانەوە پاشان سفرەی خواردنەکان ئاسا رادەخران ئەمە کارێکی گەورە بوو، قازییەکان لەپاش نوێژی شەوان دەهاتن و میردکان بەردەوام دەبوون تا ئاسا رابەرەکان هەڵدەستان[١٣].

بەڵام ئەو ئاهەنگانەی لەمیسر دەگێردران لەرۆژانی دەوڵەتی عوسمانیدا، مێژوونووسی سەردەم عەبدولرەحمان جەبەرتی لەرووداوەکانی ساڵی ١٢١٧ک باس لەو ئاهەنگێرانانە دەکات و دەڵێت: عوسمانییەکان یادی لەدایکبوونی پێغەمبەریان دەکردەوەو بەیداخەکانیان لەبەردەم ماڵی پاشا (والی عوسمانییەکان) و ماڵی دەرفەتدار[١٤] و شێخ بەکری[١٥] لەناوەراستی گۆمەکە بەرز دەکردەوەو پاشان بانگەشیان لەرۆژی پێنجشەممە رێکەوتی هەشتی مانگی رەبیعی یەکەم دەکردو خێوەتیان هەڵدەداو شارەکەیان دەرازاندەوە، بازارو دوکانیان دەکردەوە، سێ شەو دەمانەوە. لەشەوی هەینییەوە دەستی پێدەکردو لەدوا شەودا، یەکشەممە شەوی لەدایکبووندا پاشا لەماڵی دەفتەردار ئامادە دەبوون. دەفتەردار بەم بۆنەوە ئاهەنگی دەگێراو لەبەشێکی شەوەکەدا ئاگرینەیان دەکردو مووشەکیان دەهاویشت[١٦].

بەڵام لەرۆژانی حوکمرانی خدیو لەمیسردا، د.ماهیر حەسەن دەڵێت: بەکرییەکان بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) ئاهەنگێکی گەورەیان سازدەکرد، ئاهەنگ گێرانەکەیان لەماوەی (١٠) رۆژی کۆتایی مانگی سەفەری هەموو ساڵێک دەست پێدەکرد و لەماڵەکانیان (واتە ماڵی بەکرینی) سفرەیەک دەرازایەوەو تەواوی شێخەکانی سۆفیگەری و تەکیەکان و پیاوماقووڵ و خەڵکیان داوەت دەکردو بەدەنگێکی بەرز، بەزیکرو سەلاوات لێدان لەپێغەمبەر (د.خ) بەرێگاو کۆڵانەکان دەرۆیشتن، بۆ هەر یەکێکیان سۆفییەکان دادەنا کەشارەزا بوو لەشەوانی لەدایکبووندا و لەرۆژی دواتر قورئان خوێنەکان لەماڵەکە کەخۆی لەنزیکەی ٢٠٠ قورئان خوێن دەدا دەخوێندرا. لەگەڵ داگیرساندنی مۆمەکان. سەید بەکری دیاری بەسەر

شێخە تەریقەتدارەکان دابەش دەکرد، پاشان لەخێوەتەکان لەسەر شێوەی بازنەیی کە تائێستاش لەگەڵدا بێت ئەو کارە لەشەوی چوارەمی مانگی رەبیعی یەکەمدا یاد دەکرێتەوە. دواتر خەیدەوی خۆی ئامادەی ئەم ئاهەنگگێرانە دەبوو فەرووەیەکی گرانبەهای دەکردە دیاری بۆ سەید بەکری.

لەشەوی دوانزەیەم لەخێوەتگای سەید لەئاهەنگێکی گەورەدا مەولودی پێغەمبەر دەخوێندرایەوە کە وەزیرەکان و زانایان و پیاوماقوولان ئامادە دەبوون خەیدەویش لەخێوەتەکەی کە بەگڵۆپ رۆشن کرابۆوە و لەتەنیشت خێوەتەکەی سەید بەکری بوو ئامادە دەبوو، کە بەدرێژایی شەو بەقورئان خوێندن و زیکرد کردن و خێرات و چاکەکردنی جۆراو جۆر دەدرەوشایەوە[١٧].

بەڵام ئاهەنگ گێرانی لەدایکبوونی پێغەمبەر (د.خ) لەعێراقدا، مێژوو نووسەکان دەڵێن: ئاهەنگ گێران بەم بۆنە پیرۆزەوە سەرەتا لەهەولێرو بەتایبەتی لەسەردەمی سولتان موزەفەرەدین گوگبری (٦٣٠ک کۆچی دوایی کردووە) دەستی پێکردووە. ئەمەو ئەم ئاهەنگ گێرانە ئیبن خەلەکان بەوردی لەکتێبەکەیدا (وفيات الأعيان) دەخاتە روو، کەباس لەژیانی دانیشتوانی شاری ناو براو دەکا. ئاهەنگ گێرانەکەی بەبۆنەی لەدایکبوونی پێغەمبەری مەزن (د.خ) ئەوەندە گەورە بووە بەهیچ شێوەیەک زمان هەڵناگرێ باسی بکات. هەموو ساڵێک لەدەستپێکی مانگی موحەرەم تا دەستپێکی مانگی رەبیعی یەکەم لەولاتانی دیکە وەک بەغداو موسڵ و جەزیرەو شنگال و نەسیبین، زاناو سۆفی و رابەرو قورئان خوێن و شاعیرێکی زۆر روویان لەهەولێر دەکرد. موزەفەرەدین گومەزی لەدار دروست دەکردو هەر گومەزەیەک بۆ (٤) چینی بەرز بوو ئەوانی تر بۆ میرو کاربەدەستانی دەولەتەکەی بوو. ئەو گومەزانەی بەجۆراو جۆری جوانکاری دەرازاندەوەو لەهەر گومەزەیەکدا بوقێکی بۆ دانرابوو. هیچ چینێک لەیاد نەئەکرا. شیاوی ئاماژە پێکردنە لەم ماوەیەدا ئیش و کاری خەڵک دەوەستا[١٨] هیچ کارێکیان بەدەستەوە نەبوو تەنیا تەماشاکردن و خولانەوە نەبێت بەدەوریاندا. گومەزەکان بەدەرگای قەڵات لکێنرا بوون تادەرگای خانەقا کەبەلای گۆڕەپاندا بوو. هەموو رۆژێک شا موزەفەرەدین پاش نوێژی عەسر بەلای هەموو ئەو گومەزانە تێدەپەری و گوێی لەبەستەکان دەگرت و سەرنجی خەیاڵاتەکانیانی دەداو هاوکات لەخانەقاش دەمایەوەو گوێی لەقورئان دەگرت. لەدوای نوێژی بەیانیان سواری ئەسپەکەی دەبوو و دەگەڕایەوە قەڵات پێش نوێژی نیوەڕۆ، ئەمە کاری بوو تا شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەر هەموو ساڵێک لەدوانزەی مانگی رەبیعی یەکەم و هەندێ ساڵ لەهەشتی ئەو مانگە ئاهەنگ دەگێردرا. ئەمە و دوو رۆژ پێش لەدایکبوون وشترو چێڵ و مەڕو شتی تر بەزێدەوە بۆ شوێنی لەدایکبوونیان دەهێناو بەزیکرو سەلاوەت دان سەریان دەبڕین و خواردنی جۆراوجۆری زۆر باشیان ساز دەکرد. لەشەوی لەدایکبوون شا موزەفەرەدین لەقەڵات دەهاتە خوارێ، ژمارەیەک مۆم کەهەژمار ناکرێت هەڵدەگیرسان، لەوانە چواریان جیابوون بەکەژاوەکەوەو لەسەر هێسترێک دادەنراو پیاوێک لەپشتەوەی بوو. لەبەرەبەیانییەکەی ئەم شەوەدا دیاری گرانبەها بەسەر سۆفی و زاناکان دابەش دەکرا. پاشان شا دەهاتە خانەقاو لەگەڵ پیاوانی حکومەت و سەرۆکەکان و خەڵکی تر کۆدەبۆوە. گومەزێکی لەدار بۆی دادەنرا، پەنجەرەی تیایدا بوو. لەسەر گومەزەکە دوو بەندە چاودێری خەڵکەکەیان دەکرد، لەم رۆژەدا سەربازێکی گەلێ زۆرو بەشێوەیەکی بەرفراوان دەبینیدرا. جا کاتێ نمایشەکە بەکۆتا دەهات و واعیزەکان وەعزەکانیان تەواو دەکرد گۆڕەپانەکە بۆ خەڵکی گشتی دەرازاندرایەوە لەخواردنی جۆراو جۆر. دواتر سفرەی دووەم دەرازاندرایەوە کەتایبەت بوو بەوانەی کە لەلای کورسی واعیز دانیشتبوون و لەتەنیشت تاوەرەکە دانرابوو. بەر لەوەی ئەو دوو سفرەیە رابخرێن، موزەفەرەدین و میوانەکان دەردەکەوتن و ئەو خواردنەی ئامادە کرابوو هەڵیان دەگرت و دەیانبرد بۆ گەرەکە ماڵنشینە زۆرەکان، تا ئەو سەردەمەش ئەو کارە پەیرەو دەکرێت. لەم شەوەدا دەردەکەوێت هەر یەکێک لەو میوانانەی هاتوون بەخودی خۆیان شتیان هەڵگرتووە هەموو ساڵێک[١٩] هەروەکو ئیبن خەلەکان بەخودی خۆی بینیویەتی.

لەپاش نمایشکردنی ئەم ئاهەنگە لەم رۆژە گەورەیەدا کە ئێستا لەدەوڵەتە ئیسلامیەکان لەرۆژهەڵات و رۆژئاوا بەم بۆنە پیرۆزەوە بەرێوە دەچێت بۆ گەورەیی پێغەمبەر (د.خ) چاکەکەی لەوەدایە لەم رۆژەدا قورئانی پیرۆز زۆر دەخوێندراو سەلاوەت زۆر لەپێغەمبەری خوا دەدرا (د.خ)، لەم رۆژەدا خەرجی زۆر دەکراو دەستی کۆمەکی بۆ هەژاران و لێقەوماوان درێژ دەکرا.

سەرچاوەکان:
١- ادم قتر: الحضارة الاسلامية في القرن الرابع الهجري او عصر النهضة في الاسلام نقل الي العربية محمد عبدالهادي ابو ريدة، دار الكتب العربي، بيروت، ١٩٦٧، ج٢، ص٢٩٨.
٢- القلقشندي: حج الاعشي في صناعة الانشاء، وزارة الثقافة والارشاد القومي العربية، القاهرة، (د.ت)، ج٣، ص٤٩٨.
٣- السنحاوي: كتاب الشير الملوك في ذيل السلوك، القاهرة (د.ت)، ص١٤.
٤- القلقشندي: حج والاعشي في صناعة الانشاء، ج٣، ص٤٩٨.
٥-يقول القلقشندي بان داعي الدعاة كان يلي قاضي القضاء في المدينة وبين في اللباس وغيره وكان الف طمسون احدثوا هذه الوظيفة. لان داعي الدعاة يأخذ لعهد علي من يدخل الي مذهب القاطميين. حج الاعشي، ج٣، ص٤٨٣.
قەلقەشەندی دەڵێ: لە شاردا (داعیالدعاه) لە دوای(قاضی القضات) دێت، لەجل و بەرگ و شتی دیکە دیار بوو، ئەم پەلەیەش فاتمییەکان دایانهێنا.لە بەر ئەوەی (داعی الدعاه)، کە لە ئایینزانی فاتمییەکان بێت.
، حج الاعشي، ج٣، ل٤٨٣
٦- اما القراء قانوا قراء يقرؤن القران بحضرة الخليفة القاطمي في مجالسه وركوبه في المواكب، المصدر السابق، ص٤٨٤
بەلام قورئان خوتبەکان قورئانیان بە ئامادەبوونی خەلیفەی فاتمی دەخوێند.
٧- والی القاهرة: والی قاهیرە خاوەنی شاریوو لە لای فاتمییەکان شوێنێکی بەرزی هەبوو لە نێو کەژاوەش شوێنێکی دیاری هەبوو. والی سەرپەرشتی ئاسایشی قاهیرە بوو. هەمان سەرچاوە ل٤٣.
وكان صاحبها عند القاطميين فكانه كبيرة والمرخة الوافرة له مكان في المواكب يسير فيه و والي القاهيرة مسؤول عن القاهرة من النواحي الامنية. المصدر السابق، ص٤٨٠، ج٤، ص٤٣.
٨- الاستاذ: ئوستاد ناسراو بوون لە خزمەت خەلیفە دا، و پایەییکی بەرزیان هەبوو لە خزمەت خەلیفە د هەندێک لەوانەیان هەڵدەبژاد، قەلقەشەندی دەڵێ: ئەوانەی زیاتر لە هەزار کەس بوون، کە خزمەتی خەلیفەی فاتمییان دەکرد وهم المعروفون بخدام الخليفة وكان لهم مكانة كبيرة في الدولة الفاطمية وكانوا يختارون البعض من هؤلاء الخداء لانشقال الوضائق الخاصة بالخليفة ويقول القلقشندي كان عددهم يزيد علي الف شخص يخدمون الخليفة الفاطمي. المصدر السابق ص٤٧٧.
٩- المصدر السابق ص٤٩٨-٤٩٩..
١٠- علي بن داوود العيرض: ابناء العهد بابناء العصر، تحقيق حسن جش، دار الفكر العربي، القاهرة، ١٩٧٠ ص٢١.
١١- القضاة الاربعة: هم القضاة من مذاهب الائمة الاربعة اشافعي ومالك وابي حنيفة واحمد بن حنبل وقد ظهر هذا التقيم في القضاء في بداية حكم دولة المماليك حوالي ٦٦٣ل القلقشندي، ج٤، ص٣٥٠.
چوار قازی ئەم،چوارە لە هەر یەکە لە رێچکە و رێبازی شاهی و مالیکی و حەنەفی و ئەحمەد کوڕی حەنبەل بوون، ئەمەدابەشکردنەی قەزاتی لە سەرەتایی فەرمانڕەوایی مەمالیک لە ٦٣٣ سەری هەڵدا. القلقەشەندی، جزء ٤ ل٣٥٠
١٢- قدموا الالوف: وهم اعلي المراتب من طبقة الامراء، وتحت يدهم الف فارس وهم من الطبقة الاولي من الامراء المماليك. المصدر السابق ص١٤.
ئەمانەی پلەی دیکە میرەکان بوون، کە هەر یەکەی هەزار سواری لە ژێر دەست دا بوو، ئەوانەش لە چینی یەکەمی میرەکانی مەمالیک بوون. سەرچاوەی پێشوو.ل١٤
١٣- علی بن داود الصبری: ابناء العصر، ص٢١.
١٤- الدفتردار: دەفتەردار کارمەندێک بوو کاروباری دارایی رادەپەراند وهو موظف يقوم بادارة الشؤون المالية.١٥
١٥-الشيخ البكري: يتولى شيرة الطرف الصوفية ونقابة الاشراق في عصر والبكريون ينتمون الي ابوبكر الصديق (ر.ض). د.ماهر حسين منهي: محمد توفيق البكري: سلسلة اعلام العرب، القاهرة، ١٩٦٧، ص٣٤-٣٥.
شێخ بەکری: ئەم پیاوە ئەرکی سەرپەرشتی کردنی رێبازی سۆفیگەری و پیاوماقوولانی بوو لە سەردەمی بەکرییەکان، کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەبووبەکری سریت.(خ.ل ز)
١٦- د.ماهر حسين فحيمي: محمد توفيق البكري، ص٣٨.
١٧- ماهیر حوسێن فەحێمی: محەمەد تۆفیق ئەلبەکری، ل٣٨.
١٨- ئەو ماوەیە پشووی رەسمی بوو.
١٩- ابن خلكان: وفيات الاعيان وابناء بناء الزمان، حققه د.احسان عباس، دار صادر- بيروت، ١٩٧٧، ج٤، ص١١٧-١١٩.
٢٠- سعيد ديوچي: تاريخ الموصل، جامعة الموصل، ١٩٨٢، ج١، ص٤٤٩.
٢١- ابن الاثير: الكامل في التاريخ، ط بيروت، ١٩٦٦، ج١١، ص٣٦٤... و رشيد الجميلي: دولة الاتابكة في الموصل بعد عمادالدين زنكي ٥٤١-٦٣١ه، دار النهضه العربية، بيروت، ١٩٧٠.
٢٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.
٢٣- د.ماهر حسن فه



# خشتەی کاتەکانی نوێژ لە هەولێر و دەوروبەری

**عەبدوڵڕەحمان مەعرووف**

کات: ئەو پانتاییە فراوان و دەوروبەرە پڕ بایەخەی ژیان و زیندەوەر و گیانلەبەرانە، کە هەمیشە بوونی هەیە و دەورو خولی ژیانیان داوە و لەگەڵ بوون و گەردوون دوو هێڵی تەریبن، نەبوونی کات واتە تەبوونی ژیان و چەقبەستنی هەموو شتەکان. مرۆڤیش لەوەتای چاوی پشکووتووە، هەستی بەبوون و جووڵە و گۆڕان کردووە، بە شێوەیەک لە شێوەکان کاتی ناسیوە، بە پێی قۆناغ و سەردەمەکانیش رەهەندی جیا، جیای تێڕوانین و بیرکردنەوە و بۆچوونەکان گۆڕانکاری پێوەدەبینرێت، بیروڕای بیرمەند و فەیلەسووف و ئەوانەی لە کات وردبوونەتەوە، زیاتر بەسەر دوو تەوەر و جەمسەر دابەشبوون، هەیانە کات بە چەمکێکی بابەتی چاولێ دەکات و هەشیانە دەروونی و خودی لێکی دەداتەوە.

هەرچۆنێک بێت کات لە هەر سێ گاف ( دوێنێ/ رابردوو، ئەمڕۆ/ ئێستا، بەیانی/ ئایندە)بایەخ و گرنگی زۆری هەیە لە ژیانی ئێمەی مرۆڤدا، وەک دەڵێن کات وەک شیر وایە ئەگەر نەیبڕی دەتبڕێت، یان کاری ئەمڕۆ مەخەرە بەیانی و دەیان نموونەی دیکەی واقیع و ژیان، کەوا لە هەڵودرینی چرکەکانی تەمەن و تێپەڕبوونی کات و سوودوەرگرتن لەکات وشیارمان دەکاتەوە. جا تەرخانکردنی تەمەن و ژیانیش لەم دنیایە کەوتۆتە سەر

چەندین بوارو بابەت و بیروڕای جیاوازەوە، بەوەی خۆ تەرخانکردنێکی خۆشەویستانە و جدی کەسانێک لەو لایەن و بوارەی هەڵیدەبژێرێت و بەڕاستی دەزانێت دەبینین، چۆن تا دوا وێستگەی کار و کێڵگەی سەوزی خەونەکانی بە بێ ماندووبوون ساردبوونەوە ئەسپی خۆی تاودەدا و بەسەر کۆسپ و تەنگ و چەڵەمەکاندا زاڵبووە، خاوەن ئیرادە و بڕیاری خۆی بووە، تا لە ژێر ساباتی شەونخوونییەکەی ئارەقەی پڕ شکۆ دەسڕێتەوە و هەناسەیەکی قووڵ و ئاسوودەیی هەڵدەمژێت.

کارکردن لەسەر شتێک، بەردەوامی و کۆڵنەدان - بەردەکەی سیزیف ئاسا- و هەولدان لەکەوتن و هەستانەوە و ئەوین و ئارامی و وردەکاری و...تاد، گەرەکە، ئەمەش بۆئەوەی ئەم کارە بە باشترین ئاکام و زۆرترین کەلک و خزمەت بگات، ئەوەیان نموونەی ئەم کارەی مامۆستای خوالێخۆشبوو، مەلا سەید محەمەدی پیرداودییە، چۆن نزیکەی بیست ساڵ تەواوی ژیان و خەو و خۆراک و سەفەر و بیرکردنەوە و کۆششی خۆی خستۆتە خزمەت کارێک بۆ دیاریکردنی کاتی تەواو و دروستی رۆژهەلات و رۆژئاوا و بانگدانی نوێژەکانی شاری هەولێر و دەوروبەری، کە بتوانێت خزمەتێک و رێنوێنییەک بە هاوشاریانی و موسلمانانی هەولێر پێشکەش بکات، بۆئەوەی بە وردی و دڵنیاییی ئەو کاتانەیان لێ دیاربێت و نەکەونە گومان و هەڵەوە.

بەڕاستی ئەو کارەی مامۆستا شایانی رێزلێگرتن و ئاوڕلێدانەوەیە، کە هەمووکەسێک ئەو سەلیقە و توانا و سەبری ئەیبوەی نییە، ماوەیێکی دوورودرێژ شەو و رۆژ لێک بدرووێ و تا سەر ئارام و ئۆقرەی بێت، ژیانی خۆی لە پێناو کارێکی وا گەورە و چاکە و خزمەتی دنیا و دین ببەخشێتە هاوشاریانی.

گەورەیی و پانتایی رەهەندی فراوانی کارەکەی مامۆستا مەلا سەید محەمەد لەوەدا دەردەکەوێت، کە نزیکەی چل ساڵە ئەم خشتەیەچەندین جار چاپ و بلاوبۆتەوە و تاکوو ئەمرۆش لە تەواوی شاری هەولێر و دەوروبەری بۆ کاتی نوێژەکان و لە مانگی رەمەزان پەیڕەوی لێ دەکرێت.

ئەوەی ماوە بگوترێت مامۆستا عومەریش لەو کارەدا رۆڵی بەرچاوی دیت، وێڕای دەست و پەنجەی رەنگینی کاک ئیبراهیم لە چێکردنی خشتەکان و هاوکاریکردنمان، هەڵبەتە تەواوی خانەوادەی مامۆستا لەم چاکە و پاداشتە، ئەوانیش بەشێکیان ودبەردەکەوێت، بەوەی بێ پسانەوە لە سەر لە چاپدانەوە و بلاوکردنەوەی ئەم خشتەیە بە باشترین و جوانترین شێوە و زۆرترین تیراژ، تا بگاتە دەستی موسلمانانی شاری هەولێر بەردەوامن. هەر ئەوانیش بوون لە هاوکاریکردن و دەستگرتنی من ئەوپەڕی هەوڵ و جوانترین کاریان کرد، کەوا کەرەستە و بابەتەکانیان بە زووترین کات و بە ئاسانی خستەبەر دەستم و هەڵوێستێکی جوامێرانەیان نواند.

**چۆنم خشتەی کاتەکانی نوێژ داناوە؟**

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

بسم الله الرحمن الرحيم

* [وَأَقِيمُوا الصلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَارْكَعُوا مَعَ الرَّاكِعِينَ] {البقرة:٤٣}
* [وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ] {البقرة:١٨٧}
* [حَافِظُوا عَلَى الصلوَاتِ وَالصلاةِ الوُسْطَى وَقُومُوا لله قَانِتِينَ] {البقرة:٢٣٨}
* [فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصلاةَ فَاذْكُرُوا اللهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِكُمْ فَإِذَا اطْمَأْنَنْتُمْ فَأَقِيمُوا الصلاةَ إِنَّ الصلاةَ كَانَتْ عَلَى المُؤْمِنِينَ كِتَابًا مَوْقُوتًا] {النساء:١٠٣}
* [إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِنْدَ الله اثنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ] {التوبة:٣٦}
* [وَأَقِمِ الصلاةَ طَرَفَيِ النَّهَارِ وَزُلَفًا مِنَ اللَّيْلِ إِنَّ الحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ ذَلِكَ ذِكْرَى لِلذَّاكِرِينَ] {هود:١١٤}
* [أَقِمِ الصلاةَ لِدُلُوكِ الشَّمْسِ إِلَى غَسَقِ اللَّيْلِ وَقُرْآنَ الفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا] {الإسراء:٧٨}
* [فَسُبْحَانَ اللهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ وَلَهُ الحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ] {الرُّوم: ١٧-١٨}
* [فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ] {ق:٣٩ - ٤٠}
* (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)

خودا لە خۆی و لە باوکی رازی بێت دەفەرمووێ گوێم لە پێغەمبەر بووە (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (بني الإسلام على خمسة: شهادة أن لا إله إلا الله وان محمدا رسول الله واقام الصلاة وإيتاء الزكاة وصوم رمضان وحج البيت من استطاع إليه سبيلا).

* لە ریوایەتی: (البخاري، مسلم، النسائي، الترمذي، البيهقي، أحمد، البغوي، ابن خزيمة).

* (عبادەی کوڕی الصامت) دەفەرمووێ لە پێغەمبەرم گوێ لێ بووە فەرموویەتی: (خمس صلوات كتبهن الله تعالي على عباده فمن اتي بهن ولم ينقص منهن شيئا فان الله جاعل له عهدا يوم القيامة ان يدخله الجنة).

* لە ریوایەتی: (مالك، ابو داود، الدارمي، البيهقي، ابن ماجة، أحمد)، دەفەرمووێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (امني جبريل عند باب الكعبة مرتين، فصلى الظهر حين كان الظل مثل الشراك ثم صلى العصر حين صار ظل كل شيء بقدر ظله ثم صلى المغرب حين افطر الصائم ثم صلى العشاء الآخرة حين غاب الشفق ثم صلى الصبح حين حرم الطعام والشراب على الصائم، ثم صلى المرة الآخرة الظهر حين كان ظل كل شيء قدر ظله دون العصر بالامس ثم صلى العصر حين كان ظل كل شيء مثليه، ثم صلى المغرب للقدر الأول لم يؤخرها ثم صلى العشاء الآخرة حين ذهب ثلثا الليل، ثم صلى الصبح حين اسفر، ثم التفت فقال: يا محمد هذا وقت الأنبياء من قبلك، والوقت فيما بين هذين الوقتين).

* لە ریوایەتی: (ترمذي، ابو داود، أحمد، البيهقي، البغوي، الحاكم) لە (أبي هريره) دەگێڕنەوە رەزای خوای لەسەربێت کە فەرموویەتی پێغەمبەر دروودی خوای لێ بێت فەرموویەتی: (هذا جبريل عليه السلام جاءكم يعلمكم دينكم فصلى الصبح طلع الفجر وصلى الظهر حين زاغت الشمس ثم صلى العصر حين رأى الظل مثله ثم صلى المغرب حين غربت الشمس وحل فطر الصائم ثم صلى العشاء حين ذهبت شفق الليل ثم جاء الغد صلي به الصبح حين اسفر قليلا ثم صلى به الظهر حين كان الظل مثله ثم صلى العصر حين كان الظل مثليه ثم صلى المغرب بوقت واحد حين غربت الشمس وحل فطر الصائم ثم صلى العشاء حين ذهب ساعة من الليل ثم قال الصلاة ما بين صلاتك امس وصلاتك اليوم) لە ریوایەتی (النسائي).

* لە (جابر کوڕی عەبدوڵڵای ئەنساری) دەگێڕنەوە کە لە بابەت نوێژدا پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لێیان پرسیوە ئەویش فەرموویەتی (خرج رسول الله صلى الله عليه وسلم فصلى الظهر حين زالت الشمس وكان الفيء قدر الشراك ثم صلى العصر حين كان الفيء قدر الشراك وظل الرجل ثم صلى المغرب حين غابت الشمس ثم صلى العشاء حين غاب الشفق ثم صلى الفجر حين طلع الفجر) لە ریوایەتی (النسائي).

* لە (سەمرەی کوڕی جندب) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (الفجر فجران، الأول مستطيل والثاني مستطير) لە ریوایەتی مسلم. لە (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (وقت الظهر إذا زالت الشمس إلى أن يكون ظل الرجل بطوله ما لم تحضر الصلاة).

* لە ریوایەتی (مسلم، ابو داود، البيهقي)، خاتوو عائشە رەزای خوای لێ بێت دەفەرمووێ: (ان النبي صلي الله عليه وسلم كان يصلي العصر والشمس طالعة بينة في حجرته لم يظهر الفيء عليه).

* لە ریوایەتی (بخاری، مسلم، أبو داود، إبن ماجه)، لە (سلێمان کوڕی بريده) رەزای خوای لێ بێت دەگێڕنەوە فەرموویەتی: (ان رسول الله صلى الله عليه وسلم صلى المغرب في اليوم الأول حين غابت الشمس وفي اليوم الثاني حين غاب الشفق).

* لە ریوایەتی (مسلم، ترمذی، إبن ماجه، النسائي، البيهيقي، أحمد)، لە (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر) دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (الشفق الحمرة، فإذا غاب الشفق فقد وجبت الصلاة) لە ریوایەتی (البيهقي).

بسم الله الرحمن الرحيم

وتەیەک.........

گەلێ جار خەڵک لێیان دەپرسیم کە چۆن خشتـەی کـاتەکـانی نوێژم داناوە داوایان لێ دەکـردم کـارەکـەی خۆمـیـان بۆ روون بکەمـەوە، منیش هەر بە زار چۆنیـەتی دانانەکـەم پێ دەگـوتن، بەڵام ئەم توانایە و ئەم بوارەم بۆ نەدەڕەخسـا ، کە شـتـێکی لەسـەر بنووسم، تاکـو لەم دواییـانە لەگەڵ عـومـەری کـوڕم کـەوتینە سـەر ئەو بیـردی کـەوا پێـویسـتـە نامیلکەیەک لەم بارەیەوە بە کوردی و عەرەبی بڵاوبکەینەوە بۆ ئەوەی ببێتە پاڵپـشـتـێکی خشـتـەکە و چۆنیـەتی دانان و بەڵگە شـەرعـیـەکـانی تێـدا دیـاری بکرێ و ببـێـتـە یارمـەتیـدەرێکیش لە پاشـەڕۆژ بۆ هەرکەسێک بیەوێ لە کاتەکانی نوێژ بنۆڕێ.

إن شاء الله سوودی خۆی دەبێت و چاوەڕێی لوتف و مـەرحـەمـەتی خودای گـەورەین و چاوەڕێی دوعـای موسڵمانانین.

**مەلا سەید محەمەد سەید ئیسماعیل**
**پێش نوێژی مزگەوتی مەلا سەید محەمەد پیرداودی**
**عەدالەی نوێ/ هەولێر**
**شەعبان/ ١٤٢٣ ک**

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام علي سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين ومن تبعهم بإحسان إلي يوم الدين وبعد:

ئەو خشـتـەیەی خودای گەورە لە ئامادەکردنیدا تەوفیقی دام، کە لەژێر ناوی (خشـتـەی کـاتەکـانی نوێژە) مێژووی سەرەتای دانانی دەگەڕێتەوە بۆ سـەرەتای سـاڵانی پەنجاکـان، لەو وەختـەی تازە ببـوومە مـەلای گـوندی پیـرداود (گـوندێکی نزیک بە شـاری هەولێر) مـەبەسـتی سەرەکـیم تێدا بۆ ئەوە بوو لە دیاری کـردنی کـاتەکـانی نوێژ و زانین بە وەختـی نوێژ ببـێـتـە یارمـەتیـدەرێک. بۆ خـۆم، دەسـتم پێکرد چاودێری کـاتەکـانی نوێژ بکەم و لێیـان بنۆڕم، کە دەستم پێکرد هەر ئەو دەست پێـکردنە بوو، بە درێژایی ئەو سـاڵی لەسەری بەردەوام بووم، کە لەگـەڵ سـەرەتای نۆڕینم بۆ کـاتەکـان تێبینی خۆم سەبارەت بە هەر کاتێک لە کاغەزێک دەنووسی، کە ئەو ساڵە کـۆتایی هات سـاڵی دووەمـیـش لەسـەری بەردەوام بووم، ئینـدی بەم شێوەیە ساڵ لە دوای ساڵ چاودێری کاتەکانم دەکرد و بەردەوامیش تێبینی خۆم تۆمار دەکرد، تێبینی ساڵەکانی پێشـترم پارێزگـاری لێکردبوو، هەڵم گرتبوون، بە جۆرێ گەیشتە ئاستێک زیاتر بایەخیان پێبدەم، هەموویانم لە تۆمارگەیەکدا تۆمارکرد، بەمە بەراورد لەگەڵ یەکدی کردنیـانم بۆ ئاسـانتر بوو، لە بەراورد کردندا دەمـدی کـاتی هەر سـاڵێکی نوێ لەگـەڵ سـاڵەکـانی تردا وەکو یەکن، جیاوازیان نییە، بەم نەبوونی جیـاوازییـە زیاتر بە پەرۆش دەبووم لەسـەر لێنۆڕین بەردەوام بم تا گەیشتە کـاری چەند ساڵانێک و دیم کـارێکی ڕێکوپێـک و نایابە، زیاتر خـولـقم کـەوتە سـەری، بەردەوام لە هەمـوو کاتەکـانم دەنۆڕی تا گـەیشـتـە مـاوەی پازدە سـاڵان، دوای ئەو کـاتە مـاڵم هاتە ناو شـاری هەولێـر، لە هەولێـریش بەردەوام بووم، بینیم هەر سـاڵە لەگـەڵ سـاڵەکـانی تری پێش ئەودا هەروەکـو یەکن و جیـاوازیان تێـدا نیـیـە، ئەوسـا دەسـتم پێکرد بڵاوی بکـەمـەوە و بە خـەڵکی ڕابگەیەنم، ئەوەبوو لەلایەن مامۆستا و پێش نوێژی مزگەوتەکانی ناو شار و دەوروبەری شـار دەست کـرا بە پیـادەکـردن و لەسـەر ڕۆیینی، ئەو پیادەکردنە تا ئێستا کە سی ساڵ زیاتر دەبێت، وتا ڕێک لە سـاڵی (١٩٧٠)ەوە تاکـو ئێـسـتـا ، هەر بەردەوامە و تاکـو ئێسـتـاش جێگەی ڕەزامەندی و متمانە پێکردنی هەموو لایەکە، بناغەی دانانی ئەم خشتەیە دوو شتی سەرەکین. یەکەمیان تیۆری و دووەمـیـان کـردەییـە، تیـۆرییـەکـە دەرئەنجـامی خـوێندنەوەی خۆمـە لە کتێبەکانی تەفسیری قورئانی پیرۆز و تەفـسـیـری ئەو ئایەتانەی بابەتیـان کـات و کـاتەکـانی نوێژە لەگـەڵ ئەو فـەرمـوودە پیـرۆزانەی پێـغـەمـبـەری خـۆشـەویـست (درووودی خـوای لێ بێت) کە بابەتی ئەوانیش کاتەکانی نوێژە یان ئەوەی لە کـتـێبی زانایانی پێـشـووم خـوێندووتەوە یان لێـیـانم بیـسـتـووە، بۆ ئەو کاری خوێندنەوەش زۆربەی کتێبەکانی تەفسیر و کتێبی تۆمـار و ڕاڤـەکردنی فـەرمـوودەکـانی پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) و کتێبە شەرعییەکانم تەماشا کردوون ئەوەی زوو، وەخـتـی سـەرەتای لێنۆڕینم دەسـتم کـەوتن یان دواتر، کتێبی خۆم بووبێ یان بە خواستنەوە لەلام بووبێ، ئەوا بابەتەکـانی نوێژم لەزۆربەی هەرە زۆریان خوێندۆتەوە.

هەرچی دووەمـە واتا کـردەییـەکـە

ئەوا ئەوە، دەرەئەنجامی لێتوێژینەوە و لەئاسمان نۆڕینی رۆژانەی بەردەوامی خۆم بووە، بۆ بەیانی داهاتن و خۆر هەلاتن و لادانی خۆر لە ناوەندی ئاسمان و بوونی سێبەری هەر شتێک بەقەت خۆی و ئاوابوونی خۆر و بزربوونی شەفەقی سوور، هەواری جێبەجێکردنی ئەوانیش هەموو گوندی پیرداود بووە لە سەربانی مزگەوت و ناوەوەی مزگەوت یان لەسەربانی مالی خۆم، لەهەمووشیان وەختی ئیدگ (احتیاط)م بۆ وەرگرتوون، وەکو دیاریشە شوێنی لێنۆڕین دەشت بووە ئەو وەختە چ رۆناکییەکی کارەبای تێدا نەبووە، بینینی ئاسۆش لەو تەرزە شوێنەدا بە روونی کارێکی شیاوە لەبەر نەبوونی چ خانوییەکی ئاوا بلند کە ببێتە بەربەست لەبەر دیدەی مرۆڤدا لەو تەرزەی لە شاراندا رووددەدن.

سەرەڕای ئەوانە، واتا ئەو لێنۆڕینانەی لە گوندی پیرداود لە کاتە پێویستیەکاندا ئەنجامم دەدان، وەختێک کە بە میوانی لەگەل برادەرە مامۆستاکان سەردانی مامۆستایەکی برادەری خۆمانمان دەکرد کردبوومە عادەت لەوێش خۆم، یان یەکێک لە مامۆستاکان لە کاتمان دەنۆڕی و چاودێریمان دەکرد، لە ئەنجامدا دەماندی لەگەل ئەوەی من دەمزانی، وەکو یەک بوون، ئەمەش دەبوو بە مایەی ئەوەی زیاتر متمانە بە دەرئەنجامی لێنۆڕینەکان بکەم و لەسەر کاردکە سوورتربم.

**وردەکاری لە کات نۆڕینەکەشم بەم شێوەیەی خوارەوە ئەنجام دەدا:**

یەکەم/ نوێژی بەیانی: دیارکردنی کاتی نوێژی بەیانی لەسەر بنچینەی بینینی تەواوی بەیانی راست بووە، کە دیارە بەر لە داهاتنی بەیانی راست بەیانییەکی تر هەیە، بە بەیانی بە درۆ ناسراوە، نیشانەکانی لەلای ئەو کەسەی لە ئاسمان دەنۆڕێ دیارن، بە شێوەی لاکێشەیی بە دیار دەکەوتن، بەرەو لای سەرەوە هەلدەکشێت و نایەتە لای خوارەوە. من ئەوەم بە باشی رەچاو کردووە، بەیانی راست سپیاتییەکی رۆنە بە پانایی ئاسۆ بە دەردەکەوێت و بەرەبەرە زیاد دەکات. من کە لە بوونی ئەم دیاردەیە دلنیابوومە کاتەکەم لای خۆم تۆمار کردووە، چونکە ئەوەی لە چەمکی ئایەتی پیرۆزی (وكلوا واشربوا حتي يتبين لكم الخيط الأبيض من الخيط الأسود من الفجر...) و لە چەمکی ئەو فەرمووده پیرۆزەی پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) کە بە فەرموودەی جبریل ناسراوە، دەفەرمووێ (... والفجر حين حرم الطعام والشراب...)دا بە دیاردەکەوێ، بەتایبەتی لە وشەی (يتبين)دا ئەوا دلنیا بوونە لەو هەبوونەدا.

وەختێ کە من کاتم بۆ نوێژی بەیانی دیاری کردووە، بەیانییەکی راست و تەواو بووە و دلنیابوومە لەوەی ئەو کاتە، کاتی نوێژە، کاتی بانگدانی نوێژی بەیانییە و کاتی دابەستانی نوێژە.

ئەو کاتەی دیاری کراوە و لەتۆمارگەدا تۆمارم کردووە، کاتێکە بە تەواوەتی و بەبێ دوودلی لێکردن و بۆ زانینی چوونە ناو کاتی نوێ پشتی پێ دەبەسترێ، ئاشکراشە مەبەستی سەرەکی لە دانانی خشتەکە راگرتنی کاتی نوێژە و بۆ یارمەتیدانی نوێژکەرە، کاتی نوێژی خۆی پێ بزانێ، هەرچی رۆژووگرە، ئەوا بۆ یارمەتی دانی ئەو لە کاتی دەست پێکردنی رۆژووگرتنەکەیدا جێگایەکی تایبەت هەیە هەر لە ناو خشتەکەدا بە کاتی چارەگە کاتژمێرێک پێشتر، کە کاتی ئیمساکە و کاتی دەست هەلگرتن لە خواردن و خواردنەوەیە، بۆیە ئەو قسەیە نابێتە بەلگە، کە دەلێ کاتی نوێژی بەیانی درەنگە، وا باشترە بەپێش بخرێ، لەبەر ئەوەی رۆژووگر لە پارشێواندا دەست لە خواردن و خواردنەوە هەلناگرێ تا ئەو وەختەی گوێی لە بانگدێر دەبێت و بۆ نوێژی بەیانی بانگ دەدات، جا هەروەکو گووتم ئەم قسەیە بە بەلگە دانادرێ، چونکە چارەسەری ئەم گرفتە لە پەیوەست بووندایە بە کاتی ئیمساک و گوێ راگرتن لە بانگەوازی ئەو برا موسلمانەیە بۆ ئاگادارکردنەوە لە کاتی ئیمساک دەنگ هەلدەبڕێ، مەسەلەکەش دیار و روونە، بانگەوازی، ئیمساک، بۆ رۆژووگر و رۆژووگرتنە و بانگی نوێژیش بۆ نوێژکەر و نوێژکردنە.

دووەم/ خۆرهەلاتن: لە تۆمارکردنی کاتی خۆرهەلاتن بەو تەرزە بوو، کە من لەو وەختەی لە بەیانیم دەنۆڕی و بەیانی داهاتنم بۆ ساغ بووەوە و وەختی نوێژی بەیانیم دیاری دەکرد و نوێژەکەم ئەدا دەکرد و وێردی رۆژانەی دوای نوێژی بەیانی

خۆمم دەخوێندەوە، کە لێ دەبوومەوە، دەمامەوە چاوەڕێی هەڵاتنی خۆرم دەکرد، کە بەر لە وەختی خۆی بە چەند دەقیقەیەک دەچوومە سەربان و چاوەڕێی هەڵاتنی دەبووم بە دیقەت چاوم لەسەر نۆرینگەکە، واتا جێ هەڵاتنەکە دەبوو، هەر کە دەردەکەوت یەکسەر کاتەکەم لەلای خۆم لە شوێنی خۆرهەڵاتنی ئەو رۆژە تۆمار دەکرد.

سێیەم/ نوێژی نیوەڕۆ: بۆ دیاریکردنی کاتی نوێژی نیوەڕۆ دەمنۆڕییە لادانی خۆر لە ناوەندی ئاسمانەوە، ئەمەش بنیات لەسەر ئەو فەرموودە پیرۆزەی قورئانی پیرۆز، کە دەفەرمووێ: (أقم الصلاة لدلوك الشمس) واتا نوێژ، مەبەست نوێژی نیوەڕۆیە، لەو وەختە دابیەستە، کە وەختی لادانی خۆرە، کە مەبەست لادانیەتی لە ناوەندی ئاسمانەوە، هەروەها بنیات لەسەر ئەو فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، کە دەفەرمووێ: (الظهر حين زالت الشمس) واتا نیوەڕۆ ئەو وەختە دەبێ، کە خۆر لابدا، واتا لە ناوەندی ئاسمان لابدا، هەروەها بنیات لەسەر ئەو فەرموودە پیرۆزەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، کە هەر لەو فەرموودە دایە بە فەرموودەی (جبريل) بەناوبانگە، کە دەفەرمووێ (حين كان الفيء قدر الشراك) یان (مثل الشراك)، واتا وەختی سێبەرەکە، کە مەبەست ئەو سێبەرەیە دەگەڕێتەوە بۆ لای رۆژهەڵات بەقەت (شراک)ی لێهات، مەبەستیش لە (شراک) یەک لەو قایشانەی تاکە سۆلێکە لە وەختی لەپێکردندا دەکەونە سەر پشتی پێ، بە وردتریش بڵێین مەبەست بەقەت پانی یەک لەو قایشە پێ بەستانەیە.

جا بەر لەو کاتە، واتا بەر لە داهاتنی نیوەڕۆ من دارێکم لەسەر زەوی لە شوێنێکی تەختانیدا دەچەقاند و دەمڕوانییە ئاسمان و تەماشای جوولانی خۆرم دەکرد، جاربەجاریش چاوێکم دەدایە سێبەری دارەکە، کە لە بەری خۆرئاواوە دەبوو، وردەوردە سێبەرەکە کەمی دەکرد، هەر لێم دەڕوانی تاکو خۆر دەگەیشتە ناوەندی ئاسمان، کە وەختی ئیستوایە و چاوەڕێم دەکرد تا بۆ سەر چاوی راستەم لار دەبووەوە بەمە دەبووە لادانی خۆر لە نێوەندی ئاسمانێ لەگەڵ ئەم لادانەدا ئەو (فيء)ە بەدیار دەکەوت (فيء) بەو سێبەرە دەڵێین ئەو وەختەی نیوەڕۆ لەگەڵ لادانی خۆر لە نێوەندی ئاسمان، هەروەکو گوتمان، لەبەری خۆرهەڵاتەوە پەیدا دەبێت، جا من لەگەڵ دەرکەوتنی ئەو سێبەرە، وەختی نوێژی نیوەڕۆم تۆمارکرد.

چوارەم/ نوێژی عەسر: کاتی نوێژی عەسرم بەوە دیاری دەکرد، کە سێبەری هەر شتێک هەندی بەژنی خۆی لێدەهات، بێجگە لە سێبەری ئیستیوا، بەڵگەی ئەمەش دیارە کە لە فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)دا هاتووە، کە دەفەرمووێ: (والعصر حين كان ظل الشيء مثله)، واتا وەختی نوێژی عەسر ئەو وەختەیە، سێبەری هەموو شتێک بەقەت خۆی دەبێت. زیادکردنی ماوەی سێبەری ئیستیوا لەسەری لە کتێبە شەرعییەکاندا ئاماژەی بۆ کراوە. جا بۆ پێوانی ئەمەش هەر بە تەرزی دیاری کردنی نوێژی نیوەڕۆ دیسان دەهاتم دارێکم دەچەقاند سێبەری ئیستیواکەم دیاری دەکرد یان دیاری کردبوو، بێجگە لەو ماوەیە، سێبەری پەیدابووم دەپێوا، کەی دەگەیشتە ئاستێک هێندەی درێژی دارەکە خۆی دەبوو، ئەوا ئەو کاتەم بۆ نوێژی عەسر دیاری کرد.

پێنجەم/ نوێژی مەغریب (ئێوارە): کاتی نوێژی مەغریبم بەپێی ئاوابوونی خۆر تۆمارکرد، ئەویش بەو تەرزە دەبوو، کە دەچوومە سەربانی و لە ئاسۆم دەڕوانی، تەماشای خۆرم دەکرد لە ئاوابوونیدا، بۆ ئەمەش رەچاوی ئاوابوونەکەیم دەکرد لە شوێنە بەرزەکاندا، کەینێ لە ئاوابوونی دڵنیا دەبووم، کاتی نوێژی مەغریبم لای خۆم تۆماردەکرد، بۆ ئەمە ماوەی ئێدەگم دادەنا، کە زۆر بایەخم بەو ماوە ئێدەگیە دەدا و کارەکەم بە هەند هەڵدەگرت، ئەم بەهەند هەڵگرتنەشم بۆ ئەوەبوو، کە تەواو لە بزربوونی بازنەی خۆر لە دیوی بەرزاییەکاندا دڵنیابم. پێودانگی ئەمەش بزربوونی خۆرە لە تەرزێ لە هیچ لایەکی دیواران و سەر لوتکەی چیایان تیشکی نەمینێ، هەروەکو زانایانی شەرع لە کتێبەکانی خۆیاندا بەو شێوەیە باس لە دیاریکردنی کاتی مەغریب دەکەن.

شەشەم/ نوێژی عیشا (شێوان): بۆ راگرتنی کاتی نوێژی عیشا پشتم بە بزربوونی شەفەقی سوور بەستووە. بە بەڵگەی فەرموودەکەی، کە دەفەرمووێ: (... والعشاء لما غيب الشفق الأحمر...)، واتە عیشا ئەو

وەختە دەبێ کە شەفەقی سوور بزر دەبێ، جا بۆ دیاریکردنی ئەم وەختە هەر لەناو مزگەوتەوە (مزگەوتی گوندی پیرداود) لە پەنجەرەیەکەوە، کە دەیڕوانییە دەرەوە تەماشای ئاسمانم دەکرد، کە من لەدوای نوێژی مەغریب هەر لەناو مزگەوت دەمامەوە، جا بەر لە بوونی نوێژی عیشا بە ماوەیەک چرای ناو مزگەوتم دەکوژاندەوە و لێنۆڕینم دەست پێدەکرد و بە وردی دەمڕوانییە ئاسمان، بۆ تەواو دڵنیابوون لە تەواو بزربوونی شەفەق، کە مەبەست بزربوونی، ئەو رەنگ سوورایەتییەیە لەدوای ئاوابوونی خۆر پەیدادەبێت. لەگەڵ نەمان و بزربوونی ئەو سوورایەتییە کاتەکەم لەلای خۆم تۆماردەکرد، کە بەردەوام بۆ هەموو رۆژەکانی کاتی نوێژی عیشا، بەم شێوەیەم دیاری دەکرد.

حەوتەم/ ئیمساک: کاتی ئیمساکم بە چارەکە سەعاتێک بەر لە هاتنی بەیانی داناوە، من ئەو بڕە وەختەم پێ زۆر لەبارترە، کە ماوەبێ لە نێوان ئیمساک و نوێژی بەیانی، هەروەکو لە خاڵی (١) ئاماژەم بۆ کرد، چارەکە سەعاتێک ماوەیەکی چاکە، پێشتر بیست دەقیقەیان دادەنا، بەڵام من چارەکەکەم پێ گونجاوترە، کە بۆ مرۆڤی رۆژووگریش کاتێکی لەبارە.

**دوا وتە**

لە کۆتاییدا دەمەوێ ئەمە بڵێم، کە ئەم خشتەیە ماوەی (٢٠) ساڵ زیاتر دەبێ لەناو شاری هەولێر و دەوروبەری شار بە تێکڕایی پیادە دەکرێت، ناوەناوە چاپ دەکرێتەوە و بە خۆڕایی دابەش دەکرێت، تاکو ئێستا بە چەندان شێوە و بە چەندان جار چاپ کراوەتەوە، تاکو ئێستا جێی متمانە و باوەڕی هەموو لایەکە و چ نارەزاییەکی لەسەر نیشان نەدراوە، گوتم لێ دەبێ هەندێ دەڵێن کاتی نوێژی بەیانی بە ماوەی (٥) دەقیقە بەقەد ماوەی ئێدەگی خۆی پێش بخرێ باشترە، بەڵام بۆ ئەمە وەڵامم داوەتەوە کە دیاریکردنی ئەم کاتە بۆ کاتی نوێژە، دیاریکردنی ئەم کاتە یانی دڵنیابوونی تەواو لە بوونی نوێژی بەیانی و کاتی دەست پێکردنی نوێژی بەیانییە. ئەو دڵنیابوونە لە چەمکی وشەی پیرۆزی (حتی یتبین)دا دەفامرێتەوە، من کە ماوەی پێنج دەقیقەم بە ئێدەگ داناوە هەروەکو باسم کرد، ئەو پێنج دەقیقەیە بۆ ئەو دڵنیابوونەیە، کە بە تەواوەتی دڵنیابوونە لە چوونە ناو کاتی نوێژی بەیانی، لە داهاتنی نوێژی بەیانی، لەبەر ئەوە، گەرەکە ئەمە بزاندرێ، کە داهاتنی بەیانی پێویستی بە لێ وردبوونەوە و لێ دڵنیابوون هەیە، وەکو هەڵاتنی خۆر نییە، کە خۆر لەگەڵ هەڵاتن و دەرکەوتنیدا بە ئاشکرا لەبەر چاواندا دیار دەبێ، بۆیە بەیانی داهاتن پێویستی بە لێ وردبوونەوە و دڵنیابوون هەیە.

دووبارە ئەمە دەڵێمەوە، کە ئەم کات دیاری کردنە بۆ پێزانینی چوونە ناو کاتی نوێژە، بانگەوازی ئەم چوونە ناوکاتە بانگدانە بۆ نوێژ، ئاگادارکردنەوەیە بە هەڵسان بۆ ئەداکردنی نوێژ، هەرچی رۆژووە، ئەوا ئەویش بانگەوازی خۆی هەیە رۆژووگر ئاگادار دەکاتەوە لەوەی کاتی خواردن و خواردنەوە لە کۆتاییە و کاتی دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵگرتنە، ئەو کاتی دەست لە خواردن و خواردنەوە هەڵگرتنەش ئەلقەی تایبەتی خۆی هەیە وەکو دیارە، کە ئەلقەی (ئیمساک)ە.

والحمد لله الذي هدانا لهذا وما كنا لنهتدي لولا أن هدانا الله وصلى الله على سيدنا محمد وعلى آله وصحبه وسلم ولا حول ولا قوة إلا بالله العلي العظيم.

تێبینی: نووسینی ئەم نامیلکەیە بەڕێز (عومەر سەید محەمەد) کردوویە بە کوردی، منیش جارێکی دیکە دامڕشتۆتەوە.

**ژیاننامەی مامۆستا**
**مەلا سەید محەمەد سەید ئیسماعیل**

مامۆستا ناوی سەید محەمەد کوڕی سەید ئیسماعیل کوڕی سەید عومەری کوڕی سەید ئەمینی کوڕی سەید ئەحمەدی کوڕی سەید جوبرائیلە، لەساڵی (١٩١٦)ی زایینی لە گوندی قولتەپەی سەر بە ناحیەی قوشتەپەی پارێزگای هەولێر هاتۆتەدنیاوە. بەڕەگەز بەپێی سەرجەلەی خۆیان دەگەڕێتەوە سەر سەیدەکانی بەرزنجە، بەڵام چەند پشتێکە لە دەشتی هەولێر نیشتەجێبوونە. هەر لە منداڵییەوە باوکی کۆچی دوایی دەکات، بۆیە سەید ئەحمەدی برا گەورەی ئەرکی پەروەردەکردن و لەبەر خوێندن دانانی دەگرێتە ئەستۆ.

مامۆستا لە تەمەنی (١٢)

ساڵیدا دەچێتە مزگەوتی گوندەكەیان و لەلای ماموستا ) مەلا شەریف) دەست بەخوێندن دەكات، هەر لە لای ئەو كە دوای سیپارە خوێندن و خەتم كردنی قورئان، چەند كتێبێكی سەرەتایی مەنهەجی ئەوسا دەخوێنێ.

دوای ئەوەی تەواو لەسەر خوێندن رادێت، بڕیاردەدات لە دەرەوەی مەدرەسەی مزگەوتی گوندەكەی خۆیان درێژە بەخوێندن بدات، بۆ ئەو مەبەستە گوندی قوڵتەپە بەجێ دەهێڵێ و دەچێتە مەدرەسەی مزگەوتی گوندی باشتەپە، ئەو وەختە ماموستای گەورە و سەرپەرشتیاری ئەو مەدرەسەیە ماموستا (مەلا سەعید)ی سیان بوو، بەڵام ماموستا لەبەرئەوەی لە پلەی سوختەییدا بوو لەلای موستەعیدێك دەخوێنی، ئەویش ماموستا (مەلا ئەبوبەكری شەركانی) بوو، سوودێكی زۆری لەو ماموستایە دیت و هەمیشە ئەو ماموستایەی بەبناغەدانەری زانستی خۆی دادەنا، لەبەرئەوە زۆر ڕێزی ئەو ماموستایەی لە لابوو، لەلای ئەم ماموستا بەڕێزە ئەم كتێبانەی خوارەوەی خوێندووە: -

١- عوامل جرجانی.
٢- سعدینی.
٣- أنموذج.
٤- إظهار.

ماموستا دوای خوێندنی ئەم كتێبانە جارێكی دیكە دەگەڕێتەوە باشتەپە، بەڵام ئەوجارە بە موستەعیدی و لە لای ماموستای گەورە ماموستا مەلا سەعیدی دەخوێنێت، خۆی بێجگە لە باشتەپە ماموستا لە گوندی دۆلەزەش دوو جاری خوێندووە، جارێك بە سوختەیی لەلای موستەعید ماموستا مەلاعوسمان بیرەعارەبانی، جارێكیش لە كاتی موستەعیدی لەلای ماموستای گەورەی مەدرەسەكە ماموستا مەلا عوسمانی سیان.

ئیدی ماموستا بۆ درێژەدان بە خوێندن و دەستخستنی زانست و زانیاری زیاتر و بردنە پێشەوەی پلەی زانستی و ڕێچكە و ڕێبازی خۆی و گەیشتن بە خەونەكانی و دوارۆژێكی پرشنگدار، لەم گوندەوە بۆ ئەو شار و شارۆچكە، لەم دەڤەرەوە بۆ ئەو دەڤەر و ناوچە و شوێن، كوڵنادات و زۆر مكوڕ و ئازایانە شەو و رۆژ لێك دەدووڕێت و بەدوای ماموستای ناودار و دەوڵەمەند بە عیلم و مەعریفە و مەدرەسەی گەورە و تژی شاگرد و فەقێ و موستەعید وێڵ دەبێت و ماندووبوون ناناسێت، بەمجۆرە لە هەر یەكە لەو مەدرسانە و لەسەر دەستی هەر یەكە لەم ماموستا پڕ نوور و زانستانە خۆی پڕ چەكی عیلم و ئایینپەروەری دەكات و خۆی دەگەیەنێتە دوا وێستگەكانی مەبەست و ئەوەی لە پێناویدا تێدەكۆشا:

**ناوی مەدرەسەكان: -**

١- دۆلەزە.
٢- جلبەسەر.
٣- گردەسۆر.
٤- كۆبە.
٥- كتكە.
٦- دێمەكار.
٧- بێتواتە.
٨- بەردە سپی.
٩- كەسنەزان.
١٠- بێلینگە.
١١- قەشقە.
١٢- چەغەمیرە.
١٣- خورخور.
١٤- چۆمەزەردەلە.
١٥- هەولێر.

**ناوی ماموستایەكان:-**

ماموستا مەلا عوسمانی بیرەعارەبانی، ماموستا مەلا محەمەدی عەبدەلانی، ماموستا مەلا تاهیر، ماموستا مەلا مەجیدی هەرتەلی، ماموستا مەلا عومەری خورمەڵەیی، ماموستا مەلا عومەری تەلەلخێمی، ماموستا مەلا عوسمانی سیانی، ماموستا مەلا سەعیدی ئاومالی، ماموستا مەلا ئیسماعیلی ناقص ماموستا مەلا عومەری رەش، ماموستا مەلا عەبدولقادر، ماموستا مەلا شەریف دووشیوانی، ماموستا مەلا تەیب دووشیوانی، ماموستا مەلا حەمەدەمین سوێری، ماموستا مەلا ئیسماعیلی دیبەگەیی، ماموستا مەلا ئەحمەدی رەش، ماموستا مەلا ساڵحی كۆزەپانكەیی.

ماموستا مەلا سەید محەمەد لە قۆناغی پێش دوایی خوێندنی لە چەغەمیرەی لەلای ماموستا مەلا ئەحمەدی رەشی خوێندووە، زۆرترین ماوەی خوێندنی لە لای ئەو زاتە بووە، لە لای ئەو وەختێ گەیشتۆتە خوێندنی فەلەكیات لە گوندی پیرداود بەمەلای گوند دامەزراوە، لەبەر ئەوە ماوەیەك چەغەمیرەی

بەجێهێشت و لەگەڵ فەقێیەکانی خۆی بە موستەعید و سوختەوە چووە گوندی پیرداود (لە دەوروبەری شاری هەولێر) لەوێ بوو بە پێشنوێژ و خوتبە خوێنی ئەو گوندە، هەر لەوێ مەدرەسەی داناو بوو بە مودەریسی مەدرەسەکە، ماوەیەک لەوێ لە ناو فەقێیان ژیانی بەسەر دەبرد، دواتر لە ساڵی ١٩٤٤ ژنی هێنا و دوای ژن هێنانەکەی ماوەیەکی دیکە مایەوە، ئەوجارەیان سەر لەنوێ گەڕایەوە وگوندی چەغەمیرە بۆ خزمەت مامۆستا مەلا ئەحمەدی رەش دەستی بە خوێندنی زانستی فەلەکییات کرد ماوەیەکی کەم لەسەر خوێندنی ئەو زانستە بەردەوام بوو، دواتر لەوێ رۆیشت و چووە هەولێر، چووە مزگەوتی شێخ نورەدین بریفکانی خزمەت مامۆستا مەلا ساڵح کۆزەپانکەیی، بەو هیوای لەلای ئەو زانستی فەلەکیات تەواو بکات، بەرێنمایی ئەوەی ئەو زاتە سەرچاوەیەکی زۆری لە ژێر دەستە لە کتێبەکانی زانای پایە بەرز (مەلا ئەفەندی). دەستی بە خوێندنی کتێبەکانی ئەو زانستە کرد، کە لەو سەردەم دەخوێندران، لەوانە (ربع المقنطر) و ( شرح الجغمینی) و کتێبی دیکە،وەختێ تەواوی کرد، کۆتایی بە خوێندن هێنا هەر لەلای ئەوزاتە واتا مامۆستا مەلا ساڵحی کۆزەپانکەیی لە ساڵی ١٣٦٤ کۆچی رێکەوتی ١٩٤٥ ی زایینی ئیجازەی علمی وەرگرت، کە ریزبەندی (تسلسل)ی حەوتەمین بوو لەو زانایانەی لەلای مامۆستا مەلا ساڵح ئیجازەیان وەرگرتووە. وەختێ ئیجازەی وەرگرت گەڕایەوە گوندی پیرداود و بەتەواوەتی لەو گوندە وەکو پێشنوێژ و خوتبەخوێن و مودەریسی مەدرەسە جێگیر بوو. تاکو ساڵی ١٩٦٥ ی زایینی لەوێ مایەوە، لەو ساڵەدا لە پیرداود کۆچی کردو چووە ناو شاری هەولێر، لە ناو شار لە چەند مزگەوتێک بوو، وەکو پێشنوێژ و مودەریس یان وەکو خەتیب..

**ئەو مزگەوتانەی مامۆستا لێی بوو ئەوانەن: -**

١- مزگەوتی حاجی تەهای قەساب - گەڕەکی سەعدوناوە.
٢- مزگەوتی شێخ نورەدین بریفکانی - گەڕەکی تەعجیل.
٣- مزگەوتی فورقان ـ گەڕەکی راستی کۆن.
٤- مزگەوتی خۆی، مزگەوتی سەید محەمەد پیرداودی، کە بە ناوی خۆیەتی و هەر خۆی پێشنوێژ و موتەوەلی بوو. لە رۆژی ٢٠٠٢/٤/٢٧ چووە ئەو مزگەوتە و تاکو وەفاتی کرد لەوێ مایەوە.

مامۆستا لەو مزگەوتانەی سەرەوە ناومان بردن، لەوانە لەمزگەوتی حاجی تەهای قەساب و مزگەوتی شێخ نورەدین بریفکانی فەقێی هەبوون، دەرسی پێدەگوتن.

سەرەرای ئەوەی لە ساڵانی دوای شەستەکان، مامۆستا لە مەدرەسەی ئەوقاف مودەریس بوو، لەو مزگەوتانەدا دەوامی دەکرد:

١- مزگەوتی بازاڕ.
٢- مزگەوتی قەڵات.
٣- مزگەوتی شێخە رەشکە.

لەو مزگەوتانە مەدرەسە هەبوو چەند مامۆستایەک دەرسیان تێدا دەگۆتەوە. هەر لەو ماوەیەی مامۆستا کەلە شاری هەولێر بوو بۆ ماوەی جودا جودا لە چەند مزگەوتێک خەتیب بووە:-

١- مزگەوتی حاجی حەیدەرعوسمان.
٢- مزگەوتی شێخی چۆلی.
٣- مزگەوتی حاجی رەشاد.
٤- مزگەوتی (فورقان) لە گەڕەکی راستی بۆ ماوەیەکی کەم لەساڵی ١٩٩٥.

**فەقێیەکانی مامۆستا: -**

مامۆستا لە کاروانی تەدریس کردنی خویدا گەلێ فەقێ لە لایان خوێندووە، گەلێ زانای پایە بەرز لە سەر دەستی ئەودا پێگەیین، لەوانە هەندێکیان وەفاتیان کردووە و هەندێکیشیان لە ژیاندا ماون:-

* مامۆستا مەلا عومەری چۆمەزەردەلەیی.
* مامۆستا مەلا عەبدوڵلای نەبیاوەیی.
* مامۆستا مەلا عەبدوڵلای پەلپیتانی و زۆرانی دیکە....
* مامۆستا ملا عەبدولڕەحمان گردجوتیاری: زانایەکی پایە بەرزی شاری هەولێرە و ئێستا لە مزگەوتی حاجی عەزیزی خەرابەدراو لە ناو شاری هەولێر ئیمام وخەتیبە، ماوەیەکی چاکی لای مامۆستا خوێندووە.
* مامۆستا مەلا سەعدەدین مەلا

مەسعوود: ئیمام و خەتیبە لەناو شاری هەولێر.
* مامۆستا مەلا عەبدولغەنی حاجی تەها بەزاز: ئیمام و خەتیبە لە مزگەوتی ( الفرقان) لە گەڕەکی راستی کۆن، ئەم زانانەیە ئیجازەی لەلای مامۆستا مەلا سەید محەممەد وەرگرتووە.
* مامۆستا مەلا محەممەدی تێنەیی: ئیمام و خەتیبە لە مزگەوتی حاجی خالند لە گەڕەکی ئیسکان.
* مامۆستا مەلا عەزیزی شیوەلۆک.
* مامۆستا مەلا عەلی خدر مامک / ئەم زاتەش ئیجازەی لای مامۆستا وەرگرتووە.
* مامۆستا شێخ ئەحمەد خۆشکانی و زۆرانی دیکە...

**نووسین و تەئلیفاتی مامۆستا:-**

مامۆستا سەرەڕای ئەوەی بەردەوام بە پێی توانای خۆی لە دەرس گوتنەوە دابووە، کە تەدریس بۆتە کاری سێیەمی لە دوای پێشنوێژکردن و خوتبەخوێندنەوە، ئەوا سەرباری ئەوانە لەکاتی موتالەعەکردن بە حاشیەنووسینی سەر کتێبەکان خەریک بووە، دیسان سەرباری ئەوانە چەند کتێب و نامیلکەیەکی لەبواری جیاجیادا داناوە، کە زۆربەیانی بە چاپ گەیاندوە لە وانە هەندێکیان بە زمانی عەرەبی نووسراون، هەندێکیش بە زمانی کوردی: -

١- خدمة الدين في إعانة الطالبين.
٢- نخبة الأفكار في تنجية والدي المختار.
٣- تحقيق المقام في نزاهة سيد الانام.
٤- ظاهر السنة والكتاب في حل ذبيحة أهل الكتلب.
٥- فتوي في حق زوجات المفقودين.
٦- مشروعية التلفيق.
٧- جدول أوقات الصلاة. كيف وضعته.
٨- مشروعية الصلاة قبل صلاة الجمعة.
٩- الواجبات والمستحيلات لله تعالي.

**کتێبە کوردییەکان: -**

١٠- روونکردنەوەی سەفەری حەج.
١١- قوونووت لە نوێژداو کورتە باسێک.
١٢- سەلاوات و سەلامی دوای بانگی نوێژان.
١٣- خشتەی کاتەکانی نوێژ، چۆنم داناوە.

**لەوانەی چاپیش نەکراون: -**

١- حكم الموسيقي في الإسلام.
٢- کۆمەڵە فەتوایەک.

**خشتەی کاتەکانی نوێژ:-**

ئەم خشتەیە کە بەشێوەیەکی دەوری بۆ هەموو ساڵێک، کاتەکانی پێنج فەرزەی نوێژ و خۆرهەلات و خۆرئاوای تێدایە بۆ شاری هەولێر و دەورو بەری دەست دەدات، لە چاودێریکردن و شەونخوونی مامۆستایە، کە خۆی بۆ ماوەی زیاتر لە پازدە ساڵان چاودێری خۆرهەڵات و خۆرئاواو بەیانی داهاتن و کاتەکانی نوێژی نیوەڕۆو نوێژی عەسرو بزربوونی شەفەقی سووری کردووە، زیاتر لە ٣٠ ساڵە لە شاری هەولێر و دەوروبەری شار پیادە دەکرێت و هەموو مزگەوتەکانیش پەیڕەوی دەکەن.

**ژیانی کۆمەڵایەتی مامۆستا: -**

أ- لە ژیانیدا حەوت جار حەجی کردووە.
ب- لە ژیانیدا یەک خێزانی هەبووە. سێ کور و کچێکی لە دوای بەجێماوە.

**کوڕەکانی ئەمانەن:-**

١) عومەر: بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لە یاسا هەیە، ئیجازەی عیلمی زانستی ئیسلامی لە کاتی وەرگرتووە.
٢) ئیسماعیل: بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی هەیە لە پزیشکی هەیە و دبلۆمیشی لە تەندروستی کۆمەڵ هەیە.
٣) ئیبراهیم: بڕوانامەی بەکەلۆریۆسی لە کارگێڕی و ئابووری هەیە.

دوای تەمەنێکی یەکجار زۆر لە خزمەتی ئایین و موسڵمانان و هاوشارییەکانی، مامۆستا بە رووسووری لە شەوی ٢٦ لەسەر٢٧ / ١٢ / ٢٠٠٦ زایینی بەرامبەر بە رێکەوتی ٦ لەسەر٧ / ذي الحجه/١٤٢٧ کۆچی، بە یەکجاری پێلووی چاوەکانی و ژیانی لێکنا و ماڵئاوایی لە کەسوکار و خزم و هاوەڵانی دەکات و دنیای فانی جێدێڵێت و لە گۆڕستانی مەعمەل قیر لە شاری هەولێر شاردراوەتەوەو بە خاک سپێردرا.



# روانگەی هەولێر

**لیژنەی ئینسکلۆپیدیا**

وەک پێدەچێ ئەم روانگەیە، روانگەی فەرمی بنەماڵەی سەرجۆن بووبێ، لەوەش کە شاری (ئەربیل-هەولێر)یان هەڵبژاردووە، بەهۆی ئەوەبێ کە ئەم شارە مەڵبەندی پەرستنی خواوەندی (عەشتار) بوو، ئەو جەنگاوەرە رێزی لێ گیراوە، ئەمە ئەو رۆڵەیە کە دەدرایە پاڵ عەشتار (venus-Ineifer) کە خاوەنی سروشتێکی پیاوانە بوو، ئەمە سیفەتێک بوو کە سامییەکان (لە سەرەتای هەزارەی سێیەم) لە پەیکەری - ماری-دا ئەوە دەبینین، چونکە ناوی خواوەندی ژن لە زمانی سۆمەریدا گۆکردنێکی نێرانەی لەگەڵدایە. هەروەها زۆر دەقی تر هەن کە بەو مانایەن و لە بنەرەتدا لە سەردەمی سلوکی بۆ شاری (ئوروک) وەرکا دەگەڕێنەوە. کە بنکەیەکی گرنگی ئایینی بوو لە رۆژانی زوودا، دواجار بووە جێگای پەرستنی بەرێزەوەی خوداوەندی مەزنی ئاسمانی (ئانۆ) تا رۆژی لە کەل ئاوابوو بە هۆی رووداوە سیاسییەکان، وا دادەندرێ کە روانگەکە لە تابقی هەرە سەرەوەی زەکورەکەدا دامەزراوە، وەک ئەوەی کە بورجی بابل بە (۹۰ مەتر) بەرزی مەزەندە دەکرا.

لە کتێبی (علوم البابليين) وەرگیراوە.



# شین و شایی و دەستەوایی

شوان عومەر

**شیوەن لە دەشتی هەولێردا...!**

جاران کە یەکێک ئەمری خوای بەجێ دەگەیاند، ئافرەت و پیاو لەسەری خۆیاندا دەدا، سەر و گوێلاکی خۆیان نەدەهێشت، بە مستان لە خۆیان دەدا و خۆیان لە قوڕ هەڵدەکێشا. ئینجا ئایا باوکی بوو، مام بوو، خاڵ بوو. باوکەڕۆ، مامەڕۆ.. کاکی مردووە واتە خۆی کەوڵ دەکرد. لە لایەکی دیکە، ئەو کەسەی یان کەسێکی بمردبایە لە گوندێک، هەموو گوندەکانی دەوروبەری دەتاسان. تا ماوەیەکی زۆر خەڵکی گوندی هاوبەشی خەم و پەژارەیان دەکرد. دوای شاردنەوەی مردوو، کە لەسەر قەبران دەهاتنەوە. تازیە کە لە رەشماڵ بەڕێوە دەچوو، مزگەوت نەبوو یا گچکە بوو، بۆیە یەکسەر رەشماڵ هەڵدەدرا. سەبارەت بە ئافرەتان شیوەن لە ماڵی خاوەن تازیە دەگەڕا. ژنان پرچی خۆیان دەڕنییەوە و خۆیان لە قوڕێ وەردەدا و لە خۆ دەچوون. ئافرەتێک بە شان و باڵی مردووەکەی هەڵدەگوت و ئەوانی دیکەش لە دوایان دەگێڕایەوە، هەروەها تا تازیەکە تەواو دەبوو و دوای ماوەکی زۆریش خەڵک زۆر پێی شوورەیی بوو ئەگەر رێز لە مردووی یەک نەنرێ، بەڵێ..زۆر رێز لە مردووی یەکتر دەنرا. ئەوەی لەمەڕدا بوو: کامە بەران لە هەمووان قەڵەوتر بایە دەیهێنا زەنگۆڵەکەی لە ملی دەکردەوە، نەوەک دەنگی زەنگۆڵەی بێت، هەروەها بە مشکی بایە یان بۆیە پشتی مەڕەکەشیان رەش دەکرد، ئەوەش گوزارشت لەوە دەکات، کە ئەم گوندە تازیە دارن. بەو جۆرە بەشداری خەمی خزم و کەسی مردوویان دەکرد. هەروەها نەدەبایە خۆیان بشۆن یان جل و بەرگ بەسەر رستە دادەن، تا دراوسێیەکانیش جل و بەرگیان لەسەر رستەی هەڵنەدەخست، چونکە شمەک رەنگاو رەنگە. سەرو ریشیشیان نەدەتاشی، پاش

ماوەیەکی زۆر یەک دووەک یاخود مەلا یان ریش سپییەکی گوندی دەچووە لایان ئامۆژگاری دەکردن و دەیانگوت: "هەر باوکی تۆ نەمردووە، هەر لە تۆ نەقەوماوە، ئێمە هەموو براتین"، یان ماوەیەک دەیبردە سەر پەرێزێ و پیاسەیەکی دوور و درێژی لەگەڵ دەکرد، یا شەو دەچوو لە مالیان دەماوە جا لەگەڵ خۆی دەیهێنا بۆ دیوەخان تێی دەگەیاند: کە دونیا هەر مردنە، هەموو دەڕوا و وابوو و واچووە، ئەوەش لەگەڵ برا گەورە و ریش سپیان کێ بایە... ئیدی کە کاکیان بڕیاری دابایە، ئەوانی دیکە لە قسەی دەرنەدەچوون و بە قسەیان دەکرد و تازییەکەیان دەڕەواندەوە.

**بووک هێنان و بووک گواستنەوە...!**

سەبارەت بە بووک هێنان و بووک گواستنەوە بە دوو سێ قۆناغ تێپەڕیوە، ئەو کاتی گەورە بە بچووک باو بوو، یان ژن بە ژنی، یا سێ بەگایی، ژن هێنان... ئینجا هەریەک بەپێی خۆی. بێگومان ژن هەڵگرتنیش یەکێک بوو لە دابونەریتی کوردەواری. ئێستا لە زۆر لە ناوچەکاندا هەرماوە، لەوانەیە لە تەواوی دونیادا ئەوە هەر هەبووە و هەر دەمێنێ و بنبڕ ناکرێ. بەڵام ئەوەش بە دەگمەن روو دەدا، لە دەشتی دزەییدا پتر ژن بە ژنی باو بوو، گرنگ نەبوو ئەو ئافرەتە چەندیان ماڵ بۆ دەکرێ یان ناکرێ. لە کاتی ژن بە ژنیدا کە دەیانگوت: کوری فلانە کەس ژن دێنێ... هەروەها لەلای مزگەوتی ڕەشماڵەکەیان هەڵدەداو بەرەو مافووریان رادەخست، زەلام کۆ دەبوونەوە، ئەگەر دەهۆڵ و زوڕنا بایە، ئەوا ئافرەتان و پیاو رەشبەڵەکیان دەکرد، هەڵپەدەرین هەتا ماندوو دەبوون هەڵپەرکێیان دەکرد، هەڵپەرکێی چۆپەیی... ئەگەر پیک و دووزدلە هەبایە یان تەپڵەکیان هەڵدەکرا. منداڵ تەق تەقۆکەیان دەتەقاند. پیاویش برنۆ و دەمانچەی هەبوو، ئەوانیش دەیانتەقاندن. هەر لەو رۆژەدا کۆمەڵە پیاوێک دەچوون نیشانەیان دادەناوە و بە تفەنگان وەردەگەرانێ بۆ ئەوەی بزانن کامە لە هەمووان نیشان شکێنترە، نیشانەکانیش بریتی بوون لە بەرد یان نەینۆک... هتد، دوای نیشان شکێنی منداڵیش قەوانەکانیان کۆ دەکردەوە. دیاری پیاوان دەستەسڕ یان گۆرەوی بوو، دیاری ئافرەتیش چەفییە یان دەسماڵە، کە بە زەنگیانە بایە یا بە نەخش و نیگار... لەسەر ئافرەتان دابەش دەکرا. یەکەمین رۆژ ئێوارەکەی شلەساوار بە گۆشت لێدەنرا و ماستاو و سەوزەیان لەگەڵ دادەنا. خواردن دەچووە ژێر رەشماڵ، کە خواردن لەناو پیاوان دەگەڕاوە، بۆ منداڵانیان دادەنا... ئینجا ئەوەی بە پاک و خاوێنی دەماوە رەوانی لای ئافرەتان دەکرا و هەروەها ئافرەتان بەشی خواردنی تایبەتی خۆیان هەبوو، جگە لە بەرماوەی پیاوان. دووەمین رۆژ واتە رۆژی هەینی بووک دەگوازراوە. کە بووک دەگوازراوە بە وڵاخی دەیانهێنا دە پازدە پیاوی سوارچاک کۆ دەبوونەوە راوڕاوانێ و جلیتانییان دەکرد و سەگ و توولەیان لەگەڵ خۆیان دەداو لە پێش بووکێ تێپەڕ دەبوون.

بێگومان بۆ بووک پێک دانیش (گۆڕینەوە) شوێنێکیان دیاری دەکرد. ئینجا دەبایە ئافرەت بڕوا و دەستی بووکێ بگرێ و بیبێتە بەربووک، تارایان بە سەروچاوی دادەدا، کە بووک دەهاتەوە زاوا دەبایە لەسەر خانووی خۆیان رابوەستێ یان لەسەر دیواری حەوشە، جامێک پێنج فلوس و دەفلوس و دانەوێڵە و قەندە شەکری بەسەر بووکێ دادەکرد، بۆ ئەوەی پێ و قەدەمی بەخێر بێ، منداڵیش تاویان دەدایێ و دەکەوتنە بن دەست و پێی ئاپۆرەکە. بووکیان لەسەر سەکۆیەک یان تەنەکەیەک دادەنا و دەبووە چەپڵە لێدان و قریوە یەک دوو هەلهەلەیان لێ دەدا.

دواتر بووک هەڵدەستاوە بۆ ئەوەی میوانەکان بووکێ ببینن و تەماشای بکەن، -دەم و چاوی بووکێیان دەدیت، بووک مڕ مابۆوە، ئەوە نەبوو خۆی تێ بگەیەنن - پیرۆزبایی لە زاوا بکەن.

ئینجا زاواش لەم رۆژەدا خۆی پۆشتە دەکرد و دەمانچەیەکی لە نێکی قایم دەکرد و بەو جۆرە دابونەریتی بووک هێنان بەڕێوە دەچوو و دۆر دەدڕاو تەقە دەبڕا...!

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (٢)ی ساڵی ٢٠٠٠ وەرگیراوە.



# سەفەرێکی فۆلکلۆری به (پاسی) مام سەلام

عەبدوڵلا بەکر

مام سەلام خوا لێی خۆشبێ له ساڵانی پەنجاکان شوفێر بوو، پەست (پاس)ێکی هەبوو، لمووزەکەی (لای پێشەوەی) بە لۆری دەچوو، بۆدییەکەشی دار بوو، سێ بەش بوو، بەشی پێشەوەی لای شوفێرەکە کوشن بوو، خەڵکەکە هەردەم مشتومڕیان بوو لە گرتنی ئەم کوشینە، کە کرێیەکەی گرانتریش بوو، نەفەر لە پێشەوە بە دوو درهەم بوو، بەشی ناوەند و دواوەش نەفەر بە یەک درهەم بوو، بەشی پێشەوە و ناوەند بۆ نەفەران تەرخان کرابوو، بەڵام بەشی دواوە بۆ ئاژەڵ و کەلوپەل بارکردن بوو، مام سەلام ماڵی خۆی لە هەولێر بوو، بەڵام قەت شەو لە ماڵی خۆی نەدەنوست، بەڵکو لە دیبەگە لەگەڵ پەستەکەی دەمایەوە، لەوێ بەیانیان زوو نەفەر و کەلوپەل و ئاژەڵی باردەکرد و بەڕێ دەکەوت، لە ڕێگا بگەیشتبایە هەر گوندێک رادەوەستا یان نەفەری هەڵدەگرت و یان نەفەری لێ دادەبەزین، بەم شێوەیە تا چێشتانەکی درەنگ ئەوجا

دەگەیشتنە هەولێر و لە گەراجی مەخموور و دیبەگە دادەبەزین، نەفەرەکانی تێ دەگەیاند، کە هەر کەسێک ئیشەکانی خۆی زوو تەواو بکا، ئەگەرنا پاش نوێژکردن بەرێ دەکەون، بۆ گەڕانەوە، هەر کەسێک دوا بکەوێ ئەوا بەجێ دەمێنێ، لەبەر ئەوە خەڵکەکە دەبوایە زوو ئیشەکانیان راپەڕێنن و لە کاتی دیارکراوی خۆیان بگەڕێنەوە بۆ گەراجەکە.

لە ساڵی ١٩٥٥ یەکەم سەفەرم لەگەڵ مام سەلام بۆ شاری هەولێر ئەنجامدا، ئەوکات لە پۆلی شەشەمی سەرەتایی بووم، کە یەکەم جار بوو سەر لە شار بدەم، لەو کاتەی کە ئەزموونی بەکالۆریا نزیک بووبووەوە بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی دیبەگە پێی راگەیاندین، کە هەر یەکێک لە قوتابیانی پۆلی شەشەم دەبێ وێنە بگرێ و بیهێنێ بۆ هاوبەشی کردن لە ئەزموونەکە و وێنەش هەر لە هەولێر دەگیرا.

ئەوجا قوتابیانی پۆلی شەشەم مام سەلامیان تێگەیاند، کە سبەینێ لەگەڵی سەفەر دەکەین بۆ هەولێر، بۆ بەیانی لەگەڵ رۆژهەلات بەرێ کەوتین، جادەی دیبەگە و هەولێر ئەو وەختی قیرتاو نەبوو هەمووی قوڕ و زیلاق بوو، کە گەیشتینە لای گوندی منارە کە گوندێکە دەکەوێتە سەر جادەکە، هەموو رێگایەک قوڕ و لیتە بوو دیار بوو پاسەکە تەناشی دەکرد و پشتەکەی بەولا و بەم لا فڕێ دەدا، دەسووڕا و لە قوڕەکە دەچەقی و نەدەڕۆیشت، مام سەلام هاتە خوارەوە دوو زنجیری ئەستووری لە تایەکانی پشتەوە ئاڵاند، ئەوجا پاسەکە دەستی بە رۆیشتن کردەوە، بەڵام لەبەر زنجیرەکان زۆر بە گرانی دەڕۆیشت، رێگایەکە کاتی زۆر برد و پێش نیوەڕان گەیشتینە هەولێر، لە گەراجەکەی مەخموور و دیبەگە دابەزین.

مام سەلام پێی راگەیاندین کە لەگەڵ نوێژی نیوەڕۆ کرا هەموومان لە گەراجەکە ئامادەبین بۆ گەڕانەوە، هەر یەکێک بەلای ئیشوکارەکانی خۆیدا رۆیشت، من لەگەڵ برادەرەکانم جاری یەکەم روومان کردە قەیسەری و بەناو کۆڵانەکانی قەیسەریدا گەڕاین، کە یەکەم جار بوو شارم دەدی، قەیسەری لەپێش چاوم شتێکی زۆر سەیر و عەجایب بوو، ناو کۆڵانەکانی قەیسەری هەمووی دوکان و چایخانە و کەبابخانە بوو، بۆنی کەباب و دووکەڵی رژوو لەناو ئەو کۆڵانانە پەنگاوەی دابۆوە، چونکە مەنفەزی نەبوو بچێتە دەرەوە، ئەوجا دووکەڵ و بۆنی کەباب تێکەڵاو بوو بوون و زۆرمان پێ خۆش بوو لە دوورەوە بۆنەکەی دەمار دەمار دەهات.

پاش کەباب خواردن لە یەکێک لە کەبابخانەکانی قەیسەری (ئەگەر یەکێک بچووبایە هەولێر و کەبابی نەخواردبایە دەیانگوت تۆ شارت نەدیتووە) پاش کەباب خواردن بەرێ کەوتین بۆ لای وێنەگر، کە لە دەوروبەری پۆلیسی ئێستا بوو، لەوێ هەر یەکێک لە ئێمە لە پێش کامیرەی وێنەگر دانیشتین و وێنەمان گرت، کە یەکەم جار بوو لە ژیانم وێنە بگرم، کە وێنەکانمان وەرگرتەوە دەستمان کرد بە گەڕان لە کۆڵان و جادەکانی شاری هەولێر، کە ئەوکات چەند شەقامێکی کەم بوو، تا کاتی نیوەڕۆ گەڕاینەوە لای پاسەکە، لە گەراج مام سەلامیش چاوەڕێی نەفەرەکان بوو بەگاڵە و قڕە و هاوارکردن زووکەن دەڕۆین بەجێ دەمێنن.

خەڵکەکەشی زوو بە زوو سواری پەستەلۆرییەکەی بوون و هەرکەسە جێگەی خۆی گرت، مام سەلامیش ناوی خوای لێهێنا و دەستی بەگەڕانەوە کرد بۆ دیبەگە، بەم جۆرە لە رێگا لە هەر گوندێک خەڵکێک دادەبەزین و خەڵکێکیش سەردەکەوتن و کەلوپەلەکانیشیان لای سەرەوەی پاسەکە باردەکرد، بەم شێوەیە تاکو وەختی عەسر گەیشتینەوە شارۆچکەی دیبەگە، دادەبەزین و هەر کەسێ پەرتەی کرد و چۆوە ماڵی خۆی، مام سەلامیش دوور لە ماڵی خۆی لە دیبەگە دەمایەوە، لەگەڵ پاسەکەی خۆی دەخەوت و چاوەڕێی رۆژێکی دیکە بوو بۆ گەڕانەوە بۆ هەولێر.

* مامۆستا لە پەیمانگەی مەڵبەندی مامۆستایانی هەولێر.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (٩)ی ساڵی ٢٠٠٥ بڵاوبۆتەوە.



# لافاوەکانی گەڕەکی تەیراوەی هەولێر لە ساڵەکانی ۱۹۵۰-۱۹٦۵

ئا: شێرۆ مام ساڵ

ئەگەر ئاورێک لە مێژووی دێرینی پیرە هەولێر بدەینەوە، گەلێک شتی سەیر و سەمەرەمان بەرچاو دەکەوێت، ئەوەی من بەچاوی خۆم بینیومە یان لەنزیکەوە ئاگاداری بووم، لافاوەکانی گەڕەکی تەیراوە بوو کە لە ساڵەکانی ۱۹۵۰ - ۱۹٦۵ لە وەرزی زستان و سەرەتای بەهارێدا رووی دەدا. لەکاتی خۆیدا شوێنی ئەو گەڕەکە چۆڵەوانی بووە. مام "تاهیر ئاغا هەولێری" ئاوەدانی کردۆتەوە، ناوی گەڕەکەکەش تا ئەمڕۆ بەناوی ئەو پیاوەوە ناوبانگی دەرکردووە.

لە سەرەتادا ئەو گەڕەکە لە (۷) ماڵ پێک هاتبوو، پاشان رۆژ بەڕۆژ پەرەی سەندووە و گەورە بوو، چەندین کووچەو کۆڵان و شەقامی لێ کەوتەوە، لەناوەڕاستی ئەو گەڕەکەدا چەند کەند و کۆسپێک هەبوو ئاوی پێدا دەڕۆیشت، سەرچاوەکەی لە بن زوورگەکانی بنەسڵاوە و کەسنەزان دەستی پێدەکرد، ئەوجا دەبوو بەدوو لق، لقێکیان لە سێتاقانەوە بەرەو گەڕەکی تەعجیل و سەعدووناوە دەڕۆیشت. لقەکەی تریان بۆ شوێنی نەقلیات و تەیراوە شۆڕ دەبۆوە، لە پشت گازینۆی عەنتەر، لەکاتی زستانیش، کە باران زۆر دەباری لافاو هەڵدەستا و خەڵکی ئەو ناوچەیە هەراسان دەبوون. لە هەمان کاتیشدا خۆیان ئامادە دەکرد نەوەک لافاوەکە بگەڕێتەوە و راپێچیان بکاتەوە.

زۆرجاریش بەچاوی خۆم دیوە کەلوپەل و ناوماڵانی وەکو لێفەو دۆشەک و لباد و لانک و زۆر شتی تری لەگەڵ خۆیدا رادەماڵی، جاروباریش گیانلەبەر و مەڕومالات و باڵندەی لەگەڵ خۆیدا راپێچ دەکرد، ئاوەکەش لە شوێنێک کۆ دەبۆوە، کە ئێستا بینایەی (عیادەی شەعبی) لەسەر دروست کراوە و پێی دەگوترا (گۆمی گەورە) نزیک گازینۆی عەنتەر، لەوێوە بەچایخانەی بایز رەت دەبوو، پاشان لە تەنیشت باڵەخانەی (پەرلەمان) تا دەگەیشتە گوندی (تووڕەق).

لە کاتی نزمبوونەوەی ئاودا، بەتایبەتی بەستی سەعدووناوە و تەعجیل، تا دەگاتە کەندی نزیک (منارەی چۆلی) خەڵکی بەدوای شتومەک دەگەڕان، زۆرجاریش گوێم لێ دەبوو، خەڵک زێڕ و زیو و کەرەستەکانی ناو ماڵیان لەم شوێنانەدا دەدۆزییەوە.

زۆر جحێڵ و مێردمنداڵ لەدوای بەردی (خاڵدارو بەردی چەرخ)دا دەگەڕان، ئەم بەردانەش بەئاسن دەکوتران، لەپاشان وەکو خڕپلەیەکی لێ دەهات و پێیان دەگوت (کەڵلا بەرد) و بۆ یاریکردن بەکار دەهێنرا.



# ماستی هەولێر

ئا: مێرگ[*]

هەموو دەزانین کە مێژوویێکی درێژمان لە ژیانی کۆچەرایەتی و رەوەندایەتی و بەخێوکردنی مەڕ و مالات و بەرهەمهێنانی بەروبوومی شیر و ماست و پەنیر و ژاژیدا هەیە، جاران لە شاری هەولێر بەیانیان بە سەدان ژنی گوندەکانی دەوروپشتی هەولێر بۆ فرۆشتنی ماستە سەر بە کا و بەنە زەرد و سوور و مۆر و شینەکان روویان لە شار دەکرد. هەرچەندە جاران ئەم سەفا و مەروایەی بەینی گوند و شاری و پیرێژن و کچە جحێلەکانی ناو پەست و پیکابەکان زیاتر بۆنی ژیانێکی سادەی لێ دەهات، وا بزانم جامە ماستەکانیش پاکتر و بەتامتر بوون و بە پەڕۆکەکی سپی خاوێن سەر بە رێحان و پوونگ و گژ و گیا داپۆشرابوون. جارانی پەستی گوندی نەما.... بەلام هەتا ئێستاش لە هەولێر ماست هێنان و ماست فرۆشتن بەردەوامە، هەرچەندە لەوانەیە کابرایەک هەموو مەنجەلە ماستەکانی گوندەکەی کۆبکاتەوە و بیگەیەنێتە ناو شار، کە کۆمەلێک دوکانی زۆر هەن لە هەولێر ئەو مەنجەلە ماستانە دەفرۆشنەوە بە تایبەتی لە بەهاردا. هەولێر بە ماست ناسراوە، سلێمانییەکان بۆ گالتە و خۆشی دەیانگوت (هەولێرە ماست). (لبن أربیل)یش لە بەغدا زۆر ناسرا بوو، زۆر کەسیش لە گەشتەکانیاندا بۆ هەولێر و گەڕانەوەیان بۆ سلێمانی و ناوەڕاستی عێراق و بەغدا ماستی هەولێریان لەگەل خۆیان دەبردەوە.

**پرسیارێکی گرنگ، بۆ ماستی هەولێر بەناوبانگە؟**

دەشتی هەولێر پڕ لە گژ و گیایە و مەڕێکی زۆری لێ دەلەوەڕێ و خەلکانێکی زۆر مەڕ و مالاتێکی زۆریان هەیە. باشیی ماستی هەولێر ئەوەیە، کە ماستی مەڕە و تێکەلاو نییە لەگەل شیری بزن. لە ناوچە شاخاوییەکان ماستی بزن زۆرە، هەرچەندە ئێستا کەس باوەڕ ناکات لە هەبوونی ماستی مەڕ.

ماستیش یەکێکە لەو خواردنانەی نانی بەیانیانی خەلکی کوردستان لە پال گوێز و قەیماغ، بەتایبەتی لە بەهاراندا نان و ماست و چایەکی شیرین و کۆبوونەوەی خێزان بە دەوری قاپێک یان دوو قاپ ماستی بە سەرتوو. ئێستاش زۆر بەیانیان لە کۆلانەکان ئافرەتان و گەنجان و مندالان دەبینرێن بۆ کڕینی چارەگە ماست و کیلۆیەک ماست لە دوکانەکانی کۆلانەکانی گەڕەک.

جا هەرچەندە باسی خۆشی و ترشی و شیرینی ماستی مەڕ و بزن و چێل بکەین، هێشتا ناگاتە نانێکی تیری بە ماست.

ماست، چەندین خواردنیشی لێ دروست دەکرێت وەک دۆغەوا و داندۆک و کەشک، لە کاتی گەرما لەشی مندالیشی پێ چەور دەکرێ. بەهارانیش ئارەق نۆشەکان مەزەکانیان دەگۆڕن بۆ جاجکی ماست، ماست و خەیار. کە گەرماش دادێت جامە ماستاوێکی پڕ لە سەهۆل و هەندێک خوێ لە هەموو شتێک خۆشتر و فێنکترە[**]

*** ئەم بابەتە لەبەر ئەوەی ناوی کەسی بەسەرەوە نییە، بۆیە نووسیمان ئامادەکردنی مێرگ.**

**** ئەم بابەتە لە گۆڤاری (مێرگ) ژمارە (١٢)ی سالی ٢٠٠٦ وەرگیراوە.**

# خمچێتی لە هەولێر

**دیمانە: محیەدین قادر**

خمچێتی پیشەیەكی كۆنی كوردەوارییە و جاران لە شارەكانی كوردستاندا چەندین دوكانی خمچێتی هەبوون، كە جلوبەرگی خەڵكیان لە خم دەگرت و رەنگی جلوبەرگە كۆنەكان تازە دەبۆوە. هەتا (٣٠-٤٠) ساڵێك لەمەوبەریش خمچییەكان لەكاری خۆیاندا بەردەوام بوون و خەڵكیش بە مەبەستی رەنگكردنی پۆشاك و جلكی خۆیان پەنایان بۆ دەبردن.

خمچێتی لەلایەك پێوەست بوو بەباری كۆمەڵایەتی گەلی كورد و، لەلایەكی دیكەش سیمای سادە و ساكاری كۆمەڵگەی كوردەواری پیشان دەدا. بەتایبەتیش ئەوكات رەنگكردنی جلوبەرگ بەهۆی خمەوە دیاردە و نەریتێكی باوی كوردەواری بوو لەنێو ئافرەتاندا، كە لەهەموو جۆرە مۆدێلێكی جلوبەرگ و پۆشاكی بێگانە و ئارایشگایەك دووربوون و لەخمنانی كراس و كەوێ و چارۆگ و بەرامپیل، تاكە رێگە بووە بۆ جوانكردنی ئەو جلكانە.

لەهۆنراوەیەكی فولكلۆریدا هاتووە:

**كەڵەبابی نیوەشەو كوڕەكەم دەكەی لەخەو**

**رەبی ساحێبت سەری دەخمێ گری هەر ئەوشەو**

بەڕێز حاجی محەمەد عەبدوڵڵا عەلی ناسراو بە حاجی محەمەد پرێمسچی، كە ساڵی ١٩٣٠ لە شارە دێرینەكەی هەولێردا هاتۆتە دنیاوە و هەتا ئێستاش هەر لە هەولێر نیشتەجێیە، یەكێكە لە كەسایەتییەكانی ئەو شارە، كاتی خۆی ماوەی (٩) ساڵان خمچی بووە و پاشان وازی لێ هێناوە و رووی لە كار و پیشەی دیكە كردووە، بێجگە لە خمچێتی كاری ئاسنگەری و مسگەری و دارتاشی كردووە.

ئێستا خاوەن كارگەی ئارامە بۆ دروستكردنی پرێمس و تەباخی غاز و كەرستە و پێداویستییەكانی ئاگر.

بۆیە بەچاكمان زانی دەربارەی خم و خمچێتی لە شاری هەولێردا، ئەم دیمانەیەی لەگەڵدا ساز بكەین.

*** خم چییە؟**

- خم ماددەیەكی گژنیژی بوو، دنكەكانی وەكو زەنگیانە درشت بوو، رەنگی لە نێوان رەش و شیندا بوو، واتە باینجانی بوو، لە وڵاتی بەریتانیاوە بە بەرمیل دەهات.

خم دوو ماددەی دیكەی لەگەڵ بوو یەكێكیان تۆزێكی سپی بوو، كە رەنگی شەكری هەبوو پێیان دەگوت قەلیە، ماددەی دووەمیش

قسر بوو، بەردی بەستێ، کە دەسووتا و پاشان هەوای پێ دەکەوت دەبووە تۆز، ئەو تۆزەش قسریان پێ دەگوت.

*** خم چۆن دەگیرایەوە؟**

- خم بە عەیار دەگیرایەوە، نیو کیلۆ هەشمان دەهێنا لەگەڵ (٢٥٠)گم قەلیە (مادده سپییەکە) لەگەڵ نیو کیلۆ قسر (تۆزی بەردەکە) لە کووپێکی گەورەی ئاومان دەکرد، کە دەوری (٢٠٠) لیتر ئاوی دەگرت، واتە لەو ماددانەمان تێدەکرد، لەکاتێکدا کووپەکە پڕی ئاو بوو، پاشان بەدارێک جوان تێکمان دەدا هەتا بە تەواوی تێکەڵاو دەبوون، ئێواریێ دەمانگرتەوە و هەتا سبەینێ بۆ بەکارهێنانی ئامادە دەبوو، وەک ماست چۆن ئێواریێ هەوێن دەکرێ و هەتا سبەینێ دەبێتە ماست.

بەڵام ئەگەر بازارمان نەبوایە و ماددە گیراوەکە بمابایەوە، ئەوە ماددەکە لە ئاو جودا دەبووەوە و لە بنی کووپەکە دەنیشت، کە ئیشمان هەبوایە دووبارە قسرمان تێدەکرد و تێکمان دەدا و جارێکی دیکە نوێ دەبووەوە، واتە خمەکە تێک نەدەچوو.

*** یەکەم جار چۆن بیرت لەوە کردەوە دوکانی خم دابنێی؟**

- ساڵی ١٩٤٨ کە جوولەکە لە عێراق ڕۆیشتن، دەزگایان بەجێ مابوو، چونکە پێشتر ئەوان ئیشی خمیان دەکرد، ئێمەش دوکانەکانمان لە خاوەن موڵک بەکرێ گرت و چووینە جێگەی ئەوان و دەستمان بە ئیش کرد.

*** کێ جلوبەرگی لە خم دەنا؟**

- تەنیا ئافرەت جلوبەرگی خۆیان لە خمی دەنا، سەبارەت بە پیاویش ئاسنگەر و مسگەرەکان لە کاتی ئیش کردندا کراسێکی درێژیان لەبەردەکرد، بۆیە کراسی خۆیان لە خمی دەناو لەجیاتی بەدلەی ئێستا بوو.

*** چ جۆرە جلوبەرگێک لە خمی دەنرا؟**

- کراس، کەوێ، بەرامپیل، سوخمە، ئاوەڵ کراس و چارۆگ و چەندین جۆرە جلوبەرگی دیکە.

*** ئایا هەموو جۆرە کوتاڵێک بۆ خم دەگونجا؟**

- کوتاڵی جاران بەزۆری بریتی بوو لە خام، کوودەری، چیت، جورجێت. ئەوانەش هەموویان بۆ خم دەگونجان.

*** چ کاتێک بازاڕی خمچییەکان گەرم دەبوو؟**

- لە وەرزی بەهاردا خەڵکی گوندەکان بۆ دروونەی جۆ دەچوون، لەو کاتەدا جلوبەرگی خۆیان دەهێنایە لای خمچییەکان و بەرگی خۆیان نوێ دەکردەوە، دەکرێ بڵێین خەڵکی شار و دەشت تێکڕا جلوبەرگی خۆیان لە خمی دەنا، بۆیە لەو ماوەیەدا ئیشی خمچییەکان لە هەموو کاتێکی دیکە زیاتر دەبوو.

*** ئەگەر یەکێک بوخچەیەک جلکی بۆ خم کردن بهێنابا چەندتان لێ وەردەگرت؟**

- خم کردن بە پارچە بوو، بۆ نموونە کراسی ئافرەتان کە کراسی بە باغەڵ بوو بە دوو درهەم لە خم دەندرا (هەر درهەمێک ٥٠ فلس بوو). پارچەی گچکەش نرخی خۆی هەبوو، هەروەک چارۆگ بە نیو درهەم و بەرامپیل بە نیو درهەم و سوخمە بەنیو درهەم لە خمی دەنران.

*** بۆچی خەڵک جلوبەرگی خۆیان لە خمی دەنا؟**

- بەهۆی هەژاری و دەستکورتی خەڵکی جلوبەرگیان کەم بوو، تەنانەت شوشتنی جلکیش کەم بوو، بۆیە پاش ئەوەی جلکەکان ڕەنگیان دەڕۆیشت، لە خمیان دەنا و لە ئەنجامدا ڕەنگیان نوێ دەبۆوە.

*** چەند ساڵ دوکانی خمت هەبوو؟**

- لە ساڵی ١٩٤٨-ەوە هەتا ساڵی ١٩٥٧ دوکانی خمم لە هەولێر هەبوو، پاشان وازم لێ هێنا.

■



# کۆنترین چایخانەی قەیسەریی هەولێر

**کارزان حەیدەر**

بە درێژایی حەفتا ساڵ و لەگەڵ تێپەڕبوونی شەش فەرمانڕەوایەتی وڵات، چایخانەیەک لە کۆنە قەیسەری گەورە و لەم پیرە هەولێرە، کۆنە هەولێرییەکانی لەخۆ کۆدەکردەوە. لەگەڵ دروستبوونی و بە تێپەڕبوونی ئەو زەمەنە دووردش، چایخانەکە هەر بە دیمەنی پڕ لە جوانی جارانی خۆی مایەوە تا ئێستا، بۆیە هەرکاتێ بەو کۆڵانە تەنگ و بچووکەی قەیسەری گوزدر دەکەی (چایخانەی قەیسەری گەورە) دێتە بەرچاوانت، دەگەڕێتەوە بۆ کۆنە هەولێری ساڵانی زوو، دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو و خۆشیٚ جاران، برایەتی و هاوتەبایی و یەک ڕۆحی جاران، چایخانەکە وەکو کلتوورێک و مۆزەخانەیەکی دێرین دێتە بەرچاو و سیمایەکی جوانتری بە بازاڕە کۆنەکە بەخشیوە، لەسەر دیواری ژوورەوەی چایخانەکەش وێنەی ژمارەیەک لە کەسایەتییە دیارەکانی تورکمانی ئەو شارە، کە ئێستا لە ژیان نەماون هەڵواسراوە و یادگاری و ڕۆژانی رابردووی کۆنە هەولێر دێننەوە یاد.

**مێژوویەکی دێرین..**

وەستا خەلیل ساڵح چایەچی، ئێستا خاوەنی ئەو چایخانەیەیە، کە تەمەنی زیاتر لە (٧٠) ساڵە، هەروەکو خۆی باسی کرد، ئەو کاتەی کە خۆی شاگرد بوو لەو چایخانەیە، وەستا ئەمین ساڵح بەر لە ئەو خاوەنی چایخانەکە بووە و دایمەزراندووە، وەستا خەلیل ساڵح چایچی، پەنجاو سێ ساڵە لەو چایخانەیە کارێکی بەردەوام و حەڵاڵ دەکات، وەستا خەلیل دەیگوت: من

لەسەردەمانی مەلیک لەو چایخانەیە بووم، کە دەکەوێتە نێو کۆنە قەیسەری پاشان سەردەمانی عەبدولکەریم قاسم و عەبدولسەلام عارف و عەبدولڕحمان عارف و ئەحمەد حەسەن بەکر گوزەری ژیانم کردووە تا بە ئەمڕۆش، هەموو ئەو ڕۆژانە بۆ من مێژوویەکی پڕ لە سەروەرییە، ئەو چایخانەیە شوێنی کۆبوونەوەی تورکمانەکان و غەیرە تورکمانەکانیش بوو، بەمانای پیاوانی کوردەواری خۆمان.

جگە لەمەش خەڵکانی کاسبکاری ئەو بازاڕە، بەیانیان بۆ نان خواردن روویان تێ دەکردم، منیش ئەو کاتە بەو کۆبوونەوە زۆرانە دڵخۆشتر و ئاسوودەتر دەبووم، ئەو چایخانەیە کۆنە، تێکەڵ بە مێژووی ئەم پیرە هەولێر و کۆنە قەیسەرییەیە، کە هەموومان شانازی پێوە دەکەین و دڵمان پێی خۆشە، دەتوانم بڵێم ئەم چایخانەیە لە هەرە کۆنترین و بەتەمەنترین چایخانەکانی ئەو قەیسەرییەیە، ڕۆژان هات و تێپەڕی، ئەو شوێنە هەروەکو خۆی وەکو کلتوورێکی نەتەوەیی بۆ تورکمانەکان مایەوە. ئێستا هەر دەرگای چایخانەکە دەکەوێتە سەر پشت، لە بەرەبەیان تا دەمەو ئێوارەی داخستنی، تورکمانە رەسەنەکان لێی کۆ دەبنەوە و دیمەنێکی جوانتری پێ دەبەخشن. ئەگەر لەگەڵ ئەوانیش بکەویتە قسە، دەچیتەوە نێو مێژوو و هەر ئەوان خۆیان مێژوویەکی دێرینی



ئەم هەولێرەن، چونکە ئەوەی ڕووداوی تاڵ و شیرینە لە یادیان تۆمارکراوە و ناسڕێتەوە.

### خانەدانە تورکمانەکان

زۆربوون ئەوانەی ناویان هات و فریا نەکەوتم تۆماریان بکەم، کە خانەوادەی تورکمانەکانی ئەم هەولێرە بوون و ناوداری شارەکە بوون، لەوانەیە وەستا خەلیلیش زۆر لەناوەکانی لە یادچووبن، بەڵام هەقی زۆربەشیانی دا، ناویانی هێنا، ئەوەی وەستا خەلیل چایەچی ناویانی هێنا، (حاجی قادر، مام فەتاح، مام عەبدولڕەزاق مام کانەبی سەدیق، کاکۆ حاجی عەولا، حاجی حەمەدەمین و حاجی حەمەی جۆ فرۆش، بورهان کانەبی حاجی کانەبی، حاجی قەساب، حاجی شەریف خەیات، حەکیم مەلا داود، مەلا هاشم، حاجی عەولا عەزیز، حەمە ئەحمەد عەزیزە ڕەش، حاجی تەها، حاجی مەولود قەساب، حاجی لەتیف قەساب، بیلال حاجی لەتیف، ئەلیاس قەساب، شەهاب چەلەبی و ئەحمەد چەلەبی، واحید شێخ محەمەد گۆیاڵ گەورە، حاجی عەلی عەبدۆک، جەلال خەلیل دەلال، حاجی عەبۆ کەبابچی، حاجی حەکیم مەلا داود، غەفور مەلا داود، حاجی مەلا نوری بەقال، حاجی قەرۆک و یاسین پاشا و جەبار ئاغا و مستەفا ئاغا بەقاڵ و حاجی خەلیل عەزیز و حاجی زیاد و مەلا نادر و حاجی سلێمان، کاک ئەحمەد، تەها حاجی محەمەد خۆشناو، حاجی لەشکری عەزیز، خدر خەیلانی، عادل مەلا قۆجە چاوشلی، حاجی یوسف تەها خەیات، مامە سەلمان سەفار، حاجی تەها عەبدوڵلا، نادر قادر، خەتاب حاجی کەریم، ڕۆستەم حاجی سابیر، عەبۆ قاوەچی و ئەمیر سالح عەبۆ قاوەچی، محەمەد ئەحمەد

قاوەچی، بورهان ئەحمەد ئاغا قەساب و سمۆک قەساب، ئەمانەش خەڵكانێكی دیاری ئەو شارە بوون لە سەردەمێكدا بە تێكەڵاوی و برایەتی كورد و توركمانەكانیشەوە، بۆیە گەلێک جار نەوەک هەر توركمانەكان، بەڵكو پیاوانی كوردەواری و خەڵكی ئەم دەشتی هەولێرە، ئەگەر لەناو شار بوونایە، یان ئەگەر لە دەرەوەی شار بوونایە و سەردانی هەولێریان بكردبایە، دەهاتنە ئەو كۆنە چایخانەیە و لە یەكتر كۆدەبوونەوە، بەدەم خواردنەوەی چای شیرین و گەرم، كاتێكی خۆشیان بە قسە و گاڵتە و گەپی جۆراجۆر بەسەر دەبرد.

### دەرگایەكی تەمەن (١٤٦) ساڵە

دەرگایەكی گەورەی كۆنە قەیسەری، ڕێک دەكەوێتە بەردەم چایخانەكە، كاتی خۆی ئەو دەرگایە دادەخرا و دەكرایەوە، دەرگایەكی ئاسنینی زۆر توند و تۆڵە، ئەو دەرگایە تەمەنێكی درێژ و مێژوویەكی دێرینی هەیە، هەروەكو باسیان لێوە دەكرد، كە دەرگاكە تەمەنی سەدە و نیوێكە، لەوانەیە زیاتریش بێت، چونكە ئەوانەی كە باسیان لە تەمەنی ئەو دەرگایە كرد، باوو باپیریان بۆیان گێرابوونەوە و خۆیان تەمەنیان لەنزیک (٦٥ تا ٧٠)ساڵی دەبوون، بەهەر حاڵ هەر شوێنێک لەو قەیسەرییە كۆنە، مێژوویەكی خۆی هەیە و وەكو



كلتوورێک ئێستا ماوەتەوە، بەڵام چەندی گرنگی بەو شوێنە كۆنانە بدرێ، هێشتا هەر كەمە و پێویستی بە زیاتریش هەیە بۆ ئەوەی لەناو نەچن.

### وەستا خەلیل.. ئەو ناوەی زۆربەمان گوێبیستی بووینە

لەوانەیە پێتان سەیر بێ كە دەڵێم: وەستا خەلیل، ئەو ناوەی زۆربەمان گوێبیستی بووین، بەڵێ وەستا خەلیل، ئەو ناوەی كە هونەرمەند سەلام كۆیی لە تەمسیلی (تاپۆ هەقی چییە) هاوار دەكات: وەستا خەلیل، وەستا خەلیل، تاخمە چایەكی بێ ڕەنگ بێنە، وەستا خەلیلیش هاوار دەكات: شیرین یان تاڵ، سەلامیش دەڵێ: كورە نا نا، دیشلەمە، دیشلەمە، ئەوە ناوێكە و بەگوێی زۆربەمان زرنگاوەتەوە، لەوانەیە زۆربەمان وامان زانیبێ، كە ئەو وەستا خەلیلە ناوێكی خەیاڵی بێت، كەچی لە ڕاستیدا وەستا خەلیل بە حەقیقی چایەچییەكی ناوداری ئەو شارەیە.

* ئەم بابەتە لە گۆڤاری (بارش). ژمارە (٣) وەرگیراوە.



# چەند ڕووداوێکی هەولێر

نەژاد بەرزنجی

بیــردەوەری و کــەلەپوور لای گشت میللەتانی ئەم جیهانە شتێکی زۆر گرنگە، چونکە مێژووی بەرەبەیانیان دەپارێزێ، هەر ئەوەشە دەبێتە نیشاندەرێکی گرنگ بۆ دیاردەی شارستانییەتیان، بگرە هەر لە شتە دۆزراوەکانی کەلەپووری شارستانییەتی کۆنیانەوە، کە ئەوانە دەبنە نیشاندەرێکی سەربڵندی باپیرانیان، هەروەکو ئەم پەیکەرە جوانانەی کە لە بەرد تراشراون یان لە زێڕ و زیو داڕێژراون، یان ئەم تابلۆیە بەردانەی پڕ لە نووسراوی هەڵکەندراو بە نووسینی هێرۆگلیفی میسری و بزماری عێراقی، کە گشت دەستوورەکانی یاسا تێیدا نەخشێندراون، زاناکان بۆمانیان دیار کردوون، وەک یاساکانی (حامورابی و ئاشوورییەکانی چالاّیی میسوپوتامیا هەتا دەگاتە دەوری ئیسلامەتی! گەلی کوردیش کە لەسەر ئەم خاکەی ئێستاکەیدا باپیرانی ژیانیان بردۆتە سەر کەلەپوورێکی زۆر زەنگینیان بۆ بەجێ هێشتووین، کە جێگای فەخر و شانازیمانە و بووەتە هۆی ئەم سەربەرزییەی ئێستاکەمان، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە زۆر کەس حەسوودیان پێ ببەن، تۆ سەیر دەکەی لە گەلەرییەکان و بەڕێوەبەرایەتی کەلەپوور شتی وا جوان دەبینندرێن، کە هونەرمەندێکی کورد بەر لە هەزاران ساڵ لەمەوبەر دروستی کردووە، وەک روخساری کچێکی جوانی هەڵکەندراو لەسەر بەردێکی بچووکی بە قەدد نینۆکێک، ئایا ئەمە جێگای سەرسوڕمان نییە؟ کە ئەمڕۆ بە دەگمەن هاوتای ئەم هونەرمەندەمان دەست ناکەوێ... ئایا ئەم جۆرە شتانە نابێتە جێگای سەربڵندیمان؟ جا مێژووی کورد پڕیەتی لەم جۆرە شتانەی ئەگەر نەڵێم زیاتریش... دەبێ ئەوەش بخەینە سەر حیسابێک کە ئەوان نە خانووبەرەیەکی وەک ئێمەیان هەبوو. لە تاریکی شەوانیان دەخەوتن... شوێنی دانیشتنیان لەسەر حەسیر بوو، ئاوی جۆگە و رووبارانیان دەخواردەوە... ئێمە لەسەر ئەم حاڵەتە پێشکەوتووەی ئەمڕۆکەمان هێشتا نارازین، لە سەدەی بیست و یەکەمیندا، سەدەی تەکنۆلۆجی. جا منیش دەمێک بوو ئارەزووی نووسینی بابەتێکی وەهام دەکرد، بە راستی

هەستی بزواندم، بۆیە کەوتمە ناوبیری خەیاڵەوە و ئەسپی خەیاڵم تاوداو وەک باڵندەیەکی بەرزەفڕ بۆ ناو باخ و گوڵزاری وشەی رەسەنی کوردی تا چەند دەربڕینی جوان هەڵبژێرم بۆ ئەوەی هەستی خۆمی پێ بگوازمەوە بۆ سەر ئەم لاپەڕەیە، بۆیە پەنجەکانم لە بالای خامەکەم ئالاند و بە نووکە زێڕینە گەشاوەکەی خامەکەم ئەم وشە جوانانەم چنی و نووسیم!

١- باوکی خوالێخۆشبووم بە حوکمی مەلایەتی خۆی لەلای مەلاکانی شار بۆ کات رابواردن دادەنیشت، منیشی لەگەڵ خۆی دەبردە ئەم شوێنانە. جارێکیان لای شێخ محێدین - شێخ سالح دانیشتبووین، وتوویژیان دەربارەی دانیشتووانی قەلات بوو یەکێک لە شێخی پرسی و گوتی: دەزانین دەرگای ئەحمەدیە ئەحمەد- عوسمانی موتەسەریفی ساڵی ١٩٢٨ز لە هەولێر ئەوکاتە دروستی کردووە، ئەدی دەرگای بچووک کێ دروستی کردووە کە دەنوارێتە گەڕەکی شۆڕشی ئەمڕۆکە؟ شێخ وتی: من منداڵ بووم پیریاڵ ئاغا لای باوکم دانیشتبوو، دەیگوت حاجی (تەها ئاغا) لە حەوشەی ماڵی خۆی دایبڕیبوو لە ساڵی ١٩٢٦ز، چونکە سەپانەکانی پێیان راگەیاندبوو کە لەم ساڵەدا دز و جەردە چەند فەردە گەنمێکیان لەسەر جۆخین لێ دزیبوو، ئەویش ناچار دەبێ کە ئەم دەرگایە لە حەوشەی ماڵی خۆی بکاتەوە تا گەنمەکانی خۆی بگوازێتەوە سەر قەلات.

٢- باس لە عەرد لەرزینی گەورەی شاری هەولێر کرا، کە لە ساڵی ١٩١١ز روویدابوو بەجۆرێک بەشێکی زۆر لە دانیشتووانی قەلات لە خوارەوە رەشماڵیان هەڵدابوو، چونکە لەرزینەکە زۆر توند بووە و دوو رۆژی پێ چووە. دەڵێن عەرد لەرزینەکە هێندە بەهێز بووە، دار توویەکی پیری حەوشەی مزگەوتی خانەقا لە بن و رەگەوە هەڵدەکەنێ هەتا باسی ئەوەیان دەکرد کە زۆر بریندار چووبوونە مووسڵ بۆ تیمارکردنی برینەکانیان. ئەوەش بەهۆی رووخانی ئاسنجاوی سەر رەفکەکانی ژووری نووستنیان، چونکە لە دابونەریتی کۆنیاندا ئەو شتەیان بۆ مابۆوە پێیان دەگوت: تاقچە بە تورکی.

٣- لەبەر بچووکی شاری هەولێر ئەگەر رووداوێکی گرنگیش نەبوایە هەر خەڵکەکە پێیان دەزانی.

لە شاری هەولێر دوو سابوونچی هەبوون، لە ماڵی خۆیان سابوونیان دروست دەکرد، یەکیان لە گەڕەکی تەکیەی قەلات بوو بە ناوی حاجی عەبدوڵلا، ئەوی تریان لە گەڕەکی تەعجیلی ئیسلام بوو بە ناوی سمۆی سابوونچی. ئەم وەستا (سمۆ)یە مەلایەک دەبێتە میوانی بەشەو لە ماڵیدا دەخەوێ، دیارە خزمێکی خۆی بووە، کە بەیانی بەخەبەر دێ بۆ دەستنوێژ هەڵگرتن لە گۆسکەیەکی قوڕی پڕ لە ئاو دەستنوێژ هەڵدەگرێ و نوێژەکەی دەکا و پاش ماوەیەک بە (سمۆ)ی دەڵێ: هەموو لەش و گیانم لە ژان دایە، سمۆ هەموو مووی ئاکارەکانی لەش و گیانی رادەوەستێ و دەڵێ: وا دیارە بە ئاوی قەلیە شاری گۆسکەکان دەستنوێژی وەرگرتووە، دەست بەجێ دەیباتە موسڵ، کە ئەوکاتە هەولێر پزیشکی لێ نەبووە، ساڵەکەشیان نیشان کردبوو کە ساڵی ١٩٢٥ز بووە، بەر لەوەی بگەنە موسڵ مەلا کۆچی دوایی دەکا.

**هەولێر ٢٤/ ١٠/ ٢٠٠٤**

ئەم بابەتە لە گۆڤاری ئاسۆی فۆلکلۆر، ژمارە (٦)ی، ٢٠٠٤ بلاوبۆتەوە.



# پێشینەی دادوەری لە هەولێر

فاتیح یاسین مودەڕیس

**سەرەتا**

کۆمەڵی مرۆڤایەتی لەڕابردوودا حوکمیان بەو عورف و عادەت و دابونەریتانە دەکرد، کە لەناویاندا باوبوو. ئەو دابونەریتانە لەپێشینەکان بۆ پاشینەکان بەجێ دەما و دەبووە یاسایەک بۆیان و هۆزێک یان شارێک یان گەلێک حوکمیان پێدەکرد. هەر کەسێک لەو عادەت و عورفانە دەرچووبایە، بەتاوانبار دادەنرا. دابونەریت و عورف و عادەت بریتی بوو لەو بنەمایانەی کەخەڵک لەسەری راهاتبوون و خوویان پێوەگرتبوو، لە قەیران و ئاژاوەدا هەستیان پێدەکرد، کە پێویستە رێزی لێبگیرێت.

کاتێ خەڵک لەسەدەی رابردوو و ئێستاشدا یاساکانیان نووسییەوە، پشتیان بەوعورف و عادەتانە بەست، کە ببووە یاسایەکی نەنووسراو و ئەو دابونەریتانەیان نووسییەوە کە لەکۆمەڵگەکانیان حوکمیان پێدەکرا.

**پێشینەی**
**سەروەری یاسا لە هەولێر**

لای هەمووان ئاشکرایە، کە "سەروەری یاسا"و "سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری" رۆڵی گرنگیان لەبونیادنانی کۆمەڵگەیەکی سەقامگیرو ئاسوودەدا هەیە. زۆر جاریش ئەو دوو دەستەواژەیە بەیەکەوە باس دەکرێن (سەروەری یاسا) و (سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری).

هەمیشە بەشێوەیەک لەشێوەکان پەیوەندییەکی راستەوخۆ لەنێوانیاندا هەیەو دەتوانین بڵێین: بەشێکی زۆر لەسەروەری یاسا، لەسەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری و تۆکمەیی و بەهێزی دەسەڵاتی دادوەریدا خۆی دەبینێتەوە. سەروەری یاسا فراوانە، هەموو بوارەکانی کۆمەڵگاو حکومەت

و سیستەمی یاسا دەگرێتەوە. دەڵێن: جارێکیان لەحەکیمێکی یۆنانیان پرسیوە سەروەری یاسا مانای چییە؟ ئەویش لەوەڵامدا دەڵێت: "سەروەری یاسا ئەوەیە کەمیللەت گوێڕایەڵی فەرمانڕەوایان بکەن و فەرمانڕەوایانیش ملکەچ بن بۆ یاسا". یاسا، دەبێ بەرێگای ئوسولی و یاسایی و لەلایەن پەرلەمانێکی هەڵبژێردراوەوە بەمەبەستی هێنانەدی دادپەروەری، بەرژەوەندی گشتی و سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری دەربچێت.

سەربەخۆیی دەسەڵاتی دادوەری لەکاتێکدا دێتەدی، کە لەبەردەمی دەسەڵاتی دادوەری یان لەبەردەمی یاسادا وەک یەکەم خەلیفەی ئیسلام دەڵێت (هێز) لەلای لاواز بێ بۆ ئەوەی بتوانێ مافی مافخوراوانی لێ وەربگێرێتەوەو لاوازیشی لا بەهێز بێ بۆ ئەوەی مافی خۆی وەربگرێتەوە.

لەکۆمەڵگەی دیموکراتیشدا دەسەڵاتی دادوەری رۆڵی بەرچاوی هەیە، چونکە یەکێ لەپرینسیپەکانی سیستەمی دیموکراتی جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانە. لەبەر ئەوە هەر چەندە هەوڵ بدرێت بۆ ئەوەی دەسەڵاتی دادوەری سەربەخۆو بەهێز بێت، ئەوا خزمەتی زیاتر بە جێگیربوونی حکومەت و سەقامگیری کۆمەڵگە دەکرێت.

شاری هەولێریش کە بەلانکی مرۆڤایەتی دادەندرێت و بەدرێژایی مێژوو بە بەردەوامی ژیانی تێدا بووە، بەپێی ئەو گۆڕانکارییە مێژووییانەی بەسەری هاتوون بەپێی چاخ و حوکمڕانییە یەک لەدوای یەکەکان، دادگای لێبووە. یاسا بەسەر دانیشتووانیدا سەپێندراوە و نەزم و ئاسایش لەژێر سێبەری دادگاو یاسا پارێزراو بووە. بەڵام لەبەر ئەوەی کەس لەسەر مەسەلەی دادگا لەهەولێر شتێکی وای نەنووسیوە، بۆیە ئەستەمە بتوانرێ مێژووی دادگا لەو شارە دیاری بکرێ. یاخود باس لەچۆنیەتی بەرێوەچوونی کاروباری کار ڕاپەڕاندنی دادگا بکرێت. چونکە ئەو شارە بەحوکمڕانیەتێکی زۆرو میرنشینێکی زۆر تێپەڕیوە. زۆر وەرچەرخانی مێژوویی بەخۆوە بینیوە.

بۆ روونکردنەوەی هەندێ زانیاری لەبارەی دادگای ئەم شارە، پشتم بەست بە زانیارییەکانی "عوسمان موفتی" [1] و دواتر "دیوەخانی موفتی"م بۆ توێژینەوە لە سەر ئەم بابەتە دەستنیشان کرد[2]. هەر لەوێش لە زانیارییەکانی بەڕێزان "فاروق بەهائەدین خەلیفە"[3] و بەڕێز "عەبدولباقی محەمەد"کە شارەزای مێژووی پێش پەنجاکان بوون سوودم وەرگرت[4].

لەم رێگەیەوە بۆمان دەرکەت کە ئەم زانایانەی لە خوارەوە ناویان هاتووە، لەم شارە هەڵکەوتوون و بەکاری دادوەرییەوە خەریک بوون:

**١- قازی خافقین هەولێری(٤٥٧- ٥٣٨ک/ ١٠٦٤-١١٤٣ز) ناوی (محەمەد کوڕی قاسم کوڕی موزەفەر کوڕی عەلی)[5]یەو** بەقازی خافقین ناوبانگی دەرکردووە، واتە رۆژهەڵات و ڕۆژئاوا. چونکە لەزۆر وڵاتان دادوەری کردووە. لەساڵی ٤٥٧ک لەشاری هەولێر لەدایک بووە.

مەسمەعانی دەڵێت: سەبارەت بە لەدایکبوونی پرسیاری لەخودی قازی خافقین کردووە، ئەویش لەوەڵامدا گوتوویەتی لەساڵی ٤٥٧ک لەهەولێر لەدایک بووم. ئەوسا باوکی قاسم حاکمی هەولێر بووەو لێشی نیشتەجێ بووە. لەشاری بەغدا قازی خافقین لەساڵی ٥٣٨ک ماڵئاوایی کردووەو خانەوادەکەشی بەشارەزووری ناسراون.

**٢- قازی عەبدوڵلا شارەزووری**
(٤٥٦-٥١١ک/ ١٠٧٢-١١١٧ز)
ناوی (ئەبو محەمەد عەبدوڵلا قاسم کوڕی موزەفەر)ە. لەساڵی ٤٥٦ک لەهەولێر لەدایک بووە. لەموسڵ قازی بووەو هەر لەشاری موسڵیش لەساڵی ٥١١ک کۆچی دوایی کردووە[6].

**٣- قازی داود خالید خالیدی**
(٤٩٣-٥٧٣ک/ ١٠٩٩-١١٧٧ز)
ناوی (داود کوڕی محەمەد کوڕی حەسەن کوڕی خالید خالیدی هەولێری) (حصفەکی)یە چون، لەدیاربەکرو شاری بەغداش کاری دادوەری کردووە[7].

**٤- قازی بیلال رەمەزان بیلال جەلال هەولێری (٥٣٩ک/١١٩٦ز).** قازی بیلال کوڕی رەمەزان کوڕی بیلال کوڕی جەلال کوڕی حەسەنە. خەڵکی گوندەکانی ناوچە شاخاوییەکانی باڵا کورت و کوڕی هەولێر بووە[8]. ئیبن مستەوفی لەکتێبەکەیدا دەڵێت: لە (کەرخەین: کەرکووک) قازی بووە[9].

**٥- قازی شبلی ئیبن خەلەکان**

**(٥٧٦-٦٥٣ک/ ١١٨٠-١٢٥٥ز)**
شبلی کوڕی جونەید کوڕی ئیبراهیم کوڕی خەلەکان. نازناوی ئەبو بەکر کوردی هەولێرییە، چۆتە میسرو لە"ئەخیەم" کە شارێکی دێرینی میسرەو کەوتۆتە سەر کەنار دەریای رووباری نیل، بۆتە قازی. سەبارەت بە لەدایکبوونی پرسیاریان لێکردووە، ئەویش وەڵامی داوەتەوە: لەمانگی رەجەبیساڵی ٥٧٦ک لەشاری هەولێر لەدایک بووم[١٠].

**٦- قازی فەخرەدین کوڕی سەعدەدین شارەزووری هەولێری قازی مەهانی (٥٤٧-٦٢٧ک/ ١١٥٢-١٢٢٩ز)** قازی ماهانی نازناویەتی و خۆی ناوی (محەمەد کوڕی عەبدوڵلا کوڕی ئەبو بەکر)ەو لەهەولێر دادوەریی کردووە. پاشان چووە بۆ موسڵ لەوێ دادوەریی کردووە. دواتر رۆیشتووە بۆ حەلەب لەساڵی ٦٢٧ک کۆچی دوایی کردووە[١١].

**٧- قازی دێرە ١٣١٧ ک ناوی (داود کوڕی مەلا هیدایەت)ە.** قازی دێرە داود کوردی لەدەوروبەری ساڵی ١٢٤٠ک لەسەردەمی دەسەڵاتی تورکەکان و حوکمی "محەمەد پاشا رەواندوزی" قازی بووە. بەپێی هەندێ لەریوایەتەکان لەسلێمانیش دادوەریی کردووە و دواتر لەپاش مردنی باوکی لەساڵی (١٣١٢ک) گەڕاوەتەوە هەولێرو لەساڵی (١٣١٧ک) کۆچی دوایی کردووە شایانی ئاماژە پێکردنە، بەقازی داود هەولێری بە "قازی دێرە" ناسراوە[١٢].

**٨- قازی دێری**
ناوی قازی داود کوڕی مەلا سلێمان کوڕی مەلا خەزراو کوڕی مەلا سلێمانە. لەپێش جەنگی یەکەمی جیهانی لە (دێرە) قازی بووە. کە کەوتۆتە سەر رێگای حەریر- رەواندوز[١٣].

**٩- قازی زواری( ١٣٣٦ک/ ١٩١٧)**
ناوی (عەلی کوڕی سەعدوڵلا کوڕی مەلا ئادەم کوڕی مەلا عەلی)یە. زانایەکی زۆر گەورە بووە و بە پێی هەندێ لەدەستنووسەکان- کە لای کوڕی قازی، حاجی مەلا جەمیل کاوانی زواری کە عەشیرەتەکەیان زوارییە دەست کەوتووە- ئەوانە لەگەردەکانی لای باکووری رووباری بەستۆرە نیشتەجێن. لەسەردەمی قازی زواری دەوڵەتی عالی عوسمانی باڵا دەست بووەو حوکمڕانی لەژێر دەسەڵاتی ئەو بووە[١٤].

**١٠- قازی یوسف کوڕی ئەحمەد ئاغا**
قازی یوسف کوڕی ئەحمەد ئاغا قازییەکی شەرعی بووەو بەدادوەری ناوبانگی دەرکردبوو. باوکی عەونی یوسف بۆ ماوەیەک لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسم پۆستێکی وەزاری پێسپێردرا[١٥].

**١١- مامۆستا مەلا عەبدوڵلا ئەفەندی**
ئەو زاتە کەڵە پیاوی سەردەمی خۆی بوو، پلە و پایەکی بەرزی هەبووە. ماوەیەکی زۆر لەشاری کەرکووک قازی بووە، لەساڵی ١٩٤٨ز کۆچی دوایی کردووەو گۆڕی لەناو مزگەوتی موفتییە لەشاری هەولێر[١٦].

**١٢- شێخ ئەسعەد شێخ محەمەد سەعید نەقشبەندی**
ئەو زاتە یەکێک بوو لەشێخە ناودارەکانی سەردەمی خۆی. هەر ئەمەش بوو بە هۆی ئەوەی هەڵبژێردرێت بۆ قازی شاری هەولێر. لە ١٩٥١/٧/٨ کۆچی دوایی کردوو لەژوورێک لەناو مزگەوتی حاجی مەولود فەتاح (شێخە رەشکە) بەخاک سپێردرا[١٧].

**١٣- قازی رەشاد موفتی (١٩١٥-١٩٩٢)**
مامۆستای عەللامە قازی رەشاد موفتی، ٧٧ ساڵی تەمەنی خزمەتی ئایین و زانست و دادگاو کلتووری کۆمەڵگەی کوردەواری کردووە. ناوی تەواوی رەشاد کوڕی محەمەد موفتی کوڕی مەلا عوسمان کوڕی مەلا ئەبی بەکر، ناسراو بەکوچک مەلا هەولێری).

بنەماڵەکەی یەکێکە لەو خانەوادە ناودارانەی کوردستان بەوەی کە سەدان ساڵە خەریکی خزمەتگەیاندنن بەئایین و زانست و ئەدەب جیا دەکرێنەوە. لەبەرچی ناوی لێنرا رەشاد؟ خودی خۆی گێڕاویەتییەوە کە کاتی لەدایک دەبێ (محەمەد موفتی) قورئانی پیرۆز دەخوێنێ و کاتێ ئەو مژدەیەی پێدەدەن کەخودای گەورە کوڕێکی پێبەخشی ئەویش گەیشتۆتە ئەو ئایەتە (وقال الذي آمن ياقوم اتبعون أهديكم الي سبيل الرشاد)[١٨] سورەتی غافر ئایەتی (٣٨). ئەویش پابەندبوون بەقورئان گوتوویەتی با ناوی (رەشاد) بێت. بەم شێوەیە ناوی لەقورئانی پیرۆز وەرگرتووە.

**١٤- رەشاد موفتی یان محەمەد**

**رەشاد موفتی؟**

لەڕاستیدا لای خەڵکێکی زۆر جۆرە ئاڵۆزیەک لەنێوان ئەم دوو ناوەدا دروست بووە. رەشاد موفتی یان محەمەد رەشاد موفتی. خۆی ناوی رەشادە باوکی ناوی محەمەدە نازناوەکەی موفتییە، بەڵام کاتێ بۆ یەکەم جار بەقازی دامەزرا ناوی خۆی بەمحەمەد رەشاد موفتی نووسی. رەشاد موفتی لەساڵی ١٩١٥ لەقەڵاتی هەولێر لەدایک بووە و لەباوەشی باوکی پەروەردە بووەو پێگەیشتووە، ئەوسا باوکی تا کۆچی دوایی کردووە، موفتی هەولێر بووە. سەرەتا چۆتە قوتابخانەی سەرەتایی لەهەولێر. بەڵام باوکی حەزی کردووە خوێندنی ئایینی بخوێنێت، بۆیە لەقوتابخانە دەری هێناوە تاوەکو تەواوی زانستە ئیسلامییە جیا جیاکان بخوێنێت. ئەوە بوو (تەفسیرو حەدیث و فیقهو ڕێساکانیان و زانستەکانی شەرعی و میرات و زانستی مەنتیق و فەلەک و ئوسترلاب و روبعی موجیب و روبعی موقەنتەر وفێربوو لای باوکیشی هەردوو زمانی تورکی و فارسی خوێندووە. باوکی لەساڵی ١٩٣٤ ناردوویەتی بۆ میسر، تاوەکو لەئەزهەری شەریف لەقاهیرە بخوێنێت. لەوێش زانستەکانی ئایینی خوێندووەو پاش تەواوکردنی ساڵەکانی خوێندن بەڵگەنامەی زانستی پێبەخشراوە. قازی رەشاد موفتی یەکەم قوتابی کورد بووە لەکوردستانی عێراق لەجامیعەی ئەزهەر بخوێنێت و تەواویکات و بەڵگەنامەی وەرگرتووە.

پاش تەواوکردنی خوێندنی لەئەزهەری شەریف گەڕاوەتەوە شاری هەولێرو لەسەر دەستی باوکی درێژەی بەخوێندن داوەو لەلایەکی دیکە لەقوتابخانەی مزگەوت لەقەڵاتی هەولێر وانەی بەژمارەیەک (فەقێ) گوتۆتەوە، لەپاش مردنی باوکی لە ٢٧/١٠/١٩٤٦ لەشوێن باوکی وتاری هەینی دەخوێندەوە. شایانی باسە یەکەم وتارخوێنی هەینیشە، کە وتاری هەینی بەزمانی دایک (کوردی) بنووسێت و بخوێنێتەوە.

لەساڵی ١٩٥٦ لەشاری کەرکوک بەقازی دامەزرا، پاشان لەساڵی ١٩٥٧ گوێزرایەوە بۆ سلێمانی. دواتر گوێزرایەوە بۆ شاری هەولێر تا ساڵی ١٩٧٨ واتە تا خانەنشین بوونی کاری قازی شەرعی بووە. زێتر لەچارەگە سەدەیەک قازی بووە لەهەولێر. لەو میانەدا زۆر وردبین بووە، لەحوکمدان و فتوا دەرکردندا.

لەبەرەبەیانی رۆژی شەممە ١٤ی مانگی رەبیعی یەکەم ساڵی (١٤١٣ک) بەرامبەر ١٢ی مانگی ئەیلول ساڵی ١٩٩٢ پاش ئەوەی نوێژی بەیانی کرد گەڕایەوە سەر جێگایەکەی و گیانی پاکی سپارد. بۆ دواجار چاوی لێک ناو لەهەموو لایەکەوە خەڵک رژانە ماڵیان و دەرگای دوکانەکان داخران و لەتەکیەکەیان دەست کرا بەدەف لێدان. بەسەدان ئۆتۆمبێل و بەهەزاران خەڵک لەگەورە بەرپرسان و پیاو ماقووڵان و دەروێشان و موریدەکانیان و خەڵکی ئەو شارە خۆشەویستەی ئەو بنەماڵەیە بەرێو رەسمێکی رێک و پێک و شایستە لەشەقامە سەرەکییەکانی ئەو شارە دڵگیرە لە بەرێکردنی بەرەو گۆڕستانی (باداوە)-بەشدارییان کرد،ئەو گۆڕستانەی کە خانەوادەکەی لەوێ نێژراون-.

دوا بەدوای ئەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان گەورەترین مزگەوتی لەشاری هەولێر و تەنانەت لە کوردستانیش بەناوی ئەو زاتە بەرێزە ناو نا مزگەوتی (موفتی). هەروەها شیاوی گوتنە کە کوڕە بەرێزەکەی عوسمان رەشاد موفتی لەشیوەنی باوکیدا تێکستێکی دوورو درێژی هۆنیوەتەوە، لەوەش چەند دێرێک لەگۆڕەکەی هەڵکەنراوە.

**ستون عاما والمحافل تزدهي**
**بخطيبها وخلاصة الاباء**
**فاهنا رعاك الله في دار البقا**
**فلقد لحقت بارحم الرحماء**
**سيف الخطابة في شمالك لاتق**
**متوارث من امسنا الوضاء**
**هي راية الدين الحنيف يصونها**
**خفاقة تعلو على الجوزاء**
**(عثمان) ارخ ان اتيت مقامه**
**بمقالة تموعن الانشاء**
**ليكمل التاريخ فيه (محبكم)**
**قد طاب مثوى زينة العلماء**
**فرحم الله المفتي..**
**يوم ولد..**
**ويوم مات**
**ويوم يبعث حيا..**[19]

**١٥- شێخ محەممەد ئەسعەد**

- قازی شەرعی هەولێر بووە.
- لەساڵی ١٩٣٨ دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٤٧ لەپلەی قازی

دوو بەرزکراوەتەوە بۆ پلەی قازی یەک لەسنفی دووەم لەسنفەکانی دادوەری.
- لە ١٩٥١/٧/٨ کاتێ لەقازی دادگای شەرعی هەولێر بووە، کۆچی دوایی کردووە.

**١٦- قازی شەرعی یوسف ئەمجەد زههاوی**
- لەساڵی ١٩٥٣ قازی بووە لەدادگای شەرعی هەولێر.
- لەساڵی ١٩٨٢ قازی هەولێر بووە.

**١٨- لێکۆڵەرەوەی داد حوسێن عومەر حاجی**
- لەساڵی ١٩٥٤ لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٧٣-١٩٧٤ بەڵگەنامەی بەکالۆریۆسی بەشی یاسای وەدەست هێناوە.
- لەساڵی ١٩٧٦ لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٧٧ لێکۆڵینەوەی داد بووە لەدادگای هەولێر.
- ساڵی ١٩٧٧ خوولی چواری لێکۆڵینەوەی دادی، تەواو کردووە.

**١٩- قازی تەحسین عومەر ئەرسەلان**
- لەساڵی ١٩٧٤ قازی لێکۆڵینەوەی هەولێر بووە، قازی یەکەم جار لەدادگای بەرایی هەولێر کاری دادوەری کردووە.
- هەر لەهەمان ساڵ ١٩٧٤ لەدادگای کەسێتی غەیرە موسڵمان کاری کردووە.

تێبینی: ئەو دادگایە تایبەتە بە یەکلایی کردنەوەی کێشەی فرە ئایینەکان کە موسڵمان نین.

هەروەها داواکانی لەنێوان دادوەرانی دادگای بەرایی هەولێر دابەش کردووە.
- لەساڵی ١٩٨٥ لەسەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ئەوکات دەست بەکاربووە.

**٢٠- قازی سەلاح ئەحمەد یەعقوبی**
- لەساڵی ١٩٧٩ کاری دادگای سولح لەهەولێر راپەڕاندووە.
- لەساڵی ١٩٧٩ لەدادگای بەرایی هەولێر قازی بووە. هەر لەهەمان ساڵ دەسەڵاتی دادنووسی لەکاتی ڤالایی دادنووسی یەکەم پێبەخشراوە.
- لەساڵی ١٩٨٠ کاری دادوەری لەدادگای بەرایی هەولێر کردووە.
- لەساڵی ١٩٨٢ کاری قازی دووەمی لەدادگای باری کەسێتی لەهەولێر ئەنجامداوە. سەرباری وەزیفەکەی خۆی قازی بووە لەدادگای بەرایی هەولێر.

**٢١- دادوەر جەلال زیوەر ئال سەید ئەحمەد**
- لەساڵی ١٩٧٨ لەدادگای بەرایی هەولێر دادوەر بووە.
- لەساڵی ١٩٧٩ لەدادگای بەرایی هەولێر قازی یەکەم بووە.
- لەساڵی ١٩٨٠ هەڵسوڕاندنی کاروباری دادگای کەتن لەهەولێر راپەڕاندووە.

**٢٢- قازی محەمەد سەلیم یونس**
- لەساڵی ١٩٧٩ لەدادگای نەوجەوانان لەهەولێر قازی بووە.
- لەساڵی ١٩٧٩ بۆ دادگای لێکۆڵینەوەی کازمیە- لەبەغدا گوازراوەتەوە.

**٢٣- دادوەر موحسین ئەبوبەکر ئەحمەد**
- لەساڵی ١٩٥٢ لەهەولێر لەدایکبووە.
- لەساڵی ١٩٧٦ بەکالۆریۆسی یاسای لەکۆلێژی یاساو رامیاری زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٧٧-١٩٨٠ بوتە لێکۆڵەرەوەی دادی.
- لەساڵی ١٩٨٢ پەیمانگەی دادوەربی- بەغدای تەواو کردووە.
- بەدادوەر لەدادگای حەمدانیە دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٨٢بۆ دادگای شەقلاو گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٨٦ بۆ دادگای زاخۆ گوێزرایەوە.
- لەساڵی ١٩٩٠ بۆ دادگای بەرایی هەولێر گوێزرایەوە.
- لەساڵی ١٩٩٤ کرا بەسەرپەرشتیاری دادی.
- لەساڵی ١٩٩٥ کرا بە بەڕێوەبەری دادی گشتی.
- لەساڵی ١٩٩٦ جارێکی دیکە کرایەوە بەسەرپەرشتیاری دادی.
- دواتر کرا بەدەستەی دارشتنی یاسایی.

- لەساڵی ١٩٩٧ کرایەوە بەدادوەری یەکەمی دادگای بەرایی.
- لەساڵی ٢٠٠٠ بوو بەئەندامی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر تائێستا ئەندامی دەستەی دارشتنی یاساییە.
- لەساڵی ١٩٩٠-١٩٩٤ لەکۆلێژی یاسا- زانکۆی سەلاحەدین وانەبێژ بووە .
- لەکۆلێژی مافی ئێواران وانەبێژ بووە.
- دادوەرێکی شارەزایە لەهەرو لایەنی (جەزایی و مەدەنی). یەکێکە لەو دادوەرانەی وەک (مەرجەع) دادوەرانی تری تازە دامەزراو، سوودی لێ وەردەگرن.

**٢٤- دادوەر مستەفا عەباس گەلالی**

-لەساڵی ١٩٥٢ لەگەرەکی گلکەند (سەعدوناوە)ی هەولێر لەدایک بووە.
-لەساڵی ١٩٧٣ بۆتە فەرمانبەر لەشارەوانی هەولێر.
-لەساڵی ١٩٧٥ وەک قوتابی دەرەکی بەشداری کردووە لەتاقیکردنەوەی ئامادەیی و پلەیەکی باشی وەدەست هێناوە.
-لەساڵی ١٩٧٦ لەکۆلێژی یاساو رامیاری بەشی یاسا زانکۆی بەغدا وەرگیراوە.. لەهەمان کاتدا فەرمانبەر بووە لەدەزگای گشتی پردو رێگەوبان لەبەغدا.
- لەساڵی ١٩٨٠ بەکالۆریۆسی یاسای وەرگرتووە.
- لەساڵی ١٩٩٣ بۆتە دادوەر لەدادگای زاخۆ.
- دواتر بۆ دادگای سەرسەنگ گوێزراوەتەوە.
- پاشان بۆ دادگای خەبات گوێزراوەتەوە.
- ئینجا بۆ دادگای لێکۆلینەوەی هەولێر.
- پاشان دادگای کەتنی هەولێر.
- بۆ دادگای بنەسلاوە گوێزراوەتەوە.
- ئێستا لەدادگای لێکۆلینەوەی هەولێرە.

**٢٥- دادوەر فوئاد سابیر**

-لەساڵی ١٩٦٦ خوێندنی پەیمانگەی تەندروستی بالای لەبەغدا تەواو کردووە.
- لەبەغدا لەوەزارەتی تەندروستی دامەزراوە.. لەهەمان کاتدا لەکۆلێژی یاسا- زانکۆی موستەنسریە خوێندوویەتی.
- لەساڵی ١٩٧١ بەلگەنامەی بەکالۆریۆسی لەبەشی یاسا وەدەست هێناوە.
- لەپەیمانگەی بەریتانی لەبەغدا زمانی ئینگلیزی خوێندووە.
- لەساڵی ١٩٧٥ بەیاریدەدەری دادوەر لەدادگای بەرایی هەولێر دامەزرا.
- لەساڵی ١٩٨٠ خوێندنی پەیمانگەی دادوەریی بەغدای تەواوکرد.
- لەهەولێر بەجێگری دادوەری گشتی دامەزرا.
- دواتر بوو بەداواکاری گشتی بەوەکالەت.
- ماوەیەک کرا بەسەرۆکی داواکاری گشتی لەوەزارەتی دادی هەرێمی کوردستان.
- لەلایەن وەزیری دادی هەرێمی کوردستان ئینتیداب کرا بە دادوەری لێکۆلینەوەی کۆیە.
- لەساڵی ١٩٩٧ لەهەولێر کرا بەدادوەر.
- ئەندامی دادگای تاوانە لەهەولێر.

**٢٦- دادوەر نەوزاد کەریم حەکیم بلباس**

- لەساڵی ١٩٦٥ لەهەولێر لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ بەکالۆریۆسی یاسایی لەکۆلێژی یاساو رامیاری لەزانکۆی بەغدا وەدەست هێناوە.
- لەساڵی ١٩٨٣ بۆتە لێکۆلەرەوەی دادی لەهەر دوو دادگای مەخموور و هەولێر.
- لەساڵی ١٩٩١-١٩٩٢ لەپەیمانگەی دادوەری وەرگیراوە.
- لەساڵی ١٩٩٣ بووە بەدادوەر لەدادگاکانی دوکان و سلێمانی- بەرایی هەولێر- لێکۆلینەوەی هەولێر/ کەتن- دادگای خەبات- دادگای شەقلاوە- ئەندامی دادگای تاوانی هەولێرە.

**٢٧- دادوەر عەبدولباسیت فەرهادی**

- ناوی تەواوی عەبدولباسیت عەبدوللا فەرهادییە.

- لەساڵی ١٩٥٨ لەشاری هەولێر لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٨٠-١٩٨١ کۆلێژی یاساو رامیاری- بەشی (یاسا)ی زانکۆی بەغدای تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٧٨ ئەندامی یەکێتی خۆشنووسانی عێراق بووە.
-لەساڵی ١٩٨٣ بۆ یەکەم جار لەتاپۆی هەولێر دامەزراوە.
- دوای شەش مانگ هەر لەهەمان ساڵ ١٩٨٣ بۆ دادگای هەولێر گوزراوەتەوە.
- هەر لەساڵی ١٩٨٣ داخیلی خولی لێکۆڵینەوەی دادی نۆیەم بوو لەپەیمانگەی قەزایی لەشاری بەغدا.
- لەساڵی ١٩٩٤- کرا بەجێگری داواکاری گشتی.
- لەساڵی ١٩٩٥- بوو بەحاکمی لێکۆڵینەوەی هەولێر.
- لەدوای ساڵی ٢٠٠٠ بۆ دادگای کەتن گوێزرایەوە.
- دواتر هەر لەدوای ساڵی ٢٠٠٠دا بۆ دادگای بەرایی.
- لەساڵی ٢٠٠٤ کرا بە بەڕێوەبەری دادی گشتی.
- لەساڵی ٢٠٠٤ بوو بەئەندامی ئەنجوومەنی دادوەری هەرێمی کوردستان.
- ئەندامی دەستەی دارشتنی یاسای هەرێمی کوردستانە.
- لەساڵی ٢٠٠٥ وانەبێژ بووە لەهەردوو کۆلێژی یاساو ماف لەزانکۆی سەلاحەدین.
- دەربارەی ئەدەبیات دەستێکی باڵای هەیە.

**٢٨- دادوەر حەسەن رەمەزان حەسەن**

- لەساڵی ١٩٧٩-١٩٨٠ بەکالۆریۆس لەبەشی یاسا لەکۆلێژی یاساو رامیاری- زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
- لەساڵی ١٩٨١ بەیاریدەدەری دادوەر لەدادگای تاوانی هەولێر دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٨٣ بۆتە لێکۆڵەرەوەی دادی.
- لەساڵی ١٩٩٠-١٩٩١- خوێندنی لەپەیمانگەی قەزایی تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٩٣ بەدادوەر لەدادگای شەقڵاوە دامەزراوە. پاشان لەدادگاکانی سۆران و هەولێر کاری کردووە. دواتر بۆتە جێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر.
- هەروەها دادوەری لێکۆڵینەوەی دادگای بەڵگەنامەکان.

**٢٩- دادوەر نەشئەت ئەحمەد رەشید قەساب**

- لەساڵی ١٩٥٦ لەهەولێر لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٧٧-١٩٧٨ بەشی یاسایی لەکۆلێژی یاساو رامیاری- زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- لەدوای دەرچوون کاری پارێزەرایەتی کردووە.

أ- لەساڵی ١٩٩٩ کرا بەدادوەر لەدادگای سۆران.
ب- دواتر بۆ دادگای باری کەسی گوازرایەوە.
ج- پاشان بۆ دادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر.
ر- بۆ دادگای بەرایی هەولێر.
هـ- ئێستا سەرۆکی دادگای تاوانی هەولێرە.

**٣٠- دادوەر نازم محەمەد ئەمین جەمیل حەویزی**

- لەساڵی ١٩٣٦ لەکۆیە لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٦٢ کۆلێژی یاسای تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٧١ بۆ یەکەم جار لەدادگای بەرایی سنجار بەدادوەر دامەزرا.
- لەدوایدا بۆ چەند دادگایەک، وەک پێنجوین و شارباژێرو ماوەت و دوکان گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٧٢ بۆ دادگای بەرایی سلێمانی گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٨٧ کراوە بەجێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی ئۆتۆنۆمی لەسلێمانی.
- لەساڵی ١٩٨٧-١٩٨٩ کرا بەسەرۆکی دادگای تاوانی سلێمانی.
- لەساڵی ١٩٨٩-١٩٩١ کرا بەسەرۆکی دادگای تاوانی دهۆک.
- لەساڵی ١٩٩٣ کرا بەسەرۆکی دادگای تاوان لەهەولێر.
- لەساڵی ١٩٩٣-١٩٩٥ کرا بەسەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی

هەولێر.
- لەساڵی ٢٠٠١ خانەنشین کرا.

**٣١- دادوەر ئەمیر عەبدولکەریم واحید حەویزی**

- لەساڵی ١٩٣٦ لەکۆیە لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٥٧-١٩٥٨ بەکالۆریۆسی لەماف وەدەست هێناوە.
- لەساڵی ١٩٧٤ بەدادوەر لەدادگای بەرایی پشدەر دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٧٩ بۆ دادگای بەرایی هەولێر گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٨٧ لەئەنجامی هەڵوێستی کوردانەی دژی دەزگاکانی سیخوڕی بەعسی هەڵوەشاوە، بۆ دادگای بەرایی بەسرە گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٩٠ بۆ دادگای بەرایی هەولێر گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٩٣ کرا بەجێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر.
- لەساڵی ١٩٩٥-١٩٩٩ بەدادوەری دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان دامەزرا.
- لەساڵی ١٩٩٩ خانەنشین کرا.
- سەرپەرشتی یەکەم هەڵبژاردنی سەرتاسەری پەرلەمانی کوردستان بووە.
- بۆ دادوەران و پارێزەران وەک (مەرجەع) دادەنرێت.

**٣٢- دادوەر هوشیار محەمەد تاهیر ئەتروشی**

- لەساڵی ١٩٤٧ لەهەولێر لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٦٧-١٩٦٨ دەرچووی کۆلێژی ماف لەزانکۆی بەغدا.
- لەساڵی ٢٠٠٢ بەدادوەری دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان دامەزراوە.

**٣٣- دادوەر ئەحمەد عەبدوڵڵا زوبێر**

- لەساڵی ١٩٤٨ لەشەقڵاوە لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٧٠-١٩٧١ بڕوانامەی بەکالۆریۆس لەیاسا وەدەست هێناوە.
- لەساڵی ١٩٨١-١٩٨٢ دەرچووی پەیمانگەی قەزائیە لەبەغدا.
- لەساڵی ١٩٨٢ بەجێگری داواکاری گشتی لەهەولێر دامەزرا.
- لەساڵی دامەزرا بەدادوەر لەدادگای بەرایی کۆیە١٩٩٣.
- لەساڵی ١٩٩٧ کرا بەدادوەری دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر.
- لەساڵی ١٩٩٨ پۆستی جێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوە ناوچەی هەولێری پێدراوە.
- لەساڵی ١٩٩٩ بووە بەسەرۆکی دادگای تاوانی هەولێر.
- لەساڵی ٢٠٠٠ بەئەندامی دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان دامەزرا.
- لەساڵی ٢٠٠٢ کرا بەجێگری سەرۆکی دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان.

**٣٤- دادوەر بایز عەبدوڵڵا ئیبراهیم**

- لەساڵی ١٩٢١ لەدایک بووە.
- بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەماف وەدەست هێناوە.
- لەساڵی ١٩٥٥ بەدادوەر دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٧٥ بۆ دادگای بەرایی دیوانیە گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٧٩ بۆ دادگای بەرایی هەولێر گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٨٢ کرا بەجێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر.
- لەساڵی ١٩٨٤ خانەنشین کرا.
- لەساڵی ١٩٩٣ بەپێی فەرمانی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەئەندامی دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان دامەزرا.
- لەساڵی ٢٠٠١ کۆچی دوایی کرد.

**٣٥- دادوەر یەعقوب داود سەلیم یەعقوبی**

- لەساڵی ١٩٥٠ دەرچووی کۆلێژی یاسایەو بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەبەشی یاسا وەدەست هێناوە.
- لەزۆر دادگاکانی کەرکوک- هەولێر- ڕەواندوز کاری کردووە.
- ماوەیەکی زۆر سەرۆکی دادگای نەوجەوانان بووە لەکەرکوک.
- دواتر بۆ هەولێر کراوە بەئەندامی دادگای تاوانی هەولێر گوێزراوەتەوە.

- لەساڵی ١٩٨٢ لەسەر داواکاری خۆی خانەنشین کراوە.
- ؟ کۆچی دوایی کردووە.

**٣٦- دادوەر عەبدولقادر نورەدین رەشید**

- لەساڵی ١٩٢٣ لەهەولێر لەدایکبووە.
- بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لەیاسا وەدەست هێناوە.
- لەساڵی ١٩٥٦ بەدادوەر دامەزراوە.
- لەڕێکەوتی ١٩٦٤/٧/١٨ بۆ دادگاکانی شاری هەولێر گوازراوەتەوە.
- لەڕێکەوتی ١٩٧٤/٤/٢٠ کراوە بەدادوەری یەکەم لەدادگای بەرایی هەولێر.
- لەڕێکەوتی ١٩٧٧/١/٢٩ کراوە بەسەرۆکی دادگای (کبری) لەهەولێر.
- لەڕێکەوتی ١٩٧٧/٧/٣٠ کراوە بەجێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەناوچەی (ئۆتۆنۆمی) لەهەولێر.
- لەڕێکەوتی ١٩٧٨/٩/٢٥ بەئەندامی هەمیشەیی لەدادگای تەمیزی عێراق دامەزراوە.

**٣٧- دادوەر بەکر ئیسماعیل محەمەد**

- لەساڵی ١٩٢٤ لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٤٧-١٩٤٨ دەرچووی کۆلێژی مافی عێراق بەشی یاسایی.
- لەساڵی ١٩٧٠ لەدادگای بەرایی سلێمانی بۆ دادگای بەرایی سەماوە گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٧٠ بۆ دادگای بەرایی حیللە گوێزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٧٢ کرا بەجێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی بابل.
- لەڕێکەوتی ١٩٧٧/٨/١٥ بۆ جێگری سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوە ناوچەی ئۆتۆنۆمی پێشوو گوازراوەتەوە.
- ڕێکەوتی ١٩٧٨/٩/٢٦ بەدادوەری هەمیشەیی لەدادگای تەمیزی عێراق دامەزراوە.
- ڕێکەوتی ١٩٧٨/٩/٣٠ ئینتیداب کراوە بۆ سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوە ناوچەی ئۆتۆنۆمی.
- ڕێکەوتی ١٩٨٤/٢/١٦ بۆ سەرکاری پێشوو لەدادی تەمیزی عێراق گەڕاوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٨٧ خانەنشین کرا.

**٣٨- دادوەر تەحسین یاسین تەقیەدین ئەلئەسعەدی**

- بڕوانامەی لیسانس لەیاسا بۆ ساڵی ١٩٤٩-١٩٥٠.
- لەدایکبووی ١٩٢٧- هەولێر.
- شوێنی کارکردنی/ ئەندامی دادگای تاوانی هەولێر.
- لەساڵی ١٩٥٨ بەدادوەر لەدادگاکانی کەرکوک و کفری و مەندەلی و خانەقین و هەولێرو ڕواندوز کاری کردووە لەدواییدا کراوە بەئەندامی دادگای تاوانی هەولێر.
- لەساڵی ١٩٩٠ خانەنشین کراوە.
- لەساڵی ٢٠٠٤ کۆچی دوایی کردووە.

**٣٩- دادوەر سوبحی عەلی هرزانی**

- ناونیشان و شوێنی کارکردن/ جێگری سەرۆکی تێهەڵچوونەوەی هەولێر.
- ڕێکەوتی یەکەم دامەزراندن بەفەرمانبەر ١٩٧٧/٨/١٦.
- ڕێکەوتی یەکەم دامەزراندن بەدادوەر ١٩٨٥/٨/٢٠.
- ڕێکەوتی دەرچوونی لەپەیمانگەی دادوەری ١٩٨٣-١٩٨٤.

لەدایکبووی ١٩٥٢/٧/١.
بڕوانامەو ساڵی دەرچوونی/ بەکالۆریۆس لەیاسا بۆ ساڵی ١٩٧٤-١٩٧٥.

- بەناونیشانی لێکۆڵەرەوەی دادی لەدادگای بەرایی چەمچەماڵ دامەزرا.
- لەپەیمانگەی دادوەریی لەبەغداد لەساڵی خوێندنی ١٩٨٣-١٩٨٤ وەرگیراوە.
- لەساڵی ١٩٨٣ بەسیفەتی دادوەری دادگای تێهەڵچوونەوەی هەولێر دەستی بەکارکرد.
- لەساڵی ٢٠٠٠ بەسەرۆکی یەدەگ لەدادگای تێهەڵچوونەوەی هەولێر بەسیفەتی پێداچوونەوە تێهەڵچوونەوە بەپێی بەیانی وەزارەتی داد دەستنیشان کرا.
- لەساڵی ٢٠٠١ بەسەرۆکی یەدەگ لەسەرۆکایەتی دادگای

تاوانی هەولێر بەپێی وەزارەتی داد دانرا.
لەساڵی ٢٠٠١ دەست لەکار هەڵگرتن بەسیفەتی سەرۆکی دادگای تاوانی-هەولێر لەهەمان کاتدا دەستی بەکارکرد لەم سەرۆکایەتی بەسیفەتی سەرۆکی یەدەگ.
- لەساڵی ٢٠٠٢ بەسەرۆکی لیژنەی تێهەڵچوونەوە تایبەت بەکێشەی نارەزایی باج دەرانی باجی دەرامەتی هەولێر دانرا.
- لەلیژنەی نەهێشتنی رۆتین لەفەرمانگەکان و اختزال کردنی ئیجرائات و چۆنیەتی دەسەڵات پێدان بەئەندام دانرا.
- لەساڵی ٢٠٠٤ بەبریکاری وەزارەت و بەڕێوەبەرە گشتییەکان و سەرۆکی فەرمانگەکان دەست بەکار بوو.

**٤٠- دادوەر عوسمان یاسین عەلی**
- لەدایکبووی ١٩٧١/ هەولێر.
- بڕوانامەی/ دەرچووی کۆلێجی یاسای ساڵی ١٩٩٢-١٩٩٣ زانکۆی سەلاحەدین.
- شوێنی کارکردن/ دادگای بەرایی شەقلاوە/ قوتابی خوێندنی باڵا.
- لەڕێکەوتی ١٩٩٣/١١/٢٠ بەلێکۆڵەرەوەی دادی لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر دامەزراوە.
- بەپێی فەرمانی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران ژمارە (٦٦٦) لە ٢٠٠٠/٧/٢٥ کراوە بە بەڕێوەبەری تۆمارگای خانووبەرە لەهەولێر.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١/٢٤ بەدادوەر لەدادگای بەرایی شەقلاوە دامەزراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/٨/١٠ کراوە بەسەرۆکی لیژنەی چارەسەرکردنی کێشەکانی موڵکداریەتی خانووبەرە لەپارێزگای هەولێر.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١٢/٦ ماستەر لەکۆلێجی یاسای زانکۆی سەلاحەددین وەردەگرێ و ئێستا خوێندکاری دکتۆرایە.

**٤١- دادوەر دەهام ئەکرەم عومەر**
- لەدایکبووی ١٩٧٣/٧/١- هەولێر.
- بڕوانامەی/ ماستەر لەیاسا ساڵی ٢٠٠٢ لەزانکۆی سەلاحەدین/ کۆلێژی یاسا.
- شوێنی کارکردن/ دادگای بەرایی خەبات.
- لەڕێکەوتی ١٩٩٧/٤/٢٨ بەلێکۆڵەرەوەی دادی لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر دامەزراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٢/١٢/١١ بڕوانامەی ماستەری لەبواری یاسا بەدەست هێناوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/٤/١٨ بەدادوەر لەدادگای بەرایی ئاکرێ دامەزراوە.
- لەدادگای بەرایی خەبات دادوەرە.

**٤٢- دادوەر دارا محەمەد ئیبراهیم**
- لەدایکبووی ١٩٧١- هەولێر.
- بڕوانامەی: دەرچووی کۆلێجی یاسای ساڵی ١٩٩٢-١٩٩٣.
- شوێنی کارکردن: دادگای بەرایی هەریر.
- ماوەیەک لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر لێکۆڵەرەوەی دادی بوو، کە لەڕێکەوتی ١٩٩٣/١١/١٥ بەلێکۆڵەرەوەی دادی لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر دامەزراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١/٢٤ بەدادوەر لەدادگای بەرایی زاخۆ دامەزراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١٢/١٨ بۆ دادگای بەرایی هەریر گوازراوەتەوە.
- لەبواری لێکۆڵینەوە شارەزاییەکی باشی هەیە.

**٤٣- دادوەر عەبدولڕەحمان حەمەکەریم عەلی سیوەیلی**
- لەدایکبووی ١٩٥٨/٧/١- رواندوز.
- بڕوانامەی/ دەرچووی کۆلێجی یاسا بۆ ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٤.
- شوێنی کارکردن/ دادگای بەرایی شەقلاوە.
- ماوەیەک پارێزەر بوو لەهەولێر.
- بەپێی فەرمانی وەزاری ژمارە (٨٢٢/٣/٢) لە

٢٠٠٣/١٢/٩ لەدادگای بەرایی چۆمان دامەزراوە و لەڕێکەوتی ٢٠٠٣/١٢/١٣ دەستی بەکار کردووە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١٢/٣٠ بۆ دادگای بەرایی شەقڵاوە گوازراوەتەوە.
- لەبواری هونەری شێوەکاری دەستی هەیە و لەچەندان پێشانگا بەشداری کردووە.
- سەرۆکی لقی هەولێری یەکێتی مافپەروەرانی کوردستانە.

**٤٤- دادوەر فازڵ عەباس رەسوڵ**
- مێژووی لەدایکبوونی ١٩٦٩/٧/١- هەولێر.
- بڕوانامەی: دەرچووی کۆلێجی یاسا ساڵی ١٩٩١-١٩٩٢.
- شوێنی کارکردن: دادگای بەرایی سۆران.
- ماوەیەک لێکۆڵەرەوەی دادی بووە لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر.
-١٤/١١/١٩٩٣بەلێکۆڵەرەوەی دادی لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر دامەزراوە.
١١/٤/٢٠٠٠ کراوە بە بەڕێوەبەری جێبەجێ کردنی هەولێر.
- ٢٠٠٣/١٢/١٨ بەدادوەر لەدادگای بەرایی سۆران دامەزراوە.
- لەیەکێتی ماف پەروەرانی کوردستانیش ڕۆڵی هەبووە.

**٤٥- دادوەر کەمال تاهیر محەمەد**
- لەساڵی ١٩٥١ لەسلێمانی لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٧٧-١٩٧٨ بەکالۆریۆسی لەبەشی یاسا وەدەست هێناوە.
- لەساڵی ٢٠٠٢ بەدادوەری دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان دامەزراوە.

**٤٦- دادوەر ئەکرەم ئەحمەد ئەمین بابان**
- لەساڵی ١٩٣٩ لەسلێمانی لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ کۆلێژی یاساو رامیاری تەواو کردووە.
- لەساڵی ٢٠٠٢ بەدادوەری دادگای تەمیزی هەرێمی کوردستان دامەزراوە.

**٤٧- دادوەر سەلیم محەمەد نەجیب**
- لەساڵی ١٩٤٥ لەکەرکووک لەدایک بووە.
- دەرچووی کۆلێژی یاسایە.
- لەساڵی ١٩٧٣ بەدادوەر دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٧٣ لەدادگای بەرایی شارباژێر دەست بەکاربووە.
- لەساڵی ١٩٧٧ گوازراوەتەوە بۆ دادگای بەرایی هەولێرو لەچەند دادگایەکی پارێزگای هەولێر کاری کردووە.
- لەساڵی ١٩٨٩ بەپێی فەرمانی ئەنجوومەنی قەزا- لەبەغدا، خانەنشین کراوە.
- بەپێی فەرمانی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان لەساڵی ١٩٩٦ بەدادوەر دامەزراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٩٦ ئینتیداب کراوە بەسەرۆکی داواکاری گشتی.
- لەساڵی ١٩٧٧ بۆ سەرۆکی دەستەی سەرپەرشتیاری دادی ئینتیداب کراوە.

**٤٨- دادوەر نوشاد محەمەد سەلیم**
- ناونیشانی شوێنی کارکردن: ئەندامی دادگای تێهەڵچوونەوەو سەرۆکی دادگای گومرگ.
- ڕێکەوتی دامەزراندنی بەفەرمانبەر ١٩٦٠/١/١٧.
- ڕێکەوتی دامەزراندنی بەدادوەر ١٩٧٨/٧/١٩.
- ڕێکەوتی دەرچوونی لەپەیمانگای دادوەری ١٩٧٦-١٩٧٧.
- بڕوانامەی بەکالۆریۆس یاسا ١٩٧٠-١٩٧١ وەدەستهێنا.
- لەدایکبوونی ١٩٤٢/٧/١- بەغدا.
- گواسترایەوە سەر میلاکی وەزارەتی دارایی بە ناونیشانی نووسەری باجی خانووبەرە لەکازمیە بۆ سەر میلاکی وەزارەتی داد بەناونیشانی یاریدەدەری تێ بینەر لەدادگای بەرایی هندیە لە ١٩٧٠/١/٤.
- ناونیشانی لەیاریدەدەری تێ بینەر بۆ (کاتب الاول) لەدادگای بەرایی هندیە بەپێی فەرمانی وەزارەتی داد ژمارە ٢٧٢٨ لە ١٩٧١/١٠/٢٨ (لە بەدەست هێنانی بڕوانامەی بەکالۆریۆس

لەیاسا) گۆڕا.
- دەسەڵاتی لێکۆڵەرەوەی دادی لەدادگای بەرایی هندیە بەپێی فەرمانی وەزارەتی داد ژمارە ١٧٣ لە ١٩٧٢/١/١٥ پێدرا.
- بەناونیشانی دادوەر لەدادگای بەرایی ڕەواندز بەپێی فەرمانی وەزارەتی داد ژمارە ٢٠٦٠/ ١٧٦٠٤ لە ١٩٧٨/٧/٨ دامەزرا.
- لەخوێندنی یاسایی باڵا لەپەیمانگەی دادوەریی بەشی مەدەنی بۆ ساڵی خوێندنی ١٩٨٧-١٩٨٨ بەپێی نووسراوی وەزارەتی داد/ پەیمانگای دادوەری ژمارە ١٠٦٢ لە ١٩٨٧/٨/٢٧ قبوڵ کرا.
- بەسەرۆکی دادگای گومرگی هەرێمی کوردستان دانرا سەرباری کارەکەی خۆی بەپێی فەرمانی وەزارەتی داد ژمارە ٢٢٢/٣/٢ لە ١٩٨٣/٨/٣.
- بەئەندامی ڕەسەن لەدادگای تێهەڵچوونەوەی هەولێر بەشێوەی تێهەڵچوونەوە ناونرا سەرباری کارەکەی خۆی.

**٤٩- دادوەر فەوزی ڕەئوف حەسەن نەقشبەندی**
- لەدایکبووی ١٩٦٤/٢/٦- کەرکوک.
- بڕوانامەی دەرچووی کۆلێجی یاسای زانکۆی بەغدا ١٩٨٧-١٩٨٨.
- شوێنی کارکردنی دادگای بەرایی دەشتی هەولێر.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/٨/٤ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١٠/١٩ لەدادگای کەتن لەهەولێر دانراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١٢/٥ بۆ دادگای بەرایی دەشتی هەولێر ئنتیداب کراوە.

**٥٠- دادوەر فەرهاد کاکەڕەش حسێن**
- لەدایکبووی ١٩٦٦/١/١٠- کەرکووک
بڕوانامەی/ دەرچووی کۆلێجی یاسا زانکۆی موسڵ ساڵی ١٩٩٠.
- شوێنی کارکردن/ دادگای بەرایی دەشتی هەولێر.
- ماوەیەک لەکەرکوک پارێزەر بووە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/٨/٤ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوە ناوچەی هەولێر دامەزراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١٢/٥ لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر دانراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٥/٤/١٨ ئینتیداب کراوە بۆ دادگای بەرایی هەولێر.

**٥١- دادوەر مستەفا ئەحمەد کەریم بەرزنجی**
- لەدایکبووی ١٩٥٨/١١/١- کەرکوک
- بڕوانامەی/ دەرچووی کۆلێجی یاسا زانکۆی بەغدا بۆ ساڵی ١٩٨٢-١٩٨٣.
- شوێنی کارکردن/ دادگای بەرایی چۆمان.
- ماوەیەک لەکەرکوک پارێزەر بووە.
- لە ٢٠٠٤/٢/٢٨ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای ئیستئنافی ناوچەی هەولێر دامەزراوە و لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/٢/٢٩ دەستی بەکار کردووە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/٣/١ لەدادگای کەتن لەهەولێر دانراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/١٢/٥ کراوە بۆ دادگای بەرایی دەشتی هەولێر ئنتیداب.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٥/٤/١٨ بۆ دادگای بەرایی چۆمان ئنتیداب کراوە.

**٥٢- دادوەر تەحسین تەها ڕەسوڵ**
- لەدایکبووی ١٩٥٦/٧/١
- بڕوانامەی/ دەرچووی کۆلێجی یاسای ساڵی ١٩٧٩-١٩٨٠.
- شوێنی کارکردن/ دادگای بەرایی مێرگەسۆر.
- ماوەیەک لەهەولێر پارێزەر بوو.
- لە ٢٠٠٤/٨/٢٤ بەدادوەر لەدادگای بەرایی مێرگەسۆر دامەزراوە.
- لەڕێکەوتی ٢٠٠٤/٩/٢

دەستی بەکار کردووە.

**٥٣- دادوەر خەلیل ئیبراهیم تۆفیق لەدایکبووی ١٠/١٠/١٩٥٩- کەرکوک**

- بروانامەی: دەرچووی کۆلێجی یاسای ساڵی ١٩٨٤-١٩٨٥ زانکۆی بەغدا.
- شوێنی کارکردن: دادگای باری شارستانی لەهەولێر.
- ماوەی(١٥) ساڵ لەکەرکووک پارێزەر بووە.
- لە ٢٨/٢/٢٠٠٤ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوە و لەرێکەوتی ٢٩/٢/٢٠٠٤ دەستی بەکار کردووە.
- لەرێکەوتی ٥/١٢/٢٠٠٤ دانراوە لەدادگای باری شارستانی لەهەولێر.

**٥٤- دادوەر محەمەد مستەفا مەحمود جاف**

- ناونیشان: دادوەر
- لەدایکبووی: ٣/٨/١٩٦١.
- بروانامەی: دەرچووی کۆلێجی یاسای ساڵی ١٩٨٣-١٩٨٤ زانکۆی بەغدا.
شوێنی کارکردن: دادگای بەرایی هەولێر.
- ماوەیەک لەکەرکووک پارێزەر بووە.
- لە ٢٨/٢/٢٠٠٤ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوەو لەرێکەوتی ٢٩/٢/٢٠٠٤ دەستی بەکار کردووە.
- لەرێکەوتی ٥/١٢/٢٠٠٤ لەدادگای بەرایی هەولێر دانراوە.
- دادوەرێکی هێمن و شارەزایە. لەبنەماڵەیەکی کوردپەروەری کەرکوکە.

**٥٥- دادوەر تاهر خەلیل حسەن**

- ناونیشان و شوێنی کارکردن/ سەرۆکی دادگای نەوجەوانانی هەولێر.
- رێکەوتی دامەزراندنی بەفەرمانبەر ١٥/٢/١٩٦٩.
- رێکەوتی دامەزراندنی بەدادوەر ١٣/٨/١٩٨٣.
- بروانامەو ساڵی دەرچوونی: بەکالۆریۆس یاسا لە ١٩٦٥-١٩٦٦.
- رێکەوتی دەرچوونی لەپەیمانگای دادوەریی ٧/٧/١٩٨٣.
- ماوەیەک لەتاپۆ وەک فەرمانبەر کاری کردووە.
- لەدادگای بەرایی حەمدانیە بەپێی فەرمانی وەزارتی داد ژمارە ١١٥٤٢/١٨٧١ لە ٧/٨/١٩٨٣بەدادوەر دامەزراوە.
- دوا بەدوای فەرمانی وەزارەتی داد ژمارە ١٠٤٥٨/١٦٩٨ لە ٩/٧/١٩٨٣ بریاردرا بەدامەزراندنی بەدادوەر لەدادگای بەرایی مەخمور لەجیاتی دادگای بەرایی حەمدانیە بەپێی فەرمانی وەزارەتی داد ژمارە ١٤٧٦٩/٤/٤١٠ لە ١٢/١٠/١٩٨٣.
- بۆ دادگای لێکۆڵینەوەی رزەکاران و لێکۆڵینەوەی نەهێشتنی تاوان لەهەولێر بەپێی فەرمانی کارگێریان ژمارە ٤٣٧/١/٢ لە ٩/٢/١٩٨٧ ئینتیداب کرا.
- بۆ سەرۆکی لیژنەی گێرانەوەی سامانی بەدەست بەسەرداگیراو لەپارێزگای هەولێر بەپێی نووسراومان ژمارە ٢١٨/١/٢ لە ١٦/٢/١٩٩٣ تەنسیب کرا.
- بەسەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی هەولێر بەسیفەتی پێداچوونەوە بەپێی بەیانی وەزارەتی داد ژمارە ٧٢٢/٣/٢ لە ١٧/١٠/١٩٩٥ دانرا.
- ماوەیەکی زۆرە سەرۆکی دادگای نەوجەوانانە لەهەولێرو شارەزایەکی باشی لەم بوارەدا هەیە.

**٥٦- دادوەر ئەسعەد حسێن عەزیز**

- ناونیشان و شوێنی کارکردن/ جێگری سەرۆک لەم سەرۆکایەتییە.
- رێکەوتی دامەزراندنی بەفەرمانبەر ٥/١/١٩٨٠.
- رێکەوتی دەرچوونی بەدادوەر ٢٥/٨/١٩٨٦.
- بروانامەو ساڵی دەرچوونی/ بەکالۆریۆس یاسا ١٩٧٦-١٩٧٧.

- لەدایکبووی ١٩٥١/٧/١.
١- بەناونیشانی لێکۆڵەرەوەی دادی لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر بەمووچەی مانگانە (٢٨) دینار بەپێی فەرمانی وەزارەتی داد ژمارە ٣١١٥٤/٢٥٧٠/ لە ١٢/٢٤/ دامەزرا ١٩٧٩.
٢- بەمەبەستی بەشداری کردن لەخولی شەشەمی لێکۆڵەرەوەی دادی لەڕێکەوتی ١٩٨٠/٨/٣١ دەستی لەکار هەڵگرت لەبەر ئەوەی خولەکە وەدوا خرا بۆیە ناوبراو گەڕایەوە دادگای بەرایی مەخموور و لەڕێکەوتی ١٩٨٠/١١/١.
٣- لەپەیمانگای دادوەریی بۆ ساڵی خوێندنی ١٩٨٤-١٩٨٥ قبوڵ کرا.
٤- لەپەیمانگای دادوەریی لە ١٩٨٤/٩/١٧ دەستی بەکارکرد.
٥- بەدادوەر لەیەکێک لەدادگا مەدەنیەکانی عێراق بەمەرسومێکی کۆماری ژژمارە ٥٦٣/ لەساڵی ١٩٨٦ دامەزرا.
٦- بەناونیشانی دادوەر لەسەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی موسڵ بەپێی فەرمانی وەزارەتی داد ژمارە ٥/١٠ دامەرا.

**٥٧- دادوەر شوان حەبیب سالح**

- لەساڵی ١٩٥٧ لەکەرکوک لەدایکبووە.
- لەساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩ کۆلێژی یاسا- زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- ماوەیەکی زۆر لەکۆمپانیای (تەئمین) لەکەرکوک فەرمانبەری یاسایی بووە.
- لەساڵی ٢٠٠٤ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوە.
- لەساڵی ٢٠٠٤ لەدادگای کەتن لەهەولێر دانراوە.

**٥٨- دادوەر محەممەد عەزیز ئیسماعیل**

- لەساڵی ١٩٤٩ لەکەرکوک لەدایکبووە.
- لەساڵی ١٩٧٨-١٩٧٩ کۆلێژی یاساو رامیاری- زانکۆی بەغدا تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٩٧ بەدادوەر لەدادگای بەرایی شەقڵاوە دامەزراوە.
- لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر کاری کردووە.
- بە ئینتیداب بۆ دادگای بەرایی دەشتی هەولێر گوازراوەتەوە.
- ئێستا لەدادگای باری کەسی هەولێر دانراوە.

**٥٩- دادوەر ئیبراهیم محەممەد خەشمان گرگری**

- لەساڵی ١٩٥٥ لەزومار لەدایکبووە.
- لەساڵی ١٩٧٦-١٩٧٧ دەرچووی کۆلێژی یاسایە.
- لەساڵی ٢٠٠٤ بەدادوەر لەسەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوە.
- لەساڵی ئینتیداب ٢٠٠٤ کراوە بۆ دادگای بەرایی زاخۆ.

**٦٠- دادوەر بەهزاد جیهاد فایەق**

- لەساڵی ١٩٧١ لەئاکرێ لەدایک بووە.
- لەساڵی ١٩٩٢-١٩٩٣ کۆلێژی یاسای تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٩٨ بەلێکۆڵەرەوەی دادی لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر دامەزراوە.
- لەساڵی ٢٠٠٤ بەدادوەر لەدادگای بەرایی سۆران دەست بەکار بووە.

**٦١- دادوەر ئیسماعیل خەلیل شەکیب**

- لەساڵی ١٩٦٨ بەکالۆریۆسی لەبەشی ماف وەدەست هێناوە.
- لەساڵی ١٩٧٧-١٩٧٨ پەیمانگەی دادوەری تەواو کردووە.
- لەساڵی ١٩٧٤ بەفەرمانبەر لەسەر میلاکی وەزارەتی شارەوانی و گەشتوگوزار دامەزراوە.
- لەساڵی ١٩٧٩ بەدادوەر دەست بەکار بووە.
- شوێنی کارکردن/ سەرۆکی دادگای تاوانی هەولێر.

**٦٢- دادوەر شەهاب محەممەد عەلی مزوری**

- لەساڵی ١٩٥٧ لەموسڵ لەدایکبووە.
- لەساڵی ١٩٧٩-١٩٨٠ کۆلێژی یاسای تەواو کردووە.

- لەسالّی ٢٠٠٤ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوە.
- لەسالّی ٢٠٠٤ کراوە بۆ دادگای بەرایی بەردەڕەش ئینتیداب.

**٦٣- دادوەر عەبدولرەزاق مەجید عەبۆ**
- لەسالّی ١٩٥٦ لەعەشایر سەبعە لەدایک بووە.
- لەسالّی ١٩٧٩-١٩٨٠ کۆلێژی یاسای تەواو کردووە.
- لەسالّی ٢٠٠٤ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوە.
- لەسالّی ٢٠٠٤ کراوە بۆ دادگای بەرایی ئاکرێ ئینتیداب.

**٦٤- دادوەر ئەحمەد حەسەن خەلف**
- لەسالّی ١٩٥٧ لە-تەلکیف- لەموسڵ لەدایکبووە.
- لەسالّی ١٩٨٨-١٩٨٩ دەرچووی کۆلێژی یاسا- زانکۆی موسڵ.
- لەسالّی ٢٠٠٤ بەدادوەر لەسەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوە.
- لەسالّی ٢٠٠٤ کراوە بۆ دادگای بەرایی (سمێل) ئینتیداب.

**٦٥- دادوەر سەرحان ئەحمەد سەرحان**
- لەسالّی ١٩٥٧- لەزاخۆ لەدایک بووە.
- لەسالّی ١٩٨٩-١٩٩٠/ دەرچووی کۆلێژی یاسا- زانکۆی موسڵ.
- لەسالّی ٢٠٠٤ بەدادوەر لەسەر میلاکی سەرۆکایەتی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێر دامەزراوە.
- لەسالّی ٢٠٠٤ کراوە بۆ دادگای بەرایی سەرسەنگ ئینتیداب.

**٦٦- یاریدەدەری دادوەر: غازی عەبدوڵلا نانەکەلی**
- لەسالّی ١٩٤١ لەدایکبووە.
- لەسالّی ١٩٧١ لەدادگای بەرایی هەولێر دەست بەکار بووە.
- لەسالّی ١٩٧٤ بۆتە بەمعاون قەزایی لەدادگای بەرایی هەولێر.
- لەسالّی ١٩٧٤ لەدادگای لێکۆڵینەوەی هەولێر بووە.
- لەسالّی ١٩٧٥ بەهەمان وەزیفە بۆ دادنووسی هەولێر گوێزراوەتەوە.

**٦٧- یاریدەدەر دادوەر: مەحمود عوسمان حەمەد ئەمین**
- لەسالّی ١٩٧٩ لەدادگای کەتن لەهەولێر بووە.

**٦٨- یاریدەدەری دادوەر: بەشیر حوسێن سەعدی**
- لەسالّی ١٩٨٠ لەدادگای نەوجەوانان لەهەولێر کاری معاون قەزایی کردووە.

**٦٩- یاریدەدەری دادوەر: عەبدولعەزیز رەسوڵ شێخانی**
- لەسالّی ١٩٥٩ نووسەری پلەیەک بووە، لەدادگای شەرعی هەولێر. هەر لەهەمان ساڵ بۆ دادگای بەرایی هەولێر گوێزراوەتەوە.
- لەسالّی ١٩٧١ نووسەری پلەیەک ئیزافی بووە لەدادگای بەرایی هەولێر.
- لەسالّی ١٩٧٤ معاون قەزایی بووە لەنوێنەرایەتی داواکاری گشتی لەهەولێرو لە ١٤/٣/١٩٧٤ بەپێی فەرمانێکی فەرمی دەستی لەکار کێشاوەتەوە لەراژە.
- لەسالّی ١٩٧٦ بەمعاون قەزایی لەدادگای بەرایی دهۆک دەست بەکار بووە.
- لەسالّی ١٩٧٧ دووبارە لەدادگای بەرایی دهۆک دامەزراوەتەوە.

**٧٠- یاریدەدەری دادوەر: محەمەد مەلا وەیس محەمەد**
- لەسالّی ١٩٧٨ لەدادگای بەرایی مەخمور بۆ سەر میلاکی دادگای نەوجەوانان لەهەولێر گوێزراوەتەوە.
- لەسالّی ١٩٧٨ لەدادگای نەوجەوانان بۆ دادگای سوڵح لەهەولێر گوێزراوەتەوە.
- لەسالّی ١٩٧٩ دادگای سوڵح هەڵوەشاوەتەوە.

تێبینی: دادگای سوڵح دادگایەک بووە کێشەکانی یەکلایی کردۆتەوە.

**٧١- یاریدەدەری دادوەر: عەلی**

**مەولود خدر**
- لەساڵی ١٩٨٠ لەدادگای بەرایی هەولێر دەست بەکار بووە.
- لەساڵی ١٩٨٠ لەدادگای بەرایی هەولێر بۆ دادگای کەتن لەهەولێر گوێزراوەتەوە.

**٧٢- یاریدەدەری دادوەر: عەبدولمەجید مەلا شاکیر محەمەد**
- لەساڵی ١٩٧٤ لەدادگای بەرایی ئاڵتون کۆپری (پردێ) بەناونیشانی معاون قەزایی بۆ دادگای شەرعی هەولێر گوازراوەتەوە.
- لەساڵی ١٩٧٩ لەدادگای بەرایی هەولێر کاری کردووە.
- لەساڵی ١٩٧٩ یەکەی دارایی لەدادگای کاری هەولێر کاری کردووە.

**٧٣- یاریدەدەری دادوەر: جەلال رەشید عەلی**
- لەساڵی ١٩٧٥ لەدادگای بەرایی رەواندوز بووە.
- لەساڵی ١٩٧٥ بەهەمان ناونیشان معاون قەزایی لەدادگای بەرایی (سەورە) لەبەغدا تەنسیب کراوە.

**٧٤- دادوەر نازم یونس سەعید**
- خانەنشین کراوە.

**دوای ڕاپەڕین**

دوای ڕاپەڕینی گەلی کوردستانی ساڵی ١٩٩١ حکومەتی فاشی بەغدا دامودەزگاکانی خۆی لەهەرێمی کوردستان کێشایەوە، بەمەش

**ناوی دادوەرانی دادگای کۆیە ١٨٩٤-٢٠٠٤**

| ژ | ناوی دادوەر | ساڵی دەست بەکاربوون | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١ | ئەحمەد عیزەت | ١٨٩٤ زاینی بەرامبەر ١٦ ربیع الاخر ١٣١٢ کۆچی بەرامبەر ١٣١٠ رۆمی | ١٣١٢ کۆچی- ١٣١٠ رۆمی ناوی ئەو دادوەرە لەسەر سجلی ژمارە (١) نوزراوەتەوە |
| ٢ | ئەحمەد ناجی | ١٨٩٥ زایینی | ١٣١٣ کۆچی- ١٣١١ رۆمی |
| ٣ | محەمەد مەولود | ١٨٩٧ زاینی | ١٣١٥ کۆچی- ١٣١٣ رۆمی |
| ٤ | خلوص محەمەد ئەلسەید | ١٩٠١ زاینی | ١٣١٩ کۆچی- ١٣١٧ رۆمی |
| ٥ | یەحیا نەزهەت | ١٩٠٢ زاینی | ١٣٢٠ کۆچی- ١٣١٨ رۆمی |
| ٦ | محەمەد سالح ئەلزاجید | ١٩٠٤ زاینی | ١٣٢٢ کۆچی- ١٣٢٠ رۆمی |
| ٧ | (ئەحمەد) | ١٩٠٥ زاینی | ١٣٢٣ کۆچی- ١٣٢١ رۆمی |
| ٨ | محەمەد ئیبن ئیبراهیم | ١٩٧٠ زاینی | ١٣٢٥ کۆچی- ١٣٢٣ رۆمی |
| ٩ | ئیسماعیل حەقی (قاضی) | ١٩١٢ زاینی | ١٣٣٠ کۆچی- ١٣٢٨ رۆمی |
| ١٠ | قاحی شرع/ محەمەد جەلیزادە | ١٩١٢ زاینی | ١٣٣٠ کۆچی- ١٣٢٨ رۆمی |
| ١١ | رئیس ئیسماعیل حەقی ئەفەندی | ١٩١٤ زاینی | دەستەی دادگای سوڵحی کۆیە ژمارە (١٢-١٣) خەڵکی کۆیە بوون |
| ١٢ | اعضاء- مەلا ئەحمەد ئەفەندی | ١٩١٤ زاینی | دەستەی دادگای سوڵحی کۆیە ژمارە (١٢-١٣) خەڵکی کۆیە بوونە |
| ١٣ | اعضاء- حاجی عەبدوڵلا بەگ | ١٩١٤ زاینی | دەستەی دادگای سوڵحی کۆیە ژمارە (١٢-١٣) خەڵکی کۆیە بوون |
| ١٤ | قازی مستەفا جەلالەدین | ١٩١٨ زاینی | |
| ١٥ | محەمەد عەبدوڵلا جەلی | ١٩١٩-١٩٢٨ | (مەلای گەورەی کۆیە) حاکم شرع |
| ١٦ | محەمەد سدیق عەبدوڵلا نازەنینی | ١٩٢٨-١٩٣٠ | خەڵکی کۆیە بوو، دواپلەی ببوو بەسەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوە ناوچەی کەرکووک دوایش لەساڵی ١٩٥٦ لەکەرکووک کۆچی دوایی کرد |
| ١٧ | سالح زەکی مەردان | ١٩٣٠/٦/١ زانیی | |
| ١٨ | تاهیر مونیف عباس ئەفەندی | ١٩٣٣/١/١٧ | |
| ١٩ | ئیبراهیم عەبدولفەتاح | ١٩٣٤/١١/٨ | |
| ٢٠ | ئەحمەد مەدحەت عەلی نوری ئەفەندی | ١٩٣٤/٧/١٠ | حاکم زیارە بووە |

| ژ | ناوی دادوەر | ساڵی دەست بەکاربوون | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢١ | شیت مستەفا عومەر | ١٩٣٦/١/١ | |
| ٢٢ | ڕەحمان سەعید ئەفەندی | ١٩٣٦/١/٧ | حاکم زیارە بووە- حاکم صلح |
| ٢٣ | عەبدولعەزیز خلوسی | ١٩٣٩/٤/٣ | |
| ٢٤ | موسلیحەدین ساڵح | ١٩٤٢/٧/٢٢ | |
| ٢٥ | ئیبراهیم ئەحمەد فەتاح | ١٩٤٢/٣/١٢- ١٩٤٢/٤/١٦ | خەزوری بەڕێز (مام جەلال)ە _سەرکۆماری ئێستای ٢٠٠٧ی عێراقە - دۆسیەکەی لەدادگای کۆیە دوایش بۆ هەڵەبجە نەقل کراوە |
| ٢٦ | علاءالدین ئەحمەد نوری | ١٩٤٢/١٢/١٤ | |
| ٢٧ | عبدالباقی نوری | ١٩٤٤/٤/١٩ | |
| ٢٨ | نورالدین بەهائەدین | ١٩٤٧/١/٤ | |
| ٢٩ | شیت مستەفا عومەر | ١٩٤٧/١٠/٥ | |
| ٣٠ | سعاد مراد مبارك | ١٩٤٩/٣/١٧ | |
| ٣١ | نورالدین بەهائەدین | ١٩٤٩/٤/٣٠ | |
| ٣٢ | سعاد مراد مبارك | ١٩٥١/٣/٢٤ | |
| ٣٣ | مەجید عەبدوڵلا یاوەر | ١٩٥١/١٠/٢٤ | |
| ٣٤ | ئیسماعیل قیردار | ١٩٥٢/٣/١٧ | |
| ٣٥ | جەوهەر عەزیز دزەیی | ١٩٥٣/٩/٢٠ | |
| ٣٦ | محەمەد مەحمود اردەلان | ١٩٥٣/٤/١١ | |
| ٣٧ | صابر سەعید مفتی | ١٩٥٤/١١/٢٨ | حاکم زیارە بوو |
| ٣٨ | محەمەد ئەمین ئەلچەلبی | ١٩٥٥/١٠/٣ | |
| ٣٩ | تەلعەت محەمەد عەلی | ١٩٥٦/٨/١٨ | حاکم زیارە بوو |
| ٤٠ | نورەدین بەهائەدین | ١٩٥٧/١/٥ | |

بۆشاییەکی ئیداری و سیاسی و یاسایی دروست بوو. ئەوە بوو بەرەی کوردستانی ئەو کات وەک دەسەڵاتداری سیاسی هەرێمی کوردستان بڕیاری ئەنجامدانی هەڵبژاردنی دەرکردو لەڕێکەوتی ١٩٩٢/٥/١٩ بەئەنجام گەیەندراو پەرلەمانی هەرێمی کوردستان پێک هات و، پاشانیش حکومەتی هەرێمی کوردستانی لێکەوتەوە. یەکێک لەوەزارەتە گرنگ و بنەڕەتییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بریتی بوو لەوەزارەتی دادو هاوکات هەوڵ و تەقەلاکان هەر بەردەوام بوو بۆ دامەزراندنی ئەم وەزارەتە گرنگە. بۆ ئەم مەبەستەش پێشەکی یاسای وەزارەتی داد ژمارە (٣٨) ساڵی ١٩٩٢ لەپەرلەمانی کوردستان دەرچوو. پاشان یاسای دەسەڵاتیدادوەری ژمارە (١٤) بۆ ساڵی ١٩٩٢ دەرچوو. ئەمەش بووە بناغەی کاری وەزارەتی دادو لەو کاتەوە هەوڵەکان بەردەوامە بۆ بەرەوپێشبردنی

| ژ | ناوی دادوەر | ساڵی دەست بەکاربوون | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤١ | محەمەد ئەمین چەلەبی | ١٩٥٦/١٠/٩ | |
| ٤٢ | بایز عەبدوڵلا دزەیی | ١٩٥٦/١٢/٤ | |
| ٤٣ | نورەدین بەهائەدین | ١٩٥٧/١/٥ | |
| ٤٤ | بایز عەبدوڵلا دزەیی | ١٩٥٧/٧/٢٢ | |
| ٤٥ | موزەفەر نەقشبەندی | ١٩٥٨/٢/٨ | حاکم زیارە بووە |
| ٤٦ | بایز عەبدوڵلا دزەیی | ١٩٥٧/٧/٢٢ | |
| ٤٧ | خەلەف ئەلنەقیب | ١٩٥٩/٥/١٤ | حاکم زیارە بووە |
| ٤٨ | مەجید بەهائەدین | ١٩٥٩/٦/٣١ | حاکم زیارە بووە |
| ٤٩ | عەبدولقادر نورەدین | ١٩٥٩/١١/١٤ | |
| ٥٠ | جەلیل هوشیار | ١٩٦١/٧/١٩ | |
| ٥١ | مەجید بەهائەدین | ١٩٦١/٧/٣٠ | حاکم زیارە بووە |
| ٥٢ | جەمال عەبدوڵلا | ١٩٦١/١٠/٢٠ | |
| ٥٣ | رەشید عەبدولقادر سەلیم | ١٩٦٢/٦/١٤ | سەرۆکی دادگای تەمیزی هەرێم لەهەولێر/ ٢٠٠٤ |
| ٥٤ | تەحسین عەبدولقادر سەلیم | ١٩٦٤/٧/٢٦ | حاکم زیارە بووە |
| ٥٥ | رەشید عەبدولقادر سەلیم | ١٩٦٤/٩/١٣ | |
| ٥٦ | مەجید بەهائەدین | ١٩٦٦/٨/١ | حاکم زیارە بووە |
| ٥٧ | عومەر حەبیب عەبدوڵلا | ١٩٦٦/١٢/٢٦ | ناسراوە بە (عومەرە سوور) خەڵکی شاری کۆیەیە، برای شاعیر عوسمان عەونی شاعیرە لەساڵانی هەشتاکاندا کۆچی دوایی کردووە. |
| ٥٨ | جەمال عەبدوڵلا | ١٩٧١/٩/٣٠ | |
| ٥٩ | بەهجەت محەمەد حسن | ١٩٧١/١٠/٢٥ | زاوای مامۆستا (زێوەر)ی شاعیر بوو، لەهەشتاکاندا لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە. |
| ٦٠ | کەمال مستەفا قادر | ١٩٧٨/٧/٨ | سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەیی بووە لەسلێمانی لەپاش ساڵانی ١٩٩٦وە دوایش لەمانگی حەوتی ٢٠٠٤ بۆ جاری دووەم خانەشین کرا. |

ئەم وەزارەتە.

**دادگاکان**

أ- دادگای تەمیز (پێداچوونەوە)ی هەرێمی کوردستان

بالاترین دادگایە لەهەرێمی کوردستان و لەژمارەیەک دادوەر پێک دێت. بێگومان لەناو دادگای تەمیزدا جگە لەدەستەو لیژنەکان کە هەموو کێشە جیا جیاکان دەبینن، دوو ئەنجومەنی دیکە هەن سەر بەدادگای تەمیزن، کە زۆر گرنگن بۆ ئەوەی دەسەلاتی دادوەری ئاستێکی باش لەسەربەخۆیی خۆی بپارێزێت.

| ژ | ناوی دادوەر | ساڵی دەست بەکاربوون | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| ٦١ | رامز عەلی نامق | ١٩٧٩/١٢/٨ | |
| ٦٢ | ئەحمەد سالح قاسم | ١٩٨١/٤/١٦ | (حاکم زیارە) بووە، باوکی بەڕێز (د.بەرهەم ئەحمەد)ەکە ئێستا جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراقە لەهەشتاکاندا لەسلێمانی کۆچی دوایی کردووە. |
| ٦٣ | نیهاد حاجی سادق | ١٩٨١/٧/٧ | خەڵکی کەرکوك بووە ئێستا مردووە. |
| ٦٤ | سالار عەبدولواحید مستەفا | ١٩٨١/٤/٢٦ | خەڵکی کۆیەیە ئێستا دادوەری خانەنشینە. |
| ٦٥ | نوشاد محەمەد سەلیم | ١٩٨٢/١١/٣٠ | |
| ٦٦ | ئەحمەد سالح قاسم | ١٩٨٤/٥/٢٠ | |
| ٦٧ | محەمەد سالح عبدولسەمەد | ١٩٨٥/٧/١٥ | خەڵکی ناحیەی شوان بوو ئێستا مردووە |
| ٦٨ | نوشاد محەمەد سەلیم | ١٩٨٦/٢/١١ | |
| ٦٩ | محەمەد سالح عەبدولسەمەد | ١٩٨٨/١٠/١٨ | |
| ٧٠ | محەمەد سەدیق مەحموود | ١٩٨٩/٨/٣٠ | |
| ٧١ | عادل محەمەد عەبدولڕەحمان | ١٩٩٠/٩/٢٤ | خەڵکی کفری بوو ئێستا مردووە. |
| ٧٢ | ئەحمەد عەبدوڵلا زوبێر | ١٩٩٣/١/١٧- ١٩٩٦/٩/١٤ | سەرۆکی ئیستینئافە لەهەولێرو خەڵکی شەقڵاوەیە. |
| ٧٣ | فوئاد سابیر رەشید | ١٩٩٣/٢/١٣- ١٩٩٣/٥/٨ | خەڵکی شاری کۆیەیە دادوەری لێکۆڵینەوە بوو. |
| ٧٤ | عەلی عەولا ئەحمەد | رۆژانی ١٩٩٥/٦/٥ و ٧/٢٤ و ٧/٣١ و ٨/٧ و ١٩٩٥/٨/١٤ دەوامی کردووە | حاکم زیارە بووە |
| ٧٥ | سیروان کەماڵ عەبدولڕەحمان | رۆژانی ٥/١٣ و ٥/٢١ و ١٩٩٦/٧/٣ دەوامی کردووە | حاکم زیارە بووە |
| ٧٦ | حوسێن خالید خضر | ١٩٩٦/٦/١٥ . | (حاکم المنتدب) ئێستا ئەندامی دادگای تاوانە لەهەولێر- ٢٠٠٤ |
| ٧٧ | ئەحمەد عەبدوڵلا زوبێر | یەك رۆژی دەوام کرد ١٩٩٦/٩/١٤ | سەرۆکی دادگای تێهەڵچوونەوەی ناوچەی هەولێرە |
| ٧٨ | عەلی ئەحمەد ئیبراهیم | ١٩٩٦/١٠/٥ | (حاکم المنتدب) |
| ٧٩ | کەمال رەشید عەلی | ١٩٩٧/٣/١- ١٩٩٧/٥/٣١ | (حاکم المنتدب) ئێستا دادوەرە لەدادگای باری کەسی لەسلێمانی/ ٢٠٠٤ |
| ٨٠ | سەردار عومەر ئەحمەد | ١٩٩٩/١١/٢٨ | (حاکم المنتدب) دادوەر لەدادگای کار (محکمة العمل) لەسلێمانی/ ٢٠٠٤ |

ناوی دادوەرانی دادگای كۆیە ١٨٩٤-٢٠٠٤

| ژ | ناوی دادوەر | سالی دەست بەكاربوون | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٨١ | هیمداد مەجید عەلی | ١٩٩٨/٤/١٤ | دادوەری لێكۆلینەوەیە لەكۆیە |
| ٨٢ | ویداد حوسێن حەمید | ١٩٩٩/١٢/٦- ٢٠٠٠/١/٥ | (حاكم زیارە) ئێستا ئەندامە لەدادگای تاوانەكان لەسلێمانی |
| ٨٣ | ئەحمەد جەلیل ئیبراهیم | ٢٠٠٠/١/٥- ٢٠٠٠/١/٢٢ | خەلكی خانەقینە ئێستا دادوەری دادگای كەلارە/ ٢٠٠٤ |
| ٨٤ | شوان سابیر ئەسعەد | ٢٠٠٠/١١/٢٠ | دادوەری دادگای بەرایی كۆیەیە/ ٢٠٠٤ خەلكی كۆیەشە |
| ٨٥ | دیار محەمەد عەلی | ٢٠٠٤/٤/٣ | دادوەری دادگای باری كەسایەتی كۆیەیە/ ٢٠٠٤ خەلكی شاری هەولێرە |

١- ئەنجوومەنی دادوەری كە (مجلس القضاء) دەناسرێت، راستەوخۆ دادگای تەمیز سەرۆكایەتی دەكات، تایبەتە بەتاقیكردنەوەی پالێوراوان بۆ ئەوەی ببنە دادوەر (حاكم) یان جێگری داواكاری گشتی. هەروەها بۆ پلە بەرزكردنەوەیان و گواستنەوەیان لەنێوان دادگاكاندا.

٢- لیژنەی كاروباری دادوەران و ئەندامانی داواكاری گشتی (لجنة شؤن الحكام) و (واعضاء العام) كە تایبەتە بەدادوەرەكان و ئەندامانی داواكاری گشتییەوە كاتێك كێشەیەك روویان تێدەكات یان لەسەریان دروست دەبێ. لەلایەن ئەو لیژنەیەوە دادوەری دەكرێن، نەك لەدادگاكانی تردا.

ب- دادگای تێهەلچوونەوە

دوو سەرۆكایەتی تێهەلچوونەوە لەهەرێمی كوردستان هەیە:

یەكەمیان.. سەرۆكایەتی تێهەلچوونەوە ناوچەی هەولێر، كە هەردوو پارێزگای هەولێرو دهۆك دەگرێتەوە بارەگاكەی لەهەولێرە. دووەمیان.. سەرۆكایەتی تێهەلچوونەوەی ناوچەی كەركووك كە هەردوو پارێزگای كەركوك و سلێمانی دەگرێتەوە بارەگاكەی لەسلێمانییە. ئەوەی لەچوارچێوەی سنووری دەسەلاتی حكومەتی هەرێمی كوردستان كابینەی چوارەم دایە بەشێوەیەكی راستەوخۆ بریتییە لەدادگاكانی سەر بەسەرۆكایەتی ناوچەی تێهەلچوونەوەی هەولێر بەم شێوەیەی خوارەوە:

١- دادگایەكانی (لێكۆلینەوەو كەتن و بەرایی و باری كەسی و باری شارستانی) كەپارێزگاو قەزاو ناحیەكان.

٢- دادگاكانی تاوان و دادگاكانی نەوجەوانان لەپارێزگاكان و ئەگەر پێویستی كرد دەكرێت لەقەزایەكانیش بكرێتەوە.

**خشتەی دادگاكانی پارێزگای هەولێر:**

- دادگای بەرایی هەولێر
- دادگای بەرایی خەبات
- دادگای بەرایی بنەسلاوە
- دادگای بەرایی سۆران
- دادگای بەرایی شەقلاوە
- دادگای تاوانی هەولێر (١)
- دادگای تاوانی هەولێر (٢)
- دادگای باری كەسی هەولێر
- دادگای كەتن لەهەولێر
- دادگای كار لەهەولێر
- دادگای باری شارستانی
- دادگای لێكۆلینەوەی هەولێر
- دادگای بەرایی هەریر
- دادگای بەرایی چۆمان
- دادگای بەرایی مێرگەسۆر
- دادگای بەرایی عەنكاوە
- دادگای بەرایی خەلیفان

٣- دادگای تاوانی هەولێر (٢): دادگاكانی بەرایی هەریرو چۆمان و مێرگەسۆرو عەنكاوەو خەلیفان و بەردەرەش لەسەردەمی كابینەی چوارەمدا كراونەتەوەو لەبەرنامەدا هەیە بۆ (قوشتەپەو رەواندوز) دادگا بكرێتەوەو فەرمانیان پێ دەرچووە.

٤- هەروەها لەهەر یەك لەو قەزاو

ناحیانەی، کەدادگای بەرایی لێ هەیە لەهەمانکاتدا دادوەری دادگاکە ئیش و کاری دادگای باری کەسی و دادگای لێکۆڵینەوەو دادگای باری شارستانی و دادگای کەتن دەبینێت.

٥- یەک دادگاش هەیە پەیوەندی بەبازرگانییەوە هەیەو سەر بەوەزارەتی (دارایی و ئابووری)یە.

**کارو چالاکییەکانی وەزارەت:**

گرنگترین ئەو کارو چالاکییانەی کە وەزارەتی داد ئەنجامی داون ئەمانەن:

١- لەساڵی ١٩٩٩دا لەپەرلەمانی کوردستان یاسای دەرکردنی رۆژنامەی (وەقایعی کوردستان) بریاری لەسەر درابوو لەسەرەتای دەست بەکاربوون لەوەزارەتی داد، توانرا دەست بکرێت بەدەرکردنی رۆژنامەی وەقایعی کوردستان بەشێوەیەکی دەوری و ئەم یاساو بریارانەی کە لەپەرلەمان دەردەچێ بەشێوەیەکی بەردەوام لەرۆژنامەی وەقایعی کوردستان بلاوبکرێتەوە. تائێستا (٦٢) ژمارەی لێدەرچووە.

٢- کارێکی تر کەوەزارەت ئەنجامی داوە لە ٢٠٠٠/٦/٣ بەرنامەیەک دانرا بۆ ئەوەی زمانی کوردی لەدەزگا دادییەکان و لەوەزارەتی دادو لەدادگاکاندا بەشێوەیەکی فراوان بەکاربهێندرێن، چونکە لەیاسای دەسەلاتی دادوەری کە لەساڵی ١٩٩٢ دەرچووە ئەوەی تێدایە، کەزمانی دادگاکان دەبێ کوردی بێ. چونکە زمانی کوردی زمانی رەسمی هەرێمە. لەبەر ئەوەی زمانی کوردی بەشێوەیەکی رێکوپێک لەهەموو بوارەکان بەکار نەدەهێنرا، نەک هەر لەدادگاکان، بەڵکو لەزۆرێک لەدەزگاکانی تری سەر بەوەزارەت زۆربەی فۆرمەکان و کلێشەکان عەرەبی بوون. زۆرێک لەشتەکانی تر عەرەبی بوو. بۆیە بریاردرا کە بەشێوەیەکی قۆناغ بەندی دەست بکرێت بە بەکارهێنانی زمانی کوردی لەدەزگاکانی سەر بەوەزارەتی داد بەگشتی و لەدادگاکان بەتایبەتی. بۆ ئەم مەبەستە لیژنەیەک لەچەند دادوەرو کەسایەتییەک پێک هێنرا کە لەبواری یاساو لەبواری زمانەوانی کوردی شارەزا بن و سەر بەناوچە جیا جیاکانی کوردستانیش بن بۆ وەرگێرانی فۆرمەکان و زاراوە یاساییەکان. لیژنەکە بەسەر کەوتوانە توانیویەتی فۆرمەکان زێتر لە (٢٠٠) فۆرم وەربگێرێتە سەر زمانی کوردی و بەهەموو دەزگاکانی وەزارەت و دادگاکان بلاویان بکەنەوەو کاریان پێبکەن و هەروەها فەرهەنگۆکەیەکیان داناوە بۆ زاراوە بەکوردی کە (١٠٠٠) هەزار وشەی لەخۆ گرتووە ئێستاش کە٢٠-٨-٢٠٠٩ بەرێز فاروق جەمیل صادق وەزیری دادی حکومەتی هەرێمی کوردستانە پاش یەکگرتنەوەی وەزارەتەکانی داد.

**سەرچاوەو پەراوێز:**

١- عوسمان رەشاد موفتی، کوری گەورەی (قازی رەشاد موفتیە) راوێژکاری یەکەم لەوەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئایینی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

٢- دیوەخانی موفتی.. لەراستیدا یەکێکە لەو دیوەخانانەی، کە جێی شانازییە خەڵکی هەولێرو گەلی کورد شانازی پێوە بکات و دەتوانرێت وەک، ئەرشیفێک بۆ هەموو بابەتەکان بەکاربهێندرێت. پرە لەدەستنووس شتی هەمەرەنگ، وێرای چەندین کەسایەتی دیار شەوانە ئەو دیوەخانە بەزانست و گێرانەوەی رووداوەکانی رابردوو جۆش دەدەن.

٣- فاروق بەهائەدین خەلیفە-مامۆستای زانکۆ- ئێستا خانەنشین کراوە.

٤- عەبدولباقی محەمەد مەجید بەرێوەبەری بەشی پاراستن و ئەرشیف لەسەرۆکایەتی دادگای دەستپێکردنەوە. تێبینی لەساڵی ١٩٨٣وە بەرێوەبەری کۆگای پێشکەوتووە.

٥- الأکلیل في محاسن اربیل عبدولڵا فەرهادی- ١٤٢٢ک- ٢٠٠١ز چاپی دووەم ل١٢.

٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٧- هەمان سەرچاوە ل٥٤.

٨- هەمان سەرچاوە ل٦٩.

٩- هەمان سەرچاوە- ئیبن مستەوفی ل٣٦٥

١٠- الاکلیل في محاسن اربیل- عبدولڵا فەرهادی- ١٤٢٢ک- ٢٠٠١ز چاپی دووەم ل٩٣.

١١- هەمان سەرچاوە ل٩٤.

١٢- هەمان سەرچاوە ل١٠٧.

١٣- هەمان سەرچاوە ل٢٦٣.

١٤- هەمان سەرچاوە ل٣٢٤.

١٥- هەمان سەرچاوە ل٣٢٥.

١٦- هەمان سەرچاوە ل٣٧١.

١٧- گەشتێک بەنێو مزگەوت و تەکیەکانی شاری هەولێر- عومەر شێخ لەتیف بەرزنجی- لەبلاوکراوەکانی وەزارەتی ئەوقاف و کاروباری ئیسلامی ژمارە (١) ل٤٨.

١٨- سورەتی غافر- ئایەتی ٣٨ قورئانی پیرۆز.

١٩- فی ذکری الخالدین (القاضي رشاد موفتي) بقلم محمود خلیل زەرگەزوری- گۆڤاری خۆری ئیسلام- ساڵی نۆیەم- ژمارە ٣٢ شەعبانی ١٤٢٧ک- ٢٠٠٦ز ل٧٠-٧٦ بەشی عەرەبی.

# یەکەمین قوتابخانەی کچان لە هەولێر

**مەسعودی مەلا هەمزە**



لە دیدارێکی تایبەتی بەدرخاندا مامۆستا ویداد خالس باس لە یەکەم قوتابخانەی کچان لە هەولێر و مامۆستا کوردەکانی ئەو قوتابخانەیە دەکا و دەڵێ: یەکەم قوتابخانەی کچان لە هەولێر لە ساڵی ١٩٢٧ لە قەڵات دامەزرا بەناوی قوتابخانەی هەولێری کچان، خوێندن بە زمانی عەرەبی بوو تەنانەت وانەی کوردیشی تێدا نەبوو، مامۆستاکان هەموویان لە شاری موسڵ و بەغدا هاتبوون.

ژمارەی قوتابیان ١٦ کەس بوون لە قۆناغی شەشەمی سەرەتایی، لە ساڵی ١٩٣٣ (٧) کچ بەشداری تاقیکردنەوەی بەکەلۆریەیان کرد و پرسیارەکانیان لە بەغدا دەهات و دەفتەرەکان هەر لە بەغدا کۆنترۆڵ دەکران، لە ئەنجامدا تەنها یەک قوتابی لە تاقیکردنەوەکان دەرچوو و بڕوانامەی شەشی سەرەتایی وەرگرت ئەویش خوالێخۆشبوو مامۆستا شوکریە جیاووک بوو کە دایکم بوو. لەو سەردەمەدا دابونەریتی کۆمەڵایەتی ڕێگەی بە کچ نەدەدا بۆ خوێندن بچنە شارێکی تر، بەڵام خاڵم پاڵپشتی دایکم بوو و هەروەها خوالێخۆشبوو مەعروف جیاووک ڕووناکبیری هەولێر و داکۆکیکار لە مافی میللەتی کورد پاڵپشتی کرد، تەواوکردنی خوێندن لە (دارالمعلمات) لە بەغدا ماوەی ٣ ساڵی دەویست واتە دایکم لە ساڵی ١٩٣٦ بڕوانامەی خانەی مامۆستایانی لە بەغدا بە پلەی یەکەم وەرگرت و لە قوتابخانەکەی









خۆی لە قەلات دامەزرا.

مامۆستا ویداد باس لەوە دەکا دابونەریتی ئەوسا ڕێگەیان نەدەدا قوتابخانەی قەلا لە سەرەوەی قەلا بگوازرێتەوە بۆ خوارەوە، چونکە زۆربەی قوتابییەکان خەلکی قەلات بوون.مامۆستا شوکریە یەکێک بووە لە مامۆستاکانی ئەو سەردەم و مامۆستا ویداد لە بارەیەوە گوتی: مامۆستا شوکریە بەردەوام بوو لەکاری فێرکردن و پەروەردەی قوتابیان تا سالی ١٩٧٦ و لە سالی ٢٠٠٣ مالئاوایی لە ژیان کرد و تا ئێستا هیچ ڕێزلێنانێکی بۆ نەکراوە هەرچەندە وەزیری پێشووی پەروەردە عەبدولعەزیز تەیب لە پرسەکەی سەردانی کردین بەلێنی پێداین کە قوتابخانەیەکی بەناو بکا، بەلام تا ئێستا وەلامی نییە.

کاتی خۆشی دایکم داوای لە دایکان و باوکان و خزم و کەسەکانی خۆی دەکرد کە مندالەکانی خۆیان بنێرنە قوتابخانە.

دووەم مامۆستای دەرچووی خانەی مامۆستایان مامۆستا خەیریە رەفعەت بوو کە لە سالی ١٩٣٨ خانەی مامۆستایانی تەواوکرد.

لە سالی ١٩٣٩ش دوو مامۆستای تر خانەی مامۆستایانیان تەواوکرد ئەوانیش خەیریە نادر و رەبیعە رەشید بوون.

لە سالی ١٩٤٠ ئەستێر سەعید لە خانەی مامۆستایان دەرچوو، ست ئەستێر جگە لە کاری مامۆستایی

خۆی لەگەڵ نەقابەی مامۆستایان بەشداری دەكرد لە دەرچوونی رۆژنامەی هەولێر.

ست ئەستێر لەبەرئەوەی هاوسەرەكەی دكتۆر حكمەت قوزمیدس لە شۆرشی ئەیلوول بەشداری كردبوو ست ئەستێر بۆ ماوەی ٢١ رۆژ لە هەولێر گیراوە و دواتر بەریانداوە ئەگەرچی ٣ منداڵی وردی هەبووە.

مامۆستایەكی تری شاری هەولێر بەدریە پیرداود بوو كە لە ساڵی ١٩٥٢ دامەزراوە و لە ساڵی ١٩٨٤ خانەنشین كراوە و نموونەی مامۆستای دڵسۆزی كوردپەروەر بووە و بەهەموو جۆرێك یارمەتی خێزانە لێقەوماوە كوردەكانی دەدا و خوشكی فازیڵ پیرداودی پێشمەرگەی دێرینە و مەسئولیەتی بەرێوەبردنی هەموو منداڵەكانی فازیڵ لە ئەستۆی ئەو بووە، جگە لەوەی لە هەموو بەندینخانەكانی عیراق بەدوای فازیلی برای دەگەرا.

مامۆستا ویداد باسی لەوەكرد لە ساڵی ١٩٥٨- ١٩٥٩ ئەوان چوار قوتابی بوونە كە بریتی بوونە لە (ویداد خالس، رووناك ناسح، زاهیدە شەهاب، سوعاد مەعروف) و پۆلیان بۆ نەكراوەتەوە، بەڵام نەشئەت محەمەد سەفودت بەرێوەبەری پەروەردە بووە و پۆلی بۆ كردوونەتەوە بە موافەقەی وەزارەتی پەروەردە لە بەغدا بەماوەی هەفتەیەك دوو هەفتە ژوورێكیان بۆ دروستكرا بۆ پۆلی چوارەمی زانستی.





لەو سەردەمیشدا مامۆستا نەشئەت محەمەد سەفودت و مامۆستا عزەدین فەیزی رۆڵیان هەبوو لە داواكردنی هاتنی كچان بۆ قوتابخانە و داوایان دەكرد دایك و باوكەكان كچەكانی خۆیان لە خوێندن بێ بەش نەكەن و قوتابیان خوێندنی قۆناغی ئامادەیی و دواتر خوێندنی زانكۆ تەواوبكەن.

* لە هەفتەنامەی بەدرخان بلاوكراوەتەوە



# یەکەم کتێبخانەی شاری هەولێر

**رەسول محەمەد عەزیز بەختیار**

ئەگەر بێت و باس لەدامەزراندنی یەکەم کتێبخانە بکەین لەشاری هەولێر دەگەینە ئەو خاڵەی کە یەکەم کتێبخانە بۆ کتێب فرۆشتن لەساڵی (١٩٤٧) لەژێر ناوی کتێبخانەی (سەربەستی) دامەزراوە، لەلایەن (رەووف مەعرووف حەمەساڵح ئاغا رەباتی)یەوە، کە لەدایکبووی ساڵی (١٩٢٢)ە، لە رێکەوتی ٢٠٠٨/٨/٦ لەگەرەکی ئازادی شاری هەولێر کۆچی دوایی کرد، بەهۆی دامەزراندنی ئەم کتێبخانەیەش چەندین جار دەستگیرکراوە وتاوانبار کراوە کە سەر بەحزبی شوعییە، لەگەڵ ئەوەی چەندین جار (نەفی)کراوە بۆ شاری (موسڵ) بەپێی قسەی نەوەکانی ناونانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دامەزرێنەرەکەی وبرادەر وهاوڕێکانی ئەندامی حزبی (هیوا) بوونە، بۆیە لەسەر داوای

برادەرەكانی ئەو ناوەی لێنراوە، هاوكات ئەوكات زۆربەی بلاوكراوەكانی ولاتانی میسر ولوبنان وبەریتانیا وئەمەریكا دەهاتە هەولێر وەك رۆژنامە عەرەبییەكان بەنموونە (الاهرام، الاخبار، الزمان، الراى العام، البلاد، الشعب، قەلەندەر) هەروەها گۆڤارەكانی (اخر الساعة، المصور، الفنون، روز اليوسف، الهلال، مسافرات الجيب)، گۆڤارە بیانییەكانیش (تایمز، نیوزویك، سكالا)، لەگەڵ چەندین كتێبی جۆراوجۆر، ئەو هەموو كتێبخانەكانی شاری بەغدای ناسیوە ومامەڵەی لەگەڵدا كردوون، بەپێی قسەی نەوەكانی ئەوكات كتێب وگۆڤار ورۆژنامەكان بەچەند فلسێك بووە، زۆربەی ئەوانەی كڕیویانە بەقەرد بووە و زۆریشیان لەدواییدا پارەكەیان نەداوەتەوە، بەلام وەك بەردەوام بوونێك بۆ كتێبخانە وبژێوی ژیان، خاوەنەكەی چەند كارێكی دیكەی كردووە وەك دانانی (قرتاسیە) لەهەمان كتێبخانەدا، لەلایەكی دیكەوە لەسەرەتای دامەزراندنی ئەو كتێبخانەیە تەنیا چەند رۆژنامە وگۆڤارێكی كوردی هەبوو وەك (گێتی كەلەلایەن گیوی موكریانی دەردەچوو) هەروەها گۆڤاری (گەلاوێژ) كەخاوەنەكەی



(عەلائەدین سەجادی) بوو، دابەشكردنی هەموو رۆژنامە وگۆڤار وكتێبەكان بەسەر هەموو پارێزگای هەولێردا، لەخاڵی هەولێرەوە بۆ چەند خاڵێك بوو وەك ( لەهەولێر بۆ شەقلاوە، دوا خاڵیش شارۆچكەی رەواندز بوو كە لەلایەن (عەلی مەكتەبە)وە دابەش دەكرا كتێبخانەیەكی بچووكی هەبوو لەو شارۆچكەیە)، هەروەها (لەشاری كۆیە كتێبخانەیەكی بچووك هەبوو، كە خاوەنەكەی (جەمال) بوو، لە كتێبخانەی سەربەستی گۆڤار و رۆژنامە وكتێبی دەبرد)، لەلایەكی دیكەوە، هەر سەبارەت بەكتێبخانەی سەربەستی لەسالانی (١٩٧٠) ناوی سەربەستی وەك ناوێكی بازرگانی درا بە(سەید ئەحمەد) كە تائێستاش ئەم ناوە لەسەر دوكانەكەی ماوە، ئەوەی گرنگیشە ئاماژەی پێبكەین جگە لەكتێبخانەی سەربەستی هەر لەو كاتەدا چەندین كتێبخانەی دیكە هەبوون، بەلام ئەوان بەردەوام نەبوون وەك كتێبخانەیەكی بچووك كە لەلایەن (شێخە شەلە)وە بەرێوە دەبرا، بەلام تەنها كتێب و بلاوكراوەكانی حیزبی شیوعی بوو، هەروا لەپاش شۆرشی (١٤)ی تەموز لەلایەن (فارووق شووشە) كە ئەفسەرێكی سوپا بوو تەنها كتێب و بلاوكراوەی سەربازی دەفرۆشرا، ئەوەی ماوە بیلێین كتێبخانەی سەربەستی بەیەكەم كتێبخانە دەژمێردرێت بۆ بلاوكردنەوەی وشیاری ورۆشنبیری لەشاری هەولێردا.

لە هەفتەنامەی بەدرخان بلاوكراوەتەوە.

# قوتابخانەی شەوانە لە کۆیە

هوشیار محەمەد ئەمین

لەزۆر کۆنەوە دانیشتوانی کۆیە حەزو ئارەزوویان لەخوێندن و قوتابخانە بووە، تامەزۆری فێربوونی وشەی کوردی بوونەو بۆ ئەم مەبەستە هەستێکی باشی رۆشنبیریان هەبووە، هەربۆنموونە لەساڵی خوێندنی ١٩٢٣-١٩٢٤ لەوسەردەمەی کە تەنها قوتابخانەی کوڕان لەوشارەدا هەبووە،ناردنی کچ بۆ قوتابخانە بە دەرچوون لە ئایینی ئیسلام لەقەڵەم دەدرا، هەر لەوسەردەمەدا دووکچ لەقوتابخانەی کوڕان دەیانخوێند، یەکێکیان کچی مەلا محەمەد"مەلای گەورە"ی کۆیە بوو، ئەمەش وەڵامێکی توندو پڕ مانابوو بۆ کەسانی کۆنەپەرست و دواکەوتوو، هاندەرێکی باشیش بوو بۆ خەڵکی شار بۆ ناردنی کچەکانیان بۆ قوتابخانە، خوێندنی کچان بەم شێوەیە بەردەوام بوو تا ساڵی ١٩٣٣ کە بۆیەکەم جار لەسەردەمی قائیمقام"ساڵح زەکی بەگی ساحێبقڕان"قوتابخانەی کچان کرایەوە.

توێژی کاسبکارانیش ئەوانەی لەبەرکارکردن و پەیداکردنی بژێو بۆ خێزان و منداڵیان هەلیان بۆ نەرەخسابوو بۆ چوونە قوتابخانە، ئارەزوویەکی زۆریشیان لەخوێندن هەبوو، لەبەرئەوە هەرلەساڵی ١٩٢٧ی زایینییەوە کاسبکاران هەوڵیانداوە بۆ کردنەوەی قوتابخانەی شەو بەڵام کردنەوەی قوتابخانەی شەو بەردەوام نەبووە، تا ساڵی خوێندنی ١٩٣٣-١٩٣٤ داواکارییەکەیان کەوتە بواری جێبەجێکردن و هەر لەسەردەمی"ساڵح زەکی بەگ"قوتابخانەی شەو بەشێوەیەکی فەرمی کرایەوە بەڵام بەبێ مامۆستاو میلاک و بودجەی پارە، تەنها شوێنیان بۆ ئامادەکرا، کاسبکاران زۆر دڵخۆشبوون و رەزامەندی خۆشیان نیشاندا بۆ دابینکردنی بودجەی پارە بۆ کڕینی هەموو پێداویستییەکانی قوتابخانە لەچرای"لۆکس"و شتومەکی تر، تەنانەت ئامادەبوون مووچەی مامۆستایانیش بدەن، بەڵام مامۆستا جوامێرەکان خۆیان بەخشی و بەبێ پارە وانەیان دەگوتەوە، بەمە سەلماندیان کە خاوەن هەڵوێستێکی نیشتیمانپەروەرانەن و بووە جێگای دەستخۆشی دانیشتوانی کۆیەو رەزامەندی خوێندکاران.

دواتر دەست پێکرا بەناونووسکردنی ئارەزوومەندانی

خوێندن لە پینەدۆز و ئاسنگەر و کوتاڵفرۆش و کەبابچی و لبادچی و بەرگدروو و چایەچی و پۆلیس و ئەو پۆلیسە ئاشوریانەش کە هاتبوونە کۆیەو لەقشلەی کۆیە بەخێزانەوە نیشتەجێبوون خۆیان ناونووس کرد.

لێرەدا بەپێویستی دەزانم کە یادەوەری یەکێک لەو قوتابیانەی شەو بنووسمەوە ئەویش وەستا"محەمەد ئەمین ساڵح کەبابچی"یە، کەنووسیویەتی: "کە قوتابخانەی شەو کرایەوە سەرەتا ژمارەی قوتابیان گەیشتە"٢٥٠"کەس، زۆربەمان خاوەن ماڵ و منداڵ بووین مامۆستاکان بەبێ بەرامبەر وانەیان پێدەگوتین، هەندێکیان کەوتووی سێی ناوەندی بوون، هەندێکی تریان بەرۆژ مامۆستا یا فەرمانبەر بوون ناوی ئەوبەڕێزانەی کەلەبیرم ماون:

١- غەریب مستەفا
٢- عومەر جەلال حەوێزی
٣- غەریب پەترۆس، کە زۆر خزمەتگوزاربوو.
٤- نافیع عەبدولفەتاح ئاغا، ناسراو بە"رۆستەم".
٥- عەبدولمەجید شێخ نوورەدین مامۆستای جوگرافیابوو زۆر سوودم لێوەرگرت.
٦- محەمەد خدر"جۆلا"زۆر هاوکارمان بوو.

منیشیان هەڵبژارد بەچاودێری گشتی قوتابخانە "المراقب العام" بۆ چارەسەری هەر گرفتێک لەناو قوتابیان، ئەوسەردەمە چوار منداڵم هەبوو، پەیوەندیمان لەگەڵ یەکتر زۆر بەهێزبوو هەر وەک یەک خێزان بووین، بۆ رابواردنی خۆمان چایخانەیەکمان بەناوی"قوتابیانی شەو"لەئاشی سێ تووە بەرامبەر قەسری کاکە زیاد ئاغا لەناو بێستانێک کردبۆوەو لەدوای عەسرو رۆژانی پشوو لەوشوێنە بەیەکەوە رامان دەبوارد. بۆ پشووی هاوینیش گەشتمان دەکرد بۆ دێهاتەکان و هاوینە هەوارەکانی نزیک کۆیە، تیپی مۆسیقای قوتابخانەش بە سرودووی نیشتیمانی گەشتەکەیان خۆشتر دەکرد، ئامێری مۆسیقاش بریتی بوون لە دەهۆڵ و زوڕناو تاس مەعەرف، هەر لەکتێبی مێژووی کۆیەی مامۆستا تاهیر ئەحمەد حەوێزی دا هاتووە:"لەم قوتابخانەیە جگە لەکاسبکاران ٢١ پۆلیس خۆیان ناونووس کردبوو و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ یەکتر زۆر پتەو بوو، بەکۆمەڵ دەچوونە حەمام و سەرتاشخانە، گیانی نەتەوایەتیان بەرزبوو لەبری سەلام کردن رۆژباش و شەوباشیان لەیەکتر دەکرد کەوا زۆرکەس پێیانوابوو بۆ ئایین باش نییە، لەدەرەوەی شاریش یاری و وەرزش و تەمسیل و سوعبەتیان بەیەکەوە دەکرد، رۆژی شەموانیش باسی گرفتە کۆمەڵایەتییەکانیان دەکرد و چارەسەریان بۆ دادەنا، لەمامۆستاکانیش تاهیر مەلا سادق و محەممەدی فەخری و رەئوف و محەممەد حەوێز ناسراو بە"حەمەرەش" مامۆستابوون، جگە لەپیتی ئەلفوبێ، پیتی لاتینیشیان فێر دەکردین، لەساڵی ١٩٣٦ رەزامەندی بودجە بۆ وانەگوتنەوەی مامۆستایان درا، وانەی بە "٥٠ فلس" ئەم خوێندنگایە بەردەوام بوو لەخوێندن و وەگرتنی قوتابیان ناوەکەشی لەسەرەتاوە بەم شێوەیە بووە: قوتابخانەی شەو، دواتر بووە قوتابخانەی کۆیسنجاقی ئێواران و، قوتابخانەی قەندیلی ئێواران لەکۆتایی دەبێ بە ئاماژە بەو یادەوەرییە نزیکە بکەم بۆ بەراورد لەگەڵ ئاستی رۆشنبیری و حەزوئارەزووی ئەو کاسبکارانەی ئەوسەردەمی بۆ خوێندن لەگەڵ کاسبکارانی ئەو سەردەمە بۆ خوێندن، لەگەڵ کاسبکارانی رۆژگاری ئێستادا، لەپاش راپەڕینە مەزنەکەی گەلی کورد لەساڵی ١٩٩١ لەوکاتەی کە باری ئابووری مامۆستا زۆر خراپ بوو لەگەڵ چەند مامۆستایەکی دڵسۆز بەمەبەستی ناونووسکردنی کاسبکارانی چەند گەڕەکێکی میللی هەولێر، لەشەوێکی ساردی زستان پاش گەرانێکی زۆرو روونکردنەوەی گرنگی فێربوون و نووسین لەژیانی رۆژانەی ئەم سەردەمەو دابینکردنی هەموو پێداویستییەکانی خوێندن بۆیان تا درەنگی شەو توانیمان یەک کاسبکار ناونووس بکەین، کە خەڵکەکە بەداخەوە زۆر بەساردی پێشوازییان لێکردین.



# خوێندن لە کۆیە

**تاهیر ئەحمەد حەوێزی**

لەپێشان لە سوختەخانە (حوجرە) و مزگەوتەکان دەرسی ئایینی دەخوێندرا، بەڵام بە (١٠) گوندان خوێندەوارێک دەست نەدەکەوت، نامەیەک بخوێنێتەوە.

زۆر گرنگیان بە خەت و نووسین نەدەدا، بایی ئەوەندە فارسییان دەخوێند تا لە ئەدەبیاتی فارسی شارەزابن و بتوانن کاغەز بۆ یەکتری بنووسن، لەمانە خەتخۆش پەیدابوون

زۆر لە مزگەوتەکان ژووری (تەدریس) و ژووری نووستنی فەقێیانیان جیابوو. هەندێ مزگەوت سوختەخانەشیان تێدابوو، ئەو مەلای دەرسی بە منداڵان گوتبێتەوە، فارسیشی باش زانیوە، بەڵام بەشی زۆریان مەلای تەواونەبوون. مەلای تەواو بەڵکو دەرسی بە فەقێیانیش نەگوتۆتەوە، هەر دەرسیان بە (موستەعید)ان گوتووەتەوە.

مەلای منداڵان - کە مامۆستاشیان پێ گوتوون - هەبووە لە ماڵی خۆی سوختەخانەی داناوە، زستانان لە ژوورێکدا و هاوینانیش لە حەوشە، لەژێر ساباتدا دەرسیان وتۆتەوە.

لە کۆیە سوختەخانە زۆر بووە، ئەمانە لەپێش ساڵی (١٩٠٠) سوختەخانەیان هەبووە:

١- مەلا حوسێن باوکی شێخ تاهیری قایەچی لە گەڕەکی (قەڵات) ٢- مەلا رەسوول بێتووشی (قەڵات) ٣- مەلا (حەبیب ئەحمەد)ی شەمامێ (بایزاغا) ٤- مەلا عەزیزە کۆرە (بایزاغا) ٥- مەلا محەمەد بێچوو (قەڵات) ٦- حاجی مەلا ئەمین سورچی (بەفریقەندی) ٧- مەلا ئەوڕەحمان مەلا پیرۆت (هەواو) ٨- مەلا سمایل سورچی (بەفریقەندی) ٩- مەلا قادر تەها سابلاغی (بایزاغا) ١٠- مەلا ئەحمەد سوورە (بەفریقەندی) ١١- مەلای ڕەش (مەلا ئەحمەد) (قەڵات) ١٢- مەلا جراب (بایزاغا) ١٣- حاجی مەلا مستەفا نارنجی (بەفریقەندی) ١٤- مەلا سەعد ئاکۆ (بەفریقەندی)(٢) ١٥- شێخ سەعید

(بەفریقەندی) ١٦- مەلا سابیر مەلا حەبیب (بەفریقەندی) ١٧- مەلا ئەورەحمان فندەق (بەفریقەندی) ١٨- مەلا سالح مەلا ئەحمەد (بەفریقەندی).

زۆر ئافرەتیش سوختەخانەیان هەبووە، پێیان گوتوون (مامۆستا):

١- (فەقێ فاتم) کچی عەبدولرەحمان: مالی لە گەرەکی بەفریقەندیان بوو، بەرەکەریشی دەکرد. دایکی ئەحمەرەشی وەسمانی، بە زۆری کچ و کوری گەرەکی بەفریقەندی و مندالە حەوێزییەکان لەلای دەیانخوێند، (زەینەب و زبید) کچانی (عەولا ئاغا)، (کەریم ئاغای مەلا واحد ئاغا) و عاصمە کچی (حەمە ئاغای غەفووری).

دوو کچیشی هەبوو (فەقێ زەینەب) ژنی وەستا حەمەدەمین زیندروو، (رەحمە) ژنی وەستا (کەریم)ی (سەفەر)ی دارتاش.

٢- (فەقێ زەینەب) کچی وەسمانی رەسوولی هەناری، کە لە (فەقێ فاتم) بوو: (عەزیز محەمەد قادر) (سلێمانی) و (کافیە و زەکیە) کچانی (حاجی ئەسعەد) و (ئامینە و فەخریە) کچانی (حەمەد مستەفا ئاغا) لەلای خوێندوویانە.

٣- (فەقێ عەیشێ) کچی (حاجی مەلا مستەفا نارنجی) ژنی وەستا (تاهیر)ی خەیات:

(عەبدولحەمید حاجی مەلا تۆفیق)، (لەتیفە) و ٣ کچ و ٢ کوری (سالح ئەفەندی) (ضابط تجنيد) لە سەفەربرلگی و خەلقی (سلێمانی) و کچە پۆلیسێک و گەلێکی دی لەلای خوێندوویانە و هەرشتەشی سۆردەکردەوە. (فەقێ رەحمە)ی کچیشی لەلای خوێندوویە، کە بووە ژنی (حاجی قادر)ی وەستا (مەعرووف)ی سۆلدروو.

٤- (فەقێ پیرۆز) کچی (مەلا حەبیب)ی ئەحمەدی شەمامی لە گەرەکی (بایزاغا).

٥- (فەقێ حەبیب) خوشکی خەجێ دارکەر.

٦- (فەقێ گولێ) کە مێردی بە (نەجیب ئاغا) کردووە و پێکەوە بوونە فەراشی مەکتەبی کچان.

لە هەموو مزگەوتەکان دەرس دەخوێندرا، سەروەختێکی لە کۆیە (٥٠٠) فەقێ هەبووە، خواردن و نووستنی ئەمانە تەئمین کراوە.

گوتراوە: "بۆ دەرس خوێندن هاوینان (شنۆ)، زستانان (کۆ)"، هاوینان فەقێی گەرمێنێ - یەعنی دەشتی دزەییان - (کۆ)یە، بە زۆری دەچوونە (خۆشناوەتی)، لەبەر فێنکی و ئاو و دەراو و حەواندنەوە و میوەی زەریف و مەلای چاک، هەروەها دەچوونە (بالەکەتی) و دوورتریش.

(دایە خەجێ) هاوینان (فەقێ)یان بۆ دەرس خوێندن، لەگەل خۆیان دەبردە گوندی (فەقێیان)، کە لە (باکووری) (کۆیە)یە، (جەلیزادە)، فەقێیەکانیان دەبردە (چنارۆک)، هەردوولا کەپر و ساباتیان بۆ دەکردن، بێ لە دەرس پێگوتن، خواردنیشیان تەئمین دەکردن.

هاوینان فەقێ روویان لەم گوندانەی خۆشناوەتی دەکرد: ١-بێتواتە، (١٥) فەقێ، بۆلای مەلا نەبی ٢- هەرتەل، (٢٥) فەقێ (مەلا عیسا و مەلا فەتحولا ٣- زێوە (٢٠) فەقێ (مەلا عەبدوللا هەرتەلی) ٤- بێلاوە، (٢٠)فەقێ ٥- شیرێ، (١٥) فەقێ (مەلا عەبدوللای سوور) ٦- (بالیسانی) میر وسوی، (١٢) فەقێ (مەلا مستەفا فازیل) ٧- (بالیسانی) میر مەحمەری، (٢٠) فەقێ (مەلا شێخ عومەری بالیسانی) و (مەلا شێخ تەها) ٨- خەتێ، (٢٠) فەقێ ٩- شەقلاوە، (٣٠) فەقێ (شێخ مەلا تەها شەقلاوەیی) ١٠- سیساوێ (٢٠) فەقێ ١١- هیران، (١٢) فەقێ (مەلا ئیسماعیل ماویلی) ١٢- بێلینگە، (١٢) فەقێ (مەلا سەعید هەرتەلی) ١٣- سکتان، (٢٠) فەقێ (مەلا عەبدوللا مەلا ئیسماعیل ماویلی) ١٤- گەرۆتە، (١٠) فەقێ ١٥- نازەنین، (١٠) فەقێ.

مەلای باش لەبەر عیلم و (مطالعة) و دەرس گوتنەوە، خەریکی خەت خۆشی و شیعردانان نەبووە.

لە شارەکان، کە مەلای باش هەبووە، پێیان خۆش بووە و بەلکو سەریان پێیان بلند بووە، کە ئیشێکی شەرعی بهاتبا پێش، قسەی مەلایەکەی، بەسەر قسەی مەلای شوێنێکی تر سەرکەوتبا، باروبووەکی باشیان دەکردن، زۆر فەقێی گوندەکان، لە شارەکان ئیجازەی عیلمان وەردەگرت و بە جەوهەری خۆیان و یارمەتی دەست رۆیشتووەکان، ناوبانگیان پەیادەکرد و ناوی گوندەکەی خۆیان بە لەقەب بۆ دەماوە.

لە کۆیە زۆر بنەمالەی وەها هەبووە، مەلای زۆر باش و گەورە و دانەریان لێهەلکەوتووە، نەک لە ناوچەی (کۆیە)، بەلکو لە کوردستاندا و زۆر شوێنی ئیسلامی، ناویان دەرکردووە.

هەموویان (کتێبخانە)ی گەورە و کتێبی دەستنووسی زۆر کۆن و نایابیان هەبووە، بەلکو هی دەستخەتی دانەریان هەبووە، بەشی زۆری کتێبەکان لە جەنگەکانی نێوان (ئێران) و (عوسمانی) و جەنگی یەکەمی جیهانی و دەربەدەری فەوتان.

ئەم بنەمالە عیلمیانە لە کۆیە زۆر کۆنن، گەلێکیان، هەر ناوەکەیان بۆ ماوە و کەمێکیان بەناوی مەلایەتی ماون:

باپیر فەقێ ئەحمەد - دایە خەجێیی جەلیزادە، ئیمام، یوسف زاهید زادە، خەتیب، مەلا پیرۆت، عەودالانی، مەلا محەمەدی قازی، مەلا مەحموودی



موفتی)....

ئەوەی بەسەر مەلایەتی و کتێبخانەکانی شار و دێهاتی کۆیە هاتووە، بەسەر هیچ جێیەکی دیدا نەهاتووە: لە ساڵی (١٩٦٣) ئەو ژوورەی کە گۆڕی (ئۆمەری بەکری) لێیە، لە مزگەوتی (موفتی) لە ترسی شەڕ و هەرا، گەلێک کتێبی ماڵی (موفتی)یان، لەوێ شاردەوە و دەرکیان قوردا.

لە گرانی کتێبخانەی ماڵی (دایە خەجێ)یان، بە تەرازوو بەش دەکرد، بەشێکی زۆری بردرا، دەستی دزەیبان، لەبرسان کتێبیان بە یەک دوو مست گەنم دەدا.

لە زەمانی (عبدالمنعم مصرف) موتەسەریفی هەولێر، لەسەر ئارەزووی ئەم، دوو قائمقام (رەقیب حوسێنی مەلا)ی و (فائق سەبری بەگ)، کتێبێکی زۆریان لە کۆیە، چ بە هیمەت چ بە قیمەت بۆ (موتەسەریف) ناردە هەولێر.

ئەمانە گەلێ کتێبیان بە نرخێکی هەرزان فرۆشت، بەو ناوەی جێگایان لێدەگرێ و دەفەوتێن و کەسی وا نەماون، سوودیان لێوەربگرن: (حاجی مەلا عەبدولحەمید موفتی) و (مەلا سەدرددین حاجی مەلا ساڵح) و (مەلا رەئوف سەلیم ئاغا)....

(مەلا عەبدوڵلا) موئەزینی مزگەوتی (مەلا جامی) گوتی: "لەو ساڵانە یەک دوو گونیە کتێبی پەرت بوو لە مزگەوتی (مەلا حاجی) لەگەڵ (حاجی مەلا زاهیری) حەمباڵمان لێگرت و فڕێماندا رووبارێ".

حکومەتیش (٣٠٠) کتێبی دەستخەتی زۆر نایابی مەکتەبەی جەلیزادانی، بە چەند هەزار دینارێک کڕی، کتێبی وا هەبوو هەزار دیناری پتر دەێنا، زۆر کتێبخانە لە کۆیە هەبوو، وەک: (دایە خەجێ، حاجی بەکر ئاغا، جەلیزادە، شێخ مەلا تەیب، زاهید زادە، مەلا جامی کە عایدی مەلا سادق بوو، مەلا ساڵحی خەتیب، مەلا ئیمام... کە مامۆستا (مەلا تۆفیق)ی (مەلا ئیمام)ی لە کۆیە ئەمری خوای کرد، (فائیق ئەفەندی) کوڕی کتێبەکانی بردە (کەرکووک)، و لە قەڵاتێ، هەروەک بە تاڵان چووبێ، ئەوەهای لێهات!.

لەم گوندانەی قەزای کۆیە مزگەوت و مەدرەسە هەبووە و مەلای چاک و فەقێیان زۆر بووە، لە گەلێکیان نوێژی جومعەش کراوە:

(قازبەگی، کانی کوردە، بۆگد، خرابە، کانیبی، ئیلنجاغی گەورە، سێکانی، سێگردکان، ئۆمەرگونبەت، سماقوولی سەروچاوە، سماقوولی گرتک، جەلی، گۆیتەپە، هەریەکی (٥-٦) فەقێی لێبووە، بەردەسپی، جلبەسەر).

حاجی مەلا قادر سێگردکانی، بچووبا ئەم سێ گوندە: (سێگردکان، ئۆمەرگونبەت، کانی لەلە) فەقێیەکان و مەدرەسەکەش لەگەڵ ئەو دەیانگواستەوە و لە خدمەت ئەو دەیانخوێندەوە (٧-٨) فەقێی دەبوو، (مەلا سەعید ئاوماڵی) زۆرجار لە (ئۆمەرگونبەت) مەدرەسەی هەبووە، لە (گۆیتەپە)ش مامۆستا (حاجی مەلا قادر کانی دەربەندی) مەدرەسەی (١٦) فەقێیی هەبوو.

لەم چەند گوندەی دەشتی کۆیە زستانان جومعەیان لێکراوە و هاوینان کەمتر: (باغەجنێر، خرابە، شەوگێر، گۆمەشینی دەم زێیە، گۆمەشینی شێخان، ئیلنجاغی گەورە، ئۆمەرگونبەت، سێگردکان، تاڵەبانی گەورە، قازبەگی، حاجی قەڵا).

### پەراوێزەکان

١- بۆ زیاتر زانیاری لە بابەت سوختەخانە و خوێندنی مزگەوت و ژیانی فەقێیایەتی تەماشای (هەڵبژاردەی فۆلکلۆری) بکەن.

٢- رەفیقەکانی عەزیز ئاغای عەوڵا ئاغای حەوێزی لە سوختەخانەی مەلا سەعد: ئەسعەد و حەمەعەلی کوڕانی کاکە جاف غەفووری، سەمەد و سەعید کوڕانی رەسوول ئاغای غەفووری، عەبدوڵلای یاسین ئاغای غەفووری، فەقێ رەسوولی حاجی محەممەد زێزێ.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم ١٩٨٤ وەرگیراوە.

# مەدرەسەی فەقێیانی قیرژە

حاجی فاتیح دارەبەنی

قیرژە گوندێکی خنجیلانەو جوانە کەوتووتە دامێنی (سەری رەش) لە شەوی ١٥/ ٣/ ٢٠٠٣ لە گەڵ مامۆستا جەمال هەرتەلی بەخزمەت مامۆستای پایەبەرزو بلیمەت (مەلا محەمەدی قیرژەیی) گەیشتین لە هەولێر لە گەڕەکی مەلایان.

نیازو نیەتم لەم سەردانە ئەوەبوو، کە مەدرەسەی ناوبراو، کە جەنابی مامۆستا بەرێوەی بووە لە زاری خۆی باسەکە گوێبیست بین، لە راستیدا بە دیتنی ئەم زانایە گەورەو پیرۆزە نازانم چۆن وا دڵم خۆش بوو. (پاکی و گەورەیی هەر بۆ خوا) کە بەرەکەتی ئەم جۆرە پیاوانە هەر لە یەکەم چرکە، هەستی پێدەکەی، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم جۆرە زاتانە ئەوەندە خزمەتی مەدرەسەی قورئان و ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان کردووە هەتا دەمرن رووناکی دەم و چاوو گفتوگۆیان رۆژ لە رۆژ دڵگیرترو جوانتر دەبێت، وەنەبێ ئەمە یەکەم جاربێ، کە بە خزمەت ئەم مامۆستا بەرێزە گەیشتبم، ئەوکاتی کە لە سێبیرانی گەورە بوو چەند جار بە خزمەتی گەیشتبووم.

### مەلا محەمەد قیرژەیی

مەلا محەمەد قیرژەیی کوڕی فەقێ مستەفای کوڕی مەلا محەمەدی قیرژەییە، لە عەشیرەتی خۆشناون، لە ساڵی ١٩٠٤ لە گوندی قیرژە چاوی بە دنیا هەڵێناوە، لە تەمەنی حەوت ساڵی دەچێتە گوندی (قەڵاسنج) لە هەمان ناوچە، لای مامۆستای (مەلا شێخ حوسێنی سوورچی) دەخوێنێ، هەر لە منداڵییەوە مامۆستا زیرەکی پێوە دیاربووە، بەماوەیەکی کەم خەتمی قورئانی پیرۆز دەکات، چەند کتێبێکی هوردیش دەخوێنێ، پاشان دەچێتە گوندی گڕاو لای مەلا ئەبوبەکری گڕاوی دەخوێنێ، ماوەیەکیش لەوێ دەمێنێتەوە، پاشان دەچێتە گوندی (بێلینگە) کە لە تەنیشت هیرانە، لەوێ لای مەلا مەجیدی هەرتەلی دەخوێنێ، پاش ماوەیەک، چەند کتێبێک دەخوێنێ، پاشان دەچێتە گوندی (سکتان) لای مەلا عەبدوڵڵای ماویلیانی دەخوێنێ، مامۆستا هەوڵی ئەوەی داوە لە هەموو مەدرەسە پێشکەوتووەکانی سەردەم بخوێنێ، پاشان دەچێتە شارۆچکەی ئاکرێ لای مەلا محەمەدی عەبدولخالق دەخوێنێ، پاشان دەگەڕێتەوە شاری هەولێر لای شێخ مستەفای نەقشبەندی دەخوێنێ، مامۆستا بەردەوام دەبێ لە خوێندن تا لە ساڵی ١٩٣٣ لە ئاهەنگێکی زۆر شایستە لە لایەن شێخ مستەفای نەقشبەندی ئیجازەی مەلایەتی پێدەدرێ، مامۆستا پاش وەرگرتنی بروانامەی مەلایەتی دەگەڕێتەوە گوندی قیرژە، مامۆستا (ژن) دەخوازێ لە گوندی باویان، پاش گواستنەوە راستەوخۆ مەدرەسە دەکاتەوە زیاتر لە ١٥ ساڵ بەردەوام دەبێت، لەم ماوەیەدا مامۆستا هیچ دەمێک لە ١٠ فەقێ و موستەعیدی کەمتر نەبووە، پاشان، قیرژە بەجێدێڵێ و دەچێتە گوندی (سێبیرانی گەورە) ی سەربە شارۆچکەی عەنکاوە، لەوێش زیاتر لە ٢٠ ساڵ ماوەتەوەو بەردەوام بووە لە دەرس گوتنەوە، لەم ماوە دوورو درێژەی هەردوو مەدرەسە چەندین مەلای چاک و موستەعیدی پێگەیاندووە، لە بەرپیری

ناوی هەموو فەقێ و موستەعیدەکانی بەبیر نەهاتەوە، هەر ئەوەندەم نووسیوە، کە مامۆستا یادی کردن:

**١- مەلا ئەبوبەکری قیرژەیی**
**٢- مەلا ئیسماعیلی خەتیبیان**
**٣- مەلا عەبدولرەحمانی ماستاوەیی**
**٤- مەلا سولەیمانی قیرژەیی**
**٥- مەلا تەها باویان**
**٦- مەلا بەهرام نۆغەرانی**
**٧- مەلا کەریمی بەرگێلی**
**٨- مەلا زیادی زراری**
**٩- مەلا خەلیلی سەیدان**
**١٠- مەلا عوسمانی ئاشۆکان**
**١١- مەلا ئەنوەری گردەچالی**

لە کۆتاییدا مامۆستا فەرمووی لە ژیانی فەقێیەتی و موستەعیدی و هەتا ئیجازەشمان وەرگرت چوار هاورێی زۆر خۆشەویستم هەبوو، کە لە خوێندن و لە تەمەن و لە زیرەکی و هەتا لە بەڕێوەبردنی مەدرەسە قەرەبەقەرەی یەکتری دەڕۆیشتین، ئەوانیش ئەمانەن:

**١- مەلا محەمەدی هەرتەلی**
**٢- مەلا ئەحمەدی گەزنەیی**
**٣- مەلا تەهای کۆڕێ**
**٤- مەلا خدری دارەبەنی**

هەتا هەتایەش لە بیریان ناکەم.

### مەلا محەمەدی هەرتەلی

مەلا محەمەدی هەرتەلی کوڕی مەلا قادری کوڕی مەلا عەبدوڵڵای هەرتەلییە لە ساڵی ١٩١٠ لە بنەماڵەیەکی ئایینپەروەر لە گوندی هەرتەل لە دایک بووە. لە شەش ساڵییەوە لای باوکی دەستی بە خوێندن کردووە پاش خەتمی قورئانی پیرۆز و چەند کتێبێکی هورد، دەچێتە گوندی وەرتێ لای مامۆستا شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مەلا خدری وەرتێ خوێندوویەتی، پاشان چۆتە گوندی داروسەلام لەوێش ماوەیەک خوێندوویەتی، پاشان دەچێتە گوندی (زێوە) لای مەلا عەبدوڵڵای کوڕی مەلا عەبدولعەزیزی هەرتەلی خوێندووە، پاشان چۆتە شاری هەولێر لە مزگەوتی قادر دەباغ لای مەلا حەمەدەمین کونەفلوسەی خوێندووە، پاشان چۆتە شاری کەرکووک لە خانەقای سەید ئەحمەدی خوێندووە، پاشان دەچێتە شاری کۆیە بە نیازی ئەوەی لای مەلا محەمەدی جەلی زادە بخوێنێ، بەڵام جێگای نابێتەوە دەچێتە خزمەت مامۆستا بەهائەدین هەر لە کۆیە، مامۆستا بەردەوام دەبێ هەتا ئیجازەی مەلایەتی لە خزمەت مامۆستا بەهائەدین پێدەدرێ، مامۆستا محەمەد دەیفەرموو: کاتێ خۆی کە لە کۆیەم دەخوێند هەموو رۆژێ پاش نوێژی عەسران مەلا گەورەی کۆیە حەدیسێکی تەفسیر دەکرد و دەیفەرموو: کتێبێکی دادەنا هەمووی پەڕپەڕبوو، پەڕەکی هەڵدەگرت، حەدیسێکی دەخوێندەوە، دایدەناوە سەرکتێبەکە، ئینجا لەبەر تەفسیری دەکرد، هەرچی ئایەت و حەدیسی دیکە هەبایە پەیوەندی بەو حەدیسە هەبوایە دەیگوت، بە بێ ئەوەی تەماشای سەعات بکات یەک سەعاتی دەخایاند بە بێ کەم و زیاد، مامۆستا هەرتەلی دەیگوت: کردبوومە تەجرەبە هەموو جارێ وتارەکەی یەک سەعات بوو بەبێ ئەوەی دەقیقەیەک جیاوازی هەبێ، ئەوەشم بە کەرامەت دادەنا بۆ مەلای گەورە.

هەروەها مامۆستا هەرتەلی دیفەرموو: چەندم سوود لە خوێندنەوەکەی مامۆستا بەهائەدین دەدیت، هێشتا لەو سەعاتەی کە گوێم لە وتاری مەلای گەورە دەگرت پترم سوود دەدیت، ئەوەندە زاناو فەیلەسوف بوو.

بەڵێ شاعیر حاجی قادری کۆیی لە کاغەزێکی کە لە ئەستەمبوڵ بۆ کۆیەی نووسیوە دەڵێ:

**سـلاوێکە دیاریمان دیارە**
**لەدارو بەردی ئەو دارو دیارە**
**خوسوسەن ئاستانەی ئەرجومەندی**
**جەلی زادێکە (عەبدوڵلا) ئەفەندی**
**چ عەبدوڵلا عوبەیدیلاهی ئەحرار**
**موسەغغەر بەندەیێکی زەرخریدار**
**زەکاوەت کانیێکە تۆی دەراوی**
**خەتی ئیقراری نووسیوە زەهاوی**

هەروەها بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

**بەغەیری جەددی ئێوە کێ هە زانا**
**لە کوردستان ئەساسی عیلمی دانا**

مامۆستا هەرتەلی پاش وەرگرتنی ئیجازە دەبێتە مەلای گوندی (وەرتێ) ماوەیەک لەوێ دەمێنێتەوە، فەقێ و موستەعیدێکی زۆری دەبێت، پاشان دەچێتە گوندی (دەراش) کە نزیکە لە بالیسان، لەوێش مەدرەسەکەی بەردەوام دەبێت، پاش چەند ساڵێک دەگەڕێتەوە هەرتەل، مامۆستا لە هەرتەل مەلایەتی و وتارخوێنی ناکات، بەڵام لە تەنیشت ماڵەکەی خۆی حوجرەیەکی گەورە دروست دەکات، هیچ دەمێک لە دە هەتا پانزە فەقێ و موستەعیدی کەمتر نەبووە، مامۆستا کاسبی کردووە و خەڵکی خێرخوازیش، لەبەرئەوەی مەدرەسەی بەڕێوەبردووە یارمەتیان داوە، مامۆستا یەکجار زیرەک و پسپۆڕ بووە لە دەرس گووتنەوەکەی، ئیجازەی مامۆستا زۆر (موعتەبەر) بووە لە ناو مامۆستاکانی ئەو سەردەم. ئەوانەی کە لە یاد مابن لە خزمەت مامۆستا ئیجازەیان وەرگرتبێ ئەمانەن:

**١- مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ئیبراهیمی خەتێ**
**٢- مەلا عەلی هەرمکی**
**٣- مەلا عەبدوڵڵای زیخان**
**٤- مەلا خالیدی مەلەکی**
**٥- مەلا سادقی خەتێ**
**٦- مەلا عەبدولباقی کوڕی مەلا ئیبراهیم هەرتەلی**
**٧- مەلا عەبدولڕەحمانی کوڕی خۆی**
**٨- مەلا جەمالی کوڕی خۆی**

هەروەها ئەوانەی ماوەی موستەعیدیان لای مامۆستا خوێندووە ئەمانەن:

**١- مەلا عیزەددین سەلانی**
**٢- مەلا شێخ فەرخ هەرتەلی**
**٣- مەلا عەبدولڕەحیم ئێرانی**
**٤- مەلا ئیبراهیم ئێرانی**
**٥- مەلا ئەحمەد ڕۆستایی**
**٦- مەلا ئیبراهیم نێوەیی**
**٧- مەلا مەزهەری شێخ تاهیر**
**٨- مەلا عەلی خەتێ**

بێگومان بەدەیان موستەعیدی دیکەی هەبوون، بەڵام ناوەکان لە یادکراون. هەروەها مامۆستا لە سەرەتای شەستەکان فەرزی حەجی کردووە، لە ساڵی ١٩٧١مامۆستا هەرتەل بەجێدێڵێ دەچێتە شاری هەولێرو دەبێتە ئیمام و وتارخوێنی مزگەوتی گەورەی بازاڕ، لەوێش لە دەرس گووتنەوە بەردەوام بووە، مامۆستا هەردەم سەرچاوەیەک بووە بۆ هەموو مامۆستایانی شاری هەولێر لەبارەی گیروگرفتی (شەرعی).

مامۆستا لە ساڵی ١٩٨٧ تووشی نەخۆشی (شەلەل) بوو، بۆیە لە مزگەوتی بازاڕ گواستییەوە بۆ مزگەوتی (زەکیە خان)، کە ناسراوە بە مزگەوتی حەیدەراغا، لە تەنیشت ماڵەکەیان بوو، مامۆستا بە نەخۆشیش هەر بەرەکەتێک بوو بۆ گەڕەکی سەلاحەدین، مامۆستا پیاوەکی زۆر هێمن و ڕووخۆش و هەیبەتێکی تایبەتی هەبوو، کە دەکەوتە ناو قسەو باسان نقوومی دنیایەکی دیکە دەبووی، وەکو بڵێی مامۆستا لە گەڵت هاوتەمەنە، قسەکانی هەمووی سەرچاوەی باوەڕپێکراوی هەبوو، کاریگەربوون، بە قسەکانی زۆر هەستت بە دڵفرەوانی دەکرد، زۆر جاران لە حوجرەی مزگەوت یان لە ماڵێ لە گەڵ مامۆستا دادەنیشتم وەها دڵخۆش دەبووم، کە هەڵدەستام دەگەیشتمە کۆڵان چۆن یەکێک لە ناو دارستانێکی زۆر جوان چڕوپڕ کە سەروبنی دیارنەبێ لە گەورەیی، سەرت سوڕدەمێنێ نەزانی تەماشای کامەلا بکەی، لە هێکرا بگەیە چیلەی دەرچوونی دارستانەکە ئا ئەوها هەستت بە مەجلیسی مامۆستا دەکرد.

لە ١٣/ ١٠/ ١٩٨٩ ڕۆژی هەینی کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ ئەمری خودای بەجێگەیاندو لە گۆڕستانی بێرکۆت نێژراوە.

* لە کۆتاییدا تێبینیەک هەیە مامۆستا جەمال دەڵێ لە مەدرەسەکانی کە باوکم لێیخوێندووە، لەو گوندە بۆ ئەو گوندە لەوانەیە پاش و پێش هەبێ لە

ریزکردنی، هەرچەندە هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ.

**مەلا ئەحمەدی گەزنەیی**

مەلا ئەحمەد کوڕی سۆفی مستەفای کوڕی مەلا قادری کوڕی مەلا مەولوودی کوڕی مەلا ئیبراهیمە، لە بنەماڵەیەکی ئاینپەروەر لە گوندی گەزنە لە ساڵی ۱۹۰۳ چاوی بە دنیا هەڵێناوە، هەر لەوێش لە تەمەنی حەوت ساڵیدا دەچێتە حوجرەی فەقێیان، کە ئەوکات مەلا عەلی قەڵاسنجی لە گەزنەبووە، پاش خەتمی قورئانی پیرۆز دەچێتە گوندی بەحرکە، لای مەلا عوسمانی بەحرکەیی دەخوێنێ، پاشان دەچێتە گوندی عەوێنە لای مەلا عوسمانی عەوێنەیی دەخوێنێ، پاش ماوەیەک ئەوێش بەجێدێڵێ دەچێتە شارۆچکەی پردێ لای (مەلا ئەحمەدی رەش) دەخوێنێ، پاشان روودەکاتە ناوچەی خۆشناوەتی، مەدرەسە پێشکەوتووەکانی خۆشناوەتی زۆربەیان بەسەردەکاتەوە، پاشان روودەکاتە شاری هەولێر لە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مەلا حەمەدەمینی کونەفلووسەیی دەخوێنێ، مامۆستا بەردەوام دەبێ تا لە ئاهەنگێکی زۆر شایستە ئیجازەی مەلایەتی بەدەست دێنێ، مامۆستا دەبێتە مەلا لە گوندی شاوێسی بن هەولێر، راستەوخۆش مەدرەسە دەکاتەوە، شەش ساڵ دەمێنێتەوە، لەم ماوەیەدا بەدەیان فەقێ و موستەعیدی پێگەیاندووە ئەوانەی لە یادماین ئەوانەن:

**١- مەلا جەمیلی کاوانی**
**٢- مەلا عەبدوڵڵای سێبەردانی**
**٣- مەلا عەبدولڕەحیمی کۆیی**
**٤- مەلا ئیبراهیمی بێلاویی**

پاشان مامۆستا، شاوێس بەجێدێڵێ و دەچێتە گوندی (پێمەڕەبڕ)، شەش ساڵیش لەوێ دەمێنێتەوە، بە دەیان فەقێ و موستەعیدی دیکەی پێگەیاندووە، لە ساڵی ۱۹٤۷ دەگەڕێتەوە گوندی گەزنە. هیچ دەمێک لە دە هەتا پانزە فەقێ و موستەعیدی کەمتری نەبووە، لە ساڵی ۱۹٥۰ مامۆستا فەرزی حەجی کردووە، مامۆستا بەردەوام بووە لە مەدرەسەکەی هەتا ساڵی ۱۹۸۰ لەو (۳۳) ساڵەدا بەبێ حیساب فەقێ و موستەعیدی پێگەیاندووە، هێندێک لەوانەی لە یادماین ئەمانەن:

**١- مەلا عەبدولڕەحمانی گردجووتیاری**
**٢- مەلا عوسمانی ئاشۆکەیی**
**٣- مەلا جەمیل گەزنەیی**
**٤- مەلا ساڵح سەیدانی**
**٥- مەلا مەجید.....**
**٦- مەلا نەبی.......**
**٧- مەلا سەید محێدین**
**٨- مەلا سەید عەبدوڵڵای قەڵادگەیی**
**٩- مەلا سەید حەمەدەمینی گەزنەیی**
**١٠- مەلا تاهیری گەزنەیی**
**١١- مەلا شەفیع کۆیی**
**١٢- مەلا عەولای گردەشێری**
**١٣- مەلا ئەحمەد حەمەدەمین دارەبەنی**
**١٤- مەلا حامد ئیبراهیم دارەبەنی**
**١٥- مەلا یاسین گردەشێری**
**١٦- مەلا عومەر گردەشێری**
**١٧- مەلا ئیسماعیل گەزنەیی**
**١٨- مەلا ئیسماعیل بەرحوشتری**
**١٩- مەلا حەمەدەمین قەرەنی**
**٢٠- مەلا محەمەدی ساوێسی**
**٢١- مەلا خدری مەکردانی**

مامۆستا بێجگە لە دەرس گوتنەوە هەردەم ئیرشادو وتارو ئامۆژگاری بەردەوامی هەبووە. (حاجی حەسەن دارەبەنی)، کە ئێستا تەمەنی ۷۰ ساڵە دەیگوت: زانیاری مامۆستا، بەحری بێ بن بوو، بەڵگەشم ئەوەیە هەر بڕیارێکی مامۆستا بیگوتبا مەلا نەبوو بڵێ ئەوها نییە!

مامۆستا پیاوێکی رووخۆشی، موسڵمان دۆست و میوان دۆست بوو. هەر گیروگرفتەکی شەرعی هەبایە لەو ناوچەیە حەلی دەکرد، هەر گرژی و شەڕو ناخۆشییەک هەبوایە لە نێوان دوو بەرەبابان، مادام مامۆستا قسەی لێبکردبایە هیچ کەسێک بۆی نەبوو

لام و جیمی بکا، مامۆستا سێبەری هەبوو بۆ هەموو ناوچەی بەرانیان.

مامۆستا لە ساڵی ۱۹۸۰ لە بەر پیری و بێتاقەتی و نەخۆشی دەستی لە مەدرەسە هەڵگرت کەوتە ماڵێ، سەرەنجام لە ٤/ ۳/ ۱۹۸۹ لە ڕێکەوتی ۱۷ی ڕەمەزان بە یەکجاری ماڵئاوایی لە جیهان کرد، لە گۆڕستانی گەزنە نێژراوە.

**مەلا تەهای کۆڕێ**

مەلا تەها کوڕی مەلا مستەفای کوڕی مەلا سولەیمانە لە بنەماڵەی قازی داودی (دێرێ) یە. ئەم زاتە لە بنەماڵەیەکی ئایینپەروەر لە گوندی (دارەڕێ)ی سەربە ناحیەی بەردەڕەش لە ساڵی ۱۹۱۰ چاوی بە دنیا هەڵێناوە، لە حەوت ساڵی چووەتە حوجرەی فەقێیان لە گوندی ئوسوی مەریان لای مەلا یوسف دەستی بە خوێندن کردووە، پاشان چووەتە گوندی هەبابان و زۆر لەوێ ماوەتەوە، پاشان دەچێتە گوندی قەڵاسنج لای مەلا شێخ حوسێنی سوورچی خوێندووە، پاشان چووەتە گوندی هەرتەل لای مەلا مەجیدی هەرتەلی خوێندووە، پاشان چووەتە قەزای ئاکرێ لای مەلا (محەمەد عەبدولخالق)ی خوێندووە، پاشان چووەتە گوندی شۆشێ، پاش ماوەیەک دەچێتە گوندی ئاشگە لای مەلا محەمەدی ئاشگەیی دەخوێنێ، مامۆستا زۆربەی مەدرەسەکانی خۆشناوەتی بەسەردەکاتەوە، پاشان دەچێتە قەزای شەقڵاوە لای مەلا تەهای شەقڵاوەیی دەخوێنێ، بەردەوام دەبێ تاکو ئیجازەی مەلایەتی بەدەست دێنێ.

مامۆستا کە ئیجازەی وەردەگرێ لە ساڵی ۱۹۳۳ دەبێتە مەلای کۆڕێ، هەر ئەوکاتیش مەدرەسە دەکاتەوە، هیچ دەمێک لە پانزە موستەعیدو فەقێی کەمتر نەبووە، بە سەدان فەقێ و موستەعید لایان خوێندووە، بەداخەوە ئەوکات ناوەکان تۆمارنەکراون، ئەوەی لە یادمابێ ئەوان نووسراون، لە ساڵی ۱۹٦۳ فەرزی حەجی کردووە.

مامۆستا لە دەرس گوتنەوە هەتا کۆتایی ساڵی ۱۹۸۹ بەردەوام بووە، لە بەر پیری و بێتاقەتی و نەخۆشی لە ماڵەوە دەکەوێ تا لە ڕۆژی دووشەممەی ڕێکەوتی ۱٦/ ۳/ ۱۹۹۳ کۆچی دوایی کردووە.

لە هەولێر لە گۆڕستانی شێخ ئەحمەد بە خاک سپێردراوە. ئەو مەلایانەی لای ئەم زاتە ئیجازەیان پێدراوە ئەوانەن:

**۱- مەلا محەممەدی هەرِەشی**
**۲- مەلا ئیبراهیمی دینارتەیی**
**۳- مەلا شێخولئیسلامی شۆشەیی**

**ئەوانەی بە موستەعیدی لایان خوێندووە ئەوانەن:**

**۱- مەلا ئەحمەد ئاکرەیی**
**۲- مەلا ئەنوەری گردەچاڵی**
**۳- مەلا خدری مەکردانی**
**٤- مەلا سەید محێدین**
**٥- مەلا سەید عەبدوڵلای قەلادگەیی**
**٦- مەلا جەباری زەرگەزەوی**
**۷- مەلا بیلالی گردیاوان**
**۸- مەلا مەجیدی کەلەکی**
**۹- مەلا سابیر گەرۆتەیی**
**۱۰- مەلا عوسمانی شەقلاوەیی**
**۱۱- مەلا عەزیزی شەقلاوەیی**
**۱۲- مەلا رەشیدی هەرکی**

لەم بابەتە سوودمان لەم مامۆستا بەرێزانە وەرگرتووە:

**۱- د. محەممەد گەزنەیی**
**۲- محەممەد دەشتی**
**۳- عەبدوڵلا مەلا عومەر**
**٤- مستەفا مەلا تەها**
**٥- جەمال هەرتەلی**
**٦- عوسمان مەلا خدر مەکردانی**

ئەم بابەتە لە گۆڤاری هەولێر / ژمارە ۱٥ ی هاوینی ساڵی ۲۰۰۲ وەرگیراوە



# ئاماری دانیشتووانی قەڵای هەولێر - ١٩٢٢ سەرای - تەکییە - تۆپخانە

تاریق جامباز و نەژاد بەرزنجی

**بۆچی...؟ ئاماری دانیشتووانی قـەڵای هەولێـر لە سـاڵی ١٩٢٢ دا ئەنجام درا؟**

ئەنجامدانی سەرژمێریی بۆ زانینی ژمـارەی دانیـشـتـووانی وڵاتێک یا هەرێمـێـکە، بۆ زانینی ڕێژەی ژن و پیـاو و منداڵ و چەند سەر خێـزان لە مـاڵێکدا دەژین و تەمەنیـان چەندە و جـۆری کـاریـان چیـیـە و پلەی ڕۆشنبیـرییـان لە چ ئاستێکدایە و لە هەمـوو دنیا و لە گشت سـەرژمێـر و ئامارێکدا ناوی تێکڕای دانیشتووان تۆمار دەکرێت، بەڵام ئەو ئامارەی کە بۆ دانیـشـتـووانی قـەڵای هەولێـر لە ساڵی ١٩٢٢ ئەنجـام دراوە (تەنیـا و تەنیـا) بۆ نێـرینەکـان بووە. دەنا یەک تاقـە مـێـینەشی نەگـرتۆتەوە، بۆیە و لەبەرئەوەی لە بارەی ئەم ئامـاردوە نووسـینێـکی وا بڵاو نەکـراوەتەوە، بۆیـە داوام لـە هـاوکـارم (نـەژاد بەرزنجی) مـامـی هۆشـمـەندی بیـرتـیـژ کـرد، گـەرچی لە دایکبـووی قـەڵای هەولێـری ١٩٢٠ە، بەڵام هێـشـتـا چوست و چالاکە، کە ئەم پێشنیـازەم ئاراسـتـە کـرد بە دڵێکی گـوشـادەوە ئامـادەیی خۆی دەربڕی، کە دەبێ ئەم ئامـارە (فـەرامـۆش کـراوە) پێکەوە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکەین و ڕای بەڕێزیان لە بارەی ئامارەکە ئەمەیە: ئەگەر سەرنج بدەینە ئەم ئامارە بۆمان دەردەکەوێ، کـە بۆ (مـەبەسـتـێـکی تایبـەتی کـراوە، نەک بۆ ژمـاردنی دانیشتووانی کوردستان لە عێراقدا، چونکە نووسـراوەکـە تەنانەت بۆ نێـرینەیە- مـێـینەکـانی فـەرامـۆش کردووە، مەلیک فەیسەلی یەکەم لە ڕۆژی ٢٣ی ئاب لە سـاڵی ١٩٢١ز هاتە سەر حوکم لە عێراق، ئەگەر بۆ مەبەستی ژمارەی هاووڵاتیان بێ، بۆ ناوی ئافـرەت و کـچـان فـەرامـۆش دەکـرا؟ مـەزەندە کـە دوورە لەم مـەبەسـتـەوە. شـای شکۆدار شێخ

مەحموود-ی حەفید لە سالی ١٩٢١ز شای کوردستان بوو. رۆژنامەی (رۆژی کوردستان) لە ١٥ی تشرینی دووەم، ژمارەی (١)ی دەرچوو. لەم رۆژنامەیەدا لە چەند لاپەڕەیەکی ژمارەکانیدا چەند لیستەیەک بە ناوی ئەم کەسانە نووسراوە، کە (تبرعات)یان داوەتە حکومەتی کوردستان-ی ئەوسا کە بۆ مەبەستی یارمەتیدانی حکومەت، ئەوانەی جەنگاوەر نین، بەلام عەشیرەتەکانی ئەم هەرێمەی ئەوساکە بە جەنگاوەر دانراون، هەروەکو لە زۆر سەرچاواندا، ئەم شتە نووسراوە ئەم بۆچوونەش لەبەر ئەمەیە، کە ئامارەکە تەنانەت بۆ پیاوانە، واتە بۆ نێرینەکانە.

ئەم ئامارە زۆر خانەوادەی فەرامۆش کردووە، وەک خانەوادەی (حاجی سەعید جامباز و سەید حوسێن-ی بەرزنجی باوکی نەژاد بەرزنجی).

وا دیارە ئەوانەی بەو کارە هەلساون خەلکی ئەم ناوە نەبووبن، ناشارەزا بووبن لە خەلکەکەی. ئەم جۆرە (تبرعات)ە لە شاری (کەرکووک)یش کراوە بە حیسابی (رووپیە)، ئەم پارەیە هیندییە، کە لە کاتی داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەوە لە پاش رووخانی دەولەتی عوسمانی هێنراوەتەوە عێراق، ئەم پارەیە پاش سالی ١٩٣١ز گۆڕا بە پارەی عێراقی، کە لە کۆلانەکانی هەولێر دەگەڕان و دەیانگوت: ئانە بە ئانە، روپیە بە درهەم، پوڵ بە فلوس، نۆت بە دینار، ئەو کاتە ئێمە مندال بووین، ئێمە ئەم



بۆچوونە پەسەند دەکەین، چونکە لە (تەبیعەتی ئامارەکەدا ئەم شتە رەچاو دەکرێت). لە بەراییدا زۆرمان پرسی ئەم و ئەو کرد بۆ زانینی هۆکاری ئەنجامدانی ئەم ئامارە و سەردانی بە سالاچووانیشمان کرد، بەلام بەداخەوە وەلامێکی وایان پێ نەبوو، کە تینوویەتیمان بشکێنێت، دلنیابین، کە پڕ بە پێستێتی و دواتر پرسی ئەو کەسانەمان کرد، کە پسپۆڕن و بڕوانامەی بالایان لە بارەی هەولێرەوە وەرگرتووە، ئەوانیش وەلامیان لا نەبوو، بۆیە بە هەموو ئەو سەرچاوانەی کە لە بارەی هەولێرەوەن بە تایبەتی قەلای هەولێردا چووینەوە، لەوانیش وەلامان دەست نەکەوت، بەلام لە هەولەکانمان بەردەوام بووین تاکو لە رۆژنامەی (السەباح الجدید) ژ ١٦٤- لە ١١/ ١١/ ٢٠٠٤ لە لاپەڕەی حەفتەمیدا وەلامی پرسیاری بۆچی و لەبەرچی ئاماری دانیشتووانی قەلای هەولێری سالی ١٩٢٢ دراوەتەوە تێیدا هاتووە: (هەلبژاردنەکانی سالی ١٩٢٢ تەنیا بۆ نێرینەکانە)، کە ئەم ناونیشانەم بینی بە پەرۆشەوە وتارەکەم چەندین جار خوێندەوە، کە ئەم ئامارە بۆ ئەنجامدانی یەکەمین هەلبژاردنی ئەندامانی پەرلەمانی عێراق بووە، کە ژمارەی ئەندامانی پەرلەمان (١٠٠) ئەندام بوو و ئەوسا عێراق لە (١٢) لیوا (پارێزگا) پێکدەهات و تەنیا نێرینەکان ئەوانەی تەمەنی یاساییان تەواوە توانیویانە و مافی خۆ پالاوتن و دەنگدانیان هەبووە، چونکە مێینەکان ئەو مافەیان نەبووە بۆ ئەنجامدانی هەلبژاردنەکەش جگە لە لیواکانی، ئەوا هەموو قەزاکانیش لیژنەیەکیان تێدا پێکدەهێنرا بە سەرۆکایەتی سەرۆکی شارەوانییەکان و مەلایەک و قەشەیەک و حاخامێک و موختارەکان و سێ لە کەسایەتییەکان و پاش ئەوەی رێنمایی تایبەتیان لەم بارەیەوە بۆ دەهات تاکو لەناوی پالێوراوان وردبنەوە و هەروەها لیژنەیەکی پشکنینی لە پێنج تا دە ئەندام بە گوێرەی فراوانی و قەبارەی قەزایەکە

بۆ وردبینی لە لیستەکان و دەقەکانی بنچینەی دەکۆڵییەوە.

ئاماری دانیشتووانی قەڵای هەولێر ساڵی ١٩٢٢ لە سێ گەڕەکی قەڵا ئەنجام دراوە، چونکە قەڵا هەر لە سێ گەڕەک پێکهاتووە: گەڕەکی سەرا (١٧٦ ماڵ) و گەڕەکی تەکیە (٢١٢ ماڵ) و گەڕەکی تۆپخانە (١٣٢ ماڵ)، سەرجەمی دانیشتووانی هەرسێ گەڕەکەکە (٥٢٠ ماڵە) واتە دانیشتووانی قەڵای هەولێر لە (٥٢٠ ماڵ) پێکدەهات و گەر گریمان هەر ماڵی شەش کەس بوو بێ ئەوا ژمارەی دانیشتووان تێکڕا لە قەڵا (٣٠٢٠ کەس بووە) و لەم ژمارەدا ناوی سەرۆک خێزان و جۆری کار و پیشەیان و تەمەنیان چەندە بە ساڵی هیجری (کۆچی) نووسراوە و ئێمە بە پێویستمان زانی، کە ساڵی هیجری بکەینە ساڵی زایینی تاکو نەوەکانی ئیمڕۆ و ئایندەش یەکسەر ساڵەکانی لە دایکبوون بزانن و چەندانیشیان سامانداری و دەوڵەمەند بوون و جگە لە ژمارەیەکی دیاریکراو نەبێ (کرێچین) دەنا ئەوانی دیکە هەر هەموویان خانووی خۆیان بووە و ناوی مووچەخۆرەکان میریشی تێدایە و تەنیا سێ کەسیان (دوو عارەب و هیندییەک) بیانی بوون و گەر لە ناوی پیشە و کارەکانیان وردبینەوە کارتێکردنی عوسمانییەکان بە روونی لەسەر ئامارەکە دیارە، چونکە (٤٢٠) ساڵ حوکمڕانیان کردووە و ئامارەکە بە زمانی عەرەبییە و هەندێ کەس ساڵی لە دایکبوونیان نەنووسرابوو لە ساڵی ئامارەکە پتر بوو، بۆیە خاڵمان لە جیاتی دانا و قەڵای هەولێر لە شێوەی بازنەییە و رووبەری ١٠٢ - ١٩٠ مەتر چوارگۆشەیە و بەرزایی نزیکەی ٣٠ مەتر دەبێ و مێژووی قەڵای هەولێر بۆ پتر لە پێنج هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە.

**لەبارەی ئەوسای هەولێردا**

**بەشی یەکەم:**

١. سەردەتای سییەکان (مەبەست نەژاد بەرزنجی) لە تەمەنی ١٠ - ١٢ ساڵیدا بووم، چاوم بە چەند کرێکارێکی کارەبا کەوت، وایەری تەزووی کارەبایان لە دیواری کۆڵانەکانی قەڵا دەبەستا بۆ ئەوەی کارەبا بدەنە کۆڵانەکان و هاشم چەلەبی دەباغیان لەگەڵدا بوو، چاوی بە من کەوت وتی سەید تۆزێ ئاوی ساردمان بۆ بێنە. مانگەکە حوزەیران بوو، منیش ئاوی ساردم بە بەفری چیایی بۆیان هێنا. کاتەکە نیوەڕۆ بوو، من هەموو رۆژ دەچوومە دەرگای قەڵا بەفری چیام بۆ ماستاو دەکڕی....

٢. ئەوسا بەشەو لەبەر هاتوچۆی خەڵک فانووسیان هەڵدەواسییە دیواران. پێش ئەوەی مەغریب بانگ بدا ئەو چرایانە پێدەکران، هەڵدەواسرانە دیوار. بەینی هەر چرا و چرایەک بیست یان سی هەنگاوێک دەبوو. ئەو چرایانە کارمەندێکی شارەوانی هەموو ئێواران دەیهێنا لەسەر شانی لەگەڵ دارێکی دوو گوێ بۆ هەڵواسین، بەبیرم دێ جارێکیان مەلا تەها ئاغای (ساڵح) ئاغای چاوشلی مامی بابی هادی چاوشلی چرایەکی بە دەستەوە بوو دەچووە دیوەخانەی حاجی رەشید ئاغا پێش ئەوەی کارەبا سەرهەڵبدا، دەیانگوت: عەلی دۆغرەمەچی لە تورکیاوە (٢٥٠) دانەی هێنابوو بۆ شارەوانی و فانووسەکە ئەڵمانی بوو.

٣. ئەحمەد چەلەبی دەباغ لە ١٩٣٠ز لەسەر ئەرکی خۆی کارەبای هێنا هەولێر، بەو مەرجەی هەتا ١٥ ساڵ بەرهەمەکەی بۆ خۆی بێ، لە پاشان ببێتە موڵکی شارەوانی.

٤. کۆڵانەکانی قەڵا تەنگەبەر بوون لە زستاناندا دەبووە قوڕ و چڵپاو. ئەحمەد عوسمان لەمبەر و لەوبەر سەکۆی دروست کرد. ناوەندەکەشی بۆ ئاوەڕۆ بوو. ئەحمەد عوسمان لە ١٩١٨ - ١٩٢٠ سەرۆک شارەوانی بوو. ئەو سەکۆیانەی لە کۆڵانەکانی قەڵا دروست کرد. لە پاشان کە هەولێر کرا بە پارێزگا، ئەحمەد عوسمان یەکەم موتەسەریف/ پارێزگار بوو لە ساڵی ١٩٢٢-١٩٢٧ز سەکۆوەکانی کۆڵانەکانی قەڵای لابرد، چونکە ئۆتۆمبێل هاتە هەولێر بۆ یەکەم جار. جاران ئەوانەی سامانداربوون هەر یەکەیان ئەسپێکی زینداری هەبووە بۆ هاتوچۆکردن هەتا خوالێخۆشبوو ئیبراهیم قانلی باپیری جەلیل خەیات کەرێکی گەورەی خەساوی سپی هەبوو لەبەر دەرگاکەی ماڵی دەبەستەوە، هەموو رۆژێک دەچووە دوکانی (خەلیل) کوڕی بەقاڵ کە باوکی جەلیل خەیات و عومەر ئاغای ئەسعەدی و یووسف قازی-یش بە هەردووکیان ئەسپێکی زینداریان هەبوو. یووسف ئەفەندی باوکی

خوالێخۆشبوو پارێزەر عەونی بوو.
کەسایەتی دیکەیش لەو سامانداران
هەبوون، کە ئەسپی زینداریان هەبوو
ئەوە هەتا سەرەتای سییەکان، لە
پاشان (گەرۆک) ماشێن پەیدا بوو،
ئەو سامانداران ئەسپەکانی خۆیانیان
بە ئۆتۆمبێل گۆڕییەوە، وەک مەلا
ئەفەندی و عەلی پاشای دۆغرەمەچی
و جەمیل ئەفەندی و چەندانی دیکە
وەک حاجی محەمەد جانباز و ئەحمەد
پاشای دزەیی و لە بیرم ماوە دوو
ئۆتۆمبێل بۆ هاتوچۆی خەڵک هەبوو.
یەکیان لەسەر ڕێی مەخموور و
کەندێناوە کاری دەکرد، شوفێرەکەی
(سەلام) ناوێک لە چلەکان،
ئۆتۆمبێلەکەشی تانتا بوو.
ئەوی تریان لەسەر ڕێی موسڵ
کاری دەکرد، ناوی شوفێرەکەی
(حاجیلۆک) بوو. هەر ئەو دوو
سەیارە هەبوو لە هەولێر هەتا
سەرەتای پەنجاکان، لە پاشان (جەلال
خەلیل و چەندانی دیکە) گەراجیان
هەبوو سەیارەیەکی زۆریان هێنا
هەولێر بۆ کۆیە و ڕەواندوز و
شارەکانی دەوروبەری هەولێر
خەڵکیان دەگواستەوە، هەروەها
جەبار جانباز بۆ هاتوچۆی حاجی
ئۆمەران کاروانچیاتی ڕێگای
خۆشناوەتی هەتا کۆتایی چلەکان و
ناوەڕاستی پەنجاکان خەڵکی
خۆشناوەتی بەکاریان دەهێنا بۆ ڕزق
گواستنەوە، پاشتر چەند ئۆتۆمبێلی
تانتای ئەبولوگیا هێنرا بازاڕی
هەولێر، زۆر بە هەرزان دەفرۆشرا،
سامانداراکانی شار هەموو لەم
ئۆتۆمبێلەیان کڕی، وەک مەلا
فەندی و عەبدوڵڵا پاشا و عەلی



دۆغرەمەچی و جەمیل ئەفەندی و...
تاد. ئەوەش لە ساڵانی ٢٦-
١٩٢٨ز دا چەند (خانێک) مابوون
خاوەنەکانیان (حاجی ڕەشید ئاغای
وەیسی ئاغا و خانی کەردز
خاوەنەکەی عوسمان کەردز بوو خانی
حەسەنی ساکە سووی چاوشلی لە
پاشان کرا بە قشڵەی سواری/
خیالە. خانی سەعید جانباز). ئەو
خانانەی وەک ئوتێلی ئەمڕۆکە بوون
لەسەرەوە بۆ حەسانەوەی کاروانچیان.
شوێنی نووستن و نان خواردن و
چێشت لێنانی تێدا دەکرا و لە
خوارەوەش بۆ وڵاغەکانیان.

٥. حەسار: ئەم حەسارانە هەر
یەکەیان بەناوی خاوەنەکەی بوو،
وەک حەساری حاجی ڕەشید ئاغا و
حەساری عومەر ئاغا و حەساری
ئەحمەد ئەفەندی، ئەوەیان بۆ
حەسانەوەی ڕەنجبەر/ فەلاحی خۆیان
و منداڵەکانیان بوو، بۆ دەغڵ و دانی
گەنم و جۆ و چەڵتووک و نیسک و
نۆک و ماش و کونجی و شتی دیکە.
لە حەوشی حەسارەکەش چەند
چاڵێکیان تێدا دەکرد بۆ داگرتنی
گەنم لە ساڵانی قات و قڕی و بێ
بارانی. (لەوەدیان) لە قوڕ دروست

دەکرد بۆ داگرتنی کا، بۆ ئالیکی
ئاژەڵ و چەند کارێکی دیکە. جا ئەو
سامانداران ئەو گەنمەیان لە
ئاشەکانی ئاو لێ دەکرد و دەیانکردە
(ئارد) دەیانخستە بازاڕ، لە بازاڕ
چەند ئارد فرۆشێک هەبوون، وەک
حەسەن-ی باوکی مامۆستا جەبار
حەسەن-ی باوکی نەزار و دڵزار.
یەکی دیکە ناوی ئیسماعیل عەرەب
بوو.

٦. چەند چایەخانەیەکی گەورە،
ئەوکاتە لە خوارەوەی قەڵا هەبوون،
وەک:

أ. چایەخانەی جەمیل-ی مام
چەلەبی.

ب. چایەخانەی وەستای مام
چەلەبی.

ت. چایەخانەی عەلی فلەیح.

٧. ئەو ئوتێلانەش هەبوون:
ئوتێلی شیمال خاوەنەکەی
(مگردیچ)ی ئەرمەنی بوو.

لە پێشدا سێ ئاشی ئاو هەبوو لە
باغی سەعید ئاغای یەعقوبی لەسەر
ئاوی جۆگای عەنکاوە، بەڵام ئاردەکە
کە پەگی زۆر بوو، ئاشێکی
میکانیکی دیکەش هەبوو بەرامبەر
مزگەوتی حاجی قادر-ی دەباغ پێش

ئەوەی ئەحمەد چەلەبی ئاشی خۆی دابنێ...

٨. کەبابچییەکان هەموویان لەناو بازاڕدا بوون لە هەموویان ناودارتر حاجی عەبدوڵڵای شنۆیی بوو، ناوبانگی هەتا بەغدا چوو بوو (کەباب ئەربیل).

٩. هیچ جۆرە خواردنگەیەک (مطعم) لە هەولێر لە سییەکان و چلەکاندا لەسەر شەقامەکانی شاری هەولێر نەبوو، بەڵام لەبیرمە (م بەرزنجییە) یەک (مطعم) بەناوی (لۆقنتەی غەریب) هەبوو خاوەنەکەی ناوی ئیسماعیل یابە بوو لە تەک بارەگایەکەی ئەحمەد چەلەبی بوو، لە ساڵانی ٩٣٢- هەتا ٩٣٤، لە پاشان دوکانەکەی داخرا.

١٠. دەرمانخانەی (الشمال) خاوەنەکەی (پولس جورج) بوو، دیانی خەڵکی گوندی (دیانە) بوو. ئەوەش بۆ یەکەم جار بوو ئەم دەرمانخانەیەی لە هەولێر لە ساڵی ١٩٢٨ز دا کردەوە.

١١. لە هەولێر هیچ خۆشنووسێک نەبوو ناوی (مدرسە أربیل الولی) و (مدرسە أربیل الثانیە) و ناوی بەلەدییە و چەند ناوێکی دیکەی دەزگاکانی ڕەسمی حکومەت. (شەهاب)ەی دەنگخۆش دەینووسی، خۆشنووسێکی کارامە بوو، لە پاش پەنجاکان ئەوجا تاک تاک خۆشنووسان لە هەولێر سەریان هەڵدەدا.

١٢. خانووبەرەکانی هەولێر هەمووی لەسەر شێوەی ڕۆژهەڵاتی دروست دەکران، حەوشەی لەگەڵ بوو دەرگای ژوورەکان دەینوارییە حەوشە. لە پێش ژوورەکانیش هەیوان هەبوو بۆ پاراستنی لە بارانی زستان هاوینانیش ژوورەکانیش فێنک دەکردەوە، دیوارەکانی چواردەورەی ژوورەکان بە دوو دیوار دەکرا، ماوەی یەک پێ بۆشایی دەما بە کەرەستەی وردە کەڕپووچ پڕ دەکرایەوە، ئەوە شتێکی زانستییە، ساردی و گەرمی نەدەخستە ژوورەکان، تەنانەت ساماندارەکان خانوویان بە دوو قات/ نهۆم دروست دەکرا، کاسبکارەکان خانووبەرەدیان یەک نهۆم بوو، منارە لە مزگەوت دروست دەکرا هەتا بانگدەر، بەتایبەت لە بانگی مەغریب و رەمەزانان چاوی بە ئاوابوونی رۆژ بکەوێت.

١٣. لەناو ماڵان گەرماو نەبوو خەڵکەکە دەچوونە گەرماوی شار. دانی بەیانی هەتا نیوەڕۆ بۆ پیاوان بوو، لە پاش نیوەڕۆ و هەتا پاش عەسرێکی دردنگ بۆ ژنان بوو.

١٤. لە پێش ئەوە کە ئاو دابەش بکرێتە سەر هاووڵاتیان- پێش ساڵەکانی سییەکان، چەند سەقایەک (ئاو فرۆش) هەبوون بە ولاغ ئاویان دەهێنا کۆڵانان، بەشێکی لە جلدی پێستەی غارراو دروست دەکرا، پێیان دەگوت (راویە). کوندە ئاویان دەفرۆشتە هاووڵاتیان، لەناو ماڵان سەرشۆرک لە ژووری نووستن هەبوو (سەکۆیەکی پان و بەرین و چوار گۆشەیی بە ئەندازەی دوو مەتری (مربع) رووبەرەکەی دەبوو بە قسڵ و مشکی بۆ دەم و چاو شووشتن و دەستنوێژ وەرگرتن و هاوینانیش بۆ سەر شووشتن بەکار دەهات، پەردەیان لە دەورووبەری دادەنا. لە سەرەوە باسی ئاوی شارم کرد، با بزانین ئەم ئاوە لە کوێوە دەهات، ئەو ئاوە سەروچاوەکەی لە میفەتاحی جوجە محەمەد-ەوە دەهات و لە نزیک شار دەڕژا ناو بەستی شار، چەند کەسێکی دەسەڵاتدار لە ساماندارەکان پارەیەکی باشیان کۆدەکردەوە لەو شوێنەی کە ئاوەکە دەڕژا ناو بەستی پردێکیان دروست کرد لەسەر سێ تاقان هەتا ئاوەکە بە سانایی بڕژێتە ئەو دیوەی شار، بۆیە ئێستا گەرەکێکی سەرەکی ئەو ناوەی پێوەلکاوە بەهۆی ئەم سێ تاقەوە، ئاوەکە جۆگایەکی گەورە بوو بە ئاوی کەسنەزان و شێخ ئەحمەد-یش ناویان دەبرد، ئاوەکە دەچووە خانەقای هەولێر، لەوێوە دوو گەرماو هەبوو (گەرماوی گەورە و گەرماوی گچکە) هی عەلی ئاغای بوو، عەبدوڵڵا پاشای عەباس ئاغای بنەماڵەی ئەحمەدییەکان سەرۆک شارەوانی بوو لە سەردەمی عوسمانییەکان، حەوزێکی دروست کرد لەسەر چوارگۆشەیی رووبەرەکەی (١٦) مەتری چوارگۆشەیی بوو لە ساڵی ١٩١٣ز دا شوێنەوارەکەی ئەو بارەگایەی خوالێخۆشبوو پارێزەر ئەحمەد جامبازە، کە بەرامبەر کەبابخانەی (تاجرییانە)، لەوێوەش ئاوەکە دەچووە مزگەوتی (ئاڵتی بەرماغ)، لەوێوە ئەم سەقایانە ئاویان دەهێنا بۆ هاووڵاتیانی قەڵا و ئەو ئاوە مەکشوف بوو (معقم) نەبوو. شتێکم بیستووە لە رەشاد ئەفەندی موفتی، ئەویش کەسانی بە تەمەن داچوو بۆیان گێڕاوەتەوە، لە یەک دوو شوێنی قەڵا کۆڵان دەرنەدەچوو،

مەزارێکی ئیمامێک گومبەتی لەسەر دروست کراو، وەک ئیمام عەبدولقادر و ئیمام حەسەن و دەڵێن: ئەم دوو شوێنەی قەڵا مەزارگای هیچ ئیمامێک نەبوون، بەڵکو لەبن قەفەسەکەیان شوێنێکی وەک تونێل دەچووە دەرەوەی شار یەکێکیان بۆ تورەق دەچوو ئەوی تریان بۆ شێخ ئەحمەد بە بنکۆڵ کردن رێگایان دابڕیوە. دەڵێ: لەکاتی هاتنی دوژمن بۆ بەسەردادانی قەڵا، منداڵ و ئافرەتەکانیان دەناردە ئەم شوێنە مۆمیان پێدەکرد... پیاوەکانیش خۆڕاگر دەبوون لەسەر قەڵا، سەرەوەی دەرگای قەڵا سەرای حکومەت بوو، ئەو گەڕەکە بۆ ژن و منداڵەکانیان بوو، ئەوانەش هەموو فەرمانبەری تورک بوون بە خۆو بە ژن و منداڵیانەوە دەهاتنە هەولێر، ئەو گەڕەکە گچکە و خنجیلانەیە تایبەت بەوان بوو.

منداڵێک تووشی تاو لەرز بایە بەشوێن مامانەکەیان دەنارد، ئەویش وەک پسپۆرێک ناو لەپی منداڵەکەی دەپرواند دەیگوت: تووشی بای چەپ بووە برۆن گوللەیەک بێنن حەوت کچی عازەب بیگەزن بەددان شوێنی گەستنەکە دیار بکرێ، لە پاشان گوللەکەی بتاوێنن برژێندرێتە نێو جامە ئاوێک، ئەگەر شکلێکی لێوە دەرچێ ئەوە لەم شتە ترساوە.

لە کۆتایی بیستەکان و هەتا کۆتایی سییەکان ئەهلی بازاڕ و کاسبکاران و مەلای مزگەوتەکان کاتژمێری غروبیان بەکار دەهێنا، واتە: کاتژمێر (١٢) مەغریب بوو، بەڵام فەرمانبەر و قوتابی و



مامۆستایان کاتژمێری زەوالیان بەکار دەهێنا، رۆژی دوو فەسڵ دەچوونە خوێندنگاکان، دووشەممە و پێنجشەممە خوێندنی ئێواران دەوام نەبوو.

ئافرەتان چەندانێکیان دەست رەنگین بوون، گۆرەوییان دەچنی، کڵاوی رەنگاو رەنگیان دەدووری (دەچنی)، خەرەکیان دەرێست بۆ دروستکردنی داوەبەن، لەگەڵ تەشی رێستن و قەیتان دروستکردن، ئامێری تایبەتیان هەبوو، بۆ ئەم کارە هەمبانەیەکیان پڕ لە خۆڵ دەکرد بە قیتی دایاندەنا لەسەرەدوە سێ داوەبەنیان لێک دەبەست، لایەکی داوەکان داری خڕیان لێ بەسترابوو بە هێنان و بردن دەبووە قەیتانێکی سێ سووچ. ئەو کاتە بگانیە (بلانکێت) نەبوو، ژنان لێفەیان دروست دەکرد، لۆکەیان دەئاخنییە ناوی، رووی لێفەکانیان دەنەخشاند، زۆر ئافرەتی دەست رەنگین هەبوون لە قەڵا، بەرگدروو بوون بەرهەمەکانیان لە بازاڕ پەسەند دەکرا.

جۆڵا هەبوون بە ئامێرێکی تایبەت جاجم (مەوج) لە داوەبەنی خوری رەنگاو رەنگ دەکرا. دوگرد-یش لە لۆکە واتە داوە دەزوو دروست دەکرا، بەرماڵی نوێژ لەناو خۆشناوەتی و دزەییان مافوور دروست دەکرا، چەندانێکیان لە قەڵا هەبوون و بەشێکیان عەرەب بوون لە سییەکان هاتوچۆی تەکیەی حاجی مەلا خدری تەلەعفەریان دەکرد، ئەوانە مافووری لاکێشیان لە سییەکاندا بۆ قەڵاتیان دروست دەکرد. ئافرەتی برینساز هەبوون کاری بەیتاریان ئەنجام دەداو وەک ستەری نەخۆشخانە، ئەو کاتە ئەوانە هەرکەسە لە ماڵی خۆی ئەو جۆرە کارە جوانانەیان دەکرد.. ئەوانەش ناسراو بوون لە قەڵا وەک عەیشەخان- خێزانی ئیسماعیل- نەجارە ئەمنەخان- ی دایکی گچک خەلیل لە چلەکان حاجی خەلیل خاوەن گەراجی ئۆتۆمبێل بوو لە هەولێر.

ئافرەتێک هەبوو پێیان دەگوت: (عەیشە دەدە) ناوکی یەکێک بکەوتایە بۆی دەیهێناوە، لە پاشان زانست ئەم شتەی ئاشکرا کرد، کە ناوک ناکەوێ، بەڵکو ئەم شتە پەیوەندی بە جۆرێک خواردەمەنییەوە هەیە، کە زۆر چەوربێ لە پێچ و پەنای (معدە) ئەم چەوراییە دەمەیی و زگی دێشێ.

ساڵێکی قات و قڕیان بایە (زستان بێ باران) بایە ئەم ساڵە پیت و بەرەکەت نەدەبوو، خەڵکەکە تەنگاو دەبوون بۆ باران، جا هەموو ئەسنافەکانی بازاڕ، وەک دارتاش و سەفارچی و ئاسنگەر و قەساب... تاد، هەریەک لەوانە جل و بەرگێکی تایبەتیان لەبەر دەکرد، یەک دەبووە مەڕ، ئەوی تر دەبووە بزن، بە دەنگی بزن و مەڕ بە کۆڵانادا دەگەڕان، دیاردەیەکی سامناک بوو... بەوەیان دەگوت.. کۆسە... لەلایەکی دیکەوە پیاوانی ماقووڵ و ئایین پەروەرەکان، ئەگەر پەڵە هەورێکیان لە ئاسمان چاوپێکەوتبایە دەچوون یەک لە زانا بەرزەکان یان شێخێک لە شێخانی ڕێبازی قادری بە دەف دەچوونە دەشت بە خوێندنی دوعای باران و پاڕانەوە لە خوای میهرەبان، بۆ ئەوەی بارانیان بۆ ببارێنێ، جا کەمێ ئاویان دەپرژاندە سەر شێخەکە، جار وا دەبوو چەند ڕێژنە بارانێک دەباری...

لە بەهاران دەچوونە سەیران، وەک باغی سەعید ئاغای یەعقوبی یان شێخ محەمەد خورەسانی، خواردنی (بەربەسێڵیان) دەکرد و لەگەڵ چایە و چەرەزات، هەتا دانی ئێوارێ بە بەزم و چۆپی و شایی و گۆرانی چاویان بە لەقلەق دەکەوت دەیانگوت: حاجی لەقلەق مار هات، میرم زەنگولدار هات.

جار وا دەبوو لەقلەق وەک مریشک کورک دەبوو هێلانەکەی بە درک و داڵە، چاوی بە جل و بەرگی ماڵان دەکەوت لە ڕستەی، کراسێک یان دەرپێیەکی دەڕفاند بۆ سەر هێلانەکەی و هێلکەکانی لەسەر دادەنا...

یاری مندالان وەک ئەوانەی خوارەوە بوو:

١. قاشوانێ- واتە هۆکی، ٢. کەلایانێ، ٣. پەلیکانێ، ٤. جگجگانێ، ئەوانە یاری کوڕان بوون.

**یاری کچانیش:**

١. حەمامۆک: خۆڵیان کۆ دەکردەوە، ئاویان دەپرژاندە سەری، پاش ١٠- ١٢ خولەک ئاوەکەی هەڵدەمژی، بە ئەسپایی خۆڵەکەی بنیان دەردەهێنا شکلەکە وەک قەفەس دەماوە، هەندێک پووش و پەلاشیان لە بندا دەسووتاند... جا هاواریان دەکردە یەکتریان و دەیانگوت:

(ئاگرمان زۆرە و برنجمان بەرۆنە)، جارەش هەندێ مێردمندالّ مزراحیان دەسووڕاندەوە... داویان تێدەئاڵاند و ڕایاندەکێشا، مزراحەکە زۆر بە توندی دەسووڕاوە، فیتەکی بە دەنگی لێوە دەردەچوو.

لە زۆر ماڵان بەتایبەت لە ژووری نووستن چار دەورەی خانوو بە بڵندایی بەژنێکی ڕەفکەیان دروست دەکرد، قاپ و قاچاغێکی زۆریان لەسەر ریز دەکرد، لەگەڵ شووشەوات. دەگێڕنەوە دەڵێن لە ساڵی ١٩١١ز دا عەرد لە هەولێر زۆر بە توندی لەرزیوەتەوە ناویان ناوە عەرد لەرزینی گەورە. عەرد لەرزینەکە بە شەو بووە، دەڵێن یەک لەو ماڵانەی تاخچەیان بەردەبێتەوە سەریان هەموو سەرو گوێلاکیان دەشکێ.

دەگێرنەوە و دەڵێن دارتووەکی گەورە لە ڕەگ و ریشەوە دەرهات، قۆرتێکی لێ پەیدا بوو لە حەوشەی خانەقای هەولێر، هەر لە هەمان کاتیشدا دانیشتووانی قەلا بە کۆمەڵ نوێن و قاپ و قاچاغیان دەبردە چۆلی لەبن خێوەت دادەنیشتن، دەڵێن عەرد لەرزینەکە سێ ڕۆژی خایاند، کەمێک دەلەرزی کەمێک ڕادەوەستا هەتا سێ ڕۆژان. چەند خانوویەکی کۆن تەپاونەتە سەر خاوەنەکانیان، زۆریان بریندار بوون.

لە ساڵی ١٩٣١ز دا یەک دوو کەس گونییەیان لە پشتی خۆیان هەڵدابوو، هاواریان دەکرد ئانە بە ئانە، درهەم بە روپییە، نۆت بە دینار، فلس بە پول.

پارەی شانشینی عێراق دەرچوو پێشتر عێراق مامەڵەی بە پارەی هیندی دەکرد، هەر لە ساڵی ١٩١٨ز تا ساڵی ١٩٣١ز درهەم و ریالی ٢٠٠ فلسی شا فەیسەلی یەکەم زیو بوو لە پاشان درهەم کرا بە (مەعدەن). فلس هێندە بە ڕەونەق و جوان بوو بە نیو لیرەی عوسمانی دەچوو. ڕۆژی پێنجشەممە دووی شوبات ساڵی ١٩٣٢ز بەفرێکی زۆر لە هەرێمی کوردستان باری، هەموو ئەو ناوچانەی پڕ کردبۆوە بەرازێکی

یەکانەی دڕ چووەتە ناو حەوشەی دواناوەندی هەولێر لە شوێنی پارێزگای ئەمڕۆکە. شێخ حوسێن برای شێخ حەسەن ئەفەندی (نیعمەتوڵلا)ی قەرەداغی پۆلیس بوو بە دوو گوللەی شەشاگر کوشتی، بەڕێوەبەری دواناوەندی ئەوساکە حیکمەت بەکر تورکی ئەستەنبولی بوو. سامانداردەکان منداڵەکانی خۆیان لەگەڵ خزمەتچی دەنارده مەکتەب، منیش گوتم: ئەی ئێمە درندەش بمانخوا قەیناکە. شێخ حەسەن ئەفەندی گوتی: خوا پاسەوانی ئێوەیە.

دوو برا هەبوون قەڵاتی بوون (تاهیر و ساڵح) تاهریان چەلەبی مەڕی دەبردە شام و حەلەب، لە پاشان وازی لەم کارەی هێنا و دوکانی دانا ماست و پەنیری هەولێری دەفرۆشت. لە پاشان ساڵح ناوەکەیان بوو بە خەفافێکی کارامە دوو کەسی دیش هەبوون ماست و پەنیریان دەفرۆشت (حەسەن حەلیم و مام هیدایەت).

سەید جەمیل- سەید بوو کەسکی لەسەری دەبەست لە ناوەندی بازاڕی بەقالان تەشتێکی گەورەی لەسەر سێ کوچکەیەک دادەنا، گۆشت و تەماتەی لەگەڵیدا دەکوڵاند و دەبووە مەرەگە (تشریب) دوکاندارەکان نیوەڕۆیان هەر لە بازاڕ دەمانەوە شەڕ بوو لەسەر مەرەگەی سەید جەمیل-ی. قەڵاتیان دەهاتن ئەگەر مارێکیان لە ماڵەوە بدیبایە دەیانگوت: مام سەید مارمان دیوە لە ماڵێ وەرە بیگرە، ئەویش لە گەڵیان دەچوو مارەکەی دەگرت... منداڵی کۆڵانان بەدووی دەکەوتن.

چەند کەسێک لە کۆڵانەکانی قەڵا دەگەڕان تەنەکە نەوتیان بە دەستەوە بوو نەوتیان دەفرۆشتە هاووڵاتیان، ماڵ هەبوو، دوو شووشە ماڵ هەبوو زیاتر یان کەمتر ئەم نەوتەیان دەکڕی بۆ فانۆس-ی شەوان، بەڵام بۆ سووتەمەنی و چێشت لێنان نەوت بەکار نەدەهات، زستانان بۆ چێشت لێنان نەوت بەکار نەدەهات، زستانان بۆ گەرم کردنەوەی شوێنی دانیشتن و نووستن و چێشت لێنان گشتی بە دار دەکرا، خەڵووز بۆ مەنقەڵە بەکار دەهات، هەموو دانیشتووانی وڵات دار و خەڵووز (ڕەژوو)یان بۆ سووتەمەنی بەکار دەهێنا، هەتا سەماوەر بۆ چایە لێنان هەر بە خەڵووز بوو.

سامانداردکان لە ژووری دانیشتن مغێریان دروست دەکرد لەناو دیوار بادگیرێکیان بۆ دروست دەکرد هەتا دووکەڵەکە بکێشرێتە دەرەوە، ژوورەکان گەرم دەبوون لە سەرەتای پایز هەتا گەڵارێزان داریان لە خۆشناوەتی دەهێنا بە باری گوێدرێژ هەتا گۆڕەپانەکەی پشت خانەقای هەولێر، دانیشتووانی شار هەر کەس بە قەدەر کیفایەتی خۆی داری دەکڕی، لە پاشان دارشکێن هەبوون لە خۆشناوەتی دەهاتنە هەولێر زۆربەیان ڕۆستەیی بوون (بیور) و تەوشوویان لەگەڵە خۆیاندا دەهێنا بۆ شکاندنی دار، لە کۆڵانەکانی هەولێر، جا ئەو دارە قەڵاشکەرانەیان دەشکاند بۆ زستان بۆ دانیشتووانی هەولێر. لە پێشران بۆ چێشتی دۆڵمە لێنان پەلکە کودی و باینجان و تەرۆزیان وشک دەکردەوە بۆ ڕۆژانی زستان، چونکە وەک ئەمڕۆ نەبوو ئەو دەرامەتانە ساڵ دوازدەی مانگ هەبێ.

هاوینان هاووڵاتییان لەسەربان دەخەوتن، نیسک و نۆکی عەنکاوە بەناوبانگ بوو. بە هاوین کەدینە کوپ و شەربەی قوڕیان دەکرد، ئەو کەدینە و شەربە قوڕەمان پڕ ئاو دەکرد لەسەر تیفە و دیواریان دادەنا، ئاوەکە سارد دەبوو، بۆ رایەخی هاوینان حەسیری عەنکاوە رادەخسترا، کوڕە لاوێک ئەگەر منەی ژنهێنانی بەکردایە، دایکی یان خوشکی دەچووە ماڵی ئەو کچەی نیشان کراو تەماشایەکی باشی دەکرد، زۆر لێی نزیک دەبۆوە، هەتا بۆنی لەش و ئەندام و دەمی بێتە بەر کەپووی، ئەوجا ئەگەر رای لێ بایە داخوازی دەکرد بۆ کوڕە لاوەکەی کوڕی یان برای، ئەگەر کچەکەیان بدابایە کوڕەی خۆیان ئامادە دەکرد هەتا مارە دەکرا و دەگوێزراوە بە بەزم و شایی.

لە پاشان بە ڕۆیشتنی پیادە ئەگەر ماڵەکە نزیک بایە، ئەگەر دووریش بایە بە وڵاغ دەگواسترا وە ماڵی زاوا. پێش گواستنەوەی بووکەکە بە شەوێک لە ماڵی زاوا مەولوودی پێغەمبەر (مەنقەبەی نەبەوی)یان دەخوێند، پاش گواستنەوەش دەعوەتێکی فراوان دەکرا بۆ کەس و کارانی هەردووڵا و برادەرانی زاوا. ئەم جۆرە بووک گواستنەوەیە باو بوو لە هەولێر هەندێ جار وا دەبوو کوڕە رای لە کچەکە نەدەبوو، ناخۆشی لە نێوان هەردووڵا دا دروست دەبوو، هەر لە

ساڵانی سەرەتای سییەکاندا حکومەتی شانشینی ئاوی بە بۆری دابەش کردە سەر هاووڵاتییان، ئەو ئاوە بەهێزی ئامێرێکی میکانیکی لەسەر ئاوی میری، ئاوەکەی بە بۆرییەکی گەورە دەچووە ناو حەوزی قەڵا و لەوێ ماددەی (کلۆرین)ی تێدەکرا بە دەستی پسپۆرێک، هەتا ئاوەکە بێ میکرۆب بکرێ بە سافی بنێردرێتە ماڵان.

لە مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٦ز دا بارانێکی یەکجار زۆر باری، هەفتەیەک بێ پسانەوە شەو و رۆژ، لە بەستی هەولێر لافاوێکی گەورەی لێ پەیدا بوو، بەشێکی زۆری شاری هەولێری گرتەوە، ئاو لە قەڵاتیان برا، چونکە بۆرییە گەورەکان لەناو بەستی بە یەکدی بەسترابوون هەتا ئاوەکە بگاتە سەر قەڵا.

هێزی ئەو لافاوە تیژە بۆرییەکانی تێکدا و شکاندی، بۆ ماوەی دوو هەفتە ئاو لە قەڵاتیان برا، ناچار دەمان هەر یەکە گوێ درێژێک پەیدا بکا، بۆ ئەوەی بە تەنەکە یان بە جەرە (کوندە) ئاو بکێشنە قەڵا، سەقایەکانی پێشان چەندانێکیان ئەو مەسەلەیان بە هەل و فرسەت زانی دەچوون، بەراویەکەی سەر پشتی وڵاغەکانیان ئاویان دەفرۆشتە ماڵان، وا بزانم بۆ ماوەی رۆژێک یان دوو رۆژ شارەوانی بەو کارەی زانی قەدەغەی کردن. من ئەو کاتە لە تەمەنی شازدە ساڵی دەبووم، گوێدرێژێکمان لە یەکێک خواستنەوە دەچووم لە ناعورەکەی مزگەوتی شێخی چۆلی بە جەرە رۆژێ دوو فەسڵ ئاوم دەکێشاوە ماڵ.

هەر ئەو جارە بوو هەولێر لافاوی بارانی هاتە سەر، چاومان بە منداڵێکی ساوا کەوت لەناو ئاودا، بردیانە شارەوانی هەتا بدرێتەوە خاوەنەکەی، منداڵەکە زیندوو بوو پێیدەکەنی، کارێتەی ماڵە دیهاتییەکان هێنابوویە شار، ئەوانەمان بە چاوی خۆمان دیت.

**مەحموود ئەفەندی:**

ئەو فەرمانبەرەی لەسەر ئامێری ئاو داندرابوو کابرایەکی هێندە زانا نەبوو، بۆرییەکانی رەبتی یەکدی کردبوو لەناو بەستێ لەسەر لەوحەیەکی داری دانابوو. بە نەجارەکانی راسپاردبوو، چەند لەوحێکی لە دار دروستکراو دابنێتە بەست، تا بۆرییەکان لەسەر ئەو لەوحە دارانە لەنێو بەستەکە بچێتە ئەو دیو و بەشی بنەوە لەبن عەردی بە گەچ داپۆشرابوو، بەشی سەرەوەش لە بۆرییەکە لەسەر ئەو بۆشاییەدا تێپەڕ دەبووە سەر (چل- پەنجا) (لوحە). ئەوجا ئاوەکە رەوانەی قەڵا دەکرا، ئەو کاتە موتەسەریفی هەولێر ئەحمەد تۆفیق ئەو فەرمانبەرەی لابرد، یەکێکی دیکەی لەسەر پرۆژەی ئاو دانا. ئەویش موسا ئەمین سەفار کوری ئەمین-ی کوری حاجی کەریم-ی کوری سەلیم-ی سەفار بوو. بە رەچەڵەک دەچێتەوە سەر بنەماڵەی قازی مهابادی، لەکاتی خۆی لەسەر رامیاری بەند کراوە. ناوی راستەقینەی (مونیر) بووە لە گرتووخانە رادەکا و ناوی خۆی دەگۆرێ بە سەلیم و دێتە هەولێر. لە زمانی بنەماڵەکەی دەڵێن: ئەو (مونیر) ناوە ئامۆزای (قازی محەمەد)ە سەرۆک کۆماری کوردستان. یەکێکی دیکەش لەگەڵی دابوو، ناوی حاجی مەلا دەبێ، لە پاشان هەر لەسەر ئەو پرۆژەیە دەوام دەکا هەتا مووچەی مانگانەی فەرمی دەگاتە (٣٧) دینار.

کەسێک بە ناوی (ساڵح) لە ساڵی ١٩٣٥ز ئامێرێکی (سۆدە سیفۆن) دێنێتە هەولێر، ئامێرەکە لەپێشرا لەبن قەڵا بوو. لەو شوێنەی مافوور دەفرۆشرێ لەتەک چایەخانەی مەچکۆ، لە پاشان گواستییەوە بۆ لای خانەقا، دواجار گواستراوە لای سینەمای سەلاحەدین حانوتەکانی سەربازگەی حامیەی هەولێر سیفۆنەکەیان بۆ سەرف دەکرد هەتا ناویان نابوو (ساڵح سیفۆن).

لە ساڵی ١٩٣٦ز دا بۆ یەکەم جار رادیۆ هاتە هەولێر، یەکەم کەس جەمیل-ی مام چەلەبی چایەچی هێنای، رادیۆکە هێندە گەورە بوو بە قەد نیو کانتۆرێک دەبوو، دەمی ئێواران دەنگی دەهاتە ناوەندی قەڵاتێ، ئەو کاتە رادیۆ لە ماڵاندا نەبوو. ئەو کەسەی بیویستبایە رادیۆ بکرێ، دەبوا (عرضحال)ێک بنوسێ بۆ دائیرەی (تەلیفۆنات) هەتا ئیجازەی بۆ دەردەچێ، ئەوجا دەیتوانی رادیۆ بکرێ: لە رۆژی چوارشەممە ١ی تەمموزی ساڵی ١٩٣٦ دا رادیۆی بێ تەلی عێراق بۆ یەکەمجار کرایەوە. لە بیستەکان و سییەکاندا هەتا کۆتایی چلەکانیش ئافرەتان بەبێ سەر پۆشی نەدەچوونە بازار. سەر پۆشی ئەو کاتەش

چارشەو پێچە بوو.

**کوتاڵی ژنان:** قوماشی رەنگاو رەنگ بابانی و حەفت رەنگ و تاقاو ئەتلەس و گوڵ باتمان و شەر مێز بۆ ئافرەتان.

**هی پیاوانیش:** دەشتەکییەکان کورتەک و شەلوار. هەولێری: کەواو چاکەت و شەدە و هەوری.

سوونەت کردنی منداڵانی نێرینە: بە زەماوەند و دەف لێدان بوو، ئەوەی دەهات نان و چێشت (برنج و شلە و میوە)ی دەخوارد و لە پاش نان خواردن بە دەف یان بە دەهۆڵ و زورنا منداڵەکە سوونەت دەکرا، جار وا دەبوو مەولوود-یش دەخوێندرایەوە، بۆ کچان- بە نهێنی دەکرا.

ئەوانەش لە رووی شەرعەوە ئەنجام دەدرێ، منداڵێک لەدایک دەبوو (عقیقە)ی بۆ دەکرا، ئەگەر کوڕ بایە دوو کاوڕ ئەگەر کچ بایە یەک کاوڕیان سەر دەبڕی و دەدرا هەژار و دەر و دراوسێ. عەقیقەکەشیان بە مەقەس دەبڕی، ئەم چەند مووەی سەر ناوچەوانی واتە پێش سەری.

**بەشی دووەم**

١. سەفارچییەکان تەشتیان لە سفر دروست دەکرد، بە سێ جۆر (گەورە، ناوەنجی، بچووک)، دەیانفرۆشت بە ١٠ قران کە دەکاتە ٢٠٠ فلسی ئەمرۆکە. ئەو قیمەتە هی جۆرە گەورەکەیان بوو خەڵک دەیانکڕی هەتا جل و بەرگی لە ناودا بشۆن... ئەوەی دەستکورت بوایە (ئینجانە)ی دەکڕی بە یەک قران، واتە ٢٠ فلس، ئەوەش لە قووڕی سوورکراوە دروست دەکرا... گۆسکەی ئاو لە سفر دروست دەکرا لە قوڕ-یش، هەر کەسە بە قەدەر حاڵ و گوزەرانی خۆی دەیانکڕی.

٢. مەلاکی دار لە دار کەوەتی دروست دەکرا، زۆر تەنک و جوان بوو، بۆ خواردەمەنی و چێشتی شلە بەکاریان هێناوە لە پاشاندا مەلاکی سفر پەیدا بوو، ئەوەشیان بە قەڵا سپی دەکردەوە: چونکە ژەنگی سفر ژەهرە چەند ماڵێکی عەرەب لە گەڕەکی عارەبانی ئەمڕۆکە لە هەولێر جێنشین بوون، ئەوا هەندێکیان حوشترەوان بوون گەنم و دەغڵ و دانیان دەهێنا و دەبرد، وەک کاروانچییەکان، کە لە ساڵی ١٩١٨ز دا ئینگلیز هاتنە عێراق ئوتومبێلی لۆری پەیدابوو، ئەو عارەبانە حوشترەکانیان فرۆشت، دەستیان بە کاری نانەوایی کرد، نانیان لە ماڵی خۆیان دروست دەکرد و دەیانبردە بازاڕ و نانەکانیان زۆر گەورە و جوان بوو، دانەیەکیان بە فلسێک دەفرۆشت.

قەڵاتیان- نانی تەندووریان دروست دەکرد، ئەوەش چەند ماڵە کەرکووکی بوون هاتبوونە هەولێر لە گەڕەکی تۆپخانە خانوویان بە کرێ گرتبوو، پیاوەکانیان فەرمانبەر بوون.

هەولێری ئەم جۆرە نانەیان لەوان فێربوون، ئەوەش لە دەورووبەری ساڵانی ٢٩- ١٩٣٠ز دا بووە ئەو نانە تیرییەی هەولێریان دەیکەن هەویرەکەی فەتیرە، وەک نانی هەورەمان نییە، ئەوان لە هەویری هەڵاتە نانی تیری دەکەن.

٣. ئەگەر پاقلاوە و نەمنەماتیان بەکردایە لەناو سینییەکی تایبەت بە سێ ٣٠ نانی زۆر تەنک، ئەوەش وەستای خۆی هەبوو، دوو ناوکیان لەگەڵ دادەنا، گویز و شەکر و هێل لە پاشان لەسەر سێ کوچکەی ئاسن دادەنرا لە بنی ئاگری خەڵوزیان دادەنا بۆ برژاندنی، ئەوەش بە بۆنی دەزاندرا کە برژاوە، لە دوایی سینییەکیان لەسەر رووی پاقلاوەکە دادەنا ئاگرەکەی بنیان دەهێنا سەر پشتی سینییەکە هەتا رووی پاقلاوەکە دەبرژا، ئەو کاتە ساڵانی ١٩٢٦- ١٩٢٨ز بوو. پاشتر فڕن لە بازاڕ پەیدا بوو لە سییەکان پاقلاوەکەیان دەنارده فڕن بە پارە بۆیان سوور دەکراوە، هەولێری وەک ئەمڕۆ حەزیان لە شیرنەمەنی نەدەکرد، تەنیا رەمەزانان نەبێ یان کە بووک دەگوێزرایەوە ماڵی بووک سێ جۆرە شیرنەمەنیان دەنارده ماڵی زاوا:

أ. پاقلاوە.

ب. حاجی بادام- لە بادام و شەکر و هێل دەکرا.

ج. غورابییە- جۆرە شەکرلەمەیەکە بە هێل و بادام و ئارد دروست دەکرا.

٤. سابوون چۆن دروست دەکرا؟ جاران لە ماڵە سابوونچیانی هەولێر ئەوەی پێویستیان بوایە سابوون دابڕێژێ، دەبووا سێ هەتا چوار تەنەکە ١٦ کیلۆی بەزی بزن بکڕێ و بیتاوێنێتەوە لەگەڵ قەلبە شار و پەلکە لیمۆ و پرتەقال و گوڵەباغ بینێرێتە ماڵی سابوونچی لە قەڵا.

(مەلا عەبدوڵلا)ی سابوونچی لە گەڕەکی تەکیە دادەنیشت ئامێری سابوون دروست کردنی

هەبوو ساڵی ١٩٢٩ز سابوونی دروست کرد. سابوونچییەکی دیش لە گەڕەکی تەعجیل موفتی بەناو (حاجی سەلیم) بوو هەبوو.

٥. سینی خواردەمەنی: لەناو قەلاییان ئەم شتە باو بوو، برنجی کوردی بە گۆشتی مەڕی و ڕۆنی مەڕی ساغ و مریشک و کوبەی حەلەب (عروق) بە زمانی قەلاتیان کەباب و چەند شلەی ڕەنگاو ڕەنگ بە سەرپۆشییەوە دەنێردرایە چەند ماڵە برادەر و دۆست بۆ خاتری ڕێزلێنان، ئەوانیش پاداشتی ئەوانیان دەکردەوە، بەم جۆرە خواردنانە. ئەوەش چونکە ئافرەت وەک ئەمڕۆکە لەگەڵ نامەحرەم لەسەر خواردن لەگەڵ بێگانان دانەدەنیشت.

٦. چوونە گەرماوی ئافرەت:

أ. قۆدیەک لە سفر دروست کراو بە دوو پارچە لێک دەبەسترا بۆ دانانی لیفکە و سابوون و عەتر و خاولی.

ب. مەنجەڵێکی سفر ناویان نابوو (قەعدە) دەونخوون لەسەر پشتی مەنجەڵەکە خانە سامانداردکە دادەنیشت ژنی سەر شۆڕی تایبەتی هەبوو سەری دەشووشت.

بەرزاییەکیش لە گەرماو دروست دەکرا لە هەموو گەرماوەکانی شار پێیان دەگوت (بەردی زاوا) زاوا دەبوا لەسەر ئەو بەرزاییە سەری بشۆری و گەرماوەکەش چۆل دەکرا بۆ خاتری زاوا بە پارەیەکی باش.

ئەو ئافرەتەی دووگیان بوایە یان زدیستان بوایە، کە لە گەرماو دەهاتەوە ماڵ، دەبوا جەرگ و ناوی بۆ بکولاّبایە، شتێکیان بە سەری ئافرەتەکە دادەدا جەرگ و ناوە کولاّوەکەیان لە بەردەمی دادەنا هەتا هەڵمەکە هەڵبچێتە دەم و چاوی ئەوەش نەریتێکی قەلاتیان بوو.

لە قەلا یەک گەرماو هەبوو، لە خوارەوەش دوو گەرماو هەبوو: هی عەلی ئاغاو لەگەڵ گەرماوی عەلمودەی بنەماڵەی حاجی قادری دباغ.

لە ساڵانی ١٩٢٥- ١٩٢٧ز دا ماکینەی بەرگ هێنرایە شاری، ئەوەش بۆ ئەم کچانە شتێکی زۆر باش بوو بۆ فێربوونی بەرگ دوورین. تێکەڵاوی (باغچەی منداڵان) لە ساڵی ١٩٢٧ز لە شوێنەواری بانکی ڕەشیدی ئێستا هەبووە.

٧. شەڕی قەلاتیان و خوارەوەی قەلا نەک منداڵ، بەڵکو پیاوی لە خۆ گەڕایەوە بە کۆمەڵ بەردەقانیان لە دەست بوو بەردیان دەهاویشت، قەلاتیان جنێوی پیسیان پێ دەدان، لەسەر ماڵەکانی سەر بەدەن چەند پیرەژنێک وەلامیان دەدانەوە، ئەوانیش جنێویان بەوانەی خوارەوە دەدا.

٨. ماڵە قەلاتییەکان دوو جۆر ساواریان دەکرد، یەکێکی بۆ خواردنی تایبەتی خۆیان، ئەویتر بۆ ئالوویترکردنی ئەو ڕزقانەی خۆشناوەتی مامساڵ و ڕوستەیی ڕزقێکی زۆریان لەگەڵ خۆ دەهێنا هەولێر، زستانان وەک قونکە هەنجیر و مێوژی ڕەش و مێوژی سوور و گوێز و باوی دەیانگۆڕییەوە بە ساوار یەک بە دوو، یەک بە سێ.

٩. هەموو ماڵە قەلاییان دابەستی مەڕیان بەخێو دەکرد، لە زستانان دەیانکوشتەوە، گۆشتەکەیان بە دوو جۆر دەپاراست، جۆرێکیان یان دەکردە باسمە و باسترمە، ئەوی تریان دەکردە قاورمە لەناو جەرەیان دەپەست، سەری جەرەکان بە قوڕە سوور سواغ دەدران، ئەوجاکە زستان دەهات گۆشت لە بازاڕ نەدەما سەری ئەو جەرانەیان دەکردەوە، ئەم گۆشتەیان دەخوارد، ئەم گۆشتەش تام و چێژی هیچ نەدەگۆڕا و شتێکی زۆر پوختە و نایاب بوو، چونکە خوێیەکی زۆریان لە نێوان گۆشتەکان دەنا لەناو ڕۆنی خۆی دەپارێزرا هەوای نەدەکێشا، بنی جەرەکان لە نێو قاپێکی پڕ ئاو دادەنرا لەبەر گێرکە و مێرووله، جاروبار ئاوەکەیان دەگۆڕی. ماڵان مریشکیان زۆر بەخێو دەکرد بۆ هێلکە و خواردنی مریشک.

١٠. بەهاران کە ماستی مەڕ پەیدا دەبوو چێشتێکیان لێدەنا پێیان دەگوت (دۆینە)، ئەوەیان چۆن دروست دەکرد بڕی نیو کیلۆ پونگ (نعناع) لەگەڵ ماستی شل بە ئاو و گەنمەکوتاو لێیان دەنا و شتێکی وەختی بوو تایبەت بە بەهار، ژنە پۆلی شیری مەڕیان دەفرۆشت لە کۆڵانەکانی قەلا هاواریان دەکرد، دەیانگوت شیرەکی زەریف. ئێمە بانگمان دەکردن: ئەگەر شیرەکەیان ئاوی تێ نەکرابا دەمانکڕی بە هەرزان. ئەوجا چێشتێکی خۆشیان لێ دەکرد: ناویان دەنا (شیر برنج)، چونکە لەگەڵ برنج لێ دەنرا.

١١. کونجیمان (ماموستا بەرزنجی) لە بازاڕ دەکڕی، سپی دەکرایەوە، لەسەر ئاگر سوور

دەکرایەوە لە پاشان لەگەڵ دۆشاوی مێوژی ساف دەیانکولاند ناویان نابوو (تەحین) زستانان دەخورا.

١٢. کەندوو: لە قوڕە سوری کەند دروست دەکرا، بە بەرزایی بەژن و بالای پیاوێکی کەڵەگەت لە خوارەوە کونێکیان لێدەکرد، پەڕۆکیان تێ دەئاخنی، ئەوەش بۆ ئەوەی گەنمی تێبکرێ لە عەلبەیەک زیاتری دەگرت، ماڵ هەبوو دوو کەندوو یا سێ کەندووی هەبوو.

١٣. ناندین: لە بیرمە ناندێن لە قوڕە سوور دروست دەکرا بۆ پاراستنی نانی تیری، شتێک بوو وەک تەندوور سینییەک یان سەبەتێکی بێ مەساماتیان بەسەر دادەدا نانەکە هیچ بۆنی نەدەگۆڕا.

١٤. ژوورەکانی نووستن و دانیشتن بە هیچ جۆرێک پەنجەرەی گەورە بۆ نەدەکرا، تەنیا یەک پەنجەرە، کە نزیک بن مێچ دروست دەکرا یان دوو پەنجەرە داری (تێلبەند)ی لێ قایم دەکرا بەبێ شووشە، ئەوەش بۆ گۆڕینی هەوای ژوورەکان.

١٥. ماڵەکانی قەڵا بە گشتی لەسەر شێوەی شەرقی (رۆژهەڵات)ی دروست دەکرن، هەندێ کەس ژوورەکانیان بە گەچ سواغ دەدان، عەردی ژوورەکان بە قسل و مشکی و کەرپووچ رادەخسترا.

**بەشی سێیەم**

١. بەر لەوەی ئامێری برنج کوتان و پاککردنەوەی لە چەڵتووک بێت.

أ- (دەستهاڕ)ی دار هەبوو (گرگر)یان پێدەگوت، لە لای ژوورەوەی قیریان لێ دەسوا، هەتا رووەکانی ژوورەوەی زوور ببێ (دڕ ببێ)، هەتا برنجەکە لە چەڵتووکی لێک بکرێتەوە، لە پاشان برنج کوت هەبوون دیبەگێکی داریان هەبوو لەگەڵ دەسکە بۆرییەکی ئاسن.

ب- بە شوێن ئەو برنج کوتەیان دەنارد، ئەویش بە خۆ و دیبەگەکەوە دەهاتە ئەو ماڵە برنجی بۆ بکووتێ، هەر جارێ بەشێک لە برنجەکەی لە دیبەگەکە دادەنا، کەمێک ئاوی دەپرژاندە سەری دەستی بە کوتانی دەکرد، هەتا کوتینی برنجەکە تەواو دەبوو، کرێی خۆی وەردەگرت و دەڕۆیشت، لە پاشان خاوەن ماڵەکە برنجە کوتراوەکەی جێبەجێ دەکرد، درشتەکەی دادەنا بۆ قبوولی (پڵاو) و وردەکەشی بۆ کفتە و شۆربا و چاوی نیسک.

٢. ساوار: هەر کەسێ بە قەدەر پێویستی ساڵانەی خۆی ساواری دەکرد، لە گەنمی کوڵاو- دانوو لە پاش وشک بوونی، لە پاشان ساوارەکەیان دەبردە دینگی، دینگ بەردێکی زل و گەورە. دارێکی ئەستووری لە ناوەراستی بوو، لە ولاغێک قایم دەکرا، ئەویش بە دەوری سەکووەکە دەسووڕا، هەتا دینگە کە ئەو ساوارەی لە پەلکی لێک بکاتەوە، لە پاشان هەڵیان دەخست هەتا وشک دەبۆوە، لە دواییدا لە بێژینگ دەدرا، بەشە درشتەکەی لەبۆ (پڵاو ساوار)، بەشە وردەکەشی ناویان نابوو (پیرخەنی)، لەگەڵ هەرشتە لێدەندرا و دەبووە چێشتێکی بەتام. دوو جۆر ساوار دەکرا بۆ مامەڵەی بازاڕی زستانان، خێڵەسات دەهاتنە هەولێر رزقێکی زۆریان لەگەڵ خۆ دەهێنا، وەک گوێز و باوی و قونکە هەنجیر و مێوژ و دۆشاوی مێوژی ساغ و هەنگوینی بە شانە و رۆنی مەڕی ساغ، ئەو شتانە دەگۆڕا بە ساوار (٢١) یان بەشێک لە رزقە (١- ٣) ساوار، ئەوە داب و نەریتی قەڵاتیان بوو، ئەو خێڵە ساتانەش (روستەیی و بۆلی و مامساڵ و خەیلانی) زستانان رێی کاروانیان بە بەفر دەگیرا، دەهاتنە خوار هەتا کۆتایی مانگی نیسان دەمانەوە. لە پاشاندا دەگەڕانەوە کوێستان. نیسک بە پەلکییەوە (دەستارێکی تایبەت هەبوو زۆر سووک بوو، چونکە بەردەکەی وەک بەردی دەبان وابوو، کون کون بوو، چونکە نیسک زۆر ناسکە تەنیا بە لابردنی پەلکەکەیەتی).

ئەم شتانە ئەمڕۆ هەریەکە ئامێری تایبەتی خۆی هەیە بە پاکی و خاوێنی دێتە بەر دەستت بەبێ ماندوو بوون.

٣. کەشکەک: ئەوەش لە گەنمی درشت دروست دەکرا، پاش شووشتنی گەنمەکە دەنێردرایە (دینگ) لە پاشان هەڵیاندەخست تا وشک بێت، ئەوجا یەکێک لە گەنمە کوتراوەکەی دەدا تاکو پەلکەکەی نەمێنێ لە پاشاندا گەنمە کوتراوەکە پاک دەبۆوە لە پەلکی ئەو کەشکە لەگەڵ نۆک لێدەندرا.

٤. داندۆک: لە پایزان ماستی مەڕیان لە مەشکە دەژاند، رۆنەکە دەکەوتە رووی، واتە (کەرە)کە، ئەو ماستە ژاندراوەی بێ رۆن پێیان دەگوت: (دۆ)، ئەوجا چەند کیلۆیەک لەم دۆیەیان دەهێنا و ساواریان

تێكەڵ دەكـــرد، دەیانكردە ســـەلك لەناو سینییەک ڕیز دەكرا هەتا وشک دەبوو لە پاشان وەک زەخیرە هەڵیان دەگرت بۆ زستان، زستانان لێدەندرا وەک چێشتێكی بەتام لەگەڵ گۆشت قەلێ یان مریشک لێدەنرا.

٥. كەشک: لەجیاتی ساوار گەنمە كـــوتاویان لەگـــەڵ دۆیەكـــە تێكەڵ دەكـــرد. ســـەلک ســـەلک وشک دەكرایەوە هەڵیـان دەگرت بۆ زسـتان، وەک زەخیرە.

٦. هەڕشتە بڕین: ئەمە وەستای تایبەتی خۆی هەبوو لە ئافرەتان، بە شوێن ئافرەتەكەیان دەنارد، ئەویش بەخۆ و تەبەقەكەی و چەقۆی تایبەت بۆ هەڕشـتە بڕین لە دەمی ئێـوارەوە دەهاتە مـــاڵەكـــە هەتا بە شـــەو لە مـالەكـە بخـەوێت، بەیانی لە پاش نوێژی بەیانی هەڵدەستا هەویرەكەی دەشێلا و كـەمێک هێل و دارچین و گوڵەباغی لەگەڵ دەشێلا هەتا ڕۆژ لە دیواران دەهاتە خـــوار، ئەوجـــا هەڕشتەكەی دەبڕی، منداڵانی ماڵەكە هەڕشـتـە براوەكـەیان دەبردە سـەربان لەبەر هەتاو لەسـەر پەتک هەڵیـــان دەخست تا وشک بێتەوە، لە پاشاندا لەناو سێڵێكی لە قوڕ دروست لەسەر ئاگـــر ســـوور دەكـــرایەوە، ئەوجـــا هەڕشـــتـــەكـــە ســـاف دەكـــرایەوە و ئاردەكـەی منداڵان لەگـەڵ شـەكـــر تێكەڵیان دەكرد و دەیانخوارد، پێیـان دەگـوت: قـاوێت، لەو هەڕشـتـەیە كـەمێک تێكەڵ ساوار دەكرا پێش بەكارهێنانی بۆ چێشت، هەتا تامی ساوارەكە خۆش ببێت.

لە پاشان، پاش ساڵانی ١٩٤١-١٩٤٢ز ئامـێـری هەڕشـــتـــە بڕین سەریهەڵدا.

## چەند چێشتێكی كۆنی دیكەی هەولێریان

١. كفتەی برووشی لەگەڵ قیمەی گۆشتی سووركرایەوە لەگەڵ پێواز، لە پاشـاندا دەیانخسـتـە شـۆربای كـودی یان تەمـــــاتە، ئەوەش خـــــواردنی نیوەڕۆیانی زستان بوو.

٢. كفـتـەی برنجی بەناوكە قـیـمـە لەگــــەڵ كــــاری و بەهارات و یان دارچین، لەناو شۆربای تەماتە دەكولا.

٣. كوبەی حەلەب لە هەولێر ناوی (عروق)ە، ئەویش قەپێلكەكەی وردە برنجـە، بەڵام ناوكـەكـەی قـیـمـەی سـووركـراوە و كـشـمـیـش و باوی تێدەكرێ لەگەڵ دارچین.

٤. چێـــشـــتـــی.باینجـــان: ئەم باینجـــانە لەت لەت دەكـــرێ لەناو مەنجەڵێكی مام ناوەندی لەگەڵ دوو سێ كەوچک ڕۆن باینجـانەكە سوور دەكـرایەوە، ئەوجـا كـفـتـەی سـاواری كـەمێک برووش لە هەویری كفـتەكـە دەكرێ، هەتا نەكرێتەوە و خۆی بگرێ ناوكی كفـتـەكـە قـیمەی سووركراوەی تێدەكرێ بە گوێرەی ژمارەی خێـزان لەناو باینجـــانەكـــە دەیانكـولاند لە پاشـاندا ئامـادە دەكـرا بۆ خـواردن، ئەویش خواردنی زستانان بوو.

٥. دروســـــتكردنی كـــــوبەی سووركراوە لەناو ڕۆن: ناوكەكەی لە برووش كـەمـێک سـاوار وەک هەویر دەشێلرێ لە پاشاندا ناوكی تێدەكرێ، ئەویش بریتییە لە قیمەی سووركراوە و كـشـمـیـش و باوی و دارچین، جـا لەناو ڕۆن سوور دەكرایەوە.

٦. كـوبەی مـیـوانان: ئەوە لەسـەر فەرشە لەناو پەڕۆكێكی خاوێن لەناو ســـینی پان دەكـــرایەوە هەتا ڕۆخی لەســـەر یەک ئاست تەنک دەكـــرا لە پاشـاندا دەیانخسـتـە ناو كـەمـێک ئاوی كـولاو لەسـەر ئاگر دادەنرا هەتا دەكـــولا، ئەوجـــا لەناو ڕۆن ســـوور دەكرایەوە و ئامـادە دەكرا بۆ خواردن، بەوە دەگـوترا كـوبەی مـێـوان، وەک كوبەی موسڵ بەناوبانگ بوو.

٧. چێـشـتـی دەی (١٠) مـانگی (محرم) عاشورا، بەشێک گەنمەكوتاو دەكولێنن لەگەڵ گۆشتی مەڕ یان گا یان مـریشک، هەتا دەنكە گـەنمەكـە دەتووڵێتەوە، هەنجیری وشک و مێوژ و گـوێز و باوی لەگـەڵیـدا دەكـولێنن ناوی دەنێن (عـــاشـــوراو)، ئەوە لە هەولێـر، بەڵام لە شـارەكـانی خـوارەوە برا موسڵمانە شیعەكان بە شێوەیەكی دیكە ئەو چێـشـتـە دروست دەكـەن، تەنیا گەنمە كوتراوەكە دەكولێنن لەگەڵ گـــۆشت پێی دەڵێن (هەریســـە)... لەگەڵ شەكر و دارچین دەخورێت.

٨. (لۆكە یان لۆركە): كـەمێک ڕۆنی ســـووركـــراوە ئاویان بەســـەردا دەكرد، پەیتا پەیتا ئاردیان تێدەكرد لەگـەڵ تێكدانی لەسـەر ئاگـر هەتا خـۆی دەگـرت، لە پاشـان دەكـولا بۆ مـاوەیەک، ئەوجا كـەمـێک نانیـان تێدەكوشی و دەیانخوارد.

٩. حـەلوای ئارد و شـەكـر: ئارد لەگەڵ ڕۆن سوور دەكرایەوە، لە پاشان شەكراویان بەسەریدا دەكرد، كەمێک هێلیـــان لە شـەكـراوەكـە دەكـرد و دەیانكولاند بۆ مـاوەیەک هەتا پەیت دەبوو، لە پاشـاندا كـەمـێک بادامی ســووركــراوە لەگــەڵ ڕۆن بەســەریاندا دەكــرد، ئەوە دەبووە حـەلوای ئارد و شەكر.

١٠. حـەلوای كـونجی و دۆشـاو:

ئەوەشیان کونجی و دۆشاوەکە لەگەڵ کەمێک نیشاستە، لەگەڵ ڕۆن لەناو مەقلی سووردەکرایەوە هەتا جوان پەیت دەبوو، ئەوجا دەیانهێنا خوار هەتا کەمێک سارد ببێت، لە پاشان دەیانخوارد.

### ئیش و کاری هەندێ لە دانیشتووانی قەڵای هەولێر ساڵی ١٩٢٢ کە لە ئامارەکەدا هاتووە

**لە ساماندارەکان:**
عەلی پاشا مەحموود ئاغا، جەبار ئاغا عەبدولڕەحمان (کانی)، ئەحمەد عوسمان ئەفەندی (یەکەم پارێزگاری هەولێر بووە) فەیسەل و ئەمیری کوڕی.

**زانا و طالب علم:**
شێخ ئیسماعیل شێخ جودە- عالم زانا، مەلا جبرائیل- طالب علم.

**سمکری (بەلوعەچی):**
فەتاح ڕەشید

**سەراج:**
کارەسوول حاجی محەمەد

**سەبزەچی:**
ئەیوب فەتاح و محەمەدی کوڕی، شێخۆ حاجی داود، حاجی محەمەد سەعدولگڵا و ئەحمەدی کوڕی، ئیبراهیم سەعید، عەباس کارەسوول، ئیسماعیل ئیلیاس و بیلال جەلالی کوڕی، ئەڵڵاوێردی دەرمان، خدر ساڵح ئاغۆک و مەقسوودی کوڕی، ئەحمەد شێخ یونس و فەتاحی کوڕی، کەریم نەجار یووسف، واحید خدر، حاجی ئیبراهیم، کەریم ئیبراهیم.

**خەفاف:**
مەجید عەبدولڕەحمان و (هەر سێ کوڕی) مەعروف و حەمید و خورەشید، سەید قاسم ئەڵڵاوێردی و کەریمی کوڕی.

**ئارد فرۆش:**
قۆجە ئوغی محەمەد

**پارێزەر:**
موختار ئەفەندی مەلا ساڵح (گەڕەکی سەرای)، حاجی عادل ئەفەندی (گەڕەکی تەکیە).

**مووچە خۆرەکان:**
ڕەئوف ئەفەندی خەلیل (فەرمانبەر)، مستەفا مەلا ئەمین ئەفەندی (کاتب شەرعی)، حەسەن حوسێن ئاغا (موەزیع)، محەمەد ئەفەندی سەفوەت ئەفەندی (کاتبی حیسابات)، ئیسماعیل سیبغەتوڵڵا ئەفەندی (کاتبی حیسابات)، شێخ یونس ئەفەندی جەسەن ئەفەندی (کاتبی دائیرەی نفوس)، عەبدولکەریم ئەفەندی (مەئمووری دائیرەی تاپۆ)، یەحیا عەبدولڕەزاق ئەفەندی (کاتبی دائیرەی تاپۆ)، یونس ئەفەندی مەحموود ئەفەندی (ئەمین سندوق)، شوکری ئەفەندی (مفەوەز شورتە لە گەڕەکی تەکیە)، یەحیا ئیسماعیل ئەفەندی (فەراش).

**لێخوڕ (شوفێر):**
محەمەد عەلی بەغدادی، جەواد (ئەستانبول)، ئیبراهیم (بەغدا).

**موسلمانی عەرەب:**
مەحموود ئەحمەد، سەعید ئەفەندی تەقیەدین ئەفەندی.

**موختارەکان:**
موختاری گەڕەکی سەرای ناوی (محەمەد حەمادی لوتفەتوڵڵا ئەفەندی)، موختاری گەڕەکی تەکیە ١ (جەلال عەبدول)، موختاری گەڕەکی تەکیە ٢ (حاجی عەلی).

**بەرگدرووەکان (خەیات):**
محەمەد تەرزی سولتان، حەسەن قادر، ئیبراهیم حاجی خەلیل، یونس سەعدوڵلا، شێخۆ عەبدولواحد و عەبدولواحدی کوڕی، عەلی یەحیا ئەفەندی و شەهابی کوڕی، مەجید حەمواس و تاهیری کوڕی، مستەفا حاجی عەبدوڵڵا و محەمەدی کوڕی، ئیبراهیم عەبدولسەمەد، خدر سلێمان.

**بەقاڵەکان:**
حەسەن عەبدولڕەحمان، ئیبراهیم سەعید ئاغۆک، حەسەن حەلیم، سەید خەلیل حەسەن، دەروێش حوسێن ئەمین، حاجی عەزۆ ئیسماعیل، حاجی ڕەشید ئەمین، حاجی ئیبراهیم محەمەد، هیدایەت سۆفی ئیسماعیل، لەتیف سەرخۆش، سەمین کەریم و کوڕانی، ئیبراهیم قادر و خەلیلی کوڕی، حوسێن قادر، نادر قادر، عەبۆ وەلی، ئیبراهیم حەسەن بەکر، حاجی محەمەد عوسمان، عەبدولڕەحمان سەرخۆش،

محەمەد سەلمان، عوسمان سەرخۆش و ئەحمەدی کوڕی، عەزیز عومەر ئاغا، حەسەن شێخۆ و تەهای برای، یەحیا حاجی فەتاح، عەبدۆک عەلی موسلی، مستەفا محەمەد، پیربال حاجی عەزۆ، مەحموود حاجی محەمەد، عومەر حاجی محەمەد، عەبدوڵڵا مەعرووف، جومعە حوسێن، لەتیف حوسێن، حاجی عومەر سلێمان، یونس سەلیم یوشبناغ، فەتاح حاجی خدر، چەلەبی محەمەد، یاسین جەمیل، عەباس یووسف، محەمەد غەفوور، ئیبراهیم سەعید، عەزۆ ماوەران، شاکر سەلمان، محەمەد سلێمان، محەمەد خدر، سەید محیەدین ئەڵڵاوێردی، شێخ محەمەد حەوێز، قادر بەکر ئەحمەد بەکر، محەمەد ئەحمەد، ئیسماعیل ئەحمەد، عەبدوڵڵا محەمەد، خەلیل عەبدوڵڵا، مستەفا حاجی مەعرووف، سەعید مەحموود، حاجی خورەشید یووسف، تەها قادر، پیرداود حوسێن و هەرسێ کوڕی- فەتاح و عەبۆ و کەریم، مەلا لەتیف مەلا فایق، حوسێن قادر و هەردوو کوڕی قادر و حەسەن، سەعد حەسەن ئەلیاس، نادر قادر، مەحموود قادر، ئیبراهیم حەسەن بەکر، عەزیز و واحدی کوڕی، حاجی محەمەد عوسمان، پسمام شێخۆ محەمەد.

**تووتنچی:**

عەبدوڵڵا موسا، عەبدوڵڵا مەحموود، مەهدی عەزیز ئەفەندی موسلی، شەریف ئەلیاس.

**ناڵبەند:**

محەمەد ئەمین ئەحمەد، عەزیز وەستا عەلی، شەریف هیدایەت، عەبدوڵڵا ساڵح، قۆچە شاکر حاجی حەلاق، عەبدولسەمەد مەلا عوسمان حاجی ئەمین، شێخ محەمەد قادر.

**جوتیار:**

جەمیل ئاغا عەزیز ئاغا، سەید محەمەد سەید عەبۆ ئاغا، عەبدولوەهاب حیکمەت ئاغا، لەتیف یەطخا حاجی ساڵح، سەعید ئەفەندی تەقیەدین، خەتاب ئاغا مەلا ئیسماعیل.

**ئاسنگەر (حداد):**

مستەفا سەعدوڵلا، شاکر دمیرجی کەریم، وەستا قادر قۆچە، جەرجیس قادر، حاجی خدر قادر، عەزیز شێخۆ، خەتاب ئەحمەد، شێخ یونس مەحموود، ئەلیاس ئۆستا هیدایەت، عومەر ئۆستا مەولوود، سابیر حاجی شێخەڵڵا.

**بازرگان (تاجر):**

حوسێن عەبدولکەریم، فەتاح حاجی قادر، حاجی رۆستەم حاجی ئەلیاس- قۆچەی برای، عوسمان قۆجە، سەید حەسەن سەید مەحموود، حاجی مەلا حەسەن حاجی مەلا قادر- ئەمین و عارفی کوڕی، حاجی مەحموود حاجی قادر- ئەحمەدی کوڕی.

**کوتاڵ فرۆش (بەزاز):**

شێخ تەها مام عەلی، حاجی عەلی خەلیل و عەزیزی کوڕی، حاجی عەزۆ ئیسماعیل و شێخۆ و ئیسماعیلی کوڕی، عەبدولسەمەد حاجی عەلی، یونس حاجی عوسمان، ئیبراهیم عەزیز، حاجی نورەدین ئەمین و جەمیلی کوڕی، حاجی شێخۆ حاجی یونس، حەسەن حاجی هیدایەت، حەیدەر شخیل.

**مزگەوتەکان**

جگە لە مزگەوتی گەورەی قەڵا لە گەڕەکی تۆپخانە بوو ئەم مزگەوتە بچووکانەش هەبوون:

مزگەوتی یا مەدرەسەی مەلا رەسوول ئەفەندی، مزگەوتی حاجی مەلا ئیبراهیم دۆغرەمەچی لە لای چەپی قەڵا بوو، مزگەوتی فەقێ مەلا ئیبراهیم.

**ئیمامی مزگەوت:**

محەمەد کەریم ئەفەندی (ئیمامی مزگەوت)، خەلیفە محەمەد مام عەلی (ئیمامی مزگەوتی سەرا)

**مەلایەکان:**

مەلا ئەمین، مەلا تەها عەتار، مەلا شاکر، مەلا یونس ناجی یاسین (بووە بە نووسەری یەکەمی دادوەر)، مەلا شەوکەت باوکی مەلا محەمەد قازی، مەلا ناسیح باوکی نافیع جەبار، مەلا ساڵح خۆشناو لە مزگەوتی مەلا رەسوول ئەفەندی، محەمەد مەلا قۆجە عەتار، مەلا رەشید فەتحوڵلا، مەلا تۆفیق مامی (خەلیل دادنساز)، مەلا ئیسماعیل باوکی خەتاب ئاغا، مەلا رەشید ساڵحە سوور، مەلا تەها ساڵحە سوور، مەلا حوسێن حەمبال، مەلا محەمەد نەجاح، مەلا کەریم باوکی خەلیل و باپیری هەر یەک لە جەلال و

جەمال و عادل و هادی، مەلا کەریم باوکی عەساف کانەبی (ئەرز و حاڵچی)، مەلا حوسێن باوکی محیەدین نەژاد بەرزنجی، مەلا نوری کنێر، مەلا یووسف باوکی عەونی یووسف.

**تەکیەی پیاوان لە تۆپخانە:**

تەکیەی مەلا ساڵح، تەکیەی مەلا خدر خەلیفە شێخ رەشید، تەکیەی شێخ شەریف خەلیفە، شێخ عەلی تاڵەبان.

**تەکیەی ژنان:**

خەلیفە فاتیمە نەقشبەندی- لە گەڕەکی سەرای، خەلیفە فاتیمە خوشکی حەمادی- لە گەڕەکی سەرای، خەلیفە میدۆشی خوشکی خەلیل کەریم.

**سەردولکە بێژەکان:**

ریبو حەمەدۆکە، لە بەندی خەجۆ، هاجر دایکی خەلو ئیبراهیم.

**کەنیشتە:**

کەنیشتەیەکی جوولەکەکانیش لە قەڵای هەولێر لە گەڕەکی تۆپخانە هەبوو.

**چاخماقچی (سکاکین):**

عەلی قاسم، خدر عەلی، صوفی حەسەن مەحموود، حوسێن عەلی.

**طباق (خمچی):**

وەیسی عەبدوڵلا و شاکری برای، سەلیم قاوەچی محەمەد، جەبار سەعید، لالی تۆفیق.

**قوتووچی (ئەو شتانەی لەنێو قوتوو دەفرۆشران):**

عەزیز وەیسی، شێخۆ قادر چەلەبی، شاکر مستەفا، سلێمان سەید مەولوود، عالی شەهباز، مەلا مستەفا حاجی ئیسماعیل، شێخ محەمەد سۆفی، مەلا عوسمان سەعدوڵلا، ئەحمەد سلێمان عوسمان و هەر چوار کوڕی محەمەد و رەشید و وەهاب و رەشید، مەلا وەسمان حاجی، محەمەد فەقێ حاجی سەباح، محەمەد سابیر مەلا ئیسماعیل.

**حەمامچی:**

بەکر فەتاح گەرماوچی، هەردوو کوڕی (عەبدولجەبار و جەلال).

**چایەچی:**

عوسمان مستەفا، جومعە ئیسماعیل و قادری برای.

**مسگەر (صفار):**

نادر قادر، شاکر ئیسماعیل، قادر حەسەن و کوڕانی مەعرووف و مەردان، بەدرەدین عەبدولڕەحمان، حاجی کەریم ئۆستا سەلیم، عوسمان سەقا مەولوود.

**حەلاق (سەرتاش):**

مەجید ئیسماعیل، وەهاب مەحموود، قادر محەمەد، ئیبراهیم مەولوود، ناجی عەبدوڵلا، تۆفیق محەمەد.

**وەستای بینا:**

ئیبراهیم مەولوود و محەمەدی برای، داود شێخۆ، فەتاح شێخۆ، شەهاب شێخ یونس.

**خاوەنی دینگەکان:**

حەمە عەلی لە شێخ ئۆمەرە، شێخۆ حەمید لە شێخەڵلا، لە گەڕەکی تەعجیل حەمە مەحموود ئیسماعیل بوو، کە ناسراو بوو بە حوشترەوان.

**نەجار (دارتاش):**

محەمەد نەبی رەشید، داود شێخۆ، فەتاح شێخۆ، ساڵح رەحۆ،، حاجی عەبدولجەبار، بەکر مستەفا، سلێمان قادر، سەلمان قادر، عەبدوڵلا فەتحوڵلا، مەولوود حوسێن، تۆفیق محەمەد، مەوجود ئەحمەد، محەمەد عەباس، ئیسماعیل ئەحمەد، مەحموود حەسەن، عوسمان سەقا مەولوود، محەمەد ئیبراهیم ئاغا، حاجی عومەر سەید ئاغە و کوڕەکانی عوسمان و بەکر و مستەفا.

**مامانەکان:**

شازەمان، حەوا خان، مریەم خان.

**(سەقا) ئاو فرۆش لە گەڕەکی سەرای:**

لەتیف محەمەد، جەبار عەزیز بەشیر، یونس عەبۆ، سۆفی عەزیز، شێخۆ وەهاب، سەعید محەمەد.

**(سەقا) ئاو فرۆش لە گەڕەکی تۆپخانە:**

سەعید سەقا، لەتیف سەقا، ئەسود سەقا، ئەحمەد سەقا، عوسمان سەقا، شمبیل شەفیق سەقا، عەبۆ سەقا.

**(سەقا) ئاوفرۆش لە گەڕەکی تەکیە:**

سالح سەقا، نوردەدین سەقا، محەمەد سەقا، وەهاب سەقا.

**عەتار (وردەواڵە فرۆش):**
جەبار وەهاب، خدر سلێمان، داود خەلیل.

**زێرینگەر:**
ئەحمەد خروفە محەمەد موسلی.

**قەساب:**
حەسەن حاجی ئەلیاس، حوسێن مەقسود، شەهاب ئاغا سەلیم ئاغا، محەمەد (گەرەکی تەکیە)، ئەحمەد رەشید، سلێمان ئەحمەد، قەساب عەلی سالح ئاغا، جەواد مەقسوور، شێخۆ سۆفی، محەمەد ئەمین سولتان ئاغا، داود عەبۆ ئاغا، فەتاح سەعید، ئەحمەد قادر.

**کرێ چییەکان:**
ئیبراهیم هەینی، خەلیل مەلا ناسر، بەیتار هیندی، فەقێ عەبدولرەحمان، سەرخۆش رەشید، حەقی عومەر ئیبراهیم قەساب، سەلیم حاجی کارەسول، محەمەد ئەمینی وەلی، سەید محەمەد سەید ناسر، عەبۆ رەشید (مستەفا قەساب)، عەبدولوەهاب حیکمەت ئاغا، سلێمان شەریف، عەبدوللا ئەفەندی، خەتاب مەحموود، مەعروف خەتاب، شاکر محەمەد، تۆفیق ئیسماعیل، محەمەد عەبدولسەمەد،، قادر حەمەد خەلیل، محەمەد مەلا ئۆستا (محەمەد حاجی خدر)، مەلا سەعدوللا، مەلا شێخ عایید.

**حەماڵ:**
عەلی قاسم، خدر عەلی، سۆفی حەسەن مەحموود، حوسێن عەلی.

**خادم:**
قادر حەسەن، عەلی عوسمان، فەقێ محەمەد.

**سبیلاتی (سبیلە- قەلنە) لە قور دروستکراو:**
شێخۆ مەحموود قەساب و محەمەدی برای.

**بەیتار:**
هیندی

**بەیار:**
پسمام شێخۆ محەمەد و موحیەدینی کوڕی

**مامۆستای سەرەتایی:**
حاجی عەبدولکەریم ئەفەندی

**فانوس هەڵگری شەو:**
عومەر ئەحمەد و سابیری کوڕی، بەکر ئەحمەد، حاجی تاهیر عیزەت ئەفەندی و کوڕی.

**شەکرچی:**
شێخۆ سدیق، محەمەد رەجەب حەلوەچی.

**خانچی:**
ئەحمەد مەحموود.

**پەرچی (نداف):**
ئەحمەد شێخ یونس

**مخللات (تورشی فرۆش):**
عوسمان دەروێش

**قۆلچی (پاسەوان):**
حوسێن ئەفەندی کەرکووکی، شاکر مستەفا، عەبدولرەزاق ئەفەندی عەبدولوەهاب و جیهادی کوڕی.

**دقاق رز (برنج کوتانەوە):**
سالح ئەحمەد و عوسمانی کوڕی، پسمام ئەحمەد و حەسەن و محەمەدی کوڕی، سالح ئەحمەد و عوسمانی کوڕی.

**قاوەچی:**
عەبۆ سلێمان و کوڕەکانی سالح و شەریف و عەلی و مستەفا

**موئەزن (بانگدەر):**
مەلا فەتاح مەلا محەمەد موئەزن و کوڕەکانی مەلا ئیبراهیم و مەلا ئەمین و یحیی و یونس

**کاسب:**
تاهیر محەمەد سالحی برن، ئەمین حوسێن خواز، نادر محەمەد شاکر عەبدولقادر و فەتاحی کوڕی، فەتاح شەریف و محەمەد حەمیدی کوڕی.

**بوستانی (باغچەچی):**
جەرجیس یونس و رەشیدی برای، خەلیل حاج عەلی و مەعرووفی کوڕی، ئەسعەد مەلا سالح، عوسمان سلێمان عەبدولواحید و کوڕی، یونس جەرجیس و حەیدەری کوڕی.

**خانچی:**
ئەحمەد محەمەد.

**هەندێ زانیاری لەبارەی دانیشتووانی گەڕەکی سەرای قەڵای هەولێر لە ئاماری ١٩٢٢دا**

١. حاجی ساڵح- حاجی قادر دەباغ زادە و براکانی بە بازرگانی پێستە و خوریان بۆ دەرەوەی وڵات دەنارد، بۆیە بە دەباغ ناسران، چوار برای هەبوو.
٢. حاجی مەحموود حاجی قادر دەباغ.
٣. فەتاح حاجی قادر دەباغ.
٤. شهاب حاجی قادر دەباغ، بە نازناوی (چەلەبی)یش ناسراون و باوکی دکتۆر عەبدولڕەزاقە.
٥. وەلی چەلەبی حاجی قادر، ئەوەیان لە سەرەتای بیستەکان مردووە.
٦. هاشم دەباغ کوڕی وەلی چەلەبی بوو.
٧. ئەحمەد چەلەبی کوڕی حاجی مەحموود-ی دەباغ.
٨. عەبدولخالق چەلەبی کوڕی ئەحمەد چەلەبی بوو.
٩. محەمەد چەلەبی کوڕی فەتاح چەلەبی باوکی دکتۆر کامیران دەباغ.
١٠. موعتەسەم دەباغ- پارێزەر بوو.
١١. حاجی ڕۆستەم چەلەبی کوڕی حاجی ئیلیاس.
١٢. قۆجەی برای ئەوانە بە نازناوی قەساب دەناسرێن.
١٣. عوسمان قۆجە- بەڕێوەبەری دواناوەندی و سەرپەرشتیاری پسپۆری هەولێر بوو.
١٤. شیت مستەفا.
١٥. بەشیر مستەفا دەوریان دیارە لە پێناو کوردایەتی.
١٦. یونس مستەفا
١٧. عەلی پاشا کوڕی مەحموود ئاغای دۆغرەمەچی- ئەندامی پەرلەمانی ڕژێمی پاشایی عێراق بوو.
١٨. فەتاح شەریف.
١٩. مەجید-ی کوڕی- لە کوردایەتی دەوری هەبوو.
٢٠. ئیحسان دۆغرەمەچی و تەحسینی برای پارێزەر بوو، لە دەرەوەی وڵاتن، هەردووکیان کوڕی عەلی دۆغرەمەچین.
٢١. جەبار ئاغا عەبدولڕەحمان (کانی) شاعیرێکی کورد پەروەر بوو، دۆغرەمەچییە.
٢٢. بورهان (جاهید)ی برازای کانی، ئەویش شاعیر بوو.
٢٣. تەها ئاغا- ناوی کوڕەکانی ئەوانە بوون (سەعید، یونس، محەمەد مستەفا، حاجی ئەحمەد ئاغا، ئەوانە لە بنەماڵەی عوزێرینە، مەلا شەرەفیشیان پێ دەڵێن)، کوڕەکانی حاجی ئەحمەد ئاغا-ش ئەوانەن (قادر، عەلی، ئیحسان، محسن).
٢٤. سەید جەمیل سەید کەریم، بە ڕەچەڵەک دەچنەوە سەر کوردەکانی (غازی عنتاب) لە تورکیا، سەید جەمیل باوکی فەریق-ە مامۆستای سەرەتایی بوو، ئێستا لە دەرەوەی وڵاتە.
٢٥. محەمەد عەلی موختار- باوکی عومەر فەوزی و عەدنان-یە.
٢٦. حاجی ئیلیاس ئاغا- چوار کوڕی هەبوو (حەسەن، حەیدەر، ئەنور، ڕۆستەم، چەلەبی) ئەنوەر-یان مامۆستای سەرەتایی بوو، قۆجەی برای حاجی ئیلیاس-یش- باوکی عوسمان قۆجە-ی بوو، بەڕێوەبەری دواناوەندی هەولێر بوو.
٢٧. عەبدوڵلا حیلمی حاجی عومەر ئاغا- دوو کوڕی هەبوو، عەبدولڕەحمان چەلەبی و سەمەدیان- دوو کوڕی هەبوو عومەر و سەعید، بەڵام عەبدولڕەحمان-کوڕی نەبوو.
٢٨. عەبدولڕەزاق ئاغا فەتحوڵلا ئاغا زادە- چەند جار بۆتە سەرۆک شارەوانی هەولێر لە سەردەمی عوسمانیدا.
٢٩. پیربال ئاغا لە سامانداردەکانی ناسراوی شاری هەولێر بووە.
٣٠. خدر چەلەبی، لە سامانداردەکانی ناسراوی شاری هەولێر بووە.
٣١. محەمەد ئاغا مەحموود ئاغا، برای عەلی پاشا دۆغرەمەچییە، دەبێتە باوکی ڕەفعەت ئاغا، کە لە چلەکان بەڕێوەبەری ناوەندی و دواناوەندی و پەروەردەی هەولێر بوو... دکتۆر عادل-ی پزیشک کوڕی محەمەد ئاغای مەحموود ئاغایە.

عەبدوڵلا حیلمی حاجی عومەر- باوکی عەبدولڕەحمان چەلەبی کە یەکەم کەس بوو بەنزینخانەی لە هەولێر دانا پاش هێنانی ئۆتۆمبێل بۆ شاری هەولێر لە چلەکان بە شەراکەت لەگەڵ هاشم چەلەبی دەباغ.
عەبدولسەمەدی برای تاکە کوڕێکی هەبوو بەناو سەعید، لە

سالّی ١٩٤٦ز لە تەمەنی لاویدا وەفاتی کرد، مستەفا حیلمی برای عەبدوللا حیلمی سێ کوڕی هەبوو: (شیت مستەفا حیلمی، بەشیر مستەفا حیلمی، یونس مستەفا حیلمی)، ئەوانە دەورێکی بالآیان لە کوردایەتیدا هەبوو.

سەید ئەحمەد پاشا، بنەماڵەی ئەحمەدیەکانی شاری هەولێرن، لە نەوەکانیان زیوەر ئاغا و حاجی سوار ئاغا.

ئیبراهیم عاسم ئەفەندی حەیدەری- باوکی داود بەگ کە وەزیری دارایی بوو لە سەردەمی رژێمی پاشایی لە عێراقدا.

٣٢. محەمەد ئاغا مەحموود ئاغا- برای عەلی پاشا دۆغرەمەچی و کوڕەکانی (د. عادل و رەفعەت ئەفەندی).

٣٣. شاکر مەلا رەشید و بەکر-ی برای، مەلا شاکر ئەوەیان ئیجازەی عیلمی مەلایەتی وەرگرت و مامۆستای زمانی تورکی بوو.

شێخ شەریف شێخ عەبدوللا- ئەم لە گەڕەکی (تکیە)ی قەلا، تەکیەی بەناوی تەکیەی شێخ شەریف ناوبراوە قادری کوڕی شێخ شەریف باوکی شێخ فوئاد و شێخ دلّشادیە. تەکیەکەیان تێکچوو لەبەر کۆنی. ئێستا تەکیەیەکی نوێیان دروست کردووە لە سالّی ١٩٨٥ لە گەڕەکی ئازادی.

٣٤. رەشید ئەفەندی ئەحمەد ئەفەندی: باوکی خالس و ناسح.

٣٥. مستەفا مەلا ئەمین ئەفەندی برای ئەحمەد نەجار-ی بانگدەر و قادر نەجار ئەم مستەفایە کاتبی مەحکەمەی شەرعی بوو، دوا جار بوو بە ئیمامی مزگەوتی نەجارەکان. ئەحمەد نەجار-یش باوکی (د. شێرزادی)یە، حەسەن حەلیم بەقالّ بوو دوکانەکەی لەناو بازێڕی نەجاران بوو.

موختار ئاغا سەلیم ئاغا- دەبێتە باوکی (حەی؟؟ر، جەبار، یونس، حوسێن، سەلیم)، سەلیمیان مامۆستای سەرەتایی بوو.

عوسمان سەید عومەر ئاغای سەید ئەحمەدی باوکی (قەرەنی و نازم ئاغا)، زیوەر ئاغای کوڕی سەید ئاغای- سەید ئەحمەدی باوکی حاجی سوار ئاغایە.

٣٦. شەریف ئەفەندی حاجی مەلا سەعید ئەفەندی، دەبێتە باوکی شاکر شەریف، سەعدەدین شەریف سەعدەدین بە جوانە مەرگی مرد. شاکر- یان باوکی (محەمەد زیاد)یە، ئێستا لە دەرەوەی کوردستانە و لە ئەلّمانیایە.

٣٧. ئەوانە کاریان بەزازی بووە و بنەماڵەکەیان بە دۆغرەمەچی ناسراون (ئیبراهیم عەبدولقادر دۆغرەمەچی).

خەیزوللا حاجی عبد الکریم خۆشناو- یەک لە چوار ئەفسەرە شەهیدەکانی کۆماری کوردستانە... لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٥٧دا لە سەردەمی رژێمی پاشایی عێراقی شەهید کران.

### هەندێ زانیاری لە بارەی دانیشتووانی گەڕەکی تەکیەی قەلای هەولێر لە ئاماری سالّی ١٩٢٢دا

* یاسین خورەشید دارتاش رەشادی باوکی (حاجی نەجات-ی بەڕێوەبەری شارەوانی هەولێر) و پەرلەمانتار لە پەرلەمانی کوردستاندا.

* محەمەد تەرزی/ حەمە سولّتان- ی باوکی حاجی سادق و حاجی فایق- ی بەرگدروو و بازرگان.

* مەقسوود خدر سالّح ئاغۆک (هێل و دارچین فرۆش) بوو.

* غەفوور عەلی چەلەبی- کتێبی ئایینی دەفرۆشت لە بازاڕی قەیسەری- دەبێتە خالّی (محەمەد تاهیر- ی کوردی مەکی شافعی خۆشنووس) کە لە سعودیەیە.

* سەید مەردان سەید قادر- ی کەرکووکی- باوکی (ئەنەس و وەهاب) بانگدەری مزگەوتی قەلای هەولێر، مەلا فەندی لە سالّی ١٩٢٠ بە مالّ و خێزانیەوە هێنایە هەولێر لەبەر دەنگ خۆشی.

* ئەحمەد عوسمان ئەفەندی باوکی فەیسەل و زەید و ئەمیر، چەند سالّێک نائیبی پەرلەمانی سەردەمی پاشایی عیراق بوو، لە هەولێریش سەرۆک شارەوانی و موتەسەریف بووە!

* شێخ یونس ئەفەندی حەسەن ئەفەندی/ تاهیر- ی برازای- دەکاتە باوکی نیازی ئامۆزای ئەنوەر عەبدوللا دلّسۆز-ە.

* داود ئاغا سەعید ئاغای یەعقوب ئاغای قاسم بەیاتی باوکی حاکم قاسم و نازم ئاغا و عەبدولقادر-یە.

* حاجی مەلا ئیبراهیم-ی مەلا هیدایەت باوکی سەلیم-ی سەلیم-یش، دەبێتە باوکی یەحیا و فەتاح-

ی دەوریان هەبووە لە کوردایەتی لە چلەکان، عەساف نادر لە تاپۆ فەرمانبەر بوو.

* سەیدۆک عەبد مەلا عیسی- باوکی سەلیم و کەریم، مەجید و ئەمین و سابیر- ئەمین- ماوەیەک بانگدەر-ی مزگەوتی حاجی سالح-ی دەباغ بوو لە چلەکان- ئەوانە لە بازار کاری ئاسنگەریان دەکرد لە بازاری هەولێر.

* عەبدولرەزاق ئاغا خورەشید ئاغا عالمزادە باوکی حاکم حەیدەر دەبێتە باپیری حاکم تەحسین یاسین-ی لە لای دایکییەوە، عەبدولڕەزاق ئاغا لە سەردەمی عوسمانییەکان سەرۆک شارەوانی هەولێر بووە. مەعرووف ئاغای برا- شی باوکی عزەدین مەعرووف ئاغایە نادر ئاغای برا-شیان باوکی دکتۆر مستەفا-یە.

* حاجی حەسەن چەلەبی، عیسی فهمی لە پێشدا مامۆستای سەرەتایی بوو. دواجار چووە خوێندنی باڵاتر، شەهادەی دکتۆرای وەرگرت لە بەیتەری... عەبدولوەهاب-ی براشی ئەندازیار بوو لە پاشتر بەڵگەنامەی پارێزەریشی لە یاسا وەرگرت لە زانستگای بەغدا. لە ساڵی ١٩٥٨ز کرا بە سەرۆک شارەوانی بۆ ماوەی پێنج ساڵان، هەتا ساڵی ١٩٦٣ز لە سەردەمی سەرۆکایەتی شارەوانی هەولێر. لەو کاتە شارەوانی هەولێر رۆژنامەیەکی هەفتانەی دەردەچواند بە ناوی (هەولێر) لە چاوپێکەوتنێکدا خوالێخۆشبوو عەبدولوەهاب گوتی: جارێکیان ئەم بەدرەدین عەلی-یە بە دوایدا ناردم و پێی وتم: ئەگەر ئەو لاوە

رۆشنبیرانەی ئەورۆ هەر نووسینێکتان بۆ بنێرین نووسینەکان فەرامۆش بکەن، چونکە ئەوانە (مخرب)ن منیش گوێم نەدایە فەرمانەکەی، چەند نووسینێکیانم بڵاو کردەوە و خستمییە ژێر چاودێرییەوە، هەڕەشەی لێ کردم و گوتی: جارێکی دی فەرمانەکەم بە جێ نەگەیەنی ئازارت دەدەم، دواجار هەر وازی لێنەهێنام، چەند راپۆرتێکی ناشیرینی بە دژ من نووسیبوو بۆ ئازاردانم...

* ئەمین وەستا سەلیم، باوکی ئەم بەرێزانەی خوارەوەیە (یونس و بەکر و مەولوود)ە، ئەم وەستا سەلیم-ەی باوکی دەبێتە مامی راستەقینەی قازی محەمەد-ی شەهید، سەرۆک کۆماری کوردستان، لە کاتی خۆیدا لەسەر جموجۆڵی رامیاری لە گرتووخانەدا بەند دەکرێ و لە پاشاندا شەوێک لە شەوان لە هەلێکی لەگەڵ چەند کەسێک رادەکەن، هەر بەم شەوە خۆیان دەگەیەننە کاروانچییەکانی سنووری عێراق، پاش گۆڕینی جلوبەرگیان دەرباز دەبنە عێراق، ناوی خۆی کە (مونیر) بووە دەیگۆڕێ بە وەستا سەلیم لە هەولێر دۆستایەتی پەیدا دەکات و لەگەڵیان دەچێتە موسڵ، لەوێ هەموویان مسگەر بوون دەست بەکاری مسگەرایەتی دەکات، لە هەولێر پێیان دەگوتن سەفارچی (قازانچی/ مەنجەلکەر) خوشکی دەخوازێ ناوی گورجیە خان دەبێ خەڵکی گوندی (ترپەسپیان) دەبن لە کەندێناوە، ئەم ئافرەتە دەبێتە پارێزەری خوالێخۆشبوو (عەونی یوسف).

* عومەر حاجی سەلیم- دەبێتە

برای ئەمین حاجی سەلیم.

* عەلی حاجی شەریف برای وەلی حاجی شەریف- ئەوانە لە هەولێر لە بازاری بەقالەکان بوون، دوو کوری هەبوون (خدر و خەلیل) ئەوانەش کاری باوکی خۆیان کردووە.

* عەبدولرەزاق ئەفەندی قولی- پاسەوان جیهادی کوڕی لە دەرچووانی (دار المعلمین الابتدائیة) ساڵی ١٩٤٢ز بوو.

* شاکر حاجی سادق و قۆجەی برای، کە ناوی راستەقینەی سەلیم بوو، دەبێتە باوکی (رەئووف قۆجە)ی بەرێوەبەری پۆلیس فازڵ سەلیم.

* عەبدولڕەزاق حاجی حوسێن-ی دەباغ برای فەتاحی دەباغ، دەبێتە باوکی نورەدین عەبدولڕەزاقی دەباغ کە ئێستا موختاری گەڕەکی شۆڕشە لە هەولێر باوکی فەیسەڵ دەباغی سەرنووسەری گۆڤاری هەولێر.

* حاجی عەبدولکەریم ئەفەندی کۆیی- ئەم زاتە مەلا بوو بە جوبە و مێزەر مامۆستای سەرەتایی بوو لە هەولێر لە (مدرسه اربیل الاولی) و خۆشنووسێکی زۆر دەستڕەنگین و کارامە بوو.

* عەبدولڕەحمان ئاغا تاهیر ئاغا باوکی مەحموودی بەقاڵ، جەبار باوکی ئەندازیار ئەمیری سەرۆک شارەوانی هەولێر بوو، مەحموودیشیان باوکی فەتاحی حاکم بوو، کوڕێکی دیکەیشی هەبوو بەناوی عەبدولڕەزاق مەحموود ئەویشیان لە بەغدا موفەتیشی عام بوو لە بەڕێوەبەرایەتی هێڵی شەمەندەفەر.

* عەساف شێخ یونس- کاتبی

تەحریرات بوو لە موتەسەریفیەتی هەولێر، شەهاب شێخ یونس وەهاب شێخ یونس- برای هەردووکیان وەستای زۆر بوون بەناوبانگ بوون لە کاری بیناسازیدا.

* چەلەبی محەمەد- دوکانێکی خنجیلانەی هەبوو لەناو دەرگەی قەڵا عەتار بوو، باوکی جەمیلی چایچی بوو، شوێنەواری چایەخانەکەی ئێستا چێشتخانە و کەبابخانەی هەولێرە، چوار کوڕی هەبوو (جەمیل محەمەد، مەحموود، عومەر، جەبار).

* دەکاتە باوکی خانەقینی.

* محەمەد غەفوور و ئەحمەد غەفوور دوو برا بوون کاری دارتاشیان دەکرد لە بازاڕی دارتاشان، ئەحمەد سلێمان باوکی حەیدەر، سەلیم، سلێمان بوو، سەلیمیشیان دارتاش بوو، ئەوانەش بوون لە هەولێر لە بازاڕی دارتاشان لەگەڵ چەند موسڵمانێکی ئایینپەروەر ئەم مزگەوتەی بەرامبەر دوکانی سەید مەحموود حاجی حەسەنی شەکرچیان لە ناوەندی بیستەکان بنیاتنا.

* حەسەن حاجی هیدایەت- ناسراوە بە حەسەن هیدۆش، باوکی حەیدەر و شێخیل بوو، برای وەستا عەباسی ئاسنگەر بوو، ئەوانە لەسەر زمانی نەوەکانیان دەڵێن: ئێمە لقێکین لە میرەکانی پاشای سۆران، حەسەن حاجی هیدایەت مزگەوتەکەی دەکەوێتە نزیک چایخانەی بایز لە هەولێر (مزگەوتی حەسەن بەزاز و شێخی باوکی دکتۆر کامەران و مازن).

* فایق ئاغا سەلیم ئاغا برای حەیدەر سەلیم ئاغا، کە روتبەی عەسکەری عەقید بوو لە ئوردووگای هەولێر، ئەوانە برازای نورەدین ئاغا و موحوسێن ئاغان، موحوسێن ئاغا و محەمەد ئاغا بۆ ماوەی (٣٠) ساڵ سەرۆک شارەوانی هەولێر بووە، هەر لە ساڵی ١٩٢٨ز هەتا ١٩٥٨ز.

* حاجی یونس عەبۆی ئاسنگەر- دەبێتە باوکی غولام شا و کاکە حەمەی باوکی مامۆستا موزەفەر.

* عەبدولڕەزاق ئیبراهیم- واتا حاجی مەلا ئیبراهیم دۆغرەمەچی، برای عەبدولقادری دۆغرەمەچی.

* مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی حاجی عومەر ئەفەندی، کە ناسراوە بە (مەلا گچکە)، دەبێتە باوکی عیزەدین و قاسم، عیزەدین بوو بە ئەندامی پەرلەمانی عێراق لە پەنجاکان و ئازادی کوڕی عیزەدین وەزیرە لە حکومەتی کوردستان.

* ئیبراهیم یوسف ئەفەندی ئامۆزای رەشاد ئەفەندی خاوەن زەوی و زار و سامانداربوو، باوکی عەبدولباقی بوو.

* محەمەد ئەفەندی و عوسمان ئەفەندی موفتی هەولێر بوو، باوکی ئەم بەڕێزانەی خوارەوە بوو رەشید، رەشاد ئەفەندی، فەتاح، سەعید.

* حاجی شیخۆ حاج فەتاح.

* محیەدین- کوڕی و (دکتۆر محەمەد شێخۆی کوڕی) پووری دکتۆر محەمەد شێخۆی خوشکی خان خێزانی شێخی چۆلی بوو (ژنی سێیەمینی بوو) نەوەی نەبوو.

* فەخری ئەفەندی ئەمین ئەفەندی- لە سەردەمی موحسێن ئاغای سەرۆک شارەوانی هەولێر فەرمانبەر بوو لە شارەوانی هەولێر.

* سەید موحیەدین ئەڵلاویزی بەقال- باوکی (محەمەد عەلی و شەمسەدین و عیزەدین)ە، ئێستا نەوەیان سەید بیلالە لە بازاڕی بەقالان ماست و پەنیرفرۆشە لەگەڵ کاری بەقاڵیش.

**هەندێ زانیاری لە بارەی دانیشتووانی گەڕەکی تۆپخانە لە ئاماری ساڵی ١٩٢٢دا**

* مستأجر/ کرێچی سەید محەمەد سەید عەبۆ ئاغا باوکی (سەیدەوان و هاشم و عەلی ئەفەندی و نادر ئاغای ئەسعەدی دوو برا بوون) عەلی ئەفەندی باوکی (فوئاد و ئەدیب و نەسرەت و ئیکرام) بوو، فوئاد مامۆستای سەرەتایی بوو لە ساڵی ١٩٣٣ز خوێندنی باڵای تەواو کرد.

* عەبدولوەهاب حیکمەت ئاغا برای رەسوول ئاغای ئەسعەدی، عەبدولوەهاب ئاغا، فەرمانبەر بوو لە شارەوانی هەولێر لە سەردەمی موحسین ئاغا سەرۆک شارەوانی هەولێر.

* مەلا سالح یەگەن- باوکی (محەمەد و عەلی و لەتیف و رەئووف و جەمیل) بوو، مزگەوتەکەیان ئێستا لە قەڵا تێکچووە، کچێکیشی بەناو فاتیمەخان هەبوو، ئەویش دایکی هاشم دەباغ بوو.

* محەمەد عەلی یەگەن، باوکی عەبدولهادی سەر سپی بوو، جەمیل یەگەن باوکی (دکتۆر ئیحسان و

مامۆستا تەحسین بوو).

* تەقیەدین ئەفەندی (باوکی سەعید ئاغا و تەها و یاسین ئاغا و موختاری بوو).

* موختار- بەبێ نەوە مرد.

* سەعید- باوکی نازم ئاغا بوو.

* یاسین- باوکی تەحسین یاسین بوو.

* عەبدوڵلا موخلیس بەگی نەوەی رەسوول پاشای برای پاشا محەمەدی رەواندوزی بوو، دەبێتە باوکی یەحیا بەگ.

* عومەر ئاغای ئەسعەدی- دەبێتە باوکی (عەبدولجەبار و خەلیل شەکیب)، عەبدولجەباریش باوکی (فەتاح ئەسعەدی و رۆستەم) بوو، رۆستەم لە پەنجاکان مرد.

* عەبدولجەبار- باوکی (فەتاح ئەسعەدی) بوو لە حزبی هیوا.

* تاهیر کەریم و ساڵحی برای- ئەوانە ماڵیان لە پشت دیوانخانەی عومەر ئاغای ئەسعەدی بوو.

* ساڵح- خەفاف بوو پێلاوی دروست دەکرد لە بازاڕ.

* تاهیر- ماست و پەنیر و ژاژی و دۆ و کەشکی لە باژێری بەقاڵان دەفرۆشت).

* باوکی ئەحمەد عەبدولڕەحمان قەسابە.

* مەجید عەبدولڕەحمان- باوکی (مەعرووف و حەمید و خورشیدی) بوو، مەعرووف- باوکی رۆستەم بوو- دوکانەکەی شەقامی شێخی چۆلی بوو، لە ریزی حەکیمی دەرمانفرۆش بوو، رۆستەم خەزووری عەمید هاشم محیەدینە.

* حاجی مەلا حەسەن حاجی قادری دەباغزادە، دەبێتە باوکی (ئەمین چەلەبی و عارف چەلەبی)، ئەمین چەلەبی، لەگەڵ عەبدولڕەحمان چەلەبی و هاشم چەلەبی شەریک بوون لە بەنزینخانە، کە لە هەولێر یەکەمین بەنزینخانە بوو.

* عارف چەلەبی- براشی بازرگان بوو لە بازاڕی قەیسەری- زاوای حاجی ساڵحی دەباغزادە مامی بوو.

* ئەکرەم ئەمین- یش کوڕی ئەمین چەلەبی بوو، بەر لە پەنجاکاندا لە تەمەنی لاوێتی کۆچی دوایی کردووە.

* مام وەهاب حاجی ئەحمەد تووتنچی چاوشلی- دەبێتە باوکی حوسێن، حوسێن- یش باوکی (ئەحمەد و حوسام نەوزاد)، ئەوانە هەموویان لە هەولێر کاری فرۆشتنی کەل و پەلی کارەبایی دەکەن.

* عەبدولکەریم باوکی هەریەک لە گەیلان و کەرخی و ئەزەم و عەبدولقادر و عەبدولباست و عەبدولخالق و عەبدولڕەزاق.

* محەمەد- باوکی هەریەک لە فاروق و رەشید و خورشیدە.

* سەید کەریم سەید عوسمان- بە رەچەڵەک لە کوردەکانی غازی عەنتابی تورکیان، دەبێتە باوکی سەید جەمیلی باوکی مامۆستا فەریق سەید جەمیلی باوکی نامیق سەید کەریم، دەبێتە باوکی سەید غەریب ئەفەندی مامۆستای سەرەتایی بوو لە هەولێر.

* حەسەن ئاغا ساڵح سوور چاوشلی- دەبێتە باوکی (عەبدولمەجید و وەلی و رەشید) ئاغا. عەبدولمەجید باوکی پارێزەر ئەکرەم عەبدولمەجید بوو و رەشید- باوکی پارێزەر هادی چاوشلی بوو.

* مەلا رەشید حاجی فەتحوڵلا- باوکی عەبدولجەباری بوو، برای مەولوود فەتحوڵلا بوو.

* حاجی محەمەد یەحیا یەمانی- ئەوەیان سەرباز بووە لە لەشکری عوسمانییەکان، رادەکا و دەچێتە یەمەن، لەوێ ژن دێنێ لە پاش تێکچوونی دەوڵەتی عوسمانی دەگەڕێتەوە هەولێر، بۆیە ئەو ناوە (یەمانی) پێوەلکاوە.

ئەوانە و بنەماڵەی مەلا رەشیدی سەرەوە یەک بنەماڵەن، پێیان دەگوت بنەماڵەی (بابە گەورە).

* محەمەد مەلا ئیسماعیل (مەلا قۆجە)ی شاعیری فەرامۆش کراو محەمەد سابیری برای، ئەوانە هەردووکیان دەبنە خاڵی موحیەدین سەید حوسێن (نەژاد بەرزنجی)، ئەوانە لە بنەماڵەی چاوشلین و تاریق جامباز لە گۆڤاری (رامان)دا چەند پارچە شیعرێکی (مەلا قۆجەی) بە زمانی کوردی و تورکی بڵاو کردووەتەوە. برازای مەلا قۆجەن مەلا ئیسماعیل دەروێش ئاغا.

* شێخۆ شەریف ئاغا.

* غەفوور محەمەد ئەمین ئاغا.

* نوردەدین و نامیق- ئەو دوو برایەش کوڕی شێخۆ ئاغان.

* مەعروف حاجی رەزاق- برای مەلا رەشید و مەلا مەولوود بوو.

* مەلا لەتیف مەلا مەولوود- باوکی- مەجید و عارف و حاجی خەلیل ددانساز و مەلا تۆفیق مەلا مەولوود برای مەلا لەتیفە.

* حاجی عەباس ئیلیاس و حاجی

عوسمان ئیلیاس برا بوون، حاجی عوسمان- دەبێتە باوکی (موسا و ئەیوب و یەعقوب و بورهان).

* خەتاب ئاغا مەلا ئیسماعیل- ئامۆزایانە دەبێتە باوکی پارێزەر زیوەر خەتاب.

* مەجید ئەحمەد سبیلچی- دەبێتە باوکی- حاجی نامیق، کاری عەتاری دەکا لە بازاڕ لە تەک مزگەوتی گەورەی بازاڕە، واتە حاجی نامیق.

* یووسف ئەفەندی قازی باوکی عەونی یووسف پارێزەر جەلیل وشیارە، دادوەر و ئەندامی چالاک بوو لە حزبی هیوا.

* سەعید مەلا خورەشید- فەتاح مەلا خورەشید- رەزاق مەلا خورەشید، سێ برا بوون.

* سەعید- باوکی عەبدولوەهاب بوو، سەردەمێک سکرتێری حزبی سوشیالیست بوو لە هەولێر، واتە عەبدولوەهابی کوڕی سەعید، رەزاق مەلا خورەشید باوکی عەبدولحەمید و محیەدین بوو، عەبدلحەمید لە دەواجنی/ پەرەوولی هەولێر سەردەمێک فەرمانبەر بوو. محیەدینیان کاری بازرگانی دەکرد.

* عەبدوللا ئەفەندی عەبدولقادر- دەبێتە باوکی (شەریف و شەهاب و زیوەر و هاشم). هاشمی ئەندازیار و سیاسەتمەدار لە سالی ١٩٧٠- ١٩٧٥ز سەرۆک شارەوانی هەولێر بوو، کوردپەروەرێکی ناسراوە.

* وەستا محەممەد ئەحمەد خروفە موسلی و براکەی بەشیر- ئەوانە دوو برا بوون لە موسلەوە هاتبوونە هەولێر، کاری زێرینگەریان دەکرد لە پاشانان لە چلەکان گەڕانەوە موسل.

* شێخۆ مەحموود دەبێتە باوکی (رفعەت و عوسمان)، ئەوانە لە بازاڕی کوتال فرۆشان کاری بازرگانیان دەکرد، ئیسماعیل مام عەرەب بەقال دەبێتە باوکی حاجی حەیدەر و حاجی ئەسعەد دارتاش لە بازاڕی دارتاشان.

* شێخ محەممەد مەلا عابد- مەلای مزگەوتی مەلا عابدی باوکی بوو، دەبێتە باوکی (سالح و تاهیر)ی مامۆستای سەرەتایی بوون، ئێستا لە گەڕەکی تەعجیل لە باخچەی مالی خۆی گول و گولزاری بیان دەچێنێ بۆ فرۆشتن، یەک دوو مندالی بچووکی هەیە. حاجی محەممەد حاجی خدر- دەبێتە باوکی (مەلا شاکر و مەلا تەها)، مەلا شاکر-باوکی (سابیر و عادل) بوو.

* مەلا تەها-ش کتێبخانەیەکی ئایینی هەبوو لە دەرگای قەیسەری هەولێر-لە ناوەڕاستی هەشتاکان ئەمری خوای کرد.

* مەلا محەممەد مەلا سالح. براکەی شێخ یونس ئەفەندی.

* مەلا محەممەد سالح باوکی (شاکر قاچی و شەوکەت) بوو، شاکر- قازیش دەبێتە باوکی سەیدەلی نەزار شێخ یونس ئەفەندی برای مەلا محەممەد، مەلا سالحیش دەبێتە باوکی (نافیع یونس)ی سیاسەتمەدار و کوردپەروەری شەهیدی ئازادیخوازی کوردستانی عێراق و ئەندامی حزبی هیوا و ناوی نهێنی (غەمگین) بوو.

* محەممەد عبلۆش- کنێر- باوکی (نوری کنێر و عەلی) بوو، کاری بەقالیان دەکرد لە بازاڕی بەقالان، نوری فەرمانبەر بوو بەناو (مدیری تحریرات) لە موتەسەریفیەی دیالە و سلێمانی.

* رەمزی ئێستا بەقالە و دەکاتە برازای نوری کنێری و دوکانەکەشی لە بازاڕی بەقالان دایە.

سەرچاوە و پەراوێز

١. رۆژنامەی (الصباح الجدید)، ژ ١٦٤/ ١١، ت ٢، ٢٠٠٤، (وقائع أول انتخابات عامة في العراق، عام ١٩٢٢).
٢. لە ئەرشیفی برای پەرلەمانتارم کاک نەجات نەجار (چاوپێکەوتنێکی بلاونەکراوەی لەگەل شێخ شەل (١٩٩٧) ئەنجامدا بوو) خستیە بەردەستمان.
٣. ئامارەکەم لە پەرلەمانتاری خوالێخۆشبوو (ئیبراهیم دۆغرەمەچی) وەرگرت.
٤. برای پەرلەمانتار کاک رەشاد ئەحمەد ئیبراهیم، سەرۆکی لێژنەی شارەوانی و گواستنەوە و گەیاندن لە پەرلەمانی کوردستان بە ئامارەکەدا چووەتەوە.
٥. لەسەر داواکاری بەندە (بەرێز: نەژاد بەرزنجی) لە دایک بووی قەلای هەولێری ١٩٢٠، هەندێ لایەنی نەزانراو و شاراوەی ئەوسای قەلاتی هەولێری تۆمار کرد.

# هەڵبژاردەیەک لە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر لە ساڵانی ١٩٣٦-١٩٣٧

لێکۆڵینەوە و خستنەسەر رێنووسی نوێی کوردی:
سۆران عزەدین فەیزی

گەر هەر شارێک جەستەیەکی زیندوو بێت، ئەوا شارەوانییەکەی دڵ و دەمارەکانییەتی. بەچالاک بوونی دڵ و گەیشتنی خوێنیش بۆ گشت دەمار و دەزوولەکان، زیندگی لەشەکە یاخود بڵێین شار و کۆمەڵگەکە مسۆگەرو بەردەوام دەبێت. ئاشکراشە ئەرک و کارەکانی شارەوانی پەیوەندی راستەوخۆ یا ناراستەوخۆی بەژیانی رۆژانەی هەموو ئەو کەسانە هەیە کە لەناو چوارچێوەی سنووری دیاریکراوی شارەکەیدا دەژین، تەنانەت بۆ مردووەکانیش پێویستە قەبرستان دابین بکات. کەواتە جۆر و ئاستی ئەو خزمەتگوزارییانەی هەر شارەوانییەک پێشکەش بە هاوولاتیانی دەکات بە باشترین و راستترین پێوەر دادەندرێن بۆ دیاریکردنی رادەی پێشکەوتنی شارەکە و پلەی شارستانێتی تیایدا.

لە لایەکی دیکەوە بە پێداچوونەوە بە بڕیارەکانی هەر ئەنجوومەنێکی شارەوانی و ئەو کار و پرۆژانەی لایەنی جێبەجێکردنەکەی لە ماوەیەکی دیاریکراودا ئەنجامی دەدات، خۆی لە خۆیدا ئاوڕدانەوەیەکە لە بەشێکی بەرچاوی مێژووی شارەکە و ولاتەکەی، جا لە پێودانگەی هەستکردن بەم راستییەوە، بەرێزان کاک حەمید بەدرخان و دکتۆر مەولود ئیبراهیم، سەرجەم بڕیارەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر لە ساڵانی ١٩٣٦ و ١٩٣٧یان خستە بەردەستم، کە بەو شێوە زمانە کوردییە و رێنووسەی لەو کاتیدا لە نووسینە رەسمییەکاندا بەکاردەهێنران نووسراون، بۆ ئەوەی منیش بەپێی شارەزاییم لەکاروباری شارەوانی، لێیان وردبمەوە و هەڵبژاردەیەکیان لێ دەستنیشان بکەم و بە رێنووسی ئێستای کوردی دووبارە بیاننووسمەوە. بەپێی ئەمەوە زیتر لە (٢٢٠) دەق لە بڕیارەکانی ئەم دوو ساڵەم هەڵبژارد و ئامادەم کردن. بە تێڕوانینیشم لە ناوەرۆکی بڕیارەکان چەندین تێبینی لە مێشکم گەڵاڵەبوون و بە پێویستم زانی لەگەڵ دەقەکاندا بیانخەمە بەرچاوی خوێنەری بەرێزەوە، کە ئەمانەن:

١- لە ساڵی ١٩٣٠ یاسای زمانە خۆجێییەکان لەعیراق دەرچوو و جێبەجێکرا، بەگوێرەی ئەمە، لەپاش بەرواری ئاماژەپێکراو زمانی کوردی بە فەرمی لە فەرمانگەکانی کوردستانی عیراق بەکارهێنرا، بەلام لە ساڵانی چلەکانی سەدەی رابردوو حکومەتی عیراق لەم هەنگاوە پێشکەوتنخوازە پەشیمان بووەوە و زمانی عەرەبی بەسەر گشت دامودەزگاکانی کوردستان سەپاند. بەمجۆرە دەبینین گشت بڕیارەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر لە ساڵانی ١٩٣٦ و ١٩٣٧ بەزمانی کوردی نووسراون. بە وردبوونەوەش لەم بڕیارانە ئاستی دەربڕین و رێنووسی کوردی لە ساڵانی ناوبراودا لەلایەن عەوامی خەڵکەکەمان بۆ دەردەکەوێت، چونکە بە قەڵەمی فەرمانبەرانەوە نووسراون نەک ئەدیب و نووسەران. گومانیش لەوەدانییە کە زمانی ئەدەبی کوردی لەو کاتیدا لە ئاستی ئەو دەقانەدا بەرزتر بووە، بۆ نموونە هەر لە ساڵی ١٩٣٦ و لە هەولێر، گۆڤاری رووناکی لەلایەن مامۆستایان حوزنی موکریانی و شیت مستەفا دەردەکرا و شێوەی داڕشتن و نووسین تیایدا

زۆر لەم بڕیارانە ڕێکوپێکتر و پاراوتر بوو. لەگەڵ ئەوەش دەکرێت زمانی پێ نووسراوی ئەم بڕیارانە بە نموونەی نووسینی ڕەسمی لە فەرمانگەکانی هەولێر لە ساڵانی ناوبراو دابنێین.

ئاشکرایە، نەوەی نوێمان بە تایبەتی ئەوانەی لەپاش ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ و دامەزراندنی حکوومەتی هەرێمی کوردستان چاویان لەژیان بووەتەوە، لەسەر بەکارهێنانی زمان کوردی لە کاروبارە فەرمییەکان و گشت بوارەکانی دیکە ڕاهاتوون، لەوانەشە بەکوردی بوونی ئەم بڕیارانەیان لەلا ئاسایی بێت، بەڵام بۆ ئێمەمانان کە لەژێر زەبری حکومەتە ڕەگەزپەرستە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق ژیاوین، بە خوێندنەوەی ئەم بڕیارە بەکوردی نووسراوانە زۆر دڵخۆش دەبین و هەر بەکارهێنانی زمانەکەی خۆمان لە فەرمانگەکانی کوردستان لە ساڵانی سییەکانی سەدەی ڕابردوو، گەشبینی و کاریگەرییەکی گەورە لەدڵ و دەروونمان دەچەسپێنێت.

بە بەراوردکردنێکی سەرپێیی لە نێوان ئاستی زمانی کوردی ئەوڕۆکەمان لەگەڵ شێوەی نووسینی ئەم دەقانەدا، ڕادەی پێشکەوتنی زمانە شیرینەکەمان لەم قۆناغەی ئێستاماندا بەروون و ئاشکرایی بۆ دەردەکەوێت، ئەمەش بەگرنگترین دەستکەوتی خەباتی دوور و درێژی میللەتەکەمان لەپێناو چەسپاندنی بوونی نەتەوایەتی خۆیدا دەژمێردرێت. کەواتە ئەو زمانەی ئەو بڕیارانەی پێ نووسراوەتەوە، ئەو کوردییە پەتییە نییە کە لەم سەردەمەدا باوە، بەڵکو پڕە لە وشەی غەیرە کوردی و زێتر دەگەڕێتەوە ژێر کاریگەری دەربڕینی مامۆستا ئایینییەکانەوە، چونکە زۆربەی فەرمانبەرەکانی ئەوکاتی دەرچووی مزگەوت و مەدرەسە ئایینییەکان بوون یا سەرەتا لەوێوە دەستیان بەخوێندن کردبوو. بۆیە شتێکی ئاساییە کە لاسایی مامۆستاکانی خۆیان بکەن و هەمان ڕێڕەوی دەربڕین بگوازنەوە فەرمانگەکانیش. لێرەشدا بەپێویستی دەزانم ئاماژە بە چەند وشەو دەستەواژەیەک بکەم کە زۆرجار لەناو ئەو بڕیارانەدا دووبارە کراونەتەوە، هەروەها ئەو ماناو مەبەستانەی بۆیان بەکارهێنراون ڕوون بکەمەوە، لەمانەش بۆ نموونە (قاقزی موتەصەرف) واتە نووسراوی پارێزگار، (موندەرەجاتی) واتە ناوەڕۆکی، (بینا بە) واتە لەسەر بنەمای، (لە طەرەف ڕیاسەت بە مەجلیسمان تەودیع کراوە) واتە لەلایەن سەرۆکایەتی شارەوانییەوە بە ئەنجوومەنەکەمان سپێردراوە، (لیوا) واتە پارێزگا، (ڕاپۆر یاخود تەقریر) واتە ڕاپۆرت، (ئەعضایانی بەلەدیە) واتە ئەندامانی ئەنجوومەنی شارەوانی، (پێچراو و مەربووطە) واتە هاوپێچە....

شایانی باسە، لەسەر هەر بڕیارێک لەم بڕیارانە وشەی (قەرار) نووسراوە، یا لەهەندێک حالەتی تایبەتی وشەی (مەضبەطە) یا (تەصدیق) یان لەسەر تۆمارکراوە، ئێمە ئەمانەمان وەک خۆیان دووبارە کردووەتەوە لەگەڵ دیارکردنی زنجیرەی ژمارەی هەر بڕیارێک لە ساڵەکەی خۆیدا. هەروەها لە دەقی بڕیارەکاندا زۆرجار دەستەواژەی (بەکوردی) بەرچاو دەکەوێت کە مەبەستی دەستەواژەی (بەگوێرەی)ە، بۆیە هەر ئەوەی دواییمان بەکارهێناوە.

لە کۆتایی ئەم خاڵەدا جەخت لەسەر ئەوە دەکەم کە سەرجەم ئەو بڕیارانەی ئەم دوو ساڵە و بەو شێوە کوردییەی کە پێیەوە نووسراون، بە دیکۆمێنتی گرنگ دەژمێردرێن لە ڕێڕەوی پێشکەوتنی زمانەکان و پێویست بە پاراستنیان و زێتر قووڵبوونەوە دەکات لێیان.

٢- بە پێداچوونەوە بە بڕیارەکان، دەردەکەوێت کە سەرۆکایەتی شارەوانی هەر شارێک لە عێراق، لە دامەزراندنی حکومەتی عێراقەوە لە بیستەکانی سەدەی ڕابردوودا تا ساڵانی حەفتاکانی هەمان سەدە، سەرپەرشتی زۆربەی خزمەتگوزارییەکانی ناو شارەکەی دەکرد. بەڵام لە ساڵانی حەفتاکاندا سەرۆکایەتییەکان کران بە بەڕێوەبەرایەتی و چەند لایەنێکی وەک کارەبا و ئاو و ئاوەڕۆکان و لەم دواییەشدا باخچەکانیشیان لێ جیاکرانەوە و بۆ هەر یەکێکیان فەرمانگەی تایبەتیان دامەزراند.

هەرچەند حکومەتی هەرێمی کوردستانیش وەک هەوڵێک بۆ گەڕاندنەوەی پایەی شایان بەم دەزگایە، دووبارە بەڕێوەبەرایەتییەکانی شارەوانی کردەوە بە سەرۆکایەتی، بەڵام هەر بە دەسەڵاتی بەڕێوەبەرایەتییەکان مانەوە. لێرەشدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە لە ساڵی (٢٠٠١) ئەنجوومەنەکانی شارەوانی لەگشت شار و شارۆچکەکانی هەرێمی کوردستان بە هەڵبژاردن هاتنە کایەوە، ئەمەش وەرچەرخانێکی گرنگ بوو لەمێژووی شارەوانییەکان، چونکە دەیان ساڵ بوو هەڵبژاردنی ئەم ئەنجوومەنانە وەک نەریتێکی دیموکراسی لەلایەن

حکوومەتەکانی عیراقەوە پشتگوێ خرابوو. هیوادارم ئەم پرۆسە شارستانییە بەشێوازی پێشکەوتووتر لەناو کۆمەڵگاکەمان بچەسپێت.

ئەگەرچی ڕێچکەی بیرۆکەکان کەمێک لە بابەتە سەرەکییەکەی خۆمان دووری خستینەوە، بەڵام با بگەڕێینەوە ساڵانی ١٩٣٦ و ١٩٣٧ و لە بڕیارەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێری ئەوکاتی بڕوانین، بۆ ئەوەی گرنگترین ئەرک و چالاکییەکان و سنووری دەسەڵاتەکانی ئەم ئەنجوومەنە و دەزگای شارەوانی لە ساڵانی ناوبراو ئاگاداربین. بەم تێڕوانینە چالاکییەکان دەکەین بەچەند خاڵێک و لەپاڵ هەر خاڵێک ژمارەی بڕیارێک یا زیاتر لەو بڕیارانەی هەڵمان بژاردوون، بۆ بەهێزکردنی بۆچوونەکانمان دەستنیشان دەکەین، لەمانەش: دانانی نەخشەی گەڕەک و شەقامەکانی ناوشار و دیاریکردنی درێژی و بەرینیان، نموونەش بۆ ئەم لایەنە لەم بڕیارانەی خوارەوە ڕەنگ دەدەنەوە (بڕیارەکانی ژمارە ٢٢٠، ٩٦، ٢٩٥، ٣٧٧، ٥٥٢، ٧٠٨، ٧٣٥ لە ساڵی ١٩٣٦) و (٨٧، ٩٧، ٢٣٧، ٢٤٦، ٣٤٥، ٣٤٦، ٤١٤، ٥١٢، ٥٠٥ لە ساڵی ١٩٣٧). ڕاستاندنی (تصدیق)ی بودجەی ساڵانەی شارەوانی (بڕیارەکانی ژمارە ١٢٥ لە ساڵی ١٩٣٦ و ١٠٥ لە ساڵی ١٩٣٧). دابینکردنی خزمەتگوزارییەکانی تایبەت بە ئاو و ئاوەڕۆ و باخچەکان و ڕووناککردنەوەی بازاڕ و گەڕەکەکان (بڕیارەکانی ژمارە ٤٤، ١٣٩، ١٦٥، ٤٨١، ٥٤٧، ٨١٦، ٦٢٠، ١٧٦ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٧، ١١٩، ١٢٤، ٢٩٦، ٦٣٥ لە ساڵی ١٩٣٧). خاوێن کردنەوەی شار و زبڵخانەکان و دەرکردنی ڕێنمایی تایبەت





بە خاوێنی و پاراستنی تەندروستی لە شوێنە گشتییەکان (بڕیارەکانی ٥٧، ١٤١، ١٨٨، ٢٢٠، ٣١٣، ٣١٢، ٤٢، ٤٢٣، ٤٣٨، ٤٤٠، ٥٢٠، ٧٠٠، ٧٢٠، ٧٣٨، ٧٠٣ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٩٢، ١٢٤، ٢١٩، ٣١١ لە ساڵی ١٩٣٧). دیاریکردنی ڕەسم و باج و پاراستن و بەکرێدانی موڵکەکانی شارەوانی لەخانوو و دوکان و زەوی و گۆڕەپانەکانی تەرخانکراو بۆ کڕین و فرۆشتنی مەڕ و ماڵات و بارەدار و سەوزە و میوە و ڕەژوو... (بڕیارەکانی ١٢٤، ٢٢٨، ٢٩٧، ٩٧، ٩٩، ٢٦، ٧٥٣، ٨٤٥، ٥٦٣، ٦٨٥، لە ساڵی ١٩٣٦ و ٨، ٦٣، ٨١٥، ١٥٢، ٢٥٦، ٢٥٨، ٦٣٥ لە ساڵی ١٩٣٧). دانانی پاسەوان بۆ بازاڕ و گەڕەکەکان و بەدواداچوونی ئەنجامدانی ئەرکەکانیان (بڕیارەکانی ٩٠، ١٢٣، ٥٠٣ لە ساڵی ١٩٣٦ و ١٣٠، ٣٨٨ لە ساڵی ١٩٣٧). دیارکردنی

نرخی نان و گەنم و جۆ و سەوزە و میوە و بەفر و کرێی هاتووچۆکردن بە ئۆتۆمبێل و چاودێری کردنی بەکارهێنانی تەرازوو و کێشان و رێگەنەدان بە یاریکردن و فیڵکردن لێیاندا (بڕیارەکانی ١٣، ٣١٨، ٤٤٦، ٥٥، ٣٥٧، ٨٣٦، ٥٤٩، ٤٣٨، ٤٥٢، ٤٥٣، ٥٦٥، ٧٨٧ لەساڵی ١٩٣٦ و ٥٦٥، ٣٤٨ لە ساڵی ١٩٣٧). کارکردن بۆ سووککردنەوەی باری قورسی کارەساتەکان و چارەسەرکردنی ئاسەوارەکانیان لەمانەش بۆ نموونە لافاوە بەناوبانگەکەی ساڵی ١٩٣٦ (بڕیارەکانی ٨١٠، ٧٢٣، ٧٩٣ لە ساڵی ١٩٣٦ و ١٢٨، ٢٧٨ لەساڵی ١٩٣٧). میوانداری کردنی میوانە رەسمییەکانی وەک مەلیک و سەرۆک وەزیران و وەزیرەکان و... ئاهەنگگێران بە بۆنە نیشتمانییەکان (بڕیارەکانی ٦٢٧، ٧٢٤، ٦٧٠، ٦٧١، ٢٣٤، ٦٨٨، ٦٨٩، ٦١٢، ٥٣٣، ٥٧٩، ٦٠٧ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٤٨٠، ٥٨٤، ٣٥٠ لە ساڵی ١٩٣٧)، پەیڕەوکردنی رێوڕەسمی یاسایی لە ئیحالەکردنی پرۆژەکان و بەکرێدانی هەندێ شوێن (بڕیارەکانی ٢٦٠، ٤٥٢ لە ساڵی ١٩٣٦). لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە دەستگرتنی ژمارەیەکی زۆر لە هەژاران (کە بەدەیان بڕیاری لەسەر هەیە، تەنیا بۆ نموونە ٥٢، ٥٣، ١٠، ١٩ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٣٨٥، ٢٥٤، ٥٩٧ لە ساڵی ١٩٣٧). یارمەتیدانی نەخۆشی دەست کورت و بێ دەرامەت و گەڕیدە بیانییەکان بۆ سەفەرکردن بۆ شارەکانی دیکە (٦١ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٣٠، ٢٦٣ لە ساڵی ١٩٣٧). پێدانی کرێی سەفەری پێویست (٨، ٦٦ لەساڵی ١٩٣٦). هاریکاریکردنی قوتابیان و هاندانی گەشتەکانیان (٧٣٢، ٢٣٤، ٦٨٨ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٣١ لە ١٩٣٧). تەقاندنەوەی تۆپ لە جەژنەکانی رەمەزان و قوربان و





مۆڵەتدان بە چایخانە و چێشتخانەکان بۆ کردنەوە لە رەمەزان (بڕیارەکانی ١٦٣، ٧٧٤ لەساڵی ١٩٣٦ و ٦٨٨ لەساڵی ١٩٣٧). بڕوادان بەرێک رەفتاری بەربووەکان لە بەندیخانە پاش تەواوکردنی سزاکانیان و تێپەڕبوونی ماوەیەک بەسەر دەرچوونیان بۆ ئەوەی مافەکانیان بۆ بگەڕێندرێتەوە (١٧٢ لەساڵی ١٩٣٦). راستاندنی شەهادەتنامەی موختاری گەڕەکەکان (٤، ٦، ٧، ١٤ لە ١٩٣٦ و ٦٨٨ لە ١٩٣٧). بڕوادان بە هەر کەسێکی شایان بۆ کەفالەت کردنی کەسێکی دیکە لە فەرمانگەکانی حکومەت (٢٧٤، ٢٧٥، ٢٧٦ لە ١٩٣٦ و ٦١٦ لەساڵی ١٩٣٧). دابینکردنی چاودێری بۆ منداڵی تازەبووی فڕێدراو و بێکەس و مووچە بڕینەوە بۆ ئەو ئافرەتەی ئامادەیە بەشیری خۆی بەخێوی بکات، هەروەها هاوکاریکردن و دەستگرتنی خاوەن جمکە تازەبووەکان (٢٨٠، ٧٤٩ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٥٩٧ لە ساڵی ١٩٣٧).

لەڕووی ئاوەدانکردنەوەش، جێبەجێکردنی هەندێ پرۆژەی وەک کردنەوەی شەقام و قیرتاوکردنی و دروستکردنی پرد و چاکردنەوەی بینایەکانی سەر بە شارەوانی و دامەزراندنی دیوار بۆ قەبرستانەکان... (٢٣، ٢٤، ٢٦، ٩٦، ٩٩، ١٢٤، ١٣٥، ٢٣٦، ٢٩٥، ٦٣، ٦٨٨، ٧٤٨ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٧، ١٧، ٥٤، ٥٧، ٩٤، ١١٧، ١٢١، ٢٦١، ٢٩٣، ٣٢٦، ٣٢٨، ٣٧٠، ٣٨٦، ٣٩٧، ٣٩٨، ٤١٩، ٥٨٢، ٦٠٧ لە ساڵی ١٩٣٧). لەگەڵ چەند کارێکی دیکەش...

٣- وادیارە ژمارەی ئەندامانی ئەنجوومەنی شارەوانی



هەولێر لە ساڵانی ١٩٣٦ و ١٩٣٧ نۆ کەس بووە. موحسین ئاغا سەرۆکی شارەوانی و سەرۆکی ئەنجوومەنەکەش بووە، ئەندامەکانیش لەهەردوو ساڵدا ئەم خوالێخۆشبووانە بوونە (عەبدولوەهاب ئاغا، مەلا تۆفیق، مەلا شەریف، خەلیل ئەفەندی، مەلا سەلیم ئیبراهیم ئەفەندی، مەلا محەمەد حەمدی، خەواجە عەبدوڵلا روبین، مەلا سەلیم ئەفەندی،...)- ئەم ناوانە لە بڕیارەکانی (٥١، ٥٦، ٩٦، ١٣٥ لە ساڵی ١٩٣٦ و ١٠٥ لە ساڵی ١٩٣٧) وەرگیراون.

لە لایەکی دیکەوە بە گوێرەی بڕیاری ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر ژمارە ٦٨٦ لە ٢/١١/١٩٣٧ شێوە هەڵبژاردنێکی دیکە کراوە و بەپێی ماددە ١٩، ٢٠ی یاسای (ادارە البلدیات)ی ئەوکاتی هەرر موختارێک پێنج کەس لە گەڕەکەکەی خۆی بۆ ئەندامیەتی ئەنجومەنی نوێی شارەوانی دەستنیشان کردووە و ناوەکانیانی خستووەتە بەردەم ئەنجوومەنی شارەوانی. لە ئەنجوومەندا ناوە دەستنیشانکراوەکانی گشت گەڕەکەکانیان خستووەتە قورعەیەک و هەشت ناویان لێ راکێشاون، ئەمانەش لەشوێنی ئەندامانی پێشوو بوون بە ئەندامی ئەنجوومەن کە ئەمانەی خوارەوەن: عەبدولوەهاب ئاغا، عەلی حاجی ئەحمەد ئاغا، بەهجەت ئەفەندی، حاجی محەمەد حاجی قاسم، عەلی حەسەن خەدیج، سۆفی ئیسماعیل، ساسون فەخام، سەلمان شومە. هەر لەم بڕیارەشدا لیستێکی دیکە هەیە بەناوی لیستی دووەم و هەشت ناوی تری لێ ریزکراون، لەوانەیە ئەمانە لە قورعەکردنی دووەمدا ناویان دەرچوو بێت و ئەندامی یەدەگ بن. شایانی ئاماژە پێکردنە کە سەرۆکی شارەوانی و هەر خۆیشی سەرۆکی ئەنجوومەن بووە نەخراودتە ناو قورعە و هەڵبژاردن، وا دیارە ئەم قورعە و دەستنیشان کردنە سەرۆکی نەگرتووەتەوە. لەلایەکی دیکەوە لە ناوەکانی لیستە دەرچووەکەدا دیارە دووانیان (جوو) بن. ئەوەش دیار نەکراوە ئەم لیستە نوێیە، کەی دەست بەکاردەبێت و کەی کۆتایی بە ماوەی کارکردنەکەی دێت.

٤- هەروەک لە بڕیارەکاندا دیارە، لەوکاتیدا واتە لە ساڵانی سی و شەش و سی و حەوتی سەدەی رابردوو، نەخشەیەکی بنەڕەتی بۆ گشت شاری هەولێر نەبووە، بۆیە گەڕەک بە گەڕەک نەخشەی بۆ دادەندرا. (بڕیارەکانی ٣٥، ٢٩٥، ٣٧٧، ٧٠٨، ٧٣٥ لە ساڵی ١٩٣٦).

٥- هیچ پرۆژەیەکی پیشەسازی لەماوەی دیاریکراودا لە شارەوانییەوە مۆڵەتی وەرنەگرتووە، تەنیا یەک کارگەی ریخۆڵە چاککردن نەبێت. (بڕیاری ژمارە ٤٤١، ٦٨١ لە ساڵی ١٩٣٦).

٦- وردەکارییەکی زۆر توند لە لایەنی ژمێرکارییەوە هەبووە، خەرجییەکان هەر چەندەش کەم بووبن لەناو بڕیارەکان ئاماژەیان پێکراوە. لەمانەش وەک نرخی دوو گڵۆپ یاخود نرخی یەکە یەکەی ئەو پێداویستییانەی لە میواندارییەکاندا بەکاردەهێنران وەک پسکویت و چوکلێت و جغارە و.... (بڕیارەکانی ٦٧٠، ٦٦٨، ٢٠٣، ٦٢٠ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٥٨٤، ٦٢٨ لە ساڵی ١٩٣٧)دا.

٧- رێنمایی زۆر چاک بۆ رێکخستنی ئوتێل و چێشتخانە و خانەکان و دوکانەکانی قەساب و حەلاقەکان و بەکارهێنانی سەکۆیەکان دەرکردووە. ئەمەش نیشانەیەکە بۆ هەبوونی هۆشمەندی شارستانی و تەندروستی لەلایەن ئەنجوومەنی شارەوانی ئەو کاتیدا. (بڕیارەکانی ١٤١، ٥٧، ٤٢، ٤٢٣ لە ساڵی ١٩٣٦).





٨- ئەنجوومەنی شارەوانی بە دڵسۆزی و هاوخەمییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ هاوولاتیان کردووە، بۆ نموونە لەبەر کەمی باران و نالەباربوونی باری ئابووری کۆمەڵگە بەگشتی، رسووم و ئیلتیزامەکانی پەیوەست بە کشتوکاڵەوە لەسەر خەڵک کەمکردەوەتەوە. (بریارەکانی ٢٥٦، ٢٥٨ لە ساڵی ١٩٣٧).

٩- لە ساڵی ١٩٣٧ شاری هەولێر لە هەشت (٨) گەرەک و بازارێک پێکهاتبوو، سێ لەسەر قەلات (سەرا، تەکیە، تۆپخانە)، پێنجیش لە خوارەوە (طەیراوە، تەعجیل، تەعجیل یەهوود، عەرەب، خانەقا). قەیسەرییە کۆنەکەی ئێستاش ناو بازار بوو.- (بریاری ژمارە ٣٢٠ لە ساڵی ١٩٣٧).

١٠- بۆ خەملاندنی نرخی پارچە زەوی و دوکانەکان و شتی تریش، ئەنجوومەنی شارەوانی بۆ هەر حاڵەتێک لیژنەیەکی پێکدەهێنا کە بریتی دەبوو لە فەرمانبەرێکی میری و چەند کەسێکی شارەزای بوارەکە لە دانیشتوانی شار. (بریاری ژمارە ٢٩١ لە ساڵی ١٩٣٧.

١١- شەقامەکانی ناوشار بەناوی کەسایەتییە دیارەکانی مێژووی هەولێر و کوردستان کرابوون، لەمانەش صەلاحەدین، خانزاد، موظەفەر (بریارەکانی ٤٤٢ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٥٩، ٢٩٣، ١٢٨ لە ١٩٣٧).

١٢- لە خوێندنەوەی گشت بریارەکانی ئەم دوو ساڵە، ئاماژە بەهیچ حاڵەتێکی دەستدرێژی کردن بۆ دارایی میری لەلایەن فەرمانبەرانەوەم بەرچاو نەکەوت. لە لایەکی دیکەوە شارەوانی ژمارەیەکی بەرچاو لە پاسەوانانی مەددنی دادەمەزراند، بۆ پاسەوانیکردنی شەوانە لەناو بازار و گەرەکەکانی شار، کە پێیان دەگوترا "دەورییە". وا دیارە بەدواداچوونی بەردەوامیش بەسەر شێوەی کارکردنیان هەبووە. چەند جاریش ئەم پاسەوانانە لەبەر کەمتەرخەمی کردنیان لە ئەرکەکانیان، لە لایەن ئەنجوومەنی شارەوانییەوە سزا دراون. (بریارەکانی ژمارە ١٣٠، ١٢٣، ٩٠ لە ساڵی ١٩٣٦).

١٣- وا دیارە لە ساڵانی ناوبراو (واتە لە ١٩٣٦ و ١٩٣٧) ئەندامانی ئەنجوومەنی ئیدارە، کە وەک (ئەنجوومەنی پارێزگا بوو) بە بریاری ئەنجوومەنی شارەوانی دادەمەزران. لە بریاری ژمارە (٩٥)ی ساڵی ١٩٣٦ هاتووە کە پێنج هاوولاتی بۆ ئەندامێتی ئەنجوومەنی ئیدارە (بەرێوەبردن) دەستنیشان کراون. ئەم پێنج هاوولاتییەش، لە ناوەکانییانەوە دیارە موسڵمان نەبووینە، جا یا دیان یا جوو بووینە. هەر تەنیا ئەم بریارە لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی هەڵدەگرێت. (بریارەکانی ژمارە ٩٥، ١١١ لە ساڵی ١٩٣٦).

١٤- لە هەر نوێکردنەوەیەکی گرێبەستی بەکرێدانی دوکانەکانی شارەوانی رستەی (لەبەر نەبوونی طالیب ئاخەر ئیحالە درانی قەرار درا) بەرچاو دەکەوێت. واتە کەسێک نەهاتووە و کرێ لەسەر کرێچییەکەی دوکانەکە زیاد بکات، بۆیە هەر بۆ کرێچییەکە مایەوە. ئەم نەریتە چاکە ئێستاش لەناو شاری هەولێر باوە. دوکانی بەکرێدراو هەرچەندە نایابیش بێت، هیچ کەسێک لەگەڵ کرێچییەکەیدا ناکەوێتە ململانێ و کرێ زیادکردن بەسەریدا. ئەمەش خووڕەوشتی بەرزی دانیشتوانی ئەم شارە نیشان دەدات. (بریارەکانی ٢٢٣، ٢٢٤، ٢٢٥، ٢٢٦ لە ساڵی ١٩٣٧).

١٥- لە بریارێکدا ناوی (٢٢) خاوەن خەپەنگ واتە خاوەن دوکان لە بازاری هەولێر دیارکراوە، لەمانە شازدەیان جوون. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە بازرگانە جوودەکان



دەوری گرنگیان لە لایەنی ئابووری ئەم شارە هەبووە. (بڕیاری ژمارە ٨ لە ساڵی ١٩٣٧).

١٦- لە دوو دانیشتنی ئەنجوومەنی شارەوانی، بڕیاری چاککردنەوەی هەندێ شەقام و پردی ناو شاریان داوە. بەراشکاویش ئاماژەیان بەهۆی ئەم بڕیارانە داوە، واتە هەر لەبەر سەردانی مەلیکی عێراق بۆ هەولێر، یا هاتنی وەزیری دەرەوەی تورکیا بۆ ئەم شارە ویستوویانە هەندێ شەقام و پرد ڕێکبخەن. (بڕیارەکانی ٤٨٠، ٣٥٠ لە ساڵی ١٩٣٧).

١٧- سەبارەت بە هەبوونی باخچەی گشتی لەناو شاری هەولێر. لە بڕیارەکانی ساڵی ١٩٣٦ سێ جار ئاماژە بەم لایەنە کراوە. یەکێکیان لە بڕیاری ژمارە (٨٠)دا بەناوی باخچەی پێش دائیرەی حکوومەت هاتووە، مەبەستیش لە دائیرەی حکوومەت ئەو باڵەخانەیە کە بەرامبەر بارەگای ئێستای پارێزگایە و لەوکاتیدا گشت یاخود بڵێین زۆربەی فەرمانگەکانی میری تێدا کۆکرابوونەوە. بێگومان باخچەیەک لەمجۆرە شوێنەدا بێت هەرگیز ناکرێت بە باخچەیەکی گشتی بژمێردرێت. لە بڕیاری ژمارە (٧)ی ساڵی ١٩٣٧ دووبارە باس لەم باخچەیە کراوە و بە (باغچەی ساحەی بەردەمی سەرا) ناوبراوە.

لە لایەکی دیکەوە لە بڕیاری ژمارە (١٣٩) لە ساڵی ١٩٣٦ ئاماژە بە دامەزراندنی باخچەیەک لە شەقامی صەلاحەدین کراوە، کە بە داخەوە لە ساڵانی شەستەکان تێکدراو کرا بەو کۆمەڵە دوکانەی شارەوانی کە لە ڕیزی بانقی رافیدەین و قوتابخانەی خولەکانن بەرامبەر دیواری قەبرستانی گەورە. هەروەها لە هەمان بڕیارشدا باس لە سێ باخچە لە شەقامی موظەفەر دەکات، کە گوایە لە ساڵی پێشتر واتە ١٩٣٥ دامەزرابن.





سەبارەت بە ساڵی (١٩٣٧)یش گرنگترین کاری ئەنجوومەن لەم لایەنەوە دامەزراندنی ئەو باخچەیە بوو کە بە (باغی شار) بەناوبانگە. بۆ ئەمەش لە دانیشتنی ڕۆژی ١٩٣٧/٢/١٦ و بە بڕیاری ژمارە (٨١) پەنجا دینار تەرخانکراوە بۆ دامەزراندنی باخچەیەک لە (عەرصەی پێش شێخ عەبدوڵلا) واتە ئەو پارچە زەوییەی کەوتووەتە بەرامبەر مەرقەدی شێخەڵلا. ئینجا بە بڕیاری ژمارە (٢٧٥) لە١٩٣٧/٥/٥ بیست و دوو دینار و نیوی دیکەشیان خستووەتە سەر خەرجییەکانی تایبەت بە دامەزراندنی ئەم باخچەیە.

بێگومان کەمی ئاو لەم شارە بەربەستێکی سەرەکی بووە لەبەردەم هەر هەوڵێک بۆ بڵاوکردنەوەی سەوزایی و ئەمام چاندن و پێگەیشتن و بەردەوام بوونیان. (بڕیاری ژمارە ٧٨٨ لە ١٩٣٦).

١٨- هەماهەنگییەکی زۆر پتەو لەنێوان شارەوانی و بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی هەبووە، لە چەندین بڕیاردا ئاماژە بە نووسراوی بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی یا ڕاپۆرتی فەرمانبەری تەندروستی (ڕاپۆری مەئموور صحیە) کراوە. (بڕیارەکانی ٥٩٦، ٤٠٨، ٣١٢، ٣١٣ لە ساڵی ١٩٣٦). سەرۆکی فەرمانگەی تەندروستیش لەکاتی پێویست لە دانیشتنەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی بەشداری دەکرد. ( بڕیاری ٥٧ لە ساڵی ١٩٣٦).

١٩- ئەنجوومەنی شارەوانی ڕۆژانە کۆبوویتەوە و ڕۆژانەش بڕیاری دەرکردووە. لە زنجیرەی سەرجەم بڕیارەکانی هەردوو ساڵی ١٩٣٦ و ١٩٣٧، ئەم خاڵە تێبینی دەکرێت).

٢٠- لە ساڵی ١٩٣٦ شارەوانی هەولێر (٥٠٠٠) پێنج هەزار دینار بۆ پرۆژەی ئاوی ناوشار لە حکومەت بە قەرز وەرگرتووە، بە مەرجێک لەماوەی بیست ساڵدا لە ڕەسمی بەنزین و داهاتەکانی شارەوانی قەرزەکە بدرێتەوە. پاش ئەمەش (١٠٠٠٠) دە هەزار دیناری دیکەشیان بۆ ئاوەدانکردنەوە قەرز کردووە. (بڕیارەکانی ژمارە ٤٤، ٤٩

لە ساڵی ١٩٣٦). بێگومان ئەم قەرزکردنە و ئاشکراکردنی بڕی قەرزەکان لەناو بڕیارەکان، دڵسۆزی و روون و شەفافیەتی ئەنجوومەنەکەی شارەوانی دەردەخات.

٢١- وا دیارە لە ساڵانی دیاریکراو لە هەولێر نەمامگەیەک نەبووە، بۆیە نەمامەکان لە نەمامگەی بەکرەجۆ لە سولەیمانییەوە بۆ هەولێر دەهێنران. ئەم کارەش بە کەسێکەوە دەسپێردرا ناوی خەلیل باخچەچی بوو. (بڕیاری ژمارە ١٦٥ لە ساڵی ١٩٣٦). ئەم خەلیل ناوە لە ژوورێکدا لەباغی شار دەژیا و سەرپەرشتی ئەم باخچەیەی دەکرد، تەنانەت ئەم باخچەیە لەناو خەڵک بە باخچەی خەلیل ئەفەندی دەناسرا.

٢٢- لە ساڵی ١٩٣٦ دوازدە و لە ساڵی ١٩٣٧ پازدە چایخانە و چێشتخانە لە هەولێر لە مانگی رەمەزان مۆڵەتی کرانەوەیان پێدراوە. (بڕیارەکانی ژمارە ٧٤٤ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٦٨٨ لە ساڵی ١٩٣٧). شایانی ئاماژە پێکردنە حەوت لەو شوێنانەی لە ساڵی ١٩٣٧ مۆڵەتدراون لە گەڕەکی تەعجیل یەهوود بوون. ئەمەش سەربەستی ئایینی کۆمەڵگەی ئەوکاتیمان بۆ دەردەخات.

٢٣- لە بڕیارەکاندا دەردەکەوێت کە لەوکاتیدا مووەلیدەیەکی کارەبایی ئەهلی هەبووە. بۆ ئاهەنگ و بۆنەکانیش لە مووەلیدەکەوە کارەبا بەکرێ وەردەگیرا. (بڕیاری ژمارە ٦٢٧ لە ساڵی ١٩٣٧).

٢٤- ئەنجوومەنی شارەوانی بۆی هەبووە راستەوخۆ تەلگراف بۆ سەرۆک وەزیرانی عیراق بنێرێت. (بڕیاری ژمارە ٤٧٤ لە ساڵی ١٩٣٧).

٢٥- جار بووە دەستنیشانکردنی ئیمام (پێش نوێژ) بۆ مزگەوتێک لەرێگەی بڕیاری شارەوانی بووە. (بڕیاری ژمارە ٣٥٢ لە ساڵی ١٩٣٧).





٢٦- ئەنجوومەنی شارەوانی دەسەڵاتی دامەزراندنی ئەنجوومەنی بەڕێوەبردنی هەڵبژاردنە گشتییەکانی هەبوو. (بڕیاری ژمارە ١١١ لە ساڵی ١٩٣٦).

٢٧- ئەنجوومەنی شارەوانی شەهادەتنامەی (خووڕەوشت چاکی) دەدا بەو کەسانەی ماوەیەک بەسەر دەرچوونیان لە بەندیخانە و تەواوکردنی سزاکانیان تێدەپەڕێ و وەک هاوولاتییەکی ئاسایی لە کۆمەڵ رەفتاریان دەکرد. بەم شەهادەتنامەیە گشت مافەکان بۆ ئەو کەسانە دەگەڕایەوە. (بڕیاری ژمارە ١٧٢ لە ساڵی ١٩٣٦).

٢٨- لە پێناو پتەو و رێکوپێک بوونی ئەو خانووبەرانەی لەو کاتیدا دروست دەکران. دەبووایە ئەندامانی ئەنجوومەنی شارەوانی چاویان بە بەننایەکان بکەوتایە ئینجا مۆڵەتی کارکردنیان پێ دەبەخشین. هیچ کەسێکیش بۆی نەبوو کار بە بەننای بێ مۆڵەت بکات (بڕیاری ژمارە ٨٦ لە ساڵی ١٩٣٦).

٢٩- لە بڕیارەکانی ئەم دوو ساڵە، تێبینی ئەوە دەکرێت کە شارەوانی هەولێر بەو توانا کەمەی هەیبووە و بەو ئامێرە سادانەی کە لەبەر دەستیدا بووە، تا رادەیەک ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ کردووە. بۆنموونە بە تەنەکە شەقامەکان ئاو رشێن کراون (بڕیاری ژمارە ٣٤٨ لە ساڵی ١٩٣٦) و لەبڕیاری ٤٣٨ش لە ساڵی ١٩٣٦ ئاماژە بە کرینی (شەش خڕاڵ بۆ تەنظیفات) کراوە. هەروەها (کا) بۆ سووتاندنی پاشماوەی کوشتگە (مەجزەرە) بەکارهێنراوە (بڕیاری ژمارە ٧٩ لە ساڵی ١٩٣٦). ئاوەڕۆکان بە قازمە خاوێن کراونەتەوە و جۆگەلەی ئاو لە کۆڵانەکان لێدراون بۆ پێداچوونی زێدە ئاوی ماڵەکان (بڕیارەکانی ژمارە ٧٢٧ لە ١٩٣٦ و ٧٠٣ لە ١٩٣٧). هەروەها سەربانی خانووەکانی فەرمانگەکانی میری سواغ دەدراو بە باگوردان



دەپەسترانەوە (بڕیارەکانی ژمارە ٣٨ و ٥٨ لە ساڵی ١٩٣٧). بە بڕیاری ژمارە (٩٩ی ساڵی ١٩٣٦)یش هەشت کەپرە سەیوان لە شەقامی صەلاحەدین بۆ سێبەرکردن دامەزراون.

٣٠- لەبەر نەبوونی رووبار و هیچ مەلەوانگەیەک لەو کاتیدا لەم شارە، لاوەکان پەنایان دەبردە بەر هەر گۆمێک یاخود هەر حەوزە ئاوێک بۆ مەلەکردن تیایدا، بۆیە زۆرجار لە ئەنباری (کۆگای) ئاوی حەمامەکان مەلەدەکرا. ئەنجوومەنی شارەوانیش بە بڕیاری ژمارە ٣١٣ لەساڵی ١٩٣٦ ئەم دیاردە نارێکەی قەدەغە کردووە.

٣١- بۆ بەهێزکردنی بڕیارەکانی ئەنجوومەنی شارەوانی، زۆربەی زۆری بڕیارەکان بە فەسڵ و ماددە یاساییەکان بەستراونەتەوە، هەندێ جاریش لەپێناو بەرژەوەندی گشتی، ئەنجوومەن ڕێگەی بەخۆی داوە موناقەلە لە ماددەیەکی یاساییەوە بۆ ماددەیەکی تر بکات. (بڕیاری ژمارە ٧ لە ساڵی ١٩٣٧).

٣٢- ئەنجوومەنی شارەوانی دەورێکی گرنگی هەبووە لە دیارکردنی نرخی هەندێ لە کەرەستە سەرەکییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خەڵک، لەمانەش: نان، گەنم، جۆ، نیسک، کا، شووتی، تەماتە، پیاز... ئەمەش نیشانەیەکی ڕوونە بۆ خەمخۆری ئەم ئەنجوومەنە لە دابینکردنی بارێکی ئابووری جێگیر و ڕێگەگرتن لەو کەسانەی مەبەستیانە یاری بە نرخەکانی خۆراک بکەن و دانیشتوانی شار بچەوسێننەوە. (بڕیارەکانی ژمارە ٤٤٦، ٥٥، ٨٣٦ لە ساڵی ١٩٣٦و ٤٣٨، ٤٥٢، ٥٦٥ لە ساڵی ١٩٣٧).

٣٣- بۆ ئاگاداربوون لە گشت ئەو یاسا و بڕیارانەی لە بەغدا دەردەچوون. شارەوانی بەشداری لەکڕینی ڕۆژنامەی (الوقائع العراقیة) کردبوو. (بڕیاری ژمارە ٩٥ لە ساڵی ١٩٣٦).

٣٤- پێشتر لە هەولێر، دیاردەی زبڵخانەی (گووفەکی) ناو گەڕەکەکان بەدی دەکرا، واتە لە هەر کۆڵانێک بۆشاییەک هەبووایە ئەوا زبڵی ماڵەکان فڕێ دەدرایە ئەم شوێنە و لەوێدا دەپەنگایەوە. بۆیە شارەوانی ناچار دەبوو دیوار بۆ ئەم گووفەکانە دروست بکات (بڕیارەکانی ژمارە ٢٤، ٥١ لە ساڵی ١٩٣٦). یاخود حاویەی زبڵی لە گەڕەکەکان دادەنا (بڕیاری ژمارە ٥٢٠ لە ساڵی ١٩٣٦). فڕێدانی زبڵە گردبووەکان و خاوێن کردنەوەی گووفەکەکانیش بە بەڵێندەر دەسپێردرا (بڕیاری ژمارە ٢٢٠ لە ساڵی ١٩٣٦ و ٩٢ لە ساڵی ١٩٣٧).

٣٥- دەقە ئەصلییەکانی ئەم بڕیارانەی ئەنجوومەنی شارەوانی هەولێر کە لە ساڵانی ١٩٣٦ و ١٩٣٧ دەرکراون، لەکاتی خۆیدا بە دەستخەتی چەند فەرمانبەرێکەوە نووسراون. لە پەراوێزی بڕیارەکان و لە شوێنی جیا جیا ناوی سێ فەرمانبەر لەوانەی ئەم کارەیان پێ سپێردراوە تۆمار کراون. یەکەمیان (نادر ئاغا سلێمان)ەو لە تەنیشت بڕیاری ژمارە (٥٠٦ لە ساڵی ١٩٣٦) ناوەکەی دیارکراوە. دووەمیان (کەریم یوونس)ەو ناوەکەی لەو لاپەڕەیەدا هاتووە کە بڕیاری (١٠٧ی ساڵی ١٩٣٧)ی لێ نووسراوە. سێیەمیشیان (زۆراب ئەفەندی)یە، کە ناوەکەی لەنزیک بڕیاری ژمارە (٥٠٥ لە ساڵی ١٩٣٧) تۆمارکراوە.

لە کۆتاییدا دەڵێم ئەم بڕیارانە زۆر زۆر لەم خوێندنەوە خێرایەی من زێتر هەڵدەگرێت. هیوادارم ئەم هەوڵە ببێتە دەرگایەک یا ڕێخۆشکەرێک بۆ لێکۆڵینەوە و وردبوونەوەی قووڵتر.

### دەقی هەڵبژاردەیەک لە بڕیارەکانی هەردوو ساڵەکە بەڕێنووسی ئێستاماندا

**قەرار ژمارە ٢ لە ١٩٣٦/١/٢**

فلس

١٢٠ بە شوفێر خەلیل مەلا کەریم

بینا بەم وەرەقەیە و تەحقیق کردنی بێکەسی و فوقر حاڵی ئەم ژنە غەریبە کە جەمیلە ناوەو ڕەوانەی کەرکووک کرانی لە طەرەف ریاسەت مناسب دیتراوە هەروەکوو سەرەوە صەدوبیست ئوجرەتی ئوتوموبیل تا کەرکووک بە شوفێر خەلیل کەریم درانی و لە ماددە ١١ فەصل ٢ (ادارە

العامە) مەحسووب کرانی قەرار درا.

**تەصدیق ژمارە (٤) لە ١٩٣٦/١/٥**

بە گوێرەی تەحقیقات موندەرەجاتی شەهادەتنامەی مەحەللەی تەعجیل، کە لە خصوص تەسجیل نائب ضابط اکرام افندی.. و برای عبدالجبار افندی... موقارن حەقیقەت بوونی تەصدیق ئەکرێ.

**قەرار ژمارە (٨) لە (١٩٣٦/١/٨)**

| فلس | |
|---|---|
| ٦٠ | بە سەید عەبدوڵلا سەید محەمەد بۆ ئوجرەتی سەفەری بە لۆری تا کەرکوک. |

بە گوێرەی موندەرەجاتی پۆستەی پێچراوی وەکو لە سەرەوە نووسراوە بۆ درانی (٦٠)فلس بە سەید عەبدولا سەید محەمەد ئوجرەتی سەفەری بە لۆری تا کەرکوک و لە مادە (١١) فەصل ٢ ئیدارەلعامە مەحسووب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٠) لە (١٩٣٦/١/٨)**

| فلس | |
|---|---|
| ٢٥٠ | بۆ وەقعی ئیحتیاج بە.... (ناوی هاووڵاتییەک نووسراوە) |

بینا بە تەقریری سەرنووسی کە پێچراوەیە لە بەر شدەت فوقر، چونکە موراجەعەت بە دائیرە کردووە، وەکو لە سەرەوە نووسراوە بۆ درانی (٢٥٠) فلس بە............ بۆ وەقعی ئیحتیاجی و لە مادە (١١) فەصل ٢ ئیدارەلعامە مەحسووب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٢) لە (١٩٣٦/١/٨)**

مەضبەتەکانی هەیئەتی مەحەللەی عەرەب و مەحەللەی جوولەکە، کە بە قاقزی سەعادەت موتەصەریفی لیوا ژمارە (٩٨٠٤) و رۆژ ١٨/١٩-١٢-١٩٣٥ نارراوە لەگەڵ وەرەقەی تەحقیقیەی ئەعضای بەلەدیە شەریف ئەفەندی، کە مەربووطن و لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان حەوالە کراوە خوونرا.

بە گوێرەی محتەوەیاتی ئەوراقی تەحقیقیەی مەذکوور موندەرەجاتی مەضبەطەکانی هەیئەتی مەحەللەی عەرەب و مەحەللەی جوولەکە موقارن حەقیقەت بوونی تەصدیق ئەکرێ.

**ژمارە (١٣) لە ١٩٣٦/١/٨**

| قسمی ئەدنا فلس | قسمی ئەوسەط فلس | قسمی ئەعلا فلس | بار | |
|---|---|---|---|---|
| ٤٠٠ | ٥٠٠ | ٦٠٠ | ١ | داری خانوو (کاریتە) بە ئیعتباری جووتێک |
| ٤٠ | ٥٠ | ٦٤ | ١ | شەقلە |
| ٤٠ | ٦٠ | ٨٠ | ١ | داری سێ |
| ١٠٠ | ١٥٠ | ٢٠٠ | ١ | خەڵووز |

قیمەتی ئەحطاب و ئەخشاب و خەڵووز بە گوێرەی نەوعیات قیمەتی یەک بارییان لە میقداری سەرەوە نووسراوە عیبارەت بوونی لە راپۆری ئەعضایانی بەلەدیە، رۆژ ١٩٣٦/١/٤ زانراوە لە بەر ئەم سێ نوسخەیە مەضبەتەیان تەنظیم و تەصدیقەن تەقدیم کرا.

**قەرار ژمارە (٢٠) لە ١٩٣٦/١/٨**

| فلس | |
|---|---|
| ١١١ | ئوجرەتی قووەتی موستەهلیکەی کەهرەبا لە مانگی کانوونی دووەم ٣٥ لە دائیرەی بەلەدیە. |

بەگوێرەی وەصلی تەسەلسول (١٩) و رۆژ لە ١٩٣٦/١٢/٣١، کە بە قاقزی مودیری ئیدارەی کەهرەبا ژمارە ٦٠١/٢ و لە ٣٦/١/٢ پێچراوەیە و بەم قەرارە مەربووطن وەکو لە سەرەوە نووسراوە بۆ درانی (١١١) صەد و یانزە فلس بە موحاسیبی ئیدارەی مەذکوور حاجی خضر ئەفەندی عەبدولا ئوجرەتی قووەتی موستەهلیکەی مانگی کانوونی دووەمی ٣٥ لە دائیرەی بەلەدیە و لە مادە ٤ فەصل ٤ مەحسووب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٢١) لە ١٩٣٦/١/٨**

| فلس | |
|---|---|
| ١٢٠ | قیمەتی ٣ گلۆپ کە دوو بۆ قەڵات و یەک بۆ پێش مزگەوتی ئەبو بەکرە فەندی کراوە. |

بە گوێرەی موراقەباتی بەلەدیە کە بە قاقزی مودیری ئیدارەی کەهرەبا ژمارە ٦٠٢/٤ و ١٩٣٦/١/٥ پێچراوەیە بەم قەرارە مەربووطن وەکو لە سەرەوە نووسراوە بۆ درانی (١٢٠) صەد و بیست فلس بە موحاسیبی ئیدارەی مەذکوور حاجی خضر ئەفەندی عەبدوللا قیمەتی ٣ گلۆپ کە دووانی بۆ قەلات و یەک بۆ پێش مزگەوتی شێخ ئەفەندی کراوە و لە جێگایان دامەزراوە و لە مادە (٤) فەصل ٦ تەقدیرات مەحسووب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٢٢) لە ١٩٣٦/١/٨**

خاریطەی تەخطیطی طەریقی قەلعە رەقەم (٣٥) کە لە محەللەی سەرای واقیعە بە گوێرەی قەراری لجنەی موخەصەصە ژمارە (٥٦٧) لە (١٩٣٥/٦/٢٤) لە طەرەفی موهەندسی بەلەدیە بە مقیاسی ٢٠٠/١ تەنظیم و بە دەرکناری رۆژ ١٩٣٥/١٢/١٨ بە دائیرەمان تەودیع کراوە تەدقیق کراو عورض موقەرەری طەریقی مەذکور (٤) مەترە بوونی موافیق دیترا و بە تەصدیقی ئەم خاریطەیە قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٢٣) لە ١٩٣٦/١/٨**

خاریطەی عائید بە دوکانی حاجی ئەحمەداغا رەقەم ١/٧ کە لە جادەی موظەفەر واقیعە و بە قاقزی ریاسەتی بەلەدیە ژمارە ٣/٨٢ لە ١٩٣٦/١/١٣ بە مەجلیسمان تەودیع کراوە موطالەعە کرا. بینا بە ئەهمیەتی طەریق و تەسک بوونی نوقطەی دیار کراو ئیستینادەن بە ماددەکانی (٤و ١٠) لە نیظامی ئەبنییە رەقەم (٤٤) و سالی ٩٣٥ تەنفیذی تەخطیطی موقەرەر موافیق دیترا. بۆ تەقدیری قیمەتی ئەم میقدار بینایە، کە هەدم ئەکرێ معمار وەستا فەتاح و بەننا وەستا شەهاب بە خەبیر تەعیین کرانیان قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٢٤) لە ١٩٣٦/١/١٣**

تەقدیری مەئموور صحیە و دەرکەنارەکانی رەئیس و سەرنووس و موهەندسی بەلەدیە، کە لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان حەوالە کراوە موطالەعە کرا.

بە گوێرەی کەشفنامەی موهەندسی کە مەربووطە بە صوورەتی شەرائیطی کەشفنامە بە صوورەتی موناقەصە تەعمیرکرانی دیواری مەزبەلەکانی ناوشار، کە لە (٢٨) عەدەد مەزبەلە عیبارەتە موافیق دیترا و بۆ تەنظیمی قائیمەی موناقەصە بە گوێرەی موندەرەجاتی کەشفی موهەندسی و عەمەلیات لە ژێر نوقاطی موهەندس دابوون. بۆیێ موناقەصە.

**قەرار ژمارە (٢٥) لە ١٩٣٦/١/١٣**

قاقزی سەعادەت موتەصەریفی لیوا ژمارە (٢٠١) و رۆژ ١٩٣٦/١/٦ قەلەمی موحاسەبە کە کەفالەتی مووەظەفینی بەلەدیەیەو لە طەرەف ریاسەت بە مەجلیسمان تەودیع کراوە خوونرا، بینا بە دەرکناری سەرنووسی رۆژی (١٩٣٦/١/٨) کە لە ژێر تەحریری مەذکوور نووسراوە تا ئێستا لە مووەظەفینی دائیرەمان سەرنوویسی بە (١١٤٥) و صندوق ئەمین بە (٧٥٠) و جابیەکانی حراسە هەریەکێ بە (٧٥) و سکرتێری لجنەی ئاو بە (٧٥) و جابی ئیسالەی ئاو بە (٧٥) دینار کەفالەت بەپێی قەرار موکەلەف بووینە. ئێستا ئیتیباعەن بە مەنشوورەکانی وەزارەت مالیە و وەزارەت داخلیە بە کوێرەی نسبەت کەفالیات تەحدید و تەقدیر کرا. کەفالەتی سەرنووسی (٢٠٠) و صندوق ئەمینی (٣٠٠) و جابیەکانی حراسەت، هەریەکێ (٧٥) و سکرتێری لجنەی بە (١٥٠) و جابی ئاو (١٥٠) دینار بوونی موافق دیترا و بۆ موعامەلەتی پێویستی قەراردرا.

**قەرار ژمارە (٢٦) لە ١٩٣٦/١/١٣**

| فلس | | عەدەد | |
|---|---|---|---|
| ٥٠٠ | قیمەتی کەرپوچ | ٥٠٠ | تەسویە و تەعمیری دەرگەی گچکە و ئەحمەدی لە قەلات |
| ٣٧٥ | قیمەتی گێچ | عەلبە ١١/٢ | |
| ١٥٠ | قیمەتی چاقل | مەترە موکەعەب ٣ | |
| ١٢٠ | قیمەتی مشکی کوورە | بار ٣ | |

تەقریری موراقیب و دەرکنارەکانی رەئیس و موهەندیسی بەلەدیە و کەشفنامەی موهەندیس، کە مەربوطن و لە طەرەف ریاسەت بە مەجلیسمان تەودیع کراوە موطالەعە کرا، بینا بە مەنع کرانی دەرگەی گەورە و تەخەصوص کرانی دەرگەی گچکە و ئەحمەدی لە قەلات بۆ بەسەر کەوتنی ولاغ و موساعید نەبوونی وەضعیەتی

حاضیرەی هەردوو دەرگە بە گوێرەی موندەرەجاتی کەشفنامە کە موفرەداتی لە سەرەوە دیار کراوە بۆ ئیصلاح و تەسویە کرانیان بە مەعریفەتی موهەندیس و مەصرەفی دیارکراو کە (١،٨٩٥) یەک دینار و هەشت سەد و نۆهەدو پێنج فلس عیبارەتە لە مادەی (١) فەصلی (٥) هەندەسە مەحسوب کرانی قەرار درا.

## قەرار ژمارە (٢٧) لە ١٩٣٦/١/١٣

| فلس | |
|---|---|
| ١٥٠ | ئوجرەتی فڕەدانی ئەنقاض لە دائیرەی ئیستیهلاک، موڵکی بەلەدیە بە جەبار....... |

تەقریری موهەندیسی بەلەدیە ژمارە (٩) و ٣٦/١/١١ کە پێچراوەیە بە مەجلیسمان حەواڵە کراوە موطالەعە کرا.. بە گوێرەی موندەرەجاتی وەکو لە سەرەوە نووسراوە بۆ درانی (١٥٠) سەد و پەنجا فلس بە جەبار.... ئوجرەتی فڕەدانی ئەنقاض لە دائیرەی ئیستیهلاک موڵکی بەلەدیە و لە مادە ١١ فەسل (٥) هەندەسە مەحسووب کرانی قەرار درا.

## قەرار ژمارە (٣٧) لە ١٩٣٦/١/٢٠

راپۆری موراقیبی محەللەی خانەقا رۆژی ٣٦/١/١٦ و شەرحی مەئمور صحیە و دەرکناری موهەندسی بەلەدیە، کە بۆ تەئیید لە ژێر راپۆر مەذکور نووسراون و لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان حەوالە کراوە موطالەعە کرا.بۆ زیاتر ئیطمینان مەجرای مەذکوور کە لە طەرەفی تەعەهود پاکژ کرانی ئیکمال بووە ئەم جارەش لە طەرەفی ئەعضایانی بەلەدیە مەلا محەمەد ئەفەندی و مەلا شەریف موعایەنە و تەدقیق کرانی قەرار درا.

## قەرار ژمارە (٣٩) لە ١٩٣٦/١/٢٠

| فلس | دینار | | |
|---|---|---|---|
| ٦٠٠ | - | قیمەتی خۆڵ | بار ٣٠٠ |
| | ٥ | قیمەتی گێچ | عەلبە ٢٠ |
| | ٩ | ئوجرەتی عەمەلە، یەک مەئمور -یەک معمار -یەک خەلفە و -چوار عەمەلەیان | |
| ٤٦٠ | ١ | عەلاوەی کەشف | |
| ٠٦٠ | ١٦ | بۆ ئینشائی دیوار لە پێش قەبرستان ئیعتیباردن لە دیواری دەوری بینای کەهرەبا بۆ لای پرد درێژایی (٦٥) مەترە. | |

ئیقتراحی موهەندسی بەلەدیە ژمارە (١٣) و لە ٣٦/١/١٥ و کەشفنامەی پێچراوی و شەرحی سەرنووسی موطالەعەکرا. بینا بە لزووم و مەوجود بوونی ئیعتیماد لە ماوەی موخەصەصی لە ژێر نەظارەتی ئەعضای بەلەدیە خەلیل ئەفەندی و موهەندیسی بەلەدیە وەکو لە سەرەوە نووسراوە بۆ موحافەظەی قەبرستان لە چوونی وڵاغ و حەیوان و تەزەیونی مەنظەرەی جادە ئیعتیبارەن لە دیواری دەورەی بینای کەهرەبا بەلای پردەوە بە وەجهی مەشرووح لە کەشفنامەکە مەربووطە دروستکرانی دیوار و لە مادە (١٨) فەصل ٥ هەندەسە مەحسوب کرانی قەرار درا.

## قەرار ژمارە (٤٠) لە ١٩٣٦/١/٢٠

| فلس | دینار | | | | سعری |
|---|---|---|---|---|---|
| ٣٥٠ | | شتلی تۆو | عەدەد | ٣٥٠ | ١٠٠٠. |
| ٧٠٠ | | شتلی نەسیج | عەدەد | ٣٥٠ | ٢ |
| ٩٠٠ | ٢ | شتلی صنۆبەر | عەدەد | ١٠٠ | ٢٠ |
| | ٢ | شتلی سەروو | عەدەد | ١٠٠ | ٢٠ |
| ١٥٠ | | شتلی لسان الطیر | عەدەد | ٥٠ | ٣ |
| ٢٥٠ | | شتلی یۆکالیپتۆس | عەدەد | ٥٠ | ٥ |
| ٤٥٠ | ٥ | | | | |
| ٥٠٠ | | بەدەلی غیلاف بۆ شتلەکانی (یۆکالیپتۆس، سەروو، صنۆبەر) | | | |
| | ٣ | ئوجرەتی نەقلی | | | |
| ٩٥٠ | ٨ | | | | |

قاقزەکانی سەعادەت موتەصەریف و مودیری مەزرەعەی بەکرەجۆ ژمارە (٥٠٣) و ١٨٧١/١١/١ و رۆژ ١٤/١٥ و ٣٦/١/١٥ کە بە مەجلیسمان حەوالە کراون خوونرا.

بینا بە شەرحی سەرنووسی مادام ئیعتیماد موساعیدە وەکو موفرەداتی سەرەوە لە مەزرەعەی بەکرەجۆ بۆ جادە و حەدایق شتل موبایەعە کران و بۆ ئوجرەتی نەقلی ٣ دینار تەخصیص و لە نەتیجەی موبایەعە پاش هاتنی قائیمە مەحسوباتی ئیجرا کران قەرار درا.

### قەرار ژمارە (٤١) لە ١٩٣٦/١/٢٠

| فلس | دینار | | سعری | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ۲۰۰ | | قیمەتی کفن/ قانە ۱۰ | ۲۰۰... | حاجی... | تەکفین و تەدفینی یاسین...لە موستەشفا ۱۵ |
| ۱٦ | | قیمەتی صابوون | | | |
| ۱۵۰ | ۰ | ئوجرەتی حەففار | | | |
| ۳٤ | ۰ | ئوجرەتی حەمال | | محمود | |
| ۷۵ | | قیمەتی کەریوچ | | | |
| ۷۵ | ۰ | ئوجرەتی غەسل مەلا.... | | | |
| -۵۵۰ | | | | | |

بینا بە قاقزی رەئیس صحیەی ئەربیل تەئریخ ٣٦/١/١٣ و راپۆری مەئمووری صحیە ژمارە ٤٤ و ٣٦/١/١٤ کە مەربووطن وەکو موفرەداتی سەرەوە جەمیعەن بۆ درانی (٥٥٠) پێنج صەد و پەنجا فلس بە حاجی...... و رەفیقاتی قیمەت و ئوجرەتی تەکفین و تەدفینی بێ کەس یاسین...کە لە موستەشفا وەفاتی کردووە و لە مادە (١٢) فصل ٢ ئیدارەلعامە مەحسووب کرانی قەرار درا.

### قەرار ژمارە (٤٢) لە ١٩٣٦/١/٢٠

قاقزی رەئیس صحیەی لیوای ئەربیل ژمارە (٨١) و رۆژ ٣٦/١/١٤ کە بە مەجلیسمان حەواڵە کراوە لەگەڵ قاقزی ریاسەت ژمارە (٢٠/١٣٧) لە ٣٦/١/١٩ کە خیطاب بە مەجلیسمان موطالەعە کران لە سەر ئیقتراحی رەئیس صحیەی لیوا و بە ئیشتراکی مووما ئیلەیهی لەم جەلسەیە پاش موذاکەرە بە گوێرەی ماددەکانی ژێرەوە لە خصووص دەلاقەکان ئیستینادەن بە مەفهومی فەقەرە ه٩و١٠ مادە ٤٤ قانونی ئیدارەتولبەلەدیات ئیصداری ئەم تەعلیماتە موافیق دیترا:

مادە١: لە بەر ئینتیشار کردنی پیسایی و مەحووظ بوونی خەطەر بۆ صحەتی عموومیە، بە صوورەتی دەواری لە جادە و ئەطراف بەربەریی مەمنووعە.

ماددە٢: بەبێ ئیجازەی تەحریری بەلەدیە کە پاش شەهادەتی طوبیی صحیە بە دەلاقەکان ئەدرێ فەتح کرانی دوکانی بەربەریی جائیز نییە، ئەم دەلاقانەی کە ئێستا مەوجوودن ئیعتبارەن لە تەئریخی ئیعلانەوە. لە ناو پانزدە رۆژ بە تەرتیبی دوکانیان بە ئیجرای شەرائیط ژێرەوە و بە ئیستیحصاڵ ئیجازە مەجبوورن.

ماددە٣: لازمە دوکانیان سپی و خاوێن بێ، سەقفی ئەگەر چاتی بێ سپی بکرێ و پا بەتەختەی بۆیاغ کراو یاخود بە خام سەد بکرێ و ئەرضی دوکان یا کەریوچ چ فەرش و بە گێچ سپی یانەخۆ بە چیمەنتۆ و غەیری - وەکو مەرمەر و حەلان - مەغرووس بوونی و هەر وەقتی کە لە طەرەفی طەبابەتی لزووم دیترا دیسان تەجدیدیان لازمە.

ماددە٤: لە سەر هەموو دەللاقەکان لازمە لە دوکانیان مەحلوولی (فرمۆل) بە نیسبەتی (٥٪) و لامپەی ئیسپرتۆ مەوجوود بێ.

ماددە ٥: مقەص و گووزان پیس و پاش تراش لەم مەحلوولە تەعقیم و مەکینەی تەراش لە سەر ئاگری ئیسپرتۆ مرورکردنی ضەرووریە.

ماددە٦: لە سەر دەللاق و شاگردەکانی لازمە دەستیان خاوێن بێ و صەدریە یەعنی بەرکوژەیێکی سپی لە بەریان بێ.

ماددە٧: پەشتەماڵەکان کە ئیستعمال ئەکەن بشوورێ و لە ئووتی بدرێ و بەردەوام خاوێن بێ.

ماددە٨: بۆ دانانی پیساو زبڵ لە هەر دوکانێک بەرمیلێکی بە قەپاغ مەوجوود بوونی لازمە.

ماددە٩: لە هەر دوکانێک بۆ مەمنووع بوونی (تف و بەڵغەم) فڕەدان لەوحەیەک تەعلیق کران لازمە.

ماددە١٠: لەم تەعلیماتە نوسخەیەک لە ناو جام و وەضع و لە جێگایەکی ظاهر لە ناو دوکانیان تەعلیق بکرێ.

بۆ تەطبیق ئەم تەعلیماتە هەر کەسێ موخالیف بێ بە موجیبی ماددە ١٢٦ لە ق.ع.ب تەجزیە کرانی بۆ زانین بڵاوکرانی قەرار درا.

### قەرار ژمارە (٤٣) لە ١٩٣٦/١/٢٠

بینا بە فەقەرەی (١) قاقزی رەئیس صحیە ژمارە ٨١ رۆژ ٣٦/١/١٤ و لە پاش موذاکەرە بە حضووری رەئیس صحیە ئیستنادەن بە فەقەرە ه١٠ ماددەی ٤٤ قانون ئیدارەی بەلەدیات رەقەم ٨٤ ساڵی ١٩٣١ نەفعەن بە موحافەظەی صحەتی عامە.

ماددە١: ئیعتبارەن لە تەئریخی ئیعلامەوە بە پازدە رۆژ نەقلی لاشەی مەذبووح لە مەجزەرە بۆ بازاڕ بە پشتی ئینسان مەمنووعە.

ماددە٢: ئەم لاشانە لە ناو ظەرفێکی مەعمول لە توتیا یان دار لە سەر پشتی حەیوان یانەخۆ بە عەرەبانەیەکی دەست و بە صوورەتی داپۆشرانی سەری بە خامێکی سپی و پاکژ نەقل کرانی پێویستە.

موخالیفی ئەم مەوادە بە پێی ماددە ١٢٦ ق.ع.ب بۆ تەجزیەی بە مەحکەمە سەوق کرانی بۆ زانین بلاوکران قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٤٤) لە ١٩٣٦/١/٢٠**

قاقزی سەعادەت موتەصەریفی لیوا ژمارە (٤٩٨) و ١٤/١٥-١-٣٦ کە قاقزی وەزارەت داخلیەیە لە خصووص ئیستقراض (٥٠٠٠) پێنج هەزار دینارە موطالەعە کرا، ئەم ئیستقراضە موافیقە و فەقەط ئەم مەبلەغە چونکە بۆ مەشرووعی ئاو دیار کراوەو موددەتی تەسویەی بیست ساڵە و موقابیل فائیضە و لە رەسمی بانزین و لە واریدات بەلەدیە ئیعادەی مەشرووطە موباشەرەتی ئەم مەشرووعە لە طەرەفی موهەندسی مەخصووص پاش کەشف تەنسیب کراوە لە بەر ئەمە لە ئێستاوە بۆ مەجبوور نەبوونی بەلەدیە بە دانی فائیض لە وەقتی موباشەرەت کرانی بە عەمەل بە گوێرەی ئیستمارەکانی پێچراوی وەرگێرانی پارە موافیق دیتراو بۆ ئیجرای پێویستی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٤٦) لە ١٩٣٦/١/٢٠**

| | فلس |
|---|---|
| مەصرەفی رێگای......... مین قەریەت......... تا بەغداد. بینا بە قاقزی رەئیس صحیەی لیوا ژمار ١٥٥ لە ٣٦/١/٢٣ بۆ صەرف و مەحسوب کرانی چوار صەد فلس بە..........کە بە عیللەتی (شلل الاهتزازی) دووچار بووە و بۆ تەداوی بۆ بەغداد ناررانی لزووم دیترا وە بە نەفس مەرقووم....ناو لە ماددە ١١ فەصل ئیدارەلعامە قەرار درا. | ٤٠٠ |

**قەرار ژمارە (٤٧) لە ١٩٣٦/١/٢٦**

| | فلس |
|---|---|
| مەصرەفی تەسفیر کرانی....... رەواندزی بۆ مەعهەدی باستور -بەغداد | ٤٠٠ |

بینا بە قاقزی مودیری شورطەی لیوای ئەربیل ژمارە ٧٥٥ /٣/٣٤ و لە ٣٦/١/٢٢ کە لە طەرەفی سەعادەت موتەصەریفی لیوا بە ژمارە ١٣٢٥ لە ٣٦/١/٢٣ حەوالە کراوە بۆ صەرف و مەحسوب کرانی چوار سەد فلس بە گوێرەی کیتابی مودیری شورطەی مووما ئیلەیهی کە. مەربووطە بە مەرقووم............ رەواندزی کە لە طەرەفی سەگی هار گەزراوە بۆ مەعهەدی باستور - بەغداد لە ماددە ١١ فەصل ٢ ئیدارەلعامە قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٤٩) لە ١٩٣٦/١/٢٧**

بە گوێرەی قاقزی وەزارەتی داخلیە کە بە قاقزی سەعادەت موتەصەرفی لیوا ژمارە (٤٩٨) و ١٤/١٥-١-٣٦ پێچانی تەودیع کراو بە پێی قانوونی ئیقراض ئەمانەتولعاصیمە و بەلەدیات رەقەم ٤٢ و ساڵ ١٩٣٥ بۆ مەشرووع ئاو بە صوورەتی ئیستقراض (٥٠٠٠) پێنج هەزار دینار بە بەلەدیەمان دران بە قەراری مەجلیس وزەرا ئیقران کردنی زانراوە، شاری ئەربیل لە حاڵی حاضر هەرچەند بە ئاو ئیحتیاجی زۆرە بەڵام بە ئیحتیاجی عیمرانیش نەظەر کردن ضەروریە. ئەوە مەعلومە کە هەر شارێک کە مەددەنیەت لێ ی ئینتیشار بکا و رۆژ بە رۆژ بۆ پێش بروا لەم نیسبەتە ئیحتیاجی عیمرانیش زیاد ئەبێ. حکوومەتی موبەجەلمان لەم ئیستقراضە تەنیا خصووص ئاوی مولاحەظە فەرمووە و بە جیهانی مەعروضە نەظەری نەفەرمووە. حاڵوایە بە گوێرەی مەددەنیەنی حاضیرەشارمان لە خصووص عیمرانی (جادە، ئومور صحیە) موحتاجی ئیصلاحە. بۆ تەئمینی ئەم واجیباتە چونکە واریداتی بەلەدیەمان کافی نییە و طەبعەن حکوومەت مووەقەرمان ئەم قانوونی ئیقراضەی بە غایەی ئیصلاح ئیصداری فەرمووە، هەرودکو مەعلوومە شارمان بۆ فەتح -تەوسیع - ئیصلاح -تەبلیط - و تەنظیمی بەعض شەقام و بازار کە لە حاڵی قەدیمەدایە - تەصغیری ئەلغام و داپۆشرانی مەجاری پیساو زۆر موحتاجە، لەبەر ئەم ئیحتیاجە نەوعەن ما بە گوێرەی نیسبەت بۆ ئیصلاحاتی عمرانیە و صحیە کە عەرض کراوە ئەوەڵەن (١٠٠٠٠) دیناری تریش بە بەلەدیەمان دران لەگەڵ مەبلەغی (٥٠٠٠) دینار ئیستیقراض کە بۆ ئاو دیار کراوە بە (١٥٠٠٠) دینار ئیبلاغ کرانی بۆ موساعەدە بە پێویستی تەئمینی بە

مەقامی سەعادەت موتەصەرفی عەرض کەیفیەت کران قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٥٠) لە ١٩٣٦/١/٢٧**

| فلس | |
|---|---|
| ٤٥٠ | ئیعادەی تەئمینات بە گوێرەی مەقبووض ژمارە /٢٦-٣٧٨و ٩٣٥/٣/٢٨ بینا بە تەقریری سەرنووسی دائیرە ژمارە ٦و ٣٦/١/٢٧ لەبەر تەسدید کردنی..... ئیجاری چاوە خانوودکەی لە قەلات لە دەرگەی ئەحمەدیە واقیعە و نەمانی ذیمەتی ئیعادەکرانی ٤٥٠ فلس کە بە مەقبووض ژمارە ٣٧٨/٢٦ و ٣٥/٣/٢٨ تەسلیم صندووق کردووە و لە ماددە ١٦ فەصل ٢ ئیدارەلعامە مەحسووب کرانی قەرار درا. |

**مەضبەطە ژمارە (٥٥) لە ١٩٣٦/١/٢٧**

| جۆ طەن | کا طەن | |
|---|---|---|
| ٢٢٥٠ | ٣٢٠٠ | لە مانگی کانونی دووەم ٣٦ |
| ٢٤٧٥ | ٣٦٠٠ | لە مانگی شوباط |
| ٢٤٧٥ | ٣٦٠٠ | لە مانگی مارت |

بە گوێرەی راپۆری ئەعضایانی مەجلیس بەلەدیە رۆژ ٣٦/١/٢٧ کە مەربووطە طەنی کاو جۆ لە مانگەکانی کانوونی دووەم و شوباط و مارت بە قیمەتی لە جەزایاندا نووسراو بوونی زانراوە لە بەر ئەمە ئەم ٣ نوسخە مەضبەتەمان تەنظیم و بۆ ایجاب بە پێچراوی تەقدیم کرا.

**قەرار ژمارە (٥٦) لە ١٩٣٦/١/٢٧**

| فلس | دینار | |
|---|---|---|
| ٤٠٠ | ٤ | نیوە بەدەلی تەعەهودی پاکژ کرانی مەجرای پیساو لە تەنیشتی چاپخانەی عەلی پاشا بە تەعەهود وەرگیرا. |

بینا بە راپۆری نیهائی ئەعضایانی بەلەدیە مەلا محەمەد ئەفەندی و مەلا شەریف کە لەگەڵ مەربووطاتی پێچراوەیە لە بەر پاکژ کرانی مەجرای مەذکوور بە تەواوی بە گوێرەی تەعەهودو نەمانی هیچ نەفەقات بۆ درانی (٤٧٥.٤) چار دینار و چارصەد و حەفتاو پێنچ فلس نیوە بەدەلی ئاخر تەعەهودی پاکژ کرانی مەجرای پیساوی مەذکوور بە موتەعەهید دەروێش عەزیز مەحسووب کرانی لە مادە (١٨) فەصل ٥ هەندەسە قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٥٧) لە ١٩٣٦/١/٢٧**

قاقزی رەئیس صحیەی لیوای ئەربیل ژمارە (١٧١) و رۆژ ١٩٣٦/١/٢٥ کە لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان حەوالە کراوە موطالەعە کراو بە حضووری رەئیس صحیە پاش موذاکەرە:

ئیستناد بە فەقەرە (١٠) -هـ ماددەی (٤٤) قانوون ئیدارەت بەلەدیات رەقەم (٨٤) سالی ٩٣١ بۆ محافەظەی صحەتی عمومیە ئیعتیبار لە تەئریخی ئیعلان لە ناو پێنچ رۆژ ئەم مەوادی کە لە ژێرەوە نووسراوە بۆ فرۆشتن لەو کاتی دائەنرێ یانەخو دەور ئەکرێ سەری ئەودلی بوونی قەطعیەن مەمنووعە و بایعەکان بە داپۆشرانی سەری ئەم مەوادە بە خامێکی خاوێن و سپی یانەخۆ لە ناو مەحفەظەیێکی جام یا..... کردنیان موکەلەف کرانیان و موخالفین بە پێی ماددە ١٢٦-أ-ق-٤-ب مەصروفی عیقاب بوونیان پاش تەصدیق سەعادەت موتەصەریفی بلاوکران قەرار درا لە ١٩٣٦/١/٢٧.

گۆشت و عموومی مەئکوولات کە بەبێ شوشتن ئەخورێ وەکو (ماست - حەلوا - حەلەویات کە لە شەکر و هەویر دروست ئەکرێ - پەنیر و نان) و فەواکیهی وشک تر و ئەمثالی.

**قەرار ژمارە (٥٨) لە ١٩٣٦/١/٢٧**

بە گوێرەی راپۆری ئەعضایانی بەلەدیە رۆژ ١٩٣٦/١/٢٥ کە لە ژێر قاقزی رەئیس صحیە لیوا ژمارە (١٣٩) و رۆژ ١٩٣٦/١/٢١ نووسراوە فیئاتی مەوادی قائیمەی سەرەوە وەکو نووسراوی جەزایان بوونی زانراوە لە بەرئەمە ئەم مەضبەطانەمان لە ژێر جەدوەل تەنظیم و تەصدیق کرا.

٢٧ هاوولاتی ناویان تۆمار کراوە

| فلس | دینار | رقم الملك | نوع الملك | تاريخ الاشغال | تاريخ التخلية | المحلة | اسم المكلف | الملاحظات |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| | | | | | | | | |
| | | | | | | | | |

### قەرار ژمارە (٦٣) لە ١٩٣٦/٢/٣

| فلس | دینار | |
| --- | --- | --- |
| ٥٨٤ | ٣ | قیمەتی چەقل (١٢٨ مەتر موکەعەب) بە گوێرەی قانیمەی موناقەصە سعری (٠٢٨.٠) بە موتەعەهید جەبار رەشید |

بە گوێرەی راپۆری موراقبی محەللەی عەرەب رۆژ ٣٦/١/٣٠ و شەرحی موهەندسی کە لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان تەودیع کراوە موطالەعە کرا مادام موبایەعەی چەقل بە قەرارمان ژمارە ٦٩٨ و رۆژ ١٩٣٥/١٢/٧ ئیقران کردووە و بە گوێرەی شەرحی موهەندسی لە طەرەفی موتەعەهید (١٢٨) مەترە موکەعەب چەقل بە محەللەی عەرەب تسلیم و لە جیهاتی لازمە صەرف کراوە وەکو نووسراوی سەرەوە بۆ درانی ٥٨٤.٣سێ دینار و پێنج صەد و هەشتا و چوار فلس بە موتەعەهید جەبار رەشید قیمەتی چەقل کە لە بۆ تەسویەی محەللات کراوە لە مادەی ١ فەصل ٥ هەندەسە مەحسوب کرانی قەرار درا

### قەرار ژمارە (٧٥) لە ٣/٢/ ١٩٣٦

| فلس | | |
| --- | --- | --- |
| ٤٦٩ | قیمەتی دار ((٧بار) سعری (٠٦٧.٠) | قیمەتی ئیحراقیەی دائیرەی بەلەدیە لە مانگی کانوونی دووەمی ٣٦ بە مولتەزمی ئەرضیەی ئەخشاب شکور |
| ٢٧ | ئوجرەتی دار شکاندن | |
| ٤٦٨ | قیمەتی رژوو (٦ تای/ سعری ٠٧٨.٠) | |

بینا بە وەرەقەی طەلەبی مولتەزمی ئەرضیەی ئەخشاب شکور و تەصدیقی سەرنووسی کە مەربووطە وەکو موفرەداتی سەرەوە بۆ درانی (٩٦٤ ) نۆ سەد و شێصت وچار فلس بە مولتەزمی ئەرضیەی ئەخشاب شکور قیمەتی ئیحراقیە کە مانگی کانوونی دووەمی ٣٦ بۆ دائیرەی بەلەدیە کڕیوە لە مادده ٢٦ فەصل ٢ ئیدارەالعامە مەحسوب کرانی قەرار درا.

### قەرار ژمارە (٧٨) لە ٣/٢/ ١٩٣٦

| فلس | | | |
| --- | --- | --- | --- |
| ٢٤ | قیمەتی رزە | رەشید زوبێر | تەحکیمی دەرگای دائیرەی بەلەدیە |
| ٦٠ | قیمەتی قوفل | حەسەن حوسنی | |
| ١٦ | ئوجرەتی نەجار | قۆجە | |

بینا بە تەقریری سەرنووسی بەلەدیە کە مەربووطە وەکو موفرەداتی سەرەوە بۆ درانی ( ١٠٠ ) سەد فلس بە رەشید زوبێر و رەفیقانی قیمەت و ئوجرەتی لەوازماتی سەرەوە کە بۆ تەحکیمی دەرگەی دائیرەی بەلەدیە کڕاو تەئمین کراو لە مادە ١١ فەصل هەندەسە قەرار درا.

### قەرار ژمارە (٧٩) لە ٣/٢/ ١٩٣٦

| فلس | |
| --- | --- |
| ١٢٠ | قیمەتی کا بۆ ئیحراقی کوورەی قاذوورات لە مەجزەرە لە مانگی کانوونی دووەمی ٣٦. |

بینا بە راپۆری موراقیبی مەجزەرە کە مەربووطە وەکو لە سەرەوە نووسراوە بۆ درانی (١٢٠) سەد و بیست فلس بە مەحمود ئەحمەد قیمەتی کا بۆ ئیحراقی کوورەی قاذوورات لە مەجزەرە لە مانگی کانوونی دووەمی ٣٦ کراوە و لە مادده ٩ فەصل ٦ صحیە مەحسوب کرانی قەرار درا.

### قەرار ژمارە (٨٠) لە ٣/٢/ ١٩٣٦

| فلس | |
| --- | --- |
| ٤٨٠ | قیمەتی زبل بۆ باخچەی پێش دائیرەی حکومەت (٦٠بار) (سعری ٠٠٠٨.). |

تەقریری مولاحظی باخچە و شەرحی موهەندسی بەلەدیە رۆژ ١٩٣٦/١/٢٩ کە مەربووطن موطالەعە کرا. بینا بە لزووم وەکو لە سەرەوە دیار کراوە لە موقابیلی (٤٨٠) فلس ٦٠ بار زبل بۆ باخچەی پێش دائیرەی حکومەت

مویایەعە کران و مەبلەغ مەذکوور و لە مادده (١٤) فەصل ٥ هەندەسە مەحسوب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٨٦) لە ٣/٢/ ١٩٣٦**

بینا بە قاقزی موهەندسی بەلەدیە ژمارە (٥) و رۆژ ٥/١/ ١٩٣٦ کە لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان حەواڵە کراوە وە ئیستناد بە مادە ٤٢،٤٤،٤٥ لە نیظامی طرق و ئەبنیە رەقەم ٤٤ سنە ٩٣٥ بۆ تەعینی دەرەجەی مەسئوولیەتی معمارەکان و شرووطی ئیشتغالیان ئەم تەعلیماتە ئیصدار کرا:

١. معمارەکان لە تەئریخی ئیستا لە ٣٦ دوە بە ئیستحصاڵ کردنی ئیجازەی ئیشتغالی بە بەنایی لازمە و بۆ ئەم بینەدا بۆ فەحص لەلای لجنەی مەخصووص موراجەعەتیان پێویستە.
٢. بەبێ فەحص و ئیبرازی ئەهلیەت لەلای لجنەی موتەشکل لە ئەعضایانی مەجلس بەلەدیە و موهەندسی بەلەدیە و ئیستحصالی ئیجازە لە ریاسەتی بەلەدیە تەعاطی صنعەتی بەنایی قەتعیەن جاهز نییە.
٣. معمارەکان لە طەرەفی صاحبی ئینشائات بەبێ وەرگرانی ئیجازەی ئەبنیە لە دائیرەی بەلەدیە لە داخلی حدوودی بەلەدیە لە بینایەیێک عەمەل کردنیان قەطعیەن مەمنووعە.
٤. هەر معمار لە وەقتی ئیش ئیجازەنامەی ئەبنیەی لە مەوقعی بینا ئیحزار و لە تەفتیش و موراقەبەی مەئمووری بەلەدیە و طەلەبی حالەن بە ئیبراز کردنی مەجبوورە.
٥. هەر معمارێک لە داخلی ئیجازەی ئەبنیە و خاریطەی شوعبەی هەندەسەی بەلەدیە بە ئیش کردن مەجبوورە و موخالیفی شروطی ئیجازە و خاریطە معماریە بە طەلەبی ئەصحابی ئەبنیە ئیشتغالی قەطعیەن مەمنووعە.
٦. موخالفین بە پێی مادده ١٢٦ -أق.ع.ب تووشی عیقاب بوونی بۆ زانین بلاوکران قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٨٧) لە ٣/٢/ ١٩٣٦**

قاقزی ریاسەت ژمارە (٢٣٦) لە ١٩٣٦/٢/٢١، کە خیطاب بە مەجلیسمان موطالەعە کرا. ئیستناد بە فەقەرە ١-ح لە مادده (٤٤) قانوونی ئیدارە عامەی بەلەدیات رەقەم ٨٤ ساڵی ١٩٣١ و بە پێی فەقەرە ١٧ جەدوەلی قانوونی رسوومی بەلەدیات رەقەم ٨٦ ساڵی ٩٣١ لە خصووصی موضایەقە و ئیشغال نەکرانی طوروق عامە و سەکوو لە جادە و لە رێگای تەعلیماتی ئاینییە ئیصدار کرا.

١. بەبێ ئیجازە و تەطبیقی شرووطی بەلەدیە ئیشغالی طەریق و فەضلەی طەریق و سەکوو جائیز نییە.
٢. ئیجازە بۆ تەناسوبی مەوقیع لە پاش تەدقیقی لجنە و لە سەر شروطی دیار کراو لە طەرەفیاتی موقابیل بە رەسم لە طەرەفی مەئمووری جیبایەت ئەدرێ.. یەعنی مەقبووض رەسم بە ئیجازە ئیعتبار ئەکرێ.
٣. لە سەر لجنە لازمە مەوقیعی پێویست بۆ ئیشغال لە سەر سەکوو لە پێش دوکانی و لە فەضلەی طەریق بۆ وەضع کرانی تەخت و کورسی و مێز و قەپەنگ و یان بۆ فرۆشتنی ئەشیا، کەشف و میقداری ئیشغال کردنی مەوقیع تەحدید میقداری موقەدەری رەسمی شەهریەی بەیان و ئەگەر تەخت و کورسی و مێز و قەپەنگ بێ عەدەدیان و میقداری صرەی و شروطی دیار و ئەم قسمی کە تابع بە تەقدیری یەعنی رەسمی موعەیەن و موقەرەر نەبێ پاش تەصدیقی مەجلیس بەلەدیە بە تەحەقوق ئیدخال و بۆ ئیجاب بە مەئمووری جبایە بنووسرێ.
٤. مەئموری جبایەی رسووم بە شروطی مویەلەغ بە ئیجازە دان و بە ئیدخال کرانی شرووط بە مقبەض موکەللەفە.
٥. ئەوەی خیلافی ئەم تەعلیماتە حەرەکەت بکا بە پێی مادە (١٢٦) -أ ق.ع.ب مەعرووض بە عیقاب بوونی بۆ زانین بلاوکران قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٨٩) لە ٣/٢/ ١٩٣٦**

لە خصووص مەئوای گامێشەکانی موافەقەتی سەعادەتی موتەصەریفی لیوا ژمارە (١١٣٢) لە ١٩٣٦/١/٣٠ قسمی تەحریرات لەگەڵ تەقریری موشتەرەکی رەئیس بەلەدیە و رەئیس صحیە موطالەعە کرا. ئەم دوو جێگایە کە یەکی لە ئەراضی جێگای حەصاری شێخ محیەدین ئەفەندی لە خارجی شار لە طەرەفی منارەی چۆلی بە لای جنووبی بەست واقیعە و

ئەویتری لای مەوقیعی جاجم ئاوا بەلای شەرق جنووبی بەستەویە و لە تەقریری موشتەرەکی مەذکوور دیارکراون بۆ ئیتیخاذ کرانیان بە مەئوای گامێشەکان موافیقە. بەڵام بینا بە نزیکی مەوقیعی دووەم لای جاجم ئاوا حەسەب بە وەضعیەت زیاتر موافق ئەبینین بۆ ئیجرای پێویست قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٩٠) لە ٣/٢/ ١٩٣٦**

| فلس | | |
|---|---|---|
| ٤٠ | جەزای حاریس..... | موعادیل بە قسط ئەلیەومی یەک رۆژ لە مانگی شوبات ٩٣٦ |
| ٤٠ | جەزای حاریس..... | |

بینا بە قاقزی مودیری شورطەی لیوای ئەربیل ژمارە (٩٨٣) و ١١١٣ /٢/٢٨ و رۆژ ٢٩کانوونی دووەم و ١شوبات ٣٦ حاریس............. لە حزوری مەجلیسی بەلەدیە حاضربوون لە نەتیجەی ئیستجوابیان وەکو مەفهوومی قاقزەکان وەقتی دەوریە لە میعاد بە تەئخور کردنیان قەناعەت حاصل بوو لە بەر ئەمە و بینا بە سەبقەت نەکردنی ئەمثالی جاریتر وەکو لە جەزای ناویان دیاری کراوە هەر یەکی بە چل فلس کە موعادیل قسط لیەومی رۆژێک لە مانگی شوبات ٣٦ جەزای نەقدی تەجزیەیان موافیق دیترا بۆ ئیجرای پێویستی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٩٥) لە ١٠/٢/ ١٩٣٦**

| فلس | دینار | |
|---|---|---|
| | ٢ | بەدەلی ئیشتراکی جەریدەی وەقائعی عراقیە بۆ ساڵی ٩٣٦ بە گوێرەی قاقزی مودیریەتی دیعایە و نەشر ژمارە ٨٨ لە ١٩٣٦/٢/٣ کە مربووطە |
| ٤٢ | | ئوجرەتی پۆستە |

بە گوێرەی قاقزی مودیریەتی دیعایە و ئەلنەشر ژمارەی سەرەوە کە مەربووطە بۆ ڕەدان کرانی (٢) دینار بەدەلی ئیشتراکی جەریدەی وەقایعی عیراقیە بۆ ساڵی ١٩٣٦ بە ناوی مودیریەتی مووماثیلەیهی بە پۆستە و لەگەڵ (٢٤) بیست و چار فلس ئوجرەتی پۆستە لە ماددە (٢) فەسل ٢ ئیدارەلعامە مەحسوب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٩٦) لە ١٠/٢/ ١٩٣٦**

| فلس | دینار | | |
|---|---|---|---|
| ٥٠٠ | ١ | قیمەتی کەرپوچ عەدەد (١٥٠٠) | تەعمیری پردی خوار مزگەوتی شێخی چۆلی لە جادە |
| ٧٥٠ | ٠ | قیمەتی گێچ عەدەد (٣) | |
| ٧٥٠ | ٠ | ئوجرەتی عەمەلە | |

راپۆری کەشفی موهەندسی بەلەدیە ژمارە (٣٠) و رۆژ ١٩٣٦/٢/١٠ و پێچراوی راپۆری مەئموری صحیە کە بە مەجلیسمان تەودیع کراوە موطالەعە کرا، بە گوێرەی شەرحی سەرنووسی لە بەر مەوجوود بوونی ئیعتماد وەکو موفرەداتی کەشفنامەی موهەندیس کە نەقلی سەرەوە کراوە لەژێر نەظارەتی ئەعضایانی مەجلیسی بەلەدیە مەلا محەمەد ئیبراهیم و خەلیل ئەفەندی بە مەعریفەتی موهەندسی بەلەدیە تەعمیر کرانی پردی مەذکوور موافەقە و مەصاریفی مەجموعەی دیار کراو کە (٣) سێ دینارە لە ماددە (١) فەصل ٥ هەندەسە مەحسوب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٩٧) لە ١٩٣٦/٢/١٠**

| فلس | | |
|---|---|---|
| ٢٠٠ | قیمەتی جاو عەدەد/ ١٠ سعری (٠٢٠٠٠) حەقێل عزرە | مەصرەفی باگوردان کرانی بانی و تێخرانی جامی دارولضیافە بە گوێرەی قائیمەی پێچراوی. |
| ٣٠ | قیمەتی کا ١بار سعری (٠٣٠٠٠) جەبار رەشید | |
| ٢٠٠ | ئوجرەتی عەمەلە عەدەد / ٢ رۆژ /٢ سعر(٠٥٠٠٠) ئیسماعیل سەلیم و عەزیز عەبدوللا | |

راپۆری موهەندسی بەلەدیە ژمارە (٢٤) رۆژ ١٩٣٦/٢/٥ و قائیمەی پێچراوەکانی موطالەعە کران. بینا بە ئیجاب وەکو موفرەداتی سەرەوە بۆ درانی (٤٣٠) چارسەد و سی فلس بە حەقێل عزرە و جەبار رەشید و ئیسماعیل سەلیم و عەزیز عەبدوللا قیمەت و ئوجرەتی جام و کا و باگوردان کرانی لە بانی دارولضیافە تەئمین کراوە و لە ماددە (١١) فەصل ٢ئیدارەلعامە مەحسوب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (٩٩) لە ١٩٣٦/٢/١٠**

راپۆری موهەندسی بەلەدیە ژمارە (٢٣) رۆژ ٤/٢/ ١٩٣٦ لەگەڵ قائیمەی موناقەصە و کەشفی.... کە

مەربووطن و لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان تەودیع كراوە موطالەعە كرا. بە گوێرەی شەرحی سەرنووسی كە لە ژێر راپۆر مەذكوور نووسراوە لە ماددەی مەخصووص ئیعتماد هەیە لە بەر ئەمە بۆ موحافەظەی هەشت دوكانی بەلەدیە كە لە دائیرەی ئیستهلاك موفرەزە و لە سەر جادەی (صلاح الدین) واقیعن لە بەر باران و لە هەتاو دروستكرانی هەشت عەدەد مظەللە لە ئاسن و لە چینكۆ موافیق دیترا. بە گوێرەی شرووطی موناقەصە كە لە طەرەفی موهەندسی لە قائیمە دەرج كراوە بە موناقەصە درانی و بەدەلی موقەرەر لە پاش ئیكمالی عەمەل و راپۆری موهەندیس بە یەک جار بە موتەعەهید درانی مودەتی موناقەصە و ئیحالە ئیعتبارەن لە تاریخی ئیعلان دە رۆژ بوونی و كەیفییەت بەم نەوعە بڵاوكرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٠٥) لە ١٩٣٦/٢/١٥**

| فلس | دینار | |
|---|---|---|
| ٧٥٠ | ٢ | ئوجرەتی تەلەفۆن لە مانگی كانونی دووەم ساڵی ١٩٣٦ تا نیهایەتی مارت |
| ٦٢٥ | | موكالەمەی تەلەفۆن لە...... |
| ٣٧٥ | ٣ | |

بینا بە قاقزی مودیری عام بەرید و بەرق ژمارە (٢٩١/٤) لە ١٩٣٦/٢/١٠ صەرف و مەحسوب كرانی ٣ دینار و سێ سەد و حەفتا و پێنج فلس بە مەئموور مەركەزی بەرید و بەرق ئەربیل محەمەد ئەفەندی ئوجرەتی تەلەفۆن عائد بە مانگی كانونی دووەمی ٣٦ تا نهایەتی مارت لەگەڵ ئوجرەتی موكالەمەی مانگی...... كە لە قائیمەی ژمارە ٨٧٠٢ ولە ١٩٣٦/١/١٩ دیار كراوە. وە لە مادە ٣ فەصل ٢ ئیدارەلعامە مەحسوب كرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١١١) لە ١٩٣٦/٢/٢٠**

قاقزی سەعادەت مەتەصەریف لیوا ژمارە (١٨٧١) و رۆژ ١٩٣٦/٢/١٩ موطالەعە و ئیجاب موذاكەرە كرا. ئەم شەش ذەواتی دیار كراو ئەحمەد ئاغا محەمەد عەلی ئاغا، داود ئاغا سەعید ئاغا، شەهاب چەلەبی دەباغ، حاجی رۆستەم چەلەبی بۆ عضوییەتی مەجلیس ئیدارەی ئینتخابات موافیق دیترانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٢٣) لە ١٩٣٦/٢/٢٥**

بینا بە تەقریری مەئموور مەركەزی شورطە كە بە دەركناری مودیری شورطە ژمارە (٢٧٦٩) و رۆژ ١٩٣٦/٢/١٣ بە دائیرە نارراوە و لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان تەودیع كراوە موطالەعە كرا. دوو حارسی ئەهلی.......،...... كە لە ئەثنای دەوریە لە ناو حەمام دانیشتنیان لە طەرەفی چاوشی دەوریە ئیخبار كراوە لەگەڵ چاوشی موخبیر لە حضووری مەجلیس بەلەدیە حاضر بوون لە نەتیجەی ئیستیجواب - عەطفەن بە سووندی چاوش - ئیخبار واقعە موافیق حەقیقەت بوونی قەناعەت كرا و چونكە ئەوەل جارە تەنیا هەریەكی موقابیل بە ٣ رۆژ قسطلیەوم ١٢٠ فلس لە معاشی شوباط و تەجزیە ئیراد قەید كرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٢٤) لە ١٩٣٦/٢/٢٥**

| فلس | دینار | | |
|---|---|---|---|
| ٥٠٠ | ٠ | قیمەتی كاریتە | ١ |
| ٦٠ | | قیمەتی خۆڵ بار | ٣٠ |
| ٩٠ | | قیمەتی كا بار | ٣ |
| ١٥٠ | | چیخ | ١ |
| ٨٠٠ | | | |

| فلس | دینار | | |
|---|---|---|---|
| ٨٠٠ | ٠ | قیمەتی كەرپوچ عەدەد ٢٠٠ | تەعمیری سەقفی مەیدانی غیلال |
| ٢٠٠ | | قیمەتی كێچ عەلبە ١/٢ | |
| ١٥٠ | | | |
| ٨٠٠ | | نوجرەتی عومال | |

تەقریری موهەندیسی بەلەدیە ژمارە ٣٩و رۆژ ١٩٣٦/٢/٢٤ كە لەگەڵ تەقریری پێچراوی مەئموور ئیستهلاك لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان حەوالە كراوە و مەربووطن خوونرا. مادام لە بەر كثرەتی باران سەقفی مەیدان غیلال زۆر درزی پێدا كردووە و كاریتەیەكی شكاوە تەعمیری ضەروورە و ئیعتمادی هەیە لە ژێر نەظارەتی ئەعضایانی بەلەدیە مەلا محەمەد ئیراهیم و خەلیل ئەفەندی بە مەعریفەتی موهەندسی تەعمیراتی ئیجرا و مەجمووع مەصرەفی كە موفرەداتی لە تەقریری

موهەندسی دیار و بۆ سەرەوە نەقل کراوە و لە (٩٥٠.١) دینار عیبارەتە لە مادده (١١) فەسل ٥ هەندەسە مەحسووب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٢٥) لە ١٩٣٦/٢/٢٦**

نصادق علی اعتماد هذه المیزانیه

**قەرار ژمارە (١٣٣) لە ١٩٣٦/٣/٩**

| فلس | | |
|---|---|---|
| ٢٨٠ | قیمەتی شەکر حوقە ٢ | مەصرەفی مەراسیمی جەژن لە دائیرەی حکوومەت بایع عەبدولجەبار عەتار |
| ٠٧٢ | قیمەتی پاکێت ٦ | |
| ٠٨٠ | قیمەتی قەهوە ٢ق | |
| ١٤٤ | قیمەتی جیگارە غازی پاکیت ١٢ | |
| ٠١٨ | قیمەتی شەکر بۆ قاوە | |
| ٠١٠ | قیمەتی شخاطە | |
| ٠٢٠ | ئوجرەتی سۆر کران و کوتانی قاوە | |

بە گوێرەی راپۆری پێچراوی وەکو موفرەداتی سەرەوە بۆ درانی (٦٢٤) شەش سەد و بیست و چوار فلس بە بایع عەبدولجەبار عەطار قیمەتی لەوازماتی سەرەوە کە بۆ ئیجرای مەراسیمی جەژن لە دائیرەی حکوومەت کڕاوە و لە مادە ٦ فەصل ٢ ئیدارەلعامە مەحسووب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٣٥) لە ١٩٣٦/٣/٩**

| فلس | دینار | | |
|---|---|---|---|
| ٣٠٠ | ٠ | قیمەتی کەرپووچ عەدەد ٣٠٠ | تەعمیری سەکۆی پێش دائیرەی بەرید |
| ٢٥٠ | | قیمەتی گێچ عەلبە ١ | |
| ٤٥٠ | | نوجرەتی عومال | |
| | ١ | | |

تەقریری موهەندیسی بەلەدیە ژمارە ٤١و رۆژ ١٩٣٦/٣/١ لەگەڵ مەربووطاتی کە لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان تەودیع کراوە پێچراوەیە موطالەعە کرا، تەعمیری قسمی خراپ بووی سەکۆی پێش دائیرەی بەرید چونکە زۆر نییە وەکو موفرەداتی سەرەوە بە یەک دینار ئیجرا کردنی تەخمین کرا. لە بەر ئەمە لە ژێر نەظارەتی ئەعضایانی مەجلیس بەلەدیە مەلا سەلیم ئەفەندی و خەلیل ئەفەندی بە مەعریفەتی موهەندسی بەلەدیە تەعمیراتی مەذکوور ئیجرا و میقداری مەصرەفی کە یەک دینار دانراوە لە مادە (١) فەصل ٥ هەندەسە مەحسووب کرانی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٣٩) لە ١٩٣٦/٣/٩**

لاحیقە بە قەرارمان ژمارە (٥٥٩) و ٥٤/٧/١١ و ٣٦/١٠/٩

راپۆری موهەندسی بەلەدیە ژمارە ٤٢ رۆژ ٣٦/٣/١، کە لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان تەودیع کراوە و مەربووطە موطالەعە کرا. بینا بە قاقزی موخابەرەی مونتەهی سەعادەت موتەصەریفی لیوا ژمارە (٢١٣٥) و رۆژ ٣٦/٢/٢٦ لە فەضلەی طەریق کە لە جادەی صلاح الدین و لە موقابیلی بینای کەهرەبا واقیعە یەک باخچە دروست کرانی لزووم دیترا و بە گوێرەی کەشفی موهەندسی کە موفرەداتی لە ژێر راپۆری موهەندسی ژمارە سەرەوە و بار و مەجمووع موصارەفاتی باخچەی مەذکوور لە (١٢٠.٦٧٠) دینار عیبارەت بوونی تەخمین کراوە، چونکە بۆ ئەم غایەیە لە ئیعتیمادی میزانیەی ساڵی ١٩٣٥ تەنیا (٢٠) دینار مەرفووعە و میزانیەی ساڵی ١٩٣٦ بە تەصدیق ئیقتران نەکردووە هەرچەندە بۆ ئینشائاتی پێویست لەوازمات مەوجوود نییە ئێستا ئەم (٢٠) دینارە کە بۆ ئینشاء ٣ باخچە لە جادەی موزەفەر بە قەراری پێشوومان ژمارەو رۆژی سەرەوە تەخصیص کراوە بۆ صەرف کرانی لە تەعدیل و تەسویەی جێگای باخچەی باس لێکراو و مەحسووب کرانی لە مادده ٩٠ فەصل ٥ هەندەسە موافیق دیترا و بۆ موعامەلەی پێویستی قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٤٠) لە ١٩٣٦/٣/٩**

تەقریری مەئمووری صحیە ژمارە (١٦٣) رۆژ ٣٦/٣/٨ کە لە طەرەفی ریاسەت بە مەجلیسمان تەودیع کراوە و مەربووطە موطالەعە کرا. ئەم (٦٤) عەدەد پیستە قوربانی کە لە جەژن گر کراوە بە مەعریفەتی ئەعضایانی بەلەدیە مەلا محەمەد ئەفەندی و مەلا سەلیم ئەفەندی و خەلیل ئەفەندی بە مەزاد عەلەنی فرۆشان و میقداری

موصارەفات كە بۆ ئەم غایەیە ئیجرا كراوە لە بەدەلی پیستەكان تەسویە و مەبلەغی موتەباقیە بۆ جەمعیەتی طەیەران نارانی موافیق دیترا بۆ ئیجاب قەرار درا.

**قەرار ژمارە (١٤١) لە ١٩٣٦/٣/٩**

مەجلیس بەلەدیە رۆژی ٥٤/١٢/١٥ و ٣٦/٣/٩ دووشەموو بە ئیشتراكی رەئیس صحیە لیوا تەشەكول و بە موجیبی مەوادی ژێرەوە بۆ موراقەبەی قاوەخانە و ئاشتخانە و ئوتێل و كەبابخانە ئیستناد بە فەقەرە هـ- ١٠ لە ماددە ٤٤ قانون ئیدارەت ئەلبەلەدیات رەقەم ٨٤ ساڵی ١٩٣١ ئەم تەعلیماتە ئیصدار كرا:

١. ماددە ١ بەبێ ئیجازەی دائیرەی بەلەدیە كە ئیستیناد بە موافەقەتی دائیرەی صحیە ئەدرێ نەقل یان دروست یان كرانەوەی چایخانە و قاوەخانە و ئوتێل و ئاشتخانە و كەبابخانە جائیز نییە.
٢. لازمە ئەرضی ئەم جێگایە بە كەرپووچ مەغرووس یا بە چیمەنتۆ یا قیر یا بە ماددەیەكی تر موشابیهی مویەللەط بێ و دیواری بە گێچ یا بە سپی و هەر دارێكی لە محەلییان مەوجود بێ بە بۆیاغی زەیتی چەور بكرێ.
٣. مادە ٣ لازمە خدمەتچی ئەم جێگایانە لە ئەمراض ساریە ساڵم و تابع بە فەحص طبی بێ و دەست و لیباسیان خاوێن بێ و صەدریە، یەعنی بەركوژەیێكی سپی لە بەریان بێ. صاحبی محەل یا موستەئجیر هەر نەخۆشێكی لە موستەخدەمێن ظاهیر بوو حالەن بە ئیدارەی صحیە خەبەردانیان لازمە.
٤. هەر قاپە و بادە و فینجان و برداق كە بۆ خواردن و خواردنەوە لەم جێگایانە ئیستیعمال ئەكرێ دائیمەن شووراو و خاوێن بوونیان لازمە و بە پەڕۆی پیس سڕانەوەی ئەمانە قەطعیەن جائیز نییە. ئیللا بە ئاوێكی زۆر خاوێن كە كەفی سابوونی تێدا بێ شوورانیان و بە پەڕۆیێكی خاوێن و وشك كرانیان ئیجاب ئەكا. ئەم قاپی كە پێشتر لە طەرەفی شەخصێك ئیستیعمال كرابێ لە پێش شووران وەكو بەیانی سەرەوە بۆ شەخصی تر ئیستعمال جائیز نییە.
٥. لازمە مەخزەنی ئاو (وەكو كوپە و بەرمیل) كە لەم جێگایانە موستەعمەلە حەنەفیەی لێ قایم بكرێ و ئەقەللەن میقداری (٣٠) سی سانتیمەتر لە ئەرض بڵند لە سەر كورسیێك دابمەزرێ. لە وەقتی لزووم لە حەنەفیە ئاو لە مەخزەن بینی، لە زاركی مەخزەن ئاو دەرهێنان قەطعیەن مەمنووعە.
٦. لەم جێگایانە بە گوێرەی ئیرشادی دائیرەی صحیە لە درێژایی (٤٠) بەرینایی (٢٥) سانتیمەتر لەوحەیەك هەڵاوسان و لەسەر ئەم لەوحەیە (تف و بەڵغەم فڕێدان مەمنووعە) نووسران لازمە.
٧. لەم جێگایانە بۆ زبل تێدا گركران صندووقێكی مەعدەنی و یا دار مەوجوود بوون و حەجمی ئەم صندووقە بە گوێرەی وەصفی محەل تەنظیم كران و لە وەقتی پڕ بوون لە باری زبل فڕێدان لازمە.
٨. سەقفی مەطبەخ و كەبابخانە بێ دەرەز بە تەختە و یا بە قوماشێكی مەتین داپۆشران لازمە و لە ئیقتراح و لزووم دیتنی دائیرەی صحیە تەبدیل كران ئیجاب ئەكا.
٩. بۆ دانانی گۆشت و لەوازماتی خواردن دۆڵابێكی جام و یا تێل لەم جێگایانە مەوجوود و داری ئەم دۆڵابە بە ڕوونی زەیت بۆیاغ كرانی لازمە.
١٠. هەر قاپێكی كە لە پاقر مەعموولە و لەم جێگایە مەوجوودە دائیم سپی بوونیان لازمە و ئاسن موستەعمەل لەم جێگایانە هەموو وەقتێ كە لزووم دیترا سپی كران و بە هەمووم سپی و موافق بە حالی صحە بوون و لە ناو ئەم قاپە ئاسنانەوە لەو پاكژیش بێ شیو هەڵگرتن مەمنووعە و لازمە لە ناو فەخفوری هەڵبگیرێ.
١١. بە هەر سەبەبێك بێ لە ناو ئەم جێگایانە هەموو نەوع حەیوانات بەخێوكردن جائیز نییە.
١٢. رووتەخت و نوێن كە لە چایخانە و ئوتێلەكان بۆ دانیشتن و نوستن موسافرین تەخصیص كراوە دائیمەن خاوێن بوونیان لازمە. روو دۆشەك و لێف لە ئوتێلان لە قوماشی سپی دروست كردن و ئەم رووانە لە هەفتەی دووجار یا وەقتی لزووم و تەبەدولی جوان شووران و لە ئووتی دران ئیجاب ئەكا. لە ئوتێلان لە ئەرض نوێن چاكران جائیز نییە. نوێن لە ئەرض ئەقەللەن (٣٠) سانتیمەترە بڵند بوون شەرطە.

لە سەر ئاووردانی كەبابچییەكان بۆ وەركەتنی دوكەڵ بۆرییەكی تەنەكە دامەزران و و لە چایخانەكان بۆ

لەوێ بە سەر جۆگەی ئاوەکەوە بوون، هەروەها (سەیداوە)ش دواجار بە ناوی (سەید)ێکی ناودار کراوە.

هەرچی ناوی (گەڕەکی عارەبان)ە ئەم ناوەش بە ناوی ئەو یەک دوو ماڵە عارەبە کراوە، کە لە سەرەتا لەو گەڕەکە نیشتەجێ بوون، چونکە لە ناولێناندا زۆر جار (گشت) بە ناوی (بەش) دەکرێ، وەک ئەوەی گەڕەکێکی گەورەی هەولێر بەناوی یەک تاکە (منارە) دەکرێ، ئەویش (گەڕەکی منارە)یە. هەڵبەت بە پێی ناوە خەڵکییەکەی، گەڕەکی عارەبانیش ئاوایە و گەڕەکێکی گەورەی شاری هەولێر، بەناوی دوو ماڵە عارەب دەکرێ و ئەو ناوە بەسەر هەموو دانیشتوانی گەڕەکەکەدا زاڵ دەبێت و دەبێ بە فەرمی کەچی لە راستیدا ناوەکە ناوی کۆڵانی عارەبانە، واتە ناوی کۆڵانێک بووە لە گەڕەکێک و پاشتر بووە بەناوی گەڕەکەکە، لەوەش سەیرتر، کە دواجار ئەم گەڕەکە گەورە دەبێ و بەشێکی تری زەوی بۆ دادەندرێ، ئەو بەشەش بە (گەڕەکی نوێی عارەبان) ناوزەد دەکرێ، بەبێ ئەوەی کە یەک تاقە ماڵی عەرەبی وەک دانیشتوانی رەسەنی ئەو گەڕەکەی لێبێ. ئەمەش خراپ تێگەیشتنێکی لای ئەو کەسانە دروست کردووە کە شارەزای هەولێر نین و وادەزانن کە ئەم دوو گەڕەکە، (گەڕەکی عارەبان) و (گەڕەکی نوێی عارەبان) گەڕەکی تەواو عەرەب نشینن. لە راستیدا وا نییە، هەرچەند هەبوونی عەرەب و هەر نەتەوەیەکی تر لە کوردستان ئاسایی و سروشتییە، بەڵام، ئەمە حەقیقەتی گەڕەک و ناولێنانەکەیە.

لەباسی ئەو گەڕەکانەی کە بە هۆی بارە چینایەتییەکانیان ناویان بەسەردا دەبڕێ، دەتوانین، ناوی گەڕەکی (ناچاری) بێنین لە شاری هەولێر، کە راستییەکەی ئەوەیە خەڵکانی هەژار و نەدار ئەو شوێنە نەشیاو و نارێکەیان بە ناچاری کرد بە شوێنی ماڵ و حاڵی خۆیان و زۆر بە هەژاری خانووی قوڕو خراپ و نارێکیان لێ دروست کرد. هەر بەو بۆنەیەوە ناوی لێنرا (گەڕەکی ناچاری) سەیر لە وەدایە، کە لە ساڵی ۱۹۹۱ پاش راپەڕین چوومە ئێران و لە شاری (مەهاباد) ماوەیەک مامەوە، ناوی گەڕەکێکم بیست، بە ناوی (مەجبوورئاوا) کە هەمان سیفەتی گەڕەکی ناچاری شاری هەولێری هەبوو. لەوێش خەڵکێکی هەژار بە مەجبووری خانووی خراپ و نارێکیان لەو گەڕەکە دروست کردبوو، ئەمەش ئەگەرچی ناولێنانەکە هەریەکە، ئەوا بارە چینایەتییەکەش هەریەکە و ئەویش رەنگدانەوەی بارە رامیاری و سیاسەتە ئابوورییەکەی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستانە. ئێستا ئەگەر بەوردی شارە جیاجیاکانی پارچە جیاجیاکانی کوردستان بگەڕێین، ئاخۆ چەند گەڕەکی تری هەژارنشین دەدۆزینەوە، کە بە هەمان هۆ، هەمان ناویان هەیە: ناچاری و مەجبوورئاوا و گێ مەدێ و پیسکاوا و چی و چیتر..

بەداخەوە (ئێستاش لە ساڵی ۲۰۰۷) لە شاری هەولێر، بارە چینایەتییەکە هەر بەردەوامە و ئەویش چەندین ناوی گەڕەکی تازەی لێکەوتۆتەوە کە تەواو دەربڕی بارە ئابوورییەکەیە. بۆ نموونە: لە هەولێر گەڕەکی (دڕکاوا)و (گەڕەکی پۆتیناوا) و (گەڕەکی شاپاوا) کە گەڕەکی خەڵکە ناچار و مەجبوورەکانە، لە هەمان کات، گەڕەکی (دۆلاراوا) و (شاری خەونەکان) نموونەی گەڕەکی تازە بابەت و دەست ڕۆیشتووەکانن.

دواجار ئەوەی لە بارەی ناولێنانی گەڕەکەکانەوە بۆ گوتن بشێ، ئەوەیە کە زۆربەی گەڕەکەکانی شاری هەولێر لە ناوێک زیاتریان هەیە، ئەویش ناوێکی شەعبی و ناوێکی رەسمییە. بۆ نموونە (کووران ـ رزگاری)، (نەورۆز ـ حەی عەسکەری)، (دڕکاوا ـ کوێستان)ە کە زۆرتریش ناوە شەعبییەکە بلاوتر و ناسراوترە تا ناوە ڕەسمییەکەی.

جۆرێکی تری ناولێنان، ئەو ناوانەیە کە میری کاتی زەوی تازە بەسەر بەشێکی خەڵک دابەش دەکات، گەڕەکەکەش هەر بە ناوی ئەوبەشەی خەڵک ناودەنێ. بۆ نموونە: گەڕەکی مەلایان، گەڕەکی ئەندازیاران، گەڕەکی ئەفسەران، گەڕەکی مامۆستایان و گەڕەکی نووسەران و گەڕەکی کرێکاران و.... گەڕەکی شەهیدان، ماڵە ئەمنەکان و..تاد. بە هۆی جۆرەکانی ناولێنانەوە، ئەگەر ناوە ڕەسمی و ناوە شەعبییەکەی گەڕەکەکانی شاری هەولێر، بە سەر بکەینەوە، ئەوا سەرەی ڕای گەڕانەوە بۆ زۆر سەردەم و ڕووداو وسیاسەت و نهێنی دوور و نزیکمان دەباتەوە، کە هەر یەکەیان مێژوو و چیرۆکی تایبەت بە خۆی هەیە.

**دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن**

## ناوی گەڕەکەکان

### خانەقا

خانەقا وشەیەکی فارسییە، واتە (ماڵ). بەو گەڕەکە دەوترێ خانەقا کە دەکەوێتە دەوروبەر و نزیکی مزگەوتی خانەقا. ئەم مزگەوتەش مامۆستا جەمال بابان لە بەرگی یەکەمی (اصول اسماء المدن والمواقع العراقية)دا، دەڵێت: بەناوی زانای گەورەی کورد مەولانا خالیدی نەقشبەندی هاتووە. مامۆستا رەشاد موفتی لە دانیشتنێکی تایبەتیدا فەرمووی: ئەم مزگەوتە پێش هاتنی مەولانا خالید لە هەولێر هەبوو، بەڵام بە فەرمانی ئەو ئاوەدان و چاک کراوەتەوە. بێگومان ئەم گەڕەکە لەبەر بوونی ئەم خانەقایەی ئێستای ئەم ناوەی لێ نراوە و خانەقاکەش بەندە بە هاتنی مەولانا بۆ هەولێر و بایەخ پێدانی. کە ئاوی بەستی هەولێر لە بەهار و زستانانددا زیادی دەکرد ئەو ناوەی یەک پارچە دادەپۆشی و ئاوەکەش دەمایەوە و گۆمی گەورە و پیسی لێ دروست دەبوو، بۆیە ناوچەیەکی ئەم گەڕەکە بە (گۆمەپیس) ناوی هاتووە، بە تایبەتی ئەو لایەی کە نزیک و قەراخی ئەم بەستە بووە، ئێستاش گەڕەکی خانەقا یەکێکە لە گەڕەکە گەورەکانی شاری هەولێر و بەپێی دانانی بنەڕەتی ئەم شارە، ناوچەیەکی بازرگانی فراوانە و لەگەڵ جێبەجێکردنی ئەم دانانە بنەڕەتییە رووی جوان و پاکی و ئاوەدانی ئەم گەڕەکە دروست دەبێت و دەبێتە ناوچەیەکی بازرگانی تەواو، مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە گەشتێک لە کوردستاندا، کە لە ساڵی ١٩٥٦ لە چاپی داوە، دەڵێت: هەولێر ٣٨ مزگەوت و تەکیە و خانەقای لێیە.


گەڕەکی خانەقا

### سەعدووناوە

گەڕەکی سەعدووناوە دەکەوێتە نێوان ئێستگەی شەمەندەفەر و گەڕەکی تەعجیل، خەڵکی دانیشتووانی ئەم گەڕەکە بەگشتی خەریکی کوورە بوون، واتە بە دروستکردنی خشتی سوور (کەرپووچ)ەوە خەریک بوون. لەبەر نزیکییان لە باخچەی گڵکەندی ئێستا کە شوێنی خۆڵ و کوورەکانیان بووە و لەبەر چاڵی و دەستدانی ئەم خۆڵە بۆ کارەکەیان ئەم شوێنەیان هەڵبژاردووە بۆ کارکردنیان و گەڕەکی سەعدووناوە بۆ نیشتەجێیان، بەڵام دوایی (مەقلەعی) خۆڵەکەیان گواستۆتەوە.

ناونانی ئەم شوێنە رەنگە لەبەر بوونی پیاوچاکێک بێ، کە ئێستاش گۆڕەکەی ماوە و ناوی سەعدوون بووە یاخود لەبەر سەعدوون ناوێک، کە شوێنەکەی ئاوەدان کردۆتەوە یان زەوییەکەی هی ئەو بووە و فرۆشتوویەتی، گەڕەکەکە وەک گەڕەکەکانی عەرەب و تەعجیل و خانەقا کۆنە لەبەر هەندێ ئەو دیاردانەی باسمان کردن. لێرەدا راستییەک هەیە دەمانەوێ بیدرکێنین: بێ گومان ئەم کۆمەڵە ماڵەی لەم گەڕەکەدا دانیشتوون کورەچی بوون و بەژمارە زۆر بوون و مەقلەعەکەیان شوێنێکی فراوان بووە، ئەوەش وا دەگەیەنێ ئەم پیشەسازییە پیشەیەکی چاک و زۆر پێویست بووە لەبەر ئاوەدانی و قەرەباڵغی شاری هەولێر لە کۆنەوە هەروەها رووی شارستانێتی و خاوێنی و ئاوەدانی ئەم شارە و وەستایەتی خەڵکەکە دەسەلمێنێ لەبەر دووکەڵ و دوورکەوتنیان لە نەخۆشی هەستیان پێ کردووە، کە ناوە ناوە لەگەڵ گەورە بوونی شاری هەولێر کوورەکانیان گواستۆتەوە، ئەمەش نیشانەیەکی تری شارستانییەتی و پێشکەوتنی خەڵکی ئەم شارەیە لە هەموو روویێکەوە.


گەڕەکی سەعدوناوە

## گڵكەند

كەس نییە لە شاری هەولێر و خەڵكی تریش باخچەی گڵكەندی نەدیبێ، یەكێكە لە باخچە هەرە جوانەكانی عێراق، كە لە ناوەڕاستی شەستەكاندا بەپێی نەخشەیەكی زۆر هاوچەرخ لەلایەن شارەوانی هەولێر دروست كراوە و ئێستاش بایەخێكی زۆری پێ دەدەن.

شوێنەكەی لە كاتی خۆی (مەقلەعی) كوورەچییەكان بووە، چونكە خۆڵەكەی چاك بووە، بۆیە بەرەو قووڵی و نزمی دەڕۆیشت، خانووەكانیان و دانیشتوانانی یەكجار سەغڵەت ببوون. بەپێی دانانی بنەڕەتی شاری هەولێر شوێنەكەی لەبەر نزمی ببووە ناوچەیەكی سەوزایی، بۆیە جێبەجێش كرا و خەڵكەكەیان لەم قوڕتە و ژیانە ناخۆشە ڕزگار كرد، لەبەر نزمی شوێنەكەش بەم ناوە ناونراوە، كورد وشەی (كەند) بە شوێنی نزم دەڵێن، پاش دەست پێكردن و جێبەجێكردنی ئەم پرۆژەیە (واتە باخچەی گڵكەند) خەڵكەكەیان گواستەوە پاش وەرگرتنی پارچە زەوییەك و هەندێك پارە بۆ شوێنێك، كە دەكەوێتە پشت گەڕەكی سێتاقان شوێنێكی ڕەق و بەرزە و هەر بەیادی گڵكەندەكەی جاران بەم كۆمەڵە خانووەش دەڵێن گڵكەند.

## مەنتكاوا

ئەم گەڕەكە دەكەوێتە پشت ڕووناكی تا قەراغی گەڕەكی (٩٢)، گەڕەكێكی گەورە و فراوانە، لە سەرەتای شەستەكاندا كۆمەڵێكی زۆر لە خێزانی خێڵی (مەنتك) لەدێ نشینەكان و كۆچەرەكانیان لە گوندەكانی دوو شیوان و كانی بزرە و لووركە و حەسەن موتریب و هی تر... بە كۆمەڵ هاتن بۆ هەولێر، بە هاوكاری ئەسعەد ئاغای مەنتك و حاكم سابیر ئەم خەڵكەیان نیشتەجێ كرد و




زەوییان پێ فرۆشتن، بەرە بەرە ئەم گەڕەكە گەورە بوو و ئێستاش گەڕەكێكی گەورەی شاری هەولێرە، جا لەبەر هاتنی ئەم كۆمەڵە (مەنتكە) بۆ یەكەم جار بۆ ئەم شوێنە، ناوی ئەم گەڕەكە بە (مەنتكاوا) ناوبرا و وشەی لە وشەی ئاواو ئاوایی و ئاوەدانییەوە هاتووە هەر وەك بەناوی شوێنەكانی كوردی بەگشتی لكاوە.

## ئازادی

ئازادی یەكێكە لە گەڕەكە هاوچەرخەكانی شاری هەولێر، خانووەكانی بەشێوەیەكی جوان و ڕێكوپێك دروست كراون. شەقامی بەرین و باخچەی فراوانی تیایە، لە سەرەتای پەنجاكاندا بەهۆی ئەوەی، كە (ئیسماعیل حەقی ڕەسول) موتەسەریفی ئەوكاتی هەولێر ئەم گەڕەكەی بەتایبەت بۆ فەرمانبەران و مووچەخۆرانی میری دروست كرد، بۆیەش تا شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژی مەزن هەر بە (ئیسماعیلاوا)[٧] (سمایلاوا) ناودار بوو، بەڵام پاش شۆڕشی ناوبراو، ناوی گۆڕاو بوو بە ئازادی، سنوورەكەشی لە شەقامی هەولێر- كەركووك تا گەڕەكی ڕزگاری و گەڕەكی ڕاستی (عەداله) و شەقامی كوردستان درێژ بۆتەوە.

## شۆڕش

كۆمەڵەی شۆڕشی نیشتەجێی مامۆستایان ئەم گەڕەكەی دروست كرد و بەناوی ئەم كۆمەڵەیەوە ناونراوە.

## كانی

بەیادی شاعیری گەورەی كورد خوالێخۆشبوو عەبدولجەباراغای كانی و بەناوی كۆمەڵەی كانی نیشتەجێی ئەم گەڕەكە ناونراوە.

## ئاوی كەسك و سۆر

گۆڕەپانی پێش نەقابەكانی كرێكاران، كە شوێنی ئاوی میری بووە لەبەر دروستكردنی نافوورەیەك بە گڵۆپی ڕەنگاو ڕەنگەوە، ناوچەكەی گەش و جوان كردبوو، شوێنی سەیرانكەران و گەنجان بوو و تا ئێستاش ئەم ناوچە هەر بە ناوی نافوورە یان ئاوی كەسك و سۆر ناودارە، چونكە كە ئێواران نافوورەكەیان بەكار دەخست بە گڵۆپە ڕەنگاو ڕەنگەكانی دیمەنێكی ڕەنگینیان دروست دەكرد، بۆیە بە ئاوی كەسك و سۆر ناودار بوو.

## کۆڵانی عارەبان یا گەڕەکی عارەبان

ئەو گەڕەکە دەکەوێتە نێوان قەڵا و منارەو گەڕەکی تەعجیل و تەیراوە، کە دەکەوێتە نێوەند و سەنتەری شار، زۆربەی هەرەزۆری دامودەزگای میری عوسمانی، پاشاکان، تا رادەیەک دام ودەزگای حکومەتی سەردەمی مەلیک فەیسەڵی یەکەمی لێ بووە. هەروەها سەرا وماڵی سەرۆک و حاکمی ئینگلیز و پۆلیسخانە و قشڵە و خەستەخانە و مزگەوت و تەکیە و کلێسەی گاوران و کاروانسەرا و خان و بازاڕ و سینەما و مەزارگە وەک "سوڵتان موزەفەرەدین" و "عوزێر پێغەمبەر" و "گۆڕستانی ئیمام محەمەد" لەگەڵ چەندین قوتابخانەی سەرەتایی و ناوەندی و دوا ناوەندی و بەشی ناوخۆیی قوتابیان و چاپخانەو ئاش و ئوتێل و گەرماو و..هتد

هەروەک بەرێز "مومتاز حەیدەری" زانیاری پێداوم و ئاماژەی کردووە و دەڵێت ئەم گەڕەکە لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی بەرە بەرە دروست بووە.

ئەوەی راستی بێت بەر فردوانبوونی ئەو گەڕەکە دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک، لەوانە: باری رامیاری- کۆمەڵایەتی- ئابووری و نیشتەجێی شارستانی و وەزیفی و خوێندن لەم شارەدا، دیارە لەسەرەتادا ئەم گەڕەکە خەڵکانێکی بەڕەسەن هەولێری لێی نیشتەجێ بوون، بەڵام دواتر فەرمانبەر و پۆلیس و سەربازی عەرەب کە لە شارەکانی ناوەڕاست و باشووری عێراق دەگوازرانەوە بۆ هەولێر و زۆربەیان لەو گەڕەکە نیشتەجێ دەبوون، چونکە لەدام و دەزگاو سەربازگەو پۆلیسخانەکان نزیک بووە. هەروەها سەنتەری شار بووە ئەمانە بەپێی کارەکانیان دەهاتن و دەڕۆیشتن. یەک دوو ماڵە عەرەبێکی تێدا بوو، کە گامێشیان بەخێو دەکرد و بەروبوومی شیرەمەنییان دەفرۆشت و چەند ماڵە عارەبی تر کە نانەواچی بوون و بە تەنووری نان و لە ماڵەوە نانیان دەکرد و بۆ بازاڕ دەیانبرد و دەیانفرۆشت. پەیتا پەیتا ئەو عارەبانە لەو گەڕەکە نیشتەجێ بوون. بەڵام لە ئەنجامی تێکەڵاوبوون و خزمایەتی کردنیان لەگەڵ کوردان لە ڕێگای بەشوودانی کچەکانیان و ژنهێنانیان خەسڵەت و سیمایەکی تایبەتی ئەو گەڕەکەیان وەرگرت، چونکە کەمینە بوون. تائێستاش زۆربەی دانیشوانی کۆنینەی ئەم گەڕەکە بەزمانی کوردی و



توركی و عەرەبی قسەدەکەن. ئەمە وەک گەڕەکی عارەبانی (کۆن) کە لە سەرەتادا بە کۆڵانی عارەبان بەناوبانگ بوو. بەڵام دواتر پاش شۆڕشی ئەیلوول کە بەرپا بوو، بە تایبەتی لە(١٩٦٣)دا، کە دەسەڵاتی بەعسی ردگەز پەرست پەیدا بوو و حەرەس قەومی رۆڵی زولمکارانەیان دەدی و جاشە کورد پەیدا بوون و گوند و دێهاتەکان ئەوەی وێران کرا یان خەڵکەکەی دەربەدەر کران، بەتایبەتی ئەوسا ناوچە بیرە نەوتەکان، لە لایەک ژمارەیەکی زۆر لە گوندنشینانی دەشتی هەولێر لە موسڵ و هەندێکیش لە بەڕانەتی هاتنە شار و لە لایەکی تریش پاش رووخانی حوکمی مەلەکی و شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ و جێگیربوونی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم ئاغاکانی دزدیی گوزەرانیان لە دەشت لێ تێکچوو و روویان لە شار کرد، زۆربەیان لەگەڕەکی عارەبان نیشتەجێ بوون و خانوویان دروست کرد، کە تائێستاش لەو گەڕەکە ماون و بەناوی گەڕەکی "عارەبانی نوێ" ناو نرا، بەبێ ئەوەی هیچ ماڵە عەرەبێکی تێدا بێ. دانیشتوانی عارەبانی کۆن ئەو گەڕەکە نوێیەیان بە (ناوقەسران) ناودەبرد. هەروەها ئەوانەی لە قەڵاوە دادەبەزینە دامێن و لەخواردەوەی قەڵا نیشتەجێ دەبوون، تاکو ئێستاش ماڵەکانیان لەو گەڕەکە ماوە. بۆ نموونە ئەوەتا ماڵی (زانای ئاینی و نیشتیمانپەروەرو رۆشنبیر قازی رەشاد موفتی) و دەیان ماڵی دیکە.

هەڵبەتە کە ئەم گەڕەکە پێکهاتەیەکی ئاوا هەمەکەس و هەمەچین و توێژ و هەمە میزاج و هەمە ناوچەیی و شوێنگەیی هەبێت، پێکهاتەیەکی هەمە زمان و زمانێکی تایبەتیشی لێ دێتە ئارا، ئەگەر تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایە رەسەنایەتی خودی خۆیان تێدا نەپاراستبێ. من یەکێک

لەو كەسانەم كە دەبوایە بەزمانێكی سەقەت قسەم بكردایە و بنووسیبووایە، ئەگەر مەسەلەی پاراستنی گیانی نەتەوایەتی و رۆحی كوردایەتی نەبووایە. كە بە تێكۆشانی سیاسی و كوردایەتی تێكەڵ بووم و كەوتمە نێو دنیای ئەدەب و رۆشنبیری و جگە لەمەش چونكە ماڵەكەمان بنكەیەك بووە وەك میوانخانەیەك بۆ خزمەكانمان كە لەگوندەوە دەهاتن و لە ماڵی ئێمە میوان دەبوون، بەزمانە پاراوەكەی گوند، گوێبیستی قسەكانیان دەبووم، بۆیە زمانە پاراوەكەی كوردی لەسەر زارمەوە ماوە و كۆچی نەكرد و ئێستاشی لەگەڵدا بێ زۆر لە هاوڕێ نووسەرەكان پرسیاری ئەوەم لێ دەكەن و پێم دەڵێن بەڕاستی هونەرەو جێگای شانازییە كە تۆ لە گەڕەكی (عارەبان)ی كۆن لەدایك بوویت و زۆربەی تەمەنت لەو گەڕەكە بەسەر بردووە كەچی بەزمانێكی كوردی پاراو نووسین و شیعرەكانت بلاودەكەیتەوە.

لەو گەڕەكە كە سەنتەری شار بووە و هەموو بازاڕ و شارستانیەتە سەرەكییەكە و دام و دەزگاكانی میری و چاپخانە و پەرتووكخانە و قوتابخانە و خان و هەموو خانەكانی هۆشیاری و كۆمەلایەتی و رامیاری و ئابووری و رۆشنبیری وەك زۆرینە تێیدا بووە، دیارە دانیشتوان و رۆڵەكانی ئەم گەڕەكە، چاوكراوە و هەستیار و رۆشنبیر دەبن. لەو گەڕەكە تەنانەت كۆلانەكانیشیان چین چین پەیوەست بووە بەچین و توێژێك، ئەمەیان كۆلانی قەسابان، ئەوەی تریان ناوێكی تر... هتد. تا رادەیەكیش ململانێ و هەندێ جاریش توندوتیژی و ناكۆكییەكانی نێو ئەم گەڕەكە بەزەقی تەدیار كەوتووە، بەتایبەتی لە جوغزی حزبایەتی و كوردایەتی و مەسەلەی ئاینی لە نێوانی ئەو گەنجە خوێندكارانەی كە لەو گەڕەكە نیشتەجێ ببوون بۆ خوێندن **یاخود ئەو بنەماڵانەی كە رۆحی كوردایەتی و نیشتیمانپەروەرییان هەبووە،** بۆ نموونە كەسایەتی ناسراوی **كورد (ئەحمەد** حەمەدەمین دزەیی و برا و ئامۆزاكانی، **بنەماڵەی** حەیدەرییان و خەڵكانی تر، كە یەكەم **رووبەڕووبوونەوە** لە بەردەمی تەكیەی شێخ محێدین لە **نێوان ژمارەیەك** لاوی خوێن گەرم و كۆنەپەرستانی ئەوسای **هەولێر، لەو** گەڕەكە روویدا. هەروەها دەستدرێژی و **تۆقاندن لە ماڵە** كەسایەتییە نیشتیمانپەروەر و تێكۆشەرەكانی دانیشتوانی ئەو گەڕەكە كراوە لەوانە: (ماڵی ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی و عاسم حەیدەری و پاشانیش ماڵی عەونی یوسف).

لەو گەڕەكە ململانێ و دەمەدەمانێ پتر پەرەی سەندبوو، بەتایبەتی دوای شۆڕشی ١٤ی/گەلاوێژ لە نێوانی ئەندامانی پارتی دیموكراتی كوردستان و حزبی شیوعی تا لەساڵی (١٩٦٣)، كە بەعس دەسەلاتی گرتە دەست و هەردوو حزب لە شاخدا كەوتنە تێكۆشان و خەباتی هاوبەشی، خۆشی و برایەتی و هاوكاری و گیانی خۆشەویستی و ئاسوودەیی گەڕایەوە نێو ئەم گەڕەكە بە هەموو چین و توێژ و نەتەوە و ئاینیەكانیانەوە. كەسەكانی دانیشتوانی ئەو گەڕەكە پێكەوە دەژیان وەك یەك خێزان و نهێنییەكانی یەكتریان پەردەپۆش دەكرد. كاتێك پێشمەرگەیەك كارێكی پارتیزانی لەسەر شەقامەكان ئەنجامدەدا، بەنێو ئەو گەڕەكە رای دەكرد و چەكدارەكانی حكومەتیان لێ دەستخەڕۆ دەكرد.

### نووسەر و رۆشنبیر و هونەرمەند و سیاسەتمەداره هەڵكەوتووەكانی ئەم گەڕەكە

قازی رەشاد موفتی خۆی و كوڕەكانی بەتایبەتی (عەدنان موفتی)و شەهید عەلی هەژار و ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی و موحسین دزەیی و عاسم حەیدەری و كەنعان موفتی و عوسمان موفتی و مومتاز حەیدەری و عەونی یوسف و فاروق جەمیل و نەوزاد محەمەد عەلی موختار و كوڕەكەی لاوەند و زیوەر خەتاب و تاریق جامباز و شێرزاد نەجار و د. عەبدوڵلا حەداد و موحسین ئاوارە و سەیفەدین ئیسماعیل و شەهید سەلاح سەلیم سەیدۆك و عومەر خەتاب و هەروەها هونەرمەندان مشكۆی گۆرانی بێژ و جەلال بەیاری ئەكتەر و محەمەد خەتابی رەسام و خۆشنووس، فەتاح خەتابی دەرهێنەری شانۆ و سەباح عەبدولڕەحمانی دەرهێنەر و شانۆ نووس و ئەكتەر و عەلی ئەحمەدی ئەكتەر و جاسم لەتیفی گۆرانی بێژ و چەندین وەرزشوانی بەناوبانگ كە لەو گەڕەكە بوون. لەوانە یاریزانی تۆپی پێ شلیمۆن ئاردەواز و كاكل عەباس و نورەدین ئیسماعیل و مەندوب مەردان ئاغا، هەروەها لە وەرزشوانانی لەش و ماسوولكە بەهێزی بەناو بانگ محەمەد یاسین و هاشم مەلا مەحمود و كوڕەكەی، چەندین پاداشتی ناوخۆیی و نێو دەوڵەتییان وەرگرتووە لە پێشبڕكێیەكانیان.

## شێتەکانی ئەو گەڕەکە

لەبەر ئەوەی ئەم گەڕەکە سەنتەری شار بوو، بازاڕ و شەقام و کۆگاو دام و دەزگا و شوێنە گشتییەکانی گرتبووە خۆ، هەتا زۆربەی شێتەکانی نێو گەڕەکەکانی تری هەولێر و دەوروبەری بەو گەڕەکەدا گوزەریان دەکرد و لە لایەن منداڵانەوە زیاتر شێتتریان دەکردن، جار وا بوو بەبەردباران یا بەجنێو تووڕە دەبوون، هەندێکیان قسە خۆش و لەسەرخۆتر بوون و گەورەکان دەیاندواندن و کاتەکانیان لەگەڵ ئەو شێتانەدا بە مەزاق و گاڵتەو خۆشی بەسەر دەبرد و یارمەتی شێتەکانیان دەدا، لەوانە: جومعە، کسۆک، پەنجاو پێنج، کەسک و سۆر، سمە، بەرخۆکە، حەمەشێت. هەڵبەتە ئەم ناوە ناوی تەواوی خۆیان نەبووە، بەڵام بەم ناوانە دەناسرانەوە. هەندێکیان لەوانە لە نێو قەبرستانی ئیمام محەمەد دەخەوتن یان لە مزگەوتان. زۆر ئەگەر منداڵان زۆر تووڕەیان نەکردبان، دڕ و تووش نەبوون. لەوانە بۆ نموونە (بەرخۆکە) تەسبیحێکی پێ بوو، قل بەقل ئاودیوی دەکرد و ناوی شێتەکانی هەولێری دەژمارد. یەک لەدوای یەک و ناوە ناوە ناوی هەندێ کەسی هەولێری دەکەوتە نێوان ناوەکان، کە ئەوکەسە شێت نەبوو، بەڵام هاوڕێکانی خۆی پاردیان دابووە ئەو شێتە ئەویش ناوی ئەوکەسەی لە دووتوێی ناوەکان لە مێشکدا تۆمار ببوو لەگەڵ ناوی شێتەکانی دووپاتی دەکردەوە. یەکێک لەو شێتانە کە لەماڵ بە زنجیر دەبەسترایەوەو زۆر ترسناک بوو، ئەویش (سەید سوبحی) بوو لە کۆڵانی کەنیسەی کلدان لە گەڕەکی عارەبانی کۆن، نەدەوێران بەو کۆڵانەدا بڕۆن، چونکە یەک لە جارەکان شەوێکیان زنجیری قاچی پچڕاندبوو زۆر بەهێز بوو، باوکی بنکەی پۆلیسی ئاگادار کردبۆوە کە بیگرن و بۆ شێتخانەی بەرن، چەندین پۆلیس لەو شەوە لە نزیک ماڵەکەیان کۆ ببوونەوە نەیاندەتوانی لێی نزیک ببنەوە، چونکە بەدەستێک بلۆکێکی گەورەی هەڵدەگرت و هەروەک بەردێکی بچووک ڕاوەشێنێ ئاوا بلۆکی ڕادەوەشاند و بەم لاو ئەولای خانووەکان دەکەوت، دواتر سوودیان لە تاریکی شەو وەرگرت و چەندین پۆلیسی بەهێز زنجیریان لێ ئالاند و خستیانە پشتی ئۆتۆمبێل و بردرا بۆ بەغدا بۆ شێتخانە. هەروەها یەکێک لەو شێتانەی کە دانیشتوانی گەڕەک بە پیاو چاک و لە ڕیزی ئەولیاکانیان دائەنا (حەمە شێت) بوو، کە بەردەوام لەو گەڕەکە دەهات و دەچوو، لە کۆڵانی قەسابان و زۆر جاران لە تەکیەی شێخ محێدین کەلوپەلەکانی دەخست و جێگیر دەبوو. بەڵام لەم ساڵانەی دوایی تا ڕۆژی مردنی کە لەهەشتاکان بوو هەمیشە لە مزگەوتی شێخی چۆلی دەخەوت و نیشتەجێ ببوو. ئەو حەمە شێتە، پیاوێکی بەشان و شەوکەت بوو، قسەکانی جۆرە حیکمەت و پەندی وای تێدا بوو سەرنجی گوێبیستانی ڕادەکێشا، خەڵکەکە پارەیێکی زۆریان دەدایێ، ئەویش تەنیا ئاسن و کەلوپەلی لە ئاسن دروستکراوی پێ دەکڕی و لە مزگەوتی شێخی چۆلی لە دەوروبەری خۆی ڕیزی دەکرد. دەوروبەری مزگەوت و ماڵەکانی دوور لەمزگەوتیش بەتایبەتی ئێواران، جۆرەها خواردن و چێشتیان بۆ دەهێنا. ئەو مەنجەڵێکی گەورەی زنجیرداری هەبوو، هەموو چێشتەکانی دەخستە نێوی و سماقی پێدا دەکرد و تێکی دەدا، هەموو چێشتەکان سوور دەبوون، واتە دەبووە یەک ڕەنگ. ئینجا دەیخستە سەر ئاگرێکیێ گڕدار لە داری قەڵاشکەری، شتە سەیرەکە لێرەدا بوو لە ژێر مەنجەڵەکە ئاگر و لەسەر مەنجەڵیش سەلکە بەفرێکی گەورەی دەخستە نێو مەنجەڵەکە، دواتر دەکەوتە سەر ئەو مەنجەڵە و تا هیلاک دەبوو لەو چێشتە عەنتیکەیەی دەخوارد، پێم وابوو لە ئەنجامیشدا هەر ئەو زۆر خواردنییە بوو بووە هۆی مردنی کتوپڕی.

## ئەو گەڕەکەو قشڵەی سوارە

لە ناوەڕاستی ئەو گەڕەکە قشڵەیەک هەبوو کە پێوەرەکەی بە مەزەندە، چوار هەزارم٢ دەبوو، وەک لە ساڵی پەنجاکانەوە هەبوو و ئێستاش بەشێکی هەر ماوە و حەسارێکی گەورەیەو چەندین ماڵە هەژار و لانەوازی تێدا


قشڵەی سوارە

دەژی.. ئەم قشلەیە لە نێو ماڵەکان بوو، هەموو گەنج و منداڵ و دانیشتوانی ئەو شوێنگەیە بیرەوەری خۆشیان لە مێشکدا داخون بووە. من بەش بە حاڵی خۆم کە ماڵەکەمان لەدەوروبەری ئەو قشلەیە بوو، وەک چۆن لە سالانی پەنجاکانەوە کاتێ نێو کۆلان و شەقامە سەرەکییەکەی ئەو گەڕەکە قیرتاو دەکراو بەدەست و تیرۆک ئەو قیرە پان دەکرایەوە- ئامێری قیرتاوکردن نەبوو وەک پێویستە-

جا چۆن بۆنی قیرە کولاوەکە کە هەڵمی لێ هەڵدەستا ئێستاش بۆنی لە لووتم هەرماوە، دیارە (جاکسۆن باشلار) لە کتێبەکەیدا (جماليات المكان) راستی فەرمووە وێنەی جۆراو جۆر هەن لە ژیانی مرۆڤدا تۆمار دەبن لە رێگای (بینین- بۆنکردن- بیستن- هەستپێکردن.هتد) ئێستاشی لەگەڵدابێ ئاسەواری ئەم قشلەیەو دیمەنەکانی کە لە شیعرەکانمدا رەنگیان داوەتەوە هەمیشە لە هەست و مێشکمدا دەژی. ئەم قشلەیە قۆناغ بەقۆناغ لەگەڵ ئاودیوبوونی پەڕی رۆژژمێری ساڵەکان، گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە تاکو لەسالانی حەفتاکان کۆتایی بەژیانی هات، ئەم قشلەیە زۆر بەسام و شان و شکۆ بوو، دەرگا سەرەکییەکەی زۆر گەورە بوو، لە نێو تاقی دەروازەیەکی گەورەی رووەو رۆژهەلات، دەرگایەکی دوودەری بە بزمارە کلاودارەکان نەخشدار، هەمیشە لەو بەروئەوبەری چەند پۆلیسێکی تفەنگ لەدەست دەوەستا، لە ژوورەوەشدا حەوشەیەکی گەورەو پاشان ئەو حەسارەی کە تاکو ئێستاکە ماوە، ئەوەش دەرگای خۆی هەبوو لە ژوورەوەدا ژوور ژوور بوو جێگای بەرێوەبەر و دەرەجەدار و ئیدارەی پۆلیسخانەکە بوو. لە قوڵی لای باشووری حەوشەکە تەویلەی ئەسپی هەمەچەشن و جێگای نالبەند و پینەدۆز و مەیتەروان و پاککەرەوەکان و قاوشی خەوتنی پۆلیسەکان بوو، هەروەها چەند درەختێکی هەمیشە سەوزو گەورەی تێدا بوو، بەتایبەتی لەودرزی هاویندا، کە زۆبەی خەڵکی ئەو گەڕەکە دەچوونە سەربان و لە بانەکان دەخەوتن، تا بەیانی حیلەی ئەسپەکان نەدەپسایەوە، یەکێک لە جموجۆڵە بەرچاوەکانی ئەم قشلەیە، ئەوە بوو، سالانە فێستیڤالی تەرادانێ و بازبازێن و جلیتبازی لە حەوشەکەی ئەم قشلەیە ئەنجام دەدرا. ئێمەی منداڵانی گەڕەک ئەگەر بەسەر دیوارەکانیش بازیان بدابوایە یان بەهەر شێوەیەک خۆیان دەگەیاندە نێو ئاپۆرەی خەڵکەکە، کە ئەسپەکان چەپۆکیان بەرز دەکردەوە و یان سوارەکان بەسەر رایەڵە دارە دانراوەکان بازبازێنیان دەکرد و چەپڵەمان لێدەدا و، پاشانیش میدالیاو پاداشت لەلایەن کەسایەتی و دەرەجەدار و لێپرسراوان بەسەر یەکەم و دووەم و سێیەم و براوەکان دابەش دەکرا.هەر لەبەرامبەر دەرگا سەرەکییەکەی ئەم قشلەیە، دیوارێکی لاکێشەیی لە خشت بنیاتنراو سپی کرابوو، کە وەک شاشەیەکی سینەما دەچوو، بەتایبەتی لەودرزی هاویناندا سینەمایەکی سەفەری کە پێک هاتبوو لە ئۆتۆمبێلێکی گەورە دەهاتە بەردەم شاشەکەو ئامێرەکەی دەخستە گەڕ، شەوان خەڵکی ئەم گەڕەکە لەبەردەم ئەم شاشەیە لە ساکە گۆڕەکەی دادەنیشتن. سەرەتا فیلمی وێنەی مەلیک فەیسەڵ و دارو دەستەو جموجولیەکانی حکومەتی ئەوسای وەک ریکلامێک نیشاندەدا، پاشان فیلمێکی ئینگلیزی یان عەرەبی یان فیلمی کۆمیدی نیشان دەدا. خەڵکەکە کاتەکەی لەو شوێنە بەسەر دەبرد. ئەو کاتانە سالانی پەنجاکان بوو. تا ساڵی ١٩٥٨ شۆڕشی ١٤ گەلاوێژ دواتر ئەم سینەمایە نەماو وردە وردە دانیشتوانی ئەم گەڕەکە خدوویان کەوتە سەر سینەماو لە نێو گەڕەکی عارەبان "سینەمای سەلاحەددین" بەرامبەر سولتان مەزەفەرەدین و دواتر "سینەمای جوندیانی" هاوینەو "سیروان" و پێشتریش "حەمرا" هەبوو، کاتەکانیان لێ بەسەر دەبرد. ئەگەر لە باسی ئەم قشلەیە دوور نەکەوینەوە، یەکێ لە سەربردە سەیر و سەمەرەکانی ئەم قشلەیە ئەوە بوو(لە ساڵی ١٩٦٣دا)کە (حەرەسی قەومی) پەیدا بوو، رژێمی بەعس دەسەلاتدار بوو، ئەو بەعسە و حەرەسی لاقەومیانە، لەپ رەش و بێ حورمەت بوون، زۆر بەتوندی دژایەتی کورد و شۆڕشەکەی و نیشتیمانپەروەران و هێزە پێشکەوتخوازەکانیان دەکرد. هەمیشە لە جموجۆڵ و راوەدوونان و گرتن و تۆقاندنی خەڵک دابوون. هەر لەو ساڵە (١٩٦٣)دا بە فەرمانی دائیرەی ئیستخباراتی سەربازی ئەوسای رژێم لە هەولێر، بڕیار دەرچوو (کەر و باری) ئەوخەڵکانە بگرن بەتایبەتی ئەوانەی لە ناوچە شاخاوییەکانەوە بەرەو شار دێن و دەگەڕێنەوە، چونکە لەگەڕانەوەدا ئازووقە دەکڕن و باردەکەن بۆ پێشمەرگەکانی دەبەن (بەپێی بۆچوونی رژێم) بۆیە دەیان گوێدرێژ و ولاغی بارهەڵگر دەستگیر کران و خرانە ئەو قشلەیە، شەوانی ئەوگەڕەکە کە سەرەتای هاوین بوو، تا بەیانی ئاهەنگی زەڕینی گوێدرێژەکان نە دەپسایەوە. ئەم

خەڵکە تایبەیانی خەوتنی نەبوو، هەراسان بوون، شاریش وەکو ئێستا قەرەباڵغ و جەنجاڵ نەبوو، ئەو ئۆکوردیۆنە دراوانە ماوەیەک بەتایبەتی شەوان هەر بەردەوام بوو، بەیانیان خاوەن گوێدرێژەکان بەخۆیان و کیسەیەک (کا و جۆ)وە لەبەردەم دەرگای گەورەی قشڵە دەوەستان، هاتبوونە مواجەهە بۆ سەردانی کەرەکانیان، ترسی ئەوەیان هەبوو ئەو کەرە داماوانە لە برسان بمرن.

## کۆڵانی عارەبان

### پێگەی جوگرافی کۆڵانەکە

بەرەو هەوراز لادەی بەرەو باکووری قەسرانە. نشێوی برۆی بەرەو باشووری کۆڵانی تەعجیل و جوولەکانە. رۆژئاوا بەشەکەی تەعجیل و (محطة) یە، بەرەو رۆژهەڵاتیش بەشەکەی قەڵات و تەیراودیە، چەپی کۆڵانی عارەبان بازاڕی قەیسەرییە.

### کورتە دیرۆکی کۆڵانی عارەبان

کات و ساتی بەردی بناغەی کۆڵانی عارەبان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی "گرانیی گەورە"، پاش ئەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی کۆتایی پێدێ. یەک لەو کێشانەی دروستی کرد ئەوەش کۆچکردن بوو. چەند خێزانێکی عەرەب لە ناوچەی موسڵ و گوێر و خازر و شوێنی دی، لەبەر تێکچوونی باری ئابووری، سەرهەڵدانی ئاژاوە و کێشەی کۆمەڵایەتی و گرژی ئابووری تەنگیان پێهەڵدەچنێ و زێدی باب و باپیرانیان بەجێ دەهێڵن و بەرەو شاری قەڵا و منارە بەرێ دەکەون و بار و بارگەی لێدەخەن. سەرەتا لە ژێر رەشماڵ ژیاون، پاشان دەستیان کردووە بە دروستکردنی خانووبەرە، لەو رۆژەوە کۆڵانی عارەبان بووەتە دراوسێی دەستەڕاستی قەڵا سەربەرزەکەی مێژوو.

ئەو پۆلە خێزانە و چەند خێزانێکی دیکەی کورد و تورکمان و دیان، کۆڵانێکی مولتی کلتووری پێکدێنن. لە خوارەوەش بەپێی توانا باسی ئەو کەسایەتییانە دەکەین کە هەریەکە لە بواری خۆی دەست رەنگین بوون، جێگاشیان دیارە لە پرۆسەی کۆمەڵگای شارستانی هەولێر بە گشتی، کۆڵانی عارەبان بە تایبەتی، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیست بەردەوام خێزانی عەرەب بە



کاروانی جیاجیا لە ساڵی جیاجیا بەرەو هەولێر دەهاتن و نیشتەجێ دەبوون، زۆربەی ئەو خێزانانە خزم و کەسوکاری یەکتر بوون.

هۆیەکانی گواستنەوەش لەو سەردەمە زیاتر حوشتر بووە، لەو رۆژەوە کۆڵانەکە بووەتە جیرانێکی بە کلتووری دەوڵەمەندی گەڕەکە دێرینەکانی خانەقا و جوولەکان و تەعجیل.

پاش نیشتەجێبوون بۆ بژێوی ژیان، ئەو خێزانە عەرەبانە سەرەتا کاری نانەواییان کردووە، بۆ نموونە بنەماڵەی حوسێن ساڵح کەسرە، ئەحمەد واحید، عەبد سەید ئەسعەد کاری نانەوایان کردووە، بەڵام بنەماڵەی حوسێن فەتحی جامباز کاریان قەیماغ دروستکردن بووە، هەرسێ بنەماڵەش لە موسڵەوە هاتوون، پاش ماوەیەکی کورت چەند خێزانێکی خەڵکی قەڵات و دەوروبەری هەولێر روو لە کۆڵانی عارەبان دەکەن، لەو رۆژەوە ئەو تێکەڵییە رەگەزییە پێکدێ، کۆڵانەکەش بەرەو فراوانبوون دەچێ. سەرەتا ئەم خێزانانە کاری حوشترەوانییان کردووە، پاشان کاری بازرگانیکردن لە نێوان هەولێر و حەلەب و شام و هەولێر و بەغدا خەریکبوون، هاتوچۆشیان زیاتر بە حوشتر بووە. پاشان وازیان لەو کارەش هێناوە و دووبارە دەستیان بە کاری نانەوایی کردووە. بنەماڵەی سەید خەنجەری: ئەم بنەماڵەیەش تەکیەیان هەبوو، نوشتەیان بۆ خەڵک دەکرد و ترسیان لە منداڵ دەردەکرد. بنەماڵەی (وادی کشاف)یش لە گوندەوە هاتوون، کاری نانەواییان دەکرد. بەڵام بنەماڵەی حوسێن فەرووچی لە خازر هاتوون و کاری دروستکردنی فەروویان دەکرد. دوایی دەستیان بە بازرگانی کردووە.

### چەند خانەدانێکی کۆڵانەکە

نورەدین شەهاب بەقاڵ. ٢- سابیر بەقاڵ. ٣- حاجی لەتیف قەساب. ٤- حاجی سلێمان- ٥- مەلا عەزیز. ٦- برایم چەبەن. ٧- شێخ محێدین. ٨- مەستۆ شەعبان. ٩- حاجی محی عەلاف. ١٠- عەبۆ رۆستەم. ١١- خەلیفە وەلی. ١٢- حاجی ئەسوەد چەخماخچی. ١٣- قادر فاتەکە.

### شوێنە پیرۆزەکانی کۆڵانەکە

**تەکیەی شێخ عارف:** لەم تەکیەیە خەڵک نوشتەی دەکرد بۆ مناڵەکانیان ئەگەر تووشی ترس بهاتبایە.

**تەکیەی شێخ محێدین:** لەم تەکیەیە رەمەزانان نانیان دەدا بە خەڵک، ژنەکان بە عەبا و پێچە دەچوونە بەر دەرکەی شێخ و قاپ و مەنجەڵیان دەبرد تاکو ئەو شیوەی ماڵی شێخی کردیتیان بە بەریان بکەوێ.

**تەکیەی شێخ زادە،** هی دایکی شێخ محێدین بوو. ئەم ئافرەتە بەڕێزە لە تەکیەی خۆی رەمەزانان نوێژی تەراویحی بە ژنانی کۆڵانەکە دەکرد.

**تەکیەی شێخ محەمەد خوراسانی:** خەڵک سەردانی ئەم تەکیەیان دەکرد بۆ نەخۆشی لەرز و تا یان نەخۆشی گرانەتا، دەیانگوت یان چادەبتەوە یان دەمرێ، باوەڕیان زۆر بەم شتانە هەبووە.

**تەکیەی سەید خەلجەری:** ئەم بەڕێزەش یەکێک بوو لەو عەرەبانەی کە کۆچیان کردبوو بۆ هەولێر. بێجگە لەم تەکیانە چەند مزگەوتێکیش هەبوو لە کۆڵانەکە وەک مزگەوتی پاشا، دێرە بروشە، حاجی قادر، هەروەها لە کۆڵانەکە چەند ئیمامێک و مەرقەدێکیشی هەبوو وەک:

**ئیمام ساقز:** خەلک دەچوونە سەر ئەم ئیمامە بۆ ماوەی سێ چوارشەمە لەسەریەک بۆ رۆیشتنی منداڵ، ئەگەر منداڵەکەیان نەڕۆیشتبایە، ئینجا دوای چوونە سەر ئەو ئیمامە دایکی منداڵەکە هەڵدەستا بە بەستنی هەردوو پەنجەی گەورەی منداڵەکەی خۆی بە داوێک و لەپێش دەرکەی مزگەوتێک دادەنیشت، دوای دەرچوونی پیاو لە نوێژ یەکێک لەو پیاوانە دەهات داوەکەی دەبڕی، ئەمە مانای ئەوە بوو منداڵەکە دەکەوتە سەر پێ یان ئەگەر کەس نەیبڕیبایە واتە منداڵەکە بەسەر پێ ناکەوێ.

**ئیمام داود:** ئێستا نەمایە کراوەتە خانوو.

**ئیمام یەلی، یان یەلی ئیمام:** ئەم ئیمامەش بۆ چارەسەری رۆماتیزم (باداری) زۆرباش بووە بە پێی باوەڕی خەڵکەکە، باخچەی ژنان مەڵبەندی ئیمامەکە بووە.

**گەندە کۆخ:** کە لە منارەی چۆلی بوو، خەڵکی بۆ چارەسەری کۆخە، سەردانیان دەکرد و دەڵێن زۆرباش بووە، بێجگە لەوەش ئەوەی منداڵیشی نەبووایە سەردانی ئەم ناوچەیەی دەکرد و داوای منداڵیان لێدەکرد.

مەرقەدەکانیش بریتی بوون لەو مەرقەدانە کە تاکو ئێستاش ماون:

مەرقەدی عوزێر پێغەمبەر.

مەرقەدی سوڵتان موزەفەر.

مەرقەدی ئیمام محەمەد.

**کەنیسەی کۆڵانی عارەبان:** کۆڵانەکە جگە لە موسڵمان، بێ جیاوازی مەسیحیشی تێدا دەژیا، واتە چەند رەگەزی جیاواز وەک عەرەب و کورد و تورکمان لە پاڵیان دیانیش دەژیان، مەسیحییەکانیش کەنیسەیەکیان هەبوو، کە سەردانیان دەکرد رۆژانی یەکشەمە، بە زۆری ئەو مەسیحییانە کلدانی بوون، هەندێک لەو ماڵە مەسیحییانە:

جۆرج ددانساز. ٢- بایگردیچ. ٣- مساک خەیات. ٤- ساڵح سوبی. ٥- هۆرن و چەند ماڵێکی دی.

**حەسار و خانەکان:** خەڵکێکی کەم دەرامەت و رەش و رووت لە خانەکان دەژیا، تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم خان لە هەولێر هەر مابوو، هەر خێزانێک ژوورێکی هەبوو، دەگێڕنەوە دەڵێن ئەو حەسارانە نزیکی بیست تا سی خێزانی تێدا دەژیا هەروەها دەڵێن بە هەموان یەک ئاودەستیان هەبوو.

**حەسارەکان:** (حەساری حاجی نوری، خەتاب، ئەحمەد ئاغا خاوەنی سێ حەسار بووە، داود ئاغا، عەبدولڕەحمان چەلەبی دوو حەساری هەبووە، مەروان ئاغا، نورەدین ئاغا، شەشاو، حەسارێکی دیکەش هەبووە دواتر حکومەت کردیتییە قشڵەی سواری).

جگە لە حەسارەکان خانوو هەبووە بە قاپی باغڵەمە ناسراو بوو، مەبەست لە قاپی باغڵەمە ئەوە بووە، کە خێزانێک: یان دوو خێزان تێیدا دەژیا دەرکەیان قەپات دەبوو، چونکە حەسارەکان بە بەردەوامی دەرگەیان کراوە

بوو. هەروەها هەندێ خان هەبووە لە کۆڵانەکان وەک ئوتێلی ئێستای چەرخی خۆمان بووە، چونکە کاتێک غەریب دەهاتە هەولێر، دەچووە یەکێک لەو خانانە، کە خۆی دەچووە ژوورێک و وڵاغ و ئاژەڵەکانیشی دەبردە ژوورێکی دی، کە تایبەت بوون بە ئاژەڵ.

**خانەی سپی:** (مصحن) ناوێک ناسراو بە "مستۆ" سەرپەرشتی دەکرد، دەگێڕنەوە لەسەر خانەی سپی جارێک پیاوێک دێتە خانەکە و نانی تێدا دەخوات و کاتێ پارەی نانەکەی خۆی دەدات خاوەن خانەکە پارەیەکی زۆری لێدەستێنێ بۆیە کابرا چەند دێرە شیعرێک دەنووسێت لەسەر دیواری خانەکە قایمی دەکات. دێڕەکانیش ئەمانەن:

**أمان الامان أربع دوکان بالیدان**
**گزگل حەمە شعبان خلیلی کوڕی بێ ددان**
**رەحمان شەلی بێ ئیمان عەولای سرگمنی حەفت مەملەکەتان**
**هەزار ئەمان لە دەست ئەوان**

**خانەی خەجە خانچی:** لەلای تەکیەی شێخ عارفی کۆڵانی عارەبان بووە و هی ئافرەتێکی کوردی رۆژهەڵاتی کوردستان بووە، کە لە کاتی یەکەمین جەنگی جیهانی کۆچی کردووە و ئەویش لە هەولێری غەریب دۆست نیشتەجێ بووە.

لە کۆڵانەکە حکومەت تەمبەڵ خانەیەکیشی دانابوو، کە ئێستا پێی دەڵێن شوێنی پەککەوتەکان.

## دەوائیری حکومی کۆڵانەکە

قشڵەی گەورە (متصرف) لێی دادەنیشت، ئێستاکە بووەتە ئاسایش، لەکۆن بە پارێزگاریان دەگوت (متصرف).

قشڵەی سواری سەرەتا حەسار بوو، پاشان حکومەت دەیکاتە قشڵەی سواری وەکو لە پێشا باسمان کرد، کاروباری ئەو قشڵەیەش ئەوەبوو بە سواری وڵاغ کاروباری گوندەکانی دەوروبەری هەولێریان بەڕێوەدەبرد پۆلیسی ئەم قشڵەیە لە جلوبەرگیان جیابوون لەگەڵ پۆلیسی ئاسایی.

بنکەیەکی تەندروستیش هەبوو، کە خەڵکی پێیان دەگوت (خەستەخانەی گچکە)، شوێنی ئەم بنکەیەش ئێستاکە کراوەتە دوکان.

نەخۆشخانەیەکی دیکەش هەبوو کە لەناو قەسران بوو، نەخۆشخانەیەکی گەورە و گشتی شاری هەولێر بوو.

کارەبا: سەبارەت بە کارەبا یەکەم جار لەساڵەکانی بیست هاتە هەولێر و بنکەکەی لە کۆڵانی عارەبان دانرابوو، ئەو شوێنەی لێی داندرابوو، ئێستا دەکەوێتە پشت باتە، دوایی لە ساڵەکانی چل گواستراوە بۆ پشت (شێخ الله)، کە ئێستاکە ئەو ناوە شوێنی دایرەی دانی پارەی ئاو و کارەبایە. دەگێڕنەوە دەڵێن کارەبا کاتێ هاتە هەولێر ژنەکانی قەڵات و هی گەڕەکەکانی دی بە جۆت عەبا کاتی تاریک دادەهات دەهاتنە دیار بنکەی کارەباکە، چونکە گڵۆپی کەسک و سۆری پێدەکرد، تا تەواو ماندوو دەبوون، ئینجا دەچوونەوە ماڵ، ئەو سەردەمە کارەبا نرخی زۆر هەرزان بووە، بەڵام خەڵک کەم دەرامەت و دەستکورت بوون، بۆیە لە توانای کەسدا نەبووە رای بکێشێت تەنیا هەندێ لە قاپی باغڵەمەکان نەبێت کە رایان کێشابوو، بەڵام کارەبا ئەو کاتی زۆر باش نەبوو، هەر زوو زوو دەکوژایەوە و تەنیا ئێوارانیش هەبووە.

## سەرچاوەی ئاوی کۆڵانەکە

خەڵکی هەولێر گشتیان لە کارێزی ئاویان بە جەرە و گۆسکە دەکێشایەوە بۆ ماڵەکانیان. خەڵکی کۆڵانەکە ئاویان هەر لە نزیک کۆڵانی خۆیان هەبوو بە ناوی ئاوی میری، لەوێ ئاویان دەکێشایەوە بۆ ماڵەکانیان، بەڵام دواتر حکومەت لەسەر قەڵا چەند تەنکییان دانا.

لەو تەنکییانە ئاو بە بۆری دەهات بۆ ماڵەکان. پێشتر خەڵکی لە مزگەوت ئاویان دەهێنا، ئینجا ئاو هات بۆ ماڵەکان، بەڵام ئاویش وەکو کارەبا لە توانای هەموو کەسدا نەبوو رایبکێشێت، تەنها چەند ماڵێک نەبێت، کە خەڵکی دیکەش لەو ماڵانە ئاویان دەکێشا، دەڵێن پارەی ئاوی مانگانە بە درهەمێک و دە فلس بوو.

## قوتابخانەکان

لە کۆندا قوتابخانە زۆر کەم بووە، بە تایبەتی قوتابخانە بۆ ئافرەتان، بەڵام ئەو قوتابخانانەی کە سەر بە کۆڵانی عارەبان بوون بریتی بوو لە:

## سانەوی (ناوەندی) ئەربیل ئولا

مستەوفی و ئیبن خەلەکان: ئەمانە قوتابخانەی

سەرەتایی بوون، ئەوەی شایانی ئاماژە پێكردنە ئەو سێ قوتابخانانە لە ساڵەكانی بیست دروستكراون.

ئەیوبیە و خانزادی سەرەتایی، قوتابخانەیەكیش هەبوو هی كچان بوو بە ناوی (سانەوی كچان).

### ئیشوكاری خەڵكی كۆڵانەكە

سینەمای سەلاحەدین لەو كۆڵانە دروستكراوە، لە سەردەمی كۆن خێزان روویان لێدەكرد و كاری ئیجابی هەبوو لەسەر بیر و هۆشی خەڵكی و سیمای شارستانیشی بە شارەكە بەخشیوە، لەسەر دەستی یەكێك لە ئاغەكانی هەولێر هێنراوە و دروستكراوە.

جوانكاری و ئارایشتگای ئافرەتان، چەندماڵێك لە كۆڵانەكە هەبوون كە كاری ئارایشگای ئەمڕۆیان دەكرد چونكە ئافرەت ئەو كاتە دەچوونە ئەو ماڵانە بۆ برینی پرچ و لێدانی كارەبا لە پرچیان (نیگرۆی ئێستایە).

نرخی برین و كارەباكردن بە درهەمێك و نیو بووە، هەرچی بۆ رووهەڵگرتن ئافرەتە رووهەڵگرەكان خۆیان دەچوونە ماڵەكان تاكو رووی ژنەكان هەڵگرن. خانمە رووهەڵگرەكان ئەمانەن:

عەیشێ رووهەڵگر، لەعلی رووهەڵگر... هی تریش، ئەو ماڵانەی كە كاری ئارایشگایان دەكرد، ماڵی هۆری كە مەسیحی بوو، ماڵی شوكریە كارەباچی.

سەرتاشەكان، دوكانی تایبەتییان نەبووە بۆ سەرتاشینی پیاوان، بەڵكو زیاتر چەند كەسێك لەبن دیوارەكان دادەنیشتن بە گیزان سەری خەڵكیان دەتاشی یان بە تەواوی سفریان دەكرد. هەندێك لەو سەرتاشانە زۆر دەمێكە ئەو پیشەیان هەبووە، كە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەكانی بیست و سییەكان وەك: حاجی كەریم و ئیبراهیم چیچۆ. هەندێ سەرتاشی دی هەبوون دەگەڕێنەوە بۆ ساڵەكانی چلەكان، وەك: ئەمین بەربەر و ئیبۆ بەربەر بێگومان دەڵێن ئیبۆ بەربەر چارەسەری سووتانیشی دەكرد دووكانێكیشی هەبووە.

نەفتفرۆشی، كارێكی دیكەی شاری هەولێر بووە، بەڵام نەفتفرۆشەكانی كۆڵانی عارەبان چەند كەسانێك بوون، كە ئێمە ئاماژە بە نەفتفرۆشێكی كۆڵانەكە دەكەین ئەویش واحید نەفتفرۆش بووە، شایانی باسە نەفت ئەوكاتە بە بوتڵی شووشە دەفرۆشرا.

### مامانەكانی كۆڵانەكە

١- فاتمە خان: ئەم ئافرەتە جگە لە كاری مامانی چارەسەری منداڵانیشی دەكرد لە نەخۆشی گەرووخڕە و مانگگرتن و فرچك كەوتنی منداڵان ٢- ئامینە مامان ٣- میرۆش مامان ٤- عەیشێ مامان ٥- مرۆت مامان.

دارتاشی، یەكێك بووە لە كاروبارە دیار و ناسراوەكانی خەڵكی كۆڵانەكە. نموونەی چەند دارتاشێك وەك: ١. رەشاد نەجار ٢. قادر ئەحمەد نەجار ٣. برهان مستەفا.

گەرماوەكانی كۆڵانەكە چەند گەرماوێك بووە وەك: ١- حەمامی حاجی قادری ٢- حەمامی مۆدە.

بێجگە لەو كارانەی كە باسمانكرد كاری سەفاریش یەكێك بووە لە كارە باوەكانی ئەو كاتە چونكە خەڵك ساڵی دووجار مەنجەڵ و قاپ و تەشتەكانی خۆیان سپی دەكردەوە، نموونەیەكیش بۆ سەفارەكانی كۆڵانەكە، رەشیدی بەرماخ كە لە ساڵەكانی سییەكان ئەو كارەی كردووە.

پەڕەچییەكان، كارێكی دی كۆڵانەكە بووە، پەڕەچییەكان لێفە و لباد و شتی لەو بابەتانەیان دروست دەكرد، وەك: پیرداود حاجی حەمەرەحیم، مام وەهاب مەحمود.

پارێزەرەكانی كۆڵانەكە، كاری پارێزەری یەكێك بووە لە كارەكان، بەڵام زۆر بە دەگمەن هەبوو، بەو كەسانەشیان دەگوت (ئاوقاتچی): ١- عەونی یوسف ٢- فائق نادر ٣- سەعید جامباز.

مامۆستاكان، مامۆستایەتی یەكێك بووە لە كارە هەرە بەناوبانگەكان و دیارەكانی ئەو كاتەی كە ئێمەش لێرە نموونەی چەند مامۆستایەكی ئافرەت و پیاو دەهێنینەوە، كە دانیشتووی كۆڵانەكە بوون:

١. رابیعە رەشید ٢. رەمزیە فەتاح ٣. ئەلماس قادر ٤. فەخریە عومەر ٥. سەبیحە عومەر ٦. خەیریە نادر.

مامۆستا پیاوەكانیش ئەم بەڕێزانەی، كە لە ساڵەكانی دە مامۆستایەتیان كردووە وەك: ١. شێخ حوسێن ٢. جەواد ئەفەندی.

خەیاتی یان جلك دوورین، كارێكی دی بووە، كە ئافرەت و پیاو ئەنجامیان داوە: ١. ماهیە خەیات ٢. ناهیدە خەیات ٣. لامیعە خەیات.

بەرگدرووی پیاوانیش ئەم بەڕێزانەی كە لە ساڵەكانی

دە جلکیان بۆ خەڵک دەدووری وەک عەبدولڕەحمان محەمەد خەیات، بەڵام عەبدوڵلا عەبدولڕەحمان لەساڵەکانی ٢٠ خەیاتی کردووە، سەید قاسم و زنجی شاکر لە سییەکان بەرگدروو بوون هەروەها جەلیل خەیات و حاجی شەریف خەیات.

**قەسابەکان:** لە کۆڵانەکە بەشەکی تایبەتی هەبووە هی قەسابەکان بووە، ڕەنگە ریزە دوکانەک بووبن. سەبارەت بە قەسابەکانیش دەڵێن ئێواران ئەگەر گۆشتیان لەسەر ماباپەوە، ئەوا بە سەبەتە دەیانگێڕایە ماڵەکان تاکو لەسەریان نەمێنێتەوە، نموونەی قەسابەکان: ١. حاجی لەتیف ٢. عەزیز قەساب ٣. سلێمان سەکەنە ٤. یونس قەساب.

**بیناسازەکان:** خانوو بەرە و کۆشکی کۆڵانی عارەبان شایەتی دەسترەنگینی وەستا و کرێکاری ئەو سەردەمەن، دەبێ بیانپارێزین، یەکێک لەو وەستا دەسترەنگینەکانی ئەو سەردەمە، کە زۆر بەناوبانگ بووە شاکر حەسەن قادر بوو.

زۆر سوپاس بۆ ئەم بەڕێزانەی خوارەوە کە بەزارەکی و بەنووسین و ناردن و کۆکردنەوەی کورتە ڕیپۆرتاژ، هەوێنی ئەم نووسینە دۆکۆمێنتییەیان پێکهێنا. سوپاسی تایبەتیشم بۆ بەڕێز کاک (ئومێد عیسی محەمەد) کە یارمەتییەکی بێپایانی دام.

**زانیاریم لەم خانمانە وەرگرتووە:**

مەهدیە ئیسماعیل محەمەد، تەمەن ٥٥ ساڵ. ٢. ئەدیبە عەبدولڕەحمان، تەمەن ٦٠ ساڵ. ٣. سەعدیە یونس، تەمەن ٥٥ ساڵ. ٤. ئەهلە شەعلان حوسێن کەسرە، تەمەن ٥٠ ساڵ[1].

## گەڕەکی تەعجیل

هەروەک دەزانین شاری هەولێری خۆراگر کە بەقەڵاو منارە ناسراوە تائێستا بەکۆنترین شار دادەنرێت، کە ژیانی تێدا بەردەوامە. سەرەتا تەنها قەڵا بووە. پاشان وردە وردە خەڵکی قەڵات هاتوونەتە خوارەوە و لەدەوروبەری قەڵا خانوویان دروست کردووە و چەند گەڕەکێکیان پێکهێناوە. لێرەدا مەبەستمان لە گەڕەکە کۆنەکان وەک خانەقا و گەڕەکی تەعجیلە.



### مێژووی دروستبوونی ئەم گەڕەکە

مێژووی دروستبوونی گەڕەکی تەعجیل دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێش هاتنی عوسمانییەکان، بەڵام لە سەردەمی عوسمانییەکاندا فراوانتر بووە، کەواتە بەلای کەمی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٥٠٠ ساڵ لەمەوبەر.

### تەعجیل و سەعدووناوە

کە ناوی تەعجیل دەهێنین زۆر جار تائێستاش گوێمان لەگەڕەکی (سەعدووناوە)ش دەبێت. چونکە تەعجیل ئێستاکە لە "قوتابخانەی ئیبن خەلەکان" و" بانکی ڕەشید" و "فرنی سەموونی نەورۆزەوە" دەست پێ دەکات، بەدرێژایی شەقامی شێخی چۆلی تادەگاتە شەقامی ٣٠ مەتری. لای چێشتخانەی واشنتۆنی ئێستاو ئینجا هەر لەسەر سی مەترییەوە بەرەو ئوتێلی شیراتۆن و هاتنەخوارەوە بەشەقامی شیراتۆن بەرەو ڕووی قەڵات دەگەڕێتەوە. پێشتر دوو گەڕەک بووە. تەعجیل و سەعدووناوە. تەعجیلیش دوو بەش بووە، پێیان گوتووە تەعجیلی ئیسلامان، کە خەڵکەکەی موسوڵمان بوون و ئەوی دیکە تەعجیلی یەهوودییان کە جوولەکەکانی لێ بووە و بەگەڕەکی جوولەکەکان بەناوبانگ بوو. دەکەوتە پشت بازاڕگای سیروانی ئێستا.

### ناوی تەعجیل و سەعدووناوە لەچییەوە هاتووە؟

وشەی تەعجیل لەناوی (عجل)ەوە هاتووە، کە مەلایەکی گەورەبووە و بەئیمام تەعجیل ناسراوە و ئەوێ نێژراوە، بۆیە گەڕەکی تەعجیل هەر بەناوی ئەوەوە ناونراوە. ئێستاش نەزرگای هەرماوە، کە کەوتۆتە کۆتایی

کۆڵانی گەرماوی یازدەی ئازار. گەڕەکی (سەعدووناوە)ش بەناوی پیاوێک بووە کە ئاوەدانی کردۆتەوە و ناوی (سەعدوون) بووە و زەوی بەسەر خێزانە کوورەچییەکان دابەش کردووە تاسوودی لێ وەربگرن، لەبەر بوونی کارگەی خۆڵی پێویست و ئاوی میری (ئاوی میری یان جۆگەی میری کە لەشوێنی بینایەی نەقابەی ئێستا بووە، نزیک سەرۆکایەتی شارەوانی کارێز بووە) کە هۆیەکی سەرەکی بوو بۆ نیشتەجێ بوونیان. گەڕەکی سەعدووناوەش زۆربەی زۆری دەکەوتە ئەوبەری بەستێ و بەشی زۆری کوورەچییەکانی بەخۆ گرتبوو. تا(ئاشی حاجی عوسمان بابش) و ئامێری ئاوەکەی نزیک خانووی خوالێی خۆشبێت (وەستا مەحموود حیلمی) تا سووچی پردی ڕێگای کەرکوک بووە بەپانیش دەگەیشتە لێواری گڵکەند.

## کوورەچییەکان

کوورەچی و خاوەن کارگەکان خشتی کەرپووچ و وەستا کارامەکانی و خۆڵ فرۆشەکان زۆربەیان لەگەڕەکی سەعدووناوە نیشتەجێ بوون، هەروەک لەپێشتر ئاماژەمان پێدا، لەبەر فراوانی ناوچەکەو پاکی و بە جەرگی خۆڵەکەی و مشەی ئاو. کوورەچییەکان هەرچەندە هەندێکیان ئێستا لەژیاندا ماون، بەڵام هەیانە وازی لەپیشەکەی خۆی هێناوە و هەشیانە تائێستاش هەر بەردەوامە لەسەر پیشەی باو و باپیرانی. زۆربەیان ئەوانەی وازیان لەپیشەی کوورەچییاتی هێناوە هەرچەندە هەریەکە نازناوی کوورەچییەکەیان هەر ماوە، بەڵام هەندێکیان بوونەتە خاوەن تەنکەر کە نەوت یان ئاو دەفرۆشن و هەندێکی تریشیان بەلای کاری بازرگانی و کاری ترەوە چوون. ئەوانەی تائێستا بەردەوامن لەو پیشەیە گۆڕانکارییان بەسەر پیشەکەیاندا هێناوە هەر لە خشت برین و سوورکردنەوەو گواستنەوەی. جاران کوورەی خشتی کەرپووچیان چین بە پێچەوانەی، چین ڕاست و چەپ لەسەر یەک دادەناو سەری کوورەکەیان دەگرت و کووره نەفەس بڕ دەکرا تەنها کونێکیان لەسەرەوە بۆ دووکەڵ چوونەدەرەوە بەجێ دەهێشت و ئاگریان تێ بەردەدا. ئەو کوورانەش ئەوکات هەر بەکا و پوش و پەڵاش و کۆنە والآو ئێسکی ئاژەڵ سوور دەکرانەوە. چونکە لەو سەردەمی کوورەچییەکان هیچ جۆرە نەوتێکیان بەکار نەدەهێنا، بۆیە دووکەڵی ئاگری کوورەکانیان سەرتاپای ئاسمانی شاری هەولێری دادەگرت. گەلێ جار تەنییە فڕیوەکەی (والآش و پووش و پەڵاش) ی سووتاو دەنیشتە سەر ئەو جل و بەرگانەی ماڵان، کە شۆڕابوون و هەڵخرا بوون بۆ وشکبوونەوە. پاشان لەگەڵ پەرەسەندن و فراوانبوونی شار. کوورەچییەکانیش کوورەکانیان لەشار دوور خستەوە بۆ ئەوەی خەڵکی شار ئازار بەدەم ئەم چڕە دووکەڵە پیسەوە نەچێژن. لەرووی گواستنەوەی کەرپووچەکانیش بۆ خەڵکی و بۆسەر ئیش. جاران کوورەچییەکان هەریەکەو چەند گوێدرێژێک و چەند شاگردێکی زیرەک و بەتوانایان هەبوو. گوێدرێژەکان هەریەکەو شەڵتەیەکی تایبەت بەکەرپووچ گواستنەوەی لەسەر بوو. کە کەرپووچ سارد دەبۆوە بەپێی توانای گوێدرێژەکەو یان بەبەرینی شەڵتەکە شەڵتەکەیان بەچەند ریز دادەگرت. جا شاگردە کوورەچییەکان گوێدرێژەکانیان پێش خۆ دەدا بۆ شوێنی ئەو بینایەی دروست دەکرا.. هەڵبەت ئەو شاگردانە گەلێک گورج وگۆڵ و زیرەک بوون. بەماوەیەکی کەم بڕێکی زۆر کەرپووچیان دەگەیاندە سەر ئیش. گوێدرێژەکانیشیان چاک خزمەت دەکردو ئالیکی چاکیشیان دەدانێ، تا لەکاری گواستنەوە هەرگیز دوانەکەون. هەندێ لەشاگردە کوورەچییەکان هەبوون بەرچێری (سینگی) پێشەنگ و کەرەکانی تری کاروانیان بەزەنگوڵەی جۆراو جۆر دەرازاندەوەو مرۆڤ لەدوورەوە هەستی دەکرد کە کاروانی کوورەچییان هات. لەکاتی گەڕانەوەشیاندا بەبەتاڵی بۆ سەر کوورە. شاگردە کوورەچی خۆی دەهاوێشتە سەر پشتی یەکێک لەگوێدرێژەکان و ئەوانی تری دەدایە پێش خۆو بەغار بۆ سەر کوورە. وادەردەکەوێ ئەو زەنگوڵەی کە باسمان کرد بۆ ئەوە بەکار هاتبێ کەمرۆڤ ئاگادار بکاتەوە لەهێرشی گوێدرێژەکان. تاخۆیان لەبەر لادەن. کوورەچییە بەناوبانگەکانیش ئەمانە بوون (حاجی جبرائیل کە سەرۆکی کوورەچییەکان بووەو چەند کوڕێکی هەبوون، لەوانە: (سمایل. جەرجیس. تۆفیق. زەینەل. ڕەجەب). مام سەلیم. جگە لەو کوورەچییانە خۆڵ فرۆشیش هەبوون بۆ دروستکردنی خانوو، کە بریتی بوون لەم بەڕێزانە: (خورشید ئەمین لیتیان. عومەر مەلاکە. حاجی یادگار. عەبدوڵڵا محەمەد ئەمین). خۆڵفرۆشەکانیش هەر وەکو کوورەچییەکان شاگرد و شەڵتەو گوێدرێژی چاکیان بۆ دابینکردنی خۆڵ هەبوو، کە

کەرستەیەکی سەرەکی بوو بۆ دروستکردنی خانووبەرەو بینایەی دی هەروەک (خورشید ئەمین) حەفت پۆستە کەری هەبوودو هەر پۆستەی پێنچ کەر بووە. کە وەکو بەڵێندەری ئەو سەردەم بووە، کەلوپەلی بیناسازی بۆ خەڵک دەگواستەوە، وەک: (کەرپووچ و خۆڵ و کاریتە و شەقرە) تا ئۆتۆمبێل دەرکەوت ئینجا حەوت لۆری بۆ کاری گواستنەوە کڕی.

## جوولەکەکانی تەعجیل و سەرگوزشتەیان؛

کۆمەڵێک لەجوولەکەکان لە شاری هەولێر ژیاون، وا زاندراوە، کە دیلی جەنگ بوون و لە سەردەمی (نەبوخوزنەسر)ەوە هێنرابوون و بەسەر شارەکانی عێراق دابەش کرابوون. ئەگەری ئەمەش هەیە، کە هەندێکیان بەچەند قۆناغێکی مێژوویی کۆن و لەکاتی جەنگی خاچ پەرستەکان و چەند رووداوێکی تری مێژووییەوە هاتبن. ئەو بەشەی بەر هەولێر کەوتوون لە قەڵاتدا نیشتەجێ کرابوون. پاشان لەدوا ساڵانی حوکمڕانی عوسمانییەکان گوێزراونەتەوە گەڕەکی تەعجیل. هەرچەندە جوولەکەکان نامۆ بوون بەو ژینگە دەشتاوییەی ئەوکاتی شاری هەولێرو، جودا لەخەڵکی شاریش خاوەنی داب و نەریت و زمانی تایبەتی خۆیان بوون و هەر پلەو پایەکی سامانداری و کۆمەڵایەتییان هەبوودو سەرئەنجام خۆیان بەبێ دەسەڵات نیشان دەدا، کە لە ڕاستیدا وانەبووە. چونکە بێ دەسەڵاتییەکەیان تەنها خووییێک بوو بۆ خۆیان دروستیان کردبوو، چونکە ژمارەیان کەم بوو، دەبوایە خۆیان لەتەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی بپارێزن. تا چاوپۆشیی لەهەندێ کرداری نەگونجاویان بکرێت، خۆیان بەنەتەوەیەکی بێهێز نیشان دەدا. لەساڵی ١٩٥١ لەسەر داوای خۆیان و بۆ یەکجارەکی شاری هەولێریان بەجێ هێشت و تەنها کەنیسەیەک و دووماڵیان لەپاڵ کەنیسەکەیان لە تەعجیل مابوونەوە. هەندێکیشیان بوونە موسوڵمان و هەیانە ئێستاش لەشاری هەولێر ماون. چەند ناودارو هونەرمەندو بەهرەمەندێکیان هەبووە. تەنها بەکورتی باسی هەندێکیان دەکەین: مونیر قەساب و مەتێ هارول و موراد ئەفەندی و سیمۆن مامۆستای قوتابخانە بوو. دانیال عەزرا قەساب(مامۆستاو هونەرمەند). زەکی بارۆخ (مامۆستای مۆسیقا). ناجی شائوول و شەمعون فرەنسیس (پارێزەر بوون). نەسیم بەغدایی ئیلیاهوی برای و دانیال خمچی و مراد سیتۆ (بازرگانی ناودار بوون). نەسیم دوکانی لەناو بازاڕی و خدرۆکە جوو و موشێ بەیتاڵ بوون لەهەڵبەستنەوە و چارەسەرکردنی جۆرەها برین و شکان کارامە بوون. نەسیم دانی لەناو قەیسەری بوو قوماش فرۆش بوو، قورئانی پیرۆزیشی ئەزبەر بوو. جارجار لەدوکانەکەی چەند کۆپلەیەکی قورئانی دەخوێندەوە. ساڵە نووری لەهەولێر زمان ڕاستی جووەکان بووە. یوسف ساڵح و یوسف کوڕی یۆنان حەبیب هەریەکە بۆ ماوەیەک موختاری (تەعجیل)ی یەهودییان بوونە. جووەکان بۆ گوزەراندنی ژیانیان زۆر جۆر کارویپیشەیان کردووە، وەکو چایەچی و تەنەکەچی و پینەدۆزی و چەخماخسازی و جۆلایی و بیناسازی و گەلێک پیشەی تریان هەبووە.

## نووسەر و هونەرمەند و هەڵکەوتووەکانی گەڕەکی تەعجیل.

د. مارف خەزنەدار، جەمال خەزنەدار، مەلا مەسعود بێبەش، مەحمود زامدار، عەبدولخالق سەرسام، تەڵعەت سامان، د. سەرودر عەبدوڵڵا، فەرهاد شەریف، مەوجود سامان، فەرەیدون سامان، ئەسکەندەر عوسمان، جەلال حەردان، محەمەد ئەحمەد ئەربیلی، فوئاد ئەحمەد، ئازاد ئەحمەد، عەبدولرەحمان رەسول، عادل مستەفا پەریخان، جابیر پیرداود، بەختیار کەمال شەعبی، د. جەلیل ئازید، سالار ئازید، ئەنودر عەبدوڵڵا، عەبدولقادر حەمەدەمین، سەلام کۆیی، فەیسەڵ محەمەد ساڵح، زرنگ فوئاد، محەمەد عەبدولخالق، د. عەبدوڵڵا غەفور، عەبدولباست فەرهادی، نیهاد شەشخان، ئەحمەد رۆ رۆ، مستەفا پەژار، هاشم جەباری، د. ئیدریس هادی، جەلال خدر، حاجی ئەحمەد جامباز، مام سەمەدی کوورەچی، مام حوسێنی کوورەچی، مام حەمیدی کوورەچی، محەمەد محێدین عەتار، هەیاس کوورەچی، عارەب عوسمان، د. ئەحمەد فەرهادی، فازڵ پیرداود، جەمال هیدایەت، دڵشاد تەیب، جەوودەت شاکر، تەڵعەت عارف، زەعیم عەلی نانەکەلی، جەمال داود، کەمال داود، رەمزی وەلی، جەمال حەمەدێ، غازی پیرداودە کۆر، عەبدولرەزاق حەمە قوتە، نەجات واحێد، عەبدولخالق واحید، سالم فەتاح، غانم فەتاح، دانیال قەساب، مونیر قەساب، نەجمەددین ئاوارە، زەکەریا

عەبدوللا، عەلی رەسوڵ، ئیسماعیل رەسول، موئەیەد عەبدوللا، نەجات خەتات، ئەحمەد عەبدولڕەحمان خەتات، زیاد موهەندیس، ئەحمەد عەزیز، مەحمود عەزیز، هاشم عەزیز، عەباس محەمەد حوسێن (حاجی مەمۆ)، عەباس عەبدوللا یوسف، عوسمان پیرداود، حەبیب میرانی، مستەفا رەئوف عەواد، نەوزاد رەفعەت، رەزا سەید گوڵ، کامیل حەداد، مەجید غەمناک، شەمسەدین عەزیز، سەیفەدین عەزیز.

## حەسارەکان

جگە لەو خانووانەی کە خەڵک بۆ خۆی دروستی کردبوو، چەند حەسارێکیش لە تەعجیل هەبوودو هەندێکیان تا ئێستاش ماون. حەسار بریتی بووە لە حەوشەیەکی گەورە و کۆمەڵە خانوویێک کە چەند ماڵێک پێکەوە ژیاون و لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە زۆر تێکەڵاوی یەکتر بوون، ئێواران بەیەکەوە دادەنیشتن و هەر ماڵەو خواردنی خۆی دادەناو بەیەکەوە دەیانخوارد، وەکو یەک خێزان مامەڵەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکرد.

گرنگترین و ناودارترین حەساریش ئەمانە بوون: حەساری ماڵی ئەحمەد ئاغا. حەساری رەشیدی حاجی شێخ یونس. حەساری عەلی خدر دەلاڵ. حەساری ئەحمەد چەڵەبی لەخوار مزگەوتی شێخی چۆلی، حەساری ئەحمەدە فەندی، کە دوو حەسار بووە حەساری گەورە کە بیست و پێنج ماڵێک بووە. حەساری فەتاح چەڵەبی کە ئێستا شوێنگەی گەورەترین شوقەی لەسەر دروست کراوە بەشوقەی دکتۆر عیسا ناسراوە.

## باخچەی گلکەند

ئەو گلکەندەی ئێستا دەیبینین لە سەردەمی زوودا پارچە زەوییێکی تەختی بێ کەند و لەند بوو، بە مولکایەتیش لە سەردەمی عوسمانییەکانەود (سەنییە) بوو: (میری) بوو. بەپێی رۆژگار شار بەرە بەرە بەرەو فراوانی دەچوو، هەندێ لەدانیشتوانی قەلات بەپێی کاری رۆژانەیان مگێزیان لە نیشتەجێبوونی خوارەوەی قەلات دەکرد. بەماوەیەکی کەم لە گەڕەکی سەعدووناوە لە نزیک ئەو پارچە زەوییە خانوویێکی زۆریان دروستکرد و لێی نیشتەجێ بوون، بەرە بەرە خۆڵیان بۆ بیناسازی و کارگەی



خشتبڕین لێ دەبرد تا وای لێهات بووە چاڵ و قووڵییەکەی هەر زیادی دەکرد تا بوو بەزەلکاوێکی گەورە کە رووبەرەکەی (١٥٠٠٠م٢) دەبوو، کە وای لێهات لە ئەنجامی فراوانبوونی شاریش ئەم زەلکاوە کەوتبووە ناوەڕاستی شار و دەوروبەرەکەشی کرابووە جۆرەها خانوو باڵەخانەو شەقامی تازە، بەدرەختی بەرزو جوان و رازاوە بەگوڵ و زەلکاوەکەش دیمەنی شاری شێواندبوو ببووە مۆڵگەی مێش و مەگەز و جۆرەها نەخۆشی، کاربەدەستانی شار هەمیشە بیریان لەوە دەکردەوە چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوە تا لەساڵی ١٩٦٥ لە سەردەمی موتەسەڕیفی لیوای هەولێر بەهۆی ئەندازیارێکی هۆڵەندی نەخشەیەکی رێکوپێکیان بۆ کێشاو بەیارمەتی رێکخراوی خۆراکی جیهانی و بەسەرپەرشتی "ئەندازیار عەبدوللا حەسەن خەفاف" لە بەشی ئەندازەی وەزارەتی شاردوانی و ئەشغال دەست بە جێبەجێکردنی نەخشە کراوە، لەکاتی دروستکردنیدا (٤٠٠) کرێکار بە بەردەوامی کاریان تێدا دەکرد. لەکۆتایی، هەر (١٧) رۆژ جارێک هەر کرێکارێک یەک کیسە ئاردی (٥٠) کیلۆیی و (١٥) قوتوو گۆشت و (٤) قوتوو پەنیر و (٤) قوتوو مرەبا و (٣٠) گرام چای و (١٥٠فلس)یان پێ دەدرا، سەرەڕای ئەم یارمەتییانەش هەر کرێکارێک رۆژانە لەسەر حیسابی پرۆژە (٣) سەموون و چەند پارچەیەک گۆشت و چایان پێ دەدا.

بەم شێوەیە تا ئەم کەندە قووڵە بێ رەزایە کرا بەم سەیرانگا رەنگینەو لە ساڵی ١٩٦٨دا تەواو کراوە.

## مەزارگەو مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکان

گەڕەکی تەعجیل چەند مەزارگەو مزگەوتێکی لێیە،

لەوانە: (چاکی بن عەردی، کە مەزارگەیەکی پیرۆزی کۆنە دەکەوێتە تەنیشت وەزارەتی شارەوانی، مەزارگەی ئیمام تەعجیل، مەزارگەی شێخی چۆلی کە لەناو مزگەوتی شێخی چۆلییە لە تەنیشت حەرەمی نوێژ، مزگەوتی شێخ نورەدین بریفکانی تا کۆتایی سالانی شەستەکان فێرگەی زانستە شەرعییەکان و ئاینی بووە.

مزگەوتی مەلا نەبی، مزگەوتی موفتی، مزگەوتی مەلای عابد، مزگەوتی خەلیفە خالید، مزگەوتی حاجی تەها قەساب. هەروەها دوو تەکیەشی هەیە یەکێکیان تەکیەی سەید سەعیدە کە دەکەوێتە نزیک مزگەوتی موفتی ئەوەی تریش تەکیەی خەلیفە جەلالە کە پێشتر دێر بووە لەپاشان کراوەتە تەکیە.

چاکی بن عەردی یەکێکە لە مەزارگە کۆنەکانی گەڕەکی تەعجیل، کە دەکەوێتە تەنیشت وەزارەتی شارەوانی و خەڵکی لەکۆنەوە رووی تێدەکەن هەروەک مەزارگەکانی تر، ئەم چاکە دەکەوێتە ژێر زەمینێک هەربۆیەش وای پێدەڵێن.

### شێتەکانی گەڕەکی تەعجیل

هەرچەندە شێتەکانی تەعجیل بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، بەڵام لێرەدا بۆ ناساندن و یادەوەرییەکانیان تەنها باسی ناودارترینیان دەکەین ئەویش هەیاسە شێت و براکەیەتی. هەیاسە شێت کوڕی زەینەڵی حاجی جبرائیلە، کە بنەماڵەیەکی کوورەچی بوون. هەیاسە شێت لەنێو شێتەکانی هەولێر کە ناودارترین و بەناوبانگترین شێتە، دەتوانین بە سەرۆکی هەموو شێتەکانی سەردەمی خۆی دابنێین کە لە سالانی پەنجاکان تا هەشتاکان ژیاوە. هەیاس پیاوێکی چوار شانەو تێکسمڕاوو بونیادێکی زۆر بەهێز و پتەوی هەبوو، زۆربەی ژیانی خۆی لای هێڵی شەمەندەفەری (هەولێر- کەرکووک) نزیک گوندی گردە رەشەو هەروەها دەوروبەری کوورەی تۆپزاوە دەبردەسەر، بۆیە کوورەچییەکانی تۆپزاوە لە کاتی کوورە سووتاندنیاندا زۆربەیان شەوان کۆدەبوونەوەو لە ترسی هەیاس ئێشکگریان دەگرت، چونکە ئەگەر مەبەستی هەر کەسێک بووایە یەکسەر پڵنگ ئاسا پەلاماری دەداو بێ بەزەییانە ئەشکەنجەی دەداو بەردەوامیش شیشێکی ئاسنی ئەستووری پێ بووە و پێی دەکەوێتە گیانی خەڵکی و هەندێ جاریش رای دەوەشاندە خەڵک، بۆیە جگە لەدۆست و هاوەڵانی نزیکی خۆی کەس نەدەوێرا لێی نزیک بێتەوە، تەنانەت هەرکەس نەیدەوێرا سەیریشی بکات، گەورەو بچووک گەر نەیان ناسیباو سەیریان بکردبا ئەگەر ئاگای لێ بووایە کە سەیری دەکەن دەی ترساند و یا جوێنی پێدەدان. جارێکیان لە ناوەڕاستی هەشتاکان لە کۆڵانی مزگەوتی شێخی چۆلی چەند منداڵێک گاڵتەیان پێ دەکرد، ئیدی بەدوای منداڵەکاندا رای کردو جوێنی پێدەدان و دەیگوت بتان گرم جەرگ و هەناوتان دەردەهێنم.

چۆنیەتی شێتبوونی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیانەی کە لەنێو خێزانەکەیاندایە. هەر چەندە هەیاسە شێت لە بنەڕەتدا بنەماڵەکەیان دەمارەکی شێتییان هەبووە، بەڵام هۆی تەواو تێکچوونی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی (رۆژێکیان لەکاتی ئیشکردنی هەیاس لە کوورەدا کە لە خوارەوە بووە، فازڵی براگەورەشی کە لەسەر کوورە بووەو ساقۆیەکی بەخۆی دادابوو بۆ سوعبەت و یاریکردن خۆی فڕێ دەداتە سەر هەیاسی بۆ ئەوەی بیترسێنێ. هەیاس بێ ئەوەی ئاگاداری لەم بەزم و رەزمەی براکەی بێ زۆر ترساوە و لە ئەنجامدا تێک چوو، باسی هێز و شان و چوارشانەیی هەیاسمان کرد، چەندە بەهێز بووە، زۆر کەس دەیانگێڕاوە. دەیانگوت کاتێ پۆلیس بەزەبری چەک گرتوویانەو بردوویانە بۆ بەندیخانە، بەندیخانەی شکاندووەو هەروەها دەڵێن: زنجیریشی بە هەردوو دەستی دەپساند. هەیاس زۆر لە چەک ترساوە و زۆرجار کە دەمانچەیان نیشاندەدا زۆر دەترساو بەپەلە رایدەکرد، زۆرجار دەمانچەی منداڵانیان نیشانداوە ترساندوویانە، هەر وایزانیوە دەمانچەی راستییە، و هەڵاتووە.

هەیاس خەڵکی دەوروبەر و گەڕەکی تەعجیل و ناو بازاڕی بێزار کردبوو دەستی دەوەشاند، بۆیە حکومەت زۆر بەدوایدا گەڕاوەو چەندین جار گرتوویانەو لە دەستیان هەڵاتووە، تا دواجار لەساڵی ١٩٨٤بە هۆی ئەوەی کە سەربازێکی کوشتبوو رژێمی بەعس مەفرەزەیەکی پۆلیسی نارده سەری و دەستگیریان کرد. دەنگۆی ئەوەش بلاو بۆوە بەنێو خەڵکیدا گوایە رژێم بە دەرزی کوشتوویەتی.

هەیاس برایەکی لەخۆی بچووکتری هەبوو ناوی موحسینە شێت بوو، کە زۆر بێ دەسەڵات بوو، هەروەها واحیدە شێت و مەمۆ و چەندانی دیکە لەو گەڕەکە هەبوون..

## گەرماوەکانی تەعجیل

گەرماوی مۆدە بەکۆنترین گەرماو دادەندرێت لە سنووری نێوان گەڕەکی تەعجیل و عەرەب کە ئەم بەڕێزانە سەر پەرشتییان کردووە: (حاجی عەبدوڵڵا حەمامچی و ئیسماعیلی زاوایی و عوسمان سلێمان و مشیر حەمۆ). ئەم گەرماوە تا کۆتایی حەفتاکانیش مابوو، ئێستا تەنها شوێنە خاپوور کراوەکەی ماوە.

گەرماوی سەعدوناوەش لە دوای گەرماوی مۆدە بەدووەم گەرماو دێت، کە لەکۆتایی سالانی پەنجاکان دروستکراوە و تائێستا لەکارکردندایە. دوای ئەویش گەرماوی ١١ ئازار دێت کە لە سەرەتای سالانی حەفتا تا ئێستاش ماوە، بەلام ئێستا نووسینگەی رۆژنامەی (هاولاتی)یە کە سالی (٢٠٠٧)ە.

## فڕنی سەموونی ئوتۆماتیکی (الاعاشة)

کارگەی فڕنی گەورەی ئۆتۆماتیکی بوو. لە رۆژێکدا ژمارەیەکی زۆری سەموونی حکومی دەردەهێنا، ئەوەش لەبەر هەرزانی نرخەکەی، کە بە (٥ فلس) بوو. بەو دوا دواییە، لە هەشتاکان بوو بە(١٠فلس)، کارێکی زۆری کردبووە سەر ژیانی خەلکی بەتایبەتی چینی ناوەندی و هەژارەکان، تەنانەت دەولەمەندەکانیشی دەپاراست، ئەم کارگەیەش دەکەوتە لای رۆژئاوای گەڕەکی تەعجیل و ئێستاش بینایەکەی هەر ماوە و لەسەر رووبەرێکی فراوان بنیات نراوە بەلام تاپێش سالانی راپەڕین ئیشی دەکرد و لەو ساتەوە تاکو ئێستاش هەر لەکار کەوتووە.

قوتابخانەی (اربیل الاولی) کە لە سالی ١٩٢٩ لە گەڕەکی تەعجیل دامەزراوە و لە سالی ١٩٣٢تێیدا دەست بە خوێندن کراوە. لە سالی ١٩٥٢ ناوەکەی گۆڕدراوە بۆ ئیبن خەلەکان و لە ١٥/٩/٢٠٠٤ گواستراوەتەوە گەڕەکی خانەقا، بەگوتەی (مامۆستا عەبدولکەریم) بەڕێوەبەری ئێستای قوتابخانەی سەرەتایی ئیبن خەلەکان (تێکەلاو)ە کە داوای لە بەڕێوەبەرێتی پەروەردەی گشتی هەولێر کردووە بۆیان نۆژەن بکرێتەوە لەبەر ئەوەی لە سەرەتای دامەزراندنییەوە تا ئێستاش هیچ جارێک کەس ئاوڕی لێ نەداوەتەوە و نۆژەن نەکراوەتەوە کە دەکەوێتە ناوجەرگەی شاری هەولێر.

## وەرزشوانەکانی گەڕەکی تەعجیل

وادیارە گەڕەکی تەعجیل هەر لەکۆنەوە مەیدان و گۆڕەپانی وەرزشکاران بووە، بگرە زۆر جار هەموو جۆرە وەرزشێکی تێدا ئەنجامدراوە، لەوانە:

١- سەلیم کوورەچی- سوارچاکی و زۆرانبازی لە سالانی شەست بۆ حەفتا کە گۆڕەپانەکەیان نزیک گۆڕستانی جوولەکان بووە.

٢- کامل حەداد- راهێنەر بووە لە سالانی ١٩٤٠-١٩٥٥ لەناوچەی گلکەند، کە سەرپەرشتی ئاسن هەلگرتن و غارغارێن و یاری سویدی بووە.

٣- تیپی تۆپی پێی گەڕەکی تەعجیل سالی ١٩٥٦ لەم بەڕێزانە پێکهاتبوو: (عارەب، نافع شەهاب، عەبدولڵا عەبدولوەهاب، یوسف شێخیل، ئیبراهیم رەسوڵ، کەمال عەلی، رەشید، جەلال رەحمان، ئیحسان عەبدوڵڵا، عەبدوڵڵا نەجم، رەقیب شێخان)

٤- یاریزانانی بەرزکردنەوەی قورسایی و لەشجوانی لە سالانی١٩٥٠ لەم بەڕێزانە پێکهاتووە: (رەفعەت تۆفیق، حامید حەمەد، باوەکر نەجم، مستەفا عەزیز، شێخ محەمەد خدر، مستەفا عەبدوڵڵا، محەمەد سۆفی، عەزیز رەسول خۆشناو، هاشم کوورەچی)

### سەرچاوەکان

١- مێژووی شاری هەولێر لە کۆنەوە تا سالانی شەست، یوسف ئەحمەد دەرگەلەیی، سلێمانی ٢٠٠٢، لە بلاو کراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.
٢- هەولێرم وادیوە، بەرگی ١-٢-٣، مەولود بێخالی سالانی ١٩٩١-١٩٩٧-٢٠٠٥.
٣- تراث اربيل التاريخي، هادي رشيد الجاوشلي ١٩٨٥.
٤- وەرزش لەکۆنەوە تا ئەمڕۆ لە هەولێر (لەسالانی ١٩٢٠-١٩٨٦) مەزۆ لەشکری عەزیز.
٥- گۆڤاری هەولێر ژمارە (٦) بەهاری ٢٠٠٠.
٦- حاجی جەلال حەمەد عەبدوڵڵا.
٧- هەیاس حاجی حەمەد نەبی.
٨- مامۆستا مەحمود زامدار.
٩- عەبدولکەریم عەولا عەزیز.

## گەڕەکی کوران (رزگاری)

### سنووری گەڕەکەکە

گەڕەکی کوران، کە لە ناوەڕاستی هەشتاکان بەڕەسمی ناوی بوو بە (رزگاری)، یەکێکە لە گەڕەکە کۆنەکانی هەولێر. سنووری ئەو گەڕەکە شێوەیەکی لاکێشەیی هەیە و شەقامی شەستی لای باکووریێتی و تا خانووەکانی کارگەی رستن و چنین کە باشووریەتی درێژتر دەبێتەوە. سنووری رۆژهەڵاتیشی شەقامی مەخموور یان بڵێین تخووبی گەڕەکی ئازادی و زانیاری و رۆژئاواشی شەقامی پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی (جاران)ە، ئەو شەقامەی هەڵدەکشێ بۆ گەڕەکی کوردستان. هەرچەندە ئەم سنوورە جاران لەلای باکووری لە شەقامی شەست مەتری دەپەڕییەوە تا وێستگەی شەمەندەفەر، کە تەلبەندێک بوو، لە شوێنی شەقامەکەش بۆلای وێستگە هەڵدەکشا نیوە کوردو چاڵ بوو و چەند پۆلیسێکی عارەبی مەخموور و هەندێک ماڵە کوردیشی تێدا دەژیا، تا دەرگای غابات. غاباتەکەش بۆیە هەربەناوی غاباتی کوران کرابوو. بەڵام لە دوای دروستکردنی شەقامی شەست مەتری لە لای باکوورییەوە، گەڕەکەکە بەرتەسک بۆوە. شەقامێکی دیکەی سەرەکیش ئێستا بەو گەڕەکە تێپەڕ دەبێت و پاسەکانی گەڕەکی کرێکارانی لێوە تێپەڕ دەبێت (شەقامی ئەلبان). جاران ناوی میری لەلای کارگەی ئەلبانەکەوە، کە کەوتبووە سەر شەقامی شەست مەتری و تەنیشت غاباتی کوران و دەهات هەتا دەگەیشتە گردی (کلک مشک). خەڵکی ئەو ناوەش برنجیان لەبەر دەچاند و شیناییان لەبەر دەکرد، سەرەڕای ئەوەی بۆ دروستکردنی خانووەکانی کوران خولیان لەوێ دەهێنا. هەر لەوێش بەم خۆڵە خشتیان دەبڕی. لەبەر ئەم چاڵکردن و هەڵکەندنەی خەڵکی، ناوی میری وەکو کەندی لێهات و فراوانتر بوو، یەکەم کەسیش خانووی لەسەر ئەم کەندە کرد، ماڵی "مام عوسمان گچکەڵە"یە، (باوکی یاریزانی دێرینی کوران و هەولێر غازی عوسمان، کە ئێستا ناوبژیوانی پلە یەکی عیراقە). خانووەکانی ئەودیو کەندەکە لەلای رۆژئاوا پێیان دەگوت گەڕەکی باخچان، لەبەر ئەوەی لەودیوی ماڵەکان شینایی لێدەکرا.



### کێ کورانی ئاوەدان کردەوە؟

لە سەردەمی پاشایەتی، ئەحمەد چەلەبی بەدوای "حاجی کەریم شەریف"، کە ئەو کات لە گوندی رەشکینی مەڕدار بوون، دەنێرێ و پێی دەڵێت: وەرە واز لە گوندی بێنە و ئەو زەوییەم بۆ ئاوەدان بکەوە بەخۆڕایی بۆخۆتان خانووی لەسەر دروست بکەن. ئیدی وا دیارە لەگەڵ "سەید کاکۆی سەید رەسولی"، کە ئەوەیان لای رۆژهەڵات و حاجی کەریمیش لای رۆژئاوا دەست بەخانوو دروستکردن دەکەن.

هەروەها ئەوانەی بەر سەرەتاکانی ئاوەدانکردنەوەی گەڕەکی کوران دەکەون (حاجی یابە، خدری عارەب، مەلا قەهار، مەولود حەمە).

### ماڵە گڵکەندییەکان

بەشێکی دیکەشی، کە بەگڵکەندییەکان بەناوبانگن لە ساڵی ١٩٦١، ئەو کاتەی حکومەت گڵکەندی بەقەرەبوو تێکدا، کە دەکاتە شوێنی ئێستای "باخچەی گڵکەند و هوتێلی شیراتۆن"، خوالێخۆشبوو (سەید گوڵ شێخ جەلال بەرزنجی) یەکێک بوو لە دانیشتوانی ئەم گەڕەکە، نزیکەی (٨٠٪) خەڵکەکە داوایان لە (سەید گوڵ) کرد، کە بچێ لە شوێنێک بۆ هەموویان زەوی بکڕێت، بۆ ئەوەی لەیەکدی دانەبڕێن. ئەوساکە گەڕەکەکە تەنیا چەند ماڵێک بوو، وا دیارە خوالێخۆشبوو لەسەر راسپاردەی خەڵکەکە لە ماڵی (چەلەبییەکان) لە کوران زەوی دەکڕێ، سنووری ئەم کۆمەڵە ماڵەش ئێستا لە نێوان سەرەتای شەقامی (٦٠) مەتری و دەرمانخانەی (کاوە)دایە.

### کودەتا شوومەکەی ١٩٦٣

بەشێکی دیکەی کوران بۆ کودەتا شوومەکەی حزبی بەعس لە ساڵی ١٩٦٣ دەگەڕێتەوە، کە شاڵاوی سووتان و

وێرانكردنی گوندەكانی كەندێناوە و قەراجی دەست پێكرد. لە ئەنجامی ئەوە ناچاربوون خەڵكانێك لە گوندەكان ڕەو بكەن و زێد و شوێن و نیشتەجێیان جێبێڵن و بەناچاری ڕوو بكەنە شار. خەڵكی ئەو دوو دەڤەر و دەشتەش زیاتر لە گەڕەكی كوران و ئەم ناوە گیرساونەتەوە. چونكە دوای ڕووخاندنی یەكجارەكی و شاڵاوی گەورەی ئەنفال و گوند تێكدانی هەشتاكانیش زیاتر خەڵكەكە گەڕەكەكەیان قەرەباڵغتر و پڕ جمەتر كرد.

## ماڵە كوێتییەكان

چەند ماڵێك لە گەڕەكی كوران هەبوون، كە لەساڵانی پەنجاكان لە وڵاتی كوێت ژیابوون و ئیدی دواتر گەڕابوونەوە هەولێر و كورانیان كردبووە جێواری خۆیان، بۆیەش هەر بەماڵە كوێتییەكان ناسرابوون، ئەوانیش: ماڵی ڕۆستەم كوێتی و كوڕەكانی: (خالید و وەهاب و ڕەسول و محەمەد و مەولود) وخەلیل و جەلیل و بەهرام، كە لە شەڕی عێراق - ئێران شەهید بوو. هەروەها ماڵی ئەمین مرادخان، كوڕەكانی: ئەنوەر، محەممەد، ئیبراهیم، ئیسماعیل، جەماڵ و یوسف، كە هەردووكیان لە شەڕی عێراق - ئێران شەهید بوون.

## كورەچییەكان

هەرچەندە كورەچییەكان زۆربەیان لەگەڕەكی كوران نیشتەجێ نەبوون، بەڵام وەكو كار و پیشە كە لەو سنوورە كوردیان هەبووە، لەوانەش: عەولا خۆخێ، مام عەباس كورەچی، مام زەینەڵ باوكی هەیاسە شێت)، ئەو شێتە زۆر ترسناك و زەبەلاحەی هەولێر، كە هەمیشە شیشەیەكی بەدەستەوە بوو، دواتر ماڵی فازڵی برای هەیاس لە ساڵی ١٩٧٥ هاتنە كوران. هەروەها مام جەعفەر، مام ڕۆژێ،... تاد.

## باخچەییەكان

بەشێك لەو گەڕەكە، كە لای خوارەوەی دەكا ئێستا بەشێك لە ماڵەكانی گەڕەكی كرێكاران و....لە سەری بنیات نراوە پێی دەگوترا باخچان، كە خەڵكانێك كاری شینایی و باخچەیان دەكرد و سەوزە و هێندێك تەرەیان دەچاند و لێشیان دەفرۆشت لەوانەش: مام غەفوور، مام وسوو، سەلامە كۆر، عەدنان و عادڵ قادر ڕدق و ڕەمەزانی برای، حەمە پێپان، شێخە، حاجی عەنتەر، سەید كەماڵ، سیامەند، مەجید،...

## ناوی كۆڵان و كووچەكانی كوران

گەڕەكی كوران بەشێوەیەكی زۆر ئەندازەیی و ڕاستە كۆڵانی ڕێكوپێك دروست كراوە، جا زۆر لەم كۆڵانانە ناویان لێنرابوو بۆ ناسینەوە و هەتا ئێستاش لای خەڵك بەو ناوانە دەناسرێنەوە، لەوانەش: كۆڵانی كارگەی بەفری، كۆڵانی لەكان، كۆڵانی سنجاویان، كۆڵانی سورچیان، كۆڵانی بەلوعە، كۆڵانی ئاشی مام عەزیزی، كۆڵانی سەید گوڵ، كۆڵانی عەیشێ بارزانی، كۆڵانی پیستە و...كۆڵانی سەید گوڵ، مام فەرهاد، مزگەوتی مەلا حەسەن، محەمەدی قاقەزچی، مام شەریف فرنیچی، حەسەن پۆلیس، شێمەی قەساب، جەلالی دوكاندار، مزگەوتی حاجی زایەر، سەید عەزیز، ئەحمەد ئۆمەر، ئەحمەدی عەتیان، سەید محەمەد، مزگەوتی مەلا مەعروف، عەلی جۆتیار یا كۆڵانی شێران، سەرتاشخانەی سرود، كۆڵانی گابەرەكە، حاجی جامی، وەستا كەماڵ... تاد

## هاتوچۆ لە كوران

جاران هەموو ڕێگاوبان و شەقامەكانی ئەم گەڕەكە خۆڵ بوون، تا بەپێی ئەو زانیارییەی ڕەزا سەید گوڵی چیرۆكنووس دەڵێت: "ئەگەر بەهەڵە نەچووبم لە ساڵی ١٩٦٨ جادەیەكی تەسك و تریسك، كە لە شوێن ترەفیك لایتی ئێستای كورانەوە، واتە لە شەقامی شەستییەوە تا كۆتایی گەڕەكەكە دروست كرا. بەهەموو گەڕەكەكە ئەو شەقامەیان هەبوو. هەموو كارەكەشی لەبەرد ڕێژ كردن و قیركردنی كاری دەست بوو".

ئەم شەقامە لە هەشتاكان فراوان كرا و كراوە بە چوار شەقام. جارانیش هاتوچۆی ئەم گەڕەكە بەجێب بوو، كە لە كۆتایی گەڕەك دەودەستان و بە (٥) فلس خەڵكیان دەگەیاندە ناو شار، ئەو شوفێر و خاوەن جێبە بەناوبانگانەی ئەوكات "مام سابیر و جێبە شڕەكەی، حاجی عومەر عەولا، سەید سابیرە شەل، حاجی محەمەد، مام خەلیل، مستەفای حاجی نادری مام مۆتەڵەگ". هەر لەسەر ئەم شەقامە و لەنزیك مەیدانی كرێكاران، گەراجی مەخمور و پیرداود و دەڤەری كەندێناوە بوو، كە بەجێب و لاندگرۆز و تاكسی و پەست و پیكاب خەڵكیان دەگواستەوە. ئەو بازگەیەی ئەم ڕێگایەش كە ئێستا لە كۆتایی گوند و كۆمەڵگای مامزاوەیە و پێشتر لەكارگەی قیر بوو، جاران بەرامبەر كارگەی ڕستن و چنین بوو لەسەر

سنووری کـوران. هەروەها بەشـێکی خـەڵکی کـوران بە ئامانەی ئازادی هاتوچۆیان دەکرد، ئامانەکە ژوورەوەی دوو بەش بوو، بەشی پێشەوەی ئیسـفەنج بوو، نرخەکەی پازدە فلس بوو لای دواوەی دار بوو بە دە فلس. جگە خـەڵکی نەداریش هەبوو بە پێیان هاتوچۆیان دەکرد، بەڵام دیسانەوە هەندێک لە خـەڵکیش هەبوو پایسکلیـان بە کـار دێنا: (عوسمان شورتە، ئەحمەد شورتە، حەسەن شورتە، شێمە قەساب، مامە نادر، رەجەب پاسکلچی، مەلا مسـتەفا، ئەنودر شبێلی و........

## بن لەلووگان

لە مافە سەرەتاییـەکانی منداڵە، کە تێر بێت و یاری و خـۆشی بۆ دابین بکرێت. گـەڕەکی هەژار نشـینی جـارانی کوران، مەگەر لە جەژن و بۆنەکان، ئەگینا منداڵان هەرگیز بەدڵی خۆیان تێریان نەدەخوارد و یاری و گەمەیان نەدەکرد. بەڵام ئەو رۆژە خۆشانەی گۆشت و پلاوی جەژنەکان و جلی تازە و جەژنانەکان هەموو دنیای دێنا، چۆن روویان دەکردە بن لەلووگان کە کەوتبووە نزیک شوێنی گەراجی جێبەکانی هاتوچۆی شار (فلکەی کوران). لەوێش پایسکیل و کەر و عـارەبانە و لەلووک و جـۆلانەی بەکـرێ هەبوون، منداڵان بەپارە و جەژنانەکانیـان سواری دەبوون، هەروەها لەو کاتانە یاریی لگاویش باو بوو.



## بەراوردێک لەنێوان کوران و ئازادی

لەسـەرەتای دروست بوونی ئازادی و کـوران بگرە تا بە ئەمـڕۆش، گـەر سـەیری ئەم دوو گـەڕەکـە بکـەین، دەبینین وێڕای ئەوەی کوران خاوەن ئەو هەموو رۆشنبیر و شۆڕشگێڕ و قـارەمان و قـوربانیـدانەیە، بەڵام هەر جیـاوازییـەکی زۆر لەنێوانیـاندا بەدی دەکەین،. لە کاتێکدایە، ئەم دوو گەڕەکە تەنیـا یەک شـەقـام و چەند مـەترێک نێـوانیـانە. ئازادی خـاوەن ـــکلتـوورێکی شـارسـتـانی بەرەو مـەدەنیـەت و بورژوازی و....، کەچی کوران باڵی گوندنشـینی و هەژاری و دەست کورتی و... پێوە دیارە. بڕوانە لە کوران بەحوکمی کلتـوور و دەسـەڵات و توانای مـاددی، رەنگە بەشی زۆری کـوران پارچەیەک زەوی دوو سـەد مـەتری کـرابێ بەدوو لەتەوە، ئینجا دایک و باوکێک عەقڵییـەتیان رێیان دەدا کـۆمـەڵێک منداڵیـان ببـێت، بۆ نموونە (٨) منداڵیـان هەبێت. بەمەش هەر (١٠) مـەترە بەر تاکێک دەکـەوێت، کـەچی لە ئازادی زۆر لە خـانووەکـان (٤٠٠ مـەترە) دوو منداڵیـشیـان هەیە، کەواتە بۆ هەر تاکێک (١٠٠) مەتری بەر دەکەوێت...!!

## خەستەخانە و قوتابخانە

جاران بنکەیەکی تەندروستی لەوپەڕی گەڕەک، لەسەر شەقامی شەست مەتری بەرامبەر غاباتی کوران هەبوو، کە دوای راپەڕین لەلایەن رێکخـراوێکی فـەرەنسـییـەوە بۆ هاوکـاری و یارمـەتیـدانی پەککەوتە و قـوربانیـانی شەڕ، کـرایە شـوێنی دروسـتکردنی دەست و پێی پلاسـتیـکی. بنکەیەکی دیکەش لە نزیک بنکەی پۆلیس و لای فلکەی کوران بوو، کـە بە ناوی خـەسـتـەخـانەی رووناکی بوو، لە ساڵی ١٩٧٠-١٩٧١ بیناکەی بۆ دروستکراوە، لەهەمان ساڵیش "سـەباح شـێـرە" تەواوی پێـداویسـتـیـیـەکـانی نەخۆشخانەکە تەواو دەکات، خۆشی لە ساڵی (١٩٧١)ەوە لەوێ بە فەرمی دەوام دەکات، تەنیا ئەو ماوەیەی، کە شەڕ لەگەڵ بەعس دەست پێدەکـاتەوە. لە ساڵانی گفـتوگۆشدا بارەگـای رێکخراوی ئازادی (پ.د.ک) لە نەخۆشـخـانەکە دەبێت، کە خۆشی بەرپرسی رێکخراوەکە بوو.

بنکەیەکی دیکەش ئەوە بوو لە دوای راپەڕین ئەو (مرکز شباب)ی لە کوران هەبوو، کە جاران شوێنی یاری و تیپە وەرزشـیـیـەکـان و هەندێک کـاری هونەری لە شـانۆ و

تەشکیلی بوو، کرایە بنکەی تەندروستی (شەهید دکتۆر محەمەد باجەلان).

لەلایەنی قوتابخانەش، بۆخۆی کارەساتێک بوو، دەبوایە منداڵان بچنە قوتابخانەی بابا تاهیری سەرەتایی لە زانیاری یان قوتابخانەی ئازادی لە گەڕەکی ئازادی، تا لە حەفتاکان قوتابخانەی سەرەتایی کوران لەم گەڕەکە کرایەوە، بەڵام تا ناوەڕاستی هەشتاکان هیچ قوتابخانەیەکی ناوەندی و دواناوەندی لێ نەبوو. ئێستا لە سنووری ئەو گەڕەکە ئەم قوتابخانە سەرەتاییانە هەن: (هەرێم، رزگاری، نازناز، تابان، شاکر فەتاح/ جاران گەرمیان بوو، ئاراس/ جاران دجلە بوو، سۆلاف، بەختیاری، شەفەق، فریشتە، سەلاحەددین، ئاوەدانکردنەوەی تێکەڵاو، کوران،...).

قوتابخانە ناوەندی و دواناوەندیەکانیش: (ناوەندی ساباتی کچانەی لەیلا قاسم، ئیبن خەلەکانی (کوڕان)، هەڵۆی کوڕان، دواناوەندی کچانەی چنار، دواناوەندی ئاوێستا (ئێواران). دواناوەندیی کچانەی بێخاڵ، ناوەندی گەرمیان).

### نووسەر و شاعیر و رۆژنامەنووسان

ئێمە ئەوە ناشارینەوە، کە مێژووی خۆمان بەداهێنانەوە دەبەستینەوە، بەڕاستی داهێنەر و پیاوی مەزن و نووسەر و شاعیری ناودار و پڕ سەلیقە و بەتوانا و قەڵەم بەبڕست لەم گەڕەکە هەن. بێگومان ئەگەر بێبەختی کورد و هەندێک جار تەمبەڵی خۆشمان نەبێت، نەک هەر لەتەواوی پارچە و بەشەکانی کوردستان، بەڵکو دەبوایە کەسانێکی وەک عەبدولخالیق مەعروف و شێرزاد حەسەن و... لای نەتەوە و وڵاتانی جیهانیش بناسرانایە و داهێنان و نووسین و فیکر و شاکارەکانیان بگەیشتایە بەر دیدە و کتێبخانەکانی ئەوان. جا ئەم گەڕەکەی هەولێر یەکێکە لەو گەڕەکە هەژارنشین و کەم خزمەت و لا لێنەکراوانەی، کە لە بەرایی هەموو گەڕەکەکانی ئەمڕۆی پایتەخت دێت لەڕووی رۆشنبیری و نووسەر و شاعیر و هونەرمەند. ئەمەش ناوی ئەو نووسەر و شاعیرانەیە کە دانیشتووی ئەو گەڕەکەن یاخود بەشێک لە تەمەنی نووسین و داهێنانیان لەو گەڕەکە دەست پێکردووە یان بەسەر بردووە: "دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن، دکتۆر هیمداد حوسێن، سەلاح قادر (سەلاح شوان)، نازم دڵبەند، نەوزاد عەلی ئەحمەد، خالید عوسمان تەها، رەزا سەید گوڵ، عەبدولموتەلیب عەبدوڵڵا، سەلام مەحموود عەدر، پیرداود مەخموری، سەعدی عەلی. عەبدولرەحمان مەعروف، ئیدریس شەیداهۆ، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان، سەعدوڵڵا نوری، عەبدولرەحمان بێلاف، عەلی حەمەددەمین (عەلی بێچارە)، جەوهەر محەمەد عومەر، جەوهەر شێخانی، حەمە عەباس، فەرهاد محەمەد، مامەند محەمەد، عەلی شێخانی و هەنگاو ئەنوەر شێخانی، محێدین تەها، تەلعەت تاهیر، سەرکەوت رەسووڵ، رێبین رەسول ئیسماعیل، ئیسماعیل عەلی، رزگار عەبدوڵڵا، دیار عەزیز شەریف، زیرەک عەبدوڵڵا، حەیدەر جەوهەر، پوشۆ خدر، پۆڵا سەعدی، عەلی بەختەوەر، محەمەد گۆران، عەبدولقەهاری شێخ، دلزار حەسەن، ئەکرەم خامۆش، عەبدولستاری پیرداودی، سەباح مەجید، نەریمان عەبدوڵڵا، عومەر سوڵتان، سمکۆ عەبدولکەریم، شیرین قادر، نیهاد جامی، تاهیر کرمانج، رەشید رەسوول، شالاو، ئاری ئاغۆک، تاریق مستەفا ئەحمەد، چالاک بلباس، دەرهێنەر، جەمال حوسێن رۆژنامەنوس و توێژەری کۆمەڵایەتی.

### هونەرمەندی شانۆکار و شێوەکاران

دەستەیەکی بەرچاویش لە هونەرمەند و شانۆکار و هونەرمەندی شێوەکار و بوارەکانی دیکەی هونەر و مۆزیک و گۆرانی لەم گەڕەکە هەن: (دارا محەمەد عەلی، نامیق عەلی قادر، ئەنوەر شێخانی، عومەر شێخانی، سەلاح محەمەد عەلی، سەعدی عەلی، بورهان جۆلا، سەرکەوت خدر سەلیم، ئەدیبە ئیسماعیل مامە، ئازاد خەمە، قاسم نووری، خدر حەیران، مام کانەبی زوڕناژەن، ئەحمەد مەلا زوڕناژەن، کاوە حەسەن، شەهرام نامیق، نەوزاد مستەفا، سەردار سنجاوی، سەرکەوت محەمەد، محەمەد زیرەک، سەعدی سنجاوی، ئەرسەلان سابیر، شالاو پیربال، بارزان حوسێن، لوقمان حوسێن، گەیلان خەتات، حازم بندیان، تەنیا ئیدریس، محەمەد عومەر، خەتاب کاوانی، وشیار عەبدوڵڵا، یوسف، یونس سمایل مامە، گۆڤار ئەنوەر، کوردستان، رۆستەم سابیر و سیروان سنجاوی، لە هەشتاکان تەها ئاغاجانی خانەقینیش لە کوران دانیشتووە.

## توانا زانستییەكان

لەم گەڕەكە، سەرباری سیما و خەسڵەتی گوندنشینی و بێ دەرامەتی و دواكەوتوویی لە زۆر رووەوە، بەڵام كۆمەڵێک كادیر و پسپۆڕ و رۆشنبیر و دكتۆر و ئەندازیار و كەسی بەتوانای لێ هەڵكەوتووە، كە خزمەتیان بە گەڕەک و شار و هاوشارییەكانی خۆیان و خەڵک و خوا كردووە، ئەوانەش وێڕای پشتیوانی و هەوڵ و هاوكاری كەس و كار و خێزانەكانیان، زیاتر وەستاوەتە سەر تواناو بڕست و ئیرادەو مكوڕی خۆیان بۆ گەیشتن بەم پلە و پایە زانستی و عەقڵە پێشكەوتنخوازە. لەوانەش: شەهید دكتۆر برهان حەسەن كۆسە، د. جەوهەر تاهیر، د. ئەمیر حاجی مامە، د. فەیسەل عارەب، د. عوسمان عارەب، مامەند محەمەد قادر، د. عومەر قادر"عومەر سورچی" د. دلشاد عەبدولڕەحمان، د. سیروان مەحمود، د.حوسێن محەمەد، د. دڵدار عەبدولڕەحمان، د. سەلاح ئەبوبەكر بنیادنەر و خاوەن پشكێک لە نەخۆشخانەی ژینی تایبەت، د. ئیڤان سیامەند و د. كارزان سیامەند، د. مەقسوود ئیسماعیل، د. یووسف سەعدی، د. وشیار مەلا ئەمین، د. شوان محەمەد عومەر، د. نەریمان سمایل خدر، د. كەریم عەبدوڵڵا، د. تاهیر مام بەكر حوسێن، كە بە نەخۆشی شێرپەنجە كۆچی دوایی كرد، د. سەعید عەبدولڕەحمان، د. زانا قادر پسپۆری ددان، د. شێروان ئەحمەد مەلا، دادوەر عەلی عەولا، دادوەر عوسمان یاسین، كە ماستەریشی لە یاسا هەیە، دكتۆر مەولوود ئیبراهیم حەسەن، دكتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان، دكتۆر هیمداد حوسێن، كە ئەوانە دكتۆرایان لە ئەدەب وەرگرتووە و مامۆستای زانكۆی سەلاحەدینن. نەریمان عەبدوڵڵا (ماستەر لە زمانی كوردی)، نەوزاد عەلی ئەحمەد (ماستەر لە ئەدەبی كوردی، یوسف نوری ماستەر لە زمانی كوردی، ئیبراهیم حەمەد حەسەن ماستەر لە ئەدەبی كوردی، دكتۆر ئازاد عەلی محەمەد دكتۆرا لە زانستی دەروونزانی، عومەر سابیر عومەر خوێندكاری دكتۆرا لە كۆمەڵناسی زانكۆكانی رووسیا، دكتۆر رۆستەم كەریم سەعید دكتۆرا لە بیركاری، دكتۆر كەریم رەحمان دكتۆرا لە بایۆلۆژی، دكتۆر نادر مستەفا قادر دكتۆرا لە بایۆلۆژی، دكتۆر ئەكرەم عوسمان ئیسماعیل دكتۆرا لە فیزیای خاک، عەبدولڕەحمان پیرداود ماستەر لە فیزیای خاک، محەمەد سەلیم و سالم خالید و محەمەد سدیق هەرسێكیان ماستەریان لە كیمیا بەدەست هێناوە، فەرەیدوون عەبدولڕەحیم ماستەر لە بەشی مێژوو، ناسیح هاشم ماستەر لە بەشی ئیدارە، ئەبوبەكر حەمید و زیاد عەبدولڕەحمان عەبدوڵڵا ماستەر لە یاسا، نیاز هادی ماستەر لە بەشی بیركاری، رەشوان مەحموود ماستەر لە بەشی ئینگلیزی، دكتۆر عەبدوڵڵا ئیسماعیل حەمەد بكالوریوس لە كیمیا و دكتۆرا لە كۆمەڵناسی، مامۆستا ئیبراهیم حەمەد حەسەن ماستەر لە ئەدەبی كوردی، د. سلێمان عەبدوڵڵا دكتۆرا لە جوگرافیا. كۆمەڵێک ئەندازیار: "سەلاح تاهیر، فەرهاد محەمەد قادر، نەزار عومەر عەولا، نزار زەنوون، سەعید مستەفا غەفوور، عەباس محەمەد سەعید، نزار حەسەن، عادل محەمەد، رزگار ئەحمەد محەمەد، لوقمان فەرحان، ساڵح عەباس، ئاسیا، عارف ساڵح، عەدنان عەلی قادر، ئازاد مەجید، مەهدی كەریم، حەبیب خدر نەبی، عومەر عارەب، سەعدی مستەفا، حەیدەر مستەفا، بارزان سمایل فەلاح، لاجان مەحمووڎ قادر، غازیە مەجید بایز، عەزیز ئیدریس، فەرهاد كەریم عەبدوڵڵا، كوردۆ شەمسەددین مەحموود، شێركۆ خدر ئەمین، ئەنوەر تاهیر عومەر، ئیبراهیم رۆستەم، جەرجیس، نوعمان شێخ محمد، شاخەوان، كاكەمین مەولوود، بەشدار عەبدولڕەحمان خەیات، ئەرسەلان قادر، كە لە یانەی شەترەنجی هەولێر رۆڵێكی باڵای نواندووە.

## تیپی كرمانج

لە گوران بنكەیەكی لاوان (مركز شباب)ێک لە شوێنی ئێستای نەخۆشخانەی (شەهید دكتۆر محەمەد باجەلان) هەبوو، كە شوێنی چەندین یاری و تیپی وەرزشی و هونەری



بوو، لە سەرەتای هەشتاکان لەو سنوور بۆ لاوان کرایەوە. لەم بنکەیە تیپێک لە ساڵی ١٩٨٢ مۆڵەتی کارکردنی لەسەر دەستی مامۆستا سەعدی عەلی چیرۆکنووس و شانۆنامە نووس و دەرهێنەر وەرگرت، تیپەکەش چەندین کەس و لاوی لە کوران و هەولێر بە خۆوە گرتبوو (کامەران عەلی، سەعدی عەلی شێخانی، سەید کاکە جەلال، محەممەد عومەر، عەبدولڕەحمان مەعروف، فەرهاد حوسێن، گەیلان خەتات، پوشۆ خدر، عەبدولکەریم عەزیز، جەعفەر عەزیز، ئیبراهیم قادر، دلشاد عەبدولڕەحمان، ئەرسەلان سابیر، ئەحمەد عەباس، ئەحمەد محەممەد، عەبدولسەمەد عومەر، کەمال سابیر، غازی سابیر،...) نۆیەرە و یەکەم شانۆگەری تیپەکەش: (ژانی گوندەکەمان) نووسین و دەرهێنانی مامۆستا سەعدی عەلی بوو. کە لە ڤیستیڤاڵێک لە دهۆک بۆ هەرسێ شاری هەولێر و سلێمانی و دهۆک سازکرا، بەشداری کرد و لە هەولێریش هەر ئەم شانۆگەرییەیان پێشکەش کرا.

دوای ئەوەی مامۆستا سەعدی عەلی لە شالاوە رەشبگیرییەکەی بەعس بۆ سەر رێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ساڵی ١٩٨٤ دەستگیر کرا، ئیدی (موحسین محەممەد)ی دەرهێنەر و رەخنەگری شانۆیی لە ساڵانی ١٩٨٤-١٩٨٥ لەو بنکەیە چەند کارێکی منداڵانی نمایش کرد. (بێ خەمی ناو بەرمیلەکە، خولەی تەمبەڵ). دیارترین ئەکتەرەکانی ئەم شانۆگەرییانەش: (نەوزاد مستەفای شەهید، دلشاد ئەکرەم، محەممەد عومەر، ئەدیبە...تاد) بوون.

## شۆڕشگێڕان و بزووتنەوەی کوردایەتی لە کوران

یەکێک لەو خاسیەتانەش کە ئەم گەڕەکەی پێ دەناسرێتەوە، بەشداری کردنیەتی لەو بزووتنەوە شۆڕشگێڕییانە، کە نزیکەی هەشتا ساڵە کورد لە باشووری کوردستان لە بەرامبەر حکومەتە یەک لەدوا یەکەکانی عیراقی دەیکات، بێگومان لە داهاتووشدا ئاسۆ لە سایەی بیرکردنەوەی شۆڤینییانە زۆر روون نییە.

لەوانەش: (کاک کۆسرەت و سەعدی پیرە و شەهید پۆڵا و مەجیدە سۆر و خورشید شێرە و رەشید شێرە و هادی شێرە و شەهید خەسرۆ شێرە و خالید رەوەند و جەمال شینە و ئەحمەد پیرباڵ و سەروەر عەبدوڵڵا و م. رێبوار ئیسماعیل و حەمە سەر سپی و جەمال حەلاق و موحسین ئیبراهیم حەسەن و سەیدەکانی گردعازەبان: (سەید مەجید و سەید عەزیز و سەید عزەدین) و. عوسمان شوانی وەزیری نەخشەدانانی حکومەتی هەرێمی کوردستان. محەممەد ئیسماعیل عەوێنە، کە چەندین ساڵ بەرپرسی عەسکەری میحوەری کەرکووک بووە و بە (مام فەتاح) ناسراوە، یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی 'کۆمەڵەی جەنگاوەرانی پێشەنگی کوردستان' و خاوەنی ئیمتیازی رۆژنامەی 'جەنگاوەر 'یش بوو، کە یەک ژمارەی لێ دەرچووە. ئەم زاتە لە رێکەوتی ٢٠٠٢/٧/٢٦ کۆچی دوایی کرد. لە کەسە هەرە دیار و بەناوبانگەکانی نێو بزووتنەوەی کوردایەتین، کە ناکرێ مێژووی سیاسی کوردستان لە داهاتوودا بەبێ ئەوانە بنووسرێتەوە.

کوران هەم لە شۆڕشی کۆن و هەم لە شۆڕشی نوێدا بەرگری بێ وێنەی نواندووە، بەتایبەتیش لە هەشتاکانی سەدەی رابردوو بوو بە پەنایەک بۆ پێشمەرگەکانی کورد، هەفتە نەبوو مەفرەزەیەکی پێشمەرگە نەیەتە کوران و چەند کەسێکی سەر بەدام و دەزگاکانی رژێم بە سزای گەل نەگەیەنن!

لە کوراندا رۆحی کوردایەتی هەستێکی دەستە جەمعی بوو، خێزانی واهەبوو بە گەورە و بچووکیانەوە خەباتیان دەکرد، یەکێ لەم خێزانانە: خێزانی یاسین ئۆرمزیاری بوو، کە جگە لە خۆی کوڕەکانیشی و بە پاڵپشتی خوشک و خێزانەکانیان هەموو کات دەست لەسەر سنگ بوون بۆ هەر فیداکارییەک کە بەوان بسپێردرێ.

"سەبور یاسین" نموونەی قارەمانێتی ئەم بنەماڵەیە بوو لە ساڵی ١٩٩١ لە شەڕی ئازادبوونی کەرکووکدا لە


مەلا هەمزەی شێوعی


حەسەن شورتەو مەلا هەمزەی شیوعی - کوران ١٩٦٥

سەربازگەی لەیلان بەبرینداری کەوتە بەردەست ڕژێم و تا ئێستا شوێن بزرە.

هەروەها نابێت دەوری "خەجە باوە" شمان لە یاد بچێت، کە ئافرەتێکی شۆڕشگێڕ بوو، ئەویش لە ڕاپەڕینەکەی ١٩٩١ شانبەشانی پێشمەرگە چەکی خستە شان و هەڵیکوتایە سەر دەزگای ئەمنی ئەو کاتەی ڕژێم لە هەولێر و لەو ڕۆژەدا چووە ڕیزی ئەو ئافرەتانەی کە لە نێو کورددا تا ئێستا مێژوو لە بیری نەکردوون.

چەندان شەهیدی دیکە: جەوهەر کاکل، شەهید فەرهاد سەرحان، شەهید عەلی پونگینەیی و جەوهەری برای، د. ڕەشید و ڕەشیدی برای، جەلیل ڕەوەند، جەمال بندیان (جەمال مەولوود چاوشین)، لوقمان شیوعی، هەردوو شەهیدی برا (غازی مەجید و ئەسعەد مەجید فەردە)، شەهید خدر کاکل لە قرناقە و پشت ئاشان شەهید بوو. شەهید عوسمانی کوڕی کە لە ساڵی ١٩٨٦ لە داستانی هێلاوە شەهید بوو. شەهید هەمزە بەهرام لە داستانی کۆڕێ شەهید بوو، شەهید سەلام حاجی ئەحمەد لە ساڵی ١٩٨٧ لە دۆڵی جافایەتی شەهید بوو. شەهید شینە عەولا شەمعوناوەیی، موسا مەلا لەتیف، خەلیل کەننە، سیامەند قادر جامچی، ساڵح عەدۆ، شەهید فەرهاد، شەهید سیامەند.لەعلی حەساری ژنێکی کوردپەروەر بوو لەگەڵ مام پیرانی لە لایەن بەعسیەکانەوە دەستگیر کران، لەگەڵ چەند ئافرەتێکی دیکە پاش ساڵێک ئازار و ئەشکەنجەدان ڕەوانەی زیندانی (ئەبوغەریب) دەکرێن، لە هەشتاکاندا دوای ئازادکردنی پلکە لەعلی تووشی نەخۆشی دەبێت و دوای چەند مانگێک دەگاتە کاروانی شۆڕشگێڕان و بە یەکجاری چاو لێک دەنێت. لە هەشتاکانیش (١٩٨٠) وەهابە شێت و باوکی و حوسێن نادر دەستگیر دەکرێن دوای ئەوەی مام ڕۆستەمی باوکی وەهاب لە ژێر ئەشکەنجە گیان لەدەست دەدا، ئەوانی دیکە حوکم دەدرێن، پاشان بە لێبووردنی گشتی ئازاد دەکرێن.

## وەستا و دەست ڕەنگینەکانی کوران

خەڵکی کوران لەو نیشە سەنعاتکارانەی کە لە کوردستاندا هەیە لە زۆربەی بوارەکانی وەستای کارامەی لێ هەڵکەوتووە، کە لێرەدا ناوی چەند وەستایەک کە لە بوارە جیاجیاکاندا دەسترەنگینی خۆیان سەلماندووە دەهێنین. دەسترەنگین و دارتاش (حەمەد عەلی) باوکی هونەرمەند دارا محەممەد عەلی، وەستا سەعدی سەبەچی کە بۆ یەکەم جار غەباتەی بەکارهێنا، لە جۆلایی (محەمەد جۆلا)ی باوکی هونەرمەند بورهان جۆلا و وەستا کاکل جۆلا، هەروەها (وەستا محەممەد تەنەکەچی) لە وەستا هەرە کۆن و دەسترەنگینەکانی بواری تەنەکەچێتی بوو. لەمانە هەندێکیان لە پیشەی وەستایەتی کاری بەرد و کاشی و مەڕمەڕ: (وەستا فازیل، عادیل، کەمال، شەمسەددین، بایز، سەلاح، ڕەفیق، وەستا سەید فەتاح، وەستا عەبدوڵلا، وەستا سینان) و چەندانی دیکەی وەکو وەستا سەرباز، حاجی مەجید، وەستا قادر و وەستا جەلال کوێخا عوسمان، وەستا حەمەدی عەتیان، وەستا مەجیدی مام بەکری لە کاری بیناسازیدا، وەستا خەلیل، مەلا ئەکرەم، حاجی خالند نەجار، مەغدید حاجی حەمەدەمین نەجار، حاجی برایم حەداد، جگە لە باش عەمبارەکانی سایلۆ لەوانە خولێخۆشبوو (مام پیربال)....

## چەقۆ کێشەکانی کوران

خەڵکی کوران، کۆچکردووەکانی گوندەکانی دەشتی هەولێر بوون، ئەمانە بەم کۆچە شوێنی نیشتەجێ بوون و جۆری کاریان گۆڕا، هەندێک لە گەنجەکان لە شوێنی تازەیان نەیانتوانی بەشێوەیەکی ئاسایی خۆ تێکەڵ ژیانی تازە بکەن شاریش بەوە ناسراوە کە چین و دەستەی نوێی

لێ پەیدا دەبێ یەکێ لەو چینانەی چەقۆکێشەکانن. جا ئەو گەنجانە تێکەڵ ئەو دەستەیە بوون، ئیدی چەقۆکێشیش وەک کلتوور دیاردەیەکی زۆر بەربڵاو لەو گەڕەکە سەری هەڵدا. بە لێکدانەوەیەکی دیکەش دەکرێ بڵێین وەک ئەلتەرناتیڤێکی چەکیش بەکارهاتووە، چونکە لە سەردەمی رژێمی بەعس چەک قەدەغە بوو و هەموو کەس بۆی نەبوو، بەتایبەتی گەنجان چەک هەڵگرن.

شێرزاد حەسەنی چیرۆکنووسیش لە چاوپێکەوتنێکدا لە وەڵامی پرسیارێک: (ئەگەر نووسەر نەبوایە دەبوو بە چی؟) دەڵێت: "چەقۆکێشێکی کورانم لێ دەردەچوو"، کەواتە ئەمە بەڵگە و پشتراستکردنەوەی قسەکانمانە، ئەگەر یەکێک نەتوانێت داهێنان بکات ئەوە بەلاڕێدا دەڕوات و دەبێت بە چەقۆکێش. ئەم دیاردەیە لە چیرۆکی "زەلکاو"ی شێرزاد حەسەن لە کۆمەڵە چیرۆکی "گوڵی رەش"دا رەنگی داوەتەوە.

## غاباتی کوران مەنزڵگای ئەدیبان و خوێندکاران

غاباتی کوران کە مێژووەکەی بۆ پەنجا ساڵێک لەمەوبەر دەگەڕێتەوە بەردەوام شوێنی خۆپێکەیاندنی رۆشنبیران و دەمەتەقەی سیاسی و حیزبی و هونەری و فکری بووە، ئەمە جگە لەوەی کە بەردەوام قوتابیانی کوران و گەڕەکەکانی دیکەش لەوێ خوێندوویانە، زۆربەی ئەو نووسەر و رۆشنبیرانەی، کە خەڵکی کوران هی وایان تێدایە ئەوەندەی لە غابات بوونە و خۆیان تێدا پەروەردە کردووە و رۆژگاریان تێدا بەسەر بردووە، هێندە لەماڵەوە نەبوونە. جگە لەوەش وەکو سەیرانگایەکیش وابوو بۆ خەڵکی هەولێر بە گشتی و نزیک و دووروبەرەکەشی بە تایبەتی.

بەڵام بەداخەوە ساڵی ۱۹۹۲ ئەو کاتەی کەمی سووتەمەنی زۆربەی شارەکانی کوردستانی گرتەوە، خەڵکی کورانیش وەکو تەواوی شوێنەکانی دیکە پەنایان بۆ بڕینەوەی داری غابات برد و دارەکانیان بڕیەوە و لەگەڵ زەوی تەختیان کرد.

ئەوکاتە چەندین لەو رۆشنبیرانەی کە ئەوێیان بە ماڵی یەکەمی خۆیان دەزانی، وەک ئەوەی خۆشەویستێکیان لەدەست دابێت بۆ چەندین رۆژ دەهاتنەوە و تا کوڵیان دادەمرکاوە لەو شوێنە دەگریان. لەو غابات پەرستانەش:



(سەربازی عەولا خۆخە، عەبدوڵڵا ئیسماعیل کە ئێستا مامۆستایە لە بەشی کۆمەڵناسی و شێخ ئەحمەد و شێرزاد حەسەن و ئیدریس شەیداهۆ و ئیبراهیم رەسووڵ (مەلا برایم)، زیاد عەبدولڕەحمان (مەلا زادە) و دڵشادی برای، هەر دوو برا مامەند و فەرهاد محەممەد قادر، ئەسعەد رەسووڵ، کازم ئەنوەر، رەجەب رووسی، حسامەددین عەلی رەسووڵ (زەندی)، شوان غەمبار، د. کاسترۆ، غازی عوسمان، بارانی فەرهاد، رۆستەم کەریم، خاڵس و... ) چەندانی دیکە بوون. هەروەها ساڵی ۱۹۹٤ سەرلەنوێ نەماميان لێ ناشتەوە و ئێستا دارەکان هەراش بوون و جوانی فێنکی و رووە شارستانییەکەیان بە ناوچەکە بەخشیوەتەوە.

## کۆترباز و سەگبازەکانی کوران

کۆتربازی و سەگبازی و کەربازیش تا رادەیەک لە کوراندا سەردەمانێکی زوو برەو و بازاڕی تایبەتی خۆی هەبووە. کەم کەس هەیە لە کوران ژیابێت، نەزانێت ئەو کۆترەی کە لە ئاسمان دەفڕێت نەزانێت سەر بە چ تایەفەیەکە و خاوەنەکەی کێیە و چەند دەستی کردووە و چەندین لایەنی دیکەی وردی ژیانی بەڕوونی شی دەکاتەوە. کۆتربازی وای تیایە لە دووری چەندان کیلۆمەتر و بەیەک سەرنج دەزانێت کەوا ئەم کۆترە لە خاوەنەکەی تۆراوە و هێلکەی جێهێشتووە و نیازی گەڕانەوەی نییە. لەم کۆتربازانەش (سەربازی مام حوسێن، لوقمان ئەبو ریشە، ناقە کورانی، حاجی عومەری حەمە نۆفە، وەستا عەبدوڵڵای خەلیفە)ن.

بەنیسبەت سەگبازەکانیش، بەڵام ئەم جۆرەیان ئێستا

ڕوو لە کەمین، بەهۆی گۆڕانی باری کۆمەڵایەتی و بەسووک سەیرکردنی ئەو کەسەی، کەوا سەگ ڕادەگرێ، کەربازانیش دەتوانین بڵێین حاڵی حازر بوونیان نەماوە، بەڵام کاتی خۆی لە کوراندا زۆر بوون و بازاڕی تایبەت بەخۆیان هەبووە. کەر بەخێوکردن پیشەیەکی کۆنی مەڕداری و جوتیارییە و کەر پێویستییەکی گرنگی ژیانی سەردەمانی زوو بووە لە کۆنەوە کورد گوتوویەتی: "ئەوەی کەرەکی نەبێ، کەرەکی تایبنێ".


هەیاس زەینەل (هەیاسە شێت)

تەشقەڵەیان پێدەکرد، ئەویش جوێنی دەدا و هاواری دەکرد، پێیان دەگوت موحسین عەیبە جوێن مەدە. ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت: "ئەگەر بزن نەکا بێڵە بێڵێ، ئەگەش ناکا هێلە هێلێ". کەریە شێتی برای دەروێش ڕەحمان، جەمیلە شێت، ڕەوفە شێت کە حکومەت بزری کرد، پیرداوەد شێت، جەمال و ئازادە شێت، بەکرە شێت، یاهووش (ئەوەش کورانی نەبوو، بەڵام زۆربەی ڕۆژان لە کوران بوو) بەشێکن لە شێتەکانی ئەو گەڕەکە.

## شێتەکانی کوران

کوران تاکە گەڕەکی هەولێرە کە شێتەکانی لە هەموو شاردا بەناوبانگ بوو، کەسێ نییە لە هەولێر ناوبانگ و ئازایەتی هەیاسە شێتی نەبیستبێ و قسەیەکی خۆشی لێ نەگێڕابێتەوە، مامۆستایەکی خۆمان کە ئامۆزای هەیاسیشە زۆرجار قسە خۆشەکانی هەیاسی بۆ دەگێڕاینەوە دەیگوت: "هەیاس ڕۆژێک بەقتوو ئاوی چڵکاوی پێش ماڵی خۆیانی دەخواردەوە، برا گەورەکەشی چاوی لێدەبێ و پێی دەڵێت هەیاس ئەوە مالێ، بۆ ناچی لەوێ ئاو بخۆیەوە ئاخر ئەو ئاوە پیسە، خراپە. هەیاس ئاوڕێکی لێدەداتەوە و دەڵێت: "ئەها ئەها کاکیشم لێمان بووە بەدکتۆر". هەیاس چووبێتە هەر گەڕەکێکی هەولێر ژن و منداڵ و پیر و جوان خۆیان لە ژوورەوە کوتاوە، بەڵام کە هاتۆتە هەر کۆڵانێکی کوران منداڵ بەبەرد و دار کەوتوونەتە دوای، بۆیە هەیاس دەیگوت: "ئەگەر منداڵی کورانم لەگەڵدا بێت دەتوانم حکومەت لە بەغدا بگۆڕم".

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە هەیاس دانیشتووی گەڕەکی "سەعدوناوە" بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی سنووری کوران و ژێر دیواری کارگەی بەفرەکەی کردبووە مەنزڵگا و شوێنی حەوانەوەی خۆی، هەروەها ماڵی فازلی براشی لە ساڵی (١٩٧٥)ەوە هاتبووە کوران، بۆیە هاتوچۆی کورانی دەکرد.

لەناو بازاڕەکەی کورانیش موحسینە شێت هەبوو، کە زۆر شێت نەبوو تەنیا هەندێک گێل و کاڵفام بوو، جا ئەویش بەزمی خۆش بوو، زۆرجار کیژ و کاڵ و ژن گاڵتە و

## بنکەی پۆلیسی کوران

کورانیش وەکو زۆربەی گەڕەکەکانی هەولێر بنکەیەکی پۆلیسی هەبوو، بۆ چاودێری کردن و چارەسەری کێشە و هەر مەسەلەیەکی دیکەی پشت پەردە. چونکە بەڕاستی بەعس و دەسەڵاتی سەدام هەموو شت و بوار و لایەنەکانی ژیانیان چەواشە و بە لاڕێدا بردبوو، پۆلیسیش بەمانای پاراستنی سەر و ماڵ و ژیانی خەڵک و بەدیهێنانی ئاسوودەیی و ئاسایش بۆ خەڵکە کەچی هەمیشە کارەکان پێچەوانە دەبوونەوە و کەلێنێک کەوتبووە ئەو نێوانەش (پۆلیس - خەڵک). هەرچەندە زۆرجاریش بەپشتیوانی و هاوکاری پۆلیس بەتایبەتی پۆلیسە کوردەکان زۆر کاری باش و خزمەت و پیاوەتی دەکرا، وەک ڕاپەڕینی خوێندکارانی زانکۆی سەلاحەدین لە هەشتاکان، پۆلیس زۆر یارمەتی قوتابیانی دا. هەروەها پۆلیسێک بەناوی حەیدەر مەلا مەعرووف، کە خۆشی دانیشتووی کورانە، دەیگوت: "ئەو کاتەی لە ساڵی ١٩٨٤ سەرداری سەعید سۆفی تەقەی لە (ئیبراهیم زەنگەنە)ی پارێزگاری هەولێر کرد، لە ئێمە دیار بوو و ئەگەر بمانویستبایە دەمانتوانی تەقەی لێ بکەین، بەڵام نەمانکرد. جا لەسەر ئەو هەڵوێستەیان ڕژێمی بەعس بۆ ماوەی سێ مانگ پۆلیسە کوردەکانی لە بەغدا گرت و کەس سۆراغیشی نەدەزانین، بەڵام دواتر ئازادی کردن.

بنکەی پۆلیسی کوران شوێنەکەی لەکۆتایی گەڕەک و فلکەی کورانە، هەرچەند هەنگاو و تەنیا کۆڵانێک دووری شەقامی سەرەکی مەخمور بوو، بەڵام لەدوای ڕاپەڕین ئەم

بنكەیە ئاوەدان نەكرایەوە و ئێستا ماڵێكی تێدایە. ئەم بنكەیە جارێك لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول بەسەری دادرا و شەڕ و پێكدادانێك روویدا. لەوانەی تا ئێستا پلەی بەرزیان لە راژەی پۆلیسی وەرگرتووە: هاشم پیرباڵ بەڕێوەبەری پۆلیسی دێگەڵە، عەبدولخالیق تەلعەت بەڕێوەبەری پۆلیسی هەولێر،...

## بازاڕی كوران

هەمیشە و لە هەموو شوێنێك پێداویستی و زەرورەت شتێك دێنێتە پێشەوە، بازاڕ و پێویستی ژیان و خەڵكیش كڕین و فرۆشتن و بازاڕی دروست كردووە، ئەوەتا ئەمڕۆ لە پاڵ تەواوی بوارەكانی دیكە هەنارده و هاورده و بازاڕ و لایەنی ئابووری تەحەكومی باری ژیانی خەڵك و وڵاتان دەكات و لە شێوە سەرەتایی و سادەكەش نەماوەتەوە و پەرەی سەندووە و زۆر بایەخی پێدەدرێت.

ئەم بازاڕەی كورانیش پێویستی دانیشتووانی گەڕەكەكە پەرەی پێداوە و بازاڕێكی گەورەی لێ وەبەرهێناوە، بەوەی رەنگە سەرەتا لە عارەبانەیەك و كۆشكێك و دوكانێك و دووانەوە پێكهاتبێت و ئەو بازاڕە هاوچەرخە نەبووبێت، كە ئەمڕۆ لە چ بوار و بابەتێك شتێكت مەبەست بێت و دڵت بیخوازێت، لەوێ دەستت دەكەوێ.

ئەم بازاڕە بە بازاڕی كوران ناسراوە و شێوەی ئێستاشی لەسەر شێوازێكی رێك و پێك و لەسەر بنەمای كۆڵان و شەقامەكان دروست كراوە، كە كەوتۆتە نێوان هەردوو شەقامی مەخموور و ئەلبان. بەدرێژایی لە شەستییەوە تا دەگاتە خانووەكانی كارگەی رستن و چنین، بەجۆرێك كەوا ئەم نێوانە (مەبەست هەردوو شەقامە سەرەكییەكەیە) چەند كۆڵان لەم سەر بۆ ئەو سەر بەشێوەیەكی ئەندازەیی رێك درێژ بۆتەوە و لەناوەڕاستدا نێوانێكی فراوان و چەند مەتری هەیە، بازاڕەكەی لە خۆوە گرتووە و هەندێك جاریش بۆیە پێی دەگوترێت بازاڕی "ناو كوران". ئەم بازاڕە لە دوای بازاڕی گەورەی ناو شارە، ئەگەر بازاڕی تەیراوە لە قەبارە و جۆر و بابەت خۆی



خدر قصاب

لەشانی بدات. ئەمە وێڕای ئەم بازاڕ و دەیان دوكانەی كەوا ئێستا لەسەر راستە شەقامی ئەلبان دروست كراون، لە پاڵ بازاڕێكی گەورەش لەسەر شەقامی مەخموور بەدرێژایی بەری كوران و ئەوبەریش لە گەڕەكی زانیاری و ئازادی.

ئەم بازاڕە لە پێویستی رۆژانە لە تەڕە و سەوزە و ساردەمەنی و شیرنەمەنی و جوانكاری و وردەواڵەی ماڵ و پێویستی قوتابخانە و بەرگ و پۆشاك و پێڵاو و خواردەمەنی و گۆشتفرۆشی و چەند دوكانێكیش بەتایبەتی لە بەهاراندا بۆ فرۆشتن و ساغكردنەوەی (ماست و پەنیر و لۆڕ و كەنگر و كاردی و تۆڵەكە) و هەروەها نانەواخانە و چێشتخانە و چایخانە و تۆمارگا و وێنەگر و پیشەی دیكەی وەك زێڕینگەریی و بەرگدروویی و كارەباچی و سالۆن و سەرتاشخانە و جامچی و بۆیەچی و تەنەكەچی و دروست كردنی تانكی و دارتاشی و مۆبیلیات و چاكردنەوەی رادیۆ و تەلەفزیۆن و ریكۆردەر و بەفرگر و فێنك كەرەوە و پانكە و ترومپای ئاو و سۆبە و پەرەمێز و دیسانەوە گەراجی فرۆشتنی گەچ و چیمەنتۆ و پاتری ئۆتۆمبێل و كەل و پەلی كارەبایی و نووسینگەی كۆمپانیاكان و دەرمانخانە و هەروەها كلینیكی چەندین دكتۆری پسپۆڕ و بواری جیا جیاش هەن. بەڵام یەكەم پزیشك، كە لەو گەڕەكە كلینیكی كردبێتەوە دكتۆر "عەبدوڵڵا مستەفا"بوو، لە ئافرەتانیش : د. مەیامین عەبدولحەمید و د. بەهرین بوون.

یەكەم دەرمانخانەش بەناوی دەرمانخانەی یاسین بوو، ئەم پیاوە عەرەبێكی مووسڵ بووە و لە سەرەتای هەشتاكانەوە دەرمانخانەكەی كردۆتەوە، سەرەتا "مەهدی هادی شێرە" كاری لەگەڵدا كردووە، پاشان "یوسف"، كە یاریدەدەری پزیشكییە تا ساڵی ١٩٩٥ لەوێ بەردەوام بووە. ئەم "یاسین" ناوە لە دوای راپەڕین دەگەڕێتەوە مووسڵ، بەڵام لەوێوە لە ناردنی دەرمان و پێداویستی بۆ دەرمانخانەكەی هەر بەردەوام دەبێت، كاتێكیش دەسەڵات بەم كارە دەزانن دەستگیری دەكەن و پاشان رەوانەی باشووری عێراقی دەكەن، وا دیارە هەر لە رێگا گیان لەدەست دەدات، ئەمەش دژایەتیكردنی رژێمی بەعس و

سەدام چەند پات دەکاتەوە لەبەرامبەر خەڵکی کوردستان، لەم رووەشەوە بە هەموو جۆرێک گەمارۆی خستۆتە سەر کوردستان و هاوکارانی کوردیشی سزاداوە.

دواتر لەم گەڕەکە دەرمانخانەی کاوە، درەنگتریش دەرمانخانەی نائلە کرایەوە، بەڵام ئێستا تەنیا دەرمانخانەی کاوە لە کارەکەی بەردەوامە، بەڵام دیاردەیەکی دیکەش هەیە، کە پتر لەدوای راپەڕینەوە سەری هەڵدا و پەرەی سەند، ئەویش جۆرە دەرمانخانەیەکە و شوێنی بچووکترە لە زۆربەی گەڕەکەکان لەلایەن یاریدەدارانی پزیشکی و کەسانی ئەم بوارە کرانەوە، کوران دەیان دەرمانخانەی لەم جۆرەی لە بازاڕ و کۆڵانەکان لێ کراوەتەوە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین گوایە یەکەم ئافرەتی دەرزی لێدەر لەم گەڕەکە (زارێ)ی دایکی (شێرزاد حەسەن)ی چیرۆکنووس بووە. جا پێویستە ناوی هەندێک کەسی دیکەش لە بوارە جیاجیاکان بێنین، کە زۆربەیان راستەوخۆش نەبێت ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە بازاڕەکەوە هەیە، لەوانە کاخدر قەساب لە کۆڵانی تانکییەکە، خانوویێک بەکرێ دەگرێت و دوکانێکی گۆشت فرۆشی لێدەکاتەوە، کە بەیەکەمین گۆشت فرۆشی کورانیش دەدرێتە قەڵەم، کە دواتر ساڵانێکی دوورودرێژ کوڕەکانی (ئیسماعیل، سیامەند، پوشۆ، گەیلان) لەسەر ئەم کارە بەردەوام بوون.

هەروەها (شێمە قەساب)یش یەکێکە لە گۆشتفرۆشە کۆنەکانی گەڕەک و چوار ژنی هێناوە تا ئەمرۆش بەقەد ژمارەی ژنەکانی داو لەسەری سپی نەبووە.

دەروێش رەحمانی پاڵەوانی هەندێک لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن،ماڵی لەدەو کەندێ لە نزیک شەستی بوو، بە هاوینان گندۆرەی دەفرۆشت و بە زستانانیش رەشۆڵە.

یەکەم نانەواخانە لە کوران، پێشمەرگەی ماندوونەناس (سابیر مەجید قورشاغلویی) لە ساڵانی شەستەکان داینا، فرنەکە کولێرە بوو، چەند شاگردێکی هەبوو بە سەبەتە کولێرەیان بۆ ناو شار و چێشتخانەکان دەبرد.

یەکەم کەس فەتاح ئیبراهیم حەمەدەمین لە کوران دەستی دایە کاسبی (پارە بەهێلکە) لە ساڵی ١٩٦٠، دوو زەمبیلەی بەدەستەوە دەگرت و بانگی دەکرد (پارە بەهێلکە، چوار هێلکە بەدرهەمەک). لە کوران لە ماڵان دەیکرییەوە، لە ئازادی و شوێنی دیکەش سێ هێلکەی بە درهەمەک دەفرۆشتەوە.

هەر بەم کاسبییە کەرێک و عارەبانەیەکی کڕی و ئیدی وازی لە (پارە بەهێلکە) هێنا، دەستی بە قوماش فرۆشی کرد، دەچووە گەلاڵە و سنووری ئێران، قوماشی ئێرانی وەک: (ئەنگۆرە، خیابان، جەرسە)ی دەهێنا و لە کوران و گەڕەکەکانی ناوشاری هەولێر بە کەر و عارەبانەکەی دەیفرۆشتەوە.

لەو دوکاندارە هەرە کۆنەکانی دیکەش: حاجی بەکرو هەردوو برا (سمایل شەل و حەسەن کۆسە) هەروەها سەوزە فرۆشەکانی سەرەتا: (جەلالە کوێر، قاسم بلّباس، ماڵی عەزیز تۆدەر، ئیبراهیم عەولا مەخمووری، یاسین پیرداود.)

## یەکەم و سەرەتای دیکەش

* یەکەمین فەرمانبەری تەندروستی کورانی: عەلی ئیسماعیل پیرەبابی بوو.
* هەوەڵین جۆلا: عەزیز جۆلا، سەباح جۆلا، مام یابە، ئەنوەر رەشید حەمەد، سمایل قادر مستەفا، رەحمان قادر مستەفا، محەمەد جۆلا باوکی هونەرمەند برهان جۆلا.
* فەتحییە قەڵەو کە بەیەکەم لێف دروو لە کوران دەژمێردرێت، ژوورێکی بەکرێ دابووە (حەمید) ناوێک، گوڵی دەستکردی لە کاغەز دروست دەکرد و دەیفرۆشت.
* تەونکەران: زارێ باپیر، زارێی برایمی، زبێدە ئیسماعیل، بەهیە سارمەمی، خەدیجە حەمەد عەبدوڵلا، خەجە حاجی قادر شێروانی، روقیە حاجی قادر، حەنیفە حاجی شەریف، سەبری سابیر.
* بەیتارەکان: حاجی قادر محەمەد، مام تاهیر بندیان، مام خەلیفە حەسەن، مام جەواد مەلا قەرەیی، عومەر ئامان، حەمەدەمین قازیخانەیی،.... قادر خەمچی یەکەم کەس بوو لە کوران لە ماڵی خۆی کاری دەکرد.
* یەکەم بەرگدرووی ژنان (نەعیمە مەلا مەعروف)ی خوشکی شەهید عەبدولخالق بوو، هەندێکی دیکەش دەڵێن ئافرەتێکی دیکە هەبووە لە سەرەتای شەستەکان بەناوی (خونە سلێمان) دەستی داوەتە دروومان.
* یەکەم کەس کە کەبابچی بووبێ لە کوران لە ساڵی

١٩٦٧ "رەشید عەلی ئەحمەد ئۆرمزیار" بووە، بەڵام دوکانەکەی لەناو شاری بووە.
* یەکەم کەس لە کوران، لە ساڵی ١٩٥٧ دەستی دایە کارەباچییەتی"محەمەد عەلی وەلی" و کوڕەکانی: "کەریم، سەلاح، سەباح، قادر" بوون.
* یەکەم کەسێک لۆبیای بەتام و تەیرەن عەبابیلۆکەی دەفرۆشت، خوالێخۆشبوو "مام جەعفەر" بوو. ئەم پیاوە تەیرەن عەبابیلۆکەی بۆ سەرنج ڕاکێشانی منداڵان بەشێوەی کەڵەباب و مریشک و تاوس بەقالبی تایبەتی دروست دەکرد، هەروەها مەلا هەمزەی شوعیش لۆبیا فرۆش بوو.
* کۆنترین چایخانەکانی ئەم گەڕەکە لە فلکەی کوران هی سەید ئەنوەری بوو لە قوڕ دروست کرابوو، هەروەها چایخانەی سەید مەحمود حەمەد گابەرەکە، کە قەوانێکی لە چایخانەکەی دانابوو حەیران و لاوکی (ڕەسول گەردی، کاوێس ئاغا، محەمەد عارف جزراوی،...") لێدەدا. چایخانەی مام غەریبیش لەناو کوران هەبوو، لە حەفتاکان بۆ یەکەم جار تەلەفزیۆنی ڕەش و سپی لە چایخانەکەی دانا.
هەروەها چایخانەی عەولا خۆخێ لەسەرەتای کوران لە نزیک ماڵی سەید کاکۆی بوو، چایخانەی عەلی عەزیزی هەبوو، کە بە چایخانەی "کرێکاران" ناسرابوو، ئەمەش لەبەرئەوەی مەیدانێکی گەورەی کرێکاران لەبەردەم چایخانەکە و لەسەر شەقامی مەخموور، کە لە کورانەوە تێپەڕ دەبوو هەبوو، هەموو بەیانیان لەوێ هەرکەسێک ئەگەر وەستا و کرێکاری بویستبا سۆراغی دەکردن، هەمدیسانەوە چایخانەی ئەبو زێد و چایخانەی کانەبی و چایخانەی عوسمان قادریش هەبوون.
* مردووشۆری پیاوان: دەروێش محەممەد، مام عەزیز، ڕەحمان بابەکر
* مردوو شۆری ژنان: سوڵتان و گولستان دوو خوشک بوون، کیژەخان عەزیز کوردە و حاجی عەیشێ.
* مامانەکان: کیژخان، حاجی مریم، بەهیە.
* بۆ کاری ئوتووش یەکەم کەس هەردوو برا جەوهەر و کەمال قادر عەبدوڵلا، بەر لە هەشتاکان دەستیان داوەتە ئەو کارە.
* محەمەد عەلی لە دارتاش و کەسە پڕ سەلیقەکانی ئەم گەڕەکە بوو، کە دواتر دوو هونەرمەندی لەسەر دەستی پەروەردە دەبن.
* کاری بۆریچێتی لە کوران لەسەر دەستی جەلال قادر عەبدوڵلا، مامەند ڕەمەزان، حاجی مەغدیدەوە سەری هەڵداوە.
* کاری چاکردنەوەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیش لە کوران لە مام جامییەوە دەست پێدەکات، باوکی نووسەر و هونەرمەند نیهاد جامی، کە پاشتر عومەر زەینەڵ و شەهید ستار سادق و سەمەد سەعید کوردە و حەیدەر مەعروف و عوسمانی برای، گوایە دەشڵێن لەو گەڕەکە یەکەم کەس ماڵی وەزیرە کۆری تەلەفزیۆنیان کڕیوە.
ئەو تۆمارگایانەی هەوەڵین جار لە کوران کراونەتەوە بۆ فرۆشتنی کاسێتی گۆرانی و مۆزیک هەریەکە لە تۆمارگای شەماڵ خاوەنەکەی (جەوهەر مەعروف)، تۆمارگای ڕزگاری خاوەنەکەی ئەبوزێد و براکانی، تۆمارگای خالیقی خاوەنەکەی سەباح شوانی بوون.
* بیر لێدەرانی کوران: حاجی نادر و دەروێش قادر و مام ڕەحمان بوون.
* کارگەی بەفری مام فەتحی لە کوران کۆنە: هی چەند دەوڵەمەندێکی هەولێر بوو، کە بەشێکی مام فەتحیشی تێدا بوو، زۆر جاریش لە کاتی نەبوونی بەفر دەبووە شەڕ و ئاژاوە، کە جارێکیان خەڵک لەگەڵ تەقەی پۆلیس و ئینزیبات بریندار بوو، ئەوانەی بەفر فرۆشییان دەکرد: حاجی حوسێن، خالید شینە، جەباری مام حەمەدەمینی، جەبار مەعرووف.
* یەکەم کەس لە هەولێر بەگشتی و لە کوران بەتایبەتی "محەمەد جمهوری" بووە، دوای ڕووخانی پاشایەتی لە ساڵی (١٩٥٨) پارەی پاشایەتی بە کۆماری گۆڕیوەتەوە، بۆیەش هەر بەم ناوە ناسرا.
* **موختارە بەراییەکانی گەڕەک:** مام باپیر، حەسەن عارەب و قادر موختار بوون.
* **پۆلیسە بەراییەکانی کوران:** ئەحمەد شورتە و حەسەن شورتە بوون.
* چەند حەسارێک لە کوران هەبوو، کە هەریەکەی نزیکەی بیست ماڵی لێ دەژیا و بەهەر هەموویان یەک ئاودەست و یەک گەرماویان هەبوو، ئەوانیش حەساری حاجی خەلیل، حەساری شێخ محێدینی، حەساری

کەریم پاسکلچی.
* لەکوران تا ساڵی ۲۰۰۰ گەرماو نەبوو تا گەرماوی قەرەچووغ لەلایەن: (خالید شینە) کرایەوە، بۆیە خەڵکی کوران پەنایان بۆ گەرماوی دیکە دەبرد.
* ئەوانەی لەم گەڕەکە لە یاری فۆلکلۆری کوردەواری کەرەمەستانێ بەناوبانگ بوون: (حوسیلە چایچی، سابیر جامچی بندیان، عەلی حاجی حەمەد عەیشێ، رەشید عەلی ئەحمەد کەبابچی).
* مام عەزیز سۆدەر لە ناوک هێنانەوە زۆر ناودار بوو.
* جەبار یاسین وەرزشوانی گۆرەپان و مەیدان، پلە یەکی لەسەر ئاستی عێراق بەدەست هێناوە.
* یەکەم ئاش لە کوران ئاشی (مام عزیز)ی بوو لە ساڵی (۱۹۵۸) دامەزرابوو، ئاشی (حەمکۆ)ش هەبوو بە ئاو کاری دەکرد.
* وێنەگرە هەرە بەراییەکانی کوران (شەعبان) کە گەڕۆک بوو وێنەی رەش و سپی دەگرت، هەروەها (کەمال مەحمود و ئەنوەر شبێلی و سەید عادل و مەهدی)یش بە سەلیقە و دەست رەنگین.
* لە خۆشنووسە سەرەتاکان: عەبدولقادر، زیاد مەلا زادە، گەیلان.
* یەکەمین زێرینگر لەناو بازاڕی کوران دەستی دابێتە ئەو کارە: "عەبدولرەزاق تاهیر بندیان" بوو دوای ئەویش: "عەبدولڕەحمان یابە رەحمان" دێت. یەکەم ئافرەتیش کە کڕین و فرۆشتنی زێری دەکرد: "مریەم دەلال" بوو.


سەید گوڵ بەرزنجی

* یەکەمین کەس لەسەر شەقامی ئەلبان بەرامبەر خانووەکانی ئیدارەی محەلی پاقلاوە و کێکی دروستدەکرد: "وەستا رەفیق"بوو.

### کێڵگەی توێژینەوە

لە ساڵی "۱۹٦۰"دا کێڵگەیەکی توێژینەوە لەلایەن ئەندازیار: "حیکمەت ساکۆ" سەرپەرشتی دەکرا

### تەکیە و مزگەوتەکان

لەم گەڕەکە چەندین تەکیە و مزگەوت هەن، کە بۆ کاری خێر و زیکر و خواپەرستی دروست کراون و سۆفی و مورید و لە خواترسان هامشۆی دەکەن و لە نزیکەوە یەکدی بەسەر دەکەنەوە. بێگومان لەو گەڕەکەش کۆمەڵێک مزگەوت و تەکیە هەن، ناویشیان لە بابەتی سەرەکی تەکیە و مزگەوتەکانی شاری هەولێر هاتووە، بۆیە بەپێویستی نازانین ناوەکان دووبارە بکەینەوە، هەر ئەوەندە کە ئاماژە بەناوی یەکەم مزگەوت بکەین، کە مزگەوتی مەلا مەعروف باوکی (عەبدولخالیق مەعرووف)ی شەهید بوو، کەوا لە ساڵی ۱۹٦۳ دروستکرا و ئێستا بەمزگەوتی (مەلا زاهیر) ناسراوە. یەکەم تەکیەش، تەکیەی خوالێخۆشبوو (سەید گوڵ شێخ جەلال بەرزنجی)یە، کە لە ماڵەکەی خۆی ژوورێکی فراوانی کردبووە تەکیە، لە عەسر بەدواوە تا ماڵ خەوتنان ریش سپی و حاجی و کەسایەتییەکانی گەڕەک و خەڵکی دیکە دەهاتنە لای. ئەوانەی بەردەوام سەردانیان دەکرد، سەید کاکۆ سەید رەسول، سەید حوسێن گردعازەبانی، مەلا حەسەن، مەلا زاهیر، مەلا مەعرووف، مەلا نوری، حاجی مەولوود، حاجی عوسمان گەلاڵی و...تاد.

### سالۆن و سەرتاشخانە

دوای گەورەبوونی گەڕەک و پێشکەوتن و چاوکرانەوەی خەڵک، مەسەلەی رازاندنەوە و خۆ جوانکردن و روو هەڵگرتن و داو لێدان و سەرتاشین بەشێوەی مۆدێرن سەری هەڵدا. جا لەم گەڕەکە ئەوە زۆر بەسەرەتایی و لەماڵەکەی خۆی لەبواری ئافرەتان دەستی بەکار کرد (عەیشێ بارزانی) بوو، کە ئەوەک هەر لە کوران لە هەولێر ناوبانگی



هەبوو، هەمیشە ماڵەکەی جمەی دەهات و ئافرەتی وا هەبوو. سرەی وەبەر نەدەکەوت بۆ ڕۆژێکی دیکە دوا دەخرا، مەگەر کاری پەلە و بووک بووایە سرە بڕی بۆ دەکرد. هەندێک جاریش بۆ خۆی و هەگبەکەی سەردانی ماڵە دەوڵەمەند و پیاو ماقووڵەکانی دەکرد، ئەمەش بۆ لێزانی و دەست ڕەنگینی، هەروەها بۆ ڕووخۆشی و قسە خۆشەکانی ئەو دەگەڕایەوە.



حاجی عوسمان گەلالی

لە سەرتاشە هەرە سەرەتاکانی پیاوانیش (کەریم حەلاق، محەمەد عەلی باوکی هونەرمەند "دارا و سەلاح" بوو. هەروەها سەرتاشخانەکانی "ئەستێرە"ی محەمەد ئەمین، ئازاد حەللاق، گیان پۆلا، "سەرتاشخانەی زیرەک" ی عیزەدین مەولوود و عەسکەری برای، "بێریڤان"ی نەوزاد حەمەد، دیسانەوە جەمال حەلاق و عەبدولستار و عەبدولقەهار و سامی خالد. سالۆنی ئافرەتانیش: بووک، ڕازاوە، پۆلا،... هەبوون.

## پرۆژەی ناوی کوران

لەوکاتەی بیرە ئیرتوازییەکەی کوران لێدراوە، بەبۆری ئاویان بۆ ماڵەکان نزیک کردەوە. ئەمەش زیاتر بەهەوڵ و هیمەتی خوالێخۆشبوو (سەید گوڵ) و چەند کەسێکی دیکەی خێرومەند لەسەر خەرجی خۆیان، بۆریان بەناوەندی کۆڵانەکاندا هێنا و بەلوعەیان لەسەری کۆڵانەکاندا قیت کردەوە تا ماڵەکان سوودی لێوەربگرن و ئاوی لێ ببەن: ئەمە درێژەی کێشا تا حکومەت بۆری ئاوی بۆ تەواوی کۆڵانەکان دابەشکرد.

## پیاو ماقووڵ

هەڵبەتە لە هەموو شوێن و گەڕەک و دەورانێک پیاو ماقووڵ و ریش سپی و خەڵکی بەهەیبەت و ناودار هەن، لە کورانیش ئەوانە هەبوون: سەید گوڵ بەرزنجی، سەید کاکۆ (چاونەترس و حەق بێژ بوو)، مەولود حەمە، سەلیم خدر لەک (لەبەر دەرگای ماڵی سەکۆیەکی دروست کردبوو، هەموو عەسران قاوەی لێ دەخواردەوە). هەروەها مام فەرهاد مەولوود (سمێل گەورە) هەبوو هەر خەریکی تاژی بەخێو کردن و ڕاو بوو، حاجی عوسمان گەراری و خاڵە مام ندو.

## چەند ڕووداوێک لە کوران

کەسێکی هەمیشە یاخی لە ڕژێم بەناوی (محەمەد قادر لاسووتای) هەبوو. وا دیار بوو خەبەری لێدرابوو، بۆیە حکومەت بە زرێپۆش و ئۆتۆمبێلی سەربازی و چەک و تفاق دەوری کورانی گەمارۆدا، پاش شەڕ و پێکدادانێکی چەند کاتژمێری، کە هاوولاتییەک شەهید بوو، ئەویش چەندی لێ بریندار و پێکان، خۆی بەدەستەوە نەدا و بەدەستی خۆی خۆی کوشت.

* لە ڕۆژانی ڕێککەوتننامەکەی ساڵی ١٩٨٣ی نێوان یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حکومەت شەڕ و پێکدادانێک لە ڕێکەوتی (٦/٥) لەم گەڕەکە ڕوویدا. ئەمەش ڕۆژێک بوو کاک سەفین مەلا قەرە و سەلاح شینە بۆ سەردان هاتبوونە ماڵی خوشکێکی کاک سەفین لە کوران، لەو دەرفەتەدا ماڵی سەید قەهار هاتنە سەریان و تا دوای مەغریب شەڕ و تەقە بەردەوام بوو، کە لەو نێوانەدا پێشمەرگەیەک بەناوی حوسێن محەمەد شەهید بوو، هەروەها ئافرەتێکیش بەناوی (ڕابیعە سێودین)ی خێزانی حاجی جەمیل بەرکەوت. ئەوەی جێگای سەرنجە (مەلا مەعرووف شێراوەیی) کە وتارخوێن و پێش نوێژی مزگەوتی حاجی فەهیمە بوو، شەڕەکەش لەنێوان مزگەوت و ماڵەکەی ئەودا بوو، ویستی بچێتە ناوبژی و نێوانیان و شەڕەکە بوەستێنێ، کەچی یەکێک لەو پیاوانەی ڕژێم، کە مەفرەزەکانیان هاتبوونە سەیر و چاودێری شەڕەکە زۆر بێ چاوڕووانە بەمامۆستای گوت: "یا شێخ فەرقی نییە لە کام لا دەکوژرێ، گرنگ کوردێک کەم بێتەوە، بڕۆیە پێش لێت دەدەین! "، هەردەم و هەمیشە ئەوە بەرنامە و بیر کردنەوە و پیلانی گلاوی بەعس و داگیرکەرانی کوردستان بووە.

* ئێوارەی ڕۆژی پێش نەورۆز لە سەردەمی ڕژێمی بەعس لەزۆربەی گوند و شار و شارۆچکە و بستێکی ئەم کوردستانە ئاگر هەڵدەکرا و داکۆکی لە ڕەمزی سەرکەوتن و نەورۆز و جەژنی کوردان دەکرا، جا لەو گەڕەکەش ئاگریان هەڵدەکرد و بەتایبەتیش منداڵان لەسەر شەقامی مەخموور لەچەند شوێنێک بەدرێژایی شەقامەکە تایەی ئۆتۆمبێلیان ڕیز دەکرد و ئاگریان تێبەردەدا و ڕێگایان دادەخست و

بەدیار ئاگرەکەوە چەپڵە ڕێزان و سروودی (ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە)یان دەگوت. ئەمە زیاتر کاردانەوە و دژایەتیکردنی دوژمن بوو، چون بەو ئاگر و کارانە زۆر سەخڵەت دەبوو. لەو دەمەش هەر ئۆتۆمبێلێکی حکومەت یان پۆلیس و مەفرەزە و جاش بهاتایە بەر بەرد دەدرا و هۆیهای لێدەکرا، جاری وا هەبوو لە ڕۆژێک چەند جار ئاگردکان لەلایەن پۆلیس و مەفرەزەکانەوە دەکوژێنرانەوە. بەڵام دووبارە و چەند بارە هەڵدەکرانەوە، پۆلیسەکانیش چونکە کورد بوون زۆر بەدەگمەن ئازاری خەڵکیان دەدا.

* تراژیدیایەکی دیکەی ئەم گەڕەکە لە ساڵی ١٩٨٧ دوای ئەوەی کە چەند گەنجێکی سەر بەڕێکخستنی حزبی شیوعی دەستگیر کران و لەسێدارە دران، خانووەکانیان بەسەر کەلوپەل و ماڵەکانیاندا رماند و وێران کرا، ئەم شەهیدانەش: مەسعود قادر، نشێو عومەر، کارەسول رەمەزان، محێدین عەزیز بوون.

## گەڕەکی ئازادی

گەڕەکی ئازدی بەوە لە هەموو گەڕەکەکانی دیکەی هەولێر جیادەکرێتەوە، کەوا زۆربەی دانیشتوانەکەی خوێندەوارن و ئەم توێژە خوێندەوارەش هەر لەفەرمانبەر و مامۆستا و ئەندازیار و دکتۆرەوە دەست پێدەکا تا بەرزترین پلەی کاربەدەستی دەوڵەت دەگرێتەوە. تا جاری وا هەبووە فەرمانبەری دەوڵەتی بە پلەی وەزیریشی تێدا هەڵکەوتووە: ئەوەش هەر لەکۆنەوە تاوەکو ئێستاکەش بەوشێوەیە بووە، چونکە گەڕەکی ئازادی لەگەڵ دروست بوونییەوە هەموو ئەوانەی هاتوونەتە ئەو گەڕەکە، خوێندەوار و کەسانی تێگەیشتوو بوون. خەسڵەتێکی دیکەی ئەم گەڕەکەش ئەوەیە. هیچ یەکێ لەماڵەکان باڵندەو مریشک و ئاژەڵیان ماڵی نەکردووە. وەکو زۆربەی گەڕەکەکانی دیکەی هەولێر سیمای کووچە و کۆڵان و شەقامەکانیان ناشرین نەکردووە. لەوەش شارستانیانەتر ئەوەیە کە هەموو خێزانەکانی ئەو گەڕەکە وەکو یاسایەکی کۆمەڵایەتی لەسەر ئەوە کۆکن کە منداڵ جگە لە کاتی دەوامی قوتابخانە بەهیچ شێوەیەک لە ماڵ نایەتە دەرەوە و هەرزەکارەکانیش بەهەمان شێوە لەسەر کوچەو کۆڵانەکانی گەڕەک نابینرێن.

ئەوانەی گەڕەکی ئازادییان دروست کرد.



١- نەشئەت محەمەد - بەڕێوەبەری پەروەردە.
٢- شێخ تەیب - بەڕێوەبەری خەزێنە.
٣- محەمەد حەسەن دزەیی - بەڕێوەبەری بانکی زراعی.
٤- قادر قرگەیی - خانەنشین.
٥- کەمال شاکر مەحمود - مامۆستا
٦- عەلی جوکل عەباس بەریا - بەڕێوەبەری قوتابخانەی خەبات.
٧- ئیسماعیل حەیدەری (مدیر معامل بنزین)
٨- عەبدولمەسیح ئەڵلاویردی - مودەڕیس.
٩- ئەحمەد عەلی حەیاوی - بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئیواران.
١٠- فاتیح مەزهەر - مامۆستا.

ئەوانەشی کە سەرپەرشتی دروستکردنی خانووەکانیان دەکرد.

بەڕێوەبەر- محەمەد حەسەن دزەیی. یاریدەدەرەکان- علی جوکل بەریا. ئەحمەد عەلی حەیاوی.

ئەوانەی کە وردبینی و ژمێریاری پارەکانیان دەکرد.
عەبدولمەسیح ئەڵلا وێردی- فاتیح مەزهەر- قادر قرگەیی.

## چۆنییەتی دروستبوونی و ناونانی گەڕەکی ئازادی

لەو بارەیەوە "مومتاز حەیدەری" کە یەکێکە لەدانیشتوانی گەڕەکی ئازادی. گوتی: لە هەر گۆڕانکارییەکی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیدا. شار بەرەو گەورەبوون دەڕوات و چینی ڕۆشنبیر هەوڵدەدات کە گەڕەکی تازە بەجیا لە گەرەکەکانی دیکە لە شارەکەیان بکرێتەوە. دیارە هەر لەو روانگەیەوە گەڕەکی ئازادی لەشاری هەولێر

بەدەستپێشخەری چەند مامۆستایەکی شاری هەولێر لەگەڵ ئەندازیار (ئیحسان شێرزاد) کە ئەوکات سەرۆکی کۆڕی کورد بوو لە بەغدا ئەو گەڕەکە دروست کراوە. سەرەتاش گەڕەکەکە تایبەت بووە بەو مامۆستاو فەرمانبەرانەی کە ئەندام بوون لە کۆمەڵەی دروستکردنی گەڕەکی ئازادی، کە پێشتر ناوی گەڕەکەکەش(ئیسماعیلییە) بووە. بەردی بناغەی پرۆژەی دروست کردنی گەڕەکەکە دانراوە. موتەسەریفی هەولێر (پارێزگار) ئیسماعیل حەقی پرۆژەکەی رەزامەندی لەسەرداوە و تاساڵی (١٩٥٨) گەڕەکەکەش هەر بەناوی ئەوەوە بووە. واتا (ئیسماعیلییە). بەڵام دوای چواردەی تەمموزی (١٩٥٨) ناوەکەی گۆڕا و بووە بە گەڕەکی ئازادی. ئەمەش هیممەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (مامۆستا هەمزە) کە ئەوکات ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو. ئەو پێشنیاری کرد لە لیژنەی سەندیکای ژووری پارێزەرانی هەولێر، کە ناوی گەڕەکی ئیسماعیلییە بگۆڕێ بە ئازادی. ئەوەبوو کە کۆبوونەوەیەکی فەرمی کراو بە بڕیارێکی فەرمی ناوەکەی کرا بە ئازادی. ئەوکات گەڕەکی ئازادی هەمووی لە چینی فەرمانبەران بوون، هەتا ئەوانەیش کە دەهاتن و دەبوونە کرێچی، ئەوانیش هەمووی فەرمانبەر بوون.. بەهەرحاڵ ئەم گەڕەکە یەکە لە گەڕەکە هەرە پێشکەوتووەکانی شاری هەولێر. هەروەها مومتاز حەیدەری گوتی: رووبەری خانووەکانی ئەم گەڕەکە هیچی لە پێنج سەد مەتر کەمتر نییە و ئەو خانووانەشی کە کەوتوونەتە سووچ و زاویەکان لەو رووبەرەش زیاترن و ئەمەش بەوجۆرە بووە، کە کۆمەڵەی دروستکردنی بیناکان لەسەری رێککەوتوون. دواجار ئەوەشیان وت کە بۆخۆیان لە ساڵی (١٩٧٠) هاتوونەتە ئەو گەڕەکە و پێشووتر، واتە بە ئەسڵ ئەوان خەڵکی گەڕەکی عارەبانی شاری هەولێرن. خانووەکان مەتریان بەپانزە فلوس کڕان و بە دوو هەزار و سەد دیناریش تەواو بوون.

لەبارەی وردەکاری دروستبوونی ئەم گەڕەکە، (عەلی جوکل) بەو جۆرە دەستی بە قسەکانی کرد. یەکەم جار زەوییەکەمان مەتری لەسەر پانزە فلوس کڕی و (٥٤) خانوومان لەسەر رووبەری پێنج سەد مەتری دەست پێکرد. (ئیحسان شێرزاد) کە ئەندازیارێکی ناوداری شاری هەولێر بوو. ئەو بۆ خۆی هەموو نەخشەکانی بۆ هەر پەنجاو چوار خانووەکە دروست کردو. پاشان دەستمان بە لێدانی بادلۆ کرد. کە بادلۆکەشمان تەواوکرد (من و محەمەد حەسەن و ئەحمەد حەیاوی) چووینە لای وەزیری مالییەی ئەو کاتی عێراق و پێمان گوت: ئێمە کارێکی وامان لە بەردەستدایە و دەمانەوێت لە بانکی عەقاری پارەمان بۆ سەرف بکەیت تاوەکو خانووەکانی پێ تەواو بکەین. وەزیر ئەوکاتە بەسەردان هاتبووە هاوینەهەوارەکانی کوردستان و گوتی: " من لە گەڕانەوە دێمە لاتان و سەیری کارەکە دەکەم و ئەگەر بەو جۆرە بوو کە ئێوە دەیڵێن ئامادەم یارمەتیتان بدەم، بەڵام تا کارەکان نەبینم هیچ ناڵێم، چونکە دەترسم ئەو کارەتان پێنەکرێت." ئەوەبوو لەگەڕانەوەدا وەزیر هاتە لامان، کە ئیش و کارەکانی بینی زۆر سەرسام بوو، بەڵێنی دا کەوا هەر گەڕایەوە بەغدا بەزووترین کات پارەمان بۆ رەوانە بکات. ئەوە بوو گەڕایەوە بۆ بەغدا یەکەم وەجبە (روبعە ملیۆنێکی) ئەوکاتەی بۆناردین، ئێمەش بەردەوام کارەکانمان پوختترو خێراتر دەکرد. هەشتا کرێکار و بیست وەستامان هێناو چووینە موسڵ و لەوێش قۆنتەراتچییەکمان بەناوی (سەلیم حەمۆک) هێنا. ئەوەبوو تا دەهات وەستاو کرێکارمان زیاتر دەکرد و سێ کوورەچی هەبوو ئەوانیشمان هێناو گوتمان وەرن لەمەودوا تەنها ئیش بۆ ئێمە بکەن و تەنها مەرجیشمان ئەوەبوو، کە قالبی کەرپووچەکان لای ئێمەبێ و بەوجۆرە بێت، کە ئێمە دەمانویست چونکە ئەوەی ئێمە داوامان دەکرد گرانتر بوو، بەڵام دەبووایە بە شێوەیەکی تایبەتی کەرپووچەکان دروست کرابان. ئەوەبوو دواتر لەگەڵ کوورەچییەکان لەسەر ئەوە رێککەوتین کەوا هەر (هەزار کەرپووچمان بە شەست دینار) بۆ دروست بکەن. ئەمەش زۆر گران بوو، بەڵام کەرپووچەکانیش تایبەتی بوون. دوای ئەوە بەپارەکە پیکاب و قەلابێکیشمان کڕی و هەر پەنجاو چوار خانووەکەمان تا پەنجەرە هێناو ئیتر دوای ئەوە وەجبەیەکی دیکەشمان پارە وەرگرت و هەر پەنجاو چوار خانووەکە و خانوویێکی دکتۆر و یانەی ئازادی و لەگەڵ حەوت دوکانیش هەموویمان بەیەکەوە تەواو کرد. قوتابخانەی ئازادی کچانیشمان بە حکومەت دروست کرد. وەجبەی یەکەمی خانووەکان کە پەنجاو چوار خانوو بوون لەساڵی (١٩٤٨) دەستمان پێکرد و لەساڵی (١٩٥٢) تەواومان کرد. واتا ماوەی چوار ساڵی رێکی خایاند. دوای

تەوابوونیش ئاهەنگێکی گەورەمان لە یانەی ئازادی سازکرد و پەنجاو دوو وەرەقەمان هێناو خستمانە ناو سندوقێکەوە و ناوی پەنجاو دوو کەسی لەسەر تۆمار کرابوو خانووەکان هەمووی بەتیر و پشک دابەش کرابوون تەنها من و ئەحمەد حەیاوی بەبێ قورعە و دوو خانووی بەدڵی خۆمان هەڵبژارد، ئەمەش لەسەر پێشنیازی خەڵکەکە خۆیان بوو، چونکە ئێمە ئەو دووانە هەر لەسەرەتای پرۆژەکە تا کاتی تەواو بوونیشی لە هەموویان هیلاکتر بووین. خانووەکانیش هەموویان هەریەکە و دوو هەزار و سەد دیناری ئەوکاتی تێچوو. مانگانەش لەبری ئەو پارەیە حکومەت سێ تا شەش دیناری لە مووچەکەمان دەگێڕایەوە، هەر یەکە و بە پێی زۆر و کەمی مووچەکەی. دوای تەواو بوونی خانووەکان و راستەوخۆش لەساڵی (١٩٥٢) پارچەیەکی دیکەی زەویمان بۆ هەمان مەبەست کڕییەوە و لە هەمان کەسیش، کە کابراکە ناوی (حاجی حەیدەر) بوو. پارچەی یەکەمیمان هەر لەوی کڕیبوو، بەڵام جاری پێشوو مەتری بەپانزە فلوس کڕیمان و جاری بەم دواییەش مەتریمان لەسەر هەژدە فلووس کڕی، (عەلی جوکل) بەردەوام بوو لەسەر قسەکانی و گوتی: لە وەجبەی دووەم بەخەڵکەکەم گوت. کاکە با ئێمە بیر لە دوارۆژی خۆمان و منداڵەکانمان بکەینەوە و پێشنیازی ئەوەم کرد کە ئەمجارەیان هەر کەسەو لەتەنیشت خانووەکەی خۆی بە رووبەری پێنج سەد مەتریش بە بۆش لە تەنیشت خۆیەوە بهێڵێتەوە و لەدوارۆژدا هەرکەسەو دەتوانێ خانوویێکی دیکەی بەهەمان شێوە لەپاڵ خۆی بۆ منداڵەکانی دروست بکات یاخود هەر چۆنێک بێت ئەگەر نەشیکات بەخانوو دەتوانێ بیفرۆشێت و پارەکەی چەند قاتی خۆی دەکاتەوە، بەڵام چەند پیاوێکی نەزان گوتیان، دەمانەوێت کۆلێتێکمان بۆ دروست بکەن و زەوی بەتاڵمان ناوێ. هەر چۆنێ بوو قسەکانی ئەوان چووەسەر و وەجبەی دووەمی خانووەکانیش تەوابوو، بەهەمان کاتی پێشووتری وەجبەی یەکەم. هەموو جارێکیش خانووەکان بە قورعە دابەش دەکران یەک راستیش لەسەر خاوەنەکانیان تاپۆ دەکران. جاری دووەمیش دوای ئەوەی ئازادی بوو بە


نافیع یونس

گەڕەکێکی گەورەی سەد و هەشت ماڵی. لەسەر بڕیاری پارێزگاری ئەوکاتەی هەولێر. ئاو لە قەڵاتێ بەبۆڕی شەش ئینجی بۆ ئازادی راکێشرا و هەر لەسەر فەرمانی ئەویش دایرەی کارەبا لە گەڕەکی ئازادی دروست کراو بووین بەخاوەنی ئاو و کارەبای خۆمان و زۆربەی شەقامەکانیش زۆر بە پوختی قیرتاوکران و تائێستاش ئازادی قیرەکەی ئەوسای ماوە ئێستاش هەڵنەوەشاوەتەوە. ئەوسا تاکە گەڕەکی هەولێر بوو کە ناوی کوردی لێنرابوو.

لەبارەی ژیانی ئەوسای گەڕەکی ئازادیش (عەلی جوکل) گوتی: دوای تەواو بوونی خانووەکان من یەکەم کەس بووم، کە ماڵم هێنایە ئەو گەڕەکە و زۆربەی خەڵک دەیانوت. چۆن دەوێری بچی. رۆژێک هەر دێت گورک بتخوات. چونکە دەوروبەری ئازادی هەمووی چۆڵ بوو.

## سنووری گەڕەکی ئازادی

سنووری گەڕەکی ئازادی لەگەڵ گەڕەکەکانی دیکەی شاری هەولێر. وەکو عەلی جوکل و مومتاز حەیدەری ئاماژەیان پێدا. لەلای باکورییەوە لەیاریگای نێودەوڵەتی هەولێر-ەوە دەست پێدەکات و مزگەوتی مەلا زاهیر، دواخالی بەشی باشوورییەتی و لەرۆژهەڵاتیشەوە لە شەقامی شەست مەتری تا دایرەی کارەبای ئازادی درێژ دەبێتەوە و لەوێوە کۆتایی پێدێت. هەروەها ئەوەشیان وت کە ماوەیەکی زۆر سنووری بەلەدییەی هەولێر تا گەڕەکی ئازادی بووە و ئیتر لەوێوە بەدواوە هەمووی چۆلەوانی بووە و لەوەش سەرنجڕاکێشتر، کە ئەو دەمانە سنووری بەلەدییەی هەولێر، لەوێ کۆتایی پێ هاتووە. لەهەمان کاتدا گەڕەکی ئازادی سنووری نێوان پارێزگای هەولێر - کەرکوکیش بووە و دواین بازگەی هەولێر لەلای یاریگای نێو دەوڵەتی هەولێر بووە و ئەوەکەی دیکە بەسنووری نێوان هەولێر و کەرکوک زانراوە.

## رۆشنبیر و تێکۆشەرەکانی گەڕەکی ئازادی

مومتاز حەیدەری گوتی: گەڕەکی ئازادی هەر

لەسەرەتاوە گەڕەکێکی ئەرستۆقراتی بووە. بۆیە ئێمە ئەوەمان نەبووە، کە ئەمە شاعیرە و ئەوە چیرۆکنووسە. شاعیر و چیرۆکنووس لەهەموو دنیا ئاوایە کە لەگەڕەکی هەژارەکاندا پێ‌ئەگەیشتوون. گەڕەکی ئەرستۆقراتی شۆڕشگێری لێ هەڵناکەوێ، بەڵام ئەوانەی، کە هاتوون لەو گەڕەکەدا دانیشتوون کە من پێم باشە ناوزەدیان بکەین. ئەوانەی کە لەبواری پەروەردەو رۆشنبیری و زانست و شۆڕشگێڕیدا دەرچووکەون ئەم ناوانەن (میرزا عەبدولکەریم) ئەندامی سەرکردایەتی پارتی بووە بەر لە چواردەی تەمووز. شەمسەدین موفتی. ئەحمەد حەمەدەمین دزەیی. کەمال عەبدولقادر. حەیدەر عوسمان لە حیزبی هیوا بووە. بەختیار حەیدەری. جەودەت ئەحمەد ناجی. سدیق عەبدولقادر رۆشنبیر بوو. نەجمەدین موفتی رۆشنبیر. عەدنان موفتی سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان. ناسیح داود. مومتاز حەیدەری. وریا حەمەد ئەمین. رەمزیە عەلی یەکێکە لەو ئافرەتانەی کە لە موزاهەراتی چلەکان بەشداری کردووەو کچی پووری خەیروڵلا عەبدولکەریمە. حەمدیە سابیر کە لە ئافرەتان کاری کردووە. سەید مەولود بێخاڵی خاوەن چەند کتێبە. عەلی جوکل رۆژنامەی هەولێری بۆماوەی سێ ساڵ دەرکردووە. ئیحسان شێرزاد سیاسی و رۆشنبیر بووە و ماوەیەکیش وەزیر بووە. عەلی حەمادی. فاروق سەید حەسەن. نافیع یونس. ئەوەی ماوەتەوە بڵێین کە گەڕەکی ئازادی، ئازادییەکانی هەر لەسەرەتاوە بۆ بوون بەژێرخان لەوانە نادی ئازادی و مزگەوتی ئازادی، کە ئەوانە هەردووکیان دواتر چەند جارێ گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە و گەورەتر کراون. هەروەها دائیرەی کارەبای ئازادی و هەردوو قوتابخانەی ئامادەیی ئازادی کوڕان و ئازادی کچان. گەڕەکی ئازادی کاتی خۆی بنکەی تەندروستی تایبەت بە خۆشی هەبووە بەناوی (مستەوسەفی ئازادی)، بەڵام وەکو مومتاز حەیدەری گوتی: تێکدراوە و بۆ بەرژەوەندی چەند کەسانێک کە ئێستا تێیدا دەژین. لە کۆتاییشدا نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ خاوەنی مزگەوتی ئازادی. کابرایەک بووە بەناوی (حاجی خەلیل دانساز).

## گەڕەکی تەیراوە

سەرەتا لەبارەی مێژوو و سەربردەی دروستبوونی



گەڕەکی تەیراوە:

ڕاستە بەردی بناغەی ئەم گەڕەکە لە لایەن تاهیر ئاغای ئیسماعیل ئاغا دانراوە، بەڵام ئەگەر کەمێک فراوانتر باسی لێوە بکەین، تاهیر ئاغا، کەوا بە(تەیرۆی سمایلاغا) بە ناوبانگ بووە، ماڵی لەسەر قەڵات بووە، لە سەرەتای ساڵانی بیست (١٩٢١)، خانوو دیوەخان و باغێکی گەورەو فراوانی لە نزیک مزگەوتی ئەوقافی ئێستا دروستکردووەو، ماڵی لەقەڵات هێناوەتە ئەوێ، ئیتر ئەم زەوی و زارەی ئەو گەڕەکەی ئێستا پێی دەڵێن تەیراوە زۆرینەی موڵکی سمایلاغای باوکی بووەو بە میرات بۆ تەیرۆ ئاغا ماوەتەوە، ئینجا ویستوویەتی ئاوەدانی بخاتە سەر ئەم زەوییانە، هەربۆیە فەرمانی داوە بۆ خەڵک کە ئەوەی دەیەوێ خانوو بۆ خۆی دروست بکات، ئەو ئامادەیە پارچە زەوی بەخۆڕایی بۆ دیاری بکات. ئیتر خەڵکێکی زۆر روویان تێکردووە و ئەمیش زەوی بەخۆڕایی داونەتێ و ئەوانیش خانوویان بەخشت و قوڕ و دار لەسەر دروستکردووە، بۆ دابینکردنی ئەمن و ئاسایشی گەڕەکیش تەیرۆ ئاغا نۆرەی بۆ دانیشتوانی گەڕەک داناوە، هەر شەوەو یەکێک پاسەوان بێت و بۆ خۆشی چەک و تفاقی بۆ دابینکردوون.

تەیراوە دوای ئەوەی ئاوەدانی لێ پەیدا بووە، ئینجا تەیرۆی سمایلاغا دەستی کردووە بەفرۆشتنی زەوی بەپارە، ئەویش بەگوریس، جێی هەر گوریسێک زەوی بە٣ درهەم، واتە (١٥٠) فلس، پاشان کردوویەتییە مەتری بە (١) درهەم، واتە (٥٠) فلس. دیسانەوەش دەبێ ئەوە بگوترێ، وەنەبێ سەرجەم زەوییەکانی ئەو گەڕەکە بە تەنها موڵکی تاهیر ئاغا بووبێ، بەڵکو پیاوێکی تریش هەبووە بەناوی

(حاجی مەمەند هەولێری) ئەویش زەوی و زارێکی زۆری بەدیوی ئەم دیوی مەخفەری تەیراوە بۆ لای قــەزا هەبووەو ئەویش دەســتی کــردووە بە فــرۆشتن و ئاوەدانکردنەوەی گەڕەکەکە، بەڵام چونکە دوا بەدوای تەیرۆ ئاغــا بووە، هەربۆیە ناوی تێکڕای گەڕەکەکە هەر بەناوی گەڕەکی تەیراوە بڵاو بۆوەو ناوەکە سەری گرت.



حاجی تاهیر ئاغای ئیسماعیل ئاغا

## پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دانیشتوانی تەیراوە

تەیراوە لەرووی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییەوە، پێکهاتەیەکی تێکەڵاوی جیا جیا لە خەڵکی گوندەکانی دەوروبەری شاری هەولێر، لە باکوور و رۆژئاواو هەندێکی لە رۆژهەڵاتی گوندانی شارەکەوە هاتوون، واتە گوندی جیا جیا و دەڤەری جیا جیا و خێڵ و عەشیرەتی جیاوازەوە هاتوون و لەم گەڕەکە نیشتەجێ بوون، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە چونکە ئەم خەڵکە کلتوور و فەرهەنگێکی هاوبەشیان هەبووەو لە رووی داب و نەریتەوە جیاوازییەکی کەمیان هەبووە سەرچاوەی سرووتی هەر هەموویان دابی رەسەنی کورد و کوردەواری بووە، بۆیە لەماوەیەکی کەمدا گونجان و تەبایی دروست بووەو لەگەڵ یەکتردا راهاتوون.

ئەوەی من لەو سەردەم هەستم پێ کرد پەیوەندی و هاموشۆی نێوان خەڵکەکە زۆر گەرم و گوڕ و پەیوەندییەکی خزمانە پیادە دەکرا.. لە راستیشدا خەڵکەکە لەگەڵ یەکتردا هاوکار و هاوخەمی یەکتر بوون و پەیوەندییەکان سادەو پاک و راستگۆیی تێدا بەدی دەکرا و لە خۆش و ناخۆشیدا بەهاناو بانگهێشتی یەکتر دەهاتن.

کاتێ لەکۆڵانێک یەکێک مردوویێکی هەبووایە، ئەوا چەندین کۆڵان لەم دیو و ئەم دیو ئەو رۆژە نەدەچوونە سەر کار و هەموو پێکەوە لە مەراسیمی چوونە سەرقەبران و قەبر هەڵکەندن و ناشتنی تەرمەکەو پاشان هەرسێ رۆژەی پرسەکە بەگەرمی بەشدارییان دەکرد و لەم چەند رۆژەشدا زۆر بەدەگمەن ماڵی خاوەن پرسە، چێشت و نانیان ئامادە دەکرد! بەڵکو هەر رۆژەی چەند ماڵێک ئەرکی ئامادەکردنی نان خواردنیانە دەگرتە ئەستۆی خۆیان.

هەروەها لەکاتی نەخۆشی و نەبوونی و ناگوزووری بە پیل یەکترییەوە دەچوون و کۆمەگی یەکتریان دەکرد، بۆ نموونە، ئەم گەڕەکە هیچ خزمەتگوزارییەکی ئەوتۆی شارەوانی بۆ دابین نەکرابوو، بۆیە زۆربەی زستانان لافاوی گەورەو ماڵوێرانکەری لێدەکەوتەوە، کە هەندێ جار دەبووە هۆی رووخان و وێرانکردنی چەند ماڵێک، زەرەر و زیانی زۆری لێ دەکەوتەوە، لەم کاتانە هەر دانیشتوانی گەڕەک لە نێوان خۆیاندا بەهانای ماڵە رووخاوەکان دەچوون، لە رزگارکردن و ماڵ کۆکردنەوە و یارمەتیدان دریغییان نەدەکرد!؟

## باری هۆشیاری و رووناکبیری و هەستی نەتەوەیی لە تەیراوە

لە رووی هۆشیاری و هەستی نەتەوەیی ئەم گەڕەکە، دەتوانم بڵێم مەڵبەندێکی فراوانی رووناکبیری و نیشتیمانپەروەری بووە بۆ تێکڕای ئەم شارە. بەڵگەشم بۆ ئەم وتەیە، بوون و هەڵکەوتنی ئەو ژمارە زۆرەی کەسایەتی سیاسی و رووناکبیر و هونەرمەند و ئەدیب و نووسەرانەی کە ئەمڕۆ لە تێکڕای بوارەکانی ژیان جێ پەنجەیان دیارەو هەمیشە رۆڵی دیار و کەم وێنەیان هەبووە لە کاروانی پێشکەوتنی خەبات و رەوتی هونەر و رۆشنبیری کوردی شارەکە و سەراپای کوردستان، کە بەردەوام لەخزمەت و پێشڤەچوون دانەبڕاون و لیستێکی ئێجگار گەورەی قوربانی و شەهیدیان لە پێناو خاک و نیشتیمان پێشکەش کردووە کە ناکرێ لێرە ئەم هەموو ناوانە بخرێنە روو.

هەندێک لەوانە: هونەرمەند ئازاد کەریم، خاوەنی گۆرانی پڕ لەسۆزی تەلەفزیۆنی کەرکووک بەناوی (عەزیزم بەیانی کە گوڵ عەترێ دەرێژێ - کە بولبول دەناڵێ، سۆفی دێنە نوێژێ)ی ماملێی زیندوو زیندووتر کردبۆوە، بە داخەوە هەر بەگەنجی جوانەمەرگ بوو.

- سلێمان خالید: خۆشنووسی بەتواناو دەست ڕەنگین.
- عومەر ناسنگەر: شاعیرێکی دڵپاک و هەژاریەروەر لە حەفتاکان دیوانێکی بەناوی (نەوەی هەژار) بەچاپ گەیاند.

- نەجات عەساف: هونەرمەندی مۆسیقی- ئالەتی كەمانچە.
- ئەحمەد عەبدوڵڵا: نووسەری مافناس
- عەبدولسەلام دەشتی: خوالێخۆشبوو (رووناكبیر و دەست ڕەنگین لە بواری میكانیك و كارەباییات و كاری ئیزگەو رادیۆ.
- رەمەزان سەید ئەحمەد: ژەنیاری ساز و گۆرانیبێژ- برای حەمەدێی شاعیری میللی و نوكتە بازی تەیراوە.
- ئەكرەم خۆشناو: هونەرمەندی گۆرانیبێژی دەنگ خۆش بە تایبەت لەگۆرانییە فۆلكلۆرییەكان.

هەروەها هەندێ لەوانەی دەنگی شیعری باش بوون لەو سەردەم، بەڵام نازانم بۆ سڵیان لە بڵاو كردنەوە دەكردەوەو گوم بوون، لەوانە:

مامۆستا مەلا نەجمەدین: دەستی نووسینی شیعری هەبوو، بەتایبەت لە چوارینە نووسیندا و پیاوێكی زۆر قسە خۆش و نوكتەباز و خۆش مەحزەر بوو، یادی بەخێر؟

عەلی حەلاق و محەمەد حەلاق، ئەمانیش شیعریان دەنووسی، بەڵام بڵاویان نەدەكردەوە و پاشان بێدەنگ بوون. ئەوانەش كە ڕۆڵی دیار و هەڵوێستی نیشتیمانی بەرچاویان هەبوو، بریتی بوون لە كۆمەڵێ كەسایەتی سیاسی تێكۆشەر و رووناكبیری هەڵكەوتووی گەڕەكەكە، كە ئەو بەڕێزانە لە پێش نەوەكانی ئێمە بوون و رابەر و رێ نیشاندەری نەوەكانی دوای خۆیان بوون، لەوانە: مامۆستا قادر كەریم، خالید عوسمان (شەهید)، هادی عەزیز، مام قانیع، محەمەد دەشتی، فازڵ ئەحمەد، نووری ئیسماعیل (شەهید)، حەمید سەید برایم، حەمید مەلا ئەحمەد، رەسول مەحمود، ئەحمەد فەقێ وسو، تەها فەقێ وسو(شەهید)، سەباح ئەسعەد،

هەروەها نەوەیەكیش لە پێش ئەوان لە بەڕێزان: ئەحمەد بێكەس، حەمە سوور، مەلا سابیر، خەلیل كادیر، وەستا قادر ئەستی، مامۆستا جەلال زراری و زۆرانی تر بە داوای لێبووردنەوە لەوانەی كە ناویان لەبیر كراوەو لێرە تۆمار نەكراوە.

ئیتر ئەو گەنج و لاوە بزێو و چالاكانەی نەوەكانی ئێمەش لە ژێر ڕێنمایی و ڕێبەری ئەو مامۆستا بەڕێزانە دڵسۆزانە كارمان دەكرد و خۆشمان زۆر بە بەختەوەر دەزانی. بە پێشەكی دیسان داوای لێبووردن لەو بەڕێزانەی كە لێرە ناویان لە بیر دەكرێ.

كەریم دەشتی، عەبدولغەنی كاكۆ، عەبدولمۆئمن دەشتی، ئازاد عەبدولواحید، كەریم سۆفی، مەحمود ئەحمەد (مەمەد)، رەشاد حەسەن، قادر جەمیل، مەلا بەكر محەمەد حەلاق، حەسەن بۆتانی، ئازاد كۆیی، بەكر نانەكەلی، عەبدولواحید یوسف (یادی بەخێر)، رەمەزان حەمەد، مەجید نووری، فارووقە سوور، عەبدولڕەزاق مەولوود، دارا بەحری، محەمەد گەردی..هتد.

كە هەندێكمان لەسێ ڕێكخراو كارمان دەكرد، كە بریتی بوون لە: (ی.ق.ك) (ی.ل.ك)و ریزەكانی (حیزب) زۆریش لەم هەڤاڵانە لە ساڵی (١٩٧٢) بە نهێنی بەشداریان كرد لە ئۆردوگای مەشقی قوتابیان. بە دزی رژێم لە گوندی گەرۆتەو لە دوێ هەروەها لەناوچەی باڵەكایەتیش كە تێیدا هەموو جۆرە مەشقێكی چەك و تەقەمەنی و ژیانی پێشمەرگایەتی بەرجەستە دەكراو یەكێ لە خاڵەكان دەبوایە رۆژانە نزیكەی (٨-٩) كاتژمێر بە پێیا بۆ گوندەكان برۆیشتینایەو لەوێ كاری هەرەوەزی و هۆشیاری سیاسی و كۆمەڵایەتی و تەندروستیمان بۆ خەڵكی گوندەكان باسبكردایە.

## سەرچاوەكانی ئاوی خواردنەوە لەم گەڕەكە

چونكە تۆڕی ئاو لەلایەن شارەوانییەوە نەكێشرابوو بۆ ئەم گەڕەكە، بۆیە خەڵكی گەڕەك، بەتایبەتی ئەوانەی كەمێك توانایان هەبوو لە هەر كۆڵانەو ماڵێك یان دوان لە حەوشەی ماڵەكانیان بیرێكی ئاویان تێدا هەڵكەندبوو، كە بەهۆی چەرخی دار و كندرو دەولكی لاستیك ئاویان هەڵدەهێنجا و بۆ خواردنەوە و ئیش و كار و بەقات و قرِی بەكاریان دێنا، بەڵام لەهەمووان بەناوبانگتر بیری گومبەتی شێخ مەلا رەشید بوو، كە ئاوێكی باشی هەبوو، حەوزێكی گەورەش بەتەنیشتییەوە بوو، چەندین ماڵیش لە گەڕەك بیری ئاویان هەبوو، خەڵكەكە بێ جیاوازی دەچوونە ماڵان بۆ ئاو هێنان لەو بیرانە، شوێنی یەكێ لەو بیرانە ئێستاش لەحەوشەی ماڵەكەی ئێمە لە تەیراوە هەرماوە!!

## یاریگاو مەلەوانگەی منداڵانی تەیراوە

**١- گلكەند:** كەند و كەنداوێكی گەورەو قووڵی ئەو بەری گۆڕستانی شێخ مەلا رەشید بوو، دەوروبەرەكەی

شوێنی تۆپی پێ و کەلایەنێ و ناو کەندە گەورەکەشی زستانان ئاوێکی زۆری تێدا کۆ دەبۆوە هاوینان خەڵکی گەڕەک بە مێرمنداڵ و گەورەوە مەلەیان تێدا دەکرد.

**٢- گۆڕەپانی سەرگردی:** ئەمەش بەدیوی رۆژ ئاوای مزگەوتی شێخ مەلا رەشید بوو، کە ئێستا بازاڕی تەرەفرۆش و پیرەژنانە، ئەمە یاریگای جیا جیای منداڵانی گەڕەک بوو لە رۆژ و شەواندا.

**٣- مەلەوانگەی کونە گورگ:** ئەو شوێنە لە باکووری هەولێر، نزیکەی (٢کم) لە تەیراوە دوور بوو ئێمەی منداڵ و مێرمنداڵانی گەڕەک بە هەنجەتی خوێندن و سەعیکردن روخسەتمان لەماڵەوە وەردەگرت و لەوێش یاری تۆپانێ و غارغارێنمان دەکرد، هەروەها کەندەڵانێکی گەورەی پڕئاوی بارانی زستانی لێ بوو، تێر و پڕ مەلەمان تێدا دەکرد، پاشان پشوویەک کێلەبەردانێ و کەمێکیش خوێندن بەڕێگا و ڕێگا ئینجا لە درەنگی ئێواران روومان لە شار دەکردەوە.

### بازاڕ و چایخانەکانی تەیراوە

خاسیەت و تایبەتمەندی بازاڕی بچکۆلانەی ئەم گەڕەکە لەوەدا بوو، سەرەڕای بچووکی و سادەیی، هەموو شتێکی لەپێداویستی دانیشتوانەکەی لەکەلوپەلی خۆراک و تەرەو میوەو دوکانی پیشە دەستییەکان و قەساب و دانەوێڵەو سووتەمەنی جۆراو جۆری لێ دەست دەکەوت.

### دوکانە بەناوبانگەکانی تەیراوە

دوکانەکانی ماڵی حاجی شەلە: لە بەرامبەر تەجنیدی ئەم دواییە، ئەمە دوو دووکانی گەورەی قەرەباڵغ لە هەموو جۆرە کەلوپەلەکانی خواردەمەنی و زەخیرەو چەرەزات و کەلوپەلی ناوماڵ و شیرنەمەنی هەبوو، دوو سێ برا بوون بە بەردەوامی خەریک بوون، سیفەتی رەسەنی ئەم برایانە ئەوەبوو- هەموو کەلوپەلەکانیان نرخی دیار بوو، واتا مامەڵەیان یەک مامەڵە بوو، تا بڵێی سەر راست و دۆغری بوون، لەوەش سەیرتر کاتێ شتێکیان بەتەرازوو بکێشابایە دوور لەئێستا..! هەردوو تای تەرازووەکەیان بە پف پاک دەکردەوە و بەرامبەر یەکتر میزانیان دەکرد، ئینجا شتەکەیان پێدەکێشا..!؟

دووکانی حاجی هاشم بەزاز و عەتار: ئەمەش هەر لەڕیزی ئەوان بوو. دووکانێکی تابلێی قەرەباڵغ و بە هەرمێن بوو هەموو کەلوپەلێکی عەتاری پێداویستی ناوماڵی لێ بەدەست دەکەوت.

دووکانەکانی حاجی ئەنوەر و مەلا جەعفەر: دووکانەکانی ئەم دوو برایە زۆر بەهەرمێن و قەرەباڵغ بوو راستی ئەم دوکانە سەری هار و ماری لێ بەدەست دەکەوت.

دووکانی مام حاجی عەزیز: سەری کۆڵانی تەکیە، وەستایەکی دەست رەنگینی لەحیم و دروستکردنی چراو چرادان و کەلوپەلی پێویستی زستانەو سووتەمەنی، کە پاشان بووە یەکەم وەستای دامەزراندنی ئاش. لە ناوەوەو دەرەوەی شار دەهاتنە دوای بۆ دامەزراندن و چاککردنەوەی ئاش.

دووکانەکانی مام عەزیزی گەنم فرۆش و مام حوسێنی ماست فرۆش و مام عەباس گەردی و مەلا عوسمان و چەندانی تر.

دووکانەکانی تەرەو میوە فرۆش: مام خدر، مام رەمەزان، مام عەلی جوکل، محەمەد حوسێن و برهان و کەمال، رەفیق و خالید.

### چایخانەکانی ئەم گەڕەکە

چایخانەی مەلا یاسین، لەسەر شەقامی (٣٠) مەتری بەرامبەر تەجنیدی ئەم دواییە، ئەم چایخانەیە شوێنی تایبەتی دانیشتنی وەستا و وەستا کاری بیناسازی و کرێکارەکان بوو، کە لەراستیدا ئەو کات تەیراوە وەستای کاری بیناسازی زۆر دەستڕەنگینی لێ هەڵکەوتبوو، نەک هەر لەشاری هەولێر، بەڵکو لە شارۆچکەو شارە دوور و گەورەکانی عێراق دەهاتنە دوایان و بەدوای ناوبانگیان دەکەوتن.

**لەوانە وەستایانی دیوار:** وەستا سابیر حەمەد بەسێ، وەستا عەولا حەمەد ئەسمەر، وەستا یوسف حەسەن، وەستا جەعفەر، وەستا زرار، وەستا عەزیز خۆشناو، وەستا شێرۆ، وەستا حەسەن ئەستی، وەستا ئەحمەد و وەستا شەریف..

**وەستایانی سپیکار:** وەستا مەلا سابیر، وەستا محەمەد، وەستا سەلاح، وەستا حەسەن زراری، وەستا نووری، وەستا ئیسماعیل، وەستا حەسەن شوارب، وەستا مەلا زراری و وەستا شاکر، وەستا جەلالە سۆر..

**وەستایانی لەبغ:** وەستا عەبدوڵلا نووری، وەستا عەبدوڵلا حەمەد ئەمین، وەستا جەلالە قەڵەو تا بڵێی ناودار بوون.

**چایخانەی تاهیر:** لە بەرامبەر ئەو چایخانەیە بوو ئەم شوێنە زیاتر خەڵکی جۆراو جۆر بەتایبەتی پێشمەرگە- لە حەفتاکان و گەنج و لاو لێی دادەنیشتن، بەردەوام شریتی بەکردی گەورەی حەسەن حەیران و عوسمان حەیران و محەمەد عارف جزیری و تاهیر تۆفیق و حەسەن زیرەک نرکەی دەهات.

**چایخانەی مام بایز:** ئەم چایخانەیە لەسەری کۆڵانی تەکیەی کاکی هیران بوو، زیاتر پیرو جوامێری گەڕەک لێی دادەنیشتن و خەریکی قسەو باس و یاری و دامەکردن بوون، زۆر جاران لەمانگی رەمەزان تا پارشیوان چایخانەی مام بایز کرابووەوە، بەم دواییەش چایخانەی مام عەبدوڵلا پیرە کرایەوە.

## گازینۆی زۆزان

لەخوار شەقامی ٣٠ مەتری رێگەی بازاڕ لە قوولایی خوار گەرماوی سەرچنار بوو، ئەمە بە چایخانەی ماڵی ئەحمەد ئاغای قەساب ناسرابوو. شوێنی یاری دۆمینەو تاوڵەو شوێنی پیاو ماقوڵانی گەڕەکی لای خوارەوەی کۆنە مەخفەری تەیراوە بوو. زۆر شەوان لەمانگی رەمەزان لەوێ یاری سینی سینیانێ دادەمەزرا تا پارشیوان نەدەبڕایەوە.

## تەکسی و شۆفێرەکانی تاکسی ئەم گەڕەکە

هەموو تەیراوە ئەم چوار تا پێنج تاکسییەیەی لێ بوو، ئەوانیش: مام بەحری ئۆتۆمبێلی شۆفرلێت، مام نووری، مام غەفور، عەدۆ دۆڵەنگێو، مام حاجی خالند، ئەمانە هەموویان سەیارەی دۆج و مۆدیل ١٩٥٥یان هەبوو. نرخی تاکسی داخیلی ٦ درهەم واتا (٣٠٠) فلس بوو، هەموو خەڵکی تەیراوە ئەمانەیان دەناسی.

## نانەوایی لە تەیراوە

دوو تا سێ نانەواخانە لەم گەڕەکە هەبوون، کە لەسەر دەستی سەمەد فرنچی و بنەماڵەکەیان وەکو وەستا رەحمان و کارەسول نانەواو پاشان وەستا محێدین ئیبراهیم و فرنی مام ئەسعەد و شێخ محەمەد و سەباح و هەمزە بوون.

## قوتابخانەکانی ئەو سەردەم

ئەوانەی من بیرم مابن، بریتی بوون لەم چەند قوتابخانەیە: قوتابخانەی هەولێر، زانین، مستەوفی، مەولەوی سەرەتایی کوڕان، ناوەندی برایی، جمهوری کوڕان، ئەیوبییە و خەنسای سەرەتایی کچان، ناوەندی سەڵاحەدینی کوڕان، دوا ناوەندی هەولێری کوڕان.

## گەرماوەکانی گەڕەک

سەرەتا تەنیا گەرماوی کانی هەبوو، لە نزیک نەقلیاتی ئێستای شەقلاوە، پاشان گەرماوی سەرچنار و سیروان و خۆشناو و نەورۆز و موختار دروستکران.

## حەسارە بەناوبانگەکانی تەیراوە

ئەو سەردەم خەڵکی خوا پێداوی گەڕەکی تەیراوە، چەندین حەساریان دروستکردبوو کە هەریەکەو پێکهاتبوو لە چەندین ژووری دەوران دەور کە حەوشێکی گەورە لە ناوەڕاستی هەموو ماڵەکان بوو، زۆربەی حەسارەکانیش بیری ئاوی خۆیان هەبوو، کەچەندین ماڵە هەژار و لێقەوماویان گرتبووە خۆیان، لەبەرامبەر کرێی مانگانەیەکی کە لە نیو دینار تا دینارو نیوێک رەتی نەدەکرد و هەریەک لەم حەسارانە نیمچە ئیمپراتۆریەتێکی سەربەخۆ بوون.

لەوانە: حەساری ماڵی شێخ مەلا رەشید، حەساری فەیسەڵە کەر، حەساری ئەحمەد ئاغای قەساب، حەساریساڵحە فەندی، حەساری عەزیز بەسێ، حەساری مەلا فەندی و..هتد.

## شێتۆکە لە بیر کراوەکان

ئەوانە پێیان دەگوتن شێت، بەڵام هەندێ سیفاتی ساکار و بێ خەم و خەیاڵیان لێ بووبووە خوو، ئیتر بەو رازە هەرخۆیان گەورەی خۆیان بوون. لەوانە: حەمە رەزا، ئەم پیاوە داماوە هەر چەندە لە بنەڕەتدا لێقەوماوی کوردستانی رۆژهەڵات بوو، پێشمەرگەی کۆماری مهاباد بوو، لەدوای تێکچوونی ئەم کۆمارە ساوایە، لە(١٩٤٧)ەوە پەراگەندە و ئاوارەی ئەو دیوە بوو، لەماڵی خێرومەندێک لەوبەری شەقامی (٦٠) مەتری گیرسابۆوە، هەمیشە وێنەیەکی شەهید قازی محەممەدی لەگیرفان بوو،

کە خۆشی لەگەڵی وەستا بوو. هەرکاتەی دەری دەهێنا لەخۆیەوە دەستی بەقسان دەکرد و ئینجا تێر تێر دەگریا و پاشان لەگیرفانی دەنایەوە، خۆی ناوی حەمە ڕەزا نەبوو، بەڵام هەرکاتێک ناوی (حەمە ڕەزایان بهێنایە، تووڕە دەبوو. جوێنی دەداو هەندێ جاریش قسەی زۆر ناڕێکی دەکرد، چونکە بەلای ئەو حەمە ڕەزا ناوێکی شوومی کورد کوژ بوو. لە (حەمە ڕەزا شا)ی ئێرانییەوە داخ لەدڵ و قین بوو. بەداخەوە لەساڵی ١٩٧٤ کاتێ لەگەڵ ڕژێم بۆوە شەڕ، شەوێک لەکاتی پەڕینەوەی لە شەقامی ٦٠ مەتری جەلادەکانی بەعس دەنگیاندابوو، ئەویش وشەیەک زمانی لە عەرەبی نەدەزانی، ئەوانیش بێ ڕەحمانە دەستدرێژییان لێ کرد و شەهیدیان کرد.


بەکر بەگ (بەرخۆکە)

## بەکر بەگ (بەرخۆکە)

بەکر بەگ پیاوێکی خڕکەڵەی کورتە باڵا بوو. ئەگەر زەوقی هەبوایە و تووڕەیان نەکردایە، مەزاقی زۆر خۆش بوو. شتێکت، پارە یان جگەرە پێ دابا، ئەوا دادەنیشت و تەزبیحێکی قل گەورەی پڕتەقاڵی لە گیرفان بوو، دەری دەهێناو زۆر بەخێرایی ناوی یەکە یەکەی شێتەکانی شاری هەولێری دەژمارد و بۆ هەرناوێکیش قلێکی لە تەزبیحەکەی ئاوا دەکرد. ئینجا زۆر کەس بۆ مەزاق (١٠) فلسی دەدایێ و ناوی هاوڕێیەکی خۆی بە شێت لای تۆمار دەکرد، ئەویش زۆر بەگەرمی ناوەکەی لەگەڵ لیستی شێتەکان لەهەموو شوێنێک دەگوتەوە و دەیگوت ئەمە شێتی تازەیە، ئینجا دوا ناویش قلێکی ئاوا دەکرد و دەیگوت ئەوەش بەخۆم! ئینجا بۆ ئەوەی ئەو ناوە ڕەش بکاتەوە من خۆم ئەم دیوە دەبوایە خاوەنی ناوەکە بهاتایە لای و نیو درهەم واتە (٢٥) فلسی پێ بدایە! ئینجا ناوەکەی ڕەش دەکردەوە، ئەگەر نا هەموو خەڵکی لەو ناوە نوێیە ئاگادار دەکردەوە! لە هەر ماڵێکیش قەرەباڵغی هەبوایە لای دەدا بۆ خواردن، لای ئەو گرنگ نەبوو لەو ماڵە شینە یان شایی! گرنگ ئەوەبوو خواردن هەیە! بەڵا داخەوە ئەو مرۆڤە سادەو دڵپاکەش بەدەستی خۆ فرۆش و دوژمنانی گەل سەربڕاو شەهیدیان کرد و وتیان سەرەکەیان بردووە بۆ دائیرەی ئەمنی هەولێر بەناوی سەری پێشمەرگەوە تەسلیمیان کرد.

## جومعە

خاڵە جومعە ئێستاش هەر لەتەیراوەیەو ماوە، پیاوێکی باریکەڵەی زۆر بێ دار و باربوو، هەرکاتێ تووڕەی بکەن بەردێک دەگرێتە دەست و ڕێگا لەخەڵک دەگرێ و لەناوەڕاستی شەقام دەچەقێ، بەڵام بەردەکەش ناوەشێنێ هەرکاتێ گیرفانیشی بەتاڵ بێت لە ناوەڕاستی شەقام دەچەقێ و خەڵکیش دەیناسن و شتێکی پێ دەدەن بۆ خۆی دەڕوات.

## ڕەحمان زراری

ئەم پیاوە لەگەڕەکی تەیراوە جیا نەدەبۆوە، هەمیشە لە ڕێگای گەڕەک و شەقامی ٣٠ مەتری، لە هاتوچۆدا بوو. لەبەر خۆیەوە دەڕۆیشت و دەیگوت من چوار ژنم هەیە، کە لە ڕاستیدا لە ژیانی ژنی نەهێنابوو، ئینجا مێرمنداڵانی گەڕەک بانگیان دەکرد، ڕەحمان لە چوار ژنەکەت دووی من دووی تۆ! ئیتر ڕەحمان بەتەواوی شێت دەبوو، دەستی دەدا خڕەکە بەردان و بە توندی دەیهاوێشتە منداڵان، گەلێ جاران لەدەرگای ماڵانی دەدا، ئینجا خۆیشی بەخاوەنی گوندی (قەرە قاجین)ی ناحیەی ئێستای زرارەتی دەزانی، هەموو جارێ هەر لەخۆیەوە دەیگوت خەڵکی و دانیشتوانی ئەو گوندە ئەوەی بەکرمانج لەو گوندەی من دادەنیشێ با دانیشێ ئەگەر نا قبوڵم نییەو با بارکا.!

## مزگەوت و مەدرەسەکانی تەیراوە

### مزگەوت و گومبەتی شێخ مەلا ڕەشید

مزگەوت کە شوێنی نوێژ و وتاری ئاینی و لە هەمان کات مەدرەسەیەکی ئاینی ئاوەدان بوو، کە لە لایەن مەلا خدری شەمامەری بەڕێوە دەچوو، لەڕاستیدا مامۆستا مەلا خدر پیاوێکی بەویقار و زانایەکی ئاینی لێوەشاوە بوو، بەردەوام

کۆمەڵێ فەقێی هەبوو، کە لەسەر دەستی مامۆستا ئیجازەی مەلایەتییان وەردەگرت و دەرۆیشتن، خوتبەکانی مامۆستا لەو سەردەم هەمیشە باسی لە کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئاینییەکان دەکردو زۆر بەتەنگ کێشە کۆمەلایەتییەکانی خەلکەوە دەهات و ئامۆژگاری پێویستی پێشکەش بە خەڵکەکە دەکرد.

## مزگەوتی کوێتی

لە نزیک نەقلیاتی ئێستای شەقلاوەیە، ئەویش هەمیشە فەقێ و قوتابی مەدرەسەی ئاینی تێدا بووە. (ئێستا کە ساڵی (٢٠٠٧)ە خەریکن تێکی دەدەن و بە شێوەیەکی تر چاکی دەکەنەوە).

## مزگەوتی حاجی عەبدوڵلا

بە هەمان شێوە مەدرەسەی ئاینیش بوو، پیاوێکی دەنگ خۆش بەناوی حاجی عەبدوڵلا لە مزگەوت بانگی دەداو لە پارشێوی رەمەزانانیش بە ئاوازێکی خۆشەوە شیعرەکانی (صافی) کاکی هیرانی دەخوێندەوە.

## ئاشەکان

ئاشی حاجی مستەفا لەسەر شەست مەتری، نزیک فولکەی عینکاوە، پاشان ئاشێکی بەفریشی بەتەنیشتەوە دانا، ئاشی ماڵی ئەحمەد چەلەبی ئەویش لەنزیک شەقامی (٦٠) مەتری بوو، لەم ساڵانەی دوایی هیچیان نەمان و شوێنەکانیان بوون بە کۆشک و باڵەخانەو ریزە دووکان.

## گومبەت و مەزارگەی شێخ مەلا رەشید و کۆنگرەی پیران لە تەیراوە

گومبەتێکی گەورەی لە قوڕ دروستکراو لە ناوەڕاستی گۆڕستان کە مەرقەدی شێخ مەلا رەشیدی تێدا بوو، هەرچوار دەوری بەدرێژی و پانتاییەکی زۆر پڕ بوو لە دار و بار و قامیشەلان، دارە گەورەکان کە دار توو بوون، پەل و پۆی زۆریان هاویشتبوو. هاوینان هەرچوار دەوری گومبەت بە رووبەرێکی زۆر سێبەر و فێنکایی دوور لەخۆرەتاو بوون. پیاوێکی بەژن مامناوەندی تێکسمراوی بەتەمەنی لێ بوو، شەو و رۆژ لەو گومبەتە خزمەتی دەکرد، ناوی مام سەعید بوو پێیان دەگوت (مام مجێور).. ژنان، کچان زۆر دەهاتنە زیارەتی ئەو مەرقەدە بۆ مراز و نیاز و چارەسەری نەخۆشی، کە دەردەچوون شتێکیان لە پارە بۆ مام مجێور جێ دەهێشت، ئەویش لەسەر داوای خانەوادەی شێخ بەشێک لەو پارەیەی بە قاوەو شەکر و چا دەدا و رۆژانە بۆ پیرەمێرد و پیاوانی بەتەمەنی میوانی ئەم گومبەتە قاوەو چایەی لێ دەناو دەرخواردی دەدان.

ئەو ئاپۆڕەی پیرە پیاوانی گەڕەکی تەیراوە لە بەیانییەوە تا ئێوارە ئەم گومبەتەیان چۆڵ نەدەکرد و ناومان نابوون کۆنگرەی ئەنجومەنی پیران: چونکە ئێمەش مێرمنداڵانی گەڕەک دوورو نزیک دەچووینە لایان و ئەوانیش هەریەکەو بەلایەکدا پاڵی لێ دەداوەو بە نۆرە هەریەکەو سەر و سەربردەو سوالفەی سەردەمی لاوی و گرانی و سەفەر بەرلک و سەردەمی عوسمانیان و ئینگلیزیان بۆ مەجلیس دەگێڕایەوە و قسەکانیان تابڵێی خۆش و بەلەزەت بوون! بەداخەوە ئەوانەی ئەوسەردەم قسە خۆش و سەربوردە مێژوییەکانیان دەگێڕایەوە، هەر لەسەردەمی سمکۆی شکاک و قازی محەمەد و شێخ مەحمود و پاشای گەورەو شێخ عوبەیدوڵلای نەهری و زۆرانی تر لەگەڵ گێڕانەوە ئاه و هەناسەی حەسرەتباریشیان لەگەڵدا هەڵدەکێشا، ئێستاکە هیچیان نەماون و بە قەولی کەرکوکیان گوتەنی: گۆڕەکانیان غەریقی رەحمەت بێ و رۆحیان شاد، هەندێ جاریش بەنوکتەو قسەی سەیر و سەمەرە یەکتریان توورە دەکرد.!

بەڵام دوای ماوەیەکی کەم ئاشت دەبوونەوە، جار جارەش باسیان لە سیاسەت و رابردوو و داهاتووی نەتەوەو شۆڕشی کورد دەکرد و بە دیدو بۆچوونی خۆشیان رەخنەو گلەییان لە سەرکردەکانی کورد دەکرد، هەندێ جاریش باسیان لە ئەخباری رادیۆی جوودەگرت و زۆر جاران لەبەر ناشارەزاییان لە زمانی عەرەبی هەواڵەکانی رادیۆی جوو، رادیۆی ئینگلیزیان بەهەڵەو مەیلی خۆیان لێک دەدایەوە، بەڵام ئێمە ئەگەر شتێکمان لێ بزانیایە، نەماندەوێرا تێکەڵی قسان ببین، زۆرجاریش مێرمنداڵانی گەڕەک بە دزییەوە بەدار لاستیک و بەرد هاوێشتن خەریکی کێشکە کوشتن و توو داتەکاندن لە پەناوە دەزەمان دەکرد، کە من و کەریم دەشتی و سلێمان خالیدیش لەم کارانە بێ بەش نەبووین، بەڵام ئەوانەی زۆر بزێو بوون، یاسینی مام وەلی، تەحسین، ئەنوەری برام، عەبدولموئمین، عەبدلخالق

عەبدوڵڵای حاجی سۆر و قادری وەستا ئەحمەد و زۆرانی تر، یاسین چونکە لەهەمووانمان بزێوتر و باخۆشتر بوو مام سەعیدی مجێور هەر بەتەنیا ناوی ئەوی دەزانی!، بۆیە هەرکاتێک بەردێک بکەوتایە ناو گومبەت، مام مجێور بەهەموو هێزی هاواری دەکرد،

کوڕە یاسینۆک. ئەوە لۆ وەدەکەی. هەی بەبەر زریکەی بەری بەیانی کەوی! هەی توخمە سەگ.! راوەستە بزانە چیت لێدەکەم. ؟

## گەڕەکی سێتاقان

### کێ سێتاقەکەی سێتاقانی دروستکردووە؟

سەرەتا دەبێ ئەوە بڵێین: کە "سەعدوڵڵا" لە قەلاتی هەولێر لە نزیک تەکیە ژیاوە. سەعیدی کوڕی لە قەلاتێ لە دایک بووە. "سەعیدی کوڕی سەعدوڵڵا" لە بنچینەدا خۆشناوی کۆڕێنە. "سەعید"چوار کوڕی هەبووە، ئەمانەن: برایم، مەحمود، حەمەد، سالح.

ئەم "سێ تاقە" بەسەرپەرشتی برایمی سەعیدی و خزمەکانی دروستکراوە. ئەوانەی سەرپەرشتی دروستکردنی "سێ تاقە"کەیان بەم ئەندازە جوانە کردووە، ئەمانەن: برایمی سەعیدی "خۆی"، مەحمودی سەعیدی و برایەکانی تری، لەگەڵ خوشکەزاکانی وەک: حاجی حەمەد ئەمین قەساب و حاجی عەبدوڵڵای حەمامچی.

واش مەزندە دەکرێ، ئەم سێ تاقە، لەساڵی (١٩٣٢- ١٩٣٤ ز) لەم ماوەیەدا دروستکرابێ. گەوا سێتاقان لە چلەکان هەبووە. بەلام شێوەی گوندی وەرگرتووە. هەروەک گوندێک خانووەکانی لە خشت و قوڕ دروست کراوە. بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی بە زۆری باخچەیان هەبووە و فەلاحەتیان کردووە.

* * *

**زەوی سێتاقان:** خاوەن زەوییەکانی سێتاقان، "سەعیدی سەعدوڵڵاو شێخ رەئوف بەرزنجییە"، "مام سەعید" هەتا ئێستاش پارچە زەوییەکی هەرماوە بەناوی منداڵەکانی "ئیبراهیمی سەعیدی"یە کە پێی دەڵێن: خاتووناوە، کەوتۆتە پشت شەقامی "١٠٠" مەتری.

مامۆستا "خەلیل فەتاح ئەوەی "برایمی سەعیدی" دەڵێ: لە ساڵی ١٩٥٩دا عاردەکانی سێتاقان بە فەرمی



لەلایەن میرییەوە "ئیفراز" کراو باشترین پارچە زەوی لەم کاتەدا فرۆشرا، بەرزترین نرخی گەیشتە دینارێک، واتە یەک مەتر بە یەک دینار بووە.. ئێستا بووەتە کۆشک و باڵە خانە لەنزیک شەقامی "٣٠"مەتری.

* * *

سنووری سێتاقان کەوتۆتە نێوان شەقامی (٦٠)مەتریو شەقامی (٤٠) مەتری نزیک نەخۆشخانەی رزگاری. شەقامی (٦٠) مەتری کە لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکان دروست کراوە، سێتاقانی کردۆتە دووبەش سێتاقانی خوارێ (خواروو) و سێتاقانی (سەروو).

باداوە کەوتۆتە رۆژ هەلاتی سێتاقان، بەلام لە رۆژ ئاوای گەڕەکی بێرێژییە (ئەویش بەشێکە لە خانەقا).

### ناوی سێتاقان لەچییەوە هاتووە؟!

هەروەک دیارە، وشەی سێتاقان وشەیەکی لێکدراوە، پێک هاتووە لە دوو وشەی سادە (سێ + تاق) لەگەڵ پاشگری (ان) کە نیشانەی کۆیەو خراوەتە سەری و بووەتە (سێتاقان). تا بە مانای کەوانەیی نیوە بازنەیی دەرگا و پرد

ئەم ناوەش بۆ ئەو سێ تاقە دەگەڕێتەوە کە ئەو وەستایانەی هەولێر کە ویستوویانە ئاو لە کارێزەکانەوە بهێنن بۆ نێوەندی هەولێر. بێگومان ئەو شوێنەی سێ تاقاکەی لێ دروست کراوە، زەوییەکەی زۆر قووڵ و نەوی و نزم بووەو، شوێنەکەش نزیکە لە بەستی سەیداوە (بەستە گەوردکە)، بۆیە هەر ئاوێک ئاوی باران بێ یا ئاوی کارێز یەکسەر بۆ بەستەکە شۆڕدەبێتەوە. لە وێوەش بە نێوەندی هەردوو گۆڕستاندا تێدەپەڕێ. بۆیە بیریان لەوە کردۆتەوە بۆ

دروستکردنی سێ تاق، واتە سێ دینگە بەکەرپووچ و گەچ دروستکراو بە شێوەیەکی سێگۆشەیی پێک هێنراوە. دوو دینگە لەلای سەرەوە.لە تەنیشت یەکدی و دینگەی سێیەم لە خوارەوە. شێوەیەکی سێ گۆشەیی وەرگرتووە و بە جۆرێک لەسەر عاردەکە بەرز کراونەتەوە. هەرسێ تاقەکەش بەیەکدی بەستراونەتەوە. کۆلەکی بەسەر دادەهات. بە شێوەیەکی ئەندازەیی کارامە. ئاوەکە بەناو کۆلەکە شۆڕ دەبووەوە. ئاوەکەش لە کارێزی شێخ محەممەدەوە (ئێستا گۆڕستانێکی گەورەیە نزیک شەقامی (١٠٠) مەتری، دەهاتە خوارەوەو بەژێر (پردۆکە) ڕەت دەبوون کارێزەکەش نزیک بووە لە گۆڕی شێخ محەممەد، بۆیە بەکارێزی شێخ محەممەد بەناوبانگ بووە.

*** پردۆکە چییە؟!**

پردێکە سەری بەدار گیراوە. شوێنەکەی نزیک ئاشی شێخ محەممەدە، ئێستای (شەقامی ٦٠ مەتری). زۆربەی کاروانچییان لە ناوچەی خۆشناوەتی و دەوروبەردا بەسەر پردۆکە ڕەت دەبوون و دەپەڕینەوە. بەرینایی پردۆکە هێندەی دوو شەقاوی زەلامان دەبوو "ئاوەکەشی هێندەی ئاوی هێران دەبوو." هەروەها ولاغەکانیش لە ژێر پردۆکە ئاویان دەخواردەوە. ئاوەکە لە وێوە بە جۆگەلەی خۆی شۆڕ دەبۆوە و تا دەگەیشتە سەر سێ تاقەکەو لەوێوەش بەناو سێ تاقەکە ڕەت دەبوو. بەلای دەستە ڕاست دەڕۆیشت. تا دەگەیشتە (باغی عەتائوڵلاغای)و (شێخ ئەڵلا) لەوێ حەوز و تاتە نوێژێکی لێ دروست کرابوو، هەروەها گوزەبیان لێ چاندبوون لەوێوەش بەلای ڕاستی (باغی شار)دا تێ دەپەڕی و بۆ لای خانەی ولاغانی (حاجی ئەحمەد ئاغای هەولێری) بەرامبەر مزگەوتی ئاڵتی بەرماغ. هەروەها خەڵکی سێتاقان ئاوی خواردنەوەیان لە ژێر ئەم پردەوە دەهێنا. چونکە لەو ڕاستی ڕا پاکژ بوون سەرینگانێتی شار بوو. جگە لەمەش باغی (عەتائوڵلاغای هەولێریش) هەر بەم ئاوەوە ئاو دراوە. هەروەها تووتنێکی زۆریش لەبەر ئەو کراوە. جگە لەمەش لەم لاو لەولای جۆگاوەکە سەوزە و توور و سڵق و پیاز و خاس و کەوەرو کەرەوز و تەرەتوولەی لێ چاندراوە. تا کۆتایی شەستەکانیش پاشماوەی سێ تاقەکە هەر مابوو. ئینجا لەوێندەر سەوزەی لێ دەچێندرا. ئێستاکەش لە شوێنی (سێ تاقەکە) دار فرۆش و ئەنگەلاین و جەمەلۆن فرۆش و ئاسنگەرەکانی لێیە.

**مێژووی دروستکردنی سێتاقان**

- بێگومان مێژووی دروستکردنی سێتاقان پەیوەستە بەدروستکردنی (سێ تاقە)کە، کە شوێنەکەی لە تەنیشت گومرگی کۆنە. لەوانەیە ئەم سێ تاقە لە کۆتایی سییەکان یان سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەم دروست کرابێت. بەڵام سێتاقان ماوەیەکی درەنگتر لەم مێژووە دروست بووە. سەرەتاکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە.(عەتائوڵلاغای هەولێری) داوا لە حاجی تەهای سویرەیی کردووەو پێی گوتوە: گەر بتوانی خۆشناوانم بۆ پەیدا بکەیت، بۆ ئەوەی ئەم عاردانە بکەینە تووتن. لە ئەنجامدا (حاجی تەها سویرەیی) توانی چەند کەسێک پەیدا بکات بۆ چاندن و بەرهەمهێنانی تووتن. ئەوانەی بەشداری تووتن چاندنیان کرد، ئەمانەن: حاجی تەها سویرەیی، حەسەن زێوەیی، بەکری عومەربەگی شیرەیی، عەبدولعەزیزی شیرەیی لەگەڵ (سەید غەریبی بەرزنجی) کێشکەیی و سەید مووحەمەدی سەید محەممەددەمین. هەرچەندە ئەمانەی دوایی، کەمتر تووتنیان چاند.

بێگومان هەر لە سێتاقانەوە تا سینەمای حەمرا، هەمووی تووتنی لێدەچێنرا و لەبەر ئاوی کارێزی شێخ ئەحمەد. ئەوانەی خەریکی کاری کشتوکاڵی تووتن چاندن بوون. کەلوپەل و ماڵێکی بچووکیان لە نزیک ئەو زەوییانە بوون کە تووتنیان لێ وەبەرهەم دەهێنا. چونکە وەک ڕوون و ئاشکرایە بەرهەمهێنانی تووتن بەتاکە کەسێک ناکرێ. کارێکی هاوبەشی خێزانییە. سەرەتا خاڵەکانی سێتاقان لە نزیک سێ تاقەکە دروست کرابوون. تووتن و سەوزەیان لەبەر ئاوەکە دەکرد.

هەر لەم کەین و بەینەدا لە ساڵی ١٩٥١ دەستیان بە فرۆشتنی زەوی سێتاقان کرد.. هەر لەم ساڵەدا سەید غەریب بەرزنجی و حاجی تەها خۆشناو لەگەڵ حاجی حەمەد مربەم. دەستیان بەخانوو دروستکردن کرد، سەرەتا سەید غەریب حەسارێکی دروست کرد. هەروەها (حاجی تەها سویرەیی) خۆشناو (٦٠٠) مەتر عاردی کڕی و لەو سەردەمدا یەک مەتری چوار گۆشەیی بە ڕوپیەک بوون ئەمیش خانووی دروست کرد. ئێستا شوێنەکەی تەلاری دوونهۆمی و ریزە دووکانێک هەیە. هەر لەم ساڵە و دوای

ئەمـان چەند کـەسـێکی تریش عـەردیان کـڕی و خـانوویان لەسەر دروست کرد. ئەمانە بوون: حاجی محەمەد دۆرەیی، حاجی یابە قیرارەیی، مەلا ئەحمەدی شێخ وەسانان، مەلا خـدری کـونە فلوسـەیی، دەرویـش عـەلی، حـاجی سـاڵح خۆرانی، حاجی فەقێ ئەحمەد، دواتر حاجی کاکۆل و حاجی حەوێز فریزی و خدری بیرۆکەیی. لە دوای ئەمانەش شێخ عومەر بالیسانی خانووی دروست کرد. ئیتر وردە وردە ئەم بەرێزانەی ناومان بردوون سێتـاقـانیـان ئاوەدان کـردەوە. گشت خانووەکانیش لە قوڕ و خشت دروست کرابوون.

### * بۆچی ئاوی کارێزەکە بە سێتاقاندا هاتووە؟!

وەک ئاشکرایە کـارێزی کـەسنەزان بۆ حـەسـارۆکـان دەهات. هەروەها کـارێزی بنەسـڵاوەی گـەورە بۆ باداوە دەهات. لەوێ تەمـاتەو سەوزایی زۆریان لەبەر دەکرد. بۆیە بیریان لەوە کـردەوە ئاوی کـارێزی شـێخ ئەحـمـەد بۆ باغی عـەتائوڵلاغـای شـێـخـەڵلا بهـێنن. لەبەر ئەوە گـەر ئاوی کـارێزی شـێخ ئەحـمـەد راست و راست بهـاتبـایە خواردەوە، ئەوە یەکسـەر بۆ شەهیـدانی سێـتـاقـان (شـیر و خەنجـەر) دەهات و لەوێوەش بۆ گـەڕەکی بیـرێژیان. چونکە ڕێڕەوی ئاوەکە بەرەو هەوراز هەڵبکشێت و بگەیەنرێتە تاتە نوێژی شێخەڵلا و باغی عەتاولاغا و باغی شار و خانەی (حاجی ئەحمەد ئاغای هەولێری). ئەوەی ئەم بیرۆکەیەی لا دروست بووە. زۆر ژیرانە ئەم کارەی بە ئەنجام گەیاندووە. بە لێدان و هەڵکەندنی جـۆگـەیەکی نیـوە چەمـاوەی دوورودرێژ لە کـارێزی شـێخ ئەحـمـەدەوە بەرەو (پردۆکە)و سێ تاقـەکـە، لەوێوەش بۆ تاتە نوێژ و کوزەبی شێـخەڵلا و بەلای راستێ باغی شار و تا دەگەیشتە خانی ولاغانی (حاجی ئەحمەد ئاغای هەولێری) بەرامبەر مزگەوتی ئاڵتی بەرماغ. هێزی ئاوەکە هەر ئەوەندە بوو. بۆیە ئاوەکەش لەخانەکە زیاتر بڕی نەکـردووەو تێنەپەڕیوە، خـەڵکەکـەش زۆربەی ئیش و کارەکانیان لەسەر ئەم جۆگە ئاوە جێبەجێ کردووە.

### سێتاقان سەنتەری هەولێرە

ئێسـتـا بەپێی شێـوە ئەندازەیی و نەخـشـەسـازی جوگرافیـای شاری هەولێر. چەقی سەنتەری هەولێر لە نێو سێـتـاقـاندایە. چونکە ناوەندی هەولێـر دەکـەوێتـە نێـو کۆمەڵەی مـانگی سووری عێراق. هەروەها شوێن و جێگای کۆمەڵەی مانگی سووری عێراقیش لە نێو سێتاقاندایەو کەوتۆتە نێو کۆتایی سێتاقانی خواروو.

راستە سێتاقان کاروانسەرای خۆشناوان بووە. چونکە هەر کـاروانچییـەک لە ناوچەی خۆشناوەتی و دەوروبەری هاتبێتە هەولێر. دەبوایە بەسێتاقان و بەسەر (پردۆکە)دا رەت بن و ئینجا بگەنە نێو جەرگەی بازێڕی هەولێر. جگە لەمـەش رێگای باداوان هەبووە. ئەو کـاراوانچیـیـانەی ویسـتوویانە بۆ شـەمـامـک و قـەراج و کـەندێناوەو شـوێنە دوورەکان بڕۆن دەبوایە هەر بەم ڕێیە بڕۆن.

### سێتاقان و راپەڕین

لەبەر ئەوەی سێـتـاقـانییـەکـان زۆر ئارەزوو و حـەزیان لەکار و کاسبی و هەروەها لەسیاسەت و ولاتپارێزییە. بۆیە ڕەوشی سـیـاسـی هەر لە گـوند و ناوچەو دەڤـەر و زێدی خۆیان فێـر بووینە. بەهۆی ئەو پۆلە پێشـمـەرگـانەی یەک لەدوای یەک دەهاتنە ناوچەی خۆشناوەتی و دانیـشـتـوانی ناوچەکە بۆ خزمـەتی کوردایەتی و ولاتپـارێزی و ئەوانیش گەلێک خزمەتی پێشمەرگەیان کردووە. ماڵەکانیان ماڵی پێشمەرگە بووە. هەندێ جار وابووە هیچ ژەمە خواردنێکیان بە تەنهـا نەخـواردووە!! بەڵکو مـیـوانیش و ئەوانیش لەگەڵیـان بەشداربووینە. بێگومـان ناوچەی خۆشناوەتی لە هەردوو (شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێی گەلەکەمـان) بە حـوکـمی جـوگـرافـیـای ناوچەکـە، دەورێکی کـاریگـەریان هەبووە، بۆ هاوکاری و یارمەتیدانی پێشمەرگە لە هەموو رووێکەوە. هەروەها پێشـمـەرگەو کـادیرانی سیـاسـیش کـاریگـەر و کـارتێکردنی خۆیان لەسـەر خـەڵکی ناوچەکە هەبووە، بۆ هۆشیـار کـردنەوەیان لە رووی ولاتپـارێزی و نەتەوەیی و سیاسییەوە.

هیچ پێشـمەرگەو کادیرێکی دێرینیش نییـە کە نان و نمەکی ئەم خـەڵکەی نەچێشـتبێ، بۆیە خەڵکی ناوچەکەش بوونەتە پێشمەرگە و لەم پێناوەدا قوربانیان داوە و شەهید بووینە و خوێنیـان ڕشـتـوە، بەراستی ئەمە وای کردووە بۆ سێـتـاقـانیـیـەکان کە تێکهەڵکێشـان و ئاوێزان لە هەردوو لاوە بووە، ئاوێزانی جەماوەر و پێشـمـەرگە و جارێکی دی لە(٦)ی ئاداری سـاڵی ١٩٩١ لە شـاری هەولێـر کـە خۆپێشاندان دەستی پێکردو هێشتا بەعسییە فاشییەکان لە شـاری هەولێـر بوون. (کـە رێکخـسـتنی نهـێنی حـزبی

شیوعی) راپەڕین. لەگەڵ خەڵکی بەشەڕەفی شاری هەولێر. بەڵام لە ئەنجامدا بەعس و جاشە خۆفرۆشەکان تەقەیان لە خۆپیشاندەران کرد و خۆ پیشاندەرانیش لەجادەی (٣٠)سی مەترییەوە نزیک گومرگی کۆن. بەم جادەیە شۆڕ بوونەوە. جاش و بەعسییەکان بەدوایان کەوتن و بەردەوام تەقەیان لێ دەکردن. بارانیش نم نم دەهاتە خوارەوە. خەڵکی سێتاقان دەرگای ماڵ و حەوشەکەیان بۆ واڵا کردن و خۆپیشاندەرانیش خۆیان تێدا حەشار داو ئەمەش نیشانەی جوامێری سێتاقانییەکانە. هەر ئەم ئاویزانە بووە، لە راپەڕینە پڕشکۆیەکەی (١١) ئاداری ساڵی ١٩٩١ خەڵکی سێتاقان جوامێرانە وەکو گشت ناوچە جیا جیاکانی کوردستان بەهەماهەنگی لەگەڵ پێشمەرگەو تێکۆشەرانی گەلەکەمان دەست لەناو دەست خەڵکی شار بە تێکڕایی توانییان بەشداری لە ئازادکردنی شاری هەولێر بکەن. بەڵام لەجادەی کۆیێ نزیک نەخۆشخانەی رزگاری لە (سەیتەرەکە) دوو تانگ (دەبابە) مابوون. هێشتا دەستیان بەسەردا نەگیرا بوو. لەم ماوە دوورەدا تەقەیان لە جەماوەری راپەڕیو کردو تانگەکە رووی لە شەقامی سەرەکی سێتاقان بوو، بۆیە شەهیدو بریندارانی لێکەوتەوە.

هەروەها لە شەستەکان لە سێتاقاندا، کە شەو دادەهات. رژێم لەشەقامی (٣٠) مەتری ئێستاو (چوار ریانی شەهیدان). کە رژێم ناوی لێ نابوو (جادەی سەگان) نەیدەتوانی بێتە سێتاقان. ئەوکاتیش پێشمەرگە دەهاتە ناو گەڕەکەکە و جموجۆڵ و چالاکییان ئەنجامدەدا. رژێم گەر بهاتایە ناو گەڕەک و کۆڵانەکان دەبوایە زرێپۆشیان لەگەڵ بوایە لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ئەفسەر و سەرباز یان پۆلیس.

## حەرەس قەومییەکان

لە هاوینی ساڵی ١٩٦٣ حەرەس قەومییەکان، مەبەست چەکدارەکانی حزبی بەعسە خەڵکێکی زۆریان لە سێتاقان کۆ دەکردەوە و ریزیان دەکردن لە باخچەی (خدرە کەر)ی نزیک قوتابخانەی سۆران، دەستیان دەکرد بە لێدان و ئیهانەکردنی خەڵکەکە، سەرەتا دەستیان دەکرد بە پشکنینی ماڵەکان کە بەدوای چەک و دەمانچە دەگەڕان. لەم ڕەشبگیریەدا نزیکەی (٤٠٠) کەسیان لەگەنج و پیری سێتاقان گرت. کە لە بەندیخانەی هەولێر جێگایان نەدەبووەوە. (بەندیخانەکە لە بینایەی کۆنی پارێزگا بوو). زۆر درندانە مامەڵەیان لەگەڵ خەڵک دەکرد. بەڵام زۆربەی گیراوەکان هەر هەمان رۆژ و ئێوارەکەی ئازاد کران.

دیسان حەرەس قەومی رۆژێکی دی بەتایبەتی هاتن و هەردوو هاوڵاتی (عەولا سۆر و مام شاتر خۆشناو)یان لەماڵەوە هێنادەرەوەو هەر لەپێش دەرگای ماڵی خۆیان و بەبەرچاوی خەڵک لێیاندان و بووە هۆی ئەوەی مانگێک زیاتر لەسەر جێگا بکەون و لەشیان هەمووی شین و مۆر بوو بوو، جێگای ساغیان تێدا نەمابوو. پێستەیان تێ وەرگرتن بۆ چاکبوونەوە. هەندێک خەڵکی دییان لە جەنجەڕ دێخست و ئینجا رایان دەکێشا. ئەمە رەفتاری (حەرەس قەومییەکان) بوو، بەرامبەر خەڵکی هەژار و سڤیل.

## باخچەی سێتاقان

هەندێک خەڵک پێی دەڵێن دارستان. بەڵام بەدارستان دانانرێت لە ساڵی ١٩٩٢ لەوکاتەی رژێمی بەعس سووتەمەنی (نەوت و غاز و بەنزین)ی لەسەر هەرێمی کوردستان بڕی. تەنگژەی سووتەمەنی پەیدا بوون ساڵەکەش، ساڵێکی زۆر سارد و سەرماو دژوار بوو، بۆیە خەڵکی کوردستان بەناچاری داریان دەبڕی بەڵام سێتاقانییەکان جوامێرانە باخچە بووکەکەیان پاراست، نزیکەی (٣٠٠) درەختی لە چەشنی سنۆبەر و زەیتون و قەیسی تێدایە. لێ نەگەڕان دەستی خەڵکی بگاتێ و ئەو دارستانە ببڕنەوە. ماڵەکانی دەوروبەری، پارێزگارییان لە باخچە تاقانەکەیان کرد و نەیانهێشت یەک دار ببردرێت.

## نووسەر و هونەرمەندانی سێتاقان

* سەرقافڵەی نووسەرانی سێتاقان کە دەورێکی باڵا و کاریگەری هەبێت. (ئەبوبەکر خۆشناو)ە. جگە لە بواری شیعر و پێشمەرگایەتی و سیاسەت و رۆژنامەگەری. بەڵکو لە بواری وەرگێڕان دەوری خۆی بینیوەو، کۆمەڵە بەرهەمێکی بەپێزی وەرگێراوەتە سەر زمانی کوردی و کتێبخانەی کوردی پێ رازاندۆتەوە.
* نادیە یاسین: ئێستا دانیشتووی کەنەدایەو جگە لە زمانی کوردی، بە زمانی ئینگلیزیش گۆرانی دەچڕێ.
* جەلال بەرزنجی: لە وڵاتی کەنەدا دەژی، دوای ئەوەی

شـــیعـرەکـانی وەرگـێـڕدراون بۆ زمـانی ئینگلیزی. لەم وڵاتەدا خەڵات کراوە.

* هونەرمـەندان، شلێـر ئەحـمـەد و هەردوو خـوشک، ئاواز مـەحـمـود و ڕۆژ هەڵات مـەحـمود. لەو کـاتەی شـانۆی کـوردی لە شـاری هەولێـر تووشی تەنگژەو نەبوونی ئافرەت بوودتەوە، سەربازانە ئەو بۆشایی و کەلێنە گەورەیان پڕ کردۆتەوە.

**ئەمـانەی خـوارەوەش نێـوی نووسـەر و هونەرمەندانی سێتاقانن:**

شاعیری گەورە پیربال مەحموود، شێخ عومەر بالیسـانی، مەلا محەمەدی عـەلیـاوەیی، تەها مـامـەر، حوسـێن کـێشـکەیی، لاوک بێـژ قـادر مـسـتـەفـا هیـرانی، عـەبدوڵڵا پەشـێـو، جـەلال بەرزنجی، ئەبوبەکـر خۆشناو، عـەبدوڵڵا زەنگەنە، عـەبدولڕەزاق شـەمسـەدین، شوکرڵا شێخانی، بەکر سەید غەریب (بەکر زانا)، محەمەد حەسەن باوەکر، ئازاد عوبێد، د. عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، د. سەلام حەسەن خۆشناو، سەلاح ئەحمەد بەکر بەگ(سەلاح ڕێبوار)، حەسـەن حەیران، سوبحی کـۆیی، عـەبدولخالیق کـەریم بەرزنجی، برهان خـۆشناو، تەڵعـەت حـەویز، هاوتا ئەسـعەد، زیاد ئەسـعەد، زیرەک کـەمـال، د. جـاسم تۆفـیق خۆراتی، د. پەخشـان سابیر، د. محەمەد خۆشناو، سالار عـوسـمـان، نادیە یاسین، ڕزگـار شـێـخـانی، د. کـەمـال سەعدی، فـارس سەعـدی، تەحسین و موحسین، شـەهید گەیلان شەیدا، شێخ عەبدولباسیت بالیسانی، ئازاد حەمەد ئەمین هیرانی، نەسروڵڵا شێخانی، عومەر حاجی، نیزام شوکر، خدر خۆشناو، سابیر سووسەیی، محەمەد چاوشین، ئەحـمـەد حـەیران، ڕزگـار عـومـەر خـەلیـل، شلێـر ئەحـمـەد، ڕەحمان قـوربانی، جەوودەت مـەحمـود، ئاواز مـەحمـوود، ڕۆژهەڵات مەحموود، خالید ئەبوبەکر (خـالید کەسنەزانی)، حاجی عەبدولکەریم، جەوهەر سابیر، خالید بەرزنجی، ئازم کـۆیی، پەروین شـازادە، هاوژین سـەردار، ڕزگـار کـۆیی، عەباس عەزیز لەشکری، ئیسماعیل قوربانی، تەها حاجی، ئاواز مـحـەمـەد، مـزۆ لەشکری، بەناز عـەلی، عـیـمـاد موسـتەفـا، قـوباد زیرەک، دەرباز ڕەحمـان، هۆگر غـەریب، دەشـتی جەنگی، شوان مـحەمـەد ئەمین خۆشـناو، لوقـمـان ئیسماعیل، لوقمان سادق، دلێر بابەشێخ بالیسـانی، فەرهاد قـادر، فەرحان حەسەن، هیمداد عوزێر خۆشناو، سامی عەبدوڵڵا، عـەبدولڕەحـمـان حەوێز، بۆتان تەحـسـین، هەژار هیـرانی، تەها حـەوێز، سـەدرەدین خۆشناو.



پیربال مەحموود

**مزگەوتەکانی سێتاقان**

گەڕەکی سیتاقان لە سـالی ١٩٥٢ تا ئێستا (١٨) مزگەوتی تێدا دروستکراوە. ئەمـانەی خـوارەوەن: شـێخ عـومـەر بالیسـانی، سەید غەریب، خەلیفە مەلا ئەحمەد، (حاجی حوسـێن گەلالی)، حاجی حەسەن، حاجی برایمی حاجی سەید، حاجی ڕەمەزان، حاجی مراد، حاجی مستەفا، شێخ نەسـرەدین، حـاجی عـەلی (پێش نوێژ و وتار خـوێنەکـەی مامۆستا مەلا قادری گۆمەسپانی یە)، مەلا عومەر، مەلا عـەبدوڵلای سارنگەیی، حاجی تۆفیق، شـەهیـد یاسین، شـەهید حـەسـەن، شـەهید ئیسـمـاعیل، حـاجی عـەزیزی گـڵـکەند لە (گـڵـکەندی سـێـتـاقـان)، شێخ سـەدرەدین لە (شەهیدانی سێتاقان).

**خـوێندنگای ئاینی:** لە مـزگـەوتەکـانی سـێـتـاقـان خوێندنگای ئاینی هەبوو وانەیان تێدا دەگوتەوە. کۆمەڵێک خـوێندکـاریان هەبوو کـە پێـیـان دەگـوتن (فـەقێ) لەنێـو مـزگـەوتەکـان (حوجرە) یان، ژووری تایبـەتی فـەقـێـیـان. شـوێنی وانە گـوتنەوە خـەوتن. فـەقـێـیـەکـان ژیانیـان لە مزگەوتەکان دەگوزەراند. هەر بۆ نموونە لە مزگەوتی (شێخ عومەر بالیـسـانی). (شێخ عـومەر) خۆی مامۆسـتا بوو، وانەی دەگوتەوە و گەلێک فـەقێ و موستەعیدی هەبوون. هەروەها لە مزگەوتی (سەید غەریب) مامۆستا (مەلا سەید فەرهادی).

مزگـەوتی شێخ عـومـەر بالیـسـانی یەکەمین مـزگـەوتی سێـتـاقـانە کە لەسـالی ١٩٥٢ دروست کـراوە. سـەرەتا بە خـشت و قـوڕ سـەربـشی بەدار گـیـراوە. دوایی لەسـالی ١٩٦٨دا جـاری یەکـەم. گـومـبـەتی لێ دروسـتکرا. قـوتابخـانەی فـەقـێـیـانی لێ بووە و لە شـەسـتـەکـان بووە پاشکۆی وەزارەتی ئەوقاف. کە (بڕوانامەکەی وەردەگیرا. هەروەها گـڵـکـۆی دوا ئارامگای شێخ عـومـەر بالیـسـانی و

خێزانەکەی و لەگەڵ (بابە شێخی) کوڕی و کچی، هەر لەنێو مزگەوتدایە.

### راتبەی فەقێیان

بێگومان ئەم "فەقێیانە"، بەڕێز بۆ راتبەهێنان دەچوون. ئەمەش دوو ژەمی خواردنی ئێواران و سبەینان بووە. چونکە لە پەنجاکان و شەستەکان سەرەتای حەفتاکانیش شیو لێنان تەنها ئێواران بووە. بۆیە ئەم فەقێیانە خۆ بەخۆ بەڕێز و نۆبەت دوو فەقێ یان یەک بەتەنیا لە دەرگای ماڵەکانی دەداو گوتوویەتی (راتبە رەحمەتی خواتان لێ بێ). خاوەن ماڵەکانیش بەپێی توانای خۆیان خواردنیان دەدانێ. بەم چەشنە فەقێیەکان خواردنی رۆژانەیان دابین دەکرد. ماڵەکانی دەوروبەری مزگەوتیش بەردەوام لە هاریکاری فەقێیەکاندا بوون. هەر بۆ نموونە لە مزگەوتی شێخ عومەر بالیسانی ئەو خاوەن ماڵانەی نان و خواردەمەنییان بە فەقێیەکان داوە ئەمانەن: حاجی محەمەد دۆرەیی، حاجی محەمەد مریەم، حاجی کاکۆل و حاجی حەوێز فریزی، سەید عوبیدوڵلای پاقلانی، حاجی تەها سوێرەیی و (کوڕەکانی)، حاجی مەلا خدری کونە فلوسەیی و (کوڕەکانی)، شێخ عومەر بەخۆی، شێخ عیسا بالیسانی، حاجی فەقێ ئەحمەد (باپیری هونەرمەند بوڕهان خۆشناو)، حاجی حەمە شەریف، حاجی حەسەن ئەسپیندارەیی، حاجی قادر، حەمەد مستەفا خەیات، حاجی یابە تیژەیی، سەید محەمەد بەرزنجی، عومەر ئەفەندی رواندزی، حاجی نووری بیرۆکەیی، سەید نیعمەتوڵلا، حاجی نادر خەیات، حاجی محەمەدەمین خەیات، حاجی حەمەدەمین توتن فرۆش، دەرویش عەلی.

بوو بەم شێوەیە بوو: دەیانێ: تیر و پشکی فەقێیان لەکاتی دابەشکردنی نان خواردن دەیان دەیانێ، واتە دە لە من دە لە تۆ بەکار دێن. کە خواردەمەنییان لامان کۆ دەکردەوە کە فەقێیان پێیاندەگوت: (راتبەی فەقێیان).

لەپاشان خواردەمەنییەکانیان ریز دەکرد. جا تیرو پشکیان لێ دەهاوێشت بە رێگەی (دە لە من دە لە تۆ). دوو فەقێ بەرامبەر یەکتر دادەنیشتن، دەستیان لەدواوەی خۆیان دادەنا، فەقێی یەکەم دەستی دەهێنایە پێشەوە بابلێین (٣) سێ پەنجەی بەرز دەکردەوە، ئینجا سێ پەنجەی یەکەم و دوو پەنجەی دووەم و دەکاتە پێنج پەنجە، (١٠) دەی لەسەر زیاد دەکات دەبوو بە (١٥) پانزە ئەم ژمارەیە لەسەر ریزی فەقێیەکان دەست پێ دەکرا، بەشێوەی ژماردن، لە یەکەم دەست پێ دەکرا لەپاشان دوو، سێ، چوار تادەگەیشتە ژمارە پانزە. ئەو کەسەی ژمارەی پانزەی بەرکەوتبووایە، نانی یەکەمی بۆخۆی دەبرد. ئەم کردارە دووبارەو سێ بارە دەکرایەوە، تا هەموو خواردەمەنییەکە بەسەر فەقێیەکان دابەش دەکرا. ئەمەش باشترین رێگا بوو بۆ یەکسانی نان خواردن لە نێوان فەقێیاندا.

فەقێیەکان (رۆژی سێ شەمە) پشووی هەفتەیان بووە. هەروەها لەدوای تەواوکردنی ماوەی خوێندن و دەرچوونیان. ئینجا بڕوانامەکانیان وەردەگرت، ئاهەنگی تایبەتییان بەم بۆنەیەوە ساز دەدا.

ئەمەش ناوی نووسەر و هونەرمەندەکانە: ئازاد جەمیل خۆشناو، د. ئەیوب سابیر کەریم، سەدیق گچکە، جەعفەر بەرزنجی، مەعروف فەرهادی، فەهد قادر هۆرمزیار، پیرداود محەمەد"کاکە حمد"، قاسم مستەفا "لۆلان"، تاریق جەلیل خۆشناو، توانا محەمەد، کەمال ماجدی، یاسین محەمەد خەتات، پشتیوان بەرزنجی، ژوان سێودین، ئەختەر سەدیق هیرانی، عەبدولقادر میترۆ.

### شەهیدان و سێتاقان

سێتاقان هەردوو شەهیدان لە خۆوە دەگرێ. شەهیدانی سێتاقانی خواروو، کە پێی دەڵێن: شەهیدانی "شێر و خەنجەر"، ئەمە هێمایە بۆ دوو نەتەوە و نیشانەی برایەتی کورد و عەرەبە. "شێر و خەنجەر" لەسەر ستارەی پێشەوەی خانووەکان بە"قالب" دروست کرابوون. ئەمەش لەدوای بەیانی "١١"ی ئادار بوو. بەڵام شەهیدانی سێتاقانی سەروو رژێم لە هەشتاکان دروستی کرد. ئەو مرۆڤانەی لە جەنگە دۆڕاوەکەی خۆی )جەنگی عێراق ئێران) بە کوشتنی دان، لەوێ خانووی بۆ کەس و کاریان دروست کرد.

### نەخۆشخانەکانی سێتاقان

نەخۆشخانەی "سینگ" بنکەی تەندروستی نەخۆشییەکانی سینگ. یەکەم نەخۆشخانەی تیشکی سینگە، کە لە شاری هەولێر سەربەخۆ دروستکرابێت و تەنیا بۆ تیشک بێت. لەسەر شەقامی "٣٠" مەتری و لە سەرەتای شەستەکان دروست کراوە.

نەخۆشخانەی شیری. "بنکەی تەندروستی" نەجدی حەیدەر. ئەم نەخۆشخانەیە سەرەتا هی منداڵان بووە. دەرزی و کوتانی سەر شانیان لێرە بووە. بەڵام قوتوی شیریان دابەشی سەر منداڵان کردووە، بۆیە بە نەخۆشخانەی شیری منداڵان بەناوبانگەو کەوتۆتە سەر شەقامی"٦٠" مەتری لە سێتاقانی سەروو. هەروەها نەخۆشخانەی تایبەتی رەسول و نەخۆشخانەی تایبەتی "کوردستان"ی لێیە، لەگەڵ عیادەی پزیشکی "ئەمەل" و "هیوا".

**قوتابخانەکانی سێتاقان**

قوتابخانەی بابان "سۆران و کۆرەکی" پێشوو، لە ساڵی ١٩٦٢ دروستکراوە. یەکەم قوتابخانەی ئەم گەڕەکەیە. ئێستا سێ خوێندنگا لەم بینایەدا هەن، قوتابخانەی مەحوی ئێواران و دوا ناوەندی ئەختەری کچان و هەروەها دوای راپەڕین لە گۆڕەپانەکەی بینایەکی نوێ دروست کراوە و بووەتە ناوەندی زیوەری کوڕان. ئامادەیی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٠ دروستکراوە هاوکات لەگەڵ ئامادەیی کوردستانی"کەرکوک و سلێمانی". شەهیدانی تێکەڵاو ١٩٧١ و هەژاری سەرەتایی تێکەڵاو لە ساڵی ١٩٦٤ و رەسەنی سەرەتایی تێکەڵاو لە ساڵی ١٩٧٥ و کامەرانی سەرەتایی تێکەڵاو لە ساڵی ١٩٧١ و سیروانی ئێوارانی کوڕان ساڵی ٢٠٠٣ دروستکراوە. هەروەها قوتابخانەی تێکەڵاوی سەرەتایی رەوشەن "بێکەسی" تێکەڵاوی سەرەتایی هەن "سۆران" یەکەم قوتابخانەیە لە سێتاقان لە ساڵی ١٩٦٢ز دروستکراوەو بەڕێوەبەری مامۆستا "کەمال شاکر" بووە. ئەم قوتابخانەیە زۆر خزمەتی خەڵکی سێتاقان و سەیداوەی کردووە.

**گەرماوی سێتاقان**

گەرماوی سێتاقان لە ساڵی ١٩٦٦ دروستکراوە. یەکەم جار هەر بەناوی گەرماوی "سێتاقان"بووە دوایی ناوەکەی بوو بەگەرماوی "کوردستان". سێتاقان تەنها ئەم گەرماوەی لێ بووە و زۆر فراوان بووە ژووری تایبەتی تێدا هەبووە لە سەرەتاوە خاولیان بۆ خەڵک دەهێنا. لە دوای خۆ شوشتن، لەشی خۆیان پێ وشک دەکردەوە. بۆیە خەڵک زوو دەهات، تا خاولی پاکژیان بەربکەوێ و دوایی قەدەغە کرا. لەم گەرماوەدا بۆ ئافرەتانیش کاتی دیاریکراو دانرابوون خاوەنی ئەم گەرماوە ئەمانە بوون: یەکەم جار حاجی بیلال هەولێری بوو، دوایی مام یاسین و مام ئەحمەد و لە پاشان زرار ئەحمەد قاوەچی و حاجی مستەفا رۆستایی خاوەنی هاوبەشی بوون.

**بۆریچییەکانی سێتاقان**

ئێستا بۆریچییەکانی هەولێر دوکانی سەردکییان لە شێخەڵڵاو سێتاقانە. بە زۆری بۆریچییەکانی هەولێر خەڵکی قەراسنجی بنار سەفین بوون، هەروەها وەستا هەرە بەناوبانگەکانیان لە سێتاقان نیشتەجێبوون. یەکەمین بۆریچی لە سێتاقان "مەولود میراوە.

بەناوبانگترین بۆریچییەکانی سێتاقان ئەمانەن: مستەفا مەولود خۆشناو، سلێمان مەولود، جەعفەر مەولود، جەلیل مەولود، حەمید عەبدوڵڵا قەراسنجی و برایەکانی، سادق قەراسنجی، فەرحان عەلی، ئەسعەد حاجی عەلی، حاجی عەلی قەراسنجی، محەمەد حەمەدەمین قەراسنجی، حەیدەر سابیر سارتکەیی، حاجی محەمەد قەراسنجی، نەجمەددین بۆریچی، وەستا ئومێد، وەستا عەلی، وەستا سیروان، وەستا سەردار.

**قیرچییەکان لە سێتاقان**

عەزیز قیرچی: یەکەمین کەسە ئیش و کاری قۆنتەراتی قیری دەکرد. قیریان لە"دۆرەو هیت" بۆ هەولێر دەهێنا. ئەمانەش قیرچی سێتاقانن: عەزیز حاجی ئەحمەد، کاکە قیرچی، حەمە قیرچی، خەسرەو قیرچی.

**سەرتاشخانەو ئارایشگاکان**

سێتاقان گەلێک سەرتاشخانەی لێیە، بەناوبانگترینیان ئەمانەن: سەرتاشخانەی سەلام خاوەنی خالس، سەرتاشخانەی جەمال، سەرتاشخانەی هەنگاو، سەرتاشخانەی ئامێز، نەوزاد، ئاسۆ حاجی باوەکر هیرانی. حاجی باوەکر زۆر دێرینەو کرێی سەرتاشینی بە"٥٠" پەنجا فلس بوو.

ئارایشگای "سالۆن"ی سلێمانی و شەرمین هەبوو، بەڵام خاوەنیان سێتاقانی نەبوون. بەڵکو یەکەم ئافرەت "حەنیفە عەبدولرەحمان" بوو، سالۆنی بەناوی "حەوا" دانا، بەرامبەر نەخۆشخانەی فریاکەوتن، دوایی ئارایشگای"مەلیکە"ی لە سێتاقان دانا.

## ئاشەکانی سێتاقان

ئاش بۆ لێکرنی هەموو دانەوێڵەیەکە. گەنمە کوتاو نیسک و برووش و برنج و ساوار و ئاردیش. یەکەم ئاش: ئاشی شێخ ئەحمەدە. هەروەها ئاشی بەفر" کارگەی بەفر دروستکردن" هەر بەناوی شێخ ئەحمەدە. نزیک شەقامی" ٦٠" مەتری.

سێتاقان ئەم ئاشانەی لێیە: شێخ ئەحمەد، سەدیقی کێخوا بایزی بیرۆکەیی، سەید نووری، سێتاقان، هانا "خاوەنی ئیسماعیل نادرە".

## شۆفێرە دێرینەکان

ئەمانە شۆفێرە دێرینەکانی سێتاقانن: عەزیز مەدێ، حوسێنی مام نەجیم، عەلی فاتێ، حاجی حەسەن هیرانی، برایم ژیکە، سالح پاشا، سەدیق حوسێن هیرانی، عوسمان سەدیق، ساڵح سیفۆن: کە یەکێکە لە شۆفێرە بەناوبانگەکانی شاری هەولێر، نزیکەی " ٥٠" پەنجا ساڵ زیاتر ئۆتۆمبێلی لێخوڕیوە، یەک سەرپێچی نەبوو، سالآنە خەڵاتی وەرگرتووە. بۆیەش پێی دەڵێن: ساڵح سیفۆن، چونکە کارگەی "سیفۆن"ی لە هەولێر هەبوو"سیفۆن" جۆرە خواردنەوەیەک بوو.

عەزیز مەدێ: مۆڵەتی ژمارە "٣" هەبوو، هیچ سەرپێچی نەبووە. زۆر خەڵاتی وەرگرتووە.

## پینەچییەکانی سێتاقان

پینە چییەکان خزمەتێکی چاکی گەلەکەیان کردووە. بگرە هەر لە بزمار ڕێژ کردن و گۆڕینی بنی پێڵاو و کەعبەکان و "پاشپانی". هەروەها پینەکردنی پێڵاوەکان و دوورینەوەیان.

لە سێتاقانیش ئەم وەستا دەسترەنگینانە هەنە: حاجی عەلی گامێشتەپەیی، وەستا عەلی چێودیی و، مەلابەکر، وەستا حەسەن، وەستا کاکە کونەفلوسەیی و"کوڕەکانی".

## تەنەکەچییەکان

تەنەکە چییە دێرینەکان سۆبەی دارو مەسینەی ئاسن و دەستشۆر و مەقەرەو بۆڕی سۆبەیان دروست دەکرد. تەنەکەچییەکان، ئێستا هەموو جۆرە کارێک پەیوەندی بەکەلوپەلی ئاو و نانکردن و چێشت لێنان و خۆ گەرمکردنەوە هەبێت چاکی دەکەنەوەو دروستی دەکەن. چاککردنی سۆبەی نەفت و غاز. دروستکردنی سێر و پەلێمزی نانکردن "غاز و نەوت". چاککردنەوەی فانۆس و سورەیاو لالەو لۆکس. وەستا بەناوبانگەکانی سێتاقان ئەمانەن: دەروێش رەحمان، حاجی نووری کێشکەیی، وەستا سەدرەدین، وەستا عەلی رۆستایی.

## برین پێچ و یاریدەدەری پزیشکی

دکتۆر عەبدوڵلا، ناسراوە بە"دکتۆرە پیرە". زۆر چاک بوو، خۆی داوێشتە گۆرییان و بەلەک پێچی لەبەر دەکرد و کلاوێکی لەسەری دەنا. دەرزی لێ دەداو داوو دەرمانی کوردەواری دەگرتەوەو کەچەڵ و خوریشت و نەخۆشی پێستەی چاک دەکردەوە. ئەم پیشەیەی لە سەربازی فێر ببوون لە سێتاقان ئەم یەکەمین برین پێچ بوو، هەروەها ئەم برین پێچ و یاریدەدەری پزیشکانەی کە لە سێتاقان "عیادیان" هەبووە، ئەمانەن: مام قشتۆ هیرانی، غەریب خدر، شیامەند خۆرانی، سەلمان، شەوکەت، حەیدەر، فەرهاد سووسەیی، هەژار، ئیسماعیل کۆیی"عیادەی نییە" هەروەها یاریدەدەری پزیشکی"حەوێز حەسەن خۆشناو" زۆر دێرینە.

## بن لەلوگان

هەموو جەژنەکان لەجێگای بیرە ئاو و باخچەی سێتاقان لەلوگان دادەنا. پێشتر گۆڕەپانی یاریکردن بوو خەلیفە جەبار و دوو سێ کەسی دی، دوو سێ ڕۆژ پێش جەژنەکان لەلوگان دادەنا. لەم کاتەدا سوار بوونی لەلوگ بە "٥" فلس بوو خاوەن لەلوگیش ناوە ناوە پاڵیان بە لەلوگەکەوە دەنا. هەروەها لە پشت خوێندنگای هەژاریش گۆڕەپانەک هەبوو لەوێش لەلوگان دانابوو.

## دار فرۆشەکانی سێتاقان

گەر تەماشا بکەین زۆربەی دار فرۆشەکانی شاری هەولێر. جگە لە هەولێرییە کۆنەکان، خەڵکی خۆشناوەتین. چۆن عەلافەکان زۆربەیان خەڵکی دەشتی هەولێرن. جا دارفرۆشەکان زۆربەیان سێتاقانین. بەڕاستی دارفرۆشەکان سوودێکی زۆریان بە دانیشتوانی ناوچەکە گەیاندووە، هەروەک هاو پیشەکانی نێو بازاڕ. هەروەک دەزانن

"دارەکان"، بەگشتی هی ناوچە شاخاوییەکانی کوردستانە. بەڵام حەسیرەکان لە خوارووی عێراقەوە، بەتایبەتی لە زۆنگاوەکان و شاری بەسرەوە دێت.

دار فرۆشەکان دەلالی خۆییان هەیە. دارەکان لە مەزادی ئاشکرا دەکرن، دارەکان کۆمەڵ کۆمەڵ بابەت دەکرێن، بەگوێرەی باریک و ئەستووریان، راست و خوارییان. هەندێ جاریش دارفرۆشەکان بە لۆری لە ناوچەی خۆشناوەتی و سیدەکان و دۆڵی ئالانەو ناوچەکانی تر دەیانکڕی.

ئەو دارانەی دەیان فرۆشت ئەمانەن: دار ئەسپیندار و بی و دار چنار و دار گوێز و دار بەڕوو و دار مازوو: ئەمانەی خوارەوەش دار فرۆشەکانی سێتاقانن:

حاجی عومەر عەولا خۆشناو، حاجی حوسێن شێخ خدری هیرانی، حاجی تاهیر فریزی، ئەنوەر مەجید دەربەندی، حاجی باقی نازەنینی، حەمەدی حەمەسالح هیرانی، عەزیز رەشید سماقولی، حەیدەر مەجید دەربەندی، واحید کێخوا عەزیز، مەلا ئەحمەد گەرۆتە، ئەحمەد حەسەن سناوەیی، حاجی جەلال دەربەندی، حوسێن خدر هیرانی، حاجی سابیر گەرۆتە. حەوێز محەمەد نازەنینی، حەسەن کۆلکەڕەشی، لەتیف رەشید، حەمەد ئەمین کۆلکەڕەشی، جەمال حەسەن کۆلکەڕەشی، مەلا عومەر هیرانی، کێخوا ئەحمەدی دۆزێ.

## دارتاشەکانی سێتاقان

دار فرۆش و دارتاش، پەیوەندییەکی زۆر پتەویان لەگەڵ یەکدی هەیە. چونکە پیشەکەیان لە یەک نزیکە. بە زۆری دارتاشەکان داریان لە دار فرۆشەکان دەکڕی. زۆر رەنگینانە زۆربەی کەلوپەلەکانیان لە داری ناوخۆی کوردستان دروست دەکرد. بگرە هەر چەشنە دارێک بۆ پێداویستییەکی کشتوکاڵی تایبەت دەست دەدات و بەکاری دەهێنن. لە داربەڕوو بەکرەی بیری ئاوێ و کلکە قازمەو چەکوش و کلکە بیور و کلکە تەپشوو و کلکە ماوەران و دار کراوەی جۆتی و دار ئەستەندووی جۆتی، سەرە مژانکە، سەر گوارکەی هەپەو بەربۆسە دروست دەکرێ. بی کەژاو کەوە هێرەگ و کەوە بێژینگ و سەرەد و تەبەقەی حەلوای لێ دروستدەکرێ. هەروەها دار بی بۆ نیری جۆتی گایان بەکار دێت، چونکە "کونی" بەرین نەدەبوون دار چنارو کەوەت بۆ مزراح دروستکردن بەکار دێت. هەروەها دارتاشەکان درێشەو تیرۆگ و ناوبرێشک و سندوقی نوینان و کانتۆر و مێزو قەنەفەو کەرەوێت و سیسەم و گۆشەو کورسی و لانک و لانکۆکەی منداڵان و قیمەکێش و کۆلکی سەر شوشتن و شەنەو، دەسکە پێمەرەو خاکەنازو دەرگاو پەنجەرەو رەوڕەوەی منداڵانیان دروست دەکرد. بەڵام داری بیانی لە رووسیا و رۆمانیا دەهات و لەگەڵ مەعاکسی"سازی" ئەبوتێر مالیزیان بەکار دێنا.

دارتاشەکانی سێتاقان ئەمانەن: عەلی حەمەد و"بەهمەنی کوڕی"، بەکر محەمەد و "دیاری کوڕی"، حەمەدەمین گەردی و "وەستا کەمالی کوڕی"، عومەر کەریم کۆیی و کوڕەکانی "شوان و ئاکۆ و ئاسۆ"، دارتاشخانەی کوردستان خاوەنی"هێرش و ئازاد حەمە سالح نازەنینی"، دارتاشخانەی سەفین، خاوەنی وەستا سیامەند، دارتاشخانەی خۆشناو وەستا عەبدوڵڵای خدری خەجێ "هیرانی"، دارتاشخانەی هیوا خاوەنی وەستا فەرحان، دارتاشخانەی محەمەد خاوەنی وەستا ئیسماعیل قیرژەیی، دارتاشخانەی هێمن، خاوەنی وەستا زێندین، وەستا محەمەد، حاجی ئەحمەد فریزی و کوڕەکەی "جەبار"، سامی دەروێش، مستەفا رەحمان گوێ رەش، ئیدریس جەعفەر، ئازاد قادر، وەستا زەکەریا، حەسیب عەبدولڕەزاق، مەحمود کەریم، وەستا وەهاب، ئەحمەد کەریم، مەحمود سالح، جەلال عەبدولقادر هیرانی، کامەران قەساب، پیرداود محەمەد، کاروان عەباس، هاوڕێ عەباس، وەستا عەبدوڵڵا.

## جەنجەڕ و سێتاقان

لەبەر ئەوەی دەوروبەری سێتاقان هەمووی زەوی بەتاڵ بوون بۆیە زەوییەکەی گەنم و جۆیەکی زۆری لێدەچێنرا. هەروەها گۆڕەپانێکی تەخت و فراوانی لێ بوون بۆ جەنجەڕ و قرشەو جۆخینان لەبار بوون دوایی گۆڕەپانەکە بووە گۆڕەپانی یاریکردن. بەتایبەتی یاری تۆپی پێ. گەر باسی سێتاقان بکرێ، ناکرێ باسی جەنجەڕەکان نەکرێ. چونکە ساڵانە ئەو جەنجەڕانە بەگڕ دەکەوتنەوە. بەئاشکرا قرشەو ولاغ و جەنجەڕەکان دەبینران. خۆشترین شت لای منداڵانی گەڕەک ئەوە بوو کە سواری جەنجەڕ دەبوون.

ئەمانە خاوەن جۆخین و جەنجەڕەکانی سێتاقانن: سەید غەریب، مەلا داود خدر، سەید محەمەد سەید حەمەدەمین،

حاجی قادر باداوەیی، حاجی سەعیدی کەوری (باپیری عەبدوڵلا زەنگەنەیە). سابیر غەیبە، ئیبراهیمی سەعیدی، مەحموودی سەعیدی، حوسێن حاجی سالح، حاجی عەبدوللای حەمامچی.

## مەڕدارەکانی سێتاقان

سێتاقانییەکان جگە لەوەی بایەخیان بە فەلاحەتی و باخچەی سەوزەوات دەدا. هەندێکیان مەڕداریان دەکرد. سێتاقان لەلایەن میرییەوە بایەخی پێنەدرابوو، بۆیە هەتا حەفتاکانیش، کۆڵانەکانی قیرتاو نەکرابوون و لە دەوروبەری مزگەوتی شێخ عومەر بالیسانی چەند ماڵێک هەبوون مەڕدار بوون "جەرەبچی". لە مەیدانێ مەڕو بزنیان دەکڕی و دەفرۆشت. ئەو ماڵاتەی کە نەدەفرۆشران دەیانهێناوە سێتاقان. لەوێ "تەویلەو" جێگای تایبەتیان هەبوون مەڕدارەکان لە پێش ماڵی خۆیان ئاخوڕ و کۆلیان دروست کردبوو، بۆ ئالیک خواردن و ئاو خواردنەوەیان. بێریش دەیدۆشین و دوایی کاریلەو بەرخۆڵەکانیان تێبەردەدان و بەڵام بەناوبانگترین مەڕدارەکانی سێتاقان ئەمانەن:

حاجی حەمەد مریەم، دەروێش عەلی، حاجی عەولا عەزیز، خدر رەوەند" خەیلانی "باپیری زانا خەلیلی شاعیرە"، عەلی رەوەند"خەیلانی"،حاجی حەمەد، ئیسماعیل"سمە" قەساب، عەولا بۆری، مام نەعمان، حوسێن"حوسە"قەساب.

## وەرزش و وەرزشوانانی سێتاقان

وەک ئاشکرایە باب و باپیری سێتاقانییەکان هەر لەزووەوە فێری رۆیشتنی ماوەی دوورو درێژ بوون. ئەو کاروانچییانەی کە لە ناوچەی خۆشناوەتی میوەجاتیان باردەکرد گوند بەگوندی دەشتی هەولێر و کۆیەو بتوێن و پشدەر، هەر لەمولکییەو شەمامک و کەندیناوە بگرە تادەگاتە قەراجیش. هەمووی بەپێیان رۆیشتینە، جگە لەوەی شاردزاییەکی چاکیان لەم دەڤەرانە پەیدا کردووە، میوەجاتیان بە دەغڵ و دان گۆڕیتەوەو جارێکی تریش گەڕاونەتەوە ناوچەی خۆیان. ئەمەش جۆرێکە لە وەرزش "ماراسۆن"و چاکترین رۆیشتنە. جگە لەمەش ناوچەکە خۆی لە خۆیدا خاکەکەی بەرز و نزمییە. هەروەها بوونی فرە گۆڕەپان لە سێتاقان، هەمووی یارمەتیدەر بوون بۆئەوەی منداڵ و گەنجەکان وەرزش بکەن، بەتایبەتی تۆپی پێ. سێتاقان سەرچاوەی وەرزشی هەولێر بووە، گۆڕەپان و بنکەی لاوانی لێ بووە. کە ناوەندەکەی سێتاقانە. دەیان وەرزشوانی پێگەیاندووە. هەربۆیە سێتاقان چاکترین و زۆرترین یاریزانی شاری هەولێری تێدا هەڵکەتووە. چ لەیاری تۆپی پێ و باڵەو گۆڕەپان و مەیدان و بەرزکردنەوەی ئاسن.

گەر بهاتایە و یاریزانان وەکو ئەوروپا بایەخیان پێ بدرابایە ئەوە لەبەر جوان یاریکردن، یاریزانان "یوسف حەسەن خۆشناو"حاکم یوسف"، حەمید عەبدوڵلا قەراسنجی و سەید عەلی سەید محەمەد "سەید عەلی کارەباچی" باشترین یاریزانیان لێ دەردەچوو.

وەرزشوانانی سێتاقان جگە لە وەرزش، تێکۆشانی سیاسی و ولاتپارێزی و پێشمەرگایەتییان کردووە خوێنی خۆیان کردۆتە قوربانی خاک و ولاتی کوردستان و "٦" شەش شەهیدیان هەیە. ئەمانەن: شەهیدان "رەحمان حەسەن، فەرهاد محەمەد، فوئاد محەمەد، فەیسەڵ قادر سیاسی، سابیر مستەفا، یاسین حەمەد ئەمین خۆشناو".

عەزیز خدر: لە بەرزکردنەوەی ئاسن لە عێراق و کوردستاندا "لە هەولێر"، لەساڵی ١٩٧٢ لە"بەچکە شێران"و لەساڵی ١٩٧٤ لە لاوان و لەساڵی ١٩٧٦ - ١٩٧٧لە پێشکەوتووان پلەی یەکەمی وەدەست هێناوە. لەساڵی ١٩٧٩ لە سوریادا لە دوو پاڵەوانێتیدا پلەی یەکەمی وەدەست هێنا. کە کێشی "١٢٧ کگم" بەرزکردەوە، خۆی لە وەزنی"دیک - کەڵەشێر ٥٦ بوو".

تاهیر سابیر خۆشناو: وەرزشوانی بەرزکردنەوەی ئاسن بوو، لە وەزنی "٩٠- ١٠٠"کگم بوو. لەم ساڵانەدا لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق یەکەم بوون ١٩٨٠ لە تازە پێگەیشتووان، ١٩٨٢ لە پاڵەوانیەتی سوپای عێراق.١٩٨٣- ١٩٨٤چوارەمی خولی ئاسیا. لە ١٩٨٧ دووەم بوو لە پاڵەوانیەتی ئەنادۆڵی تورکیا. لەساڵی ١٩٨٨ بەشداری لە مەشقی مۆسکۆ کردووە. لەساڵی ١٩٨٩ پلەی چوارەمی لە چین وەدەست هێنا.

شاخەوان مستەفا خۆشناو: وەرزشوانی بەرزکردنەوەی ئاسنە، لە وەزنی ٦٧/٥. لەم ساڵانەدا لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق یەکەم بووە لەساڵی ١٩٨٧ لە

پاڵەوانیەتی عەرەب لە قاهیرە یەکەم بووە لە ساڵی ١٩٨٨ لە پاڵەوانیەتی نێو دەوڵەتی "عەبدولواحید عەزیز" لە بەغدا یەکەم بووە لەساڵی ١٩٨٩ لە پاڵەوانیەتی عێراق لە مۆسکۆ لە خولی مەشق و ڕاهێنان بەشدار بوو.

وەرزشوان: کاکە شێخ بابە شێخ بالیسانی: لە یاری کۆنفۆو لە پاڵەوانیەتی کوردستان و عێراقدا پلەی یەکەمی وەدەست هێناوە. لە کوردستان لە ساڵانی ١٩٩٦ - ١٩٩٧ - ١٩٩٨ لە یاری کۆنفۆ یەکەم بووە هەروەها لە عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣ - ٢٠٠٤ لە پاڵەوانیەتی کۆنفۆ یەکەم بووە.

لە سێتاقان وەرزشوانێکی زۆر هەن. بۆیە تەنها ناوی ئەوانەمان تۆمار کردووە کە تەمەنیان لە سەرووی "٣٠"سی ساڵییە. ئەمانەش وەرزشوانەکانن: سابیر حاجی حوسێن گەلاڵی "سابیر ڕیازی"، سەدیق گچکە، شەهید ڕەحمان حەسەن، ئازاد جەمیل خۆشناو، عەزیز مەولود، لەشکر حەسەن، عەبدی حەسەن، سەید عەلی بەرزنجی "سەید عەلی کارەباچی"، بایز مستەفا، ئەحمەد شێخە، جەلال عومەر خۆشناو "حاجی جەلال"، حاجی ساڵح، ساڵح گۆڵچی، عەبدولقادر سەعید "عەبدولقادرە گۆج"، سابیر حەنێ، سەید عەلی سەید مستەفا، ئیبراهیم گۆڵچی، ڕەشید ئەبوبەکر "ماستەر لە ئەندازە"، ئیسماعیل ئەبوبەکر، جەلال بەرزنجی، سەید ئەحمەد سەید مستەفا، سابیر عەدێ، سابیر حوسێن، سەید ساڵح سیفۆن، سەید موحسین سەید محەمەد، زرار ساڵح خۆشناو، حەمید عەبدوڵڵا قەراسنجی، عوسمان سەید غەریب، سەید سەباح، سەدیق ڕیازی، نەجم عەبدوڵڵا عەلی، محیەدین چاوشین، بەشیر فیتەر، کەمال عەبدوڵڵا، عوسمان عەزیز لەشکری، مەزۆ لەشکری، تاهیر سابیر خۆشناو، سەرتیپ عەلی، عەزیز کوردە، عەزیز خدر سەرسپی، عەزیز نامق گۆڵچی "عەزیز لەقتە"، شاخەوان مستەفا خۆشناو، خدر قادر، ڕەفیق ئەحمەد کەبابچی، خەلیل چاو ڕەش، فازیل عارەب، هیمداد لەشکری، محەمەد رووسی، د. جەمیل خۆشناو "دکتۆرا لە وەرزش"، مولازم زاهیر زاناوێر، تاریق فەتاح خۆرانی، زاهیر زەوقی، منەوەر گۆڵچی، ڕەقیب عومەر خۆشناو، کەریم عوسمان، باوە قاسم، عەبدوڵڵا محەمەد دۆرەیی "عەبدوڵڵا عەیشێ"، مامۆستا شێروان ساڵح "ماستەر"، سابیر ئەحمەد، شەهید فەرهاد محەمەد، شەهید فوئاد محەمەد، عەباس عەزیز لەشکری، شەهید سابیر مستەفا، شەهید فەیسەڵ قادر "سینەما" سیاسی، مامۆستا نەجات ئەحمەد، سالار موختار، غەریب عومەر خۆشناو، یوسف حاجی نادر، عەلی ئامە "عەلی ئەحمەد ئاوردە"، مامۆستا سەباح سەعید، ئیبراهیم درێژ، سەیفەددین عومەر خۆشناو، عەبدولخالیق خدر "گۆڵچی"، عزەدین خۆشناو، سەدرەدین خۆشناو، مۆفەق نامیق، مامۆستا ئیبراهیم محەمەد "ماستەر"، مامۆستا سەرتیپ عومەر خۆشناو "ماستەر"، عەبدولستار "عەبدۆ"، شەهید یاسین محەمەد ئەمین خۆشناو، شاخەوان عومەر، ئیسماعیل محەمەد، بیلال خالید، دلشاد حوسێن نەجم هیرانی، شێرکۆ حاجی عەلی، کامەران ڕەمزی، خالید حامید، سەید محەمەد "فەیسەڵ"، فەیزوڵڵا عوسمان، لەتیف سەید نیعمەتوڵڵا، مامۆستا ئازاد، عومەر خدر، ئازاد خدر، جمشیر فیتەر، سەلیم حەسەن خۆشناو، عەبدولقەهارعەزیز "قەهار چاوشین"، کاکە شێخ بابە شێخ بالیسانی، محەمەد مەلا حەسەن، دڵشاد حەمەساڵح، فەرهاد ئیسماعیل، فەرەیدوون حەمید، سادق حەمەشەریف، عومەر باپیر، بیلال ئیسماعیل، ئیسماعیل عەبدوڵڵا، ئیسماعیل کەریم، عەبدولقادر خدر، سەلام عومەر، فەرهاد ئەحمەد، سامان ئەنوەر.

## شێتەکانی سێتاقان

شێتیش مرۆڤە، وەک هەر مرۆڤێکی تری سەر ئەم زەمینە. بەڵام لە ڕەفتاردا جیایەو لە مرۆڤێکی ئاسایی ناچێ. چەند هۆکارێک هەیە وایکردووە ڕەنگدانەوەی خۆی لەسەریان هەیە. کە ئەم مرۆڤە بەم شێوەیە هەڵسوکەوت بکات. ئەمیش ڕەوشی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییە. بێگومان ڕەوشی کۆمەڵایەتی کاریگەرییەکی ڕاستەوخۆی بەسەر ژیان و گوزەران و خودی کەسەکەدا هەیە. هەر لەمنداڵییەوە وا گۆش کراوەو ترسێک لەدڵ و دەروونی جێگیر بووە. ئەم ترسەش بۆ ئەم پەروەردە سەقەتەی خێزان دەگەڕێتەوە، کە ئەم منداڵەی لێ گەشە کراوەو گەورە بووە. لە سەرەتا منداڵەکەی دەترسێنن بەجنۆکە و دێو و درنج و شەولەبان و پشیلە و سەگ و دەعباو جانەوەر، ئەم ترسەش بۆ لایەنی دەروونی زۆر خراپە و مرۆڤەکە گەورە دەبێت و ترسەکەش لەگەڵی دەژێت.

بەڵام ڕەوشی ئابووری. زۆرجار کە مرۆڤ زیاد لەپێویست بیر لەخۆی و خێزانی و منداڵەکانی دەکاتەوە، هەژاری و نەدارییە. گوزەران خراپییە. ئەم مرۆڤەی لێ دەردەچێت، کە کۆمەڵگا پێی دەڵێت: "شێت". ڕەوشی سیاسی پەیوەندی بەم ڕژێمە دکتاتۆر و فاشییانە هەیە، کە تروسکاییەک ئازادی و دیموکراتی تێدا بەدی ناکرێ. داوای یەک مافی سەرەتایی خۆت بکەی! ناکۆکن لەگەڵت و کونجی زیندان و لێدان و ئەشکەنجە، بەشی مرۆڤە ئازادیخوازەکانە. شێتی بۆماوەیی نییە!!.

## شێتەکانی سێتاقان ئەمانەن

أ) **ئافرەتەکان:** مەرزیە- بەدریە- کافیە.

ب) **پیاوەکان:** ئەنۆ، سوورە، ئەنوەر عەزیز، تەها منێ، قالە مردۆخ، فاخە، ڕەحمان.

**ئەنوەر عەزیز:** لە ساڵی ١٩٧٤ پەیوەندی بەشۆڕش دەکات و دەبێتە پێشمەرگەو لەدوای هەرەس هێنانی شۆڕشی ئەیلول، ئەو لە ئێران دەمێنێتەوەو لەساڵی ١٩٧٩ کاتی ڕاپەڕینە یەک لەدوای یەکەکانی گەلانی ئێران، دژی شا دەستی پێکرد، ئەنوەر بەشداری دەکات و لە پێشەوەی ڕاپەڕینەکە دەبێت و بەڵام ڕژێمی شا دەیگرێت و، لە بەندیخانەدا زۆر ئازاری جەستەیی دەدرێت تا شێت دەبێت. دوایی دەیگەڕێننەوە بۆ سێتاقان و هەولێر. لێرە کە تێک چووە، جارێکی دی تف لە وێنەکانی دیکتاتۆر دەکاو،"دائیرەی ئەمن" دەیگرێت و ئازار و ئەشکەنجەی دەدات و، دوایی دەزانن تێک چووە بەریدەدەن و، لەپاشان دەمرێت.

## چایچی و چایخانەکانی سێتاقان

سێ چایچی هەبوون، چایخانەیان لەناو بازاڕ بوو، یەکێکیان "مام عومەر خۆرانی" بوو چایخانەکەی لە نزیک سینەمای "حەمرا" بوو، تیپی وەرزشی "ئەتلەس"و کارگێڕەکانی لەوێ ڕۆدەنیشتن. هەروەها "مام هەمزە چایچی" ناسراوە بە"هەمزە شیوعی" چایخانەی بەرامبەر چایخانەی "سەید سەلیم" بوو، ئێستا بووەتە دوکاندار لە باڵەخانەی "یەحیا باجگر".

حاجی مستیل: بێگومان گەر باسی قاوەخانەی"عەبۆ و مەچکۆ"بکەین، دەبێ باسی حاجی مستیل بکرێ، چایخانەکەی لە شوێن کەبابی "باب القلعة" بوو، ئێستا بازاڕگەیە. دوایی چایخانەکەی لە دوکانەکانی بن قەڵا دانا، هەروەها ئەم چایچییانەی خوارەوە چایخانەیان لە سێتاقان هەبووە: حاجی ساڵح خۆرانی، حاجی جەمیل. مام خەلیل خۆرانی، خدر شیرەیی، مام مەجید، نەجیم باسە، حەمە ساڵح نازەنین، عومەر ئەفەندی ڕواندزی، عوسمان چایچی، قادر سینەما "دواتر بووە قادر سیاسی و باوکی دوو شەهید"، محەمەد سابیر خەلیل، محەمەد چایچی، مام واحید کۆیی، ئێستاش ئەم چایخانانە هەنە: ئاراس، بناری سەفین، خۆران، خەبات "ڕزگار هیرانی"، شیڤان"مام خدرو ڕەقیب"، مام سەعدون، چایخانەی حەمەساڵح نازەنینی: سێتاقان بوون بۆماوە"٨"ساڵ چایخانەی هەبوون بەزۆری ساردەمەنی لێدەفرۆشرا، جاری وا.

**مردوو شۆری ژنان ئەمانەن:** حاجی خەزال، سولحیە، غەریبە، گوڵبەهار، شوکریە، حاجی خێریە.

**مردوو شۆرەکانی پیاوان ئەمانەن:** حاجی ئەحمەد ئاوردە، دەروێش کەریم، عومەر خەپە "عومەر سماقولی"، فواد کەڕە.

## باخچەچییەکانی سێتاقان

باخچەچییەکان هەندێکیان نعوری سەربەخۆیان هەبوو، بۆ ئاودانی سەوزەکان، حەوزی ئاویشیان دروست کردبوو، بەڵام هەندێکیان نەیان بوو، بەئاوی باران، یاخود بەئاوی سیان و جۆگەی ماڵان سەوزەکانیان ئاودەدا، هەموو جۆرە سەوزەیەکیان دەچاند. توور و سلق و چەوەندەر و شێلم و خاس و کەوەر و کەرەوز و تەڕەتولە و سیر و پیاز. هەندێکیان بامیەو تەماتەو باینجان و کودی و بیبەریان دەچاند. زۆر جار لەنزیک حەوزو باخچەکەیان دەیانفرۆشت. بەناوبانگترین باخچەی سێتاقان ئەمانەن: حاجی فەتاحی برایمی، ڕەزاقی حاجی برایمی، مەلا داود خدر هەولێری، هاشم مەعروف، جەمال سەلیم، یونس محەمەد، شکور محەمەد، سلێمان حەمەد، یاسین هەینی، خدرە کەڕ، مام بیلال، حەمەد، ئەحمەد، عەبدولرەحمان "عەبۆ"، جەلال، مام وسو، ڕەمەزان حوسێن، زرار ئەحمەد.

## خواردنگە و ساردەمەنی

پێشان خواردن و شەربەت و ساردەمەنی لەسەر عارەبانە دەفرۆشران. لەفەو پاقلاوەو کوبە و شەربەت و

تورشیات.

ئەمانەی ئەم پیشەیان هەبوو ئەمانەن: لەفەفرۆشی "خورشید حەمەد ئەمین"، کوبە فرۆش "مام حوسێن"، تورشیات "عزەدین و نورەدین"، پاقلاوەفرۆشی"مام ئەسعەد"، شەربەت فرۆشی"حاجی فەتاح خۆرانی"، شێلم فرۆشی"حاجی باپیر سماقولی"، شەربەت و شێلم "حەمەسالح نازەنینی و مام سلێمان" دۆندرمە فرۆشی"حەمەد عەلی و مستەفا مەجید گەرۆتەیی"، هەروەها سمایل سیپەلاک و مام مشیر "سیپەلاک و فاتە رەشیان بە شیشە دەفرۆشت".

ئەم خواردنگە بەناوبانگانەش هەبوون: یەکەمین خواردنگە خواردنگەی برایانە "خاوەنی سیامەند و تەحسین و موحسین"، چنارۆک "سیامەند مامەند قیرژەیی"، ڕێمان "مەجید خۆشناو سەفۆ" "سەیفەدین عومەر"، گەسی سێتاقان "خاوەنی حەمەد ئەمین بێراوەیی"، چێشتخانە و گەسی هاوڕێ خاوەنی "سەید عوسمان سەید محەمەد بەرزنجی"، کەباب و چێشتخانەی سێتاقان خاوەنی "مام مشیر و نەوزادی کوڕی". هەروەها ساردەمەنی سەری رەش خاوەنی ئەدوەر مخایل.

**- ئێستا کە ساڵی (٢٠٠٦)ە، ئەم بەڕێزانەش ئەم کارانەیان بەدەستە:**

* **مامۆستا:** محەمەد عەلی ئەبوبەکر یەکەم کەس بووە لە سێتاقانییەکان بووەتە مامۆستا. ئێستا جێگری سەرۆکی لقی هەولێری یەکێتی مامۆستایانی کوردستانە.
* **ئەندازیار:** بەدرەدین سەید نیعمەتوڵلا یەکەم ئەندازیاری سێتاقان بووە.
* **پزیشک:** یەکەم پزیشکی (ئاژەڵ-بەیتەری) لەسێتاقان عەزەدین سەید نیعمەتوڵلایە.
* **راگری کۆلێژەکان:** د. سەلام حەسەن خۆشناو" راگری کۆلێژی ئادابە.

د. جەمیل خۆشناو"یاریدەدەری راگری کۆلێژی پەروەردەی وەرزشییە.

* **دادوەر و پارێزەر،** یوسف حەسەن خۆشناو. لە سەرەتای هەشتاکان بەشداری شۆڕشی نوێی گەلەکەمان دەکات. لەنێو شۆڕشدا دەبێتە دادوەر. یەکەم دادوەر لە سێتاقان. نیشتەجێی ئەڵمانیایە. لەم دواییانە بەیەکجاری گەڕاوەتەوە کوردستان.

د. نیهاد مستەفا: بڕوانامەی دکتۆرای لە بواری پزشکی لە ئەڵمانیا بەدەست هێناوە.

* سەعید خۆرانی: یەکەم کەسە دوکانی (نووسینگەی) بۆ کڕین و فرۆشتنی خانووبەرە و زەوی هەبووە.

**مین:** یەکەم کەس لەسێتاقان کە بە مین (ئەلغام) قاچێکی لەژێر کلاوە چۆکی بڕایەوە، (قاسم مستەفا لۆلان) بووە.. ساڵی ١٩٧٤ دەبێتە پێشمەرگە لەدەستەی مین چاندن دەبێ، دوای هەرەسی شۆڕش. ڕژێم پێی دەزانێت بە خورتی و بەزۆرەملێ دەیبات بۆ پووچەڵکردنەوەی مین لەچیاکان. لەئەنجامی ئەم کارانەدا قاچێکی لەدەست دەدا. پاشانیش دەچێتە وڵاتی سوید و ئەمەریکا. ئێستا لەقەڵاتی هەولێر مۆزەخانەی مافوور و کەلەپووری کوردەواری داناوە لەسەر ئەرکی خۆی.

**بەیتارەکان:** بەیتار، پەیوەندی بە شکان و لە گەڵچوون و دەرزبردنی جومگەو ئێسقانەکان لەگەڵ وەرگەڕانی دەمارەکانەوە هەیە. لە سێتاقان ئەم دوو بەیتارە هەنە: دەروێش کەریم و حاجی عومەر تەلان.

**بزووتنەوەی قوتابیان:** بزاقی قوتابیان لە سێتاقان لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠ و لەگەڵ بەیانی ١١ ئاداردا سەری هەڵدا. بەئاشکرا قوتابیان کاری ڕێکخراوەییان دەکرد.. کۆمەڵێک خوێندکاری خوێن گەرم لەم بوارە فراوانەدا هاتنە مەیدان و چالاکییان دەنواند. لەسەرەتای حەفتاکان دوو بزووتنەوەی قوتابیان هەبوو. یەکێتی قوتابیانی کوردستان و یەکێتی گشتی قوتابیان. قوتابیان لەم دوو ڕێکخراوە بەئاشکرا کاری ڕێک ڕێکخراوەییان ئەنجام دەدا. نوێنەریان لە قوتابخانەکان هەڵدەبژارد و داکۆکییان لەمافەکانی خوێندکاران دەکرد. هەروەها بەشدارییان لە دەرکردنی بڵاو سەر کراوەی دیوار و بەشداریان لەکاری شانۆیی قوتابخانەکان و بۆنە نیشتیمانییەکان دەکرد.. خوێندکاریان ڕۆشنبیر دەکرد و.. هانیان دەدان بۆ خوێندنەوەی رۆژنامەو گۆڤار و کتێبی هەمە چەشن.. ئەمانە ڕووە جوانەکانی ئەم بزاڤەیە. بەڵام ڕووە ناشرینەکەی ئەوەیە (یەکێتی قوتابیان) لێژنەی کوتەکیان هەبوون بۆ لێدان و سەرکوتکردنی نەیارانی خۆی..

لەدوای هەڵگیرساندنەوەی شەڕ لەنێوان شۆڕش و ڕژێمی بەعسدا لەساڵی ١٩٧٤دا قوتابیان تووشی گیران و ڕاوەدوونان بوون لەلایەن ڕژێمەوە. بەرچاوترین قوتابیانی ئەم بزووتنەوە ڕێكخراوەییە ئەمانە بوون: وەیس ساڵح. نەجمەدین حەمە عەلی سیان. تابع یابە. ئەبوبەكر خۆشناو. عەزیز بارزانی. شەهید سەباح نادر. سەباح جەلال. قاسم ئەبوزێد. سەدرەدین خۆشناو. بەكر زانا. محەمەد حەسەن باوەكر. سەید محەمەد غەفور. عەبدولخالق مستەفا. ئازاد عوبێد چاو شین. عەلی قادر. تەها جەبار. عومەر ساڵح. مەجید حاجی عەزیز عەوێنەیی. عومەر حاجی. بەكر حاجی. حەسیب عەبدولحەمید. نەسرەدین ئیسماعیل. موحسین سەید محەمەد. شكروڵلا شێخانی. ئەبوبەكر (یاریدەدەرێكی پزیشكی). شەهید سامی عومەر ئەفەندی ڕواندزی، سادق ڕەسول "سادقە سوور"، ئەحمەد كەریم، عەبدولڕەحمان باقی خۆشناو.

**خاوەن بڕوانامەكانی سێتاقان ئەمانەن:**

ئەمانە خاوەن بڕوانامەكانن. كە لە بوارە جۆر بە جۆرەكان بڕوانامەیان وەدەست هێناوە. - عەبدوڵلا پەشێو (دكتۆرا لە ئەدەب)- عەبدولقادر سەعید فەرهادی (ماستەر لە زمانی ئینگلیزی) - د. مستەفا سەعید (دكتۆرا لە فیزیا. نیمچە گەیەنەرەكان). - ئەیوب سابیر خۆرانی (دكتۆرا لە فیزیا ((material scince-ceramic Engineering - نیهاد مستەفا (دكتۆرا لە پزیشكی فریاكەوتن و نەشتەرگەری)- فەیزوڵلا خۆشناو (ماستەر لە ئێسقان) - سیروان ئەحمەد گەرۆتە (ماستەر لە نەشتەرگەری) - كەمال مستەفا خۆشناو (ماستەر)، مامۆستایە لە كاترینا هۆڵم لە سوید- تەیب سابیر (دكتۆرا لە نەشتەر گەری) - عەبدوڵلا محەمەد عەلیاوەیی (دكتۆرا لە مێژوو) - سەلام حەسەن خۆشناو (دكتۆرا لە مێژوو) - جەمیل خۆشناو (دكتۆرا لە وەرزش) - پەخشان سابیر حەمەد (دكتۆرا لە ئەدەبی كوردی) - ئەبوبەكر خۆشناو (ماستەر لە ئەدەبی كوردی) بەكر سەید غەریب (دكتۆرا لە زمانی عەرەبی) - ڕووناك سەید نیعمەتوڵلا (ماستەر لە پەرستیاری) - كەمال سەعدی (دكتۆرا لە یاساو ماف) - شوكریە سوارە (ماستەر لە بایەلۆژی) - سەمیرە سوارە (ماستەر لە بایەلۆجی) - رابیعە فەتاح خۆرانی (ماستەر لە مێژووی كورد) - ڕەشید ئەبوبەكر (ماستەر لە ئەندازیاری) - سەرتیپ عومەر خۆشناو (ماستەر لە وەرزشی تۆپی پێ) - ئیبراهیم محەمەد (ماستەر لە وەرزش) - شیروان ئەحمەد گەرۆتە (ماستەر لە نەشتەرگەری) - سادق عەزیز خۆشناو (خوێندكاری دكتۆرا لە نەشتەرگەری لە ولاتی سوودان) - نەوزاد حەوێز خۆشناو (خوێندكاری دكتۆرا لە ماف لە ولاتی سوودان) - موختار حەسەن خۆشناو (خوێندكاری دكتۆرا لە زانستەكان بەشی كیمیا لە ولاتی بەریتانیا) - شێروان ساڵح (خوێندكاری دكتۆرا لە وەرزش لە زانكۆی موسڵ) - فەرهاد نیعمەتوڵلا (خوێندكار دكتۆرا لە بەشی هەناو) - جاسم تۆفیق خۆرانی (دكتۆرا لە مێژوو) لە ولاتی ئیتاڵیایە. - هیمداد حەوێز خۆشناو (خوێند كاری ماستەرە لە بایەلۆجی مشەخۆردكان) - مەریوان سابیر حەمەد (خوێندكاری ماستەرە لە ماف) - ئازاد عوبێد (دكتۆرا لە مێژووی ڕۆژنامەگەری كوردی) - سەنگەر داود شرۆڵ (خوێندكاری دكتۆرا لە یاسا)

## ئەندازیارەكانی گەڕەكی سێتاقان

یەكەم ئەندازیار، بەدرەدین سەید نیعمەتوڵلا - ڕەشید ئەبوبكر - عوسمان حاجی نادر خەیات - فەرهاد عوسمان - سەلاح حەمە هیرانی - فارس سەعدی - زیاد مستەفا - عەبدول قادر مەلا عەلی (لە ئەوروپایە) - محەمەد حوسێن - جەلال حەمەد ئەمین گەردی - شەهید ئیبراهیم عەبدولحەمید (هەڵمەت عەبدولحەمید) تەلار ساز- سەعد عەبدولڕەحمان (تەلارسازی لە ئەوروپایە) - نەژاد خدر خەیات - زیرەك حەسەن خۆشناو - داود غەفور - نەریمان كاكە سوور هیرانی - یاسین سەدیق - كاروان حەمەدئەمین خۆشناو - یوسف شەفیق گەرۆتەیی - كامەران ئەحمەد گەرۆتە (دانیشتووی نەرویج) - غەفور كاكە - دارەوان مستەفا خۆشناو (دانیشتووی ئەمریكا) یە - عەبدوڵلا زەنگەنە - سیروان حەوێز خۆشناو.

## پزیشكەكانی سێتاقان

سێتاقان ئەم پزیشكانەی تێدا هەڵكەوتووە - عیزەدین

سەید نیعمەتوڵڵا یەکەم پزیشکی بەیتەرییە - فەیزوڵڵا جەلال خۆشناو (ئێسقان و جومگە) - نیهاد مستەفا (نەشتەرگەری) دانیشتووی ئەڵمانیایە - سیروان ئەحمەد گەرۆتە (نەشتەر گەری) - شێروان ئەحمەد گەرۆتە (نەشتەرگەری) - بەروار حاجی نادر خەیات (لە ئەوروپا) سادق عەزیز خۆشناو (نەشتەر گەری) محەممەد شەریف (مندالآن) -خەدیجە محەممەد عەلیاوەیی (ددان) - سکالآ ئەکردم (ددان) - عومەر باقی نازەنینی لە ئەوروپایە - جوان ئەحمەد گەرۆتە (ئافرەتان) - سیروان ئەحمەد حەسەن سناوەیی (ددان) - یوسف بەهادین - تەیب سابیر کەریم خۆرانی (نەشتەر گەری) - کاروان مەلا خدر سنجاوی (قورگ و لووت و گوێ) لە وڵاتی سویدە - فەرهاد سەید نیعمەتوڵڵا (هەناو) - کاوێس عومەر

- دوو پزیشکی تازە دەرچوو (موقیم) توانا تاهیر خۆشناو و هەڵمەت حەویز خۆشناو، نەودیەکی تریش بەرێگاوەیە.

### مەکوچییەکانی سێتاقان

لە سێتاقان ئەمانە دووکانی مەکویان هەبووە، یەکەم کەس مامۆستا خالید سماقولی دوکانی مەکوی دانا. پاشان مەکوی شوان خاوەنی مامۆستا شوان، مەکوی کریستاڵ خاوەنی مامۆستا خورشید. مەکوی ئاشتی خاوەنی ئەیوب

### دوکاندارەکانی سێتاقان

بێگومان دوکاندارەکان ژمارەیان زۆر زۆرە. بەڵام ئێمە ئەوانە تۆمار دەکەین کەزیاتر بەرچاو و دێرین و ماوەیەکی زۆر لە کارەکەیان ماونەتەوە. ئەمانەش دوکاندارانی سێتاقانن: خەلیل-عەبدول حەمید-حاجی عومەر تەلان-ئەنوەر تەلان- ساڵح سوێردیی- سەید محەممەد سەید حەمەد ئەمین- کانەبی مستەفا- حاجی شێم حەمەد مستەفا- مەلا زادە خۆرانی- کەریم عەبدوڵڵا قەراسنجی-سەید مەلا نووری-سەید کەریم- عومەر مستەفا بەگ-حاجی هەینی- حاجی مەجید هیرانی - مام حوسێن - حوسێن تەها هیرانی- ئەحمەد کۆیی باوکی هونەرمەندی خوالێخۆشبوو (سوبحی کۆیی) - حاجی مەولود شورتە-مام شێخە- مام ساڵح- مام سەعید- سەید محی الدین سەید غەریب- فەتاح ئەسپینداری- سەید موحسین- مام سوارە-حەسەن ئەحمەد دۆرەیی- خدر هەینی- نووری سوسەیی- سمایل خۆرانی- مەلا خدر حاجی- حاجی رەشید- مەعروف عومەر-مام خدر-نیعمەت خدر-م/خورشید حەمەرەشید-م/رەحمان-رەقیب عومەر خۆشناو-عوسمان هیرانی- رزگار حوسێن- حاجی موراد قەراسنجی- حاجی قادر حوسێن بەگ- ئەمین حاجی کەریم- سەید سمایل- مەلا عەولای حاجی مەلا بەکر-حاجی ئەسعەد قەراسنجی- حاجی برایمی کونە فلوسەیی-حاجی حوسێن کونە فلوسەیی- حاجە مەلا سارتکەیی-مەلا بەکر شێخە- خالید و نامیق- مەلا گۆجە.

### کوتاڵ فرۆشەکانی سێتاقان

ئەوانەی دوکانی کوتاڵیان هەیە ئەمانەن: مەلا حەسەن جوامێر- مەلا عوسمان حوسێن گەلاڵی- محەممەد مەلا حەسەن- حاجی عەزیز دیبەگەیی-سەلام حاجی عەزیز-حاجی تۆفیق رواندزی- قاسم عوسمان- حاجی نادر خەیات- خدر خەیات- دلشاد حاجی نادر- ئیبراهیم حاجی فەقێ ئەحمەد- مەجید حاجی کاکۆل فریزی- کمال حاجی کاکۆل فریزی- سەعید عومەر دەربەندی(دەستگێری عەرەبانە)- مەلا بکر شێخە-

### نانەواخانەو سەمونخانەکانی سێتاقان

سەرەتا سەمونی (عاشە)ی ئامادەکراو بە ئۆتۆمبێل دەهاتە سێتاقان و لێرەش دوکان هەبوو، بەشی خۆیان وەردەگرت و دەیانفرۆشتەوە. سەمون بە پێنج فلس بوون. یەکەم جار لە سێتاقان (مام سمایل)و یاسینی کوڕی ئەم سەمونانەیان وەردەگرت و دەیان فرۆشت. دواتر (مام قادر سینەما) ئەم سەمونەی دەفرۆشت بەڵام یەکەم فرنی (سەموون خانە). لە سێتاقان هی حاجی سەعید تورشی فرۆش بوو.

مام مەجید قەساب یەکەم گۆشت فرۆشی گەڕۆک بوو گۆشتی لەناو سەبەتەی دادەناو لە کۆڵان و شەقامەکان فرۆشتوویەتی.

(حاجی باپیر حەلاق) یەکەم سەرتاش و دێرینترینیانە لە سێتاقان.

* دێرینترین حەمباڵ (حەسەن حەمباڵ) ە پێیان دەگوت حەسەنە خوار. بە دەفلس باراشی بۆئاشی دەبرد و لێی دەکرد و دەیهێناوە.

## ئافرەت و کاری پزیشکی میللی

ئەو ئافرەتانەی کاری تەبیبی میللییان لە سێتاقان دەکرد. ژن و منداڵیان چاکدەکردەوە.. ئەمانەن:

**حاجی بەسێ:** چارەسەری نەخۆشی ئافرەتانی دەکرد. چاککردن و سووڕان و وەرگێڕانی سکی ئافرەتانی دووگیان.

**دایە گوڵێ شێروانی:** تا و لەوزەتێن بە شێلان و چەورکردن چارەسەری سروشتی (عیلاجی تەبیعی) چارەسەری دەکرد.

**ئایشە فریزی** ئەمیش ژنانی نەخۆشی چاک دەکردەوە.

**خەدیجە حاجی حوسێن خۆشناو:** ئەو منداڵانەی مەرازەیان کەوتبا. واتە لەوزەتێنی هەبا. پەنجەی لە قوڕگی رادەکرد و لەوزەتێنەکەی پاڵ دەدا. دوایی چەوری دەکردو دەیگوت ئەمە مەرازەی کەتووە. ئەمەی لەباوکی بۆ بەجێ مابوو. یاخود ئەگەر منداڵێک خێڵ یا چاوی سوڕابا چاکی دەکردەوە.. یاسکی ژنانی دووگیانی چەور دەکرد و چاکی دەکرد.

**(گوڵێ و خێزانی حامید گەڕۆتەیی)** پشت و سکی ژنانی چاک دەکردەوە.

**پلکە شیرن:** دایکی شاعیر (بەکری مەلا رەش) دەرمانسازێکی باش بوو. داوودەرمانی کوردەواری لە گژ و گیا بۆ منداڵ و گەوران دەگرتەوە و چاکی دەکردنەوە.. زەرگەتە و زەنگە سۆرە بەمنداڵێکی وەدابا. زوو منداڵەکە بەگریان و ئاخ و ئۆف دەچووە لایی و دەرمانێکی لێ دەدا و ژان و ئازارەکەی نەدەما.

**پلکە باوی:** پشت و سکی ژنانی چەور دەکرد و گەر ژنەکە دووگیان بووایە، زگەکەی چەقی با چاکی دەکردەوە. مامانەکانی سێتاقانیش ئەمانەن: ئامینە هیرانی- پلکە عەنبەر هیرانی- مەحبوبێ عەلی- پلکە عەیشێ دایکی (عەزیز مەولود)- ساجیدە هەولێری- سەید بەسێ- پلکە فاتم (دایکی مامۆستا زاهیر)- ئامینە (خەسوی عەلی رەوەند)- گوڵستان- ئامینە (دایکی ئیبراهیم)- حاجی هەیبەت- پلکە عەیشێ- پلکە حەلیمە- حاجی هەیبەت- پلکە زەخێ - حەلیمە (دایکی مام مشیر)- هەیبەتی ئاریانێ-پوورە زوبێد هیرانی- مریەم فەقێ عەولا خۆرانی.

## بەرگدرووەکانی سێتاقان

بێگومان هەندێ بەرگ درووەکانی بەرگدروویان لەنێو سێتاقان بوو، بەڵام ئەوانی دی دوکانیان لە نێو بازاڕ بوون. پیاو و ژنی بەرگدروومان هەنە. بەرگ درووە پیاوەکان دەرپێی سپی و کراسی بەکەلانگوچک و لەگەڵ جل و بەرگی کوردی رانک و چۆغەرو کورتەک و شەرواڵ بە هەموو جۆرەکانییەوە دەدوورن. بەم دواییە بەرگ درروەکان کراس و پانتۆڵیش دەدورن.. بەرگ درووەپیاوەکان ئەمانەن:

حەمەد مستەفا- حاجی نادر خەیات- خدر خەیات- حاجی حەمەد ئەمین- نەجات خەیات- موحسین خەیات- خاڵە حەمید مهاجیر- مەلا یوسف هەرکی- مەلا حوسێن خەیات- وەستا مستەفا گەلیباوەیی- غەفور هیرانی (بێستۆن)- هەڤاڵ ساڵح هیرانی(هەڤاڵ)- وەستا سەعدی هیرانی(فرمێسک)- حاجی تاهیر خۆشناو- علی خدر خەیات- حاجی مەجید خەیات- حەسەن گەلیاوەیی- حاجی حەمەدەمین کەریم کۆیی- حاجی مەمۆ قیرژەیی- حاجی سەدیق قیرژەیی- مەلا مستەفا بلباس- عەزیز سماقوڵی- کەمال فەقیانی- ئەرسەلان مەلا یوسف هەرکی- سلێمان خەیات- محەمەد حاجی مراد شیوەڕەشی.

**بەرگدرووی ژنان:** پێشان بەرگ درووی ژنان، تەنها جل و بەرگی کوردیان دەدوری وەک کراس و کەوێ و سوخمە و فیستان و یەلەگ و سەڵتەو چاکەت. لەگەڵ جل و بەرگی منداڵان. بەڵام بەم دواییە هەندێکیان فێری دروونی کراس و تەنوورە و بەدی و چاکەت و پانتۆڕ بوون. بەرگ درووە ژنەکان ئەمانەن: سەید قەدریە- گوڵێ شێروانی- زەکییە- کەلسوم- عەیشێ ئاکرەیی- گولیزار ئیبراهیم خۆشناو- شوکریە سەلیم خۆشناو- فەخریە حەویز خۆشناو-بەیان فەخریە خەیات- قەدەم خێر حەوێزی کابانێ- بێری ئیسماعیل- حەلیمە رواندزی- بسکان- چیمەن- ئەدیبە خدر- عەیشێ کۆیی- نێرگز عومەر کۆیی- مریەم (دایکی عەبدول خالق) عەبای ژنانی دەدوری- نەجیبە سەید کەریم- جەمیلە محەمەد - گوڵێ - وەسفیە خان- قەدریە خان- نیگار عومەر بۆرە- نەسیبە قادر- ئامینە سمایل.

### ڕووداوەکانی سێتاقان

ئەو ڕووداوە کاریگەرانەی کە مردنیان لێ کەوتۆتەوە. سێتاقانییەکان بوونەتە قوربانی. بێگومان. ئەمانە تامردنیش لە هزری خەڵکەکە ناچنە دەرەوە چ ڕووداوی سروشتی بن یا دوژمنانی کورد بەناهەق خەڵکی سڤیل و بێتاوانیان دەکوشت. یان بە ڕێکەوت کارەساتەکان ڕوودەدەن.. یاخود مرۆڤەکانی بە نەزانینی کارێکی چەوت بە ئەنجام دەگەیەنێت. ئەمانەش هەندێ ڕووداوی جەرگبڕی لێ کەوتۆتەوە. هەر گەڕەکێک گەلێک ڕووداو و کارەساتی تێدا ڕوویداوە، ئێستاش خزم و کەسیان ماون و نامانەوێت برینەکانیان والابکەین و زامەکانیان قووڵتر بکەین.

غەریب کۆیی: گەنجێکی کەشخەو قۆز لە تەمەنی لاویەتیدا بوون. لە سەرەتای شەستەکان لە زێی خنکاو تەرمەکەی هاتەوە سێتاقان.

مام سۆفی و مەحمود حاجی بابە قیرژەیی: لە شەستەکان تاقمی شێخ عەنەش لەلای گوێڕی ئەم دوو مرۆڤە بێتاوانەیان کوشت. مام دەروێش کۆمەڵێک منداڵی لە دوای خۆی بەجێهێشت.

ئاسۆی موعەلیم و هەڵکەوت عەبدولحەمیدی ئەندازیار. لە کارەساتی (١) شوبات دا لەشاری هەولێر شەهید بوون و سێتاقانیشی لەم قوربانییە بێ بەش نەبوو کە تیرۆرستان دەستی چەپەڵیان گەیاندە ئەم پەپوولانە و.. خوێنە سوورە گەشەکەیانی ڕژاند..

### مامۆستا سەدیق گچکە

مامۆستا سەدیق گچکە، وەرزشوانێکی لێهاتوو بوو لە تۆپی پێدا. جگە لە تیپەکانی سێتاقان یاری لە هەڵبژاردەی یانەکانی هەولێر و بروسک و پەروەردەی هەولێر دەکرد هێرش بەربوو. هەروەها لە سێتاقان سەرۆکی تیپ و کاپتن بووە. لە گۆڕەپانی یاری و مەیداندا لە ڕاکردنی (٥٠٠٠) مەتر بەشداری کردووە و ئەنجامی باشی بەدەست هێناوە.

### تووتنفرۆشەکانی سێتاقان

سەرەتا تووتنفرۆشەکان لەبازاڕی قەسیەری بوون، دواتر بە بازاڕی تووتنفرۆشەکان گواسترایەوە و نزیک باغی شار و لە کۆڵانی کەبابخانەی کۆیە بوو، بەڵام لە دوای ڕاپەڕین و لە گرانییەکە ژمارەی تووتنفرۆشەکان لە ڕادەبەدەر زیادی کرد و لە دەوروبەری بازاڕی شێخەڵلا و باغی شار بوون.

تووتنفرۆشەکان زۆربەیان خۆشناون. جگە لە دووکاندارەکان، زۆری دیش دوکانیان نەبووە. ئەمانەش ناوی دوکاندارە تووتنفرۆشەکانی سێتاقانن:- - حاجی محەمەد دۆزەیی- حەمەدی فەقێ ئەحمەدی هەرتەلی- حاجی ڕەحمان سووسەیی- سەید حەمەد ئەمین تووتمەیی- حاجی حەسەن خۆشناو - حەمەد ئەمین سوێرەیی- مام سلێمان- حاجی حەوێز ئەحمەد زێتوەیی- حاجی حەوێز فریزی- حاجی کاکۆل فریزی- حاجی ڕەزا بیرۆکەیی- حاجی حەمەد ئەمین حاجی حەمەد(باوکی عەلی سۆر)- ئەحمەد حاجی حەسەن ئەسپێندارەیی- حاجی فەقێ ئەحمەد زێتوەیی- حاجی فەقێ ئەحمەد شێخ وەسانی- حاجی حەمەد ئەمین وەرەیی- حاجی مەغدید- حاجی عەولا چیوەیی- حەمەدئەمین عەزیز- قادر عەزیز- حاجی نووری بێراوەیی- حاجی حەمەد ئەمین مستەفا- حاجی کەریمی خەجێ سارتکەیی- حاجی حەمەد توتمەیی- حاجی مستەفای ماونان- مام حارس - حاجی حەسەن بلەیی- سلێمان بناری- سمایل تەها سەردۆری- ئیسماعیل محەمەد عەزیز.

## گەڕەکی ئیسکان

### سنووری گەڕەک

ئیسکان، وەکو گەڕەکێکی هاوچەرخ و بەحوکمی ئەوەی کەوتۆتە نێوان چەند گەڕەکێکی دیاری وەکو : کۆماری، موفتی، ڕووناکی، سەیداوە، باداوە، سنوورەکەی



لەلایەن شارەوانییەوە چەند جارێک دەسکاری کراوە، بۆنموونە لەهەندێک کات خانووەکانی بەلاشاوەی خراوەتە سەر، سنووری ئێستای گەڕەکەکەش لەلایەن شارەوانی بەو شەقامەی کە لە هۆڵی گەلەوە دەست پێدەکات، تا بنکەی پۆلیسی ئیسکان و لەوێشەوە بەرەو خۆرهەڵات تا شەقامی باداوە و ئینجا بەرەو باکوور تا خانووەکانی وەزیران و لەوێشەوە تا چوارڕیانی گادگرۆس دەبێت.

گەڕەکی ئیسکان، لە سێ بەش پێکهاتووە ئیسکانی کۆن، ئیسکانی نوێ و شوقەکان وپێکهاتەی دانیشتووانیشی زۆربەیان کوردن و ئەوانی دیکەش شارستان و بە زمانی تورکی قسەدەکەن و کەمایەتییەکی مەسیحی تێدا دەژین. شایانی باسە ئەو پێکهاتانەی بەتەبایی و برایەتی پێکڤە دەژین و هیچ گرفتێکیان نییە، پێچەوانەی ویستی هەندێک لایەن کە دەیانەوێت تاوێک بەهەستی نەتەوەیی و تاوێک بەهەستی ئایینی درز بخەنە نێو میللەتەوە.

## مێژووی دروستبوونی

ئیسکان، گەڕەکێکی هاوچەرخە و تەمەنی نزیکەی (٣٦) ساڵێک دەبێت. سەرچاوەی ناوەکەشی بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە دوای شۆڕشی (١٤) تەمموزی (١٩٥٨) میری پرۆژەی گەڕەک دروستکردنی، وەکو چارەسەرییەک بۆگرفتی نیشتەجێکردن لەزۆربەی پارێزگاکان ڕاگەیاند و لەلایەن وەزارەتی (الاشغال والاسكان) جێبەجێ کران، هەربۆیەش گەڕەکی ئەم پارێزگایانە بەئیسکان ناونران، ئەو گەڕەکانە سەرجەم خانووەکانی یەک نەخشەو دیکۆرن و لەماوەیەکی دیاریکراودا دروستکران، گەڕەکی ئیسکانی هەولێریش، کە پێشتر زەوییەکانی هی عەلی ئەحمەد ئاغا بووە و دەغڵ و دانی لێ چاندراوە. بەسێ قۆناغدا دروستکران. قۆناغی یەکەمی لەساڵانی شەستەکانەوە بنیات نراوە سەرەتا بەسەر برادۆستییەکان کە بەسۆفی ناسرابوون لەگەڵ بارزانییەکان دابەشکرا، ئەمەش وەکو دەرئەنجامێکی گفتوگۆی نێوان سەرکردایەتی کوردو حکومەت، لە وساڵانەدا و پاشان بەهۆی بنبەست بوونی گفتوگۆیەکان، میری سەرجەم سۆفی و بارزانییەکانی دەرکردو لەهەڵمەتێکی بەرفراوانی تەعریبدا، بەسەر عەرەبەکانی هاوردەی دابەش کرد. ئەو عەرەبانە، کە هەموویان بەعسی بوون، تا ئەوکاتەی گەڕەکەیان جێهێشت خەڵک بەچاوی ڕقەوە سەیری دەکردن، تەنانەت بەردەوام شەڕی منداڵانی کوردو عەرەب لە نێو کۆڵانەکاندا بەرپادەبوو، کە ناویان نابوو (شەڕە کەستەک) هەرکاتێکیش ڕاوی منداڵە عەرەبەکانیان نابایە، ئەوا پۆلیسەکانی بنکەی ئیسکان، بەتایبەتیش پۆلیسە عەرەبەکان دەهاتنە ناوەوە و منداڵە کوردەکانیان بلاوە پێدەکردو دەیانگرتن. ئەوخێزانە عەرەبانە تاوەکو ڕاپەڕینیش تاوکوتەرا هەرمابوون، لەوانەش ماڵی (حەمشە) کە پێنج کوڕی هەبوو بەناوەکانی (سەدام، حوسێن، ئەحمەد، حەسەن، بەکر) هەرکاتێک بانگی بکردبوونایە، دوو ناوی دەگوت (سەدام حوسێن) و (ئەحمەد حەسەن بەکر) یەکسەر پێنج کەس دەچووە ماڵەوە. بۆیە ئەو بەشە کە یەکەم جار دروستکرا ناوی نرا (ئیسکانی کۆن). قۆناغی دووەمیش لەساڵی (١٩٧٠) دەست بەبنیادنانی کراو لەساڵی (١٩٧٣) تەواوکرا، کە بەسەر فەرمانبەرانی میری دابەش کرا و بەئیسکانی نوێ ناسرا. لەسەرەتای ساڵانی هەشتاکانیشەوە شوقەکانی ئیسکان دروست کران، کە لەباڵەخانەی (٣) نهۆمی پێک هاتووە و شەش ماڵ لەخۆدەگرێت بە(شوقەکانی ئیسکان) ناسران. ئەم شوقانە بەکرێیەکی مانگانە بەسەر فەرمانبەران و مامۆستایان دابەش کراو دواتر بەناویان کراو ئێستاش دەستکارییەکی زۆری کراوە، شێوازی جارانی خۆی ون کردووە و زۆربەشیان فرۆشتیان و خەڵکانی دیکەی نیشتەجێ بووە.

## دامودەزگاکانی حکومەت

گەڕەکی ئیسکان سێ قوتابخانەی سەرەتایی و سێ قوتابخانەی دواناوەندی و قوتابخانەیەکی تورکمانی هەیە، جگە لەمەش پەیمانگای پێگەیاندنی مامۆستایانی کچانی هەولێر، کە لەساڵانی حەفتاکان و هەشتاکانەوە بە (دار المعلمات) ناسرابوو، تاوەکو ساڵی (١٩٨٤) لەگەڕەکی ئیسکان بوو و ئێستا بینایەکەی بووەتە دواناوەندیی کاروخ.

هەروەها یەک بنکەی تەندروستی هەیە، کە سەرەتا بەناوی بنکەی تەندروستیی ئیسکان. لەیەکێک لەخانووکانی ئیسکانی کۆن بوو، دوو سستەری ڕووسی

بەناوی (تانیا) و(حەنیفە) کاریان تێدا دەکرد و خزمەتێکی زۆری خەڵکەکەیان دەکرد، تائێستاش لەژیاندا ماون. دواتر لەسەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە بینایەکی هاوچەرخی لەبەرامبەر بنکەی پۆلیسی ئیسکان بۆ دروستکرا و دوای راپەڕینیش ناوەکەی کرا بەبنکەی شەهید د. نافع ئاکرەیی.

هەروەها بەشی چوارەمی شارەوانی، کە بەم دوایانە کراوە بە لقێکی شارەوانی لە گەڕەکەکەدا هەیە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی، کە پەیمانگەی نابینایانی رووناکییە کە تاکە مەڵبەندی نابینایانە لەهەولێر و بنکەی بەساڵاچووان و خانەی بێ سەرپەرشتان و یانەی وەرزشی هێرش و یانەی کرێکاران و بنکەی چالاکیی قوتابخانەکانی پەروەردەی هەولێر و گۆڕەپانی وەرزشی تۆپی پێ. هەروەها باخچەی رووناکی و برووسک کە وەکو شوێنی گەشتیاران لە هاویناندا خەڵکی هەولێر رووی تێ دەکەن لەو گەڕەکەدا هەن.

چوار مزگەوتیشی لێیە. ئەوەی شایانی باس بێت، کەمایەتییە مەسیحییەکانی ئیسکان بۆئەنجامدانی رێوڕەسمە ئاینییەکانیان ناچارن روو لە کەنیسەکانی عەنکاوە بکەن، چونکە تاکو ئێستا کەنیسەیان نییە و وەکو مەسیحییەکانی گەڕەکی شۆڕش کەنیسەیان بۆدروست نەکراوە.

بەناوبانگترین هوتێلی هەولێریش هوتێلی (قەسری شیمال)ە، کە لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکانەوە لەلایەن (محەمەد زیوەر شەریف) بینادنراوە، شوێنەکەی پێشتر زەلکاو بوو و ئێستاش داخراوە. چەند ئەپارتمانێکی شارستانی لێیە، کە لەلایەن زانکۆی سەلاحەدینەوە کراون بە بەشی ناوخۆی قوتابیان. هەروەها چاپخانەی شارەوانی لەو گەڕەکە بووە و لە تەنیشت هەویرکاری تابانەوە بوو. لە ساڵانی شێستەکانەوە لە تەنیشت بنکەی پۆلیسی ئیسکان دینگەی (ئەنوەرە گێل)ی هەبوو. ئەو دینگەیە، کە بەردێکی گەورە بوو و دارێکی لە ناوەندی دادەندراو بەهێستر دەیانسووڕاند ساواریان پێ دەکوتاوە و ئینجا بەدەستار لێیان دەکرد. بنکەی پۆلیسی ئیسکانیش لە ساڵی ١٩٥٩ دروستکراوە و پۆلیس هاتۆتە ناوییەوە.

چوارڕیانی ئیسکانیش دەکەوێتە سەر شەقامی (٦٠م) پەیکەری "گادگرۆسی" لێیە. گادگرۆس رۆژنامەنووسێکی دانیمارکییە لەکاتی راپەڕینە مەزنەکە، لە کوردستان بوو و دەنگوباسی سەرکەوتنەکانی کوردی بۆ جیهان دەگواستەوە، بەتایبەتیش هەواڵەکانی رزگارکردنی شاری کەرکووک، هەرلەوێش لەکاتی هێرشی حکوومەتی بەعسی و لەلایەن حەرەسی جمهوری و لەگەڵ کۆمەڵێک پێشمەرگە دەوریان گیرا و شەهید بوون و لە دوای راپەڕینەکەشدا لەلایەن بنەماڵەکەیەوە لە رێوڕەسمێکی شکۆمەندا ئەو پەیکەرەیان کە لەسەر ئەرکی دایکی و لەلایەن هونەرمەند دارا حەمە سەعید دروست کراوە، لەوێ داناو شارەوانیش چوارڕیانەکەی بە ناوی گادگرۆسەوە کرد، کە ئێستا لەساڵی ٢٠٠٧ توونێلێکی لێ دروستکراوە، چون ئەم نۆژەنکردنەوەیە تەواوی شەقامی شەست مەتری گرتۆتەوە لە بەرزە پردو تونێل لە تەواوی فلکەکان.

### هەڵوێستی کوردایەتی

گەڕەکی ئیسکان مەیدانی خەبات و تێکۆشانی جەماوەری کردەوە قارەمانەکانی پێشمەرگە بووە، بەردەوام رێکخستنەکانی شۆڕش جموجۆڵ و چالاکییەکانیان ئەنجامدەدا و چەندین کوڕە ئیسکانی لە ریزەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان خەباتیان دەکرد و خەڵکەکەشی بە جۆرێک پشتگیری دەکردن، بۆ نموونە هەر کاتێک مەفرەزەکانی ئەمن بەسەر ماڵە پێشمەرگەیان دادابا. یەکسەر خەڵکەکە سەرجەم ماڵە پێشمەرگەکانی دیکەیان ئاگادار دەکردەوە. سەرەڕای ئەمانەش گەلێ شەوان پێشمەرگە بەسەر فیرقەی یەرمووکی حزبی بەعسیاندا دەدا، کە لە تەنیشت بنکەی پۆلیسی ئیسکان بوو (دوای راپەرین کرا بە لقی هەولێری حزبی سوسیالیستی کوردستان و ئێستا بۆتە شوێنی نیشتەجێبوون).

هەروەها شەقامی سەرەکی ئیسکان، شوێنی سەرەکی چالاکییەکانی پێشمەرگە بوون و بە نوێژی نیوەڕۆ پیاوانی رژێمیان دەکوشت.

لە کاتی راپەرینەکەشدا و سەر لە بەیانی رۆژی (١٩٩١/٣/١١) جەماوەری ئیسکان رژانە سەر شەقامەکان و بەسەر فرقەی یەرمووکیان دادا و بەرپرسی ئەمنی گەڕەکەکە، کە ناوی (عیرفان) بوو بەسزای گەل گەیێنرا و تەواوی گەڕەکەکەش ئازاد کرا شان بە شانی سەرجەم گەڕەکەکانی شاری هەولێر.

یەکێک لە پێشمەرگە دێرینەکانی گەڕەکی ئیسکان (غازی عەبدولواحید)ە، کە بەڕەچەڵەک تورکمانە و بە (هەندرێن) ناسراوە و ئێستا لە ڕیزەکانی (ی.ن.ک)ە.

لەلایەکی دیکەوە ئیسکان لە شەڕی هەشت ساڵەی عیراق و ئێراندا. هەردەم کەوتبووە بەر هێرشی فڕۆکەکانی ئێران و چەندین جار بۆردومان کرا، لە هەموویان کاریگەرتر بۆردومانەکەی شوقەکانی ئیسکان بوو.

## وەرزش و وەرزشکاران

ئیسکان خاوەنی تیپێکی بەهێزە و لە ساڵانی هەشتاکاندا لە ریزی پلە یەکەکانی شاری هەولێر یاری دەکرد و ڕکابەری سەرەکی ئیسکان ئەو کات تیپی کۆماری بوو، کە زۆر جار لە یارییەکاندا ئاژاوە ڕوویدەدا.

جێگەی شانازیشە ئەستێرەی ناوداری یانەی وەرزشی هەولێر و هەڵبژاردەی عیراق (کامەران محەمەد) خۆی و خانەوادەکەی ماوەیەک نیشتەجێی ئەو گەڕەکە بوون و لە ریزی تیپی میللی ئیسکان یاری کردووە.

سەرەڕای ئەمانەش تیپێکی دیکەی میللیش هەبوو ناوی کوردستان بوو. مامۆستا نیازی کە خەڵکی ئیسکانە سەرپەرشتی دەکرد.

گەڕەکی ئیسکان چەندین یاریزانی لەسەر ئاستی کوردستان و عیراق پێگەیاندووە لەوانەش: (زیاد یاسین یاریزان و ڕاهێنەری تۆپی سەرمێز هەروەها (هاشم ڕەسووڵ) کە ئێستا لە تۆپی سەرمێزدا باشترین یاریزانی کوردستان و عیراقە، عەلی بەربەر یاریزانی کۆنی هەڵبژاردەی عیراق و عەبدوڵڵا مەحموود، گۆڵچی پێشووی هەڵبژاردەی هەولێر و ڕاهێنەری یانەی هەولێرو ڕاهێنەری ئێستای یانەی برووسک. محەمەد ئەحمەد یاریزانی یانەی هەولێر.

## ڕۆشنبیران و کەسایەتییەکان و ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکان

ئیسکان ڕۆڵێکی گەورەی لە پێشخستنی ئەدەب و هونەر لە شاری هەولێردا هەبووە و هونەرمەند و گۆرانیبێژ و ڕۆژنامەنووسی کارای پێگەیاندووە، لەوانەش: (هونەرمەندی میللی حوسێن کێشکە، عەبدوڵڵا دڵسۆز، جەلال شاکر، محەممەد عەزیز. سدیق عوسمان، عەدنان شەریف، زاگرۆس، ڕەسمی جەلال، فەرەیدوون جەلال، ئازادە جەلال، ئەمجەد جەوهەر، نەجات جەوهەر، لوقمان جەوهەر، فاتیح بەرزنجی، د. قەیس کاکل تۆفیق، مەسعود پەرێشان، عەبدوڵڵا ڕەحمان).

سەرەڕای ئەمانەش بەدەیان کوڕ و کچی ئەو گەڕەکە لەساڵانی حەفتا و هەشتاکاندا لەگەڵ تیپە مۆسیقاکانی هەولێر لە کۆرسەکانی گۆرانی گوتندا بەشداربوون. بەدرێژایی ڕۆژگاریش دەیان هونەرمەند و ڕۆشنبیری شاری هەولێر ڕوویان لە ئیسکان کردووە و بۆماوەیەک تێیدا نیشتەجێ بوون لەوانەش (هونەرمەندی گەورە ڕەسوول گەردی تاکو کۆچی دواییشی لە شوقەکانی ئیسکان نیشتەجێ بوو و لەبەردەم ماڵەکەشیدا باخچەیەکی جوانی چێ کردبوو تا ئێستاش هەرماوە. هەروەها نووسەر و هونەرمەندانی وەکو (عەبدولکەریم شێخانی، نیزام شوکر، عەبدولڕەحمان مەعروف، لالۆ ڕەنجدەر، بەکر مەعروف، نیاز. ئیبراهیم حەکیم، سەدیق عوسمان).

کەسایەتییە بەناوبانگەکانی گەڕەکەکەش ئەمانە بوون: (حاجی عەلی شوونهەڵگر. شوونهەڵگرێکی بەناوبانگی شاری هەولێر بوو. حاجی ئەمین چایچی ئامۆزای عەبۆ قاوەچی بوو و چایچییەکی بەناوبانگ بوو. حاجی ئەنوەر مەکوچی. حاجی حەمەدەمین ئەویش پاقلاوەچییەکی ناودار بوو. مام عەلی مەردە کە چایخانەی هەبووە. سەید محەممەد سەندەویش فرۆش بوو، ڕەسووڵ قونیانی، حاجی مستەفا فیتەر، حاجی بەکر زێڕینگر، فازڵ حاجی شیرین زێڕینگر).

چەند مردووشۆرێکی بە ناوبانگیش لە ئیسکان بوون لەوانە (ئەسمەر، نەخشین، حاجی زەینەب، حاجی گەیلان حەمامچی کە تا وازی لەم کارەی هێناوە زیاتر لە (٤٠٠٠) جەنازەی شوشتووە و تاکو ئێستاش زیاتر لە (١٠٠) بۆتڵ خوێنی بەخشیوە.

## شێتەکانی ئیسکان

وەکو هەموو گەڕەکەکانی دیکەی شاری هەولێریش، ئیسکان چەند شێتێکی بەناوبانگی هەبووە وەکو (بەختیارە شێت، عەونی و فاتیحە شێت کە بەداخەوە بەم دواییانە تیرۆرستان بە فێڵی کرینی خواردن بۆ مووسڵ ڕفاندیان و لەشیان کردبووە TNT و پاکەتێکیان لە دەستی کردبوو و پێیان گوتبوو بچێ بیدات بەو پۆلیسەی لەبەردەم

بنکەکەی ئیشگر بووە. کاتێکیش فاتیحە شێت لە پۆلیسەکە نزیک دەبێتەوە. لەدوورەوە بەهۆی کۆنترۆڵەوە دەیتەقێننەوە.

## سەمووني ئیعاشە

لەسالآنی حەفتا و هەشتاکانیشدا میری کارگەیەکی تایبەتی سەموون دروستکردنی دانابوو بە (سەمووني عاشە) بەناوبانگ بوو لەڕێگای وەکیلەکانەوە لەگەڕەکەکان دابەش دەکران. لەئیسکانیش مالی (مام عومەر و مام حەیدەر) وەکیلی کۆمپانیاکە بوون و سبەینان و ئێواران خەلك بۆ کڕینی سەمووني عاشە لەپێش مالەکانیان کۆدەبوونەوە.

لە بەننایە کۆنەکانیش (جەلال لەتیف. وەستا یاسین) بوون.

لەسالآنی نەوەدەکانیشەوە بەهۆی نالەباری بارودۆخی سیاسی و ئابووری. مەسەلەی کۆچکردن بۆ هەندەران ببووە باس و خواسی ئەو سەردەمەو سەدان کەس بوونە قوربانی لەم ڕێگایەدا. لە ئیسکانیش هەر سێ لاو (کاوە خەلیل و فاخیر عوسمان و ئاریان قەساب) لەم ڕێگایەدا گیانیان سپارد.

لە شەهیدەکانی گەڕەکیش (سمکۆ کەریم محیەددین) کە وێنەگری پارێزگاری هەولێر بوو لە ڕووداوە تیرۆریستییەکەی (١) ی شوباتدا لە لقی دووی (پ.د.ک) شەهید بوو.

جگە لەمانەش خێزانێکی میسری لە سالآنی هەشتاکانەوە لە سلێمانییەوە هاتبوونە هەولێر و لە گەڕەکی ئیسکان نیشتەجێ ببوون و سەرۆک خێزانەکەش ناوی محەمەد بوو، کە ئەندازیار بوو لە شارەوانی هەولێر. هەروەها مالێکی موسولمانی هیندیش بۆ ماوەیەک لەو گەڕەکە بوون. بەهۆی کاری بەلێندەرایەتی روویان لە هەولێر کردبوو و کوڕێکیشیان لە کۆلێژی پزیشکی زانکۆی سەلاحەددین دەیخوێند.

## بازاڕی شەوانە

بازاڕی ئیسکان: تاکە بازاڕی شەوانەی شاری هەولێرە و تاکو درەنگانێکی شەو جمەی دێت. ئەم بازارە مێژوویەکی کۆنی هەیە و بەدرێژایی ڕۆژگار گۆڕانی بەسەردا هاتووە و فراوان بووە.

یەکەم دووکان لە بازاڕی ئیسکان لەلایەن (خەلیل جەمیل)دوە دروستکراوە و لەسالی (١٩٧٠) (جومعە) ناوێک لێی کڕیوەتەوە، یەکەم ڕیزە دووکانیش لەلایەن (موحسین پەڕۆ) دروست کراوە.

لە دووکاندارە کۆنەکانیش (مام سەید، ترشی فرۆش بووە. مام سەلام عارەب بوو، مام ڕەشید، نەجار مام عزەددین دووکانەکەی کەوتبووە شوێنی ئێستای شیرنەمەنی هەردی. کۆنترین دووکانداریش تائێستا خاوەن دووکان بێت ئەبو شێروان (عەریف محەمەد)ەو (٣٦) سالە دووکانی لە بازاڕی ئیسکان هەیە.

ئەو کەسانەی کەلە سالآنی شەستەکانەوە خانوویان لە ئیسکان و نزیک بازاڕی شەوانەی ئیسکانەوە دروستکردووە، ئەمانە بوون: (سابیر کاکەشین. عوسمان تەها باداوەیی، سابیر حەنیف باداوەیی) کە ئەو کات نرخی پارچە زەوییەک بە (٤) درهەم بووە.

بە ناوبانگترین گەرماویش (گەرماوی ئیسکانە)، د. ئومەییەی خێزانی عەبدوللا خەفاف خاوەنی زەوییەکە بووە، لەسالی (١٩٦٥) دوە ئەو گەرماوەی دروست کردووە، بەنناکەشی وەستا جەلال بووە و دواتر بەکرێ بە مام تاهیر باوکی سەباحە شەلی داوە و لەسالی (١٩٨٠) وەش حاجی گەیلان و حاجی خەسرۆ خاوەنداری دەکەن و چەندین جار نۆژەنکراوەتەوە و فراوان بووە. لە ناترەکانی گەرماویش (مام تاهیر) ناوێک بووە.

ئەو بەشە ناوەخۆییەی کە دەکەوێتە سەر چوارڕیانی



گادگرۆسەوە ئەویش مۆڵکی عەبدوڵڵا خەفافەو لەساڵی (١٩٦٥) ەوە لەلایەن (خەسرۆ قالە هەنگر) شوورەکەی دروست کراوە و هەتا ڕاپەڕینیش بەشی ناوخۆی قوتابیان بووە و پاشان لە ساڵانی نەوەدەکانەوە بەکرێ درا بە بەرەی تورکمانی و کردبووی بە مەکتەبی عەسکەری. دوای هەڵوەشانەوەی بەرەش دووبارە کراوە بە بەشی ناوخۆی قوتابیان.

لەدوای کودەتاکەی عەبدولکەریم قاسمیش لەساڵی (١٩٥٩) هۆڵی گەل دروست کراوە، لەلایەن هەردوو بەڵێندەر (شێمە و سابیر) ەوە بناغەکەی لێدراوە. دەڵێن ئەو کاتەش وا باو بووە، کە خەڵک سەیری پێ هاتووە و گوتوویانە شتێک دروست دەکرێت خەڵک گەمەی لێ دەکەن و حەفلەی لێ دەکەن ناویان ناوە (هۆڵی گەل).

لە ساڵانی هەشتاکانیش هەر سێ گەسی (ئیسکان. ئاشتی. کاروان) ناوبانگییان هەبوو و ئێستاش بە دەیان گەس فرۆش و چێشتخانەو بازاڕگای مۆدێرنی لە خۆگرتووە. هەروەها ئەمڕۆ هەر دوو خواردنەگەی گەسی بەناوبانگی ئیسکان (فاروق و غازی)یە.

## گەڕەکی سەیداوە

### سەرەتایەک

ئەم گەڕەکە لەساڵانی پەنجاکان دامەزرا. خاوەنی زەوییەکە مام خورشید و برازاکانی بوون- ئەکاتە باوکی خوالێخۆشبوو لیوای مافپەروەر "نازم خورشید" کە لێپرسراوی کاروباری یاسایی بوو لە فەرمانگەی ڕەگەزنامەی گشتی لەهەولێر- دووەمیش مامۆستا ئازادە. یەکەم ماڵ ماڵی مام خورشید بوو. دووەم ماڵی ئێمە بوو.



ئەم گەڕەکە (جاجماوە. ئەخۆشاوە. قەبری جوولەکەکانیان پێ دەوت). ئێوارەیەک کاتی عەسر جەنابی شێخ محیەدین شێخ ساڵحی بەرزنجی ناودار و خاوەنی تەکییەی شێخ محیەدین لە گەڕەکی عارەبان و جەنابی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورمایی، ئەم زاتانە و بنەماڵەی ئێمە واتە شێخانی هەرەجە بەچەند پشتێک لەگەڵ شێخ مەحموودی حەفیدی ئەمر دەگەینەوە یەک. جا هاتنی ئەم بەڕێزانە لەگەڵ چەند کەسانێکی تر وەک قادر ئاغاو عەلی حاجی ئەحمەد و ئاغای عوزێری بۆ بەخێرهێنانی باوکم بۆ ئەو گەڕەکە، من ئەوکاتە ڕاوەستابووم لە خزمەتی میوانەکان جەنابی شێخ محیەدین لەباوکمی پرسی: وتی کاک سەید ئەم گەڕەکە ناوی چییە؟ باوکیشم ئەم ناوانەی پێشووی باس کرد و ئەویش وتی: مادام تۆ هاتوویە ئەم گەڕەکە وا ناومان نا سەیداوە، ئەمە لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٥٢ ز بوو. ئەم شوێنەی لە هۆڵی گەل تا مەکتەبی سکرتارییەتی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان دەکشێ، بوو بە شەقامی ١٠٠ مەتری و لای تانکییەکەی ئاو، بێستانی تەرۆزی و گندۆرە بوو. خاوەنی ئەم بەشە زەوییانە عەلی حاجی ئەحمەد ئاغاو براو برازاکانی بوون، کە ئەمانە بنەماڵەیەکی کوردی ناودارن لە هەولێر.

لە دانیشتوانە بەناوبانگەکانی ئەم گەڕەکە (کۆنەکان): مەلا حوسەینی مەلا مستەفای هەمەوەند بوو لەگەڵ شێخ سەیدی شێخ ڕەشیدی هەرەجەو برازاکەی شێخ فوئاد شێخ سدیق بەرزنجی، کە دەکاتە برا گەورەی دکتۆر عەلی ئەسغەر بەرزنجی- کە ئێستا بەڕێوەبەری گشتی کاروباری تەندروستییە لەوەزارەتی تەندروستی لە هەرێمی کوردستان. مامۆستا مەلا خالید مورتکەیی کە دەکاتە باوکی بارزان مەلا خالید، شێخ مەسعود شێخ عەبدلقادر بەرزنجی، واتە کوڕی ئەم کاک سەیدە کە گەڕەکەکی بەناو کراوە- لەساڵانی پەنجاکانەوە لە ڕیزی پارتی دیموکراتی کوردستاندا کاری کردووە چەند جار لێپرسراوی یەکەمی ناوچەی هەولێر بووە تادواجار جێگری لێپرسراوی لقی ٧ پارتی بووە لە ئەمەریکا. تا لە ٢٠٠٤/٣/١٢ کۆچی دوایی کرد.

## گەڕەکی سەیداوە جیهانێکی پڕ لەنهێنی مێژوویێکی دێرین

مێژووە دێرینەکەی هەفت شاری هەولێر، بووەتە زەمانەتی هەموو گەڕەکەکانی شاری هەولێر، فاکتەرێکی تۆکمە بووە بۆ بنیادنان و سەرهەڵدانی چەندین گەڕەکی دیکە. هەر لەزیادبوونی دانیشتوانی تەلاری بەرەوپێش چوونی قەڵا و داهێنانی شارستانی نوێ و نیشاندانی رووی راستەقینەی حەفت شار لە پانتاییەکی کەم وێنەدا تا کۆچکردنی کەسەکان لە لادێوە بۆ شار، وایکرد سنوورە چۆڵەوانییەکانی دەرەوەی قەڵا، کە شەوان ببووە مایەی ترس و جێگای خەون و خەیاڵە سیحراوییەکانی خەڵک، ئاوەدان بکرێتەوە و گەڕەکی نوێ سەر هەڵبدەن.

مێژوونووسان نیشانیان داوە، گەڕەکی سەیداوە جیهانێکی پڕ لە نهێنییەو، یەکێک بووە لەو بێچووانەی، دایکە قەڵا لەئامێزی گرتووە، بگرە هەر پارمەتیدەر بووە بۆ دروستکردنی پشتێنەی ژیانی دایکە قەڵا و لە رۆژی هاتونەهات بە هانای حەفت کوڕانی سەراو تۆپخانەو دیوەخانی هاشم چەڵەبی و شەهابەی هونەرمەند هاتووە. گەڕەکی سەیداوە چەندین نەوەی پڕ لەزانست و مەعریفەتی پێگەیاندووە، رۆڵی کەمتر نەبووە لە شۆرشگێری و خوێنی نەوەکانی بۆ کوردستان بە حەڵاڵ زانیوە.

### کەی تانکی سەیداوە دروست کرا؟

تانکی سەیداوە دەکەوێتەلای چەپی کۆتایی گەڕەکەکە، بەیەکەم تانکی دادەنرێت لە شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٥٩ لەلایەن کۆمپانیایێکی یوگوسلاڤی دروست کراوە. تانکییەکە (١٠٠٠) لیتر ئاوی گرتووە و (١٠) مەتر بەرزییەکەی بووە، لەئاسن دروستکراوە و رەنگی شین بووە، بەڵام دوایی بە رەنگی سوور بۆیەیان کردووە. کۆمەڵێک گڵۆپی رەنگاورەنگ لەدەوری تانکییەکە هەبوو، چەند کرێکارێکی کوردیش کاریان تێدادەکرد، رۆژانەیان (٢) درهەم بووە، شوێنی تانکییەکە لەئاوی میری نزیک بووە، سەرچاوەکەی دەکەوێتە پشت بنکەی حزبی شیوعی. ئاوێکی زۆر پاک و بێگەرد بوو. بەهۆی راکێشانی بۆری ئاو دەچووە ناو تەنکی سەیداوە. لە نزیک تانکییەکە ئامێری پەمپی گەورە هەبوو، دوو کرێکار کاریان پێدەکرد.



ئاوەکە دەچووە ناو تانکییەکەوە. لەدوای چەن ساڵێک کرا بە موزەخە (دینام)، پاسەوانەکەشی ناوی (محەمەد رۆستەم) بوو، ئیستا لە ژیان ماوە. لە تانکی سەیداوەوە ئاوی دەدا بە ماڵەکانی سەیداوە و قەڵات. خەڵک بەبێ ئوتۆمبێل لە دەوروبەری شاری هەولێرەوە دەهاتن بۆ ئاو کێشان، زۆر جار لە سەر ئاو دەبووە شەڕ. ئاوەکە تامی زۆر خۆش بوو، بە بێ ئەوەی ماددەی کلۆری تێ بکرێت. دەوروبەری تانکییەکە شوورەی نەبوو، شوان و مەڕومالاتی گەڕەکەکانی هەولێر بە وەرزی هاوینان لەژێر سێبەری تانکییەکە پشوویان دەدا و ئاویان دەخواردەوە. لەکاتی جەژنی نەورۆز گەنج و پیاوە پیرەکان لەوێ کۆدەبوونەوە جەژنە پیرۆزەیان لەیەکتری دەکرد. هەروەها لەجەژنی نەورۆز خەڵک خواردنیان ئامادە دەکرد و دەچوونە ژێر تانکییەکە کاتیان لەوێ بەسەر دەبرد. بەداخەوە ئیستا (٢٠) ساڵە ئەو تانکییە بەتاڵە، چونکە بیری ژێر تانکییەکە وشکی کردووە.

### ناوی سەیداوە لەچییەوە هاتووە

سەبارەت بەناوی ئەو گەڕەکە دوو بۆچوون هەیە، هەندێک دەڵێن لەسەرەتا بەناوی جاجماوە بوو. دوو رەشماڵنشین کە پیشەیان جاجم دروستکردن بووە لەوێ نیشتەجێ بوون و خەڵک دەهاتنە ئەو شوێنە جاجمیان دەکڕی و بەرەبەرە گەڕەکەکە خەڵکی تریشی بۆ هاتووە. بۆچوونێکی دیکە هەیە دەڵێن سەیداوە لەسەرەتای ساڵانی پەنجاکان کۆمەڵێک لە شێخەکانی بەرزنجی لە ناوچەی هەڵەجەوە کۆچ دەکەن و لەو گەڕەکە نیشتەجێ دەبن، بەو

گەڕەکەیان دەوت سەیداوە. ئەو گەڕەکە ناوێکی دیکەشی هەبوو پێیان دەوت نەخۆشاوە. ئەو ناوە کۆنترە لە سەیداوە، کە چەند ماڵە نەخۆشێک لەسەر کەندێکی پیس ژیاون. بەڵام دوای هاتنی سەیدەکان بۆ ئەو گەڕەکە، بە سەیداوە ناسرا. یەکەم کەس کە ئەو ناوەی لێناوە سەید ڕەشید قادر بووە. داوای لە خەڵکەکە کرد کە بڵێن "سەیداوە".

### ئەو شتەی خەڵکی سەیداوە شانازییان پێوە دەکرد و پێی ناسرابوون

ئەوەی زۆربەی پیاوە بە تەمەنەکانی گەڕەکەکە ئاماژەیان پێدەکرد، ئەو شتەی بۆ خەڵکی سەیداوە مایەی شانازی بووە، متمانە بەیەکدی و ڕۆحی هاوکاری تەبایی و ئەمن و ئەمانەتداری بووە. جگە لەوەی پێوەندییان لەنێوان یەکتردا هەبووە، هەر ماڵێک یەکێکی لێ بمردبا خاوەن مردووەکە هەستی نەدەکرد کە خاوەن تازیەیە و کەسێکی لێ مردووە، بەڵکو خەڵکەکە خۆیان کۆمەکیان بۆ کۆ دەکردەوە و دەستی هاوکارییان بۆ یەکتر درێژ دەکرد. بەتایبەت چێشتی فەقیرانەیان، لە هەموو ماڵێک ئامادە دەکرد، بەبێ جیاوازیکردن لەنێوان چینی دەوڵەمەند و هەژار.

### پیاوە دەوڵەمەندەکانی سەیداوە

ئەگەرچی سەیداوە کەسانێکی هەژاری تێدابوو، بەڵام پیاوی دەوڵەمەندی کەم بووە، تەنها چەند کەسانێک نەبێ وەکو "حەمە عەزیز" دوکاندار بوو، قادری حاجی ئەمین دەوڵەتە کوێر، کە خەڵکی سێبیران بوو، مام سلێمان، حەمەدئەمین، گەڕەکی سەیداوە مولکی ئەوان بوو، زەوییەکانی سەیداوە لەجیاتی بەمەتر بە گوریس بە خەڵکی دەفرۆشت.

### پیاوە ڕۆشنبیرو ناسراوەکانی گەڕەکی سەیداوە

گەڕەکی سەیداوە وەکو گەڕەکەکانی دیکەی شاری هەولێر، بێبەش نەبووە لەپیاوی نووسەر و ڕۆشنبیر و بەناوبانگ، کە بووەتە لایەنێک بۆ سوود گەیاندنی کۆمەڵگا. ئەو گەڕەکە چەندین ڕۆڵەی ناسراوی زیرەکی پێ گەیاندووە. وەکو قادر عەزیز سکرتێری حیزبی زەحمەت کێشانی کوردستان، هەروەها شەهید شاخەوان عەباس، ئیدریس هادی وەزیری کاری عێراقی، ئێستا (٢٠٠٨) وەزیری خوێندنی باڵای هەرێمی کوردستانە، دکتۆر ماجد ئەحمەد، پسپۆرە لە جەراحی ئێسک و نووسەر و ڕۆژنامەنووس شێرزاد قادر هەینی و دکتۆر سەلام محەمەد سوڵتان. شەهید شەوکەت شێخ یەزدین وەزیری دارایی و ئابووری حکومەتی هەرێمی کوردستان، مامۆستا ئیسماعیل بەرزنجی. مامۆستا عەبدوڵڵا ئەحمەد ئەکتەری شانۆ. ئەندازیار تەحسین عەزیز (ئێستا لە ئەمریکایە، جۆرج بوش خەڵاتی پێشکەش بە منداڵەکەی کرد). هەروەها سەیداوە کۆمەڵێک پیاوی ماقوولی تێدابووە، وەکو حەمە عەزیز، و موختار میرزا، و عەلی خان، مامە عۆدە، و قادر سلێمان ئاغا. مامە باپیر خەسرەو و حوسێنە شێت و ئەحمەد داود نەقار، ئەحمەد تەنەکەچی، عومەر شەمە و مستەفا جیرۆ بەناوبانگ بوون. زۆربەیان لەناو خانووەکەیاندا ژوورێکی تایبەت بە مانەوەی میوانیان دروست کرد و لەکێشەو گرفتێکی کۆمەڵایەتی ژوورێکیش کە کێشەی خوێندنیان پێ چارەسەرکرد. جگە لەوەی پیاوی ریش سپی و قسەزان و جێگای ڕێزبوون، تەنها سلێمان ئاغا پیاوێکی دەوڵەمەندبوو ئەوانی دیکە کاسب و پیشەزان بوون.

### مێژووی سەیداوە و سنوورەکەی

سەیداوە یەکێکە لە گەڕەکە کۆنەکانی شاری هەولێر لەدوای گەڕەکی عەرەب و خانەقا و تەعجیلە. سەیداوە لەساڵی (١٩٤٨) لەلایەن چەند کەسانێکی سەید زادەوە و بنیاتنراوە و لەساڵی (١٩٥٥) ژمارەی دانیشتوانەکەی گەیشتۆتە (٦٠٠)کەس. ڕووبەری سەیداوە نزیکەی بۆ سەر سێ ناوچە دابەش کراوە سەیداوەی سەید بەهیە دەکەوێتە چەقی گەڕەکەکە بەناوی ئەو ژنە کراوە، کە خاوەنی زەوییەکەیە، ئەوەش زێرابێکی ئاوی قورس ئەو دوو سەیداوەیە لەیەکتری جیادەکاتەوە، ناوچەی سێیەم پێی دەڵێن گەڕەکی سلێمانی کە پیاوێکی دەوڵەمەندو زەوییەکی زۆری هەبوو هەر بەناوی سلێمان ئاغا کراوە، لەلای ئالیاتی شورتەیە و نزیک پردەکە گۆڕستانی جوولەکەکانی تێدابووە، حکومەت لای بردووە زەوییەکەی بەسەر خەڵک دابەشکردووە خەڵکی ئەو ناچەیە کە پێی

دەڵێن سەیداوە، چونکە لە بازاڕ نزیک بووە، یەکەم قوتابخانە لەو گەڕەکە دروستکرا (اربیل الاولی) بووە لە ساڵی (١٩٥٨) دروست کرا دەکەوێتە ئەوبەری شەقامی (٣٠) مەتری. خەڵکی سەیداوە و دەوروبەری لەوێ دەیانخوێند مامۆستا مەتی وانەی ئینگلیزی دەگوتەوە، قوتابخانەی کچان نەبووە تەنها لەقەلات هەبوو. یەکەم کچ کە چووە قوتابخانە کچی وەستا کاکۆ بوو، کە ئێستا مامۆستایە. یەکەم کەس لەو گەڕەکە دوکانی دانا ناوی حاجی سەعیدبوو، کاری بازرگانی کردووە پیاوێکی دەوڵەمەند بووە شتی بەقەرز دەدا بەخەڵک لەهەمان کاتدا سەرجەم پۆستەکانی گەڕەک دەهاتە لای. ئەو سەیداوە لە رووی سیاسییەوە، بێلایەن نەبووە بەڵکو سەردەمانێک زۆربەی خەڵکەکە شیوعی و پارتی بووینە. زۆرێک لە ماڵەکان کۆبوونەوەی سیاسی تێدا دەکرا و بەشداری کاری سیاسی و شۆڕشی کوردایەتییان دەکرد. شەهید حەیدەر تەها یەکەم شەهیدی گەڕەکەکە بوو، کە لە لایەن پیاوانی رژێم دەستگیر کرا و دوایی شەهیدیان کرد، موختاری سەیداوە پیاوی رژێم بووە لەلایەن رێکخستنەکانی گەڕەکی سەیداوە بە سزای گەل گەیەنرا پیاوە شۆڕشگێڕەکان، وەکو شەهید شاخەوان عەباس و رێباز و سلێمان، کانەبی عومەری چۆک. ئافرەتەکان عەبایان هەڵنەدەگرت بەڵکو زیاتر جلی کوردییان دەپۆشی عەیشێ بێوەژن مامانێکی کۆنی گەڕەکی سەیداوە بووە. مام تاهیر و مام تەها کە دوو پاکەرەوەی نەخۆشخانە بوون دەرزییان لەخەڵک دەدا، چونکە هیچ برین پێچێک و دکتۆر لەو ناوچەیە نەبوو. حاجی کەریم پیاوێکی تەمەن (٤٠) ساڵی بوو یەکەم کەس بوو پیشەگەری تەنەکەچی لەحیمی لە سەیداوە دانا.

### بەستەکەی سەیداوە

بەستەکەی سەیداوە سنووری گەڕەکەکە دیاری دەکا، ئەو بەستە قووڵییەکەی (٣) مەترە پانییەکەی (٨) مەترە بەڵام درێژییەکەی لە دەربەندی حاجی وسوو درێژدەبێتەوە و بەناوبنەسڵاوە و باغەمرە دێتە ناو دەروازەی هەولێر بۆ چەقی بازاڕ، لەو دیوە بۆدەرەوەی شار، ئەو بەستە لەزستان ئاوێکی زۆری لێهەڵدەستا و هەندێجار دەبوە لافاو و هاتوچۆی پەڕینەوەی هەر دوولای دەوەستاند، دوای چەند رۆژێک لە دوای وەستانی لافاوەکە ئینجا هاتوچۆ کردن دەستی پێدەکردەوە، دایکان و باوکان منالەکانیان بە پشت دەرباز دەکرد، بۆ ئەوەی بیانباتە قوتابخانە هەربەردەوامی لافاوی بەستەکە وای کرد کۆمەڵە عارەبێک لە ناوچەی گوێرەوە هاتن لەنزیک بەستەکە نیشتەجێ بوون، پێیان دەگوت گامێشەوان کە ئاژەڵی گامێشیان بەخێودەکرد. ماست و قەیماغ و شیریان بە خەڵکی دەفرۆشت، ئەمانە حەساریان هەبوو نزیکەی (٥٠-٦٠) گامێشیان تێدا بەخێو دەکرد. لەساڵی (١٩٦١)حکومەت پردی سەیداوەی درووستکرد تاوەکو خەڵک لە مەترسی لافاو دوور بخرێنەوە، هاتووچۆ بۆخەڵک ئاسان بێت. هەرلەکاتی هاتنی لافاوچەندین کەس تێدا خنکاوە. یەکەم جار گومرگ لە پشت قەسابەکانی ناوبازار بوو، دوای حکومەت گواستییەوە نزیک گەڕەکی سەیداوە گومرگەکە بەناوی (حەیدەر کەچەڵ) بوو، لە ساڵی (١٩٥٥) دروست کرا، خۆشناوەکان و جووتیارەکان بەروبوومی خۆیان بۆ ئەو گومرگە دەهێنا.

**تێبینی:**

ئامادەکردنی فایلی گەڕەکەکانی شاری هەولێر لەلایەن ئەو نووسەرو رۆژنامەنووسانە نووسراوە:

١- کۆلان و گەڕەکی عارەبان - موحسین ئاوارە، ئارارات ئەحمەد عەلی.
٢- گەڕەکی تەعجیل - شەمسەدین عەزیز
٣- گەڕەکی کوران- عەبدوڕەحمان مەعروف، محەمەد گۆران- حەمید ئەبوبەکر بەدرخان
٤- گەڕەکی ئازادی - محەمەد گۆران
٥- گەڕەکی ئیسکان- عەبدوڵلا رەحمان
٦- گەڕەکی تەیراوە - حەسەن یاسین - جەوهەر کەریم
٧- گەڕەکی سێتاقان - سەدرەدین خۆشناو
٨- گەڕەکی سەیداوە - تاڵیب محەمەد ئەحمەد، شێرزاد هەینی.

*** لە هەفتەنامەی بەدرخان بڵاوکراوەتەوە**



# مێژووی پزیشکی لە پارێزگای هەولێر

دکتۆر ئیبراهیم تاهیر مەعروف ڕەباتی

## پزیشکیی هەولێر لە سەردەمی ئیسلامدا

ئاشکرایە کە موسڵمانان لەسەردەمی ئیسلامدا، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی و خۆپاراستن لەگوێزانەوەی و پاراستنی تەندروستی و بایەخدان بەخواردن و خواردنەوە و هاوسەرگیری، لە ڕووی پزیشکییەوە پشتیان بەستبوو بە ئایەتە پیرۆزەکانی قورئان و فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەر ( د.خ). هەمووی ئەمانە بە (الطب النبوي)[1] ناوبراوە. بۆ چارەسەرکردنی هەندێ لە نەخۆشییەکانیش پەنایان بردووە بۆ خواردنەوەی ئاوی کانزایی یان گۆگردی، کە تووشی نەخۆشی پێستی وەک (گرووو نەخۆشیی دیکە) بوون، یان بۆ نەخۆشییەکانی دیکەی وەک میزەڕۆ و دەمارگیری و ڕۆماتیزم ڕوویان لەو جۆرە چارەسەرکردنە کردووە. پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ خەلیفەکانی راشیدین پشتیان بە پزیشکانی ناموسڵمانی وەک "حارسی کوڕی کلدە" [2]ش بەستووە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە لەگەڵ پەنابردنیان بۆ قورئانی پیرۆزو فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەر (د.خ)، زۆر سوور بوون لەسەر زانینی نەخۆشییەکان و چارەسەرکردنی نەخۆشەکانیان و پشت بەستنیان بەپزیشکان و وەرگرتنی هۆکاری چارەسەری.

هەروەها لەپاش داگیرکردنی وڵاتانی تر، زانستی پزیشکی لای موسڵمانان بەرەو پێش چوو و پەیوەندییان بەپزیشکانی دراوسێیەکانیانەوە وەک ئێرانی و ڕۆمییەکان کرد، کە لە بواری تەندروستی و پزیشکی لە عەرەبەکان پێشکەوتووتر بوون. کاتێ موسڵمانەکان دەستیان بەسەر هەردوو قوتابخانەی "ئەسکەندەرییە" و

"گوندیشاپوور" داگرت، زانستی پزیشکی تیایاندا دەخوێندرا. شایانی باسە ئەم دوو قوتابخانەیە بوو بەخاڵی گۆڕان و پەیوەندیکردنی جیهانی ئیسلام بەزانستی پزیشکییەوە.[3].

ئایینی ئیسلام کە داوای زانست و فێربوون و پاراستنی خاوێنی و تەندروستی گشتی و خزمەتگوزاری کۆمەڵایەتی دەکرد، پشتی بەقورئانی پیرۆزو فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەر (د.خ) بەستبوو.

١- خوای گەورە دەفەرمووێت (اقرا باسم ربك الذي خلق) سورة العلق/ ١/٩٦.

٢- خوای گەورە دەفەرمووێت (قل هل يستوي الذين يعلمون والذين لا يعلمون، انما يتذكر اولوا الالباب) الزمر ٩/٣٩).

فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەر (د.خ)

٣- لە "ئەبی مالیکی ئەشعەری" دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (الطهور شطر الايمان)[4].

٤- لە "ئەبی هورەیرە" دەگێڕنەوە (ر) (فمسة من الفطر: تقليم الاظافر وقص الشارب ونتف الابط وحلق العانه والمنتان)[5].

٥- لە "ئەبی هورەیرە" دەگێڕنەوە (ر) (اذا استيقظ احدكم من نومه فيلغسل يده قبل ان يدخلها في وخوئه، فان احدا لايدري اين باتت يده)[6].

٦- لە "ئەبی هورەیرە" دەگێڕنەوە (ر) (انزوا تغنموا، وصوموا تصموا، وسافروا تستغنوا)[7].

ئایینی ئیسلام، لەپێناو تەندروستی مرۆڤدا بۆ بەهێزکردنی ماسوولکەکانی جەستە و بەهێزکردنی پەنجەکانی دەست و راهێنانیان لەسەر ئارامی و بەرخوودان و ئازایەتی، بایەخی بەوەرزش و سوارچاکی و مەلەوانی و تیر هاویشتن داوە.

لەم رێگایەشەوە هوشیاری ئایینی و رۆشنبیری لەزۆربەی ناوچەکان بڵاو بۆوە. ئەمەش خۆی لەخۆیدا بووە هۆی ئەوەی خزمەتگوزاری تەندروستی و کۆمەڵایەتی بەرەو پێش بچێ. میر و وەزیر و خێرخوازان کەوتنە پێشبڕکێ لە دامەزراندنی دامودەزگای تەندروستی و کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری، وەک نەخۆشخانە و پەناگە و خانەی بەساڵاچووان.

(بیمارستان)[8] شوێنێکی سەرەکی بووە بۆ خوێندن و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکان. بەزۆری لەقوتابخانەکان زانستی پزیشکی دەخوێندرا. لەشاری هەولێر هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلام تا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، دامودەزگای خزمەتگوزاری لەو رووەوە لێ بووە.

شایانی باسە، ئەوەی یەکەم جار لەم رووەوە خزمەتگوزاری پێشکەش کردبێ لە سەردەمی میرنشینی هەزبانییە کوردەکان بووە کە لەساڵی (٤٢٠ک) تا نیوەی سەدەی شەشەمی کۆچی حوکمڕانی هەولێریان کردووە. هەندێ لەمیرەکان بایەخیان بە خاوێنی و دروستکردنی گەرماو و دەستەبەرکردنی ئاو داوە. هونەرکاریشیان لە بیناسازیدا بەکار دەهێنا. پشتیان دەبەست بە ئاوی سازگاری کارێزەکان بۆ خواردنەوە و ئاودانی کشتوکاڵ. ژمارەی کارێزەکان لە هەولێر گەیشتە ٣٦٥ کارێز. میرەکان بەپشت بەستن بەچالاکی زانستی و تەندروستی و خزمەتگوزاریی کۆمەڵایەتی کاریان دەکرد. چونکە ئەو کارانە بوو بوون بە بەشێک لەچالاکی نواندنی میرەکان و سیاسەتە گشتییەکەیان[9].

(میرانی ئەتابەکی) کە لەساڵی (٥٢٢-٦٣٠ک/ ١١٢٨-١٢٣٢ز) حوکمڕانی هەولێریان کرد، بەشدارییان کرد لە بەرەوپێشبردنی لایەنی خزمەتگوزاریی تەندروستی و کۆمەڵایەتی لەو شارەدا. واپێدەچێ میرەکان زۆر بایەخیان بەلایەنەکانی زانستی و خزمەتگوزاریی تەندروستی و کۆمەڵایەتی دابێت. ئەوەتا "موزەفەرەددین گوگبری" زۆر بایەخی بەپاراستنی تەندروستی گشتی کۆمەڵگا داوە(٤). خانەی دروستکرد بۆ نابینایان و نەخۆشان و بێ سەرپەرشتان و میوانان و هەموو پێداویستییەکی بۆیان ئامادەکرد. جار جار بۆخۆی سەردانی نەخۆشەکانی کردووە و لە تەندروستیانی پرسیوە[10] کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دەسەڵات زۆر بایەخی بەنەخۆش داوە. وێڕای ئەوە پزیشکەکانی راسپاردووە بۆ چارەسەرکردنی "شێخ ئەبو محەمەد عەبدوللەتیف کوڕی ئەبی نەسیب عەبدولقەهار کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی محەمەد کوڕی عەبدوڵڵا سەهرودی" کە تووشی زۆر لە نەخۆشییەکان بوو، ناوبراو تاکو لە ساڵی

(٦١٠ک/ ١٢١٣ز)[١١] مرد، لەو شارە مایەوە. ئەو لایەنە خێرخوازییە دوو شت دەگەیەنێ: لەلایەک رۆڵی پزیشکان نیشان دەدات کە تاچەند چارەسەری نەخۆشەکانیان کردووە. لەلایەکی دیکەش، ماوەی گەشەسەندنی ئەو زانستەش نیشان دەدات لەشاری هەولێر کە تاچەند بەرەوپێش چووە.

بەڵێ کاتێ مرۆڤ پێویستی بەداوو دەرمان دەبێت، بیر لەوە دەکاتەوە ئەو دەرمانانە چۆن لە رووەکەکان پێکبێنێ، ئەمەشی لە بەروبووم، رەگ، تۆو، گەڵا، توێکڵ یان گوشراوی هەندێ رووەک و گژو گیاکان وەدەست هێنا. جا لەبەر ئەوەی ناوچەی هەولێر ناوچەیەکی کشتوکاڵی و شاخاوییەو دارو رووەک و گژو گیایەکی زۆری لێ دەڕوێت، بۆیە زۆرینەی دەرمانەکان لە رووەکەکان دەردەهێندرا و خەڵکی هەولێر بەشی پێویستیان لەودەرمانانە دەست دەکەوت[١٢].

پشتیان بەلاساییکردنەوەو تاقیکردنەوەکانی پێشینەیان دەبەست. بۆ نموونە میرانی ناوچەکە هانی خەڵکیان دا بە چەقاندنی دار و هەڵبەستنی رووبار و پرد و ئاوبار بۆ وەدەستهێنانی بەروبووم و میوە بەجۆرە جیا جیاکانیەوە، بەوەی کە داهاتێکی ئابوورییە و پێکهێنێکی سەرەکیشە بۆ دروستکردنی دەرمان، کاریگەری پۆزەتیڤی دەبێ لەسەر تەندروستی مرۆڤ و جوانی شارەکە.

نەخۆشخانە هەموو مەرجی تەندروستی تێدا بووە، لە قەرەباڵغی دوور بووە و لە سەرچاوەی ئاوی



ئیبراهیم ئیسماعیل (الحلاق)
١٩٢٨-١٩٩٠

نزیک بووە، پاشان کراوەتە دووبەش: بەشی پیاوان، بەشی ژنان. هەر بەشێکیش چەند یەکەیەک بۆ نەخۆشی جۆراوجۆری لەخۆ دەگرت وەک یەکەی نەخۆشییەکانی هەناو یەکەی نەشتەرگەری و یەکەی چاو.

هەر بەشێکیش تەواوی پێداویستییەکانی مرۆیی و پزیشکی بۆ دەستەبەر کرابوو لەوانە: ئامێرەکانی پزیشکی و خزمەتگوزاری نەخۆشیاری و خزمەتگوزاران و سەرپەرشتیکاران. سەرەڕای ئەوەی هەموو جۆرە ئامێرو دەرمانێک و ئەوانەی کە لە دەرمانخانە ئامادە دەکران بۆ نەخۆشخانەکان و نەخۆشان دەنێردرا[١٣].

لەشاری هەولێر نەخۆشخانەیەکی گەورە هەبوو، موزەفەرەدین گوگبری دروستی کردبوو کە لەچەند بەش و یەکەی جیا جیا پێکهاتبوو، هەر بەشەو خزمەتگوزاری دیاریکراوی خۆی هەبوو، "ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەمەد حەرانی" ناسراو بە (ئیبنی نەقیب) پزیشکی چاو بووە. دەرمانخانە بەشێکی تایبەت بووە لە نەخۆشخانەو پزیشکێک بەڕێوەی بردووە ناسراو بووە و بووە بەسەرپەرشتیاری دەرمانخانە. لەم بارەوە "ئیبن شعار دەڵێت": ئەبا ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی جامع کوڕی ئەحمەد حەسەن هەولێری کە لە ساڵی ٦١٥ک/١٢١٨ز کۆچی دوایی کردووە سەرپەرشتیاری دەرمانخانەی نەخۆشخانەکەی دەکرد[١٤].

ئەو نەخۆشخانە سەرنجی زۆر پزیشکی راکێشا، چونکە لەلایەن میر موزەفەرەدین گوگبریەوە چاودێری دەکرا. ئەوەتا عەلی کوڕی عوسمان کوڕی عەلی هەولێری داوای لەوەزیر ئیبن مستەوفی کردووە کە بەسەرۆکی کارگێڕی نەخۆشخانەی هەولێری دابمەزرێنێت بۆ ئەوەی زیاتر چاودێری بکات[١٥].

هەروەها "دکتۆر عەبدولڕەحمان کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاق بیاتی" کە لەساڵی (٦٢٣ک/١٢٢٦ز) کۆچی دوایی کردووە، کاتێ سەردانی هەولێری کرد لەو نەخۆشخانەیە کاری کردووە. ئیبنی خەلەکان دەڵێت: نەخۆشخانە گۆڕستانێکی تایبەتی هەبووە بۆ ناشتنی ئەو تەرمانەی میکرۆباوی ببوون، تاوەکو پەتاکان بەهۆی ئەوانەوەو لە ناوچەکەدا بڵاونەبنەوە[١٦].

لایەنە خزمەتگوزارییەکان هەر تایبەت نەبووە بەنەخۆشخانە جێگرەکان، بەڵکو نەخۆشخانە گەڕۆکەکانیشی گرتۆتەوە. کاتێ کە خەلیفە یان میر سەفەر و گەشتی سەربازی هەبووە، ئەم نەخۆشخانانە

یاوەریان بوون و لەنێوان شارەکان و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە لەگەڵیان دەگوێزرانەوە. ئەو جۆرە نەخۆشخانانە بەهەموو پێداویستییەکانی نەخۆش، لە داو و دەرمان و ئامێری پزیشکی و خواردن و خواردنەوە و پزیشک و دەرمانسازی ئامادە کرابوون[17].

دەسەڵات گرینگی زۆری بەنەخۆشخانەکان دەدا و کە بۆ گوندو لادێش دەچوون، لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی نەخۆش پێویستی دەبێ، پزیشکیشی بۆ دەناردن. ئەو چارەسەرە تەنیا تایبەت نەبووە بەمرۆڤ، بەڵکو چارەسەری ئاژەڵانیش کراوە[18]. کاری ئەو نەخۆشخانە گەڕۆکانە هەر ئەوە نەبووە کە سەرپەرشتی گوند و ناوچەیەکی دیاریکراو بکات، بەڵکو چالاکیی دیکەشی نواندووە، یاوەری حاجیەکانیشی کردووە کاتێ بۆ حەجکردنی ماڵی خودا چوون[19].

## پزیشکان و دەرمانسازانی خەڵکی هەولێر

١- حەسەن کوڕی ئەحمەد کوڕی زەفەر هەولێری لەبارەی پزیشکی و مێژوو زۆری زانیوە- رێگەی پێدرابوو کە دەست بەکاری پزیشکی بێت. دوو کتێبی داناوە یەکێکیان (روحة الجليس و نزهة الأنيس) و ئەوی تر (مدارس دمشق ورباطها وجوامعها وحماماتها) بووە. لە نەخۆشخانەیەکی بچووک لە دیمەشق لە جەمادیولئاخیری ساڵی (٧٢٦ک/١٣٢٥ز) کۆچی دوایی کردووە[20].

٢- عەلی کوڕی ئەحمەد کوڕی زەفر کوڕی ئەحمەد کوڕی موزەفەر هەولێری دەباوەندی سوفی لە ساڵی (٦٦٣ ک) لەدایک بووە. کاری کردووە لە زانست و پیشەی پزیشکی. لەساڵی (٧٢٦ ک/١٣٢٥ز) کۆچی دوایی کردووە[21].

٣- عەلائەدین کوڕی وەلیەدین هەولێری حەلەبی ناسراو بە "ئیبن وەلی"[22] (٩٢٦ ک/١٥١٩ز) لەدایک بووە. پزیشکێکی بەتوانا بووە، دەستی بەخێر بووە، لای تەواوی خەڵک خۆشەویست بووە، مامۆستاکەی پزیشکێکی عەجەمی بووە بەناوی ئەبوبەکر. لەساڵی (٩٢٦ک) کۆچی دوایی کردووە.

٤- ئەبو ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی جامع کوڕی ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی حوسێن کوڕی حەسەن هەولێری (٦١٥ک/١٢١٨ز) چاوی بەدونیا پشکوتووە، لەزانستی پزیشکی کارا بووە. لە نەخۆشخانەی هەولێر سەرپەرشتی دەرمانخانەی کردووە. لە شاری هەولێر (دەرمانخانە) هاتە کایەوە، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زانایانی هەولێر تا چەند شارەزاییان لەدەرمان و دروستکردنی هەبووە[4].

٥- ئیسحاق مەعالی کوڕی شەواس کوڕی هەیبەتوڵلا کوڕی ئیبراهیم کوڕی شەماس بە (ئەبو ئیبراهیم هەولێری) ناسرا بوو (٦١٧ک/١٢٢٠ز) زۆر سەرقاڵ بووە بەخوێندنی کتێبی پزیشکی. زانستی ئەندازەو پزیشکی خوێندووە. لە ساڵی (٦١٧ک) لەزیندان کۆچی دوایی کردووە[23].

٦- موسا کوڕی یونس کوڕی محەمەد کوڕی مەنعە کوڕی مالک کوڕی محەمەد ئەبی فەتح، کەمالەدین هەولێری[24]. لە (٥)ی سەفەر (ساڵی ٥٥١ک) لەدایک بووە. لای ئیمامی شافیعی خوێندوویە. لەماوەی ژیانی ئەو زانستانەی وتووەتەوە: حیکمەت- بێژە- سروشت- زانستی پزیشکی. لە زۆر لە زانستەکان باڵادەست بووە. هەروەها چەند کتێبێکی داناوە لەوانە: (مفردات الفاظ القانون)- (في الاصول)- (عيون المنطق)- (التميز في الحكمة)- (الاسرار السلطانية في النجوم). لە شاری موسڵ (لە ١٤ی شەعبانی ساڵی ٦٣٩ک) کۆچی دوایی کردووە.

## پزیشکانی کورد لە ویلایەتە کوردییەکان

١- ئیبن دینار میافارقینی[25]

لەماوەی حوکمڕانیەتی نەسرودەولە کوڕی مەڕوان (٤٠١-٤٥٣ک.م/ ١٠١٠-١٠٦٣ز) لە میافارقین بووە. شارەزاییەکی باشی هەبووە لە دروستکردنی داودەرمان. تەنانەت شەربەتێکی دروست کردبوو بە شەربەتی دینار ناسرا. چونکە لە سەردەمی ئەو و دواتر لەنێو پزیشکەکان زۆر بەکاردەهێنرا. کتێبێکی داناوە بەناوی (ئەقرابا زین).

٢- محەمەد کوڕی جەنگی کوڕی محەمەد کوڕی بابا کوڕی خەلیل جەنگی[26]

لەساڵی (٦٩٧ک) لەدیاربەکر

لەدایک بووە. لەزۆر بواردا کاری کردووە. بەشداریبیەکی کاریگەری هەبووە لە زانستی پزیشکیدا. لەساڵی(٧٤١ک.م/ ١٣٤٠ز) کۆچی دوایی کردووە.

٣- محەمەد کوڕی حەسەن کوڕی ئەحمەد کوڕی محەمەد، ئەبو عەبدوڵلا، شەمس کوردی موقەدەسی[٢٧] ناسراوە بەئیبن کوردی، لەساڵی ٧٨١ لە کوردستان لەدایک بووە، شارەزاییەکی تەواوی لە زانستی پزیشکیدا هەبووە. لە (٢٠)ی شەعبانی ساڵی (٨٤٣ک.م/ ١٤٣٩ز) کۆچی دوایی کردووەو لە (مەعلا) نێژراوە.

٤- ئیسماعیل کوڕی عەلی کوڕی مەحمود کوڕی عومەر کوڕی شاهەنشای ئەیوبی، شامونەید، ساحیبێی حەما، یەکێک بووە لە میرەکانی دەوڵەتی ئەیوبی، شارەزاییەکی باشی هەبووە لەزانستی فیقە و پزیشکی، لە زۆربەی زانستەکان شارەزایی هەبووە. لەساڵی (٧٣٢ک/١٣١٣ز)[٢٨] کۆچی دوایی کرد.

٥- محەمەد کوڕی قاسم بەغدادی ئەرواسی. ناسراو بەقوتب[٢٩]

باپیرەی ئارواسییەکانە، لە گوندی ئەرواسی کە سەر بەشاری (وان)ە لەدایک بووە. کتێبێکی لە بواری پزیشکیدا هەیە کە تێیدا ئاماژەبە ژمارەیەکی زۆر لە نەخۆشییەکان دەکات و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان بەو دەرمانانەی ئەو کات دەست دەکەوتن وەسف دەکات. کتێبی (جالینوس الحکیم)ی داناوە.

مەلا محەمەد ئەرواسی وەری گێڕاوە بۆ سەر زمانی کوردی.

٦- مەنسور کوڕی عیسا ئەبو سەعد/ بەزاهیدی زانایان بەناوبانگە[٣٠]

ئەبو سەعد مەنسور کوڕی عیسا لە میافارقین لە سەردەمی میر نەسرودەولە ئەحمەد کوڕی مەروان (٤٠١-٤٥٣ک/ ١٠١٠-١٠٦١ز) ژیاوە. خزمەتێکی زۆری وڵاتەکەی کردووە. لەوانە نەخۆشخانەیەکی لە میافارقین دروستکردووە بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان. خۆی پزیشکی چاو بووە. چەند کتێبێکی داناوە لەوانە (امراض العین ومداواتها)- (بیمارستان)- (في الفصول والمسائل والجوابات)- (فیما یجب علی المتعلمین لصاعة الطب).

٧- بەدر کوڕی ئەحمەد کوڕی مەحمود/ عیزەدین، ئەبو نەجم ئەسعەدی دەرمانساز

عیزەدین ئەبو نەجم بەدر کوڕی ئەحمەد کوڕی مەحمود ئەسعەدی دەرمانساز، پزیشکێکی دەرمانسازە لەدورگەی عەرەبیء ئامەد ناوبانگی دەرکرد. پزیشکێکی لێهاتوو بووە، لە زانستی پزیشکی شارەزا بووە. لەدەرمان و ئاوێتەکردنی دەرمانەکان شارەزاییەکی بێ وێنەی هەبووە. ئیبن فوتی دەربارەی عیزەدین دەڵێت (لەدەرمان و دەرمانگرتنەوەو ئاوێتەکردنی شتی نامۆ شارەزا بووە)[٣١].

٨- محەمەد کوڕی عەبدولسەلام کوڕی عەبدولرەحمان ماردینی[٣٢]

یەکێکە لەو پزیشکە بەناوبانگانەی لە ماردین بایەخی بەزانستی دەرمانسازی داوە. (ئیبن ئەبی ئەسبەعە) باسی دەکات و دەڵێت: (پزیشکێکی گەورە بووە، زانا بووە بەپیشەی پزیشکی، شارەزاییەکی بێ وێنەی لەکارەکەی خۆی هەبووە). زۆر لە پزیشکانی سەردەمی خۆی لەسەر دەستی ئەو فێری پزیشکی بوون. بایەخی بەزمانی عەرەبی داوە.

٩- عومەر کوڕی خدر کوڕی محەمەد حەموی/ عیمادودین دەنیسری[٣٣]

لە دەنیسر لەدایک بووە و پێگەیشتووە. یەکێکە لەو پزیشکانەی ناسراوە کە ڕۆڵی هەبووە لە چالاککردنی ئەو زانستەو بەرەو پێشبردنی پزیشک لە دوورگەدا. وێڕای ئەوەی پزیشک بووە لەهەمان کاتدا مێژوو نووسیش بووە. کتێبێکی پۆلێن کردووە بەناوی (حلیة السریین من خواص الدنیسریین).

١٠- یوسف کوڕی حەیدەر کوڕی حەسەن روحی/ ئەبو حەجاج[٣٤]

بەیەکێ لە گەورە پزیشکان دەژمێردرێت، شارەزا بووە لەدەرمان، ئیبن ئەبی ئەسبەعە باسی دەکات و دەڵێت: (یەکێک بووە لە گەورەکانی پیشەی پزیشکی). پزیشکی سوڵتان سەلاحەدینی ئەیوبی بووە. چەند کتێبێکی داناوە لەوانە (اختصار المسائل لحنین بن اسحاق) (تهذیب شرح ابن الطیب لکتاب الفصول لأبقراط) (مختصر الحادي لابي بکر الرازي) لە ساڵی (٦٣١ک/١٢٣٤ز) کۆچی دوایی کردووە.

١١- محەمەد کوڕی عومەر کوڕی محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی شوجاع شەیبانی، ئەبو سەنا، ناسراو بە ئیبن رەقیقە[٣٥]

لە دیاربەکر هاتۆتە دنیاوە، لە زانستی پزیشکیی سەردەمی خۆی چالاک بووە. پزیشکی چاو بووە. نەشتەرگەرێکی بالادەست بووە لەچاو. لەبەر ئەوەی ناوبانگی دەرکردبوو نەجمەدین ئەیوبی داوای کرد و ماوەیەک لای مایەوە. پاشان سەردانی زۆر لە پاشاکانی شامی کردووە. بۆ دواجار تامردنی لای پاشا ئەشرەف سولتانی دیمەشق دەمێنێتەوەو لە سالی (٦٣٢ک/١٢٣٤ز) کۆچی دوایی دەکات.

١٢- عەلی کوڕی ئەبی فەتوح کوڕی عومەر قرشی/ ئەبو حوسێن دنیسیری[٣٦]

لە سەدەی شەشەمی کۆچی (١٢ی زاینی) ژیاوە. یەکێک بووە لەو زانا بەرزانەی لە دنیسر شارەزایی لەپزیشکیدا هەبووە. پزیشکی چاو بووە خەلکێکی زۆری چارەسەر کردووە. نزیکەی سەد سال ژیاوەو لە دەنیسەر کۆچی دوایی کردووە.

١٣- محەمەد کوڕی ئەبی حەنین ئەبوبەکر نەسیبی[٣٧]

لە سەدەی شەشەمی کۆچی (١٢ی زاینی) ژیاوە، یەکێکە لەو پزیشکانەی لە دنیسر لە کارامەیی پیشەی پزیشکی پراکتیزە کردووە. وانەی پزیشکیشی گوتووەتەوەو قوتابییەکی زۆری هەبووە. لە نەسیبین کۆچی دوایی کردووە.

١٤- محەمەد کوڕی ئیبراهیم کوڕی ساعد شەنگالی (ئیبن ئەکفانی)/ ئەبو عەبدوللا شەمسەدین[٣٨]

پزیشک و توێژەرو زانای حیکمەت و بیرکاری بووە. پیشەی پزیشکی بەکارامەیی پراکتیزە کردووە. شارەزا بووە لەدەستنیشانکردنی نەخۆشی و ئاوێتەکردنی دەرمان و لە زانینی گەوهەری دەرمانەکان بەناوبانگ بووە. لە میسر لە سالی (٧٤٩ک/١٣٤٩ز) کۆچی دوایی کردووە. چەند کتێبێکی پزیشکی داناوە لەوانە (غنیة الطب في غیبة الطبیب) (کشف الرمق في امراض العین) (نهایة القصد في صناعة القصد) (روضة الألبا من أخبار الأطبا).

١٥- محەمەد کوڕی عەباس ئەحمەد دنیسری/ عیمادودین، ئەبو عەبدوللا[٣٩]

پزیشک، نووسەر و شاعیر بووە لە سالی (٦٠٦ک/١٢٠٩ز) لە شاری دنیسر لەدایک بووە و هەر لەوێ پێگەیشتووە. زانستی پزیشکی خوێندووە تا لێی شارەزا بووە. لە دیمەشق خزمەتێکی زۆری بەبیمارستانی نوری گەورە کردووە. هەر لە دیمەشقیش کۆچی دوایی کردووە.

## مێژووی پزیشکی نوێ لە شاری هەولێر

لە سالی (١٩٢٠-١٩٢٢ز) پزیشکێکی بەریتانی بەناوی "ولیەم سون" لە شاری هەولێر کاری دەکرد. هەندێکیش دەلێن ناوی "ریج جۆنست" بووەو لە پۆستی سەرۆکی تەندروستی لە هەولێر کاری دەکرد. هەروەها پزیشکێکی هیندی بەناوی "محەمەد خان" کاری لەگەل کردووە. وێڕای ئەوە پزیشکێکیش هەبووە بەناوی "دیمتریکی". پاشان پزیشکێکی دیکەی نەسرانی مەزەب کە خەلکی موسل بووە بەناوی "عەبدولئەحەد عەبد نور" هاتۆتە هەولێرو بۆ ماوەی زێتر لە هەشت سال ماوەتەوە. هەندێکیان دەلێن لە سالی (١٩٢٠-١٩٢٨ز)، هەیە دەلێت لەسالی (١٩٢٤-١٩٣٢ز) لە هەولێر ماوەتەوە[٤١].

پاش ئەوەی "شا فەیسەلی یەکەم" لەسالی ١٩٢٠ پادشایەتی عێراقی گرتە دەست، داوای کرد لەو پزیشکە عێراقییانەی لەدەرەوەی ولات بوون، بگەڕێنەوە. هەر بۆیە ژمارەیەک لەوانە گەڕانەوە ولات. دوای ئەوە عێراق پشتی بەپزیشکانی سوریایی بەست. ئەوەبوو زێتر لە (٧٣) پزیشکی سوریایی هاتن بۆ عێراق، زۆرینەیان لە شاری بەغداو موسل نیشتەجێ بوون. لەسالی (١٩٢٤ز) (دکتۆر میلز) - ئینگلیزی بوو- بەڕێوەبەری تەندروستی عێراق، بڕیاری دا چارەسەرکردن بەخۆڕایی بێت[٤٢]. ئەوسا لەشاری هەولێر بالەخانەیەکی تایبەت بەناوی نەخۆشخانە نەبوو. خانووی خورشید ئاغا (باپیری دکتۆر مستەفا نادر عالم) تایبەت کرابوو بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی و تیمارکردن و پێدانی دەرمان. کە کەوتبووە بەرامبەر (شێخی چۆلی). پاشان خانووەکە بووە مولکی

"عەبدولرەزاق"ی مامی. دواتر بوو بەموڵکی "حاجی نوری بەقال کوڕی شێخ شەریف"[٤٣] و پێدانی دەرمان بوو بەخۆڕایی.

لەساڵی (١٩٢٤ز) بەردی بناغەی یەکەم نەخۆشخانەی تازە بابەت لە هەولێر دامەزرا، کە کەوتبووە سەر ڕێگەی هەولێر- موسڵ (کۆمەڵگەی ددانی ئێستاکە). کاتێ شا فەیسەڵی یەکەم سەردانی هەولێری کرد لەماڵی مەلا فەندی میوان بوو. لەساڵی (١٩٢٩ز) نەخۆشخانەکە کرایەوە.

لەشاری هەولێر دەرمانخانەیەکی فەرمی نەبوو، بەڵکو لەنزیک دەرگای قەیسەری (بەرامبەر مزگەوتی گەورە لە بازاڕ) دوکانێکی بچووک هەبوو هی پیاوێک بوو بەناوی محیەدین، لەپاش ئەویش کوڕەکەی محەمەد محیەدین دەرمانی دەفرۆشت.

پیشەی پزیشکی میللی لەلایەن کەسێک بەناوی "ئەمین" بەڕێوە دەچوو، پێیان دەگوت ئەمینی حەکیم. بەڕەگەز ئەفغانی بوو. باپیری دەرمانساز "سەباح نوری ئەمین" بوو. لەژوورێکی تایبەت چارەسەری نەخۆشەکانی دەکرد. خۆی دەرمانی ئامادە دەکرد. پێداویستی زۆری پزیشکی و ژمارەیەکی زۆری کە مۆڵەتی تایبەت بەئامادەکردنی دەرمان لەگژوگیای ناوخۆو دەرەوەی هەبوو. کتێبێکی تایبەتی لەم بارەیەوە هەبوو. بەپێی هەندێ گێڕانەوە نەخۆش لەدەرەوەش لە (ئێران و لە تورکیا) بۆ لای هاتوون. پسپۆڕ بووە لەچارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەرس.



ئەو حەکیمە لەساڵی ١٩٤٠ کۆچی دوایی کردووە[٤٣].

"شێخ شەریف کوڕی شێخ عەبدوڵڵا قادری خاوەنی تەکیەی قادریە" خەڵکی قەڵایە و لە ساڵی (١٨٧٠ز) لەدایک بووە، لەقەڵای هەولێریش نیشتەجێ بووە. بەسەردان چووەتە شاری کەرکوک بۆ وەرگرتنی تەریقەی قادری لەسەر دەستی شێخ عەلی عەبدولرەحمان تالیبانی قادری. پاش ئەوەی تەریقەتی قادری قبوڵ کرد، زانستی پزیشکی فێربوو. ژمارەیەک موریدی شێخ کە هیندی بوون، لەگەڵی بوون. بەشێکی زۆری زانستەکانی پزیشکی لێ وەرگرتوون. شارەزایی پەیدا کردووە لەبەکارهێنانی گژوگیا بۆ چارەسەری نەخۆشی. لەوانە زۆر لەگەڵی دەچوون بۆ ناوچە شاخاوییەکان و دۆڵەکان بۆ ناسینی گژوگیاو چۆنیەتی دروستکردنی دەرمانی میللی. پاش تێپەڕبوونی (٣) ساڵ گەڕایەوە هەولێر بۆ خزمەتکردنی کۆمەڵگاکەی. لەیەک کاتدا دوو کاری کردووە. یەکێکیان فێرکردنی خەڵک لەسەر ڕێگەی قادری لە تەکیە تایبەتەکەی لەقەڵا. ئەوی دیکەش چارەسەرکردنی نەخۆش لە مزگەوتی خانەقا لەدەرەوەی قەڵا. دەرمانی لەناو ژوورێکی تایبەتی ناو مزگەوت ئامادە دەکرد. نەخۆشەکانی بەدەرمان چارەسەر دەکرد. کە لەسەردانەکانی یاخود لە چیاو باخچەکان دەستی دەکەوت. هەروەها یارمەتی هەژاران و نەدارانی خەڵکی شارەکەی و ئەو کەسانەی کە لەدەرەوە دەهاتن دەدا تا ساڵی(١٩٥٧ز) گیانی سپارد. زمانەکانی کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی زۆر بەباشی زانیوە. کتێبێکی دەستنووسی هەبووە بەزمانی عەرەبی و تورکی لەیەک کاتدا لەژێر ناونیشانی (الرحمة في الطب والحكمة). کتێبێکی دیکەی هەبووە بەناوی (منافع الناس) بەزمانی عەرەبی، کە دەستنووس بووە بەر لە (٣٠٣) ساڵ لەموسڵ. بەڵام نەتوانراوە ناوی دانەرەکەی بزانرێت. کتێبێکی تایبەتی هەبووە بەدەستنووس، عەرەبی و تورکی و تێیدا سەرنج و تێبینییەکانی دەربارەی ئاوێتەکردنی هەندێ دەرمان و ناوەکانیان و پێدانی مژەی

پێویست بۆ هەر دەرمانێک تۆمار کردبوو. شایانی باسە ئەو کتێبە ئێستا لای شێخ فوئاد کوڕی شێخ عەبدولقادر کوڕی شێخ شەریف ماوە[٤٥].

لە هەولێر کەسێکی دیکە هەبوو لە بنەماڵەی نانەکەلی بەناوی (حاجی محەمەد کوڕی مەحمود کوڕی عاشور نانەکەلی) کە ساڵی لەدایکبوونی نەزانراوە، بەڵام پێدەچێ لە ساڵی (١٩٣٢ز) کۆچی دوایی کردبێ. لەهەردوو دەیەی یەکەم و دووەمی سەدەی بیست لەم بوارە کاری کردووە. لە بنەچەدا خەڵکی کۆیەو تامردنی ئەو پیشەی ئەنجامداوە. هەروەها نەخۆش لەشارەکانی دیکەی عێراق و دەرەوەی وڵاتیش هاتوون بۆ لای بەتایبەت لە ئێران. پزیشکی هەناو و شکست و جومگەی کردووە. سوودی لە کتێبی (الرحمة في الطب والحكمة) وەرگرتووە. لەبرین پێچیدا ژمارەیەک مێرووی قەبارە گەورەی بەکارهێناوە. دوای ئەوەی مێرووەکە چەند جارێک گەزەی لەپێستەکەی گرتووە راستەوخۆ سەری بڕیوە. بەم شێوەیە لایەنی پێستەکە یاخود برینەکە لێک نزیک بۆتەوەو بۆ یەک هاتۆتەوە. لەبن دەستی ئەو دوو کەسی بەناوبانگ دەرچوون، کە خزمەتیان بەو شارە گەیاندووە. یەکێکیان (ئەحمەدی کوڕی سلێمان کوڕی تەها) یە، کە لەبنەچەدا خەڵکی دەشتی هەولێرە. سەرەڕای ئەوەی لەهیچ قوتابخانەیەکی پزیشکی دەرنەچووەو خوێندنی ئەکادیمی تەواو



نەکردووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش لەماڵی خۆی نەشتەرگەری گشتی و نەشتەرگەری شکست و جومگەی ئەنجامداوە. هەروەها دەرمانی پێویست بۆ نەخۆشەکانیشی ئامادەکرد. لەپاش ئەوە بە (ئەحمەد تەبیب) ناسرا. باوکی هونەرمەند، فوئاد ئەحمەدی خوالێخۆشبووە. ئەو پزیشکە کارامەیە بۆ ماوەی زێتر لەنیو سەدە تا لەساڵی (١٩٧٩ز) کۆچی دوایی کرد بەسەرکەوتنێکی بێ وێنە کارەکەی ئەنجام دەدا. هەروەها کەسێکی دیکە بەناوی (عەلی کوڕی حاجی محەمەد کوڕی مەحمود کوڕی عاشور نانەکەلی) ناودار دەبێت. لە ساڵی ١٩٠٠ لەکۆیە لەدایک بووە، چۆتە قوتابخانە و بەڵگەنامەی سەرەتایی وەدەست هێناوە. لەباوکی لەبارەی پزیشکی فێری زۆر شت بووە. پاشان لە بەغدا لە خولێکی تەندروستی بەشداری کردووە. لەخولەکە سەرکەوتنی بەرزی وەدەست هێناوە. تا ساڵی (١٩٣٥ز) بەکارمەندی تەندروستی لەکۆیە دامەزرا. دواتر گوێزراوەتەوە بۆ شاری هەولێر لە نەخۆشخانەیەکی ئەهلی دامەزرا. یارمەتی دکتۆری نەشتەرگەر سالم خەیات موسڵی و دکتۆر سەبری محەمەد محیەدین قەبانی دەدا.

هەر لەو بنەماڵەیە مامی (یابە) ناوبانگی دەرکردو بەرێگەی میللی لە سییەکان چارەسەری نەخۆشەکانی دەکرد، خزمی (ئەحمەد تەبیب) و (عەلی کوڕی حاجی محەمەد نانەکەلی)[٤٦] بووە. بەڵام سەبارەت بەنەخۆشییەکانی چاو ئافرەتێکی جوولەکە بەناوی (ئامۆش) لە گەڕەکی عەرەبان- لە نزیک کلیسا هەبوو چارەسەری نەخۆشییەکانی چاوی دەکرد.

کەسێکی تر بەناوی (سلێمان) کە نەسرانی مەزەب بووەو خەڵکی شاری موسڵە، کاری پزیشکی ددانی کردووە. ئامێرێکی سادەی بەدەستەوە بووە بۆ پاکژکردنەوەی ددانەکان. زۆرباش فێری زمانی تورکمانی بووە. لەساڵی ١٩٣٩ پاش ئەوەی (حاجی خەلیل عەبدوللەتیف مەولود ئەفەندی) لە پەیمانگەی پزیشکی ددان لە بەغدا دەرچووە، گەڕاوەتەوە هەولێر، ئەویش گەڕایەوە موسڵ. لەکۆتایی شەستەکان کەسێکی ئێرانی بەناوی (عەلی شیرازی) کە لەشاری رانیە نیشتەجێ بوو، کاری دروستکردنی ددان و چارەسەری نەخۆشییەکانی ددانی دەکرد.

ژمارەیەک کوردی عێراقی فێری پیشەی دروستکردنی ددان و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی کرد. لەوانە رەووف دیشچی[٤٧].



**حاجی خەلیل عەبدوللەتیف مەولود ئەفەندی و نووسەر**

## ساڵی (١٩٣٠-١٩٤٠)

ژمارەی دانیشتوانی شاری هەولێر لەساڵی( ١٩٣٥ز) ١٦٩ هەزار کەس بووە. ئەوسا عێراق (٣/٣٥٢) ملیۆن کەس بووە، ژمارەی پزیشکان (٥ یان ٦) بووە، زۆربنەی لەناو شار کاریان کردووە. د.سەلیم خەیات. د.بەشیر سەرسم. د.سەبری محەمەد قەبانی. د.ڕەشید زەکەریا. د.سەلیم نوحاس.

لەساڵی ١٩٣٢[٤٨] نەخۆشخانەی مەلەکی لەلایەن کۆمەڵێکی بێ لایەنی خەڵکی بەغدا لە ئەندازیار و وەستا و هەتا کرێکاران[٤٩] دروستکرا. دوای ئەوەی باڵەخانەی نەخۆشخانەی مەلەکی تەواو بوو، چارەسەرکردن لە ماڵی خورشید ئاغا گوێزرایەوە بۆ ئەو نەخۆشخانەیە. ئەو نەخۆشیارە کچانەی لە نەخۆشخانە کاریان دەکرد (روزدو سەبیحە)، کچی ولیەم خەیاتی موسڵی بوون[٥٠]. لەپاش دەوامیش لە نەخۆشخانە پیشەی (مامانی)یان دەکرد.

لە شارەکە یەک دەرمانخانە هەبوو بەناوی دەرمانخانەی (شیمال)، کە کەوتبووە شەقامی سەرای بەرامبەر قەڵا- واتە کۆتایی شەقامی سەلام لە باتا. بۆلس جۆرج بەڕێوەی دەبرد، کە بەرەگەز کلدانی بوو. لەساڵی (١٩٣٦ یان ١٩٣٧ز) لە پەیمانگەی دەرمانسازی کە سەر بەکۆلێژی پزیشکی مەلەکی بوو دەرچووبوو. یارمەتی هەژارو نەدارانی دەکرد و بەخۆڕایی یان بەقەرز دەرمانی پێ دەدان. تا لەناوەڕاستی حەفتاکان کۆچی دوایی کرد لەسەر ئەو کارە بەردەوام بوو. خەڵک ڕێزو حورمەتی تایبەتی دەگرت. لەپاش مردنی ناوی دەرمانخانەکە گۆڕا بەناوی (یوسف)ی کوڕی.

لە ناوەڕاستی سییەکان بڕیاردرا ئەو نەخۆشانەی تووشی نەخۆشی سییەکان و مێرکوتە بوون لەنەخۆشخانە دایانبڕاندن و گوازرانەوە بۆ خانوویێک لە نزیک ئاشی شێخ محیەدین کە لە منارە نزیک بوود. ڕۆژانە لە نەخۆشخانەی مەلەکییەوە[٥١] خۆراک و خزمەتگوزاری پزیشکییان دەچوو. بەر لەوەی لە پەنجاکان مەڵبەندی سییەکان دابمەزرێت.



د.ڕەشید زەکەریا



د.سەبری قەبانی

## ساڵی (١٩٤٠-١٩٥٠)

دانیشتوانی شاری هەولێر لەساڵی ١٩٤٢ گەیشتە ٢٠٢ هەزار کەس، لە کاتێکدا ئەوسا کۆی دانیشتوانی عێراق، ٤/١٤٦ ملیۆن کەس بوو. لەساڵی ١٩٤٧ ژمارەی دانیشتوانی شاری هەولێر بەپێی ئاماری فەرمی گەیشتە ٢٣٩/٧٧٦ هەزار کەس لەکۆی تێکڕایی دانیشتوانی عێراق کە ٤/٨١٦ ملیۆن کەس بوو. ژمارەی پزیشکان لە شاری هەولێر لەساڵی ١٩٤٨ گەیشتە (١٠) پزیشک. لەساڵی ١٩٤٩ بوو بە (١٧) پزیشک. لەساڵی ١٩٥١ کەم بۆوە بۆ (١١) پزیشک. لەساڵی ١٩٥٢ بەرز بۆوە بۆ (١٥) پزیشک. لەساڵی ١٩٥١ ئەو یانزە پزیشکە بەسەر چوار نەخۆشخانە دابەش کران. بەڵام لەساڵی ١٩٥٢ ئەو (١٥) پزیشکە بەسەر (٦) نەخۆشخانە دابەش کران[٥٢].



هەر چەندە ئینتیداب هەڵگیراو عێراق لە کۆمەڵەی نەتەوەکان وەرگیرا، بەڵام لەبەر دەست تێوەردانی بەردەوامی بەریتانیا لە کاروباری عێراق، باوەڕ ناکرێ لەو دەیەدا هیچ پێشکەوتنێک لە بواری تەندروستی یان بوارەکانی دیکەی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و رۆشنبیری، لەعێراق و لە کوردستان هاتبێتە ئاراوە. هەروا وامەزندە دەکرێت سەرۆکی تەندروستی هەولێر لەو دەیەدا لە سەردەمی دکتۆر بەشیر سرسم و دکتۆر رەشید زەکەریاو دکتۆر سەلیم نوحاس[٥٣] هەولیان دا خزمەت بەشارەکە بکەن، بەڵام بەهۆی نالەباری رەوشی سیاسی و سەربازی ناوچەکە سەریان نەگرت. بەڵام لەم ماوانەی دوایی لەساڵی ١٩٣٨ یەکەم پزیشکی خەڵکی هەولێر لە کۆلێژی پزیشکی عێراقی دەرچوو ئەویش دکتۆر هاشم شەریف دۆغرەمەچی هەولێری بوو. بەڵام نەیتوانی بگەڕێتەوە هەولێر، چونکە بەپزیشک لە قەزای مەندەلی و هەڵەبجە دامەزرا. پاش چەند ساڵێک بەسەرۆکی تەندروستی سلێمانی دامەزرا. دواتر لە پەنجاکان گەڕایەوە شاری هەولێر تا ساڵی ١٩٦١ وەک پزیشکێکی نەشتەرگەر مایەوەو لە هەمان ساڵیشدا خانەنشین کرا.

هەر لە هەمان خولدا پزیشکێکی دیکە کە خەڵکی کۆیە بوو، بەناوی دکتۆر رەفیق تاهیر چەلەبی دەرچوو. لەساڵی ١٩٥٠-١٩٥٤ بوو بەسەرۆکی تەندروستی شاری هەولێر. دواتر دکتۆر عوسمان ئەحمەد تەها عوزێری دەرچوو و لە نەخۆشخانەی شەقڵاوە دامەزرا. و دواتر لەساڵی ١٩٤١-١٩٤٣ لە هەولێر دامەزرا. پاشان بوو بەسەرۆکی تەندروستی لە هەردوو پارێزگای کەرکوک و موسڵ. دواتر گەڕایەوە هەولێر لەساڵی ١٩٦١-١٩٦٣ بوو بەسەرۆکی تەندروستی هەولێر. لەساڵی ١٩٦٣ داوای خانەنشینی کرد. تا ساڵی ١٩٧٥ بەشێوەیەکی بەردەوام خزمەتی شارەکەی کرد[٥٤].



هاشم شەریف دۆغرەمەچی



د.عوسمان ئەحمەد تەها عوزێری

پۆلێکی دیکەی قوتابیانی شاری هەولێر لەکۆلێژی پزیشکی لەنێوان ساڵی ١٩٤٠-١٩٤٣ وەرگیران. بەڵام لەبەر قورسی و گرانی تاقیکردنەوەکان و زمان لە هەردوو قۆناغی یەکەم و دووەم دەرنەچوون بۆیە کۆلێژیان جێهێشت. بەڵام دواتر لە کۆلێژی پزیشکی بەغداو ژمارەیەک پایتەختی وڵاتانی دیکە وەرگیران، لە ئاکامدا بەغەرەی باش سەرکەوتنیان وەدەست هێنا: لەوانە:

١- دکتۆر خەیروڵڵا عەبد جاسم دەرچووی زانکۆی بەغدا ١٩٥٢.
٢- دکتۆر حیکمەت قوزمی عەبدولئەحەد قوزمیدس بەڕەگەز خەڵکی شاری ماردینی تورکیایە. دەرچووی زانکۆی دیمەشق ١٩٥٤.
٣- دکتۆر خالید ئیسماعیل دزەیی لە ئەستەنبوڵ لەساڵی ١٩٥٥ خوێندنی تەواو کردووە.
٤- دکتۆر عومەر ئیسماعیل دزەیی. لەساڵی ١٩٥٥ دەرچووە.


د.خەیروڵلا عەبد جاسم


د.حیکمەت قوزمی عەبدوڵئەحەد


د.خالید ئیسماعیل دزەیی


د.عبدالرزاق شهاب دباغ


د.محەمەد زیوەر شەریف یوسف


د.محەمەد شێخۆ


د.تەحسین نورەدین محەمەد ئاغا


د.محەمەد ئەحمەد سلێمان دزەیی

٥- دکتۆر عەبدولرەزاق شەهاب دەباغ. لەساڵی ١٩٥٦ دەرچووە.
٦- دکتۆر محەمەد زیوەر شەریف یوسف. لە زانکۆی ئەنقەرە ١٩٥٥ دەرچووە.
٧- دکتۆر محەمەد شێخۆ. لەساڵی ١٩٥٦ دەرچووە.
٨- دکتۆر تەحسین نورەدین محەمەد ئاغا ئەسعەدی. دەرچووی زانکۆی ئەستەنبۆڵ ١٩٥٧.
٩- دکتۆر محەمەد ئەحمەد سلێمان دزەیی. دەرچووی ئەنکەرە ١٩٥٩.

## ساڵی (١٩٥٠-١٩٦٠)

ژمارەی مەڵبەندەکان لە لیوای هەولێر بەشێوەیەکی گشتی گەیشتە ٣٠ مەڵبەند لە کۆی ١٠٥ نەخۆشخانەو، ٤٩٨ مەڵبەند لەعێراقدا، لەو ٣٠ مەڵبەندە (٧)یان پلە یەک بوون، (٢٣) یەکەی تر پلە دوو بوون.

لە ساڵی ١٩٥٨ ژمارەی پزیشکەکانی هەولێر گەیشتە (٢١) پزیشک. بەڵام ژمارەی پزیشکانی ددان لەهەمان ساڵ لە کۆی ١١٢ پزیشک لەعێراقدا لە لیوای هەولێردا تەنیا یەک پزیشکی ددان هەبوو. ٣ دەرمانسازیش هەبوو لە کۆی ٣٧٨ دەرمانسازدا. یەک یاریدەدەری تاقیگەش هەبوو لە ١٧٢ کەسدا[٥٥].

بەشێوەیەکی گشتی ئەم دەیە جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە لەگەڵ دەیەکانی دیکەدا لەعێراق بەگشتی و لە هەولێر بەتایبەتی، چونکە چالاکییەکی پزیشکی بەرفراوانی بەخۆوە بینی. لەساڵی ١٩٥٢ کۆمەڵەی پزیشکی نەهێشتنی نەخۆشییەکانی سینگ دامەزرا. بنکەی تەندروستی (مەڵبەند) لە زۆر لە شارەکان تایبەت بەنەهێشتنی نەخۆشی سینگ و چارەسەری کرانەوە، یەکێک لەوانە هەولێر بوو. لەساڵی ١٩٦٠ لەلایەن ئیدارەی خۆجێییەتی باڵەخانەیەکی نوێ کرایەوە، کە لە ٤ یەکە پێکهاتبوو بەفراوانی (١٠٠) قەرەوێڵە بۆ پیاو و ژنان.

کاتێ دکتۆر مەردان عەلی لەناوەڕاستی ساڵی ١٩٥٤ لەپاش دکتۆر رەفیق تاهیر چەلەبی کە خەڵکی کەرکوک بوو، بوو بەسەرۆکی تەندروستی هەولێر، بەشێوەیەکی نیمچە تەواو دەستی کرد بەبنبڕکردنی

کـــوَلێــــرا. لەســـــاڵی ١٩٥٩ نەخـــۆشـــخـــانەیەکی بەناوی نەخۆشخانەی کۆماری کردەوە، کە ٢٦٧ قـەرەوێڵـەی هەبوو. هەر لەو نەخۆشخانەیە، نەخۆشخانەی گرانەتا کە ٣٦ قەرەوێڵەی هەبوو، بە هۆیەی تیشک و تاقیگەکـانەوە. پاشـان لەنزیک تەکیـەی شێخ مـسـتـەفـای نەقـشـبـەندی باڵەخـانەیەکی بۆ نەخۆشخانەی منداڵان دروست کرد.

دکتۆر ئاگوب نیشـان میناسیان لە ١٩٥٦ لە زانکۆی بەغدا دەرچوو، کـە بەرەگـەز ئەرمـەنـیـەو خـەڵکی دیاربەکـــرەو لـە بنەمـــاڵەیەکی بەناوبانگە.

دووەم دەرمـانخـانە لە هەولێـر بەناوی دەرمـانخانەی (سـەلاحەدین) کرایەوە، کە خاوەنەکەی ئەرمەنییەک بوو بەناوی (ئوهان کـریکۆریان) کـە کەوتبووە شەقـامی سەرای بەرامبەر قەڵا.

سەبارەت بەدەوروبەر. لەشەقڵاوە نەخۆشخانەیەکی (٢٤) قەرەوێڵەیی دروستکرا. لە ڕەواندز لە پەنجاکـان نەخۆشـخـانەی مـەلەکی دروسـتکرا. لەساڵی ١٩٥٦ مـەڵبـەند لە گوندی



بەحـرکـە و بارزان و دیانەو ئارگـوش دروستکران[٥٦].

لەساڵی ١٩٥٩ (٩٠) پزیشکی ددان لەعـێـراق هەبوون، بەڵام تەنیـا دووانیان لە هەولێر بوون.

### ساڵی (١٩٦٠-١٩٧٠)

هەولێـــر لەم دەیەدا، پاش ئەوەی نەخـۆشـخـانەی کـۆمـاری کـرایەوەو نەخـۆشی وەرگـرت و نەشـتـەرگـەری لەلایەن پزیشکانی پسپۆری جیاجیا ئەنجامدرا، لەمێژووی پزیشکیدا پێی نایە قـۆناغێکی تازەوە. هەر لەشاری

هەولێر ژمارەیەک مەڵبەند هەبوون، وەک: (مـــەڵبـــەندی قـــەڵا- نەخۆشییەکانی سینگ، تەندروستی قوتابخانە).

هەندێ لەخـێـرخـوازانی شـاری دلێـران هاریکاریـیـان کـرد لەگـەڵ دەسـەڵاتدارانی ناوخـۆ بۆ کـردنەوەی چەند یەکـــەیەکی تازە، لەوانەی بەشـداریـیـان کـرد: سـەید ڕەشـاد نەجار- سەید ئیبراهیم ئاغا دزەیی باوکی دکتۆر خورشید[٥٧].

هەروەها مەڵبەند لە قەزای کۆیە و گوندی "قورشاغلوو"و گوندی "دری " لەساڵی ١٩٦١ و لە "قـوشتەپە" و "گـردعـازەبان" و "هەریر" لە سـاڵی ١٩٦٤ دروســـــتکران. هەروەها نەخـۆشـخـانەی سەربازی لە هەولێـر دامەزرا[٥٨].

بەڵام سەبارەت بەپزیشکی ددان، یەکەم پزیشک کە خزمەتی شـاری هەولێـری کـردبێ، دکـتـۆر "پۆلس عەبدلئەحەد" خەڵکی کەرکوک بووە" و لە ناوەڕاستی شەستەکان مردووە. هەروەها دکـتـۆر عـارف سـمکۆ، کـە



لەپێش ١٩٦٥ دەرچووە، لەکۆتایی شەستەکان وەک پزیشکی ددان خزمەتی بەشار گەیاندووە. لەساڵی ١٩٦٥ سێیەم دەرمانخانە لەشار بەناوی (دەرمانخانەی هەولێر) کرایەوە. نزار شاکر محەمەد قازی لەساڵی ١٩٧٠ یەکەم دەرمانسازی خەڵکی هەولێرە کە لەزانکۆی بەغدا دەرچوو. شاکر محەمەد، بوو بەخاوەنی دەرمانخانەی هەولێر لەساڵی ١٩٧١[٥٩]. شایانی ئاماژە پێکردنە، لەسەرەتای شەستەکان هەولێر بێ بەش بوو لەپزیشکانی ددان. ئەوە بوو ڕەووف دیشچی مەشقی بە هەریەک لە (کەمال عەلی و ئەنوەر وەلی) کرد، بۆفێربوونی پیشەی ددان و چۆنیەتی چارەسەرکردنی هەندێ نەخۆشی پێویست بۆ ماوەی زێتر لە (١٠) ساڵ. کەمال عەلی نۆرینگەیەکی تایبەتی لەگەڕەکی تەعجیل کردەوە. بەڵام ئەنوەر وەلی لەگەڵ فێرکارەکەی مایەوە. ئێستاکە تاقیگەیەکی تایبەتی هەیە بۆ دروستکردنی ددان بەناوی تاقیگەی سەلاحەدین.

### ساڵی (١٩٧٠-١٩٨٠)

هەروەکو پێشتر ئاماژەمان پێکرد، ئەو کاتەی دکتۆر "محەمەد زبودر"و دکتۆر "عەبدولرەزاق دەباغ" بەڕێوەبەری گشتی فەرمانگەی تەندروستی هەولێر بوون، فەرمانگەکە چالاکی باشی بەخۆیەوە بینی. گرینگترینی ئەو کارانە ئەوانە بوون کە مەڵبەندی زۆریان دروست کرد و ژمارەیەک لە نەخۆشخانەکانیان نۆژەن کردەوە و بە دەستەبەرکردنی ئامێری پێشکەوتووش بەرفراوانیان کردن[٦٠].

١- بەرفراوانکردنی نەخۆشخانەی کۆیەو نۆژەنکردنەوەی بەچەشنی سەردەمییانە لەساڵی ١٩٧٠-١٩٧١.
٢- نۆژەنکردنەوەی نەخۆشخانەی شەقڵاوەو ڕانیە ١٩٧٠-١٩٧١.
٣- دامەزراندنی قوتابخانەی نەخۆشیاران ١٩٧٢.
٤- تەجهیزکردنی بنکەی تەندروستی چۆمان لەساڵی ١٩٧٣ پاش ئەوەی ئەو بنکەیە لەلایەن پارتی دیموکراتی کوردستان بەفەرمانگەی تەندروستی هەولێر بەخشرا.
٥- هێنانی دەزگای C.T.S لەگەڵ ئامێری دیکەی پزیشکی بۆ نەخۆشخانەی کۆماری لەساڵی ١٩٧٣دا.
٦- کردنەوەی نەخۆشخانەی تاداران لەساڵی ١٩٧٦.

### لەساڵی ١٩٨٠-١٩٩٠

ژمارەی دانیشتوانی پارێزگای هەولێر لەم دەیەدا بەپێی ئاماری فەرمی ساڵی ١٩٨٧ گەیشتە (٧٤٢٥٣٨). ئاشکرایە کە پێشخستنی تەندروستی لەپاش نسکۆی ١٩٧٥ تا ١٩٨٠ بنبەست کرا. بەڵام لەگەڵ ئەوەش، لەلایەن دڵسۆزانەوە توانرا لایەنی بەرپرس لەوەزارەتی تەندروستی عێراق قایل بکەن بەوەی کە نەخۆشخانەی گەورە و ژمارەیەک بنکەی تەندروستی لەناو شارو دەرەوەی شار بکرێنەوە یان بەرفراوان بکرێن و بەرەوپێش ببردرێن یاخود ئامێرو دەزگای پزیشکی تازەیان بۆ دەستەبەر بکرێت. ئەوەبوو لەساڵی ١٩٨٣ بەڕێوەبەرایەتی پاراستنی تەندروستی و پاراستنی ژینگە لە ئەمینداریەتی گشتی تەندروستی کرایەوە.

لەساڵی ١٩٨٢ بەردی بناغەی نەخۆشخانەی گشتی دانراو لەساڵی ١٩٨٤ تەواو بوو. سەرجەم دەزگاو ئامێری پزیشکی و خزمەتگوزاری پێشکەوتووی بۆ دابین کرا. سەرجەم ئەو لق و بەشە پزیشکییانەی لەخۆگرت (هەناو- نەشتەرگەری ئافرەتان- فریاکەوتن- بووژاندنەوەی



دڵ- تیشک- سۆنار- چاو....هتد) لەخۆ گرت. لەساڵی ١٩٨٥ بەناوی نەخۆشخانەی سەدام کرایەوە. لەپاش ڕاپەڕینە پڕ شکۆیەکەی ئازاری پیرۆز ناوی نرا نەخۆشخانەی رزگاری.

لە ساڵی ١٩٨٦ نەخۆشخانەی لەدایکبوون و منداڵان بەهەموو پێداویستییی دەزگاو ئامێری پزیشکی پێویست کرایەوەو سەرجەم بەشەکانی وەک: (فریاکەوتن، ناکام، نەشتەرگەری و بەشی نەخۆشییەکانی خوێن...تاد)ی لەخۆگرت.

هەر لەهەمان ساڵ نەخۆشخانەی فریاکەوتن لەشوێنی نەخۆشخانەی منداڵانی کۆن کرایەوە، کە پێشتر بەشێک بوو لە نەخۆشخانەی کۆماری.

لەو دەیەدا زۆر لە مەڵبەندەکان پێشکەوتنیان بەخۆوە بینی و گۆڕانیان بەسەر داهات و بوون بەبنکەی تەندروستی پێشکەوتوو، زۆر لە پێداویستییەکانیان بۆ دەستەبەر کرا. زۆر لقی پزیشکی و تاقیگەی شیاویان بۆ پشکنینی رۆتین تێدا دامەزراند بۆ دیاریکردنی زۆرێک لە نەخۆشییە بڵاوەکانی وەک: (مەلاریا- گرانەتا...). ئەو بنکانە وەک بنکەی تەندروستی لە (خەلیفان- تۆبزاوە- کەورگۆسک- جدیدەزاب- دارەتوو- تەندروستی دیکە)

### تایبەتمەندییەکانی کۆلێژی پزیشکی:

کاتێ زانکۆی سلێمانی لەساڵی ١٩٨٢ گوێزرایەوە بۆ پارێزگای هەولێر، چالاکی رۆشنبیری لە شار بەرفراوان بوو، بەتایبەت چالاکی پزیشکی، ئەویش بەهۆی بوونی کۆلێژی پزیشکی لە شار. لە ساڵی ١٩٨٢ پۆلێک لە پزیشکانی دەرچوواند.

بەڵام ئەوەی پەیوەندی بەپزیشکی دەدانەوە هەیە، بە پێی ژمارەی دانیشتوانی هەولێر، زۆرینەی پزیشکەکان هەولێری نەبوون. بەناوبانگترین پزیشکانی شار: (دکتۆر تەلعەت شەریف. دکتۆر پۆلس عەبدلئەحەد. دکتۆر جەوودەت. دکتۆر نەجدەت. دکتۆرە شلێر رەفعەت...) بوون.

### ساڵی (١٩٩٠-٢٠٠٢)

حکومەتی کوردی و ئیدارەی هەرێم دەستی کرد بەهەماهەنگی کردن لەگەڵ هەندێ رێکخراوی دیاری تایبەت بەتەندروستی و خزمەتگوزاری تەندروستی، بۆ دووبارە دروستکردنەوە، نۆژەنکردنەوە یان تەیارکردنیان بەپێداویستی و ئامێری پزیشکی نوێی ئەو نەخۆشخانانەی وێران کرابوون. هەروەها هەندێ نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستی تازەی لە ناوچە دوورەکان، کە پێشتر قەدەغە بوون، دروست کرد. وەک نەخۆشخانەی مێرگەسوور لە قەزای مێرگەسوور و دروستکردنی دەیان نەخۆشخانەو بنکەی تەندروستی لە قەزا و ناحیە و شارەکانی سەر بەهەولێر و ناو شار، وەک نەخۆشخانەی **Emergency** کە لەساڵی ١٩٩٧ لەناو شار کرایەوە.

لەپاش ساڵی ٢٠٠٠ بەشی نەشتەرگەری لە زۆربەی نەخۆشخانەکانی قەزاو ناحیەکانی وەک: (نەخۆشخانەی سۆران- پیرمام- مێرگەسوور...تاد) کرانەوە.

لەپاش ساڵی ١٩٩٤ کۆلێژی پزیشکی ئەو دەستکەوتانەی وەدەست



هێنا:
١- لەساڵی ١٩٩٤ ئەنجوومەنی پزیشکی بەریتانی دانی بە کۆلێژ دانا.
٢- خوێندنی باڵا لە کۆلێژ بەرەوپێشەوە چوو.
٣- لە ساڵی ١٩٩٤ کۆلێژ، گۆڤاری (زانکۆ- جامعه) کە تایبەتە بەزانستی پزیشکی دەرکرد.
٤- پەرتووکخانەی کۆلێژ پەرەی پێدرا، بەشی ئەنتەرنێتی بۆ کرایەوەو لەهەمان کاتدا ژمارەیەکی باش لە کتێبی تازەی بۆ هات.
٥- کۆلێژ بەشداری تەندروستی و هاریکاری زانستی دەکات لەگەڵ زانکۆی (state university east tennesse) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ پێشخستنی پرۆگرامی خوێندن و پەرتووکخانەی کۆلێژ لەسەر شێوازی زانستی نوێی پێشکەوتوو. هەروەها بۆ پێشخستنی بنکەی فێرکردنی تەندروستی لادێیی.

**تایبەتمەندییەکانی کۆلێژی پزیشکی ددان**

ئەو کۆلێژە لە ساڵی ١٩٩٤ دەرگاکەی کرایەوە. لە سەرەتای ساڵی خوێندنی ١٩٩٥-١٩٩٦ پێشوازی لەقوتابیان کرد. حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ساڵی ١٩٩٦ هەندێ لە پێداویستی کۆلێژی لە تورکیاوە بۆ کۆلێژی پزیشکی ددان دابین کرد. ساڵانە بەرێژەی ٢٥ قوتابی تێیدا دەردەچێت. خوێندنی



باڵاش بەلقە جیا جیاکان تێیدا کرایەوە. پلەی (ماستەر) لە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی ددان و بەهێزکردنی ددان و دروستکردنی ددان و چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پووک و شانەی دەم و تیشکی دیاریکردن درا بە خوێندکاران.

**کۆلێژی دەرمانسازی:** بەبڕیاری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە هەولێر، کۆلێژی دەرمانسازی لە ساڵی ١٩٩٧-١٩٩٨ دامەزرا.

**کۆلێژی پەرستیاری:** ئەنجوومەنی وەزیران لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٠-٢٠٠١ پەسندی کرد، کە کۆلێژی پەرستیاری لەبەر پێویستی نەخۆشخانەکان بەم پسپۆرییە دەگمەنە، کە بە برِبڕەی پشتی چارەسەری نەخۆشییە جۆراوجۆرەکان دادەندرێت،بکرێتەوە.

**گەورەترین نەخۆشخانەکان لە شاری هەولێر و ساڵی کردنەوەیان (لەناو شاردا)**

١- نەخۆشخانەی هەولێری فێرکردن (کۆماری پێشوو) ١٩٥٩.
٢- نەخۆشخانەی تاداران ١٩٧٦. ئەو نەخۆشخانە لە ساڵی ٢٠٠١ داخرا.
٣- نەخۆشخانەی زرگاری فێرکردن ١٩٨٥.
٤- نەخۆشخانەی لەدایکبوون و منداڵان ١٩٨٦.
٥- نەخۆشخانەی فریاکەوتن ١٩٨٦.
٦- نەخۆشخانەی فریاکەوتن (emergency) ١٩٩٦-١٩٩٧.
٧- نەخۆشخانەی ڕاپەڕین ٢٠٠١-٢٠٠٢.
٨- نەخۆشخانەی نانەکەلی بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی خوێن ٢٠٠٤.

**نەخۆشخانە تایبەتییە ئەهلییەکانی هەولێر**

١- نەخۆشخانەی تایبەتیی هەولێر.
٢- نەخۆشخانەی تایبەتیی ڕەسول.
٣- نەخۆشخانەی تایبەتیی کوردستان.
٤- نەخۆشخانەی تایبەتیی ژین.

**ناوی دەزگاو بنکە تەندروستییەکانی سەر بەکەرتی ناوەندی- ناو شار**

| ژ | ناوی بنکە | ژ | ناوی بنکە |
|---|---|---|---|
| ١ | بنکەی تەندروستی مەلاأفەندی | ١٦ | بنکەی تەندروستی هیلینا |
| ٢ | بنکەی تەندروستی منارە | ١٧ | بنکەی تەندروستی نەخۆشییەکانی سینگ |
| ٣ | بنکەی تەندروستی شەهیدان | ١٨ | بنکەی تەندروستی خواکورك |
| ٤ | بنکەی تەندروستی نافیع ئاکرەیی | ١٩ | بنکەی تەندروستی کۆلێژی پۆلیس |
| ٥ | بنکەی تەندروستی کوردستان | ٢٠ | بنکەی تەندروستی بەندیخانەی مەحەتە |
| ٦ | بنکەی تەندروستی تەیراوە | ٢١ | بنکەی تەندروستی بەندیخانەی دائیرەی ئەمن |
| ٧ | بنکەی تەندروستی سولتان موزەفەر | ٢٢ | بنکەی تەندروستی فەرەنسۆ حەریری |
| ٨ | بنکەی تەندروستی گوڕانی عەنکاوە | ٢٣ | بنکەی تەندروستی مەئموون دەباغ |
| ٩ | بنکەی تەندروستی نەورۆز | ٢٤ | بنکەی تەندروستی لەیلا قاسم |
| ١٠ | بنکەی تەندروستی نازدار بامەرنی | ٢٥ | بنکەی تەندروستی گوڵان |
| ١١ | بنکەی تەندروستی نەجدی حەیدەر | ٢٦ | کۆمەڵگەی پزیشکی ددان |
| ١٢ | بنکەی تەندروستی محەمەد باجەلان | ٢٧ | کۆمەڵگەی پسپۆڕانی پزیشکی ددانی |
| ١٣ | بنکەی تەندروستی سەروەران | ٢٨ | نووسینگەی لەشیکبوون |
| ١٤ | بنکەی تەندروستی دیی زانکۆ | ٢٩ | یەکەی نەخۆشییە دەروونییەکان |
| ١٥ | بنکەی تەندروستی ئازادی | ٣٠ | یەکەی چارەسەرکردنی ئەزۆك |

## مێژووی سەندیکانی پیشەی پزیشکی لە پارێزگای هەولێر

یاسای ژمارە(٦٧)ی خاوەن پیشەی پزیشکی لەساڵی ١٩٥٢ دەرچوو. بەپێی ئەم یاسایە سەندیکای خاوەن پیشە پزیشکییەکان دامەزرا. ئەو سەندیکایە تائێستاشی لەگەڵدا بێت، ژمارەیەک لیژنەی لەخۆی گرتووە، لەوانە: لیژنەی پیشەی پزیشکی - لیژنەی پیشەی دەرمانسازی- لیژنەی پیشەی پزیشکی ددان - لیژنەی پیشەی بەیتالی لیژنەی بەرزەفت.

### ١- سەندیکای پزیشکان

لە ساڵی ١٩٦٥ پارێزگای هەولێر نوێنەری لە سەندیکای پزیشکانی بەغدا هەبوو. یەکەم نوێنەر دکتۆر محەمەد زیوەر شەریف بوو. لەساڵی ١٩٩٢ سەندیکایەکی سەربەخۆ پێکهێندرا.

### ٢- سەندیکای پزیشکانی ددان

هەولێر نوێنەری لە سەندیکای پزیشکانی ددان لە بەغدا هەبوو. لەساڵی ١٩٩٨ بەشێوەیەکی فەرمی و بەپەسندکردنی پەرلەمانی کوردستان سەندیکایەکی سەربەخۆ پێکهات.

### ٣- سەندیکای دەرمانسازان

لەبەر ئەوەی سەندیکای دەرمانسازان لە بەغدا رازی نەبوو لقێکیان لە پارێزگای هەولێر بکرێتەوە، لەساڵی ١٩٩٨ بەڕەزامەندی پەرلەمانی کوردستان سەندیکایەکی سەربەخۆ پێکهات.

### بەشی یەکەم: پزیشکان

١- دکتۆر عوسمان تەها ئاغا ئال عەزیز عوزێری
٢- دکتۆر هاشم شەریف دۆغرەمەچی
٣- دکتۆر عادل محەمەد دۆغرەمەچی
٤- دکتۆر خالید ئیسماعیل عەلی دزەیی
٥- دکتۆر خەیروڵڵا عەبد جاسم
٦- دکتۆر عومەر ئیسماعیل عەلی دزەیی
٧- دکتۆر محەمەد زیوەر شەریف یونس
٨- دکتۆر یەحیا ئەمین محەمەد

بەقال
٩- دكتۆر عەبدولرەزاق شەهابەدین دەبباغ
١٠- دكتۆر محەمەد حاجی شێخۆ
١١- دكتۆر تەحسین نورەدین حەمەد ئاغا ئەسعەدی
١٢- دكتۆر ئەنوەر محەمەد ئەمین بایز دزەیی
١٣- دكتۆر ئەحمەد فەتاح حەوێز دزەیی
١٤- دكتۆر سالم رەفعەت دۆغرەمەچی
١٥- دكتۆر محەمەد ئەحمەد سلێمان دزەیی
١٦- دكتۆر خورشید ئیبراهیم ئەمین دزەیی
١٧- دكتۆر فوئاد زەكی ئەحمەد هەناری
١٨- دكتۆر موحسین محەمەد دۆغرەمەچی
١٩- دكتۆر عەدنان یاسین تەقیەدین ئەسعەدی
٢٠- دكتۆر كەمال عەزیز ئیسماعیل توتنچی
٢١- دكتۆر پۆلس ئەلقس بەهنام سیاوش
٢٢- دكتۆر سەلیم بۆیا حەننا عزمەت
٢٣- دكتۆر سەلاح جەمال عەبدولوەهاب
٢٤- دكتۆر عیسا شێخ حوسێن شێخ عەبدوڵڵا عەساف
٢٥- دكتۆر مستەفا نادر خورشید ئەلعالم
٢٦- دكتۆر عەبدولباقی محەمەد هاشم دەبباغ
٢٧- دكتۆر عەدنان محەمەد مەحمود دۆغرەمەچی
٢٨- دكتۆرە زاهیدە شەهاب عەبدولقادر دەبباغ
٢٩- دكتۆر عەبدولرەحمان سلێمان محەمەد زێباری
٣٠- دكتۆر شیت محەمەد ئەمین خدر
٣١- دكتۆر سوبحی داود سەعید یەعقوبی
٣٢- دكتۆر تاریق بەهائەدین خەلیفە محەمەد
٣٣- دكتۆر حەسەن عەبدوڵڵا مستەفا نەقشبەندی
٣٤- دكتۆر فەیسەل محەمەد مستەفا نەقشبەندی
٣٥- دكتۆر جەعفەر حەمەد قادر
٣٦- دكتۆر سابیر تاهیر ئیسماعیل
٣٧- دكتۆر تاریق ئەنوەر وەلی بەیرەقدار
٣٨- دكتۆر عەبدولمەجید عەبدولقادر یونس
٣٩- دكتۆر محەمەد عەبدوڵڵا مستەفا ئەبوبەكر
٤٠- دكتۆر مەعروف ئەحمەد ئیبراهیم
٤١- دكتۆر حوسێن ئیسماعیل عەبدوڵڵا حەسەن بەرزنجی
٤٢- دكتۆرە سوهام ئەحمەد ئەمین نەجار
٤٣- دكتۆر سەبور یوسف عوسمان
٤٤- دكتۆر محەمەد دلشاد رەجەب محەمەد پاشا
٤٥- دكتۆر نەبیل دەنحا یەلدا
٤٦- دكتۆر ئەحمەد سابیر كۆیی
٤٧- دكتۆر حەبیب یوسف تۆما مالح
٤٨- دكتۆر سەردار عەبدولرەحمان ئەمین
٤٩- دكتۆر عەبدوڵڵا مستەفا عەبدوڵڵا چەلەبی
٥٠- دكتۆر عیزەدین حەمەد ئەحمەد دزەیی
٥١- دكتۆر فەرهاد جەلیل خەلیل خەیات
٥٢- دكتۆر مازن حەیدەر سەلیم ئەسعەدی
٥٣- دكتۆر نەجات ئەمین یونس موختار
٥٤- دكتۆر نیاز جەمیل رەشید میران
٥٥- دكتۆر هادی رەئوف شاكر
٥٦- دكتۆر عامر عەلی حوسێن كەسرە
٥٧- دكتۆر عەبدولحەمید عەبدولقادر یونس ئەترەقچی
٥٨- دكتۆر هەمزە قادر حەمەد گەردی
٥٩- دكتۆر ئەدیب تۆما جەرجیس
٦٠- دكتۆر رۆستەم تاهیر عەبدوڵڵا
٦١- دكتۆر فەرهاد عومەر حەوێز
٦٢- دكتۆر نەزاهەت شاكر محەمەد قازی
٦٣- دكتۆر حیكمەت سلێوە ئیبراهیم
٦٤- دكتۆرە سوهەیلە مەجید عەزیز كەلوڕ
٦٥- دكتۆر سەدرەدین شەمسەدین
٦٦- دكتۆرە فائیزە بیلال ئیسماعیل
٦٧- دكتۆر فریاد مەجید غەفوری
٦٨- دكتۆر لوقمان ئیبراهیم رەسول
٦٩- دكتۆرە سوعاد رەفیق مستەفا
٧٠- دكتۆرە ئەدیب عەبدلئەحەد ئۆغستین ئەلقس ئیلیاس
٧١- دكتۆر كاكل ئیبراهیم رەسول
٧٢- دكتۆر ئازاد ئەحمەد بەكر

شـــانـازییـــەوە باسی بەیتـــارە پسـپـۆرەکـانی کـورد بکرێ و ژیان نامەیان بخرێتە سەر کاغەز و وێنە و بیـر و ڕاو کرداریان لەمۆزەخانەکان بپارێزرێ. ئەمەش ئەرکێکە دەکەوێتە ئەستۆی ڕۆشنبیرانی کورد و ئەمانەی دەرک بەگـرنگی ئەم لایەنە دەکـەن. بۆیە پێویستـە هەر کـەس بەگـوێرەی شارەزایی لەناوچەی خۆی بەژیان نامە و کردارو بیر و ڕاکانی بەیتار زانەکان لە ناوچەکـەیان دەسـتی یارمـەتی بۆ دەوڵەمـەندکـردنی کـەلەپووری نەتەوەکەی درێژ بکا کە هەم خزمەتی گـەلەکـەی دەکـا و هەم خـزمـەتی مـرۆڤـایەتیش دەکـا، بۆیە ئێـمـەش لێرەدا زۆر بەشانازییەوە ناوی چەند بەیتار زانێکی دەشتە بەپیت و فەڕە کاکی بەکاکییەکەی هەولێر دەخەینە ڕوو کـە لەمـانـە هەندێکیـان مـاون هەندێکی تریشـیـان مـاڵئـاواییـان لە ژیان کردووە بێ ئەمەی هیچ شتێک لە دوایان جێ بمێنێ و ئاسـەواریان ڕەش بۆتەوە و ئاگردانیان کوێربۆتەوە لەمانەش:

١- حـاجی حـەمـەد ئەمین لە گـوندی قەپران. نەماوە.
٢- عـومـەر کێخوا عەلی لە گـوندی شێراوە. نەماوە.
٣- ڕەحمان لۆری لە گوندی قونیان. نەماوە.
٤- حاجی عمر لە گوندی کڵاوڕەش.
٥- حـاجی حـەسـەن لەگـوندی کـۆزە پانکە. ماوە.
٦- حـاجی عـومـەر کـاکە لە گـوندی دینگاوەی دەشتی قەراج.
٧- قادر حەمبار لە هەولێر. نەماوە.
٨- حـاجی عـوسـمـان لە گـوندی شەمشولە - نەماوە.

هەروەها جگە لەمانە لەوانەیە هی تریش هەبێ بەڵام ئێـمـە بەرچاو و گـوێمـان نەکـەوتبێ بۆیە دەرخستنی ئەمانە دەکەوێتە ئەستۆی ئەمانەی ناوبانگ و دەنگ و باسیان دەزانن.

لێرەوە بەرەو ناوەڕۆکی بابەتەکە دەڕۆین، بەڵام پێش ئەمەی بە تەواوی بخـزێینە ناوی دەمـەوێ کـورتە پێناسەیەکی بەیتاری بکەم، بەیتاری خـۆی بریتـیـیـە "لەم پیـشـەیەی کـە یەکـێکی شـارەزا دەیکا بۆ چاک کـردنەوەی شکـسـتی لەشی مـرۆڤ یاخـود ئاژەڵ". شکـسـتـیـیـەکـانیش بەزاراوەی سـەر زاری بەیتـار زانەکـان ئەمانەن:

١- شکان.
٢- لەگـەڵ چوون، وەرگـەڕان یان لەدوو چوون.
٣- قەڵەشین.
٤- دەمار وەرگەڕان.
٥- گۆشت پچڕان.

ئەگـەر ئەمـانە لە هەر شـوێنێکی لەش ڕوویبـــدابـایە ئەوا لە لایەن بەیتـارەکانەوە چارەی خۆی بەگوێرەی لێکدانەوە و بیر و بۆچوونی خۆیان بۆ دادەنرا. ئینجا لێرەوە با بزانین تا چ ڕادەیەک ئەمـە چەسپ دەبێ ئەگـەر شکـسـتـیـیـەک لەم جـۆرە بابەتانە ڕوویبدابایە. بۆ ئەمەش بەڕیز دیاردە گرنگەکانی ئەم لایەنە دەخەینە ڕوو.

**١- گۆزینگ:**

شکان لەم جـۆرە شـوێنە کـەمـە بەزۆری لەگەڵ چوون لێـیا ڕوودەدات. لەگەڵ چوونیش بریتـییـە لە: ترازانی دوو جـومگە لەسـەریەک. کـە نیشانەکانیشی بەم جۆرەیە: پەنجەکان ناتوانن بجـووڵێن، دەمـارەکـانیش هەڵدەستن و ئەستوور دەبن.

چارەکـردنیـشی بەم جـۆرە بۆ دانراوە. نەخۆشە و لەسەر پشت درێژ دەکـرا پێ دەخـرایە ناو قـۆرتی پێی تاوەکـو نەجـوولێ، ئینجـا بەهێـز سپلکی قاچی ڕادەکێشرا. لەگەڵ ئەم ڕاکێشانە جومگەکان تەقەیان لێوە دەهات و دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان وەک لەوێنەی (١) دیارە.

**٢- کڵاوەی چۆک:**

بە وتەی بەیتارەکان ئەم شوێنەی (گە) بێ ناشکێ. واتە دوو جـومگە بەیەکەوە بەسترابن. ئەمەش بەتەواوی لە ئەژنۆدا هەیە چونکە دوو جـومگە بەهۆی کـڵاوەی چۆکـەوە بەیەک بەستراون. بۆیە بە زۆری لەگەڵ چوون لەم جۆرە شوێنانە ڕوودەدات واتە دوو جـــومگەکــە لێـک دەترازێن. لەکاتێکیش ئەم جۆرە شکستیـیـە ڕوویدات لەشوێنی وا بەم شێـوەیە چاری کـراوە. نەخۆشەکە لەسـەر زگ درێژ دەکرا بالۆرەیەک لەشێوەی بالیف بە پارچە پەڕۆکـان بۆیان دەکـرد. دەخرایە نێـوان هەردوو جـومگەکـان یەکـێکیش ڕانی دەگـرت بۆ ئەوەی نەبزوێ. ئینجـا بەتوندی لاقی بۆ دواوە دەنوشـتـایەوە، بەم جـۆرە جومگەکان دەهاتنەوە شوێنی ئاسایی خۆیان لەگەڵ ئەم کردارە تەقەیان لێوە دەهات.

**٣- ڕان:**

هەروەک دەزانین ڕان گەورەترین و بەهێـزترین ئێـسکی لەشی مـرۆڤـە.

بۆیە ئەگەر هەر ئێش و ئازارێكی زۆری پێ بگا، ئەوا لەوانەیە بەتەواوی مرۆڤ پەك بخاو لە كاروكاسبی دووری بخاتەوە، بەرۆڵی ئەوەی شوێنێكی گرنگ و ترسناكی هەیە، زۆر جار وابووە ئەگەر شكستی لەم جۆرە شوێنانە روویدابوایە، ئەوا ئەم كەسە تووشی سەقەتی دەهات و تاوەكو ژیانی كۆتایی دەهات بەدەست ئەم بێزارییە دەتلایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشا بەیتارانی كورد بەرانبەر ئەم ئاستەنگە دەستەوئەژنۆ دانەنیشتوون و بەڵكو چاری خۆیان بۆ داناوە.

با بزانین چۆن؟ ئەگەر ران بشكابوایە، ئەوە شوێنەكەیان بەئاو و سابوون زۆر بەپاكی دەشوشت، ئینجا چوار پەلە داریان دەهێنا بەشتێك دەیان تاشی تا بەتەواوی رێك دەبوو بۆ ئەوەی نەوەك ئازار بە نەخۆشەكە بگەیەنێ. زۆر جار پەلە قامیشیشیان بەكار دەهێنا. ئینجا لەسەر گازی پشت درێژیان دەكرد و كارە موویان لەهەر چوار دەوری رانی دەئالاند، لەپاشا پەلە دارەكانیان لەسەر كارە مووەكە دادەناو بەتوندی بە پەرۆكی سپی دەیانپێچا. لەدوای ئەمە دوو توورەگەی باریكی پر خۆڵیان دەهێنا دەیانخستە ئەم لاو ئەو لای رانە شكاوەكە و بە بەنێك یان هەر شتێكی تر كە بۆ ئەم جۆرە كارە بشیایە دەیان بەست. ئەمە بۆ ئەوە بوو تاوەكو جوولە نەكا. بەم جۆرە دەمایەوە تا ماوەیەك. زۆرجار وادەبوو لەم ماوەیە سەری پەنجەكان و قاچی ئەستوور دەبوون. ئەمەش لەبەر ئەوەی گەرم دادەهات بۆ ئەمەش ئاوی ساردیان بەكار دەهێنا بەسەری پەنجەكانیان دادەپرژاند بۆ ئەوەی بنیشێتەوە. پێویستە ئەمەش بگوترێ كە بەستنی شوێنە شكاوەكان چ لە ران و چ لە شوێنەكانی تر دەبوایە پاش هەفتەیەك تۆزێك شل بكرابوایەوە. لەپاش چواردە رۆژ بە زەریفی واتە بە تەواوی شل دەكرایەوە. هەروەها دەبوایە ئەم كەسە هەتا دوو سێ مانگ كار نەكات.

### ٤- نێك:

هەروەك وتمان ئەم شوێنانەی جومگەبێ شكانی كەمە. لێرەوەش ئەمە هەیە چونكە جومگەی ران دەچێتە ناو قۆرتی سمت. جومگەیك پێك دێنی پێی دەڵێن (شەقوڵگە) بۆیە بەزۆری لەكاتی ئازار گەیشتن بەم شوێنە واتە نێك. لەگەڵ چوون روو دەدات ئەمەش دوو جۆری هەیە. (جۆرێك بۆ سەرەوە) (جۆرێك بۆ خوارەوە) ئەگەر بۆ سەرەوە بێ ئەوا جومگەكە لەشوێنی خۆی دەردێ و بۆ سەرەوە دەروا. لەم حاڵەتە بەم شێوەیە چاری دەكرا. نەخۆشەكە بەپێوە رادەگیرا. ئینجا یەكێكی تر. ئەمیش هەر بەپێوە قاچی دەخستە سەر قاچە لەدوو چووەكە. ئینجا هەردووكیان لەیەك دەپێچران و نەخۆشەكە دەستی دەخستە سەرشانی زەلامەكەی تر، ئەمیش دەستی دەخستە بن هەنگڵ و باڵی. بەتوندی رایدەتەكاند بۆ سەرەوە. ئەو حەلە جومگەكە قرپەی لێوە دەهات و دەگەرایەوە شوێنی خۆی ئینجا قیروزفتی لێدەنرا بۆ ئەوەی ژانەكەی بشكێ. هەروەك لەوێنەی ژمارە دوو دیارە.

بەڵام ئەگەر بۆ خوارەوە بهاتابوایە ئەم كاتە قاچێكی لە قاچێكی درێژتر دەبوو. بەم شێوەیە بەئاسانی هەستی پێ دەكرا.

چاریشی ئەمەبوو بەراست و راستی درێژ دەكرا. یەكێك سواری ئەژنۆی دەبوو توند دەیگرت نەوەك ببزوێ. ئینجا سێ چوار پێلەقەی بەتوندی لەژێر قاچی دەدرا لەگەڵ ئەم لێدانە جومگەكە دەگەراوە شوێنی خۆی. ئەوسا قیر و زفتەكی لێدەنرا بۆ ئەوەی ژانی بشكێ لەپاشا بەخۆی بەری دەدا.

ئەگەر بەم شێوەیەش جومگەكە نەگەرابوایەوە شوێنی خۆی. ئەم كاتە هەردوو ئەژنۆیان لێك دەپێچا و پێستێكی مەر یا بزن دەهێنرا، دەخرایە ناوگەڵیەوەو پری هەوا دەكرا. لەگەڵ ئەم هەوایە هەردوو لایێكی لێك دەكشا و جومگە لەگەڵ چووەكە دەگەرایەوە شوێنی خۆی.

### ٥- پەراسوو:

هەروەك ئاشكرایە دەفەی سنگی مرۆڤ چەند ژمارەیەكی پەراسوو تێدایە كە ژمارەیان دەگاتە (٢٤) پەراسوو ئەمانە جووت جووت بە (١٢) بڕبڕەكەی ناوچەی سنگەوە جومگاون لەدواوە. بەڵام (١٤)ی پێشەوە بەهۆی پارچە كركراگەی بچووكەوە یەكسەر بەدەفەی سنگەوە بەستراون. ئینجا زۆر جار بووە بەهۆی كاری گران یان شتی قورسی كەوتن. هتد... ئەم پەراسووانە شكاون لەكۆنیش ئەگەر پەراسوو بشكابا تەنیا چاری ئەوەبوو قیر و زفتەكەیان لەشوێنە شكاوەكە دەنا تاوەكو یەكتری دەگرتەوەو ژانی

دەشکا. بەڵام پێش ئەوەی قیـــر و زفتەکەی لێ بنرێ، دەبوایە بەجوانی بەئاوی شڵەتێن و سابوون بشۆردرێ.

**٦- دەمار لەپشت وەرگەڕان:**

ئەمـە تەنیـا لەپشت ڕوونادات بەڵکو لە شـوێنی تریش وەک مل و پشتی پێ و هتد... نیشانەکانیشی ئەوەیە نەخۆشـەکـە بەخـواری دەڕوا ئەگـــەر لە پشــتی بێ. لە ملیش هەروایە خوار دەبێتەوە هەست بەئازار دەکا چارەکردنیشی لەکاتی خۆی بەم جۆرە بووە. ئەگـەر دەمـاری لەپشت وەرگەڕابوایە ئەوا کابرایان لەسەر زگ درێژ دەکـرد قـاچێکی دەخرایە سـەر ناوەندی پشتی ئینجا بەپێچەوانەوە قـــاچێکی لای ڕاســـتی لەگـــەڵ دەستـێکی لای چەپی دەگیـراو بڵند دەکـــرا واتە بەیتـــارەکـــە قـــاچ و دەستەکەی بۆلای یەکتری ڕادەکێشا بەم جۆرە دەتەقی و دەهاتەوە شـوێنی خـۆی وەک لەوێنەی ژمـارە سێ دا دیارە.

بەڵام ئەگەر دەماری مل بوایە ئەوا تەنیـا بەگـرتن چاری دەکـرا هەروەها جگە لەمـــەش زۆر جـــار وابووە گـەیەکـانی پشت لەیەک ترازاون یان چوونەتە ناو یەکـتری بۆ چاری ئەمـە دوو بەرمـیل یان هەر شتـێکی تر کـە بە قـــەدەرایی ئەم دوو بـەرمـــیلە بەرزبوایە بەڵام نەک ئەم بەرمـــیلە گەورانەی نەوتی یان گازی بەڵکو هی لەمـانە بچـووکـتـر هەیە دەیان هێنا دارێکـیـان لەسـەر ڕایەر دەکـرد واتە درێژ دەکـرد ئینجـا نەخـۆشـەکـەیان زگاوزگ دەخـستـە سەردارەکە بەڵام نابوایە دەستی بگەیشتابوا سەر زەوی ئینجا بەیتارەکە پشتی مل و قوونە جـوڵەی توند دادەگـرت لەگـەڵ ئەم داگـرتنە گـەیەکـان واتە بڕبڕەکـان تەقـەیان لێـوە دەهات و دەگـەڕانەوە شـوێنی خـۆیان ئەمــەش هەروەک لەوێنەی ژمارە چواردا دەردەکەوێ.

**٧- مل:**

هەروەک دەزانین مل شـوێنێکی کـــاریگەری لە لەشی مـــرۆڤ بەرکـەوتووە. جـابۆیە هەر ئازارێکی پێ بگا ئەوا بە زەحـــمـــەت چاک دەبێتەوە.

(شوێنی دانانی بالیف)

بە زۆریش ئەم شـوێنانەی مل کـە شکستـیـیـان لێ ڕوودەدا (کلیلەی ملە). ئەم کلیلـەیەش لەبەر ئەوەی ناسکە دەشکێ. لە کـۆنیـشـا ئەگـەر شکسـتی لەم شـوێنە ڕووی بدابوایە بەم جۆرە چاریان دەکرد بالیفێکیان بە پەڕۆک دروست دەکرد و دەیانخسـتە بن باڵی نەخۆشەکە بۆ ئەوەی لەگەڵ جێگە شکاوەکە یەکسان بێ و قوڵی زۆر نەیەتە خوارەوە نەوەک ئازاری پێ بگا. ئینجا قیـرو زفتەکەیان لەجێگە شکاوەکـــە واتە کلیلـەی مل دەدا تاوەکو ژانی دەشکا.

**٨- پیل:**

ئەمـە ئێـسکێکی سێ گـۆشـەی تەخـتــە پێی دەڵێن (دەفــە) کـە دەکـەوێتـە دیوی پشــتـەوەی لەش، بۆشـاییـەک لەبەیەک گـەیشــتنی ئێـسکی دەفـە و چەڵەمـە هەیە. پێی دەڵێن (سـەوتە چاڵ) کـە ئێـسکی بازووی دەچێـتـەوە ناو واتە جومگەی بازوو. ئینجـا زۆرجار وادەبێ بەهۆی ئازار گـــەیشـتن بەم شــوێنە. ئەم جومگەیە لەشوێنی خـۆی دەترازێ و لەگـــەڵ دەچێ. شکـانیـش بۆیە لەم شوێنە ڕوونادات چونکە ئێسکی دەفە پانە. واتە پیل لە کـاتێکیش ئەگـەر ئەم جـــومگـەیەی چووەتـەوە ناوی لەشوێنی خـۆی بتـرازابوایە. ئەوا بەم جۆرە چاریان دەکرد. کابرایان لەسەر گـازی پشت درێژ دەکـرد بەیتـارەکـە پاژنەی قـاچی دەخـســتــە بن باڵی نەخـۆشەکـە و توند دەسـتی بۆ خـۆی ڕادەکـێـشـا. بەم کـارە جـومگەکـە دەهاتەوە شوێنی خۆی.

**٩- هەنیشک:**

هەروەک دیارە، ئەمـە بریتـیـیـە لە شـوێنی بەیەک گـەیشـتنی هەردوو سـەری ئێـسکی بازوو و باسک کـە بەهۆی جـومگەکـانی سـەریانەوە دەجـومگێن و بەیەک دەگـەن. لەبەر ئەوەی ئەم جـۆرە جـێگایانە (گـەنە) واتە شـوێنی بەیەک گـەیشـتنی دوو جـومگەن، شکـان کـەم ڕوو دەدات. تەنیـا لە هەڵوێسـتی زۆر ناخـۆش نەبێ. بۆیە بەزۆری ئەم دوو جومگانە لەیەکـتـری دەترازێن و لەگـەڵ دەچن. چاری ئەم جۆرە شکستییانەش تەنها ڕاکـێـشـــانە. تاوەکـو ئەم جـۆرە شکستییەش تەنها ڕاکێشانە تاوەکو جـومگەکـان دێنەوە شـوێنی خـۆیان. هەروەها ئەگـەر شکسـتێ لەم جـۆرە شـوێنانە ڕوویدات، تامـــاوەیەکی زۆریش نەهێنرابێتە لای بەیتار، ئەوا بەم شێوەیە چاریان کردووە. پێشـەکی دەبوایە مـاسـیـیـەک بێنن بەبێ هیچ دەست لێـــدانێک ورد وردی بکەن. بەڵام ماسی ڕووبار نەک، هی ئەم لاو

ئەولا. ئینجا لە شوێنەکەیان دەنا پێوەی دەمایەوە بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر. بەم جۆرە شوێنەکە نەرم دەبۆوە. ئەوسا نەخۆشەکەیان لەسەر گازی پشت درێژ دەکرد. یەکێک توند بازووی دەگرت تا نەبزوێ. بەیتارەکەش دەستی وەیاخود بلێین مەچەکی دەگرت و بۆ خۆی رادەکێشا، بەم جۆرە جومگە لە شوێن ترازاوەکان دەهاتنەوە شوێنی خۆیان.

**١٠- باسک:**

لەدوو ئێسکی درێژ پێک دێت پێیان دەوترێ (زەندوکورە). زەند درێژەکەیانە دەکەوێتە لای پەنجەکانی دەست ئەویتریشیان دەکەوێتە لای پەنجە گەورە. بەڵام بەیتارەکان بەم هەردوو ئێسکە بەیەکەوە دەڵێن (شەپکە).

لەوانەشە هەردووک لەشەپکەی دار بچن، بۆیە وای پێ بڵێن. ئینجا زۆر جار وایە ئەم ئێسکانە دەشکێن ئەمەش دوو جۆری هەیە: ئەگەر راستەوراست واتە بەدرێژی شکا، ئەوا تەنیا (قیرو زفتی) لێ دەنێن. بەڵام ئەگەر بەجۆرێکی تر شکا کە پێی دەڵێن (گردەبڕ)، ئەوا گرتنەوەی دەوێ. هەروەک بەیتارەکان دەڵێن. شێوەی گێڕانەوەکەشی بەم جۆرەیە: لەپێشا شوێنەکە بەئاو و سابوون دەشۆرێ. لەدوایشدا بەدەست پێدا هێنان ئێسکەکە دێنێتەوە شوێنی خۆی و (کارە مووی) لەسەر دادەنێن (واتە مووی کارێ). لەدوایشدا بە پەڕۆکێکی سپی خاوێن دەیپێچن. ئینجا چوار پەلە داری چاککراو دەهێنین بە بەن سەرەکانیان دەهۆنینەوە. بەڵام دەبێ تۆزێ بەینیان هەبێ واتە نابێ هەر چوار بە تەنیشت یەکەوە بن بەتەواوی دەیانخەینە سەر شوێنە شکاوەکە و ئەم سەر و ئەو سەریان گرێ دەدەین و دیسانەوە بەشتێک دەیپێچین. ئەمە نابێ دەستی لێ بدرێ تا ماوەی (١٥-٢٠) رۆژ. بەڵام ئەگەر ئەستوور بوو، یان ژانی کرد ئەوا لەپاش هەفتەیەک تۆزێک شل دەکرێتەوە. هەروەها بەهەمان شێوە ئەگەر ئێسکی (بازوو)ش شکا، چارە دەکرێ. ئەمیش کارەموو لەگەڵ پەلەداری بۆ بەکار دێنین.

**١١- زەنگە:**

ئەمە پێی دەڵێن (مەچەک) کە لە هەشت ئێسک پێک هاتووە. دەبێ بەدوو ریز هەر ریزێکیش چوار ئێسکی تێدایە. ئەمانە لەگەڵ یەکترو لەگەڵ ئێسکەکانی تەنیشتیانەوە بەهۆی چەند بەستەرێک بەیەک دەگەن. بەشێوەیەک کە جوولەی هەریەکەیان ئاسان بێت. بۆیە لەم شوێنە شکان کەم روو دەدات. تەنیا لەگەڵ چوون نەبێ ئەمیش بەم شێوەیە لەلایەن بەیتارەکانەوە چاری بۆ دانراوە. یەکێک هەنیشکی توند دەگرێت تاوەکو نەجوولێ. ئینجا بەیتارەکە دەستێکی دەخستە ژێر زەنگەیەوە بەدەستەکەی تری پەنجەی دەستی دەگرت و بۆ خوارەوەی رادەکێشا بەم جۆرە ئێسکە لەگەڵ چووەکان دەگەڕانەوە شوێنی خۆیان. هەروەها بەم شێوەیە ئەگەر پەنجەکانی دەست و پێ لەگەڵ چووبان ئەوا بەراکێشان دەهێنرانەوە شوێنی خۆیان. بۆ نموونە ئەگەر پەنجەی گەورەی دەست لەگەڵ بچووبایە ئەوا بەم شێوەیە بەیتارەکان دەیانگەڕاندەوە بۆ جێگەی خۆی. بەنێکیان لە پەنجەکە دەخست و دەستێکیان دەخستە سەر بەنەکە ئینجا رایان دەکێشا جارێک بۆ خوارەوە جارێک بۆ سەرەوە تاوەکو دەتەقی بەم جۆرە چاک دەبۆوە....

لە کۆتایی ئەم باسە پێویستە ئەمە بگوترێ کە بەیتاری تەنها مرۆڤ ناگرێتەوە، بەڵکو ئاژەڵ و مەڕ و ماڵاتیش دەگرێتەوە لەبەر ئەمەی بەیتارەکان چارەسەری شکستییەکانی ئەمانیشیان کردووە.

**فەرهەنگۆک:**

شێلگیری: بەردەوامی.

قرپە: تەقە.

گە: شوێنی بەیەک گەیشتنی دوو جومگە. مفصل.

رایەر: رایەڵ، درێژ، رایەر کردن "رایەڵکردن" درێژ کردن. ڕاخستن.

کارە موو: مووی کاریلەی بزن. ئەمە لەبەر نەرمی بە کاردەهات.

جومگە: جومگە. بەگوێرەی جیاوازی ناوچەکان دەگۆڕێ.

تێبینی:

ئەم زانیاریانەی لەم بابەتە خراونەتە روو دەربارەی بەیتاری هەمووی لەسەر زاری بەیتار (حاجی عومەر کاکە) لە گوندی دینگاوەی دەشتی قەراج لە گەلاوێژی ١٩٨٥ تۆمار کراوەو کۆکراوەتەوە کە تەمەنی (٧٠) ساڵ دەبێ.

هەروەها سوودیش لە سەرچاوەی تەندروستی دیکەش وەرگیراوە.

# حاجی حەمەدەمین بەیتار

## دکتۆر مەولود ئیبراهیم حەسەن

ڕۆژگاری ئەمڕۆش کە سەدەی بیستەمە، پاش ئەوەی ئەم هەموو کۆلیژ و خوێندنگایانە لە پان و بەرینی ئەم زەوییەدا کراونەتەوە، سالآنە چەندین هەزار پسپۆر و تایبەتکار و تایبەتمەند، لەبەشە جۆراو جۆرەکانی ژیان لە ولآتە جۆراو جۆرەکانەوە دەکەونە کار، هێشتا ... ئەم هەموو دەرچووانە تێرایی پێویستییەکانی کۆمەڵ ناکەن! جا ئەمە باری ژیانی ولآتە پێشکەوتوو ڕوو لە گەشەکان و دەسەلآتدارەکان بێ، خۆ ولآتە پاشکەوتوونەتەوە ژێردەستەکان، لەم ڕووەوەش وەک هەموو ڕووەکانی تری ژیان، هەر بەدەست نەبوونی پسپۆڕ و قات و قڕی تایبەت کارەوە دەناڵێنین!!

جا ئێمە ئەگەر تەنیا گۆشەی تەندروستی و حەکیمکاری وەربگرین و چاوێک بە کوردەواری سالآنی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم بگێڕین، کە هێشتا ژیانی زۆری ئەم خەڵکە لەسەر مەڕداری و جووتکاری بوو، جا ئەوی ڕۆژێ نە زانکۆ و ئامۆژگایەک هەبوو نەهیچ جۆرە خوێندنگایەک تا پسپۆڕ و



لێزانان بەڕەڵلای نێوخەڵک بکات. جا کە نەخۆشی و دەرد و شکستیش دۆستی دێرینەی مرۆڤە و لەهەر کوێ مرۆڤ ژیابێ، دەرد و نەخۆشیش لەوی یەخەگیری بووین! مرۆڤیش بۆ خۆشترکردنی ژیان و پاراستن لە نەخۆشی پەنای بۆ زۆر شت بردووە، هەر لەجادوو خەرافات و ئەفسانە و ئایینەوە بگرە! هەتا زانست و هونەر، هەر هەمووی بەکارهێناوە، بەڵام لەمانە لەهەمووان بەربلآوتر و خەڵکیی تر، زانستی تاقیکردنەوە و کارە! جا چونکە ژیان بۆخۆی قوتابخانەیەکی بێ حوجرەو مێز و

کورسی و مامۆستا و بەرنامە و ئەلف و بێیە! لەنێو ئەم قوتابییانەش شاگردی وا هەڵکەوتووە! بێ ترس دەتوانین بڵێین: گەیشتوونەتە پلەی (وەستا - استاد)یی. جا هەر ئەم نەخوێندەوار و بێ بەڵگەنامانە هێندە بەزانایی و دڵسۆزی و بەردەوامی خزمەتی خەڵکیان کردووە، بەبێ جیاوازی و بە خۆڕاو لەخۆڕا وەکو - خدری زیندە- بەهانای لێقەوماو و دەردەداران ڕاگەیشتوون، بێ منەت و ناز بەسەردا کردن، هێندەیان کاری پیرۆز کردووە، کە ئەم کارانە هەر لەدەست پیاوی فریشتە ئاسا دێت!!

ئەگەر ئەم جۆرە کەسانە (لە بەر بێ دەفتەری و بێ ناوو نیشانی) ون نەدەبوون، ئێستا وەکو ئەستێرە لە ئاسماندا دەگەشانەوە، نەک وەک (عەکسی قەمەر دەبوون لەنێو گۆمێکی لیخندا).

هەر لەنێو کوردەواری خۆماندا. ئەم قوتابخانەی ژیانە هێندەی (سەرسپی) و (ڕیش سپی) و (مامۆتک) و (تەبیب) و

(بەیتار) و (وەستا)و حەکیم و نازانم چی و چی تێدا هەڵکەوتووە. کە نە لە ژمارە دێن و نە بەکەسیش دەژمێردرێن!! لەنێو ئەمانەدا (تەبیب) و (بەیتار)ەکان هەر بە ڕەنج و دڵسۆزی خۆیان بێ ژمارە خەڵکیان لە دەست سەقەتی و شەلی و گۆجی و گێری و مردن و زەمتەیی ڕزگار کردووە. ئەوا ئەمڕۆش باسی یەکێ لەم بەیتارە بەناوبانگ و تەمەن پڕ خزمەتانە دەکەین کە نزیک بەشەست ساڵ بە بەردەوامی خزمەتی خواو خەڵکی کردووە.

ئەم بەیتارەش (حاجی حەمەدەمین حاجی حەسەن)ە کە سەرەڕای نەخوێندەواریی و بێ ماموستاییشی ناوی بە هەموو ولاتدا پەنگی دابۆوە. هێندە دەست سووک و شارەزا و وەستابوو لە بەیتاریدا. زۆر شکستی خراپ گیراوەی - نوژدار- ەکانی دەشکاندەوە و چاک دەکردەوە. ئەمەش ببووە هۆی ئەوەی کە نوژدارە دڵسۆزەکان زۆریان خۆش بووێ!!

**چۆنیەتی فێر بوونی!!**

هەموو لایەک ئەوە دەزانن! کە مرۆڤ پێشان پتر ژیانی لەسەر مەڕداری و جووتکاری بوو، لە کارکردنا زۆر پشتی بەستەزمان و چوارپێ و بەرزان دەبەست. بۆیێ ئەم بەستەزمانانە ئەوی ڕۆژێ لای مرۆڤ زۆر بەڕێز و نرخ بوون.

ئەگەر مردنی ئەسپێک، مردار بوونی مەڕێ، تۆپینی سەگێ، جووتیار یا مەڕدارێکی هۆڕەهۆڕ هێنابتە گریان لات سەیر نەبێ !! جا لەم ڕۆژ و سەردەمانە لە بیستەکانی ئەم سەدەیە، ماڵی حاجی حەمەمین، کە ئەوێ ڕۆژێ گەنجێکی مەڕدار و خوێن گەرم دەبێ!! جوانوویێکیان قاپی دەشکێ، حەمەدەمینی گەنج و بەستەزمان دۆست، زۆر بە دڵسۆزی و گیانی پڕ بەزەیی و هەستی خاوەنداریەتییەوە خۆ لەگەڵ جوانوو خەریک دەکات و چاکی دەکاتەوە. ئەم بەیتارکارییەی بۆ جوانووەکە یەکەم کاری دەبێ، پاشان .... دایکیشی نێکی دەشکێ کە نێک شکانیش بۆ ئافرەت. ئەوی ڕۆژێ نەدەکرا لەدەست هەموو کەسی بنێن!! دیسان حەمەدەمینی گەنج قۆڵ و باسکی لێ هەڵدەکات و زۆر بە شێنەیی و لەسەرخۆیی ئەم جێگا ئەستەمە چاک دەکاتەوە. کە ئێستاش نێک بۆ نوژدارەکان بەم هەموو زانیاری و کەرستەوە لە نەخۆشخانەکان چاک کردنەوەی سەرکەوتوو نابن.

کە حاجی حەمەدەمین لەم دوو کارەی یەکەمجاری سەردەکەوێ، ئیتر هەم خۆی بڕوا بەخۆی دەکات و هەم خەڵکەکە بڕوای پێ دەکەن. دیارە خۆشی زەمینەی بوونە بەیتاری لەمێشک و دڵدا هەبوو... ئەویش وەک ڕەوشتی هێمنی و بیرکردنەوەی پێش دەست دانەکار، بیرتیژی و دەست گەرمی لەکار و دەست و دڵ و دەروون پاکی لەنێو کۆمەڵ و لەخواترسی بۆ ئایین و مرۆڤ دۆستی لەنێو خەڵکدا. سا پاش ئەم دوو سەرکەوتنە، شکستی مرۆڤ باڵدار و چوار ناڵ و دووسمان بێ ترسی چاک دەکاتەوە. جا بەرە بەرە ناوی بە بەیتار دەرواو هەر لەسنووری گوندەکەی خۆیان نامێنی و لەهەر حەفتی و دوو گوندی کەندێناوەش ڕەت دەکا و هەموو وڵات دەگرێتەوە. بەتاریف و دەست نیشان کردنەوە لە جێگای زۆر دوور شکستی زۆر گران و هیوا براوی بۆ دێنن، ئەویش بەڕێزەوە پێشوازیان دەکات و بەگیراوەیی و دڵی پڕ هیواوە بەڕێیان دەکات. واچاکە ئەوەش بڵێین کە وەستایی حاجی حەمەدەمین تەنیا لە سنووری بەیتاری بەند نەبووە، بەڵکە حەکیمکاریشی بەگەڵ دەکەوێ، جگە وەستایی لەکاروباری جووتیاری و مەڕداری و زۆر ڕووی تری ژیان.

**چۆنیەتی کارکردنی:**

ئەم جۆرە بەیتارانە عیادەیان نیە تا کات و شوێنی کارکردنیان دیاربێ. بەڵکە لەهەموو شوێنێک و لەهەموو کاتێکدا، نەخۆش و شکستیان دەهاتە لا، جا یان شکستەکەیان دەهێنا، یا ئەوەتە دەهاتن حاجی حەمەدەمینیان دەبرد کە لەماڵی خۆی بوایە، زۆر کوردانە پێشوازی دەکردن و بە ڕوویێکی خۆش و بەدڵێکی کراوە

وەری دەگرتنەوە. سەرەڕای گرتنەوەی شکستەکە زۆرجار کەرستەی پێویست بۆ شکست گرتنەوەش هەرچی با لەماڵی خۆی بۆی دەکردن. ئەمانەش هەمووی بەخۆڕایی و لەڕێی خواو خەڵک، زۆر جاریش کە دەیانبردە ئەو جێگایەی کە دەبوو شکستەکەی لێ بگرێتەوە، لەوێ پاش گرتنەوەو تەواوبوون کەسانی وا لەدەرگای ماڵ بەڕێیان دەکرد و نەیان دەگەیاندەوە ئەو جێگایەی لێیان هێناوە. ئەویش بێ ئەوەی بەسەرەخۆی بێنی و خۆی گرژ بکات وەک ئەوەی بۆکاری خۆی هاتبێ، ملی ڕێگای دەگرت و دەگەڕایەوە ماڵ.

لەگرتنەوەی شکستیش ئەو شتانەی بەکاری دێنا، زۆری ڕوون و کەرە و هێلکە و هەندێ جار پیستە و ماست بوو، ئەوە جگە لە پارچەی سپی و پاک ئەویش بۆ پێچانەوە لەگەڵ خۆشکردنی قامیش و دار و تەختە بۆ ڕاست گرتنەوە و پێچانەوە لەگەڵ ئامۆژگاری کردنی نەخۆش بۆ هەڵس و کەوت کردن، دیسان دیارکردنی جۆری خواردن و پارێز بۆ دانان.

ئەوە ئەگەر جێگای شکست ڕان و نێک و پشت و شان و مل بوایە، تەختەی نووستن و (دانیشتن)ی بۆ خۆش دەکرد و ئەو ماوەیەی بۆ دادەنا کە نەخۆش دەبوایە پەیڕەوی ئامۆژگاری و پارێزەکانی بکات.

لەم ڕووەوەش زۆری هونەر دەنواند و لەخۆوە هەر لەدار و تەختە شتی وای دادێنا کە نەخۆش زۆری سود لێ دەدیت بۆ چاک بوونەوە.

بەم جۆرە نزیک بەشەست ساڵ حاجی حەمەدەمین بێ پسانەوە لەخۆڕاو بەخۆڕایی خزمەتی خەڵکی کرد. ئەگەر ناو و ژمارەی ئەو کەسانەی حاجی حەمەدەمین چاکی کردوونەتەوە بنووسرابا، ئێستا دەردەکەوت، کە چ ژمارەیەکی زۆری خەڵک بەدەستی حاجی حەمەدەمین لەدەست مردن و سەقەتی و شەلی و گێڕی و گۆجی و خواری و نەخۆشی و زەمتەیی ڕزگاریان بووە، هەم خۆیان لەم ئازارانە ڕزگاربووین هەم کۆمەڵ و خاو خێزانیش لە نەخۆش و زەمتەیێ!

حاجی حەمەدەمین لەسایەی ئەم خزمەتانەی زۆر لەکاریە دەست و نوژدارەکان دەناسی، هەر بۆیش زۆر جار داوای ئەوەیان لێ دەکرد کە دایبمەزرێن و مووچەیەکی بۆ ببڕنەوە، کەچی لەوەڵامدا دەیگوت: (خێری خۆم بە پارەی حکومەت نادەم!) بەڵام ئەگەر شکستێکی خراپ گیراوە هەبا سەر لەنوی جێگاکەی دەشکاندەوەو دەیگرتەوە، زۆر کەس لەم جۆرە کەسانە ئێستا چاک بووینەوەو هەست بە شکستی خۆیان ناکەن.

ئەو نەخۆشی و شکستانەی حاجی حەمەدەمین چاکی کردوونەتەوە:

جۆری شکستەکانی مرۆڤ:

أ-١- شکانی دووکەرت.
١- شکانی هورد بوون.
٣- قەشەشتن، دەرزبردن.
٤- لەگەڵ چوون
٥- لێک ترازانی جومگە و داکەلانی.
٦- دەمار وەرگەڕان و سواری یەکتر بوونی دەمار.
٧- شکانی بێ برین.
٨- شکانی بە برین.

ب- حەکیمکاریەکانی تر:
١- ددان کێشان و دەرمانکردنی.
٢- نەخۆشییەکانی پێستە.
٣- هەندێ نەخۆشی گەدە.
٤- هەندێ نەخۆشییەکانی چاو.
٥- دەرمانکردنی سووتان.
٦- هەندێ جار دەرمانکردنی مایبسری.
٧- خوێن بەردان.
٨- دەرمانکردنی کولکی هەمە جۆر.

**بۆ بەستەزمانان**

١- گرتنەوەی شکستی ئاژەڵ، ئەگەر زانیبای چاک نابێتەوە دەیگوت سەری ببڕن، با لەم ئازارە ڕزگاری ببێ، جا گۆشتی خورابا یان نەخورابا.
٢- نەخۆشییەکانی پێستە.
٣- خەساندنی نێرەکانیان.
٤- خوێن بەردانی کاتی پێویست.

ئەم کارانەی هەمووی بە کەرستە و داودەرمانی کوردەواری دەکرد. ئەگەر لەپاش گرتنەوەو دەرمان کردنەکە، پارێز و

ئامۆژگارییەکانیان نەشکاندبا. زۆر چاکی و لەکاتی دیاریکراودا چاک دەبوونەوە. هەر بەتاقیکردنەوەی خۆشی دەیزانی چەند پارچە ئێسک لە لەشی مرۆڤ و ئاژەڵدا هەیە، هەریەکەشیان چۆن دەشکێ و چۆن چاک دەبێتەوە. خزمەت کردنەکەشی لە سنووریکی بەرتەسک نەوەستاوە. بەڵکە بەبلاوی و بێ جیاوازی هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵی گرتووتەوە دەوڵەمەند و هەژار، خوێندەوار و نەخوێندەوار، منداڵ و گەنج ژن و پیر لە هەموو تەمەن و توێژێکی هاتوونەتە بەردەست.

**چەند بەیتارکارییەک:**
**چارەسەرکردنێکی دەروونی:**

* جارێک کابرایەکی قەڵەوی خینگە ملەی پڕ گۆشت و خڕ بەسەر سەردا دەکەوی، لەبەر گرانی لەشی ملی دەچێتەوە ژووری و هەردوو گوێی بەشانی وەدەنووسێن، هەرچۆنی دەستی لێ دەدەن، نەخۆش دەزیرێنێ و چارەسەرییان بۆ ناکرێ! دواجار دەیهێننە لای حاجی حەمەدەمین، ئەوش کە سەرنج دەدا و لێ ی ورد دەبێتەوە، دەڵێ: ئەمە شکستی دیار و بەدەردەوە نیە، نەخۆشیش هەرچی لەگەڵ دەکەی ئارام ناگرێ و هاوار دەکا، دواجار داوا لەکابرای مل بە بەژوور چوو دەکات لەسەر چینچکان دانیشێ، ئەویش نەرم نەرم و لەسەر خۆدەکەوێتە شێلانی شان و ملی، تا کابرای نەخۆش دەخافڵێ و خۆی لەبیر دەکا، لەپڕ حاجی حەمەدەمین تیلکەک بەکابرای نەخۆش وەدەکا کابرا کە زۆر سڕ دەبێ لەشەرمان ڕادەجفری، لەو کاتەش حاجی حەمەدەمین گرانایی خۆی داوێتە سەرشانی کابرا، لەگەل راجفرین و تاقەت دانە خۆی کابراو شان داگرتنی، لەلایەن حاجی حەمەدەمین، سەروملی کابرا دەکەونە ژێر زەختی ڕاجفرین و ملی دەگەڕێتەوە جێگەی جاران و کابرا بێ ئەوەی هەست بەخۆی بکات چاک دەبێتەوە. جا دەتوانین ئەم چارەسەرکردنە بخەینە ژێر چارەکردنی دەروونیۍ ئەمەش نیشانەی زیرەکی و شارەزایی (حاجی حەمەدەمین)ە بۆ چارە سەرکردنی شکست و پێشهاتی گرێچن.

* جارێک کابرایەکی عەرەب کە خەڵکی (موصل) دەبێ- سێ جار لەسەریەک خەون دەبینی و پێی دەڵێن: چاری تۆ لەکن (شێخ عەلی شێخ رەزا شێتە)یە کە دانیشتووی ناحیەی دیبەگەیە. کابرای عەرەبیش کە ماوەیەک دەبێ ڕانی دەشکێ و بە خواری بۆی دەگرنەوە زۆر عەبرە دەبێ، بەڵام هەرچی دەکات چارەسەری خۆی پێ ناکرێ.

پاش ئەوەی جاری سێیەم، خەونەکە دەبینی، هەڵدەستی بە سۆراغان دەچێتە دیبەگەو (شێخ عەلی) دەدۆزێتەوە، باسی شکست و خەونەکەی خۆی ورد و باریک بۆ دەگێرێتەوە. کە شێخ عەلی ئەمە دەبیسێ، بەکابرا دەڵێ: بەڵێ: چاری تۆ دەکرێ، بەڵام من لێرە تەنیا هۆیەکم بۆ ئەوەی تۆ بگەیەنمە ئەو کەسەی کە چاری تۆی پێ دەکرێ. ئەویش (حاجی حەمەدەمین)ە کە دانیشتووی دێی (قەپلان)ە. جا عەرەب و یاشێخ دەچنە کن حاجی حەمەدەمینی بەیتار و خەون و بەسەرهاتەکە بۆ ئەویش دەگێڕنەوە. کە حاجی حەمەدەمین سەیری شکستی کابرا دەکات: پێی دەڵێ: ئەم ڕانی تۆ خراپ گیراوەتەوە، دەبێ سەرلەنوی بشکێتەوەو بگیرێتەوە، ئەویش لێرە ئەوە ناکرێ، بەڵکە دەبێ لەنێو ماڵی خۆت بۆت بگیرێتەوە، چونکە پاش شکاندنەوە و گرتنەوە تۆ ماوەیەک نابێ جوولە بکەی، جا لەگەڵ کابرای عەرەب دەچنە - موصل- و لەوی سەرلەنوی دەیشکێننەوەو بۆی دەگرێتەوە، پاش پارێز بۆ دانان و ئامۆژگاری کردن، بەدڵی پڕ هیواوە عەرەب جێدێڵێ.

* جارێک کابرایەکی بەلبادی دێننە کن حاجی حەمەدەمین، ئەویش سەیری دەکا و دەڵێ: ئەم کابرایە لێی دراوە و هەموو لەشی کوتراوە، برۆن دوو کوشتییان بکوژنەوە لە پێستەی بگرن! پێستەکە هەتا بۆنی لێ نەیێ، لێی مەکەنەوە، ئەوانیش دەڵێن: راستە لەشەڕی نێوخۆ گەلەکۆی لێ کراوەو لێی دراوە، جا دەچن لەسەر قسەی حاجی حەمەدەمین لەپێستەی

دەگرن تا چاک دەبێتەوە.

* جارێکی دی گەنجێکی دێننە کن، کە گەنجەکە هەردوو نێکی لەباریەک دەچن و ماوەیەک بەسەردا دەچێ و بەخواری جێ دەگرنەوە، ئەوەش وا لە گەنجەکە دەکات زۆر خەم لەخۆی بخوات و لەم نێک خوارییەی خۆی بێزاربێ، بۆیێ زۆر بە عەبرەیی، بەحاجی حەمەدەمین دەڵێ: مام حاجی تۆ بەس چاکم بکەوە، من پێنج خوشکی عازەبم هەیە، یەکێکیانت بەخۆرایی دەدەمێ، جا بۆخۆت چ بۆ کوڕ و برازات بێ، بەلاّم حاجی حەمەدەمین کە سەیری نێکی کوڕە دەکات، پێی دەڵێ: کوڕم، نێکی تۆ لەمنداڵی لەبار یەک چووین و خراپ جێگایی خۆیان گرتووتەوە، لەم ماوەیەشدا تۆ گەورە بووی، ئەمەش وای کردووە.

چاک کردنەوەی زۆر ئەستەم بێ، چونکە من دڵنیا نیم، کە تۆ بەرگەی شکاندنەوەی هەردوو نێکت بگری. دەترسم لە شکاندنەوەیان تۆ دەرنەچی، دوایی دیسان لەوە دڵنیام کە پاش شکاندنەوەش، ئەم نێکانە جێگای خۆیان ناگرنەوە، جا بۆیێ من ناتوانم دەستیان لێ بدەم چونکە لە دەرچوون و چاک بوونەوەت دڵنیا نیم!! جاکە لە چاکبوونەوەت دڵنیا نەبم، نەک خوشکێک! هەر پێنج خوشکتم بدەیتی دەستی لێ نادەم، من چ ڕۆژان بۆ تەماع شکستم چاک نەکردووەتەوە، ئەگەر ئومێدی چاک بوونەوەت هەبا، هەر بەخۆرایی بۆم چاک دەکردیەوە.

لێرەشدا ئەوە بەدەردەکەوێ کە حاجی حەمەدەمین دەستی لەکارێک نەداوە، ئەگەر لەسەرکەوتنی دڵنیا نەبووبێ، تەماع و ماڵی دنیاش: نەیتوانیوە یاسایی زانستی و ویژدانی پێ بخاتە ژێر پێ!! هەر ئەم یاسا ناسیبیەی کە لەخۆوە فێری بوو، وای لێ کردبوو، لە شکاندنەوەو شکستی گران، پرسی بەکەس و کاری نەخۆش بکات و ڕوخسەتی دەست لێدان لە کەسێکی بەرپرس وەربگرێ و ئاگاداریان بکاتەوە. ئەم کارەشی وەک کاری نەخۆشخانە و نوژدارەکان وایە، ئەوانیش کە (عەمەلیات) بۆ کەسێ بکەن، دەبێ ڕاو ئیمزای کابرای نەخۆش خۆی یان کەسێکی بەرپرسی وەربگرن!! کارێکیش ئەگەر بیزانیبا سەرکەوتنی مسۆگەر نیە، سۆز و پاڕانەوە و تەماع نەیان دەتوانی، ناچاری بکەن ئەم یاسا زانستییەی پێ بخاتە ژێر پێ. هەروەها حاجی حەمەدەمین جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەندو هەژار نەدەکردو عەرەب و کوردو تورکمان و فارس و موسڵمان و مەسیحی و ئێزیدیش چاک کردووەتەوە.

**ژین نامەی حاجی حەمەدەمین:**

ناو: حاجی حەمەدەمین حاجی حەسەن وەسمان (عثمان) گەردی.

ناوی دایکی: سولتانە ئەحمەد.

ساڵی لەدایک بوونی. ئەوەی ڕاستی بێ ساڵی لەدایک بوونی بەتەواوی دیار نیە. لە (دەفتەر نفوس)ی خۆی کە ساڵی -١٩٦٩- دەری هێناوە ساڵی ١٩٠٢ بەساڵی هاتنە دنیای تۆمار کراوە. بەلاّم لە (دەفتەر خدمە)ی (ابراهیم)ی برای کە لەساڵی ١٩٤١ دەرهاتوە، ساڵی لەدایک بوونی حاجی حەمەدەمین بەساڵی ١٨٩٤ داندراوە. جا نازانین ئەم دوو ساڵە کامیان ڕاستن یا ئەوەتە: هەردووکیان هەڵەن. بەلاّم جێگای لەدایک بوونی: دێ (عالا- عبدالله گوجیلان)ی کەندێناوەیە، سەر بەناحیەی دیبەگە لەشاری هەولێر.

ژنی هێناوە، بەلاّم دیسان نازانین ژن هێنانەکەی لە چ ساڵێکدا بووە؟ ژنەکەی ناوی (عائشە) عەیشێ بووە، لەم ژنە سێ منداڵی دەبن! بەلاّم هیچیان چلەبڕی ناکەن و دەمرن، بۆیێ هیچ منداڵی لەپاش جێ نەماوە، لە سەرەتای پەنجاکان دەچێتە دێی (قەپلان) و لەوی باڵ بەسەر چەند کوڕو برازایەکی دادێنی و باوکایەتیان بۆ دەکات و پێیان دەگەیێنێ. تا دواجار لەڕۆژی ٢٨/١١/ ١٩٨٠ لە شاری هەولێر کۆچی دوایی دەکات و لەگۆڕستانی عالاّلای لە تەنیشت باوک و براکانی بەخاک دەسپێردرێ.



# خزمەتگوزاریی تەندروستی و کۆمەڵایەتی لەشاری هەولێر لە سەدەی (١١-١٢ز)

**میقداد شاهۆیی**
**کۆلیژی پەروەردەی بونیات- زانکۆی سەلاحەدین**

**یەکەم:** خاوێنی
أ- خاوێنیماڵەکان
ب- خاوێنی گەرماوەکان
ج- خاوێنی چێشتخانەو ساردەمەنییەکان
د- خاوێنی شەقام و بازاڕەکان
**دووەم:** چاودێری چێشتخانەو ساردەمەنییەکان
**سێیەم:** بایەخدان بەنۆژەنکردنەوەو دروستکردنی خانە
أ- دروستکردنی خانەی بێ سەرپەشتان و بێوەژنەکان
ب- دروستکردنی خانەی میوانداری
ج- بایەخدان بەڕووەک و ئاژەڵ
**چوارەم:** بایەخدان بەپزیشکی و پزیشکەکان
أ- پزیشکەکانی هەولێر
ب- نەخۆشخانەکان
ج- نەخۆشخانە جێگرەکان
د- نەخۆشخانە گەڕۆکەکان (گەڕۆکی)

**أ- خاوێنی ماڵەکان:**

دانیشتووانی شاری هەولێر پێشتر بایەخێکی زۆریان بەخانووەکانیان لەڕووی خاوێنی و هەوا گۆڕکێ دەدا و تەنانەت بگرە لەکاتی خۆی ژێرزەمینیشیان بۆ خانووەکانیان دروست دەکرد[1]، کە ئەمەش رۆڵێکی گەورەی هەبوو بۆ جوانکاری و سەلامەتی خەڵکەکەی، هەروەها خەڵکەکە بەمە توانییان لەوەرزی هاویندا لەڕێگەی ژێرزەمینەکانەوە خۆیان لەبەرز بوونەوەی پلەی گەرما بپارێزن و لەهەمان کاتدا تا ئێستاش لەگەڵدابێت بەکاری دەهێنن بۆ پاراستنی خۆراک و دوورخستنەوەی لە بۆگەنکردن و تێکچووندا[2] وێڕای ئەوە رێگایەکی دیکەشیان بەکارهێناوە بەناوی (باوگیر)[*] بۆ هەوا گۆڕکێ و لەسەربانەکان پەنجەرەیان بەرەو ئەو لایەنەی بای

لێدێت دادەمەزراند، بەمەش هەوای سازگار لەو ڕێگایەی لەناو دیوار دروستکراوە لەسەربانەوە بۆ ژێر زەمین[3] دەگوازرایەوە.

لە ڕاستیدا پیاو ماقووڵ و دەوڵەمەندەکان ئەمەیان دروست دەکرد بۆ ئەوەی لەوەرزی هاویندا هەواکە سازگارو سارد بێت[4]، سەرەڕای ئەوەش لەبەر گەرمای هاوین بەشەو دەچوونە سەربانەکان[5]. لەوەرزی زستانیشدا خەڵکی هەولێر لەماڵەکانیان پشتیان بەسۆپا بەستووەو بۆ ئەم مەبەستەش شوێنی دووکەڵکێشیان لەخانووەکان دروست دەکرد. ناوچەکە دارێکی زۆری لێ ڕواوەو وەک کەرستەی خاوی باش بەشێوەیەکی بەردەوام بۆ گەرمکردنەوە لەوەرزی زستاندا بەکارهێنراوە[6].

بۆ نەهێشتنی (شێ)ش خەڵکی هەندێ لە شارەکانی ناوچەی هەولێر ئەم مەسەلەیان بە هەند هەڵگرتووە، ئەوەتا هەندێ لە ریوایەتە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەدەن، کە خەڵکەکە بەباگوردانێکی لوولەیی لەپاش و پێش باران بارینـدا سەربانەکانیان دەگێڕا بۆ ئەوەی ئاوی باران دزە نەکات و دڵۆپە نەکات بۆ ناو خانووەکانیان، چونکە دەبووە هۆی پەیدابوونی (شێ) لەناو خانووەکانیاندا[7].

## ب- خاوێنی گەرماوەکان

بەکارهێنانی گەرماو بۆ سەردەمێکی زۆر کۆن دەگەڕێتەوە[8] و موسڵمانەکانیش یەکەم کەس بوونە گەرماو بەشێوەیەکی ڕێک و دروست بەکاربهێنن. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی موسڵمانەکان گەرماوێکی زۆر لە سەرتاسەری دووڕگەی فورات دروست بکەن و بەکاری بهێنن. لەوانە شاری هەولێر. کوردیش لەمێژوودا ناسراوە بەبایەخدان بەزۆری پاک و تەمیزی و چوونە ناو گەرماوەکان. شایانی باسە سوپای سەلاحەدینی ئەیوبی زیتر لە هەزار گەرماوی خۆشووشتنی هەبووە[9]. بەوەی بایەخێکی یەکجار گەورەی بەپاک و خاوێنی و ئارەزووی موسڵمانە کوردەکان دەدا، تەنانەت لە گۆڕەپانەکانی جەنگیشدا.

لێرەدا یەکێ لە لێکۆڵەرەوەکان جەخت دەکاتەوە کە (ئیبن بەتووتە) باس لە گەرماوەکان دەکات و دەڵێت: گەرماوەکانی شاری هەولێر لە ڕووی وردەکاری و بیناسازییەوە وەکو گەرماوەکانی شاری بەغدا بوون[10].

ڕۆڵی ئەم گەرماوانەش بەوە دەرکەوت، کە لە ڕووی خزمەتگوزاری تەندروستییەوە چاکترین خزمەتیان پێشکەش بەدانیشتوانی شارەکە کردووە بەمەبەستی سوود گەیاندن بەمرۆڤەکان لە ڕێی گەرماوەکان و پاکڕاگرتنی جەستەیان لەپیساتی و، خاوێن بوونیان بۆ بەئەنجام گەیاندنی فەریزە شەرعییەکان[11]، خەڵکی شاری هەولێر لەهەر گەرماوێکدا ژووری تاکیان دروست کردبوو، کە لە مەترێک چوار گۆشە فراوانتر نەبووەو بەئامانجی تایبەت بەکارهێنراون، وەک پاککردنەوەی هەندێ شوێنی جەستە لە موو، ئافرەتانیش لە بێ نوێژی. کە لەگەرماوی قەڵا بەدی دەکرێ[12].

سەرەڕای ئەوەی گەرماوەکان سوودیان بۆ جەستە هەبووە، کارێکی باشیش بوون بۆ خاوێنی شارەکە لە زبڵ و داری فڕێدراو، چونکە بۆ گەرمکردنی گەرماوەکان بەکاردەهێندران[13].

## ج- خاوێنی چێشتخانەو ساردەمەنییەکان:

خەڵکی هەولێر بایەخێکی زۆری بەخاوێنی چێشتخانەو ساردەمەنییەکان و باشکردنی کەلوپەلە سفرەکان داوە هەمیشە پابەند بوونە بەوەی لەکاتی گۆڕینی ڕەنگی کەلوپەلەکان لای سفرچییەکانیان سپیان دەکردەوە، لەم بارەوە ئیبن مستەوفی دەڵێت: باوکی عەبدولڕەحمانی کوڕی سەفار لە بازاڕی سفرچییەکان کاری دەکرد[14]، ئەمەش خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکە، کە بازاڕێکی تایبەت هەبووە بۆ دروستکردنی کەلوپەلی سفرو نوێکردنەوەیان لە شاری هەولێردا، لەلایەکی تر ئەمە بەڵگەیە، کە کورد بایەخی بەپیشەسازی کەلوپەلی باش و نوێکردنەوەو سپیکردنەوەی داوە.

گومان لەوەدا نییە لەشاری هەولێر دارو خەڵووز بەکارهێنراوە، ئەمەش بەهۆی بوونی دارو دارستانێکی چڕ لە شارەکەدا[15] داربڕەکان[*]یش ئەم کارەیان قۆستبۆوەو داریان بۆ چێشتخانەو گەرمکردنی ماڵەکان لەت لەت دەکردو ئامادە دەکرد. وێڕای ئەوە خەڵکی شارەکانی کوردستان،

بەتایبەتی خەڵکی هەولێر خزمەتگوزاری تەندروستی دیکەشیان پەیڕەو دەکرد وەک پاراستنی خۆراک و داکردنی لەژێرزەمینەکاندا، وەک گۆشت و پەنیر و میوە و هەنگوین و گەنم. هەروەها هەندێ خۆراکی دیکەشیان لەڕێگەی وشککردنەوە یان لەڕێگەی خستنە ناو گۆزە یان کووپ پاراستووە، نەوەک بۆگەن بکات و تێک بچێ[١٦].

بەڵام سەبارەت بەپاراستنی ئاو، لای دانیشتوانی شاری هەولێر هەروەکو شارەکانی دیکە بایەخی تایبەتی خۆی هەبووەو بایەخیان پێداوە، بەوەی پاراستنی ئاو کاریگەری راستەوخۆی بەتەندروستی مرۆڤەوە هەیە، لەبەرئەوە دوو سەرچاوەیان هەر لەکۆنەوە بەکارهێناوە بۆ سازگارکردنی ئاوی خواردنەوەو دەستەبەرکردنی بۆ ژیانی رۆژانەی ماڵەکانیان. یەکەم: بیری قەڵا کە ئاوەکەی لەگوندی (قەرە سووریکان)* بەرێگای نۆکەندی داخراو لەژێر زەویدا بەدووری (٢٠) کیلۆمەتر لەهەولێر دەگوازرێتەوە بۆ قەڵا[١٧]. دووەم: کارێزە کە ئەو رێگاش بۆ زەمەنێکی دوور دەگەڕێتەوە[١٨].

## د- خاوێنی شەقام و بازاڕەکان

خەڵکی هەولێر بەزۆر رێگا بایەخی بەپاک و خاوێنی داوە جا چ لەرێگای پلاندان یان رێکخستن یان نۆژەنکردنەوە بێت بەشێوەیەکی هاوەدنگی، هەروەکو زانراوە زۆرینەی خەڵکی ناوچەکەش موسڵمانن ئایینی ئیسلام، بەشێوەیەکی گشتی جەخت لەسەر پاک و خاوێنی دەکاتەوە، لەوانە پاک راگرتنی رێگاکان. پێغەمبەر د.خ لەپاش ئەو زاناکان جەختیان لەسەر پاراستنی رێگاکان کردۆتەوە، بەوەی کە تەسک نەکرێنەوەو خانووی نیشتەجێشی لەسەر دروست نەکرێ و وەکو زەویش کڕین و فرۆشتنی لەسەر نەبێ، چونکە بەشوێنی گشتی دادەنرێت نەک شوێنی تایبەت[١٩].

ئەمەش پاڵی بەخەڵکەکەی ناوە شارەکەیان بەپاکی رابگرن، بۆ نموونە دانیشتوانی شار زبڵەکانیان هەڵدەگرت و لەدەرەوەی شار دەیان سووتاند تاوەکو نەخۆشی و پەتا بڵاو نەبێتەوە، هەندێ خەڵکیش وەکو سووتەمەنی بۆ گەرمکردنی ئاوی گەرماوەکان بەکاریان دەهێنا[٢٠].

سەبارەت بەپاک راگرتنی بازاڕەکان، خەڵکی شار بایەخ بەرێکخستنی بازاڕەکان و پاکو خاوێنی دەدا. جاران بازاڕی قەیسەری لە رووی رێکخستن زۆر رێکوپێکی بەخۆوە دەبینی و دیاربوو[٢١]. هەر بازاڕێک بەپیشەیەک ناسراو و ناوپۆش کرابوو لە تەنیشتەکانیش دوکانی زۆر هەبوون رێگا بەنێوباندا دەڕۆیشت[٢٢]. لە سەرووی دوکانەکانیش پەنجەرەی رووەو رۆژهەڵاتی تێ گیرابوو، ئەوانەی روو لە رۆژئاواش بوون بەهەمان شێوە، جگە لەو دەروازانەی لە بازاڕەکەدا هەبوون[٢٣].

خەڵکی هەولێر بایەخێکی زۆریان بەخاوێنی بازاڕەکە دەدا لە رووی هەواگۆڕکێ و نەهێڵانی هاتنی ئاوی باران بۆ ناو بازاڕەکە بەهۆی گومەزەکانیەوە[٢٤]، چونکە ئەو کات بازاڕەکان لە شارە ئیسلامییەکان قیرتاو نەکرابوون[٢٥]. بەڵام پەنجەرەکانیان بۆ خاوێنی بازاڕەکان بەکاردەهێنا بەوەی کە رۆشنایی و تیشکی خۆری دەهێنا ژوورەوەو بەمەش شێ و بۆنی ناخۆش نەدەما لەهەمان کاتدا پاککەرەوەش بوو. هەندێ لەخاوەن پیشەی دیکە لەبازاڕەکان دوور خرابوونەوە بۆ ئەوەی کار لە تەندروستی و تەمیزی بازاڕەکان نەکات وەک دار فرۆش و خەڵووز فرۆشەکان، هەروەکو ئیبن مستەوفی باسی لێوە کردووە[٢٦].

## دووەم: چاودێریکردنی چێشتخانەو ساردەمەنییەکان

دەسەڵاتدار و دانیشتووان بایەخێکی زۆر بەچێشتخانەو ساردەمەنییەکان دەدەن، چونکە کاریگەری پۆزەتیڤ و نێگەتیڤی لەسەر باری تەندروستی خەڵکەوە هەبوو. لەبەر ئەوەی لەرێگەی هەردووکیانەوە نەخۆشییەکان دەگوازرانەوە بۆ مرۆڤ، بۆیە لایەنی دەسەڵاتدار دەزگاکانی چاودێری دامەزراند تا چاودێری بکرێن و بەکارهێنانی ئەو ئامێرە ناتەندروستییانە و کەرستە زیان بەخشانە بکەن، کە زیان بەمرۆڤ دەگەیەنن، لەگەڵ چۆنیەتی دروستکردنیان. هەروەها لایەنی دەسەڵاتدار لەسەریانی فەرزکرد، کە

نابێ کەلوپەلی لە زێڕ و زیو دروستکرا و بەکاربهێنن، بۆ ئەوەی زیان بەتەندروستی گشتی نەگەیەنن[٢٧] هاوکات چاودێری خاوێنی مەنجەڵە سفرەکان و سپی کردنەوەیان بن لای سەفارچییەکان[٢٨]. یەکێ لە سەرچاوەکان دەڵێت: دانیشتوانی شاری هەولێر بەبایەخەوە گرینگی بەو مەسەلەیە دەدا تاوای لێهات بازاڕێکی تایبەتیان دروست کرد و ناویان نا بازاڕی سەفارچییان[٢٩]، بێگومان ئەمەش دەلالەت لەسەر ئەوە دەکات، کە بایەخ بەخاوێنی کەلوپەلەکان دراوەو ملکەچیش بوون بۆ مەرجەکانی چاودێری تەندروستی.

گرینگیدان بەخزمەتگوزاری تەندروستی وای لێهات دەزگا چاودێرییەکان چاودێری هەندێ لە خۆراکە وشک کراوەکانیش بکەن، کە پێشتر گۆشت و هەندێ خۆراکیان لەرێگای وشککردنەوە هەڵدەگرت. هەروەکو پێشتر لە هەولێر باو بوو وەک دروستکردنی روونی حەیوان و پەنیر لەماوەی وەرزی هاوین یان زستاندا[٣٠].

ئەو خزمەتگوزارییە تەندروستییە وای لە دەسەڵاتدارێتی میرنشین کرد لە هەولێر، کە بایەخێکی زۆر بەچاودێریکردنی سەرچاوە ئاوییە سازگارەکان بدات و دووریان بخاتەوە لە ئاوی سیانەکان، کە لەماڵەکان دەردەچوو بۆ دوو دۆڵی گەورە[٣١] ئەمەش تا ئەمرۆ مایەوە. هەندێ لە سەرچاوە مێژووییەکان ئاماژە بەوە دەدەن شاری هەولێر لەهەردوو سەرچاوەی کاریزو نۆکەند ئاوی سازگاری بەکارهێناوە[٣٢] ئەم نۆکەندانەش زۆر بوون لەوانە دووانیان بەشاری هەولێردا تێپەڕ دەبوون[٣٣].

ئیبن مستەوفی ناوی یەکێ لە وتاربێژەکانی شاری هەولێری هێناوە، کە ناوی محەمەد کوڕی عەلی کوڕی جامع بووە، کە لە سەدەی شەشەمی کۆچی- دوانزەهەمینی زاینی پۆستی (محسب)ی پێ سپێردرا، بۆ ئەوەی سەرپەرشتی شارەکە بکات لە رۆژانی ئەبی هەیجا کوڕی عەلی ساحێبی هەولێر[٣٤].

**سێیەم: بایەخدان بەنۆژەنکردنەوەو دروستکردنی خانە**

**١- دروستکردنی خانەی بێ سەرپەرشتان و بێوەژنەکان**

گومان لەوەدا نییە چاکترین شت لە ئیسلام ئەوەیە خەرجی بێ سەرپەرشتان و بێوەژنان لەئەستۆ دەگرێت و کۆمەکیان دەکات لە نەهامەتەکانیان. پێغەمبەر (د.خ) دایک و باوکی نەبووە[٣٥] هەستی بەبێ سەرپەرشتی دەکرد، بۆیە هەمیشە بانگەشەی ئەوەی دەکرد بەزەییتان بەبێ سەرپەرشتان و بێوەژنان و هەژاراندا بێتەوە، سەرەڕای ئەوە لەزۆر شوێن لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بەو لایەنە دەدات[٣٦]. بەمە موسڵمانەکان هاندەدان بەتایبەت دەسەڵاتداران، کە بایەخ بەخانەی بێ سەرپەرشتان بدەن و بیانپارێزن و وا لە تاکەکانیان بکەن، کە خزمەت بەکۆمەڵگا بگەیەنن و لەلادان دووریان بخەنەوە. بۆیە کۆمەڵگەی ئیسلامی بەپێشینەی نەتەوەکانی دیکە دێت، کە داموەزگای تایبەت بەداینگەو خانەی بێ سەرپەرشتان و پەککەوتووەکانی دروست کردبێ[٣٧] لەم بارەوە یەکێ لە لێکۆڵەرەوەکان دەڵێت: میر موزەفەرەدین گۆگبری یەکێکە لەدەستپێکی دەسەڵاتدارە موسڵمانەکان، کە بایەخی بەبێ سەرپەرشتان دابێ و خانەیەکی تایبەتی بۆ تەرخان کردبێ[٣٨].

لەمیرە بەناوبانگەکانی شاری هەولێر لەو ماوەیەدا واتە لە (س ٥-٦/ ١١-١٢ ز) سەرچاوەکان ئاماژە بەکارە گرنگەکانی میر موزەفەرەدین گوگبوری دەدەن لە شاری هەولێردا دەڵێن (٤) خانەی بۆ نەخۆشە درێژخایەنەکان دروست کردو تەواوی پێداویستییەکانیشی بۆیان دابین کرد[٣٩].

لە بایەخێکی دیکەی ئەو میردا خانەی بۆ بێ سەرپەرشتان و هەژارەکان دروستکرد هەروەها سەرچاوەکان دەڵێن: لەهەموو رۆژانی دووشەممەو پێنجشەممەی هەفتەیەکدا ئەو خانانەی بەسەردەکردەوەو لەباری ژیان و تەندروستی و حەوانەوەو خواردنیانی دەپرسی[٤٠].

موزەفەرەدین گۆگبری هەر بەتەنیا چاودێری بێ سەرپەرشتانی نەکرد، بەڵکو ئەو سۆزە نابینایانیشی گرتەوەو خانەیەکی تایبەتی بۆ دروستکردن و نابیناکانی تێدا کۆکردەوەو جار جارە خودی خۆی بەسەری دەکردنەوەو لەباری ژیان و

خواردن و خەوتنیانی دەپرسی[٤١].

### ب- دروستکردنی خانەی میوانداری

سەبارەت بەدروستکردنی خانەی میوانداری لەماوەی هەردوو سەدەی پێنجەم و شەشەمی کۆچی بۆ شارە کوردییەکان کارێکی گرنگ بوو بۆ پێشوازیکردن لەو کەسانەی روو لە شاری هەولێر دەکەن، بەتایبەت بۆ میرەکان و زانایان و قوتابیانی زانست، کە لەمیوانخانە رێزیان لێ بگیرێ و ئەوەی پێویستیان پێدەبێ لەرووی حەوانەوەو خواردن و خواردنەوە لەماوەی مانەوەیاندا پێشکەشیان بکرێت. میر موزەفەرەدین فەرمانڕەوای هەولێر گرنگییەکی باشی بەخانەی میوانداری دەداو خەرجییەکی زۆری دەکرد بەو شێوەیەی تا شیاو و گونجاو بێت لەگەڵ شاندو میوانەکاندا[٤٢] لەم بارەوە ئیبن مستەوفی ئاماژە بەوە دەدات کە ئیبن مەلاعب[٤٣] ماوەیەکی زۆر (چاودێریکردنی خانەی میوانداری خستە ئەستۆ، کە ئەبو سەعیدی گۆکبری وەقفی کرد)[٤٤].

شایانی باسە هەندێ لەلایەنەکانی شاری هەولێر تایبەت کرابوون بۆ پێشوازیکردن لەو کەسانەی لەدەرەوەی شار دێن. هەموو لایەنەکان وەک خانەیەکی (میوانداری) بوو بۆ چین و توێژەکان لەوانەی روویان لە هەولێر دەکرد وەک قوتابیانی زانست، بازرگانە دەوڵەمەندەکان یان ئەوانەی لەرێگاوە لایان دابوو. تەنانەت بگرە یەکێ لە لایەنەکان ناسراو بوو بە (لایەنی سەڵتەکان) کە موزەفەرەدین گۆکبری دروستی کردبوو[٤٥].

### ج- بایەخدان بە رووەک و ئاژەڵ

دارو رووەک بەسەرچاوەیەکی گرنگ هەژمار ئەکرێت بۆ وەدەستهێنانی کەرستەی پزیشکی، چونکە لەوانە دەرمانە پزیشکییەکان ئاوێتەی یەکتر دەکران، ئەمەش وای لە خەڵکی هەولێر کرد بایەخی گەورەی پێ بدەن، بەوەی کە زانستی رووەک لای ئەوان بوو بەبنەمایەک بۆ ئاسوودەکردنی ئادەمیزادو چارەسەرکردنی خودی خۆیان لە نەخۆشییەکان، کوردەکان زۆرینەی دەرمانەکانیان لەرووەک وەبەردەهێنا، بۆیە هەر لەکۆنەوە خوویان بەخێرو بێری سروشتەوە گرت، کوردستانیش پڕە لەدار[٤٦]. هەولیان دا دەرمان بەپێی پێداویستییەکانیان وەبەر بهێنن. سەبارەت بەدروستکردنی دەرمانیش لەگژو گیاو دارەکان بەشێوەیەکی سەرەکی پشتیان بەلاساییکردنەوە و بەردەوامی تاقیکردنەوەو بەکارهێنانیان دەبەست. هەندێ دەرمانیان بەشێوەی دەرهێنان یان دڵۆپاندن دروست دەکردو بۆ چارەسەرکردنی هەندێ لە نەخۆشییەکانی هەناو یان ئەوانەی دیارن بەکار دەهێنا.

بۆ نموونە میرەکانی هەولێر هانی خەڵکیان دا بەچاندنی دارو رووەک بەتێچوون و هێنانی رووبار بۆ وەبەرهێنانی دارو میوە بەهەموو جۆرەکانییەوە، کە بە بەرهەمی کشتوکاڵی دادەنرێن و لەرووی ئابووری و کشتوکاڵییەوە زۆر گرنگن و کاریگەری پۆزەتیڤیان لەسەر تەندروستی مرۆڤ و بەرهەڵستی بەهێزکردنیان لەدژی نەخۆشییەکان هەیە. وێڕای ئەوەی لایەنی تریشی هەیە لەرووی ئابووری و سروشتی و جوانییەوە. نموونە لەسەر ئەوە شاری هەولێر یەکێکە لەو شارانەی ناسراوە بەکشتوکاڵ و رووەک و بەچڕی دارو درەخت و باخچەوە. هەڵبەتە ئەمەش کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دانیشتوانەکە هەبووە لە رووی تەندروستی و ئابوورییەوە، هەروەکو ئیبن مستەوفی، کە لە هەولێر ژیاوەو لەماوەی لێکۆڵینەوەکەیدا باسی لە باخچەو بێستانەیەک کردووە[٤٧] کە نزیک بووە لەدەروازەی شاری کۆن و پێی دەوترا (دەرگای رەژوو فرۆشان)، زۆر رووباریان بۆ هێنا لەوانە دووانیان دەهاتنە ناو شار[٤٨] و کاریگەری گەورەیان هەبوو بۆ زێدەکردنی رێژەی دارو رووەک لەناو شاردا، چونکە زۆرینەی دارەکانی ناوچەکە پشت بەجۆگەو رووباری دروستکراو دەبەستن.

بەڵام بایەخدانی خەڵکی هەولێر بەئاژەڵ شتێکی ئاشکرایە، کە ئەوسا ئاژەڵ کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەژیانی دانیشتوانی شارەکەدا لەبواری گواستنەوەو خاوێنی تەندروستییان، چونکە بەسەرچاوەیەکی گرنگی خۆراک دادەنراو، هەر لەئاژەڵ شتیان دروست دەکرد، کە خۆیان پێ لە سەرمای زستان بپارێزن. هەندێ لە ئەندامانی

ئاژەڵ هەناو و زراوەکەیان بۆ دروستکردنی دەرمانی پزیشکی بەکار دەهێنا[٤٩].

ئەو چاودێری و پاراستنە گشتییەی لای موسڵمانەکان بەتێکڕاو خەڵکی شارەکە بەتایبەت زانستێکی تایبەت بەناوی زانستی بەیتاڵی لێی وەبەرهەم هات، ئەو زانستە باس لە بواردکانی ئاژەڵ دەکا لەو شتانەی سوودو قازانجی پێدەگەیەنن، ئامانجیش لەو زانستە تیمارکردن و چارەسەر کردنیانە[٥٠]. ئەمەش بە بەشێک لە خزمەتگوزارییە تەندروستی و کۆمەڵایەتییەکان دادەنرێت، کە هەندێ لە لێکۆڵەرەوەکان بە بەیتاڵییان داوە لە شاری هەولێردا، لەوانە هەندێکیان فەرموودە بەنرخەکانی پێغەمبەریان هێناوەتەوە، کە پەیوەندی بەو پسپۆڕێتییەوە هەبووە، هەروەکو ئیبن مستەوفی باسی لێوە دەکات[٥١].

سروشتی پێگەی جوگرافی شاری هەولێر، کە ناوچەیەکی دەشت و شاخاوی و دۆڵەو بەفرو بارانێکی زۆری لێ دەباری بەهۆکارێکی گرینگ دادەنرێت بۆ دانیشتووانی شارەکە، کە بایەخ بەخوە جیا جیاکانی ئاژەڵ بدەن، بێگومان ئەم جۆرە خۆراگرییە وای لەدانیشتووانی ناوچەکە کرد جۆراوجۆری ئاژەڵ بەخێو بکرێت. شاری هەولێر بەمەڕو هێسترو ئەسپی باش بەناوبانگ بوو[٥٢] خەڵکی هەولێر چەند شوێنێکیان تایبەت کرد بۆ بایەخدان و بەخێوکردنی ئاژەڵ و داوای یارمەتییان لە بەیتاڵەکان دەکرد.

هەروەکو ئیبن مستەوفی باس دەکات و دەڵێت: لەم بوارە بازاڕێکی تایبەت هەبوو پێی دەوترا (بازاڕی بەیتاڵەکان)[٥٣] بەیتاڵەکان ئاوی جۆیان بۆ چارەسەرکردنی دەواب بەکاردەهێنا[٥٤].

## چوارەم: بایەخدان بەپزیشکی و پزیشکەکان

گومان لەوەدا نییە زانستی پزیشکی یەکێکە لە زانستەکانی پراکتیکی یان رووت، هەروەها زانستی دەرمانسازی و ئاوێتەی دەرمانەکانیش بەهەمان شێوە، ئەم زانستە بەستراوەتەوە بە رووەک و دەرمانسازی، واتە هەر یەکەو پشت بەئەوی تر دەبەستێت[٥٥]، پزیشکی بەگشتی بابەتێکەو بۆ سوود گەیاندن بەجەستەی مرۆڤ و هێنانەوەی تەندروستی سەری هەڵداوە و زەرووەرەتێکیشە بۆ هێنانەوەی باشییەکان بۆ خۆ دوورگرتن لە نەخۆشییەکان و پاراستنی تەندروستی، کە ناشێ گەر بەزانستی پزیشکی نەبێت[٥٦].

بۆیە لەلایەن رۆڵەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی و دەسەڵاتدارانەوە لە هەموو چەرخ و زەمانێکدا لە سەرجەم شارەکان بایەخێکی گەورە بەزانستی پزیشکی دراوە[٥٧]، لەوانە شاری هەولێر. هەندێ لەدەقە مێژووییەکان ئەو راستییە دەردەخەن، کە شاری هەولێر ناوبانگی بەرووەک و گژو گیای پزیشکی دەرکرد و بووبووە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ بەرەو پێشخستنی زانستی پزیشکی بەکەرەستەی خاو بۆ ئامادەکردن و ئاوێتەی دەرمانەکان لە رووەکەکان، کە لەخاکی هەولێر دەڕواو پێی دەوترا (نیلوفر)، کە لە گۆمەکان دەڕواو بۆ چارەسەرکردنی سەرئێشە بەکاردەهێنرا[٥٨]. شایانی ئاماژە پێکردنە ئەو رووەکە لەزۆربەی زۆری بێستانەکانی شاری هەولێر دەڕوا[٥٩].

هەروەها خەڵکی هەولێر بایەخیان بەئاوی کانزاکان و کانی گۆگرد دەداو، بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی پێست و میزو فێ و باداری بەکاریان دەهێنا[٦٠] هەندێ لە سەرچاوەکان گوتوویانە لەگوندی (تەرجلە)، کە نزیکە لەشاری هەولێر بەکانیاوی کبریتی بەناوبانگ بوودو خەڵکی هەولێرو دەوروبەری خۆیان پێ دەشووشت[٦١].

### أ- پزیشکەکانی هەولێر

زانستەکانی پزیشکی بەهاندان و بایەخدانی میرەکان و پزیشکەکان گەشەسەندنێکی گەورەی بەخۆوە بینی. ئەمەو ئەبو ئەحمەد یوسف کوڕی جامع کوڕی ئەحمەد کوڕی محەمەد کوڕی حوسێن هەولێری، کە لەساڵی (٦١٥ک-١٢١٨ز) کۆچی دوایی کردووە بەشداری لەگەشەسەندنی ئەو زانستە پزیشکیانە کردووە. ناوبراو لەزانستی پزیشکی لەبارەی دەرمانسازییەوە پسپۆر بوو، سەرپەرشتی دەرمانخانەی نەخۆشخانەکانی شاری هەولێری دەکرد[٦٢].

هەروەها ئیسحاق کوڕی مەعالی کوڕی شەماس کوڕی هەیبەتوڵڵا کوڕی ئیبراهیم کوڕی شەماس ئەبو ئیبراهیم هەولێری، کە لەساڵی (٦١٧ک- ١٢٢٠ز) کۆچی دوایی کردووە یەکێکی دیکەیە لەناودارانی شاری هەولێر، کە بایەخی بەم زانستە داوە. ناوبراو شارەزایی لەزۆر لەزانستە جیا جیاکان هەبووە[٦٣] وەک زانستەکانی پزیشکی و فەلەکناسی و ئەندازە[٦٤]. پزیشکی دیکەش هەبوونە کە خزمەتیان بەخەڵکی هەولێر کردبێ لەو سەردەمەدا، لەوانە ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل کوڕی محەمەد کوڕی غازی کوڕی عەبدوڵڵا ئەلحەرانی، کە ناسراو بوو بەئیبن نەقیب و لەساڵی (٦٢٢ک- ١٢٢٥ز) کۆچی دوایی کردووە، پزیشکێکی چاو بووە لەنەخۆشخانەکانی هەولێر، وێڕای ئەوەی بایەخێکی زۆریشی بەوێژە (ئەدەب) داوە[٦٥].

ئەوانەی ڕۆڵیان هەبووە لەچالاککردنی زانستی پزیشکی لەشاری هەولێر، عەبدولڕەحمان کوڕی عەلی کوڕی ئیسحاق کوڕی شیت بەیاتی بووە، کە لەساڵی (٦٢٣ک- ١٢٢٦ز) کۆچی دوایی کردووە، زاناو شارەزا بووە لەپزیشکی و دروشم و نامەشی هەبووە[٦٦] سەرچاوەکان ئاماژە بەوەش دەدەن کاریگەری زانستەکانی پزیشکی ئاسەوارێکی باشی جێهێشتووە لەدوورگەی فورات و لەوڵاتە ئیسلامییەکانی دیکەداو هانی زۆری قوتابیانی زانستی داوەو سەرنجی ڕاکێشاون، کە بێن بۆ دوورگەی فورات، لەوانە موهەزەبەدین ئەلحاجب، کە لەساڵی (٥٩٠ک- ١١٩٣ز) ژیاوە[٦٧]. زاناو شارەزا بوو لەپزیشک و وەرزش و وێژەدا، لەپێناو زێدەکردنی زانستەکەی دیمەشقی جێهێشتووەو هاتۆتە دوورگەکە، لەوانە شاری موسڵ و بۆتە قوتابییەکی زانای ئەو سەردەم، پاشان هاتووە بۆ شاری هەولێرو لەگەڵ زاناکان کۆبۆتەوە[٦٨].

**ب- نەخۆشخانەکان**

پرۆژەی نەخۆشخانەکان لەو ماوەیە یەکێ بوو لای میرو دەسەڵاتدارەکان بەهەندی هەڵبگرن و[٦٩] بەیەکێ لەدامودەزگا تەندروستییەکان گوزارشت دەکرێت. کە میرەکان و کەسانی خێرخواز لەشارەکاندا لەپێناو پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری مرۆییەوە ئەنجامیان داوە[٧٠] نەخۆشخانەکان پێگەیەکی زۆر باشیان هەبوو، سەرجەم مەرجەکانی تەندروستی تیایدا هاتبووە دی لەرووی ئاوو هەوای سازگارو دوور بوون لەهەراو غەڵبەغەڵب[٧١] نەخۆشخانەکان دوو یەکەی جیای لەناو یەک بوون، یەکەی پیاوان، یەکەی ژنان[٧٢] هەر یەکەو لەژمارەیەک یەکەی نەخۆش بۆ نەخۆشە جیاجیاکانی لەخۆ دەگرت، وەک یەکەی نەخۆشییەکانی هەناوو یەکەی نەشتەرگەری و یەکەی چاو[٧٣].

هەریەک لەو یەکانە سەرجەم پێداویستییەکانی مرۆیی و پزیشکی تێدا بووە، لەوانە ئامێرەکانی پزیشکی و لایەنی خزمەتگوزاری لەنەخۆشیاران و خزمەتگوزاران و سەرپەرشتیاران[٧٤]، لەگەڵ تەواوی پێداویستییەکانی دیکە لەئامێرو داودەرمانی ئامادەکراو، کە لەدەرمانخانەکان هەبوون[٧٥]. جا گەر سەرنج بدەین لەشاری هەولێر دوو جۆر نەخۆشخانە هەبوون، نەخۆشخانەی جێگرو نەخۆشخانەی گەڕۆک.

**أ- نەخۆشخانە جێگرەکان**

ئەم جۆرە نەخۆشخانە لە باڵەخانەیەکی جێگرە، بەزۆری لە شارە گەورەکان بوونیان هەیە[٧٦] لەو نەخۆشخانانەی، کە لەشاری هەولێر ناوی هاتووەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی میر موزەفەرەدین گۆکبری فەرمانڕەوای هەولێر[٧٧]، کە لەشاری هەولێر دروستی کردو[٧٨] لەژمارەیەک بەش و چەند یەکەیەکی جیا جیا پێکهاتبوو، هەر بەشەو خزمەتگوزارییەکی دیاریکراوی پێشکەش دەکرد. ئیبراهیم کوڕی ئیسماعیل کوڕی ئەحمەد کوڕی عەبدوڵڵا حەرانی ناسراو بەئیبن نەقیب لە (٦٢٢ک-١٢٢٥ز) کۆچی دوایی کردووە (پزیشکی چاو) بووە[٧٩]، دەرمانخانەش بەشێکی تایبەت بووە لە نەخۆشخانەو پزیشکی ناودار ناسراو بوو بەشێخی دەرمانخانەو سەرپەرشتی دەرمانخانەی نەخۆشخانەی کردووە. ئەمەش ئیبن شعار ئەبو ئەحمەد کوڕی یوسف کوڕی جامع کوڕی ئەحمەد هەولێری، کە لەساڵی (٦١٥ک- ١٢١٨ز) کۆچی دوایی کردووە باسی

دەكات[٨٠].

ئەم نەخۆشخانەیە سەرنجی ژمارەیەكی زۆر لەپزیشكانی راكێشا لەبەر ئەوەی لەلایەن میر موزەفەرەدین گۆگبری بەپلە یەک بایەخی پێدەدرا. عەلی كوڕی عوسمان كوڕی عەلی هەولێری داوای لە وەزیری ئەوسا ئیبن مستەوفی كرد بەسەرۆكی كارگێڕی نەخۆشخانەی هەولێر دایبمەزرێنێت، بۆ ئەوەی زیاتر چاودێری بكات، بەم بۆنەیەوە هۆنراوەیەكی هۆنیوەتەوەو مێژوونووسی یۆنینی ئاماژەی پێداوە[٨١].

كاتێ دكتۆر عەبدولڕەحمان كوڕی عەلی كوڕی ئیسحاق كوڕی شەبیب بیانی، كە لەساڵی (٦٢٣ك-١٢٢٦ز) كۆچی دوایی كردووەو سەردانی هەولێری كردووە، كاری لەو نەخۆشخانەیە كردووە[٨٢]. مێژوونووس ئیبن خەلەكان كە لەساڵی (٦٨١ك- ١٢٨١ز) كۆچی دوایی كردووە گوتوویەتی: میر موزەفەرەدین بەناو نەخۆشخانەكاندا گەڕاوەو لە تەندروستیانی پرسیوەو هاوكات ژمارەیەک سەرپەرشتیاری هەبووە بەمەبەستی گەیاندنی خزمەتگوزاری بەنەخۆشەكان[٨٣].

شایانی باسە ئەم نەخۆشخانەی هەولێر جیادەكرایەوە لە نەخۆشخانەكانی شارەكانی دیكە بەبوونی گۆڕستانێكی تایبەت بەو نەخۆشخانەیەو ئەوانەی لە نەخۆشخانە دەمردن لەوێ دەنێژران، بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی لەدەرەنجامی ئەو تەرمانەی هەڵگری میكرۆب بوون، كە ئەمەش كاریگەرییەكی پۆزەتیڤانەی هەبووە لەسەر تەندروستی دانیشتووانی شارەكە، هەروەكو ئیبن مستەوفی باسی لەوانە كردووە، كە لەگۆڕستانەكە نێژراون، وەک: ئەبو تالیب بار ستیفان، كە لەساڵی (٦١٦ك-١٢١٩ز) كۆچی دوایی كردووە[٨٤] ئەبو محەمەد عەبدولڕەحمان كوڕی ئەبی بەرەكات كوڕی محەمەد كوڕی ئەحمەد كوڕی ئیبراهیم كوڕی كندرگلی ناسراو بەئیبن شەنری، كە لەساڵی (٦١٩ك-١٢٢٢ز) كۆچی دوایی كردووە[٨٥] هەروەها ئەبو سەنا مەحمود كوڕی عەلی كوڕی محەمەد كوڕی بەكر هەولێری زێرینگەر، كە لەساڵی (٦١٩ك-١٢٢٢ز) كۆچی دوایی كردووە[٨٦].

**٢- نەخۆشخانەی گەڕۆک**

لایەنە خزمەتگوزارییە تەندروستییەكان هەر بەتەنیا لە نەخۆشخانە جێگرەكان پێشكەش بەخەڵک نەدەكران، بەڵكو نەخۆشخانە گەڕۆكەكانیشی دەگرتەوە، كە لەشارەوە بۆ شوێنی دیكە دەگوازرانەوە[٨٧] ئەو نەخۆشخانانە لەگەڵ میرو خەلیفە لەكاتی سەفەركردن و ئەنجامدانی گەشت، لەگەڵ گەشتی سەربازی دەرۆیشتن[٨٨] ئەم جۆرە نەخۆشخانە تەواوی پێداویستییەكانی نەخۆشی لە دەرمان و ئامێری پزیشكی و خواردن و خواردنەوەو پزیشک و دەرمانسازەكان تیایدا بووە، كە لە شارەوە بۆ شوێنەكانی دیكە دەگوازرانەوە، كە نەخۆشخانەی جێگیری لێ نەبووە[٨٩].

هەڵبەتە ئەم جۆرە نەخۆشخانەیە تەنیا كارو چالاكی ئەوە نەبووە، كە سەرپەرشتی گوندو ناوچە دیاركراوەكان بكات، بەڵكو چالاكی تریشی دەنواند، بۆ نموونە یاوەری كاروانی حاجیانی كردووە، كە دەچوون بۆ بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج و بەكەرستەی فریاكەوتن و دەرمانی جیا جیاو ئەوەی نەخۆش پێویستی پێ دەبوو ئامادە كرابوو[٩٠].

ئیبن مستەوفی لەسەر زاری ئەبی حامید كوڕی ئەبی فەجر كوڕی ئەحمەد كرمانی، كە لەساڵی (٦٣٥ك-١٢٣٧ز) كۆچی دوایی كردووەو یاوەری حاجییەكانی فارسی كردووە، كە لە ئێرانەوە رۆیشتوون بۆ بەجێگەیاندنی فەریزەی حەج، گوتوویەتی: میر موزەفەرەدین گۆگبری ساحێبی هەولێر هەموو ئەو پێداویستییانەی دابین كردووە، كە حاجییەكان لەو سەفەرەدا پێویستییان پێ دەبوو لە رێگادا[٩١].

لێرە سەرنجی ئەوە دەدەین كە میر موزەفەرەدین خێرخواز بووە بۆ ئاسانكاریكردن لە كاروانی حاجییان و دەستەبەركردنی هەموو ئەو پێداویستییانەی حاجی پێویستی پێ دەبێ. لەگەڵ داو و دەرمان و تیمێكی پزیشكان بۆ چارەسەركردنی نەخۆشەكان لەو رێگایەدا[٩٢].

**پەراوێزەكان:**

١- بڕوانە وێنەی ژمارە (١).

٢- احمد امين: ظهير الاسلام، ج٢، ص٢١، ميخائيل عواد، صورة مشرقة، ص١٦.

* باوكير: كلمة كوردية، تعني جذب، النسيم.

٣- شريف يوسف: تأريخ من العمارة، ص٥٨٣، بروانه وێنەی ژماره (٢).

٤- ابن الجوزي: النتظم، ص١٣٦، ابن الاثير الكامل،٦/ ص١٨٠.

٥- بروانه: ابن المستوفي: تأريخ اربل، ج١، /١ص٣٩، عمادالدين خليل: ملاحظات تراث الموصل، بحث منشور في مجلة سومر، ج٣٨، ص٢٤١.

٦- بروانه: ابن المستوفي: تأريخ، ج١، ص١٦٦.

٧- شريف يوسف: فن العمارة، ص٦-٥.

٨- الفريزي: خطط، ج٢، ص٧٩، ابن قيم الجوزية: معجم التداوي، ص١٣٦.

٩- دريد عبدالقادر نوري: سياسة صلاح الدين الايوبي، ص٤٦١.

١٠- ليون بەرخۆ: هەموو ڕێگاكان بەرەو گەرماوی هەولێر دەچن، وەرگێرانی سەلام ناوخۆش، گۆڤاری شانەدەر، ژماره (١)، لاپەرە ٦٥.

١١- الشيزري: نهاية الرقبة في طلب وكسبة، ص٨٦، محمد بن حسين بيرم، الحمامات المدينة، ص٤.

١٢- بروانه وێنەی ژماره (٣).

١٣- متز: الحضارة الاسلامية، ج٢، ص٢٢٥.

١٤- تأريخ اربل، ج١، ص١٣٥.

١٥- بروانه: القدسي:أحسن التقاسيم، ص١٤٥، ابن المستوفي تاريخ، ج١، ص٣٦٦.

(*)- الشقاتوى: ئەم وشەیە بە كەسێک دەگوترێت، كە دار شەق دەكات، بروانه ابن الاثير: اللباب في تذهيب الانسان، ج٢، ص٢٠٢.

١٦- ناصر خسرو: سفرنامة، ص٥٠، ابن الاثير: الباهر، ص٧٨-٧٩، هادي رشيد الجاوشلي: الظاهر الاقتصادية في تراث كردستان، ص١٦-١٧.

(*)- قرة مورتكيان: قرية تقع في شمال مدينة اربل بمسافة ٢٠كم، بروانه: فؤاد جميل: حدياب واربيلا، بحث منشور في مجلة سومر، ١٩٦٩، ج٢٥، ج٢،١، ص٢٢١.

١٧- فؤاد جميل: حدياب، مجلة سومر، مج٥، ج١، ص٢٢١.

١٨- الحموي: معجم البلدان، ج١، ص١٣٨، هادي رشيد الجاوشلي، تراث أربيل التأريخي، ص٥٤.

١٩- ابو يعلي: الاحكام السلطانية، ص٢٢٦.

٢٠- موسيس ديرها كوبيان: حتالة العراق الصحية في نصف القرن العشرين، ص٢٨.

٢١- الحموي: معجم البلدان، ج١، ص١٣٨.

٢٢- هادي رشيد الجاوشلي: الظاهر الاقتصادية، ص١٢.

٢٣- بروانه وێنەی ژماره(٤).

٢٤- هادي رشيد الجاوشلي: المظاهر الاقتصادية، ٢١٢.

٢٥- الشيزري: نهاية الرتبة في طلب المسبة، ص١١.

٢٦- بروانه: ابن المستوفي، ج١، ص٢٢٣.

٢٧- ناجي معروف: أصالة الحضارة، ص٣٦٣.

٢٨- محمد بن الحسن البغدادي: كتاب الطبع، ص٧.

٢٩- ابن المستوفي: تأريخ، ج١، ص١٣٥.

٣٠- المقدسي: أحسن التقاسيم، ص١٤٥، ابن صوفل، صورة الارض، ص٢٠٣.

٣١- عبدالرحمن طزني: اربيل وماء الشرب، ص٢٩.

٣٢- الحموي: معجم البلدان، ج١، ص١٨٦، هادي رشيد الجاوشلي: تراث اربيل التأريخي، ص٥٤.

٣٣- ابو الفداء: تقويم البلدان، ص٤١٣، القلقشندي: صبح الاعشي، ج٤، ص١٦٧، سباهي زاده أوضح المسالك، مخطوط، ورقة ٤٧.

٣٤- تأريخ اربل، ج١، ص٣٧١-٣٧٢.

٣٥- بروانه: ابن هشام: السيرة النبوية، ق١، ص١٥٨-١٦٨.

٣٦- سورة الضحي: الاية ٩، سورة الفجر: الاية ١٧.

٣٧- سورة الضحي: الاية ٩-١٠.

٣٨- محسن محمد حسين: اربيل في عهد الاتابكي، ص٢٣٨.

٣٩- ابن خلكان: وفيات الاعيان، ج٤، ص١١٦، العساني: العجد المسبوك، ص٤٥٣.

٤٠- سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ج٨، ق٢، ص٦٨٢، ابن خلكان: وفيات الاعيان، ج٤، ص١١٦.

٤١- ابن خلكان: وفيات الاعيان، ج٤، ص١١٦، العساتي: المجد المسبوك، ص٤٥٣.

٤٢- سبط ابن الجوزي: مرآة الزمان، ج٨، ق٢، ص٦٨٣، ابن خلكان: وفيات الاعيان ج٤، ص١١٦، ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٣، ص١٦٠.

٤٣- ابن ملاعب: هو ابو الحسن علي ابن ملاعب. كان؟؟؟ القرآن باربل، ولايأخذ عوض عنه، وتوفي سنة (٦٠٤ه/ ١٢٠٧م) بروانه: ابن

المستوفي: تأريخ اربل، ج١، ص١٥٧.
٤٤- تأريخ اربل، ج١، ص١٥٧.
٤٥- ابن المستوفي: تأريخ اربل، ج١، ص ص ٣٥٧، ٤١٢.
٤٦- هادي رشيد الجاوشلي: المظاهر الاقتصادية، ص١٨.
٤٧- شهد الكف: دەكەویتە باشووری رۆژهەلاتی قەلای هەولێرەوە، بە دووری (٧٥)، بڕوانە: حسام الدين النقشبندي خطط اربل، بحث مشنور في مجلة أبحاث، ج١، ص١٤٢.
٤٨- ابو الفداء: تقويم البلدان، ص٤١٣، القلقشندي: صبح الاعشي، ج٤، ص١٦٧.
٤٩- بڕوانە: عبدالله بن احمد يوسف: مفاتيح العلوم، ص١٠١.
٥٠- حاجي خليفة: كشف الظنون عن أسامي الكتب والفنون، ج٢، ص٦٩٥-٦٩٦، جرجيس طنوس: صدق البيان في طب الحيوان، ص٦.
٥١- تأريخ اربل، ج١، ص٧١.
٥٢- احمد العزيز: الهذبانيون في اربل وأذربيجان، دراسة سياسية حضارية، رسالة ماجستير، كلية الاداب، جامعة صلاح الدين، (اربيل: ١٩٨٨)، ص١٥٠.
٥٣- تأريخ اربل، ج١، ص٢٢١.
٥٤- ابن كثير: البداية والنهاية، ج١٢، ص٦٨.
٥٥- شاخت بوزورت: تراث الاسلام، ترجمة حسين مؤنس وآخرين، ق٣، ص ١١٧-١٢٠.
٥٦- ابو الحسن الرومي: المعالجات القراطية، مخطوط، رقم ٣٦٩٥٣، ورقة ٤.
٥٧- ابن خلدون: المقدمة، ص٣٣٠، المقريزي: خطط، ج٢، ص٤٠٥.
٥٨- ابو البقاء الشقي: نزهة الانام في محاسن الشام، ص١٧٢.
٥٩- بڕوانە: ابن المستوفي: تأريخ اربل، ج١، ص٦٥.
٦٠- محمد بن حسين التونسي: الحمامات المدينة، ص. ٥٥
٦١- الحموي: معجم البلدان، ج٢، ص٢٢، محمد أمين العمري: منهل الاولياء، ص١٣٧.
٦٢- ابن الشعار: عقود الجمان مخطوط، ج١٠، ورقة ١٧٣ب.
٦٣- ابن الشعار: عقود الجمان مخطوط، ج١، ورقة ٢٤٠ب.
٦٤-ابن الفوطي: تلخيص مجمع الاداب في معجم الالقاب، ج٤، ق٢، ص١٦٢-١٦٣.
٦٥- الن الشعار، عقود الجمان، ج١، ورقة ٥١٦، ١٧أ.
٦٦- بڕوانە: ابن المستوفي، تأريخ اربل، ج١، ص٣١٤-٣١٥.
٦٧- ابن خلكان: وفيات الاعيان، ج٤، ص١٠٥.
٦٨- ابن ابي أصبيعة: عيون الانباء، ص٦٥٩، نحن محسن محمد حسين: اربيل، ص٢٧٠.
٦٩- بڕوانە: ابن خلكان: وفيات الاعيان، ج٤، ١١٧، الغساني، المجد المسبوك، ص٤٥٣.
٧٠- احمد عيسي بط: تأريخ البيمارستانات، ص٣.
٧١- هونكە: شمس العرب، ص٢٢٩.
٧٢- كمال السامرائي: مختصر تأريخ الطب، ج٢، ص٨٠.
٧٣- احمد عيسي بط: تأريخ البيمارستانات، ص١٩.
٧٤- بڕوانە: ابن خلكان: وفيات الاعيان، ج٤، ص١١٦.
٧٥- بڕوانە: ابن ابي أصبعة: عيون الانباء، ص٣٤١.
٧٦- البدري: الطب عند العرب، ص١٢٨.
٧٧- ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص ١١٦، محسن محمد حسين، أربيل، ص٢٣٦.
٧٨- ابن خلكان، وفيات الاعيان، ج٤، ص١١٦.
٧٩- ابن الشعار: عقود الجمان، ج١، ورقة ١٦-ب.
٨٠- عقود الجمان: مخطوط، ج١، ورقة ١٧٣ ب.
٨١- ذيل مرآة الزمان، ج٢، ص٤٨١.
٨٢- ابن المستوفي: تأريخ اربل، ج١، ص٣١٤-٣١٥.
٨٣- ابن خلكان: وفيات الاعيان، ج٤، ص١١٤.
٨٤- تأريخ اربل، ج١، ص ٢٤٤-٢٤٥.
٨٥- ابن المستوفي: تأريخ اربل، ج١، ص٢٣٩-٢٤١.
٨٦- ابن المستوفي: تأريخ اربل، ج١، ص١٨٤-١٨٥.
٨٧- عمر فروخ، العلوم عند العرب، ص١٩٤.
٨٨- ابن الجوزي: المنتظم، ج١٠، ص٢٧٣.
٨٩- بڕوانە: القفطي: تأريخ الحكماء، ص١٩٤.
٩٠- ابن الجوزي: النتظم، ج٦، ص٢٥٣.
٩١- ابن المستوفي: تأريخ اربل، ج١، ص٣٠٤.
٩٢- سعيد الديووضي: دور العلاج، ص٣٣.

# بەڕێوبەرە گشتیەکانی تەندروستی هەولێر لە ماوەی ٨٠ساڵدا

**مەولود قادر بێخاڵی**


دکتۆر عەبدولرەزاق دەباغ


دکتۆر تاریق بەهائەدین خەلیفە


دکتۆر موزەفەر حوسێنی


دکتۆر مستەفا نادر العالم

١- دکتۆر سەلیم خەبات لە سییەکانەوە
٢- دکتۆر رەشید زەکەریا تا کۆتایی چلەکان
٣- دکتۆر بەشیر سەرسەم تا کۆتایی چلەکان
٤- دکتۆر سەلیم نوحاس لە پەنجاکانەوە- تا کۆتایی پەنجاکان
٥- دکتۆر عەبدولرحمان عەبدوڵلا لە پەنجاکانەوە- تا کۆتایی پەنجاکان
٦- دکتۆر مەردان عەلی لە پەنجاکانەوە- تا کۆتایی پەنجاکان
٧- یەحیا ئەمین بۆ ماوەیەک جێگر بووە لە شەستەکان بەردو سەردەوە
٨- دکتۆر سەلاح دەرویش
٩- دکتۆر ئەحمەد عوسمان ١٩٦١- ١٩٦٣ز
١٠- دکتۆر محەمەد زیوەر شەریف ١٩٦٤- ١٩٧٠ز
١١- دکتۆر عەبدولرەزاق دەباغ ١٩٧٠- ١٩٧٣
١٢- دکتۆر تاریق بەهائەدین خەلیفە
١٣- دکتۆر موزەفەر حوسێنی ١٩٧٩
١٤- دکتۆر مستەفا نادر العالم ١٩٨٠- ١٩٨٨
١٥- دکتۆر عەدنان یاسین سەعدی ١٩٨٨- ١٩٩١
١٦- دکتۆر مستەفا نادر العالم ١٩٩١- ١٩٩٣
١٧- دکتۆر حەسەن محەمەد سورە ١٩٩٣- ١٩٩٥
١٨- دکتۆر مستەفا نادر العالم ١٩٩٥
١٩- دکتۆر مەجید محەمەدەمین ١٩٩٥- ١٩٩٦
٢٠- دکتۆر حەسەن محەمەد سورە ١٩٩٦- ١٩٩٧
٢١- دکتۆر مستەفا نادر العالم ١٩٩٧-١٩٩٨
٢٢- دکتۆر فریاد غەفوری ١٩٩٩- ٢٠٠٥
٢٣- دکتۆر خالد عەلی عەبدوڵلا ٢٠٠٥ - تا ئێستا

* هەولێرم وادیوەو بیستووە، مەولود قادر بێخاڵی بەرگی سێیەم،٢٠٠٥/ل٧

# دەرماناوەکانی هەولێر

نادر رۆستی و سەلمان برادۆستی

بە هۆی پێکهاتە جیۆلۆجییەکەی خاکی کوردستان و هەڵکەوتی شوێنە سروشتییەکەی، سەدان بگرە هەزاران کانی جۆراوجۆر هەڵدەقوڵێت، ئاوی کانیاو ئەو ئاوەیە، کە بە شێوەی سروشتی لەژێر خاک دێتە دەرەوە، کانیاوەکان زیاتر لە ناوچە چیاییەکان بەدی دەکرێن، پێکهاتەی کانییەکان وەک یەکە، بەڵام رێژەی کانزاکانیان جیاوازە و شێوەی رێژەیی وەردەگرێ، ئەمەش وا دەکات هەندێک کانی خاسیەتی تایبەت وەربگرن و بە کانی کانزایی (دەرماناو) ناوزەد بکرێن، زۆر لە کۆنەوە ئەم جۆرە کانیاوانە لە کوردستاندا ناسراون.

باب و باپیرانمان لەژێر ناو و مەبەستی تایبەت و لەژێر بیر و باوەڕ و جۆرێک لە ئیمانداری سوودیان لەو کانیاوانە وەرگرتووە، بەڵام زانستی سەردەم ئاشکرای کردووە، کە کانییە کانزاییەکان (دەرماناو) پێکهاتەی کیمیایی جیاوازە لە کاتی ئاسایی، بۆ ئەم مەبەستە زۆرێک لە وڵاتان بە شێوەی زانستی لە کانیاوەکانی وڵاتەکەیان وەرگرتووە و بۆ چارەسەری چەندان نەخۆشی بەکاریان هێناون، بۆ ئەم مەبەستەش چەندان خزمەتگوزاری و رێگا و شوێنی تایبەت بۆ ئەو کەسانە گیراوەتە بەر، وەک گەشتیار سەردانی ئەو کانیاوانە دەکەن و سوودی لێ وەردەگرن، لێرەدا تەنیا یەک نموونە باس دەکەین لە وڵاتی ئوردەنی هاوسێی عێراق، چەند کانیاوێک هەیە، بۆ هەموو کانیاوەکان کۆمەڵێک خزمەتگوزاری لە جۆری خۆشکردنی رێگاوبان، رێکخستن و سەبکردنی کانیاوەکان و گەرماوی تایبەت لەسەر کانییەکان، تەنانەت گازینۆ و ئوتێل لە زۆرێک لە شوێنەکان دروست کراون، ئەمەش وای لێ کردووە بە سەدان و هەزاران گەشتیار لە ناوەوە و لە دەرەوە سەردانی کانیاوەکان بکەن و سوودی چارەسەری بۆ نەخۆشییەکان وەربگرن، لە ساڵی ١٩٧٧ ژمارەی گەشتیاران تەنیا لە گەرماوی (الحمة المعدنية) گەیشتۆتە (٤٦٤٥٠٠) گەشتیار. بەپێی ئەو پێوەرە ئەمڕۆ گەشتیاران سێ جار و بگرە چوار جار بەرامبەر زیادی کردووە، بەم جۆرە ئەگەر سێ جار زیاد بکەین ژمارەی گەشتیارانی ئەمڕۆ دەگاتە ١،٣٩٣،٥٠٠ واتە زیاتر لە یەک ملیۆن گەشتیار.

لێرەدا مرۆڤ پرسیار لە خۆی دەکات، کە بۆچی ئەوان بەم جۆرە گرنگییان بە کانیاوە کانزاییەکان داوە و کۆمەڵێک خزمەتگوزارییان بۆ جێبەجێ کردووە، کە ئەمەش ساڵانە رادەکێشی، بەڵام بۆچی ئێمە نەمانتوانیوە کەمترین خزمەتگوزاری بۆ ئەو کانیاوانە دابین بکەین و بەشێوەی زانستی سوودیان لێ وەربگرین؟

لێرەدا بە پێویستی دەزانین، کە نموونەی چەند کانیاوێکی سنووری پارێزگای هەولێر بخەینەڕوو، کە تاکو ئەمڕۆ بۆ چەندان جۆر نەخۆشی سوودیان لێ وەرگیراوە و لە لایەن دانیشتوانی کوردستان بە پیرۆز و پڕ بایەخ سەیر کراون.

١- کانیاوی شێخی باڵەکان، لە ناحیەی حاجی ئۆمەران، گەشتیاران بە رێژەیەکی زۆر رووی تێ دەکەن و سوودی لێ وەردەگرن، لە لایەن پزیشکەوە سەلمێنراوە کە سوودی بۆ نەخۆشییەکانی گورچیلە و فرێدانی بەردی گورچیلە هەیە.

٢- سێ کانیاوی گراوی حاجی

ئۆمەران، کە دەکەونە خۆرئاوای ناحیەی حاجی ئۆمەران، ئەم سێ کانیاوە خاسیەتی تایبەتییان هەیە، هەرسێ کانیاو لە تەک یەکترن و ئاوەکانیان جیاوازە و تەواوکەری یەکترن و بۆ نەخۆشی پێست بەکاردێن.

٣- کانیاوی گراو لە نزیک گوندی سماقوولی، لە سنووری شارۆچکەی کۆیە، ئەم دەرماناوە بۆ نەخۆشییەکانی پێست بە کاردێ، جێگای باسە کە ئەم کانییە کەمێک دەستکاری بۆ کراوە و دوو حەوزی بۆ ژنان و بۆ پیاوان بۆ دروست کراوە، کە ئەمەش کەمترین خزمەتگوزارییە.

٤- کانیاو و رووباری جەلی، لە نزیک گوندی جەلی لە باکووری شارۆچکەی کۆیە، ئەم دوو شوێنە بۆ نەخۆشی پێست سوودیان لێ وەرگیراوە.

٥- کانیاوی گراوی بابەجیسک، لە نزیک قەڵای دیوین، کە دەکەوێتە باکووری شارۆچکەی پیرمام (سەلاحەدین) ئەم دەرماناودیە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکانی پێست بەکاردێ، کانیاوێکی بەناوبانگە و رۆژانە گەشتیاران سەردانی دەکەن.

٦- دەرماناوی گوندی گراو، کە دەکەوێتە دامێنی سەری بڵند، ئەم کانییە بۆ نەخۆشی باداری (رۆماتیزم) بە کاردێ و سوودی لێ وەرگیراوە.

٧- گراوی گوندی شێخ مەموودیان، دەکەوێتە باکووری خۆرئاوای هاوینەهەواری سەلاحەدین (پیرمام)، ئەم دەرماناوە بۆ نەخۆشی پێست بە کاردێ.

٨- دەرماناوی گوندی کۆرێ، کە دەکەوێتە سەر رێگای پیرمام - شەقلاوە، ئەم کانیاوە بۆ نەخۆشی هەناو و ژانە سک بەکاردێ.

٩- کانیاوی شێرەسوار، لە نێو سەیرانگای شێرەسوار، بۆ نەخۆشی ماسولکە و رۆماتیزم بەکاردێ.

١٠- کانیاوی مام هند، لە گوندی کۆرێ، بۆ نەخۆشی پێست و خورشتی لەش بەکاردێ.

١١- کانیاوی مامەر (کانیێ مامەری)، دەکەوێتە نێوان گوندی گرتک و گوندی روست لە ناحیەی سمیلان لە قەزای چۆمان، ئەم دەرماناوە بۆ نەخۆشی باداری بەکاردێ.

١٢- کانی پیری باغ، ئەم کانیاوە دەکەوێتە سەر مەزاری پیری باغ لە بەرامبەر گوندی روست لە ناحیەی سمیلان، ئەم کانیاوە بۆ نەخۆشییەکانی گورچیلە و ژانەسک بەکاردێ، تەنانەت دەڵێن بۆ هەوێنی ماست بەکاردێ، بە تایبەت ئەو ماستەی نەمەیبێت و شل بێت.

ئەمانەی سەرەوە نموونەی چەند دەرماناوێک بوون، کەچی دەیان دەرماناوی دیکە لە کوردستان بەگشتی و لە هەرێمی کوردستان بە تایبەتی هەیە، بۆ زانیاری زیاتر زانینی پێکهاتە زانستییەکەی کانیاوەکان و ئەم جۆرە دەرماناوە، پەیوەندیمان بە دکتۆر (مەریوان ئەکرەم حەمە سەعید - پسپۆری گشتی جیۆلۆجی - ئاوی ژێر زەوی، لە کۆلیژی زانست، بەشی زەویناسی)یەوە کرد و گوتی: پێکهاتەی ئاو (H2O) یە، بەڵام (TDS) یاخود (الأملح المذابه) هەروەها چەندین ئایۆنی سەردکی تێدایە، کە ئەمانەن: (-O3-، -CO3، -HCO4، CL-، Ka+، -Na+، Mg++، Ca++)، هەروەها چەند توخمێکی دیکەش، کە رێژەیان کەمە لە ئاودا وەک: (کالیسیۆم NCa، مەگنیسیۆم Mg، سۆدیۆم- Na، پۆتاسیۆم-K، کلۆر-Cl، بایکاربۆنات - Hco3، کبریتات So4، کاربۆنات و نیتراتی رێژەی ئەم ئایۆنانە لە کانییەکەوە بۆ کانییەکی دیکە دەگۆڕێ یان جیاوازە، هەوروەها بە هەمان شێوە لە بیرێکەوە بۆ بیرێکی دیکە، سەبارەت بە چۆنیەتی سوود لێوەرگرتنیان بۆ جۆرەکانی نەخۆشی، هەندێکیان لەلای ئێمە زانراوە، بەڵام ئەوانی دیکە نەزانراوە، کە رەنگە پزیشکەکان زیاتر لەو بارەوە شارەزا بن، بەڵام ئەوەی زانراوە، بۆ نموونە: ئەگەر PH 7، ئەو ئاوە پێی دەگوترێ ئاوی ترش، یاخود حامض و ترشیش دەبێتە هۆی توانەوەی کلس، بەردی گورچیلەش لە نیشتنی کلس لە ناو گورچیلە دروست دەبێ، کەواتە دەکرێ ئەو جۆرە ئاوە ترشی زۆرە بۆ توانەوەی بەردی گورچیلە، سوودی لێ وەربگیرێ، هەروەها ئەو ئاوەی بۆ نەخۆشی پێست بەکار دێ، ئەو غازی تواوەی (H2S)ی تێدایە، کە بۆنی کبریتی لێ دێ، ئەمەش سوودی لێ وەردەگیرێ بۆ نەخۆشی پێست.

*** ئەم بابەتە لە گۆڤاری مێرگ ژمارە ١٦ ساڵی دووەم ٢٠٠٦ وەرگیراوە.**



# گوندی (ئەرمۆتە) و دێری (ماربهنام)

تاهیر ئەحمەد حەوێزی

وەختێ (یوسف سلیمان) پێش ئەوەی ببێ بە (قەشە)[1] لە مێژووی (١٩٦١/٨/٦) نامەیەکی بۆ نووسیم، لەسەر ناوی گوندی هەرمۆتە (ئەرموتە) و ناوی دێری (ماربهنام)، کە لەکن گوندی (تۆبزاوا)یە. لەو نامەیەدا نووسیویەتی - کە ئەوسا (شماس) بوو، و لە (معهد)ی (مار یوحنا الحبیب) لە (موسڵ) دەیخوێند:

لە کتێبخانەی کەنیسەی (ئەرمۆتە)ی گەڕام، کتێبەکانیم هەڵگێڕ و وەرگێڕ کرد، هەندێ زانیاری مێژوویی زۆر کەمم دەستکەوت:

لە کتێبی (گزا) کە بە دەستخەت و بە زمانی (کلدانی) نووسراوەتەوە دەتوانین وشەی (گزا) بە (کنز) = گەنجینە (کتێبی گەنجینە) وەربگێڕین، کە باسی نوێژە فەرزەکانی ڕۆژانی یەکشەموو، جێژنەکان و بیرخەرەوەکان (تذکار) دەکا، کتێبێکی زۆر ئەستوورە، لە کۆتایی کتێبەکە دەخوێنینەوە. ناوی کتێبەکە و مێژووی نووسینی کتێبەکە (١٨٥٩) و ناوی گوندەکەشی تێدایە، کە بۆ خاتری گوندەکە نووسراوەتەوە. بەم جۆرە نووسراوە: (ئەرموتە)ARMOUTA، هەروەها دەنووسێ (ماربهنام) (MARBEHNAM).

بەڵام لە کتێبی حوذرا (HOUDRA) کە تەفسیرەکەی (المدار)ە، کتێبی نوێژ و دوعای فەرزە بۆ درێژایی ساڵ، بەڵام لەم کتێبەکەی هەرمۆتەی بە (طاء) دەنووسرێ (ارموطه) و (ماربهنام): ئەو کتێبە لە ساڵی (١٨٧٣) بەدەست نووسراوەتەوە.

لە کتێبی (کەشکوڵ) (Caiscol) ئەو کتێبەش هی نوێژە فەرزەکانی ڕۆژانی ساڵی (بسیطە)یە، ناوی هەرمۆتەی لە (طاء) هاتووە، بەڵام ناوی (ماربهنام) لەسەر شێوەی (ماربێنا) (MARBENA). لە ساڵی (١٨٧٤) نووسراوە[2].

سەیر ئەوەیە چۆن لە ماوەی ساڵێکدا هەر عەینی نووسەری کتێبی (کەشکوڵ)و کتێبی پێشوو (حوذرا)، کە هەردوو کیان هەریەک نووسەر نووسیوینی، دێر

(ماربهنان)ی بەدوو چەشن نووسیوە؟

لە کتێبخانەی کنیسەی کۆیە کەمێ زانیاریم دەست کەوت، نووسەری هەندێ بەشەکانی (توراة) ناوی (ماربهنان)ی نووسیوە (مارمربهنام)، وشەی (مار)یش واتای بەرێز، گەورە (سید)، (قدیس)، (وەلی) دەبەخشێ، نووسەریش ناوی (هەرمۆتە)ی نووسیوە (ئەرموتە) لە ساڵی (١٨٦٩) بە دەست نووسراوەتەوە وشەی راستییەکەی (ئەرموتە) و (ماربهنام)ە.

یەکێ لە زانایانی مێژوو لە (موسڵ) باوک حنا فی (R.P. HANNA FYE) داوای لێ کردم کە هەندێ زانیاری لەسەر ناوی (ماربهنام) بۆ بنووسمەوە لە لاپەڕەکانی (ئینجیل)ێکی کۆنی دەستخەت، بەڵام بەداخەوە ئەو کتێبە بەنرخەم لە بارێکی زۆر شڕ و وردا دیت، زۆر پەڕی لێکرابۆوە. ئەو زانایە بە تەمایە لە کتێبخانەکانی عێراق و ئاوروپا بکۆڵێتەوە و لەبابەت مێژووی دێر (ماربهنام)ی (موسڵ) و (کۆیسنجق) زۆر وتاران بڵاوبکاتەوە.

بەڵام مێژووی (دێر ماربهنام) کە کوردە موسڵمانەکان پێی دەڵێن: "شێمحەمەد" (شێخ محەمەد) ی دێری، لەلای موسڵمانەکانیش پیرۆزە. هێشتان نەزاندراوە، (خوری افرام عبدال) لە مێژووی (دێر ماربهنام)ی (موسڵ)[3] دەڵێ: (دێر ماربهنام)ی کۆیسنجەق لەسەر ناوی ماربهنامی شەهید دروست کراوە، کە لە وڵاتی موسڵ کوژرا، لە سەدەی چوارەم و پێنجەم، راهیبەکانیش، کە لە موسڵ جێیان وەتەنگ هات، لە کێوەکانی (هەولێر) بڵاوبوونەوە.

وادەزاندرێ هەموو کەنیسەیەک کە رێکخرابێ (دێر)ێکیان هەبوو. گەنجەکانیان لەوێ پەروەردە کردووە و یارمەتی داوە لەسەر پەرستن و راهێنان و وەرگرتنی زانستی، تا لە دوارۆژ لەجیاتی ئەو قەشانەی کە ئەمری خوای دەکەن، ببنە قەشە. لەبەر ئەوەی لە کۆیە و دەورویشتی کۆمەڵانی زۆری دیان هەن، پێویستییان بە (دێر)ێکی ئەوها هەبوو، بۆ دەرچوونی قەشە تا ببنە سەرۆکی کەنیسەکان و هەڵسووڕێنەریان. ئەو دێرە لقی دێری سەرەکییەکەی (موسڵ) نییە، جارێ لەبابەت راهیبەکانیشی هیچ زانیاریمان نییە.

بەتریارک (یۆحنا هرمزد) خەلقی (ئەلقوش) لە باسی مێژووی ژیانی خۆیدا دەنووسێ: (لە ساڵی (٢٠٩٠)ی یۆنانی، کە دەکا (١٧٧٩)ی میلادی ئامۆزایەکم گەڕاوە سەر رێگای پێشوو، وازی لە (کاسۆلیکی) هێناوە، منیش لە (موسڵ)ەوە چوومە گوندی (عینکاوە) ماوەیەکی درێژی لێ مامەوە، لەسەر داخوازی خەڵکەکە چوومە گوندی (ئەرمۆتا) و گوندی (شەقڵاوە)، زۆر پێیانەوە ماندووبووم هەتا کردمنە (کاسۆلیک) و باوەڕی راستییان وەرگرت، کوڕی مامم کە ئەو خەبەرەی بیست کاغەزی بۆ ئەو گوندانە نووسی، کە گوێ بە قسەکانی من نەدەن. هەر خەڵکی هەرمۆتە (ئەرموتا) بە قسەیان کرد.

لە مانگی کانوونی ساڵی (٢٠٩٣ یۆنانی = ١٨٨٣ز)، رۆیشتم بۆ گوندی (ئەرموتا)، بە شەو گەیشتمە ئەوێ، زۆر سەرما بوو، کەسیان منیان نەحەواندەوە، بەیانی هەمووویان چوونە لای (مەحموود پاشا)ی کوردی، کە حاکمیان بوو، شکایەتیان لێ کردم و گوتیان: (ئەوە فەرەنگە) حاکم بەدوایدا ناردم، گفتوگۆیەکی زۆرمان بوو، (١٥) رۆژان لەوێ مامەوە، لە پاشان ناردمییە (موسڵ)ی فەرمانەکەی (سوڵتان)م بۆ هات، نیشانیم دا، کە زانی ئەمن کراومە دەسەڵاتداری هەموو (طائف)ەی



(کلدانی)مان، بە: (کاسۆلیک) و (نسطوری)یەوە، حاکم ڕێی دام بە ئارەزووی خۆم ئیش بکەم. دڵخۆشی خۆم بۆ بەدەرخست، من بە خراپی میللەتەکەم نەکرد، لەجیاتی خراپە چاکەم لەگەڵ کردن، ئەوانیش کە ئەمەیان لەمن دیت، نیشانەی تۆبەی تەواویان بۆ بەدەرخستم و گەڕانەوە ڕێی ڕاست.

لە مانگی ئابی ساڵی (٢١٠١ یۆنانی = ١٧٩١م) برازایەکی خۆم بەناو ئیماندارەکاندا گێڕا، قسەی ڕاستی فێر دەکردن، خوا چاوی دیانەکانی (هیران) و (بارزان)ی ڕوونکردەوە، ئیمانیان قبووڵ کرد، هەندێ پیاو و کاهنیان لەگەڵی هاتنە لام، کتێب و قاپی پیرۆزی پێویستم دانێ، کە لە کەنیسەکانیان ئیشی پێبکەن و گەڕانەوە گوندی خۆیان[٤].

قرۆکییەکی دێرەی تۆپزاوایە، کە بە دێر ماریێن قدیشە یا (شێخ محەمەدی دێرێ) دەناسرێ، بە گێچ و بەرد و گونبەت دروست کراوە و ناوەکەی تەواو تاریکە، لە پشتەوەی گۆرستانێکی گەورە هەیە، شوورەیەکی بە کەڵەکە بەردی هەیە، لەگەڵ هەندێ بنەدار زەیتوونی پیر، لەکاتی معینا لە ساڵا لە زۆر شوێنا دیان بۆ زیارەتی دێن. هەرمۆتەیی لە هەندێ جێژنان بەتایبەتی دەچنە زیارەتی و خواردنی لێ دروست دەکەن. موسڵمانیش بەناوی (شێخ محەمەد) دەچنە زیارەتی، دەمێکە چۆڵە، دیانەکان سواغی دەکەن[٥].

١- دەرگای ڕەئیسی، کە لە ترسی حەیوانات تەسک کراوەتەوە، نووسین دۆزراوەتەوە، کە بە چیلکە دارێک لەسەر کەفماڵی گێچ نووسراوە: (صلاو علای عمان) = (نوێژ بکە لە نیەتم و نیەتی هەموومان).

٢- تاق، نووسینی کلدانی لەسەرە، دەڵێ: کێخوا ئوغون یەکێ لە گەورانی گوندی ئەرمۆتە ئەو دێرەی لای (٨٠٠) ساڵ پێش ئێستا تەعمیر کردووەتەوە.

٣- سەکۆ.

٤- شوێنی پەرستن، جێگای قەشە و شەماشان.

٥- شوێنی دانیشتنی خەڵقە نوێژکەرەکان.

٦- دەرگەکان.

**ئاشەکان:**

بە ئاوی تۆپزاوایە، لە تۆپزاوایەوە هەتا نزیک گوندی (شیلە)ی ئەم چەند ئاشانە گەڕاون، هەندێکیان، هەتا ساڵانی (١٩٤٠)یش مابوون، هەندێکیشیان هەر شوێنیان ماوە:

**١- تۆپزاوا:**

١- ئاشی مام برایم ٢- ئاشی کۆن ٣- ئاشی حاجی جەلیل ئاغا ٤- ئاشی کەریم ئاغا - ئەمانە منارەی بە گێچ و بەردیشیان هەبووە.

**٢- هەرمۆتە:**

١- ئاشی چارباغی ٢- ئاشی مەلا موسای ٣- کاولەئاشی ناو ڕەزی خواجە کەریم ٤- کاولە ئاشی لە عاردی سێوەی لە بەرزان ٥- ئاشی دیانان ٦- ئاشی مزە لەبەر ڕێی (شیلە).

**سەرچاوە:**

١- لە مێژووی کۆیە بەرگی یەکەم هەندێ باسم کردووە، ئێستاش نامەکانیم هەموو لەلایە، ڕاستییەکەی خۆی زۆر بۆ ماندوو کردم، هەمووی بە عەرەبی بۆ نووسیومەوە.

٢- قەشە (حەنا ولیەم) لە مانگی شوباتی ١٩٨٠ کە قەشەی هەرمۆتە و کۆیەیە گوتی: (کتێبخانەی هەرمۆتەی لە ڕووداوەکانی ساڵانی (١٩٦٣) و بەملاوە هەمووی سووتێندرا، دەیانگوت: "هی کافرانە").

٣- (اللؤلؤ النضید في تاریخ ماربهنام الشهید) لاپەڕە (٥٠) چاپی موصل ١٩٥١.

٤- گۆڤاری (بین النهرین) ساڵی نۆیەم ژمارە (٣٤ - ٣٥) ساڵی ١٩٨١ کە لە مەترانیەتی کلدانی موسڵ دەردەچێ، لاپەڕە (٢٤٥ - ٢٥١).

٥- لە ڕۆژی جومعە (١٩٧٨/٣/٣١) مامۆستای سانەوی (عەبدولئەمیر حەنا) بەناوی سەری ساڵی تازە بە سەفەر چووبووە ئەوێ، لەسەر داخوازی من، ئەو قرۆکییەی بۆ کێشام لەگەڵ شەرحی نوقتەکان.

* ئەم بابەتە لە کتێبی (مێژووی کۆیە)ی تاهیر ئەحمەد حەوێزی، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم ١٩٨٤ وەرگیراوە.

# قادر حەمباڵ
# پزیشکی کوردەواری

بەرهەم عەلی

زستانی ساڵی (١٩٩٢) بوو، ئەو کات قوتابی بووم لە زانکۆی سەلاحەددین، لەگەڵ چەند قوتابییەکی دیکەی هاوڕێم - ژوورێکمان بەکرێ گرتبوو لە یەکێک لە باڵەخانەکانی شەقامی شێخەڵڵا لە هەولێر، ئێوارەیەکیان من و قوتابییەکانی هاوڕێم لە سینەماوە دەگەڕاینەوە بۆ ئەو باڵەخانەیەی کە ژوورەکەمانی تێدا بوو. کاتێ بە پێپلیکانەکاندا سەرکەوتین، یەکێک لە قوتابیانی هاوڕێم قاچی لە پێپلیکانێک خزاو کەوتە خوارەوە، قاچی لەجێ چوو. هێندە ئازاری دا، پڕ بەو باڵەخانەیە هاواری دەکرد، بۆیە دەستبەجێ باوەشمان پێدا کرد، هێنامانە خوارەوە، بەو نیازەی بیگەیەنینە نەخۆشخانەی فریاکەوتن، هێشتا چاوەڕێی تەکسی بووین، برادەرەکەشمان هەر هاوار هاواری بوو «ئای باوکەڕۆ قاچم!!»..

ئەوەندەمان زانی پیاوێکی ریش سپی عەرەبانەچی، هاتە لامان و گوتی: «ئەو برادەرە چ خێریەتی؟»، گوتمان: «لاقی لەجێ چووە»... گوتی: «ئەدی کێوەی دەبەن؟»... نەخۆشخانە. کابرا گوتی: «مامۆستا نەخۆشخانەی لۆ چییە هەنووکە بیبەنە کن قادر حەمباڵی، دەستبەجێ لاقیتان بۆ چاک دەکاتەوە»، ئیدی ئەو ئێوارەیە ناوی قادر حەمباڵم بیست، وەک پیاوێکی زۆر ناسراو لە هەولێردا. لەو پیاوەمان پرسی ماڵی قادر حەمباڵ لەکوێیە؟ پێی گوتین: «هیچ وەسف و ناونیشانی ناوێ، لە هەر کەسەکی بپرسی پێتان دەڵێ ئەوە ماڵی قادر حەمباڵییە».. تەکسییەکمان گرت و بە کاکی شوفێرمان گوت ئەرێ ماڵی قادر حەمباڵ دەزانی؟ دەستبەجێ گوتی سەرکەون، ئیدی ئەوەندەی یەک و دوو، لەبەردەم

ماڵی قادر حەمباڵ دایبەزاندین، لە ڕاستیدا ئەو کات وەکو ئێستا شارەزای گەڕەک و شەقام و کوچە و کۆڵانەکانی هەولێری پایتەخت نەبووم، بەڵام بۆم دەرکەوت، کە ئەم قادر حەمباڵە پیاوێکی ئاسایی نییە، بەڵکو ماڵەکەی وەک هەر نەخۆشخانە و دامودەزگایەکی دیکە لە هەولێردا ناسراوە. کە ڕۆیشتینە ماڵیان خانویەکی سادە و ساکار بوو، مام قادر بە ڕوویەکی گەشەوە پێشوازی کردین. کە چووینە ژوورەکەیەوە تەماشام کرد، وەک عیادەیەکی پزیشکی وایە، یەک دوو پەل و پۆ لە جێ چووی تریشی لێ بوو، کۆمەڵێ وێنەی ئێسکە پەیکەری مرۆڤ بە دیوارەکانەوە هەڵواسرا بوو، ئەو ئێوارەیە کاتێ تەماشای قاچ هێنانەوەی برادەرەکەم و نەخۆشەکانی دیکەم کرد. بۆم دەرکەوت کە قادر حەمباڵ بەیتاڵێکی چەند شارەزا و بە ئەزموون و لێهاتووە. هەر لاقی نەخۆشەکانی ڕادەکێشا و قرچ و ڕێک لە ئەژنۆیانەوە دەهات و مام قادر دەستێکی دەدا بە شانی نەخۆشەکەدا و دەیگوت: «هەستە بە پێی خۆت بڕۆ چ عەیبت تێدا نەما". ڕۆژ هات و ڕۆیی، کۆلێژم تەواو کرد و گەڕامەوە سلێمانی، بەڵام دووبارە چارەنووسم هاتەوە هەولێر، ئەم سێ چوار ساڵە چەند جارێکی دیکە خزم و کەس و برادەرانم دەبردە لای مام قادر حەمباڵ، هەموو جارێکیش زیاتر ئەم پیاوەم خۆش دەویست، مام قادر پیاوێکی هەژار و زەحمەتکێشی ئەم شارە بوو، پێم وابێ هەر بە پیشەی حەمباڵی ماڵ و منداڵی بەخێو کردبوو، پیاوێکی ڕیش سپی بەتەمەن و ڕووح سووک و لەش سووک و گورج و گۆڵ بوو، لەش و لارێکی زەعیفکەلەی هەبوو، بەڵام زۆر نەفس بەرز بوو، بە دەگمەن خەڵک هەیە لە هەولێر قادر حەمباڵ نەناسێ و ناوبانگی نەبیستبێ. مام قادر بەشێکی زیندووە لە ژیانی کۆمەڵایەتی شاری هەولێر، کەم کەس هەیە کاتێ خۆی یان کەس و کار و برادەرانی دەست و قاچیان لەجێ چوو بێ و هانای بۆ مام قادر حەمباڵ نەهێنا بێ. لەم دوو سێ ساڵەی دواییدا چەند جارێک دیمانە و ڕاپۆرتی تایبەتم لە ڕۆژنامە و کۆڕەکاندا دەخوێندەوە، کە لەگەڵ قادر حەمباڵدا ئەنجام درابوو. بەڕاستی لە هەموو شارێکدا ئەم جۆرە کەسانە هەنە و خەڵک ڕێزی تایبەتیان لێ دەگرێت، ئەمانە خەڵکانێکی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدار و دەست ڕۆیشتوو نین، بەڵام هەموو سەرمایەکەیان خۆشەویستی و ڕێز و حورمەتی خەڵکی سادە و ساکاری شارە... بڵێین و نەڵێین خەڵکانی وەک قادر حەمباڵ مرۆڤی گەورەن و پلە و پایەیان بڵندە، بەڵام بەداخەوە ئەم پیاوە زۆر بە بێ دەنگی ماڵئاوایی کرد و دەزگاکانی ڕاگەیاندن کەمتەرخەم بوون بەرامبەر دوایین هەواڵی قادر حەمباڵ، کە کۆچی دوایی کرد. لە ڕاستیدا ئەوەی بەرچاوم کەوت تەنیا هەواڵێکی زۆر بچووک بوو لە گۆشەیەکی تەنگی هەفتەنامەی گوڵاندا خوێندمەوە. من لەو باوەڕەدا بووم هەواڵی مەرگی قادر حەمباڵ لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکاندا هەواڵێکی سەرەکی دەبێت و لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا مانشێتی قەبە داگیر دەکات... بە داخەوە.